مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک

بەرتووکی پێنجەم

# کێشەی کورد و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتیک

(لەناو بەرداشی ژینۆسایدی کلتووریدا بەرگریکردن لە کورد)



عەبدوڵڵا ئۆجەلان
و: لوقمان عەبدوڵڵا

مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک

پەرتووکی پێنجەم

# کێشەی کورد و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات

## لەناو بەرداشی ژینۆسایدی کلتووریدا بەرگریکردن لە کوردان

عەبدوڵڵا ئۆجالان

وەرگێڕانی: لوقمان عەبدوڵڵا

ناوی کتێب: **کێشەی کورد و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات**
نووسینی: **عەبدوڵڵا ئۆجالان**
وەرگێڕان: **لوقمان عەبدوڵڵا**
چاپ: **یەکەم**
**تیراژ:( ٤٥٠٠ )**
**نرخ؛ (٦٠٠٠)**
**چاپخانە: ڕەنج**

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (٢٣٥٣) ساڵی (٢٠٠٩) پێدراوە**

# ناوەڕۆک

**بەشی سێیەم:**



**بەشی چوارەم:**

**بەشی پێنجەم**



**بەشی شەشەم:**

بەشی حەوتەم:

## گوتەیەکی پێویست

ئەم پەرتووکەی وا پێشکەش بە خوێنەران دەکرێت دوا بەرگی شاکارە پێنج بەرگیەکەی ڕێبەری گەلی کورد عەبدوڵڵا ئۆجالانە کە لەژێر ناوی مانیفستۆی شارستانیتی دیموکراتیک وەک بەرگرینامەیەک ئامادەیکردووە. بەرگرینامەکە بۆ دۆزێکی ناڕەزایی دەرهەق بە سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە ئامادەکراوە کە لەمیانی بڕیارێکی سیاسی کۆنسەی ئەورووپا ڕەتکرایەوە، بەو ئامانجە پێشکەش بە دادگایەکی باڵاتری مافی مرۆڤی ئەورووپا کراوە.

وەک لەمیانەی کتێبەکەشدا هاتووە لە ڕێکەوتی ٢٢ی کانونی یەکەمی ٢٠١٠ لەلایەن نووسەرەکەیەوە تەواو کراوەو پێشکەش بە لایەنە پەیوەندیدارەکانی وەزارەتی دادی تورکیا کراوە تا بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپای ڕەوانە بکەن. بەڵام حکومەتی ئاکەپە دەستی بەسەردا گرت و لە مانگی ئابی ٢٠١١ بەشێوەیەکی ناتەواو بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپای ڕەوانە کرد؛ لاپەڕەیەکی کەم بوو، کە ئەویش دوای چەند مانگێک بەدەست هێنرایەوە، لەپاڵ ئەمەشدا لەجیاتی دەستنووسی ڕێبەر ئاپۆ فۆتۆکۆپیەکەیان ڕەوانە کردبوو؛ فۆتۆکۆپیەکەش باش نەبوو و هەندێک شوێنی بە باشی نەدەخوێنرایەوە. هەر بۆیەش چەند جارێک پێداچوونەوە بۆ دەقە تورکیەکە کراوە کە دواترینیشیان لە هاوینی ٢٠١٢ بوو. بەگوێرەی ڕێکاری ئەم خەباتەو داخوازی ڕێبەر ئاپۆ دەبوایە دوای پێداچوونەوە جارێکی دیکە بەجۆرێک لە جۆرەکان خۆی ببینیبوایە، بەڵام بەهۆی ئەو گۆشەگیریە ناڕەوا و هۆڤانەی حکومەتەکەی ئەردۆغان لە دوورگەی ئیمرالی بەسەر بەڕێزیدا سەپاندوویەتی ئەو دەرفەتە نەڕەخسا.

وەک چوار بەرگەکەی پێشوو ئەو پەرتووکەشمان بۆ شێوە زاری کرمانجی خواروو (سۆرانی) وەرگێڕاوە. هەرچەندە وەرگێڕانەکە کامل نەبێت و لە کەموکورتیش بێبەش نەبێت بەڵام لەو بڕوایەدام کە ئەم بەرهەمەی ڕێبەر ئاپۆ چاوڕوونیەکی زۆر بە تاک و کۆمەڵگای کوردستان دەدات و دەبێتە چاوگێکی ڕۆشنکردنەوەی بیرو هزر.

دەقە تورکیەکەی چوار بەرگەکەی پێشوش پێداچوونەوەی بۆ دەکرێت و سەرلەنوێ چاپدەکرێنەوە، ئێمەش لەلای خۆمانەوە بەگوێرەی ئەوە پێداچوونەوە بۆ هەر چوار پەرتووکە سۆرانیەکەی پێشوو دەکەین، هەوڵدەدەین سەرلەنوێ چاپیان بکەینەوە و پێشکەش بە خوێنەرانی هێژای بکەین.

لەکۆتاییدا سوپاس و ڕێزی خۆم پێشکەشی یەکە یەکەی ئەو بەڕێزانە دەکەم کە لە تایپکردن، پێداچوونەوە و کارە هونەریەکان و هەر بوارێکی تردا بە جۆرێک لە جۆرەکان یارمەتیدەرم بوون.

وەرگێڕ

١٢-١٢-٢٠١٢

## پێشەکی

هەڵکشانی هێزەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری لە ئەورووپا و بەدەستەوەگرتنی جڵەوی پێشەنگایەتی سیستەمی شارستانی ناوەندی ـ کە بنەڕەتەکەی بۆ خۆرهەڵاتی ناوین دەگەڕێتەوە ـ و هەوڵەکانی خۆبونیادنانەوەیان لەسەر کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین؛ باجەکەی کارەساتی زۆر گەورە بووە. شانبەشانی ئەو هەژموونگەراییەی لەسەر کلتووری ماددی و کلتووری زهنییەت بەڕێوەیان بردووە؛ لەرێگای دامەزراوە سیخوڕیەکانیەوە، لەسەررووی هەمووشیانەوە لەژێر هەژموونگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە، لەسایەی هەلومەرجی بەردەوامی شەڕ و لەمیانەی کۆمەڵکوژی، داگیرکاری، ئاسیمیلاسیۆن، ژینۆساید، ئەنتگراسیۆنی زۆرملێیانە کلتووره هەزار ساڵیەکانی کۆمەڵگاکانیان رووبەڕووی لەناوبردن کردۆتەوە، چەندە جێگای داخە لەو دوو سەدەیەی دوایی مێژووی خۆرهەڵاتی ناویندا ناکۆکییە بونیادیەکانیشی بەکارهێنا، ئەمەش وایکردووە تا ئێستا بیر لەتێگەیشتنی ئەو دامەزراوە سیخوڕیانەش نەکرێتەوە کە ئاواکراون. نەک تەنیا زاڵکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر شێوازی هزری خۆرهەڵاتناسی (ئۆریانتالیزم)، بەڵکو زاڵکردنی بەسەر تەواوی بوارەکانی ژیاندا، تەنیا دەشێت لەمیانەی شیکاری زۆر بەرفراوان و میتافۆری ناو "قەفەسی ئاسنین" روون بکرێتەوە.

بۆ نموونە؛ رۆڵی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەو کارەساتانەی بەسەر کلتووره خۆجێییە هەزاران ساڵیەکاندا هات ـ لەسەررووی هەمووشیانەوە ئاشووری، ئەرمەنی، ئیون و گورجی ـ کە میراسەکانیان بوون بە کاڵای مۆزەخانەکان، تەنانەت رەخنەش نەکراوە و کۆمەڵکوژی و ژینۆسایدکردنیان نەخراوەتە ژێر رۆشنایی هزری دیالیکتیکیەوە. هەروەها ئەوانەش واقیعێکی پەردەپۆشکراون کە دەسەڵاتەکانی بە بنەچە عەرەب، فارس، تورک کە خۆیانیان بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بونیادناوە، هەریەکەیان وەک ئامێرێکی قڕکردن لەسەر کلتووری کۆمەڵگای خۆیشیان دەستبەکاربوون. لەگەڵ هەڵوەشانەوی دەوڵەت ـ نەتەوە و کەوتنی دەمامکەکانی، ئیتر ئاشکرا بووە کە نەک تەنیا لە جوگرافیا داگیرکراوەکان بەڵکو لە جوگرافیای بنەڕەتی هەژموونگەرایی خۆیشیدا، ئەو دامەزراوەی ئامانجی ئافراندنی "نەتەوە ـ کۆمەڵگا هۆمۆژەنەکان" ـە وەک پێویستیەکی "یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج" بریتییە لەبونیادێکی فاشیست ـ تۆتالیتارانە.

کاتێک کوردان جێگای باس بن ئەو لێویاتان[١]ـەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە خۆی نوێکردۆتەوە، خۆی دەمامک دەدات و لە بەرگێکی شاراوەدا هەموو جۆرە ئاستەنگێک دەئافرێنێت و لەژێر ناوی "پێشکەوتنخوازیەوە" ژینۆسایدێکی کلتووری بەسەردا دەسەپێنێت کە ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر لە پەرەسەندن دایە. بێگومان ژینۆسایدی کلتووری کوردان لە سیستەمی شارستانی ناوەندی بەبنەچە خۆرهەڵاتی ناوینی هۆکاری ریشەداری خۆی هەیە، تەنیا بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە نابەسترێتەوە. بەڵام تا ڕۆڵی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆرئاوای ئەم دوو سەدەیەی دوایی لەناوچەکە روون نەکرێتەوە، ناتوانین ڕاستینەی کورد و کێشەی کوردی بەکانگرێن بوو وەک زاراوە و تیۆری تاوتوێ بکەین. بەرپرسیارێتی هێزە هەژموونگەراکانی ئەوروپا، لەسەرووی هەمووشیانەوە بریتانیا، ئەڵمانیا، فەرەنسا و ئەوانی دیکە دیاریکەرە لەو دۆخەی کە نوخبەی فاشیستی "تورکی سپی" کە لەسەر پاشماوەکانی نەریتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی هاتە ئاراوە و تەنیا لەچوارچێوەی دەسەڵاتگەرایی تەسکدا پەیوەندی بە ڕاستینەی تورکەوە هەیە و لە تورکەکان زیاتر لەو کەسە بێ نەتەوانە پێکهێنراوە کە دووچاری هەموو جۆرە نەخۆشیەکی دەسەڵات هاتبوون ـ وەک ئامێرێکی ژینۆسایدی کلتووری تەواوی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین، گەلی تورکیشی لەناودا ــ ڕۆڵ ببینێت. لەکاتێکدا زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە؛ فاشیزمی ئەو تورکە سپیە لە ژینۆسایدکردنی ئەرمەنیەکان ــ کە بەردەوام دەکرێت بە ڕۆژەڤ ــ تەنیا وەک ئامرازێک ڕۆڵی بینیووە، بەڵام لەمیانەی دەستنیشانکردنێکی زانستیانەوە روون دەبێتەوە کە ئەو هێزە هەژموونگەرایانە خۆیان لە ئاشکرابوونی بەپرسیارێتیەکەیان دەشارنەوە و گشت تاوانەکانی ژینۆساید دەخەنە ئەستۆی تورکەکانەوە.

دەکرێ ئەو ڕاستیەش زیاتر لە ژینۆسایدی کورداندا ببینرێت و روون بکرێتەوە. لەم دوابەشەی بەرگرینامەکانم بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا هەوڵی ڕۆشنکردنەوەی ئەو ڕاستیە دەدەم. دادگاییکردنەکەی دورگەی ئیمڕالی لەڕاستیدا هی سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەوروپا بوو کە بەدەستی تورکیا ئەنجامدرا. واتە دادگاییەک نەبوو کە بەهێزی دەوڵەتی تورک ئەنجام درابێت. ڕۆڵی نوخبەی دەسەڵاتی تورک لە مەقاش بەولاوە تێپەڕ ناکات. بێگومان ئەوە ڕۆڵێکی چەپەڵە و سەر و مێشک ئاڵۆز دەکات. گەیاندنی ڕاستینەکەی بە گوزارشتێکی ڕاست گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. بە پێداگریەوە ناخوازن ئەو پیلانە یاسایی و فشارانەی دەسەڵات ببینن و پەسەندی بکەن

---

[١] Leiviathan بە گوێرەی تەورات درندەیەکە لە شێوەی نەهەنگدایە و لە دەریادا دەژی و هەموو شتێک قووت دەدات. بۆ یەکەمین جار لەلایەن تۆماس هۆبزەوە بەواتای دەوڵەت و دەسەڵاتی ستەمکارانە بەکارهێنرا، تەنانەت پەرتووکێکی بەم ناوەوەیە.

کە لەسەر کەسێتی من پەیڕەو دەکرێت. تەنانەت مەسەلەیەکی وەک دەستگیرکردنم لەلایەن ئۆپەراسیۆنێکی نهێنی و شاراوەی گلادیۆ (ناتۆی نهێنی) کە بەشێوەیەکی ئاشکرا مانای پێشێلکردنی یاسای جیهانی و یەکێتی ئەوروپا دەبەخشێت، دیسان دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا ـ کە لەژێر بەرپرسیارێتی کۆنسەی یەکێتی ئەوروپا دایە ـ خۆی لێدەدزێتەوە و هەوڵدەدرێت لە دژی من ئەنجامگیر بکرێت. ئەوەش لەحاڵەتێکدایە کە لەناو زیاتر لە دووسەد دۆزی سەبارەت بە"سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە" کە پێشکەش بەو دادگایە کراوە، لەسەر بنەمای ئەو ڕێکەوتنە ئابڕووبەرانەی لەگەڵ دەوڵەتی تورکیا بەستوویەتی، بەبێ هیچ شەرم و سڵەمینەوەیەک تەنیا دەرهەق بە دۆزەکەی من گوایە "لەسەر دۆسیەکە" بە ئەنجام گەیشتوون و بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایان ڕەوانە کردۆتەوە؛ بەمجۆرەش گرنگترین بەشی دۆزەکەیان داخستووە. دادی تورک و پەرلەمانی تورکیا کە تا ئێستاش تەواوی پرەنسیپەکانی حقوقی گەردوونی بنپێ دەکات و ماددەی تایبەتی یاسایی دەردەخات تا ئەو یاسا و حوکمانە جێبەجێ نەکرێن کە لە بەرژەوەندی من و دۆزەکەمدان؛ ئەو بڕیار و کردەوە نایاساییانە چاوەڕوانی حوکم و بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپایە. ئەو ستاتۆیەی کە ١٢ ساڵە جگە لە من لەسەر هیچ حوکمکراوێکی دیکە پەیڕەو ناکرێت، هەروەها ئەو هەڵوێستە نا عادیلانەی دادی تورک و DMME کە پێچەوانەی پێوەرە حقوقیەکانی خۆیشیانە، پیشانیدەدات کە پیلانگێڕییە نێودەوڵەتیەکەی دەوروبەری دۆزەکە لەبواری یاساییدا بەردەوامە و تا ئێستاکەش گلادیۆ لەسەر کارە.

بەمجۆرەش هەوڵدەدرێت بەرگێکی یاسایی بەبەر ئەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتیەدا بکرێت تا لەو دۆزەی دەرهەق بە کەسێتی من بەڕێوەدەچێت ژینۆسایدی کلتووری سەر کوردان ئاشکرا نەبێت. نکوڵی کردنی ڕاستینەی ژینۆسایدی سەر کوردان بەردەوامە و هەروەک ئەو دوو سەدەیەی دوایی خوازیارن بەرژەوەندیەکانی هەژموونگەرایی خۆرئاوای سەرمایەداری بەردەوام بێت. ئامانجی ئامادەکردنی بەرفراوانی دوا بەرگرینامەم ئەوە بوو تۆزێکیش بێت دەمامکی ئەو گەمە مەزنەی نیولیبڕالیزم هەڵماڵم و ئاشکرای بکەم کە هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانگیری لەسەر تەواوی گەلانی جیهان، بەتایبەتیش لەسەر گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین هەوڵی جێبەجێکردنی دەدات. بێگومان لەو هەوڵەشدا گەورەترین یارمەتی لەو ڕۆشنبیرانەی ئەوروپا وەردەگرم کە کۆمەکی مەزنیان پێشکەش بە ڕۆشنکردنەوەی دەستەواژەی حەقیقەت کردووە. هەروەها تێکۆشانی ئازادی، سۆسیالیزم و دیموکراسی گەلانی ئەوروپاش کە بە لەخۆبردوویی و فیداکاریەکی مەزن بەڕێوەیان بردووە بەلانی کەم هێندەی بزووتنەوە ڕۆشنبیرییەکان لەو بارەیەوە خاوەن کۆمەکن و بەهادارن. لەڕاستیدا چەمکی گەردوون (جیهان)ی کە ناوەڕۆکی بەرگرینامەکەم پێکدێنێت بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئاماژە بە یەکێتی

لێکدانەبڕاوی تێکۆشانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی ڕۆشنبیران و گەلان دەکات. پەیڕەوی سەرەکیم لەسەر بنەمای یەکپارچەیی پەیوەندی نێوان تاکانەیی- گەردوونییە.

لە بەرگرینامەکانمدا چاوەڕوانی بەدەستهێنانی دەسکەوتی یاسایی نیم. ئەم بەرگرینامەیەم تەنیا بە ڕوونکردنەوەی چەپەڵی و ستەمکاری ئەوانە ناوەستێت کە تەنیا خۆیان بەشارستان دادەنێن و لەو بڕوایەدان کە دڕندەیەکی سەرەتایی یان کێویەک پەروەردە دەکەن، لەوەش قێزەونتر مەزەندە دەکەن لە کەسێتی مندا گەلێک تەربیە دەکەن؛ گوایە دەتوانن گەلی کورد تەربیە بکەن؛ لە هەمان کاتدا ڕووی ڕاستەقینەی خاوەنەکانی سیستەم ئاشکرا دەکات کە تا دواڕادە سووک و چرووکن و ڕەفتار و کردەوەکانیان لە هیچ پێوانەیەکی مرۆڤایەتیدا جێگای نابێتەوە. ئەوەش بێڕوویی هەزار ڕووەکان، لەوەش زیاتر بێڕوویی بێڕووەکان ڕوون دەکاتەوە.

دڵنیام کە بەرگرینامەکانم کاریگەریەکی بەهێزیان لەسەر کلتووره خۆجێییەکانی تەواوی خۆرهەڵاتی ناوین دەبێت، لەسەررووی هەمووشیانەوە کلتوورەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا کە وەک حەقیقەت گوزارشت لەخۆیان بکەن و لەبواری سیاسیشدا ئازادبن. لەو بڕوایەدام ئەو بەرگرینامانەم دەبێتە یەکێک لە بەردەکانی بناخەی ئەو کلتوورانەی ڕۆڵێکی مەزن لە پەرەسەندنی مانادارترین بوونەکانی ئەو گەردوونەدا دەبینن و لەمیانەی کاروانی ئازادی، دیموکراسی و سۆسیالیزمەوە جێگیر دەکرێت و تا دوایش ڕێگای ژیانی ڕاستەقینەی مرۆیی ئاوالا دەکات.

# دەروازە

بەپێچەوانەی مەزەندەکان پێناسەکردنی کێشەی کورد بەدۆخی هەنووکەییەوە لەلایەنە خۆجێییە تایبەتەکەی بەهۆی دۆخە گەردوونیەکەیەوە زیاتر رەوشێکی ئالۆزی وەرگرتووە و زەحمەتە. ئەو کاتە کێشەی کورد بۆمن دەستیپێکرد کە رۆژانە لەگوندی خۆمانەوە پێنج کیلۆمەتر بەپێ بۆ قوتابخانەی سەرەتایی گوندی جەبین ی دراوسێ دەرۆیشتم. گرفتەکە لە مەسەلەیەکی جەستەیی زیاتر کلتووری بوو. چونکە زمانی تورکی زمانێکی بیانی بوو. جددیترین و یەکەمین خۆ بچووک بینین ئەو کاتە دەستیپێکرد کە بە بێدەنگی لەزمانی دایک واتە لەزمانی کوردی دوورکەوتمەوە و لە تورکی نزیک بوومەوە کە زمانێکی خاوەن جیاکاری (امتیازات) بوو. لەو بڕوایەدام کە دۆخی بچووک زانین و بچووک بینینی لە شەخسی خۆمدا هەستم پێدەکرد هەوڵمداوە پیشانی بنەماڵەکەمی بدەم و باجەکەشی لەوان دەربخەم. ئێستاش لەبیرمە: ئەو دایکەی بانگەشەی مافی بە سەرمەوە دەکرد؛ مریشک و جووجەلەکانیم پیشاندا کە لەو ناوە دەسوڕانەوەو پێم گوت "ئەو مریشکە چەندی ماف بەسەر جوجەلەکانیەوە هەیە، تۆش ئەوەندە مافەت بەسەر منەوە هەیە". پێویستە ئەو نموونەیە سەرچاوەی خۆی لەو ناکۆکیەی نێوان زمانی کوردی و تورکی وەربگرێت، لەکەسێتی بنەماڵەکەمدا کوردێتیش بۆ من هۆکارێکی خۆبچووک بینین بوو. گەلێک کە بە زمانی خۆی نانووسێت و نائاخافێت شایستەی بچووک بینینە!.هیچ گومانێکی تێدا نییە ئەو دیاردەیە برینێکی لە رۆحی منداڵیم کردەوە و چەندەی کاتیش بەسەردەچوو قووڵتر دەبوویەوە؛ هەروەها ئەگەر گوزارشتەکە لەجێگای خۆیدا بێت: ئیتر کوردێتی وەک کلکێک بەمنەوە نووساو تەنانەت بۆ ساتێکیش منی بە ئارامی نەدەهێشت. ئیتر لەو دەوروبەرەدا گوتەی "کوردی کلکدار" بڵاو دەبوویەوە. ئەوەش دووەمین زەبر بوو بەلای منەوە.

خوازیارم ئەو خاڵە بەبیربخەمەوە کە میکانیزمی بەرگریکردنم لەدوو لایەندا پێکهات. وەک نوێنەرێکی کلتووری نەریتی باو خۆپێچان لە ئایین و پێشنوێژیکردن بۆ ئەو دە قوتابیەی قوتابخانەی سەرەتایی کە بەلای خۆمدا کەمەندکێشم کردبوون؛ ئاشکرایە کە تەنیا دەشێت وەک پەرچەکردارێکی جددی مانادار بکرێت. ئەو هەڵوێستەم تا دوا پۆلی ئامادەیی وەک خۆی بەردەوام بوو. دۆخی باوەڕمەندیم بەرامبەر بە نەریتی عەلمانیی فەرمی تایبەت و سەیربوو، پەرچەکردار و بەرگریکارانە بوو. نزیکەی ئەو سی و سێ سورەتەی قورئان کە دەرخم کردبوون بۆ من وەک چەکی بەرگری وابوو، راوەستەکردن لەسەر ئەو یەکەمین دۆخە پەردەپۆشکراوەی پەرچەکردارم بەرامبەر بە کوردێتی شایانی هەڵوەستەکردنە. دووەمین چەکی بەکاریگەرم لەبەرامبەر گرێی بچووک بینینم، بەردەوام بوونم بوو لە پێگەی یەکەمی پۆل. تا دوا قۆناغی زانکۆ دەستبەداری پێگەی خوێندکارە بەرچاوەکەی مامۆستایان نەبووم. ئەمەش نمایشێکی پاڵپشت بە دەرخکردن بوو؛ میکانیزمێکی بەرگریکار و پەرچەکردار بوو، وەک بڵێی خوازیاری سەلماندنی ئەو خاڵە

بووم کە: هەم قەرەبووی ئەو دۆخە نەرێنییە بکەمەوە کە بچووک بینینی کوردێتی ڕێگای لەپێش کردبوویەوە، هەم پیشانیان دەدەم کە بە ئاسانی رادەست نابم. ئەم بابەتەش بەو شێوەیە بەردەوام تێیدا سەرکەتوو بووم.

لەدوا قۆناغی قوتابخانەی ناوەندیدا لە سۆفیێتی ئیسلام دوورکەوتمەوە کە بریتییە لە ئایینی نەریتی و لایەنی نمایشکردنی لەپێشە و لەمیانەی پەرتووکی ئەلفبێی سۆسیالیزم وەک ئایینی عەلمانیی هۆگری سۆسیالیزم بووم و لە ژێر ئەو دیمەنەدا درێژەم بە موریدێتی نوێدا. گۆڕانکاری لە رووخساردا بوو. باوەڕمەندی بەردەوام بوو. لەراستیدا ١٩٧٠کان سالآنێک بوو کە هەنگاوی گەورە و وەرچەرخان لە دونیا و تورکیا جێگای باس بوو. یەکەمین درز لە پیرۆزیەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دەکرایەوە. کێشمەکێشی نێوان سەرمایەداری ــ سۆسیالیزم لەو سالآنەدا هەروەکو چۆن لەناوەڕۆکدا مانای جیابوونەوەیەکی جددی نەبەدەخشی، لەلای منیشەوە وەک جیابوونەوەیەکی قووڵ نەدەبینرا. جیاوازی تارادەیەکی زۆر لەبواری رەوانبێژیدا بوو. تاکە لایەنی گۆڕانکاری چارەنووسسازی ئەو دۆخەی تورکیا لەوە دابوو کە بەهۆی بچووک بینین هەستەکانی کوردێتیم بژاری سۆسیالیزمی رووخسار یاخی لەمندا بەدەرخست. ئیتر خۆئاشکراکردنی کوردێتی لەمیانەی سۆسیالیزمەوە جێگای شەرم و ترس نەبوو. هەلومەرج پێویستی بەمە بوو. هەرواشم کرد. وێڕای ئەوەی بە ترسەوە جولامەوە بەلآم لەو هەلومەرجەدا هەواداریم بۆ هەر گروپێکی چەپڕەو و گەیشتنم بە میلیگەراییەکی کورد تێکەڵ بەسۆسیالیزم دەستپێکردنی پرۆسەیەکی مانادار بوو. بەو خێراییە ئەو گروپانە تێریان نەکردم، ئیتر گروپی سەربەخۆم پێکهێنا، دوای دامەزراندنی PKK بە ئەزموونەکانیARGK و ERNKدا تێپەڕیم و هەرە دوایش لەمیانەی KCKوە رۆژانەیی و هەنووکەییکردنەوەی قۆناغ ئەنجامێکی هەمان پێکهاتەی رۆحی بوو، رۆشنکردنەوەی کێشەی کورد بەو دۆخەیەوە ماراسۆنێکی سی سالآنەیە، ئەگەر سەردەمی سەرەتایی و ناوەندیشی بخەینە سەر کە قۆناغێکی شاراوە بوو، ئەوا دەبێتە ماراسۆنێکی چل سالی. لە سەرووی هەموویانەوە دایک و باوک و تەواوی بە ناو گەورەکانمان ــ پێویستە بە ئازارەوە بیڵێم ــ ئاگاداری دۆخی رۆحی مندالآن بن و مسۆگەر پێویستە رۆحیان بە بەکۆمەڵگابوونێکی راست تێربکەن، تا بەئێش و رقێکی بەمجۆرە مندالآن ناچاری ماراسۆنێکی وەها نەبن!.

سەبارەت بەکێشەی کوردەوە بەباشی ئاشکرا بووە ئیتر دەولەت و کۆمەڵگا چاوەڕوانی ڕێگەچارەیەکی خێران. نەخۆشی شوێنی خۆی گرت، ئێستاش ڕێگەچارەیەکی تەندروستانەی پێویستە. کێشەی کورد کە لەئەنجامی حالەتی رۆحی مندالێک دەرکەوتەروو کە لە رووخساردا غروری شکێنراوە و بێزێزی لەبەرامبەر کراوە و لەهەلومەرجێکی ناتەواودا چاوەکانی بۆ ژیان کردۆتەوە، لەراستیدا بەو دۆخەی ئێستای تەواو لە رەوشێکی گەردوونیبووندا دەژیت. کاتێک کێشەکە لەدۆخی گەردوونیدابێت، ئەوا دەست لێبەرنەدراوە کە چارەسەرکردنیشی پێویستە لە هەلومەرجی گەردوونیدا بێت، ئەمەش پێویستی بە زهنیەتێکی گەردوونی هەیە. هەڵکشانی گەورە فەیلەسوفی ئەڵمانی

هیگل لەسەرەتاکانی ١٨٠٠ بۆ گەردوونیبوون ڕێکەوت نییە. بەڵکو لەنزیکەوە گرێدراوی هەلومەجەکانی ئەو قۆناغەیە، کێشەی ئەڵمانیا کە پارچەبوونی میرنشینە ئەڵمانیەکان ڕێگایان لە پێش کردەوە و بە پارچەبوونیان قووڵتریان کردەوە و لە ئاکامی داگیرکاری ناپلیۆنیش بەحاڵەتێکی زۆر ئاڵۆز گەیشت، سەرەتا تەنیا دەشیا لەبواری هزریدا شیکار بکرێت، هەر ئەوەش بوو کە لای هیگل ڕەنگیدایەوە. کاتێک گوتیان بەرگرینامەی *لەدەوڵەتی کاهینی سۆمەرەوە بەرەو شارستانێتی دیموکراتیک* تایبەتمەندی هاوشێوەی لەگەڵ یەکەمین گەورە قەڵەمبازی فەلسەفی هیگل "فەنۆمەنۆلۆژی" هەیە کە دوو سەد ساڵ پێش ئێستا نووسیویەتی سەرم سوڕما. ئەگەر زۆر سنوورداریش بێت یەکەمجار بوو هەنگاوم بۆ تێگەیشتنی هیگل هاوێشت. منیش ناچاربووم ململانێ لەگەڵ گەردوونیبووندا بکەم. هەروەها جێگای سەرنجە؛ ئەو پیلانگێڕییە نێودەوڵەتییەی بەسەر مندا دەسەپێندرا و کێشمەکێشەکانی سەر کوردستان کە بە هی ئەڵمانیای قۆناغی خۆی دەچوو، ڕێگای لەپێش چارەسەریەکی هاوشێوە دەکردەوە. کورد و کوردستان کە یەکێک لە گەل و وڵاتە هەرە دێرینەکانی جیهانن؛ وڵاتەکە دزراوە و گەلەکەش لەبیرکراوە، خوداوەندە هاوچەرخە بەهێزەکان؛ هێزە هەژموونگەرا و هاوپەیمانەکان کە بێدەمامک یاری دەکەن، ڕەفتارێک بەرامبەر بەو گەل و نیشتیمانە دەکەن گرێدراوی هیچ یاسا و ڕێسایەک نییە، ئەوەی بەشێوەیەکی بەردەوام ڕوودەدات و دەسەپێنرێت، ژینۆسایدێکی کلتووری پەردەپۆشکراوە.

لەئومەتگەرایی ئیسلام، کۆسمۆپۆلیتیزم و لیبرالیزمی سەرمایەداری و ئەنتەرناسیۆنالیزمی سۆسیالیزمی بونیادنراودا کورد و کوردستان لەبوویەرێکی بێهیوا بەولاترەوە، لەدۆخێکی بێکاریگەر ناوە ناوە بیریان هاتۆتەوە، دەشێت ئەو ڕەوشەش تەنیا بە ژینۆسایدی دەمامکدراوەوە گوزارشت بکرێت. گرێدراو بەو واقیعەشەوە بەرگرینامەکانم بەشێوەی سێ ئەڵقە پێشکەشکراوە کە یەک بەدوای یەک قووڵتر دەبوونەوە. کاتێک لە ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە بۆ یەکەمین جار بە دەستنووسی هەڤاڵی ڕەسەن و باوەڕمەندم محەمەد خەیری دورموش یەکەمین دەقی ڕەشنووسمان سەبارەت بە پێناسەکردنی کێشەکە نووسیەوە، شیکارێکی کلاسیکی ئیمپریالیزم و داگیرکاریم تێپەڕ نەکردبوو. بە مانایەکی تر ئەوەی ئەنجامم دابوو کۆکردنەوەیەکی گشتی بوو. کارەکانی دواترم بۆ یەکەمین گرووپەکانی پڕوپاگەندە دۆخی قووڵکراوەی هەمان چوارچێوە بوو. قەیرانی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەو بارەوە ڕۆڵێکی فشارهێنەری دەبینی. بەڵام کوتکردنی هەژموونگەرایی لیبرالیزم ـ دۆخی ڕاستڕەو و چەپڕەویشی لەناودا ــ زەحمەت بوو کە لەسەر دونیای زهنیەتدا ئاواکرابوو، تەنیا لەمیانەی شەڕی کەرامەتەوە دەمتوانی ئەو زەحمەتیانە دەرباز بکەم، کە لە دوورگەی ئیمرالی بەرامبەر بە پیلانگێڕی نێودەوڵەتی (گلادیۆی ناتۆ) بەڕێوەچوو. هەر بەم جۆرەش بوو. ئەگەر هەرسێ ئەڵقەی سەرەتا وەک قۆناغی گوزەرکردن بۆ گەردوونیبوون هەڵسەنگێنین، ئەوا دەتوانین بڵێین کە شێوەی دوایی ئەو بەرگرینامانەی بەشێوەی پێنج بەرگ ئامادەکراوە خۆی نزیکی گەردوونیبوون کردۆتەوە و تەواوی کردووە.

لەیەکەم بەشی ئەم بەرگەی دواییدا هەوڵدەدەم بەشێوەیەکی بەرجەستە و تۆکمەتر هەندێک زاراوە و تیۆری تایبەت بە کورد و کوردستان بخەمەڕوو کە لەبەرگەکانی پێشووتردا هەوڵی ڕوونکردنەوەیان دراوە. هەرچەندە وەک دووبارە کردنەوەش دیاربێت، بەڵام بەشێوەیەکی ڕوونتر و تایبەت بەکێشەکە هەوڵدەدرێت زاراوەکانی دەوڵەت، کۆمەڵگا، دیموکراسی، سۆسیالیزم، کلتوور، شارستانی، هەژموونگەرایی، دەسەڵات، سیاسەت، چین، نەتەوە، داگیرکاری، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆساید لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ڕاڤە بکرێت، تەنانەت لەهەندێک شوێن هەوڵی سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی دەدرێت. لەکاتی ئەنجامدانیشدا بەردەوام ڕاستینەی کۆمەڵگای مێژوویی ڕەچاو دەکرێت. بەمجۆرەش بەرۆژەڤکردن و بەچارەسەری گەیاندنی ڕاستینە و کێشەی کورد لەمیانەی چەمکێکی ڕوونەوە ئاسانتر دەبێت. کاتێک دەڵێم ئاسانتر دەبێت، بەتایبەتی مەبەستم تێگەیشتنی ڕاستینەی ژینۆسایدی کلتووری شاراوە و ڕوونکردنەوەی دۆخی بێبەریبوون و دووری مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە لە چارەسەریەوە. بە مانایەکی تر مەبەستم ڕوونکردنەوەی ڕۆڵەکەیەتی لە ژینۆسایدا. ئەو مەسەلەیەی لەتێگەیشتنی کێشەی کورددا زۆرترین گرفت دەنێتەوە، پەیوەندییە خۆی (زاتی) یەکەیەتی لەگەڵ سیستەمی هەژموونگەرادا، تێکەڵی و ئاڵۆزی کێشەکە پێویستی بە کاملکردنی چوارچێوەی تیۆری و زاراوەیی سەرەکی هەیە، کە لەچارەسەریدا بەکاریان دێنێت. بەتایبەتیش پێناسەکردنێکی کاملانەی دەستەواژەکانی دەسەڵات، دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتی گرنگیەکی زۆری هەیە. هەروەها تێگەیشتنی جیاوازی و پەیوەندی نێوان دەوڵەت و دیموکراسی ڕۆڵی کلیل دەبینێت. ئەگەر جیاوازی نێوان دەسەڵات و سیاسەت بەشێوەیەکی ڕاست پێناسە نەکرێت، ئەوا دیموکراسی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە دەرکیان پێناکرێت. هەروەها پێناسەکردنی دەستەواژەکانی لەجۆری چین، گەل و نەتەوە لە چارەسەرکردنی کێشەی هاوشێوەدا وەک ئامراز ڕۆڵێکی گرنگی هەیە. پێناسەکردنێکی زانستیانەی دەوڵەت و کۆمەڵگا کە ڕۆڵ لە بناغەی تەواوی ئەو دەستەواژانەدا دەبینێت کارێکی لەپێشینەیە. پێویستە پێناسەی ڕاستی یاسا و ئەخلاقیش بخرێتە سەر ئەمجۆرە پۆلێنەی دەستەواژەکان. هەروەها شیکارکردنێکی تەندروستانەی تێگەیشتنی سۆسیالیزمی بونیادنراو – کە خۆی وەک ئەلتەرناتیڤێکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێشکەش کردبوو– سەبارەت بە دەوڵەت و دیموکراسی دەرهەق بە ڕۆشنکردنەوەی بابەتەکە گرنگە.

لەمیانەی کۆمەکی چوارچێوەی زاراوەیی و تیۆری ئێستا و بەرگەکانی پێشووتری بەرگرینامە، بەشی دووەم ئامانجی پێشخستنی هەڵوێستێکی بەرجەستە و تایبەتە سەبارەت بە ڕاستینە و کێشەی کورد. تا شیکارێکی بەرجەستە لەمیانەی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکیەکانەوە سەبارەت بەڕاستینەی کورد و کێشەکەی ناواخنی ئەنجامنەدرێت، دەستەبەرکردنی چارەسەریەکی بەرفراوان زەحمەتە. وەسفکردنی کوردان لەژێر ڕۆشنایی دەستەواژەکانی کلتوور و شارستانییەوە تابلێی فێرکەر و ئەزموونبەخشە. ئەمە هەڵوێستێکە بۆ گەلانی دیکەش پێویستە. بەتایبەتیش وەک بوونێکی کلتووری

مەبەست چاودێری و توێژینەوەی پێگەی درێژایی مێژوویان بەرامبەر بە شارستانییەکان، ڕێبازێکە تابلێی کۆمەک بەپێناسەیەکی ڕاستی کوردان و کێشەکەیان دەکات، پەیوەندییەکی توندوتۆڵ لەنێوان پێگەی جیۆستراتیژی و خێڵەکی لەگەڵ بەرگری لەخۆکردن بەرامبەر ژینۆساید و ئاسیمیلاسیۆندا هەیە. لێرەدا لەجیاتی هەڵوێستێکی جێگیر یان وەستاو بە بنەماگرتنی هەڵوێستێکی دینامیک و مەرحەلی تابلێی بابەتەکە ڕۆشن دەکاتەوە. بڵاوبوونەوەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری لە خۆرهەڵاتی ناوین لە دوو سەدەی دواییدا ڕۆڵێکی دیاریکەری لە قورسکردنی کێشەی کورددا بینیوە. ئەگەر بەرژەوەندییە سیستەماتیکەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری شیکار نەکەین، ئەوا لەو کێشەیە تێناگەین کە هێندە سەخت بووە، بەئاستی ژینۆسایدی کلتووری بگات. لە ڕەوشێکی بەمجۆرەشدا هەروەکو لەنموونەی ژینۆسایدی ئەرمەنیدا بینرا، وەک ئەوەی ئاسنی سارد بکوتی ئەگەری دەست بەتاڵی جێگای باسە. تەنیا لە ڕێگای ڕوونکردنەوەی دەستەواژەی فاشیزمی تورکی سپییەوە دەشێت دەستەواژەکانی کۆمەڵگای توندوتیژی، ڕژێمە ئانتی دیموکراتیەکان و وەسایەت ـ کودەتای سەربازی بەشێوەیەکی تەواو دەرکیان پێبکرێت کە تائێستاش بەهەموو قورسایی و خەستیەکەیەوە بەردەوامە. بەتایبەتیش شیکارکردنی پەیوەندی سیخوڕێتی و دامەزراوەیی میللیگەرایی زێدەڕۆیی شۆڤێنستی زادەی ئەو دەستەواژەیە لەگەڵ هێزە هەژموونگەراکانی سەرمایەداری ڕۆڵی کلیل دەبینێت. تێگەیشتنێکی ڕاست بۆ کردەوەکانی ژینۆسایدکردن لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا گرێدراوی پێناسەکردنێکی ڕاستی ئەو دەستەواژەیە. هەروەها ئەو فاشیزمەی تورکی سپی کۆسپی سەرەکی بەردەم دیموکراتیزەکردنی کۆمارە.

لەبەشی سێیەمدا؛ هەوڵی شیکارکردنی پەیوەندی نێوان بزووتنەوەی نەتەوەی کورد و دەوڵەت ـ نەتەوە دەدرێت. دەتوانین بڵێین سەرەکیترین هۆکارەکانی کە ڕۆڵیان لە قورسبوونی کێشەی کورددا بینیوە؛ پێشنەخستنی شیکارێکی ڕاست بۆ نەتەوەی کورد وەک دیاردەیەکی ناوەکی و پەیوەندیەکەی بە دەوڵەت ـ نەتەوە، هەروەها ڕاست دەرکنەکردن بە پێگەی بوونی نەتەوەیی کورد وەک دیاردەیەکی دەرەکی لە بەرامبەر دیاردەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا. واتە پەسەندکردنی ڕێگاچارەی میللیگەرایی و دەوڵەتگەرایی وەک پڕەنسیپێکی دەست لێبەرنەدراو و بە شێوەی نەخۆشییەک پەیوەستبوون پێیەوە، هۆکارێکی دیکەی سەرەکی قووڵبوونەوەی بێچارەییە. کەچی لەکاتێکدا خۆبەڕێوەبەرایەتی کە لەمێژووی سەلجۆقی و عوسمانیەکاندا زۆرجار نموونەگەلێکی پەیڕەوکراوە و کردارەکانی فیدراسیۆنی دیموکراتیانەی لەرۆژگاری ئەمڕۆمان بەتایبەتی لە وڵاتانی ئەورووپا لەناوەخۆیان و لەگەڵ یەکتردا پەیڕەوی دەکەن، پرۆژەیەکی دەوڵەمەندی چارەسەرکردن پێشکەش بەکێشەی کورد دەکات؛ ئەویش سەرباری ڕاستینەی دەوڵەت ـ نەتەوە کە زۆر محافەزەکارانە ڕەفتار دەکات. پێناسەکردنێکی ڕاست بۆ دەستەواژەکانی سیاسەتی دیموکراتیک و خۆبەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیانە کە ڕۆڵی کلیل دەبینن سەبارەت بە چارەسەریەوە گرنگیەکی ژیانییان هەیە. لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری درەنگ

وەختدا هەم لەدەرەوە هەم لەناوەوە سەپاندنی هەڵوێستەکانی نەتەوە ـ دەوڵەت بەسەر کێشەکەدا جگە لەدووبارەکردنەوەی بێچارەیی کێشەی ئیسرائیل ـ فەلەستین، تەنانەت جگە لەقووڵکردنەوەی بنبەستبوونی هاوشێوەی فیدرالیزمی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق بەولاتر هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. چونکە لەراستیدا پەیوەندی ئەو پەیڕەوانە لەگەڵ بەرژەوەندی هێزە هەژموونگەراکانی سەرمایەداری و بەکرێگیراوەکانیان و ئەو کارەساتانەی لەدەرەنجامدا رێگەی لەپێش دەکەنەوە ئاشکرایە. ئەگەر لەسەدەی ٢١ دا دابڕان لەزهنیەتی دەوڵەتگەرایی و خستنەگەڕی ئامرازەکانی سیاسەتی دیموکراتیانە بەدی نەیەت، ئەوا بەتەنیا کێشەی کورد بەسە تا سەدەیەکی دیکەش خۆرهەلاتی ناوین وەک گۆڕەپانێکی بەرژەوەندی هێزە هەژموونگەرا باوەکان بهێڵێتەوە. پێچەوانەکەشی راستە. پەرەسەندنی دیموکراتیزەبوون لەخۆرهەلاتی ناوین و رۆڵی کلیلی چارەسەری دیموکراتیانەی تەواوی کێشە کۆمەلایەتیەکان بە ئەزموونی رێگەچارەی دیموکراتیانەی کوردستاندا گوزەر دەکات. پێگە و دۆخی ئێستای کوردستان، بەواتایەکی تر یەکێتی چارەنووسی مێژوویی نەتەوە دراوسێکانی ناوچەکە تورک، عەرەب و فارس و پێکهاتەی ئەرمەنی، سوریانی و تورکمانەکان لە ناوەوە لەگەڵ کوردان، بڵاوبوونەوە و پەلهاوێشتنی چارەسەری دیموکراتیانەی کوردستان بەشێوەیەکی زنجیرەئاسا دەکاتە ئەگەرێک. رێگەچارەی کوردستانی دیموکراتیک رێگەچارەی خۆرهەلاتی ناوینی دیموکراتیک دەئافرێنێت.

لەبەشەکانی چوارەم، پێنجەم و شەشەمدا دیاردەی PKK چاوی پێدا دەخشێنرێتەوە. بەئەندازەی رۆڵی PKK — کە بە پێگەی چارەسەری هەنووکەیی گەیشتووە — لەئاشکرابوونی کێشەکە، ئەوا شیکارکردنی پێگەکەی کە لەسەرەتایەکی زۆر هەستیاردا وەستاوە گرنگی و کاریگەریەکەی خۆی دەپارێزێت. هەروەکو چۆن لە قووڵاییدا تێگەیشتنی کێشەی کورد و دەربازکردنی هەڵوێستەکانی نەتەوەی ـ دەوڵەتگەرا لەمێژووی PKK دا پەرەسەندنێکی گرنگە، ئەوا تێگەیشتنی ئەو راستیەی کە PKK بۆ بونیادێکی چارەسەر ئامێزانەتر وەرچەرخاوە سەبارەت بەتەواوی هێزە سیاسی و دەوڵەتەکانی خۆرهەلاتی ناوین، ناچاریەکە. یافتە و مۆرکی"تیرۆریست"ی کە بە یەخەی PKK وە کراوە زیاتر رێگە لە پێش بێچارەیی دەکاتەوە و زیان بەخاوەنەکانیشی دەگەیەنێت. مۆدێلی خۆبەرێوەبەرایەتی دیموکراتیانە کە PKK لەدۆخی بەرجەستەی KCK دا هەوڵی پەرەپێدانی دەدات تەنیا بۆ کوردان و چارەسەکردنی کێشەی کورد نییە، بەڵکو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگاکانی عەرەب، تورک، ئێران، ئەفغانستان، قەفقاسیا و ئەو جڤاتانەی دیکە کە بەدەست کێشەی هاوشێوەوە دەناڵێنن، گرنگیەکی ژیانی هەیە.

بەشی حەوتەم؛ بەئامانجی تێگەیشتنی پێگەی کێشەی کورد لەتەواوی خۆرهەلاتی ناوین و بەناویەکداچوونی لەگەڵ گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی ناوچەکە ئەگەر بەشێوەیەکی کورتیش بێت هەڵسەنگاندن لەبارەی تەنگژەکانی خۆرهەلاتی ناوینی ئەمرۆ و دەرفەتەکانی چارەسەریی تیۆری مۆدێرنیتەی دیموکراتییەوە دەکرێت. لەو پێناوەشدا

چاوێک بەرۆڵی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دەخشێنرێتەوە سەبارەت بە قووڵکردنەوەی تەنگژەکانی ناوچەکە و هەوڵدەدرێت فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک وەک هێزی چارەسەری پێشکەش بکرێت.

بەشی هەشتەم؛ یش کە بەشی ئەنجامە کۆمەکی گەردوونی شۆڕشی کوردستانی تێدا هەڵدەسەنگێنرێت. لەو پێناوەشدا لەژێر ڕۆشنایی پێناسەی خۆجێیی و گەردوونی، بەش و گشتدا چارەسەری شۆڕشگێڕانەی کێشەی کورد لەچوارچێوەی دوو مۆدێرنیتەی جیاوازدا پوخت دەکرێتەوە و بەمجۆرەش بەرگرینامەکە لەمیانەی ئەم دوا بەرگەیەوە تەواو دەبێت.

ئامادەکردنی ئەم دوا بەرگرینامەیەم لەمیانەی ئەو ناوەرۆکەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ پەرەسەندنە کرداریەکانەوە بووە. ئەوەش دۆخێکە زۆر بەدەگمەن دەبینرێت. باسی زەحمەتیەکانی ژیانی ئیمرالی ناکەم، بەڵام کاتێک هەم لەلایەنی دەوڵەتەوە هەم لە لایەنی بزاڤی ئازادییەوە ناچاری ڕۆڵی ڕێبەرایەتی دەکرێم ئاشکرایە کە زەحمەتیەکانی چەندین قات زیاد کردووە. چەندین کەسایەتی بەناو ڕۆشنبیر بە هەڵەدا چوون و لێکدانەوەی ساویلکەی ئەوتۆیان کرد؛ گوایە لە دوورگەیەک و لە ژێر قورسترین گەمارۆی دەوڵەتدا تەنیا دەتوانم بەکرێگیراوێتیەکی هەرزان بکەم، بەمجۆرەش شرۆڤەی چەوت و ناعایلانەیان کرد. تەنانەت هەندێک لەوانەی ناو PKKش لەو بڕوایەدا بوون کە زۆر بێکاریگەر دەکرێم؛ دوودڵیان لە پارچەکردن، ڕفاندن و پووچکردنی ژیانیترین بەهاکانیش نەکرد. ژیان و ئاستی پەیوەندیەکانیشم بە تەواوی ئاشکرایە و لەبەر چاوانە. لەو بڕوایەدام کە مافی ڕەخنەکردنێکی مانادارم هەیە. ڕوون و ئاشکرایە کە نەک تەنیا کۆماری تورکیا بەڵکو ئەو کێشە قورسانەی چەندین بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەی سەرمایەداری هاوشێوە لەخۆرهەڵاتی ناوین دووچاری هاتوون تەنیا لەمیانەی لۆژێکی ڕووخاندنی دەوڵەت دەرباز ناکرێت. لەو بڕوایەدام لە ئەزموونی سۆڤێت ئەنجامەکانی ڕووخاندنی قەیسەر لەلایەن کۆمۆنیستەکان و ئاواکردنی ڕژێمە دیکتاتۆریەکەی خۆیان وانەبەخش و فێرکەرن. ئەزموونی چینیش کە هەمان مۆدێلی پەیڕەو کردووە ڕۆڵی سەرەکی لەبەردوامبوونی هەژموونگەرایی فینانسی جیهانگیردا دەبینێت، کە کۆنەپەرسترین و فاشیسترین ڕژێمەو لە قورسترین قەیرانەکانی خۆیدا دەژیت.

خوازیارم بڵێم: ئەزموونی سۆسیالیزمی بونیادنراو لقێکی دەوڵەتگەرایی دواکەوتووتری لیبرالیزمی سەرمایەدارییە، بەلانی کەم ئاشکرابووە کە هەڵە سەرەکیەکانی ناو بونیادەکەی بەربەستە لەبەردەم پێشخستنی بەرنامەی ستراتیژی و تاکتیکی پێویست لەپێناو دابڕان لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری. بەڵام ئەو دۆخەش مانای بە فیڕۆچوونی تێکۆشانی ئەنجامدراوی ئازادی، دیموکراسی و سۆسیالیزم نابەخشێت. بەپێچەوانەوە پیشانمان دەدات کە بەدرێژایی مێژوو ئەزموونەکانی دیموکراسیخوازی، ئازادیخوازی و سۆسیالیستی بەرامبەر بە سیستەمی شارستانی ناوەندی – کە سەرچاوەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری پێکدێنێت – لەئارادابووە و لەهەلومەرجی ئێستاشدا دەتوانن خۆیان بەشێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک جیابکەنەوە و ببن بە ئەلتەرناتیف. سەرمایەداری

فینانسی جیهانگیری لەرووخساردا لەبەهێزترین سەردەمی خۆیدا دەژیت، بەڵام لەراستیدا پیشانیدەدات کە سیستەم لەلاوازترین دۆخی خۆیدایە و لە پێگەیەکدا بنبەست بووە کە چیتر ناتوانێت بەردەوام بێت. چونکە چەوسانەوەی سنوورنەناس، بێبەریبوون لەکۆمەڵگا و دەرکەوتن لە ژیان بە جۆرێک بە ئاستی هۆڤێتی بگات دوا وێستگەیە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێی گەیشتووە. لەمەسەلەیەکی تیۆری زیاتر دیاردەیەکی پراکتیکی رۆژانەییە کە سیستەمی سەرمایەداری تەنیا لەپەرەپێدانی پووکانەوە و هەڵوەشانەوە لەناو کۆمەڵگادا ناوەستێت، بەڵکو وێرانکردنی سروشتیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لەناوەڕۆکدا بەرگرینامەکەم بەرامبەر بەو سەرمایەدارییە پێشخستووە. هەڵبەتە بەتەواوی چەپەڵی، بێئەخلاقی و بێ یاساییەکەیەوە ئاشکرایە کە بەردەوامکردنی ژیانی جەستەیی لە ئیمراڵی لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانی (ناتۆ ـ گلادیۆی شاراوە) ئەم سەردەمەوە ئافرێنراوە.

پاڵنەری سەرەکی پێشکەشکردنی بەرگرینامەکەم بەشێوەیەکی نووسراو بۆ DMME هەمان ئەو هەڵوێستە یاخی بووەی رۆحی منداڵیمە بەرامبەر بە بچووک بینین و گەورەییە ساختەکان کە لە قۆناغی درەنگیشدا هیچی لەزیندوویی خۆی ون نەکردووە و سووربوون لەسەر بە مرۆڤ مانەوە و بەردەوامبوونی لە ژێر ناوەڕۆک و شێوەی گونجاوی کۆمەڵگادا دەسەلمێنێت.

## بەشی یەکەم

# چوارچێوەی تیۆری و زاراوەیی

ئەگەر لەزانستی کۆمەڵگادا پێناسەی تیۆری و زاراوە سەرەکییەکان نەکرێت پێشخستنی راڤەی مانادار زەحمەتە. تەنانەت لەبارەی پێناسەکردنی خۆیشیەوە زانستی کۆمەڵگا لە یەکێتی و هاوفیکریەوە دوورە. لەکاتێکدا قەیرانەکانی سەرجەم بوارەکانی زانست ئاشکرا و بەرچاوە، لەبواری زانستی کۆمەڵگادا گەڕان بەدوای مسۆگەریدا هەوڵێکی بێواتایە. ئەوەی لەبنەڕەتدا پێویستە پێناسەکردنێکی راستی دیاردەی کۆمەڵایەتییە. ناسینی کۆمەڵگا لەئاستێکی زۆر کەمتر لەمەزندەکان خاوەنی کەڵەکەبوونی مانایە. چەندە هەوڵی پێناسەکردنی کۆمەڵگا بدرێت رووبەڕووی دووفاقیەکی لەجۆری قووڵبوونەوە لە جەهالەتدا دەبێتەوە. چەندە رۆڵی کۆمەڵگا لەپێشکەوتنی تاکی مرۆڤدا دیاریکەر بێت، بەو رادەیەش کۆسپە لەپێش پەرەسەندنیدا. ئەمەیە دووفاقی کۆمەڵایەتی. ئەو تاکەی کۆمۆنیتە بەستوویەتیەوە و بەناو تاکە ئازادەکەی لیبڕالیزمیش کە تاکخوازی قووڵدەکاتەوە بە هەمان رادە و پێوەر گومڕان و وەک تاکێک لە ژیان بەدەرنراون. مەحاڵە لەمیانەی پشتبەستن بەو تاکە نەخۆشانەوە کۆمەڵگا پێناسە بکرێت. چەندە جێگای داخە تا رۆژی ئەمڕۆشمان مرۆڤایەتی لەژێر کاریگەری هەردوو دۆخیشدا رزگاری نەبووە. تا دوارادە جێگای گفتوگۆ و گومانە کە لەمیانەی ئەو دووفاقییە کۆمەڵایەتیەوە چەندە دەکرێ کاری زانست بکرێت. ژیریش کە سەرەکیترین مەرجی پەرەپێدان و کارکردنە لەسەر زانست، تەنیا لەرێگەی کۆمەڵگاوە دەبێتە خاوەن زمان و دەتوانێت قۆناغ ببرێت، بەڵام هەنگاوێک زیاتر بڕوات لەلایەن هەمان پێکهاتەی کۆمەڵگاوە رێگای لێدەگیرێت. دیاردەیەکی بەمجۆرەی حەقیقەت تا دوارادە بەڕێژەیی دەمێنێتەوە. تەواو لەو حاڵەدا باوەڕی یاخود هزری دۆگماتیک وشکتر دەبێت، بەم شێوەیە ژیری مرۆڤ لەهی دواکەوتووترین بوونەوەرەکانیش زیاتر دووچاری بێ بەرپرسیارێتی و تێگەیشتنی چەوت دەکات. کاتێک زۆری ژمارەی کۆمەڵگا دۆگماتیکەکان رەچاو بکرێت، ئەوا زیاتر هەست بە پاشکۆیی زانست دەکرێت.

لەگەڵ ئەوەی بەتەواوی دەربازکردنی دووفاقی کۆمەڵایەتی ئەستەمە، بەڵام دەشێت بەشێوەیەکی سنووردار تێپەڕ بکرێت و بە ئاستی زانین بگەیەنرێت. لەو دۆخەدا دەشێت بەدەستهێنانی زۆرترین زانیاری سەبارەت بەخودی ژیانەوە بێت. بەسیفەتی ئەو سروشتەی پەی بەخۆی بردووە دەشێت ژیان مردن بێواتا بکات. کاتێک بپرسین "کەی شەڕی زۆربوونی زایەندی، خواردن و خۆپاراستنی زیندەوەران دەوەستێت یاخود ئەنجامگیر دەبێت؟" بەهەر حاڵ دەشێت داناترین وەڵامی بەشێوەی "ئەو سروشتەی لەخۆی تێگەیشتووە" لە مرۆڤدا گەڵاڵە بووە. دەشێت ئەوە بەگەردوونیبوونی کۆتاییش ناو ببەین. ئەگەر بشکوترێ؛ کەوتوویەتە ناو هەڵوێستێکی ئۆبژەکتیفیتی قورسیشەوە دیسان دەڵێم؛ هەر شتێکی دەبینرێت، دەزانرێت و هەستی پێدەکرێت بە مرۆڤی رێژەییەوە سنووردارە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو سروشتەی بەوجۆرە لەخۆی تێگەیشتووە چەندە نوێنەرایەتی گەردوونیبوون دەکات بابەتێکی گفتوگۆکردنە. هەروەها لەدەرەوەی مرۆڤ "بەو سیفەتەی سروشتێکە خۆی دەناسێت" دیسان هەبوونی گەردوونێک تا دوا رادە جێگای گفتوگۆیە. کاتێک دەڵێین؛ لەدەرەوەی عەقڵی مرۆڤ ـ بەو سیفەتەی پوختەی زیندەوەرەکانی دونیایە ـ گەردوون جێگای گفتوگۆیە، ئەو عەقڵەی مرۆڤیش جێگای گفتوگۆیە کە تا چ رادەیەک نوێنەرایەتی گەردوونی خۆی دەکات، لەوانەیە بڵێن دیسان کەوتینە ناو دووفاقیەکەوە. بەڵام تەواوی چوارچێوەی ئەو حەقیقەتە بەم دووفاقیەوە دەورە دراوە. ئەو ئەنجامە بنەڕەتیەی پێویستە بەدەست بهێنرێت، کارەکتەری رێژەیی زانیاری و پەیوەندییە توندوتۆڵەکەیەتی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵایەتییەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ تەنیا لەمیانەی قاڵبوونەوە سەبارەت بەسروشتی کۆمەڵگا و دانانی پەیوەندیەکی راست، ئەخلاقی و جوان لەگەڵ یەکەمین و سێیەمین سروشتەوە دەشێت قەیرانەکەی دونیای زانست دەربازبکرێت، ئەویش بەشێوەیەکی رێژەیی.

### أ . چوارچێوەی زاراوەیی

بەهۆی پەیوەستبوونیان بە بابەتەکەمانەوە لە شیکارکردنی سروشتی کۆمەڵگادا پێناسەکردنی هەردوو زاراوەی سەرەکی کلتوور و شارستانی دەشێ رێخۆشکەر بێت. دەشێت زاراوەکانی دیکەش بە ریزە باشتر پێناسە بکرێن.

#### ١. کلتوور

دەشێت کلتوور بە پێناسەیەکی گشتی بگەیەنرێت کە بریتییە لە کۆی ئەو بونیاد و مانایانەی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بەدرێژایی مێژوو ئافراندوویەتی. لەکاتێکدا بونیادەکان وەک کۆی ئەو دامەزراوانە پێناسە دەکەین کە بۆ وەرچەرخان کراوەن؛ ئەوا دەشێت واتاداریش وەک ناوەڕۆک یاخود ئاستی مانـاداری هاوئاراستەکاری هەمەڕەنگی و دەوڵەمەندی دامەزراوە وەرچەرخاوەکان پێناسە بکەین. ئەگەر لەمیانەی لێکچواندنێکەوە پێناسەکە بەهێز بکەین؛ دەشێت پێکهاتەی بونیاد وەک چوارچێوەی بەرجەستە و ماددی

بونیادەکـە، واتـاش وەک نـاوەڕۆک و یاسـای ئـەو چوارچێـوە مـاددی و بەرجەسـتەیە دەستنیشان بکەین کە دەیبزوێنێ و دەیکات بەخاوەن هەست و هـزر. دەتـوانم بڵـێم؛ لێـرەدا نزیکی دەستەواژەکانی "سروشت"و "رۆح" ی هیگل بووینەتەوە. دەشێت بڵێین؛ ئەو واتایـەی دوو سەدە بەر لە ئێستا بەتایبەتی هیگل لـەو دەسـتەواژانەی بـارکردووە و نـاوەڕۆکی ئـەو پێناسـەیەی لەبارەیانـەوە پێشخسـتووە، لەمیانـەی پەرەسـەندنە زانسـتیەکانی دواتـرەوە تۆکمە بووە.

پێناسەی بەرتەسکی کلتووریش بەشـێوەیەکی بـەربڵاو بـەکاردەهێنرێت. لێـرەدا زیـاتر هەوڵدەدرێت کلتوور وەک واتا، ناوەڕۆک، زیندوویی و یاسای بونیاد دەستنیشـان بکرێـت. کاتێک کۆمەڵگاش جێگای باس بێت ئەوا لە واتای بەرتەسکدا دەشێت کلتـوور وەک دونیـای مانـای کۆمـەڵگا، یاسـای ئـەخلاق، زهنیەتەکـەی، هونـەر و زانستەکەی پێناسـە بکـەین. دامەزراوە سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان لەگەڵ ئەو چوارچێوەیە سنووردارە دەکرێتە یەک و لەچوارچێوەیـەکی گشتیدا هـەنگاو بـۆ پێناسـەی گشـتی کلتـوور دەهاوێژرێـت. لـەو سۆنگەیەوە؛ ئەگەر لەبناغەدا دامەزراوەیی بێت و لەبواری ناوەڕۆکیشدا مانای هەبێت، ئەوا وەک بوونێک دەشێت باس لەخودی کۆمەڵگا بکرێت. بە تەنیا باسکردنی کۆمەڵگایەکی واتـا یاخود دامەزراوەیی چەندەی بڵێیت خەڵەتێنەر دەبێت. کۆمەڵگایەکی تاقانە کاتێک خۆی بـە ئاستێکی پێویستی واتا و دامەزراوەیی بگەیەنێت ئەوا وەک بوونێـک دەتوانێـت خـۆی بکـات بـەخاوەن ناسـنامە و نـاو لـەخۆی بنێـت. تـەنیا باسـکردن لەکۆمـەڵگای مانـایی یـاخود دامەزراوەیی، بیرکردنەوە لە ژیانێکی مرۆییانە لەناو ئەو چەشنە کۆمەڵگایانـەدا هـەروەک لەمێژوو لەلایەن تەواوی کۆمەڵگاکانەوە ئەنجامدراوە بـە چـەوتی، گومڕایی و بێئـەخلاقی دادەنرێت.

دوای پەرتەوازەبوونی کۆمەڵگایەک لەبواری دامەزراوەییەوە چیتر ناکرێ باس لە واتـا و کلتووری بەرتەسکەکەی بکرێت. لەو دۆخەدا دامەزراو وەک جامێکی پڕ ئاو وایە. ئاشکرایە کە دوای شکانی جامەکە ناشێت باس لەهەبوونی ئاوەکە بکرێت. تەنانـەت ئەگـەر باسیش بکرێت، ئیتر بۆ خاوەنی جامەکە ئاو نییە، بـەڵکو تـوخمێکی ژیانـە کە بـۆ خـاکێکی دیکـە یـاخود جـامی کەسـانی تر رژاوە. ئەنجامـەکانی لەدەسـتدانی جـوانی، زهنیـەت و مانـای کۆمەڵگا ترسناکترە. لە دۆخێکی بـەمجۆرەدا تـەنیا دەشێت باسی پەلـەقاژەی ئـەو بوونـە بکرێت کە وەک زیندەوەرێک سەری پەڕێنراوە. کۆمەڵگایەک دونیای زهنیەت و جوانی خۆی لەدەستدابێت بـە لاشـەیەک دەچێـت کـە بـۆ رزیـن، پارچـەکردن و خـواردن فڕێدراوە. لـەو سۆنگەیەوە؛ بۆ پێناسەکردنی کۆمەڵگایـەک لـەبواری کلتووریـەوە مسۆگەر هەڵسـەنگاندنی لەچوارچێوەی هەمووێتی مانایی و دامەزراوەیی مەرجـە. سـادەترین نموونـەی لـەو بـارەوە ئامـاژەی پـێ بکـەین راسـتینەی کۆمـەڵگای کـوردە کـە بـە شـێوەیەکی بـەرفراوان ئـێش و ئازارەکانیمان چێشتووە. چونکە لەبواری مانایی و دامەزراوەییەوە دووچاری پارچەبوونێکی قووڵ و لەدەستدانی زهنیەت هاتووە. دەشێت کۆمەڵگای کورد تەنیا وەک "کۆمەڵگایەکی ژێر ژینۆسایدی کلتووری" پێناسە بکرێت.

**٢. زمان**

دەستەواژەی زمان بەشێوەیەکی توندوتۆڵ گرێدراوی دەستەواژەی کلتوورە، لەچوارچێوەی بەرتەسکیشدا لە بنەڕەتدا توخمێکی سەرەکی بواری کلتوورە. بە مانا بەرتەسکەکەی دەشێت زمان بە سیفەتی کلتووریش پێناسە بکرێت. خودی زمان کەڵەکەبوونی کۆمەڵایەتی زهنیەت، ئەخلاق و جوانی هەست و هزرە کە کۆمەڵگایەک بەدەستیهێناوە؛ زمان ئامادەگی ساتەوەختی و ناسنامەیە کە واتا و هەست دەرکیان پێکراوە و بەگوزارشت گەیشتوون. ئاستی پێشکەوتوویی زمان ئاستی پێشکەوتوویی ژیانە. ئەو کۆمەڵگایەی زمانی بەدەست هێنابێت ئەوا بۆتە خاوەن بیانووە بەهێزەکەی ژیان. کۆمەڵگایەک چەندە زمانی زگماکی (دایک) خۆی پەرەپێبدات، بەو رادەیە ئاستی ژیانی پێشخستووە. هەروەها چەندە دووچاری لەدەستدانی زمان هاتبێت و کەوتبێتە ژێر هەژموونگەرایی زمانی دیکەوە، بەو رادەیەش داگیرکراوە و تووشی ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆساید هاتووە. ئاشکرایە ئەو کۆمەڵگایانەی لەو واقیعەدا دەژین لە بواری زهنیەت، ئەخلاق و جوانیەوە ژیانێکی ماناداریان نابێت و وەک کۆمەڵگایەکی نەخۆش تا دەسڕێتەوە و لەناو دەچێت مەحکومی ژیانێکی تراژیدیانە دەبێت. بەها دامەزراوەییەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی دووچاری لەدەستدانی واتا، جوانی و ئەخلاق هاتوون تەنیا وەک کەرەستەیەکی خاوی بەهای داگیرکاران و چەوسێنەرەکانیان بەکاردەهێنرێن، ئەمە دەست لێبەرنەدراوە. وەک ئەنجام، کاتێک زمان لەدۆخێکی وەک هی کوردانا بێت، ئاشکرایە کۆمەڵگایەک لەو رەوشەدا بژیت دووچاری هەژاریەکی لەرادەبەدەر و دۆخی پارچە پارچەیی دێت، لەو سۆنگەیەوە؛ لەبواری واتا، ئەخلاق و جوانیەوە لە ژیانێکی قێزەون و خیانەتکارانە رزگاری نابێت.

**٣. شارستانی**

دەستەواژەی شارستانی زیاتر دەستەواژەی کلتووری گشتی کۆمەڵگای سەردەمی چین، شار و دەوڵەت پێناسە دەکات. جیابوونەوەی چینایەتی (چینایەتیبوون)، شاربوون و دەوڵەتبوون لە پۆلێنە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای شارستانە. لێرەدا کۆمەڵگا، کۆمەڵگایەکی چینایەتی، شاری و دەوڵەتی بووە. دیاردەکانی جیابوونەوەی چینایەتی کۆمەڵگای کلان و قەبیلە کە بەدرێژایی مێژووی پەرسەندنیدا لەدۆخی یەکسانی دابوو، هەروەها شارگەرایی سەر کۆمەڵگای کشتوکاڵ ـ گوند، تایبەتمەندییەکانی شارستانی دیاری دەکەن. جگە لەپەیوەندی سەمبیۆتیکی چوارچێوەی سروشت ـ کۆمەڵگا پەیوەندی حکومڕانیەتی ناو سروشتی کۆمەڵگا یەکلایەنە پەرە دەسەنێت و کاتێک بە دۆخی ناکۆکیەکی دژوار دەگات خۆی بەرجەستە دەکات. هەستی جوانی، ئەخلاق، مانا و بونیادی جیاواز لەناو کۆمەڵگا پەرە پێدەدات. تا دوا رادە جێگای گفتوگۆیە کە سەبارەت بە کۆمەڵگا شارستانی پەرەسەندنێکی ئەرێنییە یاخود نەرێنی. سەبارەت بەو توێژە دەسەڵاتدار و چەوسێنەرانەی مێژوویان نووسیوە؛ شارستانی پەرەسەندنێکی گەورەی مێژووییە، بگرە خودی مێژووە.

سەبارەت بە پێناسەی ئەو توێژانەی لەژێر فشار و چەوسانەوەشدا دەژین وەک کارەساتێکی مەزن و لەدەستدانی ئۆتۆپیای بەهەشت هەڵدەسەنگێنرێت. ئەمەش راستیەکەیەتی. پێکهاتنی جیاوازی هزر، ئەخلاق و هەستی جوانی کۆمەڵگایەک کە بە قووڵایی لەناو ئەو ناکۆکیەدا دەژیت پێویستیەکی سروشتی کۆمەڵگایە. دروستبوونی دونیای ناکۆک و پارچەبووی واتا و دامەزراوەکان پێویستیەکی شارستانییە. لەبەرزترین ئاستیشدا شەڕ گوزارشت لەو واقیعە دەکات. دەرکەوتنی چالاکی کۆمەڵایەتی لەجۆری شەڕ کە لەناوچوونی جەستەیی بەرفراوانی تێدا رووودەدات، تەنیا گوزارشت لە کۆمەڵگایەک دەکات کە لە قووڵاییدا دابەش و پارچە پارچە بووە. هەرچی پارچەبوونی مانایە گوزارشت لەشەڕی ئایدیۆلۆژی دەکات، ئەمەش هێندەی شەڕی جەستەیی شەڕێکی بەکاریگەری هەژموونگەراییە کە بەردەوام لەکۆمەڵگای شارستاندا رووودەدات. لەکاتێکدا لایەنە ناکۆکەکانی کۆمەڵگای شارستان لەلایەکەوە لەمیانەی شەڕە ئایدیۆلۆژی، جەستەیی و دامەزراوەییەکانەوە جیاوازیەکانیان دەخەنەروو، لەلایەکی دیکەشەوە خۆیان وەک کۆی ئەو واتا و بونیادە بنەڕەتیانە گوزارشت دەکەن کە خۆیان بە هەمیشەیی و باڵادەست دادەنێن. بانگەشەی ئەوە دەکەن کە خۆیان پێکهێنەری کۆمەڵگای راستەقینەن، بەمجۆرەش کۆمەڵگا وەها خۆی پێکهێناوە. هەرچەندە سەردەمی شارستانی لەناوخۆیدا بۆ قۆناغ، دامەزراو و مانای جیاوازیش دابەش بووبێت، بەڵام راستیە سەرەکیەکەی شارستانی بەمجۆرە دەمێنێتەوە.

دیاردەیەکی سەرەکی کە لە پەرەسەندنی کۆمەڵگای شارستاندا تێبینی دەکرێت ئەوەیە کە؛ چەندەی دەچێت لەمیانەی ئامێرەکانی توندوتیژی و چەوسانەوە ئەو کۆمەڵگایەی لەهەناویەوە دەرکەوتووە قووتیدەدات و دەیتوێنێتەوە، گرێدراو بەو دیاردەشەوە پەیوەندی ئیکۆلۆژی ــ سمبیۆتیک لەگەڵ سروشتی یەکەم هەڵدەوشێنێتەوە، تەنیا دەیکات بە سەرچاوەیەک و دوای چەوساندنەوەشی لەناوی دەبات. لەحاڵەتێکی بەمجۆرەدا ئایا لەمیانەی ناکۆکیە ناوخۆییەکانەوە، یاخود ناکۆکیە ئیکۆلۆژیەکانەوە کۆمەڵگا پەرتەوازە دەبێت؟ پرسیارێکە و بووە بە رۆژەڤ. راستیەکەشی ئەوەیە؛ ئەگەر وەرچەرخانێکی ئەرێنی و ریشەیی لەشارستانیدا روونەدات، ئەوا سروشتەکانی یەکەم و دووومم لەکارەساتی گەورە رزگاریان نابێت، چونکە لەژێر حکومڕانی هەردوو ناکۆکیدان. هەڵسەنگاندنەکانی لەجۆری؛ کۆمەڵگاکان ناتوانن بە بێ شارستانی بژین، ئەو کۆمەڵگایانەی بەشێوەیەکی شارستانانە دەژین کۆمەڵگای دەوڵەمەند و بەهێزن، هەڵسەنگاندنێکی ئایدیۆلۆژین و زیاتر دونیابینی نوخبەی پاوانخوازی چەوسێنەر و حکومڕان دەخاتەڕوو. ئەو ئاستەی جیاوازی چینایەتی، شاربوون و دەوڵەتبوون پێی گەیشتووە لەلایەن سەرجەم ناوەندە کاریگەرەکانی زانستەوە وەک شێرپەنجەی کۆمەڵایەتی هەڵدەسەنگێرێت (شێرپەنجەی جەستەییش پابەندی ئەو راستیەیە). لەو بارەیەوە نیشانەگەلێکی زۆر لەئارادان. خۆ پڕچەککردنی ئەتۆمی، وێرانکردنی ژینگە، بێکاری بونیادی، کۆمەڵگای بەکاربردن، زیادبوونی لە رادەبەدەری ژمارەی دانیشتووان، شێرپەنجەی بایۆلۆژی، نەخۆشیە زایەندیەکان و زیادبوونی ژینۆسایدەکان سەرەکیترینی ئەو نیشانانەن. لەم سۆنگەیەوە؛ ژیار ــ مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە کە شارستانی پڕ لەناکۆکی و شێرپەنجەیی ئێستا لە کارەکتەری ستەمکاری و

چەوسێنەرانەی ڕزگار دەکات و وەریدەچەرخێنێت، وەک ڕێگـای ڕزگـاربوون و دەرەتاتێک چەندەی دەچێت خۆی دەکات بە ئەڵتەرناتیف. لـەجیاتی ئـەوەی هەرەسـهێنانی شارستانی کـۆن وەک هەرەسـهێنانی تـەواوی مرۆڤایـەتی ببینرێـت، هەڵوێسـتی ڕاسـت ئەوەیـە وەک پەرەسەندنی شارستانێتی دیموکراتیک و گەیشتنی بە پێگەی پێشەنگایەتی هەڵسەنگێنرێت. لـەو دۆخـەدا گرنگـە کـە بـزانین کلتوورەکـانی کۆمـەڵگا هەمیشـەییترن و توانـا و هێـزی وەرچەرخاندنی شارستانیەکانیان هەیە، هەم شارستانیەکان دەگۆڕن و بـەرەو پێشـەوەیان دەبەن، هەم دەتوانن دووچاری وەرچەرخاندنی ڕیشەییان بکەن. لەجیاتی ئەوەی ڕووخـانی شارستانی کۆمەڵگایەک وەک زیـان و دۆڕانـدنێکی بنـەڕەتی هەڵسـەنگێنرێت، بەتایبـەتیش ئەگەر ڕێگـای لـەپێش پەرەسـەندنی مانـایی و بونیـادی کلتـوور کردبێتـەوە، پێویستە ئـەو ڕووخانـە وەک پەرەسـەندنێکی ئـەرێنی ببینرێـت. ئەگـەر ڕێگـای لـەپێش وەرچـەرخانی شارستانی کردبێتەوە، ئەوا دەشێت ئەو گۆڕانکارییە وەک ڕزگارییەکی بنـەڕەتی و گەیشتن بە ژیانی ئازاد راڤە بکرێت.

**٤. دەسەڵات**

لەسەرووی ئەو دەستەواژانەوە دێت کە زۆرترین کۆسپ لەبەردەم شیکارکردنی واقیعـی کۆمەڵایەتی دروست دەکات و ڕێگا لەپێش چەوتی و ناکۆکیەکان دەکاتەوە؛ لەبواری شێوە و ناوەڕۆکـەوە کەللـەڕەقی بەرامبـەر بـە پێناسـەکردن دەنوێنێـت. ئەمـەش لـە پێناسـەی باڵادەستێتی شاراوەی ناو سروشتەکەشیدا ڕەنگدەداتـەوە و بەرامبـەر پێناسەیەکی واقیعـی بەرخودان دەکات و خۆی بەدەستەوە نادات. گوایە بێلایەنـە، بـەڵام وەک بڵێـی دیاردەیـەکی ئیلاهـی و دەستلێبەرنەدراوە خـۆی دەگشـتێنێ و ڕەهـا دەکـات. وا ڕاسـتترە دەسـەڵات وەک چڕبوونەوەی چەوسانەوەی ئابووری و توانست (پۆتـانسێل)ی هێز پێناسە بکرێت. دەسەڵات توانستی هێـز و چەوسـانەوەی کەڵەکـەبووە کـە تـەواوی ناوەنـدە بونیـادی و مانایيـەکانی کۆمەڵگا کارەکتەرێکی بۆهێلی (وەک DNA) بەدەست هێناوە، ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی ئەو میکانیزمەی دەسەڵات بەدەست بێنن دەوڵەتی مێژوویی بەرجەستە و نوخبەکانی چەوسانەوە و چینـەکانی پێکـدێنن. هەڵسـەنگاندنی دەسـەڵات وەک توانسـتی یـەدەگی پۆتانسـێلی بونیادەکانی چین و دەوڵەت گرنگیەکی مەزنی هەیە. کاتێک پۆتانسێلی دەسەڵات بەرجەستە بێت، جۆرێک لە دەوڵەت و چینە کۆمەڵایەتیەکەی چەوسانەوە (کۆیلەداری، دەرەبەگایەتی، بۆرژوازی...هتد) پێکدێنێت کە نوخبەی فـەرمانڕەوا پشتی پێدەبەستێت. دەشێت دەسـەڵات وەک پوتانسێلی هێزی جەسـتەیی و ڕۆشـنبیریش ببینرێـت. هۆکـارێکی دیکـەی گرنگـی خـۆ سەپاندنی وەک ناچاری، ڕەها و پێویستیەکی هەمیشەیی بەسەر کۆمـەڵگادا، خـۆی لەگـەڵ کارگێڕی سروشتی کۆمەڵگا هاووانا دەکات. لەبەر ئەوەی دەسـەڵات خـۆی لەگـەڵ دیـاردەی کـارگێڕی یەکسـان دەکـات، خـۆی دەکـات بـە ناچـاری و دەسـت لێبەرنـەدراو، کاتێـک لـە ڕێبەرایەتی کۆمەڵگای سروشتی جیابکرێتـەوە، ئـەوا دەبینرێـت کـە دەسـەڵات وەک تـەنێکی شێرپەنجەیی لەناو بونیادی کۆمەڵگا تەشەنە دەکات.

بینینی جیاوازی نێوان دەسەڵات و دەوڵەتیش گرنگ و بایەخدارە. وێڕای ئەوەی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا بەربڵاوترە و دزەی کردۆتە ناو سەرجەم مەمیلە و جومگەکانیەوە، بەڵام دەوڵەت گوزارشت لە ناسنامەی دەسەڵاتێکی بەرتەسکتر و خاوەن ڕێسای بەرجەستە دەکات. دەوڵەت شێوەیەکی دەسەڵاتە کە زیاتر کۆنترۆڵکراوە، بە ڕێساکانەوە گرێدراوە و هەنگاو بەهەنگاو یاسایی دەبێت و گرنگی بە ڕەوابوون دەدات. لەکاتێکدا دەسەڵات وەک دۆخێکی گشتی فەرمانڕەوایی هەڵسەنگێنرێت، دەشێت بێدەسەڵاتیش وەک ڕەوشێکی گشتی کۆیلایەتی ببینرێت. شێوە جیاوازەکانی دەسەڵات و کۆیلایەتی گرێدراوی تایبەتمەندییە گشتیەکانی دەوڵەتە و سوودی لێوەردەگرن. دەشێت ئەوانە وەک دژی ئازادیش ببینرێن. چەندە پۆتانسیلی دەسەڵات لەناو کۆمەڵگادا هەبێت، بەو ڕادەیەش نەبوونی ئازادی جێگای باسە. بە پێچەوانەشەوە چەندە دەسەڵات کەمبکرێتەوە، بەو ڕادەیەش ڕەوشی ئازادی پەرەدەسەنێت. پێویستە زۆر ئاگاداری ئەو تامەزرۆییە بین کە لەناو کۆمەڵگادا سەبارەت بە دەسەڵات لە ئارادایە. ئەو تامەزرۆییە چەندە بەربڵاو بێت بەو ڕادەیەش ستەمکارە کۆمەڵایەتیەکان سەرهەڵدەدەن. ئەمەش بەرەو لەناوچوونی تەواوەتی دیموکراسیمان دەبات، هەروەک لە نموونەکانی چەشنی هیتلەریشدا بینرا کاتێک کۆنترۆڵ نەکرێت زۆر گەورە و سەرەڕۆ دەبێت. ئەو سەرەڕۆییەی لەمێژوودا بەشێوەی حکومڕانی هەرەمەکی سەریهەڵداوە و وەک نەخۆشیەکانی فاشیزمی کۆمەڵایەتی لە ئارادایە، لە قۆناغەکانی دەسەڵاتی سەرمایەداریدا بە خێرایی گەورە دەبێت و لەناو تەواوی جومگە و مەمیلەکانی کۆمەڵگادا بڵاودەبێتەوە و بەشێوەی هێزی بەڕێوەبەرایەتی تۆتالیتاری کۆمەڵگا بەرجەستە دەبێت. بەڵام شێوەگرتنی دەسەڵات لە شێوازی دەوڵەت ـ نەتەوە گرێدراوی ڕژێمی فاشیستی ـ سەرمایەدارییە و گوزارشت لەدۆخی یەکەمی دەکات.

**٥. کارگێڕی (بەڕێوەبەرایەتی)**

پێناسەیەکی ڕاست بۆ دەستەواژەی کارگێڕی لەئاست دەربازکردن و بەلاوەنانی ئەو خراپی و کورتبینیانەی سەرچاوەی خۆیان لەدەستەواژەی دەسەڵاتەوە دەگرن، گرنگ و بایەخدارە. وەک کلتوور کارگێڕیش دیاردەیەکە بەردەوام لەناو کۆمەڵگادا هەبووە. ئەگەر گشتگیرتری بکەین: ئەوا یەکسانە بە چڕبوونەوەی ئەعساب و پەرەسەندنی مێشک لەئاستی گەردوونیدا، بەتایبەتیش لەئاست جیهانی بایۆلۆژیدا. کارگێڕی گوزارشت لە ڕێکوپێکی گەردوون و دەرکەوتن لە دۆخی کائیوس دەکات. دۆخی پەرەسەندوویی سروشتی مانایی خاوەن ژیری نەرم لەناو کۆمەڵگادا، لێهاتوویی هێزی کارگێڕی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. دەشێت مێشکی کۆمەڵایەتی بە کارگێڕی ناوببرێت. لەڕەوشێکی وەهادا شیکارکردنی دەستەواژەکانی خۆبەڕێوەبەرێتی و بەڕێوەبەرێتی بیانی گرنگە. لەکاتێکدا خۆبەڕێوەبردن ڕێکخستن و چاودێریکردنی خودی هێزی سروشتی کۆمەڵگایە، بەمجۆرەش هەمیشەییبوون، خۆراک پێدان و پاراستنی گەرەنتی دەکات، هەرچی بەڕێوەبەرێتی بیانیشە بەشێوەی دەسەڵات خۆی "ئاسایی دەکات"و کۆمەڵگا لەڕێ دەردەخات (مێشکی ئاڵۆز دەکات)،

بەمجۆرەش دەیکات بە کۆلۆنی خۆی و هەوڵی بەڕێوەبردنی دەدات. لەو سۆنگەیەوە؛ خۆبەڕێوەبەرێتی پێویستیەکی ژیانی هەر کۆمەڵگایەکە. کۆمەڵگایەک لە خۆبەڕێوەبەرێتی بێبەش بووبێت هەروەک چۆن لە کۆلۆنیبوون رزگاری نابێت، وەک ئەنجامێکی ئاسایی ئەو دۆخەش بە پێی بەسەرچوونی کات لەرێگای ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدەوە لە لەناچوون رزگاری نابێت.

ئەو بەڕێوەبەرایەتیانەی لە ناوەڕۆکی کۆمەڵگا نامۆن نوێنەرایەتی چەوسێنەرترین و زۆردارترین شێوەی دەسەڵات دەکەن. لەو سۆنگەیەوە؛ جوانترین، زانستی، ئەخلاقی و ژیانیترین ئەرکی کۆمەڵگایەک گەیشتنە بە هێزی خۆبەڕێوەبردن. ئەو کۆمەڵگایەی لەو ئەرکەدا سەرکەوتوو نەبێت هەروەک چۆن لەبواری ئەخلاقی، زانستی و جوانیەوە پەرەناسەنێت، پەرەسەندن و دامەزراوەبوونی سیاسی و ئابووریشی لەناو دەچێت. ئەوەی گرنگە، هێزی کارگێڕی لەلایەکەوە رێگا بەخۆی نەدات بە شێوەی دەسەڵات بگات، لەلایەکی دیکەشەوە تا دواڕادە بەرامبەر نەبوونی کارگێڕی بەرخودان بکات. هێندەی گرنگی بەدەسەڵاتنەکردنی کارگێڕی، زۆر گرنگە جیاکاریەکانی بەڕێوەبەرێتی لەچنگی دەسەڵات دەربهێنرێت. چەندە دەسەڵات ئانتی ـ کۆمەڵگایە، کارگێڕیش بەو رادەیە هێزی کۆمەڵگایە. بەبێ هێزی کۆمەڵگا پەرەسەندنی ئەخلاقی، ئەستاتیک و زانستی بەدینایەت. بەمجۆرەش ئەگەر لەچوارچێوەی بەرتەسکدا پەرەسەندنی کلتووری نەبێت، ئەوا لەچوارچێوەی بەرفراواندا پەرەسەندنی ئابووری و سیاسیش بەدینایەت. لەدۆخێکی وەهاشدا داگیرکاری، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆساید روودەدات، کە ئەمەش کۆتاییەکەی لەناوچوونە.

بەڕێوەبەرێتی ـ حوکمڕانی دەسەڵات چەندە ئانتی دیموکراتیک بێت، خۆبەڕێوەبەرێتیش بەو رادەیە گرێدراوی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیکە. بەڕێوەبەرێتییە سافەکانی دەسەڵات چەندە گوزارشت لەدژێتی دیموکراسی و دوورکەوتنەوەی کۆمەڵگا لە بەڕێوەبەرێتی بکات، خۆبەڕێوەبەرێتیەکانیش هێندەی کۆمەڵگا لە بەڕێوەبەرایەتیدا گوزارشت لە دیموکراتیزەبوون دەکات. لەوەها حاڵەتێکدا دەشێت دیموکراسی وەک ئەو خۆبەڕێوەبەرێتیە پێناسە بکەین کە کۆمەڵگا بەشداری تێدا دەکات. لەبەرئەوەی خۆبەڕێوەبەرێتیەکان بەردەوام سەرقاڵی کۆمەڵگان، ئەوا ناشێت بیر لە بەشداری نەکردنی کۆمەڵگا بکرێتەوە. هەربۆیەش دیموکراسی لەسروشتەکەیاندا هەیە. لەبەرئەوەی دیموکراسی دەستەواژەیەکە زیاتر بۆ ماکرۆ کۆمەڵگاکانی وەک گەل و نەتەوە بیری لێکراوەتەوە، خۆبەڕێوەبەرێتیەکان گوزارشت لەهێزێک دەکەن کە لە بچووکترین کۆمەڵگای کلانەوە تا بەرفراوانترین کۆمەڵگای نەتەوەکان بڵاوبۆتەوە و هەمیشەییە. گرنگترین قەیرانێک یاخود سەرەکیترین کێشەیەک کە زانستی کۆمەڵگا بەدەستیەوە دەناڵێنێت شیکارنەکردن و چارەسەرنەکردنی شێواندن و ئاڵۆزی دەسەڵات و بەڕێوەبەرێتییە. ئەمەش تەواوی ئەنالیزە مانایی و بونیادیەکان و هەڵوێستە مێژوویەکان لەگەڵ خۆیدا دەخاتە ناو کائیۆسەوە، تەمەنی قەیران درێژ دەکاتەوە. ئەنجام، دەسەڵات تەواوی کۆمەڵگا و دەوروبەر قووت دەدات، دیموکراسی بێناوەڕۆک دەکات و لەدۆخی قاوغێکی بۆشدا دەیهێڵێتەوە، خۆی بۆ بەرگێک بچووک دەکاتەوە کە بێمانایانە خۆی دووبارە دەکاتەوە. تا سۆسیۆلۆژیا دەستەواژەکانی دەسەڵات

و بەڕێوەبەرێتی دیموکراتییانە نەخاتە ژێر تیشکی خۆیەوە و چارەسەریان نەکات و گرێدراو بەمەشەوە چارەسەریەکە بەسەر مێژوو و زانستەکانی دیکەدا بڵاو نەکاتەوە ئەوا ناشێت قەیرانی بواری زانستی دەرباز بکرێت، لەو سۆنگەوە؛ ناشێت قەیرانی کۆمەڵگا وەک مانا و بونیادیەکی نوێ دەرباز بکرێت.

## ٦. سیاسەت

دەستەواژەی سیاسەتیش بەلانی کەم هێندەی دەستەواژەی دەسەڵات تێگەیشتنی زەحمەتە و نوێنەرایەتی دیاردەیەکی کۆمەڵگا دەکات. پۆلیتیکا کە دەستەواژەکانی بەڕێوەبەرێتی و دەسەڵاتمان بیردێنێتەوە وەک وشە بنەچەکەی گریکییە و مانای "بەڕێوەبەرێتی شار" دەبەخشێت. بەڵام کاتێک وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی باس بکرێت، دەشێت وەک پەرەسەندنی زادەی بەڕێوەبردنی ئازادانەی کۆمەڵگا و گەشەکردنی کەسێتیەکەی پێناسە بکرێت. لەگەڵ ئەوەی دیاردەی کارگێڕی لەخۆوە دەگرێت، بەڵام بۆ بەڕێوەبەرێتی بچووک ناکرێتەوە. ناشێت لەگەڵ خۆبەڕێوەبەرێتی و بەڕێوەبەرێتی دەسەڵات هاوتا بکرێت. راڤەکردنی پۆلیتیکا (سیاسەت) وەک بواری ئازادی کۆمەڵگا، بواری ئافراندنی ئیرادە و مانای پەرەسەندنی زیاتر نزیک بە راستیەکەیەتی. بگرە دەشێت سیاسەت لەگەڵ ئازادیدا هاوتا بکرێت. لێرەدا لەبواری هزر و کردارەوە کۆمەڵگا پەی بەناسنامەی خۆی دەبات، پەرەی پێدەدات و بەرگری لێدەکات. لەکاتێکدا سیاسەت ببێت بە نۆخی هێزی خۆبەڕێوەبەرێتی ئەوا ناسنامەی سیاسەتی دیموکراتیانە بەدەست دێنێت، بەڵام ببێت بە بەڕێوەبەرێتی دەسەڵات ئەوا مانای لادانی سیاسەتە لەناوەڕۆکی خۆی و تەنانەت وەک نکوڵیکردن لەخودی خۆی هەڵدەسەنگێنرێت. گۆڕەپانی دەسەڵات ئەو بوارەیە کە نکوڵی لە سیاسەت دەکرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ هەروەک بە سووربوونەوە لیبڕالیزم دەیسەپێنێت بەڕێوەبردنی دەوڵەت سیاسەت و بەڕێوەبردنی سیاسی نییە، بە پێچەوانەوە نکوڵیکردنی سیاسەتە و مانای جێگرتنەوەیەتی لەلایەن بەڕێوەبەرێتی هەرەمەکی دەسەڵات یاخود بەڕێوەبەرێتی یاسایی دەوڵەت. هەرگیز ناشێت بەڕێوەبەرێتی دەوڵەت وەک سیاسەت پێناسە بکرێت. بەڵکو جۆرێکی دەسەڵاتی رێساداره کە بە فۆڕم گەیشتووە. خودی دەسەڵاتیش لەهەموو بارێکدا نکوڵیکردنی سیاسەتە.

ئەو گۆڕەپانەی لەزانستی کۆمەڵگادا زۆرترین ئاڵۆزی لەبارەی دەستەواژەکانەوە جێگای باسە بواری دەسەڵات، بەڕێوەبردن و پەیوەندی سیاسییە. دەستەواژەکان هێندە تێکەڵن و بەجۆرێک بەکاردەهێنرێن وەک بڵێی هاوواتا و یەکسان بن، ئەوەش وایکردووە بناغەی زانستی کۆمەڵایەتی بەشێوازی زنجیرەیی بە هەڵە دابڕێژرێت. ئەو زانستە کۆمەڵایەتییە ئیلهامی لە ئایدیۆلۆژیای لیبڕالیزم وەرگرتووە و لەو بوارەدا خزمەتێکی بێسنوور بە ناڕوونی و ئاڵۆزی مێشک دەکات. بە تایبەتیش لەکاتێکدا سەرجەم چالاکیەکانی سیستەمە زۆردارەکان بە سیاسەت ناودەبرێت، هەرچی پاشماوە کەمەکانی سیاسیشە لەسەرپێ ماونەتەوە فەرامۆش دەکرێن؛ بەڕێوەبەرێتی خێڵی سەرەتاییش

بەخۆجێییەکی بەرتەسک، کورتبینی و نوێنەرایەتی نەکردنی بەرژەوەندییە نەتەوەییە ناوخۆیی و دەرەکییەکان تاوانبار دەکرێت. ئاڵۆزی و پەشێویی ئەم بابەتە لەڕادە بەدەرە. وێڕای ئەوەی لەمێژە سیاسەت لەکۆمەڵگا دەرکراوە، کۆدەکانی دەسەڵاتیش – کە یەکسانە بە خیانەت ـ لەجێگایدا زاڵکراوە، بەڵام لەبواری سیاسیدا بە پەرەسەندنێکی گەورە دادەنرێت، باسی ئاستێکی شارستان و مۆدێرنی سیاسەت دەکەن. کەچی لەراستیدا ئەو بوارە کۆمەڵایەتیەی سیاسەتی تێدا هەبێت بەرژەوەندییە ژیانیەکانی کۆمەڵگا جێگای باسە؛ بەختەوەری و لێهاتوویی بونیادی و مانایانە. ئەو کۆمەڵگایانەی بێ سیاسەتن یان سیاسەتەکەیان لاوازە لەژێر چەوسانەوە و سەرکوتکردنی دەسەڵاتێکی دەرەکی داگیرکردن و قڕکردنی دەرەوە یان چینی چەوسێنەر و بژاردەی دەسەڵاتی ناوخۆ رزگاریان نابێت. گەورەترین چاکەی بەرامبەر کۆمەڵگایەک بکرێت بەرزکردنەوەیەتی بۆ ئاستی کۆمەڵگای سیاسی. لەوەش باشتر گەیاندنیەتی بە دیموکراسیەکی بونیادی و هەمیشەیی کە بیست و چوار کاتژمێر سیاسەتی دیموکراتیانەی تێدا کارا بێت.

### ٧. ئەخلاق

دەشێت ئەخلاق وەک دۆخی نەریتی دامەزراوەیی مێژوویی سیاسەت پێناسە بکەین کە شێوەی گرتووە. لەکاتێکدا سیاسەت رۆژانە زیاتر رۆڵی ئافرێنەری، پارێزەری و خۆراکدەری دەبینێت، ئەوا ئەخلاقیش لەرێگای هێزی رێسایی و دامەزراوەیی نەریتەوە هەمان خزمەت دەکات. هەروەها دەشێت ئەخلاق وەک یادەوەری کۆمەڵگای سیاسیش ببینرێت. ئەو کۆمەڵگایانەی لەبواری ئەخلاقەوە تێکچوون یاخود بێ ئەخلاق ماونەتەوە، واتە یادەوەری سیاسی خۆیان؛ هێزی رێسا و دامەزراوەیی نەریتی خۆیان لاواز کردووە یان لەدەستداوە. ئەوەش بۆ کۆمەڵگایەک واتای بێبەش بوونە لە (خودبەرگری) بەرگری خۆیی، کرانەوەیە بە رووی هەرجۆرە کردەوەیەکی ئاسیمیلاسیۆن و داگیرکاری هێزە ستەمکارە ناوخۆیی و دەرەکیەکان. هۆکاری سەرەکی تێکدانی بەردەوامی ئەخلاق لەلایەن قەوارەکانی دەوڵەت و سیستەمەکانی دەسەڵات و لەجێگای ئەویشەوە سەپاندنی ئیرادەی یاسای تاکلایەنە (شێوەی ئەخلاقی باڵادەستان) بەسەر کۆمەڵگادا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لەرێگەی تێکدانی خۆبەڕێوەبەرێتی و سیاسەتەوە لەبواری بونیادیەوە بەردەوام کرانەوەی کۆمەڵگای ناوبراو بە رووی بەڕێوەبەرێتی دەسەڵات و چەوسانەوە وەک ناچاریەک دەبینن. کۆمەڵگایەک بەشێوەیەکی بەهێز ئەخلاقی خۆی بژێنێت، بە ئاسانی ملکەچی دەسەڵات و چەوسانەوە نابێت. نەرێنیترین، دواکەوتووترین و سەرەتاییترین دۆخی ئەخلاق لە بەڕێوەبەرێتی و یاسا پێشکەوتووەکانی دەسەڵات و دەوڵەتەکان بۆ کۆمەڵگایەک بەهادارترە. ئەو شوێنەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی تێدا بێت ئەوا دەسەڵات و یاسا نەک هەر بێواتا و نا پێویست دەبن، بەڵکو دەبنە بارێک کە هەڵناگیرێن. کۆمەڵگایەک چەندە لەدۆخێکی ئەخلاقی و سیاسیدا بمێنێتەوە، بەو رادەیە دیموکراسیخواز، ئازادیخواز و یەکسانیخواز دەبێت، لەو سۆنگەوە؛ بەرامبەر بە بەکارهێنانیان لەلایەن هێزی دەسەڵات و

پاوانەکانی سەرمایەوە داخراو دەبێت و بەرخودان دەکات. ئەو زانستە کۆمەڵایەتیانەی لیبرالیزم ئیلهامیان پێدەبەخشێت سیاسەتیان بۆ ئاستی دیماگۆژییەت بچووک کردۆتەوە، بەتایبەتیش کاتێک ئەو پارتانەی نموونەی بەرایی دەوڵەتن وەک کەرەستە و ئامرازی سەرەکی دیماگۆژییەت پێناسەی دەکەن ئەوە تەنیا خراپیەکی گەورە و بەناوی زانستەوە خیانەت نییە بەرامبەر بە زانست ئەنجام دەدرێت، بەڵکو بە بەرنامە ئەو رۆڵە دەبینن کە بۆیان دەست نیشان کراوە، ئەوەش بۆ پێگەی خزمەتکردنیان بە پاوانەکانی چەوسانەوە و دەسەڵات دەگەڕێتەوە.

**٨ . یاسا**

وێڕای تەواوی رایەڵەکانی بە ماف و دادپەروەرییەوە، رۆڵی سەرەکی یاسا تۆکمەکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەرتەسککردنەوەی زیاتری بواری کۆمەڵگایە. پڕوپاگەندەیەکی زۆری یاسا دەکرێت، هەربۆیەش رۆڵە بنەڕەتیەکەی هێندە ئاشکرا نابێت. یاسا لەجیاتی ئەو ژیانە رێکخراوە جێگیر دەکرێت کە بەردەوامی کۆمەڵگا، خۆراک و پاراستنەکەی دەستەبەر دەکات. لەو رێگایەشەوە ئەو مافەی لە دەست دەردەهێنرێت، کۆمەڵگا لەخۆبەڕێوەبەرێتی و سیاسەت بێبەش دەکرێت، لە لایەنی بەڕێوەبەرێتی و یاساشەوە گەمارۆ دەدرێت کە لەسەرەوە لەلایەن دەوڵەت و دەسەڵاتەوە ئامادەکراوە، هەروەها دەخرێتە ژێر فشار و چەوسانەوەی چینایەتیەوە. لەبەر ئەو هۆکارەش دەستەواژەی یاسا بوارێکە بەلانی کەم هێندەی دەستەواژەکانی دەسەڵات و سیاسەت نادیارە، تا دوا رادە بۆ چەواشەکردن لەبارە و مێشک ئاڵۆز دەکات. هەروەک چۆن پەرەسەندنی زۆری یاسا لە کۆمەڵگایەکدا گوزارشت لە نەبوونی ئەخلاق دەکات، ئەوا لەو کۆمەڵگایەدا ململانێ یان پێکدادانێکی دژواری چینایەتیش پیشان دەدات، واتە هەبوونی چەوسانەوە و سەرکوتکردن پیشان دەدات. بە پێچەوانەی ئەو بانگەشە بەردەوامانەی دەکرێن؛ پۆلێنبەندییە یاساییە وردەکان نوێنەرایەتی هێزی ماف و دادپەروەری ناکەن، بەڵکو بەرژەوەندییە کۆدکراوە سیستەماتیکەکانی پاوانەکانی چەوسانەوە و سەرکوتکردن دەخەنەڕوو. بەتایبەتیش گەورەبوونی ترسناکانەی یاسا لەسیستەمی چەوسانەوەی سەرمایەداریدا، بۆ مەیلەکانی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج دەگەڕێتەوە کە هیچ سنوورێک ناناسێت. کاتێک بەشێوەیەکی مێژوویی توێژینەوە لەبارەی دەستەواژەی مافەوە بکەین، رووبەڕووی پاوانی دەسەڵات دەبینەوە کە خۆی وەک پاشا ـ خوداوەند راگەیاندووە. لێرەدا دەستەواژەی ماف هەم گوزارشت لەموڵکداری و چالاکی ئیرادەی یەکلایەنەی پاشاکان دەکات، هەمیش گوزارشت لە ئیلاهیبوونەکەی دەکات. یەکسانکردنی دەستەواژەکانی ماف، خوداوەند و ئەڵڵا و بەگوێرەی ئەمەش داتاشینیان گوزارشت لەو راستییە دەکات.

لەلایەکی دیکەوە دەشێت یاسا وەک ئەخلاقی پاوانەکانی دەسەڵات و چەوسانەوەش ببینرێت. لەکاتێکدا ئەخلاقی نەریتی لەو بوارەدا ئاراستە دەگرێت کە وەک پاشماوە بەناوی کۆمەڵگا ماوەتەوە، ئەوا یاساش هەنگاو بە هەنگاو گۆڕەپانی کۆمەڵگا بەرتەسک دەکاتەوە

و دەیکات بە بواری ڕێساکانی دەسەڵاتی دەوڵەت. بە مۆمیش بە دوای ئەخلاقدا بگەڕێیت لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نادۆزرێتەوە و سەرجەم بوارەکانی ژیان، تەنانەت ئاو و هەواکەشی دەکرێت بە بابەتی یاسا، ئەمەش ناوەڕۆکی دەستەواژەی یاسا بەرجەستە و روونتر دەکاتەوە. ئەگەر لەگەڵ زەوتکردنی کۆمەڵایەتی فەرمانڕەواکانی شارستانی کۆن بەراورد بکرێت کە زۆر رەخنە کراوە و لەراستیشدا زۆر لاوازە، ئەوا دەبینین کە زەوتکاریەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەڕێگای یاساوە رەوای کردووە سنوور ناناسێت.

هەڵکشانی یاسا بۆ ریزەکانی سەرەوەی زانستی کۆمەڵایەتی سەرچاوەی خۆی لە پەردەپۆشکردنی ناهەقیەکان بەناوی مافەوە، درۆکانیش لەژێر ناوی واقیعی کۆمەڵگا و کۆت و بەندکردنی ژیانیش بەناوی ژیانی ڕێسایی یان ڕێکوپێکەوە وەردەگرێت. هەربۆیەش یاسا ناچارە ئامرازی سەرەکی رەواکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێت. هەروەک لەدیاردەی دەسەڵاتیشدا بینرا، ئەوەی لەبواری یاساشدا گرنگە ئەوەیە کە؛ هەرچەندە وەک بە یاساکراویش دیاربێت لێرەدا پێویستە رەهەندی ئەخلاقی ببینرێت و لەڕێگەی چارەسەرکردنی ئاڵۆزی و پەشێویەوە کۆمەڵگا لەمیانەی ئەو ئەخلاقە سنوردارەوە بپارێزرێت کە دەرخواردی یاسا دراوە. هێندەی بەدەستهێنانەوەی ئەو کارگێرییەی کۆمەڵگا کە دەرخواردی دەسەڵات دراوە، ئەو ئەخلاقەی دەرخواردی یاساش دراوە دەستبەرداری رۆڵی پاراستن و بەردەوامکردنی کۆمەڵگا نابێت.

**٩. دیموکراسی**

بەکارهێنانی بەردەوامی لەبواری کرداری و راڤەکردنی بەپێچەوانەی ناوەڕۆکەکەیەوە پێناسەیەکی راست بۆ دەستەواژەی دیموکراسی بایەخدار دەکات. دەشێت پێناسەی بەرتەسک و فراوانی دیموکراسی بکرێت کە بە شێوەیەکی دەستەواژەیی لەبارەیەوە بەکاردەهێنرێت. بە مانا بەرفراوانەکەیەوە دەشێت دیموکراسی وەک خۆبەڕێوەبردنی ئەو جڤاتانە پێناسە بکرێت کە ئاشنای دەوڵەت و دەسەڵات نەبوون. خۆبەڕێوەبردنی جڤاتەکانی کلان، قەبیلە و خێڵ دەکەوێتە ناو ئەو پۆلێنەوە. لەو کۆمەڵگایانەی کە دیاردەکانی دەسەڵات و دەوڵەت بەشێوەیەکی چڕ لەئارادا بن، ئەوا ئەو خۆبەڕێوەبەرایەتیانەی لەدەرەوەی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت و دەسەڵات ماونەتەوە بە واتا بەرتەسکەکەی دەشێت لە چوارچێوەی دیموکراسی هەڵسەنگێنرێت. لەکۆمەڵگا دەوڵەتیەکاندا بە دۆخێکی پەتی و ساف تەنیا بەڕێوەبەرێتی ستەمکاری یاخود دیموکرات جێگای باس نییە. بەڵکو دیاردەیەکی بەڕێوەبەرایەتی تێکەڵاو جێگای باسە. ئەمەش رژێمگەلێک بەرهەم دێنێت کە بۆ تێکدانی دیموکراتی و دەسەڵاتیش کراوەن. وەک پێویستیەکی سروشتەکەی لەپەیوەندی کردن بە کۆمەڵگاوە دەسەڵاتی دەوڵەت ناچارە دیموکراسی بەرەو دواوە ببات و سنووورداری بکات. هەرچی هێزەکانی دیموکراسیشن لەمیانەی داننەنان بە دەوڵەتەوە بەردەوام خوازیارن سنوورەکانی خۆیان بەرفراوان بکەن. ناوەڕۆکی کێشەکە سەرچاوەی خۆی لە شیرزەیی نێوان دەوڵەتی پەردەپۆشکراو بە دیموکراسی و ئەو دیموکراسییە وەردەگرێت کە خوازیارە ببێت بە دەوڵەت. لە شارستانی

ئەوروپا ئەو شپرزەییە بەشێوەیەکی سیستەماتیک پەرەی پێدراوە و لە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتیش جیاوازی نێوان سروشتی کۆمەڵگا و دەوڵەت قووڵترە. خۆ سنووردارکردنی دەسەڵاتی دەوڵەت لەرێگای دەستوورەکانەوە و سنووردارکردنی کۆمەڵگاش لەمیانەی دیموکراسی نوێنەرایەتیەوە، پیاهەڵپژانە دژوارەکەی نێوانیان نەرم دەکات و دەرفەتی بەیەکەوە ژیانیان دەدات. ئەو مۆدێلە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دایهێناوە لەناوەڕۆکدا لەرێگەی نەرمکردنی ناکۆکییە چینایەتیەکانەوە ئامانجی بەڕێوەبردنە لەکاتێکدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەلایەکەوە چڕترین و بەربڵاوترین شێوەی دەسەڵاتی دەوڵەت ــ وەک دەوڵەت ــ نەتەوە – لەسەر تەواوی هێزە کۆمەڵایەتیەکانی دەرەوەی خۆی بەڕێوەدەبات، لەلایەکی دیکەشەوە هەوڵدەدات ئەوانەی لەژێر سەرکوتکردن و چەوساندنەوەی سیستەمدان بە دیموکراسی پەرلەمانتاری نوێنەرایەتی ــ بۆ رازانەوە ــ رازی بکات. ئەمە ئەو دیاردەیە کە دیموکراسی لیبڕال بەناو دەکرێت.

دەشێت لەرێگای پەرەپێدانی خۆبەڕێوەبەرایەتیەکانەوە دیموکراسی کۆمەڵایەتی لەو خەڵەتاندن و لەخشتەبردنە رزگار بکرێت. پەرەپێدانی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانە بە بێ ئەوەی لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت هاوتا بکرێت یان لەژێر ناوی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریاوە گەل چەواشە بکرێت، نزیکترین مۆدێلی چارەسەری راستە. نە دەوڵەتبوون بەناوی گەل و نە بوون بە پاشکۆیەکی سادەی دەوڵەت، هیچ یەکێکیان جیاکاری و بنەمای خۆبەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیانە نین. لەمیانەی رێچکەیەکی دیکەی دەرەوەی ئەو رێگایە دەربازکردنی چەواشەکارییە چەپڕەو و راستڕەویەکانی دیموکراسی لیبڕالیزم ئەستەمە. ئەگەر خۆی وەک دیموکراسی لیبڕالی کلاسیک یاخود دیموکراسی گەلی سۆسیالیزمی بونیادنراو پیشانبدات، هێزی سەرەکی بەڕێوەبەرایەتی لیبڕالیزم قۆرخکاری دەوڵەت و قۆرخکارییە ئابووریەکانە، ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەرشانی کۆمەڵگا، بەدرێژایی مێژوو ئاواکردنی هێزەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەی خۆیانە بەرامبەر هێزەکانی شارستانیەت و هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆژگاری ئەمڕۆمان. بەو رادەیەی پێویستە رووخاندنی دەوڵەت و ئاواکردنی دەوڵەت لە جێگایدا نەکرێتە ئامانج و لەناو دەوڵەتدا نەتوێتەوە و نەبێتە پاشکۆیەکی سڤیل، خۆبونیادنان لە سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا و بە واتا گەیاندنیان رۆڵی مێژوویی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەیە.

### ١٠. ئابووری

لەبەر ئەوەی ئابووری پیرۆزکراوە، گەیاندنی بە پێناسەیەک کە سنوورەکانی دیاریکراو بێت گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. لیبڕالیزم کە هەرشتێکی بۆ مۆدێلی ئابووری بچووککردۆتەوە پێناسەکەی بێواتا کردووە، هەر دیاردەیەکی پێچەوانەی ئابووریشی بە ئابووری لەقەڵەم داوە. لەکاتێکدا لە واتای گشتیدا ئابووری بە چالاکی جێبەجێکردنی پێویستییە ماددییە ژیانیەکانی کۆمەڵگا و گوزارشتە رێسایی و دامەزراوییەکەی روون بکرێتەوە، لە واتا بەرتەسکەکەشیدا دەشێت وەک ئاڵوگۆڕی پێویستی ماددی دەوروبەری

بازاڕ پێناسە بکرێت. لەگەڵ ئەوەی ئابووری بازاڕ پێناسەیەکی پەسەند نەکراوە، کە لەجیاتی بەکارهێنان بەهای گۆڕینەوە بەبنەما دەگرێت، هەروەک چۆن سەرمایەداری بواری دیموکراسی چەواشە کردووە، بواری ئابووریشی خستۆتە ژێر باڵادەستی قۆرخکاریەکانی سەرمایە و دەوڵەت ـ نەتەوە و بێناوەڕۆکی کردووە. ئابووری بەجۆرێک پێناسە دەکرێت وەک بڵێیت؛ کردە و چالاکیەکی خودی قۆرخکاری سەرمایەی سەر بازاڕەکانە کە لەژێر بانی دەوڵەت ـ نەتەوە بونیادنراون. لێرەدا نکوڵی لە ئابووری دەکرێت، لەجیاتی ئەویش سیستەمێکی قۆرخکاری و پاوانخوازی قازانجی زێدەڕۆییانەی بازرگانی، پیشەسازی و فینانس ئاواکراوە کە ئابووری نییە و نکوڵیکردنە لە ئابووری پێداویستە ڕاستەقینەکان؛ وەک بڵێیت ئەو قۆرخکاری و پاوانانەی سیستەم چالاکیەکی ئابووری ئەزەلی و ئەبەدین لەمیانەی ڕەواکردنێکی بەرفراوانەوە لە ژێر ناوی ئابووریەوە پێشکەش دەکرێن. ئەو کردە و چالاکییەی دەشێت وەک تیۆری ئابووری شرۆڤە بکرێت، گەورەترین کارەساتی کۆمەڵگایە کە لەمێژوودا هاوتاکەی نەبینراوە. واتە کۆمەڵگا لەبواری ئابوورییەوە دەڕووخێنرێت، بازاڕ گەمارۆ دەدرێت و دەکرێت بە گۆڕەپانی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج، لەڕێگای ئامرازەکانی فینانسەوە پەیوەندی پاوانەکانی سەرمایەداری بوارەکانی بازرگانی و پیشەسازی لەگەڵ ئابووری ناهێڵن و قازانجکردنی دراو بە دراو دەکرێتە سەرەکیترین پۆلێن.

سەردەمی سەرمایەداری فینانس لوتکەی وێرانکردنی ئابووری و کۆمەڵگایە. ڕووبەڕووی جانەوەر و دڕندەیەکی چاوبرسی ئانتی کۆمەڵگا، ئانتی مرۆڤ و ئانتی ـ سروشت بووینەتەوە کە نزیکەی نیوەی کۆمەڵگای خستۆتە ناو بێکارییەوە، لەژێر ناوی ئابووری چەکەوە بەرهەمهێنانی ئامرازەکانی قڕکردن و لەناوبردنی کردووە بە کەرتی سەرەکی ئابووری، تەنیا ئامانجی بەدەستهێنانی قازانجە، پەیوەندی بە پێویستیە ژیانیەکانی کۆمەڵگاوە نییە، ژینگەی وێرانکردووە و سەرجەم سەرچاوەکانی کۆمەڵگا و سروشتی کردووە بە سەرچاوەی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج. ئەوەی لێرەدا گرنگە ژنان و لاوان کە یەکەمین قوربانیەکانی ئەو سیستەمەن، ڕەنجەکەیان لەکار دەخرێت و ناچاری ژیانێکی دابڕاو لە ئابووری دەکرێن، لەبەرامبەر ئەوەشدا CEO[1]کانی هیچ پەیوەندییەکیان بە ئابوورییەوە نییە و هەریەکەیان گورگێکی "قیت و قۆز"ی بەڕێوەبەرێتی دەسەڵاتن، وەک کۆڵەکەکانی ئابووری پێشکەش دەکرێن؛ ئەو ناکۆکیە سەیرە وەک سەرەکیترین چالاکی ئابووری پێشکەش دەکرێت. قۆرخکاری و پاوانە ئۆلیگارشیەکان کە زۆربەری زۆری کۆمەڵگا لە ئابووری ڕاستەقینە دادەبڕێت، بەدەستهێنانی قازانج دەکاتە تاکە ئارمزوو و پەیوەندییەکەی بە کۆمەڵگاوە تەنیا ئاواکردنی پاوانەکانی چەوسانەوە و درێژە پێدانیانە، بەجۆرێک ڕێگا لەپێش شێرپەنجەی کۆمەڵایەتی دەکاتەوە کە دەسەڵاتی دەوڵەتیش دەرباز

---

[1] گەورە بەڕێوەبەرانی گشتی (Chief executive officer) (CEO): بەرزترین دەسەڵاتە لە بەڕێوەبەرایەتی باڵادا، بەرپرسیاری یەکەم و کۆتایی لە بەڕێوەبەرایەتی کۆمپانیایەک، دەزگایەک لەبەردەم ئەنجوومەنی بەڕێوەبەریەتییەکەیدا. هەر یەکێک لە بەڕێوەبەرانی گشتی پێویستییان بە دوو یارمەتیدەر هەیە و هەر یەکێکیشیان ئەرک و بەرپرسیارێتی دیاریکراویان هەیە. (وەرگێڕ)

دەکات. هەر بۆیەش بە ئابووری دانەنانی و تاوتوێکردنی وەک نکوڵیکردنی ئابووری گرنگیەکی ژیانی هەیە.

بەهۆی رۆڵە راستەقینەکەیان پێویستە کاهینە مۆدێرنەکانی ئەو سەردەممان (سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری) زۆر چاک پێناسە بکەین کە لەژێر ناوی زانستی ئابووری ـ سیاسیەوە دە ئەوەندەی داهێنانە میتۆلۆژیەکانی سەردەمی کاهینی سۆمەری بەرژەوەندی هێزەکانی دەرەوەی کۆمەڵگایان کردووە بە ئەفسانە. پێویستە CEO کانی کۆمپانیاکانیش بخەینە ناو ئەو پۆلێنەوە. پێویستە هیچ کاتێک لەبیرنەکەین کە لەبنەڕەتدا دەوڵەت ـ نەتەوە سیستەمی توندوتیژی ئەو سیستەمە مۆدێرنەی کاهینەکانە. خەباتی "سەرمایە" ی ک. مارکس کە بە ناوی زانست رووبەڕووی سەرمایەداری بوویەوە سەرلەنوێ پێویستی بە راڤەکردنەوەیە. چونکە وەک بڵێی؛ ئەو سیستەمە زەمینەیەکی رەوای هەیە هەوڵی بەزانستیکردنی داوە. هەرچەندە لەزۆر بوارەوە هەوڵی داماڵینی دەمامکەکانیانی داوە، بەڵام پێشکەشکردنی سەرمایەداری وەک سیستەمێکی مێژوویی دەست لێبەرنەدراو هۆکاری سەرەکی تواندنەوەی مارکسیزمە لەناو مۆدێرنیتەدا. هەروەک لەئەزموونەکانی یەکێتی سۆڤێت و چین ی سۆسیالیزمی بونیادنراو بینراوە؛ گەورەترین خزمەتیان پێشکەش بە لیبڕالیزم کردووە و جێگای خۆیان لەسیستەمدا گرتووە. ئەویش لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو راستییە ئاماژە پێکراوەیە. بچووککردنەوەی زانستی کۆمەڵگا بۆ مۆدێلی ئابووری؛ جیاکردنەوەی ئابووریش بۆ ئانالیزمی سیستەمی سەرمایەداری کە واتای نکوڵیکردنی ئابوورییە، ناوەڕۆکی قەیرانی بواری زانستییە. ئەگەر قەیرانی ئابووری سیاسی بەلاوە نەنرێت کە سەرجەم زانستی کۆمەڵگای خستۆتە ناو قەیرانەوە، ئەوا ناشێت قەیرانی سەرجەم زانستەکان دەرباز بکرێت کە رێنمایی و دیدگای دامەزراوەیی (زانکۆکان)، واتایی و فەلسەفییان لەدەستداوە. تا قەیرانەکەی زانست دەربازنەکرێت و سەرلەنوێ زانست لەبواری مانا و دامەزراوەییەوە بونیاد نەنرێتەوە، ناشێت قەیرانی گشتی کۆمەڵگا و هاربوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز بکرێت.

### ١١. ئاسیمیلاسیۆن

ئاسیمیلاسیۆن (تواندنەوە) گوزارشت لەو پەیوەندی و چالاکییە یەکلایەنانە دەکات کە پاوانەکانی سەرمایە و دەسەڵات لەکۆمەڵگاکانی شارستانی لەسەر ئەو گروپە کۆمەڵایەتیانە پەیڕەوی دەکەن کە دەیانخەنە ژێر ستاتۆی کۆیلایەتیەوە و خوازیارن بیانکەن بە پاشکۆ و سێبەری خۆیان. ئەوەی لە ئاسیمیلاسیۆن بەبنەما دادەنرێت، بەکەمترین تێچوونەوە کۆیلە بۆ میکانیزمی دەسەڵات و چەوسانەوە پێ بگەیەنێت. ناسنامە و بەرخودانی گروپی ئاسیمیلەکراو تێکدەشکێنرێت و پەرتەوازە دەکرێت، بە دۆخێک دەگەیەنرێت کە گونجاوترین کۆیلەکانی خزمەتکاری نوخبەی دەسەڵاتی تێدا کۆکراوەتەوە. لێرەدا سەرەکیترین رۆڵی دەکەوێتە سەر کۆیلەی ئاسیمیلەکراو؛ بەشێوەیەکی رەها بەخاوەن (سەردار)ە کەی بچێت، لەپێناو بوون بە پاشکۆ و سێبەرەکەی هەموو جۆرە هەوڵێک بدات، بەمجۆرە خۆی

بسەلمێنێت و جێگای خۆی لەناو سیستەمدا بکاتەوە. هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. لەپێناو ژیان و مانەوەدا ساتێک زووتر دەستبەردان لە ناسنامە کۆمەڵایەتییە کۆنەکەی و بەباشترین شێوە خۆگونجاندنی لەگەڵ کلتووری سەردارەکانی وەک تاکە بژاردەیەک پێشکەشی دەکرێت. ئەو کۆمەڵگایەی دووچاری ئاسیمیلاسیۆن هاتووە لەگەڵاڵەی بێویژدان، بێئەخلاق و ناهۆشمەندترین مرۆڤ پێکدێت کەماڵیکراوە، خەسێنراوە و لەپێناو نۆکەرێتی پێشبڕکێ دەکات. ئەوانە هیچ بڕیار و کردەوەیەک نییە ئازادانە ئەنجامی بدەن. بۆ ئاژەڵێک بچووک کراوەتەوە کە لە بەرگی مرۆڤ دایە و ناچاری خیانەتکردن لەسەرجەم بەهاکانی ناسنامە کۆمەڵایەتیەکەی کراوە و تەنیا بەدوای تێرکردنی سکیەوەیە. بۆ سەپاندنی ئەو بێناسنامەییە بەسەر کۆمەڵگای ئاسیمیلاسیۆن دوو چەکی سەرەکی بەکاردێنێت: یەکەمیان؛ توندوتیژی رووتی جەستەییە. لە بچووکترین یاخیبوون و سەرهەڵداندا شمشێری قڕکردن لەسەر ملی ئامادەیە. دووەمیان؛ ڕووبەڕووکردنی برسێتی و بێکارییە. هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو یاسا پۆڵایینە دەدرێت: ئەگەر داکۆکی لەسەر ناسنامەی کلتووری خۆت بکەیت و نەبیت بەخزمەتکاری سەردارەکەت، یان کەللەت دەپەڕێت یان بە برسێتی دەمێنیتەوە!.

سەرەکیترین ڕێکاری نوخبەی باڵادەست لەو پێناوەدا دایهێناوە؛ هەرکێیەک بن ئەوانەی تێکەڵی ئەو کلتوورە بوون یان مەیلیان بۆ هەرشتێکی پەیوەست بەو کلتوورە ئاسیمیلەکراوە هەیە بەو ئامانجەی هیچ دەرفەتێکی ژیان نەدۆزنەوە سەرجەم ڕێگاکانی پەرەسەندنی واتایی و بونیادی کلتوورییان لەپێش دادەخات. ئەو دامەزراو، گرووپ و کەسانەی پەیوەندییان بە کلتووری ئاسیمیلەکراو هەیە و لەپێناو ژیانەوەی ئەو کلتوورە کار دەکەن چەندە بەهرەدار و بەتواناش بن هەروەک چۆن تەواوی دەرگاکانی دەوڵەتیان بەڕوو دادەخرێت، لەپێناو دەرکردنیان لەبوارە کۆمەڵایەتیەکانی دەرموەی دەوڵەتیش هەرجۆرە تەگبیرێک وەردەگیرێت، جا ئەمانە بە ڕێبازی ئاشکرا یان نهێنی، نەرم یان دژوار بن. ئەو کەس و ڕێکخراوانەی سەرەتا بە ئارەزوویەکی ناشارەزایانە سەبارەت بە کلتووری ئاسیمیلەکراو کاردەکەن کاتێک تێدەگەن بەپێی پێشڤەچوونی هەوڵەکانیان تەنیا هەموو دەرگاکان بەڕوویانەوە داناخرێت، بەڵکو لەدۆخی سووربوون لەسەر هەوڵەکانیان ژیانیشیان دەکەوێتە ژێر مەترسییەوە، یان دەچنە ریزی کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوەی باڵادەست و ئاسیمیلەکار یان ئەوەتا ڕێباز دەگۆڕن و ڕزگاربوون لەکەسایەتی و ڕێکخستنی بەرخودانی کارادا دەبینن. لەتەواوی قەوارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا نموونەی لە ژمار نەهاتووی بەم چەشنە جێگای باسە. میکانیزمی ئاماژەپێکراو تەنیا بەسەر گەلان و چڤاتە ئەتنیکیە چەوساوەکان پەیڕەو ناکرێت؛ چینە چەوساوە و گرووپە ئەتنیکیە جیاوازەکانی نەتەوەی نوخبە دەسەڵاتدارەکەش پشکی خۆیان لە ئاسیمیلاسیۆن وەردەگرن و ڕووبەڕووی لەدەستدانی شێوەزاری ئەتنیکی و بەها کلتوورییە ئازادەکانیان دەبنەوە.

گەلی کوردیش کە گەورەترین قوربانی ئاسیمیلاسیۆنە لەخۆرهەڵاتی ناویندا، لەو بارەیەوە بەکاریگەرترین و سەرنج ڕاکێشترین نموونەیە. سووربوون لەسەر کوردایەتی یان کوردبوون باجەکەی شاڵاوێکە بە بێکارییەوە دەست پێدەکات و تا قڕکردن و ژینۆساید

دەچێت. ئەگەر تاکێکی کورد ئارەزووەمەندانـە هـەر جـۆرە سیاسـەتێکی کلتـووری دەوڵـەت ـ نەتـەوەی باڵادەست پەسـەند نـەکات، هەرچەنـدە بـە توانـا و بـەهرەداریش بێت سـەرجەم دەروازەکانی پێشکەوتنی کەسێتی و دامەزراوەیی یـەک بـەدوای یـەکتر لێـی دادەخرێن. یـان رادەسـتەبوونی ئارەزووەمەندانـە هەڵـدەبژێرێت و کرانـەوەی ئـەو دەروازانـە دەبینێـت کـە تەنانەت تا سەرۆک کۆماری دەڕوات، یان ئەوەتا رادەست نابێت و بەرخودان هەڵدەبژێرێت و هەموو جۆرە بەڵا و کارەساتێک ـ ژینۆسایدیشی لەناودا ـ رەچاو دەکات.

**١٢. ژینۆساید**

ژینۆساید؛ کـە بریتییـە لەبـەردەوامی دیـاردەی ئاسیمیلاسـیۆن، ئامـانجی لـەناوبردنی کلتووری و جەستەیی ئەو گەل و گرووپە ئـایینی، مەزهـەبی و ئەتنیکیـە هەمەجۆرانەیـە کـە لـەرێگای ئاسیمیلاسـیۆنەوە تێـک نەشـکاون. بـەگوێرەی رەوش یـەکێک لـەو رێبازانـە هەڵدەبژێرێت. رێبازی ژینۆسایدی کلتووری بەگشتی بەرامبەر ئەو گرووپە کلتووریانە پەیڕەو دەکرێت کە بەرامبەر بە کلتووری نوخبەی باڵادەست، واتـە بـەگوێرەی کلتـووری دەوڵـەت ـ نەتەوە باڵاترن. بەرچاوترین نموونەشی ئەو ژینۆسایدانەیە کـە بەرامبـەر گـەل و کلتـووری یەهودی پەیڕەو کراوە. لەبەرئـەوەی لـەبواری کلتـووری مـاددی و مەعنەویـەوە بـەدرێژایی مێژوو یەهودیەکان یەکێک لەبەهێزترین جڤاتـەکان بـوون، دووچـاری گـورز و لـەناوبردنی جەستەیی کلتـووورە باڵادەستە رکابـەرەکان هـاتوون، بـەردەوام تووشـی ئـەو ژینۆسـایدانە هاتوون کە بە پۆگرۆم ناو دەبرێن.

هەرچی ژینۆسایدە کلتووریەکانە، کە دووەمین رێبازی ژینۆسایدە، زیاتر لەسـەر ئـەو گرووپە ئایینی، جڤاتە ئەتنیکی و گەلانە پەیڕەو دەکرێت کە بـەگوێرەی کلتـووری دەوڵـەت ـ نەتەوە و نوخبەی دەسەڵاتدار لاواز و گەشە نەکردوون. وەک رێکاری سـەرەکیش لەمیانـەی ژینۆسـایدی کلتوورییـەوە ئامـانج لـەناوبردنی تـەواوەتی ئـەو گـەل، گرووپـە ئـایینی و ئەتنیکیانەیە کە لەناو زمان و کلتووری دەوڵەت ـ نەتەوە و هێزی باڵادەست؛ دەخرێنـە ژێر فشـاری هـەرجۆرە دامـەزراوێکی کۆمەڵایەتیـەوە، لەسـەرووی هەمووشـیانەوە گوشـاری دامـەزراوەکانی پـەروەردە، بـەمجۆرەش هـەوڵی کۆتاییهێنـان بەبوونەکـەیان دەدرێـت. بەگوێرەی لەناوبردنی جەستەیی ژینۆسـایدی کلتـووری بەئێشـترە و جـۆرێکی درێژخایـەنی ژینۆسایدە. ئەو ئەنجامانەی دەیخولقێنێت لـە ژینۆسـایدی جەسـتەیی زۆر مەترسیدارترە. گەورەترین کارەساتە کە گەلێک یان هەر جڤاتێک لە ژیاندا دووچاری دەبێت. ناچـارکردنی بۆ دەستبەردان لەبوون، ناسنامە و تەواوی فاکتەرەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی لەگەڵ لەخاچدانی بەکۆمەڵی درێژخایـەن یەکسـانە. لێرەدا ناشێت بـاس لـە ژیانێـک بکرێـت کـە لەپێناو ئەو بـەها کلتووریانـە بێـت کـە لـە ژێـر ژینۆسایدایە، بـەڵکو بـاس لـە ژیـانێکی پەلەقاژە و ناڵانـدنی بـەر لـە مـردن دەکرێـت. کاتێـک مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری زۆرتـرین قـازانجی خـۆی بەدەسـت دێنێـت ئـێش و ئـازاری بنـەڕەتی تـەنیا ئـەوە نییـە کـە لـەبواری ماددییـەوە تـەواوی گـەلان، چینـی چەوسـاوە و بێکارکراوەکـان دەچەوسـێنێتەوە، بـەڵکو

ئەوەیانە کە بەهۆی لەخاچدانی سەرجەم بەها کلتوورییەکانی دیکە دەیچێژن. ئەو واقیعەی تەواوی بەهاکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی دەرەوەی کلتووری فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوە دووچاری دێن ڕۆحدانە بەسەر تەختەی لەخاچدانەوە. چونکە بە چەشنێکی دیکە ناتوانن مرۆڤایەتی و دەوروبەری ژینگە بکەن بەسەرچاوەی چەوسانەوە و لەناوی ببەن.

ڕەوشی کوردان بەکاریگەرترین و تراژیدیترین دۆخی ژینۆسایدی کلتوورییە. کاتێک گەلی کورد بەدەست ئەو میکانیزمەی لەخاچدانەوە ناڵەناڵی بوو کە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە لەسەر تەواوی بەهاکانی کلتووری ماددی و مەعنەویەوە دانراوە، لەسەرووی هەموویانەوە بەهاکانی ڕەنج، سەرجەم توانستەکانی کۆمەڵگا، سەرچاوەکانی دەوڵەمەندی سەرخان و ژێرخانی دووچاری تاڵانێکی ئاشکرا دێت؛ ئەوەی دەمێنێتەوەش، ڕووبەڕووی لەناوچوون دەبێت، بێکارو بێ ڕۆڵ دەکرێت، دەڕژێنرێت، دەخرێتە ڕەوشێکی قێزەونەوە کە توانای ژیانی نییە و سەیری ڕووخساری ناکرێت. وەک بڵێیت؛ تاکە ڕێگایەک لەپێش مرۆڤی کورد ماوەتەوە: توانەوە لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەی زاڵ، دەستبەردانی تەواو لە بەها سەرەکیەکانی! جگە لەوە ڕێگای ژیانی نییە. ژینۆسایدی کلتووری کوردان کە ناوە بەناوە بەئاستی ژینۆسایدی کلتووریش دەگات لەسەرووی ئەو نموونە تراژیدی و بەکاریگەرانە دێت کە بە ڕوونترین شێوە ڕاستی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەخاتەڕوو.

## ب ـ چوارچێوەی تیۆری

وێڕای ئەوەی تیۆری بیردۆزە کۆمەڵایەتیەکان هەمەجۆرن و خاوەن بونیادی ناکۆکن سەبارەت بە ڕۆشنکردنەوەی بابەتە سەرەکیەکەمان بە سەرنج ڕاکێشانە سەر هەندێکیان سنووردار دەبین.

لەگەڵ ئەوەی دەشێت هەمەڕەنگیەکانی کۆمەڵگا تیۆریزە بکەین کە گەردوونێکی زۆر فراوان پێکدێنێت، بەڵام هێندە خزمەت بەئامانجەکەمان ناکات. لەوانەیە ئەو تیۆریزەکردنە ئەو بابەتە بنەڕەتیە پەراوێز بکات کە پێویستی بەڕۆشنکردنەوەیە و بێبایەخی بکات. گرنگترین خاڵی زانستی کۆمەڵگا ڕۆشنکردنەوەی هەموو شتێک نییە، بەڵکو دەستنیشان کردن و ڕۆشنکردنەوەی ئەو بابەت و گرفتانەیە کە گرنگی ژیانییان هەیە. گرنگترین پرسیاریش ئەوەیە: لەدارستانی دیاردەکانی کۆمەڵگا دیاریکەرترین دیاردە کامانەن؟ لەبوویەر و کەسایەتییە گرنگەکانەوە تا دەگاتە ئەوانەی گرنگی بەدەوڵەت و ئابووری دەدەن لەوبارەیەوە دەشێت لیستەیەکی دوور و درێژ ئامادە بکرێت. لەبەرئەوەی هەندێک دیاردەی ڕۆشنکەرەوە و ئەو بونیاد ـ سەردەمانەی بەسەریان بردووە لەلامەوە گرنگن، هەوڵدەدەم بە ڕیزە بەشێوەی گەلاڵەیەک پێشکەشی بکەم.

### ١. دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی

بەهۆی بابەتە سەرەکییەکەمان پێویستە ژیانیترین پێناسەی تیۆریمان سەبارەت بەدەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی بێت. ئەو تیۆرییە سەرەکییەی دۆخی گەیشتنی گەلێک بەلێواری ژینۆسایید رۆشن دەکاتەوە، تیۆری دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندییە. بەگوێرەی ئەوەی دەستەواژەی دەسەڵات بەرادەی پێویست پێناسەکراوە، دەستنیشانکردنی ئەو خاڵە گرنگە کە بەدرێژایی مێژووی پەرەسەندنیەوە دەسەڵات چۆن کۆمەڵگای خستۆتە نێوان مەنگەنەی خۆیەوە. بەرلەهەموو شتێک پێویستە زۆر بەچاکی خەسڵەتی هەژموونگەرایی دەسەڵات دەستنیشان بکرێت. هەر لەقۆناغی دەرکەوتنیەوە ناوەندەکانی دەسەڵات ناچارن لەگەڵ یەکتردا بکەونە ناو کێبڕکێی دژوار و دواتریش شەڕی خوێناوییەوە. دەسەڵاتەکان سەرەتا لەرێگای جەنگەکانەوە یەکتری لەناو دەبەن و هەوڵی مۆنۆلیتیک[٢]بوون دەدەن. دوای ماوەیەک کاتێک بۆیان روون دەبێتەوە کە ئەمە بێکەڵکە و ئەستەمە بەدی بێت، کەوتنە ژێر هەژموونگەرایی بەهێزترین دەسەڵاتی ناوەندی لەلایەن ناوەندەکانی دیکەی دەسەڵاتەوە وەک ئەهوەن ئەلشەرەین (أهون ألشرین) پەسەند دەکرێت. هەروەها ئەو بزاوتە ئانتی - دەسەڵاتگەرایيانەی بەردەوام لەخوارەوە و دەرەوە سەرهەڵدەدەن، خاوەن دەسەڵاتەکان ناچار دەکات لەژێر دەسەڵاتی هەژموونێکی هاوبەشدا رێککەوتن ئەنجام بدەن. دەسەڵاتە سافەکان لەمێژوودا دەگمەنن؛ خەسڵەتی هەژموونگەرایی دەسەڵات رێسایە.

دەسەڵاتی ناوەندی لەمیانەی ناوەندی ئابوورییەوە تەواو دەکرێت. چڕبوونەوەی دەسەڵاتی ناوەندی لەگەڵ ناوەندی سەرەکی چڕبوونەوەی ئابووری لەناو رایەڵەیەکی توندوتۆڵ دایە. کاتێک ئابووری ناوەندی شەپۆل بە شەپۆل لەدەوروبەر بڵاودەبێتەوە و خۆی بەسیستەم دەکات، ناچارە ئەمە لەگەڵ پەلهاوێشتنی دەسەڵاتی ناوەندیدا ئەنجام بدات. لەبەرئەوەی دەسەڵاتی ناوەندی بۆخۆی بەهێزترین و خەستترین پۆتانسێلی بونیادی ئابوورییە، لەناو هەلومەرجی رۆژانەیدا ئابووری کارا دەکات و لەناوەندەوە بەرەو کەنار بڵاودەبێتەوە. بەگوێرەی ئەوەی قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە لەبەرزترین ئاستدایە، بەردەوام ناوەند و کەنار جێگۆڕکێ دەکەن. ئەو دۆخەش قۆناغگەلێکی دەست لێبەرنەدراو لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە بەتەنگژە ناودەبرێت.

کەواتە کەنار و تەنگژە سیفەتە سەرەکی و دەست لێبەرنەدراوەکانی دەسەڵات و ئابووری ناوەندیین. تا سیستەم بەشێوەیەکی بەپێت و بەرهەمدار کاربکات پێویستی بەگۆڕینی ناوەند نییە. بەڵام هەروەک زۆرجار لەمێژوودا روویداوە، بەهۆی مشەخۆربوونی ناوەند لەگەڵ بەسەرچوونی کاتدا، هێزێکی بەبەرهەمی کەنار سوود لەکاریگەری

---

[٢] مۆنۆلتیک (Monolithic) یان (Monolitik): بەردێکی گەورەی تەنیا بێت، لەشێوەی ستوون یان (مسلة). لێرەدا مەبەست لێی بوون بە قەوارەیەکی زلی تەنیایە. (وەرگێڕ).

تەنگژەکانیش دەبینێت و هەنگاو دەنێت، لەمیانەی پرۆسەکانی تەکنۆلۆژیای نوێوە ئابووری سەرکەوتووتر دەکات و ئەم پێهەڵگرتنە ئەنجام دەدات. تەکنۆلۆژیای نوێ مانای تەکنیکی نوێی سەربازییە. لەو ساتە مێژووییانەدا گواستنەوە یان خزانی دەسەڵات بە کەنار و ناوەندی نوێ ئەنجامگیر دەبێت. هەژموونگەرایی دەسەڵات سەرلەنوێ ئاوا دەکرێتەوە. لەمێژوودا بەردەوام پێکهاتەی ئەمجۆرە دەسەڵاتە هەژموونگەراییانە بینراون کە بە پێشەنگایەتی خانەدان یان قەومێکی نوێ هەڵکشاون. لێرەدا جیاوازی کردن لەبارەی ئاخۆ ئابووری و دەسەڵات کامەیان دیاریکەرن واتایەکی ئەوتۆی نییە. هەروەک چۆن هیچ دەسەڵاتێکی هەژموونگەرا بەبێ ناوەندی ئابووری ناتوانێت، هیچ ناوەندێکی ئابووریش بەبێ هەنگاونان بۆ بونیادنانی هەژموونگەرایی دەسەڵاتی ناوەندی ناتوانێت خۆی درێژخایەن یاخود هەمیشەیی بکات.

دیاردەیەکی دیکەی زۆر گرنگی مێژوویی گرێدراو بەدەسەڵاتی هەژمونگەرایی ناوەندی، ئەو سیستەمە بەشێوەی زنجیرە بەیەکەوە گرێدراوە و بۆشایی پەسەند ناکات؛ بەشێوەی پچڕانی کات و شوێنەکان نییە، بەڵکو بەشێوەی ئەڵقەکانی زنجیرەیەک ڕوودەدات. لە سروشتی دەسەڵاتی هەژموونگەرادا بۆشایی هێشتنەوە لەکات و شوێندا جێگای باس نییە. بەڵکو پڕاوپڕی جێگای باسە. ئەڵقەکان تێکەڵن و بەتوندی بەیەکەوە بەستراونەتەوە. ئەگەر بۆشایی یان پچڕان ڕووبدات، ئەگەری داڕووخانی ناوەند بەدەردەکەوێت. ئەگەر لەکاتی خۆیدا چاک نەکرێتەوە و پڕنەکرێتەوە، هەرەس و جێگۆڕکێ دەست لێبەرنەدراو دەبێت. پێویستە دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی وەک دۆخێکی تایبەت بە ئیمپراتۆریەتە گەورەکان بیری لێنەکرێتەوە. هەوڵدەدرێت تەواوی کۆمەڵگا بە پەیوەندیەکانی دەسەڵاتی هەژموونگەراییەوە ببەسترێتەوە. لە گەورەترین ناوەندی ئیمپراتۆریەتەوە تا دەگاتە یەکینەی ئەو خێزانەی پێیەوە گرێدراوە، ڕێسای هەژموونگەرایی هاوشێوە بۆ هەموویان جێگای باسە. لە ڕۆما ئیمپراتۆر چی بێت، لەگوند ئاغا و مێردیش لەناو خێزاندا هەمان شتە. ئەگەر لەبیر بکرێت کە کۆمەڵگای مێژوویی لەمیانەی ئەمجۆرە بەرکەوتنە هەژموونگەراییانەوە چنراوە، ناشێت پەی بەکۆمەڵگای مێژوویی ببرێت. لەوانەیە کۆمەڵێک زانیاریمان لەلا کۆببێتەوە، بەڵام تێگەیشتنی دیالیکتیکیمان جێگای باس نابێت.

دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی نەک تەنیا لەرێگای ئابوورییەوە، پێویستە لەمیانەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەوە تەواو بکرێت، کە بەلانی کەم هێندەی ئەو گرنگە. هەژموونگەرایی دەسەڵات بە بێ هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی نابێت. بەتایبەتیش هەنگاوە سەرەکیە ئایینی و میتۆلۆژیەکانی قۆناغی شارستانیەت یان ئانتی ـ هەژموونگەراییە، یان لەکورتترین ماوەدا بەلانی کەم لەرێگای باڵێکیەوە لەگەڵ دەسەڵات دەبێتە یەک و بەخێرایی دەبێت بەهەژموونگەرا. بەتایبەتیش پەرەسەندنی تێکەڵی ئایینە تاکخوداییەکان لەگەڵ هەژموونگەرایی ناوەندی تابلێی فێرکەر و وانە بەخشە. دەرکەوتنیان گرێدراوی هەژموونگەرایی ڕەهایە. دەستەواژەی خودا، ئەڵڵا یان دەستەواژەی ئەلتەرناتیفی هەژموونگەرایی سەرەکییە؛ لەو دۆخەشدا ئایین بەرخودانکار و بەرهەڵستکارە. یاخود پیرۆزکردن و ئیلاهیکردنی خودی هەژموونگەرایە، لەو دۆخەی دووەمدا ئایین ڕەنگدانەوەی

سیستەمی هەژموونگەرایی ناوەندییە. بەهۆی پەیوەندی و ناکۆکیەکانەوە دۆخێکی زۆر خەستی شەڕ و ململانێ لەنێوان هەردووکیاندا جێگای باسە. تەنیا کاتێک مێژووی ئایینە تاکخوداییەکان بەیەکەوە لەگەڵ مێژووی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی توێژینەوەی لەبارەوە بکرێت دەرکی پێدەکەین. بەجۆرێکی دیکە ناکرێت دەرک بە مێژووی ئایینەکان بکرێت. مێژووی ئایینەکان دابڕاو لەبنەماکانی دەسەڵات و ئابووری سەفسەتەیەکی گەورەیە. پەیوەندی نێوان ئایین ـ خوداوەند ـ هەژموون ـ دەسەڵات ـ ئابووری لەمەزەندەکان زیاتر توندوتۆڵترە. وەک چۆن دەسەڵاتی هەژموونگەرایی بەشێوەی زنجیرەیەک کات و شوێنی تەنیوەتەوە و ئابلۆقەی داوە، مێژووی راستەقینەش لەمیانەی تێکەڵەی ئایین ــ خوداوەند ــ هەژموونگەرا ــ دەسەڵات ــ ئابووریەوە گەمارۆ دراوە. کۆمەڵگای مێژوویی بەشێوەی ئەمجۆرە گەمارۆ و ئەڵقانە دەرکەوتووە و تارۆژی ئەمڕۆمان هاتووە.

ئەگەر بەرجەستەی بکەین، بە پێی زانیارییە زانراوەکان ئەو پرۆسەی بەیەکەم هەژموونگەرایە بە سەرجۆنی ئەکەدی دەستی پێکردووە و بەشێوەی ئەڵقەکانی زنجیرەیەک بەردەوام بووە و ئەمڕۆش لەرێگای هەژموونگەراییەکی هاوشێوەی وەک سەرجۆن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە بەردەوامە، سەبارەت بە سیستەمی شارستانی ناوەندی وەک لێشاوی رووبارێکی سەرەکییە. لەکاتێکدا هەژموونگەرایی سۆمەر، ئەکەد، بابل، ئاشوور، هیتیت، میتانی، ئورارتوو، ماد، ئەسکەندەر، رۆما، ساسانی، بێزەنتی، عەرەب ـ ئیسلام، تورک ـــ مەغۆل، عوسمانی، بریتانیا و ئەمریکا، رووباری سەرەکی پێکدێنن، ئیمپراتۆریەتەکانی میسر، ئیلام، هەراپا، چین، رووس، فرانک و جێرمەن لقەکانی رووباری سەرەکین. ئەگەر بەدرێژایی مێژووی شارستانی ناوەندی کۆمەڵگای مێژوویی بەشێوەیەکی بەرجەستە لەمیانەی رووباری سەرەکی و لقەکانی سیمبۆلیزە بکرێت، ئەوا بەشێوەیەکی واقیعیتر دەرکی پێدەکرێت. بێگومان ئەو رووبارە سەرەکییە و لقەکانی تەنیشتی لقی بچووکتریشیان هەیە کە هەریەکەیان مانای شارستانی و کلتووریکە. ئەوەی گرنگە تێبگەین کە پەرەسەندنی مێژوویی پچڕاو نییە، جگە لە ماوەکانی گوزەرکردنی هەژموونگەرایی ناوەندی بەردەوام بوونی خۆی بەهێزکردووە و دونیای رۆژی ئەمڕۆمانی پێکهێناوە. بێگومان ئەو ئاواکردنە یەکلایەنە نییە. لەلایەکی دیکەشەوە هێزە ئانتی ــ هەژموونگەراییەکانیش هەر لەسەردەمی دەرکەوتنیانەوە بەرامبەر سیستەمی شارستانی ناوەندی و هێزە هەژموونگەراکانی بەردەوامبوونی خۆیانیان ئاوا کردووە و جەمسەرەکەی دیکەی دونیا، واتە دونیای شارستانێتی دیموکراتییان تا رۆژی ئەمڕۆمان هێناوە. راستیەکی حاشاهەڵنەگرە کە ناوەرۆکی ئەو دونیایە لەبنەڕەتدا دیموکرات، ئەخلاقی و سیاسییە، لەرێگەی کۆنفیدڕاسیۆنە دیموکراتییە لەبن نەهاتووەکان بەردەوام خۆی نوێکردۆتەوە و بەهێز بووە، بەگشتی لەئایینەکان بەتایبەتیش لە یەکە یەکەی مەزهەبەکانی ئایینی تاکخوداییدا دونیای ئایدیۆلۆژی خۆیانیان بونیاد ناوە و هێزە بەرهەمهێنە رەسەنەکانی ئابوورین.

هەرچەندە مێژووی دەوڵەت ـ نەتەوەی تاکانە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەوڵی زاڵکردنی دەدات، خوازیاری سەرکوتکردنی پەرەسەندنی مێژوویی هەژموونگەرایی ناوەندی

گەردوونی بێت، بەڵام ئەو ڕاستیە گەردوونییە ناگۆڕێت. مێژووی گەردوونی (جیهانی) نەبێت مێژووی بەشیش نابێت. بەمانایەکی تر مێژوو لەمیانەی کاریگەری بەشی و گەردوونی بۆسەر یەکترەوە پەرەدەسەنێت. مێژووی تاکە نەتەوە، چین و خانەدان یاخود مێژووی کەسێتییەکان ئەگەر لەچوارچێوەی جیهانیدا جێگیر نەکرێت دەرکی پێناکرێت. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری مێژووی لیبرالی خۆی وەک "کۆتایی مێژوو" ڕادەگەیەنێت، هەوڵی دووبارەکردنەوەی ئەو فێڵە دەدات کە هەر سەردەمێکی کلاسیکی هەژموونگەرایی پەنای بۆ بردووە. بەڵام مێژوو بەردەوامە. ئەوەی کۆتایی هاتووە لەوانەیە خودی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێت. ئەو سیستەمەی لەگەڵ گەیشتنی بەسەردەمی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری هیچ پەیوەندییەکی بەکۆمەڵگا و مێژووی بەرجەستەوە نەماوە لەبواری ناوەڕۆکەوە بێواتا بووە. لەبواری شێوەشەوە ڕۆژ بەڕۆژ پەرتەوازە دەبێت. لەوانەیە بۆجاری یەکەم بێت لەمێژوودا کە سیستەمی هەژموونگەرایی ناوەندی گشت یەدەگەکانی کۆتایی هاتووە و پەیتا پەیتا کرتە کرتی دێت، بەردەوام ململانێ لەگەڵ قەیران دەکات و لەکۆتایی نزیک دەبێتەوە. لەناوەڕۆکدا لەزۆر لایەنەوە دەربازکراوە. جێگای مەراقە بەو قاڵبە زرێپۆشیەوە تاکەی دەتوانێت خۆی بپارێزێت؛ توێژینەوە و ئاشکراکردنی ئەو حەقیقەتە بابەتێکی بەهادارە کە لەمیانەی بەنەبوو دانانی شوێن و کات بوونە ڕووکەشیەکەی خۆی کردووە بە ئەبەدی، یاخود لەناوچوونی جێگای باسە.

## ٢. دەسەڵات و بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیک

لە دیاردەی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگادا جیاوازی نێوان شێوەکانی دەسەڵاتگەرا و خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیک لەچارەسەرکردنی کێشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگادا گرنگە و ڕۆڵی کلیل دەبینێت. تا جیاوازییە بنەڕەتیەکانی نێوان پارادایمی هەردوو بەڕێوەبەرایەتی لێک جیا نەکرێنەوە و یەکلانەکرێنەوە، ئەوا تەواوی ئەو ڕێگەچارانەی پێشبخرێن بێکاریگەر دەبن. ئەگەر خودی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی ئازادانە دەستنیشان نەکرێت، ئەوا تەواوی کێشەکانی دیکە دواجار ڕووبەڕووی بێچارەیی بەڕێوەبەرایەتی دەبنەوە و مایەپووچ دەبن، تەنانەت سەختتربوونی کێشەکانیش لەگەڵ خۆیدا دێنێت. ئەگەر ئاماژەکردن بە نموونەیەکی مێژوویی پێویست بێت: هەڵوێستی دیکتاتۆری دەسەڵاتگەرایی سەبارەت بە دیاردەی بەڕێوەبەرایەتی ڕۆڵێکی دیاریکەری لەمایەپووچبوونی ئەزموونی سۆڤێتدا بینی. هەمان دیاردە لەژێر سەرنەکەوتنی شۆڕشەکانی دیکەشدا شاراوەیە. لەدەرەنجامی دانەبڕانی ئەو شۆڕشانە لەچەمکی بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتگەراوە یان بوونەتە دەسەڵات و خراپ بوون، یان بەتەواوەتی دیاردەی بەڕێوەبەرایەتییان بەلاوە ناوە و بەرەو ئەنارشیزمی تاکەکەسی خزاون و ژێرکەوتنیان کردووە بەناچاری. کێشەی کۆمەڵگا سەرچاوەی خۆی لەدەستدرێژیکردنی دەسەڵاتی دەوڵەتگەرا و پلەداری بۆسەر دیاردەی بەڕێوەبردن یان بەڕێوەبەرایەتی وەردەگرێت. چونکە تا دیاردەی بەڕێوەبەرایەتی دووچاری

لاقەکردن نەبێت، گومڕا و چەواشە نەکرێت چەوسانەوە و سەرکوتکردن بەدامەزراوە نابێت، ئەو دیاردانە یان سەرهەڵنادەن یان کورتخایەن و کاتی دەبن. بەو رادەیەی زەوتکردنی بەڕێوەبەرایەتی جێگای باس بێت میکانیزمی بەرفراوانی چەوسانەوە و سەرکوتکردن لەسەر کۆمەڵگاکان ئاوا دەکرێت. بەمجۆرەش وەک چیرۆکی کرانەوەی قتوەکەی پاندۆرا سەرجەم دیاردەکانی کۆمەڵگا لەناو کێشەکاندا دەخنکێن.

سیستەمی کۆمەڵگای سروشتی کە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی پلەدارییەوە تێکچوو، شانبەشانی ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆیان لەسروشت وەردەگرت، ئیتر رووبەڕووی کێشە کۆمەڵایەتییە ناوخۆییەکانیش دەبوویەوە. کێشەکانی کلتووری ماددی و مەعنەوی کۆمەڵگا قورس دەبوون. شەڕە دژوارەکانی نێوان کلان و قەبیلەکان ئاماژە بە بونیادی گرفتدار دەکەن، ئەو دەستەواژە ئیلاهی و فیکرە میتۆلۆژییە ناکۆکانەی لەدونیای زهنیەتدا دەرکەوتن لەناوەڕۆکدا گوزارشت لەکێشە کۆمەڵایەتیە زیادبووەکان دەکەن. بەشێوەیەکی سەرنج راکێش دەتوانین تەواوی ئەو دیاردانە لەکۆمەڵگای سۆمەردا چاودێری بکەین. لەراستیدا شەڕی نێوان خوداوەندەکان گوزارشت لەجەنگی بەرژەوەندی نێوان خودی خانەدانە پلەدارە هەڵکشاوەکان و بەڕێوەبەرانی دەوڵەت ـ شاردا دەکات. شێوە و نموونەی سەرەتایی ئەو کێشە کۆمەڵایەتییە دژوار و ریشەییانە پێکدێت کە لەساڵانی نێوان ٥٠٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز لە میزۆپۆتامیای خواروو و لەتەواوی کۆمەڵگا شارستانەکانی دواتر بەشێوەی پێکدادانی دەسەڵاتەکان، پاوانەکانی چەوسانەوە، ناکۆکییەکانی شار ـ لادێ و ململانێی چینایەتی ئاشنای دەبن. لێرەدا یەکەمین نموونەکانی سەرجەم شێوەکانی پێکدادان و رێککەوتنەکانی کۆمەڵگا، ئاشتی و شەڕەکانی دەوڵەت و چین لەناوەوە و دەرەوەی شار تاقی دەکرێنەوە.

لەگەڵ ئەوەی لایەنی سەرکەوتووی ئەو پرۆسەیە بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتگەرا بوو، بەڵام هیچ کاتێک کۆمەڵگا دەستبەرداری داخوازی خۆبەڕێوەبردن نەبووە، بەردەوام داواکاری خۆبەڕێوەبەرێتی بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتگەرایی بەرزکردۆتەوە. قەبیلە و خێڵەکانیش کە بەربلاوترین فۆرمی کۆمەڵگابوون لەمێژوودا، لەناوەڕۆکدا خۆبەڕێوەبەرێتییان پەیڕەو کردووە؛ لەجیاتی ملکەچکردن بۆ بەڕێوەبەرایەتییە دەسەڵاتگەرا بیانیەکان، ژیانی کۆمەڵگای رەوەندی بیابان، شاخ و کوێستانەکانیان هەڵبژاردووە. قوربوونیان رەچاوکردووە، بەڵام دەستبەرداری مافی خۆبەڕێوەبردن نەبوو، کە پێویستیەکی سەرەکی کۆمەڵگای سروشتیە. قەبیلە و خێڵەکان لەقوڵاییەوە دەرکیان بەو راستییە کردبوو کە دەستبەردان لە خۆبەڕێوەبردن مانای لەدەستدانی ناسنامە و دیل بوونە. ئەو دیاردەی بە بەرخودانی بەربەرەکان بەرامبەر بەشارەکان ناو دەبرێت، لەناوەڕۆکدا جەنگی کۆمەڵگای قەبیلەیە لەپێناو دەستبەردار نەبوونی خۆبەڕێوەبەرایەتی و بەرگریکردن لەناسنامەکەی. دەشێت بەشێوەیەکی بەربلاو تا رۆژی ئەمڕۆشمان ببینرێت. لە تابلێتەکانی سۆمەر لەمیانەی گوزارشتی سەرنج راکێشەوە هێرش و بەرخودانی قەبیلە خوریەکان (کوردی بەرایی) لەخۆرهەڵات و باکور، قەبیلە ئامۆریتەکان (عەرەبە بەراییەکان) لە خۆرئاوا بۆ سەر کۆمەڵگای سۆمەر کراون بەداستان.

کێشەی خۆبەڕێوەبردنی جڤاتەکانی قەبیلە و خێڵ لەقۆناغەکانی قەوم، نەتەوەبوون یان بەگەلبووندا بەشێوەی دیموکراسی (بەزمانی یۆنانی مانای /خۆبەڕێوەبردنی گەلە/)خۆی بەرجەستە دەکات. پێویستە دیموکراسی بە دوو سیفەتی گرنگەوە پێناسە بکرێت، یەکەمیان؛ رکابەرێتی دامەزراوەبوون و دەوڵەتبوونی دەسەڵات لەسەر گەل لەخۆوە دەگرێت. دووەمیان؛ ڕێگەی بەشداریکردنی لەخۆبەڕێوەبەرێتی پاشماوەی کۆمەڵگای نەریتی بەرفراوانتر دەکات، کلتووری گفتوگۆ و کۆبوونەوە دەکات بەدامەزراوە و شێوەی سەرەتایی پەرلەمان پێکدەێنێت. خۆبەڕێوەبردن بەسیفەتی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانە بەشداریکردنی سەرجەم یەکینە پەیوەندیدارەکانی کۆمەڵگا دەستەبەر و بەدامەزراوەیی دەکات. لەو بارەیەشەوە لەمیانەی سەیرکردنی بەڵگە نوسراوەکانەوە دەتوانین نموونە مێژووییەکەی لە دیموکراسی ئەسینادا ببینین. لەبەرئەوەی دیموکراسی ئەسینا کۆیلایەتی دەرباز نەکرد تەواو بە دیموکراسی دانانرێت. بەڵام چونکە دەوڵەتبوونی نموونەی سپارتاشی پەسەند نەکردووە بە دەوڵەتیش دانانرێت. ئەو نموونە سەرنج راکێشەی گوزەرکردن لە دیموکراسی تەواوەوە بۆ دەوڵەت سەبارەت بە دیموکراسی راستەقینە چەندین وانە دەبەخشێت و تەنانەت بۆ ڕۆژی ئەمڕۆشمان جێگای باسە. بەهاکانی وەک دیموکراسی راستەوخۆ، دەست نیشانکردنی بەڕێوەبەرێتی لەرێگای هەڵبژاردنی ساڵانە و نەبوونی هیچ جیاکاریەکی باڵاتری هەڵبژێردراوەکان، دیاردەی بەڕێوەبەرایەتی ژێر فەرمانی دیموکراسی، کلتووری کۆبوونەوە، کە بەشداریکردنی هاوڵاتیانی لە گفتوگۆ سیاسیەکاندا دەستەبەر دەکرد و لەو سۆنگەیەوە؛ پەروەردەی دەکردن؛ بەهاگەلێکن کە لەدیموکراسی ئەسیناوە وەک میراس بۆ ڕۆژی ئەمڕۆمان ماونەوەتەوە. بێگومان ئەوەی جڤاتە لەژمارنەهاتووەکانی دیکەش تێیدا ژیاون و نەنووسراون کلتوورێکی دیموکراسی هاوشێوەیە.

ئەو ئەزموونە مێژووییانەی بە کورتی ئاماژەمان بە نموونەکانیان کرد بڵاوبوونەوە و جیاوازی دیاردەی خۆبەڕێوەبردن و دیموکراسی دەخاتەڕوو. خۆی وەک شێوەیەکی بەڕێوەبردن دەناسێنێت کە نابێت بە دەسەڵات، بەمجۆرەش ڕێگا بەکێشەی کۆمەڵایەتی نادات و دەرفەت بە دەرکەوتنی چەوسانەوە و سەرکوتکردن نادات. مانەوەی بەردەوامی بێخەوشی ئەو سیفەتە بنەڕەتیانەی دیموکراسی یاخود خۆبەڕێوەبردنی دیموکراسیانە بەرامبەر بە خراپەکاری و چەواشەکاریەکانی بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵاتگەرا و دەستبەرنەدان لەو خەسڵەتانە گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. بەکارهێنانی دیموکراسی وەک دەمامکی ڕەواکردنی دەسەڵات یاخود دەوڵەت گەورەترین خراپەکارییە بەرامبەر دیموکراسی ئەنجام بدرێت. پێویستە هەرگیز دیموکراسی لەگەڵ دەسەڵات و دەوڵەت هاوتا نەبینرێت. ئەمجۆرە تێکەڵکردنە بەو رادەیەی مانای نەدۆزینەوەی ڕێگەچارەی کێشەکانی کۆمەڵگایە، بەو رادەیەش کەڵەکەی سەریەکتریان دەکات. دیموکراسی کە بەردەوام هۆشیاری سیاسی و هەستیاری ئەخلاقی کۆمەڵگاکان بەزیندوویی دەهێڵێتەوە، بواری چارەسەری راستەقینەی ئەو کێشانەیە کە دەوڵەت و دەسەڵات دەیانخوڵقێنن. ئاشنای ڕژێمگەلێکی دیکە نەبووین کە هێندەی دیموکراسی بێ پەنابردنە بەر شەڕ توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگای هەبێت. تەنیا کاتێک ژیان و بەختەوەری کۆمەڵگا لەلایەن دەوڵەت و دەسەڵاتەوە بکەوێتە

ژێر هەڕەشەیەکی کوشندەوە دیموکراسیخوازەکان بەجۆشەوە شەڕ دەکەن و بە ئاسانیش نادۆڕێن.

لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا گەورەترین هەڕەشەی سەر دیموکراسی و خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە دێت. زۆربەری دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دەمامکی دیموکراسییان پۆشیوە، وشکترین ناوەندگەرایی ئاوا دەکەن و مافی خۆبەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لەبەین دەبەن. هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبڕالیزم هەوڵدەدات ئەو سیفەتە دژە دیموکراسیەی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک "سەردەمی دیموکراسی" دەرخواردی مرۆڤایەتی بدات و نکوڵیکردنی دیموکراسی لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە بە سەرکەوتنی رژێمی دیموکراسی ناو دەبات. کێشەی راستەقینەی دیموکراسیەکان لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوەیە کە چۆن جیاوازی خۆی بخاتەڕوو، دەستبەرداری تایبەتمەندێتی هەمیشەیی و هەرەوەزی پشکداری نەبێت. ئەگەر هەژموونگەرایی دەوڵەت و دەسەڵات نەسەپێنرێت، کێشەیەکی کۆمەڵگا نییە دیموکراسی توانای چارەسەرکردنی نەبێت.

هەوڵی سۆسیالیزمی بونیادنراو بۆ چارەسەرکردنی کێشەی دەسەڵات و دەوڵەت لەرێگای ئاواکردنی دەوڵەت و دەسەڵاتەوە هۆکاری سەرەکی مایەپووچ بوونیەتی. سۆسیالیزمی بونیادنراو هیچ لێکدانەوەیەکی بۆ ئەوە نەکردووە کە دەوڵەت و دەسەڵات بریتین لەسەرمایەی کەڵەکەبوو، چەندەش کارابن بە سەرمایە و سەرمایەداری ئەنجامگیر دەبن، لەو بارەیەوە دووچاری نابینایيەکی تیۆری جددی هاتبوو. ناوەندگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەی چەند ئەوەندەی نموونە کلاسیکیە لیبڕالەکان گەورەتر کرد و لەو بڕوایە دابوو کە بە کۆمۆنیزم دەگات، بەڵام رووبەڕووی دڕندانەترین بونیادی سەرمایەداری بۆتەوە. راستینەی سۆسیالیزم بە بێ دیموکراسی بەدینایەت، ئەمەش گرنگترین ئەنجامی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو. کێشەکانی کۆمەڵی مەدەنی، مافی مرۆڤ و کەمایەتیەکان کێشەکانی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی و سەرجەم کێشە نەتەوەییە کلاسیکەکان سەرچاوەی خۆیان لە سەرکوتکردنی دیموکراسی و خۆبەڕێوەبەرایەتەکان لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە وەردەگرت، بۆ ئاراستەکردنی ئەو کێشانەش بۆ سەر رێگای چارەسەرکردن تەنیا لەمیانەی دەربازکردن و بەلاوەنانی زەمینەی زەوتکردنی ماف بەدیدێت، کە دەوڵەت ـ نەتەوە رەخساندوویەتی. ئەگەر خەسڵەتی فیدڕالی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بێت، یان ئەگەر پەیتا پەیتاش بێت پەرەپێدانی بەها دیموکراتیەکان لەلایەن یەکێتی ئەورووپاوە لەسەر بنەمای سەرلەنوێ گەڕاندنەوەی بۆ کۆمەڵی مەدەنی، تاک و کەمایەتیەکان و بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێییەکان کە لێیان زەوتکرابوو، پیشانیدەدات کە لە تیۆری و تەکتیکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی سێسەد ساڵە هەڵگەڕاونەتەوە. چونکە ئەو سێسەد ساڵە رێگای لەپێش شەڕ، تاڵان و داگیرکاری، ژینۆساید و ئاسیمیلاسیۆنێک کردۆتەوە کە لە هیچ سەردەمێکی مێژوودا نەبینراوە. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت نموونەی یەکێتی ئەوروپا هەنگاوێکی مێژوویی گەڕانەوەیە بۆ دیموکراسی. هەروەک لەنموونەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا بینرا ئەگەرێکی بەهێزە کە ئەو مۆدێلەی بۆ دیموکراسی کراوەیە تا دەچێت لەلایەن دەوڵەتان و گەلانی دونیاوە پەیڕەو دەکرێت. بەڵام وەک دەبینرێت دیموکراسی رادیکاڵی

ڕەسەن لە کیشوەرەکانی دیکەی جیهان پەرەدەسەنێت. ئەزموونی ئەمریکای لاتین، هەلوێستی ولاتە کۆنەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، تەنانەت واقیعی هیندستان و ئەفریقیاش ڕۆژبەرۆژ زیاتر گرنگی دیموکراتیزەبوون دەخاتەڕوو، پەرەسەندنەکان ناچاری ئەو ئاراستەیە دەکات.

ئەو گەورە کائیۆسەی لەناوچەکە و ولاتی سەرەکی شارستانی ناوەندی لەئارادایە لەهەموو لایەنەکانەوە و بەشێوەیەکی ڕووت مایەپووچ بوونی دەوڵەت – نەتەوە و پشکداری دەسەلات دەخاتەڕوو. ئەو کائیۆسە دەمامکی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی فەلەستین ـ ئیسرائیل، ئێراق و ئەفغانستان و دەسەلاتەکانی دامالیوە کە بناغەکەی پشت بە پێگەیشتووترین پلەدارییەکان دەبەستێت، سەرچاوە سەرەکیەکانی کێشەکان پێکدێنێت و لەهەموو لایەکەوە ڕوونی کردۆتەوە کە سەرچاوەی توندوتیژی بێ سنوور، تیرۆر، شەڕ و کۆمەلکوژیەکانە. بەپێی پێویست سەلمێنراوە کە دەوڵەت ـ نەتەوە و پشکداری دەسەلات وەک بوومەڕانگ[٣] جگە لەلێدانی خاوەنەکانیان بەهرەیەکی دیکەیان نەماوە.

لەو هەلومەرجانەدا هێزی چارەسەری دیموکراسی ڕادیکاڵ و کۆنفیدرالیزمی دیموکراتیک دەردەکەوێتە مەیدان. جوگرافیای کوردستان کە لانکەی سەردەمی بەرەبەیانی شارستانی بوو، ئەمجارە دەبێتە لانکەی بەرەبەیانی کۆنفیدڕالیزمی دیموکراتی و دیموکراسی ڕادیکاڵ و ڕاستەقینە. ڕێسایەک لەسروشتدا جێگای باسە: هەموو شتێک سەرلەنوێ لەسەر بنجی خۆی سەوز دەبێتەوە. وەک دیارە دیموکراسیش لەسەر ڕەگە شاراوەکانی نیولیتیکەوە بەشێوەیەکی تەواو سەرکەوتوو لەدایک دەبێت. ئەو لانکەیەی تا ئێستاش گورزەکانی تەواوی شارستانییە ناوەندییە هەژموونگەراکانی بەردەکەوێت، دەرفەتی گەورەکردنی کۆرپەلەی دیموکراسی هەیە. ئەو خاک و شاخانەی لەمێژە هێزی خۆبەڕێوەبردن، توانای کۆمەلگای سیاسی و ئەخلاقییان لەدەستداوە، لەوانەیە جارێکی دیکە شایەدی بۆ دەرکەوتنی "کورد" ییەکان لەبێشکە و دەستپێکردنی کاروانەکەی بکەن. لە کلتووری خۆرهەلاتی ناویندا هەموو شتێک وەک نموونەی ئەلقەکان و زنجیرەیەکە. حەقیقەتێکی کۆمەلایەتی کە لەبوارێکدا سەرکەوتنی خۆی سەلماند بێت، بەخێرایی لەبوارەکانی دیکەشدا بلاو دەبێتەوە. تەنیا لەماوەیەکی کورتی نزیکەی سی ساڵ ئیسلام بوو بە سیستەمێکی جیهان. کێشە بچووکەکەی فەلەستین سالانێکی درێژە وەک بلێیت تەواوی ناوچەکەی دیل کردووە. مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە کە لەبەرەبەیانی کوردستان، لە لانکەی ژیار گەورە دەبێت و بەئاستی ئەنجامدانی قەلەمباز گەیشتووە، گوزارشتی سیستماتیکی سەرجەم دیاردەکانی دیموکراسی ڕاستەقینە، خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە و کۆنفیدڕالیزمی دیموکراسیانەیە وەک ئەلتەرناتیفێکی بەهێز لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕۆڵ دەبینێت. لەبەرامبەر ئەو سیستەمەی ڕۆژ دوای ڕۆژ لەمیانەی وانەی

---

[٣] ئامێری بەمرەنگ (Boomerang): بریتییە لە پەلوکە دارێکی شێوە چەماوە (ملوية يان معكوفة)، خەلکی ڕەسەنی ئوسترالیا بۆ لێدانی ئامانجێک دەیهاوێژن. جۆرێک لەو بەمرەنگە هەیە کە دەهاوێژرێ بۆ هاوێژەرەکەی دەگەڕێتەوە. (وەرگێڕ)

پەندبەخشەوە مایەپووچ بوونی خۆی دەسەلمێنێت مۆدێرنیتەی دیموکراتی ئەستێرەی هەڵکشاوە.

سەرەکیترین گرفتێک کە پێویستە لەپەیوەندی نێوان خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە لەگەڵ دەسەڵات و دەوڵەت چارەسەر بکرێت، مەسەلەی چۆنیەتی هێشتنەوەی جیاوازی نێوانیان و ڕێکخستنیانە؛ بەمانایەکی دیکە چۆن دەتوانن کێشەی ئاشتی کۆمەڵایەتی چارەسەر بکەن. لەنموونە مێژوویی و هەنوکەییەکاندا دەبینین هەڵوێستەکانی یەکتری لەناوبردن تەنیا ڕێگە لەپێش گۆڕانی دەسەڵاتی دەوڵەت بۆ جانەوەر (لێویاتان) و قوڵبوونەوە و هەمیشەییبوونی قۆناغی کائیۆس دەکاتەوە. هەر ئەزموونێکی چارەسەری لەو چوارچێوەیە دابێت هەناسە لەبەر کۆمەڵگا دەبڕێت و لەناوی دەبات. مرۆڤایەتیەک کە لەپاشماوەی بێچارەییەوە ماوەتەوە و لەقالبەکانی بەکاربردن قەتیس کراوە، بووە بە مێروولە و لەژێر کۆنترۆڵی ڕەهای دەوڵەت دایە. ئەو واقیعەش لەئاکامی ئەو هێرشە سەرتاسەرییەوە پێکهاتووە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە دژی کۆمەڵگا ئەنجامیداوە، لاوازیەکانی ئەو شۆڕشگێڕییەی خەیاڵپەرستی و دەسەڵاتگەرایی دەرباز نەکردووە، بۆتە هۆکاری بەهێزبوونی زیاتری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری.

ڕێگەچارەی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە بەدوو جۆرە ڕێباز دەتوانێت بەرەنگاری ئەو بونیادە زەبەلاحانە ببێتەوە: ئەویش ڕێبازەکانی شۆڕش و ریفۆرمە. ئەزموونی مێژوویی ڕێبازی شۆڕشگێڕی کە لەسەر بنەمای ڕووخاندنی بونیادەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە، بەتایبەتیش بەتەواوی ڕووخاندنی دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەبنەما دەگرێت، ئەنجامەکەی زیاتر بەهێزبوونی دەسەڵاتگەرێتی دەوڵەت ـ نەتەوە بووە؛ لەئافراندنی کۆمەڵگایەکی دیموکراتیک، ئازاد و یەکسانیخوازدا سەرکەوتوو نەبوو. دیموکراسی ریفۆرمخوازیش لەتوانەوە لەناو مۆدێرنیتەی زاڵدا ڕزگاری نەبووە. ئەو ئەنجامەی لێیەوە بەدەست دەهێنرێت: کامە ڕێباز بەکاربهێنرێت، پێویستە بەردەوام ئەو بژارە دامەزراوەیی و واتاییانە بەرۆژەڤ و بەپەرەو بکرێت کە سیستەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتی بەرەو پێش دەبەن. پێویستە هەردوو سیستەمی مۆدێرنیتە پێشبینی ئەو خاڵە بکەن کە ناچارن بەدرێژایی سەدان ساڵ بەیەکەوە بژین، هەربۆیە ئەگەرێکی بەهێزە کە ڕێگەچارەکانی دەستووری دیموکراتیانە هەم لەناو بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەی تاکانە و هەمیش لەناو سیستەمی گەردوونی بان ـ نەتەوە پەرەپێبدەن و پەیوەندی و ناکۆکیەکانی نێوانیان دەرباز بکەن. پەرەسەندنێکی لەوجۆرە دەشێت لەجیاتی ڕابردووی نەرێنی داهاتوویەکی ئەرێنی بئافرێنێت.

## ٣. نەتەوەی دیموکرات

تێکۆشانی نەتەوەی خاوەن ئامانجی دەوڵەت و دەوڵەتی ئامانج نەتەوە هۆکاری سەرەکی واقیعی خوێناوی سەردەمەکەیە. پێکەوەگەیاندنی دەوڵەت و دەسەڵات بە نەتەوەوە

سەرچاوەی سەرەکی کێشەکانی سەردەمی مۆدێرنیتەیە. کاتێک کێشەکانی سەردەمی مۆدێرنیتە لەگەڵ ئەو کێشانە بەراورد بکەین کە سەرچاوەی خۆی لە دەوڵەتە دیکتاتۆری و خانەدانەکان وەردەگرن، دەبینن کە لە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کێشەکان سەرچاوەی خۆی لە نەتەوەی دەوڵەت وەردەگرێت و ئەو دۆخەش گەورەترین جیاوازی نێوانیان پێکدێنێت. دەوڵەت – نەتەوە کە یەکێکە لەئاڵۆزترین بابەتەکانی زانستی کۆمەڵایەتی وەک گۆپاڵێکی سیحراوی چارەسەرکردنی سەرجەم کێشەکانی دژە مۆدێرنیتە پێشکەش دەکرێت. لەناوەرۆکیشدا تاکە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی دەکات بە هەزار. هۆکارەکەشی ئەوەیە کە ئامێری دەسەڵاتی بۆ ناو دەمارە ریشاڵەییەکانی کۆمەڵگا بڵاوکردۆتەوە. خودی دەسەڵات بەرهەمهێنەری کێشەیە؛ بەهۆی کارەکتەری پۆتانسێلی سەرمایە کە بەشێوەی توندوتیژی ڕێکخراوە، بەسیفەتی سەرکوتکردن و چەوسانەوە کێشەی کۆمەڵایەتی دەخولقێنێت. کۆمەڵگای نەتەوەی هۆمۆژەن کە دەوڵەت – نەتەوە کردوویەتی بەئامانجی خۆی، تەنیا کاتێک لەڕێگای دەسەڵاتەوە تەواوی ئۆرگانەکانی بە مشار دەبڕدرێت هاوڵاتی یەکسانی ساختە (گوایە بە یاسایی) ئاوا دەکرێت. ئەو هاوڵاتییە بەگوتە و زاری یاسا یەکسانە، بەڵام وەک تاک و جڤات لەهەر بوارێکی ژیاندا لەناو زۆرترین نایەکسانی دایە.

خۆڕێکخستنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەشێوەی دەوڵەت – نەتەوە، لەڕێکخستن بەشێوەی پاوانی ئابووری زیاتر، ڕۆڵی چەوسانەوە و سەرکوتکردن دەبینێت. نەبینینی پەیوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە بەچەوسانەوە و سەرکوتکردن لەلایەن مارکسیزمەوە بەگشتیش لەلایەن سۆسیۆلۆژیاوە یاخود پێشکەشکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک بونیادێکی ئاسایی سەرخان کەموکوڕیەکی سەرەکی و شێواندنە. کاتێک شیکاری چین و سەرمایەی مادی سەربەخۆ و دابڕاو لەدەوڵەت ـ نەتەوە ئەنجام بدرێت، دەبێتە گشتگیریەکی دەرهەست (مجرد) کە کاتی بەسەرچووە و ئەنجامێکی کۆمەڵایەتی لێناکەوێتەوە. ئەو دەرهەستکردنە لەژێر سەرنەکەوتنی سۆسیالیزمی بونیادنراودا شاراوەیە؛ بە واتایەکی تر دەرەنجامە گرێدراوەکانی ئەو دەرهەستکرنە ڕۆڵی لەو ژێرکەوتنەدا هەبوو.

وەک دەستەواژە نەتەوە شێوەگرتنێکی کۆمەڵگایە کە دوای پێکهاتەکانی قەوم، گەل و میللەتی ئەو کلان، قەبیلە و خێڵانە دێت کە سەرچاوەیان لە پەیوەندی خوێن و خزمایەتی گرتووە و زیاتر لەمیانەی لێکچوونی زمان و کلتوور خۆی فۆرمێل دەکات. بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگای قەبیلە و قەوم کۆمەڵگا نەتەوەییەکان بەرفراوانترن و قەبارەیان مەزنترە، هەربۆیەش جڤاتگەلی مرۆڤانێکن کە بەپەیوەندی نەرمەوە بەیەکتر گرێدراون. کۆمەڵگای نەتەوەیی زیاتر دیاردەیەکی سەردەمەکەمانە. ئەگەر پێناسەیەکی گشتی بۆ بکرێت، دەتوانرێت بگوترێت؛ جڤاتی ئەو کەسانەیە کە خاوەن زهنیەتێکی هاوبەشن. واتە دیاردەیەکە لەبواری زهنیەتدا بوونی هەیە. لەو سۆنگەیەوە؛ بوونێکی دەرهەست و خەیاڵییە. دەشێت ئەمە بەنەتەوەیەک ناوببەین کە لەسەر بنەمای کلتووری پێناسە کراوە. لەبواری سۆسیۆلۆژیشەوە ئەوە پێناسەیەکی ڕاستە. سەرباری جیاوازی چینایەتی، ڕەگەزی، ڕەنگی پێست، بنەچەی ئەتنیکی بگرە نەتەوەش، بەشێوەیەکی گشتی پێکهاتنی

جیهانی زهنیەت و کلتووریکی هاوبەش بۆ نەتەوەبوون بەسە. لەپێناو سۆفیستیکەکردنی ئەو نەتەوەی خاوەن پێناسەی گشتی نەتەوۆچکەی لەجۆری نەتەوەی ـ دەوڵەت، نەتەوەی یاسا، نەتەوەی ئابووری و نەتەوەی ـ سوپا (میللەت ـ سوپا) ن کە بەسەر نەتەوەی گشتیدا زاڵ دەکرێت، پۆلێنی جیاوازترن. دەشێت ئەوانە بەنەتەوەی هێزیش ناوببرێن. بوون بە نەتەوەی بەهێز ئایدیالی سەرەکی مۆدێرنیتەی سەرەتاییە. چونکە نەتەوەی بەهێز جیاکاری سەرمایە، بازاڕی بەرفراوان، دەرفەتی داگیرکاری و ئیمپریالیزم بەرهەم دێنێت. لەو سۆنگەیەوە؛ لەقەڵەم نەدانی ئەو نەتەوە قایمکراوانە بە تاکە مۆدێلی نەتەوە، تەنانەت شیکارکردنیان وەک نەتەوە شوڤێنیەکانی هێز کە لەخزمەتی سەرمایەدان گرنگ و بایەخدارە. بەهۆی ئەو سیفەتەیانەوە دەبن بە سەرچاوەی کێشەکان. نەتەوەی دیموکرات؛ کە دەشێت لە نەتەوەی کلتووریش بەرهەم بهێنرێت، ئەو مۆدێلەیە کە سەرکوتکردن و چەوسانەوەی لغاو کردووە و توڕیداون. نەتەوەی دیموکرات نزیکترین نەتەوەیە لەئازادی و یەکسانیەوە. بەگوێرەی ئەو پێناسەیەش ئەو کۆمەڵگایانەی پەیجووری ئازادی و یەکسانین چەمکی نەتەوەی نموونەیین.

تاوتوێ نەکردنی جۆری نەتەوەی دیموکرات لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئەو زانستە کۆمەڵناسییەی ئیلهامی لێوەرگرتووە پێویستیەکی بونیادەکەی و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیەکەیەتی. نەتەوەی دیموکرات تەنیا بە هاوبەشێتی کلتوور و زهنیەت سنووردار نابێت، بەڵکو نەتەوەیەکە سەرجەم ئەندامەکانی لەدامەزراوەکانی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە دەکاتە یەک و بەڕێوەیان دەبات. ئەوە لایەنە دیاریکەرەکەیەتی. شێوازی بەڕێوەبەرێتی سەربەخۆ و دیموکراتیانە مەرجی سەرەکی نەتەوەبوونی دیموکراتیکە. لەو لایەنەوە ئەلتەرناتیڤی دەوڵەت – نەتەوەیە. لەجیاتی بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەت بەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانە توانا و دەرفەتێکی گەورەی ئازادی و یەکسانییە. سۆسیۆلۆژیای لیبراڵ لەبنەڕەتدا نەتەوە لەگەڵ دەوڵەتێکی بونیادنراو یان لەگەڵ بزووتنەوەیەک یەکسان دەکات کە ئامانجی ئاواکردنی دەوڵەتە. تەنانەت ئاراستەگرتنی سۆسیالیزمی بونیادنراویش بەدوای ئەو مەیلەدا هێزی ئایدیۆلۆژیای لیبراڵیزم پیشان دەدات. مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیڤی تایبەت بەنەتەوەی دیموکرات مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەیە. ئابووری دوور لە پاوانخوازی، ئیکۆلۆژیای تەبا لەگەڵ دەوروبەر، تەکنۆلۆژیای دۆستی مرۆڤ و سروشت بناغەی دامەزراوەیی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەیە، لەو سۆنگەیەوە؛ بناغەی دامەزراوەیی نەتەوەی دیموکراتیشە.

دیاردەکانی بازاڕ و وڵاتی هاوبەش کە وەک مەرج بۆ کۆمەڵگا نەتەوەییەکان دانراوە، وەک دوو فاکتەری ماددی بەسیفەتە دیاریکەرەکانی نەتەوە دانانرێن. بۆ نموونە یەهودییەکان کە بۆماوەیەکی درێژخایەن بێ نیشتیمان مابوونەوە لەمێژوودا وەک بەهێزترین نەتەوە لەتەواوی گۆشە دەوڵەمەندەکانی دونیادا ژیاون، وێڕای ئەوەی بازاڕێکی نەتەوەییان نەبوو، بەڵام توانیان ببن بە بەهێزترین تاکە نەتەوەی بازاڕەکانی جیهان. بێگومان وڵات و بازاڕ دوو ئامرازی بەهێزی خۆ قایمکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەن. خوێناویترین و زۆرترین شەڕەکانی جیهان لەپێناو نیشتیمان و بازاڕ روویان داوە. نیشتیمان وەک

موڵک، بازاڕیش وەک بواری بەدەستهێنانی قازانج زۆر گرنگ و بەهادارن. چەمکی نیشتیمان و بازاڕ لەلای نەتەوەی دیموکرات جیاوازترە. نەتەوەی دیموکرات نیشتیمان بەهادار دەبینێت، چونکە توانا و دەرفەتێکی گەورەی کلتوور و زهنیەتی نەتەوەیە؛ بیر لە کلتوور و زهنیەتێک ناکرێتەوە کە جێگای خۆی لە یادەوەریەکەیدا نەگرێت، بەڵام پێویستە لەبیرنەکرێت دەستەواژەی وڵات ـ نیشتیمان، کە مۆدێرنیتە پیرۆزی کردوون، کاتێک لەجیاتی کۆمەڵگا لەپێشینەیی پێدەدات، ئامانجی بەدەستهێنانی قازانجە. زلنەکردنی نیشتیمانیش گرنگە. چەمکی "هەموو شتێک لەپێناو نیشتیمان"سەرچاوەی خۆی لەچەمکی نەتەوەیی فاشیستەوە دەگرێت. بەختکردنی هەموو شتێک لەپێناو کۆمەڵگایەکی ئازاد و نەتەوەیەکی دیموکرات ماناداترە. پێویستە ئەمەش نەگەیەنرێتە ئاستی پەرستنەوە. ئەوەی بنەڕەتییە بەهادارکردنی ژیانە. بۆ ژیانی تاک و نەتەوە نیشتیمان خەیاڵێک نییە، بەڵکو تەنیا ئامرازێکە. وێڕای ئەوەی نەتەوەی دەوڵەت بەدوای کۆمەڵگای هۆمۆژەنەوە وێڵە، بەڵام نەتەوەی دیموکرات زیاتر لەجفات و گروپە جیاوازەکان پێکدێت. جیاوازییەکان بەدەوڵەمەندی دادەنێت. هەڵبەتە خودی ژیانیش لەمیانەی جیاوازیەکانەوە بەدیدێت. دەوڵەت ـ نەتەوە کە کۆمەڵگا ناچاری چەشنە هاوڵاتیەکی لێکچوو دەکات وەک بڵێی لەتۆڕنە دراون؛ لەو لایەنەشەوە پێچەوانەی ژیانە و لەگەڵیدا ناکۆکە. ئافراندنی مرۆڤی ڕۆبۆتیش دوا ئامانجیەتی. بەو لایەنەیەوە لەراستیدا بەرەو هیچبوون دەچێت. ئەندام و هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکرات جیاوازە، ئەو جیاوازییەی خۆیشی لەجفاتە جیاوازەکان وەردەگرێت. بوونی نەتەوە و خێڵیش هەریەکەیان دەوڵەمەندییەکن بۆ نەتەوەی دیموکرات.

لەگەڵ ئەوەی زمانیش هێندەی کلتوور بۆ نەتەوەبوون گرنگە، بەڵام مەرجێکی ناچاری نییە. هەبوونی زمانی جیاواز لەبەردەم ئەندامبوون لە نەتەوەیەک کۆسپ نییە. وەک چۆن دەوڵەتێک بۆ هەر نەتەوەیەک پێویست نییە ئەوا یەک زمان یان تەنیا شێوەزارێکیش بۆ هەر نەتەوەیەک پێویست نییە. لەگەڵ ئەوەی زمانی نەتەوەیی پێویستە، بەڵام مەرجێک نییە کە بێ ئەو نەبێت. دەشێت زمان و شێوەزاری جیاوازیش بەدەوڵەمەندێتی نەتەوەیەکی دیموکرات دابنرێت. بەڵام دەوڵەت ـ نەتەوە بەشێوەیەکی وشک سەپاندنی یەک زمان بەبنەما دەگرێت. بەئاسانی دەرفەت بە فرە زمانی نادات، بەتایبەتیش دەرفەت بەفەرمیبوونی فرە زمانی نادات. لەو لایەنەوە هەوڵدەدات کەڵک لەجیاکاریەکانی نەتەوەی زاڵ وەربگرێت.

لەو هەلومەرجانەی نەتەوەی دیموکرات پەرەی نەسەندووە و دەوڵەت – نەتەوەش ناتوانێت کێشە چارەسەر بکات وەک ڕێککەوتن و چەمکێک دەشێت باس لە نەتەوەی یاسا بکرێت. ئەو ڕێگەچارەیەی لەمیانەی هاوڵاتێتی دەستووریەوە باس دەکرێت لەبنەڕەتدا ئەو ڕێگەچارەیە کە لەسەر بنەمای نەتەوەی یاسایە. هاوڵاتێتی یاسایی وابەستە بە گەرەنتی دەستووریەوە جیاوازی نەژاد، ئەتنیک و نەتەوە بەبنەما ناگرێت. ئەو چەشنە خەسڵەتانە ماف نائافرێنێت. بەم لایەنەوە نەتەوەی یاسا پۆلێنێکی پێشکەوتووە. بەتایبەتیش نەتەوەکانی ئەورووپا لەنەتەوەکانی میللەتەوە بەرەو نەتەوەکانی یاسا دەگۆڕێن و پەرەدەسێنن. لەنەتەوە دیموکراتەکان خۆبەڕێوەبەرێتی، لەنەتەوەی یاساشدا ماف بنەمایە و مەرجە. لەدەوڵەتی نەتەوەشدا بەڕێوەبەرایەتی دەسەڵات یەکلاکەرەوەیە. مەترسیدارترین

جۆری نەتەوە زهنیەت و دامەزراوەبوونی "میللەت ـ سوپا"یە. هەرچەندە لەڕووخساردا وەک نوێنەرایەتی نەتەوەی بەهێز خۆی بنوێنێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا زهنیەتێک لەخۆ دەگرێت کە دەگاتە فاشیزم، بەردەوام ئەرک دەسەپێنێت و ژیان لەناویدا زەحمەتە. نەتەوەی ئابووریش پۆلێنێکی نزیک بەدەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەم چەمکەی نەتەوە، کە لە وڵاتانی ئەمریکا، ژاپۆن و تەنانەت لە ئەڵمانیاش ڕۆڵی سەرەکی بە ئابووری دەدەن، لە رابردووی ئەوروپا بەهێزتر بوو. هەرچەندە جۆری نەتەوەی سۆسیالیستیش هەوڵی تاقیکردنەوەی دراوە، بەڵام ناتوانین باسی سەرکەوتنی بکەین. ئەمە نموونەی نەتەوەیەکە تاڕادەیەک لە کوبا دەبینرێت. بەڵام ئەو نموونەیەی نەتەوەش شێوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی دەوڵەت – نەتەوەیە؛ شێوەی دەوڵەت – نەتەوەی سەرمایەداری دەوڵەتە کە لەجێگای دەوڵەت – نەتەوەی سەرمایەداری تایبەت ئاواکراوە.

کاتێک تیۆری نەتەوە جێگای باس بێت، ئەو بابەتەی پێویستە بەبایەخەوە رەخنە بکرێت واقیعی پیرۆزکردن و ئیلاهی کردنی نەتەوەیە. لەجیاتی ئایین و خوداوەندی باو، مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خودی خوداوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئافراند. ئەو مەسەلە زۆر گرنگە. ئەگەر ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم) وەک ئایینی دەوڵەت ـ نەتەوە راڤە بکەین ئەوا خودی دەوڵەت ـ نەتەوەش وەک خوداوەندی ئەو ئایینە دەرکی پێدەکرێت. خودی دەوڵەت لەسەردەمی مۆدێرنیتە بەشێوەیەک ئاواکراوە کە ناوەڕۆکی تەواوی دەستەواژە ئیلاهیەکانی چاخی ناوین، تەنانەت چاخی کۆنیش لەخۆوە بگرێت. ئەو دیاردەیەی بە "دەوڵەتی عەلمانی" ناو دەبرێت بەرجەستەکردن و بونیادنانی پوختە یاخود تەواوی شێگەلە ئیلاهیەکانی چاخی یەکەم و ناوینە بەشێوەی دەوڵەت. پێویستە لەو لایەنەوە فریو نەخۆین و بەهەڵەدا نەچین. کاتێک جیلوەی عەلمانیی یاخود دەوڵەت ـ نەتەوەی هاوچەرخ رامالین دەوڵەتی ئیلاهی چاخەکانی یەکەم و ناوینی لەژێردا دەردەکەوێت. رایەڵەیەکی زۆر توند و بەهێز لەنێوان دەوڵەت و ئیلاهیبوون لەئارادایە. بە هەمانشێوە پەیوەندییەکی بەهێز لەنێوان پاشایەتی هەڵکشاوی چاخەکانی یەکەم و ناوین لەگەڵ دەستەواژەی خوداوەند جێگای باسە. کاتێک وەک کەس لەدوای چاخی ناوین پاشا کاریگەری خۆی لەدەستدا و دوای دامەزراوەبوونی مۆنارشی و گۆڕانی بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی، پاشا ـ خوداوەندیش جێگای خۆی بۆ خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە بەجێهێشتووە. لەو سۆنگەیەوە؛ هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری – کە دەرفەت بە بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج دەدات – لەژێر دەستەواژە پیرۆزکراوەکانی نیشتیمان، نەتەوە و بازاڕ و پیرۆزکردنی دامەزراوەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا شاراوەیە. بەو رادەیەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ئەو دەستەواژانەی پەیوەست بە نەتەوە بکات بە ئایین یاسای زۆرترین قازانج رەوا دەکات و بەمجۆرەش پەیرە دەکرێت.

لەو سەردەمەدا بەدەنگێکی بڵند هوتافدانی دروشم و سیمبوڵەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی لەجۆری یەک ئاڵا، یەک زمان، یەک وڵات، یەک دەوڵەت و دەوڵەتی ناوەندی کە گوێی مرۆڤ کەڕ دەکەن، هەستیاری بینینی رەنگە جیاوازەکانی ئاڵای دیکە و بچووک بینینیان، مۆنۆلیتککردنی دونیای زهنیەت و سەقەتکردنی، شەکاندنەوەی شۆڤینیزمی نەتەوەیی لەهەر

چالاکیەکدا، بەتایبەتیش لەچالاکیە هونەری و وەرزشیەکاندا و گەیاندنی بەئاستی سرووت، پێویستە وەک عیبادەتی ئایینی میللیگەرایی راڤە بکرێت. لەراستیدا عیبادەتی چاخەکانی پێشووتریش هەمان رۆڵیان دەبینی. ئامانجی سەرەکی لێرەدا دەستەبەرکردنی بەرژوەندی پاوانەکانی دەسەلات و چەوسانەوەیە، ئینجا ئەمە بەرێگای شاردنەوە بێت یان پیرۆزکردن و رەوا کردنیەوە. ئەگەر لەژێر ئەو پارادایمە سەرەکیەدا تەواوی هەڵوێست و رەفتارە زێدەرۆ و پەردە پۆشکەرەکانی رۆژی ئەمڕۆمان راڤە بکەین، ئەوا بەشێوەیەکی راستتر دەرک بەواقیعی کۆمەڵگا دەکەین.

نەتەوەی دیموکرات مۆدێلی نەتەوەیەکە کەمترین رادەی ئەو نەخۆشیانە بەخۆوە دەبینێت. بەڕێوەبەرێتی وەک دیاردەیەکی سادە لە خزمەتی ژیانی رۆژانە دایە. کاتێک پێویستیەکانی جێبەجێ بکرێت، ئەوا هەرکەسێک وەک فەرمانبەر دەتوانێت ببێتە کارگێڕ و بەڕێوەبەر. بەڕێوەبەرێتی بەهادارە، بەڵام پیرۆز نییە. چەمکی ناسنامەی نەتەوەیی جەمسەرەکانی کراوەیە؛ وەک ئەندامێتی و باوەڕمەندێتی ئایینێکی داخراو نییە. ئینتیمابوون یان ئەندامبوون لەنەتەوەیەک نەجیاکاری و نەکەموکوڕی، هیچ یەکێکیان نییە. دەشێت ئینتیمای چەند نەتەوەیەک بێت. بەمانایەکیتر دەشێت نەتەوەی جیاوازی تێکەڵ بەیەکتر لەئارادابێت. ئەگەر نەتەوەی دیموکرات لەگەڵ نەتەوەی یاسایی رێکبکەوێت بەئاسانی دەتوانن بەیەکەوە بژین. وێڕای ئەوەی وڵات، ئاڵا و زمان بەهادارن، بەڵام پیرۆز نین. لەجیاتی دژایەتی وڵاتی هاوبەش، زمان و ئاڵاکان بە یەکەوە لەسەر بنەمای دۆستایەتی هاوبەش بەکاربێنن و ژیانداری بکەن؛ نەک تەنیا دەرفەت و زەمینەی هەیە، بەڵکو لەهەمانکاتدا پێویستیەکی ژیانی کۆمەڵگای مێژووییە. بەتەواوی ئەو تایبەتمەندێتیانەیەوە دیاردەی نەتەوەی دیموکرات وەک ئەلتەرناتیڤە بەهێزەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئامرازە هارەکەی شەڕی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەتوانێت سەرلەنوێ جێگای خۆی بگرێت.

ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی نەتەوەگەرایی دەوڵەت پارچە پارچەی کردوون، مۆدێلی نەتەوەی دیموکرات کە مۆدێلێکی چارەسەرکردنە سەرلەنوێ دیموکراتیزەیان دەکات؛ کارەکتەرێکی لێبووردەیی، ئاشتیخواز و تەبا بە ناسنامە جیاوازەکان دەبەخشێت. پەرەسەندنی نەتەوەی دەوڵەت بەرەو نەتەوەی دیموکرات دەستکەوتی گرنگ لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بەر لەهەموو شتێک مۆدێلی نەتەوەی دیموکرات لەرێگای مەعریفەیەکی راستی کۆمەڵگاوە ئەو هەستە کۆمەڵایەتیانەی بەتوندوتیژی بار کراون نەرم دەکاتەوە و دەیانکات بەهەستێکی مرۆییانە (ئەو مرۆڤەی هاوسۆزی ژیری و سۆزی هەیە). بێگومان ئەگەر بەتەواویش ئەو پەیوەندیانەی چەوسانەوە لەناو نەبات کە توندوتیژی لەخۆوە دەگرن زۆر کەمی دەکاتەوە، دەرفەتی کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسانتر دەرەخسێنێت و دواتر ئەنجامی دەدات. تەنیا بەدەستەبەرکردنی لێبووردەیی و ئاشتی ناوخۆیی ناوەستێت، لەهەمانکاتدا هەڵوێستە بارکراوەکان بەچەوسانەوە و سەرکوتکردنی نەتەوەکانی دیکەی دەرەوە دەرباز دەکات و بەرژەوەندی هاوبەش بۆ سینارۆی دەگۆڕێت و ئەو رۆڵەی خۆی جێبەجێ دەکات. کاتێک دامەزراوە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان بەگوێرەی بونیادە سەرەکییەکانی دامەزراوەیی و زهنیەتی نەتەوەی دیموکرات سەرلەنوێ ئاوابکرێتەوە، ئەو کاتە دەرکی

پێدەکرێت کە مۆدێرنیتەیەکی نوێ واتە نەک لەبواری تیۆری بەڵکو دەرەنجامە کرداریەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لە ئاستی رێنسانسدا دەبێت. مۆدێرنیتەی دیموکراتی و نەتەوەی دیموکراتی پێکهێنەری بناغەکەی ئەلتەرناتیڤی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین؛ ئەو کۆمەڵگا ئابووری، ئیکۆلۆژی و ئاشتیخوازەیە کە لەناوەوە و دەرەوەی نەتەوەی دیموکراتدا هۆنیویەتەوە.

لەرۆژی ئەمڕۆماندا لەجیاتی دەوڵەت ـ نەتەوە و یەکێتییە هەرێمی و جیهانییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەتایبەتیش UN، کە بێناوەڕۆکن یاخود بێناوەڕۆک کراون، بەخێرایی ئاواکردنی ئەو نەتەوە دیموکراتانەی خاوەن کارەکتەری باڵای چارەسەرکردنی کێشەکانن؛ کە تەنیا جێگرەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی یەکانە و دۆخە وەرچەرخاوەکەی نین، بەڵکو شێوەیەکی تێکەڵی پەرەپێدراوی مۆدێلە هەرێمی (تا رادەیەک یەکێتی ئەوروپا لەسەر ئەو رێگایە) و جیهانگیریەکەیەتی؛ ئەمەش راستترین، ئەخلاقیترین و سیاسیترین رێگای رزگاربوونە لەقەیرانی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری.

## ٤. سۆسیالیزم و سەرمایەداری

بەرامبەر بەو تاکخوازییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر کۆمەڵگایدا دەسەپاند بەرگریکردن لەکۆمەڵگابوون و بەستنەوەی بە داواکاریەکانی ئازادی و یەکسانی تێگەیشتنی سەرەکی ئۆتۆپیایی سۆسیالیزمی کلاسیک بوو. ئەو ئامەزرۆییە باوەی بەرامبەر کۆمەڵگا، ئازادی و یەکسانی لەئارادا بوو، لەگەڵ ئاوێتەبوونی سەرمایەداری بە تایبەتمەندێتی هەژموونگەرایی‌یەوە بەهێزتر بووە. لەگەڵ پەرەسەندنی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزم، ئۆتۆپیا کۆمەڵایەتیەکان بەزانستی پەرەسەندوو کاریگەر بوون و خۆیان بەسۆسیالیست راگەیاند. گۆڕینی یان خزینی هەژموونگەرایی سیستەمی شارستانی ناوەندی چاخی نوێ ئەنجامی تێکۆشانی درێژخایەنی بزاوتی بەشاربوونی ئەوروپای خۆرئاوایە. لەسەدەی شازدەهەمدا خزینی جددی هەژموونگەرایی شارستانی دەست وڵاتە ئیسلامیەکان، چین و هیندستان خێراتر بووە. هەرسکردنی کلتووری ناوەندە کۆنەکانی شارستانی لەلایەن کلتووری شارەکانی ئەوروپای خۆرئاوا رۆڵێکی سەرەکی لەمەدا دەبینێت.

بەپێچەوانەی مەزەندەکان شارستانی ئەوروپای خۆرئاوا بەهۆی توانای چارەسەری و هێزی کلتووری کرستیانی نەبوو، بەڵکو پابەندی لێکەڕینی کلتووری نوێیە بەهۆی ئەو بێچارەییەی بەرامبەر پێویستیەکانی ژیانی نوێی شار لە ئارادایە. بەرامبەر بە پەرەسەندنەکانی سەدەی شازدەهەم کرستیانی تەنیا لەرێگای ریفۆرمەوە توانی درێژە بەخۆی بدات. نەتەوەییبوونی کلێسا گۆڕانکاریەکی رواڵەتی بوو نەک گەوهەری. کلتووری ئیسلامی خۆرهەڵاتی ناوین و شارستانیەکانی چین و هیندستان سەرچاوە بنەڕەتیەکانی بوون. ئەو گواستنەوەیەی لەو ناوەندانەوە ئەنجامدرابوون، بە شۆڕشەکانی ئابووری ئینگلیز، سیاسی و کۆمەڵایەتی فەڕەنسی ئەنجامگیر بوو کە لەکۆتاییەکانی سەدەی

هەژدەهەم دەستی پێکرد. بێگومان چەندین فاکتەری دیکەش ڕۆڵیان لەمەدا بینیوە. هەرچەندە دۆزینەوە و داهێنانەکان شتی نوێش لەخۆوە بگرن، لەدوا شیکاردا ئەگەر گواستنەوەی کلتووری ناوەندەکانی شارستانی کۆن نەبێت خزانی هەژموونگەرایی جێگای باس نەدەبوو. بێگومان لەڕێگای بزاوتەکانی ڕێنسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەرییەوە ئەورووپا توانایەکی گەورەی سەنتێز و نوێبوونی پیشانداوە. لەسەردەمەکانی پێشووتری مێژووودا ئەو چەشنە بزاوتە گەورانە لە هیلالی بەپیت، میزۆبۆتامیای خواروو، خۆرهەڵاتی دەریای سپی و کەنارەکانی ئیجەشدا دەبینین. لەراستیدا دوا گەورە ئەڵقەی سیستەمی شارستانی ناوەندی کە بەریزە لەو ناوەندە مێژووییانە پێکهاتوون لە کەنارەکانی ئەورووپای خۆرئاوا بناغەکەی دانراوە. شارستانی شارەکانی ئیتالیا ڕۆڵێکی دیاریکەریان لەمەدا بینیوە.

ئەوەی سەبارەت بە بابەتەکەمان گرنگە؛ ئەو شارستانییە نوێیە واتە گرنگی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەوە دایە کە دونیابینی زانستی نوێی خستۆتە ژێر هەژموونگەرایی خۆیەوە. زانستی نوێی براگماتیک لەجیاتی زهنیەتە بەبنەڕەت ئایینی و تەنانەت فەلسەفیەکانیش جێگیر کراو بوو بە بەهایەکی هەڵکشاو. شۆڕشی زانستی کە لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم پەرەیسەند بوو بە تەواوکەری شۆڕشە سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی دیکە. هەروەها جیاوازیەکی ریشەیی لەنێوان زانستە فیزیاییەکانی ئەزموونگەری و زانستەکانی پەیوەست بەسروشتەوە ئەنجام دران. لەناو خۆیاندا چەندین بواری پسپۆڕی و لقەکانی زانستی جیابوویەوە. هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی لیبرالیزمیش لەلێدانی مۆرکی خۆی لەزانستە کۆمەڵایەتیەکان درەنگ نەکەوت. ئەنجامە ئەرێنیەکانی شۆڕشی لەژێر پاوانی خۆیدا مالی کرد و لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی خۆیدا گونجاندنی. بەپێشەنگایەتی ک. مارکس و ف.ئەنگلس لەناوەراستی سەدەی نۆزدەهەمدا خۆراگەیاندنی ئۆتۆپیای سۆسیالیستی بەشێوەی سۆسیالیزمی زانستی لەژێر کاریگەری زانستگەرایی لیبرالیزمدا ڕوویدا. هەڵبەتە ک.مارکس و ف.ئەنگلس بوودڵیان لەراگەیاندنی ئەو خاڵەش نەکرد کە سۆسیالیزمە زانستیەکەیان بریتییە لە سەنتێزێکی فەلسەفەی ئەڵمانی، ئابووری - سیاسی ئینگلیز و سۆسیالیزمی فەرەنسی.

وێرای بانگەشەکانی زانستیبوون و رەخنەکانیان، ئەزموونگەلێکی زۆر لەسەرووی هەمووشیانەوە سۆسیالیزمی بونیادنراوی ڕووسیا و چین خستوویەتیە ڕوو کە تەواو هێزی دەربازکردنی بونیادەکانی کلتووری ماددی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دونیا زانستی و زهنیەتەکەی پیشان نەداوە. ناشێت بانگەشەیەکی بەمجۆرە بکرێت کە تەواوی شۆڕشە سۆسیالیستیەکان تێکشکان و مایەپووچ کران. نکوڵی ناکرێت کە ئەو شۆڕشانە میراسگەلێکی مەزنیان بەجێهێشتووە، تا ئێستاش فاکتەرێکی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی ڕۆژانە و هیوا بەخشترین هێزی دونیای زهنیەتە. بەڵام جیاوازی مۆدێرنیتە و شارستانی ئەلتەرناتیڤیان مسۆگەر و جێگیر نەکرد. تا رادەیەکی مەزن لەناو مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا توانەوە. لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا بەپێی پێویست ئاشکرابووە کە ئەو واقیعە قەدەرێک نییە، بەڵکو گرێدراوی ئەو کێشانەیە کە سۆسیالیزمی سەردەمی سەرمایەداری چارەسەری نەکردوون.

لەگەڵ دەرکەوتنی سەرمایەداری پیشەسازی ئەو گفتوگۆیانەی پەیوەست بەکۆمەڵگاوە ئەنجامدران گرنگە. لەو سەردەمەدا هەوڵدەدرێت ئۆتۆپیا سۆسیالیستیەکان لەسەر بناغەیەکی زانستی و ڕێبازێکی چالاکی جێگیر بکرێت. بەڵام فیکری ڕۆشنگەری لەژێر هەموویاندا شاراوەیە کە دابڕانێکی ریشەیی لەگەڵ رابردوودا کردووە. لەبەر ئەوەی هزری ڕۆشنگەری دەربازکردنی دیالیکتیکیانەی رابردوو نییە، بەڵکو پەیوەندی بەدابڕانی ریشەیی لەرابردووەوە هەیە، بۆیە بەشێوەیەکی بەهێز کاریگەری کردۆتە سەر دووسەد ساڵەکەی دواتر. هەر دیاردەیەک وەک بڵێیی تازە بونیاد دەنرێت، بەجۆرێک تاوتوێ دەکرێت کە هیچ پەیوەندییەکی بەرابردوو و نەریتەوە نەبووە. بگرە هەر شتێکی پەیوەست بەرابردوو دەکرێتە بابەتی هەڵسەنگاندن و شیکارە نەریتییەکان. هەرچەندە وەک پێویستیەکی دونیابینی ئەو هەڵوێستە هۆکاری مایەی تێگەیشتنیشی هەبێت، بەڵام ئاشکرایە کە راستی کۆمەڵگا بە شێوێنراویەوە پێشکەش دەکات. بێگومان توانست و توانای حەقیقەتی هزری ڕۆشنگەری لەزۆر لایەنەوە لەهزرەکانی چاخی پێشووتر باڵاترە. ئەگەر وەها نەبووایە، نەیدەتوانی سەردەمی نوێ بئافرێنێت. ئەو دۆخەش مانای لەخۆوەگرتنی تەواوی حەقیقەت نابەخشێت. بەڵام بانگەشەی تەواوی ئەوانەی پێشووتر بەو ئاراستەیە بوون. کێشەکانیش سەرچاوەی خۆیان لەو بانگەشەیە وەردەگرت. دەشێت هیگل وەک گەورە فەیلەسوفی هزری ڕۆشنگەری پێناسە بکرێت کە هەمواری کردۆتەوە. وەک چۆن لەمێژووی کۆمەڵگا شوێنی شایستەی پێداوە، ئاماژەی بەو خاڵەش کردووە کە هێشتا هێزی دەربازکردنی فەلسەفەی زانستی نییە.

کارل مارکس کە بەهیگل کاریگەر بووە لەو بڕوایە دابوو کە لەمیانەی ماتریالیزمەوە لایەنە بەهێز و ئایدیالیستە زێدەڕۆییەکەی فەلسەفەکەی دەرباز دەکات و لەولایەنەشەوە بەپرەنسیپ بووە. جیاوازی نێوان ئایدیالیزم ـ ماتریالیزم گرنگ نییە، ئەوەی لێرەدا کێشەیە تێنەگەیشتنی ئەو راستیەیە کە لەناوەڕۆکدا هەردووکیان تایبەتمەندێتی میتافیزیای ئایدیالیستی لەخۆوە دەگرن. لەو بڕوایە دابوو کە دوو فەلسەفەی دژ پەیڕەو کراوە. لێرە لە هیگل زیاتر مارکس لە ژێر کاریگەری ڕێبازی ڕۆشنگەری دایە. لەدەربازکردنی رابردوو زیاتر مارکس رابردووی بەبێ حوکم لەقەڵەمداوە یان وەک دیمەن و تارمایی هەڵیسەنگاندووە. دەرکی بەو خاڵە نەکردووە کە بەهەموو قورساییەکییەوە رابردوو "ئێستا" یە. لەو بارەیەوە لە هیگل لاوازترە و بێ ئامادەکارییە. لەدوا ساڵانی تەمەنیدا (١٨٨٠ـ١٨٨٣) هەستی بەو کەموکوڕی و هەڵەیە کرد، دەکرێ بگوترێت هەستی بەگرنگی کۆمەڵگای کۆمینالی کۆن و دیاردەی دەوڵەت کرد کە بەسەرخان ناودەبرێت. پەیوەندی بەرامبەر کۆمەڵگای خۆرهەڵات زیادی کردووە. هەندێک راستکردنەوەی لەهزری خۆیدا ئەنجامداوە. بەڵام بەدرێژایی مێژوویی سۆسیالیزمی بونیادنراو ڕێبازی ڕۆشنگەری بەسەر مارکسیزمدا زاڵ بووە. هەڵەی سەرەکی ئەو مێژووە ئەوە بوو: لەو بڕوایە دابوون کە کۆمەڵگای نوێ یاخود کۆمۆنیزم بەشێوەی دەربازکردنی تەواوی سەرمایەداری یاخود کۆمەڵگای سەرمایەداری بەدیدێت، تەنانەت لەئاستی زانستدا ئەوەیان بە "سۆسیالیزمی زانستی" ناوبردووە.

خودی ئەو هەڵوێستەش دوو هەڵەی سەرەکی لەخۆوە دەگرێت: یەکەمیان، ئەگەر دواتریش بێت ئەو ڕاستییە دەرکی پێکراوە کە لەزانستەکانی فیزیا بێت یاخود بایۆلۆژی ڕەهابوون یان مسۆگەری زانستی جێگای باس نابێت، لەو سۆنگەوە؛ دەرک بەو ڕاستییە نەکراوە کە سروشتی کۆمەڵگا پابەندی فۆرمێلەی زانستی ڕەها ناکرێت. چونکە خودی سروشتی کۆمەڵگا کلتوورە کە هەموو کاتێک کاریگەرییە دەستەمۆنەکراوەکەی زهنیەت لەخۆوە دەگرێت. لەو سۆنگەوە؛ یەکسانکردنی یاساکانی کۆمەڵگای سروشتی لەگەڵ یاسا فیزیاییەکان یاخود یاسا بایۆلۆژییە داروینیستیەکان ئەو هەڵوێستە بەناو زانستیەیە کە بناغەی هەڵەکانیان پێکدێنێت. دووەمینیشیان سەبارەت بەفەلسەفەی مێژووە. دەرک بەوە نەکراوە کە خودی کۆمەڵگا دیاردەیەکی مێژووییە، بەڵام پێویستە وەک دووەمین سروشت و جیاواز هەڵسەنگێنرێت. تەنانەت داخوازی تێگەیشتنی ئەو خاڵەش لەئارادا نەبووە کە ئێستای کۆمەڵگا تاڕادەیەکی مەزن مێژووی کۆمەڵگایە. هزری ڕۆشنگەری ئەو دەرفەتە نادات. ئەوەی ماوەتەوە شیکارەکانی سەرمایەدارییە لەلایەن دونیابینیەکی پۆزیتیڤیستی قەبەوە کە لیبرالیزم بێناوەڕۆکی کردووە. بەگوێرەی سەردەمی خۆی سەرمایەداری بەتاقانە و زاڵ و کۆمەڵگایەکی پێشکەوتوو دانراوە. زۆر لەوەدیوی شێوەیەکی چەوسانەوە سەرمایەداری لەگەڵ کۆمەڵگای نوێ هاوتا و یەکسان کراوە. بەمەش؛ مەگەر تەنیا شێوازێکی قۆستنەوەی وەک سەرمایەداری بتوانێت پێکهاتەی کۆمەڵگای جیهانی و کۆمەڵگای مرۆیی دێرینی ملیۆنان و تەنانەت ملیاران ساڵ بەشێوازێکی نامرۆڤانە و پەیڕەوەکانی دەرەوەی دونیا بدزێت و تاڵانی بکات. وێڕای ئەمەش کەچی سیستەمێکی قۆستنەوە بە حەقیقەتێکی کۆمەڵگا دادەنرێت کە سەرکەوتنی بەدەستهێناوە! لاوازی سەرەکی دونیابینی مارکسی لێرەدا شاراوەیە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەوە هۆکاری سەرەکی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوە. هەر بزاوتێکی ڕاستکردنەوەی پاڵپشت بەمارکسیزم یان سۆسیالیزمی بونیادنراو پێویستە لەو حەقیقەتەوە دەست پێ بکات.

لەئاستی دەستەواژەدا خۆروونکردنەوەی سۆسیالیزم بەشێوەی کۆمەڵگاگەرێتی ڕاستە. ئەوەی هەڵەیە دەستەواژەی "کۆمەڵگای سەرمایەداری" و گوتنی؛ تەنیا لەمیانەی دەربازکردنی ئەو شێوە کۆمەڵگایە بەکۆمۆنیزم دەگەیت. بەر لەهەموو شتێک پێویستە بەر لەدەست نیشانکردنی چوارچێوەکەی دەستبەرداری ئەو شیکارانە بین کە دەستەواژەی کۆمەڵگای سەرمایەداری (پێویستە مۆدێلەکانی کۆیلایەتی و دەرەبەگایەتی هاوشێوەی بخرێتەسەر) وەک حەقیقەتێکی گشتی کۆمەڵگا دەبینێت. هەڵسەنگاندنی سەرمایەداری بەنەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی کوشندە، گەورەبوونی تەنێکی نەخۆشی کۆمەڵایەتی لەجۆری شێرپەنجە ڕاستترین هەڵوێستە. سەرجەم کۆمەڵگاکانی بەر لەسەرمایەداری تەنانەت ئەوانەی بەکۆیلەداری و دەرەبەگایەتیش ناودەبرێن شێوەکانی چەوسانەوەی لەچەشنی سەرمایەدارییان بەگەورەترین بێئەخلاقی لەقەڵەم داوە، ناچارییان کردووە بەشێوەیەکی شاراوە و بێکاریگەر لەقوژبن و کەلێنەکانی کۆمەڵگادا بژین. چونکە لەبەرگەکانی پێشووتر هەوڵمانداوە سەرکەوتنی هەژموونگەرایی ئەو جانەوەرە بەسەر کۆمەڵگا شیکار بکەین، لێرە تەنیا سەرنجی بۆ ڕادەکێشین. کۆدی نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی کە ڕاستیەکەی بەمجۆرەیە:

کاتێک وەک "پێشکەوتووترین و سەرکەوتووترین کۆمەڵگای نوێ" پێشکەش دەکرێت تەواوی زانستە کۆمەڵایەتیەکان سەقەت دەکات. هەربۆیەش دەڵێم رژێمی خوداوەندە رووتەکانە کە هەزار ئەوەندەی کاهینەکانی سۆمەر چەوسێنەرترن کە رژێمی قۆستنەوە و بەکارهێنانیان کردبوو بە ئیلاهی، کارە زهنیەکانیان سەبارەت بە سەرمایەداری ئایدیۆلۆژییە و زیاتر بە پیرۆزی (ساختە) بۆیاغکراوە. وەک حەقیقەت ئەمانە هیچ پەیوەندیەکیان بە زانستی کۆمەڵایەتیەوە نییە. تەنیا رێکخستنی دەستەواژە زانستیەکان، چەواشەکردنیان و پێشکەشکردنیان وەک زانست جێگای باسە.

کۆمەڵگا سروشتێکی جیاوازە، ئاکامی پەرەسەندنی ملیۆنان ساڵ و بەردەوامی جیهانی زیندەوەرانی پێشووترە، بەرهەمی جیهانی سۆز و عەقڵێکی شکۆدارە. خاوەن هەموویتیەکی بەمجۆرەیە. گەردوونێکی پانزە ملیار ساڵییە (مێژووی گەردوون) کە پەی بەخۆی بردووە. ئافراندنی کۆمەڵگا لەلایەن قۆستنەوەی (أستغلال) کاری سەرمایەداریەوە، هەروەک ئافرێنەری نەمروود و فیرعەونەکان بۆخوداوەند جگە لەبانگەشەیەک هیچ بەهایەکی دیکەی نییە. لەو چوارچێوەیەدا "کۆمەڵگای سەرمایەداری" بانگەشەیەکی فیرعەونی و دروستکراوە. هەنگاوی راست ئەوەیانە کە سەرمایەداری بەشێوەی سەرمایەی فینانس هارتر بووە) بکرێت بەدەستەواژەی نەخۆشیەکی کۆمەڵایەتی. باسکردنی زانستێکی سۆسیالیستی وەک بڵێی خوازیاری پەرەپێدانی زانستێکی ئەفدروستین کە هەوڵدەدات مرۆڤایەتی لە سەرمایەداری رزگار بکات مایەی تێکەیشتنە و هەڵوێستێکی ئەخلاقییە. لەدۆخێکی پێچەوانەدا ناتوانین شەڕ، بۆمبی ئەتۆمی، زیادبوونی نائاسایی ژمارەی دانیشتوان و وێرانکردنی ژینگە لەو پێنج سەد ساڵەی دوایی روونبکەینەوە. پێویستە بەهایەکی باڵا بە کلان، قەبیلە، قەوم، ئوممەت و تەنانەت ئەو نەتەوانە بدەین کە نەبوونەتە دەوڵەت ـ نەتەوە و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لیبڕال و لقە جیاوازەکەی سۆسیالیزمی بونیادنراویش بە پاشماوەی کۆمەڵایەتی دواکەوتووی لەقەڵەم دەدان. تەواوی ئەو شێوەگرتنە جیاوازانەی کۆمەڵگا بەهادارن. وەک پێداویستیەکی دیالێکتیکی پێویستە لە پێشکەوتووترین کۆمەڵگای نەتەوەییدا کلان، قەبیلە، خێڵ و جڤاتەکانی گەل لەدۆخێکی گەشەسەندوو و هەموویتیدا ببینرێن. وەک چۆن توخمێکی پێکهاتوو لە سەد ئەتۆم مانای نەمانی ئەتۆم نابەخشێت، بەپێچەوانەوە وەک دۆخی یەکپارچەیی گەشەکردووی ئەتۆمەکان هەڵدەسەنگێنرێت، بەهەمان شێوە هەڵسەنگاندنی جیاوازیەکانی دوای کۆمەڵگای کلانیش زیاتر بەرەو حەقیقەتی کۆمەڵگامان دەبات.

لەدۆخێکی وەهادا؛ پێویستییەکی راستینەی خۆیەتی کە کۆمەڵگای سۆسیالیستی بە دژە ژەهری سەرمایەداری دابنرێت، هەروەها وەک کۆمەڵگای سەرجەم کۆمەڵگاکانی رابردوو هەڵسەنگێنرێت کە هەوڵدەدات بەشێوەیەکی گەشەکردوو، هەمەگیر، ئازاد و یەکسان بێتەئاراوە. هەڵکشانی لەسەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەو لاوە بمێنێت، پێویستە دۆخی نەخۆشی مۆدێرنیتەی دەمامک کراو بە "لێویاتان" ی مۆدێرن و "قەفەسی ئاسنین"ی سەر کۆمەڵگا لە کۆمەڵگای مێژوویی دوور بخاتەوە، بەمجۆرەش دەتوانێت لەگەڵ پێناسەکەی خۆیدا بگونجێت. ئەگەر هێندەی سەرمایەداریش نەبێت سۆسیالیزمیش بەدرێژایی مێژووی

شارستانی لەمیانەی خۆ ڕزگارکردنی و پاککردنـەوەی لەپاشماوەی پاوانـە سەپێنراوەکانی چەوسانەوە و سەرکوتکاری کۆیلەداریەوە هەم لەسەر بناغەی مێژوویی خۆی جێگیر بـووە، هەمیش لەڕێگای دەسکەوتە هەنووکەییەکانەوە خۆی تۆکمە و نوێ دەکاتەوە.

ئەگـەر سـەیر بکرێـت لـەو هەڵوێسـتەدا ڕێبـازێکی قەدبڕانـە و ڕاسـتەهێڵی لـەجۆری کۆمەڵگای نوێ یـان کـۆن یـاخود کۆمـەڵگای کۆیلـەداری، دەرەبەگایـەتی، سـەرمایەداری و سۆسیالیستی بەکارناهێنین. بـەڵکو دەسـتەواژەی وەک پەرەسـەندنی کۆمـەڵگا، یـەکبوون، ئـازادبوون و یەکسـانی لەسـەر بنـەمای جیاوازیـەکان بەبنـەما دەگـرین. لـەوەش گرنگتـر سۆسیالیزم وەک دۆخی کۆمەڵگایەک هەڵناسەنگێنین کە لەداهاتوو و دوای شۆڕش یـان بـە تەدریجی دێتەئاراوە. هەڵبەتە هەڵوێستێکی بەمجۆرە لەگەڵ ڕاستی ژیانی سروشتی کۆمەڵگا ناکۆکە. جۆری مرۆڤ بەردەوام کۆمەڵایەتییە. لەمیانەی لێکجیاکردنەوەی ڕابردوو ـ ئێستا ـ داهاتوو بەردەوام نابن. هەر سێ دۆخـیش لـەناو یـەکتر و بەیەکـەوە دەژیـن. سـاتی ئێسـتا هێندەی ئەوەی ڕابـردووە داهاتووشـە. لێـرەدا پێویسـتی بـە هەڵوێسـتێکی فەلسـەفی ڕاست هەیە. هەڵسـەنگاندنی فەلسـەفەی زەمـان یـان ڕۆژگـار وەک ڕابردوویێکـی بێکۆتـا (ئـەزەلی) یـاخود داهـاتووی بێکۆتـا (ئەبـەدی) واتایـەکی ئـەوتۆی نییـە. تـەنیا دەشـێت زەمـان وەک پێکهاتنی بوون پێناسە بکەین. واتە پێکهاتنی هەر بوونێک زەمانەکەیەتی. زەمانێکی دیکەش بوونی نییە. کاتێک بـەمجۆرە بێـت زەمـانی کۆمـەڵگا پێکهاتنەکەیـەتی، بـەگوێرەی ئـەوەی کۆمەڵگاش بەردەوام لەدۆخی پێکهاتن و دروست بوون دایە، لەو دۆخەدا ڕابردوو ـ ئێستا ـ داهاتوو تێکەڵە، نهێنییە. لەو سۆنگەوە؛ هەڵەیە کۆمەڵگا وا وێنا بکرێت کە بە قۆناغەکانی پێشـکەوتنی ڕاسـتەهێڵی لـەدۆخی پەرەسـەندندایە و تـەنیا مـاوەی درێژخایـەن لـەنێوان قۆناغەکانـدا هەیـە. ئـەم وێنایـە ڕێگـا لـەپێش شـیکارگەلێکی کۆمەڵایـەتی دەکاتـەوە کـە بەرگەگرتنی ئەستەمە.

ڕاسـتینەی نزیکتـرین ژیـان بـە حەقیقـەت و دروسـتی لێوانلێـو ژیـانکردنی ڕاسـتینەی کۆمەڵگایە؛ ژیانکردنی خرۆشانی ساتی پێکهاتنێتی کە تەواوی توانستەکانی ڕابردووی پێدا تێپەڕ دەبێت و هیوا بەرفراوانـەکانی داهـاتووی لـەخۆوە دەگرێت. کاتێـک دەسـتەبەرکردنی شێوازێکی بەمجۆرەی ژیـان بـە کـار و کێشـەی سـەرەکی تیـۆری و پراکتیکـی سۆسیالیسـتی دادەنرێت بەهایەکی مەزنی هەیە. ئەمەش وەک گوزارشت و ژیانکردنێکی ڕاستی حەقیقـەتی کۆمـەڵگا مانـادار دەبێت. لـەجیاتی ئـەوەی سۆسیالیزم وەک پـڕۆژە یـاخود بەرنامەیـەکی سـەبارەت بـەداهاتوو ببینرێـت، پێویسـتە وەک شـێوازێکی ژیـانی ئـەخلاقی و سیاسـی بەرجەستە بکرێت کە چاودێری یەکسانی و دادوەرییە، لەکات و ساتی خۆیدا ئازادت دەکات و بەهای جوانی هەیە. سۆسیالیزم شێوازێکی ژیانی هوشیارانەیە کە گوزارشت لە حەقیقەت دەکات. پێویستە وەک دانا و باوەڕمەندی ئەو زەمانە بژیت کە شێوازەکەیان هاوشێوەی ئەو دانا و باوەڕمەندانەیە کە نموونەی زۆریان لەمێژوودا بینراوە. تاکخوازی یان تاکگەرایی کە گوزارشت لە رووخانی ئەخلاقی لیبڕالیزم دەکات ئازادی نییـە، بـەڵکو ڕیسـواترین شـێوەی کۆیلایەتییە کە لەڕێگای مەعریفەی ساختەوە دەژێنرێت. وەک ئانتی ـ لیبڕالیزم سۆسیالیزم ئایدیۆلۆژیای ژیانکردنی ئازادییە لە ئەخلاق و چالاکی هاوبەشدا.

پێویستە لەتێڕوانینمان بۆ کۆمەڵگا سەرمایەداری زل نەکەین. بەتایبەتیش بانگەشەیەکی لەوجۆرە کە سەردەمەکەمان قۆناغێکە بەشێوەیەکی رەها ئیمپریالیزم و سەرمایەداری و شێوازی ژیانی رۆژانەیان تێیدا زاڵە، بەخشینی مانایەکە بە سەرمایەداری کە شایستەی نییە، راست نییە و بە هەڵە داچوونێکە و زیاتر لەژێر پروپاگەندەوە پێکهاتووە. شەڕێکی ئایدیۆلۆژییە کە لەلایەن پروپاگەندەی ترس و تۆقاندنەوە پێشدەخرێت. راستیەکەشی: سەرمایەداری سیستەمێکە بەردەوام مەحکومی مارژینالی و بێکاریگەربوونە، تالانکاریەکی ئانتی ــ کۆمەڵگابوونە و تەنیا لەرێگای زۆرداری فاشیستانەوە هەوڵی زاڵکردن و باڵادەستی خۆی دەدات، سیستەمی چل دزەکەیە. لەسەردەمی کۆندا وەک چۆن لەمیانەی بەئیلاهیکردن و پیرۆزکردنی فەرمانڕەوا زۆردارەکان مرۆڤ کراوە بە بەندەی گرگن، لەو سەردەمەشدا هەژموونگەراییەکی ئایدیۆلۆژی سەرمایەداری جێگای باسە کە ئەنجامی هاوشێوە دێنێتە ئاراوە. کۆیلایەتی و گرگنیەک جێگای باسە کە ئەو هەژموونگەراییە لەرێگای شەڕە سارد و گەرمەکانەوە پێش دەخرێت.

هەڵسەنگاندنی سۆسیالیزم وەک کۆمەڵگایەک کە بەردوام لەرێگای شۆڕش و شەڕەوە بەدەست دەهێنرێت هەڵەیە. بێگومان لەکاتی رەخسانی هەلومەرج دەشێت شەڕیش لەپێناو وەرچەرخانی شۆڕشگێڕانە پەیڕەو بکرێت. بەڵام سۆسیالیزم تەنیا مانای شۆڕش نییە؛ تەڤلیبوونی دیموکراتیانەی کۆمەڵگا و ژیانێکی هۆشیار و پڕ چالاکی دژ بە سەرمایەدارییە. گوتەی "دوای سەرکەوتنی شۆڕش ژیانی سۆسیالیستی ئاوا دەکرێت" خۆخەڵەتاندن و چاوەڕوانیەکی بێمانایە. تا چ رادەیەک رابردوو لەمیانەی مەعریفەوە بەشێوەیەکی بەهێز بژێنرێت و بکرێت بە ئێستایی، ئەوا داهاتوو بەشێوەیەکی بەهێز و مەعریفیانە پێشوازی لێدەکرێت و دەژێنرێت. بێگومان لەتەواوی ئەو پرۆسە و قۆناغانەدا پێویستی بە رێبەرایەتی ستراتیژی و تاکتیکی هەیە. بەڵام هەڵسەنگاندن یان تاوتوێکردنی سۆسیالیزم وەک دۆخێکی چالاکی کە لەمیانەی ئەمجۆرە چەمکە سەربازیانەوە بەڕێوە دەبرێت رێگا لەپێش هەڵەی گەورە دەکاتەوە. بەجۆرێک لەجۆرەکان سۆسیالیزمی بونیادنراو بەمجۆرە بەڕێوەچوو. کاتێک ماندووش بوو کەوت و رووخا. لەژێر چەتری پارادایمی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لەهەموو کاتێک زیاتر پێویستی بەو بزووتنەوە، پارت و بەرە سۆسیالیستیانە هەیە کە کۆمەڵگای مێژوویی بەبنەما دەگرن. لەبەرامبەر گەمارۆدانی کۆمەڵگای بەکاربردن لەلایەن ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ــ نەتەوەی سەرمایەداری و وێرانکاری ژینگەوە خۆی بە بەڕێوەبەرایەتیەکی ژینگە دۆست، ئابووری، دیموکراتی کۆنفیدراڵەوە تەیار کردووە. پێشخستنی تیۆری سۆسیالیستی لەچوارچێوەی ئەو رەشنووسە گەڵاڵەکراوە و بەرجەستەکردنی لەبواری کرداریدا گرنگ و بایەخدارە. چونکە لەراستیدا ئەوە بزاڤی رێکخراو و مەعریفەیەکی پێشەنگ نییە تەنیا لەبەرامبەر هەژموونگەرایی سەرمایەداری سەرپەهەڵدابێت، بەڵکو بزووتنەوەیەکی راستەقینەی کۆمەڵگابوونە کە بەدرێژایی مێژوو بەهەمان ناوەڕۆک و رووخساری ئایدیۆلۆژی ــ کرداری جیاوازەوە بەردەوام بووە. کۆمەڵگای راستەقینە سروشتی ئەو بزاڤەیە، خودی رۆڵی کۆمەڵگابوونە. لەتەنیشت سەرجەم سیستەمەکانی شارستانیەوەیە، بەڵام لەپێگەی رکابەرێتی و بەشێوەیەکی

سیستەماتیک دەژییت. لێحالّی نەبوون و پەی پێنەبردنی، پەیوەندی بە هێزی پڕوپاگەندەی ئایدیۆلۆژی لایەنی بەرامبەرەوە هەیە. حەقیقەتە کۆمەڵایەتیەکان خودی سۆسیالیزمە، تا کۆمەڵگا بەردەوام بێت ئەویش بەسیفەتی شێوازی ژیانی راستەقینە هەر بەردەوام دەبێت. لەو مانایەدا مێژوو تەنیا دیرۆکی ململانێ و تێکۆشانی چینایەتی نییە، بەڵکو دیرۆکی تێکۆشانی ئازادی، یەکسانی و پاراستنی کۆمەڵگایە بەرامبەر دەوڵەت و دەسەڵاتی هەژموونگەرایی. سۆسیالیزمیش مێژووی ئەو تێکۆشانەی کۆمەڵگایە کە هەنگاو بەهەنگاو زانستی دەبێت.

### ٥. هاوژیانی ئازاد

تا پەیوەندی نێوان ژن و پیاو دەرکی پێنەکرێت، هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتی بەپێی پێویست دەرکی پێناکرێت و چارەسەریش ناکرێت. چونکە کێشەکانی پەیوەندی نێوان ژن ـ پیاو بناغەی کێشەکانی کۆمەڵگا پێکدێنێت. دامەزراوەی هاوسەریتی کە لە کۆمەڵگای پلەداری و شارستانی بەشێوەیەکی یەکلایەنە بەسەر ژندا دەسەپێنرێت، بەمجۆرە بناغەی دامەزراوەیەکی کۆیلایەتی و پاشکۆیەتیەک دادەنرێت کە لەسروشتدا هیچ بوونەوەرێک تێیدا ناژیت و تایبەت بە کۆمەڵگای مرۆڤە. یەکەمین ستاتۆی چەوسێنەر ـ چەوساوەی کۆمەڵایەتی، چینایەتی و نەتەوەیی بەردەوام لەسەر ئەو بناغەیە هەڵدەکشێت. دیسان ئەو واقیعە لەژێر هەمووجۆرە شەڕ و پێکدادانێکدا شاراوەیە. ئەو شتەی مێژووی شارستانی بەتایبەتیش دوا قۆناغەکەی، مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، شاردویەتیەوە، بەشێوەیەکی پێچەوانە و نەرێنی پیشانیداوە ئەو راستیانەی سەبارەت بە ستاتۆی کۆیلایەتی ژنە؛ ژن کە لە کۆمەڵگای شارستانی ناوی لەگەڵ شەیتان هاوتا و یەکسان کراوە، لە سۆسیۆلۆژیای مۆدێرنیتەدا ماڵیکراوترین کەسایەتی کۆنفۆرمیزمە[٤]، وەچەخەرەوە و دایکی منداڵان و کارکەرە بێدەستهەقەکەی ماڵەوەیە.

تێگەیشتنی سەرجەم شێوە و ناوەڕۆکی ئاستی ئەو کۆیلایەتیەی بەدەستی پیاوی چەوسێنەر و زۆردارەوە بەهەزاران ساڵ دەرخواردی ژیانی ژن دراوە دەبووایە یەکەمین هەنگاوی سۆسیۆلۆژیای راستیەکان بێت. چونکە فۆرمەکانی چەوسانەوە و کۆیلایەتی ئەو بوارە شێوەی بەرایی سەرجەم شێوەکانی چەوسانەوە و کۆیلایەتی کۆمەڵگایە. پێچەوانەکەشی لەجێگای خۆیدایە. تێکۆشانی ئازادی و یەکسانی بەرامبەر ئەو چەوسانەوە و کۆیلایەتیەی دەرخواردی ژیانی ژن دراوە، هەروەها ئاستی دەستکەوتەکانی ئەو تێکۆشانەش بناغەی تێکۆشانی ئازادی و یەکسانییە بەرامبەر چەوسانەوە و کۆیلایەتی سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا. هۆکاری سەرەکی پەرەنەسەندنی تەندروستانەی تێکۆشانی

---

[٤] رەفتاری چاولێکەری یان بەدواکەوتن (CONFORMITY): بریتییە لە رەفتاری کەسێک کە دەبینێت هەندێک کەس رەفتارێکی هەڵە دەنوێنن، ئەویش هەمان رەفتار دەکات، وێڕای ئەوەی دەزانێت کە رەفتارەکەیان هەڵەیە، بۆئەوەی لەگەڵ رای زۆرینە دابێت و لێیان نەترازێت. (وەرگێڕ)

ئازادی و یەکسانی لەمێژووی شارستانی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا و بەدەست نەهێنانی سەرکەوتنێکی بەهێز، دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنی زهنیەت و دامەزراوەکانی چەوسانەوە و کۆیلایەتی کە دەرخواردی ژیانی ژن دراوە و شێوەی پێدراوە. هەروەها تێکۆشان لەبەرامبەریاندا بەبنەما وەرنەگیراوە. پێشینان گوتوویانە؛ ماسی لەسەریەوە بۆگەن دەبێت. کاتێک بناغە قایم و راست نەبێت، ئەوا ئەو تەلارەی ئاوا دەکرێت خۆی بەرامبەر بچووکترین زەمینلەرزە ناگرێت و لەرووخان رزگاری نابێت. ئەو واقیعەی لەمێژوو و رۆژگاری ئەمڕۆماندا روویداوە پڕ لەو نموونانەیە.

لەو سۆنگەیەوە؛ قاڵبوونەوە لەسەر دیاردەی ژن، هەروەها لە کاتی هەوڵەکانی چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆمەڵگا بە سەرچاوەدانانی ژیانی ژن بۆ هەوڵەکانی ئازادی و یەکسانی؛ هەم پێویستە ببێتە رێبازی سەرەکی، هەم ببێتە بناغەی هەوڵە زانستی و ئەخلاقی و ئیستاتیکەکان. رێبازێکی توێژینەوەی بێبەش لە راستی ژن، تێکۆشانێکی ئازادی و یەکسانی کە ژنی نەکردبێتە تەوەرەی خۆی بەحەقیقەت ناگات، ئازادی و یەکسانیش دەستەبەر ناکات.

بەرلەهەموو شتێک پێناسەکردنی ژن و دەستنیشانکردنی رۆڵەکەی لەژیانی کۆمەڵگادا بۆ ژیانی راست مەرجە. بەهۆی تایبەتمەندییە بایۆلۆژی و ستاتۆ کۆمەڵایەتیەکەی ژنەوە ئاماژە بەو داوەرییە ناکەین. وەک کەینونە و بوونێک دەستەواژەی ژن گرنگە. بەو رادەیەی ژن پێناسە بکرێت ئەگەری پێناسەکردنی پیاویش هەیە. لەمیانەی دەست پێکردن بە پیاوەوە ناتوانین پێناسەیەکی راست بۆ ژن و ژیان بکەین. بوونی سروشتی ژن لەپێگەیەکی ناوەندی تر دایە. لەبواری بایۆلۆژیشەوە دۆخەکە بەمجۆرەیە. بچوککردنەوەی ستاتۆ و بێکاریگەرکردنی ژن لەلایەن کۆمەڵگای پیاوسالاریەوە پێویستە تێگەیشتنی راستی ژنمان لێبەربەست نەکات. سروشتی ژیان زیاتر پەیوەندی بە ژنەوە هەیە. پەراوێزخستن و بەدەرنانی ژن لە ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو راستییە ناگۆڕێت، بەپێچەوانەوە دەیسەلمێنێت. پیاو بە هێزە لەناوبەر و زۆردارەکەیەوە لەراستیدا لەکەسایەتی ژندا هێرش دەکاتە سەر ژیان. بەو سیفەتەی باڵادەستی کۆمەڵگایە دوژمنایەتی پیاو بۆ ژیان و وێرانکردنی لەنزیکەوە پابەندی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتیەیە کە تێیدا دەژیت.

کاتێک ئەو داوەریەمان دەکەین بەگەردوونی دەشێت دوالیزمی وزە – مادده بەبنەما بگرین. بە بەراورد لەگەڵ مادده وزە سەرەکیترە. خودی ماددەش وزەی بە بونیاد بووە. ماددەش شێوەی شاردنەوەی وزە و بوونەکەیەتی کە بووە بە فۆرم. بەو تایبەتمەندێتیەوە مادده وزە دەخاتە قەفەسەوە و لێشاو و جووڵەکەی دەوەستێنێت. پشکی وزەی هەر فۆرمێکی مادده لێک جیاوازە. هەڵبەتە ئەو جیاوازیەی وزەش جیاوازی نێوان فۆرم و بونیادە ماددییەکان دەست نیشان دەکات. وزەی مادده و فۆرمی ژن لەگەڵ وزەی ماددەی پیاو جیاوازە. ئەو وزەیەی ژن هەڵیگرتووە هەم زیاترە هەم چۆنیەتی وزەکە جیاوازترە. فۆرمی ژن سەرچاوەی ئافراندنی ئەو جیاوازیەیە. کاتێک لە سروشتی کۆمەڵگا وزەی پیاو بۆ ئامێرەکانی دەسەڵات دەگۆڕێت دۆخی شێوە و فۆرمی ماددی بەدەست دێنێت. بەو سیفەتەی وزەی ساردەوەبووە شێوەکانی لەتەواوی گەردوون محافەزەکارن. بوون بە پیاوی زاڵ یان

باڵادەست لەکۆمەڵگادا گەیشتنە بە دۆخی شێوەگرتنی دەسەڵات. بەو حاڵەتەشیەوە ئەو وزەیەی هەڵیگرتووە زیاتر فۆڕمی بەدەستهێناوە. ئەو وزەیەی بۆ فۆڕم نەگۆڕاوە کەمە و لەکەسانێکی زۆر دەگمەندا روودەدات. هەرچی لە ژندایە لەزۆربەی حاڵەتەکاندا وزە نابێتە فۆڕم و ناکەوێتە ناو فۆڕمێکەوە. لە ژندا وزە دۆخی لێشاو و بزێوی خۆی دەپارێزێت. ئەگەر نەخرێتە ناو فۆڕم و هزری پیاو و تێیدا بەند نەکرێت، ئەوا بە سیفەتی وزەی ژیان بەردەوامی بەلێشاو و بزێوی خۆی دەدات. جوانی و شاعیرێتی و پۆتانسێلی مانای ژن کە نەبووە بە بەستەڵەک لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو دۆخەی وزەیە. بۆ تێگەیشتنی ئەو راستیە پێویستە لەقووڵاییەوە دەرک بە ژیانی زیندوو بکرێت.

پەرەسەندنی ژیانێک کە بە ژیانی مرۆڤ گەیشتووە دەشێت تا رادەیەک پێناسە بکرێت یان پێویستە پێناسە بکرێت. بەرلەهەموو شتێک پێویستە لێپرسینەوە و بەدواداچوون لەبارەی مەبەستی ژیان بکرێت، بۆچی دەژین؟ بۆچی ژیان درێژە بەخۆی دەدات، خۆراکی پێدەدات و بەرگری لێدەکات؟ ئەگەر بڵێین؛ ژیان پێویستی بەخۆراک، پاراستن و زۆربوون هەیە، بەهەر حاڵ بەشی وەڵامدانەوە ناکات. ئەو پرسیارەی دوای ئەوە زەقبکرێتەوە بۆچی زاوزێ دەکەین، خۆراک دەخۆین و بەرگری لەخۆمان دەکەین؟ کاتێک وەڵامەکەی "لەپێناو ژیان" بێت ئەوا دەکەوینە ناو بازنەی نەزۆک و بەتاڵەوە. کەوتنە ناو دۆخی دووبارەی بازنەی بەتاڵەوە وەڵام نییە. ئاستەکانی زهنیەت و دیاردەی تێگەیشتن کە وەک شێوەیەکی وزە تا ئاستی مرۆڤ پەرەسەندن و گەشەکردنی بەخۆیەوە بینیوە هەندێک سەرەداوی وەڵام بەدەستەوە دەدات. پەرەسەندنی گەردوون تا ئاستی مرۆڤ هێزێکی واتا دەخاتەڕوو کە بەردەوام لەگەشەکردن دایە. ئەو راستیە پۆتانسێل یاخود وزەی شاراوەی گەردوون وەک بڵێی خوازیارە ئاشکرا بێت، دەرکی پێ بکرێت و بەئەنجامێکی بەمجۆرە بگات. پێویستی تێگەیشتن و حاڵیبوون ئارەزووی سەرەکی گەردوونە. ئەو پرسیارەی لەو خاڵە بەدواوە بوروژێنرێت پێویستە سەبارەت بە خودی تێگەیشتن و حاڵیبوون بێت. ئەو شتە چییە کە خوازیارە تێی بگەین و روون بێتەوە؟ لە پەرتووکی پیرۆزدا خودا دەفەرموویێت "من نهێنی و پەنهانیەک بووم، بۆ لێتێگەیشتنم گەردوونم ئافراند"، لەوانەیە ئەوە وەڵامێکی پرسیارەکەمان بێت، بەڵام تێرو تەسەل نییە. پێویستی تێگەیشتن یان بوون بە بابەتی تێگەیشتن تەواو تێری پێناسەکردنی واتا ناکات. بەڵام تا رادەیەک نهێنی ژیان ئاشکرا دەکات.

پێناسە رەهاکەی هیگل یش لەبارەی رۆحەوە مانایەکی هاوشێوەی هەیە. بەگوێرەی بۆچوونی هیگل لەرێگای رۆحی رەهاوە گەردوون بەشێوەیەکی مەعریفی و هوشیار بۆخۆی گەڕاوەتەوە. گەردوون کە خوازیارە پەی پێ ببەن یان لێی تێبگەن لەمیانەی مەعریفەی فەلسەفیەوە ـ کە بەقۆناغی فیزیکی، بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتیدا تێپەڕیوە و لێهاتووترین دۆخی مەعریفەیە ــ واتە لەرێگای رۆح یان هزری رەهاوە دڵنیابووە کە خۆی ئاشکرا کردووە، بەمجۆرەش خۆی کردووە بەگەردوونی ناسراو، دەرک پێکراو و سەرکێشیەکەی خۆی تەواو کردووە. ئەو داوەریانە کە پشکی گرنگی حەقیقەت لەخۆوە دەگرن مەبەستی ژیان لەگەڵ واتادا یەکسان دەکات. دەستەواژەی "تیۆریا"ی فەلسەفەی یۆنانیش مانای

هاوشێوە لەخۆوە دەگرێت. وەک ئەنجام "واتا" بەئیلاهیبوونی مرۆڤی بەکۆمەڵگابووە. لێرەدا پرسیاری گرنگ ئەوەیە: بەئیلاهیبوونی مرۆڤی بەکۆمەڵگابوو یان ئەو هێزەی واتا کە بەدەستیهێناوە دەتوانێت نوێنەرایەتی سەرجەم مانای گەردوون بکات یاخود گوزارشتیان لێبکات؟ ئایا دەشێت زۆرترین واتای (رۆحی رەهای هیگل) بە کۆمەڵگابوون لەگەڵ خودی مانای گەردوونی هاوتا بکرێت؟ ئایا خودی کۆمەڵگا بوونەوەرێکی ناتەواو نییە؟ لە دۆخێکی وەهادا ئایا ماناکەشی ناتەواو نابێت؟

بەو دۆخەی مرۆڤبوونمان ناتوانین بە تەواوی وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە. چونکە ئێمە بەکۆمەڵگاوە سنووردار کراوین. نابین بە بوونەوەرێکی بان ـ کۆمەڵگا. تەنیا دەتوانین بپرسین. ئەوەیە چارەنووسمان، بەڵام پرسیارکردنیش نیوەی تێگەیشتنە. لەو سۆنگەوە؛ دەشێت سەرەداوەکانی سەبارەت بە تێگەیشتن مانای رەها بەدەستەوە بدات. ئێستاکە دەتوانین تێبگەین و دڵنیابین کە گەیشتن بەدۆخی ماناداربوون زۆر گرنگە و تابڵێی نزیک بە مەبەستی سەرەکی ژیان بووینەتەوە. ئیتر دەکرێ بڵێین؛ دەتوانین پرسیارە سەرەکیەکانی دەرهەق بە خودی ژیانی مانادار شیکار بکەین، بەلانی کەم توانا و بەهرەی وەڵامدانەوەی ژیانێکی کۆمەڵایەتی راست، جوان و دادوەرانەی خوازراومان هەبێت.

کاتێک لەمیانەی ئەو دیدگا فەلسەفیەوە روو لەراستی ژن بکەین، بەو ئەنجامە دەگەین کە پێویستە رایەڵەی ژیانی مانادار لەگەڵ لایەنە چاک، راست و جوانەکانی ژندا ببەستین. کاتێک لەمیانەی ئەو داوەریەوە تەماشەی مەسەلەکە بکەین ئەوا ناشێت ئامانجی بنەڕەتی ژیان لەگەڵ ژندا زاوزێ و زۆربوون بێت. لەوانەیە بڵێن سادەترین زیندەوەرە تاکخانەکانیش ئاگاداری زۆربوونن و لەوانەیە تاکە ئامانجی ژیانیشیان لەسەر ئەو بنەمایە کۆد کرابێت. بەڵام ئەو پەرەسەندنەی گەشەی کردووە پیشانمان دەدات کە خۆ دابەشکردنی تاکخانە بۆ دووبەشی یەکسان کۆتایی ژیان نییە، بەڵکو ئەو چالاکیەی تاکخانە کە بە ملیۆنان جار دابەش بووە لەجیاتی کۆتایی هێنان بە ژیان بەڵکو بەخێرایی بەرەو هەمەڕەنگی و جیاوازی بردووە، هەربۆیەش وەڵامە واتادارەکەی دواتر زۆربوون نییە، بەڵکو گۆڕانکاری و وەرچەرخانە. زۆربوون ئامرازێکی پێویستی ژیانە، بەڵام بۆ تێگەیشتنی هەرگیز بەش ناکات. زۆربوون ئامرازە، ئامانج یاخود مانایی نییە. بەمانایەکی تر ژیانێک تاکە مانای زۆربوون بێت ژیانێکی زۆر ناتەواو و بەکەموکوڕییە. کاتێک لەزیندەوەرێکی تاک خانەدا رەوش بەمجۆرە بێت، ئەوا ژیانی مرۆییانە لەگەڵ ژندا تەنیا بەستنەوەی بەزۆربوونی زایەندی و زیادبوون، تەنیا ناتەواوی مانای ژیان نییە، بەڵکو گوزارشت لەکوێربوونی ژیان دەکات. هەڵبەتە بەگوێرەی ئەوەی زۆربوون لای ژن بەشێوەی ئەمیبیا روونادات، کاتێک لە ژیانی هاوبەش لەگەڵ ژندا زاوزێ دەکرێت بە ناوەند و ئامانجی ژیان واتە مانای پێویست لە پەرەسەندنە شکۆدارەکەی زیندەوەران بەدەست نەهێنراوە. کەچی لەرێگای تەکنۆلۆژیای رۆژی ئەمڕۆماندا گرفتی کەمی ژمارەی دانیشتوان لەکۆمەڵگای مرۆڤدا بەتەواوی دەربازکراوە. کەمی ژمارەی جۆری مرۆڤ نەبۆتە کێشە، بەپێچەوانەوە ئەو زۆربوونەی کە ئیتر لەسەر رووی دونیا جێگای نابێتەوە چەندەی دەچێت دەبێت بەکێشەیەکی گەورە. هەروەک لەزیندەوەری تاکخانەشدا سەلمێنراوە وەک

پێویستیەکی خێراییەکەی و گرێدانی بەئاستە بەراییەکەی. هەر زۆربوونێک مانای مردنە. لەتەواوی جۆرەکانی پەرەسەندن زۆربوونی جەستەیی مانایەکی بەمجۆرەش لەخۆوە دەگرێت. ئەو بوونەوەرەی کۆتاییەکەی مردنە لەو بڕوایەدایە لەڕێگای زۆربوونەوە دەتوانێت خۆی بۆ هەمیشە بژێنێت، بەڵام ئەوە بەهەڵەداچوونە. درێژەدان بەخود لەڕێگای کۆپیەکەیەوە لەوانەیە پێویستی ئاسایش و ئارەزووی تەڤلیبوون بەئەبەدیەت دڵنیا بکات، بەڵام نایکات بەواقیعی و راستەقینە.

بەکورتی؛ فەلسەفەیەکی ژیان کە پشت بەزاوزێ لەگەڵ ژندا دەبەستێت واتایەکی جددی نییە. لەکۆمەڵگای چینایەتیدا بەهۆی دیاردەکانی لەجۆری میرات و بەهێزبوون مانای لەژنی وەچەخەرەوە بارکردووە. ئەمەش مانایەکی پەیوەست بەچەوسانەوە و سەرکوتکردنە و بۆ ژنیش نەرێنییە. واتە ئەو ژنەی زاوزێی زیاتر دەکات، زووتر دەمرێت. ژیانێک کە بەهای مانای لەگەڵ ژندا زۆر بەرزبێت: یان وەچەخستنەوەیەکی زۆر کەم، یانیش ئەگەر کێشەیەکی لەچەشنی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوانی جۆری مرۆڤ لەئارادا نەبێت لەگەڵ ئەو ژنە بەدیدێت کە هیچ زاوزێ نەکات. خستنەوەی وەچەی زۆر بۆ ئەو گەلە کۆڵۆنی و دواکەوتووانەی وەک تاک و کۆمەڵگا خۆیان بەهێزی سیاسی و رۆشنبیری پێشنەخستووە، دەشێت وەک بەرگری خۆیی بەهایەکی هەبێت. وەڵامدانەوەی قڕکردن لەڕێگەی زۆرکردنی بنەچەوە رێبازێکی بەرخودان و هێشتنەوەی بوونی خودە. بەڵام ئەوە بەرگری خۆیی ئەو کۆمەڵگایانەیە کە هێندە دەرفەت و شانسی ژیانی ئازادیان نییە. هەربۆیەش لەو کۆمەڵگایانەی ئاستی مانایان تا ئەو رادەیە نزمە ژیانێک لەگەڵ ژن بەدینایەت کە ئاستەتیک و راستی بەبنەما گرتبێت. راستی ئێستای کۆمەڵگاکانی جیهان ئەوە دەسەلمێنن. لە رۆڵی خۆراک دان و پاراستنی ژیان لەگەڵ ژندا لایەنێکی تایبەت و سەربەخۆی نییە. خۆراک و پاراستن بۆ هەر زیندەوەرێک پێویستە و لەجێگای خۆیدایە. گفتوگۆکردن سەبارەت بە ژیانێکی بێ ژن یاخود بێ پیاو مانایەکی ئەوتۆی نییە. لەسەرجەم ژیانی توخم یان ناتوخمەکاندا دیاردەی نێرینە ـ مێیینە جێگای باسە. لەو سۆنگەیەوە؛ کێشە لەگەڵ خودی هاوژیانی نییە، پەیوەندی بەو مانایەیەتی کە لەکۆمەڵگای مرۆڤدا هەیە.

شێوەی ژیانی کۆمەڵگای مرۆڤ وەک شێوەی ژیانی هەر جۆرێکی زیندەوەر نییە. تایبەتمەندێتی ئاواکردنی دیاردەی دەسەڵات و فەرمانڕەوایی ناوخۆیی و حوکمڕانی سەر سروشت لەخۆوە دەگرێت. هەر وەک لەدەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوەدا دەبینرێت لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتیدا راکردن بەدوای نەتەوەی بەهێز لەوانەیە هەسارەی ژیانمان بکات بەگۆڕستانی ژیان. ئەو شێواندن و لادانەی ئێرە سەرچاوەی خۆی لە کۆمەڵگای پیاوسالاری وەردەگرێت. ئەو هەژموونگەراییەی باڵادەستی پیاو لەسەر ژیانی ژنی ئاواکردووە هەسارەکەمان بەدۆخێک دەگەیەنێت دەرفەتی ژیانی تێدا نەمێنێت. لەڕێگای پەرەسەندنی بایۆلۆژییەوە بەو ئەنجامە ناگات، بەڵکو لەمیانەی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالاریەوە پێی دەگات. هەر بۆیەش پێویستە بەیەکەوە ژیان لەگەڵ ژندا لەدیاردەی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالاری رزگاری بێت. وێڕای ئەوەی ژن ژیانی کەوتۆتە ژێر حکومڕانیەوە و بەملیۆنان ساڵ لەمیانەی خەسڵەتی وەچەخستنەوە مرۆڤایەتی ژیاندووە،

بەڵام لەرێگای مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە ئەو وەچەخستنەوە بەشێوەیەکی ئیرۆنیک کۆتایی بەژیان دێنێت. ژیان لەگەڵ ئەو ژنەی لەژێر ستاتۆی ئێستا دایە هەواڵی کۆتایی ژیان دەدات. هێما ناکۆتاکانی ئەو راستییە لەئارادایە. ئەگەر ریزیان بکەین:

أ ـ زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان بە ئاستێک گەیشتووە چیتر لەهەسارەکەمان جێگای نابێتەوە و جۆرەکانی دیکەی زیندەوەرانیشی خستۆتە ژێر هەڕەشەوە. ئەو شێوازەی ژیان لەگەڵ ئەو ژنەی لەژێر ستاتۆی ئێستادایە بەخێراییەکی بەردەوامەوە، هەڕەشە لە ئیکۆلۆژیا و سروشتیبوونی ژیان دەکات.

ب ـ هەروەها ئەو ژیانە لەناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگاکان رێگا لەپێش توندوتیژی بێ سنووری دەسەڵات دەکاتەوە. ئەو ئاستەی میلیتاریزم پێی گەیشتووە بەشێوەیەکی تێروتەسەل ئەو راستییە دەسەلمێنێت.

ج ـ لایەنی زایەندی (سێکسی) ژن کراوە بە ئامرازێکی مەترسیداری بەکارهێنان، چەوسانەوە و سەرکوتکردنێکی سامناکی لەسەر ئاواکراوە. ژیان بە تەواوی تووچاری لادان کراوە، تەنانەت لەگەڵ گومڕابوون و لادانێکی زایەندی هاوتا کراوە کە زۆر بێمانایانە دووبارە دەبێتەوە.

د ـ ئەو ژنەی هەنگاو بەهەنگاو دەسڕێتەوە، بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە دەکرێتە ئامرازێکی بەردەوامکردنی وەچە، کاڵای سێکسی و هەرزانترین هێزی کار. وەک بڵێی هیچ مانایەکی دیکەی نییە.

ه ـ جۆرێک لە ژینۆسایدی کلتووری لەسەر ژن بەڕێوەدەبرێت. بەڵام بەهۆی لایەنی زایەندی و رۆڵی بەردەوامکردنی وەچە ژن وەک ئەندامێکی سوپای بێکارە کەم کرێکان یان بێ کرێکان بەهایان پێدەدرێت. لەو هێزە خۆییە بێبەشکراوە کە لەبواری جەستەیی و ئەخلاقی و مانابییەوە بتوانێت بەرگری لەخۆی بکات.

و ـ کۆمەڵگایەک لەژێر ئەو فاکتەرانەوە ژن بخاتە ناو مەنگەنەی ژیانێکی بێواتا تەنیا دەشێت کۆمەڵگایەکی نەخۆش بێت. کۆمەڵگایەک ژنی بێواتا بێت، خۆیشی بێمانا دەبێت.

ئەو هێمایانەی دەتوانین زیاتریان ریزبکەین بەشێوەیەکی روون پێویستی خێرای وەرچەرخانی ریشەیی هاوژیانی لەگەڵ ژندا دەخاتەڕوو. ژیانی ئازاد لەگەڵ ئەو ژنەدا ئەستەمە کە بێبەرگرییە و کراوە بە موڵک. لەبواری ئەخلاقیشدا ئەستەمە و نابێت. چونکە تەنیا لە حاڵەتی لەناوبردنی ئەخلاق کۆیلایەتی بەدیدێت. هەڵبەتە ئەخلاقی هێزە هەژموونگەراکان بە ئەخلاق ناو نابەین. هێزی هەژموونگەرا، لەو نێوەندەدا پیاوێتی زاڵیش تەنیا دوای داڕووخانی ئەخلاقی کۆمەڵگا بەدیدێت. بەگوێرەی ئەوەی ژیان بە بێ ژن نابێت، رزگارکردنی ژیان رزگارکردنی ژن دەکات بە ناچارییەک. ئەو باسەش زیاتر سەبارەت بەو ژنەیە کە لەناو بونیادی کۆمەڵگادایە. دونیای زهنیەت و پەیوەندیەکەی گرنگی کێشەی ژن و ناواخنی بایەخدارتر دەکات. تا زهنیەتێک پەرەی پێنەدرێت کە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە بەرەنگاری ئەو هێما نەرێنیانە بێتەوە کە لە سەرەوە روونکرایەوە، ئەوا بەگشتی بەشێوەی هاوسەر، بەتایبەتیش ژیان بەشێوەی هاوژینی ژیانی ئازاد ئەستەمە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو

پێویستیانەی وەک تێزی بەرامبەر بۆ ژیانێکی هاوژینی ئازاد لەگەڵ ژندا پێویستن بەو شێوەیە کورت دەکرێتەوە:

أ ـ بەر لە هەموو شتێک پێویستی بەدەستەواژەیەکی هاوژینی ئیکۆلۆژی هەیە کە بەردەوامکردنی ڕەچەڵەک و زۆربوون بەبنەما ناگرێت، بەگوێرەی بیر و خەیاڵی مرۆڤایەتی گەردوونییە و ژیان و هەبوونی زیندەوەرەکانی دیکەی هەسارەکەمان ڕەچاو دەکات. ئەو ئاستە گەردوونییەی کۆمەڵگا پێی گەیشتووە ژیانی ئازاد لەگەڵ ژندا دەکات بە ناچارییەک. تەنیا لەسەر بنەمای ژیانێکی ئازاد لەگەڵ ژندا دەشێت سۆسیالیزمی ڕاستەقینە ئاوابکرێت. ئەولەویەتی سۆسیالیزم مسۆگەر پێویستی بەجێگیرکردن و گەیشتن بەئاستی ژیانی ئازاد لەگەڵ ژندا هەیە.

ب ـ لەو پێناوەشدا پێویستە تێکۆشانێکی زهنی و دامەزراوەیی لەبەرامبەر دەسەڵاتی هەژموونگەرایی پیاوسالاری بکرێت و لەئاستی هاوژینی ئازاددا سەرکەوتنی ئەو تێکۆشانە لەڕووی زهنیی و دامەزراوەیی مسۆگەر بێت. تا ئەو سەرکەوتنە بەدەست نەهێنرێت هاوژینی ئازاد بەرجەستە نابێت.

ج ـ پێویستە هەرگیز ژیان لەگەڵ ژن بەمانای هەمیشەیی کردنی ئارەزووی سێکسی و زۆر ئەنجامدانی شرۆڤە نەکرێت. ژیانی کۆمەڵگای ڕەگەزگەرایی (ڕەگەزپەرستی) کە لەڕێگای شارستانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە بە ئاستی زۆر ترسناک گەیەنراوە، لەسەرجەم بوارە هزری و دامەزراوەییەکان لەناونەبرێت و پاکنەکرێتەوە، هاوژینی ئازاد ئاوا ناکرێت. لەو دونیابینی و دامەزراوانەی ژن وەک دیاردەیەکی موڵکایەتی و ئۆبژەیەکی زایەندی دەبینرێت ژیان لەگەڵ ژن تەنیا بێئەخلاقیەکی گەورە نییە، لەهەمان کاتدا چەپەڵترین و چەوتترین شێوەی ژیانە. لەژێر ئەو هەلومەرجەدا نموونەی دیاردەیەکی دیکەی کۆمەڵایەتی لەئارادا نییە کە لەو سۆنگەیەوە؛ پیاوێک ژنێک هێندە بپوکێنێتەوە و بچووکی بکاتەوە.

د ـ تەنیا لەو هەلومەرجانە هاوژیانی ئازاد لەگەڵ ژندا بەدی دێت کاتێک موڵکایەتی یان بەموڵکردنی ژن ڕەت بکرێتەوە، ڕەگەزپەرستی کۆمەڵایەتی بەکارهێنراو بە تەواوی دەرباز بکرێت و لەهەموو ئاستێکدا یەکسانی (لەسەر بنەمای جیاوازییەکان) بەرقەرار بکرێت.

هـ هاوژیانی ئازاد تەنیا لەگەڵ ئەو ژنە بەدیدێت کە لەدۆخی ئامرازی بەردەوامکردنی بنەچە و بێکاری و هێزی کاری هەرزان یاخود بێکرێ ڕزگاری بێت و لەجیاتی ئۆبژەبوون لەهەر ئاستێکدا ببێت بەسۆبژە.

ر ـ تەنیا لەژێر ئەو هەلومەرجە ئەرێنیانە دەشێت کۆمەڵگا لەگەڵ هاوژیانی ئازاد بگونجێنرێت، لەو سۆنگەیەوە؛ بۆ کۆمەڵگایەکی هەلومەرجی یەکسان و ئازاد بگۆڕێت.

و ـ ئەو ژن و پیاوانەی لەژێر هەلومەرجی ئەرێنی کۆمەڵگادا پەرەیان بە بەهای مانایی و بونیادی خۆیانداوە، دەشێت خاوەنی هاوژیانی ئازادبن.

پێویستە زۆرچاک بزانین کە گەشەکردنی شارستانی هەژموونگەرا و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری باجەکەی نکوڵیکرن بوو لە هاوژیانی ئازاد. لەبەرئەوەی دەرفەتی هاوسەنگی هێزی مانایی و بونیادی نێوان ژن و پیاو لەبەین براوە کە مەرجی ژیانی ئەشقی

کۆمەڵایەتییە ئەشق ڕووناداتی یان جێگای باس نییە. ئەشق لەهەلومەرجەکانی هاوسەرگیری بەدینایەت کە وزەی مانای لەدەستداوە و لەناکاو لەمیانەی پەیوەندییە کۆیلایەتیەکانی کۆمەڵگای کۆیلە ئافرێنراوە. لەبەر ئەو هۆکارەش کاتێک دەرفەتی هاوژیانی ئازاد نامێنێت کاریگەری کوشندەی دەسەڵاتی مۆدێرن و هەژموونگەرا دەبینرێت. هەربۆیەش ئەو ژیانەی وەک پەرچوویکی تەلیسماوی لەلایەن مرۆڤایەتیەوە پێشوازی لێکراوە لەو هەلومەرجانەدا بەهای تەلیسماوی و پەرجوویی خۆی لەدەست داوە، کراوە بە کارەساتێک کە بەخەم و خۆکوشتنەوە لەلایەن ژنەوە پێشوازی لێدەکرێت. پێویستە چاک بزانرێت کە هاوسەرێتی بونیادنانێکی کۆمەڵایەتییە. ئەو ژیانە لەنێوان کەسە نێر و مێیەکان بەدی نایەت؛ بەڵکو لەلایەن ژنێتی و پیاوێتی دروستکراوەوە پێکدەهێنرێت. زۆر چاک ئاگادارین کە ئەو بونیادنانە هەژموونگەراییە هەردوو ڕەگەز (ژن و پیاو) سەقەت دەکات، پەیوەندییەکەی نێوانیشیان بەمەوە کاریگەر دەبێت و بەشێوەی پەیوەندی هەژموونگەرایی ڕەنگدەداتەوە. لەپەیوەندی هەژموونگەرایشدا ئەشق جێگای باس نابێت. مەرجی سەرەکی ئەشقی مرۆڤ؛ لایەنەکان خاوەن ئیرادەیەکی هاوسەنگی ئازادی بن.

کاتێک شارستانی و مۆدێرنیتە لەمیانەی ژیان و هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی و دامەزراوەیی پەیڕەو دەکرێت، سەبارەت بە بابەتی ئەشق بەدرێژایی مێژوو لەناو دووفاقیدا دەمێنێتەوە. زۆر باسی ئەشق دەکرێت، بەڵام ئەنجام نادرێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان ئەدەبیاتی دونیا بریتییە لەباسی ئەشقە بێ ئاکامەکان. ئەو داستانانەی لەباسەکانیان ژن بە هۆکاری هەڵگیرسانی شەڕەکانیش دادەنێن بەڵگەی ئەو ڕاستیەیە. تەواوی شێوەکانی هونەر وەک دان پێدانانی ئەشقی بێ ئاکامە، تەنانەت دەقە ئایینیەکانیش بەجۆرێک لەجۆرەکان کۆنترین شاکارەکانی هونەرن کە بەشێوەیەکی بەهێز لەخواست و ئارەزووە یەکلایەن یان بێ ئاکامەکانی پەیوەندی نێوان نێر خوداوەند ـ مێخوداوەند کاریگەر بوون. پیرۆزکردنی هاوژیانی بەشێوەی "ژیانی تایبەت" لەلایەن سیستەمەکانی شارستانیەوە سەراوبنکراوترین داوەری حەقیقەتی کۆمەڵگایە. لەڕاستیدا تێگەیشتنی گشتی وەک تایبەت، تایبەتیش وەک گشتی لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگا گونجاوترە. پەیوەندییەکەی هاوژیانی خاوەن کۆمەڵێک تایبەتمەندییە کە لەریشەوە کاریگەری لەسەر گەردوونی بوون و سەرجەم رایەڵە کۆمەڵایەتیەکان دەکات. گەورەترین دووڕوویی شارستانی لەوەدایە؛ ئەو پەیوەندییە گەردوونییە بە تاکە دیاردەیەکی دووانەیی زۆر مەحرەم لەقەڵەم دەدات. ئەمەش یەکێکە لەسەرەکیترین هۆکارەکانی بێکەڵکی و بێبایەخی زانیاری سۆسیۆلۆژیا. گوتەی "ژن یان مرۆڤ دەکات بە فەیلەسوف یان شێتی دەکات" کە گوایە تایبەت بە سوقراتە، لەگەڵ ئەو پەندەی دەڵێت: "ژن دەتکات بە وەزیر و ڕەزیلیشت دەکات" دیسان پەیوەندی بە بواری گشتی ڕاستەقینەوە هەیە. چونکە جیاکردنەوەی بواری "تایبەت"و "گشتی" لەناو کۆمەڵگادا چەواشەکارییەکی مۆدێرنیتەیە. لە کۆمەڵگای ڕاستەقینە و ڕەسەندا جیاوازییەکی بەم چەشنە هیچ واتایەکی نییە. ڕاستیەکەی، ژیاندارکردنی شێوە سەرەکی و دیاریکەرەکانی پەیوەندیین.

یەکەم هەنگاوێک بەناوی ژیانەوە بۆ کۆمەڵگای مرۆڤی بهاوێژین پێویستە سەبارەت بە هاوژیانی بێت. هیچ بوار یان کایەکی ژیان هێندەی بواری هاوژینی خەسڵەتی دیاریکەر و بنەڕەتیبوونی نییە. دانانی ئابووری و دەوڵەت بەپەیوەندی سەرەکی چەواشەکارییەکی سۆسیۆلۆژیایە. لەدەرەنجامدا ئابووری و دەوڵەتیش هەردووکیان ئامرازی هاوژیانین. ناشێت و نابێت هاوژیانی لەخزمەتی ئابووری، دەوڵەت و ئاییندا بێت. بەڵکو بە پێچەوانەوە دەوڵەت، ئایین و ئابووری ناچارن لەخزمەتی هاوژیانی دابن. بەڵام پێچەوانەکەی ئەو ڕاستییە تەواوی سۆسیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی گرتۆتەوە.

وەک پێویستیەکی تەواوی ئەو باسە یەکەمین بواری پێویستی بە بونیادی زانستی هەیە پێویستە بواری هاوژیانی بێت. میتۆلۆژیاکانی چاخی کۆن کە زۆر سەرەتایی دەبینرێن و لەخۆڕانییە کە بەردەوام ئایینەکان بەو بوارەوە دەستیان پێکردووە، لەڕاستیدا پەیوەندییان بەحەقیقەتی کۆمەڵگاوە هەیە. هاوژیانی یەکەمین هەنگاوە کە بەتایبەتی لەتەوەری ژنەوە بەرەو زانست و سۆسیۆلۆژیای ڕاست دەنرێت. نەک تەنیا لەبواری سۆسیۆلۆژیا بەڵکو لەبوارەکانی هونەر و فەلسەفەشدا پێویستە یەکەم هەنگاو لەدەوری ئەو پەیوەندییە بهاوێژرێت. هیچ پێویست ناکات بڵێین بەو سیفەتەی لقێکی فەلسەفەن پێویستە ئەولەویەتی ئەخلاق و ئایینیش لەو بوارە بێت. ئایین و ئەخلاق بە ڕادەی پێویست بەو بوارە بەستراونەتەوە.

مایەپووچبوونی هێزەکانی چەوسانەوە و دەسەڵاتی هەژموونگەرایی سەردەمەکەمان زیاتر لە داڕووخانەکەی هاوژیانیدا دەکەوێتەڕوو. مێژووی پەیوەندی نێوان ژن - پیاو مانای خۆی لەدەست داوە، بەدۆخێکی لەناوچوون گەیشتووە کە نە لەگەڵیدا و نە بە بێ ئەو هیچ دۆخێکیان نابێت. ئەوانەی شۆڕشی سەرەتایان لەسەر بنەمای شیکارکردنی ئەو ڕەوشە کائیۆسییە پەرە پێنادەن، جگە لەدرێژەدان بە کائیۆس هیچ دەرفەت و چانسێکی دیکەیان نییە. ئەوانەی پێهەڵگرتنی شەخسی و جفاتی ئەنجام دەدەن، تەنیا کاتێک لەلایەنەکانی زانستی، هونەری و فەلسەفییەوە ئەو بوارە بەبنەما بگرن، دەتوانن هەنگاو بەرەو هاوژیانی ئازاد بهاوێژن. وەک مەزەندە دەکرێت یەکەمین هەنگاوی ئەو پێهەڵگرتنە هەنگاوێکی تایبەت و تاکانەی نێوان دوو کەس نییە، بەڵکو یەکەمین هەنگاوە کە سەبارەت بە پەرەپێدانی کۆمەڵگای دیموکراتیک و سۆسیالیستی دەنرێت.

بەر لەهەموو شتێک پێویستە سۆسیالیستبوون پەیوەستی جێگیرکردنی ئاستی ئازادی هاوژیانی بێت. پێویستە شێوازی ژیانێکی مەزنی پرەنسیپی و دژواری کرداری بەبنەما بگیرێت کە لەسەرەتای ژیانی میتۆلۆژی کۆن و ئایینی دەبینرێت. تەنیا لەمیانەی دەربازکردنی شێوە و ناوەڕۆکی ماڵیکەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و سیستەمەکانی شارستانیەوە بونیادی سۆسیالیستیانەی هاوژیانی جێگای باس دەبێت. ئەو ڕەچەڵەکگەرێتی (بەمانای زۆربوون)، گەمەکانی ماڵیکردن و زایەندگەرێتیەی سیستەم گشتاندوویەتی پەیوەندییەکی بە "هاوسەرێتی سەر یەک سەرین" ەوە نییە. بەتایبەتیش پەیوەندی بە جووتبوونی زایەندی ڕۆژانەییەوە نییە کە لەدۆخی ئێستاماندا تەواو کراوە بەنەخۆشیەک. نەبوونی جووتبوونی زایەندی ڕۆژانە لەهیچ گیانلەبەرێکدا، بەپێچەوانەوە

پەیڕەوکردنی بەشێوەیەکی خولی دەیسەلمێنێت کە زایەند لەجۆری مرۆڤ بەشێوازی کۆمەڵگا بونیادنراوە. برسێتی زایەندی و زێدەڕۆیی کردن لە پەیوەندی زایەندی پابەندی بونیادی کۆمەڵگا و دەسەڵاتی هەژموونگەرایییە. ئەو رەگەزپەرستیەی بەسەر ژندا دەسەپێنرێت، بەهەموو شێوەکانیەوە خۆی وەک بەرجەستەکردنی دەسەڵات دەخاتەڕوو. ئەو رەگەزپەرستییە نەک هەر تەنیا بەختەوەری پێنابەخشێت، بەڵکو بەتەواوی سەرچاوەی نەخۆشی و بێ هیواییە، لەناوچوون و مردنی پێشوەختە. بونیادی هیچ پیاو یان ژنێک ئەو پێکهاتەیەی نییە لەگەڵ ئەو شێوازەی زایەندگەرێتی رەگەزپەرستیدا بگونجێت. بەتایبەتیش ئەو زایەندگەرێتیەی سەرمایەداری لەمیانەی رێکلامچێتی ژنەوە دەیوروژێنێت بەتەواوی پەیوەندی بە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیەوەیە، لەپێناو جێبەجێکردنی یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجە. دەتوانین بڵێین هیچ پەیوەندییەک هێندەی رەگەزپەرستی کۆمەڵایەتی هێز و توانای هەڵگرتنی سیستەمی نییە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئانتی ـ سەرمایەداری تەنیا لەرێگای رەتکردنەوەی ئەو ژیانەی شێوازی رەگەزپەرستی و دەربازکردنیەوە بەدیدێت.

ئەو ئاستەی لەپەیوەندیەکانی هاوژیانی پەرەی پێدەدرێت چەندە زانستی، هونەری و فەلسەفی بێت، بەو رادەیە دەشێت رێگا لەپێش شێوازی ژیانی سۆسیالستی بکاتەوە. بەر لەهەموو شتێک ئاواکردن و پەیڕەوکردنی سۆسیالیزم لەپەیوەندیەکانی هاوژیانیدا بەهایەکی کرداری و پرەنسیپانەی دەست لێبەرنەدراو و ژیانی هەیە. لەدەرەوەی ئەو شێوازەی پەیوەندی رێگایەکی دیکە نییە بەرەو سۆسیالیزمت ببات. ئەگەر هەش بێت، ئەو پەیوەندیانە ناراستەوخۆن و بۆ هەڵە کراوەن. نرخاندن و تێگەیشتنی هاوژیانی سۆسیالیستانە وەک پەیوەندی نێوان دووکەس هەڵوێستێکی ناتەواوە. بێگومان دەشێت هاوژینی بەرجەستەکردنی دووانەیی بەخۆوە ببینێت، بەڵام ناشێت بۆ ئەو نۆخە بچووک بکرێتەوە. هاوژیانی هێزی گەورەی مانا، ئەستاتیک و جوانییە، بەشێوەیەکی دەرهەستیش ژیانێکی گەوهەرییە.

ژن و پیاوەکانی پەیوەست بە ژیانی سۆسیالیستانە کەی لەبواری گەردوونی و جڤاتی ژیانی ئازاد بەرجەستە بکەن، ئەوا وەک تاکیش دەتوانن چانس و دەرفەتی ژیانێکی راست و جوان بەدەست بێنن. لەسەرجەم بزاوتە گەورەکانی کۆمەڵگادا دەشێت ئەو راستییە ببینرێت. تێکەڵ نەکردنی ژیانی تاک (کەسی) لەگەڵ گەمەکانی هاوسەرگیرێتی ئێستا و شێوە خراپترەکەی دەرەوەی هاوسەرگیری گرنگ و بایەخدارە. وێڕای ئەوەی لە ژیانی تاکانەیی (کەسی) دا تەواوی پۆتانسیێلی گەردوونیبوون و جڤاتبوون شاراوەیە، بەڵام بەشێوەکانی دەرەوەی هاوسەرێتی و ماڵیکردنی تایبەتی شارستانیو مۆدێرنیتە نکوڵیکردن لەگەردوونی بوونو جڤاتبوون جێگای باسە. ئەو جیاوازییە نەکرێت ژیانی ئازادانەی پاژەی سۆسیالیستانە بەدی نایەت. ئەو مرۆڤەی، بەتایبەتیش ئەو ژنەی دەکەوێتە ناو چوارچێوەی پەیوەندی سۆسیالیستیەوە لەمیانەی ئەو فەلسەفیبوون، ئەخلاقی، جوانی و زانستیبوونەی لەخۆیدا بەرجەستەی دەکات خاوەن هێزێکی گەورەی راکێشانە. کەسایەتی ئەمجۆرە ژن و پیاوانە وەک چۆن لەبەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتیدا دووچاری شکست نایەن،

لەمیانەی هەبوونی خۆیانەوە ژیانی ئازادی کۆمەڵگاش بونیاد دەنێن. چونکە لە جووتی ئەو تاک (کەس)انەدا رێزگرتن و متمانە زاڵە، نەخۆشیەکانی سیستەم لەجۆری ئێرەیی، برسێتی، ناجێگیری و بێزاربوون جێگایان نابێتەوە. لەبەرئەوەی یەکتری ناکەن بەموڵک بانگەشەی ماف بەرامبەر بەیەکتری ناکەن (کە ئەمە لە یاسای بۆرژوازیدا هەیە). هێزی مانای هاوسەنگیان لەو دۆخە دایە کە لە کەسێکدا گشت، لەگشتیشدا کەسێک بژێنێت.

بزووتنەوەکانی کۆمەڵگای مێژوویی تەنیا لەمیانەی ئەمجۆرە کەسایەتیانەوە بەسەرکەوتن دەگات کە مانای وەهایان بەدەستهێناوە. ئەو کەسایەتیانە ناچارن بەمانای راستەقینەی وشە وەک سۆسیالیست بناسرێن، یادیان بکرێتەوە و چاوەڕوانیان بکرێت.

رەچاوکردنی هەندێک ئەزموونی گرنگی مێژوویی جێبەجێکردنی تیۆری هاوژیانی ئازاد لە پەرەسەندنی کۆمەڵگای سۆسیالیستدا گرنگ و بایەخدارە. لەو بارەیەوە ئایینی کرستیانی ژیانی رەبەنێتی بۆ کادیرەکانی کردووە بە مەرج. ئەو هەنگاوە رۆڵێکی گرنگی لە پەرەسەندنی شارستانی خۆرئاوادا بینیوە. لەمیانەی ئەو پرۆسەیەی دەرهەق بەکادیرانەوە پەیڕەوی کردووە کرستیانی خراپیەکانی کۆمەڵگای رەگەزپەرستی سنووردار کردووە. جڵەوکردنی فشاری زایەندگەری سەر زهنیەت لەلایەن روحانیەتەوە رۆڵێکی گرنگی لەپەرەسەندنی کۆمەڵگابووندا بینیوە. بەڵام رێگای لەپێش پەرەسەندنی دیالیکتیکی نەکردۆتەوە کە دەرفەتی هاوژیانی ئازاد دەڕەخسێنێت؛ ئەوەی بەشێوەیەکی پەرچەکرداری لەبەرامبەریدا سەریهەڵداوە تەقینەوەی رەگەزپەرستی کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بووە. ژیانی مۆدێرنی موڵکداری یەک ژنی وەک شێوازێکی ژیانی دژ بە کلتووری رەبەنێتی راهیبەکان دووەمین خاڵی ئەوپەڕگەری و جەمسەرگەرێتی ئافراندووە. کلتووری رەبەنێتی کرستیانی لەژێر تەنگژەی ژیانی تاک ژنی مۆدێرندا شاراوەیە. هەردوو کلتووریش لەدەربازکردنی کۆمەڵگای رەگەزپەرستدا بنبەستبوون. ئەو راستییە لە تەنگژەی کلتووری کۆمەڵگای رەگەزپەرستی خۆرئاوادا شاراوەیە.

رێگەچارەی ئیسلامیش سەبارەت بە بابەتەکە سەرکەوتوو نەبووە. ئیسلام کە بە پێچەوانەی ژیانی رەبەنی راهیبەکان ئەولەویەتی بەتێرکردنی زایەندی داوە، لەو بڕوایەدا بووە کە لەمیانەی فرەژنی و دۆخی کەنیزەکی ژنەوە کێشەکانی چارەسەر دەکات. پەیڕەوکردنی دۆخی ژنانی حەرەمسەرا لەئیسلامدا بەجۆرێک لەجۆرەکان رۆڵی سۆزانیخانەی تایبەتکراو دەبینێت. جیاوازیەکەی لەگەڵ سۆزانیخانە لەوەدایە کە تایبەت بەچەند کەسێکە، لەناوەڕۆکدا جیاوازیەکیان نییە. ئەو کردەوانەی کۆمەڵگای رەگەزپەرست رۆڵێکی دیاریکەریان هەیە لە دواکەوتنی کۆمەڵگای خۆرهەڵات بەرامبەر بە کۆمەڵگای خۆرئاوا. لەکاتێکدا جڵەوکردنی زایەند لەلایەن ئایینی کریستیانیەوە رێگا بۆ مۆدێرنیتە دەکاتەوە، پشتگیریکردن و هاندانی تێرکردنی زێدەڕۆییانەی زایەندی لەلایەن ئیسلامەوە لەو بارەیەوە رێگای لەپێش دۆخێکی دواکەوتووتر لەکۆمەڵگای جاران و شکست بەرامبەر کۆمەڵگای مۆدێرنیتەی خۆرئاوا کردۆتەوە. رەگەزپەرستی کۆمەڵگا رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە ژێرکەوتنی ژن و پیاوی خۆرهەڵات بەرامبەر بە ژن و پیاوی خۆرئاوا. لەمەزندەکان زیاتر رەگەزگەرایی کاریگەری دەکاتە سەر پەرەسەندنی کۆمەڵگا. سەبارەت بە کرانەوەی

جیاوازی نێوان کۆمەڵگای خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێویستە بەبایەخەوە هەڵوەستە لەسەر ڕۆڵی ڕەگەزگەرایی بکرێت. چەمکی ڕەگەزگەرایی ئیسلام لەبواری قووڵایی بەکۆیلەکردنی ژن و پتەوکردنی دەسەڵاتگەرێتی پیاو بە بەراورد لەگەڵ شارستانی خۆرئاوا ئەنجامی زۆر خراپ و نەرێنیتری ئافراندووە.

کاتێک پراکتیکی هاوژیانی ئازاد پێشدەخەین خاڵگەلێکی گرنگ جێگای باسن کە پێویستە لەلایەن ژن و پیاوەوە ڕەچاو بکرێت. ئەو پێویستیانە بەو شێوەیەی خوارەوە دەستنیشان دەکەین کە دەبێت ئەو ژنە ئەنجامی بدات کە دەرفەتی ژیانی ئازادی هەیە یاخود خوازیارە ئەو چانسە بەدەست بێنێت:

أ- ئەو هاوبەشی یان پشکدارییە زایەندییەی ژن لەگەڵ پیاو ئەنجامیدەدات تەنیا تێربوونێکی جەستەیی رووت نییە، پێویستە پێشتر بزانێت ڕووبەڕووی چڕنوکی هێز و دەسەڵاتێک دەبێتەوە: وەک ئەوەیە لەناو قەفەسدا لەگەڵ پڵنگ بخەوێت. بەتایبەتیش دۆخی برسێتی و دیلی پڵنگەکەی ناو قەفەس لەوانەیە ڕێگا خۆشکەربێت کە پیاو بەشێوەیەکی کوشندەبر چڕنووکەکانی بەکاربێنێت. پێویستە ژن زۆر بەچاکی بزانێت کاتێک لەمیانەی پەیوەندی هاوسەرگیری کلاسیکەوە جارێک کەوتە ناو قەفەسەوە بەئاسانی و بەسەلامەتی دەرناکەوێت؛ باجەکەی یان گیانی دەبێت یاخود ئەویش دەبێت بە مێ پڵنگێکی رادەستبوو. شێوەی پڵنگی مێینەش نوێنەرایەتی ژنی بەپیاو بوو دەکات؛ ئەوەش قێزەون و چەپەڵە. پەیوەندی زایەندی نێوان پیاوی هەژموونگەرا و ژنە پیاوانیەکەی تەواو ڕادەستی بووە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە ڕوودانی ئەو قێزەونی و چەپەڵیەدا. لەکاتێکدا پیاوان بە سەرفرازییەوە ڕۆژی "دڕاندنی پەردەی کچێنی" ژن بەسەر دەبن، هۆکارەکەی تێربوونی ئارەزوو (دیاردەی جەستەیی) نییە، بەڵکو پشکی ئەو پەیوەندییەیە لە دروستبوونی پەیوەندی دەسەڵات ـ کۆیلەدا. دڕاندنی پەردەی کچێنی سەرەتای مەحکومکردنی ژنە بە کۆیلایەتی بێکۆتاوە. ڕێگا لەپێش هەستی دەسەڵات و سەرداری دەکاتەوە. ئەوەش مانای سەلماندنی پیاوێتی دەبەخشێت. دواتر ئەو ڕێبازە لەسەر کوڕە لاوەکانیش پەیڕەو دەکرێت. دامەزراوەی کۆیلایەتی لەسەر هەردوو ڕەگەزیش پەیڕەوکراوە. هێندەی پیاو بەپەرۆشنەبوونی ژنان و ڕانەکردنیان بەدوای پەیوەندی زایەندیدا پەیوەندی بەدامەزراوەی کۆیلایەتیەوە هەیە. چالاکی زایەندی کە بەشێوەیەکی بێ سنوور لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە زیادکراوە، بەرفراوانترین ئامرازی کۆیلایەتییە کە بەسەر جۆری مرۆڤدا سەپێنراوە؛ ڕێگا لەپێش دەرفەتێکی بێ سنووری دەسەڵات و چەوسانەوە دەکاتەوە. هەڵوێستی بەگومانی زۆربەی ئاینەکان بەرامبەر بەو پەیوەندییە واتادارە، پەیوەندی بەرێخۆشکردن بۆ کەوتن، چەپەڵی و دەرکەوتن لە حەقیقەتەوە هەیە.

ب ـ ئەگەر لەدۆخی هاوسەرێتیەکی هاوتادا نەبێت، پێویستە ژن ئاگادار بێت کە پیاو بەردەوام بە سایکۆلۆژیای پڵنگ ڕەفتار دەکات و هەر ساتێک بۆ ڕاوکردنی نێچیرەکەی ئامادەیە، پێویستە بەگوێرەی ئەوەش شێوازی جموجۆڵ و ڕەفتاری خۆی دەستنیشان بکات. کاتێک پیاوی پڵنگی دەرفەت ببینێت، واتە ئەو بەربەستە کۆمەڵایەتیانە دەرباز بکات کە دێنە پێشەوە مسۆگەر چڕنوکێک لە ژن دەوەشێنێت. لەو ساتەدا پیاوی دەسەڵاتگەرا هیچ

پێوانێکی ئەخلاقیو پاساوێکی ویژدانی ناناسێتو خوازیارە ژن ڕاو بکات. نە بەرگی ئایینیو نە یاسا هیچ یەکێکیان لەبەردەم ئەودا کۆسپ نین. پێویستە ژن ئاگاداری ئەو ڕەوشە بێتو بەگوێرەی ئەمە دابەزێتە مەیدانە کۆمەڵایەتیەکانەوە. بە مانایەکیتر بە بێ گەرەنتی بەرگرییەکی خۆیی کارا بۆ مەیدانە کۆمەڵایەتیەکان دانەبەزێت.

ج ـ پێویستە زۆر باش بزانێت کە لەمیانەی بەکارهێنانی پارە و ئەو ڕێبازانەی توندوتیژی کە گوزارشت لە هێزی دەسەلات دەکەن، ڕێبازی نەرمیش کە هێزی هونەر، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەدەبیات، پیشانیدەدات ئامانجی سەرەکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری؛ ژن بکات بە کۆیلەیەکی مۆدێرن. لەڕێگای دەسەلاتەوە بێت یان بەڵێنە بەردەوامەکانی ئەشقەوە، مۆدێرنیتە چەندین قات هێندەی پیاوی کۆمەڵگای کۆن زیاتر بەرامبەر بە ژن لەپێگەی هێزی هێرشبەر دایە. بەرامبەر بەو هێزە ترسناکەی باڵادەستی پیاو سەبارەت بە بابەتی پارە و ئەشق بە دواداچوون و لێگەڕینی ژن بۆ ژیانی ئازاد جگە لە خەیاڵێکی پووچ هیچ واتایەکی دیکە نابەخشێت. بەو هەموو ڕەفتارە جوان و دڵسۆزیەیەوە چەندە هەڵوێست بنوێنێت و بەدوای هاوژیانی ئازاددا هەوڵ بدات، بەرامبەر بەپیاوی مۆدێرنیتەی دەستبەکار لە دۆڕاندن ڕزگاری نابێت. واتە هەموو ڕێگایەک بەرەو کۆیلایەتی مۆدێرنی ژنی دەبات.

د ـ وێڕای تەواوی ئەو کۆمەڵگا پیاوسالارییە، ئەگەر ژن لەسەر ئازادی سووربێت، ئەوکاتە پێویستە بەرگەی ژیانێکی تەنیایی مەزن یان زەحمەتیەکانی میلیتانێتیەک بگرێت کە هەر ساتێکی پڕ لە تێکۆشانی سۆسیالیستانە بەسەر دەچێت. تەنیایی بۆ دۆخە مارژینال و بێکاریگەرەکان جێگای باسە. هەرچی ژیانی سۆسیالیستانەیە پێویستی بە ژیانی مێخوداوەندی هەیە کە لەگەڵ کلتووری کۆنی مێخوداوەندیدا هاوتابێت. پێویستە ئەو خاڵە ڕەچاو بکات: یەکێک لە خەسڵەتەکانی مێخوداوەندێتی هاوسەرگیری لەگەڵ پیاو نەدەکرد. وەک لەدیرۆکەوە ئاگادارین کاتێک پیاویش بوو بەخوداوەند شوێنپەنجەیەکی ئەوتۆی مێخوداوەند دیار نەمابوو. ئەوەی دەمێنێتەوە بەفریشتە بوونە. بەڵام ئافرەتی فریشتە نوێنەرایەتی ئەو ژنە بێهێزە دەکات کە تۆزێک هێزی ڕەگەزی لەدەستداوە. ڕۆڵی ئەو چەشنە ژنە لەناو کۆمەڵگادا دۆخی پەیامبەری تێپەڕ ناکات. شێوەی ئینانا ـ ئەفرۆدیتی میتۆلۆژیاش هەر یەکەو هێمای ژنێکی جیاوازترە؛ نوێنەرایەتی ئەو ژنە دەکات کە هێشتا جوانی، سەرنجڕاکێشی ڕەگەزی و هێزی جەستەیی خۆی لەدەستنەداوە. ئینانا ـ ئەفرۆدیت بەسیفەتی مێخوداوەندی ئەشق ئەو فاکتەرەیە کە پەیجووری هاوژیانییە. ئەو فاکتەرەیە کە هاوبەشێتی هاوژیانی ئازاد دەکات. پێویستە باش تێبگەین کە فاکتەرێکی بەمجۆرە تەنیا دەشێت پیاوێکی پرۆمۆتۆسی نیمچە ـ خوداوەند ـ مرۆڤ هاوژیانی بێت. لەدیرۆک و ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا ئەو فاکتەرە یاخود پیاوە تەنیا دەشێت وەک شێوەیەک وێنابکرێت. بەرجەستەکردنیشی تەنیا دەشێت لەئاکامی تێکۆشان و جەنگاوەرێتیەکی نائاسییەوە بەدیبێت. تا خوداوەندە ڕووتەکان تێکنەشکێنێت کە بەهێزە مەترسیدارەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە چەکدارکراون ناتوانێت خۆی بئافرێنێت. ئەمە ئافراندنێکی زەحمەتە بەڵام

مەحاڵ نییە. سۆسیالیستبوونیش تارادەیەک لەمیانەی بەرجەستەکردنی شێوە و خەیاڵی ئینانا ـ ئافرۆدیت و پرۆمیتۆس بەدیدێت.

ئەو هەنگاوانەی پێویستە پیاوی پەیجووری هاوژیانی ئازاد بیهاوێژێت دەتوانین بەمشێوەیە کورتیان بکەینەوە:

أ ـ ئەو پیاوە پێویستە بزانێت ئەو ژنەی بەرامبەری قووت کراوەتەوە لەژێر سایەی شارستانی پێنج هەزار ساڵی و هەژموونگەرایی پێنجسەد ساڵەی سەرمایەداری دووچاری هەلومەرجەکانی هەموو جۆرە کۆیلایەتیەک هاتووە. تاکە رێگەچارەی ئەو ژنە بەرامبەر پیاوی پڵنگی ئەوەیە ببێتە مێیینەیەکی پڵنگی. سەرجەم ستراتیژ و تەکتیکەکانی ژیانی بەشێوەیەکی ساتەوەختی لەسەر ئەو بنەمایە بونیادنراوە. ئەگەر بەپێچەوانەوە بیخوێنینەوە. ئەویش بەگوێرەی خۆی قەفەسێکی هەیە کە خوازیارە هاوتا نێرەکەی تێدا بەند بکات. ئەگەر پیاو بەدوای هاوژیانی ئازاددا بگەڕێت، ئەوا رزگاربوونی لە ستراتیژی و تەکتیکەکانی ئەم چەشنە ژنە بەلانی کەم هێندەی ژنە کۆیلەکە زەحمەتە. رزگاربوون لە ستراتیژ و تەکتیکەکانی ئەو چەشنە ژنە کە بەسیفەتی دژە کۆیلایەتی دەیسەپێنێت بۆ ئەو پیاوەی بەدوای هاوژیانی ئازادەوەیە پێویستە بوارێکی لەپێشینەی تێکۆشان بێت، لێرەدا سەرکەوتوو نەبێت تەنانەت تاکە هەنگاوێکیش بۆ تێکۆشانی کۆمەڵگای سۆسیالیستانە ناهاوێژێت.

ب ـ ئەو پیاوەی لەدۆخی هاوسەرگیری دایە پێویستە ئاگاداربێت کە بەلانی کەم هێندەی ژن دووچاری کاریگەریەکانی دامەزراوەی کۆیلایەتی هاتووە. لەپێناو دەربازکردنی کاریگەرییە نەرێنیەکانی دامەزراوەکە لەجیاتی ماڵ پێویستە ئەو پیاوە بەردەوام بەدوای ژیانی سۆسیالیستیانەوە بێت و هەوڵی بۆ بدات. ژیان لەگەڵ ژنی کۆیلەدا ژیانێکی کۆیلایەتییە، ژیانێکی چەوتە. دەربازکردنی کلتووری سۆزانیخانەی تایبەتکراو پێویستی بە سەرکەوتن لەبواری دەستەبەرکردنی کلتووری هاوژیانی ئازاد هەیە.

ج ـ پێویستە بە شێوەیەکی هەمیشەیی و سەرکەوتوانە بەردەوام شەڕی نەفس بەرامبەر کلتووری فریودەری زایەندگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامبدرێت. ئەو ستراتیژو تەکتیکانەی لەپێناو تەسلیمگرتنی پیاو پێشخران بە لانی کەم هێندەی دیلێتی ژن لەناوبەرە. پێویستە لەبیر نەکەین لە کاتێکدا لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەلایەکەوە پیاو تەنیا لەلایەنی بایۆلۆژیەوە بۆ پیاوێتیەکی زلکراو گۆڕاوە، لەلایەکی دیکەوە بە هەموو کلتوورە کۆمەڵایەتیەکەیەوە کراوە بە ژن. لە کاتێکدا پیاوی بایۆلۆژی رەگەزپەرست و زلکراو لە لایەکەوە دەکرێتە پڵنگ، لە لایەکی دیکەوە لەمیانەی کلتووری ژنانە (ژنی کۆیلە) وە دەکرێت بە پشیلەیەکی بە کلتوور. ئەو پیاوێتیە تێکنەشکێنرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەیسەپێنێت، ئەوا نابێت بە سۆسیالیست و تێکۆشانی کۆمەڵگای سۆسیالیستی ئەنجام نادرێت.

د ـ بەرامبەر تەواوی ئەو فاکتەرە نەرێنیانە لەپێناو هاوژیانی ئازاددا؛ بەلانی کەم هێندەی ژنی ئازاد پێویستی بەتێکۆشانی پیاوی ئازاد هەیە. پیاوێتی ئازاد تەنیا لەمیانەی دەربازکردنی کەسایەتی ئەو پیاوە بەدیدێت کە کۆمەڵگای پیاوسالاری کردوویەتی بەکۆیلە.

پێویستە پایەی عاریفی (ألعلامة) بەدەست بێنێت کە تا ئێستاش لەراستینەی کۆمەڵگاکەماندا پەسەندکراوە. بەو رادەیەی "مرۆڤ وەک پیاو لەدایک نابێت، بەڵکو مرۆڤ دەبێت بە پیاو"، وەک پیاوی شارستانی لەدایک دەبێت، بەڵام دەبێت بە پیاوی ئازادیش. لەو سەردەمەماندا تەنیا لەمیانەی زانست، فەلسەفە و مۆدێرنیتەی دیموکراتیکەوە خەیاڵی پیاوی پرۆمیتۆسی بەرجەستە دەبێت. پێویستە بەبایەخەوە تێبگات کە میتۆلۆژیا، ئایین، فەلسەفە، زانست و هونەر لەپێناو ژیانن و سەرەکیترین ڕۆڵیشیان بەرجەستەکردن و ئاواکردنی هاوژیانی ئازادە، هەربۆیەش ئەوە بکات بە ئەخلاق و ئەستاتیکا. هاوسەرێتییە هاوچەرخەکانی ئێستا بەردەوامی کلتووری پلەداری خانەدانێتی (کلتوورێکی نزیکەی حەوت هەزار ساڵییە) یە، بەو سیفەتەی سەرەکیترین بواری ئافراندنی بەهاکانی کۆمەڵگای دەوڵەتییە، لە بەرزترین ئاستدا بەشێوازی نامووس و نۆرم دەستدرێژی دەرخواردی کەسایەتی ژن و پیاو دراوە. پێویستە نەبوونی ئەشق، لێکجیابوونەوە و هەڵوەشانەوەی خێزان وەک ئاکامی کلتووری لاقەکردن و دەستدرێژی ببینرێت کە بەئامانجی دەسەڵات و چەوسانەوە لە کەسایەتیەکان بارکراون. کۆمەڵگای ئازاد و سۆسیالیست تەنیا لەلایەن ئەو کەسایەتیانەوە دەئافرێنرێت کە بەرامبەر بە کلتووری لاقەکردن و دەستدرێژی سات بەسات بە فەلسەفە، زانست، ئەخلاق و ئەستاتیکا بارکراوە. ئاشکرایە ئەو هاوژیانە ئازادانەی لەسەر ئەو بنەمایە ئاوا دەکرێن بەردەوام جوانی، راستی و چاکە بۆ تاک و کۆمەڵگا بەرهەم دێنن.

ئەو ژیانە پەرچوویی و تەلیسماوییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وێرانی کرد تەنیا لەمیانەی هاوژیانی ئازاد، کەسایەتییە سۆسیالیستەکەی و تێکۆشانە کۆمەڵایەتیەکەی بەدەست دەهێنرێتەوە و دەتوانین هاوبەشێتی تێدا بکەین. لەو پێناوەشدا پێویستە هەر لەمنداڵیەوە، بەتایبەتیش کیژۆڵە بچووکەکانمان لەمیانەی زهنیەتی ئازادیەوە لە دامەزراوەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیەوە پەروەردە بکەین، لەرێگای تێکۆشانی کۆمەڵایەتی سۆسیالیستی دیموکراتیانەوە جێبەجێی بکەین و وەک شێوازی ژیانمان پەسەندی بکەین، ئازادی بکەین و سەرکەوتوو بین.

## بەشی دووەم

# راستینەی کورد

بوون و هۆشیاری سەرەکیترین کێشەی فەلسەفەیە. خودی دەستەواژەی بوون لەسەرووی ئەو دەستەواژە فەلسەفیانەوە دێت کە تائێستاش جێگای مەراقە. دووەمین دەستەواژەی تەنیشتیشی زەمانە. هەردووکیان لەیەکتری جیانابنەوە. وەک چۆن بە بێ زەمان (کات) ناشێت بیر لەبوون بکرێتەوە، بەبێ بوون کاتیش بوونی نییە. کات بەتەواوی پەیوەست بە بوونە. پەیوەندی نێوانیان زیاتر پابەندی دەستەواژەی ژیانە. مسۆگەر بوون و کات لەمیانەی نەشونماکردن (نشوء)ـەوە دێنە بوون. لەبووندا کات نەشونماکردن (نشوء) دەکات بەناچاری. بە واتایەکیتر بەردەوامی بوون بە نەشونماکردنەوە بەدیدێت. کاتێک باسی بوونێکمان کرد کە دەژێت واتە کات لەدایک بووە. نەشونماکردن هەبێت: بۆ نموونە لەشوێنێکدا دوو جۆرە گوڵ لە ئارادابن، واتە بوون و کات لەو شوێنەدا جێگای باسن. نەبوونی نەشونماکردن مانای نەبوونی بوون و کاتە. نەشونماکردن دۆخی جیاوازی و شێوەگرتنی بوونە. ئەو بوونەی لەدۆخی نەشونماکردندا نییە بوون و کاتێکی نەبووە.

نەشونماکردن، رەوشی جیاوازی ئەو هوشیارییەیە کە لە دۆخی پۆتانسیێلدایە. لەوانەیە جیاوازی یەکەمین هەنگاوی هەڵکشان بێت بەرەو هوشیاری. بوون لەمیانەی کاتەوە نەشونما بکات و جیاواز بێت، واتە یەکەمین هەنگاوی خۆی بۆ هوشیاری دەهاوێژێت. چەندە نەشونما، فۆرم و شێوە (گشتیان هەمان واتایان هەیە) هەبێت واتە هێندە هوشیاری لە ئارادایە. بە مانا گەردوونییەکەی هوشیاری؛ جیاوازییە، هەرچی هوشیارییە بەسیفەتی پۆلێن یان کۆمەڵ دۆخی گشتی گەردوونی تەواوی هوشیاریی جیاوازیەکانە. بەڵام دۆخەکانی هوشیاریی بێکۆتای فۆرمەکان مانای بێکۆتا دەبەخشێت. چەند فۆرم (شێوە)ی جیاوازی هەبێت، هێندە هوشیاریی جیاوازیش جێگای باسە. دەستەواژەی هوشیاری (رۆح) لای هیگل بەر لە فۆرم دێت. بە مانایەکی تر هوشیاریی بێ فۆرم و بێ شێوە جێگای باسە. لای هیگل فۆرم لەسروشتی جەستەییەوە دەستپێدەکات و تا دەوڵەت بەرزیدەکاتەوە. لەرێگای فۆرمەکانەوە هوشیاری خوازیارە لەدۆخی هەرەمەکیەوە (بێ فۆرمی) ببێت بە هوشیارییەکی تایبەت بەخۆی. لەمیانەی فۆرمە جەستەیی،

بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتیەکانەوە هوشیاری هەم خۆی دەناسێت هەم دەسەلمێنێت. هوشیاری لای مرۆڤ ئەو هوشیاریەیە کە هەنگاوی بۆ پەیبردن بەخۆی هاوێشتووە. هوشیاریی فەلسەفی کاملترین دۆخی هوشیارییە. بەسیفەتی ئەو هوشیارییەی هەستی بەبوون و جیاوازی خۆی کردووە بۆ یەکەمین دۆخی خۆی دەگەڕێتەوە؛ بەڵام بەو سیفەتەی هەستی بەخۆی کردووە، واتە وەک هوشیاریی ڕەها. دەشێت ئەوە بە بوون یان سەرکێشی کاتیش ناوزەد بکەین. ئەو شێوازەی بیرکردنەوە کە لە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵات زیاتر لەڕێگای باوەڕیی ئایینی و تەسەوفەوە پێی گەیشتوون کۆمەڵگای خۆرئاوا لەڕێگای زانست و فەلسەفەوە پێی گەیشتووە.

ئەوەی سەبارەت بە بابەتەکەمانەوە گرنگە ڕوونکردنەوەی پەیوەندی نێوان نەشونماکردن ـ بوون ـ هوشیاری و ماناداركردنیانە. کاتێک کوردان بابەتی باس بن ئەوا دەستەواژەکانی بوون، نەشونماکردن و هوشیاری تابڵێی ڕۆشنکەرەوە دەبێت. کۆششکردن بۆ پێناسەکردن یان ناساندنی کوردان بە دۆخی بوون، نەشونماکردن و هوشیاری، بناغەی تێگەیشتنێکی ریشەییانەی بابەتەکەیە. تا قۆناغێکی نزیکیش بوونی کوردان سەبارەت بە زۆربەی بەشەکانی کۆمەڵگا و دەوڵەت بابەتێکی گفتوگۆ بوو. کوردان لەپێناو سەلماندنی بوونی خۆیان لەو دوو سەدەیەی دوایی لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دووچاری توندوتیژی، فشار و سەرکوتکردنی گەوهەری و رووالەتی، نکوڵی و قڕکردنێک هاتووە کە هیچ پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی دووچاری نەهاتووە. ژینۆسایدی کلتووری و جەستەییان لەسەر بەڕێوەبراوە. لەپێناو پارچەکردنی فیزیۆلۆژی (جەستەیی) و کلتووری (زهنی) و نکوڵیکردن هەموو جۆرە ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی و توندوتیژی لە جوگرافیای دایک (کوردستان) دەستبەکار بوو. دەتوانین بڵێین؛ تا دەگاتە ژینۆساید هیچ میکانیزمێکی سەرکوتکردن و تالانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەما کە پەیڕەو نەکرێت. لەبەر ئەو هۆکارە کوردێتی یان کوردبوون دیاردەیەکە هاوشێوەکەی نییە. سەبارەت بەو ژینۆسایدەی یەهودیەکان دووچاری هاتن بەشێوەیەکی تایبەت دەستەواژەی "بێهاوتا"و "تاقانە" بەکاردێنن. نەک تەنیا بەهۆی ئەو ژینۆسایدەی دووچاری هاتن، بەڵکو بەهۆی تەواوی ئەو کردەوانەی لەپێناو نەهێشتنی بوونیان ئەنجامدراوە بەکارهێنانی گوزارشتی "گەلی تاقانە" یاخود "بوونی کۆمەڵایەتی تاقانە" سەبارەت بە کوردان لەجێگای خۆیدا دەبێت.

تێکۆشانی ئەو سی ساڵەی دوایی لە کەسایەتی PKK دا بەڕێوەچوو تەنیا لەپێناو کێشەی بوونی کوردان ئەنجامدرا. بەمانایەک لەماناکان ئەو تێکۆشانە تێکۆشانی یەکلایی کردنەوەی پرسیاری؛ کورد هەیە یان نا؟ بوو. یەکێک لەلایەنەکان بەشێوەیەکی خۆکوژیانە دەیگوت هەیە، لایەنی بەرامبەریش دەیگوت نییە. لەمەش زیاتر و خەجاڵەتتر، شەست ساڵی بەر لەو سی ساڵەی دوایی مەسەلەی سەرەکی لەلایەن ڕۆشنبیرانی کورد کۆشش بوو لەپێناو سەلماندنی بوونی کوردان. بێگومان گفتوگۆکردن لەبارەی بوونی خۆیەوە بۆ تاک و کۆمەڵگایەک زۆر مەترسیدارە و دۆخێکی نارەسەنییە، ئەمەش هێمایە بۆ ئەو هێڵە

باریکەی نێوان ژیان و مردن. هیچ بوونێکی کۆمەڵایەتی لەمێژوودا دووچاری ئەو دۆخە نەهاتووە، یاخود زۆر کەمن ئەو بوونە کۆمەڵایەتیانەی کە دووچاری ئەمجۆرە هۆڤێتییە هاتوون. هیچ بوونێکی کۆمەڵایەتی هێندەی کوردان دووچاری رەوشێک نەکراون شەرم لەخۆیان بکەن و نکوڵیکردن پەسەند بکەن یاخود ژمارەیەکی زۆر کەمی بوونە کۆمەڵایەتیەکان دووچاری سووکایەتیەکی بەم چەشنە هاتوون. کوردبوون ماناکەی هاوشێوەی پاشماوەی جڤاتێکی بێ نیشتیمانە، بێنرخە، بەردەوام بێکارە، بەرامبەر هەرکرێیەک کار دەکات، بەردوام تێکۆشانی مان و نەمان دەکات، پێویستی کلتووری لە بیر کردووە، هەوڵێکی مەترسیدارانە لەپێناو دابینکردنی پێداویستیە مادیەکانی دەدات و لە نیشتیمانی نان (وڵاتی کشتوکاڵی چاخی بەردین) بێنان ماوەتەوە!.

باسی ئەو تراژیدیایەم کرد کە لەکاتی دەستپێکردنی خوێندن لە یەکەم قوتابخانەی ئاسیمیلاسیۆن دووچاری هاتم. وەک بڵێی؛ هەستم بەو هەڕەشەیە کرد کە لەژێر قوتابخانەی سەرەتایی شاراوە بوو، ئەو قوتابخانەیەی لەجیاتی زمانی دایک بە زمانێکی دیکە پەروەردەیان دەکردین. بەو حاڵەتەی منداڵیشمەوە، ناچارکردنم بۆ دەستبەردان لە زمانەکەم، لای من ناچارکردنم بوو بۆ دەستبەردان لە بوونم. ئایا دەستبەرداری بوون (کورد بوون)ی خۆم دەبووم، یاخود ناچاری دەستبەرداربوون دەبووم؟. دیاردەی کورد یان کێشەی کورد بۆمن بەمجۆرە دەستی پێکردبوو. بوون یان کێشەیەکە کە ساڵانێکی درێژ بێ وەڵام مایەوە و منی خستە ناو نائارامیەکی قووڵەوە... لە دەستدانێکی قووڵی بوون لەژێر لەدەستدانی زمان جێگای باس بوو. چی بوون ئەو شتانەی لەدەستمدان؟ ئەمە پرسیارێک بوو وەڵامەکەی زۆر زەحمەت بوو. پاراستن یان بەرگریکردن لە کورد، بوونێکی سەخت و بە کێشە بوو. ئەوەی دووچاری هاتم بوون نەبوو، لەرزەکانی لەناو چوون بوو؛ هوشیاریەکی وەڵامدراوە نەبوو، گڵۆڵەی ئەو کێشانە بوو کە بەردەوام گەورە دەبوو و مرۆڤی شێت دەکرد.

لەسەرەتاکانی ساڵی ١٩٧٥ بەجۆرێک خیتابی هەڤاڵ محەمەد خەیری دورموشم دەکرد وەک بڵێی وەڵامی گڵۆڵەی کێشەکانم دۆزیوەتەوە کە لەناخەوە منی دەشێلا. وەڵامی کێشەکان بەشێوەی رەشنووسێک لەلایەن هەڤاڵ محەمەد خەیریەوە نووسرایەوە، دواتر گووتەکانی من فراوانتر کرا. زمانم کرایەوە. ئاشکرایە کە وەڵامەکەم بانگەشەیەکی زارەکی بوو سەبارەت بە بوونێک کە وەک خەیاڵێک، سێبەرێک و شوێنپێیەک خۆی پیشاندەدا. لە پەنجەرەی رزگاری نیشتیمانی و چینایەتیەوە سەیرکردنی دونیام بە وەڵام دانابوو. بەزیادەوە وەڵامی ئایدیالیستانەم دەدایەوە. هەرچۆنێک بێت قالب و شێوەی حەقیقەتی نوێ سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو. زانین و ناسینی ئەلفباکەی سۆسیالیزم ئەوەی تریشی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. بێگومان ئەو هەڵوێستە دژە ژەهرێک بوو لەبەرامبەر کاریگەرییە کوێرکەر و نکوڵیکارانەکانی فاشیزم و لیبرالیزمی نەریتی تورک. ئەگەر بەحەقیقەتیشت نەگەیەنێت، دەیتوانی ژەهراوی بوون بەربەست بکات. ئەمەش کۆمەک و یارمەتی بوو بۆ شەڕی بوون، کە بەرامبەر ژینۆسایدی کلتووری کەوتەگەڕ.

بەشێوەیەکی گشتی تێکۆشانی کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگا) پەیوەندی بەلێگەڕینی حەقیقەتەوە هەیە. تێکۆشانێک هەوڵی چارەسەرکردنی کام کێشەی کۆمەڵگا بدات گوزارشت لە حەقیقەتی کۆمەڵگا نەکات سەرکەوتوو نابێت. حەقیقەتی کۆمەڵگا کۆمەڵێک تایبەتمەندی هەیە کە ئاستی ڕێژەییبوونەکەی تا دوا ڕادە زۆرە. بەشێوەیەکی توند بەکات و شوێنەوە گرێدراوە. کاتێک لە ڕوانگەی حەقیقەتەوە هەڵسەنگێنرێت دەبینرێت کە PKK تەنیا بەسەلماندنی بوونی کورد نەوەستاوە کە لەکەناری لەناوچوون بوو، بەڵکو تاڕادەیەکی زۆر زیندووی کردەوە. هەڵبەتە بەمانا کلاسیکەکەی نەدەبوو بەبزووتنەوەیەکی ڕزگاری نیشتیمانی. چونکە نە ڕەوشی ئەو بوونەی پشتی پێدەبەست، نە ئەو هوشیارییەی هەیبوو لەبار نەبوون. وەک چالاکی و کردار PKK کوردانی زیندوو کردەوە. کوردایەتی سەدەی بیستەم کوردایەتیەک بوو بەر لەڕزگارکردن پێویستی بە زیندوو کردنەوە هەبوو. ئەوەی سەرکەوتنی تێدا بەدەست هێنرا زیندووکردنەوە بوو. ئەگەر شتێک ڕووبەڕووی کێشەی بوون بووبێتەوە، ئەوەی پێویستە بەر لە هەموو شتێک بکرێت ڕزگارکردنی نییە، بەڵکو ڤەژین و کردنێتی بە خاوەنی بوون. ڕەوشی کوردانیش تەواو پێویستی بە ئەولەویەتدان بە ژیانەوە (ڤەژین) بوو. دەستەواژەکانی لەجۆری ڕزگاری، ئازادی و یەکسانی تەنیا بۆ ئەو بوونانە واتادار بوو کە کێشەی بوونیان چارەسەر کردووە. چالاکی و کردارەکانی PKK لەلایەنی ڕزگاری زیاتر لایەنی ڤەژین و زیندووکردنەوەی بوون گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. سەرباری ئەو کێماسیانەی لەبواری بونیاد و هوشیارییەوە لەخۆیەوە دەگرت، مسۆگەرە کە PKK ڕۆڵێکی ژیانیی لە ڤەژینی کوردا بینی. ئەو پرسیارە گرنگە: ئایا چالاکیەکانی PKK نەبووایە بوونی کورد ئەو دۆخەی ئێستای دەبوو؟ بەڵێکردنی ئەمە زەحمەتە.

بەر لەگفتوگۆکردنی کێشەی کورد و ڕێگەکانی چارەسەری ڕۆشنبوونەوە سەبارەت بە کێشەی بوون مەرجە. ڕۆشنبوونەوە ئاشنابوونە بە حەقیقەتی ئەو بوونەی جێگای باسە. هەرچی حەقیقەتە ئامانجێکە بە بێ ئەنجامدانی تێکۆشانێکی مەزن پێی ناگەیت. حەقیقەت ڕاستی نییە، بەڵکو دۆخی دەرک پێکراوی ڕاستییە. ڕاستی بێ حەقیقەت، ڕاستیەکی خەوتووە. ڕاستی خەوتووش کێشەی نییە. حەقیقەت دۆخی بێداربوونەوەی ڕاستییە خەوتووەکەیە. دۆخی خەوتنی تایبەت بە کوردان هێندە قووڵ و نزیکی مردن بوو، ئاشکرا بوو کە لەپێناو حەقیقەتدا شەڕ زۆر ئاڵۆز و دژوار دەبێت. دوای ڕەوشی سی و پێنج ساڵ بەر لە ئێستا بەئامانجکردنی حەقیقەتی گەلی کورد (سەرباری تەواوی هەلومەرجە سەختەکانی زیندانی ئیمرالی، هیچ شتێکم لە تامەزرۆیی و خرۆشانم لەدەستنەداوە) وەک بڵێی بەهارێکی زۆر مانادار ڕۆشن دەکاتەوە کە لە ڕۆڵی ڕۆشنکەرەوەی کوردان لەسەردەمی بەرەبەیانی ژیار واتادارترە. ئاگادارم کە ئەوە تێڕوانینێکی ڕۆمانتیکە. بەڵام بەهەرحاڵ بەرامبەر بە خۆڵەمێشی حەقیقەتی تێڕوانینی ئیرۆنی هیواشکێن تێڕوانینی ڕۆمانتیکی بانگێشت و بانگەوازیەکە بۆ نەمامە تازەکانی حەقیقەت. حەقیقەتەکانی دەرهەق بە کێشە و ڕاستی کورد بۆ جاری یەکەم شاهێدی بەدیهاتنی هیواکانی ئازادی دەکات.

## A ـ کورتەی پێکهاتنی مێژوویی راستینەی کورد

لە بەشەکان یان بەرگەکانی پێشووتری بەرگرینامەکانم گەشتێکی مێژوویی دەرهەق بە راستینەی کورد ئەنجامدرا بوو. لە دووبارەکردنەوە زیاتر شیکارکردنی دیاردە و رووداوی دووڕیانە گرنگەکان رۆشنکەرەوەتر دەبێت. کوردێتی یان کوردبوون واقیعێک نییە کە لە مێژوودا بەردەوام بەجێگیری وەستابێت. وەک هەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی وەرچەرخان ئەنجامدەدات و پەرە بە بوونی خۆی دەدات. وەرچەرخانی دۆخی ئێستای بەرفراوانتر و خێرایە. لەرۆژی ئەمڕۆماندا دیاردەی کورد پرۆسەیەکی هەمەلایەنی روونکردنەوە بەخۆیەوە دەبینێت. شێوازی گوزارشتی هونەری شێوازێکی دەربڕینە کە بەشێوەیەکی باو زیاتر پەنای بۆ دەبرێت. لەو لایەنەوە کوردبوون تۆزێک لەرێگای مۆسیقاوە هەوڵی پێناسەکردنی خۆی دەدات. مۆسیقا گرنگترین شێوازی دەربڕینی حەقیقەتی کوردە. هەروەها لە شێوازی زانستی سەلمێنراویشدا پەرەسەندنێکی گرنگ جێگای باسە. لەمیانەی دەستەواژە مێژوویی و سۆسیۆلۆژیەکان و رێبازە جیاوازەکانەوە هەوڵی روونکردنەوە و سەلماندنی کوردێتی یان کوردبوون دەدرێت. هەوڵی ئەکادیمیەکان زیاتر بەو لایەنەوەیە. وێڕای ئەوەی هەڵوێستە بەبنەڕەت ئایدیۆلۆژیەکان زیاتر هەڵگری هەزرە رزگاریخوازەکانن، بەڵام کۆمەکی گرنگیش پێشکەش دەکەن تا وەک حەقیقەت گوزارشت بکرێت.

بێگومان خەسڵەتی چینایەتی هەر ئایدیۆلۆژیایەک بەگوێرەی خۆی هەڵگری پشکێکی حەقیقەتە. هەرچەندە هەر مۆدێلێک بەتەنیا هەوڵی روونکردنەوەی حەقیقەت بدات، بەڵام تەنیا گوزارشت لەرێژەیەکی راستی دەکات. خودی دیاردەی کۆمەڵگا ناچاری ئەوەی دەکات. وەک چۆن روونکردنەوەی تابلۆیەکی سێ رەنگی بەرەنگێکی زلکراوەوە تێر ناکات، هەڵوێستەکانی یەک مۆدێلی لە روونکردنەوەی کۆمەڵگای مێژوویی لە نوێنەرایەتیکردنی راستیدا بەردەوام ناتەواوە و بەهەڵەدا دەچێت.

دەرکەوتنە پێشی رێبازی زانستی لەو سەردەمەماندا ئەو داوەرییانەی لەگەڵ خۆیدا زەق کردۆتەوە کە رێبازەکانی دیکە گوزارشت لە حەقیقەت ناکەن. بەڵام ئەو کائیۆسە زانستیەی لەئارادایە سەرجەم کێماسیەکانی ئەو رێبازانەی خستۆتەروو کە پشتیان پێدەبەستێت. خودی رێبازی زانستی کۆسپی جددی لەپێش تێگەیشتنی حەقیقەت دروست دەکات. چەندە دەچێت پەیوەندی رێبازی زانستی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیا و دەسەڵاتی هەژموونگەرای سیستەمی شارستانی خۆرئاوا ئاشکرا دەبێت. بەیەکەوە بەکارهێنانی هەڵوێستە تاکانە و گەردوونیەکانی سەبارەت بەحەقیقەت پێویستیەکی سروشتی بەدیهاتنی بوونە.

**١ . کوردان وەک بوون و نەشونماکردن**

دەستنیشانکردن و پێناسەکردنی بوونی کوردان لەمیانەی ڕێبازە پەیڕەوکراوەکانی ئێستای مێژوو زەحمەتیەکی زۆر لەخۆوە دەگرێت. ئەو مێژو و جوگرافیایەی تێیدا ژیاون بەدژواری کاریگەری لە بوون و ژیانیان کردووە، ناچاری مارژینالی و بێکاریگەری کردوون. توێژینەوەکانی دوایی پیشانیدەدەن کە هۆمۆساپیانسەکانی بە باپیرەی مرۆڤی ئەمڕۆ دادەنرێن؛ لە سێسەد هەزار ساڵی دوایی مێژوویاندا هەڵکشان و لە هیلالی بەپیت (ئەو جوگرافیایەی کە کوردستان لە ناوەراستیدایە و زۆرینەی نیشتەجێبووانی کوردن) بوون بەجۆری باڵادەست. سەردەمی هۆمۆساپیانس لەمێژووی سێ ملیۆن ساڵی دەستنیشانکراوی جۆری مرۆڤدا هاوکاتی دەرکەوتنی زمانی هێمایییە. شۆڕشی هۆمۆساپیانس کە لەگەڵ زمانی هێمایی دەرکەوتەپێش، هەڵوێستێکی بنەڕەتی بەرامبەر مێژووی هیلالی بەپیت دەکاتە پێویستیەک. لەمیانەی توێژینەوەی بۆهێلیشەوە سەلمێنراوە کە شۆڕشی هۆمۆساپیانس لەو ناوچە چڕبۆتەوە. لەگەڵ کۆتاییهاتنی دواترین قۆناغی سەهۆڵبەندان بەر لە بیست هەزار ساڵ و پاشەکشێی سەهۆڵەکان دەرفەت بۆ شۆڕشی کشتوکاڵی چاخی بەردینی نوێ ڕەخساوە. کاتێک دەوڵەمەندی جوگرافیا لەڕووی ڕووەک و ئاژەڵەوە لەگەڵ هێزی بیرکردنەوەی هۆمۆساپیانس یەکیان گرت، گوزەرکردن بۆ کۆمەڵگای گوند ـ کشتوکاڵ کە ریشەییترین شۆڕشی مێژوویی مرۆڤایەتییە لە هیلالی بەپیت ڕێگای لەبەردەم پەرەسەندنی مەزن کردۆتەوە.

شۆڕشی گوند ـ کشتوکاڵ و ئەو قەڵەمبازەی لەبوارەکانی زمان و بیرکردنەوە هاتنە ئاراوە، ڕێگای لەپێش شێوەگرتنێکی کۆمەڵگا خۆش کرد کە تا ئەو سەردەمە هاوتاکەی نەبینرابوو. جڤاتەکانی گرووپی هیندۆ ـ ئەورووپی (ئەم ناونیشانە هەڵەیە، گوتەی گرووپی زمان ـ کلتووری ئاریان ڕاستترە) پێکهاتووە کە زمان ـ کلتوورێکی زاڵە. دەشێت بنەچەی کوردانی ڕۆژی ئەمڕۆمان وەک شانەی بنەڕەتی جڤاتەکانی هیندۆ ـ ئەورووپی پێناسە بکرێت. توێژینەوەکانی سەبارەت بە زمان و کلتووری کوردان ئەو ڕاستییە دەخاتەڕوو. هەم جوگرافیای ژیانی و هەم مێژووەکەی ئەو ڕاستیە دەسەلمێنن. پاشماوەکانی شوێنەواری گۆبەکلی تەپەی ئورفا کە بەرهەمێکی کنە و کۆلین و توێژینەوەکانی ئەم دواییەیە، ناوەندی کۆنترین تیرە و ئایینە کە بۆ دوازدە هەزار ساڵ بەر لەئێستا دەگەڕێتەوە، هەریەکە و نموونەیەکی گرنگی سەلمێنەری هێزی ئەو کلتوورەن. لەهیچ شوێنێکی جیهان نموونەیەکی کۆنی بەمجۆرە نەبینراوە.

کاتێک هەڵسەنگاندن لەبارەی هێزی ئایین و قەبیلە دەکەین کە تائێستاش بەکاریگەرن، ئاشکرایە کە دیرۆک و جوگرافیای پشتی یان پاشخانەکەی پێگەی دیاریکەر دەبینێت. کۆمەڵگایەک تاچەند لەژێر کاریگەری قووڵ و درێژخایەنی دیرۆک و جوگرافیا مابێتەوە ئەوا خۆجێیەتی ئەو کۆمەڵگایەش هێندە بەهێز و هەمیشەیی دەبێت. کاریگەرییە

هەمیشەیی و بەهێزەکانیش لە پەرەسەندنی مێژوویی دواتردا کۆمەڵگا دەکات بە محافەزەکار. ئەگەر تا ئێستاش تێبینی تایبەتمەندێتییە خۆجێیی و ئۆتانتیکەکانی کوردان دەکرێت پێویستە باسی کاریگەرییە بەهێز و هەمیشەییەکانی بناغەکەی بکەین. بێگومان لەسەردەمی نیولیتیکدا هێشتا دیاردەی بەگەلبوون جێگای باس نییە. لەو قۆناغەدا ئاشنای لەدایکبوونی کۆمەڵگای قەبیلە دەبین. بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵگای کلان قەبیلە پەرەسەندنێکی شۆڕشگێڕی مەزنە. دەشێت شۆڕشی نیولیتیک بە شۆڕشی قەبیلە ناوببرێت. جیاوازی زمان ــ کلتوور و پەیوەندییەکانی رەوەندی ــ نیشتەجێبوون لەکۆمەڵگای قەبیلەدا دەستی پێکردووە. ناوەندە ئاینییەکەی گۆبەکلی تەپە لەسەردەمی خۆیدا رۆڵی کەعبەی ئەو قەبیلانە دەبینێت کە هەزاران ساڵ بەشێوەی کۆچبەری و جێنشینی لەناویەکدا ژیاون. ناشێت رۆڵ و پشکی ئەو راستییە لە بەهێزی هەست و سۆزی ئاینی لە ئورفا بەتایبەتیش لای کوردان بەگشتی بچووک بکرێتەوە. ئاشنای بوونی کلتوورێکی بەهێز دەبین کە هەزاران ساڵ بەر لە شارستانی شارەکانی سۆمەر پێکهاتووە و بەهەزاران ساڵیش بەردەوام بووە. لەبەردە چەقێنراوەکاندا چاومان بە نموونەکانی یەکەمین پیت و نووسینی بەر لە هێرۆگلیفی دەکەوێت. دوازە هەزار ساڵ بەر لەئێستا داتاشینی ئەو بەردانە و گۆڕینی زمانی هێمایی بۆ نووسینێکی هاوشێوەی هیرۆگلیفی پرۆسەیەکە بەها مێژووییەکەی زۆر مەزنە.

کۆمەڵگای شارەکانی سۆمەر و میسر لەخۆیانەوە پەیدا نەبوون. هەروەک ئەو نموونانەش سەلماندوویانە بەدڵنیاییەوە سەرچاوەی خۆیان لە کلتووری میزۆبۆتامیای سەروو وەرگرتووە. کۆچەکەی ئیبراهیم پێغەمبەر بۆ میسر کە شیمانە دەکرێت سێ هەزار و پێنجسەد ساڵ بەر لەئێستا ئەنجامی دابێت، بەڵگەیەکی دیکەی گرنگی چۆنیەتی پەرەسەندنی دیالیکتیکی مێژوویی هیلالی بەپیتە. کلتووری کەوانەی زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆڕۆس ئەو کلتوورەیە کە شارستانی سۆمەر و میسری ئافراندووە. ئەوەی لێرەدا گرنگە بوونی پرۆسەی کلتوورێکی مەزنە لەمێژووی کۆمەڵگا کە تا ئێستاش کاریگەرییەکانی بەردەوامە. ئەگەر تا ئێستاکەش شوێنپەنجەی ئەو ناوەندە کلتوورییە بەشێوەیەکی خەست لەناو کورداندا دەژێت ئەو گەلەش وەک کۆنترین گەلی نیشتەجێی ئەو جوگرافیایە درێژە بەبوونی خۆی دەدات، ئەوا لەو دۆخەدا گەڕاندنەوەی دەرکەوتن و نەشونمای راستینەی کورد بۆ ئەو کلتوورە دەستلێبەرنەدراوە. نزیکەی هەشت هەزار ساڵ لەمەوبەر کۆمەڵگای قەبیلە لە جوگرافیای زاگرۆس ــ تۆڕۆس بەدیار کەوتووە. ئەوە کلتوورێکی هێندە رەسەنە وەک بڵێیی لەلایەکەوە خۆی بە یەکەمین گەورە کەعبە رادەگەیەنێت، لەلایەکی دیکەشەوە خۆی بە یەکەمین کلتووری مۆسیقای گەربوونی، شمشاڵ، دەهۆڵ و زووڕناکەیەوە رادەگەیەنێت. شمشماڵ و زووڕنا گوزارشتی هونەری ئەو کلتوورەن. ناوەندی ئاینیش گوزارشتە هزریەکەیەتی.

راستینەی کورد هەم بەرهەمێکی ئەو پرۆسە مێژووییە مەزنەیە، هەم هەڵگری نیشانە بەهێزەکانی بەهەڵواسراوی مانەوەیە لەو کلتوورەدا. سووربوونی لەسەر مانەوەی

لەدۆخی گەلی قەبیلە کلتوورییەکان ناشێت تەنیا بە ڕەوشی خۆپاراستن بەرامبەر هێزەکانی شارستانی روون بکرێتەوە. ئەگەر خودی کلتوور خاوەن ڕەگ و ریشەی زۆر قووڵ نەبێت، یان بۆخۆی دەبێت بە شارستانی یان دەچێتە ناو ئەو شارستانیانەی یارمەتی نەشونماکردنی داوە. شاهێدی هەزاران کۆمەڵگای قەبیلەی بەمجۆرەین کە تواونەتەوە. لەولایەنەوە کوردان جڤاتی گەلێکی بێ نموونەن. وەک حەقیقەتێکی سۆسیۆلۆژی ئەگەر کۆمەڵگایەک بەشێوەیەکی ریشەیی شۆڕشێکی مێژوویی بەخۆیەوە ببینێت، ئەوا زەحمەتە ئەو کۆمەڵگایە لەناوەخۆیدا ڕێبەرایەتی بۆ دووەمین گەورە شۆڕشێکی جیاواز بکات. داگیرکردنی دونیا زهنی و دامەزراوەییەکەی لەلایەن شۆڕشەکەی خۆیەوە رۆڵی لەو دۆخەدا هەیە. شۆڕشێکی دیکە پێویستی بە دامەزراو و زهنیەتێکی دیکە هەیە. ئەو شۆڕشەش تەنیا بۆ ئەو کلتوورانە ڕێکدەکەوێت کە بە بەراورد لەگەڵ ناوەندی کلتووری بەهێز لەدۆخی کەنار و کلتووری دووەم دایە. سەرجەم پێدراوە مێژووییەکان پیشانمان دەدەن کە نەک تەنیا شۆڕشی سێسەد هەزار ساڵەی هۆمۆساپیانس، بەڵکو شۆڕشی کشتوکاڵی چواردە هەزار ساڵیش کاریگەری هەمیشەیی کردۆتە سەر کلتووری جێگیری کوردان. نەخشە بۆهێلیەکان دەیسەلمێنن کە هەم جۆری هۆمۆساپیانس هەم شۆڕشی کشتوکاڵ لە ناوەندی ئەو کلتوورەوە بۆ دەوروبەر و جیهان بڵاوبۆتەوە.

ئەو جوگرافیایە تەنیا لە نەشونماکردنی بناغەی کلتووری گوزەرکردن بۆ قۆناغی شارستانی خاوەن رۆڵ نییە، بەڵکو لە پەرەسەندنی ناوەڕۆک و شێوەگرتنی شارستانیشدا رۆڵی دیاریکەرە. ئەو جوگرافیایەی یەکەمین شارستانیەکان (سۆمەر و میسر)ی مێژوویی لەسەر بەرز بووویەوە، واتە میزۆبۆتامیای خواروو و نیلی خواروو (دۆڵی نیل) پێشتر بناغەیەکی کلتووری پێشکەوتوویان نییە. تەنانەت هەلومەرجەکەیان بۆ ژیانی کۆمەڵگای کلان یش لەبار نییە. ئەو شارستانیانە کە پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا گەشەیان کردووە بۆ سەرجەم بناغە هزری و دامەزراوەییەکانیان قەرزاری ئەو کلتوورەن کە خاوەن ژیانێکی شکۆمەندی هەزاران ساڵەیە؛ وەک چۆنیەتی پشتبەستنی شارستانی ئەوروپا بە شارستانی ئیسلام و چین، پشتبەستنی شارستانی ئەمریکا بە شارستانی ئەوروپا. تا ئێستاش لاوازترین لایەنی دیرۆک و سۆسیۆلۆژیا لەوەدایە کە لایەنە تیۆری و کردارییەکانی پەیوەندی نێوان کلتوور و شارستانی شیکار نەکردووە. شیکارنەکردنی ڕێڕەوەکانی تێپەڕبوونی شارستانی و کلتووری میزۆبۆتامیای سەروو لەگەڵ میزۆبۆتامیای خواروو و دۆڵی نیل رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. دیرۆک و سۆسیۆلۆژیا تەنیا لەمیانەی ڕێبازە ئەنالیتیکەکانەوە ناکرێت بەزانستی. مێژوو چۆن بووە وەک راستی خۆی دەرکی پێنەکرێت، کۆمەڵگاش چۆن بێت وەک خۆی دەرکی پێنەکرێت سۆسیۆلۆژیا ناکرێت بەزانستی.

پاراستنی بوونی کوردان بەخەسڵەتە کلتوورییەکەی خۆیانەوە، سەرچاوەکەی بۆ هێزی ئەو کلتوورە مێژووییە دەگەڕێتەوە کە پشتی پێدەبەستن. هەڵبژاردنی ژیانی کلتووری بەرامبەر بە ژیانی شارستانی بە کۆنەپارێزیەکی ساویلکە یاخود سەرەتاییبوونەوە روون

ناکرێتەوە. ئەو کلتوورەی تێیدا دەژین کلتووری شار، چین و دەوڵەتێک نییە، کلتوورێکە کە لەناوەخۆیدا جێگای بە دەسەڵات و جیابوونەوەی چینایەتی نادات و داکۆکی لەسەر دیموکراسی قەبیلە دەکات. بە ئاسانی جڵەونەکردنی کوردان بۆ ژێر زەبت و رەبتەوە پەیوەندی بەو دیموکراسییە کلتووریەیانەوە هەیە.

زۆر دواتر تێگەیشتم کە ژیانێکی دەوڵەتی، چینایەتی و شاری فەزیلەت نییە، بەڵکو کەوتن و رووخانە. بێگومان چەمکی رانکایی (مێژووناس لیۆپۆلد ڤان رانکا) بۆ نەتەوە رۆڵی سەرەکی بینی لە تێگەیشتنمان بۆ کێشەی نەتەوەیی. کاتێک بیر لە هەر یەکێک لە کۆمەڵگا تاقانەکان دەکەینەوە ئەوا دەوڵەتی، چینایەتی و نەتەوایەتی بە تایبەتمەندێتیە رەسەنەکانی راستیەکەی دادەنێین. زۆر جار هەڵوێستی ئایدیالیستی لەو جۆرە جێگای باس دەبێت کە ئەو کۆمەڵگایانەی ئەم تایبەتمەندێتیانە لەخۆوە نەگرن بە کۆمەڵگا دانانرێن. تایبەتمەندێتی گەردوونی بە خەسڵەتێکی سەرەکی هزری دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆرئاوا دەبەخشین. تا وێناکردنمان بۆ دیرۆک و کۆمەڵگا لەو قالبە دەوڵەتی و نەتەوەگەراییەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی ناوەندی ئەوروپا رزگار نەکەین، ئەوا پەرەپێدانی چەمکێکی زانستی ئەستەمە. لەپێناو بوون بەنەتەوەیەکی خاوەن دەوڵەت فشارێکی لەرادەبەدەر دەخەینە سەر زهنیەتی مێژوویی و کۆمەڵایەتیمان. ئافراندنی مێژوو بۆ هەر کۆمەڵگایەک بە مەرجی بوون بەنەتەوە و دەوڵەت دەبەستریتەوە. دەکەوینە ناو هەستێکەوە وەک بڵێیت؛ ئەگەر لەمێژوودا خاوەنی تایبەتمەندی نەتەوە و دەوڵەتێکی (بەرێز)نەبین ئەوا چانسی بەکۆمەڵگا حیسابکردنمان لەدەستداوە. ئەو زهنیەتە دەوڵەتگەرا و نەتەوەپەرستەی وەک فاکتەرە سەرەکیەکانی زهنیەتی زۆرداری و چەوسانەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەرەیان سەندووە، مسۆگەر فاکتەری ژێر ئەو ناتەواوی، لادان و کوێریەیە کە لە دیرۆک و زانستی کۆمەڵگادا جێگای باسە. ئەوەی لە زانستەکانی کۆمەڵگا و مێژوودا ئاسۆمانی تاریک کردووە ئامێر و ئامرازە ئایدیۆلۆژی و چەوسێنەرەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە.

لەو سۆنگەیەوە؛ کاتێک هەوڵی دەستنیشانکردنی گەورەترین قۆناغی مێژووی مرۆڤایەتی و کلتووری کۆمەڵگا دەدەین، بەچەمکێکی نەتەوەپەرست و دەوڵەتگەرا لە ئەمڕۆوە تەماشای ئەو قۆناغە ناکەین. قالب دەرهەق بەکوردێتی دروست ناکەین. بەڵکو بەدوای دیرۆک و کۆمەڵگای گەردوونیەوەین. پێویستە زۆر بەباشی بزانین ئەگەر پابەندی چەمکی دیرۆک و کۆمەڵگای گەردوونی نەمێنین ئەوا نازانین کە هەر تاقانە جڤات یان کۆمەڵگایەک بەکوێی پەرەسەندنەکانی کۆمەڵگا و مێژوو ببەستینەوە و جێگیریان بکەین. ئەگەر خەباتی سەبارەت بە تاقانە دیرۆک و کۆمەڵگا بەشێوەیەکی دابڕاو لە مێژوو و کۆمەڵگای گەردوونی تاوتوێ بکەین، ئەو ئەنجامانەی پێی دەگەین جگە لە داوەری سۆبژەکتیڤ شتێکی تر نییە. بۆچی لایەنگرانی هزری ناوەندی شارستانی ئەوروپا خۆیان لەدیرۆکی گەردوونی و پەرەسەندنی کۆمەڵگا دەدزنەوە و لەبەرزترین ئاستدا خۆیان

بەچەمکی کۆمەڵگا و مێژووی گریک ـ ڕۆما سنووردار دەکەن؟ ئاشکرایە کە لێرەدا بەرژەوەندییە ماددی و ئایدیۆلۆژیەکانی هەژموونگەرایی دیاریکەرە.

مسۆگەر پێویستە لەو بارەیەوە دووچاری بەهەڵەداچوون نەبین: کۆمەڵگایەک لە ئێستادا بژیت، چەندە بێ دەوڵەت بێت و تایبەتمەندیەکانی نەتەوەی لاوازبێت، مسۆگەر بەشێکی دیرۆک و کۆمەڵگای گەردوونییە. بەهەڵەداچوون لەو بۆچوونەدایە کە توێژینەوەی زۆر لە کۆمەڵگاکان دابڕاو لە کۆمەڵگا و مێژووی گەردوونی ئەنجام دەدرێت. لەمیانەی ئەو زهنیەتە ئانتی ـ زانستیەی بۆ هەر جۆرە پێشداوەرییەک کراوەیە دەرک بە دیرۆک و کۆمەڵگا ناکرێت. کەچی یەکپارچەیی یان هەمەویتی تەنیا تایبەتمەندێتی سروشتی کۆمەڵگا نییە، بەڵکو تایبەتمەندێتیەکی سەرەکی سروشتی بایۆلۆژی، کیمیایی و فیزیاییشە.

پێویستە بەبایەخەوە ئاماژەی پێبکرێت کە سەرجەم بۆچوونە مارژیناڵ و ریزپەڕەکانی سەبارەت بە کوردان پشت بەم چەشنە پێشداوەرییە سۆبژەکتیڤە دەبەستن. هەرچەندە لەرۆژی ئەمرۆماندا کوردان لەدەرەوەی کۆمەڵگا و مێژووی گەردوونی بهێڵرێنەوە، بەڵام بەپێچەوانەوە نوێنەری کۆمەڵگای قەبیلەیە کە لەسەرجەم قۆناغەکانی کۆمەڵگا و مێژووی گەردوونی رۆڵی سەرەکی بینیوە، کە لە دەربازکردنی کۆمەڵگای کلان دەستی پێکردووە و تا پەرەسەندنی کۆمەڵگای شارستانی بەردەوام بووە. فاکتەری سەرەکی ئاواکردن و بەردەوامکردنی کلتووری قەبیلەیە. هەڵسەنگاندنی قەبیلە وەک دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بەسەرچووی دەرەوەی سەردەم چەوتە. قەبیلە فۆڕمی سەرەکی مرۆڤایەتییە و هیچ کاتێک دەرباز ناکرێت. دەشێت لەبواری شێوە و ناوەرۆکدا بگۆڕدرێت، بەڵام ئەستەمە بەتەواوی لەدۆخی دیاردەی کۆمەڵایەتی وەدەربنرێت. فۆڕمەکانی کلان و نەتەوەی دیاردەکانی کۆمەڵگا هێندەی فۆڕمی قەبیلە هەڵگری گەردوونیبوون و مێژوویی بوون نیین. بێگومان فۆڕمەکانی کلان و نەتەوەش هەڵگری تایبەتمەندی گەردوونین، بەڵام هێندەی تایبەتمەندیەکەی قەبیلە بەکاریگەر نیین. قەبیلە فۆڕمی سەرەکی ئاواکردنی کۆمەڵگایە. تەنانەت لە سەرمایەداریشدا نەک قەبیلە دەرباز نەکراوە، بەڵکو سەرجەم پاوان و هۆڵدینگە لەپێشەکانی سەرمایەداری لەدوا شیکاردا هەریەکە و رێکخستنێکی قەبیلەن. لەوانەیە ئەمانە قەبیلە رەوەندەکان و کۆمەڵگای کشتوکاڵی پێکهێنەری مێژوو نەبن، ئەستەمە وابن؛ قەبیلە شارگەراکانی کۆمەڵگای قەیران و هەرەسن: قەبیلە پلەداری، دەوڵەتگەرا و چەوسێنەرەکانن.

لەسەردەمی مێژوویی نووسراوەوە لە پەیوەندیەکانیان لەگەڵ سۆمەریەکاندا بەردەوام ئاشنای کوردەکانی سەرەتا دەبین. لەبەرئەوەی سەرچاوەی گشتی بوون کە سۆمەریەکان پشتیان پێدەبەستن گەلی ناوچە شاخاویەکانی خۆرهەڵات و باکووریان بە کورتی KURTİ، گەلانی قەبیلەکانی خۆرئاواشیان بە ئامووری ناو دەبرد کە تا ئێستاش مانا بەخشن. مانای پەیڤی کورتی یان کوردی "گەلی شاخی" یە. کاتێک دەڵێین کورد، لە رۆژی ئەمرۆشماندا شاخی وەک تایبەتمەندێتیەکی سەرەکی بەبیری مرۆڤدا دێت. لەراستیدا

جیاوازی نێوان کوردەکانی سەردەمی سۆمەریەکان و کوردانی ڕۆژی ئەمڕۆمان هێندەی جیاوازی نێوان پیتی (ر)ی لاواز و قەڵەوە. کوردانی خاوەن کلتووری هەزاران ساڵەی قەبیلە، ئێستاش قورسایی و مۆرکی قەبیلەییان لەناو گەلی کورد لەپێشە. زۆر لە شارستان، لادێیی، جیابوونەوەی چینایەتی، بەکرێگیراوانی دەوڵەت و بەرهەڵستکارانی دەوڵەت هەن. بەلام قەد و جەستە سەرەکیەکەی کوردایەتی، ئەو کوردایەتییەی ڕەچەڵەکی خۆی دەژێنێت، ئەو کوردایەتیەیە کە تایبەتمەندییە نەریتیەکانی خێڵ و قەبیلەی لەپێشە، کوردایەتی قەبیلە بنەڕەتییە. کوردێتی شارستان، چینی دەسەلاتدار و کوردی دەوڵەتی گوزارشت لە کوردێتیەک دەکەن کە بەشێوەیەکی نەریتی لە کوردێتی دابڕاون و بۆ ئاسیمیلاسیۆن ئامادەن. ئەنکیدۆی داستانی گلگامێش کە یەکەمین کوردی شارستان و بەکرێگیراوە، لەوانەیە یەکەمین باپیرەی تەواوی کورد (کورتی)یە نۆکەرە شارستان، چینایەتی و بەکرێگیراوەکانی دەسەلات بێت. خومبابای ناو داستانەکە کورد (کورت)ی شاخییە. ئەنکیدۆ وەک بڵێیی لە گلگامێش دەپاڕێتەوە تا خومبابا بکوژێت کە خۆی خیانەتی لێکردووە. چەندە بەشێوەیەکی نەوازە کوردە بەکرێگیراوەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان دێنێتە بەرچاو! کەواتە کاتێک دەڵێین جیاوازی نێوانیان وەک پیتی (ر)ی لاواز و قەڵەوە ناهەق نین.

کاتێک بیر لەگۆڕانکاری کۆمەڵگا یان بە واتایەکی تر بیر لەکۆمەڵگای مێژوویی دەکرێتەوە گرنگە کە دووچاری بەهەڵەداچوونی بنەڕەتی نەیەیت. گرنگترین ئەو بەهەڵەداچوونە ریشەییانەش: هەڵسەنگاندنی مێژوو یاخود پەرەسەندنی کۆمەڵگایە لەمیانەی بۆچوونی دونیابینی "پێشکەوتنی ڕاستە هێڵ"یەوە. ئەو زهنیەتە فەلسەفییەی لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا بوو بە ڕێبازێکی ئایدیۆلۆژی هەژموونگەرا، هەموو جۆرە گۆڕانکارییەک بەشێوەی هێڵێکی ڕاست تاوتوێ دەکات کە لەئەزەلەوە بۆ ئەبەد دەڕوات. شرۆڤەی لەجۆری دوێنێ دوێنێ بوو، ئەمڕۆش ئەمڕۆیە! وەک بڵێی هیچ پەیوەندی یاخود لێکچوونێک جێگای باس نییە: شرۆڤەیەکی چەوتی پەرەسەندنی دیالیکتیکیە. دژەکەی ئەو دونیابینی (پارادایم)یەش چەمکی "بازنەیی"یە کە گۆڕان پەسەند ناکات و بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوە. دیاردەی گۆڕان بە دووبارەبوونەوەی بەردەوام لەقەڵەم دەدات. ئەم چەمکە فەلسەفیانەی لەڕووخساردا تا دوا ڕادە دژی یەکتر دەبینرێن، لە ناوەڕۆکدا ئایدیالیستن. هەردووکیشیان دوو ڤێرسیۆنی جیاوازی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزمن. یەکەمیان لەمیانەی پێشکەوتنی ڕاستەهێڵی ئەبەدی و دووەمیشیان لەڕێگای دووبارەگەراییەکەیەوە لەناوەڕۆکدا لەنکولێکردنی گۆڕانکاری بەیەکتری دەگەن.

ئەو مەسەلەیەی فەلسەفە و ئایین، تەنانەت کۆنترین مەسەلەی میتۆلۆژیا بەبنبەستوون ئەنجامگیر دەبێت. ئەمەش دۆخێکی ئیرۆنیکە، چونکە دەرکیان بە پەیوەندی کات - شوێن نەکردووە. دەرکیان بە بوویەری پەیوەندی نێوان بوون و کات نەکردووە، واتە دەرکیان بەخۆنواندنەکەی نەکردووە کە بەسیفەتی گۆڕانکاری دەکەوێتەڕوو. دەست لێبەرنەدراوە کە تێنەگەیشتن ئەو زهنیەتانە بەرەو شێوەکانی پێشکەوتنگەرایی ڕاستەهێڵی

و دووبارەکردنەوە ناچار دەکات. گرنگترین نوێبوونەوەی کە فەلسەفەی دیالیکتیکی لەو بارەیەوە هێناویەتی دەرهەق بە ناوەڕۆکی پەرەسەندنی گەربوونییە. چونکە کات و شوێن تەنیا لەمیانەی بوون و ژیانەوە دەستبەر دەبێت. گۆڕانکاری ئەنجامێکی سروشتی هەبوونی بوون (شوێن) و کاتە. بۆ هەبوونی بوون و زەمان گۆڕان مەرجە. گۆڕان سەلمێنەری زەمان و بوونە. شیکارکردنی ناوەڕۆکی دەستەواژەی گۆڕان گرنگترە. بۆ بەرجەستەبوونی گۆڕان پێویستی بە هەبوونی شتێک هەیە کە نەگۆڕێت. گۆڕان بە بەراورد لەگەڵ نەگۆڕەکە گۆڕانە. نەگۆڕەکەش ئەوەیانە کە هەر وەک خۆی دەمێنێتەوە. نەگۆڕەکە بوونە بنەڕەتیەکەیە، خودی بوونەکەیە، سەرچاوەی ژیان و ئەو گەوهەرەیەتی کە دەمێنێتەوە. لەوانەیە بڵێن؛ لێرەدا نزیکی دەستەواژەیەکی ئیلاهی سۆفیگەرایی یان ڕۆحی بوونەتەوە. بەڵام تێگەیشتنێکی فەلسەفی بەمجۆرە ناچارییە و پێچەوانەی زانستیش نییە. چونکە ئەگەر بڵێین هوشیاریی مرۆڤ توانای تێگەیشتنی تەواوی نەشونمابوون، کات و شوێنی هەیە ئەوە میتافیزیکە. توانای تێگەیشتنی مرۆڤ سەبارەت بە ڕەها، جێی گومانە.

لەو سۆنگەیەوە؛ نکوڵینەکردن و گەورە نەکردنی گۆڕانکاری لە زانستی کۆمەڵگا و مێژوودا خاڵێکی زۆر گرنگە. کۆمەڵگای کلتووری لە کۆمەڵگای شارستانی هەمیشەییترە، بنەڕەت و بوونی کۆمەڵگا پێکدێنێت. ئەو کۆمەڵگایەی لەبواری کلتوورییەوە بەشێوەیەکی تۆکمە پێکهاتووە لەهەمیشەیی کردنی بوونی خۆیدا چانسدارە. لەکاتێکدا شارستانی و دەوڵەتەکان پابەندی گۆڕانکاری خێرا و فرەن، بەڵام کلتوورەکان دەرفەت بە گۆڕانکارییەکی زۆر سنووردار دەدەن. ئەگەر بڵێین هیچ گۆڕانکارییەک نابێت چەوتە. بەڵام باسکردنی بەردەوامی ئەو کلتوورانەی دەگۆڕێن، یان ئەو بەها کلتوورییانەی بەخێرایی دەگۆڕێن، هێندەی ئەو چەمکانە چەوتە کە دەڵێت هیچ ناگۆڕێت. هەرچی تامپۆ سەیرەکەی مۆدێرنیتەیە بۆ گۆڕان کە لەو بڕوایەدایە لەمیانەی قەتیسکردنی هەرشتێک لە ساتێکدا ڕێگای لەپێش کردۆتەوە، لە ناوەڕۆکدا گوزارشت لە نەگۆڕی دەکات. لەڕاستیدا ئەستەمە ئەنجامدانی خێراترین گۆڕانکاری کە لەمیانەی ژیانە ساتەوەختیەکانی خۆیان دووبارە دەکەنەوە. ئایدیۆلۆژیایەکی دەستخەڕۆکردن ئاوا کراوە. ئەو فریودانە ئایدیۆلۆژیانەی هەڵگری مۆرکی لیبڕالیزمن ئامانجی شێواندن و چەواشەکردنی هوشیاری و دەرککردنی کۆمەڵگا و مێژووە.

کاتێک دیاردە و مێژووی کورد تاوتوێ دەکەین، پێویستە ئەو هەڵوێستە سەرەکیانەی ڕێباز ڕەچاو بکەین. لەمیانەی مێژووە نەتەوەیی و دەوڵەتیەکانەوە هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی ڕاستینەی کوردان ناچارکردنێکی زێدەڕۆیانەیە. ئەمجۆرە ئەزموونانە مێژووی زۆرەملێیانەن، پەیوەندییەکیان بە پەرەسەندنەکانی دیاردەوە نییە. بگرە هێندەی میتۆلۆژیا و داستانەکانیشی ڕاستیەکان پیشاننادات. مێژووی کلتووری لەڕاستینەی دیاردەکان نزیکترە. مێژووی کلتووری قۆناغ و پرۆسەکانی شارستانی و مۆدێرنیتەش لەخۆوە دەگرێت. بەڵام کلتووری شارستانی و مۆدێرنیتە مێژووی گەربوونی کلتوور لەخۆوە ناگرێت. دەوڵەت و نەتەوە کە پۆلێنە سەرەکیەکانی سەردەمی شارستانی و

مۆدێرنیتەن، دەشێت تەنیا بەشێکی مێژوویی کلتووری بن. لەو توانایە بێبەشە کە جیهانی کلتووری لەخۆوە بگرێت. جێنەگرتنی کوردان لەمێژووی نەتەوە و شارستانیەکان، مانای بێ دیرۆکبوونی کوردان نییە. کاتێک لەچوارچێوەی مێژووی کلتووریەوە تەماشای بکەین ئەوا دەبینین کە کوردان خاوەنی کلتوورێکی هەزاران ساڵەی پێشەنگن. سەرەکیترین خەسڵەتی ئەو کلتوورە، بەشێوەیەکی بەهێز لەفۆرمەکانی قەبیلە و خێڵدا ژیاوە، ڕۆڵێکی شۆڕشگێڕانەی لە ئابووری کشتوکاڵ و ئاژەڵداریدا بینیوە. کلتووری هیلالی بەپێت چەندەی ڕۆڵ لەمێژووی مرۆڤایەتیدا بینیوە، ڕۆڵی کوردانیش لەمێژوویی کلتووری گەلاندا بەو رادەیەیە. لەمێژوودا کلتووری ناوەندی سەردەمەکانی میزۆلیتیک و نیولیتیکە( ١٥٠٠٠ - ٣٠٠٠ پ ز). لە چین و هیندستانەوە تا دەگاتە ئەوروپا سەرجەم کلتوورەکانی کۆمەڵگای نیولیتیکی تێرخۆراک کردووە. لەمیانەی ڕێبازە بۆهێڵی و ئەتمۆلۆژیەکانەوە دەتوانین شوێنپەنجەی پەلهاوێشتنی کلتووری دەستنیشان بکەین. هێندەی کە دەستنیشانکراوە پێشەنگایەتیەکی کلتووری دوازدە هەزار ساڵەی تەوەرەی هیلالی بەپێت جێگای باسە. لەمێژوودا شاهێدی هیچ کلتوورێک نەبووین کە هێندە درێژخایەن و بەرفراوان، وەک خۆر ڕۆشنکەرەوە، گەرمی بەخش و تێرکەر بێت. ئەگەر هەشبن ڕۆڵیان سنووردار و رووالەتییە.

ناشێت شارستانی سۆمەری کە مێژووی دەستپێکردنەکەی دەستنیشانکراوە و بۆ ٣٠٠٠ پ.ز دەگەڕێتەوە، لەگەڵ شارستانیەکانی میسر، هیندستان و چین دابڕاو لەڕەگەکانیان واتە دابڕاو لەهیلالی بەپیت بیریان لێبکرێتەوە. راستیەکی حاشا هەڵنەگرە کە کلتووری هیلالی بەپیت تەنیا ڕۆڵی لە ئاوابوونی شارستانییە سەرەکیەکاندا نەبینیوە، بەڵکو وەک سەرچاوەی بنەڕەتی ڕۆڵی لەبەردەوامکردن و تەمەنی هەزار ساڵانەشیاندا بینیوە. وەک دەزانرێت کلتوورەکانی شارستانی تەنیا لەزەمینە بە پیتەکانی نیولیتیکدا توانای پەرەسەندنیان هەیە. سەربەخۆ بەتەنیا ئەو توانا و بەهرەیان نییە لەسفرەوە ئاوایبکەن. نیولیتیکی میزۆبۆتامیای هیلالی بەپیت ئەوەندەی نەمابوو بەتەنیا ببێتە لانکەی شارستانیەتی چاخی یەکەم (کۆن، ٣٠٠٠ پ ز ــ ٥٠٠ زایینی). شارستانی تەوەرەی میزۆبۆتامیاش لەساڵانی ٣٠٠٠ پ.ز تا ٣٠٠ پ.ز ناوەندێتی بۆ شارستانییە سەرەکی و دیارەکانی دونیا کردووە. کاتێک لەگەڵ هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەراوردی بکەین کە هێشتا سەد ساڵی پڕ نەکردۆتەوە، ئەو کاتە باشتر دەرک بەجیاوازی نێوانیان دەکەین.

ئەم ڕۆڵە مێژووییەی نیولیتیکی کورد گرنگە. ریشەی میزۆبۆتامیای سیستەمی شارستانی ناوەندی (سیستەمێکی پێنج هەزار ساڵەیە) و پێشەنگایەتی ناوەندی سێ هەزار ساڵیەکەی، دەرفەتی باشتر تێگەیشتنی گرنگی کلتووری نیولیتیک دەرەخسێنێت. دەستنیشان کردنی کلتوور و شارستانیەکان بەناوی گەلان دەشێت زێدەڕۆیی بێت، لەو سۆنگەیەوە؛ لەوانەیە رێباز و پەیڕەوێکی راست نەبێت. بەڵام بەلانی کەم دەشێت باسی ڕۆڵەکانیان بکەین لەسەردەمی نموونە یان چەشنی یەکەمیاندا. ئاشنابوونی مێژوو تەنیا

لەمیانەی هەندێک ئیمپراتۆریەت و خانەوادەوە بۆ گوزارشتکردنی ڕاستی بەس نییە و ناتەواوە. بەتایبەتیش پێناسەکردنی نەتەوە ناسراوەکانی مۆدێرنیتە وەک هێزی هەڵگری مێژوو، مانای ئەنجامدانی گەورەترین چەواشەکاری مێژووە. کاتێک ئەو زەمینە مێژووییانە دەربازکران کە پەیوەندی تاقانەیی ـ گەردوونییان نەبەستووە و زیاتر وەک میراسی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیەکان ماوەتەوە، ئەوکاتە مێژوویەکی ڕاستتری مرۆییانەی کۆمەڵگامان بەرچاو دەکەوێت. تەنیا بەو ڕێبازە دەتوانین مێژووی ڕەنجدەران و گەلان بئافرێنین کە بێ مێژوو کراون.

پەیوەندی نێوان مێژووی کلتووری و دیموکراسی بابەتێکە لە سۆسیۆلۆژیا باسنەکراوە. پێوانەی ڕاستەقینەی دیموکراتیبوون پەیوەندی بە ڕکابەریێتی شارستانیەوە هەیە نەک شارستان بوون. ئەو بەرخودانەی کۆمەڵگایەک بەرامبەر هێزەکانی شارستانی پیشانیداوە گرنگترین پێوەری دیموکراسیبوونە. هەرچی لیبرالیزمە بانگەشەی پێچەوانەکەی دەکات. شارستانیبوون دەکاتە مەرجێکی دیموکراسی. ئەو کلتوورانەی نەبوون بە شارستانی نەریتێکی بەهێزی دیموکراسی لەگەوهەرەکەیاندا هەیە. ئەو بەڕێوەبەرایەتیانەی بەسیفەتی دژە تێزی فۆڕمی دەوڵەت دەرکەوتوون دیموکراتیکن و بەو خەسڵەتەشیان نەریتێکی بەهێزی دیموکراسی پێکدێنن. نەتەوە و گەلە بێدەوڵەتەکان، گروپە ئایینی و مەزهەبیەکان، جڤاتەکانی قەبیلە و خێڵ کە لەپشت دیوارەکانی شار بەرامبەر بە جیاوازی چینایەتی بەرخودانیان کرد و تاڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامن هێزە بنەڕەتیەکانی دیموکراسین. ئانتی ـ شارستانیەتی سیستەماتیک دیموکراسیخوازییە. بەدەستەواژەکردن و دامەزراوەکردنی دیموکراسی لەچوارچێوەی شار، چین و دەوڵەت لەلایەن ئایدیۆلۆژیا مارکسی و لیبرالیەکانەوە شێواندن و چەواشەکاریەکی گەورەیە. سیستەمی دیموکراسی کە خراوەتە چوارچێوەی شار، چین و دەوڵەتەوە خەسێنراوە، ناوەڕۆکی کلتووری دیموکراسی بووچەڵکراوە، خراوەتە ژێر فەرمانڕەوایی دەوڵەتی شار و چینی باڵادەست و مایەپووچ کراوە. لەبنەڕەتدا شارستانی سیستەمێکە دژی کلتووری دیموکراسی سەریهەڵداوە.

کاتێک پێگەی کلتووری کوردان لەبەرامبەر شارستانیەکان هەڵدەسەنگێنین، پێویستە بەردەوام ئەو پەیوەندییە دیالیکتیکیە ڕەچاو بکەین کە لەسەرەوە هەوڵی پێناسەکردنیمان داوە. وەک دەزانرێت؛ بەرامبەر کلتووری شارستانی سۆمەر کوردان (کورتییەکان) بەردەوام لەدۆخی بەرخودان دابوون. بەتایبەتیش دەشێت لەو باسە میتۆلۆژیانەدا ببینین کە باسی مێخوداوەندی شاخ (نینهورساک) دەکرێت. داستانی گلگامێشیش لەناوەڕۆکدا گوزارشت لە تێکۆشانی ئازادی و پاراستنی بوونی کوردان (کورتییەکان) دەکات کە بەرامبەر شارستانیبوونی سۆمەر بەرخودانیان دەکرد. هەرچەندە دزەکردنی شارستانی بۆ ناو کوردان(کورتییەکان) ڕووبەڕووی بەرخودان بووبێتەوە؛ بەڵام بناغەی زهنیەت و دامەزراوەکانی خۆیشی دادەنێت. لەگەڵ ئاواکردنی شارەکان لەدەوروبەری بازاڕدا کلتووری شارستانی کۆمەڵگای نیولیتیک دەخاتە ژێر کاریگەری خۆیەوە. بەگوێرەی پێدراوە

بەرجەستەکان دەستنیشان کراوە کە لەساڵانی ٤٣٠٠ پ.ز بەدواوە کلتووری ئەلعوبێیدی میزۆبۆتامیای خوارو‌و کاریگەری کردۆتە سەر کلتووری میزۆبۆتامیای سەروو. کلتووری ئەلعوبێد لەمیانەی ئەو کۆمەڵگایەی لەدەوری خانەدانە بەهێزەکان پێکهاتووە لە کلتووری پێشووتری قەبیلە جیادەبێتەوە.

پەیوەندی و ناکۆکیەکانی نێوان کلتووری یەکسانیخوازی قەبیلە و کلتووری پلەداری کە جیابوونەوەی چینایەتی تێیدا دەستی پێکردووە رۆڵێکی گرنگ لە پێکهاتەی هوری(خوری) یەکاندا دەبینێت. خوریەکانیش وەک کورتییەکان لەهەمان رەچەڵەکەوە دێن (لەزمانی سۆمەریدا "کور"و "ئور" مانای "شاخ"و "گرد"ە) دەرک دەکرێت. ئەو کۆمەڵگایەی لە گرد و شاخەکانی کەوانەی زاگرۆس ـ تۆرۆس چڕبوونەتەوە گوزارشت لەهەمان جڤات دەکەن کەناویان لەو دوو وشە پێکهێنراوە. کلتووری خانەدانیش کە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ قەبیلە سەریهەڵداوە، دەبێتە بەشێکی گرنگی کلتووری نەریتی کوردان.

وەک دەستنیشانکراوە لەساڵی ٢٠٠٠ پ.ز بەدواوە خوریەکان (کورتی) هەنگاوی گرنگیان بەرەو شارستانی هاوێشتووە و لەمیانەی خانەدانێتی گودیا (بە خودیا ش ناودەبرێت و) وە بەسەر شارەکانی سۆمەردا زاڵ بوون (٢١٥٠ـ ٢٠٥٠ پ.ز). لەساڵانی ١٦٠٠ پ.ز بەدواوە دوو ئیمپراتۆریەتی دراوسێ و خزمیان بە ناوەکانی هیتیت (الحثیین) لە ئەنادۆڵی ناوەوە و میتانی لە میزۆبۆتامیای سەروو دامەزراندووە. کلتووری هیتیت و میتانی گرنگترین و بە هێزترین نموونەی شارستانیبوونی خوریەکانی ژێر کاریگەری کلتووری سۆمەریەکانە لە مێژوودا. هەر دوو هێزیش بە تایبەتی بەرامبەر هێزەکانی بابل و ئاشوور یەکیان گرتووە کە بە بنەچە سامی بوون و لەسەر کلتووری سۆمەری ئەو قۆناغە ئاوا کرابوون، لە ساڵی ١٥٩٦ پ.زیش شاری بابلیان داگیر کرد. لە ساڵانی ١٥٠٠ ـ ١٢٠٠ پ.ز وەک بە کاریگەرترین هێزەکانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوین توانیویانە شارستانی میسریش بخەنە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. نەفەرتیتی بەناوبانگ (شازادەخاتوونی میتانی کە بە بووکێنی چووە میسر) بەڵگەی بەهێزی ئەو کاریگەریەیە. وەک هێزێکی شارستانی خوریەکان بەرامبەر ئاشووریەکان پەرتەوازە بوون کە لە ساڵانی ١٢٠٠ پ.ز هەڵکشاون و بۆ کلتووری کۆنی قەبیلە گەڕاونەتەوە و ماوەیەکی درێژخایەن تێیدا ژیاون. وەک دەستنیشان کراوە بە ناوی کۆنفیدراسیۆنی نائیری(١٢٠٠ـ٨٥٠ پ.ز؛ بە زمانی ئاشووری نائیری مانای گەلی رووبار و ئاو دەبەخشێت) بەشێوەی یەکینە خاوەکانی قەبیلە ژیاون. لەو سەردەمانەدا بەر لە ناوەندیبوونی هێزی لەجۆری ئیمپراتۆریەت و دواتریش تێبینی ئاواکردنی کۆنفیدراسیۆنەکان دەکرێت.

پاشایەتی ئورارتوو(٨٥٠ـ٦٠٠ پ.ز)ی بە ناوبانگیش نموونەیەکی دیکەی بەرهەمی پەیوەندی و ناکۆکیەکانی نێوان کلتووری نەریتی میزۆبۆتامیای خوارو‌و و سەرووە. لە شارستانیدا بە تایبەتی بە هونەری ئاسنگەریەوە دەرکەوتۆتە پێش. کلتووری ئورارتوو کە شیمانە دەکرێت لە سەنتێزی بنەچەی خوری و فاکتەرە کلتووریەکانی نوێنەرانی ئەرمەنیەکانی رۆژی ئەمڕۆمان پێکهاتووە ئەڵقەیەکی گرنگی سیستەمی شارستانی

ناوەندی پێکدێنێت. تاکە هێزە کە بتوانێت بەرەنگاری ئیمپراتۆریەتی ئاشووری هێزی هەژموونگەرایی ئەو قۆناغە ببێتەوە، لە سەر پێیان بمێنێتەوە، تەنانەت ناوە بە ناوەش ناچاری پاشەکشێی بکات. کاریگەریەکی بەهێزی لەسەر سەرجەم زهنیەت و بونیادە کلتووریەکانی ناوچەکە هەیە، لە سەرووی هەمووشیانەوە کلتووری ئەرمەنی و کوردەکان. کۆنفیدڕاسیۆنی میدیاش (لەوانەیە ناوێک بێت کە ئاشووریەکان لە خوریەکانیان ناوە) کە لە شاخەکانی زاگرۆس بە درێژایی سێسەد ساڵ بەرخودانیان بەرامبەر ئاشوور کرد لەساڵی ٦١٢ پ. ز نەینەوای پایتەختی ئیمپراتۆریەتی ئاشووریان رووخاند و بوون بە ئیمپراتۆریەت. دوای سەردەمە کورتخایەنەکەی ئیمپراتۆریەتیش کە لە ئاکامی تەڵەکەبازیەکانی خانەدانێتیەوە پاشایەتی کەوتە دەستی پاشا بەبنەچە ئەخمینیەکانی فارس ٥٥٠ پ.ز، بەڵام دیسان کلتووری میدیەکان بەهێزترین کلتووری ئەو ئیمپراتۆریەتە بوو. بەتایبەتیش لەبواری هونەری سەربازیەوە بەمجۆرەیە. لە سنووری دەریای ئیجەوە تا ناوەوەی هیندستان، لەمیسرەوە تا دەگاتە تورکمانستانی ئەمڕۆمان بەناوی ئیمپراتۆریەتی پارسەوە دەبێتە تاکە هێزی جیهانی. یەکێکە لە ئەڵقە بەهێزەکانی سیستەمی شارستانی ناوەندی. تا لەساڵی ٣٣٠ پ.ز کەوتە دەستی ئەسکەندەرەوە بەدرێژایی دووسەد و پەنجا ساڵ تاکە هێزی هەژموونگەرایی جیهان بوو، شوێنپەنجەیەکی قووڵی لەکلتووری شارستانی جێهێشتووە. ئەوەی شارستانیەتی رۆمای ئافراند لەناوەرۆکدا شارستانی ماد ـ پارسە. ئەو پاشایەتیانەی وەک ئەڵقەی بەستنەوە دوای فەتحەکانی ئەسکەندەر ئاواکران وەک هێزی بەدەگی شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان ساسانیەکان (بەردەوامی پارسەکانن ٢١٦ـ٦٥٠ زایینی) و رۆما (٥٠٠ پ.زـ ٥٠٠ زایینی) بەکارهێنران. رۆما و ساسانیەکان کە دواترین دوو گەورە هێزی چاخی کۆن بوون کاتێک نەیانتوانی بەتەواوی یەکتری تێکبشکێنن و هیلاک بوون ڕێگای فەتحی ئیسلامیان خۆشکرد. لەگەڵ دەرکەوتنی حەزرەتی محەمەد سەردەمێکی نوێی کلتووری لەمێژوو دەست پێدەکات کە لەژێر ناوی کلتووری ئیسلامیەوە بەهرەی کۆکردنەوەی یەکێتی کلتووری بەهێزی هۆز و قەبیلەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی پیشان داوە.

سەرجەم رووداوە گرنگەکانی کلتووری شارستانی چاخی کۆن کە نزیکەی چوارهەزار ساڵی خایاند لەمیزۆبۆتامیای سەروو و دەوروبەرە نزیکەکەی روویانداوە. کلتووری کوردەکانی سەرەتاش ئەرێنی بێت یاخود نەرێنی لەو دووەم سەردەمە درێژخایەنەدا پەرەسەندن و گۆڕانکاری بەخۆوە بینیوە. بەدڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کە خوری، میتانی و هیتیتەکان لەیەکەمین دووهەزارەدا لەئاستی دونیادا کاریگەرییان هەبووە. ئەڵقەی بنەڕەتی و دیاریکەری پێکهێنەری کلتووری گریک و رۆما و دەرکەوتنی کلتووری خۆرئاوا کلتووری خوری ـ میتانی ـ هیتیتە. لەمیانەی گواستنەوەی داهێنانەکانی خۆی و میراسی کلتووری سۆمەر بۆ خۆرئاوا، واتە بۆ گریک ـ رۆما رۆڵی ئەڵقەی زێڕینیان لەبەردەوام کردن و نەپچڕانی سیستەمی شارستانی ناوەندیدا بینیوە. رۆڵی ئەو ئەڵقە زێڕینە دەست نیشان نەکرێت ناشێت لێشاوی مێژوو روون بکرێتەوە. ئەگەر لەلایەن

کلتووری دوازدەهەزار ساڵی نیولیتیک و کلتووری شارستانی دووهەزار ساڵە تێرخۆراک نەکرابووایە، بەهەرحاڵ نەماندەتوانی باسی کلتوورێکی مرۆڤایەتی بکەین کە مۆرکی خۆی لەئەمڕۆ داوە.

لە یەکەم دووهەزارەی کۆمەڵگای شارستاندا پەیوەندی کوردەکانی سەرەتا (پرۆتۆتیپ) لەگەڵ شارستانی زۆر خەست بووە. پەیوەندییەکی دوولایەنە مۆرکی خۆی لەسەرجەم پەرەسەندنەکان داوە. بەلایەنی یەکەمەوە؛ بەردەوام شەڕ و تێکۆشانیان لەبەرامبەر فاکتەرە چەوسێنەر و سەرکوتکارەکانی شار، چین و دەوڵەتی کلتووری شارستانی جێگای باس بووە. هەندێکجار هەڵمەتگەلێکیان ئەنجامداوە کە بەسەرداگرتنی ناوەندەکانی چەوسانەوە و سەرکوتکردن (فەتحکردنی بابل، رووخانی نەینەوا) گەیشتووە، کاتێک هێزیشیان سنووردار بووە زیاتر لە لووتکە فەتحنەکراوەکانی شاخەکان گیرساونەتەوە (کلتووری هەورامی و زازایی کە لەبنارەکانی باشووری شاخی زاگرۆس تا دەگاتە دەڤەری دێرسیم دەژین و بەشێوەزاری لێکچوو قسە دەکەن لەنزیکەوە پەیوەندییان بەو پەرەسەندنانەوە هەیە) بایەخێکی تایبەتیان بە بەرگریکردن لەبوون و دەستبەردار نەبوون لەسەربەخۆیی و ژیانی ئازاد داوە. شوێنپەنجەی ئەو کلتوورە تا رۆژی ئەمڕۆشمان بەکاریگەرە. ئەو توێژانەی یان خەڵکانەی بەکورت (کورد)ی شاخی ناودەبرێن لەبنەڕەتدا ئەو قەبیلە خورییانەن کە بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ لەسەر ئەو هێڵە ژیاون. لێکچوون و بەیەکگەیشتنی چەندین پەیڤی زازاکی و هەورامی لەگەڵ بنەچەی هەندێک وشەی زمانی خوری ئەو راستییە روون دەکاتەوە. لایەنی دووەمی ئەو پەیوەندییانەی لەگەڵ کلتووری شارستانی پێشخراوە بەشێوەیەکی ئەرێنی هەڵسەنگاندووە و لەسەر بنەمای پەسەند و هەرسکردن بووە. ئەو رەنگدانەوەیەی شارستانی لە کلتووری کورداندا بەشێوەی نەشونماکردنی زهنیەت و دامەزراوەکانی شار، چین و دەوڵەت بووە. رێسای "ئەگەر ناتوانی تێکیبشکێنیت، بەخۆتی بچووێنە ئینجا بەسەریدا زاڵ بە" کە لەزۆر نموونەدا دەیبینین لێرەدا جارێکی دیکە رووبەڕوومان بۆتەوە. نموونەکانی گۆتی، میتانی، هیتیت، ئورارتوو، ماد، پارسی و ساسانی بەرامبەر بەهێزەکانی شارستانی کە پەلاماریانی دەدا، لەمیانەی خۆ ئاواکردن بەشێوەی شارستانی و لێکچوونەوە هەوڵی لەسەر پێ مانەوە و تێکشکاندنیان دەدات.

دووهەزار ساڵەی دووەمینی سەردەمی شارستانیەت سەبارەت بەکوردەکانی سەرەتا تا دەگاتە قۆناغی ئیسلامیەت ئەو سەردەمەیە کە شارەکانی خۆیانیان ئاواکردووە، چینە دەسەڵاتدارەکان پێکهاتوون و دەوڵەتی خۆیانیان ئاواکردووە. ئەو کلتوورەی زیاتر لەبناری شاخەکان و ناوچە دەشتاییەکان پێکهات تایبەتمەندێتیەکی تێکەڵی زاڵە: ئەرستۆکراسە فەرمانڕەواکان؛ زمان و کلتووری ئەو شارستانیانە دەژێنن کە هەوڵی لێکچوون لەگەڵیان دەدەن، لەگەڵ ئەو توێژانەی کە چینی ژێرەوە پێکدێنن و کلتوور و زمانی خۆیان دەژێنن. کارەکتەری دووانەیی ئەو کلتوورەی لەژێر کاریگەری قورسی جوگرافیای کوردان پێکهاتووە بەگۆڕانکاریەکی زۆر کەمەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە.

ئەگەر جیابوونەوەی دوانەیی، بەشێوەی کلتووری دەشت و شاخ بێت، یاخود جیابوونەوەی دووانەیی چینایەتی کلتووری دەشت ـ شار بێت تایبەتمەندێتی سەرەکی کەسایەتی ئەو کلتوورەن. چینی سەروو خۆگونجاندنێکی بێهاوتای بەرامبەر بیانی، داگیرکار و فەتحکارە چەوسێنەرەکان پیشانداوە، کلتووری گەل ـ قەبیلەی خۆیشی بە بێکەڵک داناوە و پشتگوێی خستووە، بەشێوەیەکی زۆر سنووردار لە پەیوەندییە ناوخۆییەکان بەکاریهێناوە. خۆی لەناو ئەو شارستانیانەی ڕۆڵی تێدا دەبینێت یاخود خۆی ئاوایکردووە، لەپێناو زاڵکردنی زمان و کلتووری خۆی هەوڵی نەداوە یاخود هەوڵێکی زۆر کەم لە ئارادابووە. لە گۆتیەکانەوە تا دەگاتە ئەیوبیەکان ڕەوش بەمجۆرە بووە. ئەو گرووپە باڵادەستە شاری و دەوڵەتییە بەجۆرێک ڕۆڵی نەرێنییان بەرامبەر بوونی کلتووری نەریتی کوردان بینیوە کە لەهیچ کۆمەڵگایەکدا نەبینراوە. بێگومان ئەو بەرژەوەندییە باڵایە بنەماڵەیی و چینایەتیانەی لەمیانەی توانەوە لەناو زمان و کلتووری بیانیدا ئافرێنراوە، ڕۆڵی کاریگەری لەو خراپەکاریانەدا بینیوە. کورتی (کوردی: گورتی: گۆتی) شاخ و چینی خواروو کە لەناوەخۆیدا داخراو بوون، تەنیا لەمیانەی کلتووری خێزان و قەبیلەی نەگۆڕەوە توانیوویەتی بوونی خۆی لەتوانەوە بپارێزێت و تا ڕۆژی ئەمڕۆمانی بێنێت. دروستبوونی کەلێنێکی گەورە لەنێوان ئەو توێژە یان چینە کلتووریەدا بەشێوەی کوردایەتی ڕاستەقینە ـ کوردایەتی ساختە ڕێگای لەپێش جیابوونەوەیەکی ڕیشەیی کردۆتەوە. ئەو ڕاستییە مێژووییە لەژێر ئروست نەبوونی بۆرژوازیەکی نەتەوەیی کورد شاراوەیە کە دەبوایە لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێکبێت.

پێویستە باسی دیاردەیەکی کلتووری کوردی سەرەتایی بکەین کە لەسەردەمی نیولیتیک و چاخەکانی سەرەتا بەشێوەیەکی بەهێز ژیاوە. ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتیانەی هەریەکەیان دیاردەیەکی مێژوویین لەو قۆناغەدا نەیاندەتوانی خۆیان وەک ڕاستینەی قەوم یاخود گەلێک پێشکەش بکەن کە بەتەواوی جیاوازن و بوونەتە خاوەن ناسنامە. چونکە هێشتا بەو سەردەمە نەگەیشتبوون. چونکە دیمەن یان ڕووخساری سەردەمی نیولیتیک و چاخەکانی سەرەتا لەبواری قەوم و گەلدا بەشێوەی یەکینەکانی قەبیلە، خێڵ ـ هۆز و خانەدان بوو. یەکینە ئایینی و مەزهەبیەکانیش هێشتا بەتەواوی پێکنەهاتبوون. واتە شێوەی هۆشیاری قەبیلە، خێڵ و خانەدان پێشکەوتووترین هۆشیاری کۆمەڵایەتی ئەو قۆناغەن. سەردەمی نیولیتیک سەردەمی شکۆمەندی قەبیلەیە. هەر قەبیلەیەکیش بەتەوتەمێکەوە نوێنەرایەتی دەکرێت. تەوتەمیش ناسنامەی قەبیلەیە. شیمانە دەکرێت پەرستگاکەی گۆبەکلی تەپەی ئورفا ناوەندی خوداوەند ـ ئایینی بەهێزترین قەبیلە بێت؛ ناوەندی ئایینی هاوبەشی بەهێزترین قەبیلەکانی دەڤەرەکەیە. دەشێت هێما هاوشێوەکانی نووسینی هێرۆگلیفی سەر بەردە چەقێنراوەکان وەک تۆماری ڕەچەڵەکی هەر قەبیلەیەکیش بخوێنرێتەوە. واتە شێوەی سەرەتایی و یەکەمین نموونەی ماڵی خوداوەند و ناوەندەکانی ئایینی هاوشێوەی ئەهرام، زەقوورە و کەعبەی شارستانی ئیسلامی چاخی ناوین و شارستانییە سەرەکیەکانی میسر و سۆمەری چاخەکانی کۆنە. هەربۆیەش گرنگیەکی

مێژوویی زۆری هەیە. هەربۆیەش ڕێکەوت نییە کە حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا سەریهەڵداوە و بووە بە باپیرەی سێ ئایینە ئاکخودابیەکە. ئەنجامێکی کلتووری ناوەندی ئایینی دەڤەری ئورفایە کە هێندەی دەست نیشانکراوە رابردووەکەی بۆ دوازدە هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە. لەوانەیە سیستەمی پەرستگای گۆبەکلی تەپە رۆڵی کەعبەی ئایینی سێ هەزار ساڵی ئەو سەردەمەی بینیبێت. دەشێت باس لە رۆڵێکی هاوشێوەی حەرانیش بکرێت. لەوانەیە چەندین ناوەند هەبن کە تا ئێستا نەدۆزرابنەوە. کلتووری پەرستگای نەوالە چۆرێ ی ناوچەی سیڤەرەکیش بۆ یازدەهەزار ساڵ بەرلە ئێستا درێژ دەبێتەوە.

وەک دەزانرێت قەبیلەکانی سەردەمی نیولیتیک هەریەکەیان بەگشتی گیانلەبەرێکیان وەک تەوتەم بۆخۆیان هەڵبژاردووە. کاتێک دەڵێین تەوتەم بەجۆرێک لەجۆرەکان نازناو و ناسنامەی قەبیلەیە، بەمجۆرە یەکەمین شێوەکانی هۆشیاری قەبیلەش پێناسە دەکەین. وەک چۆن دەوڵەت ـ نەتەوەکانی رۆژی ئەمڕۆمان لەمیانەی ئاڵاکانیانەوە نوێنەرایەتییان دەکرێت و دەبن بەخاوەن ناسنامە، تەوتەمی یەکینەکانی قەبیلەش هەمان واتا دەبەخشن. وەک چۆن هێندەی ژمارەی ئاڵاکانی ناو نەتەوە یەکگرتووەکان نوێنەرایەتی دەوڵەت ـ نەتەوەکان دەکرێت، ئەوا لەرێگای تەوتەمەکانی ناوەندەکانی پەرستگای ئایینیشەوە نوێنەرایەتی ئەو قەبیلانە دەکرێت کە لەو سەردەمەدا بەهێز و بەناوبانگ بوون. جیاوازی نێوانیان پەیوەندی بە قەبارەکەیانەوە هەیە نەک ناوەڕۆک. ئاگادارین کە تەوتەم هەڵگری تایبەتمەندێتیەکی دیاری تابۆ و پەرستنە. پەرستنی تەوتەم گوزارشت لەخۆ پیرۆزکردن و شکۆدارکردنی قەبیلە دەکات، واتە ئارەزووی گەیشتن بە ژیانێکی درێژخایەن و گەرەنتیکراو پیشان دەدات. باوەڕی ژیانی دوای مردن ئەنجامی ئەو وابەستەبوونە گەورەیەیە کە بە باب و باپیران هەیانبوو. چونکە بوونیان لەگەڵ ئەواندا یەکسانە. پابەندبوون و رێزیان بەرامبەر باوان و باپیرانیان بەرەو باوەڕی ژیانێکی ئەبەدی دوای مردنیان دەبات. ئایینە ئاکخودابیەکانی دواتر شێوەی پێشکەوتووی ئەو باوەڕییەی قەبیلە و چەمکی ئایین و خوداوەندە.

شیکارکردنی کلتووری قەبیلەی ئورفا و دەڤەرەکەی سەردەمی نیولیتیک و سەردەمەکانی شارستانی، لەوانەیە روونی بکاتەوە کە ئەو کلتوورە تەمەن پێنج هەزار ساڵییە بۆچی هێندە خۆڕاگر و هەمیشەییە. هەروەها شوێنپەنجە بەهێزەکانی کلتووری قەبیلە لەژێر ریشەی چەمکی ناموس و خێزان و سۆزە ئایینیەکاندا شاراوەیە کە تائێستاش زۆر بەهێزە. تا ئێستاش بەهێزی کێشەکانی خوێن و ناموس دیسان ئەنجامێکی راستی ئەو کۆمەڵگا کلتوورییەیە. ئەو یاسایانەی لەناسنامەی کۆمەڵایەتیدا نووسراون (بەکۆلین) بەئاسانی ناسڕێتەوە و کاریگەری خۆی لەدەست نادات.

هەرگیز ناشێت ئەو دونیایەی هزر و سۆز بچووک ببینرێت کە بوونی کلتووری قەبیلە ئافراندوویەتی. تەنانەت ئەو هوشیاری و بوونە کلتوورییەی تا ئێستا مرۆڤایەتی لەسەر پێیان رادەگرێت شوێنپەنجە قووڵەکانی لەخۆوە دەگرێت. کلتووری قەبیلە لە سەرچاوەی سەرجەم شێوە سەرەکیەکانی هوشیاری لەمیانەی هونەر، زانیاری، فەلسەفە، ئایین و

میتۆلۆژیاوە ئاماژەی پێدەکرێت. هیچ قوتابخانەیەکی میتۆلۆژی، ئایین، فەلسەفە و هونەری نییە کە کلتووری قەبیلە نەکاتە سۆز و ئاماژەیان پێنەکات. کاتێک لەقووڵایی توێژینەوە سەبارەت بە جیاوازییە میتۆلۆژی، ئایینی، فەلسەفی و هونەرییەکان بکەین، ئەوا بوونی قەبیلە لەبناغەی هەر جیاوازییەکدا دەبینین. هۆشیارییەکانی دواتری قەوم و نەتەوە، دەرهاوێشتەکانی هوشیاریی ئەو قەبیلانەیە کە پشت بە یەکینەکانی فرە قەبیلەیی دەبەستن. بۆ نموونە قەبیلە عیبرانی (قەبیلەی حەزرەتی ئیبراهیم) بناغەی ئایینە ئیبراهیمی و مەزهەب و تەریقەتەکانی پێکدێنێت کە هەرە دوایی بەشێوەی میللیگەرایی ئایینی بوون بەنەتەوەیی. بەر لەوەی ئەو ئایین، مەزهەب و نەتەوانە سەرهەڵدەن، هێزی پۆتانسێلی راستیەکان سەرچاوەی خۆی لەگەڕانی قەبیلەی ئیبراهیمی دەگرێت لەنێوان هیلالی بەپیت و شارستانیەکانی میسر. شکاندنی خوداوەندە ـ بتەکانی تەوتەمی قەبیلەکانی ناوەندی پەرستگای دەڤەری ئورفا و جێگیرکردنی باوەڕییەکی مانادارتر و بە دەستەواژەکراوی قەبیلە لەجێگایدا بناغەی شۆڕشی ئیبراهیمی پێکدێنێت. مەسیحیەتیش بەناوی قەبیلە هەژار و کۆیلە فرێدراوەکانەوە ئایینی ئیبراهیمی وەرچەرخاندووە. هەرچی ئایینی ئیسلامە کە حەزرەتی محەمەد ڕێبەرایەتی دەکرد هەمان شتی بۆ دونیای ئەو قەبیلانە فەراهەم کرد کە لەنێوان بێزەنتی و ساسانیەکانەوە گیریان خواردبوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە دونیای قەبیلە عەرەبیەکان. ئەگەر قەبیلە هەژار و دەستەی ئەو کۆیلانە نەبووایە کە لە ویژدانێک دەگەڕان پەنای بۆ ببەن ئەوا ئایینی کرستیانی نەدەبوو، ئەگەر قەبیلە هەژارەکانی عەرەبیش نەبووایە بیر لەدەرکەوتنی ئیسلام نەدەکرایەوە.

جەماعەتی کرستیانی و ئوممەتی ئیسلامی کۆمەڵگای هۆشیاری نوێن کە قەبیلەکان و مرۆڤە ئاوارەکانی لەقەبیلە دابڕابوون لەگەڵ کۆیلە بێ کار و سەربازە راکردووەکان لەسەر بنەمای باوەڕی هاوبەش پێکیان هێناوە. لێرەدا کۆمەڵگایەکی نوێ و باوەڕییە نوێکانی جێگای باسە کە قەبیلەی دەربازکردووە و بناغە چینایەتیەکەی پەرەیسەندووە. بەڵام لەهەلومەرجی ئەو کۆمەڵگایە نوێیەشدا قەبیلە بەشێوەیەکی بەهێز درێژە بەبوونی خۆی دەدات کە گۆڕانکاریەکی زۆر کەمی بەسەردا هاتووە. ئەوەی لێرەدا جێگای باسە وەرچەرخانی کۆمەڵگای قەبیلەییە لەسەر بنەمای بونیادێکی کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیایەکی نوێ. چونکە کەوتبووە قەیرانەوە؛ ئەو چارەسەرییەی قەبیلە لەناو خودی یەکینەی خۆیدا نایدۆزێتەوە، لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی دیموکراسی قەبیلە لەدەرەوە لەناو پەرەسەندنی کلتووری شار، چین و دەوڵەت هەوڵی دۆزینەوەی دەدات.

لەسەردەمی قەبیلەدا قەیرانی ئەو قەبیلانە جێگای باسە کە ژمارەیان زیادی کردووە و قەبارەشیان گەورە بووە. لەسەردەمی قەیراندا دوو چینی خاوەن چەمکی جیاواز دیار دەبێت: یەکەمیان؛ لەکاتێکدا بنکە هەژارەکەی قەبیلە دابەش دەبێت و جەخت لەسەر ئازادی خۆی دەکاتەوە. توێژی دووەمیشیان؛ پلەداری قەبیلەش بەسیفەتی خانەدانی دەسەڵاتدار لە بنکە هەژارەکەی قەبیلە دادەبڕێت، لەمیانەی پێهەڵگرتنە ئایدیۆلۆژیەکانەوە ـ کە بەگشتی

بە ئاییني شارستاني ناوی دەبەین ـ خۆی بەشێوەی کۆمەڵگای دەوڵەتی نوێ ڕێکدەخات. بەمجۆرەش کلتووری کۆنی قەبیلە بەرامبەر بە کلتووری شارستاني دۆڕاوە. ئاواکردنی شار، جیابوونەوەی چینایەتی و دەوڵەتبوونیش ئەو گۆڕانکارییەیە کە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەو وەرچەرخانەدا ڕوودەدات. ئەمە ئەو چارەسەریەیە کە شارستاني بۆ قەیراني کلتووری قەبیلەی دۆزیوەتەوە. ئەو بۆچوونەی لەمێژوودا گفتوگۆیەکی زۆری لەبارە کراوە و مارکسیستەکانیش خاوەنداریێتی لێدەکەن: ئەو وەرچەرخانە هەنگاوێکی زەبەلاحە کە بەرەو پێشەوە هاوێشتراوە. مارکس و ئەنگلس لەمیانەی تێڕوانینی ماتریالیزمی مێژووییەوە کردوویانە بە حەتمیەت و دۆخێکی یاساییان پێداوە، وەک هەنگاوێکی زەبەلاحی مێژوویيان هەڵسەنگاندووە کە بەرەو پێشەوە هاوێشتراوە.

منیش ئەو چەمکە ڕەخنە دەکەم. ئەوەی لەکۆمەڵگای قەبیلە ڕوویداوە ناشێت وەک قۆناغێکی ناچاری قەیران هەڵسەنگێنرێت. ئەوەی ڕوویداوە بڕاری چینایەتی فاکتەرەکانی پلەدارییە. چونکە گۆڕانکاریەکە (نالێم پێشکەوتنەکە) باجەکەی دواخستنی دیموکراسی، ئازادی و یەکساني ناو قەبیلەیە، دواکەوتنێکی سەر سوڕهێنەر و هەنگاوێکی کەوتنی مرۆڤایەتیە. لەبەر ئەوەی بەردەوام مێژوو بەتێڕوانینی ئایدیۆلۆژی گروپە دەسەڵاتدارەکان کۆدکراوە؛ ئەو گۆڕانکاریە بە ناچاری، پێشکەوتنخواز، تەنانەت پێشکەوتنێکی شۆڕشگێڕانەش ناودەبرێت! لەراستیدا ئەوە هەنگاوێکی ناچاری نییە، پاشڤەڕۆ، ڕووخێنەر و دژە شۆڕشە. ئەو کلتوورەی ڕووە باسنەکراوەکەی مێژووە، بەردەوام بەرامبەر خیانەتی نوخبەی خانەدانگەرای پلەداری خۆی تێدەکۆشێت و داکۆکی لەسەر هوشیاری و بونیادی یەکسان، ئازاد و دیموکراسی قەبیلە دەکاتەوە ئەو هێزە ڕاستەقینەیە نوێنەرایەتی پەرەسەندن و پێشکەوتن دەکات. گوزارشت نەکردنێکی سیستەماتیکیانەی زانستیانەی مێژوو لەلایەن ئەو هێزەوە لەوانەیە کێماسیەک بێت. بەڵام ئەو واقیعە مانای نەبوونی مێژوویێکی بەمجۆرە نییە؛ بەپێچەوانەوە پیشانی دەدات کە نەنووسراوە، ئەگەر نووسرابێتیش سەرکوتکراوە و بە شێوەیەکی بەهێز پروپاگەندەی نەکراوە. ئەو شارستانییەی پاوانەکانی چەوسانەوە و پاوانە ئایدۆلۆژیەکانی گروپی دەسەڵاتدار ئافراندوویانە چارەسەری قەیراني نەکردووە؛ لەمیانەی ئەو شارگەرایی، جیابوونەوەی چینایەتی و دەسەڵاتگەرێتیەی بەردەوام وەک گرێیەکی شێرپەنجەیی خۆی لەسەر پشتی کۆمەڵگا گەورە کردووە، لەرۆژگاری ئەمڕۆمان بووە بەگەورەترین سەرچاوەی قەیران. ئەگەر مرۆڤایەتی خوازیاری ژیانە پێویستە لەبەرامبەر کۆمەڵگای قەیراني مێژوویی، کلتووری دیموکراسی، ئازادی و یەکساني سەردەمی قەبیلەکان لەسەر بنەمای دەستکەوت و پەرەسەندنە ئەرێنییە دامەزراوەیی و زهنیەکاني درێژایی ژیار سەرلەنوێ زیندووی بکاتەوە و بەمجۆرە سەرکەوتوو دەبێت.

کاتێک بووني کلتووری و بەهاترین میراسی پاشماوەی کلتووری نیولیتیک و کلتووری چاخی کۆنی کوردە یەکەمینەکان لەگەڵ هوشیاری مۆدێرنیتەی دیموکراتی ببێتە یەک ئەوا

دەتوانێت لەقەیرانی ئەمڕۆی خۆرهەڵاتی ناوین ڕزگاری بێت و خاوەنی پەرەسەندنێکی شایستەی مێژوو و ناسنامەی خۆی بێت.

## ٢ ـ بوونی کوردان و نەریت

نەریتی زەردەشتی ڕۆڵێکی گرنگی لەپێکهاتنی بوونی کورداندا بینیوە. ئەو نەریتە ئەڵقەی گوزەرکردنی مێژوویی نێوان ئایینە ئیبراهیمیە یەکتاپەرستەکان و ئایینە بتپەرستەکانە. زەردەشتایەتی یەکەمین گەورە شۆڕشی ئایینی ـ ئەخلاقییە کە بۆ یەکەمین جار بونیادە تەوتەمیەکانی چەمکی ئایینی زاڵی کلتووری قەبیلەی لەدۆخی تابۆ دەرخست و بۆ بنەمایەکی ئەخلاقی ـ مانایی وەرچەرخاند. بە پێچەوانەی لەگرتنی ئیسلامی پشت بەستوو بەقەبیلە عەرەبەکان دەچێت، بەڵام پێش ئەویانە. قەبیلە ماد (میدیا)ییەکانی کوردە یەکەمینەکان لەسەر بنەمای باوەڕی و ئەخلاق ئامانجیان ئافراندنی یەکێتیەکی بالاترە. ڕێگەچارەیەک بۆ قەیرانی کۆمەڵگای قەبیلە پێشدەخات کە لایەنی دیموکراسی لەپێشە. ئەو سیستەمە باوەڕییەی لەساڵانی ١٠٠٠ پ.ز دەردەکەوێت لەڕێگای زەردەشتەوە (سەدەی شەشەمی پ. ز) سیستەمێکی کاریگەری کۆمەڵگا ئاوادەکرێت. ئەوەی لە شۆڕشی زەردەشتیدا گرنگە: بۆ یەکەمین جار یەکینە بەرتەسکەکانی قەبیلە و خانەدان دەرباز دەکات، ناسنامەیەکی بالای هاوبەش لەنێوان سەرجەم قەبیلەکانی میدیا دەئافرێنێت. ئەو کاهینانەی بە مۆغ (داناکان) ناودەبرێن هێزە بەکاریگەرەکانی کۆمەڵگای نوێن. زەردەشتی ڕێگا لەپێش وزەیەکی مەزنی کۆمەڵگا دەکاتەوە. کۆکردنەوەی ئەو قەبیلانەی هێنانیان بۆ لای یەکتر سەخت بوو لەسەر بنەمای باوەڕییەکی ئایینی ـ ئەخلاقی هاوبەش گەورە شۆڕشێکە کە بەپێی پێویست مێژوونووسان هەڵوەستەیان لەسەر نەکردووە. کاریگەریەکەی لە ئیسلامیەت و کریستیانی کەمتر نییە. بگرە ڕۆڵی سەرچاوەی سەرەکی لە نەشونماکردنی نەریتی قەبیلەی عیبرانی دەبینێت. سەرەکیترین کەرەستەی ئاوابوونی کۆنفیدراسیۆنی میدیایە. دەست بەسەرداگرتنی کۆنفیدراسیۆنی میدیا ـ کە ناوەڕۆکەکەی دیموکراسیانەتر بوو ـ لەلایەن خانەدانی ئەخمینی پارس لەڕێگای تەڵەکەبازیەوە و ئاواکردنی گەورەترین ئیمپراتۆریەتی مێژوو لەنزیکەوە گرێدراوی نەریتی کۆمەڵایەتی زەردەشتییە. شێواندنی نەریتەکە و بێناوەڕۆککردنی، بەنەریتی شارستانی تەوەرەی ئێران ئەنجامگیر بووە.

نەریتی ئیمپراتۆریەتی ئاری شارەزاترین هێزی مێژووە لەچۆنیەتی بەکارهێنانی کلتووری قەبیلەی ناوەڕۆک دیموکراتیانە لەچوارچێوەی چەرخی بەڕێوەبەرایەتی خۆیدا. شانازی بەوە دەکات کە ناوەڕۆکی دیموکراتیانەی لەناو سیستەمی شارستانی تواندۆتەوە و بەهێزترین پاشایەتی مێژووی ئاواکردووە. بەو سیفەتەی نەریتێکی زۆرداری خۆرهەڵاتە بەرامبەر بە دیموکراسی ئەسینا لە خۆرئاوا، خۆی بەهێزکردووە و تاڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. ئەو هوشیارییە فەلسەفیەی دیموکراسی ئەسینا ڕێگای لەپێش کردەوە لەکاتێکدا

رۆڵــی ســەرچاوەی ســەرەکی نەشــونمای شارســتانی خۆرئــاوا دەبینێــت، وەک چــۆن زۆرداریەکانی کۆشکی پارس ـ کە ناوەڕۆکی نەریتی زەردەشتییان خاڵی کردووە ـ تـەنیا بەدۆڕان بەرامبەر سوپاکانی ئەسکەندەر نەوەستا، بەڵکو نەیتوانی توانستە کلتووریەکانی کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتیش لە لەناوچوون و بە فیڕۆدان رزگار بکات: وەک چۆن زۆرداری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیش نەیتوانی پاشماوەکانی توانستی کلتووری عوسمانی بەرامبەر شارستانی سەرمایەداری خۆرئـاوا بپارێزێت. ئـەو نەریتـە مێژووییـە دیموکراسیەی تـا رادەیەک لە کوردە ئێزیدیەکاندا پارێزراوە بابـەتێکی گرنـگ و شایستەی توێژینەوەیـە. ئەگـەر کـوردە ئێزیـدی و عەلەویـەکان لەنزیکـەوە تێبینــی بکـرێن، ئــەوا بــە ئاســانی تایبەتمەندێتیەکانی دیموکراسی، ئازادی و یەکسـانی کلتووری زەردەشتی بەتایبـەتی لـە ژنەکانیانـدا دەبینرێـت. وێـڕای ئـەو هـەموو سـەرکوتکاریەی دووچـاری هـاتوون لایـەنی راشکاوی، بوێری و ئاوێتەبوونیان لەگەڵ ژینگە و سروشتدا شایەنی سەرنجدانە.

ئـەو توێژینەوانـەی سـەبارەت بەراستینەی کلتووری کوردان ئـەنجام بـدرێت کـە تـا سەردەمی ئیسلام بەرادەیەکی زۆر تایبەتمەندێتییە خۆجێییەکانی خۆی پاراست، تەنیا بە رۆشنکردنەوەی مێژووی کـوردان ناوەستێت، بـەڵکو سـەردەمەکانی مێـژووی گـەردوونیش رۆشـن دەکاتــەوە کــە هــەزاران ســاڵ بــەردەوام بــووە. هەرچەنــدە لــە رۆژی ئەمڕۆمانــدا لەدۆخێکی بێکاریگەر داین، بـەڵام ئـەو توێژینەوانـەی دەرهـەق بـە مێژووەکـەیان ئـەنجام بدرێت دەیسەلمێنێت کە کوردان بەردی بناغەی مێژووی ژیاری دیموکراتین.

### ٣. بوونی کورد و نەریتی ئیسلامی

رێنسانی ئیسلامی کاریگەریەکی وەرچەرخێنەرانەی لەسەر تـەواوی کلتـووری نـەریتی قەبیلـەی خۆرهـەڵاتی نـاوین و سیسـتەمی شارسـتانی کـردووە. لـەرێگای گۆڕانکارییـەوە لەمیانەی ئوممەتگەرایی ئیسلامەوە لەناوەوە هەوڵی تێپەڕاندنی قەیرانی کۆمەڵگای قەبیلە دراوە، لەدەرەوەش لەسەر بنەمای ئاواکردنی سەڵتەنەتی گـەردوونی ئیسلامیەوە هـەوڵی دەربـازکردنی قەیرانـەکانی ئیمپراتۆریـەتی بێزەنتـی و ساسـانی دراوە. بـەمجۆرەش دوو نــاکۆکی ریشــەیی لەئاســتی تاکانــەیی و گــەردوونی لەمیانــەی ســەنتێزی ئیســلامی و رێکخستنی بونیادی و ئایدیۆلۆژی نوێ هـەوڵی دەربـازکردنی دەدرێت. ئـەو دیـاردەی بـە سیستەمی شارستانی چاخی ناوین ناودەبرێت پێهـەڵگرتنی ئیسلامی لەژێریـدا شاراوەیە. کاریگەرییــە بەهێزەکــەی نــەریتی ســەڵتەنەت و ئوممــەتی ئیســلامی لــەمێژوودا بــۆ تایبەتمەنــدێتی ئــەو ســەردەمە نوێیــە دەگەڕێتــەوە. بــەجۆرێک لــەجۆرەکان رۆڵــی مۆدێرنیتەیەکی سەرمایەداری پێشوەختی بینیوە. وەک بڵێی هـەواڵی بـەرایی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری خۆرئـاوای ئەوروپایـە، لـە دۆخـی منداڵـە مـردووە لەبارچووەکـەدا مـاوە. شارستانی ئیسلامی نەبێت بیرکردنەوە یان چاوەڕوانـی کردنـی لـەدایکبوونی شارسـتانی ئەوروپا هەڵەیە.

کاریگەری ئیسلام لەسەر کلتووری نەریتی قەبیلە و سیستەمی شارستانی لەئاستی شۆڕش دایە. لەوانەیە بەکاریگەرترین وەڵامی شۆڕشگێڕانەی ئەو قەیرانە بێت کە بەسەدان ساڵ لە کلتووری قەبیلە لە ئارادابوو. قەبیلە عەرەبەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبی بەسەدان بگرە بەهەزاران ساڵ لەناوەخۆیاندا کەوتبوونە ناو شەڕ و پێکدادانێکی بێکۆتاییەوە. خراپەکاریەکی مەزن لە کلتووری قەبیلە روویدابوو. ژن بچووک دەبینرا و جێگای سووکایەتی پێکردن بوو، کیژۆڵەکان هێندە بێنرخ بوون زیندە بەچاڵ دەکران. وەک چارەسەریش ئەو کلتوورە لەو هەلومەرجانە بێ بەش بوو کە کۆمەڵگای کلاسیک تێر بکات. بەکورتی نە فیدراسیۆنەکانی قەبیلەی باو و نە بونیادە نەریتیەکانی دەسەڵاتی کۆیلەداری هیچ یەکێکیان ناتوانن قەیرانەکان بەربەست بکەن. پێشنیازە کرداری، ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانی حەزرەتی محەمەد لەو هەلومەرجەدا وەک دەرمان بەکاریگەر بووە.

سەرەکیترین خەسڵەتی شۆڕشی محەمەدی: بەبێ ئەوەی لەسەر کۆمەڵگای قەبیلەوە ببێتە کۆمەڵگایەکی نوێ و بکەوێتە ژێر فەرمانی ئیمپراتۆریەتەکانی بێزەنتی و ساسانی تەنیشتیەوە، بوێری سیستەمێکی سیاسی نوێی پیشانداوە کە هەردووکیان دەرباز دەکات و خۆیشی بۆ ئەو کارە گونجاو و دەسەڵاتدار بینیوە. ئەو دوو دیاردە شۆڕشگێڕییە، واتە کۆمەڵگابوونی ئوممەتی ئیسلامی و دۆگمای کلتووری سیاسی لەژێر شکۆدارکردنی رادەبەدەری دەستەواژەی ئەڵڵا شاراوەیە. کاتێک بەشێوەیەکی زانستیانە شیکاری مێژوویی و سۆسیۆلۆژی دەستەواژەی ئەڵڵا بکرێت بە بایەخە و رایەڵەکەی لەگەڵ ئەو دوو دیاردەیە ئاشکرا دەبێت. نەوەد و نۆ چەشنە مانای پەیڤی ئەڵڵا هەڵگریتی، لەبنەڕەتدا ئاماژەیە بۆ مانیفستۆی سیاسی، کۆمەڵایەتی و بگرە ئابووریش. لەراستیدا کاتێک خۆی وک "پەیامبەر" پێناسە دەکات، ئەوا بەشێوەیەکی تۆکمە و بەهێز ناسنامە نوێیەکەی سەنتێزی کۆمەڵایەتی و مێژوویی پاشخانەکەی ئاشکرا دەکات. گەردوونی، ئاگادار بوون، زانایی، بەخشندەیی، ئاگادارکەرەوەیی لەرێگای خەڵاتەکانی بەهەشت و دۆزەخی دەستەواژەی ئەڵڵا وەک فەرمانێک ناسنامەی سیستەمی نوێ پێشکەش دەکات.

مانیفستۆی کۆمۆنیستی چی بێت کە مارکس و ئەنگلس نووسیویانە، قورئانی پیرۆزیش هەمان شتە کە"بۆ حەزرەتی محەمەد هاتۆتە خوارەوە". یەکەمیان تایبەت بە ئەوروپا و زانستی نووسراوە، دووەمیشیان لەمیانەی کۆدی تایبەت بە خۆرهەڵات و ئایین راگەیەنراوە. دیاردەکانی بە کۆمەڵگای سۆسیالیستی و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ناودەبرێن لە ئیسلامیەتدا بەرامبەرەکانیان کۆمەڵگای ئوممەت و سوڵتەی ئیسلامییە. هەروەها سیستەماتیکی چەمکی سوڵتە (سەڵتەنەت)ی ئیسلامی لەچەمکی دیکتاتۆریەتی سۆسیالیستی کەمتر نییە. هەروەک هی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەردوو دیاردەش بەدرێژایی سەدان ساڵ بەشێوەیەکی سیستەماتیک هەوڵی پەرەپێدانی دراوە.

ئەو دوالیزمەی لەمێژووی شارستانی بەسەر هەر شۆڕشێکدا هاتووە بەشێوەیەکی بەهێز لە شۆڕشی ئیسلامیشدا روویداوە. ماوەیەکی کورت دوای ئەنجامدانی؛ ئاخۆ شۆڕش

بەئاراستەی دیموکراتیدا دەبێت یاخود بەئاقاری دەسەڵات ـ دەوڵەت دەچێت؟ بووە بە کێشەیەکی سەرەکی. هەر لەسەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامەوە هەردوو مەیلیش بەشێوەیەکی بەهێز دەرکەوتوون. لەکاتێکدا چینی سەرووی قەبیلە و ئارەزووخوازانی دەسەڵات هەوڵیاندەدا بەخێرایی ئیسلام بکەن بە سەڵتەنەت، توێژی خوارووی قەبیلە و کۆیلەکان هەوڵێکی زۆریان دەدا بەئاراستەی دیموکراسیدا بچێت. چینی سەرووی قورەیشیەکانی قەبیلەی حکومڕان بەڕێبەرایەتی مەعاوییە هەوڵیدا پێهەڵگرتنە دیموکراتیەکەی ئیمام عەلی بەربەست بکات کە زیاتر کارەکتەری چینی ناوینی هەبوو. بەهۆی ئەو ناکۆکیەی ئەبوبەکر، عومەر و عوسمان لەگەڵ ئیمام عەلیدا هەیانبوو دوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد لەقۆناغی گوزەرکردن دا (٦٥٦ـ٦٣٢زایینی) بە ریزە خەلیفایەتی (یاریدەدەری حەزرەتی محەمەد) یان وەرگرت. لەو قۆناغەدا ململانێیەکی بەهێز لەنێوان نەریتی (شەعبیە) دیموکراسی و نەریتی (سوڵتە) دەسەڵاتگەرادا روویدا.

ئەو ململانێ و پێکدادانە بەجۆرێک لەجۆرەکان یەکەمین نموونەی شەڕی ناوخۆیی ئیسلام بوو. بەپێچەوانەی مەزەندەکان ڕێبازی ئیمام عەلی (ئامۆزا و زاوای حەزرەتی محەمەد و یەکێک لە موسڵمانە یەکەمینەکان) چەپڕەوێکی رادیکاڵ، ئەوپەڕگەڕ یاخود دیموکراتیک نییە، بەڵکو بەشێوەی ئیسلامی میانڕەوی مام ناوەندە (وەسەت). خەواریجەکان نوێنەرایەتی دیموکراسی و رادیکاڵیزمی راستەقینە دەکەن. خەواریجەکان لەهەژارترین توێژی خێل و قەبیلەکان پێکهاتبوون. کاتێک لەدۆخی هاوسەنگی (رەوشی شەڕی سەفین)دا ئیمام عەلی بە کەوتنەگەری ناوبژیوانان رازی بوو، هەم ڕێگای لەپێش جیابوونەوەی رادیکاڵەکان (خەواریج)ی پشتیوانانی خۆی کردەوە و مەزهەبێکی نوێیان ئاواکرد (یەکەمین پێکهاتەی مەزهەبی)، هەم ڕێگای لەپێش حیساب و لێکدانەوە لێزانیەکەی مەعاوییە بۆ دەسەڵات کردەوە. لە ئاکامدا لایەنگرانی دەسەڵات سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. لەسەردەمی سەرکەوتنی ئیسلامەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان ئەو سێ رەوتە سەرەکییە لەمیانەی ناوەڕۆک و ناوی جیاوازەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتوون، بەدرێژایی مێژووی خۆیان گێژاو و بازنەیەکی نەزۆکیان بەسەر کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناویندا سەپاندووە کە بەشێوەیەکی زێدەڕۆییانە خۆی دووبارە دەکاتەوە؛ ڕێگایان لەپێش شەڕە گەورەکانی دەسەڵات، پێکدادانە خوێناویەکانی خانەدانەکان، شەڕی مەزهەبی و جیاوازی باوەڕی کردۆتەوە. سەرەنجام؛ لەسەر بنەمای دەوڵەتۆکە دەسەڵاتگەراکان، ئیمپراتۆر، مەزهەب و تەریقەتە لەژمار نەهاتووەکان گوزەرکردن بووە لەقەیرانی کۆمەڵگای قەبیلەوە بۆ قەیرانێکی سەختتری کۆمەڵگا (ئوممەت)ی ئیسلامی. ئەو راستییە مێژووییە لەژێر دۆخی ئێستای خۆرهەڵاتی ناویندا شاراوەیە کە بەرامبەر هەژموونگەرایی سەرمایەداری خۆرئاوا دووچاری شکستی قورس هاتووە و لەناو قەیرانێکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەریدا دەژیت و بەرگەگرتنی ئەستەمە.

بوونی کلتووری کوردانیش بەدژواری کەوتە ژێر کاریگەری قەڵەمبازی ئیسلامی کە لەتەنیشتیەوە روویدا. زیاتریش دووچاری وێرانکاری ئیسلامی سەڵتەنەت هات. لەمیانەی

شـەڕە خوێناویـەکانی فەتحکاریـەوە کـە خانـەدانێتی ئەمـەوی و ڕژێمـی سـەڵتەنەت بەشـێوازێکی هاوشـێوەی فـەتحکاری و وێرانکـاری ئەسـکەندەر ئەنجامیـدان لەماوەیـەکی کورتدا خاکی کوردانی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە. بەتایبەتیش فەرماندە زۆردارەکـانی وەک حەجاج تەواوی ئەو کوردانەی کۆمەڵکوژ کرد کە دەستیان شمشێر دەگرێت و بەکۆمەڵ دەستیان بەسەر ژنان و منداڵەکانیاندا گرت. هێندەی زانراوە یەکەمین نموونەی ئەو شێوە داگیرکارییەی کوردان لەمێژوودا دووچاری هاتوون ئەو شاڵاوەیە کە بۆتە بابەتی داستانی گلگامێش و لە باکووری ئێراق (لەوانەیە ناوی ئێراق سـەرچاوەی خـۆی لـەناوی ئـوروک وەرگرتبێـت کـە یەکـەمین دەوڵەتشـارە) و دەڤـەرە شـاخی و دارسـتانیەکەی خۆرهـەڵات گلگامێش لەگەڵ ئەنکیـدۆی بـەکرێگیراوی ئەنجامیانـدا و خوێنیـان ڕژانـد (ئـەو دڕندەیـەی دەکوژرێت و ناوی خومبابەیە لەبنەڕەتدا پێویستە وەک سەرۆک قەبیلەیـەک ببینرێت).

هەڵوێستی کوردان بەرامبەر بە ئیسلامی سـەڵتەنەت بەشێوازێک بـووە کـە لەقووڵاییـەوە ڕێگای لەپێش دوالیزمێک کردۆتەوە. لەگەڵ دۆڕانـدن و هەڵوەشـاندنەوەی ئیمپراتۆریـەتی ئێران ـ ساسـانی پلـەداری نـەریتی خێڵـەکان کـە پێیانـەوە گرێـدراو بـوون، لەپێشـاندانی دڵسۆزی بۆ سەردارە نوێیەکانیان درەنگ نەکـەوتن. دەسـتەی کـوردە بـەکرێگیراوەکان کـە بەردەوام بیر لەنۆکەرێتی بۆ سەردارەکەی دەکاتەوە، بـەپێی بەسـەرچوونی کـات سـەرەتا لەگـەڵ خانــەدانێتی ئەمــەوی بــوو بەیــەک، دواتــریش لەمیانــەی ئاسیمیلاســیۆنی ئارەزوومەندانەوە بوون بە عەرەب.

چیرۆکـی بەعـەرەببوونی نوخبـەی کـوردی بـەکرێگیراوی دەسـەڵات زۆر سـەیرە. ئـەو تـوێژەی کـە هـەزاران سـاڵە ڕێککـەوتنی لەگـەڵ کلتـووری ئیمپراتۆریـەتی ئێرانـی هـەبوو لەبواری ئەتنیکیشـەوە لێـک نزیـک بـوون و تارادەیـەکی زۆر هـەبوونی زمـان و کلتـووری خۆیـان لـەناودا پاراسـتبوو هـەڵبژاردنی بەعـەرەببوون لەنزیکـەوە گرێـدراوی پێکهاتـەی چینایەتیانـە. بـەر لـە عـەرەببوون سـەرکردەکانی پلـەداری کـورد هێشـتا پەیوەندییـەکی نزیکیان لەگەڵ کلتووری قەبیلەدا هەبوو، ئەندامی هەمان قەبیلـە و خێـڵ بـوون. هەربۆیـە جیـاوازی چینایـەتی لاوازە. لـە جیابوونـەوەی چینایـەتی زیـاتر بەرژەوەندیـەکانیان و مانەوەیان وەک چینی سەرووی پلەداری ناو قەبیلـە و خێـڵ بەکـەڵک و پێویست دەبینـی. لەدەستدانی رایەڵە کلتوورییەکانی خێڵ و تـەنیا وەک تـاک یـاخود بنەماڵـە توانـەوەیان لـەناو کلتـووری خانـەدانێتی حکـومڕانی بیـانی بـەگوێرەی بەرژەوەندییـەکانیان نـەبوو. لـەدۆخێکی بـەمجۆرەدا لەوانەیـە هـەموو شتێکی خۆیـانیـان لەدەست دابووایـە. چەنـدین نموونەی مێژووییان لەبەرچاو بوو کە ئـەو مەسـەلەیان دەسـەلماند. ڕاستینەی قەبیلـە و خێڵی کورد بەشێوەیەکی زۆر وشک پابەندی کلتووری خۆیەتی، هەر بۆیـەش ئاوێتـەبوون لەگـەڵ هێـزە دەرەکیـەکان و ئاسیمیلاسـیۆنی ئەسـتەم بـوو یـاخود کردبـوو بەحاڵـەتێکی دەرئاسـا. لەگـەڵ ئـەوەش پێنەگەیشـتنی هەلومـەرجی مـاددی جیابوونـەوەی چینایـەتی و گرنگترینیشـیان تێکۆشـانی بـەردەوامیان بەرامبـەر فـەتحکار و داگیرکـارە دەرەکییـە چەوسێنەرەکان ڕۆڵێکی گرنگی لەمەدا بینیوە.

لەسەردەمی داگیرکاری خانەدانی ئەمەوی عەرەبی هەم لەبواری مێژوویی هەم کۆمەڵایەتی جیاوازییەک جێگای باس بوو. لەگەڵ زاڵبوونی سەڵتەنەتی ئیسلامی چینی سەرووی قەبیلەی عەرەبدا، لە چینی خوارووی قەبیلە دابڕا و بەخێرایی بوو بە چینێکی نوێی دەسەڵاتدار. جیابوونەوەیەکی چینایەتی قووڵ جێگای باس بوو. لەسەردەمی ئەمەویەکاندا ئەرستۆکراسیەکی بەهێزی عەرەبی ـ ئیسلامی پێکهاتبوو. بۆ یەکەمین جار لە کلتووری خۆرهەلاتی ناوین چەشنێک پەیوەندی نوێی لەجۆری بەگ (مەوالی[1]) ـ جووتیار (مسکێن) پێکهات کە پەیوەندی باوی سەردار ـ کۆیلە دەرباز دەکات و لە پەیوەندی دەرەبەگ ـ بەندە دەچێت کە دواتر لە ئەورپا سەرهەڵدەدات. بە بەراورد لەگەڵ کۆیلایەتی کلاسیک پێکهاتنی پەیوەندیەکی چینایەتی نەرمتر گرنگترین بەرهەمی سوڵتەی ئیسلامییە. سیستەمی نوێی چینایەتی دەسەڵاتی ئیسلامی جێگای باسە. ئەو هێزەی پێشەنگایەتی ئەو پرۆسەیە دەکات خانەدانی ئەمەوییە. لەپێناو خزمەتکردن لەماوەیەکی کورتدا خانەدانی ئەمەوی کۆشکەکانیان پڕ لە بیروکرات و نۆکەرە چینایەتیەکانی پاشماوەی ساسانی و بێزەنتی دەکەن. چینی سەرووی سەرجەم ئەو کلتوورانەی فەتحیان کردوون ئەو جیابوونەوە چینایەتییە کۆمەڵایەتییە مێژووییە تا دوا رادە بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان دەبینن، ئەگەر لەسەر بنەمای بەکرێگیراوێتیش بێت بەخێرایی دەبن بە ئەرستۆکرات. ئەمانە پەیوەندییەکی زۆری هاوسەرگیریان لەگەڵ ئەرستۆکراسی خانەدانی فەرمانڕەوا بەست. منداڵەکانیان بە زمان و کلتووری فەرمی عەرەبی پەروەردە کرد. ئەو جارە زۆر بەخێرایی لەزمان و کلتووری قەبیلەی خۆیان دوور کەوتنەوە. ئەو دۆخەی جاران لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیاندا ناکۆک بوو، تا دوا رادە لەگەڵ هەلومەرجە نوێیەکانی ئەرستۆکراسی ئیسلامی گونجاو بوو. لەراستیدا زۆر جار نموونەی هاوشێوە لەمێژوودا روویدا بوو.

هەزاران ساڵ بەر لەزمانی عەرەبی زمانی فەرمی ئەکەدی، ئارامی و سوریانی زمان و کلتووری هاوبەشی ئیمپراتۆریەتەکان بوون. لەمێژبوو ئەو رۆڵەیان دەبینی کە زمانی گریکی و لاتینی لە خۆرئاوا دەیانبینی. بۆ یەکەمین جار بوو لەرێگەی ئیسلامیەتەوە زمانی عەرەبی وەک زمانی هاوبەش و بەربڵاوی کلتووری خۆرهەلاتی ناوین هەڵدەکشا، کلتووری خانەدانێتیش بە زمانی عەرەبی گوزارشت دەکرا و دواتر دەبوو بە کلتووری هاوبەشی ژیانی سەرجەم ئەرستۆکراسی ئیسلامی خۆرهەلاتی ناوین. وەک بڵێی بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراسی تازە هەڵکشاوی خۆرهەلاتی ناوین نەمابوو بنەچەی خۆی بە خانەدانێتی عەرەب نەبەستێتەوە. هەر بنەماڵەیەکی ئەرستۆکراتی بەکرێگیراو گرنگیەکی تایبەتی بەو خاڵە دەدا کە بنەچەی خۆی بەخانەدانێکی عەرەب ببەستێتەوە، بەتایبەتیش ئەهلی بەیت. پێویستە چینی سەرباز و زانا نوێکانیش بخەینە سەر ئەو کاروانەوە.

[1] ئەمەوییەکان، پەنواشیدا عەباسییەکان، بەو کەسانەیان دەگووت مەوالی کە عەرەب نەبوون. عەباسییەکان بۆ زۆر کاروباری سیاسی خۆیان پشتیان بەو مەوالیانە دەبەست. هەروەها مەوالی بەوانەش دەگووترا کە لە کۆتی بەندایەتی رزگاریان دەبوو. (وەرگێڕ)

هەموویان نکوڵیکردن لە بنەچەی کۆنیان و هەڵگرتنی نازناوی سولالەی نوێیان بۆخۆیان کرد بە نەریتێک. بگرە کلتووری هەزاران ساڵەی فارسیش لە ئاسیمیلاسیۆنێکی خەستی ناو زمان و کلتووری عەرەبی رزگاری نەبوو. زمان و کلتووره لاوازەکانیش زۆر بە ئاسانی قووتدران. لەکاتێکدا زمانی ئەکەدی کۆن بە تەواوی گرنگی خۆی لەدەستدا، زمانەکانی ئارامی و سوریانیش زۆر لەهێزی خۆیانیان لەدەستدا.

چینی سەرووی خێڵ و قەبیلە کوردەکانیش پشکی خۆیان لەو ئاسیمیلاسیۆن و ئاوێتەبوونە خێرایە وەرگرت. بەردەوامکردن و درێژەپێدانی نەریتی کۆنی زەردەشتی لە سوود زیاتر زیانی پێدەگەیاندن. سووربوون لەسەر ئەو کلتووره مانای لەدەستدانی بوونیان بوو. دوای قۆناغێکی کورتی بەریەککەوتن بەخێرایی پەسەندکردنی توانەوە لەناو زمان و کلتووری بیانی کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی چینە دەسەڵاتدارەکان لەمێژوو تێیدا بەهرەداران، پێویستیەکی بەردەوامکردنی بوونیان بوو. لەماوەی نێوان سەدەکانی ٧ - ١٠ ی زایینیدا چینێکی سەردەستی بەکرێگیراوی کوردی زۆر بەهێز پێکهات کە لەناو زمان و کلتووری ئەرستۆکراسی عەرەبی توایەوە و لەگەڵیدا ئاوێتە بوو. هەرچەندە ئەو توێژانە لە رووخساردا بە کورد دابنرێن، بەڵام لەبواری زمان و کلتووردا هەریەکەو بەندەیەکی زمانی فەرمی عەرەبی بوون. ژیانیان لەگەڵ ئەو زمان و کلتووره نوێیە بە هێمای نوخبەیی دادەنا و شانازییان پێوە دەکرد. ئەو توێژانە کەسانێک بوون کە بەر لە هەر کەسێکی دیکە دەستبەرداری زمان و کلتووری خۆیان بوون. تا ئێستاش پاشماوەیەکی بەهێزی ئەمانە لە کوردستان ماوەتەوە.

ئەرستۆکراسی بەکرێگیراوی کوردان کە رۆڵی دەسەڵات دەبینێت لەبواری مەزهەبی پابەندی نەریتی سوونەنییە. لەبواری واتادا سوننیی بوون گوزارشت لە ئیسلامیبوونی رواڵەتیانەی نەریتی چینی سەرووی پلەداری قەبیلە دەکات. ئیسلامی سووننی ئیسلامی زاڵ و دەسەڵاتگەرایە. بناغەیەکی بەهێزی چینایەتی هەیە. پەسەندکردنی سوننیگەرایی لەلایەن زۆرینەی میرنشینە کوردەکانی چاخی ناوین پێویستییەکی بەرژەوەندییەکانیان بوو؛ لەبواری پەیوەندی ئیسلام بە حەقیقەتەوە هیچ واتایەک نابەخشێت. دەتوانرێت بگوترێت سوننیگەرایی شێوەی دەمامکدراوی باوەڕی ئەو دەستە و گرووپانەیە کە بە بەرژەوەندیخوازی و دەسەڵاتی رووتی ئیسلامەوە سەرقاڵن. ئەو گرووپانە چەندین رەفتار و کردار لەژێر ئەو دەمامکەدا ئەنجام دەدەن کە لەناواخنەوە لەگەڵ ئەخلاق و ویژدانی کۆمەڵایەتی ئایین ناگونجێن، بگرە لەگەڵیشیدا دژن. رۆڵی دەمامککردنی بەکارهێنان، ستەم و تەڵەکەبازیەکانی کۆشکی سوڵتانەکان بە ئیسلامی سوننی بەخشراوە. نموونەکانی کۆشکی ئەمەوی، عەباسی و عوسمانیەکان لەو بارەیەوە تابڵێی فێرکەر و وانەبەخشە. نکوڵیکردن، بێزیی و بەربەستکردنی گەشەکردنی بوونی کلتووری کوردان لەلایەن زۆربەی زۆری کوردە بەکرێگیراوەکانی میرنشینەکانی چاخەکانی ناوین تا دەگاتە پاشماوە کەسی و بنەماڵەییەکانیان لەرۆژی ئەمرۆماندا گرێدراوی کارەکتەری چینایەتی، بونیادی دەسەڵاتگەرێتی و ئایدیۆلۆژییانە. شێوازی نەشونمای بونیادی و ئایدیۆلۆژی چینێک

کاریگەریەکی قووڵ لەسەر بوونی یەکپارچەیی کلتووری کۆمەڵگا جێدەهێڵێت. شێوازی نەشونمای چینی دەسەڵاتداری عەرەب، فارس و تورک لەلایەن ئیسلامەوە پەیوەندی ئەو توێژانەی لەگەڵ کۆمەڵگاکانی خۆیشیان دەست نیشانکردووە. بەو ڕادەیەی بەکریگیراوێتیان سنووردار بێت هێزە دەستپێشخەرەکانی دەسەڵات پێکبێنن، بەلایەنی ئەرێنی و نەرێنییەوە کاریگەرییان کردۆتە سەر کلتووری کۆمەڵگاکەیان. وێڕای ئەوەی ڕادەی ئاسیمیلاسیۆنیشیان کەمترە، بەڵام سەرکوتکردن و چەوسانەوەیەکی دژوارتریان بەرامبەر چینەکانی خوارەوە بەڕێوەبردووە. دەسەڵاتدارانی کوردیش کە لایەنی بەکریگیراوێتییان لەپێشترە لەکاتێکدا بۆ ئاسیمیلاسیۆن لەبارترن، دەسەڵاتێکی لاوازتریان لەسەر بوونی کۆمەڵگای کورددا ئاوا کردووە. لاوازی دەسەڵات و تایبەتمەندێتی گونجاویان بۆ ئاسیمیلاسیۆن وایکردووە بەرامبەر بە زمان و کلتووری کۆمەڵگاکەیان نکوڵیکار و بێکەڵک بن. ئەو مەیلەیان لەڕۆژی ئەمڕۆماندا ئاسیمیلاسیۆنی تێپەڕکردووە و بە ئاستی بەکریگیراوێتیەک گەیشتووە کە تا ژینۆسایدی کلتووری هەڵکشاوە. بوونە بە بوونەوەرێک کە لەسەر کڕاندن و کرتاندنی کۆمەڵگای خۆیان دەژین.

دووەمین مەیلی بەرامبەر شۆڕشی ئیسلامی هەڵوێستی دیموکراسییە. چۆنیەتی پێشوازیکردنی کوردان بۆ ئیسلام بەشێوەیەکی یەکپارچە نەبووە. وەک چۆن هەڵوێستی کوردانی شاخ و دەشت لەیەکتر جیاوازبوو، هەڵوێستی چینەکانی سەروو و خوارووش لێکجیاواز بووە. زانا زەردەشتی و قەبیلەکانی بەرامبەر یەکەمین گورزەکانی فەتحکاری ئیسلام ڕادەست نەبوون، هەروەک بەردەوام لەمێژوودا ڕوویداوە بۆ بەرزایی و قووڵایی شاخەکان هەڵکشاون و بۆ ماوەیەکی درێژ بەردەوامییان بە بەرخودانەکانیان داوە. ئەو توێژە سەرەکیانەی بەرخودانەکانیان ڕادیکاڵ و هەمیشەیی بوو واتە زەردەشتی و عەلەوییەکان؛ یان ئیسلامێکی دژ بە ئیسلامی سوونەیان هەڵبژاردووە یان هیچ نەبوون بە ئیسلام. لەشوێنە شاخاویەکانیشدا دەرکی پێدەکرێت کە عەلەوێتی کلتووری باوەڕی توێژی ڕادیکاڵە کە بەرگری لەبوونی کلتووری بەرخودانی نەرێتی خۆی دەکات، ئاسیمیلاسیۆن بە کوفر دادەنێت و بەڕادەی گونجانی لەگەڵ بوونی کلتووری خۆیان ئیسلامیان پەسەند کردووە. ناشێت عەلەوێتی بەتەواوی بە کلتووری ئیسلامی دابنرێت. کلتوورێکە کە پابەندی کلتووری قەبیلە و خێڵی خۆیەتی، نەک لەبەر هەندێکی دیکە بەڵکو بەو ڕادەیەی لەگەڵ کلتووری خۆیان بگونجێت هەندێک بەهای ئیسلامیان لەپێناو خۆیان ئاسیمیلەکردووە و هەرسیان کردووە. لەبەر ئەو تایبەتمەندییانەش مایەی تێگەیشتنە کاتێک لێکچوونیان لەگەڵ بوونی زمان و کلتووری خوریەکانی پێنج هەزار ساڵ بەر لەئێستا جێگای باس دەبێت. بەرخودانی بەردەوامیان بەرامبەر داگیرکارییە دەرەکیەکان و کلتووری توندوتۆڵی ژیانی قەبیلەگەری پێویست بۆ شاخەکان ئەو ئەنجامەی خولقاندووە.

ڕەوشی زەردەشتیەکان جیاوازترە. ئەمانە زیاتر لە ڕەهەندی ئاییندا بەرخودانیان کردووە نەک قەبیلەیی. بوونی ئاینی لەسەرووی بوونی قەبیلەییەوە بینراوە. بەشێوەی

چەند مەزهەبێک توانیویانە تارۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بن. بە بەراورد لەگەڵ کوردە سوونییەکان نوێنەرایەتی بەها پەتی و سافەکانی کوردێتی دەکەن. وێڕای ئەوەی لەمێژوودا دووچاری چەندین کۆمەڵکوژی هاتوون، بەڵام داکۆکییان لەسەر باوەڕی خۆیان کردووە. سەرباری ئەوەی سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی کلتووری نەریتی کوردن، بەڵام سووتاندنی پەرتووکەکانیان و سەرکوتکردنی بەردەوامی ژیانی ئازادیان ڕێگای لەپێش هەژاری ئەو سەرچاوە دەوڵەمەندە و وشک بوونی کردۆتەوە.

تەریقەتە سۆفیگەراکانیش وەک مەیلێکی بەرخودانی کوردانی دەشت بەرامبەر بە ئاسیمیلاسیۆن دەبینین. سۆفیگەرایی گوزراشت لە ئیسلامی باتینی دەکات کە ڕەهەندەکانی دەرەوەی ئیسلامی دەوڵەت ـ سوڵتە و لایەنەکانی ئەخلاقی و ویژدانی لەخۆوە دەگرێت کە لەقوڵاییەوە دەرکی پێکردووە. بە واتا گشتیەکەی گوزراشت لەو ئیسلامە کۆمەڵایەتی (کۆمەڵگایی)یە دەکات کە لەگەڵ دەوڵەت نەبۆتە یەک، لەدەسەڵات خۆشنود نییە، خوازیارە لەمیانەی هوشیاری، هەست و ویژدانی کەسێتیەوە ئایین بژێنێت. دابەشکردنی ئیسلام بۆ دوو کۆمەڵ یان پۆلینی لەجۆری ئیسلامی دەسەڵاتگەرا ــ دەوڵەتی و ئیسلامی کۆمەڵگایی لەگەڵ راستی کۆمەڵگای مێژوویيدا دەگونجێت. ئیسلامی کۆمەڵگایی تەنیا بەشێوەی سۆفیگەرایی دەتوانێت بژیت، ڕێکخستنە بەرفراوانە گەلەریەکانی بەشێوەی تەریقەتیش ئەو راستیە پیشان دەدات. ئیسلامی کۆمەڵگایی گرێدراوی دیموکراسییە. تەسەوف کە ڕێکخستنێکی ئیسلامی کۆمەڵگاییە لەبەرامبەر ئەو ئیسلامەی بەخێرایی بووە بەدەسەڵات (دەشێت بە ئانتی ـ ئیسلامیش ناوببرێت) شێوەیەکی پەناگە و پشتیوانی گەلە. کۆمەڵگای ئیسلامی لەگەڵ ئیسلامی فەرمی دەسەڵاتگەرا جێگای باس نابێت، بەڵکو دەشێت لەمیانەی تەریقەتە سۆفیگەریەکانەوە بەدیبێت و بژیت. هەروەها پۆلێنی ئیسلامی کەسی (تاکەکەسی)ش جێگای باسە. ئیسلامی کەسی ئیسلامی ڕۆحانییە؛ گوزراشت لە تێگەیشتنی تاک بۆ خوداوەندێتی دەکات. مانایەکی دیاری هەیە. بەڵام ئەو ئیسلامەی کە گرەو لەسەر دەسەڵات دەکات لەناوەڕۆکە کۆمەڵگاییە قووڵەکەی خۆی دابڕاوە و کەوتۆتە پێگەی دژیەوە.

هەبوونی ڕەوتەکانی تەسەوف بەشێوەیەکی قووڵ و بەرفراوان لەناو کۆمەڵگای کوردەواریدا لەناوەڕۆکدا گرێدراوی پەیوەندی خراپی کوردانە لەگەڵ دەسەڵاتدا. بنەچەی کوردێتی زۆرێک لەدامەزرێنەرانی تەریقەتە تەسەوفییەکان پەیوەندی بە راستینەی کۆمەڵگاکەیانەوە هەیە. تەریقەتەکان بەجۆرێک لەجۆرەکان ڕێکخستنەکانی بەرگری خۆیی گەلن. ئەو ڕۆڵەی سەندیکاکانی چینی کارکەر بەرامبەر بە دەسەڵاتی سەرمایەداری بینیویەتی، لە چاخەکانی ناوینیشدا تەریقەتەکانی تەسەوف ڕۆڵێکی هاوشێوەیان لەناو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناویندا بینیوە. هەم ڕۆڵی ڕێکخراوە دیموکراتیەکان، باوەڕی و هزر، هەم ڕۆڵی ڕێکخراوەکانی ئابووری و بەرگرییان بینیوە. زۆرجار بۆ ڕێکخراوی سیاسی گۆڕاون، ئەو وەرچەرخانەش هەندێک جار شێوێنراوە و ڕێگای لەپێش بونیادی نوێی دەسەڵات و دەوڵەت کردۆتەوە. ئیسلامی کۆمەڵگایی بەلانی کەم هێندەی ئیسلامی

دەوڵەت بەکاریگەر بووە. پێویستە ئیسلامی کەسیشی بخرێتە سەر. جیاوازی ئیسلامی کەسی لەگەڵ ئیسلامی دەوڵەتی و ئیسلامی کۆمەڵگایی ئەوەیە کە بەشێوەی ئایینی شەخسی و ویژدان دەژێنرێت. ئەستەمە ئیسلامی دەوڵەت بە ئایین بژمێردرێت. بۆ بەدەستهێنانی مەشروعیەتی رەفتارەکانی دەوڵەت لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، یاسایی و ئابووری بەکاردەهێنرێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئایا دەوڵەت ئایین بەکاردێنێت یاخود ئایین دەوڵەت بەکاردێنێت. ئەگەر دەوڵەت ئایین بەکاربێنێت، واتە ئەو ئایینە ناسنامەی خۆی لەدەست داوە، چونکە ناوەرۆکی ئایین بەردەوام پەیوەست بەکۆمەڵگایە. لەگەڵ ئەوەی بەکارهێنانی دەوڵەت لەلایەن ئایینەوە جیاوازترە بەلام دەچێتە سەر هەمان رێگاوە. کاتێک چەرخێکی بەرفراوانی حکومڕانی وەک دەوڵەت دەکەوێتە ژێر فەرمانی ئایینەوە ئەوا دەبێتە هۆی مەترسیەکی گەورەتر. بەجۆرێک لەجۆرەکان فاشیزمی چاخی ناوین دێتە ئاراوە. سنووردارکردنی ئایین بەکایەی کۆمەڵایەتی و هێشتنەوەی بۆ بژاری ئازادی تاک لەگەڵ تایبەمەندێتیەکانی دەرکەوتنی گونجاوترە.

دەشێت بگوترێت کە ئایین لەو سێ بوارەی چالاکی کۆمەڵگای کوردەواریدا رۆڵی بینیوە. ئیسلامی دەوڵەت یاخود دەوڵەتی ئیسلام فەرمانـدەر و ئانتی دیموکراتە. مەشروعکردنی ئایین بەدەستی دەوڵەت یان مەشروعکردنی دەوڵەت بەدەستی ئایین، هۆکاری سەرەکی محافەزەکاری ئایین و بێکاریگەرکردنی ئایینە. هەر لەبەر ئەو هۆکارە سەرەکیەیە کە ئیسلام لەکۆمەڵگای کوردەواریدا بەکاریگەرە. لەبەرامبەر دەوڵەتدا جۆرێک لە بەرگری خۆیی دەستەبەر دەکات. بوونی کوردستان بە لانکەی زۆرێک لە تەریقەتەکان لە قووڵاییەوە پەیوەندی بە بەرگری خۆییەوە هەیە. هەرچی ئیسلامی کەسی (تاکەکەسی)یە بەرامبەر ئەو بێمتمانەییە قووڵەی لەناو کورداندا هەیە کاریگەریەکی مۆڕاڵی هەیە. تا سەردەمی دەرکەوتنی کاریگەریەکانی ئایدیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە کوردستاندا، ئیسلامیش شێوەیەکی کلتووری کۆمەڵگایە کە بەلانی کەم هێندەی کلتووری ئەتنیکی قەبیلە رۆڵی بینوە. هۆکاری سەرەکی دروستبوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەکانی سەرووی پەیوەندییە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانە.

هەر سێ ئایینە تاکخوداییەکان لە خۆرهەڵاتی ناوینی چاخی ناویندا رۆڵێکی گرنگیان بینی لەپێکهاتنی پەیوەندی و رایەڵە کۆمەڵایەتیەکانی سەرووی قەبیلە و خێڵ. پەرەپێدانی ئەو رایەڵە و پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی قەبیلە و خێڵ دەرباز دەکەن مانایەکی گەورەی شۆڕشگێڕی دەبەخشێت. ئەو گۆڕانکارییە مانای لەدایکبوونی کۆمەڵگایەکی نوێیە. ئوممەت(ألامە)ی یەهودی، مەسیحی و ئیسلامی مانای ئاواکردنی رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە کە رێکخستنەکانی قەبیلە و خێڵ دەرباز دەکات. ئەو دیاردەیەی لەو بارەیەوە بەشێوەیەکی بەرجەستە دەردەکەوێت راستی گەل و میللەت (الملة) ە. لە پێکهاتنی پۆلێنکردنەکان (کاتەگۆریەکان)ی گەل و میللەتدا ئایینەکان رۆڵی کارای یارمەتیدەریان بینیوە. بەجۆرێکی دیکە کۆکردنەوە و یەکگرتنی قەبیلە و خێڵەکان لەژێر ناسنامەیەکی سەرووداا زۆر زەحمەتە. ئەو رۆڵە بچووک ناکرێتەوە کە ئایین لە سەرخستنی ئەو هەوڵەدا

بینیویەتی. گەلبوون و میللەتبوون دیاریکەرترین تایبەتمەندێتیەکانی چاخی ناوینن. وەک چۆن چاخی نزیک سەردەمی زەقبوونەوەی نەتەوەبوونە، چاخی ناوینیش سەردەمی زەقبوونەوەی پێکهاتەی گەل و میللەتە. بە بەراورد لەگەڵ دەستەواژەی گەل، میللەت دەستەواژەیەکی نزیکتر بە ئایینە و قەبیلە و خێڵ دەخاتە پلەی دووەمەوە و جەماعەتی ئایینی دەکات بەخاوەنی قسە و بڕیار. گەل مانای قەومی ئەو قەبیلە و خێڵانە دەبەخشێت کە لەژێر کاریگەری ئایینی تایبەتمەندێتی ئەتنیکییان بەدەستهێناوە. هەرچی میللەتە گوزارشت لەو کۆمەڵگایانەی ئوممەت دەکات کە ئایین مۆرکی خۆی لێداوە، لەسەرووی قەبیلە و خێڵەوە پێکهاتووە و زمانیان جیاوازە. دەشێت ئوممەتێکی ئیسلامی لەمیانەی کۆمەڵێک میللەت نوێنەرایەتی بکرێت. باسکردنی تاکە میللەتێکی ئیسلام دەستەواژەیەکی زۆرەملێیانەیە. ئەو خاڵە بۆ کریستیانی زیاتر لەجێگای خۆیدایە. میللەتبوون زووتر لە کریستیانی دەستی پێکردووە. لە یەهودیەتیشدا لەگەڵ ئەوەی میللەت ی سەرەکی یەهودییە، بەڵام بەدەگمەن میللەتی دیکەش دەبینرێت.

میللەتی سەرەکی کە لەمیانەی ئیسلامەوە هەڵکشان عەرەبەکان بوون. دوای عەرەبەکان فارسەکانیش لەڕێگای ئیسلامی شیعەوە وەک میللەتێک بەدەرکەوتن. تورکەکانی لەریزی سێیەمدا دێن لەگەڵ سەدەی دەیەم وەک قەوم و میللەت بەدیار کەوتن. وێڕای ئەوەی کوردان وەک چوارەمین گەورە میللەت بەدەرکەوتن، بەڵام بە بەراورد لەگەڵ سێ میللەتەکەی تر لەپێگەیەکی دواکەوتووتردا مانەوە. ئەوەش مەسەلەیەکە پەیوەندی بەدەوڵەتبوونەوە هەیە. وەک چۆن نەتەوەکانی ئەورووپا (ألأمم ألأوروبية) لەدەوری دەوڵەتی سەرمایەداری بەهێز بوون و بوونەتە نەتەوەی دەوڵەت، بەدەوڵەتبوونی بەرەبابەکانی قەبیلەکانی عەرەب، فارس و تورکیش وایکردووە ببن بە میللەتێکی پێگەیشتووتر. کوردان کە لەئاواکردنی دەوڵەتدا لاواز بوون بەهۆی ئاسیمیلاسیۆنە خەستەکەی چینی سەروو وەک میللەت بێهێز بوون. میللەتی دەوڵەتی تەنیا بۆ چینی سەروو گرنگە. ئەوەی بۆ چینەکانی خواروو گرنگترە لەدەوری تەریقەتە سۆفیگەراییەکان وەک گەل شێوە بگرن و فۆرم بەدەستبهێنن. دەوڵەت لە میللەتبووندا، جەماعەتی سۆفیگەراییش لە بەگەلکردن (ألتحول ألى شعب) بەکاریگەرترە. سەرەڕای ئەوەی کوردان خاوەن راستینەی میللەتێکی لاوازی تەوەرەی دەوڵەتن، بەڵام لەدەورەی تەریقەتە سۆفیگەراییە بەهێزەکان راستی گەلبوونێکی دیموکرات، ئازاد و یەکسانتریان جێگای باسە. پێویستە ئەوەش بڵێین؛ کە لەسەردەمی ئیسلامیەتدا کوردان لەدەوری میرنشینی بەهێز و تەریقەتە سۆفیگەراییەکان بەتەواوی لەڕێگای میللەتبوون و گەلبوون دوانەکەوتوون. لەگەڵ ئەوەی جیاوازی لەنێوان میللەتبوونی چینی سەروو و گەلبوونی چینی خواروو هەیە، بەڵام پێویستە زلی نەکەین.

دیاردەی بەگەلبوون کە لەئاکامی دەرکەوتن لە کلتووری قەبیلە و خێڵی کورد بەدیهات بەکرمانج ناودەبرێت؛ ئەمەش مانای "مرۆڤی کورد"ە. لای تورکەکان تورکمان، عەرەبەکان بەدەوی، لای ئێرانیەکانیش عەجەم هەمان مانا لەخۆوە دەگرن. ئەگەر کرمانج لەتەواوی

رایەڵە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانیش دانەماڵدرێت، بەڵام پۆلێنێکە بەهۆی پەرەسەندنی خێرای شار و شارستانبوون لەگەشەکردن دایە. ئەو خێزانانەی لەبەر هۆکاری جیاوازەوە لەتەواوی خێڵ و قەبیلەکان دابڕاون و لەگوندە قەڵەبالغ و شارەکان سەربەخۆ و بەهێز دەبن، هێزی سەرەکی بەگەلبوونی کوردانن. لەکاتێکدا کوردان وەک گەل بەو شێوازە پەرەدەسەنن و بەرەو نەتەوەبوونێکی نوێی دیموکراتیک ڕێگا دەبڕن، بەڵام گوزەرکردنی چینی سەرووی قەبیلە لە میللەتێکی لاواز بۆ نەتەوە بەهەمان چڕی و خێرایی نییە. ئەو فەشەلەی ئەم چینە لەبوون بە بەنەتەوەی دەوڵەت دووچاری هات ڕێخۆشکەر بوو کە نەتەوەبوونی دیموکراتیک ببێتە چانسی کوردان. جیاوازی ریشەیی لەنێوان نەتەوەبوونی دیموکراتیک و نەتەوەبوونی دەوڵەتی هەیە. لە بەشەکانی داهاتوودا بەدرێژی هەڵوەستە لەسەر ئەو بابەتە دەکەین.

کاتێک بەمجۆرە لەکلتووری خۆرهەڵاتی ناوین هەوڵی دەستنیشانکردنی لایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکانی تێکۆشانی کلتووری کورد و ئیسلامبوون لەپێناو ژیان دەدەین، پێویستە جەخت لەسەر کارەکتەری دینامیکی ئەو پرۆسەیە بکەینەوە. گەلبوون و قەومبون فۆڕمێکی کۆمەڵایەتی پێگەیشتوو و بەقەبارەترن. پەرەسەندنی ئابووری دەوروبەری بازاڕ و نەشونمای کلتوورێکی نوێی گەل لەدەوری گەلبوون، گرووپی سۆفیگەرایی و میللیگەرای چینی سەروو وەک گەلانی دیکە بەشێوەیەکی گشتی کوردانیشیان بە دەروازەی نەتەوەبوون (ألتحول ألی أمة) گەیاندووە.

## ٤ ـ کلتووری ئیسلام و پەیوەندییەکانی عەرەب ـ کورد ـ تورک

پەیوەندیەکانی کورد ـ عەرەب ـ تورک کە لەسەربنەمای کلتووری ئیسلامی چاخی ناوین شێوەی گرت ڕۆڵێکی گرنگ لەگەشەکردنی راستینەی کورداندا دەبینێت. بەتایبەتیش لەلایەکەوە پێکهاتەکانی دەسەڵات ـ دەوڵەتی بەشێوەی میرنشینەکان، لەلایەکی دیکەشەوە پێکهاتەکانی لەسەر بنەمای تەریقەتە سۆفیگەراییەکان لەقۆناغی نێوان سەدەکانی ٧ ـ ١١ لەژێر کاریگەری کلتووری عەرەب ـ ئیسلامی پەیوەندیەکانی عەرەب ـ کورد هاتنە ئاراوە، ڕێگای لەپێش کوردان کردەوە لەبواری گەلبوون و قەومبوون و میللەتبووندا (جیاوازییەکی زۆر بچووک لەنێوان ئەو زاراوانەدا هەیە) پەرەسەندنی گرنگ بەخۆیانەوە ببینن. لەسەدەکانی پێشووتریشدا لەپەیوەندی فارس ـ کوردیشدا پەرەسەندن و گۆڕانکاری هاوشێوە جێگای باس بوو. بەشێوەی گەڵاڵەیەک هەڵسەنگاندنمان بۆ کردبوو. پەیوەندییەکانی کورد ـ تورک کە لە بەردەوامی ئەو قۆناغە پەرەی سەند سەبارەت بە پاراستنی هەبوونی هەردوو گەل بۆ پەیوەندی ستراتیژی گرنگ وەرچەرخا.

ئەو تیرە و بەرەبابە تورکانەی بەهۆی ئەو دۆخە خراپەی لەهەلومەرجی کۆمەڵایەتی و کەشوهەوای ئاسیای ناوین هاتەئاراوە لەسەدەی دەیەم کۆچی خۆیان بەرەو خۆرهەڵاتی ناوین خێراکرد، بەدوای شوێنێکدا دەگەڕان کە بەردەوام تێیدا بژین. هەرچەندە لەمیانەی

فەتحکاریەوە شوێنگەلێکیان لەزەویەکانی ئیمپڕاتۆریەتی ئێران بەدەستهێنا، بەڵام ئەوانە هەمیشەیی نەبوون. هەم لەپەیوەندی نێوان بەرەبابەکان خۆیاندا هەمیش لەگەڵ قەومە دراوسێکاندا بەردەوام لەنێوان ململانێکانی دەسەڵات دابوون. شەڕ و پێکدادانەکان دەرفەتێکی ئەوتۆیان بەنیشتەجێبوونێکی هەمیشەیی و ئارام نەدەدا. لەو سۆنگەیەوە؛ هەنگاونانیان بەرەو خۆرئاوا و کرانەوەیان بەرەو خاکەکانی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی و عەرەبی دەکرد بە ناچارییەک. ئەوجارە وەک قەوم رووبەڕووی عەرەب، کورد و ئەرمەنیەکان دەبوونەوە. گرنگترین سەربازە کۆکراوەکانی سوڵتانەکانی عەباسی ئەوانەبوون کە بەبنەچە تورک بوون. لەئاکامی ئەو رێبازەشەوە تەنیا بژاردەترین جەنگاوەرە تورکەکان نیشتەجێ دەکران. کەچی لەماوەیەکی زۆر کورتدا ئەوانە بوون بە عەرەب و دەیانتوانی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ کلتووری قەبیلەی خۆیان ببڕن. دابینکردنی خێرای شوێنی نیشتەجێبوون بۆ یەکینە بەرفراوانەکانی تیرە وەک کێشەیەکی سەرەکی رووبەڕوویان ببوویەوە. ئاتابەگ و خانەدانەکان لەسەر بنەمای توانا سەربازیەکانیان لە گۆڕەپانی عەرەبی، بەتایبەتیش لە ئێراقی رۆژی ئەمڕۆ تا دەگاتە میسر، چەندین میرنشینیان ئاواکردبوو. بەڵام بەرامبەر بەلێشاوە گەورەکانی کۆچیان ئەو میرنشینانە کورتیان دەهێنا و بەشی نەدەکردن. لێرەشدا دیاردەی کۆکردنەوەی سەربازی سەرەکی بوو، تیرە تورکەکانی دیکەش لەکۆچی بەردەوام دابوون و بەدوای شوێنێکی نیشتەجێبوونی هەمیشەییدا دەگەڕان. پەیوەندییە مێژوییەکانیان لەگەڵ کوردان لەمیانەی ئەو گەڕانە هاتەئاراوە.

کێشەی سەرەکی کوردان؛ هەم میرنشینەکان، هەمیش بەسیفەتی کۆمەڵی مەدەنی، لەو قۆناغەدا (سەدەکانی یازدە و دوازدە) سەرچاوەی خۆی لەو گیرخواردن و فشارانە دەگرت کە لەلایەکەوە بەهۆی شەڕ، گرژی و رێککەوتنەکانیان لەمیانەی پەیوەندییەکان لەگەڵ سوڵتانە عەرەب و داگیرکاریەکانیانەوە هاتبووە ئاراوە. لەلایەکی دیکەشەوە بەهۆی هەڵکەوتەکەیان کە دەکەوێتە سەر رێگای هێڵی داگیرکاری و پەلهاوێشتنی ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتی کە لە رۆماوە بۆی مابوویەوە. هەروەها پەلاماری قەبیلە بەبنەچە سەمیتک (سامی)یەکانیش کۆتایی نەبوو، کە لە باشوور لەناوچە بیابانیەکان هاتبوون، لەیەمەنەوە دەهاتن و رابردووەکەیان بۆ سەردەمی کلتووری ئەلعوبێد (٥٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز) درێژ دەبوویەوە. ئەو پەلهاوێشتنانەی لەسەردەمی ئەکەدی، بابلی و ئاشووریەکان بەپشتگیری ئیمپڕاتۆریەتەکانیان بەرەو باکوور (ئەو خاک و جوگرافیایەی رێگەی لەپێش دەستەواژەی بەهەشت کردەوە) بەردەوام بوو، لەسەدەی پێنجەمی پ.ز لەمیانەی دەستپێکردنی داگیرکاری عەرەبی خێراتر بوو.

لەکاتێکدا عەرەبەکان لەمیانەی ئیسلامیەتەوە لەرێگای داگیرکاریەکانیانەوە هەرەس ئاسا گەورەدەبوون وەک لافاو تا ئەوروپا، قەفقاسیا و ناوەوەی ئاسیای ناوین رۆیشتن، گەورەترین زیانی بەجڤاتە نەریتییە ئاریانیەکانی باکوور گەیاند، لەسەرووی هەموشیانەوە کوردە یەکەمینەکان و کوردان خۆیان بوون. دوای بەرخودانێکی بەرچاو

کوردان بوون بە موسڵمان، چینی سەرووی کوردان ئاسیمیلاسیۆنی عەرەب ـ ئیسلامی پەسەندکرد، چینی خوارووش کۆمەڵگای مەدەنی سۆفیگەراییان پێکهێنا و هەروەک رابردوو لەلوتکە و قووڵایی شاخەکان گیرسانەوە و ستراتیژی پاراستنی بوونی خۆیان بەبنەماگرت. هەروەک ئاماژەمان پێکرد؛ لەمیانەی ئەو ستراتیژیانەوە بەلایەنە باش و خراپەکانیەوە توانیان بەرگری لە بوونی خۆیان بکەن و پەرەی پێبدەن. لەکاتێکدا چینی سەرووی بەکرێگیراو میللیبوون (قەومیەت)ێکی سوننی (زیاتر خۆی سەر بە میللیبوونی (قەومیەت) عەرەب دەبینێت، کاتێک پێویستیش بێت کوردایەتی بەکاردێنێت) کردە بیانووی بوونی خۆی کە لایەنی نێگەتیڤی لەپێشە، چینەکانی خوارووش لەسەر بنەمای تەریقەتە سۆفیگەراییەکان (بەتایبەتیش مەدرەسەکان) کە لایەنی پۆزێتیڤی لەپێشە و کارەکتەری کۆمەڵی مەدەنییان هەیە بەئاراستەی گەلبوون پەرەیان سەند و لەچاخی ناوین کۆمەکێکی گرنگییان پێشکەش بە راستینەی کورد کرد.

ئەو شاڵاو و پەلامارانەی لە باکوور و خۆرئاواوە دەهاتن، واتە ئەو هێرشانەی بە ئەسکەندەر دەستی پێکرد و بە ئیمپراتۆریەتی رۆما و بێزەنتیەکانەوە بەرەو ئیمپراتۆریەتەکانی ئێران، پارس، پارت و ساسانیەکان بەردەوام بوو، زیاتر لە گۆڕەپانە سەرەکیەکانی ژیانی جڤاتە بەبنەچە کوردەکان روویاندەدا. لێشاوی ئەو شاڵاوە مێژووییەی لە باکوور، باشوور و خۆرئاواوە دەهات دوای ئەوەی بەیەکەوە لەگەڵ تیرە و میرنشینە تورکەکان و دواتریش ئیمپراتۆریەتەکانیان ئیمپراتۆریەتی ئێرانیان رووخاند، لەلای خۆرهەڵات هێزیان بەدەستهێنا و بەخێرایی و قەبارەیەکی زیاتر بەردەوام بوون. بەمجۆرەش ئەو خاک و زەویانەی بە بەهەشت ناودەبران بوون بەخاکی نەفرەتی. پێویستە بەبایەخەوە ئاماژەی پێبکرێت کە مێژوویەکی پڕ لەشەڕی بێبەزەییانەی بەمجۆرە لەپشت دۆخی نەفرین و بێ چانسی کوردانەوەیە. ئەگەر بەشێوەی قەبیلە و خێڵ بین بەخاوەن هەبوون یان بەسیفەتی قەوم، بەردەوام کوردان ئاگاداری ئەو هێزە دەرەکیانەن کە ئەنجامی نەرێنی دەئافرێنن و لەناوەوەش پاشکۆیان هەبوو و بەردەوام جێگای باس بوون. لەناو ئەو هەلومەرجانەدا کوردان ئاشنای بەرەبابی قەبیلە، سوڵتان و میرنشینەکانی تورکان بوون. هەر دوو هێزیش بە ئەزموون و جەنگاوەر بوون. هەرچەندە لەیەکەم بەریەککەوتنندا هەندێک شەڕ و پێکدادان لەنێوانیان روویدا، بەڵام لایەنی دۆستایەتی و رێککەوتن لەپێش بوو. هەردوو لایەنیش پێویستیەکی زۆریان بەمە هەبوو. ئەگەر رێگای شەڕ و پێکدادانیان هەڵبژاردایە لەوانەبوو هەردوو لایەنیش بەشێوەیەکی ستراتیژی دۆڕابان و بەیەکەوە لەناو چووبانایە. وەک دەرکی پێدەکرێت ئەو تێگەیشتنە لەلای هەردووکیشیان جێگای باس بووە.

سوڵتان ئەلپ ئەرسەلانی خانەدانی ئۆغوزی سەلجوقی[٢]، كە نازناوی سوڵتانی لە خەلیفەی عەباسی وەرگرت، بۆ كردنەوەی دەرگاكانی ئەنادۆڵ لە كوردستان لە هاوپەیمانێك دەگەڕا. لەساڵی ١٠٧١ كاتێك خۆی بۆ شەڕی مەلازگرد[٣] ئامادە دەكرد پەیوەندی لەگەڵ میرنشین و خێڵە بەهێزەكانی كوردانی ئەو قۆناغە پێشخست. لەئاكامدا ئەو هاوپەیمانەی لە سوڵتانێتی مەروانی دۆزیەوە كە ناوەندەكەی مەیافارقین (سیلوان) بوو. هێندەی هێزەكانی قەبیلەی خۆی هێزی لەچەندین خێڵی دەڤەرەكە كۆكردەوە. بەپێچەوانەی مەزەندەكان شەڕی مەلازگردی بەرامبەر ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی شەڕێك نەبوو تەنیا هێزی قەبیلە توركەكان ئەنجامیان دابێت، بەڵكو شەڕێكە بەلانی كەم هێندەی ژمارەی ئەوان هێزی میرنشین و خێڵە كوردەكانیش بەشدارییان تێداكردووە و بەمجۆرە سەركەوتنیان بەدەست هێناوە. كاتێك لێكدانەوە و شیكارێكی ڕاست بۆ شەڕی مەلازگرد بكرێت، ئەوا لۆژیكی ستراتیژی سەرەكی پەیوەندی نێوان كورد ـ توركیش دەركی پێدەكرێت. بەكورتی دۆخەكە بەمجۆرەیە: بۆ پاراستنی بوونی خۆیان بەرامبەر بە پەلاماری ڕۆما و بێزەنتیەكانی خۆرئاوا و باكوور پێویستییان بەهاوپەیمانێكی بەهێز بوو. توركوكان ئەو توانایەیان لەهێزەكانی عەرەب ـ ئیسلامدا بینی. ئەم پێویستیەی پاراستن و ئاسایش یەكێك لە هۆكارە سەرەكیەكانی ئیسلامیوونیان بوو لەسەر بنەمای ئەو پەیوەندیانەی لەگەڵ هێزە عەرەبەكان بەستیان تا ئەو كاتەی سولالەكانی تورك بۆ ناوچەكە هاتن. تیرە توركەكانیش یان لەڕێگای شەڕكردن دژ بە كوردان دەبوون بەهێزێكی داگیركار، ئەگەر دەرفەتی ئەوەش نەبووایە، ئەوا ڕێككەوتنیان لەگەڵیاندا دەبەست و ئیمپراتۆریەتی بێزەنتییان بەرەو ئەولاتری خۆرئاوا دوور دەخستەوە و بەمجۆرەش شوێنی خۆیان دەكردەوە. هەردوو لایەنیش بەو لۆژیكە ستراتیژییەوە كەوتنە شەڕی مەلازگردەوە. مسۆگەر شەڕی هاوبەشی كوردان و توركان بوو بەرامبەر بە ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی.

ئەنجامەكانی ئەو شەڕە ئاشكرایە: دەرگاكانی ئەنادۆڵ بۆ تیرە و بەرەبابە توركەكان كرایەوە، قۆناغێكی مێژوویی دەستی پێكرد. كوردانیش لەهێزێكی بەربەستی مێژوویی ڕزگاریان بووە كە بەدرێژایی سەدان ساڵ فشاری بۆدەهێنان و بۆ دواوەی دەبردن. لەو ئەركەدا ئیسلام ڕۆڵی كەتیرەی بینیوە. ئەو شەڕە هاوبەشەی لەژێر پەردەی ئیسلامەوە ئەنجامدار، لەبنەڕەتدا بەئامانجی پاراستن و پەرەپێدانی بوونی هەردوو گەل بوو كە

---

[٢] سەلجوق بەگی كوڕی دەقاق: دامەزرێنەری ناوكی دەوڵەتی سەلجوقی دەوروبەری ساڵانی ١٠٠٠ زایینی. وەك باس دەكرێت چوار كوڕی هەبووە: میكایل، یونس، موسا و ئەرسەلان. تۆغرل بەگی نەوەكەشی دامەزرێنەرە ڕاستەقینەكەی دەوڵەتی سەلجوقییە، كە وڵاتی فارس و ئێراقی داگیر كرد.

[٣] گرنگترین شەڕی نێوان بێزانسەكان بە فەرماندەیی ڕۆمانۆس و سەلجوقییەكان بە فەرماندەیی ئەلپ ئەرسەلان بوو. ئەلپ ئەرسەلان دەركی بە زەبەلاحی و زۆری چەك و كەلوپەلی سەربازی سوپاكەی بەرامبەری كرد، بۆیە هێرشی بردە سەر ڕیزی پێشەوەی سوپای بێزانسەكان (ڕۆمەكان) و سەركەوتنێكی كتوپڕی بەدەست هێنا، كە ئەمەش وایكرد ئیمپراتۆری بێزانسەكان كە لەشەڕەكەدا بە دیلی گیرابوو دانوستانی لەگەڵدا بكات. وێڕای ئەمەش بەبێ ڕێككەوتن لەگەڵ كوردان سەلجوقییەكان نەیاندەتوانی لەشەڕەكانی دژ بە بێزانسەكاندا سەركەوتن بەدەست بهێنن. (وەرگێڕ)

خەسڵەتە قەبیلەیی و خێڵەکیەکانیان لە پێش بوو. دۆڕاندنیان هەر لەو سەردەمەوە مانای لەدەستدانی بوون و دواکەوتنی هەردوو گەل دەهات. مێژوویی فەرمی بەردەوام شەڕی مەلازگرد بەگەورەیی سوڵتانی تورک دەبەستێتەوە و ناوەڕۆکەکەی دەشارێتەوە. شەڕی مەلازگرد بەلانی کەم هێندەی تورکەکان شەڕی کوردانیشە. تۆمار نەکردنی لەدیرۆکی فەرمی راستیەکەی ناسڕێتەوە، ناتوانێت بیسڕێتەوە.

هەرچەندە ناوە بەناوە بەهۆی پێکدادانەکان تێکچوون بەخۆیەوە ببینێت، بەڵام ئەو لۆژیکەی پەیوەندی نێوان کورد ـ تورک تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتووە. لەگەڵ نیشتەجێبوونی تورکەکان لەناوەوەی ئەنادۆڵ ئەو ستراتیژییە نوێیە هەر بەردەوام دەبێت. هەر دووگەلیش لەیادیان دەبێت کە لە ساتە هەستیارەکانی مێژوودا تەنیا کاتێک هەر دوو هێز بەیەکەوە رەفتار بکەن سەرکەوتوو دەبن. لە خانەدانێتی ئەیووبی کورد، چەندین میرنشینی ئەنادۆڵ و سەردەمی عوسمانیش بەردەوام ئەو لۆژیکە کارایە. کاتێک بۆ قووڵاییەکانی مێژوو شۆڕبینەوە دەبینین کە لەسەردەمی پەیوەندی هیتیت ـ میتانی (١٦٠٠ پ. ز)ییەوە ستراتیژیەتێکی هاوشێوە لەنێوان هێزەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا لەئارادا بووە. هەم بەشێوەی گەل و هێزە سڤیلەکان، هەمیش وەک هێزەکانی دەسەڵات ئەو تێکەڵبوونە جێگای باس دەبێت. نەک تەنیا بەرامبەر پەلامارەکانی خۆرئاوا بەڵکو بەرامبەر هەڕەشەکانی خۆرهەڵات و باشووریش ئەو ستراتیژییە هاوبەشەی بەرگریی لەسەر کارە. سوڵتانی عوسمانی سەلیمی یەکەمی[4]ش لەمیانەی چەمکێکی رێککەوتنی هاوشێوەوە پەلهاوێشتنی ئیمپراتۆریەتی خانەدانی سەفەوی ئێرانی بەربەست کردووە. لەهەمان مێژوودا (١٥١٤ـ١٥١٧) لەمیانەی ئەو رێککەوتنەی بە پێشەنگایەتی ئیدریسی بەتلیسی ئەنجامدرا سەڵتەنەتی مەمالیکی تەوەرەی میسر کە لەباشوورەوە هاتبوون سەرەتا بەربەستکران، دواتر رووخێنران. لەشەڕی رزگاری سەرەتای ١٩٢٠کانیشدا هەمان ستراتیژی دەکەوێتە گەڕ.

لە شەڕی چاڵدێران[5]ی ساڵی ١٥١٤ ی بەرامبەر پەلهاوێشتنی ئیمپراتۆریەتی خانەدانی سەفەوی ئەنجامدرا لە سەربازە کۆکراوەکان زیاتر هێزەکانی قەبیلە و خێڵە کوردییەکان جێگایان لە سوپاکەی یاوز سەلیمدا گرتبوو. هەم شوێنی روودانی شەڕەکە، هەم لەلایەنی

---

[4] بە یاووز سوڵتان سەلیم ناسراوە. حەوتەمین سوڵتانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانییەکان و خەلیفەی حەفتا و چوارەمینی موسڵمانان بوو. لە ساڵانی نێوان ١٥١٢ تا ١٥٢٠دا فەرمانڕەوایەتی کرد، بەهاوکاری ئینکشارییەکان و خاقانی قەرم کودەتایەکی بەسەر باوکی خۆی بایەزیدی دووەم کرد و تەواوی برا و کوڕەکانی خۆی لەناوبرد، بۆئەوەی کەس ململانێی لەگەڵدا نەکات. دوای ئەوەی بەهاوکاری کوردان بەسەر ئیمپراتۆرییەتی سەفەوییەکاندا سەرکەوت، چاوی بڕییە سەڵتەنەتی مەمالیکەکان (ألمملوكية) و خاکەکەیانی داگیر کرد و سنووری ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەسەردەمی فەرمانڕەوایەتی ئەودا فراوانتر بوو و ئیدی رێگای بازرگانی وشکانی ئاوریشمیش کەوتە ژێر رکێفیەوە. (وەرگێڕ)

[5] ئەو شەڕە لە ٢٣ی ئابی ١٥١٤دا لەدەشتی چاڵدێراندا لەنێوان سوپای عوسمانی بەفەرماندەیی سوڵتان سەلیمی یەکەم و سوپای سەفەوییەکان بە فەرماندەیی شا ئیسماعیلی یەکەم روویدا. کە تێیدا سوپای عوسمانی سەرکەوت و پایتەختی سەفەوییەکان تەورێزی داگیر کرد و بەمەش نزیکەی یەک سەدە قەڵەمڕەوێتی سەفەوییەکانی راوەستاند. (وەرگێڕ)

سەربازیشـەوە شـەڕەکە لـەئاکامی ڕێککـەوتنی کـورد ــ تـورک سـەرکەوتوو بـووە! (پرۆتۆکۆلەکـەی ئاماسیای نێوان یـاوز سـەلیم و بیست و هەشت بـەگی کـورد). ئەگـەر حوکمڕانی مەمالیکەکان لە ماردین و ئورفا ڕەچاو بکـەین ئـەوا دەبینـین کـە شـەڕی مـەرج دابق[٦] (شوێنێکی نزیک شاری حەلەبی بـاکووری سـوریایە) یـش کارەکتـەرێکی هاوشێوەی هەیە. ئەگەر بڵێین؛ هەردوو شەڕیش لەبواری ستراتیژیدا ڕۆڵێکی گرنگیـان لـە ڤـەژین و سەربەخۆیی کورداندا بینی تا دوا ڕادە واقیعی و پێویستیشە. مێژوویی شۆڤینی بـەردەوام ڕاستیەکانی پـەردەپۆش کـردووە. ئـەو شـەڕانەی لەسـەردەمی خانەدانـەکانی سـەلجۆقی، ئەیووبی و عوسمانی لـەجوگرافیای کوردسـتان بـەرپا بوونـە پێویسـتە زیـاتر بەشـێوەی شەڕی کوردان لەبەرامبەر هێزە داگیرکارەکان هەڵسەنگێنرێت. شـەڕی ڕزگـاری نیشـتیمانی ١٩٢٠ ـ ١٩٢٢ ش لەو چوارچێوەیە دایە. دەسـتکەوتی تورکـەکان لـەو شـەڕانە لـە ئـەنادۆڵ وڵاتێکی هەمیشەییان بەدەست هێنـا: بێگومـان کـورد نەبووایـە نەیـدەتوانی جێگـای خـۆی بکاتەوە.

ئەگـەر بەشـێوەیەکی ڕاسـت دەرک بەماهیـەتی پەیوەنـدی کـوردان لەگـەڵ قـەوم، میرنشـین، سـوڵتان و قەبیلـە تورکـەکان نـەکرێت، ئـەوا مێژوویـی پەیـدابوونی هـەردوو کۆمەڵگا بەڕاستی نانووسرێت. پێویستە زۆر بەباشی ئەو ڕاسـتیە بزانرێـت کـە کوردەکـان لەپەیوەندییەکانیان لەگەڵ تورکەکان ئەو سـتراتیژیەیان پەسـەند نـەکردووە تـا لـەڕێگای ئاسیمیلاسیۆن یان توندوتیژی سەربازیەوە بوونیان بکەوێتە ژێر هەڕەشە و مەترسیەوە، بەڵکو بەو ئامانجە بوو کە بەیەکەوە بوونی خۆیان بپارێزن و بەرەو پێشەوەی ببەن.

هەمان لۆژیکی ستراتیژی سەبارەت ئەو تورکانەش جێگای باسە کە خاوەن زهنیەتێکی قـووڵی مێـژوویین. نیـاز و کردەوەکـانی پیلانگێـڕی "فاشـیزمی تـورکی سـپی" ــ کـە بەشێوەیەکی بابەتی مانای سیخوڕێتی بۆ خۆرئاوا دەبەخشێت ـ بەرامبەر هەردوو کلتوور بناغەی هەڵوێستی نکوڵیکردن لە لۆژیکی ئەو ستراتیژییە و ڕێکارە مێژووییەکەی سـەدەی دوایـی پێکدێنێت. سـەپاندنی نکوڵی، قڕکردن، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسـاید بەسـەر ئـەو کوردانەی لەیەکەم قۆناغەکانی ئاواکردندا پەیوەندیەکی خاوەن ئەمجۆرە ناوەڕۆکەیان بـە بنەما گرتووە، گەورەترین خیانەتە بەرامبـەر بەهـەردوو کلتـوور و بـە زیـان و دۆڕانـدنی هەردووکیان ئەنجامگیر دەبێت.

ئایین ئەو دیاردەیە کـە مۆرکی خـۆی لەپەیوەندیـەکانی نێوان کۆمـەڵگاکانی چـاخی ناوین داوە. لەچاخی ناویندا ئـایین وەک میللیگـەرایی ڕۆژی ئـەمڕۆمان بەکاریگـەر بـووە. بەڵام لەڕاستی کۆمەڵگادا ئایین پەردەیەکی ئایدیۆلۆژییە و زمان و کلتووری نەریتی بوونی ڕاستەقینە پێکدێنن. ئەو گۆڕانکاریانەی زمان و کلتووری کوردانیش لەژێر پەردەی ئیسلامی

---

[٦] ئەو شەڕە لە نزیک شاری حەلەبی سوریا لە ٢٤ی ئابی ساڵی ١٥١٦ لـەنێوان سـوپای عوسـمانییەکان بـە فەرمانـدەیی سوڵتان سەلیمی یەکەم و سوپای مەمالیکەکان بە فەرماندەیی قانسـوەی گـۆری ڕوویـدا. لـەو کاتـەدا بـەهۆی ناکۆکی و ململانێی ناوخۆییەوە سوپای مەمالیک پارچـە بـوو، هـەروەها لەوکاتـەدا پڕوپاگەنـدەی ئـەوە بڵاوکرایـەوە کـە قانسـوەی گۆری کوژراوە. بەمەش وورەی سوپاکەی دابەزی و ئاژاوە و لێکترازانی تێکەوت و ژێرکەوت. (وەرگێڕ)

پیشانیداوە بەلایەنە ئەرێنی و نەرێنیەکانیەوە بەردەوام بووە. دیاردەکانی گەلبوون و قەومبوون کە لەو چاخەدا زیاتر بەدەرکەوتن بووە بە یەکێک لەسەرەکیترین رەهەندەکانی راستی کلتووری. شانبەشانی زهنیەتی خێڵەکی و ئاینی زهنیەتی قەومیش پەرەی سەندووە.

**٥ . کاریگەری ئەرمەنی . سوریانی . یەهودی لەراستینەی کورددا**

کاریگەری کریستانیەکان، ئەرمەنی، ئاشووری و یەهودییەکان لەسەر راستینەی کوردانی چاخی ناوین رۆڵێکی گرنگی بینیوە. کریستیانی شەش سەدە بەر لە ئیسلام سەریهەڵدا، بەو سیفەتەی هزر و سۆزێکی ئاینیە هەر زوو بەکاریگەر بووە. لەسەرەتا زیاتر بزووتنەوەیەکی هەژاران، چەوساوە و سەرکوتکراوان بووە. لەسەردەمی لەدایکبوونی کریستیانی باڵادەستی ئیمپراتۆریەتی رۆما لەسەر ناوچەکە لەلوتکە دابوو. هێلینیەکان، ئاشووری و ئەرمەنیەکان، تارادەیەکیش کورد و عەرەبەکان ئازار بەدەست ئەو باڵادەستیەوە دەبینن. ئیتر چینی هەژاری یەهودیەکانیش نەشونمای کردووە. ئیتر قەبیلەگەرایی یەهودیش بەرتەسک دەبینرێت. لەبەرئەوەی چینی سەروو بووە بە بەکرێگیراوی رۆما، دابەشبوون لە رەگەوە روویداوە. حەزرەتی عیسا بەرهەمی ئەو دابەشبوونە رادیکاڵەیە. وەک رێبەری ئاینی هەژاران دەرکەوتۆتە مەیدان. لەراستیدا مەسیحیەت دووەمین گەورە ئاینە و زادەی یەهودیەتە. بەهۆی پەرتووکی پیرۆزی عەهدی قەدیم یەهودیەکان لەقووڵاییەوە دابەش نەبوون، ئەوانەی جیابوونەوە کەمینە بوون. ئاینە نوێیەکە زیاتر کاریگەری کردۆتە سەر هێلینی، ئەرمەنی و ئاشوورییەکان. لەسەدەی سێیەمی زایینیشدا بڵاوبوونەوەی ئاینی کریستیانی خێرابووە. سەدەی چوارەمیش سەردەمی وەرچەرخانە گەورەکەیە. بەشی زۆرینەی هەرسێ گەلەکەش بوونەتە کریستیان. چونکە بوون بەکریستیان مانای دابڕانە لە کۆیلایەتی رۆما، بەجۆرێک لەجۆرەکان رۆڵی میللیگەراییەکی پێشوەختی بینیوە. وێڕای ئەوەی ئەو جۆرە میللیگەراییە لەگەڵ ناسیۆنالیزمی سەرمایەداری جیاوازیشە بەڵام رۆڵی میللیگەرایی بەرایی دەبینێت. هەربۆیەش هەڵگری ناوکی سەرمایەداری پێشوەختە. هەژموونگەرایی بوونی کریستیانی لەهەناوی کریستیانیدا رێکەوت نییە. کریستیانی رۆڵێکی گەورە لە دابەشبوونی رۆما بۆ دووپارچە دەبینێت (سەدەی چوارەم). لەئاواکردنی رۆمای خۆرهەڵاتدا واتە بیزەنت کریستیانی دیاریکەر بووە. دوای ماوەیەکی کورت رۆمای خۆرئاواش بووە بە کرستیان. کاسۆلیکی و ئۆرتۆدۆکسی دەربڕینی ئایدیۆلۆژیانەی ئەو دابەش بوونەن. زمانی لاتینی بووە بەزمانی کلتووری کاسۆلیکی و زمانی گریکیش بووە بەزمانی ئۆرتۆدۆکسەکان. ئەرمەنی و سریانی ـ کلدانیەکان یش لەئاواکردنی مەزهەبی خۆیان دوانەکەوتوون. ئەو دابەشبوونانە جیاوازی ریشەیی لەناو کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا دروست کردووە؛

جیابوونـەوەی هێلـین، ئەرمـەنی و سـریانیەکان خێـرا بـووە، ئـەو جفاتانـە بـەدۆخێک گەیشتوون وەک بڵێی پرۆتۆ نەتەوەی پێشوەختن.

ئاستی ماددی، مەعنەوی و ڕۆشنبیری ئەو گەلانە زۆر لە قەبیلـە کـورد و عەرەبـەکان لـەپێش و سـەرووترە. دروسـتبوونی جیـاوازی و کرانـەوەی مـەودای نێوانیـان دەسـت لێبەرنەدراوە. هەر سێ گـەلیش کۆنترین گـەلـی خۆرهـەڵاتی نـاوینی بـە بنەچـە شـارین. شارستانبوون یـان شـاریبوون بـاڵابوونی کلتووری بەدەست دێنێت. ئاساییە کـە کـوردە شـاخیەکانی بـاکوور و عەرەبـە بیابانیـەکانی باشـوور بەرامبـەر بـەو باڵابوونـە بکەونـە ناکۆکییەوە. هەروەها خاوەنداریێتی کردنـی بێزەنتیـەکان لـە هێلینییـە ئۆرتۆدۆکسـەکان و خاوەنداریێتی کردنی ساسـانیەکان لـە ئەرمـەنی و سـریانیەکانی سـەر بـە مەزهـەبی دیکـە بـوون، ناکۆکیـەکانی بـەدۆخێکی ئـاڵۆزتر گەیانـدووە. لـەدایکبوونی ئیسـلام لەسـەدەی هەفتەمـدا و بـەخێرایی بـاڵابوونی بەرامبـەر بەهـەردوو ئیمپراتۆریـەت و مەزهەبـە وابەسـتەکانی؛ هـەم ناکۆکیـەکانی زیـاد کـردووە، هـەمیش دژواری کـردووە. ناکۆکییـە نەریتیەکانیش بەردەوام لەمیانەی یەهودیەتەوە بووە بە تەقاندنەوەی گێژاو.

لەگەڵ هاتنی ئیسلام جوگرافیای کوردان (لەسەدەی یازدەهەمینەوە ئەو جوگرافیایە بە کوردسـتان نـاو دەبرێـت) تـەواو لەناوەڕاسـتی پشـێویی ئـەو ناکۆکیـە نوێیانـە دابـوو. کوردسـتان بـووە بـە گۆڕەپـانی نوانـدنی هێزەکـانی عـەرەب، فـارس، کـورد، سریانی و ئەرمەنیەکان و ماوەیەک دواتریش هێزی تورکەکان. کوردستان بۆتـە گۆڕەپـانی سـەرەکی شـەڕ و پێکـدادانی بێزەنتیـەکان و ئیمپراتۆریـەتی ئیسـلامی (پێشـتریش ساسـانیەکان). کوردەکان لە باکوور زیـاتر لەگـەڵ ئەرمەنیـەکان، لـە باشـوور لەگـەڵ سریانیەکان، لـە خۆرئاوا لەگەڵ ڕۆماییەکان لە خۆرهەڵاتیش لەگەڵ فارسەکان تێکەڵن. سەرباری ئـەوەی پێکهێنـەری گـەلی زۆرینـە بـوون، لەگـەڵ ئـەو گەلـە دراوسـێیانە لەپەیوەنـدی بـەردەوام دابوون، بەتایبەتیش لەمیانەی هێزەکانی شارەوە. لەکاتێکدا خۆیان وەک گەلی شوانکارە و کشتیار بوونە خاوەن بوون، ئەرمەنی ـ سریانیەکانیش بەشێوەی گەلی پیشەکار- شاری خـاوەن بـوون بـوون. بـەمجۆرە دابەشـکردنێکی مێژوویـی کـار لەنێوانیانـدا هاتـەئاراوە. پەیوەندییەکان لەناکۆکی زیاتر ماهیەتی پەیوەندی سیمبیۆتیک (یەکتری تەواوکەر) بـوو. پێویسـتە یەهودیـەکانیش بخەینـە چوارچێـوەی ئـەو پەیوەندییانـەوە. هـەر لەسـەردەمی لەدایکبوونیـەوە یەهودیـەت رایەڵـە و پەیوەندییـەکی نزیکـی لەگـەڵ جوگرافیـای کـوردان هەبوو.

لەو قۆناغەدا لەکاتێکدا زۆربەی کوردان لەسەر باوەڕی زەردەشتی بوون هەندێکیشیان ببوون بـە یـەهودی و کریستیان. لەگـەڵ هـاتنی ئیسـلام بـۆ دەڤەرەکـە ئـەو هاوسـەنگییە لەریشەوە گۆڕانکاری بەسەردا هات. لـە ئێـراق و سـوریای ڕۆژی ئەمڕۆمانـدا عەرەبـەکان دەسەڵاتی خۆیان بەسەر سریانی، یەهودی و ڕۆمەکان سـەپاند، (لـەژێر پـەردەی ئیسـلام بەسەر یەهودی و کریستانیەکاندا زاڵبوون). هەمان دۆخ بەرامبەر قیبتییە کریسـتیانەکانی میسریش جێگای باس بوو. تورکەکانیش لە ئەنادۆڵ بەرامبەر بە ڕۆمەکان تا رادەیـەکیش

بەرامبەر ئەرمەنیەکان باڵابوون و بوونەتە زۆرینە. لە کوردستانیش کوردەکان باڵابوونێکی هاوشێوەیان بەرامبەر بە ئەرمەنی و سریانیەکان ئاواکرد. لێرەدا کاتێک ناوی قەوم دەهێنرێت پێویستە دەرک بەهەژموونگەرایی چینی سەرووی ناو قەوم بکرێت. وێڕای سەرجەم ئەو شەڕ و فەتحکاریانەی روویانداوە پەیوەندی نێوان گەلان و چینی خواروو زیاتر بەشێوەی دۆستایەتی بەردەوام بووە. کوردان بەیەکەوە بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ قەومی ئەرمەنی و ئاشووری ژیاون و بەیەکەوە هەنگاویان بۆ چەندین پێهەڵگرتنی شارستانی و کلتووری هاوێشتووە. ئەمجۆرە پەیوەندییانەی بۆ ساڵانی ٢٠٠٠ پ.ز درێژ دەبێتەوە لەبواری مێژووییشەوە سەلمێنراوە. سەرباری تەواوی کێشمەکێشەکانی دەسەڵاتی نێوان بەگی قەومەکان و شەڕەکانی موڵکایەتی، بەڵام تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم پەیوەندی کلتووری بەردەوامی نێوان گەلانی ئەرمەنی، کورد، تورکمان و سریانی لەئارادابووە. ئەو پەیوەندییانە زیاتر سیمبیۆتیک (یەکتر تەواوکەر) بوون و لەبوارەکانی کلتووری مادی و مەعنەویشەوە پەرەیان سەندووە. رەوشێکی خراپی لەو جۆرە رووینەدا کە بەشێوەیەکی ریشەیی چارەنووسی ئەو گەلانە بگۆڕێت. ناکۆکیەکان لە نێوان چینەکانی سەرووی قەوم زیاتر لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاندراوە و شەڕ و پێکدادنی لێکەوتۆتەوە. جیاوازی ئایینی و مەزهەبی نێوان چینەکانی خوارووش بەرێزەوە پێشوازی لێکراوە و وەک کۆسپێکی بەردەم پەیوەندی دۆستانە و برایانە نەبینراوە. نووسینی مێژوو لەسەر بنەمای هێز و ئایدیۆلۆژیا هەژموونگەراکان و پڕوپاگەندەکردن لەو چوارچێوەیەدا ناتوانێت ئەو راستییە پەردەپۆش بکات و لەناوی ببات.

لەگەڵ گەیشتن بەکۆتاییەکانی چاخی ناوین، ئەو پەیوەندیانەی راستینەی کورد لەخۆرهەڵاتی ناوین لەگەڵ کلتووری ئیسلامی پێشیخست ئەنجامی گرنگی لێکەوتۆتەوە. ئەو پەیوەندییانەی نزیکەی هەزار ساڵ بەردەوام بوو لەبواری ئەرێنی و نەرێنییەوە کاریگەریەکانی جێگای باس بوو. لایەنی نەرێنی کاریگەری ئاسیمیلانیستی زمان و کلتووری عەرەبی بوو. کاریگەریەکانی عەرەباندن (تەعریب)و زمانی عەرەبی سەدان ساڵ بەردەوام بووە. چینی سەرووی کوردانیش؛ کە وەک توێژێک نەشونمای کردووە، لە کلتووری گەل دوورکەوتۆتەوە، لە بەکرێگیراوێتی نەریتیدا مەودای بڕیوە، لەسەدەی شازدەهەمینەوە ئەو بەکرێگیراوێتیەی لەگەڵ خانەدانی عوسمانی ـ تورک زیاتر پەرەی پێداوە، ناوە بەناوەش لەگەڵ گەلانی ئەرمەنی و سریانی کەوتۆتە شەڕ و پێکدادانەوە. بەو سیفەتەی چینێکی دەسەڵاتداری بەکرێگیراوە؛ سەرکوتکردن و چەوسانەوەی سەر توێژی کرمانج و چینە هەژارەکانی قەبیلە و خێڵەکانی پەرەپێداوە. لایەنی ئەرێنییان ئەوە بوو کە بۆ یەکەمین جار بوو کوردان بەشێوەیەکی فەرمی وەک گەل ـ قەوم لەو قۆناغەدا ناوبرێن و جوگرافیاکەشیان ئیتر بەفەرمی بە کوردستان ناودەبرێت. بەکورتی ناوی گەل و وڵات لەو قۆناغەدا مسۆگەر بووە. شاکاری ئەدەبی بە زمانی کوردی نووسراون. چەندین شاکاری زانستی و ئەدەبی بە زمانی کوردی نووسراون، بەرهەمی ئەو قۆناغەن، لەسەرووی هەموشیانەوە مێژووی کوردستانی شەرەفخان، مەم و زینی ئەحمەدی خانی و

شیعر و هونراوەکانی فەقێی تەیران. لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ڕێژەیی قەبیلە و خێڵە کوردەکان کۆمەڵ یان پۆلێنی کرمانج پێکهاتووە و دانیشتوانی سەرەکی چەندین شار و گوندی جێگیریان پێکهێناوە. ئیتر ڕۆڵی بڕبڕەی پشتی گەلبوون بۆ کرمانجەکان گواستراوەتەوە کە لەقەبیلە و خێڵەکان دابڕان و بوون بە ڕەنجدەرە سەربەستەکان. بەرامبەر بە هەژموونگەرایی پاوانخوازی خراپی سوڵتان و میرنشینەکان لەبوارەکانی دەسەڵات، ئابووری و ئایدیۆلۆژی چەندین گرووپی هاوشێوەی کۆمەڵی سڤیل پێکهاتوون، لەسەرووی هەمووشیانەوە تەریقەتە سۆفیگەرایییەکان، عەلەوێتی و ئێزیدی. تەواوی ئەمانەش کۆمەڵە پەرەسەندنێکن کە ناوەڕۆکە دیموکراتیەکەی بەهێزە. بەکورتی کاتێک گەیشتینە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم ڕاستینەی کورد لەڕاستی قەوم و کلتووری کۆمەڵگاکانی تەواوی جیهان دواکەوتووتر نەبوو، بەڵکو پێشکەوتووتر بوو.

### ٦. کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین و هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

کاتێک کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کەوتە ژێر کاریگەری هەژموونگەرایی سەرمایەدارییەوە سەبارەت بە ڕاستینە کۆمەڵایەتیەکان ڕێگای لەپێش دەرەنجامێک کردەوە کە بەئاستی کارەسات دەگات. ڕکابەرایەتیکردنی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین جێگایەکی گرنگ لە لۆژیکی ئاواکردنی هەژموونگەرایی سەرمایەداری دەگرێت. لە بەشەکانی پێشووتری بەرگرینامە ئاماژەمان پێکردبوو کە دواترین گەورە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین ئیسلامیەت لەڕێگای ئیسپانیا و سەقەلیا لە خۆرئاواوە، لەڕێگای ئەنادۆڵ لە خۆرهەڵاتەوە هەڕەشە و مەترسیەکی گەورەی بۆ سەر ئەورووپا دروست کردبوو (لەسەدەی هەشتەمەوە تا سەدەی شازدەهەم). هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەرامبەر بەو هەڕەشەیە پێشخرا. کاتێک ناکۆکی باوی خۆرهەڵات ـ خۆرئاواشی بخرێتەسەر ئەوا باشتر دەرک بە ماهیەتی هەژموونگەرایی نوێی خۆرئاوا دەکرێت. تا کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بێکاریگەر نەکرێت هەژموونگەرایی سەرمایەداری خۆرئاوا ناتوانێت پەرە بسەنێت و هەمیشەیی بێت. شاڵاوەکانی ناپلیۆن لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم بۆ سەر میسر و مۆسکۆ یەکەمین ئەزموونی هەڵمەتە بڕشتەکانی هەژموونگەرایی بوون. ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز کە لەگەڵ تێکشکانی ناپلیۆن سەرکردایەتی هەژموونگەرایی گرتەدەست، هەم هەژموونگەرایی خۆی بەسەر کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا سەپاند هەمیش هەنگاو بەهەنگاو کردی بە هەمیشەیی. لە سەردەمی ئەسکەندەرەوە ئەو هەڵمەتە گەورەترین فەتح بوو کە سیستەمی شارستانی خۆرئاوا بە گشتی بۆ خۆرهەڵات بە تایبەتیش لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین ئەنجامیداوە. لەپێناو ئەنجامدان و سەرخستنی ئەو فەتحە خودی سەرمایەداری بووە بە هەژموونگەرا. ئەگەر مێژوو بەشێوەیەکی ڕاست نەخوێنینەوە ناتوانین ئەو بوویەرانە شیکار بکەین کە لەو دوو سەدەیەی دوایی خۆرهەڵاتی ناوین ڕوویانداوە. ئەوەی ڕوویداوە وێکچووی فەتحکاری هێزێکی وەک عوسمانیەکان، ئێرانیەکان و جەنگیزخان نییە،

بەکورتی فەتحکاری هیچ شارستانیەک نییە. بەڵکو سیستەمی ناوەندی لەپشتەوەیە کە لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، ئابووری، سیاسی و سەربازییەوە سەرلەنوێ بەدامەزراوە بووە. لەئاکامی هەوڵێکی هەزار ساڵیدا (لەیەکەمین هێرشەکانی خاچپەرستان لەساڵی ١٠٩٦ وە تا دوا هێرشی سەر ئێراق ٢٠٠٣) سیستەمی شارستانی ناوەندی لەسەر بنەمای شێوازی سەرمایەداری (لەسەدەی شازدەهەمەوە) لەئەوروپای خۆرئاوا بونیادنرا و دەستی بەسەرداگیرا و هەژموونگەرایيەکەی جێگیر بوو.

تا ئێستاش کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین لە چۆنیەتی فەتحکردنەکەی ئەو دوو سەدەیەی دوایی بێئاگایە و تێنەگەیشتووە. دەشێت روونترین و ئاشکراترین دۆخیشی لە تراژیدیای سەددام حوسێن دا ببینین. ئەو شەڕانەی لەو دوو سەدەیەی دوایی بەناوی ئیسلامگەرایی نوێ یاخود میللیگەرایی عەلمانی بەناوی شەڕی سەربەخۆیی بەڕێوەچوون لەناوەڕۆکدا شەڕی پێشخستنی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بوون. ئەو ڕێبازانە (ئیسلامگەرایی، میللیگەرایی) هەر یەکەیان وەک ڤێرسیۆنێکی ئایدیۆلۆژیای ئۆریانتالیست داهێنران و لەسەر بنەمای داگیرکردنی خۆیان بەناوی سەرمایەدارییەوە بەکارهێنران. جگە لەهەندێک شەڕی بەرایی لەراستیدا سیستەمی هەژموونگەرایی پەلهاوێشتنی هەژموونگەرایی خۆی لەمیانەی ئەو ئامرازە ئایدیۆلۆژی و سیاسیانەوە ئاواکرد، بەتایبەتیش ئەوەی بەدەستی چینە هەڵبژاردەکانی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین ئەنجامداوە و پەرەی پێداوە. ئەو خاڵە زۆر گرنگە، ئەگەر وەک پێویست دەرکی پێنەکرێت ئەستەمە رەوشی ئەمڕۆی خۆرهەڵاتی ناوین شیکار و چارەسەر بکرێت. بە واتایەکیتر لەمیانەی پرۆژەکانی (پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن) سیستەمی هەژموونگەراییەوە لەدۆخی کائیۆسدا رادەگیرێت، لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی خودی سیستەم شیکار دەکرێت و هەوڵی سەرلەنوێ بونیادناوەی دەدرێت.

تەنیا لەسەر بنەمای ئەو گۆڕانکارییە جیهانگیری و هەرێمیانەوە دەتوانین گۆڕانکاریەکانی ئەو دوو سەدەیەی دوایی راستینەی کورد شیکار بکەین. لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم ئیمپراتۆریەتی بریتانی لەڕێگای باشوور لە ئێراقەوە، لە باکووریش لەلایەن رووسیای قەیسەریەوە هەوڵی گەمارۆدانی کوردستان دەدرا. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە خۆیشی لەژێر فشاری هەردوو هێزدابوو، لەپێناو لەسەرپێ مانەوەیدا شەڕی مان و نەمانی دەکرد. هەوڵەکانی چاکسازی (أصلاحات)ی سەلیمی سێیەم[٧] و مەحمودی

[٧] سوڵتان سەلیمی سێیەمی کوڕی مستەفای سێیەم (١٧٦١ ـ ١٨٠٨):یەکێک بوو لە خەلیفەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، لەدوای مردنی عەبدولحەمیدی یەکەمی مامی، دەسەڵاتی گرتەدەست. یەکێک بوو لەو فەرمانڕەوایانەی هەوڵی چاکسازیی دەدا. دوای بێدەنگی لەبەرەی جەنگەکاندا گرنگی بە چاکسازی ناوخۆیی دا و هەوڵی دا تا رێگا و بانەکان لە چەتەکان پاک بکاتەوە، هەروەها لەسەردەمی ئەودا قەڵاسازی لەزۆر شوێن پێشخرا و چەندین کەشتی پێشکەوتوو دروست کران، چەندین سەفارەتی هەمیشەیی لە دەوڵەتانی ئەوروپا کردەوە و سەرلەنوێ سیستەمی سەربازی رێکخستەوە. (وەرگێڕ)

دووەم[٨] بە ئامانجی دواخستنی داڕووخـان بـوو. هەوڵـەکانی محەمـەد عـەلی پاشـای والـی میسر لەپێناو دەستگۆڕکێی دەسەڵات تەنیا لەمیانەی ئـەو سازشـانەوە بەربەسـت کـرا کـە پێشکەش بـە ئیمپراتۆریـەتی رووسـیا و ئینگلتـەرا کـران. لەکاتێکـدا شـەڕی قەومـەکانی بونیادەکەی ئیمپراتۆریەتی پەرتەوازە دەکرد، ئەو ڕێگەچارەیەی بۆ ڕێگریکردنی پەنای بۆ بردرا، لەمیانەی ریفۆرمەوە لەگەڵ سیستەم ئاوێتەبوون بوو. سەنەدی ـ ئیتفـاق[٩] (میثـاق ألتحالف)، هەڵوەشانەوەی یەنی چەرێتی(الأنكشارية)، دامەزراندنی سوپای نوێ، فەرمانی تەنزیمات و ئیسلاحات و راگەیاندنی مەشروتیەتی یەکەم و دووەم هەمووی بـەو ئامانجـە بوو. ئەنجامی ریفۆرمەکانیش ئاوێتەبوونی تەواو بوو لەگـەڵ سیسـتەمی هەژموونگـەرایی سـەرمایەداری. لـەدەرەنجامی ئەوەشـدا کلتـووری خۆرهـەڵاتی نـاوین لەلایـەنی مـاددی و مەعنەوییـەوە تـا دوایـی بـۆ فـەتح و ئاسیمیلاسـیۆنی سیسـتەم کرایـەوە. نوێکردنـەوەی بیرۆکراسی و رەوتی عوسـمانگەرایی کـە بـەو ئامانجـە پێکهێنـران، لەناوەڕۆکـدا لـەپێناو وەسـتاندنی هەڵوەشـانەوەی ئـامێرە نەریتیـەکانی دەسـەڵات لەسـەر گـەل و پێشخسـتنی هەژموونگـەرایی سـەرمایەداری بـوو. لەبنەڕەتـدا ئینگلتـەرا ئـەو کـارەی بـەڕێوە دەبـرد. کاریگەریەکانی فەڕەنسا، ئەڵمانیا و رووسیاش بەردەوام لەزیادبووندا بوو.

کاتێـک یـاخیبوون و بزووتنـەوە سـەربەخۆخوازەکـانی سـەدەی نۆزدەهـەم شـیکار دەکەین، پێویستە ئاگادار بین و باش تێبگەین کە ئیمپراتۆریەت لە دۆخی نەخۆشیدا بـوو و هێزەکـانی هەژموونگـەرایی سـەرمایەداری بەڕێوەبـەری کـرداری بـوون. لەرووخسـاردا پاشـای عوسـمانی و بیروکراتـەکان ئیمپراتۆریـەتیان بـەڕێوەدەبرد، بـەڵام ئـەو شـێوازەی بەڕێوەبردن لەبوون بەئامرازی دەستی هێزی دیکە بەولاوە هیچ مانایـەکی دیکـەی نـەبوو. نـەک تـەنیا ئیمپراتۆریـەتی عوسـمانی، بـەڵکو لـەو دوو سـەدەیەی دوایـی ئەوانـەی لـە ئیمپراتۆریەتی ئێرانیش بڕیاردەر بوون هێزە هەژموونگـەراکانی سیسـتەم بـوون، ئـەوانی دیکەش تەنیا ئەکتەر بوون. فەتح، کۆڵـۆنی و داگیرکردنـی راستەوخۆ هـەم خەرجیەکـەی یەکجار زۆر بوو هـەمیش بـۆ بـەدیهێنانی ئامانجـەکانیان پێویست نـەبوو. ئامانجـەکانی هەژموونگەرایی بە کـەمترین خـەرجی و هەمیشـەبیتر بەدەسـتی ئەکتـەرەکان بەدیـدەهات.

---

[٨] محەمەد عەلی پاشا (١٧٦٩ ـ ١٨٤٨): بە ئەلعەزیز ناسرابوو، دامەزرێنەری میسری نوێیە و بۆ ماوەی زیاتر لە چل ساڵ فەرمانڕەوایەتی میسری کردووە. شەڕێکی ناوخۆیی دژ بە مەمالیکەکان و ئینگلیزەکان بەرپاکرد، پاشان بەوەکالەت بۆ عوسمانییەکان شـەڕی وەهابییـەکان و یۆنانییەکانیشـی کـردووە. دواتـر شـەڕی سـوپای عوسمانییەکانیشـی کـرد و خەریکبوو دەوڵەتەکەیان بڕووخێنێت، ئەمە ئەگەر ئەو رووخاندنە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەتانی خۆرئاوایی ناکۆک نەبووایە، کە ناچاریان کرد دەستەبەرداری زۆربەی خاکی بەدەستهێنراو ببێت. محەمەد عەلی پاشا توانی میسر لەرووی سـەربازی و خوێنـدن و پیشەسـازی و کشـتوکاڵی و بازرگـانی ببووژێنێتـەوە. بـەڵام بـەهۆی لاوازی جێگرەوەکـانی و زێدەڕۆییکردنیان دەوڵەتە پادشاییەکەی لە ساڵی ١٩٥٣ دەڕووخێنرێت. (وەرگێڕ)

[٩] بەڵگەیەکی یاساییە بریتییە لە هەندێک تایبەتمەندی دەستووری هەیە کە لەلایەن سەدری ئەعزەمی عوسمانی مستەفا پاشای عەلەمدارەوە لـە ٢٩ی ئـەیلولی ١٨٠٨ بـە ئامادەبوونی نوێنـەرانی رۆم و ئەنادۆڵییـەکان راگەیـەنرا. یاساناسـانی تورک کۆکن لەسەر ئەوەی ئەمە یەکەم بەڵگەی دەستوورییە لە مێژووی تورکیادا و لەسەر بنەمای ئەو بەڵگەیـە بزاوتـی یاساییان دەست پێکردووە. هەندێک کەس ئەمە بە بەڵگەنامەی ماگناکارتای ئینگلیزی دەچوێنن. چونکە سنوورێک بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت دادەنێت. (وەرگێڕ)

سەرجەم گەلان (تورکەکانی ئەتنیکی دەسەڵاتداریشی لەناودا) بەرامبەر بەو سیستەمە نوێیەی سەرمایەداری راپەڕین. پەرچەکردار و بەرخودانێکی گشتی جێگای باس بوو. بە ئامانجی سەرکوتکردنی ئەو سەرهەڵدانانە و رێگریکردنی دابڕان، سیستەم رێبازی هەمەجۆری پێشخست. ئۆریانتالیزم، مژدەهێنەر و ئیسلاحگەرایی سەرەکیترینی ئەو رێبازانە بوون. مەشروتیەتگەرایی میللیگەراییش خرایەسەر ئەو رێبازانەوە. وەک ئەنجامێکی تەواوی ئەو رێبازانە لە رێگای نەتەوەگەرایی ـ دەوڵەت، دەوڵەت ـ نەتەوەی بچووک لەناوچەکە ئاواکران و سەرلەنوێ بە سیستەم لکێنرایەوە. ئەو بزووتنەوانەی لەسەر بنەمای شۆڕشی ئۆکتۆبەر سەریانهەڵدا و ئانتی ـ سیستەم بوون، وێڕای ئەوەی سەرکەوتنی گرنگیشیان بەدەستهێنا، بەڵام لەبەرئەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان دەرباز نەکردبوو و مۆدێرنیتەیەکی نوێیان نەئافراند، خۆیان لەناو قەیرانێکی قووڵدا دۆزیەوە. لەکاتێکدا توێژێک دەخرایە سەر سیستەم، ئەوانەی دیکەش بوون بە رکابەرێکی پاسیف و بێکاریگەر.

راستینەی کورد بەخێرایی بەو پەرەسەندنانە کاریگەر بوو کە بەشێوەی گەڵاڵەیەک هەوڵی ئاماژە پێکردنیماندا. لەدۆخێکدا ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی ئەو رێککەوتنە باوەی هەڵوەشاندەوە کە لەگەڵ کوردان گرێی دابوو بەدوای باڵادەستی تەواوەوە بوو، رووسەکانیش لە باکوور چینی سەردەستی ئەرمەنیەکانی بەکارهێنا و هەوڵی زیادکردنی کاریگەری خۆی دەدا، ئینگلتەراش لە باشوور سریانیەکانی بەکارهێنا و هەوڵیدا کۆنترۆڵی خۆی لەسەر کوردستان و ئێراقی چاوەڕوانکراو پەرەپێبدات. یارمەتی و کۆمەکی بۆرژوازی ئەرمەنی و سریانی رۆڵێکی گرنگییان لەمەدا بینی کە پێشوەخت بوون بە سەرمایەداری. سێ هێزی گرنگ سەرلەنوێ کوردستانیان لەناوخۆیاندا دابەش دەکرد. دینامیزمی ناوخۆیی کوردانیش بەرامبەر بەو هەموو گۆڕانکاریانە دەستەوەستان نەبوو. چینی سەروو کاتێک بینییان دەسەڵاتی نەریتییان لەدەست دەچێت لەهەندێک شوێن یاخیبوونیان ئەنجامدا. کوردستان بوو بە مەیدانێکی سەرهەڵدان و تەواوی سەدەی نۆزدەهەمی گرتەوە. قۆناغی یاخیبوونەکانی لە ساڵی ١٨٠٦ لە باشوور بە رێبەرایەتی بنەماڵەی بابانیەکان دەستیپێکرد، لەدەڤەری بۆتانی ناوەڕاستی کوردستانیش لەمیانەی یاخیبوونی بەدرخان بەگ لەساڵی ١٨٤٢ بەلوتکەی خۆی گەیشت. لەگەڵ تێکشکانی بەدرخان بەگیش سەردەمی دەرەبەگایەتی و میرنشینی کلاسیک کۆتایی پێهات.

دەزگای شێخایەتی کە لەجێگای میرنشینەکان ئاواکرا وەک هێزێکی نوێی پێشەنگایەتی کۆمەڵگا هاتە مەیدانەوە. ئەو یاخیبوون و سەرهەڵدانەی شێخ عوبەیدوڵلا لەساڵی ١٨٧٨ هەم بەرامبەر ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی هەمیش ئێرانی بەرپایکرد، تەنیا لەئەنجامی هاوکاری ئینگلتەرا بۆ هەردوو ئیمپڕاتۆریەت توانیان سەرکوتی بکەن. ئەو یاخیبوون و سەرهەڵدانانەی لەساڵی ١٩٢٥ لەمیانەی شێخ سەعید موە دەستی پێکرد و بە سەرهەڵدانی ١٩٣٠ ئاگری بەردەوام بوو و بە رێبەرایەتی سەید رەزا لەساڵی ١٩٣٧ ـ ١٩٣٨ لە دێرسیم بۆ دواجار تاقی کرایەوە؛ شکستیان هێنا. یاخیبوون و سەرهەڵدانەکانی ١٩٢٠

کانی باشووری کوردستان بە ڕێبەرایەتی شێخ مەحمود و خۆرهەڵاتی کوردستانیش بە ڕێبەرایەتی سمکۆی شکاک هەمان خەسڵەتیان هەبوو و لە شکست ڕزگاریان نەبوو. دیسان ئینگلتەرا ڕۆڵێکی دیاریکەری لەو تێکشکاندنانەشدا بینی. لە سەرەنجامی ئەزموونی کۆماری کوردستان لە مەهابادی خۆرهەڵاتی کوردستان (١٩٤٦) و بزووتنەوەی ئۆتۆنۆمیخوازی مەلا مستەفای بارزانی ساڵانی ١٩٦٠ – ١٩٧٥ ؛ قۆناغی یەکەمی بزووتنەوەی کورد بەشکست کۆتاییهات. لەساڵی ١٩٧٥ تا ڕۆژی ئەمڕۆمان قۆناغێکی نوێ دەستی پێکردووە. ئەو پرۆسە و قۆناغە نوێیەی دوای تێکشکانی یاخیبوونەکانی شێخ، ئاغا و بەگە کلاسیکەکان ڕێبەرایەتیان دەکرد، دەستیپێکرد، بزووتنەوە نەتەوەییە دیموکراتیەکانی گەل و ڕۆشنبیران کاریگەر بوو.

لەنزیکەوە بینینی تایبەتمەندییەکانی ئەو دووسەد ساڵەی دوایی ڕاستینەی کورد کە لەقۆناغە مێژووییەکانی پێشووتری جیادەکاتەوە یان هاوشێوەیەتی فێرکەر دەبێت. لە سەردەمە شکۆدارەکەی نیولیتیکدا کوردە یەکەمینەکان داینەمۆی مێژووی جیهان بوون. لەچاخی کۆنیش ڕۆڵی لانکە و دایکی لەدایکبوون و خۆراکپێدانی سیستەمی شارستانی ناوەندی بینی. لەچاخی ناوینیش یەکێک لە گەلە پێشەنگەکانی سیستەمی شارستانی ناوەندی (ئیسلامیەت) بوون. بەڵام لەچاخی نوێدا، واتە لە سەردەمی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هیچی نەمابوو ئەو ڕاستیە شکۆدار، بوێر و ڕەنجدەرە لەمێژوودا بسڕێتەوە. وەک بڵێیی بوونی نییە دیوەزمەیەکی ڕاستەقینە بەسەر ڕاستینەی کورد داڕووخا. دووچاری "کارەساتە گەورەکان" بوو کە گوتەیەکە بۆ کۆمەڵکوژییە یەک لەدوای یەکەکان بەکاردەهێنرێت. هەرچەندە بوونی خۆیشی پاراستبێت، بەڵام ئەو بوونە ئازاد نییە و بەسەر پردی سیراتی دۆزەخدا تێپەڕدەبێت.

لە یەکەم چوار بەرگەکەی ئەو بەرگرینامەدا هۆکاری قاڵبوونەوەی گشتی سەبارەت بە شارستانی و بەتایبەتیش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەپێناو ئەنجامدانی شیکاری سۆسیۆلۆژی ئەو کارەساتە گەورانە بوو کە یەک لەدوای یەک ڕوویاندابوو؛ ئامانجم لابردنی دیوەزمەکەی سەر ڕاستینەی کوردی ئەو دوو سەدەیەی دوایی و بڵاوەپێکردنی هەوری ڕەش بوو. لەسەردەمی ئەو کارەساتە گەورانەدا هەردوو گەل و کلتووری دێرینی ئەرمەنی و ئاشووری کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی بەیەکەوە لەگەڵ کوردان ژیاون و ئیمزای خۆیان لەژێر بەرکەماڵترین کلتووری ناوچەکە داوە، بوونە قوربانی ژینۆساید و قەڵاچۆکران. کلتووری سێ هەزار ساڵەی هێلینی ئەنادۆڵ بەتەواوی لەناوچوو. خودی کوردانیش لەلایەن ژینۆسایدی پەردەپۆشکراو و ئەو شەڕە تایبەتییەی لەسەر بنەمایەکی کلتووری بەڕێوەدەچێت ڕووبەڕووی لەناوچوونن. ئەو هێزانەی بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار دەستیەکار بوون گەلانی تورک، عەرەب و فارسیان لەناو فاشیزمی سپی ـ ڕەش سەوزدا تواندەوە. بەتایبەتی لەو پەرتووکەی بەناوی "سۆسیۆلۆژیای ئازادی"یە هەوڵمداوە پیشانی بدەم کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرپرسیاری سەرەکی ئەو قۆناغ و پرۆسەیەیە. کەم و زۆر شتگەلێک هەن کە بخرێتە سەر ئەو خەباتە

(پەرتووک)ەوە. بەگوێرەی رەوش و روانگەکانەوە لەهەندێک لایەنەوە هەوڵی تەواوکردنی دەدەین.

أ ـ هێزی هەژموونگەرایی دیاریکەری دووسەد ساڵەی دوایی ئیمپراتۆریەت و دەوڵەت ـ نەتەوەی ئینگلتەرایە. ئەو گەورە ئیمپراتۆریەتە لە کاتێکدا لەو سێسەد ساڵەی دوایی گەورە هێزەکانی ئەوروپای لە کیشوەری ئەوروپای بەگژ یەکترەوە دەنا و بێکاریگەری دەکردن، لە دەرەوە کاریگەریەکانیانی شکاند و بەسەر کۆلۆنی و رێگاکانی بازرگانیکردنیاندا زاڵ بوو. ئەوانی تریشی خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بە هەمان رێباز ئەمریکا، ئاسیای خۆرهەڵات و باشووری خۆرهەڵاتی بەخۆیەوە گرێدا. بوو بەو ئیمپراتۆریەتەی کە خۆری لەسەر ئاوا نابێت. بە رێبازی هاوشێوەوە لەو دووسەد ساڵەی دواییدا خۆرهەڵاتی ناوینیشی پارچە کرد و بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی دابەشکرد، لە بواری ئابووری و ئایدیۆلۆژیەوە خستییە ژێر پاوان و قۆرخکاری خۆیەوە. لە دوو سەد ساڵی دواییدا گوایە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی درێژەیان بە بوونی خۆیان دا (بە زارەکی). دواتر عەرەب، ئێرانی و تورکەکان بۆ چەندین دەوڵەت ـ نەتەوە دابەشکران و گوایە درێژەیان بە سەربەخۆیی خۆیاندا. ئەگەر بە قووڵایی شیکاری لەبارەوە بکرێت ئەوا بە دڵنیاییەوە دەبینرێت کە بەشێکی سیستەماتیکی تاکە سیستەمی هەژموونگەرایی کە لە تەواوی جیهاندا بڵاوبۆتەوە بەشێکی لە خۆرهەڵاتی ناوین جێگیر کراوە. کاتێک تیۆری شارستانی ناوەندیم تاوتوێ کرد ئامانجم ئاشکراکردنی ئەو راستیە بوو. بەڵام کەسانێک کە مێشکیان لەت و پەت کراوە دەشێت مێژوو بە شێوەی پارچەگەلێکی دابڕاو و راوەستاو ببینن. راستی پێچەوانەکەیەتی. مێژووی گەردوونی راستییە و تا رۆژی ئەمڕۆمان وەک ئەڵقەکانی زنجیرەیەک بە یەکەوە گرێدراون یاخود وەک رووباری بنەڕەتی بەبێ پچڕان لێشاوەکەی بەردەوامە. وەک هێزی هەژموونگەرایی سیستەمی شارستانی ناوەندی هەرچەندە ئینگلتەرا وەک جاران بە کاریگەریش نەبێت، بەڵام تا ئێستاش هێزی بونیادنان و بەردەوامکردنی سیستەمە.

هەڵسەنگاندنی یەکە یەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین وەک پارێزگا یان ویلایەتێکی سیستەم زیاتر نزیکی حەقیقەتەکانی کۆمەڵگامان دەکاتەوە. ویلایەتەکان کۆماری سەربەخۆ یاخود پاشایەتی بن، هیچ لە ناوەڕۆکەکەیان ناگۆڕێت. گوتەکانی پاشکۆیەتی کەم و سەربەخۆیی زۆر درۆ و دەلەسەی هەڵبەستراون. ئەوانەی دەرک بەو راستییە نەکەن، ئەوا هەڵوەشانەوەکەی رووسیای سۆڤێتی دوای حەفتا ساڵ، حوکمڕانی فاشیستی سپی کۆماری تورکیا، فاشیزمی رەشی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب، فاشیزمی سەوزی ئێران و پاکستان و ئەفغانستانیش تێناگەن. بە هەمان شێوە ناتوانێ هەرەسهێنانی لە ناکاوی دەوڵەتە بەناو تەواو سەربەخۆکان و شێوەگۆڕینیان شیکار بکات، ناتوانێ ئەو راستیەش شیکار بکات کە دەوڵەتێکی زەبەلاحی وەک چین چۆن بووە بەو هێزە سەرەکییەی سەرمایەداری دەژێنێت.

دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی شۆڕشەوە ئاوا نەکراون؛ بەڵکو لەلایەن سیستەمی هەژموونگەراوە ئاواکراون. ئامانجی سەرەکی ئەو دەوڵەتانە خۆی لەوەدا دەبینێتەوە کە بەناوی سیستەمەوە بە توندترین شێوە گەلەکانیان بچەوسێننەوە. لەو بوارەوە سەرکەوتووش بوون. هەمان پرۆسە لە تەواوی جیهانیش دەستبەکارە. ئەو ڕژێمە داگیرکاریانە لەژێر ئەو دۆخە کائیۆسیەدا شاراوەن کە لە خۆرهەڵاتی ناویندا قووڵبۆتەوە و تەنیا لەمیانەی کارەساتەوە بەردەوام دەبێت. لە کاتێکدا ڕووداوەکانی چاخی سەرمایەی فینانسی نیولیبرالی دوایی تەواوی گەلانی ناوچەی مەحکومی بێکاری کردووە، سەرچاوەکان لەناودەبات و کۆتایی بە ژینگە دێنێت، ئەوا چاکتر دەرک بە ڕاستی دەکەین. لە دوا شیکاردا لەسەدا دەی ئەو توێژەی سیستەم کە پارە بە پارە قازانج دەکات و باڵادەستی خۆی بەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، ئابووری و کلتووریدا سەپاندووە، بۆ شاردنەوەی باڵادەستیەکەشی بەردەوام فاشیزمی میللیگەرایی و ئایینی لە ڕۆژەڤدا دەهێڵێتەوە، ئەمەش سەلمێنەری گەشەکردنی وڵاتان و سەربەخۆیی نەتەوەکان نییە. کاتێک گەلان لە کارەساتبارترین سەردەمی مێژوویی خۆیاندا دەژین، دوا پاشماوەکانی کلتووری کۆمەڵگاش لەناو چەرخی دەوڵەت ـ نەتەوەدا دەتوێنرێتەوە. گوایە لە سەردەمی ماف و ئازادییە کەسیەکان داین، بەڵام خواحافیزی لە دوا پاشماوەی کەرامەتی تاکەکەس دەکەین. کاتێک دەستەواژەی ژینۆساید شیکار دەکەین، ئەگەر بە گشتی تاوتوێی بکەین و بەناوەڕۆکە سیستەماتیکەکەی بگەین، دەتوانین سەرکەوتوو بین. بە بایەخەوە گوتەی "تاقانە" سەبارەت بە ژینۆسایدی یەهودیەکان بەکاردەهێنرێت. بەڵام ڕاستی پێچەوانەکەیەتی. لە سیستەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ژینۆسایدی "تاقانە" بوونی نییە. لە هەر کۆمەڵگا، گەل و دەوڵەت ـ نەتەوەیەک کەم یان زۆر ژینۆساید جێگای باسە. هەندێکیان لەمیانەی پەیڕەوی جەستەیی (کۆمەڵکوژی جەستەیی) جێبەجێ دەکرێن، زۆربەشیان بە شێوەیەکی کلتووری و پەردەپۆشکراو جێبەجێ دەکرێن. بێبەشکردن لە مێژوو، ئابووری، بەڕێوەبەرایەتی و زهنیەت بەلانی کەم هێندەی ژینۆسایدە کلتووری و جەستەییەکان بە کاریگەر و بێبەزەیین.

لەپێناو کارابوونی یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج پێویستە شێوەی چەوسانەوەی سەرمایەداری ئیندوستریالیزم و سەرمایەی فینانس پاوان یان قۆرخ بکات. قۆرخکردنیش لەژێر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم) پێویستی بە باڵادەستی دەوڵەت ـ نەتەوە هەیە کە ئامانجی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەنە و تا دەمارە دەزوولەییەکانیەوە دەخرێتە ژێر کۆنترۆڵ و چاودێری ئامێر و ئامرازەکانی دەسەڵاتەوە. لەسەر بنەمای پشتگیری کردنی یەکتری قۆرخکاری پیشەسازی و قۆرخکاری سەرمایەی فینانسی سەر ئابووری لەگەڵ قۆرخکاری دەوڵەت ـ نەتەوە لەناو یەکتردا ئاوا دەکرێت. لە میانەی ئاواکردنی قۆرخکاری میللیگەرایی بواری ئایدیۆلۆژی پرۆسەکە تەواو دەبێت. لە ئاکامدا ئەو کۆمەڵگا هۆمۆژەن و لێکچووە ئاوادەکرێت کە کرابوو بە ئامانج. ئەوەش مانای سەرکەوتنی فاشیزمە. بچووککردنەوەی فاشیزم بۆ کردەوەکانی هیتلەر و

مۆسۆلۆنی، هەڵسەنگاندنیان وەک بڵێی تاکە دیاردەی فاشیزمن یەکێکە لە چەواشە گرنگەکانی ئایدیۆلۆژیای لیبڕالیزم.

کۆمەڵگای هۆمۆژەن (ألمجتمع ألنمطي) ئەو کۆمەڵگایەیە کە دووچاری ژینۆساید هاتووە. لە ڕێگای هۆمۆژەن کردنەوە کۆمەڵگا لە مێژووی ڕاستەقینەی خۆی دادەبڕێنرێت، لە میانەی وێناکردنی ئایدیۆلۆژیەوە سەرجەم کلتوورە جیاوازەکان لەناو دەبرێن. بەمجۆرە لەکاتێکدا یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج بەسەر ئابووریدا زاڵ دەکرێت، قۆرخکاری دەوڵەت ـ نەتەوەش لەسەر دەسەڵات ئاوا دەکرێت. ئەوەی لەمیانەی دووەمین جەنگی جیهانەوە بەدیهاتووە هەژموونگەرایی ئینگلتەرا، ئەمریکا و ڕووسیایە بەرامبەر بە هەژموونگەرایی ئەڵمانیا، ژاپۆن و ئیتاڵیا؛ سەرکەوتنی جەمسەرێکی هەژموونگەراییە بەسەر ئەویتریان. وەک لیبڕالیزم بانگەشەی بۆ دەکات سەرکەوتنی دیموکراسی نییە لە بەرامبەر فاشیزمدا. جەمسەری ئەڵمانیا دۆڕاوە، بەڵام وەک شێوەیەکی دەسەڵات لەسەر ئاستی دونیا فاشیزم بە سەردەمی باڵادەستی خۆی گەیشتووە. سەردەمی هەڵکشان و هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لە میانەی سەردەمی درەنگی سەرمایەی فینانس (هەژموونگەرایی سەر ئابووری لە دوای ساڵانی ١٩٧٠) و سەردەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی سەر کۆمەڵگای هۆمۆژەن (ئەو کۆمەڵگایەی بە ژینۆساید تێپەڕیوە) تەواو کراوە. بێگومان ئەو قۆناغە یان ئەو پرۆسەیە لەسەر هێڵێکی ڕاست پێشنەکەوتووە. دەرکەوتنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (دوای ١٩٦٠)ەکان، هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت لە١٩٩٠ دەشێت لەچوارچێوەی هەڵوەشانەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بە تایبەتیش لەچوارچێوەی هەڵوەشانەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەڵسەنگێنرێت. ئەو سەردەمەی بە پۆست مۆدێرنیتە (پاش مۆدێرنیتە) ناو دەبرێت، لە ڕاستیدا مانای هەڵوەشانەوە و کائیۆسی درەنگکەوتووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری فاشیست دەبەخشێت. هێندەی ئەو مۆدێرنیتە سەرمایەدارییەی خۆی نوێکردۆتەوە، دەشێت مۆدێرنیتەی دیموکراتیش بە بەدەستهێنانی هێزێکی مەزن لە کائیۆس دەربچێت. ئەوەی لێرەدا ئاراستەی پەرەسەندنی پرۆسەکە دەستنیشان دەکات، هێزی واتا و چالاکی لایەنەکانە لە بواری ئایدیۆلۆژی، ئەخلاقی و هونەریدا. لە ئاکامدا هەردوو هێزیش ڕووبەڕووی یەکتری دەبنەوە و تێدەکۆشن، بە گوێرەی بارودۆخ یان کائیۆسەکە قووڵتر دەبێتەوە و بەردەوام دەبێت، یان یەکێک لە لایەنەکان سەردەکەوێت؛ بەڵام بەم شێوازانە تێکۆشان زۆر درێژخایەن دەبێت، لەوانەیە چەندین سەدە بەردەوام بێت.

ب ـ لەو چوارچێوەیەدا و بەهۆی بابەتەکەشمان ئەو وەڵامەی بدرێتەوە پرسیاری لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا چی ڕوویدا؟ گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. لەبەر ئەوەی ناوچەیەک بوو کە سیستەمی شارستانی ناوەندی کۆنی تێدا لەدایک بوو و بەهەزاران ساڵ درێژەی بە ژیانی خۆیدا. هەربۆیە جوگرافیای میزۆبۆتامیا و ئەنادۆڵ بۆ هێزی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری واتە بۆ ئیمپڕاتۆریەتی ئینگلتەرا ستراتیژی بوو (بۆ ئەڵمانیا و ڕووسیاش بەم شێوەیە بوو). سەبارەت بە کۆنترۆڵکردنی خۆرهەڵاتی

ناوین، قەفقاسیا، ئاسیای ناوین و هیندستان مسۆگەر پێویست بوو بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. هەروەک لەمێژوودا ڕوویداوە لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا ئەو جوگرافیایە گرنگی خۆی لەو ڕاستیەوە وەردەگرێت.

ئەو پێکهاتانەی بە جەمعیەتی جۆن تورک و ئیتیحاد و تەرەقی ناودەبرێن (بونیادەکانی دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیا میللیگەرا مۆدێرنەکان کە لە تەنزیماتی ساڵی١٨٤٠ وە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بە کاریگەرە) تەنیا لەسەر بنەمای پەیوەندییەکانی لەگەڵ لێکدانەوەکانی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە دەشێت بەشێوەیەکی ڕاست شیکار بکرێت. هەروەک ڕوونکرایەوە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی کە لە پەلەقاژەی مەرگدا بوون بەهۆی حیسابەکانی هاوسەنگی هەژموونگەرایی و دۆخی ژەنگگرتووی پێکهاتەکەیان مۆڵەتی ژیانیان پێدرابوو. تاکە ڕێگای لەسەر دەسەڵات مانەوە سەبارەت بیروکراسی ئیمپراتۆریەت، پشتبەستن بوو بە هێزێک یان چەند هێزێکی هەژموونگەرا: بەمجۆرەش دەیانتوانی درێژە بە بوونی خۆیان بدەن. لەو سۆنگەیەوە؛ لەو ناوچانەی ئاماژەمان پێکردن جیابوونەوەی نوخبەی نوێی دەسەڵاتی گرێدراو بە ئینگلتەرا، ئەڵمانیا، ڕووسیا و تاڕادەیەکیش گرێدراوی فەڕەنسا دەستی پێکرد. لاساییکردنەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەلایەن ئەو نوخبانەوە دەست لێبەرنەدراو بوو. وەک چۆن ئەمانە لەگەڵ کلتووره کۆنەکانی ئیمپراتۆریەت چانسی ژیانیان نەبوو (لەمێژبوو کلتووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری فەتحی کردبوون)، بژارەکانی دیموکراتیانەی گەلیش جێگای باس نەدەبوو. بەهەر حاڵ چاوەڕوانی قەڵەمبازێکی دیموکراتییانە لەو بیروکراسیانە نەدەکرا کە بوونیان لەسەر بنەمای زەوتکردنی کلتووری گەل ئاواکراوە یان چینی سەروو گیانی بەبەرکردوون. جگە لە خۆلکاندن بە هێزە هەژموونگەرا نوێیەکان ئەو توێژانە چانسێکی دیکەیان نەبوو. ئەوەی دەمایەوە گواستنەوەی لاساییکردنەوەی مۆدێرنیتە بوو لەمیانەی ڕۆشنگەری بیروکراسیەوە. هەروەک تەواوی جیهان (پێشتر لە ئەورووپای دوای شۆڕشی فەڕەنسا) بیروکراسی عوسمانیش کەوتە سەر ئەو ڕێگایەوە. بزووتنەوەی جۆن تورک کە دوای پاشا تەنزیماتگەراکان بوو بە عوسمانییە لاوەکان و لە ساڵی ١٨٩٠ وە بۆ جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی گۆڕا، هەنگاوگەلێکی هەستیاربوون کە بەو ڕێچکەیەدا هاوێشتران. ئەو گۆڕانکارییەی لە بواری ئایدیۆلۆژی سەرەتا بە عوسمانگەرایی دەستی پێکرد و بە پان ئیسلامیزم بەردەوام بوو، بە تورکێتی ئەنجامگیر بوو. لە میانەی عوسمانگەراییەوە ئامانج ئافراندنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەک بوو کە تەواوی پاشماوەکانی ئیمپراتۆریەت بگرێتەوە، کاتێک مەیلی جیابوونەوەی گەلە کرستیانەکانیش هاتە ئاراوە لە ڕێگای پێکهاتەیەکی گەلە موسڵمانەکان ( بە تایبەتی عەرەبەکان لە خۆوە دەگرێت) لەسەر بنەمای پان ئیسلامیزم نیازی درێژە پێدانی ئیمپراتۆریەتیان هەبوو. لەگەڵ بەهێزبوونی مەیلی جیابوونەوە لە عەرەبەکاندا مەیلی تورکێتی دەرکەوتە پێش. لەکاتێکدا مەشرووتیەتی یەکەم لە ئاکامی ئارەزووی عوسمانییە لاوەکان ڕاگەیەنرا، بەڵام لە مەشرووتیەتی دووەمدا ئایدیۆلۆژیەکانی تورکێتی و ئیسلامی لەپێشتر بوون.

لە ساڵی ١٩١٣وە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان زهنیەتی تورکچێتی بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەوڵـەت و پارتـەکانی تـەوەرەی دەوڵـەت. کـەم و زۆر کاریگـەری هێـزە هەژموونگـەراکان لەسەر تەواوی ئـەو مەیلانـە هـەبوو. لـەوەش گرنگتـر، دژەکردنێکـی جددیانـەی ماسۆنی جێگای باسـە. لـە سـەردەمی شۆڕشـی فەڕەنسـاوە ماسۆنیەکان پشـتگیرییان لـە تـەواوی بزووتنەوە نەتەوەگەرا عەلمانیەکانی لاوان کردووە؛ بـەجۆرێک لـەجۆرەکان گوزارشت لـە یەکلاکردنەوەی حیسـاباتی کۆمەڵگـەرایی سـڤیلی بـۆرژوازی لەگـەڵ لایـەنگرانی دەسـەڵاتی تیۆلۆژی دەکات. لـەو قۆناغـەی بـە تەنزیماتـەوە دەسـتی پێکـرد تـا دواڕادە کاریگـەرییان لەسەر هەر سێ ڕەوتیش هەبووە، نوخبەی بەڕێوەبەری دەسـەڵات و پێکهـاتنی دەسـەڵاتی ئیتیحاد و تەرەقی بوون. کاریگەری زایۆنیزمیش لەسەر ئەو ڕەوتانە جێگای بـاس بـووە. زایۆنیـەکانی لـە سـاڵی ١٨٩٦ بەشـێوەیەکی فـەرمی خۆیـان وەک نوێنـەرانی میللیگـەرایی بـۆرژوازی یـەهودی ناسـاند، بـە دوای سـەرلەنوێ ئاواکردنـەوەی دەوڵـەتی یـەهودی ـ ئیسـرائیل بـوون کـە ناوەندەکـەی قـودس بێـت. ڕێگاکەشـی بەکاریگـەربوونیان لـە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دا تێپەڕ دەبوو. ئامرازی گونجاوی ئەوەش جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی بوو. هەرچەندە لەگەڵ کودەتاکەی کانونی دووەمـی ١٩١٣ لـە بـواری ئایـدیۆلۆژی جەمعیەتی ئیتحادو تەرەقی بڕیاری فەرمی لە سەر تـورکچێتی داوە، بـەڵام لـە ناوەڕۆکدا بونیـادێکی سیاسـی و ئایـدیۆلۆژی ئـاڵۆز بـوو. تـورکێتی ئیتیحادگـەراکان لـەجیاتی پشتبەستن بە دیاردەیەکی سۆسیۆلۆژی، گوزارشت لە بونیادێکی شپرزە و ئاڵۆز دەکات لە تورکەکان زیاتر لە فاکتەرە خڵتەییەکانی هەرجۆرە میللەتێک پێکهاتووە. لەو قۆناغەدا کە بەڕێوەبەرانی دامەزراوە بیروکراتیەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە سوپا، حیسـابەکانی گەڕان بە دوای ئایندەیەکی خۆیـان دەرکەوتبوویـە پـێش، پێکهاتـەی ئامـاژە پێکراو هـیچ بناغەیـەکی چینایـەتی یـاخود ئـەتنیکی نـەبوو. لـەو لایەنـەوە تـورکچێتی لـە سـەرەتا دروستکراو و خڵتـە بـوو. لەگـەڵ دەستبەسـەر داگرتنـی دەسـەڵات خوازیـاری ئامـادەکردنی بناغەیەکی کۆمەڵایەتی خـۆی بـوو. هەوڵیانـدا چینێکـی بـۆرژوا لـە بیروکراسـی پێکبێـنن. دەسەڵاتەکانی کۆماریش ئەو بەرنامەیان بەرەو پێشتر بـرد و تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان هـەوڵی بـەردەوامکردنیان داوە. هەرچەنـدە لەمیانـەی تێپـەڕبوونی کـات بەشـێوەی ناوەندگـەرا و لامەرکەزیەکانیش دابەشبن، بەڵام پرەنسیپە ئایدیۆلۆژیەکەیان هەر وەک خۆی مایەوە.

ئەو بۆرژوازییەی زادەی ئەو نوخبە و هێزە ئایدیۆلۆژی و دەسەڵاتگەرایەی لـە کـاتی دەرکەوتنی هیچ بنەمایەکی چینایەتی و کۆمەڵایەتی نەبوو، تەنیا لەمیانەی سەرمایەداری دەوڵەتـەوە پێکدەهات. سـەرمایەداری دەوڵـەت لـە خولقکـاری بێبەشـە و دواکـەوتووترین شێوەی سەرمایەدارییە. یان لەلایەن دەرەوە خۆراکی پێدەدرێت و پەرەدەسەنێت، یاخود لە ناوەوە لەمیانەی تیرۆرێکی بێئامانی سەر کۆمەڵگا زێدە ـ بەها بەدەست دێنێت و دروست دەبێت. پێویستی پشتگیری دەرەوە بەردەوام زەمینەیەکی لەباری بۆ دژەکردنـی سـەرمایەی یەهودی خولقاندووە. کەچی لە ڕاستیدا هەر لە سەردەمی سەلجۆقیەکانەوە، بەتایبەتیش دوای ساڵانی ١٥٥٠کان لە سەردەمی هەڵکشانی هەژموونگەرایی سەرمایەداریدا یەهودیەکان

زۆر بە کاریگەر بوون. دوای بەدەرنانیان لە ئیسپانیا (١٤٩٢) باڵێکیان لە هۆڵەندا ـ ئەمستردام، دووەمین باڵی گرنگیشیان لە ناوەندی ئەزمیر ـ سەلانیک ـ ئەستەنبوڵ جێگیر بوون. بەشێوەیەکی باو بەردەوام سەرمایەی یەهودی لە ئەنادۆڵ هەبووە. ڕێکخراوترین توێژی سەرمایە لە ناوەوە و دەرەوە یەهودیەکان بوون. حیسابی ئەو سەرمایە بۆ بەدەستهێنانی وڵاتی یەهودیەکان سەرەتا لەسەر ڕووسیا، هۆڵەندا و دوورگەی بریتانیا قاڵبوویەوە. ئەڵمانیا ئەو وڵاتە بوو کە زۆرترین حیسابی لەسەر کرابوو. یەهودیەکان ڕۆڵێکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابووری کاریگەریان لە نەشونمای بۆرژوازیدا هەبوو. پێشەنگایەتی نموونەییترین ئەڵمانیایان کرد. بە هەڵوێستی خزمەتکار لە پاشا پاشاترە ڕۆڵێکی داهێنەریان لە میللیگەرایی ئەڵماندا بینی و بەدەستی دەوڵەتیش سەرمایەدارییەکەیان ئاواکرد. هەژموونگەرایی ئەڵمانیایان بەرامبەر بە هەژموونگەرایی ڕووسیا، فەڕەنسا و بریتانیا دەرخستە پێش. زایۆنیزم زیاتر مەیلی بۆرژوازییە یەهودیەکانی ئەڵمانیا ـ نەمسا بوو. یەهودیەکانی ڕووسیا و بریتانیاش کارابوون. بەڵام تا ساڵی ١٩١٨، واتە تا کاتی ڕووخانی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی بۆرژوازی یەهودی ئەڵمانیا بەردەوام لە پێش بوو.

لە ئاکامی لێکدانەوەکانی هاوسەنگی کە لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لەلایەن عەبدولحەمیدی دووەمەوە پەیڕەوکرا پەیوەستبوون بە سەرمایەی دەوڵەتی ئەڵمانیا دەرکەوتەپێش. سەرمایەی ئەڵمانی کە لە ئیتیحاد و تەرەقیدا بەهێز بوو، لە ناوەڕۆکدا کاریگەری سەرمایەی یەهودی بوو. کاتێک کاریگەری ماسۆنیەکان و سەرمایەی خۆجێیی یەهودیشی هاتەسەر، بەر لە زایۆنیزمی ئیسرائیل میللیگەرایی یەهودی بە شێوەیەکی بەهێز زایۆنیزمی ئەنادۆل ـ تورکیای جێگیر کرد. لە ڕاگەیاندنی مەشروتیەت، کودەتای ١٩١٣، پرۆسەی رزگاری نیشتیمانی ١٩١٩ ــ ١٩٢٢ و ئاواکردنی کۆماردا خاوەن ڕۆڵی سەرەکی بوون. هەر لەبەر ئەو هۆکارەش بوو ئایدیۆلۆژیای تورکچێتی ڕۆڵی دەمامکێکی نموونەیی بینی و خۆیانیان لەژێردا شاردەوە، بەمجۆرەش بەکاریان هێنا. شیکاری ئەبستراکتی (دەرهەستی) ڕووکەشانە سەبارەت بە نەشونماکردنی سەرمایەداری تورکیا لە ڕۆڵێکی ڕۆشنکەرەوە زیاتر، پەرەسەندنی بەرجەستە لە ڕوونکردنەوەیەکی وەک خۆی دوور دەخاتەوە و ڕۆڵێکی کوێرکەرانە دەبینێت، ماناکەی چەواشە دەکات. بە بەراورد لەگەڵ سەرمایەداری ئەڵمانی هێزێکی کاریگەر، حوکمڕان و خەستتری ئامێر و ئامرازەکانی دەسەڵات، کلتووری و ئایدیۆلۆژی سەرمایەی یەهودی لە سەرمایەداری تورکیا جێگای باسە، بە تایبەتیش لە پەیوەندی دەرەوە، بونیادی سوپا، دامەزراوە کلتووری و ئایدیۆلۆژیەکانیدا جێگای باسە. بۆرژوازیەکی تورک لە ئارادا نییە. تورکێتی ڕاستەقینە تورکمانەکان و لادێییە عەوامەکانن. سەرمایە و بۆرژوازی یەهودی بە جۆرێک ڕۆڵی

بۆرژوازی تورک دەبینن کە نموونەکەی لە فیلمەکانی"یەشیل چام"[10]یشدا نابینرێت. کاتێک تەماشای چیرۆکی وەهبی کۆچ[11] و هۆلدینگەکەی بکرێت کە یەکەمین بۆرژوازی کۆمارە واتە سەربوردەی تەواوی بۆرژوازی تورکیا خوێندراوەتەوە. نالێم بۆرژوازی تورک پێکنەهاتووە (نەشونمای نەکردووە) و نەبووە؛ بەڵکو دەڵێین پێویستە بەشێوەیەکی بەرجەستە تەماشا بکرێت و شیکار بکرێت کە چۆن پێکهێنراوە.

هیچ کەسێک گومانی لە هێزی سەرمایەی یەهودی نییە کە لە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرەکیترین هێزی بونیادنەرە. هەروەها گومان لە هێزە کلتووری و رۆشنبیریەکەشی ناکرێت. لە هەمان کاتدا گومان لە رۆڵی پێشەنگایەتی رەنجدەر و رۆشنبیرە یەهودیەکان بۆ بزووتنەوە ئایدیۆلۆژی و کرداریەکانی چەوساوەکانیش ناکرێت. لێرەدا ئامانجمان هاندانی هەست و سۆزی ئانتی ـ سامی نییە، بەڵکو راست دەستنیشانکردنی پێگەی کۆمەڵایەتی ـ مێژوویی سەرمایەداری و بزووتنەوە رکابەرەکانێتی.

دوای دۆڕاندن و تێکشکانی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی لە ساڵی ١٩١٨ ئەو سەرمایەی یەهودی دەرکەوتە پێش کە لە ئینگلتەرا و هۆڵەندا بە ناوەندی ببوو. بە مانایەکی تر لە شەڕ و رکابەرێتی هێزی هەژموونگەرایی هەردوو لایەن کە لە سەدەی شازدەهەمەوە لەناو کێبڕکێیەکی نەتەوەییدا بوون (سەرەتا ئیمپراتۆریەتی ئیسپانیا، دواتر ئیمپراتۆریەتی فەڕەنسا، دواترینیشیان ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی، رووس و عوسمانی) لە کۆتاییدا ئینگلتەرا سەرکەوتوو بوو. رۆڵی سەرمایەی یەهودی لەو سەرکەوتنەدا زۆر گرنگە: هەروەکو چۆن پێشتر هەمان رۆڵی لە ئاواکردنی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کۆلۆنی ئینگلتەرادا بینی و بوو بە هێزێکی هەژموونگەرایی. پێویستە لەو راستیە بەدوای هۆکاری دەرکەوتنی هیتلەر و نازیەکاندا بگەڕێین. سەرمایەی یەهودی کە پۆشاکی ئەڵمانی پۆشی و رۆڵێکی ستراتیژی لە ئاواکردنی سەرمایەداریەکی شۆڤینی و قۆرخکاری دەوڵەتدا بینی، بە بەرپرسیاری شکستەکەی ساڵی ١٩١٨ی ئەڵمانیا لە قەڵەمدرا. پارتەکەی هیتلەریش لە وردە بۆرژوا بیرتەسک و بێئاسۆکان پێکهاتبوو. ئەو ئایدیۆلۆژیا شۆڤینیەی گەورەیان کرد نەفرەتێکی گەورەی بەرامبەر یەهودییە پۆشاک (دەمامک) ئەڵمانەکان لە ناخیاندا دروست کرد. ئەو رق و نەفرەتەش بە ژینۆساید ئەنجامگیر بوو. چونکە یەهودیەکانیان بە بەرپرسیاری هەژموونگەرایی ئینگلتەرا و ئاواکردنی یەکێتی سۆڤێت دادەنا. هەروەها

---

[10] یان هۆلیوودی تورکیا، شوێنگەیەکی گەورەی سینەماییە لە ناوەڕاستی هەشتاکان دروستکرا، کە ساڵانە نزیکەی سێ سەد فیلمی تێدا بەرهەم دەهێنرا. سەرەڕای نزمی ئاستی هونەری فیلمەکانی، بەڵام بەرهەمهێنانی ئەو رێژە زۆرەی فیلم تورکیای گەیاندە ئاستی پێنجەمین گەورەترین بەرهەمهێنی فیلمی سینەمایی لە جیهاندا. بەڵام ئەو بووژانەوەیە زۆری نەخایاند، بەهۆی بڵاوبوونەوەی تەلەفیزۆن و ڤیدیۆ و ئامێرەکانی دیکەی بینینەوە کە جێگەی سینەمای لەق کرد و بەهۆی قەیرانی ئابووری و کەشوهەوای عەسکەرتاری و شۆڤێنیستانەی کودەتای ١٩٨٠ فیلمە سینەماییەکانی یەشیل چام بکەوێتە خزمەتی سیاسەتی دەوڵەت و توێژی عەسکەرتاری باڵادەستی تورکیا. (وەرگێڕ)

[11] وەهبی کۆچ (گووچ) (١٩٠١ - ١٩٩٦): سەرداری بنەماڵەی گەورە کارساز کۆچ (گووچ)ە، بەناوبانگترین دەوڵەمەندەکانی تورکیایە. نەوەکانی خاوەنی گەورەترین و بەرچاوترین کۆمپانیان لە تورکیا. لەتەمەنی منداڵییەوە خەریکی بازگانی بوو، لەساڵی ١٩٦٣دا کۆمەڵەی کۆمپانیاکانی "کۆچ"ی دامەزراند. (وەرگێڕ)

چەندین سۆسیالیستی بە ڕەچەڵەک یەهودی وەک ڕۆزا لۆکسمبۆرگ لە شەڕەکەی ناوەوە ڕۆڵی پێشەنگایەتییان بینیبوو. کارل مارکسیش بەرەچەڵەک یەهودی بوو. کاتێک تەواوی ئەو فاکتەرانە بهێنرێتە لای یەکترەوە، ئەوا راستینەی سەرمایەداری و ژینۆساید باشتر روون دەبێتەوە.

راستیەکی دیکەی گرنگی پێویستە لەو خاڵانە زیاد بکرێت جیاوازی نێوان میللیگەرایی یەهودی (زایۆنیزم) و گەردوونگەرایی یەهودییە. هەرچەندە ئیسرائیل و میللیگەرایی یەهودی لە پێگەیەکی بەهێز دابن، بەڵام یەهودییە گەردوونیگەراکان (جیهانیەکان) هەم لە ئاست سەرمایەی نێودەوڵەتی هەمیش لە کامپی ڕەنجدەراندا بەردەوام کاریگەرییان هەبووە. لە کاتێکدا ئیسرائیل ناوەندی سەرنجی یەهودییە میللیگەراکانە، سەرنجی یەهودییە نێودەوڵەتیەکان (لە ڕێگای کۆمپانیا جیهانگیرییەکانەوە) لەسەر پاوانەکانی دەسەلات و ئابووری دەوڵەت ـ نەتەوە خۆجێییەکانە؛ لەوێدا سەبارەت بە پێگەگرتنی بەهێزی خۆیانە، دەرهەق بە ڕۆڵە بەهێزەکەیانە لەناو کۆمپانیا نێونەتەوەییەکان، میدیا و چالاکییە کلتوورییەکان.

هەر کلتوور و ئایدیۆلۆژیایەکی میللیگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە کەم تا زۆر نەک هەر تەنیا ڕەنگەکەی بەڵکو گرێدراوی ناوەڕۆکی ئەو سەرمایەشە. سەرمایەی یەهودی گەردوونی وەک چۆن دەستی لە قۆرخکاری ئابووریدا هەیە دەستی لە هەر قۆرخکاریەکی دەوڵەت ـ نەتەوەشدا هەیە: هەروەک ئەو ڕۆڵە گەردوونیەی یەهودییە سۆسیالیستەکان لە بزووتنەوەکانی ئازادی و یەکسانی ڕەنجدەراندا بینیویانە.

لەبەر هەندێک هۆکاری ستراتیژی (ئاواکردنی ئیسرائیلێک لە فەلەستین) خاکی ئەنادۆل ڕۆڵێکی مێژوویی بۆ یەهودیەکان هەیە. لە سەردەمی بابلی، ئاشووری، عەرەب، ڕۆما و بیزەنتیەکانەوە ئەو ڕۆڵە ستراتیژیە هەر بەردەوام بووە. هەروەک چۆن ڕێگای دەرکەوتنە لە قودس (تا ڕادەیەک میزۆبۆتامیاش)، ڕێگای هاتنە ژوورەوەش بە ئەنادۆڵدا تێپەڕ دەبێت. لەو سۆنگەیەوە؛ لە ڕوانگەی زایۆنیەکانەوە ئەنادۆل گرنگترین بەردەبازی ئیسرائیل و وێستگەی ستراتیژییە. هەر بۆیەش بۆ ماوەیەکی درێژ هێڵی ئەزمیر ـ مانیسا، سەلانیک ـ ئەدرنە لەلایەن گروپێکی یەهودیەوە وەک وڵاتی دایک ناونوێ کرا. هەربۆیەش گەشەیان بەو ناوچانەدا.

لەو چوارچێوەیەدا کودەتاکەی ١٩١٣/١/١ی ئەنوەر پاشا[١٢] گرنگە کە مۆدێلی ئەڵمانی بۆ خۆی بە نموونە دانابوو (پێشتر لە پێناو ڕاگەیاندنی مەشروعیەت هەڵمەتێکی

---

[١٢] ئیسماعیل ئەنوەر پاشا (١٨٨١ ـ ١٩٢٢): فەرماندەیەکی سەربازی خوێنڕێژ و یەکێک لە سەرکردەکانی بزووتنەوەی جۆن تورک بوو، پەیوەندی بە جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقیەوە کرد. بەشداری لە یاخیبوونی دژ بە سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم کرد. لەیەکەم جەنگی جیهانیدا وەک فەرماندەیەکی عوسمانی لەدژی ڕووسەکان لەشەڕ دابوو. پاشان لە ئێراقدا ڕووبەڕووی شاڵاوەکانی بریتانیا بووەوە و شکستی هێنا و پاشەکشەی کرد و ئینگلیز بەغدادی داگیرکرد. لە بوخارا کوژرا. بەیەکێک لەو فەرماندانەی عوسمانی دەژمێردرێت کە پیلانڕێژی بۆ کۆمەڵکوژییەکانی ئەرمەنی و ئاشوورییەکان کردووە. (وەرگێڕ)

هاوشێوەی هەیە). لەو قۆناغەدا کادیرە یەهودیەکان لە ئەڵمانیا لە بەهێزترین دۆخ و پێگەی خۆیاندا بوون. ئەوانەی ئەنوەر پاشا و گرووپەکەشیان پەروەردە کرد ئەمجۆرە کادیرانەی وەک لیمان ڤۆن ساندرس[13] و گۆلتز پاشا[14] (جولمار ڤاندەر گۆلتز) بوون. رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئەڵمانی و عوسمانی پێشەنگایەتی خستە دەست کادیرە یەهودیەکانی لایەنگری ئینگلتەرا. کێبرکێ گەورەکەی رێبەرایەتی لە شەڕی رزگاریدا پەیوەندی بەو دەستکۆرکێیەی پێشەنگایەتیەوە هەیە. هەر چەندە راستە کە مستەفا کەمال پاشا بە لامپی سەوزی ئینگلتەرا چۆتە سامسۆن، بەڵام رۆڵی لە سەرهەڵدانەکەی ئەنادۆل لەسەر بنەمای سەربەخۆخوازی و نیشتیمانپەروەریەوە بووە. لەگەڵ تێگەیشتنی ئەو دۆخە ئینگلتەرا دوو تەدبیری پێشخست: لە دەرەوە پشتگیری لە داگیرکاری یۆنان بکات و یاخیبونەکە سەرکوت بکات؛ ئەگەر دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسێت، لە رێگای عیسمەت ئینۆنۆ و فەوزی چەکماک مستەفا کەمال بخرێتە ژێر کۆنترۆڵەوە. لەگەڵ تێکشکانی یۆنانیەکان (بۆرژوازی بەکرێگیراوی یۆنانی بە شێوەیەکی باو لایەنگری ئینگلیز ـ ئەمریکایە) گشت هەوڵەکان لە بەهێزکردنی هەردوو پاشا عیسمەت و فەوزیدا چڕ کرانەوە. وەک چۆن عیسمەت ئینۆنۆ و فەوزی چەکماک هیچ رۆڵێکیان لە بڕیار و سەرەتای یاخیبوونەکەدا نەبوو، هەردووکیان لە پاشماوەی ئەو سوپایەی لەژێر کۆنترۆلی ئینگلتەرا دابوو لەسەر ئەرک بوون. لەبەر ئەوەی هیچ تەگبیرێکیان بەرامبەر ئینگلیزەکان وەرنەگرت دواتر تەقلی بزووتنەوەکە بوون، راستتر بڵێین؛ نێردران. بەمجۆرە لەژێر بیانووی جیاوازەوە چوار پاشا لەو پێنج پاشایەی پێشەنگایەتی یاخیبوونیان کرد کوژران (کازم قەرەبەکر، عەلی فوئاد جەبەسوی[15]، رەئوف ئوربای[16] و رەفعەت بیلا[17]). مستەفا کەمالیش

---

[13] ئوتو لیمان ڤۆن ساندرس (١٨٥٥ ـ ١٩٢٩ Otto Liman von Sanders): فەرماندەیەکی ئەڵمانی بوو لە مەملەکەتی برووسیا و لە هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی و عوسمانی. سوپای تورکی رێکخستەوە و لەیەکەم جەنگی جیهانیدا لەدژی شاڵاوەکانی هێزە هاوپەیمانەکان بۆ سەر گالیبولی فەرمانداریێتی کرد. لە ساڵی ١٩١٨دا بووە فەرماندەی باڵای هێزەکانی تورک لە فەلەستین و لەبەرامبەر بە فەرماندە ئەلێرەنسدا شکستی هێنا. (وەرگێڕ)

[14] ویلهایم ڤۆن گۆڵتز (١٨٤٣ ـ ١٩١٦ Wilhelm von der Goltz):یان گۆڵتز پاشا. نووسەر و یەکێک لە فەرماندە گەورەکانی برووسیا بوو و لە هەردوو سوپای ئەڵمانی و عوسمانی چالاک بوو. رۆڵی لەنوێکردنەوەی سیستەمی سوپای عوسمانی هەبوو؛ زەمینەسازی بۆ پێگەیاندنی ئەفسەرانی گەنج کرد، تاکو بتوانن هاوشانی تەکنۆلۆژیا پێبگەن و بۆ خزمەتی تۆکمەکردنی سوپای بەکاربیهێنن. هەروەها پشتیوانی لە دانانی هێڵی ئاسنین (شەمەندەفەر)ی بەغدادی کرد، بۆ ئەوەی باڵادەستیی عوسمانی و ئەڵمانی لە خۆرهەڵات مسۆگەر ببێت. (وەرگێڕ)

[15] عەلی فوئاد جەبەسۆی (١٨٨٢ ـ ١٩٦٨): سیاسەتمەدار و ئەفسەرێکی پێشووی سوپای عوسمانی و شەشەمین سەرۆکی پەرلەمانی تورکیا بوو. ئەو بە کرداری دەستی بە شەڕی سەربەخۆیی کرد و ئەرکی گرنگی لەئەستۆ گرت. گرنگترینیشیان واژۆکردنی پەیماننامەی مۆسکۆ بوو، کە تێیدا سنووری باکووری خۆرهەڵاتی تورکیا دەستنیشان کرا. هەروەها یەکێکە لە دامەزرێنەرانی "پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری". بە تۆمەتی کوشتنی مستەفا کەمال لە ئەزمیر سزا درا. بووە وەزیری ئیشغالی گشتی. پاشان لە پارتی دیموکراتدا بەردەوامی بە کاری سیاسی دا. لەپەرتووکەکانی: یادداشتەکانی مۆسکۆ، هاوڕێی ئەتاتورک لەکاتی خوێندندا، یادداشتە سیاسییەکان. (وەرگێڕ)

[16] حوسێن رەئوف ئۆربای (١٨٨١ ـ ١٩٦٤): دەریاوان و سیاسەتمەدار و یەکەم سەرۆکوەزیرانی کۆماری تورکیا بوو. بەشداری لە شەڕەکای هێزەکانی عوسمانی لە هەرێمی تەرابلوسی لیبیا و شەڕی بەڵکان کردووە. هەوڵیدا لەمیانەی نوێکردنەوەی سەڵتەنەت و پاراستنی خەلافەتدا چاکسازی نیشتمانی بکات. وەک ناڕەزاییەک لەبەرامبەر پرۆسەکانی

بەهۆی ڕۆڵە ستراتیژیەکەی و سیاسەتی هاوسەنگیەوە توانی پێگەی خۆی بپارێزێت. ئەو ڕژێمەی لە میانەی زنجیرە پیلانەکانی ١٩٢٥ کە بە پیلانگێڕیەکەی دژ بە شێخ سەعید دەستی پێکرد بەشێوەی بەرنامەیەکی سیاسی جێبەجێکراو، دەتوانین بە فاشیزمی تورکی سپی ناوی ببەین، هەر چەندە خۆی وەک سیستەمێکی تورکچێتی عەلمانیش پێناسە بکات، لە ناوەڕۆکدا ئایینێکی نوێی میتافیزیک، دۆگماتیک و تیرۆریستە؛ ئەو ئایینە نوێیەیە کە ئایدیۆلۆژیای یەهودی خاوەن ئەزموونی مێژوویی بۆ کۆماری تورکیای هەڵبژاردووە. بە خوداوەندکردنی مستەفا کەمال، بە پێغەمبەرکردنی ئینۆنۆ و بە فەرماندەکردنی فەوزی چەکماک (وەک نموونەی یەشوع و داود) پێویستیەکی ئایدیۆلۆژیای یەهودییە. تورکچێتی ئایدیۆلۆژیای ئایینی نوێ کە بەبێ داخوازی زۆربەی زۆری کۆمەڵگای تورک ڕاگەیەنرا و کرا بە بەرنامەی سیاسی، کۆدی بۆهێڵی تیرۆر، ژینۆساید و چەوسانەوە پێکدێنێت کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە.

لە ڕێگای هەوڵە تیرۆرکاریەکەی ئەزمیر هەوڵی ترساندنی مستەفا کەمال درا. لە میانەی یاخیبوون و سەرهەڵدانەکانی کوردانیشەوە دنەدان و هاندان (پرۆڤەکە) ئەنجامدرا. هەر بۆیەش هاوڕێ نزیکەکەی خۆی، واتە فەتحی ئۆقیار[18] (لایەنگری سەرکوتی خوێناوی سەرهەڵدانی کوردان نەبوو)ی لە ئەرکی سەرۆک وەزیرانی بەلاوە نرا و عیسمەت ئینۆنۆ پاشا لە جێگای دانرا. سوپاش بە تەواوی خرایە ژێر کۆنترۆڵی فەوزی چەکماک پاشاوە. ئیتر لەژێر ناوی سەرۆک کۆماری ڕەمزیەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان مستەفا کەمال لە کۆشکی چانقایا دەستبەسەرە. دەڵێن لە شەڕی ڕزگاری نیشتمانیدا ئینگلتەراش تێکشکێنراوە. ئەوە درۆیەکی شاخدارە. لە ساڵی ١٩٢٢وە ئەگەری ڕۆڵێکی ئینگلتەرا لە شەڕی ڕزگاری نیشتمانی یەکلا بۆتەوە. لەمێژە دەستبەرداری پشتگیریکردنی یۆنانیەکان بووە، لە ڕێگای کادیرە تایبەتەکانی خۆیەوە هەنگاوی بۆ ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە هاویشتووە، لەجیاتی ئیمپراتۆریەتێکی زل و زەبەلاح بە کۆماری تورکیای گیرخواردووی ئەنادۆڵ بە ئامانجی خۆی گەیشتووە. بەڵگەیەکی دیکەی ئەو دۆخە، بەردەوام کۆمار وەک لەمپەر و دیوارێک بە ڕووی ڕووسیای سۆڤێتی بەکار دەهێنرێت. لەو پێناوەشدا

---

کۆچپێکردنی زۆرەملێیانەی خەڵکی گوند و شارەکانی چەرکەسییەکان بۆ ناوچە بیابانییەکان و ڕاوەدوونانی کەسایەتییە چەرکەسییەکان لە ساڵی ١٩٢٢دا دەستی لە کاری سەرۆکوەزیرانی کێشایەوە. (وەرگێڕ)

[17] ئیبراهیم ڕەئفەت باڵا (١٨٨١ ـ ١٩٦٣): یەکێکە لەو پێنج ئەفسەرە دەستپێکانەی بەشدارییان لە شەڕی ڕزگاری نیشتمانی کرد. بەهۆی جیاوازی فیکری لەگەڵ ئەتاتورک بەشداری لە دامەزراندنی یەکەم پارتی ڕکابەر(ئۆپۆزسیۆن) لە تورکیا" پارتی پێشکەوتنخوازی کۆماری" کرد. یەکێکیشە لەوانەی بە تۆمەتی کوشتنی ئەتاتورک لە ئەزمیر دادگایی کرا و دادگا بڕیاری بێتاوانی ئەوی دا. (وەرگێڕ)

[18] عەلی فەتحی ئۆکیار (١٨٨٠- ١٩٤٣):سیاسەتمەدار و دیبلۆمات بوو. لەکۆتایی تەمەنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا ئەفسەر بوو لە سوپادا. دووەم سەرۆکوەزیران و دووەم وتەبێژی پەرلەمانی تورکیا لەدوای ئەتاتورک بوو. لەساڵی ١٩١١دا بەشداری لە ڕووبەڕووبوونەوەی داگیرکاریی ئیتاڵیا بۆ لیبیا کرد. پاشان کرایە سەفیری تورکیا لە بولگاریا، دواتر بووە ئەمینداری گشتی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی. بەفەرمانی ئەتاتورک پارتی لیبراڵی کۆماریی ڕکابەری دامەزراند. (وەرگێڕ)

کۆمەڵکوژی سۆسیالیستەکان کە بە تیرۆرکردنی مستەفا سوبحی و هەڤاڵانی دەستپێکرد تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بووە. ژینۆسایدی ئەرمەنیەکانیش تەنیا دەستپێک بوو. ژینۆسایدی کلتووری سەر کوردانیش تا ئێستا بەردەوامە. کەمایەتیەکانی دیکە، کوردان، سریانی و تورکمانەکانیش لە ئاکامی ئەو کارەسات و کۆمەڵکوژییە بچووک و ئاڵۆزانەی تورکچێتی پەیڕەوی کردن دەستبەرداربوونی ناوەڕۆک و خودی خۆیان بەسەردا سەپێنرا.

پرسیاری تەواوی ئەمانە چ پەیوەندییەکیان بە یەهودی میللیگەرایی و گەردوونی و سەرمایەی یەهودیەوە هەیە؟ پرسیارێکی پووچ نییە، پرسیاری هەرە هەستیار و سەرەکی تێگەیشتنی مێژووی ئەو دوو سەدەیەی دوایی تورکێتیە. مێژووی تورکێتیەک کە تورکی تێدا نییە و بونیادنانێکی ئایدیۆلۆژییە؛ لە بواری تیۆری و کردارییەوە ئامادەکاریەکی ئیسرائیلی بەرایی بەر لە دەوڵەتی ئیسرائیلە. ئەگەر سیاسەتە هاوسەنگی پارێزەکانی مستەفا کەمال (لەدەرەوە لەنێوان یەکێتی سۆڤییەت و ئینگلتەرا، لەناوەوەش لەنێوان چین و توێژە جیاوازەکاندا) نەبووایە هیچ کەسێک نەیدەتوانی پێکهاتە نوێیەکانی ئەنادۆڵ لەژێر کۆنترۆڵی کادیرانی ئیتیحاد و تەرەقی و ئەنوەر پاشا دەربهێنێت، ڕێگیری لە تورکچێتی بکات کە لە هەڵکشانێکی شۆڤینی و فاشیستیانەی خراپتر لە فاشیزمی ئەڵمانی بوو. ئەمەش مانای رووخانی کۆمار بوو (ئایا کۆمار دادەمەزرا؟ پرسیارێکی دیکەیە) بەر لە جەنگی دووەمی جیهانی. مردنی مستەفا کەمال بە ماوەیەکی کەم بەر لە دووەمین جەنگی جیهانی، کێبڕکێی نێوان ساڵانی ١٩٣٨ ـ ١٩٤٥ی ئینگلتەرا و ئەڵمانیا لەسەر ئەنادۆڵ ـ تورکیا، مسۆگەربوونی هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دوای ١٩٤٥، بە فەرمیکردنی بژاری تورکیا بۆ سیستەم لەمیانەی بە ئەندامبوونی ناتۆ؛ بەردەوامی ١٩٢٢ بوو. پارتی گەلی کۆماری( CHP) کە پارتی کۆمارە، بریتی بوو لە گەرەنتی (سیگۆرتەی) سیستەم. ئەو سیستەمەی لە ڕێگای کودەتا و پیلانگێڕیەکانەوە تا سەرەتای ٢٠٠٠کان بەڕێوە چوو، ناوەکەی دیکەی "فاشیزمی تورکی سپی"یە. مەبەست لەوەدا تورکێتی دروستکراو و هۆمۆژەنکردنی کۆمەڵگایە بە گوێرەی ئەو تورکێتیەوە؛ مافی ژیان بە هیچ کەس و کلتوورێک نەدراوە کە لە دەرەوەی ئەو پێناسەیە دەمێننەوە.

توێژی بەناو ئەنادۆڵی سەرمایەداری تورکیا کە گرێدراو بە تیۆری"پشتێنەی سەوز"ی هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سپییەوە بۆ سەوز گۆڕا و ڕووپۆشی ئیسلامی لەخۆی پێچابوو، هەر لە سەرەتاوە هەوڵی دەرچوون و پێهەڵگرتنی دەدا. بزووتنەوەی چەپی تورکیا و جووڵانەوەی ئازادیخوازی کوردستان ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساند. هیلاکبوونی فاشیزمی تورکی سپی لەو شەڕەی بەرامبەر بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان و چەپڕەوەکان بەڕێوەی برد و لە ئاکامدا گۆشەگیربوونی، باڵی ئەنادۆڵی بەهێز کرد. بزووتنەوە میللیگەرا ئیسلامیەکانی ئەمریکا بەرامبەر بە گەلانی ناوچەکە و پەلهاوێشتنی رووسیای سۆڤێتی خستنیەگەڕ لە تورکیا سەرەتا لە ڕێگای هاوپەیمانی لە ساڵانی ٢٠٠٠کان بەدواوەش بە تەنیا لە دەسەڵات جێگیر بوو. میللیگەرای زایۆنیزمی یەهودی لە فاشیزمی تورکی سپیدا چەندە بەکاریگەرە، سەرمایەی یەهودی

گەردوونیش بەو ڕادەیە لە فاشیزمی تورکی سەوزدا بەکاریگەرە. ئەو پارتەی هەرە دوایی وەک پارتی گەرەنتی بڕیاریان لەسەر داوە؛ پارتی داد و گەشەپێدان (AKP)یە. میللیگەرای زایۆنیزمی یەهودی چەندە لە دەرکەوتنی بیروکراسی بۆرژوازی تورکیا بەکاریگەرە، سەرمایەی یەهودی گەردوونیش(الکرمشاکی) بەو ڕادەیە لە پەرەسەندنی بۆرژوازی ئەنادۆڵ (بە سەرمایەی تایبەت و لیبراڵیش ناو دەبرێت) و جێگیربوونی لە دەسەڵاتدا خاوەن ڕۆڵ و کاریگەرییە. ئەنوەر پاشا، نیهاڵ ئاتسز، ئەلپ ئەرسەلان تورکێش و MHP (پارتی بزووتنەوەی میللیگەرایی، بنەچەی دامەزراندنی خۆی بۆ پارتی میللەتی فەوزی چەکماک دەگەڕێنێتەوە) خوازیاربوون نوێنەرایەتی فاشیزمێکی چەشنی هیتلەر بکەن. دۆڕاندنی ئەڵمانیا چانسی دەسەڵاتی ئەو باڵەی کەمکردەوە کە دەتوانین بە فاشیزمی تورکی ڕەشیش ناوی ببەین. ئەو هەرسێ باڵەی فاشیزمیش پاشکۆ و بەردەوامی هێزە هەژموونگەرا دەرەکیەکانن، کامە هێز بەسەر سیستەمدا زاڵ بێت پاشکۆکەی دەسەڵاتی ناوخۆ(لە تورکیا) دەگرێتە دەست.

مێژووی ئەو دوو سەدەیەی دوایی تورکیا لە هێزە هەژموونگەرا دەرەکیەکان سەربەخۆ نییە؛ دەوڵەت ـ نەتەوەی کۆماری تورکیا ستاتۆی"ویلایەتی تایبەت"ی هەیە کە لە میانەی پەیوەستبوونێکی توند و تۆڵەوە ئاواکراوە. پێگەی تورکیا لە پشتێنەیەکی هەستیاردا، ڕەنگدانەوەیەکی تایبەتی هاوسەنگی هەژموونگەرایی نێودەوڵەتی دەکات بە پێویستیەک. وێڕای بانگەشە تیژەکانی سەربەخۆیی، بەڵام وابەستەترین وڵات، نەتەوە و دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە لەلایەن سیستەمی هەموونگەراییەوە لغاو کراوە. ئەگەر سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەشێوەیەکی ڕاست شیکار نەکرێت ئەوا تورکیاش ڕاست شیکار ناکرێت، پێچەوانەکەشی ڕاستە. چارەسەری گەردوونی سیستەم چارەسەری تورکیایە. بەمجۆرە دەشێت ڕاستی ژینۆسایدەکانیش بە شێوەیەکی ڕاست شیکار بکرێت.

ج ـ تەنیا گرێدراو بە ئاواکردن و کردارەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە جوگرافیای ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا دەتوانین تیرۆری سەر گەلە کرستیانەکان، ئەزموونەکانی ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدی سەر ئەرمەنی، سریانی، پۆنتۆس و کلتووورە جیاوازەکان شیکار بکەین. تەنیا بەستنەوەی ژینۆسایدی ئەرمەنی بە فاشیزمی تورکی سپیەوە (جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی و CHP: بزووتنەوەی بەرنامە سیاسیەکەی و ئایدیۆلۆژیا فەرمیەکەین) هەڵوێستێکی تەسک و کورتهێنە. مێژوویەکی زۆر دوور و فاکتەری کۆمەڵایەتی ئاڵۆز لەژێر ئەو ژینۆسایدەدا شاراوەیە. ئەگەر هێندەی سەرمایەی یەهودیش نەبێت چینی سەرووی قەبیلە ئەرمەنیەکانیش لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین شوێنێکی گرنگییان لە پێکهاتنی سەرمایەدا هەیە. هەر پێشوەخت هەڵبژاردنی شار وەک ناوەند لەلایەن ئەرمەنیەکان، هەروەها شارەزاییان لە کاری دەستی و خەسڵەتی باڵای بازرگانیکردن، هەر لە سەردەمی دەوڵەتی هیتیتەوە کردوونیەتی بە خاوەنی سەرمایە. بەتایبەتیش لە شارگەرایی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا نوێنەر و ئەکتەری سەرەکی بوون. لەگەڵ پەسەندکردنی ئاینی کرستیانی (۳۰۰زایینی) هەم ئەو ڕۆڵەیان جیاوازییەکی زۆری

بەسەردا هات، هەم بوونیشیان دەرکەوتە مەیدان. جۆرێک لە دایکبوونی پێشوەختی سەرمایەدارییان لە خۆرهەلاَتی ناوین فەراهەم کرد. کاتێک دەلێین پێشوەخت، باسی لەدایکبوونێکی سیستەماتیک دەکەین. ئەگەرنا کەلەکەکردنی سەرمایە لە سەردەمی سۆمەریەکانەوە لەلایەن فاکتەرە مارژینالەکانی هەر کلتوورێکەوە ئەنجام دەدرا. لە رێگای کرستیانیەوە بۆرژوازی ئەرمەنی بۆ یەکەمجار ئەو کەلەکەبوونەی بە دۆخێکی سیستەماتیک و کاریگەر گەیاند. پێگە بەهێزەکەیان لە بواری پیشە و بازرگانیدا ئەو دەرفەتەی بۆ رەخساندن. کەلەکەکردنی سەرمایە بەردەوام رێگا لە پێش رق و بەرپەرچدانەوەی کۆمەلگاکانی خێل و قەبیلە کۆمینالەکان دەکاتەوە. چونکە وێرانکاریەکی بەردەوام لەسەر کلتووره یەکسانیخوازەکەیان دەکات. پێکهاتەکانی شار، چین و دەولەت ئاوا دەکرێن و رێگا لەپێش ناکۆکی دامەزراوەیی دەکرێتەوە. پێویستە بەردەوام هەبوونی ناکۆکیەکی بەمجۆرە لە بناغەی ژینۆسایدی ئەرمەنیدا رەچاو بکەین.

سەدەی شازدەهەم کە سەرەتای سەردەمی هەلکشانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە، هەمان سەدەیە کە بۆرژوازی ئەرمەنیش هەلکشا. لە ئیمپراتۆریەتی ئێرانی و عوسمانیشدا رۆلی پێشەنگییان لە بازرگانی و پیشەسازی مانیفاکتۆرادا دەبینی. پشکێکی گرنگیان لە پاوانەکانی بازرگانیدا هەبوو کە لە شارەکانی بەندەر عەباس و ئەسفەهانی ئێران، لە رێگای ئەستەنبۆل و ئەزمیرەوە تا دەگاتە ئەورووپا ئاسیای خۆرهەلاَتی دوور لە جوگرافیایەکی فراواندا چالاکیەکانی بەرێوە دەبرد. لە چەندین شاری دیار و بەرچاودا گەرەکە پێشکەوتووەکانی ئەرمەنیەکان جێگای باس بوو. تا سەدەی نۆزدەهەم بۆرژوازی بچووک و گەورەی ئەرمەنی بەشێوەیەکی سەرەکی لە گۆرەپانی ئابووریدا بەهێز و کاریگەریان بوو. لە هونەری بیناسازیشدا رۆلێکی لە پێشیان هەبوو. مۆرکی خۆیان لە چەندین شاکاری بیناسازی خۆرهەلاَتی ناوین داوە. یەکەمین ئامانجی موژدە بەخشە کرستیانییە خۆرئاواییەکانی لە سەدەی نۆزدەهەم لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی چالاکیەکی چرو پریان دەست پێکرد قازانجکردنی ئەرمەنیەکان بوو. کلیساکانی رۆم و سریانیەکان تێرای خۆیانیان دەکرد. کلێسا ئەرمەنیەکان لە رەوشێکی هەستیاردا بوون. نیشتەجێبوونێکی زۆر بەربلاویان لەناو گەلە موسلمانەکان جێگای باس بوو. ئەو جوگرافیایانە زۆر سنووردار بوون کە تێیدا زۆرینە بن. یەکینە تێکەلەکانی نیشەجێبوون کە بە تایبەتی لە ئەنادۆل و میزۆبۆتامیا لەچوارچێوەی دابەشکردنی کاری نێوان شار و لادێ دەبینران تایبەتمەندێتی سەرەکی پێکهاتەی دیموگرافی بوو.

کاریگەری هاندەرانەی چالاکیەکانی پروپاگەندە و ئەو قوتابخانانەی میلیگەرایی سەدەی نۆزدەهەمی ئەورووپای خۆرئاوا لە رێگای مژدەبەخشەکان کردیانەوە لەسەر کۆمەلگای ئەرمەنی دەست لێبەرنەدراو بوو. لەوەش گرنگتر بۆرژوازی ئەرمەنی کە رێککەوتنی لەگەل یەکەمین هەلمەتی جیهانگیری سەرمایەی ئەورووپا کرد کەوتە ژێر کاریگەری بەهێزی ئەو میلیگەراییەی لە ئەورووپا دروست ببوو و ئامانجی ئاواکردنی دەولەت – نەتەوە بوو. کەوتە خەمی بازارێکی نەتەوەیی کە بەدلنیایی سەرمایەی خۆی

تێدا بەکار بێنێت. هەروەک گەڕانی سەرمایەی یەهودی بە دوای وڵاتدا، داواکاری وڵاتی ئەرمەنیەکانیش بەشێوەیەکی بەهێز کەوتە ڕۆژەڤەوە. کۆمەڵگای ئەرمەنی گەلێکی دێرینی جێنشین بوو، بەڵام لە دۆخی زۆرینە و هۆموٚژەنی بێبەش بوو. لەو سۆنگەیەوە؛ هەوڵەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە ئامانجێک بوو کە گۆڕانکاری مەترسیداری لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

یەکەمین ڕێکخستنە ئەرمەنییە میللیگەراییەکانی لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدە ئاواکران بە ڕادەی سەرمایە و ژمارەی دانیشتوانەکەی لەناو ئیمپڕاتۆریەتدا بەشداریکردنێکی سیاسی کردبوویە ئامانج. ئەوە بەرنامەیەکی واقیعیتر بوو و توانای پراکتیزەکردنی هەبوو. لە مەشروتیەتی یەکەم و دووەمیشدا تا بڵێی سەرکەوتوو بوون. بەڵام لە کۆتاییەکانی سەدەی ١٩ و سەرەتای سەدەی ٢٠ کە میللیگەرایی بە لوتکە گەیشت، بەرەو داواکاری دەوڵەت ـ نەتەوەی سەربەخۆ هەنگاویان هاوێشت. ئەو خاکانەی داوایان دەکرد چەندین کلتووری جیاوازی لەخۆوە گرتبوو کە کورد و تورکەکان لە سەرووی هەموویانەوە دەهاتن. ئەگەر پێکهاتەیەکی وەک پارتی سۆسیال دیموکراتی کرێکارانی رووسیا[19] هەبووایە ئەوە لەوانەبوو لەسەر بنەمای شۆڕشێکی هاوشێوەی شۆڕشەکانی ١٩٠٥ و ١٩١٧ی ڕووسیا بە ئامانج کردنی ئاواکردنی سیستەمێکی فیدراڵ لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی واقیعیترین ڕێبازی چارەسەری بووایە. بەڵام پارتی تاشناکی[20] ڕاسترەو و هنچاکی چەپڕەو دۆخی ڕێکخستنی میللیگەرایی تەسک و وشکیان دەرباز نەکرد.

فاکتەرێکی مێژوویی گرنگی دیکەی ژێر تراژیدیاکە میللیگەرایی ئەرمەنی بوو کە کاریگەری کرستیانی لەسەر هەبوو و ڕێگای لە پێش کاریگەرییە دژەکان کردەوە. کاریگەرییەکی هاوشێوەی ئانتی سامی کە میللیگەرای یەهودی لە ئەورووپا ڕێگای لەپێش کردەوە لەناو کۆمەڵگا موسڵمانەکان دەنگی دەدایەوە. مەترسیدارتریشیان ئەو کێبڕکێیەی سەرمایەداری ئەرمەنی بوو لەگەڵ کاریگەریەکانی سەرمایەی یەهودی لە ئیمپڕاتۆریەتی

---

[19] پارتی کرێکارانی سۆسیالیستی دیموکراتی رووسیا: پارتێکی شۆڕشگێڕی سۆسیالیستی بوو، بەئامانجی کۆکردنەوەی ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان لەژێر یەک چەتردا لەساڵی ١٨٩٨دا دامەزرا. بەڵام لەناوخۆیدا دووچاری هەژان و لێکترازانی توند بووەوە. دوو ڕەوت لەناو ئەو پارتەدا هەبوو: ڕەوتێکیان لینین و بەلشەفییەکان بوون، ڕەوتەکەی تریشیان مارتۆف و مەنشەفیکەکان بوون. لە ئاکامدا بەلشەفییەکان سەرکەوتن و ناوەکەیان بۆ پارتی کۆمۆنیستی سۆڤییەتی گۆڕی. (وەرگێڕ)

[20] ناوی تەواوی "یەکێتی شۆڕشگێڕیی ئەرمەنی"یە. پارتێکی سیاسی شۆڕشگێڕی سۆسیالیستییە لەپێناو بەرگریکردن لە گەلی ئەرمەنی دژ بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە تبلیس لەساڵی ١٨٩٠ دامەزرا. پارتی تاشناق گەورەترین پێگەی لەناو ئەرمەنییەکانی لوبناندا هەیە. ڕۆژنامەی "ئەزناک" کە ڕۆژنە بە زمانی ئەرمەنی لە لوبنان دەردەچێت زمانحاڵی فەرمی پارتی تاشناقە. (وەرگێڕ)

پارتێکی سیاسی دیموکراتی چەپڕەوە، لەساڵی ١٨٨٧دا لەلایەن کۆمەڵێک خوێندەڤانی ئەرمەنی لە ژنێف بەئامانجی بەرگریکردن لە گەلی ئەرمەنی لەبەرامبەر بەستەمکاری و زۆردارییەکانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دامەزرا. لەدوای پارتی تاشناک، هەشناک دووەمین گەورەترین پارتییە لەناو ئەو ئەرمەنیانەی لە لوبناندا دەژین. بەیروت و چیای لوبنان کە بەرێژەیەکی زۆری ئەرمەنی تێدا دەژیت و پێگەی سەرەکی پارتی هەشناکیشە لە لوبنان. لە بەیروت ڕۆژنامەی "ئارارات" ڕۆژانە بە زمانی ئەرمەنی دەردەچێت، زمانحاڵی فەرمی پارتی هەشناکە. (وەرگێڕ)

عوسمانیدا. ئەو ناکۆکییەی لە ساڵانی ئاواکردنی کۆماردا لە نێوان سەرمایەدارە کرستیانەکان و سەرمایەدارە یەهودیەکان هەبوو، لە فەتحکردنی ئەستەمبۆڵ و سەلانیک گەرم و دژوار بوون. چونکە کلتوور و سەرمایەی رۆم و ئەرمەنیەکان لە ئیمپڕاتۆریەتدا کاریگەریەکەیان بۆ ماوەیەکی درێژ و کۆنتر دەگەڕایەوە، بەردەوام و بەرفراوان بوو. کەچی بوارەکانی چالاکی دراوی، پیشەسازی و بازرگانی لە نێوان ئەو سێ ئەتنیک و دوو ئایین و میللەتە (لە سیستەمی عوسمانی بە میللەت "ألملة" ناو دەبران) دابەش کرابوون. کێبڕکێی نێوانیان دەست لێبەرنەدراو بوو. هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەوروپا و پەلهاویشتنی و بڵاوبوونەوەی لەناو بونیادی ئیمپڕاتۆریەتدا ئەو کێبڕکێیەی توندتر کرد. لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەر سێ گرووپی ئەتنیکیش بە داخوازییەکانی دابەشکردنی دەسەڵات نەوەستان و ئیتر گەرانیان بە دوای وڵاتێکدا جێگای باس بوو. ئەو لێگەڕینانەش لەگەڵ یەکتردا ناکۆک بوون و کێبڕکێی قووڵتر دەکردەوە. هەروەها هەر لە سەردەمی دەرکەوتنی ئایینی کرستیانی لەخاچدانی حەزرەتی عیسا لەلایەن یەهودییە بەکرێگیراوەکانی رۆماوە رێگای لە پێش نەفرەت و ناتەباییەکی بەردەوامی نێوان کرستیان و یەهودیەکان کردبوویەوە. کاتێک تەواوی ئەو فاکتەرانە کۆبوونەوە، سەرمایەدارە یەهودیەکانی پەیوەندیەکی دارایی(مالی) بەهێزتریان لەگەڵ کۆشکی عوسمانی و بیروکراسیەکەی هەبوو پێگەیەکی باڵاتریان بەدەست هێنابوو.

جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی بە یارمەتی بەهێزی یەهودیەکان، واتە لەمیانەی کۆمەکە ئایدیۆلۆژی (کردە و چالاکیەکانی تورکچێتی) و ماددییەکانیان (سەرچاوەی سەرەکی خۆراکپێدانی تورکچێتی بوون) دامەزرا و پەرەی پێدرا. بەشی زۆری ئەو ئەفسەر و پاشا ئەڵمانیانەی سوپای مۆدێرنی عوسمانیان پەروەردە دەکرد بە رەچەڵەک یەهودی بوون. هەم لە راگەیاندنی دووەمین مەشروتیەت، هەمیش لە سەرکوتکردنی دژە کودەتاکەی ٣١ی ئادار و هەمیش لە شەڕی رزگاری نیشتیمانی کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دەستی پێکرد کادیرە یەهودیەکان خاوەن رۆڵێکی ستراتیژی بوون و بە شێوەیەکی سەرکەوتووش جێبەجێیان کرد. تەواوی بەرهەمە سەرەکیەکانی تورکچێتی بۆ یەکەمجار لەلایەن رۆشنبیرە یەهودیەکان (وەک روامبیری[٢١]، کۆهن) بڵاو دەکرایەوە. ئافرێنەرە راستەقینەکەی ئایدیۆلۆژیای تورکچێتی بوون. وێڕای ئەوەی زۆربەی زۆری کۆمەڵگای تورک لەناو راستیەکی پێچەوانەی ئەو ئایدیۆلۆژیایە دەژیان، بەڵام بەهۆی بێپەروەردەیی و دۆخی رێکنەخراوییان بێکاریگەر بوون، دیسان ئەو کادیرانە رۆڵی ناوکی سەرەکی سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی دەوڵەتیان بینی (لە رێگای ئیتیحاد و تەرەقی و CHP وە). لە بەرامبەر ئەو باڵابوونە بەرچاوەی یەهودیەکان ئەرمەنی و رۆمە کرستیانەکان چانسیان لە

---

[٢١] ئەرمینیوس ڤەمبیری (١٨٣٢ ـ ١٩١٣ ArminiusVámbéry): گەڕیدە و خۆرهەڵاتناسێکی هەنگاریایی بوو. گەشتی بۆ ئاسیا کردووە و لە ساڵی ١٨٥٤دا چۆتە ئەستەنبوڵ، فەرهەنگێکی بچووکی ئەڵمانی تورکی داناوە. ئەو بابەتانەی لەلایەن مێژوونووسە عوسمانییەکان سەبارەت بە هەنگارییەکان نووسیویانە بۆ ئەڵمانی وەریگێڕاوە. لە گرنگترین بەرتووکەکانی: گەشتەکان بۆ ئاسیای ناوین، مێژووی بوخارا و وڵاتانی ئەودیو رووبار. (وەرگێڕ)

پێکهاتە و بونیادەکانی دەوڵەتی نوێدا زۆر کەم بوو. بوونە بەهێزەکەیان لە بواری ئابووریدا بەرامبەر بە ڕەقیبەکانیان ـ کە لە دەسەڵاتدا بوون ــ دەیکردن بە ئامانج (بەرامبەر بە سەرمایەدارە یەهودی و چینی سەرمایەداری ـ دەستەجەمعی دەوڵەتی تورکچییەکان). کاتێک کۆماریش ڕاگەیەنرا هیچ شتێکیان نەمایەوە.

ژینۆسایدی ئەرمەنی تراژیدیترین بەشی ناو ئەو تابلۆ گشتییەیە. کاتێک لە بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە ڕاپەڕین (بەر لە ١٩١٤ و یەکەمین ساڵی جەنگ) خۆیان لە بەرامبەر دژەهێرشی حوکمڕانی ئیتیحاد و تەرەقی بینیەوە کە لە ٢٤نیسان بڕیاریان لەسەردا، لە ئاکامی ئەو شاڵاوەشدا لە وڵاتی هەزاران ساڵەی خۆیان بەدەرنران و لە ڕێگاکان لەناوچوون، ئەوانەی کە مانەوەش چارەنووسیان ژیانی درێژخایەنی هەندەران بوو. ئەرمەنیەکانی هەندەران ڕاستیەکن، بەڵام ڕاستیەکی داپلۆسێنراو، داڕووخاو و زۆر بێ هیوان. دەوڵەت ـ نەتەوە ئەرمەنییە بچووکەکەی ئاواکراوە لەوانەیە بۆ دڵنەوایی بووبێت. تەنیا بورژوازی تورکچێتی ژینۆسایدی ئەنجامنەدا بەڵکو ڕۆڵی دەرەبەگە کوردەکانیش جێگای باسە. ئەمانە تەنیا ڕۆڵیان لە ژینۆسایدی ئەرمەنیەکاندا نەبینی، تاوانباری سەرەکی ئەو ژینۆسایدەش بوون کە لە هەمان قۆناغدا و بە شێوەی جیاواز(بە تایبەتی لە فرقەکانی حەمیدییە ـ سوارەی حەمیدیە) لە سەر کوردان پەیڕەو کران. ئەمانە لەژێر ناوی "گوندپارێزان" (جاشایەتی) تا ئێستاش لە بەرامبەر تکوڵیکردن لە کوردێتی سامان و موڵکی خۆیان زیاد دەکەن، کاتێک پێویستیش بێت کوردایەتیەکی ساختەش نمایش دەکەن و لە ژینۆسایدکردنی کوردان درێژە بە ڕۆڵە نەفرەتلێکراوەکەیان دەدەن.

هیچ نموونەیەک هێندەی پێکدادان و شەڕی نێوان ئەرمەنیەکان و دەوڵەت ــ نەتەوەی تورکچێتی ئەو ڕاستییە پیشاننادات کە دەوڵەت – نەتەوە ڕژێمێکی ژینۆسایدە (بەشێوەیەکی گشتی نکوڵیکردن لە مێژوو، لەناوبردنی کلتووری خۆجێیی و دەسەڵاتی دیموکراتیانە). تراژیدیای گەلی ئەرمەن سەرچاوەی خۆی لە سەرمایەداربوونی پێشوەختی بۆرژوازی و بەدەستهێنانی ئاستێکی پەرەسەندنی کلتووری باڵاتر لە دراوسێکان و پیلان و یارییە بێبەزەییەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری وەردەگرێت (بەرامبەر بە بەرژەوەندییەکی بچووکی ڕۆژانە کلتوورێکی هەزاران ساڵە ژێرپێ دەخەن).

ژینۆسایدی سریانی ــ کلدانیەکانیش لەلایەن هەمان میکانیزمەوە و ئەمجارە لە باشووری ناوەڕاستی کوردستان ئەنجامدەدرێت. چیرۆکی لەناوچوونی ئەو سێ کلتوورە کرستیانییەی پاشماوەی ئاشووری، بابلی و ئەکەدی (بەرەچاو کردنی گەڕاندنەوەی بنەچەی مەحەلمیەکانی ماردین بۆ ئەکەدیەکان) و فەرسیۆنەکانی دیکەیان تا دوارادە تراژیدییە. ئەو گەلانەی سەردەمانێک کلتووری سێ ئیمپراتۆریەتی شکۆدار(ئەکەد، بابل، ئاشوور)یان ژیاندووە و تێیدا ژیاون، لەوانەیە یەکەمین قەومی بازرگان و پیشەکار بووبن لە مێژوودا. لەگەڵ شار لەدایکبوون، لەگەڵ شاریش گەورە ببوون. لەناو قووڵایی تەلیسمی میتۆلۆژیا، ئایین و هونەردا ژیابوون. کلتووری سۆمەریشیان بۆ دونیا گواستبوویەوە. ئەو قەومانە بوون کە شارستانییان بۆ جیهان گواستبوویەوە. ئەو مێژووە

شکۆداره پێنج هەزارساڵییه وەک بڵێی تەنیا پاشماوەیەکی بۆ مۆزەخانەکان ماوەتەوە: هەندێک پاشماوەی کڵێسای تایبەت، چەند پیشە و هەندێک شوێنەواری بیناسازی و هونەری مۆدا. سەرگوزەشتەکەیان لە هی ئەرمەنیەکان دەچێت. خاوەنی یەکەمین سەرمایه بوون کە لە ساڵانی ٢٠٠٠پ.ز دەستی پێکرد، یەکەمین کارخانە و دەزگایان (قاروم = کار، مانای ئەجەنتای چاخی کۆنە) کردەوە و خاوەنی یەکەمین کاروان بوون، ئەمانە تایبەتمەندێتییە رەسەنەکەیان بوون. یەکەمین کەس بوون کە کۆلۆنیەکانی بازرگانییان ئاوا کرد. بازرگانی بەرهەمە جوانەکانی رستنیان دەکرد. پێشەنگی پیشەکاری کانزاکان و دەست رەنگینی جوانترین بەرهەمەکانی زێڕ و مسکاری بوون. ژمێریاری بازرگانی و نووسەری نامە سەدان تابلێتە خشتیەکان بوون. بە ئەندازەی ئەو لایەنە شانازیبەخشەی مێژووەکەیان، لایەنە ئازاربەخشەکەشیان بەردەوام لەناو یەکتردا بوون.

گوتەی"چونکە بە هۆی ئایینی کرستیانی تایبەتمەندێتی جەنگاوەربیان لە دەستدا بۆیە رووخا" کە بۆ رۆما ئاماژەی پێدەکرێت، دەشێت بۆ گەلە کرستیانەکانی خۆرهەڵاتیش بگوترێت. ئەگەر ئەو کلتووره دێرینانە خۆیان لە ئایینی کرستیانی نەپێچابوایە ئایا چانسی ژیانێکی درێژخایەنتریان بەدەست نەدەهێنا؟ پرسیارەکە گرنگە و پەیوەندی بە راستینەی هەنووکەییەوە هەیە. ئەمانە یەکەم گەلن کە بوونە کرستیان. ئەوان عەرەبەکانیان بە شارستانی ئاشنا کرد کە لەگەڵیاندا هاورەچەڵەکن. ئامادەکاره سەرەکیەکانی لەدایکبوونی ئیسلامیش بوون. بەلانی کەم هێندەی بازرگانی هەڵگری بە هێزی میراتی کلتووریش بوون. تەنیا کاڵایان بۆ چین و هیندستان و ئەفریقیا و ئەوروپا نەدەگواستەوە، بەڵکو بەهای دەوڵەمەندی کلتووریشیان گواستەوە، بەهای کلتوورییان ئافراند. کلتوورەکانیان بۆ یەکتری وەرگێڕاوە. بەڵێ لەناوچوونی ئەو گەلانەی خاوەنی ئەو میراتە مێژووییە بوون لە سەرووی ئەو بابەتە مێژووییانەوە دێت کە شایەنی لێکۆڵینەوە و توێژینەوەن. جێگای خۆی لە سەرووی بابەت و کێشەکانەوە دەگرێت.

بەر لە کرستیانێتی هەڵگرتنیان بۆ ئەو فاکتەرانەی بۆ یەکەمین جار لە چاخی کۆندا ئاشنای سەرمایە بوون، دەشێت بەدبەختی ئەو گەلانە بووبێت. نەفرەت لە سەرمایە ئازارێکی زۆری بە یەهودیەکانیش چەشت. تووشبوونیان بە ژینۆسایدیش لەئاکامدا پەیوەندی بەو سەرکەوتنەیانەوە هەیە کە لە سەرمایەداریدا بەدەستیان هێنا. دەشێت دۆخێکی هاوشێوە لە کلتوورەکانی دیکەی خاوەن سەرمایەشدا ببینین. کەچی لە راستیدا ئەو سەرمایانە بە جۆرێک لە جۆرەکان گەڕانەوە بوو بۆ شاڵاوە بێبەزەییەکانی کۆمەڵکوژی و تاڵانکاری ئیمپراتۆریەتەکانی ئاشوور، بابل و ئەکەد. ئەوەی پەیڕەو دەکرێت تۆزێکیش"شەلم، کوێرم، نابوێرم"ە. ئەو کلتووره دێرینانەی میزۆبۆتامیا کە لە ساڵانی ٦٠٠پ.ز بەدواوە هەژموونگەراییان کەوتە دەست ماد و پارسەکان، دواتریش ئەسکەندەر، هێلینیەکان، رۆما و بێزەنتیەکان بەو سیفەتەی گەلە دامەزرێنەرەکانی کرستیانی بوون، ناچار بوون جۆرێک لە دژە بەرخودان پەرەپێبدەن. ئەو کلتوورانەی لە میانەی کلتووری کرستیانیەوە ناوی خۆیانیان بۆ سریانی و کلدانی گۆڕی، وەڵامیان

دایەوە رۆما، بێزەنتی، پارس و ساسانیەکان. ئەمە دەستنیشانکردنێکی گرنگە. لەبەر ئەوەی هێزێکی جەستەیی ئەوتۆیان نەبوو، تەنیا لە ڕێگەی هێزی نەرمەوە، واتە لەمیانەی کلتوورێکی ئایینیەوە توانیان درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. ناچار بوون کرستیانی بئافرێنن. ئەگەر بە جۆرێکی دیکە رەفتاریان کردبوایە ئەوا لە ژێر پێی هەر دوو هێزی هەژموونگەرا و لە نێوان لەپەکانیان لەناو دەچوون. لەو سۆنگەیەوە؛ زمانە نەرمەکەی کرستیانی "لەلای راستیان دایت، لای چەپیان بۆ وەرگێڕە" بژارێک نەبوو بەڵکو ناچاری بوو. لەسەر ئەو بنەمایەش لە کلتووری کۆنی ئیمپڕاتۆریەت و بتپەرستیەوە بەرەو ئایینی ئاشتی و کلتووری نوێ گەڕانەوە، وەرچەرخانیان بە خۆیانەوە بینی. ئەمە گەڕانەوە و وەرچەرخانێک بوو لە کلتووری زۆرداری مێژوو بۆ کلتووری ستەم لێکراوان. لەو لایەنەوە لە یەکەم سێسەدساڵی خۆیدا کرستیانی یەکەم بزووتنەوەی ئەخلاقی و ویژدانی جددی مرۆڤایەتی دەستەجەمعی (جڤاتی) دەرەوەی سیستەمی کۆیلەداری بوو. یەکەمین شێوەگرتنی گرنگی هوشیاری ئازادییە. کلتووری بابل، ئاشوور، گریک و ئەرمەنی پێشکەوتووترین کلتووری ئەو قۆناغە بوون.

قودس ناوەندێکی گرنگی نەریتی پێغەمبەرایەتی یەهودی بوو. بە مانایەکی تر دوای ئورفا ناوەندی دووەمین گرنگترین پەرستگا بوو. لە سەردەمی رۆما کاتێک چینی سەرووی ئیمانداران بەکرێگیراوێتیان هەڵبژارد، بەو سیفەتەی نوێنەری چینی خواروو بوو ڕێگای حەزرەتی عیسا کرایەوە. کاتێک چینی سەرووی یەهودییە دەوڵەمەندەکان لایەنگری رۆمایان کرد، لایەنگرانی عیساش بوون بە کەمینە. لەو دۆخەشدا گریک، ئاشووری، بابلی و ئەرمەنیەکانیش کە بە کلتوورترین جڤات بوون ئەو گەلانە بوون کە کرستیانییان پەسەند کرد؛ وەک بزووتنەوەی ڕێکخستن و هوشیاری دەستەجەمعیی (کۆلەکتیف ـ جڤات) بەشدارییان تێدا کرد. دەشێت کرستیانی وەک یەکەمین بزووتنەوەی هاوکاری و پشتگیری چەوساوە و هەژارانی نێوان قەوم و قەبیلەکانیش هەڵسەنگێنرێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان شێوەی بەرایی ئەنتەرناسیۆنالی کۆمۆنیستییە.

لە ساڵانی ٣٠٠زایینی هێلینی، ئەرمەنی، سریانی و کلدانیەکان لەژێر سایەی پاتریکەکان کلێسای خۆیانیان ئاواکرد و ئایینیان بە دامەزراوە کرد. بوون بە گەل و قەومگەلێکی کرستیان. بە گوێرەی قۆناغی خۆیشی ئەوە وەرچەرخانێکی گرنگ بوو. تا سەردەمی دەرکەوتنی ئیسلامیەت لەو بارەیەوە تا دوارادە سەرکەوتوو بوون. زۆر پێشتر لە هی ئەورووپا قۆناغێکی مێژوویان لە شارستانی و کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا بڕیبوو. لەگەڵ گەیشتن بە سەدەی شەشەم سەرجەم خاکەکانی بێزەنتیان لە خۆرئاوا کردبوو بە کرستیانی، لە مێژبوو بزاوتی مێژوویی خاچپەرستانیان دەستپێکردبوو کە بە خێرایی بۆ ناوەوەی ئەورووپا بڵاو دەبوویەوە. لەگەڵ گەیشتن بە سەدەی دەیەمیش ئیتر ویژدان و ئەقڵی کرستیانی مۆرکی خۆی لە تەواوی ئەورووپا دەدا. هێندە بەهێز ببوون کەمێک مابوو لەلایەنی ئایینیەوە لە خۆرهەڵات ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی بخەن (دواخستنی زەردەشتایەتی). تا ناوەوەی چین و هیندستان بڵاو ببوونەوە. لێرەدا زانا ئایینیە

سریانیەکان واتە پاتریکەکان رۆڵی پێشەنگایەتیان دەبینی. کەمێک مابوو کرستیانی ببێت بە ئایینی جیهان، ئیسلامیەت لە دایک بوو.

یەکەمین ناوکی جەنگاوەرانی ئیسلام(موجاهیدین) ئەو کەسانە بوون کە لە ئایینە سەرەتاییەکانی وەک باوەڕیەکانی تەوتەم و ئانیمیزم گەڕابوونەوە. لە گوتە و فەرموودەکانی حەزرەتی محەمەد دەڤەر و وڵاتانی شارستانی وەک"بەهەشت" وێنا دەکران. لە راستیدا دونیای دیکەی دەستەواژەی بەهەشت ئەو وڵاتە جوانانەیە کە جەنگاوەران دوای شەڕکردن (گیانبەختکردن) لەپێناویدا بەدەستی دێنن، واتە وڵاتەکانی شارستانی بوو. دواتر فەرموودەکەی حەزرەتی محەمەد لەلایەن سۆفستاگەراکان چەواشەکرا و وەک ژیانێکی ئاخیرەت راڤە کرا کە دوای مردن پێی دەگات. لە راستیدا مانای راستەقینەی بەهەشت فەتحکردنی وڵاتانی شارستانی ئەو دونیایە بوو کە ژیانیان وەک بەهەشت جوان و خۆش بوو (بە بەراورد لەگەڵ بیابانی عەرەبستان). ئەمەش پێویستی بە جەنگاوەرێتیەک بوو گیانی خۆی لەسەر دەست دابنێت و بۆ مەرگ ئامادەبێت. لێرەدا مەرگ وەک بە دەستهێنانی مافی بەهەشتی ئاخیرەت راڤەکرا. ئەگەر خوازیارین بەراستی لە ئیسلام تێبگەین ئەوا پێویستە زۆر باش بزانین کە ئەو چەشنە راڤەیە چەواشەکردنی گوتە و فەرموودەیە. ئەو بەڵێنەش لەلایەن مرۆڤە سەرەتاییەکانی بیابان زۆر سەرنجڕاکێش بوو. وەک دەزانرێت هێشتا سەدەیەکی پڕ نەکردبوویەوە ئەو مرۆڤانە لە زەریای ئەتڵەسیەوە تا زەریای مەزن (لە مەغریبەوە تا چین) بڵاوبوونەوە. ئیسلامیەتیش بەو سیفەتەی ئایینێکی ئیبراهیمییە لە هەمان بنەچەوە وەک سێیەمین ڤێرسیۆن (دوای یەهودیەت و کرستیانی) لە دایک ببوو. هەر بۆیەش دواتر خۆی وەک دوا پێغەمبەر و ئایینی تەواوکەر راگەیاند. ئیتر بەسەرچوون و بێواتابوونی هەر دوو ڤێرسیۆنەکەی یەکەم لەسەر بنەمای راگەیاندنی ڤێرسیۆنی سێیەم وەک ئایینی تەواوکەر و حەزرەتی محەمەدیش وەک پێغەمبەری دوایی وەک پێویستیەکی فەرمانی ئەڵڵا و مەرجی ئایین بەیاندەکران. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا ناکۆکی و پێکدادان لەگەڵ یەهودیەت و کرستیانی دەست لێبەرنەدراو بوو. هاوبەشێتی بنەچەیان نەیدەتوانی رێگری لەو ململانێ و پێکدادانانە بکات کە لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی ناکۆکی نێوان چینی دەسەڵاتداری قەبیلە و قەومەکانیان لەگەڵ جیاوازیەکانی دواتریان هاتنەئاراوە.

لەو چوارچێوەیەدا قۆناغێکی نەرێنی بۆ کۆمەڵگاکانی سریانی، هێلینی و ئەرمەنی دەستیپێکرد کە لە دەڤەرەکانی بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلامیەتدا دەژیان. یەکەمین جار ئەو کۆمەڵگایە قورسایی سیاسی خۆیانیان لەدەستدا. ئەو دەوڵەت و دەسەڵاتانە رووخان کە دەیپاراستن. بەو مەرجەی سەرهەڵنەدەن هەژموونی ئیسلامی دەرفەتی ژیانی پێدان. لە بەرامبەر ئەوەشدا بە باجێکی قورس و زۆریان بەستنەوە(جزیة)، ئەمەش ئەو گەل و قەومانەی خستە دۆخێکی هەژاری و بێچارەییەوە. بەڵام ئەزموونە ئابووری و کلتوورییەکەیان توانای هەبوو لە سەردەمی دەسەڵاتە ئیسلامیەکانیشدا خۆیان دەوڵەمەند بکەن. دەسەڵاتەکان پێویستییان بە توانا ئابووری و کلتوورییەکەیان هەبوو. هەمان خاڵ

بۆ یەهودیەکانیش لەجێگای خۆیدابوو. لەسەر ئەو بنەمایە تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم درێژەیان بەبوونی خۆیاندا کە سەردەمی دەستپێکردنی پەلهاوێشتنی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە لە خۆرهەڵاتی ناویندا.

ئینگلتەرا کە یەکێک لە هێزە هەژموونگەراکانی ئەوروپا بوو لەپێناو چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی ئەو هێڵەی لە میسرەوە تا هیندستان درێژ دەبێتەوە هەوڵی دۆزینەوەی ئەندامگەلێکی گرێدراوی خۆی دەدا. لە لایەکەوە لە ڕێگای سوڵتانەکانی عوسمانی (بە سیاسەتی سەرکوتکردن و شانتاج)یەوە هەوڵی دابینکردنی دەدا، لەلایەکی دیکەشەوە لەمیانەی فاکتەرە خۆجێییەکانەوە هەوڵی بە هێزکردنی دەدا. سریانیەکان لەپێشترین فاکتەری لەبار و گونجاوی ئەو سیاسەتە بوون. لەمیانەی چاودێریکردنی ئێراق و کەنداودا دەیانتوانی ڕۆڵی پێشەنگ ببینن. لە باکوور رووسیاش هەمان یاری لەسەر ئەرمەنیەکان پەیڕەو دەکرد. میللیگەرایی پێشوەخت؛ کە لەمیانەی فاکتەرە ناوخۆییەکانی وەک کرەمیانی، سەرمایەداربوونی پێشوەخت و چالاکیەکانی مژدەبەخشەکان بەهێز بوو، وەک چۆن ئەرمەنیەکانی بەرەو مەرگەسات برد، سریانی و کلدانیەکانیشی بەرەو کارەساتی گەورە (ژینۆساید) برد. میکانیزمەکەی ژینۆسایدکردنی یەهودیەکان بەهەمان شێوە بۆ سریانی و کلدانیەکانیش کاری کرد. وەک چۆن فرقەکانی حەمیدییە لە باکووری کوردستان لە کارەساتی ئەرمەنیەکاندا بەکارهێنران، لە باشووری کوردستان لە دەڤەرەکانی بۆتان و بادینانیش زووتر لە ساڵانی ١٨٤٠ هێزەکانی میرنشینی کوردان بەرامبەر سریانیەکان بەکار هێنران. کۆمەڵکوژی سریانیەکان روویدا. لە ئاکامدا هەم بزاوتی کوردی هاندراو کە بەدرخان بەگ ڕێبەرایەتی دەکرد، هەم بزاوتی میللی سریانی بە ڕێبەرایەتی پاتریک لە لەناوچوون رزگاریان نەبوو. ئەو هاندانە (پرۆڤەقاسیۆن) ڕێگای لە پێش پەرەسەندن و جێگیربوونی ڕەگ و ریشەی سوڵتانی عوسمانی و بیروکراسیەکانی لە کوردستان، هەژموونگەرایی ئینگلیزیش لە ئێراق کردەوە. لەو کۆمەڵکوژییە بەدواوە جارێکی دیکە سریانیەکان نەهاتنەوە سەر هۆشی خۆیان. بە خێرایی لەسەر ڕێگای پەرتەوازەبوون و هەندەراندا توانەوە.

هەر لە سەردەمی ئەمەویەکانەوە ئیسلامگەرایی سوونی بەرامبەر بە گەلە کرستیانەکان ڕژێمێکی تاڵان بوو. دەرفەتی پێنەدەدان وەک گەلێکی شەرەفمەند و سەرفراز بژین. لەناوچوونی کرستیانی لە خۆرهەڵاتی ناوین ئاماژەیەک بوو بە قۆناغێکی ترسێنەر دەرهەق بە کلتوور و دەوڵەمەندێتیەکانەوە. لەدەستدانی ئەو کلتوورانە، لە دەستدانێکی گەورەی زهنیەت و دەوڵەمەندی ماددی بوو. سەرەکیترین هێزی بەرپرسیار لە رووداني ئەو لەناوبردن و کۆمەڵکوژیانە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. بەکرێگیراوە موسڵمانەکانیش بە پلەی دووەم خاوەن ڕۆڵ و بەرپرسیارین. ئەوانەی بە ناوی گەلەکانیان تێکۆشانی بوون و ئازادیخوازی بەڕێوە دەبەن پێویستە زۆر باش بزانن کە تەنیا لەمیانەی شیکارێکی ڕاستی کۆمەڵگا و مێژو و روانگەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکەوە دەتوانن میراسە کلتووریەکەیان بپارێزن و ئازادی بکەن.

چیرۆکی لەناوبردنی هێلینیەکانی ئەنادۆلیش هەڵگری هێلێکی هاوشێوەیە. کۆلۆنیکردنی ئیۆن کە لە ساڵانی ١٠٠٠پ.ز دەستی پێکرد لە ساڵانی ٦٠٠ پ.ز بۆ کەنارەکان و ناوچەکانی ناوەوە تەشەنەی کرد، لە سەرووی هەموشیانەوە کەنارەکانی ئیجە، بەمجۆرەش بناغەی شارستانیەکی نوێی دانابوو. هێلینیەکان بەشێوەیەکی سەرکەوتوو کلتووری خۆرهەڵاتیان هەرس کردبوو، لەمیانەی سەنتێزێکی نوێوە دەرکەوتبوونە سەر شانۆی مێژوو. لە بوارەکانی زانست، فەلسەفە و هونەر مۆرکی خۆی لە قۆناغێکی شکۆدار دابوو. دوای شارستانی سۆمەر ببوو بە دووەمین گەورە قۆناغی شارستانی. بە پێچەوانەی مەزەندەکان ئەو شارستانییە سەرچاوەی خۆی لە ئەسینا و شارەکانی دیکەی نیمچە دوورگەوە نەدەگرت؛ بە پێچەوانەوە شارستانی کەنارەکانی ئیجە لە ئەسیناوە تا مارسیلیا، لە باکووری دەریای سپییەوە تا دەگاتە کەنارەکانی دەریای رەش هەمووی کردبوو بە کۆلۆنی. لە رێگای فەتحی ئەسکەندەریشەوە ئەو شارستانییە لە کەنارەکانی ئیجەوە تا هیندستان گواسترایەوە. ئیتر قۆناغێک دەستی پێکردبوو کە بە سەردەمی هێلینی (٣٠٠پ.ز-٢٥٠زایینی) ناودەبرێت. رۆما و بێزەنت لەمیانەی ئەو کلتوورەوە پەرەیان سەند. هەمان کلتوور کاریگەریەکی زۆری کردبووە سەر ساسانیەکانیش. لە رێگای سریانیەکانەوە بۆ کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین وەرگێڕدراوە، یەکێک لە دەمارە سەرەکیەکانی لەدایکبوون و رێگای حیکمەت (فەلسەفە)ی پەرەسەندن و گەشەکردنی ئیسلامە. خودی بێزەنتیش بەجۆرێک لەجۆرەکان ئیمپراتۆریەتێکی گریک ـ کرستیان بوو. لەگەڵ دەستپێکردنی قۆناغی گرژی لەگەڵ ئیسلام تا فەتحکردنی ئەستەنبوڵ هێلینیەکان بەردەوامییان بەهێزی سیاسی خۆیاندا. لەگەڵ فەتحکردنی ئەستەنبوڵ سەروەری سیاسی خۆیان لە دەست دا. بەڵام هەروەکو ئەرمەنیەکان دەستبەرداری پاراستن و پەرەپێدانی هێزی ئابووری و کلتووری خۆیان نەبوون. لە پێکهاتنی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا شوێنێکی گرنگ لە بوارەکانی دەریاوانی، بازرگانی و پیشەکاریدا دەگرن. تا دامەزراندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی یۆنان (١٨٢٩) درێژە بەو پێگەیەی خۆیان دەدەن.

لەو دیرۆکە بەدواوە ئیتر مێژوو بۆ ئەوانیش بوو بە ناسۆری و ئازار. لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەم چەندەی دەچوو خوێنێکی زیاتریان لە دەستدەدا. دوای شەڕەکانی بەلقان و یەکەمین جەنگی جیهانی رەوشیان ئەستەمتر بوو. ئەو رێککەوتنەی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی لەگەڵ سەرمایەدارە یەهودیەکان گرێیدا، دژی تەواوی گەلە کرستیانەکان دەستبەکار بوو. لە شەڕدا باجێکی قورسی لایەنگرێتی ئینگلیزەکانیان دا. لە چەندین شار و گوندەوە لە سەرووی هەموشیانەوە ئەستەنبوڵ ناچاری جیابوونەوە کران. سیاسەتێکی هاوشێوەی سەر ئەرمەنی و سریانیەکانیان لەسەر جێبەجێکرا. دوای شەڕی رزگاری نیشتیمانی لە رێگای ئاڵوگۆڕ[٢٢] (ألمقایضة)ەوە ناچارکران دەستبەرداری وڵاتی سێ هەزار

---

[٢٢] دوای شەڕی رزگاری نیشتیمانی ئالوگۆڕ لەنێوان تورکەکانی یۆنان و بەلقان (کە ژمارەیان ٢٠ هەزاری تێپەڕ نەدەکرد) لەگەڵ رۆم، یۆنان گەلانی بەلقان لە تورکیا (کە ژمارەیان ١٢٠ هەزاری تێپەڕ دەکرد) ئەنجامدرا، بەمجۆرەش ئەو گەلانە لەسەر خاکی باب و باپیرانیان بەدەر نران.

ساڵەیان ببن. بەرژەوەندییەکی بچووکی کاتی ئینگلیزەکان ڕێگای لەپێش لەناوچوونی یەکێک لە شارستانی و کلتووره گرنگەکانی مێژوو کردەوە. ئەوانەی کە مانەوەش لە ڕێگای تیرۆری فاشیزمی تورکی سپیەوە لە ئەنادۆڵ بەدەرنران. بوونەکەیان بە دۆخێک کۆتایی هات کە بە لانی کەم هێندەی تراژیدیای ئەرمەنی و سریانیەکان سەخت و قورس بوو. چارەنووسی گەلانی کەنارەکانی دەریای ڕەشیش هەمان شت بوو، دووچاری هەمان تراژیدیا هاتن. کەچی ئەوانیش (پۆنتۆسەکان) شارستانیەکی هەزاران ساڵەیان لەو دەڤەرە ئاوا کردبوو و ژیانیان پێبەخشیبوو.

گورجەکان (جۆرجیەکان) وەک گەلێکی کرستیان لە باکووری خۆرهەڵاتی ئەنادۆڵ، لە دیرۆکێکی کۆنەوە شارستانیەکیان لە کەنارەکانی خۆرهەڵاتی دەریای ڕەشدا ئاوا کردبوو (لەسەردەمی هیتیتەکاندا ناسراو بوون). لە سەردەمی کرستیانیدا شارستانیەکەیان زیاتر پەرەی سەندبوو. ئەوانیش دووچاری چارەنووسێکی هاوشێوەی ئەرمەنیەکان هاتن. بەشی گەورەیان لە بەرژەوەندی پەلهاوێشتنی ئیسلامگەراکان لە دەست دا و لە دەڤەرێکی بچووکدا گیریان خوارد. ڕۆڵی سیاسەتەکانی رووسیای قەیسەریش لەو دۆخەدا جێگای باسە. ئەو گەلە ڕووبەڕووی زەحمەتیەکی زۆر بوویەوە، تا ئێستاش بەدەست زامەکانیەوە دەناڵێنێت و لێی ڕزگار نەبووە.

هەر وەک پێشتر باسمان کرد یەهودیەکانی ئەنادۆڵ لە سەردەمی سەلجۆق بەگەوە (دەوڵەتی خەزەری یەهودی ٩٠٠ زایینی) ڕێککەوتنیان لەگەڵ چینی سەرووی قەبیلە تورکەکان هەبوو. بەشێوەی جیاواز لە قەفقاسیا، قرم، ئەورووپای خۆرهەڵات و ئەنادۆڵ درێژەیان بەو یەکێتیەدا. دوای دەرکردنیان لە ئیسپانیا، ئەنادۆڵ ببوو بە پەناگەیەکی ئارام. پێگە ژیانیەکەیان لە بواری دارایی (مالی) ئیمپراتۆریەتدا ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینیبوو. تا دەچوو پەیوەندیەکانیان لەگەڵ بیروکراسی و سوڵتانی عوسمانی بەرامبەر بە کرستیانیەکان بەهێزتر دەبوو. لە ساڵانی ١٥٥٠ ــ ١٦٠٠ تا ڕادەیەکی زۆر کۆشکی عوسمانییان کۆنترۆڵ کردبوو. لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەم و چارەگی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هێزە ڕاستەقینە و نادیارەکەی ئیمپراتۆریەت بوون. لە مەشروتیەتی دووەمدا، کودەتاکەی ١٩١٣/١/١، یەکەمین جەنگی جیهانی و ڕۆڵی ڕێبەرایەتی ستراتیژی ڕزگاری نیشتیمانیان لەژێر دەمامکی تورکچێتیدا ئەنجام دابوو. داهێنەر و دامەزرێنەری ڕاستەقینەی میللیگەرایی (فاشیزمی) تورکی سپی بوون. هەم لە بواری زهنیەت هەمیش لە بونیادناندا، پێشەنگایەتی سەرجەم پەرەسەندنە دامەزراوەییە گرنگەکانی بوارەکانی ئابووری، کلتووری، سەربازی و سیاسی کردووە. ئەو ڕۆڵە (هەرچەندە هەندێ ناکۆکیان لەگەڵ بۆرژوازی موسڵمانی تورکەکانی ئەنادۆڵیشدا هەبێت) تا ئێستاش بەردەوامە. لەدوا شیکاردا کۆمار وەک بەرهەمێکی ڕێککەوتنی نێوان سەرمایەی یەهودی و بۆرژوازی بیروکراسی تورک لە بەرامبەر گەلە کرستیانەکان لەدایکبووە، تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان درێژە بەو ماهیەتەی خۆی دەدات (هەرچەند دوای دامەزراندنی ئیسرائیل سەرمایەی یەهودی بەشێوەیەکی ڕێژەیی پاشەکشێی کردبێت). ئەگەر لەسەردەمی سەلجۆقیەکانەوە ڕۆڵی

کلتووری یەهودی لە قۆرخکارییە ئایدیۆلۆژی، ئابوورییەکان و دەسەڵاتی ئەنادۆڵدا رەچاو و حیساب نەکرێت، ئەوا ناتوانین لەناوچوونی گەلە کرستیانەکان و گەشەکردنی نوخبە و هێزی ئایدیۆلۆژی، ئابووری و دەسەڵاتگەرایی تورک شیکار بکەین. هەڵبەتە ئەگەر ئەو رێککەوتنە شیکار نەکەین ئەوا هەرگیز لەو راگواستن، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدانە تێناگەین کە لە ساڵی ١٩٢٥ وە لەسەر کوردانی بەرێوە دەبەن.

ئەو هەڵسەنگاندنانەی لە دۆخی گەڵاڵەنامەیەک دایە لەچوارچێوەی بەرگرینامەدا بە ئامانجی ئاشکراکردنی رووی راستەقینەی مێژووی هەزار ساڵەی ئەم دواییەی ئەنادۆڵە. کوێری و چەواشەکاریەکی مەترسیدار سەبارەت بە هوشیاری مێژوویی ئەو بابەتە جێگای باسە. ئەگەر ئەو کوێری و چەواشەکارییە دەرباز نەکرێت، وەک چۆن راست لە بەهای میراسی کلتووری گەلان تێناگەین، بە تایبەتیش ئەو گەلانەی لە دۆخێکی تراژیدی دان، ئەوا لە هەلومەرجی ئەمڕۆشماندا بەراستی نایژێنین، بۆ داهاتووی ناگوازینەوە و ناتوانین ئازادی بکەین و ژیانێکی برایانە ئاوا بکەین.

### ٧. لێکجیابوونەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا

لێکجیابوونەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات لە خۆرهەڵاتی ناوین و قووڵبوونەوەی چەوسانەوە و داگیرکاری سەر گەلە موسڵمانەکان، لە سەرووی سەرەکیترین ئەو کێشە سۆسیۆلۆژیانەوە دێن کە پێویستییان بە روونکردنەوە هەیە. لە پەرتووکەکانی سۆسیۆلۆژیا و مێژووی فەرمیدا هەڵوێستێک پیشان دەدرێت، وەک بڵێی کێشەی بەمجۆرە بوونیان نییە. بە مانایەک لە ماناکان مێژووی شارستانی بە لێکجیابوونەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات دەست پێدەکات. دەسەڵات و قۆرخکارییەکانی دەسەڵات کە بەیەکەوە ئاوایدەکات، بەو رادەیەی لە کۆمەڵگا جیاببنەوە، بە سیفەتی هێزێکی خاوەن جیاکاری، زێدە ـ بەهاکانی کۆمەڵگا زەوت دەکەن. هەرچەندە شیکارەکانی مارکسیزم سەبارەت بە چەوسانەوە و ناکۆکی چینایەتی هەڵگری بەشێکی راستی بێت، بەڵام ناکۆکی و ململانێی بنەرەتی لە رووی پەیوەندی نێوان کۆمەڵگای چەوسانەوە و سەرکوتکردن لەگەڵ قۆرخکاریەکانی دەسەڵات و سەرمایە روودەدات. پەرەسەندنە دیاردەییەکانی لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا روودەدات لەو لایەنەوە سەرنجڕاکێشە. بەهۆی هەژموونگەرایی پێنج هەزار ساڵ زیاتری شارستانی ناوەندی پێویستە شەرێکی راستەقینەی نێوان کۆمەڵگا و دەسەڵات لە کلتووری مێژوویی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا ببینرێت. لەو چوارچێوەیەدا دەشێت دەوڵەت وەک دۆخی ئاشتی یاخود ئاگربەستی کاتی رەواکراوی ناکۆکی و پێکدادانی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگا پێناسە بکرێت کە خراوەتە چوارچێوەیەکەوە و بە هەندێ یاسای سەرەکی گرێدراوە. دەوڵەت بە سیفەتی دۆخی ئاگربەستی کاتی، دۆخی کرداری ئەو دەوڵەتەیە کە هێشتا پێوەرەکانی پێکنەهاتووە و مەشروعیەتی بە دەست نەهێنراوە. هەرچی دەوڵەتە بە سیفەتی دۆخی ئاشتی راستی دەوڵەتە کە بۆتە خاوەن پێوەر و

مەشروعیەتی بە دەستهێناوە (بە پەیمانی نێوان کۆمەڵگا و دەسەڵات). دەشێت پەیمان و رێککەوتنی نێوان ئایین و دەسەڵات بە دەوڵەت ناوببرێت. ئایینە تاکخوداییەکان لە بنەڕەتدا لێگەڕینی جفاتگەلێکن بۆ رێککەوتن لەسەر بنەمای دەوڵەت کە بەرژەوەندیەکانیان لەگەڵ هێزە هەڵکشاوەکانی شارستانی جیادەبێتەوە و ناکۆکە. کاتێک رێکەوتن بەدی نەیەت ئایینەکان یاخی دەبن. رێککەوتنیش دەستەبەر بێت واتە دەوڵەتە رەواکە لە دایکبووە. دیرۆکی کرستیانی و ئیسلام پڕ لەو جۆرە نموونانەیە. واقیعی جیابوونەوەی مەزهەبیش سەرچاوەی خۆی لە ناکۆکی نێوان ئەو دوو توێژەی ناو هەمان ئایین وەردەگرێت کە شارستانی دەوڵەتی لەگەڵ توێژێکیان رێککەوتووە و لەگەڵ ئەویتریش نا. لە کاتێکدا ئەو مەزهەبەی لەگەڵ دەسەڵات رێککەوتووە دەبێتە دەوڵەت، توێژەکەی دیکەش بەشێوەیەکی ئاشکرا یان نهێنی درێژە بە تێکۆشانی خۆی دەدات، هەوڵدەدات بە بێ دەوڵەت و دەسەڵات راستی کۆمەڵگای خۆی بژێنێت.

لە بەشەکانی پێشووتردا هەوڵماندا ناکۆکیەکانی گەلە کرستیانەکان لەگەڵ هێزەکانی ئیمپراتۆریەت و دەسەڵاتە ئیسلامییەکان و کارەساتە گەورەکانی دووچاری هاتن هەڵسەنگێنین. ئەو خاڵەی وادەکات هەست بە پێویستی روونکردنەوەی زیاتری رەوشەکە بکەین پەیوەندی نێوان دەسەڵات و کۆمەڵگاکانی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوینە کە باوەڕمەندی هەمان ئایینن.

أ ـ ئیسلامی عەرەب (پاشکۆکانی ئەفریقیاشی لە ناودا) بە درێژایی دیرۆکی خۆی ناکۆکی و پێکدادانێکی زۆر جددی نێوان هێزەکانی دەوڵەت و دەسەڵات لەگەڵ هێزە جەماوەریەکانی گەلی بەخۆوە دیوە. هێشتا حەزرەتی محەمەد لە ژیاندا بوو ئەو پێکدادانە دەستی پێکرد. ئایینی ئیسلام (جۆرێک لە بەرنامەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی) وەک بەرهەمێکی تێکۆشانی نێوان قەبیلەیەکی هەژار کە حەزرەتی محەمەدیش ئەندامێتی (هاشمیەکان) لەگەڵ سەرۆکی قەبیلەیەکی تری دەوڵەمەند ـ کە چینی سەرووی زۆر بەهێز بووە و سەر بەهەمان ئەتنیکن ـ لەدایک دەبێت. دوای کۆچی دوایی حەزرەتی محەمەد ململانێکە زۆر دژوار دەبێت. بەهۆی ئەو ناکۆکی و ململانێیانەوە سێ لە چوار خەلیفەکانی سەرەتا دەکوژرێن(عومەر، عوسمان، عەلی). مەعاویە بە سیفەتی نوێنەری چینی سەروو لەو قۆناغەدا لە وەرچەرخاندنی مەیلی خۆی بۆ دەوڵەتی خانەدانێتی (دەوڵەتی ئەمەوی) سەرکەوتوو دەبێت. لایەنگرانی ئەهلی بەیت (خانەوادەی حەزرەتی محەمەد) وەک هێزێکی کۆمەڵایەتی و خەواریجەکانی هێزی رادیکاڵی کۆمەڵگای قەبیلە هەژارەکانیش لەو نێوانەدا دەمێننەوە. ئەمە یەکەمین دابەشبوونی جددی کۆمەڵگا، چین و دەوڵەتە. بە پێی بەسەرچوونی قۆناغەکان ئەو دابەشبوونە پەرە دەسەنێت و تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام دەبێت.

لەکاتێکدا ئیسلامی دەسەڵات بەشێوەی ئیمپراتۆیەت و دەوڵەتۆکەی بێ شومار خۆی پتەو و بەهێز دەکات (لە رێگای شەریعەتی ئیسلام و مەزهەبی سوونییەوە ئەنجامیدەدات)، مەزهەبە ئیسلامیەکانی رکابەری دەسەڵاتیش بەشێوەی ئەهلی بەیت و خەواریجەکان

هەوڵی بەردەوامکردنی بوونی خۆیان دەدەن. خەواریجەکان کە زۆربەیان لە هەژارترین توێژی کۆمەڵگاو بەدەویەکان پێکدەهاتن. بەدەویبوون زیاتر مانای وەرچەرخانە بۆ رەنجدەرە لادێییەکان و ئەندامە پرۆلیتارەکانی شار. پرۆلیتاربوونی عەرەبەکان خۆی وەک بەدەویبوون بەرجەستە دەکات. بەو بارەیەوە تا رۆژی ئەمرۆ بەردەوام دەبێت. بەدەویەکانی دەرەبەگایەتی چاخی ناوین، بۆ جووتیار و کارکەرانی سەرمایەی رۆژی ئەمرۆمان وەردەچەرخێن و پشکداری لە مێژوویکی هاوبەشدا دەکەن. ئەهلی بەیت و لایەنگرانی بە جۆرێک لە جۆرەکان نوێنەرایەتی عەرەبەکانی چینی ناوین دەکەن. کاتێک توێژە هەژارەکانی بەشێوەی جڤاتە رادیکاڵەکانی شیعە و عەلەوی درێژە بە بەرهەڵستکاری دەوڵەت و دەسەڵات دەدەن، چینەکانی سەروو لە پێکهاتە و بونیادی چەندین دەوڵەتدا بەردەوامی بەبوونی خۆیان دەدەن. بە سیفەتی هێزی دەسەڵات و کۆمەڵایەتی لە مەغریبەوە تا هیندستان، بە تایبەتیش تا لوبنان، سوریا، ئێراق و ئێرانی ئەمرۆمان و بەشێوەیەکی خەستتریش لە تەواوی جوگرافیای موسڵمانی لەمیانەی ئەو ماهیەت و خەسڵەتە سەرەکیەوە درێژەیان بە بوونی خۆیانداوە. هەرچی ئیسلامی نەریتی دەسەڵاتە هەر لە سەرەتاوە خۆی بە پێوەری دەوڵەت (شەریعەت) بەستەوە و خۆی بە رەوابوون (مەزهەبی سوننی) گەیاند و تا رۆژی ئەمرۆمان درێژەی بە بوونی خۆی داوە. راستینەی قووڵ و بەرفراوانی جیابوونەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات بناغەی دۆخی شەڕاوی و دابەشبوونی زۆری هێزەکانی دەوڵەت و کۆمەڵگای عەرەبی پێکدێنێت کە تا رۆژی ئەمرۆشمان بەردەوامە و تەنانەت رووپۆشی هاوبەشی ئیسلامیش نەیتوانیوە بیشارێتەوە و سەرکوتی بکات.

ب ـ جیابوونەوەی کۆمەڵگا و دەسەڵات لە ئیسلامی ئێران، ئەفغانستان، پاکستان و باشووری خۆرهەڵاتی ئاسیا بە رێبازێکی سێیانەی هاوشێوە پەرە دەسەنێت. بەو ئامانجەی بە هەڵە تێنەگەن بە گرنگیەوە ئاماژەی پێدەکەم، کاتێک دەڵێم پەرەسەندنی هێڵ ئاسا مەبەستم راستەهێڵی نییە، بەڵکو لێرەدا مەبەستم هێڵی دۆخی پەرەسەندنی بازنەیی دووبارە بووەوەیە. یەکێک لەو ناوچانەی ئیسلام کە دووچاری شێوەگرتنێکی ریشەیی هات ئێرانە. لە چوارچێوەیەکی بەرفراواندا پێویستە حیساب بۆ پاشکۆ و بەردەوامەکانی بکرێت و بەمجۆرە دەرکی پێبکرێت. ئەو ئیسلامەی لە ئێران شێوەی گرت، ئەو ئیسلامەیە کە گۆڕاوە. هەرچەندە بە گشتی بە شیعەش ناو ببرێت، بەڵام خاوەن دیدگا و راڤەیەکی بەرفراوانترە. لە ناوەڕۆکدا ئیسلامی ئەهلی بەیتی چینی ناوینە. لەو بروایەدایە کە پێویستە بەردەوام رێبەرایەتی بە دەست ئەهلی بەیتەوە بێت، ئەمەش وەک مافێک دەبینێت و بەبنەمای وەردەگرێت. ئەو کردەوە و رەفتارە ستەمکارانەی نەریتی سوننە و ئەمەوییەکان لەکاتی فەتحکردنی ئێران پەنایان بۆ برد ئەمجۆرە مەیلەی بەهێز کردووە. بەردەوام لە میانەی کوشتاری ئیمام حوسێنی نوێنەرە بژاردەکەی ئەهلی بەیت و حەفتا و دوو هاورێکەی لە کەربەلا یادی تاوانی ئەمەویەکان دەکرێتەوە. بە هۆی کلتوورە دەوڵەمەندەکەی و پەرەسەندنی بەشێوازی ئیمپڕاتۆریەت شێوەگرتنی ئیسلامی ئێران بە

چەشنێكی جیاواز لە نەریتی دەسەڵات و كۆمەڵگای عەرەب پێویستیەكی سروشتەكەیەتی. ئەوەی لێرەدا گرنگە هەڵوێستی پێكدادان و ناكۆكی دەسەڵات و كۆمەڵگای توێژەكانی سەروو و خوارووی چینی ناوینە. بەهۆی نەریت و فێربوونەكانی وەك میرات لە ئیمپراتۆریەت ماوەتەوە؛ توێژ یان چینی سەروو بە خێرایی ئیسلام بە دەوڵەتبوون دەگەیەنێت و هەوڵی ژیان دەدات. هەرچی چینی خوارووە چونكە خاوەن ئەو هوشیاریەیە كە بە درێژایی مێژوو چی بە دەستی دەسەڵات و خاوەنەكانی چەشتووە، هەوڵیداوە بەشێوەی كۆمەڵگای سڤیل و خەسڵەتی ركابەریتی دەسەڵات ئیسلام بژێنێت. دەشێت بەردەوام ئەو راستیە لە مێژووی ئێرانی ئیسلامیدا ببینرێت. كەچی لەراستیدا پاشخانێكی مێژوویی بەمجۆرەی ناكۆكی نێوان كۆمەڵگا و دەسەڵات بەردەوام هەبووە تا ناكۆكی میدیا - پارسی نەریتی زەردەشتی درێژ دەبێتەوە. دابەشبوونی پلەداری كۆمەڵگای قەبیلەش بنەچە و رەگەكەیان پێكدێنێت.

ئێران تەنیا خاوەنی نەریتی ئەتنیكی پارس نییە؛ چەندین نەریتی ئەتنیكی لەهەمان جوگرافیا جێگای باسە. لە جیابوونەوە كۆمەڵایەتیەكاندا تایبەتمەندێتییە ئەتنیكی و ئایینیەكان لەناویەكدا پەرەیسەندووە. لە بواری كۆمەڵگای سەروو و دەسەڵاتدا ناتوانین ئێران لەمیانەی تایبەتمەندییەك پێناسە بكەین كە لایەنی ئایینی یاخود ئەتنیكی لەپێش بێت. پێناسەكردنی وەك شێوەیەكی تایبەتی گونجاندنی بەناویەكداچوونی تایبەتمەندێتیە ئایینی و ئەتنیكیەكان. هەرچەندە ناوە بە ناوە یەكێكیان لە هەردوو لایەن دەربكەونە پێش، بەڵام بە درێژایی مێژوو دابەشبوونێكی رادیكاڵانە لە نێوانیاندا نەبینراوە. بۆ نموونە نە وەك عەرەبەكان بە مانایەكی كلاسیك بووە بە كۆمەڵگای قەوم، نە وەك یەهودیەكانیش توانیویەتی ببێت بە كۆمەڵگایەكی ئایینی. پێویستی بینیوە كە خۆی وەك مۆدێلی سێیەم ئاوا بكات. هەبوونی باوەڕیگەلێكی زۆری ئایینی و ئەتنیكی رۆڵێكی گرنگی لەمەدا بینیوە. لەسەر بنەمای ئەو راستیە پێشوازی لە كاریگەری ئەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری كردووە. نە ئەزموونێكی میلیگەرایی و دەوڵەت – نەتەوەی هاوچەشنی وڵاتانی ئەوروپای بەخۆوە بینیوە، نە دەوڵەت – نەتەوەیەكی بچووكی هاوشێوەی وڵاتانی عەرەبی بەخۆوە دیوە. خەسڵەتە مێژووییەكانی خۆی پاراستووە و بەرامبەر بە هەردوو مۆدێل لەسەر بەردەوامكردنی مۆدێلی خۆی سووربووە. هەر ئەو راستیەش لەژێر خۆڕانەگری و رووخانی ئێرانی شادا شاراوەیە. بەڵام بەرامبەر بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و سەرمایەداری جیهانگیری ناتوانێت بۆ ماوەیەكی درێژ بەردەوامی بەو شێوازەی ژیان و هەبوونی خۆی بدات. یان وەرچەرخانێكی ریشەیی ئەنجامدەدات (سەبارەت بە دەسەڵات و دەوڵەت ئەمە زۆر زەحمەتە؛ بوون بە دەوڵەت ـ نەتەوەیەكی لیبڕال مانای كۆتاییهاتنی مۆدێلی دەوڵەتی ئیسلامی ئێستایە)؛ یان پارچە دەبێت و لەسەر بنەمای پەسەند كردنی بەها هەنووكەییەكانی مۆدێرنیتەی دیموكراتی و بەها دیموكراتییە مەدەنیەكانی نەریتی ئیسلامی چینی خوارو وەك یەكێك لە هێزە لەپێشەكانی مۆدێرنیتەی دیموكراتی رۆڵی خۆی لە رزگاربوون لە كائیۆسی خۆرهەڵاتی

ناویندا دەبینێت و بەشێوەیەکی شایستە بە رابردووەکەی جێگای خۆی لە مێژوودا دەگرێت.

ج ـ تورکەکان یەکێکن لەو گەلانەی بنەچەیان بۆ گرووپە زمانی ئورال ـ ئاڵتای دەگەڕێتەوە، کە نزیکەی حەوت هەزار ساڵ بەر لە ئێستا لە سیبریای باشوور یەکەمین شێوەی خۆی وەرگرتووە. لەوێشەوە بەرەو خوارووتر دابەزیوە و بووە بە جڤاتەکانی قەبیلە. هەروەک لە کلتوورە هاوشێوەکانیش روویداوە، تورکە یەکەمینەکانیش لەمیانەی پەرەسەندنی شارستانیەتەوە دەرکەوتوونەتە سەر شانۆی مێژوو. بەتایبەتیش بە شارستانیبوونی پێشوەختی چینیەکان (١٥٠٠ پ.ز) کە لەهەمان گرووپی کلتووری دان، کاریگەری کردۆتە سەر بنەچەی تورکان و رێخۆشکەر بووە تا جێگای خۆیان لە مێژوودا بگرن. وەک زانراوە لە سەدەی سێیەمی پ.ز میرنشینی خۆجێییان دامەزراندووە. چەندەی دەبن بە دەسەڵات لەناو چیندا دەتوێنەوە. تەنیا بە شێوەی قەبیلە دەتوانن بوونی ئەتنیکی خۆیان بپارێزن. کاتێک لەگەڵ چینییەکان ناسازێن و دەرەقەتیان نایێن بەرەو خۆرئاوا دەڕۆن و بڵاوەبنەوە. زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، وشکانی و دژوارییەکانی بیابان و چۆلەوانی ئاسیای ناوین رۆڵێکی گرنگ دەبینێت. پەیوەندییەکانیان لەگەڵ شارستانی ئێرانی بۆ چەند سەدەیەک بەر لە زایین دەگەڕێتەوە. پەیوەندییەکی هاوشێوە لە رێگای هیندستانیشەوە جێگای باسە. ئەو کۆچبەرییەی سەدەی سێیەمی زایینی بەدواوە بەرەو خۆرئاوا چڕبوویەوە بۆ دوو ڕێڕەوی سەرەکی باشوور و باکووری دەریای قەزوین جیابۆتەوە. لە ساڵانی ٤٥٠ زایینی لە باکوور بە سنوورەکانی خۆرئاوای ئیمپراتۆریەتی رۆما گەیشتبوون، هێندە بەهێز ببوون کە ئیتر بتوانن داگیرکاری بکەن. لەناوەندی مەجەرستان (هەنگاریا) ی ئەمڕۆ دەکەنە ناوەند و دەتوانن بەرەو ناوەوەی ئیتاڵیا و فەرەنسا بڕۆن و پەلاماریان بدەن. بەڵام ناتوانن خۆیان بە دەوڵەت یان دەسەڵاتێکی دامەزراوەیی هەمیشەیی بگەیەنن. لە هەمان دیرۆکدا فشار بۆ سنوورەکانی ئێرانیش دەهێنن. هەروەها لە ساڵانی ٥٥٠ زایینی بۆ یەکەمین جار دەوڵەتێکی ئەتنیکی بە ناوی گۆکتورک ئاوا دەکەن. دوای ئەوەش دەوڵەتی تورکە ئویگورەکان[٢٣] (ساڵانی ٧٤٠) دێت کە ئایینی مانی وەک ئایینی فەرمی خۆی پەسەند کردووە. لە سەدەکانی هەشت و نۆ دا وەک سەربازی مووچەدار رۆڵێکی گرنگ لە ئیمپراتۆریەتی عەباسی و بێزەنتیدا دەبینن. بۆ یەکەمین جار لە سەدەی دەیەمدا بە شێوەیەکی بە کۆمەڵ ئیسلامیەت پەسەند دەکەن. قەرەخانەکان یش دەبن بە یەکەمین میرنشینی تورکە موسڵمانەکان.

لە سەدەکانی نۆیەم و دەیەمدا لە باکوور و خۆرهەڵاتی قەزویندا دەوڵەتێکی تورکی یەهودی ئاواکراوە. یەکەمین تیرەکانی بوونە موسڵمان و بۆ ناوەوەی ئێران شۆڕبوونەوە تورکە ئۆغوزەکان بوون کە وەک خانەدانی سەلجۆقی دەناسرێت. لە کاتێکدا سەلجۆق

---

[٢٣] ئویگورەکان: جڤاتێکی گەلی تورکە، بە شێوەیەکی گشتی لە ناوچەی تورکستانی رۆژهەڵات نیشتەجێیە. لە هەندێک ناوچەی باشووری ناوەڕاستی چین یش نیشتەجێن، مانای وشەی ئویگور واتە یەکێتی.

بەگ لە دەوڵەتی خەزەری یەهودیدا (ألدولة أليهودية ألخزرية) ئەفسەرێک (لە ئاستی سەرتیپیدا) بوو، بۆ یەکەمین جار لە تورکمانستانی ڕۆژی ئەمڕۆمان لەنێوان ڕووبارەکانی سەیهوون و جەیهوون هەنگاوی ئاواکردنی دەوڵەت بۆ قەبیلەکەی دەهاوێژرێت. شەڕ و پێکدادانی دژوار ڕوودەدات. وەک چینی سەرووی قەبیلە ئەزموونی دەسەڵات بەدەست دێنن. شاڵاوەکانی بەدەستهێنانی غەنیمەت ئەنجامدەدەن. ئەو واقیعە تێدەگەن کە لە پێناو بە دەستهێنانی سەرکەوتن و غەنیمەتی زیاتر پێویستە بێنە ناو ئیسلامەوە. هەر لە سەدەی نۆیەمەوە گرووپێکی گرنگی سەربازی مووچەداری کۆشکی عەباسیەکان پێکدێنن. شاری سامەڕایان بۆ ئاوا دەکرێت. یەکینەکانی تیرەی سەلجۆقی تا ناوەوەی وڵاتی بێزەنت دزە دەکەن و پەلاماریان دەدەن، غەنیمەت کۆ دەکەنەوە. تورکە کرستیانەکان لە بەرامبەر خۆیاندا دەبیننەوە. لە سەرەتاکانی سەدەی یازدەهەم بە گشتی دەبن بە موسڵمان. سەلجۆق بەگ لە ساڵی ١٠٠٨ کۆچی دوایی دەکات. لە ناوی کوڕەکانی کە جێگای دەگرنەوە میکایل، مووسا، یونس و ئەرسەلان دیارە کە کاریگەریەکی زۆری یەهودیەکانی لەسەرە. لەو قۆناغەدا ناکۆکی و جیابوونەوەی نێوان چینی دەوڵەمەندی سەروو و توێژە هەژارەکانی خوارووی قەبیلە خەست دەبێتەوە. یەکەمین قەبیلەکانی لە هێز و نوخبەی دەسەڵات دادەبڕێن لە ساڵی ١٠١٨ بە دواوە دەچنە ناوەوەی ئێران. داوا لە کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران دەکەن بەرامبەر بە سەرۆک قەبیلەکان بیانپارێزن. بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا گەلی تورکمان (بەرامبەرەکەی لای عەرەب بەدەویەکان، لای کوردانیش کرمانج) بە سیفەتی قەبیلەکان بەرامبەر بە بەگەکانیان رادەبن و خوازیاری ژیانێکی سەربەخۆن.

ئەو یەکەمین جیابوونەوە جددییەی لە کۆمەڵگای قەبیلە تورکەکان دەرکەوت دواتر کاریگەرییەکی هەمیشەیی لە مێژوودا دەبێت. ئەو جیابوونەوەی لەسەر بنەمای دەسەڵات و کۆمەڵگایە، ململانێیەکی زۆر دژوار لەگەڵ خۆیدا دێنێت. لەو مێژووە (مێژووی تورک ـ ئیسلام) بەدواوە دیاردەی تورک بەشێوەی دووباڵ پەرەدەسەنێت کە لە نێوان خۆیاندا ناکۆکن و لەناو ململانێدان. چینی سەرووی قەبیلەکان کە لە دەوری ئامێر و دەزگاکانی دەسەڵات خۆیان ڕێکخستووە و دواتر ئەو شێوازەی ژیان بۆخۆی دەکات بە کێشەی مان و نەمان. ژیانێک لەسەر بنەمای دەسەڵات کە لە سەردەمی دەوڵەتی تورکی یەهودیەوە پێکهاتووە چەندەی دەچێت بەهێز دەبێت و تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان دێت. ژیان بەبێ دەوڵەت و دەسەڵات بۆ ئەو گرووپە نوخبانەی هێز بەردەوام وەک مردن بینراوە. جیاکاری دەسەڵاتیان بۆ ئاستی ئایینێک بەرز کردۆتەوە (دەوڵەتی پیرۆز، دەوڵەت دایک ـ باوکە). پەیوەندی جەستە(تەن) = سێبەر لە نێوان خودا و دەوڵەت (ظل ألله = سێبەری خودا) دروستکراوە. وشەکانی خودا، ڕەب، ئەڵڵا کە دەستەواژەگەلێکی ئاسمانین زیاتر لە دیاردەی دەوڵەتدا بەرجەستە بووە. لەو چوارچێوەیەدا هەم لە ناوەوە هەمیش لە دەرەوە بەگە سەلجۆقیەکان بوون بە جەنگاوەرێکی سەرسوڕهێنەری دەوڵەت و دەسەڵات. جگە لەو کارە ئیتر سەرقاڵی هیچ کارێکی دیکە نەبوون. لە چەندین دەوڵەتی خانەدانی لە جۆری عەباسی، خەزنەوی، سامانی، ئاتابەگ و تۆلۆن ئۆغوڵلاریدا وەک هێزی سەرەکی

سەربازی خزمەتیان کردووە یاخود خۆیان دەوڵەتیان ئاواکرد. لە ساڵی ١٠٥٥ ئیمپڕاتۆریەتی سەلجۆقییان دامەزراند. دوای شەڕی مەلازگردی ١٠٧١ لە هەر لایەکی ئەنادۆڵ میرنشینیان ئاواکرد. لە ساڵی ١٠٨٦ ئیمپڕاتۆریەتی سەلجۆقییان لە ئەنادۆڵ دامەزراند. شەڕی نێوان خودی میرنشینەکان تا دامەزراندنی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی بەردەوام بوو. لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانیدا بە بەرزترین ئاستی دەسەڵات گەیشتن. لە چڕبوونەوەی تەواوی ئەو دەوڵەت ـ دەسەڵاتەدا شەریعەتی ئیسلام پێوەرە سەرەکیەکان (پێوەرە یاساییەکان)ی پێکدەهێنا. مەزهەبی سوونی ئیسلامیش ئامرازی سەرەکی مەشروعیەت بوو.

بە گشتی ئایین، بە تایبەتیش ئایینی ئیسلام لای نوخبەی دەسەڵاتی تورک مانای ئامرازێکی دەسەڵات دەبەخشێت. لە دەرەوەی دەسەڵات ئایین هەڵگری بەهایەکی ئەوتۆ نییە. ئەگەر زۆر بە باشی ئاگاداری میتافیزیای دەسەڵاتی تورک نەبیت ناتوانیت شیکارێکی راست سەبارەت بە دەوڵەت و کۆمەڵگا ئەنجامبدەیت. ئەوەی ئەنجامیش دەدرێت هەڵگری بەشێکی گەورەی هەڵە و کێماسیەکان دەبێت. نوخبەی دەسەڵاتی تورک هەر لە سەردەمی یەکەمین میرنشینەوە، تەنانەت لە پلەداری سەرووی قەبیلەدا وێنە و دەستەواژە شامانیەکانی پیرۆز کردووە و پەرستوونیەتی. پەرستنی رەمزی هاوشێوەی ئاڵای ئەمڕۆ سەرچاوەکەی لەوێوە دێت. پەرستنی تەوتەمی قەبیلەش تا بڵێی نفوزی پەیدا کردووە. ئەو فەتیشیزمەی ناو بە پیاو نابەخشێت تا قارەمانێتیەک نەنوێنێت؛ گرێدراوی ئەو دۆخەیە. پەرستنی ئەسپیش گرێدراوی ئەو مەسەلەیە. لە دەسەڵاتی میرنشینەکاندا سێکوچکەی ئەسپ، ژن، چەک (پوسات) پیرۆزترین بەهاکانی ناموسن و تەنانەت خودی ژیانن. ژیانی دەسەڵات مانای ئەسپ، ژن و چەکە. ئەم سێ بۆهێڵە سەرەکییە لە خانەی بنەڕەتی دەسەڵاتدا جێگیربووە و کراون بە تایبەتمەندێتی بۆماوەیی. لە بەرزترین ئاستدا گرێدان لە نێوان ئەڵڵای ئیسلامیەت و دەسەڵات دروستکراوە، بە شێوەیەکی شاراوە خودا ـ دەسەڵات هاوواتا و یەکسانکراون، لەو سۆنگەشەوە؛ زۆرترین پیرۆزی بە دەسەڵات و دەوڵەت دراوە. هەڵبەتە ئارەزووی دەست بەسەرداگرتنی غەنیمەت (ئامانجی فەتحکردن؛ مافی دەستبەسەرداگرتنی هەر شتێکی هەبێت) لەژێر ئەو پیرۆزکردنەدا شاراوەیە.

وێڕای ئەوەی نوخبەی دەسەڵاتی تورک لەمیانەی ئەو دەستەواژانەوە پێشەنگایەتی ئەو گەورەکردنەی دەسەڵاتیان کردووە لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا، بەڵام تەنیا ئەوان نین. ئەو هێزانەی لە سەردەمی چاخی ناوینەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان پێشەنگایەتی نوخبەکانی دەسەڵاتیان کردووە لەناو یەکتردا تواونەتەوە. ئەو تورکێتیەیە کە بە ناو تورکە بەڵام لە سەرووی هەمووانەوە تورکمانەکان و تورکی کۆمەڵایەتی دەچەوسێنێتەوە و کردوونیەتی بە"ئەتراکی بێئیدراک" (تورکە جاهیل و نەزانەکان). دیسان ئەوەی بە زۆردارترین شێوە بەرامبەر تورکێتی کۆمەڵایەتی رەفتار دەکات و دەیچەوسێنێتەوە ئەو تورکێتییەیە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو سەرکوتکردن، چەوسانەوە، داگیرکاری و قڕکردنەی تورکێتی دەسەڵات لە سەر تورکمانەکانی پەیڕەو کردووە لەسەر هیچ کۆمەڵگا یان گەلێکی

جێبەجێ نەکردووە. لەو بارەیەوە چەندین ڕێگە و ڕێبازی هەمەجۆر پەیڕەو کراون. لە سەرووی هەمووشیانەوە بەسەربازکردنیان تا مردن، سەپاندنی باجی تایبەت، مەحکوم کردنیان بە جەهالەت و نەزانی، لە بەرامبەر بچووکترین پەرچەکرداردا کۆمەڵکوژ کردنیان، تالانی بەردەوام و نەفیکردن، بەکورتی تا دوایی پرەنسیپی "گۆشتی بۆ تۆ، ئێسکی بۆ من"یان جێبەجێ و پەیڕەو کردووە؛ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆشماندا لە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار کۆکراونەتەوە، وەک پێویستیەکانی قۆرخکاری قازانج نیوەی زیاتریان بێکار دەهێڵرێنەوە، دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوە دەگەیەنرێتە بەرزترین ئاست و بە سیفەتی کلتووری کۆمەڵایەتی بەهیچکردنیان هەندێک لەو ڕێچکە و ڕێبازانەن. دووەمین پۆلینی تورکێتی یاخود تورکمانێتی کە لەسەر ئەو بنەمایە پێکهاتووە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی زۆر جیاوازترە.

هەر لە سەردەمی سەلجۆق بەگەوە تورکمانێتی (تورکە موسڵمانەکانی دەرەوەی دەسەڵات) جیابوونەوە ریشەییەکەی خۆی لەگەڵ دەسەڵات پیشانداوە. یەکەمین گرۆپی تورکمانە هەژارەکان لە ساڵی ١٠٠٥ بۆخۆپاراستن بەرامبەر بە زۆرداری بەگەکان پەنایان بۆ خەزنەویەکان بردبوو. دواتر بۆ دەڤەرە جیاوازەکانی ئێران ڕۆیشتن بە تایبەتیش بۆ باکووری خۆرئاوا واتە بۆ ئازەربایجانی ڕۆژی ئەمڕۆمان پاشەکشێیان کردووە و هەوڵی خۆپاراستنیان داوە. بەشێوەی لقی بەرفراوانەوە لە خاکەکانی سوریا و ئێراقی ڕۆژی ئەمڕۆمان هەوڵی حەوانەوەیان داوە. لەو سەدە یەکەمینانەدا بەردەوام دابڕان جێگای باس بووە. لەسەر ڕێڕەوی باکووری قەزوینیش پەرەسەندنی هاوشێوە ڕوویانداوە. بەگ و سوڵتانە سەلجۆقیەکان بۆ خۆ ڕزگارکردن لە تورکمانەکان بەردەوام بەرەو عەرەبستان، کوردستان و ئەنادۆڵ ڕاپێچیان کردوون. جگە لەوانەی بە کەڵکی سەربازی هاتوون ئەوانەی تریان ڕووبەڕووی چارەنووسی خۆیان کردۆتەوە. زنجیرە شاخەکانی دەریای ڕەش، دەریای سپی و کوێستانەکانی ئەنادۆڵی ناوین پڕبوونە لە تورکمانەکان. هەلومەرجە سەختەکانی ژیان، چەوسانەوە و سەرکوتکردن بەردەوام تورکمانەکانی بەرەو یاخیبوون بردووە. بەندکردنی سوڵتان سنجار لە قەفەسێکدا و هەڵگرتنی لەگەڵ خۆیاندا، دابڕانیان لە سوونیگەرایی دەسەڵات و عەلەویبوونیان، ئاواکردنی چەندین تەریقەت و پەرەپێدانی کۆمەڵی مەدەنی (لە ئەحمەد یەسەویەوە تا مەولانا، لە بابا ئیسحاقەوە تا شێخ بەدرەدین، لە پیرسوڵتان عەبداڵەوە تا شێخ ئیسماعیل، لە ڕاپەڕینی جەلالیەوە تا دەگاتە ڕاپەڕینی کاسبکاران) و ئەنجامدانی چەندین ڕاپەڕین لەو پێناوەدا دەشێت وەک نموونەگەلێکی گرنگ پیشان بدرێن. لە وتەکانی پیرسوڵتان عەبداڵ، قەرە ئۆغلان[٢٤]، کۆر

---

[٢٤] قارەجە ئۆغڵان (١٦٠٦ ـ ١٦٧٩ یان ١٦٨٩): شاعیرێکی میللی بەناوبانگی تورکمانە. زۆربەی ژیانی لە چوقورئاوا و مەرعەش و عەنتاب بەسەر بردووە. لە ڕۆژگاری ئەودا ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بە نسکۆی ئابووری و ململانێی ناوخۆییدا تێدەپەڕی. هۆنراوەکانی زیاتر باس لە شێوازی ژیانی گەڕۆکیانەی گەلەکەی دەکات و ئەشقی خۆی بۆ مرۆڤ و سروشت دەربڕیوە و شێوازێکی نوێی بۆ ئەدەبی ئەشق داهێناوە. مژارەکانی وەک غوربەتی و جودابوونەوە و سۆز و مردنی کردۆتە هەوێنی هۆنراوەکانی. (وەرگێڕ)

ئـۆغلان و داداڵ ئۆغلـو بـە شـێوازێکی ئەفسـانەیی کلتـووری بـەرخودانی خۆیانیـان خستۆتەڕوو. بەرامبەر بەزمانە تێکەڵەکەی عەرەبی و فارسی سەمەرەکەی دەسەڵات دیسان تورکمانەکان پارێزەری زمانی پەتی تورکی بوون. بەشێوەیەکی دۆستانە لەگەڵ گەلانی خۆرهەڵاتی ناویندا ژیاون، لە بەیەکەوە ژیانێکی ئارەزوومەندانەدا دوودڵییان نەکردووە.

تورکمانێتی بە سیفەتی کلتووری کۆمەڵایەتی لەلایەنە ماددی و مەعنەویەکەیەوە پێویستی بە توێژینەوەی بەرفراوان هەیە. پێویستی بە ئافراندنی مێژووی کۆمەڵایەتی خودی خۆیان هەبوو. لە سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بوونی تورکمانەکان لەمیانەی هەلومەرجی سەختترەوە دەورە دران. دەرفەتەکانی ژیانی جێنشینی و کۆمەڵگای کۆچبەری کەم بوویەوە. وەک بڵێی راپێچکردنیان بۆ ژیان لە دژوارترین و مەترسیدارترین دەڤەرەکاندا بەس نەبووە، لە رۆژی ئەمڕۆمان بە شێوەی بێکاری، کۆچبەری بۆ دەرەوە و کۆبوونەوەیان لە گەڕەکەکانی دەرەوەی شار لەناو هەلومەرجێکی زۆر سەختدا هەوڵی بەردەوامکردنی هەبوونی خۆیان دەدەن. تورکمانێتی مێژوویی کە هێندەی نەتەوەیەک واتا بەخشە، لەناو چەرخی چەوسانەوە و سەرکوتکاری قۆرخکارییەکانی سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوە، هەروەها لەناو مەنگەنەی پارتییە فاشیست و ئایینگەراکانی دەوڵەت رووبەڕووی لەناوچوون بوونەتەوە. ئاوانەکردنی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی رۆڵێکی گرنگی لەو دۆخەدا بینیوە. بزاوتی فاشیست و ئایینگەرایی کە ئامانجیان دەوڵەت ـ دەسەڵاتە ئەو بۆشاییەیان پڕکردۆتەوە، تایبەتمەندێتییە ئەرێنییەکانی تورکمانێتییان پێچەوانە کردۆتەوە و گەورەترین خیانەتیان ئەنجامداوە، بەمجۆرەش گورزێکی کوشندەیان لە کلتووری تورکمانێتی کۆمەڵگای ـ مێژوویی داوە کە گوزارشت لە بەهاگەلێکی مەزن دەکات. پێویستە زۆر باش تێبگەین کە تورکێتی تورکمانی کۆمەڵگای مێژوویی ئاسیای ناوین و قەفقاسیا بە گشتی، ئەنادۆڵیش بە تایبەتی پێکهاتە و دیاردەیەکی زۆر جیاوازترە لەو تورکێتییە میللیگەرا، ئایینگەرا، رەگەزگەرا و دەسەڵاتگەراییەی لە چەرخەکانی دەسەڵات ـ دەوڵەتدا پێکهاتووە. هەروەها لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە تورکمانەکان لە بونیادە پیلانگێڕ ـ فاشیستەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە جیا بکەینەوە کە لە ئەمامگەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و لەلایەن ئەندامە ناتورکەکانەوە بە ساختەکارانەترین شێواز پێکهاتووە و بە رەنگەکانی سپی ـ رەش ـ سەوز داپۆشراوە، لەسەر بنەمای کۆماری دیموکراتیک، نیشتیمان و نەتەوەیەکی دیموکراتیک بۆ فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک وەرچەرخێنرێت. لەو پێناوەشدا پێویستە سیاسەتی دیموکراتییانە، کۆمەڵی مەدەنی و رێکخستنی خۆبەڕێوەبەرێتی و چالاکیەکەی بە بنەما وەربگیردرێت، ئەمەش لەگەڵ کلتووری نەریتی تورک ـ تورکمانی بکرێت بە سەنتێز و کلتوورێکی هاوچەرخ پێشبخرێت. کێشەی سەرەکی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی تورکیا؛ پێناسەکردنێکی راستی ئەو کلتوورە بە هەموو لایەنە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکانەوە، لێکۆڵینەوە و خاوەندارێتیکردنە، لەو پێناوەشدا پەروەردە و رێکخستەی بکات و لەمیانەی پراکتیزەکردنیەوە لەگەڵ سیستەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا ئاوێتەی بکات.

جگە لە تورکمانەکان کلتوور و گەلانی دیکەش لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا هەبوون کە بە کلتووری ئیسلامیەوە دەژیان. ئەو کەمینە عەرەبەی لە باشووری شاخەکانی تۆرۆس دەژین پاشماوەی سەردەمی فەتحی ئیسلامین. کلتووریکە لەو کاتەی جیاکاریەکانی دەسەڵاتی لەدەستداوە چەندەی دەچێت هەژار و نەدارتر دەبێت. چینی سەرووی لەناو نوخبەی حوکمڕانی تورکدا تواوەتەوە. کلتووری عەرەبی چین و توێژە هەژارەکانیش بەهۆی ئاسیمیلاسیۆنەوە دواکەوتووە و ئیتر بە پێی بەسەرچوونی قۆناغ بەکار ناهێنرێت. لەگەڵ ئەوەی بە شێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ کوردان دەژین، بەڵام بوونی خۆیانیان پاراستووە. بەردەوامکردنی بوونەکەیان لە هەلومەرجی سەرمایەداریدا تا دەچێت سەختتر دەبێت.

گرۆپە ئەلبان[٢٥]ی و بۆشناقەکانی بنەچەیان بۆ بەلقان دەگەڕێتەوە نوێنەرایەتی کلتوورێکی پەیوەست بە دەسەڵات دەکەن. سەبارەت بە ناسنامە جیابوونەوەیەکی ئەوتۆیان بەخۆیانەوە نەدیوە. هەوڵیانداوە لەناو بیروکراسیدا درێژە بە بوونی خۆیان بدەن. تا بڵێی پابەندی ئایدیۆلۆژیای فەرمین. وەک پێویستیەکی بەرژەوەندیەکانیان بەرگریەکی زۆر لە میللیگەرایی تورک دەکەن. توێژە هەژارەکانی لە بواری چەندایەتیەوە کەمترن بوونەتە پرۆلیتاریا و جێگای خۆیان لەناو چالاکیەکانی بزووتنەوەی ڕەنجدا دەگرن. وەک پێویستیەکی ئایدیۆلۆژیای فەرمیش سەبارەت بە مەسەلەی ئینتیمای ئەتنیکی داکۆکی ناکەن.

قەفقاسیەکان زۆربەی گرۆپەکان پێکدێنن. بەستنی پەیوەندی نزیک لەگەڵ دەسەڵات، شوێنگرتن لەناو هێزی دەسەڵات جێگای خۆی لەناو کلتوورەکەیاندا کردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی حەسرەتی گەڕانەوەی وڵاتی دایکیان هەیە، بەڵام تا ڕابردوویەکی نزیکیش گەڕانەوە خەیاڵبوو. دوای هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت دووبارە پەیوەندییان لەگەڵ وڵاتی دایک بەستەوە. بە ڕەچەڵەک بەلقانیەکانیش لە دۆخێکی هاوشێوەدا دەژین. لایەنگریکردنی لایەنی بەهێز نەریتێکی چینی سەروویانە. وەک چۆن لە ئاستی پێشەنگایەتیدا جێگای خۆیان لەناو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکاندا گرتووە، بەهەمان شێوە جێگای خۆیان لەناو بزووتنەوە ڕاستڕەوەکانیشدا گرتووە.

وێڕای ئەوەی وەسفکردنی خاکەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا بە مۆزائیکی کلتووری دەستەواژەیەکی گونجاوە، بەڵام جێگای داخە وەک رووی ئەو مۆزائیکانەی لەژێر خاک دەرکەوتوون چەندەی بڵێیت شڕبوون و لە کار کەوتوون. بەهۆی پرۆژەی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆ ئافراندنی کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەن (لێکچوو) ئەو مۆزائیکە کلتوورییە وەک وردەبەردی چەوی لێهاتووە، کۆمەڵکوژی بەرامبەر بوونیان ئەنجامدەدرێت. هەرچەندە بوونە

---

[٢٥] ئەلبانییەکان (ئەرناتۆتییەکان): گەلێکی دێرینن و بە زمانی ئەلبانی قسە دەکەن و نزیکەی هەشت ملیۆن و نیو دەبن و زۆرینەیان لە ئەلبانیا دەژین و هەندێکیشیان لە کۆسۆڤۆ و سربستان و مەکەدۆنیا و چیای ڕەش و تورکیا و یۆنان و ئیتاڵیا دەژین. زۆربەیان لەسەر ئایینی ئیسلامن (سوننی و بەگداشیین)، هەندێکیشیان مەسیحیین (ئەرسەدۆکس و کاسۆلیکیین). (وەرگێڕ)

کلتوورییەکان لەپێگەی کەمینەش دابن، بەڵام میراسێکی مێژوویین کە مسۆگەر پێویستە بپارێزرێن. خەسڵەتی کۆمەڵکوژانەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەشێوەیەکی بەرچاو لەو سیاسەتانە ڕەنگدەداتەوە کە بەرامبەر ئەو کلتوورانە پەیرەوی کردوون. ئەمەش گرنگترین بەشی ئەو کۆمەڵکوژیانەیە کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە هەر چوار لای دونیا ئەنجامیداوە و لە ڕێگایەوە چەندین پێکهاتەی کلتووری لەناو بردووە. شانبەشانی پەیرەوکردنی توندوتیژی لەسەر ئەو پێکهاتە کلتوورییانەی کەمینەن، لە بواری ئابووریشدا بێ دەرەتان دەکرێن و تەنانەت دەرفەتی ژیانیشیان پێنادرێت. ئیتر ئەو ڕێسایە پەیڕەو دەکرێت: ئەگەر بەردەوامی بە کلتووری خۆت بدەیت و ڕادەستی کلتووری فەرمی زۆرینە نەبیت ئەوا بە بێکار و بەبرسێتی دەمێنیەوە! ئەگەر تەقلی کلتووری فەرمی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبیت، دەستبەرداری کلتووری خۆت نەبیت و ئەو تەقلیبوونە نەکرێت بە ڕادەستبوون ئەوا لە ڕێگای هەزار و یەک کەند و کۆسپەوە جێگاگرتن لە کۆمەڵگا و بەرەو پێشڤەچوون ئەستەم دەکرێت. بەمجۆرەش ئەندامێتی کۆمەڵگای فەرمی هۆمۆژەن دەکرێت بە ناچاری.

ئەزموونی فاشیزمی دووەمین جەنگی جیهانی کە لە ئەوروپا ڕوویدا مۆدێرنیتەی ناچارکرد چاوێک بە پرۆژەی کۆمەڵگای هۆمۆژەندا بخشێنێتەوە. لەمیانەی پرۆژەی یەکێتی ئەورووپاوە وەک ئەلتەرناتیڤێک گەڕانەوە بۆ فرەکلتووری جێگای باسە. لەگەڵ ئەوەی پۆست مۆدێرنیتە خاوەنداریێتی لە بەهای فرەکلتووری دەکات، بەڵام لە بوون بە ئەلتەرناتیڤی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دوورە. سەرجەم ئەو کلتوورانەی لەدەرەوەی ناسنامەی کلتووری فەرمی دەژین لە دواشیکاردا مارژیناڵ دەکرێن، یان لەخۆیەوە یان لەمیانەی ڕێبازە ناراستەوخۆکانی چەوسانەوەی سەرمایەداری و سەرکوتکردن یاخود لە ڕێگای سیاسەتەکانی ئافراندنی کۆمەڵگای هۆمۆژەن لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەوە ڕووبەڕووی لەناوبردن و ژینۆساید دەبنەوە. ڕاستترین ڕێگای بەرەنگاربوونەوەی ئەو ڕەوشە؛ لەپێناو پاراستنی بوونی کلتووری و ئازادکردنی پێویستە چەمکی ناسنامەیەکی کلتووری کراوە پەسەند بکرێت، ئەمەش لەگەڵ کلتوورەکانی دیکە بکرێت بە سەنتێز و لە ئاستێکی بەرزتردا پرۆژەی ژیانی هاوبەش پێشبخرێت. نەتەوەی دیموکرات، هاونیشتیمانی دەستووری، کۆماری دیموکراتیک و چەمکی فرەکلتووری و نیشتیمانی هاوبەش سەرەکیترینی ئەو پرۆژانەن. سیاسەتی دیموکراتیک، ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی و خۆبەڕێوەبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە سەرەکیترین ئامرازەکانی جێبەجێکردنی ئەو پرۆژانەن. هەم لەپێناو پاراستن و ئازادکردنی کلتوورە نەریتییەکان، هەمیش بۆ ئەوەی وەک سەنتێزێک لەگەڵ کلتوورە هاوچەرخەکان بژین، ڕێگەچارەی مۆدێرنیتەی دیموکراتی پێویستیەکی ژیانییە.

**ب . راستینەی کورد لە سەردەمی سەرمایەداریدا**

لە سەردەمی منداڵیدا کاتێک رووبەڕووی سیستەمی پەروەردەی سەرەتایی تورک بوومەوە، راستینەی کورد کە ئەو کاتە وەک خەیاڵێک هەستی پێدەکرا چەندین پرسیاری لە فیکر و رۆحمدا دروست کردبوو. بە شێوەیەکی ئاسایی تورکاندنم پەسەند نەدەکرد. بەهۆی ئەو داسەپاندنەش لە قووڵایی رۆحمدا هەستم بە کاریگەریەکانی سووکایەتی پێکردن دەکرد. یەکەم شتی بە ئەقڵمدا گوزەری کرد، گەڕان بوو بەدوای رایەڵە خێزانیەکانمان؛ ئاخۆ پەیوەندییەکی بە تورکێتیەوە هەیە. ئەو پەیوەندییە دوورەی خزمایەتی کە لەرێگای دایکەوە هەبوو، نەدەبوو بە چارەسەرییەکی ئەوتۆ. هەر چۆنێک بێت کوردێتیەکی پیاوسالاری ئاشکرا و بەرچاو بوو. نەمدەتوانی لەو راستینە رابکەم. بەڵام هەر لەچوارچێوەی ئەو راستینەشدا لە قوتابخانەی سەرەتایی دووچاری یەکەمین زام و برین هاتم. یەکەمین بەرکەوتنم بە کوردێتی؛ کە بۆ من راستینەیەکی زۆر بە کێشە بوو، بەمجۆرە یەکەمین هوشیاری لای من ئافراند. هەمان هەستیاری لای هاوتەمەنەکانم جێگای باس نەبوو. بۆ نەهێشتنی ئەو جیاوازییەی نێوان خۆم و منداڵانی گوندە کۆنەکەی ئەرمەنیان کە تورکێتی کۆماریان پەسەند کردبوو، بە بەدەستهێنانی رەزامەندی مامۆستایان تێپەڕ دەبوو. وەک دیار دەبێت هەر لە سەرەتاییەوە هەوڵ و کۆششەکانم لەپێناو یەکەمینی پۆلدا، رێبازێکی بەرگری بووە بەرامبەر هەر دۆخێکی نەرێنی کە سەرچاوەی خۆی لە راستینەی کوردەوە وەردەگرێت. بەمجۆرە خوازیاری سەلماندنی تایبەتیەتی (خصوصیتی) خۆم بووم. لەوەشدا سەرکەوتوو بووم. تا دوا قۆناغی زانکۆش بەردەوام ئەو چیرۆکانەی سەرکەوتنم دووبارە کردەوە. لەمیانەی ئەو رێبازمشەوە جددییەتی خۆم بۆ "دۆست ـ دوژمن" سەلماندبوو و پیشانم دابوون کە دەتوانم ببم بە مرۆڤ. ئیتر دەمتوانی دەست بۆ کاری گرنگ ببەم.

هەروەها لە رێگای دەرخکردنی سورەتەکانی قورئانەوە هۆشیاری ئایینیم بەدەست هێنابوو کە لە راستیدا زیاتر شتێکی نەریتییە. سی و سێ سورەتی بچووکم دەرخ کردبوو. بەجۆرێک هەڵکشابووم کە ئیتر بۆ نوێژکردن جێگای خۆم لە نزیک مینبەری ئیمامی گوند کردبوویەوە. وەڵامێکی بەمجۆرەم لە ئیمام وەرگرت: "عەبدوڵلا بەو خێراییە بەردەوام بێت دەفرێت!" ئەو هەوڵەشم رێبازێکی دیکەی لە دەرگادان و بە کاریگەربوون بوو. بەمجۆرە لەناو کۆمەڵگای باوی نەریتیشدا پێگەی بەرچاوم بەدەست هێنابوو. ئەو دوو رێبازەم لا بەس بوو. ئارەزووییەکی ئەوتۆم سەبارەت بە بابەتەکانی دیکە جێگای باس نەبوو. ناوە بە ناوە کاتێک عەمەلە (کرێکار)تیشم دەکرد دەبووم بە نموونە. سەبارەت بە بابەتەکانی دیکەش دوورە پەرێز دەبووم. هەڵبەتە مەشی چیاکان، مارکوشتن و گرتنی چۆلەکەش بابەتگەلێک بوون کە پێشەنگایەتیم دەکردن.

یەکەمین جار لەساڵی ١٩٦٩ دا سەرەتا بوێری هەنگاونانم بۆ هزری سۆسیالیستی پیشاندا، لە ساڵی ١٩٧٠شدا بۆ کوردایەتی هەنگاوم نا. شێوازی تاوتوێکردنم بۆ ئەو راستیانەی لە ناواخنی خۆیاندا هەڵگری کێشەگەلێکی گەورە بوون، سەرەتا لە تایبەتمەندیگەلێک تێبەڕی نەکرد کە لایەنی باوەڕی و دۆگمایان لە پێشە. قۆناغ سەردەمی شۆڕشگێڕیتی دروشم بوو. لە ڕێگای چەند دروشمێکی سەرەکیەوە هەوڵی هەنگاونانم دەدا. هەڵبەتە بەردەوام تێبینی پسپۆر و شارەزاکانم دەکرد: دروشمەکانی "کورد هەیە"، "کێشەی کورد هەیە"، "مافی چارەی خۆنووسینی گەلان مافێکە"، "مافی ئاواکردنی دەوڵەتیش هەیە"، "راستترین ڕێگای چارەسەرکردنی دۆزی میللی سۆسیالیزمە"، "دەشێت شەڕی رزگاری نیشتیمانی ڕەچاو بکرێت"، "ئەگەر پارتی هاوبەشیش نەبێت دەشێت پارتێکی نەتەوەییش بێت"؛ ئەوانە سەرەکیترین دروشمە پیرۆزەکانم بوون.

لە بواری کرداریشدا هەر لە منداڵیەوە نێچیرڤانێکی باشی هاوڕێ و برادەربووم. ئاواکردنی یەکینەی منداڵان کێشەی سەرەکیم بوو. لەو پێناوەشدا هەموو شتێکم بەکاردەهێنا. لە ڕێگای هاتووچۆم بۆ قوتابخانە گروپی نوێژکردنی خۆمم دروست کردبوو و پێشنوێژیم بۆ دەکردن. ماوەکانی کوشتنی مار، هێرشەکانی کوشتنی چۆلەکە و هەڵمەتەکانی کۆکردنەوەی گوڵ بەردەوام لە ڕۆژەڤدابوو. بەردەوام بیانوویەکم دەدۆزیەوە و دەچوومە لای هاوڕێیە منداڵەکانم. لەو بارەیەوە خانەوادەکانیان تا بڵێی وریا ببوونەوە. ئیتر لە ڕێگایەک دەگەڕان تا منداڵەکانیان لە من دووربخەنەوە. هەرچۆنێک بێت لە روانگەی ئەوانەوە من " Dînê Çolê شەیدای چۆڵ و چیا" بووم. ئەوجۆرە لێگەڕین و دیدەوانیانەشم روونی دەکاتەوە، رووخسارەکانی کۆمەڵگای نەریتی و مۆدێرنم بەس و تێرکەر نەدەبینی. بۆشاییەکی قووڵ لە ڕۆح و زهنمدا دروست ببوو. بە یەکێک نەدەچووم کە بە ئاسانی رازی بێت. دانا پیرەکەی گوند جارێکیان ئاگاداری کردمەوە و پێی گوتم: "چییە وەک جیوە لە جێگای خۆت ناوەستیت"، بەراستیش لەسەر ئەو ڕێچکەیە بووم. دەستەواژەکانی وەستان و وێستگەی وەستان لە فەرهەنگی مندا دروست نەبیوو. بەو خێراییەوە کاتێک گەیشتمە دواقۆناغی زانکۆ، ئیتر ئەزموونی کاملبوونم دەربازکردبوو، بەدۆخێک گەیشتبووم هەنگاوی جددی بۆ کاری پیرۆز بهاوێژم.

لەسەرەتای ١٩٧٠کان کاتێک دەستم بۆ کارە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی کوردان برد تابڵێی لەنێو ناکۆکیدا بووم. وەک بڵێی لە هەمانکاتدا لەناو کەسایەتیەکی لاو و بەساڵاچوودا دەژیام. لە نەریت دابڕابووم، بەڵام مۆدێرنیتەشم پەسەند نەکردبوو. هەردووکیشیان وەک پۆشاکێکی ناجێگیر و ساختە پێمەوە نووسابوون. بەو ئامانجەی دۆستان ببینن هەردووکیانم لە کۆڵ کردبوو. لەراستیدا لە شۆڕشگێڕییەکی بەو چەشنە دوور بووم. بە مانایەکی تر لەنێوان هەردووکیاندا مابوومەوە، بەڵام ناوەندێک بوو لەوانەیە لە هەرساتێکدا لافاوە بە گۆڕەکەی بمبات. لە مانەوە زیاتر، هەوڵ و کۆششێکی زۆرم دەدا نەخنکێم. دوو میکانیزم لە پێشمدا وەستابوون کە خۆیان وەک ئامرازێکی رزگاری پێشکەش دەکرد: میللیگەرایی کورد و چەپڕەوێتی تورک. نزیکبوونەوەم لە

هەردووکیشیان جێگای باس بوو. هەردووکیشیان لایەنی سەرنجراکێشیان هەبوو. کوردایەتی بارزانچێتی - تاڵەبانچێتی دەنگی دابوویەوە. سەرقاڵی شاگردەکانیان بووم، بەڵام توانای رازیکردن و تێرکردنیان نەبوو. شۆڕشگێڕێتی چەپڕەوێتی ماهیرچی[٢٦] - دەنیزچی[٢٧] - ئیبراهیمچی[٢٨] لە من نزیکتر بوو، بەڵام لەو پێگەیەدا نەبووم بەو ملیتانبوونە بگەم. بە لایەنگیری ماهیر سنووردار بووم.

بەو حاڵەتە رۆحیەوە لە زستانی ١٩٧٥ بەگوێرەی خۆمان هەنگاومان بۆ پڕوپاگەندەی فەرمی گوتە یان بانگەشەکانمان هەڵهێنا. بەیەکەوە پەرەم بە تیۆری و پڕوپاگەندە دەدا. دوای ئەو بایکۆتەی دژی کوشتنی ماهیر چایان و هاوڕێکانی لە قزل دەرە لە ٣٠ ئاداری ١٩٧٢ ئەنجامدرا و دواتر حەوت مانگ (نیسان ـ تشرینی یەکەمی ١٩٧٢) زیندانیکردنم لە زیندانی ماماق، دوای کۆبوونەوەی نەورۆزی ١٩٧٣ بەنداوی چوبووک بەرپرسیارێتی و بوێری پراکتیکی گروپێکم پیشاندا. ئیتر راستینەی کورد لای من گرێدراوی ئەو ئەنجامانە بوو کە پراکتیکی ئەو گروپە دەریدەخست. دواتر بەردەوام بیرم دەکردەوە: ئایا بۆ گەیشتن بە راستینەی کورد جگە لە گروپ ئامرازێکی باشتر جێگای باس دەبێت؟ تا ئێستاش لەو بڕوایەدام کە ئەو رێبازەی ئاواکردنی گروپ راسترین رێگای گەیشتنە بە راستی. لە باوەڕیش بەولاتر بوونم بە کەسێکی ئافرێنەر یاخود شۆڕشگێڕێک (ئەمە بۆ کەسێکی محافەزەکار یان دژە شۆڕشیش هەر هەمان شتە) بە گروپێکی دەستەجەمعی (کۆلەکتیف)دا تێپەڕدەبوو کە ئامرازە ژیانی و دەست لێبەرنەدراوەکەی بوو. تا ئێستاش لەو بڕوایەدام کە ئەو تاکەی رێکخستنی نەبێت کۆمەڵایەتی نییە. هەڵبەتە فۆڕم و ناوەڕۆکی ئامرازەکە فاکتەری سەرەکی دیاریکردنی ئەنجامە. من ناچار بووم پەرە بە گروپ بدەم، گروپیش پەرە بە من بدات. ناتوانین بڵێین تا لە مانگی ١١ی ١٩٧٨ خۆی وەک PKK راگەیاند گروپ دۆخی لێکۆڵینەوە و بڵاوکردنەوەی حەقیقەتی تێپەڕکردبوو. تەنانەت بە ناشارەزایەکی سیاسەتیش دانەدەنرا. بەڵام کاریگەری هەلومەرجی گشتی سیاسەت و توندوتیژی لەسەر بوو.

---

[٢٦] ماهیر چایان (١٩٤٥- ١٩٧٢):سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی مارکسیستی لینینست و سەرۆکی "پارتی بەرەی رزگاری گەل لە تورکیا"بوو. لەگەڵ نۆ لە هاوڕێیەکانی لەپێکدادانێکدا لەگەڵ سەربازانی تورک لە گوندی قزڵدەرە گیانیان بەخت کرد. (وەرگێڕ)

[٢٧] دەنیز گەزمیش (١٩٤٧ ـ ١٩٧٢): سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی مارکسیستی لینینست و دامەزرێنەری "ئەرتەشی رزگاریخوازی گەلی تورکیا" و یەکێک لە گەورەترین سەرکردەکانی تەڤگەری گەنجانی تورکیا بوو. دوا گوتەی بەر لە لەسێدارەدانی "بژی تێکۆشانی سەربەخۆی هەردوو گەلی کورد و تورک، بژی برایەتی کورد و تورک" بوو. (وەرگێڕ)

[٢٨] ئیبراهیم کایپاک کایا (١٩٤٩ ـ ١٩٧٣): سەرکردەیەکی شۆڕشگێڕی مارکسیستی لینینستی ماویست و دامەزرێنەری "پارتی کۆمۆنیستی تورکیا ـ مارکسیست لینینیست" بوو. هاوکات لەگەڵ شۆڕشگێڕێتی لەبواری کرداریدا؛ لەبواری فیکری سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی و شۆڕشگێڕی لە تورکیا و جیهاندا لە هەوڵدان دابووە. دژی مەیلی میللیگەرایی بوو، بەقسە و کردەوە بەرگری لە مافەکانی نەتەوەکان دەکرد. باوەڕی بەپەرەسەندنی شۆڕش لە گوندەکانەوە بۆ شارەکان هەبوو، لەم پێناوەشدا باوەڕی بە تێکۆشانی چەکداری هەبوو. یەکێک لە گوتە بەناوبانگەکانی: " کورد نەتەوەیە و مافی دەستنیشانکردنی چارەنووسی خۆی هەیە". (وەرگێڕ)

لەو هەلومەرجەدا؛ تا کودەتاکەی ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ش، زۆر لە پێشەوەی هیچ یەکێک لە گرووپەکان نەبووین. لە ساڵی ١٩٧٩ دەرکەوتنم لە سنوورەکانی تورکیا و کرانەوەم بەڕووی خۆرهەڵاتی ناوین هەنگاوێکی ستراتیژی بوو. چونکە دواتر ئاسۆی راستیمانی زیاتر کردەوە. گەڕانەوەیەکی سیستەماتیکی بۆ تێکۆشانی چەکداری، راستیەکەمانی ناچارکردبوو بە هۆشیاریەکی پێگەیشتووتر بگات. ئەو کاتە هەوڵی توێژینەوەی پەیوەندی نێوان توندوتیژی و کوردستان درابوو. هەڵمەتی ١٥ی تەباخ لە رووخساردا سەربازی بەڵام لە ناوەڕۆکدا قۆناغێکی دەست پێکردبوو کە لایەنی واقیعی سیاسی لە پێش بوو. چەندەی تێپەڕدەبوو زیاتر پەیوەندی نێوان سیاسەت و توندوتیژی ئاشکرا دەبوو. لەمیانەی ئەو قەڵەمبازەوە کەسایەتی کۆمەڵایەتی، داهێنەری تاک، هێزی رێکخستەبوون، کۆمەڵگابوونی نەتەوەیی و ئازادی ژن رۆشنتر دەبوونەوە.

دووەمین گەورە کۆچەکەم کە بەرەو ئەوروپا بوو (یەکەمینیان ئەوەبوو کە لەسەر شوێنپێی حەزرەتی ئیبراهیم بۆ خۆرهەڵاتی ناوین ئەنجامدرابوو؛ تەنانەت دەشێ گرێدراو بە یاخیبوونەکەی گوند کۆچکردن بەرەو شاریشی بخرێتە سەر) کۆمەکی کردین تا لە نزیکەوە ئاشنای واقیعی نێودەوڵەتی ببین. قۆناغی زیندانی ئیمڕالیش کە لەسەرەتاکانی ١٩٩٩دەستی پێکرد ناچاری کردم بە شێوەیەکی یەکپارچەیی و بەرفراوانتر لەو راستییە تێبگەین. رێژەی حەقیقەتەکەی قۆناغی ئیمڕالی لە قۆناغەکانی پێشووتر لەپێشتر بوو. گۆڕانکاری گرنگم لە ئەبستراکتەوە بەرەو بەرجەستە، لە دۆگماتیزمەوە بۆ ریالیزم، لە کەمتەرخەمیەوە بۆ هەستیاری، لە دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوەوە بۆ دیموکراتیزەبوون، لە ئیکۆنۆمیزمەوە بۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (سەرمایەگەرایی، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە)، لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە بۆ مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە، لە مێژووناسی ئایدیالیستیەوە بەرەو مێژووناسی زانستی ـ فەلسەفیەوەم بەدیهێنا. لە سۆفیگەرایی ئیسلامیشدا کەسایەتی حەقیقەت تاوتوێ کراوە و پایەدار کراوە. باسکردن و ئەنجامدانی چالاکی دەرهەق بە چارەنووسی نەتەوە و کۆمەڵگاکان لەنزیکەوە گرێدراوی قۆناغەکانی حەقیقەتە و لەمیانەی رێژەی حەقیقەتی پابەند بە ئەنجامە کرداریەکان دەستنیشان دەکرێت.

لە سەرەتای بەریەککەوتن لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا راستینەی کورد و کوردستان بەبەراورد لەگەڵ راستیەکانی دراوسێیدا نە زۆر لەپێشترە وە نە دواکەوتووتر. بگرە کاتێک لە ئاستی دونیا لەگەڵ نموونە هاوشێوەکانی بەراورد بکرێت، ئەوا هەڵدێرێکی جددی لە نێوانیاندا نابینرێت. لەوانەیە شتێکی کەمتر نەبێت بەڵکو زیاتر بێت. دابڕان لە راستینەی گەردوونی لە بنەڕەتدا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم دەستی پێکردووە. سەبارەت بە دیرۆکی گەردوونیەوە سەدەی نۆزدەهەم سەردەمێکە کە هۆشیاری مێژووی نەتەوەیی دەرکەوتۆتە پێش. دابەشبوونی کۆمەڵگاکان لەسەر بنەمای ئایین بۆ دابەشبوون لەسەر بنەمای نەتەوە گۆڕاوە. چەندین نەتەوەی عەلمانی لە ئوممەتی کاسۆلیکی هاوبەشی ئەوروپا جیابوویەوە و کۆمەڵگای نەتەوەیی لەدایکبوون. لەگەڵ

پەرەسەندنی سەرمایەداریش کۆمەڵگا نەتەوەییەکان بە فۆرمی دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازیگەرایی داپۆشراون. قووتدان و خستنە "قەفەسی ئاسنین"ی کۆمەڵگای نەریتی لەسەر بنەمای سێیانەی سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و نەتەوە ـ دەوڵەت جێگای باسە. وەک ماهیەتێکی دژی ئەوەش دەستەواژەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیک، سۆسیالیستی و ئەزموونە سنوردارەکانیان ئاواکراون. ئەو ئەزموونانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا ئەورووپا بەخۆیەوە بینی لە سەدەی بیستەمدا لە تەواوی جیهاندا بڵاوبۆتەوە. لەگەڵ بەجیهانیبوونی سەرمایەداری ئیندوستریالیزمیش بووە بە جیهانگیری و دونیاش نزیکەی بۆ دووسەد دەوڵەت ـ نەتەوە دابەشبووە. ئیتر لە سەرتاسەری جیهاندا ڕاستینەی کۆمەڵایەتی لەچوارچێوەی سنووری وشکدا لەگەڵ کۆمەڵگای هۆمۆژەنی دەوڵەت ـ نەتەوە یەکسان دەبینرێت. لەگەڵ پەرەسەندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری قۆناغێکی گومڕایی و دەستخەڕۆیی سەبارەت بە حەقیقەتی کۆمەڵگا قووڵ بۆتەوە. تێڕوانینە میتافیزیکیەکانی سیستەمی شارستانی دایهێنابوون بۆ شێوە پۆزیتیڤیستەکانی سەرمایەداری گۆڕان و مۆرکی خۆیان لەو تێگەیشتن، دەستەواژە و تیۆریانەدا کە پەیوەندییان بە ڕاستینەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگاوە هەیە.

هەرچەندە کۆی ئەو تیۆری و دەستەواژانەی بەناوی زانستی کۆمەڵگا و مرۆییەوە هەڕاج بکرێن (دوای ١٩٧٠کان) لەو کاتەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بکەونە ناو قەیرانێکی قووڵیشەوە، بەڵام دیسان پێکهێنەری قاڵبە سەرەکیەکانی هۆشیاری کۆمەڵگان. دەستەواژەی ڕاستینەی کۆمەڵایەتی، کە بۆ هەزار و یەک لق جیابۆتەوە، ئیتر کراوە بە ئامرازێکی داپۆشینی سیاسەتەکانی سەرمایەداری، ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە کە دوژمنایەتی حەقیقەت دەکات. وێڕای ئەوەش ئەو کۆڵەکە سێکوچکەییەی مۆدێرنیتەش لە ناوخۆیدا هەمووێتی و یەکپارچەیی جێگای باسە. لەو سۆنگەوە؛ خاوەن ڕاستییە. بەدەستهێنانی ڕاستینەی مۆدێرنیتە باجەکەی نکوڵیکردن بوو لە کۆمەڵگای مێژوویی. لە کۆمەڵگاکانی شارستانیدا، بەتایبەتیش لە کۆمەڵگا سەرمایەداریەکاندا ڕاستینە زیاتر سڕی بردووە، بریندار و پارچە پارچە بووە. ئەو ڕاستینە کۆمەڵایەتییەی لە ئەوەڕەی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجدا ئاواکراوە، لەسەر بنەمای ئاسیمیلاسیۆن و کۆمەڵکوژی ڕاستی ئەو کۆمەڵگایە بەدیدێت کە لەو بونیادنانەدا زەرەرمەند دەبێت. بۆ نموونە؛ کۆمەڵگای سەرمایەداری تەنیا لەسەر بنەمای بە پاشکۆکردن و کۆیلەکردنی کۆمەڵگای نەریتی و کۆمەڵگای ڕەنجدەران فەراهەم دەبێت. ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتیانەی بوونەتە کلک و پاشکۆ تەنیا بە شێوە یان سیفەتی ئۆبژە بوونیان جێگای باس دەبێت. خۆیان بە تەنیا خاوەن حەقیقەتێکی ئەوتۆ نین. لەو سۆنگەوە؛ نوێنەرایەتی ڕاستیەکی زۆر لاواز دەکەن. کۆمەڵگای پیشەسازی تەنیا لەسەر بنەمای کۆلۆنیکردنی کۆمەڵگای پیشەکاری و کشتوکاڵ و کردنیان بە کۆیلەی کرێدار دێتەکایەوە. کۆمەڵگای دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەر بنەمای تواندنەوە و بە مێرووولەکردنی کۆمەڵگای دەرەوەی دەوڵەت، واتە تواندنەوە و بە مێرووولەکردنی کۆمەڵگای مەدەنی دیموکراتیک بەدیدێت. لە کاتێکدا لەو نموونانە

کۆمەڵگای مێژوویی لەناوەڕۆک و دۆخی راستەقینەی دەردەخرێت، هەرچی ئەو کۆمەڵگایەیە کە لە جێگاکەیدا ئاوادەکرێت لە کۆمەڵگا زیاتر دەکرێن بە ئامرازگەلێکی میکانیکی کە دیاردەی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج دەستەبەر دەکەن. هەرەسی راستینەی کۆمەڵگا لەو دیاردەیەدا شاراوەیە. ئەوانە پاوان و قۆرخکاریە زەبەلاحەکانی پیشەسازی، دامەزراوەکانی فینانس و دەوڵەت ـ نەتەوەن کە لێرەدا رۆڵی ئامرازگەلێکی میکانیکی دەبینن. خۆیان بەتەنیا هیچ راستیەکی کۆمەڵگایان نییە. ئەوانە جانەوەرە دراویی و پیشەسازیەکانن کە کۆمەڵگا و سروشتەکەی دەخۆن و لەناویان دەبەن. رۆڵی ئامرازە ئاسیمیلاسیۆنیست و میلیتاریستەکانی مەرگ دەبینن. شرۆڤەکردنی راستینەی کورد لە ژێر رۆشنایی ئەو پێناسەیەدا زیاتر نزیک بە راستی و تابلۆی فێرکەر و ئەزموونبەخش دەبێت.

### ١. نیشتیمانی دایک لە راستینەی کورددا

میکانیزمی کۆڵەکە سێکوچکەیی یان سێیانیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە لە تورکیا و بەشی هەرە گەورەی کوردستان ئاواکراوە، لەکاتێکدا کۆمەڵگای تورک ـ تورکمانی داگیرکردووە و لەناوخۆیدا تواندویەتیەوە، راستینەی کوردیشی لە ئاستی جیاوازدا پارچە کردووە و ئامانجی نەهێشتنی بوونەکەی بووە. پێشتر بە شێوەی گەلاڵەیەک رووداوەکانی دەرهەق بەراستینەی کلتوورەکانی دیکەم ئاماژە پێکردبوو، بۆیەش دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام بەهۆی پەیوەندییە توندوتۆڵەکەیان لەگەڵ راستینەی کورددا هەوڵ دەدەم بەیەکەوە راڤە و شرۆڤەیان بکەم. راڤەکردنی راستینەی کورد لەژێر سەرەدێر و چوارچێوەی جیاوازدا سەبارەت بە ئەزموونبەخشی و پێشکەشکردنی ئاسانکارییەوە گونجاوترە. ئەگەر سەرجەم رەهەندەکانیشی بەیەکەوە راڤە بکەین ئەوا پێویستە بە گرنگییەوە ئەو خاڵە رەچاو بکەین کە تەنانەت لە دۆخی دابەشکراوی، بەئۆبژەکردن، توانەوە و بەهۆی بێناوەڕۆک کردنیشی (بەهۆی ژینۆسایدەوە) لەگشت پارچەکانی کوردستاندا لێکچوون جێگای باسە.

بەشێوەیەکی مێژوویی لە کوردە یەکەمینەکانەوە تا دەگاتە کوردانی هاوچەرخ بەردەوام راستینەی نیشتیمانی دایک بۆ کوردان لە ئارادا بووە. دەستەواژەکانی کورتیا (کوردیا) لای سۆمەریەکان، کوردیوانا (مەملەکەتی کوردان) لای لوییەکان و کاردۆکیا(کاردۆخیا) لای هێلینیەکان هەمان رەگیان هەیە و بە پێی بەسەرچوونی کات و سەردەم گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە، لەسەردەمی دەسەڵاتی سوڵتانە سەلجۆقیەکان لە ئێران (سەدەی یانزدەی زایینی) بەدواوە بەشێوەیەکی فەرمی وەک کوردستان دواشێوەی خۆی وەرگرتووە. لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیشدا لە سەدان فەرماندا (فەرمانەکانی سوڵتان) بەردەوام دەستەواژەی کوردستان بەکارهاتووە. لەکاتی دامەزراندنی کۆماریشدا چەندین جار خودی مستەفا کەمال بە شێوەی نووسراو و زارەکی دەستەواژەی کوردستانی بەکارهێناوە، یەکەمین نوێنەرانی گەلی ناوچەکە بۆ پەرلەمانی

توركیاش خۆیان وەک نوێنەرانی كوردستان "مەبعووسی كوردستان" ناساندووە. لەسەردەمی پیلانگێڕی توركی سپی ساڵی ١٩٢٥ بەدواوە لەناكاو هەموو جۆرە میراس و ناوێكی پەیوەندی بە كورد، كوردستان و كوردێتیەوە بووبێت لەمیانەی ڕێچكە و ڕێبازی ترسناكەوە قەدەغە كراون و خواستوویانە وەک دیاردەیەک نەمێنێت و لەناوی ببەن.

ئەو زەبرەی لە دەستەواژەی كوردستان وەشێنرا هەڵگری چەندین ئامانجە. بەر لە هەموو شتێک؛ توركە سپیەكان (دەشێت ئەمە بە بۆرژوازی توركە بیروكراتە لاوەكانیش ناو ببەین. بەڵام بەمەرجێک سەرمایەی یەهودیشی لەناودابێت كە ناوكی بەڕێوەبەرایەتی بوو) بەیەكەوە لەگەڵ فەرمانڕەوایی ئینگلیز و فەڕەنسا سەرلەنوێ كوردستانیان بۆ چوار پارچە دابەشكرد و پارچەی گەورەشیان بۆخۆیان جیاكردەوە، خۆی و هەموو شتێكی ناویشیان بە تورک لەقەڵەم دا و قۆناغی ژینۆسایدكردنیان دەستی پێكردووە. ئەمەش كودەتایەكی پیلانگێڕانەیە دژ بە جوگرافیای كوردستان. لەڕێگای "پیلانی ئیسلاحاتی شەرق" ی ساڵی ١٩٢٥ خواستوویانە ڕاستینەی كورد لە مێژوودا بسڕنەوە، نیشتیمانی كوردانیش بە "نەبوو" دانراوە.

دەستەواژەكانی وڵات و نیشتیمانی دایک لەسەردەمی نەتەوەبووندا بایەخدار بووە. نیشتیمانی دایک وەک دەستەواژەیەكی سۆسیۆلۆژی جوگرافیایەک پێناسە دەكات كە بە درێژایی سەدان ساڵ كلتووری لەسەر ئافرێنراوە، بازاڕ ئاواكراوە، هوشیاری مێژوویی لەسەر بەدەستهێنراوە و لە بواری دیمۆگرافیدا كراوە بە شوێنی نیشتەجێبوون. نیشتیمان سەبارەت بە سەرمایەدارەكانی گرێدراو بە بازاڕ، لەویش گرنگتر بۆ ئافرێنەرە ڕاستەقینەكانی كلتووری كۆمەڵگا واتە بۆ نەتەوە و گەل شوێنە دەست لێبەرنەدراوەكەی ژیانە. نیشتیمان تەنیا شوێنی یان جوگرافیای بەرهەمی ماددی ژیانی كۆمەڵگا و دروستبوونی كلتوورەكەی نییە، بەڵكو خانە و بێشكەی پێكهاتنی ڕۆح و مێژووەكەیەتی. بێبەشبوون لێی (وەک ڕۆح و دەستەواژە)، زۆر لەوە خراپترە كە بێماڵ و بێڕۆح بمێنیتەوە. ئەوەی كۆمەڵگا بێڕۆح و بێماڵ بهێڵێتەوە، بە بێ كلتووری ماددی و مەعنەویشی دەهێڵێتەوە. لە ڕاستیدا ئەمجۆرە هەنگاوانە بەشێوەیەكی زۆر هۆڤانە و لەژێر ناوی پیلانی ئیسلاحاتی شەرقەوە خراوەتە باری جێبەجێكردنەوە. وەک پێویستیەكی پیلانگێڕی ئەو سەرهەڵدانانە كراونەتە بیانوو كە لە هەلومەرجی دنەدان و هاندان (پرۆڤەقاسیۆن) سەریانهەڵداوە، بەمجۆرە دار و بەردیان بەسەر یەكترەوە نەهێشتووە، هەوڵیانداوە تاكە پەیڤێكیش سەبارەت بە كورد و كوردستان بەكارنەهێنرێت. ئەندامی بنەڕەتی دامەزراندنی كۆمار، ئەو گەلەی لەوانەیە یەكەمین گەلی مێژووە بووە بە خاوەن نیشتیمانێک كە ناوی خۆی لەسەرە، ڕووبەڕووی دۆخێک بۆتەوە نكوڵی لێدەكرێت كە گەلێكی نیشتیمانەكەی خۆی بێت!.

لە هیچ سەردەمێكی مێژوودا نەبینراوە كە وڵاتێک بەمشێوەیە لەلایەن ئایدیۆلۆژیا یان ئایینێكەوە نكوڵی لێكرابێت و بە نەبوو لە قەڵەم درابێت. لە بڕیار و زهنی زۆربەی زۆری كۆمەڵگای توركیشدا هەڵوێستێكی بەمجۆرە بوونی نییە. دەشێت لە هەمان مێژوودا

پراكتيكيكی هاوشيوەی ديارەدی توركی سپی لە چەندين نەتەوە (نەتەوەی دەوڵەتی، ئەو نەتەوەيەی بە دەستی دەوڵەت ئافريندراوە، ئەو دەوڵەتەی بەدەستی ميلليگەرايی و ناسيۆناليزم ئاواكراون)دا ببينريت كە درەنگ وەخت هەنگاويان بۆ مۆديرنيتەی سەرمايەداری هاويشتووە لە سەرووی هەمووشيانەوە ئەڵمانيا، ئيتاڵيا و ژاپۆن. بەڵام كاديرە بيرۆكراتەكانی ئيتحاد و تەرەقی كە خوازيار بوون دەوڵەت لە ميلليگەرايی توركەوە ئاوا بكەن، كاتيک ميليتاريزم و ميلليگەرايی ئەڵمانيان بە بنەماگرت كە لە نەمامگاكەياندا گەشەيان كردبوو بەيەكەوە لە بەرەيەكدا جەنگابوون (يەكەمين جەنگی جيهانی)، تەنيا ليكچوو يان دووانەكەی ميلليگەرايی نازی نەبوون، بەڵكو لە فاكتەرە دامەزرينەرەكانی بوون. هيتلەر كاتيک ژينۆسايد بەرامبەر يەهوديەكان ئەنجام دەدات خۆی دانی پيداناوە كە بە ژينۆسايدی حكومەتی ئيتحاد و تەرەقی سەر ئەرمەنيەكان كاريگەر بووە.

بێ نيشتيمانكردنی كوردان لە نزيكەوە پەيوەندی بەو دوو ئەزموونە ميژووييەوە هەيە. پيويستە كاريگەری سەردەميكيشی لەسەر زياد بكريت كە ئايديۆلۆژيای پۆزيتيڤيست بە لوتكە گەيشتبوو. زانستگەرايی پۆزيتيڤيست ديارەدە كۆمەڵايەتيەكانيشی لەميانەی ياسا پەيڕەوكراوەكانی زانستی بايۆلۆژی و فيزيا هەڵدەسەنگاند. توركگەرا سپيەكانی هەڵگری كاريگەری عەلمانيی دۆگماتيكی ئەو ئايديۆلۆژيايە بوون لەو بڕوايەدابوون كاتيک لە ريگای ياساوە ديارەدەيەک بە نەبوو دابنين ئەوە راستی و حوكمی ئەو ديارەدەيە ناميننيت. لەو لايەنەوە لە دۆگماتيكەكانی چاخی ناوين دۆگماتيكتر بوون. دەستەواژەی توركياش لەو ساڵانە پەيدا ببوو. بەهۆی زۆری ژمارەی توركەكان و پيكهاتە ميژووييەكەی ئەمە دەستەواژەيەكی هەڵە نەبوو. بەڵام لە ريگای ياسا و بە شيوەيەكی زۆرەمليانە بەرفراوانكردنی تا كوردستانيش لەخۆوە بگريت پيچەوانەی راستينە ميژووييەكان بوو. مۆديرنيتەی نەتەوەگەرايی تورک وەک بڵيی ئايينيكی نوێ دەئافرينيت لەو بڕوايە دابوو كە هەر ديارەدە و دەستەواژەيەكی پەسەندی نەكات كاتيک دەڵيت "لەناو بچيت" ئيتر لەناو دەچيت. بيگومان ميليتاريزمی كوشندە رۆڵيكی سەرەكی لەوەدا دەبينی.

سەرهەڵدانەكانی كوردان بەشيوەيەكی زۆر بيبەزەييانە سەركوت كران تا كوردستان وەک نيشتيمانی كوردان نەميننيتەوە. چيتر گەليكی دامەزرينەری كۆمار و وڵاتەكەی نەماون، بەڵكو هەنديک كيوی جيگای باس بوون كە پيويست بوو هەموو شتيكيان بپليشيتەوە و بە نەبوو دابنريت، كە بێ زمان و بێ وڵاتە، ناوی قەدەغە كراوە و لە كاتی رۆيشتن بەناو بەفردا دەنگی "كارت، كورت" لە ژير پييانداا دەردەكەويت. ئينگلتەرا كە ئەوكاتە هيزی هەژموونگەرايی سەرمايەداری بوو هاوكارە نزيكەكەی ئەو سياسەتە بوو. هيچ دەنگيكی ليوەنەهات و ژير بەژير پشتگيری لەو سياسەتە كرد. هەر لەبەر ئەوەش دەستی بەسەر پەترۆڵی موسڵ ـ كەركوكدا گرتبوو. نزيكبوونی دەوڵەتی تورک لە فەڕەنسا و پەسەندكردنی چەمكی ياسا و نەتەوەی عەلمانی، بەس بوو تا فەرەنسا ئەو كردار و رەفتارە نامرۆييانە لەبير بكات. ئەڵمانياش خۆی ئەندامی دامەزرينەر بوو. لە روانگەی

ریال سۆسیالیستەکانی رووسیاوەش کردەوەکانی تورکچێتی سپی لە کوردستان سەرکەوتنی پێشکەوتنخوازی بوو بەرامبەر بە کۆنەپەرستی. کۆماری کوردستان لە مەهابادی خۆرهەڵاتی کوردستانیش ببوو بە قوربانی هەمان سیاسەت. ئەو شتەی سەلمێنراوە: هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەپێناو بەرژەوەندییە رۆژانەییەکانی خۆیان لە قوربانیکردن و بەنەبوو دانانی وڵاتی هەزاران ساڵەی گەلێک هیچ دوودڵیەکیان نەکردووە.

راستینەی باشووری کوردستانیش لە ئاکامی حیساب و لێکدانەوەکانی شەڕی سارد گەرمکرا. بە ئامانجی بەربەستکردنی حوکمی گەلی کورد بەسەر چارەنووسی خۆیدا کە لە بواری جەستەییدا بوونی خۆی پاراستبوو، هەروەها بۆ ئەوەی لە دۆخی سەربازگەیەکی پێشووی سیستەمدا بێت بەردەوام کوردستانێکی بچووککراوە لە رۆژەڤ و یەدەگدا مایەوە. ئەمجارە بەرژەوەندییەکانیان ئەوەی دەکرد بە پێویستییەک. هەروەک چۆن لە بەرامبەر لەدەستدانی هێلینی و ئەرمەنیەکان بۆ نیشتیمانی مێژوویییان وەک قەرەبووکردنەوەیان و دانەوەی قەرز مەحکومی دەوڵەتۆکەی بچووک کران، ئەو دیاردەیەی بە کوردستانی ئێراقیش ناو دەبرێت بەهەمان شێوە خرایە رۆژەڤەوە. کاتێک سەدەی بیستەم کۆتایی هات، یەکەمین و کۆنترین نیشتیمانی مێژوویی رووبەڕووی لەناوچوون ببوویەوە. ئەگەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری گەلێک بەبێ نیشتیمان دابنێت، لە روانگەی ئەو کۆمەڵگایەوە مانای لەدەستدانی نیوەی بوون و راستیەکەیەتی. دوای بەنەبوو دانانی نیشتیمان، خاک و وڵات، لەسەر پێ هێشتنەوەی کۆمەڵگا و درێژەدان بە ژیان و بوونی کلتووری مادی و مەعنەوی ئیتر بۆ پەرچووەکان دەمێنێتەوە. ئەو دۆخەش لە هەوڵەکانی مەلەکردن یاخود رۆیشتنی مرۆڤێک لە هەوا و بۆشاییدا دەچێت. ئەگەر دەتەوێت بوونی خۆت بپارێزیت یان دەبێت بەماسی و مەلە دەکەیت یان دەبیت بە باڵندە و دەفڕیت.

یەکێک لە تاوانە هەرە گەورەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرامبەر بە دیاردەی نیشتیمان؛ بە شێوەیەکی زۆر ساختەکارانە چەمکی سنووری تاک نەتەوەی وشک و نەگۆڕی وەک دەستەواژەیەکی پیرۆز خستۆتە بازاڕەوە. چەمکی سنووری دەوڵەت ـ نەتەوە وەک هێمایەکی چۆنیەتی پاراستنی بەناو نیشتیمان، بە شێوەی باوەڕی و عیبادەتێک دەخرێتە گەڕ. لەناوەڕۆکیشدا سنووری موڵکایەتییەکی گشتگیرکراو پێشخراوە. پێشخراوترین شێوەی موڵکایەتییە؛ دواترین قۆناغی مێژووی موڵکایەتییە کە بە بەرژێنکردنی دەوروبەری کێڵگەیەک دەستی پێکردووە. سنوورەکان هێندە توند دەکرێن، گوایە لە پێناو بستێکیدا ئامادەن بجەنگن و چەندین شەڕیش روودەدات. دەجەنگن، بەڵام ئەو شەڕانە لە پێناو بەرژەوەندییەکانی گەل و نەتەوە نییە، بەڵکو بەهۆی پۆتانسێلەکەیان بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج ئەنجام دەدرێن. سنوورەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە چەندە توند بکرێن، واتە بەو رادەیە زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت.

بێگومان گەل و نەتەوەکان خاوەن سنوورێکی نیشتیمانن. بەڵام بەگوێرەی چەمکی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پێکهاتن و پاراستنی ئەو سنوورانە بەتەواوی لەگەڵ زهنیەتی

دەوڵەت ـ نەتەوەدا جیاوازە. واتە لەو چەمکەدا سنوور وشکبوون و توندکردنی موڵکایەتی نییە، بەڵکو هێڵی هاوکاری، دۆستایەتی و پێکهاتە کۆمەڵایەتییە باڵاکانە لەگەڵ دراوسێکاندا کە زیندووترین ڕێکەوتن، هاوبەشێتی، ئاڵوگۆڕ و سەنتێزی کلتووری لێدەکەوێتەوە. ئەو دەڤەر و ناوچانەی شوێنی فرەنەتەوەیی و فرەکلتوورییە ئەو ئەڵقە ئافرێنەرانەن کە کلتوور و ژیارێکی باڵای تێدا هەوێن بووە؛ جێگای ئاشتی و برایەتین، نەک شەڕ و پێکدادان. ئەو سنوورانەی لە مێژوودا بوونەتە ماڵخۆی ئەو جۆرە کارانە، لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا کراون بە هێڵگەلێک کە زۆرترین دوژمنایەتی و شەڕی بەخۆوە بینیوە، مینڕێژکراوە، بە تەلبەند و شووراکان گیراوە و دەرباز ناکرێت. کراون بە دیواری ئەو بەندیخانەی گەلان و نەتەوەکانی لەناودا گیراوە. ئەو گەل و نەتەوانەی لەناو ئەو سنوورانە دەژین ناپارێزرێن؛ بەڵکو دەخرێنە ناو قەفەزی ئاسنینەوە، زیندانی دەکرێن، دەکرێن بە سەربازی زۆرەملێیانە، کرێکاری کرێی هەرزان و بێکار. نەریت و کلتووری ئەتنیک، گەل و نەتەوەکانی دەرەوەی نەتەوەی فەرمی باڵادەست دووچاری ئاسیمیلاسیۆن و کۆمەڵکوژی دێن. بەرژەوەندییە سنوورنەناسەکانی قۆرخکاریەکانی دەسەڵات و سەرمایە لە ناوەڕۆکی راستینەی سنووری دەوڵەت ـ نەتەوەدا شاراوەیە.

راستینەی کوردی دابڕێنراو لە نیشتیمانی دایک راستینەیەکی بریندارە و لە جانەڵڵا دایە. خاوەنداریێتی نەکردن لە نیشتیمانی دایک، مانای دەستبەردانە لە مێژوو و کلتوورەکەی. لە ئاکامدا مانای دەستبەردانە لە دۆخی کۆمەڵگابوون و نەتەوە. راستینەی کۆمەڵگای کورد بەبێ نیشتیمان پێناسە ناکرێت، کۆمەڵگایەکی بێ نیشتیمان ناتوانێت درێژە بە هەبوونی خۆی بدات، لە پەرتەوازەبوون و لەناوچوون رزگاری نابێت.

هەرچەندە راستی نیشتیمانێک جێگای باس بێت کە دووچاری داگیرکاری و کۆمەڵکوژی هاتووە، بەڵام ناتوانرێت نکوڵی لە بوونی کوردستان بکرێت. تا دوا تاکی لەسەر بمێنێت کە خوازیارە ژیانێکی ئازادانەی شایستە و گرێدراوی راستی کۆمەڵگا و بیرۆکەکەی هەبێت ئەوا هەر بوونەکەی بەردەوام دەبێت. تەنیا نابێت بە نیشتیمانی کوردان، بەڵکو دەبێت بە وڵاتی هاوبەش، ئازاد و دیموکراتی ئەرمەنی، سریانی، تورکمان، عەرەب و هەر تاک و کلتوورێکی دەخوازێت بە ئازادی بژیت و بەشێوەیەکی یەکسان بەشداری تێدا بکات. نەگەیشتنی بە دەوڵەت ـ نەتەوە بێ چانسی نا، بەڵکو بۆی دەبێت بە چانسێک. ئەو جارە نابێت بە وڵاتی شارستانیەکی نوێی چینایەتی، شارگەرایی دوژمنی ژینگە و دەوڵەت ـ نەتەوە، بەڵکو دەبێت بەو نیشتیمانەی کە بەرەبەیانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی خۆرهەڵاتی ناوینی لێهەڵدێت و لە بێشکەی خۆیدا گەورەی دەکات.

## ٢ . ڕەهەندی نەتەوەیی ڕاستینەی کورد

لە چوارچێوەی کێشەی کورددا هەوڵماندا ڕاستینەی کورد وەک دەستەواژەیەک بخەینەڕوو. هوشیاریەکی بەرفراوان لەو بارەیەوە پێشنەکەوتبوو کاتێک یەکەمجار باسی کێشەکە دەکرێت ڕووبەڕووبوونەوەی چ جۆرە ڕاستییەک دەبینەوە. گرێدراو بە کێشەکە و بەر لە هەموو شتێک لەمیانەی لایەنی فەرمانی و فەرەکلتووریەوە هەوڵی سەلماندنی ڕاستینەی کورد دراوە. هەروەها لەبەر ئەوەی ڕاستینەی کورد لەمیانەی شالاوێکی بەرفراوان و بەردەوامی نکوڵی و قڕکردنی ئایدیۆلۆژیای فەرمی ئابلۆقە درابوو، سەلماندنی بوونی کوردان بە شێوەی کێشەیەکی سەرەکی و لە پێشینە کرابوو بە ڕۆژەڤ. ئەوەش هەڵوێستێکی زۆر دواکەوتووانە و هەڵە بوو سەبارەت بەو ڕاستینەیە. بێگومان هەوڵەکانی سەلماندنی بوونێک کە هەیە و لە ئارادایە، لە گفتوگۆکردنی هەبوون و نەبوونی خۆر دەچوو. ئەوەش مانای چەنەبازیەکی بێواتا و بەفیڕۆدانی کات بوو، پەلکێشکردن بوو بۆ ڕۆژەڤی ڕژێمی داگیرکار و کۆمەڵکوژ. لە بنەڕەتدا ئەو جۆن کوردانەی بە ئاسیمیلاسیۆندا دەرباز ببوون ئەو جۆرە گفتوگۆیەیان گەرم دەکرد. ئەوانە لە ژێر ناوی گفتوگۆکردنی کێشەی کورددا لە ڕاستیدا بوون و پێگەی خۆیان دەخستە ژێر گومانەوە.

کاتێک دەستم بۆ ئەو کارانە برد هێندە نەبووم بە ئامرازی ئەو جۆرە گفتوگۆیانە. هەرچەندە لە قووڵاییدا جیەتی هەنگاوی ڕاست شیکاریش نەکەم، بەڵام چونکە لەو بڕوایەدابووم لە جیاتی ئەوەی بە شێوەی هەبوون ـ نەبوون کێشەکە تاوتوێ بکەم ڕاسترین ڕێباز ئەوەیە لەمیانەی دەستەواژەکانی ڕزگاری و ئازادی ئاماژەی پێبکرێت، لەو چوارچێوەیەدا هەنگاوم نا. بە بنەماگرتنی ئەو ڕێبازەی پێهەڵگرتن گرنگترین هۆکاری پێشکەوتنی خێرامان بوو بەرامبەر حەقیقەتە لەت و پەتەکەی گروپەکانی دیکە. کاتێک ڕێبازی ڕاستمان هەڵبژارد، زوو یان درەنگ ئێمەی بەرەو خودی ڕاستی دەبرد. بەڵام یەکێک لە کەموکوڕیەکانی ئەو ڕێبازە ڕێگای بۆ کردەوە، کرانەوەی بوو بۆ شرۆڤەی دۆگماتیکانەی ڕاستینەی کورد. ئەو پێشداوەریانە بەهێزبوون کە دەشێت ڕاستینەی کوردیش وەک ڕاستینەی هەر نەتەوە یاخود گەلێکی دیکە تاوتوێ بکرێت. تاوتوێنەکردنی ڕاستینەیەک وەک ڕاستی چەندە ڕێبازێکی ڕاست بێت، پێشبینی نەکردنی چۆنیەتیەکەی و بە گومانەوە تەماشانەکردنیشی بەو ڕادەیە ڕێبازێکی ناتەواو بوو.

ڕاستینەی دەستەواژەی "کوردستان داگیرکراوە" کە لە نەورۆزی ١٩٧٣ پێشکەشی یەکەمین کۆبوونەوەی گروپم کرد و بەگوێرەی من لەو ڕۆژانە پێویست بوو وەک شتێکی نهێنی بمێنێتەوە. هەرچەندە دوو نوێنەرە لەپێشەکەی مەیلی ئاسیمیلاسیۆنیستی بەکرێگیراوی ئەو قۆناغە کەمال بۆرقای و ممتاز کۆتان بانگەشەی بەکارهێنانی ئەو دەستەواژە بکەن، بەڵام لەو بڕوایەدام کە ڕاست ناکەن. ئەگەر وابوایە پێویستی شاردنەوەی ئەو دەستەواژەم نەدەبینی. دواتر گفتوگۆکان دەرهەق بە کوردستان لەمیانەی

دەستەواژەی "کوردستان داگیرکراوە" بەرێوەچوو. زۆرینەی چەپی تورک دەیانگوت: "تەواوی تورکیا کۆلۆنییە یاخود نیمچە کۆلۆنییە" بەمجۆرەش هەوڵی تەمومژاویکردنی کێشەکەیان دەدا. کاتێک ماهیرچایان، دەنز گێزمیش، ئیبراهیم کایپاک قایە مەرگیشیان ڕەچاوکرد و ئەو دەستەواژەیان هێنایە زمان ئیتر لای من بوونی کوردان بە شێوازی شۆڕشگێڕانە سەلمێنرابوو. ئەوەی مابوویەوە ڕزگاربوون لەو ستاتۆیە و کێشەی ئازادی بوو. تیۆری کوردستانی داگیرکراو سەرەتایەکی ڕاستی ئەو ڕێگایە بوو.

راسیۆنالیزم (ألعقلانیة)و ئەزموونگەرایی (ألتجریبیة) وەک دوو ڕێبازی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لە ڕاستینەی کورد هاتنە مەیدانەوە. ڕاسیۆنالیستەکان لەو بڕوایەدا بوون لەمیانەی سەلماندنی ڕاستینەی کورد بە ئامانجەکانیان دەگەن. ڕۆشنبیرە بۆرژوازییە ڕاڕاکانیش باوەڕی ڕەهایان بەوەبوو کە لەمیانەی ئاواکردنی کۆمەڵەکان، دەرخستنی گۆڤار و ئاواکردنی ئەو پارتانەی دەست لە ئاوی سارد و گەرم نادەن ئەنجام بەدەست دێنن. چاوەڕوانیان دەکرد ڕۆژێک لە ڕۆژان لۆژیکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە لایەنی ئەواندا وەرچەرخێت. ئەوانەی لەناو هەوڵی پراکتیکی بەرتەسکیش دابوون، ئەو کەسانە بوون کە زیاتر لایەنگری تەقینەوەی هەستەکانی یاخیبوون بوون. وەک پێویستییەکی هەلومەرجی ئەو کاتە لاوانی شۆڕشگێڕ ئەو دۆخەی بەخۆیەوە بینی. بێگومان کودەتای ١٢ی ئەیلول هەناسەی لەبەر هەردوو توێژ بڕی، لەمیانەی ڕادەستبوون و لەناوبردنیان هێزی حەقیقەت و ئیرادەکەیانی ئاشکرا کردبوو. لە کاتێکدا ئەوانەی لەناوەڕۆکدا لە سیستەم دانەبڕابوون لەڕێگای تەسلیمیەتدا بەرەو پێشدەچوون، ئەوانەی لەدەرەوەی سیستەم دەستبەرداری لێگەڕینەکانیان نەبوون بەدوای لێگەڕینێکی قووڵتری حەقیقەت و ئیرادەی بەهێزدا دەچوون.

لە چۆنیەتی وەڵامدانەوە بۆ کودەتای ١٢ی ئەیلول هەوڵەکانی گەڕانم بەدوای حەقیقەت و بەهێزکردنی ئیرادە لە هی هەردوو مەیل جیاوازتر بوو. بێگومان تا ڕادەیەک خاوەن ڕاسیۆنالیتە بووم. هەوڵە ئیرادەییەکانیشم بچووک نەدەکرایەوە. دواتر کاتێک خۆمم ڕەچاوکرد لە جیاوازییەکەی خۆم تێگەیشتم. ئەوەی منی جیادەکردەوە جێبەجێکردنی بەناویەکداچوونی تیۆری - کردار بوو بە پراکتیک و ناوەڕۆک، نەک بەزارەکی. پتەوکردنی گوتە و چالاکی لەمیانەی ڕاستی تیۆری و کرداری تۆکمەوەو هەنگاونانم: لەسەر ئەو بنەمایەش هەڵمەتی چالاکی ١٥ی ئابی ١٩٨٤و گوتەی ئاشتی ١٩٩٣کردبوو بە ڕاستیەکی بەرجەستە و دەرفەتی بۆ ڕەخساند. هەنگاونان و بەرێوەچوونم لەسەر هەمان ڕێچکە و ڕێباز لەمیانەی کردارەکانی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەی قۆناغی ئیمراڵی بە تێگەیشتنی مۆدێرنیتەی دیموکراتییانەی دەگەیاندین.

بۆ یەکەمین جارە لە مێژوودا ڕاستینەی نەتەوە و گەلی کورد بە پێگەیشتووترین قۆناغی هۆشیاری خۆی گەیشتووە. ئەوەی لێرەدا جێگای باسە ڕاستینەکە چوارچێوەی هوشیاریی گروپێکی نوخبە یاخود پارتی دەربازکردووە. بەشە بنەڕەتیەکەی ڕاستینەکە وەک گەلێک یاخود نەتەوەیەک بە هوشیاری و دەرککردنی خۆی گەیشتووە. خودی نەتەوە

وەک دەستەواژە گوزارشت لە دۆخی زهنیەتێک دەکات. سەبارەت بە کوردانیش ئەو دۆخەی زهنیەت بەدیهاتووە. بەڵام ناتوانین هەمان شت دەرهەق بە جەستەکەی بڵێین. بەگوێرەی ئەوەی ژیان تەنیا بە زهن نابێت، بەجەستەبوونیش پرۆسەیەکی گرنگە، لەو سۆنگەیەوە گوزارشت لە دۆخی حەقیقەت دەکات.

قۆناغی کلتووری نیولیتیکم وەک سەردەمە شکۆدارەکەی کوردە یەکەمینەکان شرۆڤە کردبوو. لە سیستەمی شارستانی ناوەندی تا سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کوردە یەکەمینەکان هەنگاوێکی بەهێزی راستینەی قەومیان هاوێشتبوو. کۆمۆنیتەکانی ئاشنای بەڕێوەبەرایەتییە سیاسییەکانی فیدراسیۆنی قەبیلە و خێڵەکانی چاخی کۆن و ئەزموونەکانی ئیمپراتۆریەت ببوون، بە تایبەت لەمیانەی سیستەمی باوەڕی زەردەشتیەوە فۆرمی گەلبوونیان بەدەست هێنابوو. بەگوێرەی سەردەمی خۆی فۆرمە سەرەتاییەکانی کوردان پاشکۆ نەبوون، هەرچەندە لەگەڵ دەرکەوتنی ئیسلامی چاخی ناوین ئەو فۆڕمانە تارادەیەک شێوێنرابن، بەڵام هەم لە بواری زهنیەتەوە هەمیش لە بواری جەستەییەوە کوردان فۆڕمی قەومیان پتەوتر کرد. جگە لەوانەی سەر بە ئایینی جیاوازتر بوون هەر قەبیلە و خێڵێک بەو رادەیەی موسڵمان بوو کوردیش بوو. هەروەها هەر جیابوونەوەیەکی مەزهەبیش لەگەڵ راستینەی چینێکی دیاردا رێک و گونجاو بوو. فۆڕمی گەل یاخود قەوم یەکەم هەنگاوی جیابوونەوەی ئەتنیک و گۆڕانێتی بۆ کۆمەڵگای چینایەتی. لەو دۆخەدا خێڵ و قەبیلەکان بوونی خۆیان دەپارێزن، بەڵام بە دۆخێک گەیشتوون بۆ لەدایکبوونی پێکهاتە چینایەتیەکان لە هەناویاندا، کراوەن. راستینەی ئەتنیکی لەگەڵ راستینەی چینایەتیدا تێکەڵن و لەناو یەکتردان. ئایینە تاکخوداییەکانیش تا رادەیەک فۆڕمی ئایدیۆلۆژی و پەردەی ئەو راستییە تێکەڵە پێکدێنن. ئەگەر بە شێوەی میرنشینە سەربەخۆکان بن یاخود یەکینەیەکی گرێدراو بە سیستەمی ئیمپراتۆریەت پێکبێنن، چینی سەرووی قەبیلەکان راستی چینایەتین کە هەر یەکەیان بوونەتە ناوەندێکی دەسەڵات. خۆیان وەک خانەدانی نوخبەی دەسەڵاتدار ناودێر دەکەن.

لەچوارچێوەی دەسەڵاتدا چارەسەرکردنی کێشەی قەوم لە چاخی ناویندا مانای ئاواکردنی پاشایەتیەکی ناوەندی بووە. ئەوەی لە داستانەکەی ئەحمەدی خانیدا ئاماژەی پێکراوە ئەو حەسرەتەیە. بە ئێرەییەوە تەماشای لەدایکبوونی پاشایەتی (سەڵتەنەت) ناوەندی عەرەب، عەجەم و تورکەکان دەکەن. گریمانی ئەوە دەکەن ئەگەر پاشایەتیەکی ناوەندی بەمشێوەی کوردانیش ئاوا بێت کەس ناتوانێت رێگیری بکات، لەو چوارچێوەیەشدا کێشە و گرفتەکانیان چارەسەر دەبێت. لە چاخی ناویندا کێشەیەکی بەمجۆرەی راستینەی قەومی کورد جێگای باسە. دەربڕی دینامیزمێکە کە هێزی هەڵمەتکردنی لە زیادبوون دایە. پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو توێژە هەژارەکانی گەل کە لەناو خێڵ و قەبیلەکان جیادەبوونەوە بە کرمانج ناودەبران. وەک چۆن لەناو عەرەبەکان بەدەوی، لای تورکەکان تورکمان و لە ئێرانیش عەجەم جێگای باسن. کۆمەڵ یان پۆلێنی کرمانج ئەو توێژەی گەلە کە سەرەتا لە گوند، دواتریش لە شارەکان ژمارەیان زیاد

دەبێت و لەمیانەی فرۆشتن یان بەکرێدانی رەنجەکەیان بژێوی ژیان دابین دەکەن. چینی خوارووی مووچەدار و کرێداری جیابوونەوەی چینایەتی پێکدێنێت. بەجۆرێک لە جۆرەکان بە پرۆلیتاریابوونە. بەتایبەتیش کاتێک کەوتنە دۆخی کرێداری و کرێنشینیەوە بەناوەکەی تر وەک زەحمەتکێش و کارکەریش ناو دەبرێن. لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ئەو پرۆسەیە خێرا دەبێت. بەشێوەیەکی هاوتەریب لەگەڵ بەگەلبوون، لە کلتووری خێڵ و قەبیلەوە وەرچەرخان بۆ کلتووری گەل روودەدات. لە هەلومەرجی ئەو کلتوورە ماددی و مەعنەویەدا بە قۆناغی پێکهاتەی نەتەوەیی دەگات.

گوایە ئەوەی نەتەوەی ئافراندووە بازاڕە. بەڵام ئەمەیان تێڕوانینێکە گوزارشت لە شێوازی پێکهاتنی راستینەی نەتەوەی بۆرژوازی دەکات؛ یەکێک لە دەستەواژە هەڵەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراوە سەبارەت بە نەتەوە. لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دوو جۆرە رێبازی سەرەکی پێکهێنانی نەتەوە جێگای باسە. دەشێت پەیڕەوەکانی هەمەڕەنگ بێت. رێبازی یەکەم، لەسەر بنەمای زاڵبوون بەسەر بازاڕدا دەکەوێتە جووڵە، لەو پێناوەشدا پەرژینەکانی دەرەبەگایەتی (سیستەمی میرنشینی) دەڕووخێنێت، بە ئامانجی زیادکردنی خستنەبازاڕ و پشکی قازانج لە دروشمی بازاڕی نەتەوەیی دەئاڵێت. لەبەر ئەوەی میللیگەرایی بۆرژوازی لە یەکەم قۆناغی خۆیدا تارادەیەک گوزارشتی لە بەرژەوەندی هاوبەشی هەر کەسێک دەکرد، ئەو رێبازەی نەتەوەبوون وەک فاکتەرێکی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا تاوتوێکراوە. چونکە رێکخستەبوونی هێزەکانی دەسەڵات و سەرمایە لەچوارچێوەی نەتەوەدا هەردوو توێژی بەهێزکردووە، بە هەموو هێز و توانایەکەوە پشتگیریان لە دەوڵەت ـ نەتەوە کردووە. ئەمجۆرە نەتەوەگەراییە هەنگاو بەهەنگاو کۆمەکەکەی سەرەتای بۆ نەتەوەبوون کۆتایی دێت، لێی دوور دەکەوێتەوە. نەتەوەگەرایی دەبێتە ئامرازی ئایدیۆلۆژی چەوسانەوە و فشاری سەر بازاڕ و کرێکاران، بازرگان و پیشەکاران. دووەمین رێبازی سەرەکی نەتەوەبوون؛ نەتەوەبوونی دیموکراتیانەی چینە زەحمەتکێشەکانە بەرامبەر بە هێزەکانی دەسەڵات و سەرمایەی ناوخۆ و دەرەوە. ئەمجۆرە نەتەوەبوونە هەم بەشێوەی رەوتی ئایدیۆلۆژی هەم لە بواری کرداریدا هەوڵیداوە بەکاریگەر بێت. کاریگەری جددی ئەو نەتەوەگەراییە لەسەر بناغەی ئەو دیاردەیە هەیە کە بە دیموکراسیەکانی ئەورووپا ناو دەبرێت. دەستەواژەی دیموکراسی بۆرژوازی هەڵەیە. دیموکراسی بۆرژوازی جێگای باس نابێت، هەرچی دیموکراسییە بە سیفەتی شێوەی دەوڵەت هەرگیز جێگای باس نابێت. ئەو دۆخەی لە ئەورووپاش هاتۆتە ئاراوە، گوزارشت لەو سازشە دەکات کە تێکۆشانی مافداری چینە زەحمەتکێشەکان لەگەڵ قۆرخکاریەکانی دەسەڵات و سەرمایە ئەنجامیان داوە.

وەک تەواوی خۆرهەڵاتی ناوین پەرەسەندنە نەتەوەییەکانی دیاردەی کوردیش، لەگەڵ تەشەنەکردنی هێزە هەژموونگەراییەکانی سەرمایەداری رۆژئاوا بۆ ناوچەکە، سەرچاوەی خۆی لە دینامیزمی ناوخۆ وەرگرتووە. ئەو قۆناغەی لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم خێرا بووە، پرۆسەکانی نەتەوەبوونی شێواندووە. نەتەوەبوونەکانی

ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە یارمەتی هێزە هەژموونگەراکان یاخود لەمیانەی بەخۆوە گرێدانیان هەوڵی شێوەپێدانیان دراوە. پێوەری دیاریکەر بەرژەوەندیەکانی سیستەمە. وەک پێویستیەکی بەرژەوەندییەکانیان نەتەوە ئاوا دەکرێت یاخود سەرکوت، بگرە ڕێ بۆ لەناوچوونیان خۆش دەکەن. ماوەیەکی درێژ ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەرخودانی بەرامبەر نەتەوەبوون کرد. لەمیانەی ڕێبازە دروستکراوەکانی نەتەوەگەرایی خۆی هەوڵی بەردەوامبوونیدا. عوسمانگەرایی، پان ئیسلامیزم و پان تورکیزم ئەو ڕێبازانە بوون بەو ئامانجە بەڕیزە یەک بەدوای یەکتر تاقیکرانەوە. لەگەڵ مایەپوچبوونی ئەو ڕێبازانە و لەدایکبوونی چەندین دەوڵەت ـ نەتەوەی تەبا لەگەڵ بەرژەوەندی هێزە هەژموونگەراکان، زەمینەیەکی گونجاو بۆ نەتەوەگەرایی ئەنادۆڵ مایەوە. ئەو پرۆسەی بە ڕزگاری نیشتیمانی و نەتەوەگەرایی کۆمار ناو دەبرێت گوزارشت لەو ڕاستییە دەکات. باسی سەرگوزەشتەی ئەو مەیلەم کردبوو کە وەک کەمالیزم پێشکەش دەکرێت. لەجیاتی دووبارەکردنەوەی باسکردنی ئەو مەیلە لەچوارچێوەی نەتەوەگەرایی کورد، تورک، یەهودی و عەرەب ئەزموونبەخشتر دەبێت.

نەتەوەگەرایی ئەنادۆڵ بە پێشەنگایەتی مستەفا کەمال وەک بزووتنەوەی ڕزگاری کەوتە بواری کردارییەوە. پشکی ڕاستی لێرەدا جێگای باس بوو. لەسەرەتا یاخیبوونێکی دژی هێزە هەژموونگەراکان بە بنەما دەگرت. کوردان و یەهودیەکان ڕۆڵی دامەزرێنەریان لەو بزووتنەوەیەدا هەبوو. خاوەن زەوی و ئەشرافە کوردەکان و سەرمایەدارە یەهودیەکان ڕێککەوتنیان لەگەڵ میللیگەرایی بیرۆکراتە تورکەکان ئەنجام دا. کرستیانەکان لە دەرەوەی ئەو ڕێکەوتنە مانەوە و زیاتریش بوون بە ئامانجی پێکان. ئەو ڕێککەوتنەش بۆ قۆناغی دامەزراندنی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی دەگەڕێتەوە؛ لەیەکەمین جەنگی جیهاندا جێبەجێدەکرێت. لە شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی (١٩١٩ ــ ١٩٢٢)دا بەرتەسک دەکرێتەوە و درێژەی پێدەدرێت. هەرچەندە هەندێک گومانیشیان هەبێت، بەڵام زۆربەی زۆری ئەشراف و ڕۆشنبیرانی کورد پشتگیری لەو ڕێککەوتنە دەکەن. پرۆتۆکۆلی ئاماسیا، کۆنگرەکانی ئەرزرۆم و سیواس و یەکەمین پێکهاتەی ئەنجوومەنی نوێنەران ئەو ڕێککەوتنە پیشان دەدەن. لەمیانەی یاسای ریفۆرمی کوردان ١٠ی ئاداری ١٩٢٢ ئەو ڕێککەوتنە پتەودەکرێت. لەگەڵ ئیمزاکردنی پەیماننامەی لۆزان و ڕاگەیاندنی کۆمار قۆناغێکی نوێ دەست پێدەکات. هەوڵدەدەن ناکۆکیەکانی موسڵ ـ کەرکوک لەگەڵ ئینگلیزەکان بە پەیماننامەیەکی زۆر تراژیدی دژی کوردەکان ئەنجامگیر بکەن. هەرچەندە پەیماننامەی ئەنقەرە کە لەگەڵ فەرەنسیەکان مۆرکراوە لەسەر بنەمای سازشکردن لەسەر میساقی میللی دژی کوردان (هەروەها تورکمانەکانی سوریا) ئەنجامگیر بووبێت، بەڵام لە ئاستی کارەسات نەبووە. لەمیانەی ئەو پەیمانەوە بەشێکی بچووکی کوردستان بۆ فەرەنسییەکان ماوەتەوە. بەڵام بەهۆی کاریگەرییە خراپەکانی بۆ سەر ڕاستینەی نەتەوەی کورد پێویستە بە بایەخەوە هەڵوەستەی لەسەر بکرێت.

دابەشکردنی کوردستان لەسەر بنەمای ئەو ئێراقەی خوازیاری دامەزراندنی بوون پێشێلکردنێکی ئاشکرای میساقی میللی بوو. ئەو گۆڕانکارییە لەناو ئەنجوومەنی نوێنەرانی تورکیا و کوردان ڕێگای لەپێش تووڕەبوونێکی مەزن کردەوە. ئەو پەیماننامەیەی لە ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ لەگەڵ ئینگلیزەکان ئیمزا کراوە چەندین فاکتەر لەخۆوە دەگرێت کە تا ئێستاش بەشاراوەیی ماونەتەوە. مەرجە کە وەک دیرۆکی دەستپێکردنی ژینۆسایدی کوردان تاوتوێ بکرێت. وەک دەزانرێت مستەفا کەمال لەو بارەیەوە زەحمەتێکی زۆری بینیوە و نەیتوانیوە حیساب بدات. هەروەها مسۆگەر لە ڕێگەی ئەو پەیماننامەیەوە دینامێت خرایە ژێر ڕێککەوتنی مێژوویی نێوان کورد و تورک. لە بنەڕەتدا سەرهەڵدانەکەی ١٩٢٥ بە ڕێبەرایەتی شێخ سەعید ئەنجامدرا بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو خیانەتە مێژووییە هەم دنەدراوە و (پڕۆڤەکە) کراوە، هەم بە شێوەیەکی بێواتا و نابەجێ زۆر بێبەزییانە و بەشێوازێکی خوێناوی سەرکوت کراوە. لەو چوارچێوەیەدا ساڵی ١٩٢٥ تەنیا سەرەتای یاخیبوون و سەرهەڵدان نییە، بەڵکو لە ڕاستیدا مێژووی دەستپێکردنی پیلانگێڕی، خیانەت و ژینۆسایدە. دیپلۆماسی ئینگلیز و فاکتەرە یەهودیەکان ڕۆڵێکی دیاریکەریان لەو ڕەوشەدا بینیوە. وەک دەزانرێت چونکە فەتحی ئۆقیار لەو قۆناغەدا گوتوویەتی: "دەستی خۆم بەخوێنی کوردان سوور ناکەم" لە ئەرکی سەرۆک وەزیران دوورخراوەتەوە و عیسمەت ئینۆنۆ لە جێگای دانراوە. فەتحی ئۆقیار هاوڕێی منداڵی مستەفا کەمال بوو و جێگای متمانەی بووە. کاتێک لە ئەزموونی فرقەی سەربەستیشدا سەرکەوتوو بوو دیسان لەلایەن عیسمەت ئینۆنۆوە لە ئەرکەکەی دوورخرابوویەوە. ئاشکرایە لەو ساڵانە تەنیا توخمە ئیسلامی و چەپڕەوەکان لەناونەدەبران، لەناوبردنی بنەڕەتی لەسەر نەتەوەی کورد بەڕێوە دەچوو. هەروەها مستەفا کەمال و گروپەکەشی چەندەی بڵێی لاواز کرابوون. وەک چاوەڕوان دەکرا کۆمارێکی دیموکراتی نەهاتە ئاراوە، بەڵکو سیستەمێکی دیکتاتۆری تەسفیەکار جێگای باس بوو.

بۆ دەرکپێکردنی ڕاستینەی تورک و کوردی هاوچەرخ و تێگەیشتنێکی ڕاست سەبارەت بە پەیوەندی نێوانیان پێویستی بە شیکردنەوەیەکی بەرفراوانی قۆناغی پیلانگێڕی ١٩٢٥ هەیە. خەیاڵی "ئەتاتورک" کە بۆچوونی فەرمی هەموو شتێکی پێیەوە گرێداوە، وەک هەژموونێک لەسەرجەم هەست و تێڕوانینەکانی زهنیەتی تورکیا جێگیرکراوە. بە بەراورد لەگەڵ زهنیەتی ئیسلامی بەهێز ئەو هێمایە یاخود خەیاڵە زەقتر کراوەتەوە و زاڵ بووە. ئەو زهنیەتە کە خۆی وەک نەتەوەگەرایی (ناسیونالیزم)ی تورک خستۆتە ڕوو، مسۆگەر دیاردەیەکی نوێی ئایینییە. عەلمانیەت و نەتەوەگەرایی تورک وەک ئایینێکی پۆزیتیڤیست ئاواکراوە. نموونەیەکی نزیکی ئەمەش لە فەڕەنسا ئاواکراوە (لە سێیەمین کۆماری فەڕەنسای ١٨٨٠)، نەتەوەگەرای تورکیش وەک مۆدێلێک بۆخۆی بە بنەماگرتووە. ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە: تەنیا میللیگەرایی تورک جێگای خۆی لە ئاواکردنی ئەو نەتەوە عەلمانیەدا نەگرتووە، بەڵکو میللیگەرایی یەهودی زایۆنیستیش زۆر بەکاریگەرە. بگرە لە ئاواکردنی ئەو نەتەوە نوێیەدا میللیگەرایی یەهودی زایۆنی ڕۆڵی پێشەنگایەتی لە

بابەتەکانی سیاسەتی دەرەوە، سیستەمی ئابووری و سەربازیدا دەبینێت. ئەو خاڵەی تا رادەیەکی زۆر لە مێژووی تورکدا شاراوەتەوە ماهیەتی ئەو ڕۆڵەیە. بەر لە دامەزراندنی ئیسرائیل میللیگەرایی زایۆنیست لەژێر دەمامکی نەتەوەگەرایی تورک"تورکی سپی" خۆی بونیاد ناوە و باڵادەست کردووە. ئیسرائیلێکی بەرایی جێگای باسە.

نەتەوەگەرایی تورکی سپی لەژێر ڕژێمی وشکی دیکتاتۆری هەردوو نەتەوەگەرایی درێژەی پێدەدرێت. لێرەدا لەناوبردنی کوردان، ئیسلامگەرا و چەپڕەوەکان لەمیانەی پیلانگێڕی جێگای باسە، کە لە شەڕی ڕزگاری نیشتیمانیدا لە بواری سیاسەتەکانی ناوخۆیی و دەرەکی و کلتوور لە ڕێککەوتندا بوون. پیلانگێڕی لە ناوەخۆشیدا بە شێوەیەکی بێبەزەییانە بەڕێوەچووە. کوردان کراون بە ئامانج، سەرهەڵدان دنەدراوە و (پرۆڤەکە) کراوە (کاتێک لەناوچەی دیجلە تیمێکی بچووکی جەندرمە دەنێرنە سەر شێخ سەعید پێکدادان ڕوودەدات و دوو سەرباز دەکوژرێن) و لە ئاکامدا لەمیانەی ئەو ڕێگا و ڕێبازانەی بە کۆمەڵکوژی دەگەن کوردان لەناو سیستەم تەسفیە کراون و بە نەبوو دانراون. چوار لە ژەنراڵەکانی گروپی مستەفا کەمال (ئەو گروپەی لەپێنج ژەنەراڵی یاخیبوو پێکدەهات) لە ڕێگای تەڵەزگەی هەمەجۆرەوە لە گروپی نوخبەی دەسەڵات بەدەر نراون، م. کەمال کە بەتەنیا ماوەتەوە ڕووبەڕووی کوردانی دەکەنەوە، بەشێکی هەمان تەڵەزگە بۆ هەوڵەکەی تیرۆرکردنی م.کەمال لە ئەزمیر هەڵگیراوە، بەمجۆرەش مستەفا کەمال ڕۆڵەکەی بۆ کەسایەتییەکی سیمبۆلی بچووککراوەتەوە. هەمان تەڵەزگە بۆ لەناوبردنی هێزە ئیسلامی و چەپڕەوەکانیش پەیڕەوکراوە. لێرە لە ڕووخساردا دوو هێزی دیاریکەر سەرۆک وەزیران عیسمەت ئینۆنۆ و سوپاسالار فەوزی چەکماک ن. بەڵام ئەوەی لە پشتیانەوە بوو هێزی هەژموونگەرایی ئەو سەردەمە ئینگلیزەکان و گروپەکانی سەرمایەی ژێر بونیادەکەی بوو کە ئافرێنەر، پێکهێنەر و درێژەپێدەری ڕاستەقینەی ڕژێمی نوێ بوون. سەرمایەی یەهودیش کە یەکێک لەو گروپانەی سەرمایە بوو بۆ یەهودیەکان بەدوای وڵاتێکدا دەگەڕا. بۆ ئاواکردنی وڵاتێکی یەهودی لە فەلەستین سەرەتا هەوڵی بەکارهێنانی سوڵتان عەبدولحەمید درا، چونکە وەک داوایان دەکرد ڕەفتاری نەکرد دژە کودەتا (پرۆڤەکاسیۆن) ٩ی ئادار کرا بە بیانوو و عەبدولحەمید بەلاوەنرا، کەوتنە یەکەمین جەنگی جیهانەوە، لەسەر بنەمای ئەو دەرفەتانەی هەلومەرجەکانی جەنگ ڕەخساندوویەتی ژینۆسایدی ئەرمەنیەکان ئەنجامدراوە، دەستوەردانیان لە شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی کردووە، پێشەنگایەتی کردارییان بەدەست خستووە، کرستیانە بەبنەچە ڕۆمەکان لەناوبراون، لەکاتی جەنگ و دوای جەنگ شانبەشانی هاوپەیمانە چەپڕەو و ئیسلامیەکان هاوپەیمانە ستراتیژییە کوردەکانیش لەناو براون و بەمجۆرە لە ساڵی ١٩٢٥ پیلانگێڕی سەرکەوتووە.

بەپێچەوانەی مەزەندەکان لە ساڵی ١٩٢٥ مستەفا کەمال لە لوتکەی هێزی خۆیدا نییە، بەڵکو کەسێکە کە کراوە بەهێزێکی سیمبۆلی، بۆ پلەی خوداوەندێتی ئایینی نوێ بەرزکراوەتەوە و مەحکومی چانقایا کراوە و وەک "کۆتەڵ (أیقونة) " ێک بۆ پەرستن

دانراوە. قووڵترین پیلانگێڕی ئەوەیانە: سەرهەڵدانەکانی کوردانیان کرد بە بیانوویەک و بەشێوەیەکی دژ بە ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕی شەڕی رزگاری و رێبەری راستەقینەی ئەو شەڕە یاخود یاخیبوونە (مستەفا کەمال) تامردنی وەک پرۆسەیەک درێژەی پێدراوە و بەمجۆرە خولی یەکەم بەسەرکەوتوویی تەواو بوو. لێرەدا کێشەکە گەورەکردن یاخود بچووککردنەوەی مستەفا کەمال نییە، بەڵکو جێگیرکردنیەتی لە شوێنی مێژوویی خۆی و دیاریکردنی رۆڵی کەسایەتییە داماڵراوەکەیەتی لە میتۆلۆژیا.

کاتێک قۆناغی ١٩٢٥ ـ ١٩٤٠ هەڵدەسەنگێنین پێویستە باش بزانین کە ئینگلتەرا هێزی هەژموونگەرایی جیهانی بوو، لە شەڕی رزگاری نیشتیمانیشدا تێک نەشکاوە، بەڵکو تەنیا بەرەی خۆی گۆڕیوە و ئەمەشی لەپێناو بەرژەوەندی سیستەمدا ئەنجامداوە. کۆمار دژی ئینگلتەرا ئاوا نەبوو، بەپێچەوانەوە بەیارمەتی دیاریکەری ئینگلتەرا دامەزرا. ئینگلتەرا دوو ئامانجی لەمەدا هەبوو: یەکەمیان؛ بەکارهێنانی تورکیا وەک هاوسەنگیەکی ستراتیژی رێگای باشوور بەرامبەر یەکێتی سۆڤێت کە لەو قۆناغەدا بەدوای ئەنجامدانی شۆڕشی جیهان بوو؛ دووەمیان، بەرتەسک کردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە نوێیەکەی تورک لە سنوورێکی دیاریکراودا کە بۆی نەبێت بەهەڕەشەیەک. پەیماننامەی لۆزان ئەنجامی ئەو هەڵوێستەیە. ئەوەی تر پڕوپاگەندە هەرزانەکانی سەرکەوتنن. کۆنترۆڵێکی توندوتۆڵی ئینگلتەرا لەسەر کۆمار جێگای باسە. ئەو کۆنترۆڵەشی لەمیانەی ئیسرائیلی بەراییەوە ئەنجام دەدات. لەدونیایەکی هەژموونگەرایی بەمجۆرەدا تەنیا رۆشنبیرە وردە بۆرژوازییە گەمژەکان دەتوانن باسی "کۆمارێکی تەواو سەربەخۆ" بکەن. لەو هەلومەرجانە نەک تەنیا لە ئەنادۆڵ، بەڵکو لە هیچ شوێنێکی دونیا سەربەخۆیی تەواو بیری لێناکرێتەوە و جێگای باس نییە. چونکە لەراستیدا سیستەمی شارستانی ناوەندی لەمیانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە کارەکتەری هەژموونگەرایی خۆی گەیاندە بەرزترین ئاستەکانی کە نزیکەی پێنج هەزار ساڵە لە ئارادایە. لە هەلومەرجە تایبەتەکاندا تەنیا بە شێوەیەکی رێژەیی سەربەخۆیی جێگای باس دەبێت. مستەفا کەمالیش ئەو هەلومەرجانە (هاوسەنگی ئینگلتەرا ـ رووسیا)ی هەڵسەنگاندووە و تا بۆی کراوە هەوڵی پەیڕەوکردنی سیاسەتی سەربەخۆخوازی داوە.

ئەگەر ئیسرائیلی بەرایی نەبێت ناتوانین لە دامەزراندن و بەردەوامبوونی کۆماری تورکیا تێبگەین. بەڵام بۆ ئافراندن و بەردەوامبوونی ئەو دوو دەوڵەت ـ نەتەوە تێکەڵ بەیەکترەدا پێویستی بە "ئەویدیکە" هەبوو. ئەوانەش کوردان بوون. بەئامانجگرتنی کوردان بەرژەوەندی ئینگلتەراشی تێدابوو. وەک پێویستیەکی میساقی میللی کۆمارێکی تورک ـ کورد کە موسڵ ـ کەرکوکیش لەخۆوە بگرێت سەبارەت بە کۆنترۆڵکردن یان دەستبەسەرداگرتنی نەوتی ئێراق بۆ ئینگلتەرا دەبوو بەزەبرێکی جددی و بەکاریگەر. دەبووایە مستەفا کەمال لەو دوو بژارەدا یەکێکیان هەڵبژێرێت. یان کۆمار یان موسڵ ـ کەرکوک. هەردووکیان بەیەکەوە نەدەبوون. بەئامانجگرتنی هەردووکیان مانای رەچاوکردنی شەڕ بوو لەگەڵ هەژموونگەرایی جیهان. مستەفا کەمال هێندە واقیعی بوو کە

ئەمەی ڕەچاو نەکرد. ئیتر مێژوو لەو خاڵەدا هەنگاو بۆ ئەو قۆناغە دەهاوێژێت کە سەرەتای تراژیدیە گەورەکەی کوردە کە بە ئاستی پیلانگێڕی و ژینۆسایدکردنی دەگات و تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان بەردەوامە. مەبەست لە تراژیدیای کورد ئەوەیە: کۆمار بۆ ئەوەی بژیت ناچارە لە بەرژەوەندی ئینگلتەرا دەستبەرداری موسڵ ـ کەرکوک بێت. هەرچی دەستبەردانە لە کەرکوک، یەکسانە بە زەبرێکی کوشندە لە ڕۆحی کوردان. کۆماری تورکیای ئیسرائیلی بەرایی و هەژموونگەرایی ئینگلیز لە پێناو بەرژەوەندییە پیرۆزەکانیان بەدوای قوربانیەکەدا گەڕاون، کوردانیش بوون بەو قوربانییە. ئەوەی گرنگتریشە تراژیدیا هاوچەرخەکەی کوردانە کە لە ١٩٢٥ دەستی پێکردووە، بەردەوام سەختتر دەبێت و بێوچان تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە.

لەسەردەمی سەرۆک کۆماری عیسمەت ئینۆنۆدا چیمەنتۆیەکی ئەستوور بەسەر ڕاستینەی کورد کرا و کۆنکرێتکراوە. دوای ١٩٥٠کان ئەو ڕاستییە بەجۆرێک بەسەر زهندا سەپێنرا و زاڵکراوە کە چیتر جێگای پرسیار و بەکێشەکردن نییە. وەک تابۆیەکی فەرمانڕەواکانی کۆماری تورک بەرگری لێکراوە، کراوە بە هێڵی سووری سیاسەتەکانیان. بەر لەوەی ڕەهەندی نەتەوەیی ڕاستینەی کورد ژیانی بەبەردا بێتەوە گەمارۆیان داوە و وشکیان کردووە. تەنیا بەدابەشکردنیان بۆ چوار پارچە نەوەستاون، لەهەر بەشێکیشدا سیاسەتی هێندە مەترسیدار پەیڕەو کراون کە وەک بوونێک نەمێنێت. لەو سۆنگەیەوە؛ هەڵسەنگاندنی ڕاستینەی نەتەوەی کورد دوای ١٩٢٥ وەک ڕاستینەک کە خراوەتە ژێر پرۆسەی کۆمەڵکوژی و ژینۆسایدەوە هەڵوێستێکی واقیعی دەبێت. تێزی کوردستان نیشتیمانێکی کۆلۆنییە لەو لایەنەوە کورت دێنێت. هەڵبەتە سەرجەم ڕەهەندەکانی داگیرکاری جێبەجێ دەکرێت، بەڵام پەیڕەوێک جێگای باسە کە داگیرکاری دەرباز دەکات و ئامانجی سڕینەوەی بوونی کوردانە. بێگومان ناوەکەشی ژینۆسایدە.

ئەگەر ئاوتوێکردنی کێشەی کورد دوای ١٩٧٠کان بەشێوەی کێشەی ئازادی لەلایەکەوە ڕاستیش بێت، بەڵام لەلایەکی ترەوە کێماسیەکی مەزن لەخۆوە دەگرێت. ئەویش کێشەی بوون (ئۆنتۆلۆژی)ی کوردانە. چونکە ڕاستینەیەک کە بوونەکەی ڕووبەڕووی لەناوچوونە یەکەمین کێشەی ئازادی نییە، بەرلەهەموو شتێک پاراستنی بوونە و ئەگەر بکرێت لەگەڵ پاراستندا ئازاد بکرێت. چونکە ئەوەی بوونی نەبێت ئازادی نابێت. ئازادیش تەنیا لەڕێگای بوونەوە بەدیدێت. خەسڵەتە تایبەتیەکەی ڕاستینەی نەتەوەی کوردی هاوچەرخ لێرەدایە. هەروەها جیاوازتر لە کۆمەڵکوژی یەهودی و ئەرمەنیەکانی مێژووی نزیک (لەناوبردنی جەستەیی لەو کۆمەڵکوژیانە لەپێشە)، لە ژینۆسایدی کوردان ڕەهەندی کلتووری لەپێشە. گروپێکی کلتووری کە بێناوەڕۆک کرابێت و بووبێت بە شتێکی دیکە، ئەگەر بەشێوەیەکی زهنی یاخود کلتووری ئەنجامدرابێت، مانای ئەوەیە کە دووچاری ژینۆساید هاتووە. بەهۆی دابەشکردنی کوردان بۆ چوار پارچە و پەیڕەوکردنی کردەوە جیاوازەکانی لەناوبردن لەسەر هەر پارچەیەکدا، ژینۆساید بەشێوەیەکی جیاواز بەڕێوەچووە، هەر بەشێکی کوردستان لە ئاستی جیاوازدا پشکی خۆی لە کۆمەڵکوژی

وەرگرتووە. بەهۆی کارەکتەری ئەو ژینۆسایدەی لەسەر کوردان پەیڕەو دەکرێت تا ئێستاش ئەو قۆناغە بەردەوامە. راستینەی کورد کە رووبەڕووی داگیرکاری، چەوسانەوە، ئاسیمیلاسیۆن و لەناوبردنی رەچەڵەک بۆتەوە، پێویستە لەچوارچێوەی پرۆسەیەکی بەمجۆرە هەڵبسەنگێنرێت: هەوڵدەدرێت راستیەکە وەک ناسنامەیەکی نەتەوەیی نەمێنێت و لەناو ببرێت.

لە رۆژی ئەمڕۆماندا هەوڵدەدرێت راستینەی کورد بەشێوەی ناسنامەی کورد گوزارشتی لێبکرێت. وشەی ناسنامە هاوتای پەیڤی بوونە. لەو دۆخەدا سەرەکیترین مەسەلەی پێویستە تاوتوێ بکرێت سەبارەت بە ماهیەتی ناسنامەی کوردە. راستینەی کورد، بە واتا هەنووکەییەکەی ناسنامەی کورد تەنیا ئەو کاتەی بە رادەی رابردووە مێژووییە درێژخایەنەکەی، هەموو لایەنەکانی ئەو پەیڕەوە تایبەتانەی رۆژی ئەمڕۆمان هەڵبسەنگێنرێت کە لە رێگایەوە خوازیارن بێناوەڕۆکی بکەن و بەگوێرەی خۆیان بونیادی بنێن، ئەو کاتە مایەی تێگەیشتن دەبێت. واتە دەبێتە خاوەن بەهای حەقیقەت. بەدواداچوون و لێگەڕینەکانی دەرهەق بە پەرەسەندنی کورد یاخود کوردە یەکەمینەکانی مێژوو چەندە گرنگ بێت، ئەوا چۆنیەتی ئەو کردەوە و رەفتارانەی راستینەی کورد لە رۆژی ئەمڕۆماندا رووبەڕووی بۆتەوە هێندە گرنگە. چونکە هەوڵی شیکارکردنی پەیوەندی نێوان دیرۆک و رۆژی ئەمڕۆمان داوە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام پێویستە زۆر چاک ئاگادار بین کە بە بێ لێکۆڵینەوەی راستینەی مێژوویی هیچ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی لەمیانەی رێبازە ئەنالیکتیکیە هەنووکەییەکان پێناسە ناکرێت، کاتێک لە دەرەوەی راستییە مێژووییەکەی تاوتوێ بکرێت ئەوا بەشێوەیەکی هەڵە و ناتەواو دەرک بە راستییە کۆمەڵایەتیەکەی دەکرێت. هەربۆیەش هەر راستییەکی کۆمەڵایەتی تاوتوێ بکەین لە چوارچێوە مێژووییەکەیدا لێی دەکۆڵینەوە.

ئەگەر بەشێوەی گەڵاڵەیەکیش بێت بەڵام لەو بڕوایەدام کە بە شێوەیەکی بەرفراوان لێگەڕینی خۆمان سەبارەت بە مێژوو خستۆتە روو. ئەو جارەش لەچوارچێوەی هەلومەرجەکانی رۆژی ئەمڕۆمان هەوڵی شیکارکردنی (رێبازی ئەنالیتیک) (ألأسلوب ألتحليلي) راستینەی کورد یاخود ناسنامەی کورد بدەین.

### أ . ناسنامەی هاوچەرخی کورد
### لە ژێر هەژموونگەرایی دەسەڵات و سەرمایەی تورک و هاوپەیمانەکانیدا

لە هەڵسەنگاندەکانمان سەبارەت بە مێژووش بینیمان کاتێک پاوانی چەوسانەوە و دەسەڵاتی نەریتی عوسمانیەکان هەرەسیهێنا، گروپێکی دەستەبژێری کە جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی رۆڵی سۆبژەی تێدا دەبینی لە رێگای پیلانگێڕی و کودەتای جیاوازەوە وەک رێکخستەترین هێزی بیرۆکراتی بۆرژوازی لە مەشروتیەتی دووەم، لەسەر تەخت لابردنی عەبدولحەمید دوای راپەڕینی ٣١ ئاداری ١٩٠٩ و هێرشی ١٩١٣ /١/٢٣ بۆ سەر باب

ئەلعالی، لەماوەی یەکەمین جەنگی جیهانی ١٩١٤ ـ ١٩١٨و هەرەدوابیش لە شەڕی رزگاری نیشتیمانی ١٩١٩ ــ ١٩٢٢دا پاوانی دەسەڵات زەوت دەکات. لەبواری ئایدیۆلۆژی و ئابوورییەوە مۆرکی خۆی لە هەژموونگەرایی قۆرخکاری دەدات. لەساڵی ١٩٢٣ وە دەست بەسەر بەڕێوەبەرایەتی کۆماردا دەگرێت. لەسەر بنەمای تورکێتیەکی سپی، کە لە دەوروبەری ئامێرەکانی دەسەڵات و ئایدیۆلۆژیایەکی دروستکراوی ناسیۆنالیزمی تورک پێکهاتووە، وەک چەتەیەک لەمیانەی تەڵەکەبازیەکانی پیلانگێرییەوە سۆسیالیست، ئوممەتگەرا ئیسلامی و هێزە نەتەوەییەکانی کوردان واتە هاوپەیمانە سەرەکیەکانی شەڕی رزگاری نیشتیمانی لەناو دەبەن و"دیکتاتۆریەتیکی ئۆلیگارشی" ئاوادەکەن کە تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە. ئەو دیکتاتۆریەتە هەژموونگەراییە ناوخۆییە، لەژێر رێنومایی و کۆنترۆڵی هێزە هەژموونگەرا جیهانیەکانی دەرەوە رۆڵی خۆی دەبینێت کە ئینگلتەرا سەرۆکایەتییان دەکات. بەتایبەتی لەمیانەی بە سیمبۆلکردنی کەسایەتی مستەفا کەمال و ناسنامەیەکی ئایدیۆلۆژی فاشیستانەی لە دەمارگیری چاخەکانی ناوین قورسترە لەژێر ناوی ئەتاتۆرکچێتی ناوەناوەش لەژێر ناوی کەمالیزمەوە ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدکردنی سەرجەم کلتوورە کۆمەڵایەتیەکانی چوارچێوەی سنوورەکانیان لە رێگەی بەرنامەیەکەوە جێبەجێدەکەن. لەبواری ئابووریشدا لەرێگای قۆرخکاریەکانی دەوڵەت تا مۆخی ئێسقان کۆمەڵگا دەچەوسێنرێتەوە و وشکدەکرێت. هەرچەندە ئەو قۆرخکارییانەی پەیوەندی هەژموونگەراییان لەگەڵ یەکتردا هەیە کێبڕکێ و شەڕی دژوار لە نێوان خۆیاندا جێگای باس بێت، بەڵام سەبارەت بە بەکارهێنان و لەناوبردنی کلتوورە کۆمەڵایەتیەکان (بەلایەنی ماددی و مەعنەویەوە) تەواو بەشێوەیەکی یەکگرتوو و هەمئاهەنگ دەجووڵێنەوە. ئەو دیکتاتۆریەتەی هێزی تورکی سپی لەمیانەی رێبازەکانی پیلانگێڕی، کودەتا و کۆنترگەریلاوە (لقی گلادیۆی رێکخراوە نهێنیەکەی ناتۆ لە تورکیا) ئاوای کردبوو لە بنەڕەتدا تا سەرەتاکانی ساڵانی ٢٠٠٠ درێژەی پێدەدات.

ئەو پێکهاتە یان قەوارە هەژموونگەرایییەی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لە ئەنادۆڵ دامەزرا بەهیچ پێکهاتەیەکی دیکە ناچێت. لە رووخساردا باڵادەستی تورکێتیەکی زۆر وشک جێگای باسە؛ بەڵام لە ناوەڕۆکدا سیستەمێک جێگای باسە کە لە رێگەی کاریگەری گرووپێکی پیلانگێڕی زۆر تەسک بەڕێوەدەچێت. هیچ پەیوەندیەکی بە سیستەمە مۆنارشی، کۆماری و دیموکراسیەکانی دەوڵەتەوە نییە. زۆرداری و دەسپۆتیزمێکی تایبەت بەخۆیەتی. خاوەن میکانیزمێکی زۆر نهێنی و شاراوەن. بێگومان بۆرژوازیبوونی بیروکراتی تورک رۆڵێکی دیاریکەری لە بزاوتی لەناوبردنی کوردایەتی و قەڵاچۆکردنی ئەرمەنی، سریانی، پۆنتۆس و فاکتەرە هێلینییە کرستیانەکانی دیکە هەبوو کە لەلایەن ئیسرائیلی بەرایی بەڕێوە چوون. رژێمێک رەفتار و کردەوەگەلێک جێبەجێ بکات کە بە ئاستی ژینۆساید دەگەن ناشێت بە شێوەیەکی ئاشکرا و لەمیانەی رێبازی مەشروعەوە بەردەوام بێت. تەنیا ئەو پەردەپۆشیەی لە رۆژی ئەمڕۆماندا سەبارەت بە شاردنەوەی ژینۆسایدی کلتووری کوردان پەیڕەو دەکرێت بەسە تاوەکو رووی راستەقینەی رژێم ئاشکرا

بکات. بەڵام هیچ کەسێک بوێری ئاشکراکردنی ئەو راستییەی نییە. هەرچی رەخنەکردن و بەرەنگاربوونەوەیەتی بەشێوەیەکی نادیار "بکەری نادیار" دەتکات بە قوربانی. لەوانەیە دونیای شەفافیەتی هەرە زۆر بۆ ئەو بونیادە پێویست بێت.

ئەوەی بە فاشیزمی تورکی سپی ناودەبرێت خەسڵەتی دامەزرێنەری ئەو سیستەمەی هەیە. لایەنی سەیری مەسەلەکە لەوەدایە زۆربەی زۆری ئەوانەی رۆڵیان لە سیستەمدا بینیوە یاخود بوونەتە ئامراز ئاگادار نین و نازانن بەو رۆڵەی کە بینیویانە خزمەتیان بەچی کردووە. بەشێکی زۆر کەمیان، بەتایبەتیش ئەوانەی لە دەرەوە خەریکی پەیوەندین لەگەڵ سیستەمدا ئاگادارن کە رۆڵەکەیان چ مانایەک دەبەخشێت. کاتێک یادەوەریەکانی مستەفا کەمال و پێنج ژەنراڵە بەناوبانگەکەی یاخیبوون بەباشی بخوێنرێتەوە ئەوا زۆر بە ئاشکرایی روون دەبێتەوە کە؛ بەهۆی ئاشنابوونیان بە پێکهاتەیەکی دوور بگرە دژی ئەو بەرهەمەی خوازیاری ئاواکردنی بوون، زۆر تووڕە و نائارامن. مەترسیداتریشیان ئەوەیە: کەسانێکی سنووردار سەرقاڵی ئەو تورکێتیەن کە بە فاشیزمی تورکی سپی ناودەبرێت، زۆربەی زۆرینەی کۆمەڵگای تورکیش ئاگاداری ئەو واقیعە نین و تەنانەت هیچ زانیاریەکیان لە بارەیەوە نییە. لەوانەیە گوتەی "ئەتراکی بێ ئیدراک" گوزارشت لەو راستییە بکات. گەرچی بەدرێژایی مێژوو لە ئاواکردنی سەرجەم دەسەڵاتدا تێز و بەڵگەی هاوشێوە جێگای باسن، بەڵام هیچ یەکێکیان لەگەڵ تێز و بەڵگەکانی بونیادی دەسەڵاتی هاوچەرخی ئەنادۆڵ بەراورد ناکرێت و باڵاکەی ناپێورێت.

وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە دوای دووەمین جەنگی جیهانی رێبەرایەتی هەژموونگەرایی سیستەمی گرتەدەست، فاشیزمی تورکی سپی پتەوتر کرد و درێژەی بە کۆنترۆڵکردنی کۆماری تورکیا داوە. وەک دەزانرێت لە ساڵی ١٩٤٥و ١٩٥٠کان لەسەر بنەمای رێکخستنی گلادیۆ گروپێک ئەفسەری پەروەردە کرد و بە ئامانجی جڵەوکردن و دیاریکردنی پێوەرەکانی سیستەم بەکاری هێناون، هەر ئەمانەش بوون کە دواتر کودەتای ٢٧ی مایسیان ئەنجامدا. هەروەها وەک دەزانرێت لە ساڵانی ١٩٤٠کاندا ئینگلتەراش لەو چوارچێوەیەدا گروپێک فرۆکەوانی تورکی لە شەڕدا بەکارهێنابوو. بەتایبەتیش ئەلپ ئەرسڵان تورکێش و گروپەکەی لەناو ئەو ئەفسەرانە دەرکەوتنە پێش کە دوای ساڵانی ١٩٦٠ لە پێناو بێکاریگەرکردنی بزووتنەوەکانی زەحمەتکێشان و چەپرەوەکانی تورکیا لە هەمان چوارچێوەدا بەکارهێنران. لەو بوارەدا هەرچەندە پەیوەندی بەردەوامی لەگەڵ فاشیزمی تورکی سپی هەبوو، بەڵام ڤێرسیۆنێکی جیاوازتری ئەو گروپانە بەردەوام دەستبەکار و لە ئارادابوون. ئەوانەش فاشیستە نەژادپەرستە تورکەکان بوون کە ئانتی ــ زایۆنیست و زیاتریش لە تەوەرەی هیتلەرگەراییدا چالاکیەکانی خۆیانیان بەڕێوە دەبرد. ئەو توێژانەی نوێنەرایەتی ئەو مەیلە دەکەن کە دەتوانین بە فاشیزمی تورکی رەش ناوی ببەین، خوازیارن بوونی ئیسرائیلی بەرایی لە ئەنادۆڵ نەهێڵن و سیستەمێکی هەژموونگەرایی تورکێتی ساف لە ئەنادۆڵ ئاوابکەن. ئەو توێژانە ئەو سیستەمەی لە شەڕی یەکەمی جیهاندا زەوتیان کرد و بۆ یەکەمینجار دژی ئەرمەنیەکان پەیڕەویان کرد،

جارێکی دیکە بەتەواوی دەستیان بەسەردا نەگرت. بەشێوەیەکی ڕێژەیی ڕوویداوە، ئەویش کاتێک فاشیزمی تورکی سپی پێویستی بینیوە، لەسەر بونیادی ئاواکراو زیادکراون. بەتایبەتی بەشێوەیەکی بێبەزەییانە، نایاسایی و بەشێوازێکی پیلانگێڕانە دژی بزووتنەوەی سۆسیالیستی و دیموکراسیخوازی تورکیا بەکارهێنران. لایەنی سەیری مەسەلەکە لەوەدایە؛ کاتێک لەناوبردنی ناسنامەی کورد جێگای باس بێت، لەدەرەوەی دۆخی ناوازە بونیادە دیموکرات و چەپڕەوەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەش لە بەشداریکردنی بونیادی ناوکی فاشیزمی تورکی سپیدا دواناکەون. بەبێ ئەوەی هەستی پێ بکەن کە چۆن لەلایەن ئەو ئیمپریالیستانەوە بەکاردەهێنرێن کە گوایە خۆیان بەرهەڵستییان دەکەن!.

ئەوانەی هەوڵی ئاواکردنی نەژادێکی ساف دەدەن پێویست ببینن سەرلەنوێ تەواوی ئەنادۆڵ (کوردستانیشی لەناودا) فەتح دەکەن، ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی تورک لەسەر بنەمای ئەتنیکێک بە ئۆتۆپیای سەرەکی خۆیان دادەنێن. ناکۆکییان لەگەڵ کلتووری کەمایەتییە جیاوازەکان و لایەنگرانی ئیسرائیلە. بەڵام لەبەرئەوەی زۆرباش ئاگادارن ئەگەر ئیسرائیل نەبێت (ئیسرائیلی ناوەوە و دەرەوە) ناتوانن بەردەوام بن، بەشێوەیەکی ئاشکرا هەڵوێست نانوێنن. هۆکاری هەبوونیان وەک پارتێک، نەژادپەرستترین میلیگەرایی ئەتنیکی تورک و دەوڵەتگەرایی ـ نەتەوەیە. سیاسەتی فاشیزمی تورکی هەم سپی و هەمیش ڕەش سەبارەت بە ناسنامەی کورد لەناوبردنی تەواوەتییە لەبواری جەستەیی یان کلتوورییەوە، نەهێشتنی کوردانە وەک بوونێک. لەکاتێکدا تورکە سپیەکان ئەو کەسانە بە تورک پەسەند دەکەن کە خۆیان بە تورک دادەنێن، بەڵام تورکە ڕەشەکان (دەشێت بە تورکە گورگە بۆرەکانیش ناو ببرێن) بۆ ئەوە کراوە نین. لەجیاتی ئەوە بەدوای نەژادی سافەوەن. ئامانجی سەرەکییان زوو یان درەنگ لەناوبردنی کوردانە لەڕێگەی ژینۆسایدی جەستەییەوە. تورکە ڕەشەکانی لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانەوە بۆ لەناوبردنی بزووتنەوە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکان بەکارهێنران لەڕۆژی ئەمڕۆماندا چیتر وەک جاران گێنەی چاو نین.

پەسەندکردنی سەنتێزی تورک ـ ئیسلام لەلایەن کودەتای ١٢ی ئەیلول (١٩٨٠)، سێیەمین نەوەی بزاوتی فاشیستی خستە ڕۆژەڤەوە. ئەو ڕەوتەی دەشێت بە فاشیزمی تورکی سەوز ناوی ببەین، ئەو کاتە پەرەیسەند کە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە ئامانجی بەربەستکردنی پەلهاوێشتنی یەکێتی سۆڤێت دوای ١٩٧٠کان بۆ خۆرهەڵاتی ناوین، دەرخستنی ڕووسیای سۆڤێتی لە ئەفغانستان و سەرقاڵکردنی بە کێشەکانی ئاسیای ناوین و ڕێگرتن لە خزینی وڵاتە ئیسلامییەکان بۆ دیموکراسی و سۆسیالیزم پشتگیری لێکردن، چونکە لەو بڕوایە دابوو بە بەراورد لەگەڵ میلیگەرایی نەژادپەرست گونجاوترن و باشتر بەکار دەهێنرێن. بزووتنەوەی ئیسلامگەرا زیاتر لەسەر بنەمای خزمەتکردنی هەژموونگەرایی ئینگلیز هاتۆتە ئاراوە. لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری جیاواز و سەربەخۆ نییە. هێندەی مەزەندە دەکرێت نەتەوەیی و ئازادیخوازیش نییە. بەشێوەی ڤێرسیۆنێکی میلیگەرایی سەرمایەداری ئاواکراوە. ئامانجی سەرەکی بەربەستکردنی

دیموکراتیزەبـوون و سۆسیالیسـتەبوونی ئـەو کۆمەڵگایانەیـە کـە بەشـێوەیەکی بـەربڵاو کلتووری ئیسلامی تێدا دەژیت و ئەنتەگرەکردنی کلتووری ئیسلامە لەگەڵ سـەرمایەداریدا، واتە کلتووری ئیسـلام بکـات بـە بەشـێکی گـونجێنراو لەگـەڵ سـەرمایەداری. یـەکێک لـەو ئامرازانەیە کە سەرجەم هێزە هەژموونگەراکان بەو ئامانجە بەکاری دێنن.

بەئامانجی کۆکردنەوەی توخمە (عناصر) ئیسلامیەکانی ناو ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و بەکارهێنانی لە دژی هەژموونگەرایی ئینگلیزەکان سەرەتا پان ئیسـلامیزم بـە پشـتگیری ئـەڵمانیا ئـاواکرا. ئینگلتـەراش بـە پەرەپێـدانی وەهابیـەت[٢٩] لـە جوگرافیـای عـەرەبی وەڵامیدایەوە. ئیسلامگەرایی بۆ خزمەتکردنی پەرەپێدان و زیادکردنی پشکی بەکرێگیراوان ــ کە لە کاتی دەرکەوتنیەوە کلتووری ئیسلامی بەکار دەهێنن ــ لـە چەوسـانەوە و کۆلـۆنی هێزە هەژموونگەراکان بەکارهێنراوە. بەشێوەی میللیگەرایی ئایینی لەسەر هەژموونگەرایی سەرمایەداری زیاد کراوە. پێویستە فاکتەر و ئەندامە ئیسـلامییە نیشـتیمانپەروەرەکان لـە ئیسلامە سیاسیەکان جیابکەینەوە. چونکە ڕێبەرایەتی ئانتی ـ هەژموونگەرایی بەم چەشنە دەرکەوتوون. ڕەوشێکی روون و ئاشکرایە کە کلتووری ئیسلامی هۆمۆژەن نییە، بەڵکو بـە گوێرەی دۆخە کۆمەڵایەتی و چینایەتیەکانەوە بۆ پیشاندانی هەڵوێستی جیـاواز کراوەیـە. لەسەردەمی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانیدا وەک هێزێک ئیسـلامیەکان هەڵوێسـتێکی ئـانتی ــ هەژموونگـــەراییان پیشــــانداوە. هـــــەروەک ئەندامــــە سۆسیالیســــت و کـــــوردە نیشتیمانپەروەرەکان، هێزە ئیسلامییە وڵاتپارێزەکانیش لەلایەن فاشیزمی تورکی سپیەوە لەناوبراون. جێگای ئیسلامیە وڵاتپارێزەکان لەگەڵ پیلانگێڕی تورکی سپی لەناو دەوڵەتدا جێگـای بـاس نـەدەبوو. ئەوانـە نەیانـدەتوانی بەیەکـەوە لەگـەڵ عەلمانیگـەرا وشـکەکان (ئایینگـەرایی عـەلمانیی) بـژین. هەربۆیـەش بێـدەنگ کـران. هـەروەک باڵـە ئـانتی ــ کۆمۆنیستەکانی دیکە ئیسـلامگەرایی سیاسیش لـەژێر ڕێبەرایـەتی هەژموونگـەرایی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا سـەرلەنوێ هـەوڵی زیندووکردنـەوەیان دراوە. وەک فاشـیزمی نەژادپەرسـتی تـورک ئـەو ڕەوتـەش دوای قەڵـەمبازی بزووتنـەوەی سۆسیالیسـتی و دیموکراسـیخواز دوای ١٩٦٠ کـان بـوو بـە پـارتی. هەرچەنـدە ناکۆکیـان لەگـەڵ باڵـە فاشیستەکانی دیکـەدا هـەبێت بـەڵام هـەموویان لـە ئامـانجی سـەرەکیدا دەبـوون بەیـەک. ئەوانیش لە ١٩٧٠کان بەدواوە جێگای خۆیان لەناو دەسەڵاتدا کردەوە.

هەڵکشـانی بزووتنـەوەی شۆڕشگێڕی کاریگەریـەکی روون و ئاشکرای لـەوەدا هەیـە. بەڵام داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێت و شۆڕشی ئیسلامی شیعەگەرایی لە ئێران ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو کە بە شێوەیەک بایەخداربن تا ڕێککـەوتن لەگـەڵ کودەتـای

---

[٢٩] بزوتنەوەیـەکی ئیسـلامی سیاسـییە، لەسـەدەی هـەژدەدا لەسـەر دەسـتی محەمـەد عەبـدولوەهاب دروسـت بـوو. وەهابییەکان خۆیان بە ئەهلی سوننە دادەنێن و لەو باوەڕییە دان کە تاقە گروپن کە ناچنە ناو دۆزەخـەوە. پێیـان وایـە دەبێت دەوڵەتی ئایینی لەسەر بنەمای شەریعەت پێک بێت. لەسـەر نـاوی ئـەوەی دەوڵـەتێکی ئـایینی دروسـت دەکـەن دەستیان بە شەڕێکی دژوار دژ بە نەیارانیان کرد و دەسـتیان بەسـەر موڵـک و سامانیان داگرت. لەئـەنجامی ئەمەشـدا یەکەم دەوڵەتی سعودیە دامەزرا. (وەرگێڕ)

١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠ ئەنجام بدەن. پێویستیەکی زۆر بە سەرلەنوێ بونیادناوەوەی بزووتنەوەیەکی ئیسلامی هەبوو کە هەم ڕۆڵ لە شکاندنی هەژموونگەرایی یەکێتی سۆڤێتدا ببینێت، هەمیش ببێتە بەربەست و لەمپەر لە پێش شۆڕشی ئێران. مایەی تێگەیشتنە کە لەمیانەی جیاکردنەوەی ئەندامە میانڕەوەکانی ناو بزووتنەوەکەی نەجمەدین ئەربەقان سەرۆکایەتی دەکرد (میللی گۆروش: ئامانجی ئاواکردنی بۆرژوازیەکی میللی تورکە) کە لە تورکیا بۆ ئەو مۆدێلە بە رادیکاڵ دەبینرا، هەروەها لەمیانەی کۆکردنەوەی کادیران لە گروپ و جەماعەتە جیاوازەکانەوە گروپێکی دەستەبژێری دەسەڵاتگەرا کۆکرایەوە. ئەوەبوو کە هەوڵیان دەدا لەرێگەی تورگۆت ئۆزالەوە ئەنجامی بدەن. دوای لەناوبردنی سیاسی و جەستەیی ئورگوت ئۆزال لە نیسانی ١٩٩٣ کە تا ئێستاش چۆنیەتی و هۆکارەکەی وەک نهێنیەک شاراوەتەوە، لە ٢٨ی شوباتی ١٩٩٧یش لەمیانەی دوورخستنەوەی نەجمەدین ئەربەقان لە ئەرکی سەرۆک وەزیران، کار لەسەر ئەو مۆدێلە کرا کە دواتر خۆی وەک پارتی داد و گەشەپێدان AKP راگەیاند. وەک مەزەندە دەکرێت دەرکەوتنی AKPلە ٢٠٠١ نیە، بەڵانی کەم ریشەکەی بۆ ١٢ی ئەیلول درێژ دەبێتەوە. کاتێک پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی جۆرج دەبڵیو بۆشی سەرۆکی ئەمریکا کەوتە رۆژەف، ئەفغانستان و ئێراقی داگیرکرد پرۆژەی ئیسلامی میانڕەوی تورکیای کرد بە ئەلتەرناتیفێکی نوێ. فاشیزمی تورکی سپی بەهۆی بونیادە عەلمانیی و بەسەرچووەکەیەوە لە جەماوەر دابڕا و گۆشەگیر بوو. هەروەها بەرووی دەرەوە داخرابوو. هێندە بۆ سەرمایەداری جیهانگیری کراوە نەبوو. چونکە بزووتنەوەیەکی دیموکراسی و سۆسیالیستی ئەوتۆ لە بەرامبەریدا نەبوو، پێویستیەکی وەهای ئەمریکا بە فاشیزمێکی نەژادپەرست نەبوو. گرنگتریش ئەوەبوو کە لە تەواوی کوردستان و کوردستانی ژێر دەسەڵاتی تورکیاش بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی و ئازادی کوردستان بەردەوامی بە پەرسەندنە مەزنەکەی خۆی دەدا. لەو سۆنگەیەوە؛ کاتێک دۆخی دابڕاوی و گۆشەگیری ئایدیۆلۆژیە فاشیستەکانی لە چەشنی سپی و نەژادپەرستی رەچاو بکەین، ئەوا ئاشکرا دەبێت کە پێویستییان بە نوخبەیەکی فاشیستی سەوزی تورک بینیوە.

رۆڵی گرنگی کلتووری ئیسلامی لە ناسنامەی کلتووری کوردانەدا کاریگەری لەو بابەتەدا هەبوو. کاریگەری سەدان ساڵەی مەیلەکانی تەریقەتگەرایی لە کۆمەڵگای کوردەواریدا، بژاری فاشیزمی تورکی سەوزی دەکرد بەتێزێک کە دەرفەتی بەکارهێنانی زیاتری هەبێت. نوێنەرانی دوو باڵەکەی دیکەی فاشیزم لەناو سوپا و پارتە سیاسیەکاندا، لەسەرووی هەمووشیانەوە MHPو CHP بەتوندی دژی ئەو گۆڕانەی دەسەڵات وەستانەوە. لە ساڵی ٢٠٠١ تا ٢٠٠٧ چوار جار هەوڵی کودەتایاندا. بەڵام بەهۆی پشتگیرینەکردنیان لەلایەن ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا سەرکەوتوو نەبوون. هەروەها لایەنگری بەهێزیAKP بۆ سەرمایەی فینانسی جیهانگیری کردی بە تاکە بژار، تەنانەت مانەوەی بە شێوەی دەسەڵاتی یەک پارتی بەهێز و تۆکمەتر کرد. گەیشتنیAKP بە دەسەڵات مانای قۆناغی هەژموونگەرایی نوێیە لە دەوڵەتدا. هەژموونگەرایی هەشتا

ساڵەی تورکی سپی بەسەر کۆماردا بەشێوەیەکی پڕ بە ئازار و هەنگاو بە هەنگاو شوێنی خۆی بۆ فاشیزمی تورکی سەوزی کۆمار بەجێهێشت کە خۆی بە ئیسلامی میانڕەو دادەنێت. بێگومان ئەو دۆخە مانای فەتحکردنی تەواوی دەوڵەت نابەخشێت، بەڵام بەو ئاراستەیەدا دەڕوات. لەجیاتی فاشیزمی تورکی سپی تەوەرەی ئەنقەرە، فاشیزمی تورکی سەوزی تەوەرەی قۆنیا ـ قەیسەری هێدی هێدی بەڵام بە هەنگاوی بەخۆباوەڕ ڕێگای هێزە نوێکەی هەژموونگەرایی کۆماری گرتۆتەبەر. هەر لەئێستاوە لەژێر ئەو هەژموونگەراییەدا نەخشە و بەرنامەی پێشوازیکردنی ساڵی ٢٠٢٣ی سەدەمین ساڵی کۆمار دانراوە.

لە قۆناغی ئەو هەژموونگەراییە نوێیەدا شانبەشانی ئەوەی ناسنامەی تورک ماهیەتی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک خۆی دەپارێزێت، لەڕێگای ئامێرو ئامرازەکانی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامگەرایی سوونیی بەهێز و تۆکمەتری دەکات. ئەوە کوردانن کە دووچاری کێشەیەکی بنەڕەتی ناسنامە دێن. ڕێککەوتنی باڵێکی سوپا لەگەڵ هێزە هەژموونگەرا نوێیەکە، هۆکارەکەی بۆ ئەو دیدەیان دەگەڕێتەوە کە ئامرازەکانی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامگەرایی لە سەرکوتکردن و لەناوبردنی ناسنامەی کوردان ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. کادیران و فەرماندارە نوێیەکانی سوپا ڕۆڵێکی گرنگیان لە ڕازیکردن و بێدەنگبوونی ئامراز و ئامێرەکانی دوو ئایدیۆلۆژیا فاشیستەکەی دیکە هەیە. لە ڕاستیدا فەرماندارانی کودەتای ١٢ی ئەیلولیش خاوەن مەیلێکی هاوشێوە بوون و پەیوەندییە ئۆرگانیەکانی نێوانیان ئاشکرا ببوو. خاڵێکی دیکەی گرنگی پەیوەندی هێزی هەژموونگەرایی نوێیە لەگەڵ سەرمایەی یەهودی و ڤێرسیۆنە ئایدیۆلۆژیەکانی. ڕاستیەکی دەست لێبەرنەدراو بوو کە بونیادی ئیسلامی میانڕەوی هێزی نوێی هەژموونگەرایی و پەیوەندیەکانی لەگەڵ هێزە ئیسلامی و دەسەڵاتە هاوشێوەکانیان ڕێگا لەپێش ناکۆکی لەگەڵ زایۆنیزم (میللیگەرایی وشک) ی ئیسرائیل دەکاتەوە. بەڵام ئەو دۆخە مانای نەبوونی پەیوەندی AKPلەگەڵ سەرمایەی یەهودی و ئامرازە ئایدیۆلۆژیەکانی دیکەی نابەخشێت. بە پێچەوانەوە AKPتوندوتۆڵترین پەیوەندی لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای قەرایمی یەهوودی و باڵی فینانسی جیهانی جیهانگیری سەرمایەی یەهودی نازایۆنیست هەیە، بە واتایەکیتر ئەو باڵە بە شێوەیەکی تۆکمە لەجێگای باڵی زایۆنیست ئاواکراوە. لەهەر پارتێکی نەژادپەرست یان فاشیستی سپی تورک زیاتر AKP نوێنەر و هۆبەی سەرمایەی یەهودی و ئامرازە ئایدیۆلۆژیەکانێتی لە ئەنادۆڵ و کۆماری تورکیا.

پێویستە لەبیر نەکەین کە ئەو سەرمایەی یەهودی و ئامێرە ئایدیۆلۆژیەکەی لەو چوار ساڵەی دوایی لە سەرووی ئەو هێزە سەرەکیانەوە دێت کە هەژموونگەرایی جیهانگیری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەرەی پێداوە و بەڕێوەیبردووە. ڕۆڵی لە پێکهاتنی سەدان قۆرخکاری سەرمایە و دەسەڵاتی دەوڵەتدا هەبووە، لەو سۆنگەیەوە؛ ڕۆڵێکی دیاریکەری لە دەرکەوتنی شەڕ و پێکدادانەکان هەیە. ئەو گریمانە واقیعی نییە هێزێک لە بواری ئابووری و ئایدیۆلۆژی هەژموونگەرایی جیهانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا هێندە بەکاریگەرە، لە جوگرافیایەکدا کە خۆی بە ستراتیژی دادەنێت، واتە لە پێکهێنانی

دەسەڵات و دامەزراندنی مۆدێرنیتە لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا بێکاریگەر بێت. وەک چۆن لە ساڵانی دامەزراندنی کۆماردا دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی میلیگەرایی ـ عەلمانی ئاواکرد و بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان بە گونجاوترین مۆدێلی مۆدێرنیتەیان دانا (ئیسرائیلی بەرایی، بونیادێکی داخراوی دەسەڵات کە دژی یەکێتی سۆڤیەتە و لە ناوچەکە دابڕێنراوە)، لە ساڵانی ٢٠٠٠کانیشدا لەسەر بنەمای ئامانجی هاوشێوە، بەڵام لەمیانەی ئامرازە پێچەوانەکانەوە (کۆماری تورکیایەک کە بە شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکێتی ـ سوونی سەرلەنوێ بونیادنراوەتەوە، سنوورەکانی بەرووی دەرەوە کراونەتەوە، زیاتر خۆی لە ناوچەکە هەڵدەقورتێنێ و لەگەڵ سەرمایەی جیهانگیری بۆتە یەک) بەرەو ڕێکخستنی هێزی هەژموونگەرایی هەنگاوی نا. گرنگترین خاڵی پێویستە بزانرێت؛ هێزی هەژموونگەرایی جیهانی ڕۆڵێکی دیاریکەری لە ئاواکردنی ئەو هەژموونگەراییە نوێیەدا هەبوو.

لە سەردەمی ئەو هێزە هەژموونگەرایە نوێیەدا ڕێ و ڕێبازی نوێی پیلانگێڕی بەئامانجی لەناوبردنی ناسنامەی کورد تاقیکراوەتەوە و ئێستاش تاقیدەکرێتەوە. ئەو پرۆڤانە بۆ یەکەمین جار لە ساڵانی ١٩٩٠کان بەناوی حزبوڵلای تورکیا (ئەو ڕێکخستنەی گەلی کوردستان بە حزبول کۆنترا ناویدەبات) ئەنجامدران. هەروەک یەکێک لە دامەزرێنەرانی ژیتەم سەرهەنگ عارف دۆغان[٣٠] بە ئاشکرا ئاماژەی پێکرد حزبول کۆنترا ڕێکخستنێک بوو کە خۆیان ئاوایان کردبوو. هەر کەس دەزانێت ئەو پێکهاتەیە ڕۆڵێکی گرنگی لە تیرۆرکردن و کوشتنی بکەری ـ نادیاری زیاتر لە دە هەزار مرۆڤ هەبوو. دوای ئەو تاقیکردنەوە لە ڕێگای AKPوە هەنگاو بۆ دووەمین قۆناغ نراوە. ئەو مۆدێلە سەرەکییەی لەناوبردن کە AKPو هاوپەیمانەکانی (هێزەکانی تەریقەت ـ کۆمپانیاکان، بەتایبەتیش ئەو کۆنترا سەوزەی بەناوی جەماعەتی گولەن دەناسرێت و لەناوەڕۆکدا ناواخنی دەوڵەتە و لە جیاتی کۆنترا ڕەشەکانی گورگە بۆرەکان لەلایەن وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئاواکراوە) سەبارەت بە کوردستان گونجاویان بینیوە و ئامرازە سەرەکیەکەی ئەو مۆدێلە ئیسلامگەرایی سوونی میانڕەوە، هەرچی ئەو ڕێکخستنەیە کە لە جیاتی حزبول کۆنترا پێشبینی کردووە ئەو پێکهاتەیە کە بەجۆرێک لە جۆرەکان بە حەماسی کورد ناویدەبەین. پیلانی نوێی لەناوبردن بە تەواوی دەستبەرداری ڕێبازەکانی فاشیستی تورکی سپی و ڕەش نابێت، زیاتر خەسڵەتی تەواوکەری هەیە و سەرلەنوێ ئەو بوارانە ڕێکدەخەنەوە کە ئەوان تێیدا سنووردار و بێکاریگەر بوون. ئەو گۆڕەپانانە "دژی تیرۆری PKKو بەردەوامیەکەی لە شاران KCK" بۆ پێنج ـ شەش بەشی سەرەکی گرنگی

---

[٣٠] عەقیدێکی خانەنشین و یەکێک لەوانەی بەشداری لەدامەزراندنی "هێزەکانی پاراستن و هەواڵگری و نەهێشتنی تیرۆر" کردووە. ناوی لەگەڵ تاوانەکانی بکەری نادیار کە زیاتر لە حەڤدە هەزار کەس بوونەتە قوربانی و ڕووداوی سوسورلک هاتووە و یەکێک بوو لەوانەی لێکۆڵینەوەی لەگەڵ کەسە تەسلیمکار و هەڵاتووەکانی ناو تەڤگەری ئازادی کوردستان کردووە. لەم ماوەیەدا لەسەر مەسەلەی "ئەرگەنەکون" دەستگیر کرا دانی بە هەبوونی ڕێکخراوی ژیتەم دلناوە و خۆیشی لە دامەزرێنەرە سەرەکیەکانێتی. (وەرگێڕ)

لە جۆری ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری ـ سایکۆلۆژی، سەربازی، سیاسی و دیبلۆماسی جیادەکەنەوە و بە شێوەیەکی سیستەماتیک و کاریگەرانەتر ڕێکیدەخەن. AKPلە ڕێگای ئەو پرۆتۆکۆلانەی لە ٢٠٠٧/١١/٥ لەگەڵ ئەمریکا و لە ٤ی مایسی ٢٠٠٧ لە دۆڵمە باخچە لەگەڵ گرووپی فەرمانداریتی فەرمی سوپا (ئەو ڕێککەوتنەی نێوان سەرۆکوەزیران ئەردۆغان و سوپاسالاری ئەو کاتە یەشار بویوک ئانت مۆرکرا و بڕیاریاندا تا مردن بە نهێنی بمێنێتەوە) هەوڵیدا ئەو هەنگاوانە بەخێرایی جێبەجێ بکات و ئەو هەوڵانەشی بەردەوامە. هێرشە ئاسمانیەکانی کە پێشتر نموونەی بەمجۆرەیان نەبینراوە، بەخشینی هەواڵگری ساتەوەختی لەلایەن ئەمریکاوە، ئۆپەراسیۆنەکانی KCK و داخستنی DTP، دەستپێشخەرییە ساختە و دروستکراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی کوردان، هێرشەکانی سەر ROJTV، ئەو ئۆپەراسیۆن و دەستگیرکردنە بەرفراوانانەی لە وڵاتانی یەکێتی ئەورووپا دژی کوردان پێشخراون، ئەو کۆمپانیایانەی لە گشت شارەکانی کوردستان ئاواکراون و ڕاگرتنی منداڵانی کورد لە قوتابخانەکانی شەوانی سەرەتایی تایبەت بە دەوڵەت گرنگترین نموونەی کردە و ڕەفتارەکانی ئەو ڕێکخستنە نوێیەیە. لە بنەڕەتدا ڕاستینەی کورد و ناسنامەکەی ڕووبەڕووی بەرفراوانترین گەمارۆی شەڕی تایبەت بۆتەوە کە لەهەر بوارێکدا پیلانی بۆ دانراوە (ئابووری، کۆمەڵایەتی، سیاسی، سەربازی، دیبلۆماسی...). هەندێک لە نموونەکانی بەناوی کرانەوەی دیموکراتیک (سەربەستکردنی ڕۆژنامە، کردنەوەی TRT٦، دابەشکردنی خەڵوزو ئامێرەکانی ناو ماڵ) بە ئامانجی پەردەپۆشکردنی ئەو ژینۆسایدە لەڕێگای پڕوپاگەندەیەکی بەرفراوانەوە پێشکەشکراون. پێویستە وەبەرهێنانی سەرمایە لە باشووری کوردستان، پەیوەندییە دیبلۆماسی و ڕێککەوتنە سێ قۆڵیەکان (ئێراق ـ ئەمریکا ـ تورکیا، سوریا ـ ئێران ـ تورکیا، هەوڵی تەواوکردنی گەمارۆی ناوەوە بوو لە ڕێگای ئابلۆقەی دەرەوە)یشی بخەینەسەر. بەمجۆرەش بەرفراوانترین شەڕی ئاشکرا، نهێنی، داپۆشراو، تایبەت و ژینۆسایدی مێژوویی جێبەجێکردووە کە سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگا دەگرێتەوە.

بونیادە قۆرخکاریەکانی بوارەکانی ئایدیۆلۆژی، کۆمەڵایەتی و ئابووری قۆناغی دەسەڵاتی ناوخۆیی هەژموونگەرایی نوێ کە هاوکاتی سەردەمی هەرەسهێنانی کۆماری بیروکراتیکە، جیاوازی گرنگی لەگەڵ بونیادەکانی سەردەمی دامەزراندندا هەیە. ئایدیۆلۆژیای فەرمی سەردەمی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە میللیگەرایی عەلمانی پۆزیتیڤیست بوو. لەو سەردەمەدا تێروانینە داروینیستییە وشکەکان زاڵبوون. کاتێک بڕیاریان سەبارەت بە ئافراندنی کلتوورێکی هۆمۆژەندا، ئەوا وەک پێویستیەکی یاسای داروینیستی "مانەوە بۆ بەهێزترینە" لەناوبردنی کلتوورەکانی دیکە لەسەرووی ئەمانەشەوە لەناوبردنی بوونی کلتووری کوردان بەناوی پێشکەوتنخوازیەوە ڕەوا بینراوە. هەمان یاسا لە ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەورووپاشدا پەیڕەوکرابوو. لەمیانەی ئەو ڕێبازانەی کە بە ئاستی ژینۆساید دەگەیشتن ئەنجام لەناوبردنی کلتوورەکانی دەرەوەی ئایدیۆلۆژی فەرمی بوو. خەسڵەتی بیروکراسیانەی بۆرژوازی تورک ئەو دید و بۆچوونە

بایۆلۆژیستیانەی بەرەو کردەوە و جێبەجێکردنێکی زۆر بێبەزەییانەتری دەبرد. ئەوانەی ژینۆسایدەکانی ئەنادۆڵیان ئەنجامدا هێزی ئایدیۆلۆژی خۆیان لەو دیدە پۆزیتیڤیست ـ بایۆلۆژییە قەبەیە وەرگرتبوو. هێزی هەژموونگەرایی ئەو بونیادە کۆمەڵایەتییە تازە ئاواکراوە بۆرژوازی بیروکراتیکە کە بەدەستی دەوڵەت پێگەیەنراوە (موڵک و سامانە دەستبەسەرداگیراوەکانی ناموسڵمانان ڕۆڵێکی گرنگ لەو پێگەیاندنەدا دەبینێت)، چونکە بەچەشنێکی دیکە دەرفەتی ئافراندنی بۆرژوازی تورک نابینرێت. لەبواری ئابووریشدا لە دەورەی بازاڕێکی ناوخۆیی داخراو و لەمیانەی دامەزراوە قۆرخکاریەکانی دەوڵەتەوە ئەولەویەتیان بە پیشەسازیبوون داوە. لە بنەڕەتدا قۆرخکاریە بازرگانی، دراوی و پیشەسازییەکان لەناو یەکتریدا بوون و بە گوێرەی قۆناغی خۆی هەندێک کەرت دەکرێن بە کەرتی سەرەکی. هەر لە سەرەتاوە و بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە مۆدێلی سەرمایەداری ئەڵمان (ئەو مۆدێلەی بە دەستی دەوڵەت قورسایی دەداتە سەرمایەدارییبوون) هەڵبژێردراوە. خودی قۆرخکاری دەسەڵاتیش دیکتاتۆریەتی ئۆلیگارشی یەک پارتی بوو. گرێدانی ئەو بونیادەی دەسەڵات بە ناوکی فاشیزمەوە بەهۆی چەوسانەوەی سەرمایەداریانەوە خاڵێکی مایەی تێگەیشتنە.

ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لە بوارە سەرەکیەکانی ئەو بونیادانە پێکهاتووە، لەبەرئەوەی ئامانجە سەرەکیەکەی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەنە، لەدۆخێکی بەمجۆرەدا چارەنووسی چاوەڕوانکراو بۆ ڕاستینەی کورد لەناوچوون بوو لە ڕێگای کۆمەڵکوژییە کلتووری و جەستەییەکانەوە. وەک چۆن ڕێخۆشکردنی پرۆسەی لەناوبردنی کوردان بۆ یاخیبوون و سەرهەڵدانەکان دەست لێبەرنەدراو بوو، دنەدان و (پرۆڤەقە) کردنی کۆمەڵگاش پێویستیەکی هەمان ئامانجی لەناوبردن بوو. وەک پێویستیەکی پۆزیتیڤیزم باوەڕی بەوە هێنرابوو. لەناوبردنی ڕاستینەی کوردان بە پێشکەوتنخوازی دادەنرا. هێزەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دڵنیابوون لەماوەیەکی کورتدا ئەو لەناوبردن و قەڵاچۆکردنە سەرکەوتوو دەبێت. گوزارشت یان تەعبیرەکەشی لە دەستووردا ماددەی "هەرکەسێکی بە رایەڵەی هاوڵاتێتیەوە بە دەوڵەت پابەند بێت تورکە"بوو. ئایدیۆلۆژیای پۆزیتیڤیست لە رووخساردا خۆی بە دونیایی (سیکۆلار)، دیاردەیی و زانستی پێناسە دەکات. دوای بۆچوون یان فیکری ئایینی و میتافیزیک خۆی بە سێیەمین و دواترین جیهانبینی (پارادایم) مرۆڤایەتی دادەنێت. بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئەویش قاڵبێکی فیکری میتافیزیکە، جیهانبینیەکی قەبا و بەرتەسکە. بەشێوەیەکی زۆر روون و ئاشکرا ئەو راستییە لە پێناسەی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک بۆ پێناسەی تورکێتی دەبینین کە پشت بە ئایدیۆلۆژیای ناسیۆنالیزم و عەلمانیەت دەبەستێت. لەمیانەی زهنیەتێکی لە چەشنی فەرمانی "کن" فەیەکونی خوداوەند، لەو بڕوایە دایە بە گوتەی "ببە بە تورک" ئیتر هەر کەسێک دەبێت بە تورک. وەک لەو نموونەیەدا دەبینرێت زانستیبوونی سۆسیۆلۆژی لە بۆشاییدا ماوەتەوە و بە شێوەیەکی زەق و بەرچاو کارەکتەرە میتافیزیکە پۆزیتیڤیستەکەی

سەلمێنراوە. تەنانەت ئایدیۆلۆگە سەرەکیەکەی میللیگەرایی نەژادپەرست نیهاد ئاتسزیش، ئەو کردەوانەی تورکی سپی بە "ترسناکی تورکێتی" راڤە کردبوو.

قۆناغی ١٩٥٠ ـ ١٩٨٠ سەردەمی کاملبوونی فاشیزمی تورکی سپییە. بەڵام تەنیا لە ریگای پیلانگێڕی و کودەتاکانەوە توانیویانە بەڕێوەی ببەن. ئەگەر پێویستی گۆڕانی هێزی هەژموونگەرایی دەرەکی (لە جیاتی ئینگلتەرا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) چەندێک کردەوە و رەفتاری جیاوازیش پەرەبسەنن (دیموکراسی پەرلەمانتاری فرە حیزبی، کرانەوە بەڕووی سەرمایەداری لیبڕالیزم، تارادەیەک سازشکاری کردن لەسەر عەلمانیەت) بەڵام دیکتاتۆریەتی ئۆلیگارشی فاشیست بونیادی سەرەکی خۆی پاراستووە و درێژەی پێداوە. ململانێ کۆمەڵایەتی و چینایەتییە توندەکان بێئاکام بوون. ئەنجام کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول بوو. ئەو کودەتایەی وەک پێویستیەکی هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکیەکان (تێکچوونی هاوسەنگی دەرەکی بەهۆی شۆڕشی ئێران لەخۆرهەڵاتی ناوین و داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە، تێکچوونی هاوسەنگی ناوخۆییش بەهۆی هەڵکشانی تێکۆشانی شۆڕشگێڕی) پیلانی بۆ دانرا، لەلایەنی مێژوودا هاوکاتی قۆناغی هەرەسهێنانی سیستەمی فاشیستی تورکی سپی بوو، خوازیاری بەربەستکردنی هەرەس بوو. لەو پێناوەشدا لە بواری ئایدیۆلۆژی لە جیاتی ناسیۆنالیزمی عەلمانیی، میللیگەرایی تورک ـ ئیسلام بە بنەما گیراوە، لە بواری ئابووریش لە جیاتی داخراوبوون لەناوخۆدا کرانەوە بەرەو یەکبوون لەگەڵ قۆرخکاری جیهانگیری ئەنجامدراوە، لە بۆرژوازیەتی لەپێشینەیی بیروکراتەکان گوزەری پێشەنگایەتی سەرمایەی تایبەت بوون، لە بواری سیاسی ـ دەسەڵاتیشدا وەسایەتی سەربازی جێگیرکراوە. دەستووری ١٢ی ئەیلول کە ئەو سیستەمەی دەستەبەرکردووە بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە سەپێنراوە. رژێمی وەسایەتگەری سەردەمی هەرەس بە خەستی تا سەردەمی دوا حکومەتی بلند ئەجەوید (١٩٩٩ـ ٢٠٠٢) بەردەوام بووە و لەمیانەی رژێمێکی شەڕی ناوخۆوە بەڕێوەبراوە. لەکاتێکدا رژێمێکی خەستی بێکاریگەرکردن لەسەر کۆمەڵگای تورکیا بەڕێوەبراوە، هەر جۆرێکی شەڕی تایبەتیش لە کوردستان تاقیکراوەتەوە. رژێمێکی بێهاوتای شەڕی تایبەتی ناوخۆ دامەزرێنراوە کە لەوانەیە نموونەکەی لە مێژوودا زۆر دەگمەن بێت (بەکرداری دەستووری خۆشیان پێشێل کرد) لەو سۆنگەیەوە؛ دەستوور رووکەشی بووە. تیرۆرێکی سەیر هەم لەناو دەوڵەت (قۆناغێکی بەرفراوانی تەسفیەکاری بە لەناوبردنی تورکوت ئۆزال و ئەشرەف بتلیسی فەرماندەی گشتی جەندرمە لە ١٩٩٣ دەستی پێکرد) هەم لە دەوڵەتەوە بۆ سەر کۆمەڵگا (چۆڵکردن و وێرانکردنی هەزاران گوندی کوردان، رەفتارو کردەوەکانی زیندان کە بە ئاستی هۆڤێتی گەیشتن، بەدەیان هەزار تاوانی بکەری نادیار، کۆمەڵکوژی ئۆتێلی مادماک لە سیواس، تیرۆرکاری کۆنترگەریلا کە گشت یاساکانی پێشێل دەکرد، دەستگیرکردنی سەدان هەزار کەس زیاتر، کوشتنی زیاتر لە چل هەزار کەس) پەیڕەوکراوە. لەسەر ئەو بنەمایە لەوانەیە رێگری لە هەرەسهێنانی دەوڵەت ـ نەتەوە کرابێت، بەڵام بەمانا کلاسیەکەکەی دەوڵەتیش لەناوەڕۆکی خۆی دەرکەوتووە. بێگومان

کۆمـار بـە مانـا و چوارچێوەیـەکی ڕۆشـنگەری بونیـاد نـەنرا و لـە دوای ١٩٨٠ ڕادەسـتی وەسایەتی سەربازی بووە.

لەسەرەتای ئەو قۆناغەوە لەمیانەی ئەو پرۆسەیەی بەرخودان کـە بـە پێشـەنگایەتی PKK دەستی پێکرد، بەتایبـەتیش هەڵمـەتی ١٥ی ئـابی ١٩٨٤ تـەنیا لـەناوبردنی بـوونی کوردان نەوەستێنراوە، بەڵکو مەودایەکی زۆری ڕێگای ئازادیش بڕاوە. لەمیانەی ئەو شەڕە تایبەتـەی لەسـەر بنـەمای ڕادەسـتبوون بـە سیسـتەمی ئـابووری فینانسـی جیهـانگیری، پشتگیری تـەواو بـۆ سیاسـەتە هەرێمیـەکانیان، ئـەرێکردنی گـەورەکردن و بـەکارهێنانی گلادیۆی سوپای نهێنـی نـاتۆ لـە تورکیـا، بـە پشتگیری بـەرفراوانی هێـزە هـەژموونگـەرا دەرەکیەکان لە سەرووی هەموووانەوە ئەمریکا، ئینگلتەرا و ئەڵمانیا بەڕێوەبراوە، جگە لە گروپێکـی خـائین و بـەکرێگیراوان، ئـەو کوردانـەی لـەناو تێکۆشـانی پاراسـتنی بـوون و ئازادیخوازیدان بەتەنیا ماونەتەوە و گۆشـەگیرکراون. تـەواوی دەوڵـەت ـ نەتـەوەکان بـە شێوەیەکی زۆر وشک پێویستیەکانی بەرژەوەندی خۆیـان جێبـەجێکردووە، یـان لایـەنگری ئەو هێرشە مەترسیدارانە بـوون یـانیش بینـەر بـوون. بەتایبـەتیش دەوڵـەت ـ نەتـەوەی ئیسرائیل لەساڵی ١٩٩٦ ئەو ڕێکەوتنە سەربازیانەی بەرفراوانتر کردووە کە لە ساڵی ١٩٥٨ بەنهێنی ئەنجامدرابوون و پشتگیری و کۆمەکی خۆی بۆ شـەڕی تایبـەتی دەوڵـەتی تـورک پەرەپێـداوە. ئەگـەر پشـتگیری هێـزە هەژموونگەراییـەکانی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری (ڕوسیای سۆڤێتیشی لەناودا) نەبووایـە کـە وەک پێویستیەکی بەرژەوەندیـەکانیان بـوو، هیچ کلتوورێکی کۆمەڵایـەتی لـە ئـەنادۆڵ و میزۆبۆتـامیا ڕووبـەڕووی ژینۆسـاید نـەدەهات. مەیلی سەرمایە بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج لەوەدا دیاریکەر بووە. ئەو ڕاستینە بـە تەواوی دۆخە نایاسایی، نائەخلاقی و زەقەکەیەوە لە ژینۆسایدکردنی کلتووری کوردانـدا ئاشکرا بـوو کـە سـەدەیەک زیـاترە بەردەوامـە. لـەپێناو بەرژەوەندییـە کورتخایەنـەکانی سەرمایە یان چاوپۆشی لە قڕکردنی بوون و جڤاتە کلتوورییـە هـەزاران سـاڵیەکان کراوە یان بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا پشتگیری کراوە. پەیوەندی ژینۆساید لەگەڵ دەوڵـەت ـ نەتەوە و قۆرخکاریەکانی سەرمایە لەهیچ وڵاتێکدا وەک ئـەوەی کوردسـتان بەشـێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا خۆی نەنواندووە. تەنانەت ڕێکخراوی ڕزگاری فەلەستینیش بە شێوەیەکی سازشکارانە لەگەڵ حکومەتەکانی تورکیا ڕێککەوتووەو پشتگیری پێویستی نەکردووین.

هیلاکبـوونی لەرادەبـەدەری ڕژێـم لـە ئاکـامی ململانێـی ناوخۆییـدا و ئۆپەراسیۆنی ئـەمریکا بـۆ سـەر ئەفغانسـتان (هەرچەنـدە هێرشـی دنـەدان و هانـدان ـ پرۆڤـەکاتۆری) ڕێکخراوی ئەلقاعیدە بۆ سەر جووت تاوەرەکە بکرێتـە بیـانوو) هەژموونگەراییـەکی نـوێی دەسەڵاتی لە تورکیا کردووە بە ناچارییەک. ئامرازە ناوخۆییەکانی هەژموونگەرایی نوێش لە ١٩٧٠کانەوە کۆدەکرایەوە. دەشێت پەسـەندکردنی سـەنتێزی تـورک ـ ئیسـلام، بڕیـارە ئابووریەکانی ١٩٨٠/١/٢٤ (کرانەوە بەڕووی سـەرمایەی فینانسـی جیهـانگیری)، کودەتـای سـەربازی ١٢ی ئـەیلول، داخسـتنی پارتییـە دەوڵـەت ـ نەتەوەییـەکانی تـورکی سـپی، ئەرکپێدانی نایاسایی لە سوپاسالاریدا، حکومەت و ئۆپەراسیۆنی تانسۆچیللەر لە پارتی

دۆغرو یۆل (ڕێگای ڕاست)، قۆناغی ٢٨ی شوبات، لەسەرکارلابردنی حکومەتی نەجمەدین ئەربەکان و هەرەدواییش مایەپووچکردنی بلند ئەجەوید وەک کەس و حکومەت وەک قۆناغە بەرچاوەکانی ئەو پرۆسەیە ریز بکەین. تاوتوێکردن و هەلسەنگاندنی AKP وەک دیزاینێکی سەرجەم فاکتەرە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی ئەمجۆرە قۆناغانە گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەیە. ئەمە هەلمەتێکە هێندەی هەلمەتی کۆماری مێژووی هاوچەرخی کۆمار گرنگە؛ ناوی وەرچەرخانێکی بەمجۆرەیە. چۆن پارتی گەلی کۆماری CHP پارتی ناوەندی دەولەتە لە قۆناغەکانی تەنزیمات، مەشروتیەتی یەکەم و دووەم و پرۆسەی رزگاری نیشتیمانی، ئەوا پارتی داد و گەشەپێدانAKP یش پارتی دەولەت ـ نەتەوەی ناوەندییە کە لە هەمان قۆناغدا لەپێگەی ئۆپۆزسیۆندا بووە، لەگەل رژێمی عەبدولحەمید رێککەوتووە، بەرامبەر بە هەژموونگەرایی ئەلمانی هەژموونگەرایی ئینگلتەرای بەبنەماگرتووە، بەرامبەر بە نەتەوەپەرستی عەلمانی میللیگەرایی ئیسلامی پەرەپێداوە. بەرامبەر بە میللیگەرایی زایۆنی رێککەوتنی لەگەل گەردوونگەرایی جولەکەی قەرایم کردووە، ئایدیۆلۆژیای تورک ـ ئیسلامی کردووە بە کۆلەکەی خۆی کە سوپا لە کودەتای ١٢ی ئەیلول پشتگیری لێکرد و لەئاکامی پارچەکردنی پارتە رادیکالەکەی نەجمەدین ئەربەکان لەمیانەی قۆناغی ٢٨ی شوبات (بە کودەتای پۆست مۆدێرن دەناسرێت) لەلایەن سوپاوە وەک دەرەنجامی قۆناغێکی درێژخایەن هاتە ئاراوە. بەرامبەر بەوەی بەڕێبەرایەتی دەنیز بایکالCHP ببێت بە پارتی سەرەکی ئۆپۆزسیۆن، بە ناسنامەی پارتێکی هەژموونگەرایی ستراتیژی کە لەبن رێبەرایەتی رەجەب تەیب ئەردۆغان دامەزراوە، وەک هێزی دامەزرێنەر و بەڕێوەبەری فاشیزمی تورکی سەوزی قۆناغی نوێ خاوەن پاشخانێکی مێژوویی درێژخایەنە و لەمیانەی بەدەستهێنانی پشتگیری هێزە هەژموونگەرا ناوخۆیی و دەرکییەکان دەسەلاتی گرتۆتە دەست.

ئەو رژێمەی لەژێر رێبەرایەتیAKP دا هەولی ئاواکردنی دەدرێت ناوزەدکردنی بە دووەمین کۆمار یاخود کۆماری ئیسلامی میانڕەو راڤەیەکی پێشوەخت دەبێت. وێڕای بانگەشەکان و جێگیرکردنی لە دەستووردا، بەلام هیچ کاتێک کارەکتەری سەرەکی رژێم نەبوو بە دیموکراسی، عەلمانیی و دەولەتێکی یاسایی و کۆمەلایەتی، بەلکو لەسەردەمی دامەزراندنییەوە بەردەوام کارەکتەری فاشیزمی ئۆلیگارشی پاراستووە. سیستەمی کۆماریشی بەمانا کلاسیکەکەی تەنیا وەک ناوێک ماوەتەوە. بەتایبەتیش هیچ بە دۆخی کۆمارێکی دیموکراتیک نەگەیشتووە. هەروەک چۆن تێکۆشانی کۆمار و دەستووری دیموکراتیک بەرامبەر هەژموونگەرایی CHPلەئارادا بوو، ئەوا بەرامبەر هەژموونگەراییAKPش لە ئارادا دەبێت. لەو سۆنگەیەوە؛ ناوزەدکردنی ئەو قۆناغە بە تێکۆشانی کۆماری دیموکراتیانە بەرامبەر بە دیکتاتۆریەتی ئۆلیگارشیانە راستتر دەبێت. هەرچەندە بە سووربوونەوە و لەمیانەی چەواشەکاریەکی میدیایی نەخشە بۆ کێشراوەوە وەک ئەلتەرناتیفی فاشیزمی تورکی سپی هەشتا سالە پێشکەش بکرێت، بەلام لە رێگای جیاوازی رەنگەوە لەناوەڕۆکدا بڕیاری درێژەدانی بەو رژێمە داوە. وەک ئەنجامێکی

سروشتی لە پەلوپۆکەوتنی ڕژێمی فاشیستی تورکێتی سپی و لە دەستدانی بەشێکی زۆری پشتگیرییە ناوخۆیی و دەرەکیەکەی، ڕێگای فاشیستی سەوزیAKP کراوەتەوە.

یەکەمین هەشت سالّی دەسەلاتیAKP زۆر لە یەکەمین هەشت سالّی دەسەلاّتی CHP( ١٩٢٣ ـ ١٩٣١) دەچێت. لە هەردووکیشیاندا ڕژێمی یەک پارتی دەسەلاّتدارە. وەک چۆن لە سالّی ١٩٣١ (سەرباری ئەزموونی فرقەی سەربەستی مستەفا کەمال) فاشیزمی عیسمەت ئینۆنۆ و ڕەجەب تەکەر دەرکەوتە پێش، ئەگەرێکی لەپێشە لە هەلّبژاردنەکانی ٢٠١١بەدواوە AKPش دیکتاتۆریەتی خۆی خەست بکاتەوە و لە ڕێگای دەستووری خۆشیەوە تۆکمە و بەهێزی بکات (تابلّێی دۆخی لە ڕەوشی هیتلەر و هەلّبژاردنەکانی ١٩٣٣ دەچێت). وەک چۆن کاتی خۆی CHPدووچاری هات لەوانەیە زیادبوونی ناکۆکیەکان (وەک ئەوەی نێوان مستەفا کەمال و عیسمەت ئینۆنۆ) و دەربازبوونێکی بەئێش و ئازاری قۆناغەکە AKP بەرەو ئاراستەی جیاواز ببات. لەوانەیە کێشمەکێشی نێوان تەیب ئەردۆغان و عەبدولّلا گول بێتە ئاراوە. توێژێکی لایەنگری چارەسەری و ڕێککەوتنی دیموکراتیانە لەوانەیە جیاببنەوە. ئەگەری کۆمارێکی دیموکراتی و دەستوورێکی دیموکراتیانە وەک بژارێکی جددی لەوانەیە قورسایی خۆی بەسەر ڕۆژەڤدا بسەپێنێت. وەک چۆن هێشتا دەسەلاّتی هەژموونگەرایی AKP یەکلا نەبۆتەوە، چارەنووسی ڕژێمێکی دەستووری دیموکراتیانەش یەکلا نەبۆتەوە. تێکۆشانی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانەی کوردان و سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکانی تورکیا لەگەلّ هێزە هەژموونگەراکان دیاری دەکات کە کام لەو دوو ئەگەرە یەکلا و مسۆگەر دەبێت.

لەسەردەمی هەژموونگەرایی دەسەلاّتی نوێدا بە ئامانجی لەناوبردنی بوونی کوردان و ئازادییان ڕژێمی شەڕی تایبەت بە شێوەیەکی بەهێزتر پەیڕەو دەکرێت. لە ڕاستیدا لەناوبردنی بوونی کوردان و ئازادیەکەی (هوشیاری و ڕێکخستەبوون) و بەردەوامکردنی ژینۆسایدی کلتووری لەژێر ئەو ڕێککەوتنەدا شاراوەیە کە AKP لە کەسایەتی سوپا لەگەلّ خاوەنە کۆنەکانی دەسەلاّتی ڕژێم ئەنجامیداون. چونکە بەجۆرێکی دیکە دەسەلاّت ڕادەستی AKP نەدەکرا. هەروەها ڕێککەوتنی سالّی ١٩٢٥ی نێوان میللیگەرایی زایۆنیزم و نەتەوەپەرستی تورکیش لەسەر بنەمای نکولّیکردن لەبوونی کوردان و لەناوبردنی هێزە یاخیبووەکان لەڕێگای توندوتیژییەوە ئەنجام درابوو. لەسەردەمی AKPدا ئەو ڕێککەوتنە هەر تەنیا وەک خۆی پەسەند نەکراوە، بەلّکو لەمیانەی تێزە ئیسلامگەراکانەوە بەهێزتر کراوە و بەمجۆرە درێژەی پێدراوە. بەکورتی؛ ژینۆسایدی کلتووری کوردان خالّی هاوبەشی هەرسێ ڕەوتی سەرەکی میللیگەرایی (نەتەوەپەرستی زایۆنی و تورک، میللیگەرایی نەژادپەرستی تورک، میللیگەرایی تورک ـ ئیسلام) بوو. هەر سێ میللیگەرایی سەبارەت بە بابەتەکانی دیکە کودەتا لەبەرامبەر یەکتری ئەنجامیدەن و تێکۆشانی خوێناویشیان لەنێواندا هەبێت، بەلاّم لە بەرامبەر ڕاستینەی کورددا هەلّوێستی هاوبەش دەنوێنن. ئەمە ئەو دیاردەیەی ڕژێمی فاشیستە کە بە"یاسای سوور" ناو دەبرێت. هەر هێزێکی دان بەو سیاسەتە دانەنێت لەناو سیستەمدا مافی ژیان و سیاسەتی پێنادرێت.

وەک چۆن کردەوە و هەنگاوە تەکتیکیە جیاوازەکانی AKP پێچەوانەی ستراتیژی هاوبەش (لەناوبردنی بوونی کوردان و بزووتنەوە ئازادیخوازەکەی) نییە، مانۆڕگەلێکی تەکتیکین لەپێناو جێبەجێکردنێکی خولقکار و سەرکەوتووانەی ئەو ستراتیژیانە ئافراندوویەتی. بۆ نموونە؛ ئەو رەجەب تەیب ئەردۆغانەی لە ساڵی ٢٠٠٥ لە دیاربەکر گوتی: "کێشەی کورد کێشەی ئێمەشە"و دوای بەدەستهێنانی پشتگیرییەکی گرنگی کوردان دواتر لە ساڵی ٢٠٠٦ دووددڵی لە دەرخستنی "یاسای تێکۆشان دژی تیرۆر" نەکرد کە بە پاساوی بێواتا و بێبنەما ژنان و منداڵان و هەموو کەسێکی خستە زیندانەوە (یەکێکە لە دژوارترین یاساکانی قۆناغی تایبەت بە دژە کورد). بۆ یەکەمین جار دەستگیرکردنی بەربڵاوی منداڵان، ئۆپەراسیۆنەکانی KCKو هێرشە ئاسمانیەکان پێویستیی ئەو ستراتیژییە بوون. هەروەها هەموو جۆرەکانی شەڕی تایبەت، هەوڵدان بۆ ئاواکردنی گرووپێکی سەرمایەی کوردی بەکرێگیراو لە شارە گرنگەکانی باکوور و باشووری کوردستان تا ببن بە ناوەندی کەمەندکێشکردن و دامەزراندنی رێکخراوە ساختەکانی کۆمەڵی مەدەنی، لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو ستراتیژییە نوێیەیە. هەروەها پێویستە راگەیاندنی کوردی بەکرێگیراویشی بخەینە سەر (ئامرازەکانی شەڕی دەروونی). چەندین لقی وەرزش و هونەریش بۆ هەمان ئامانجی ستراتیژی بەکارهێنراون. لەوانەیە مەترسیدارترین هەنگاویش هەوڵەکانی ئاواکردنی حەماسی کورد بێت لەجیاتی حزبول کۆنترا. ئامانجی سەرەکی میدیا و رێکخراوە ئایینگەراکان، ئاواکردنی حەماسی کوردی تایبەت بە خۆیان و بەکارهێنانێتی دژی KCKو کردنیەتی بە رێکخراوی سەرەکی. بۆ نموونە؛ حەماس کە هیچ پەیوەندییەکی بە تێکۆشانی فەلەستین نەبوو، بەڵام بە ئامانجی لاوازکردنی رێکخراوی رزگاری فەلەستین لەلایەن موسادەوە پشتگیری لە دامەزراندنی کرا، ئەمڕۆ رێکخراوی رزگاری فەلەستینی بەتایبەتیش ئەلفەتحی رووبەرووی مایەپووچبوون کردۆتەوە. هەوڵدەدرێت هەمان مۆدێل لە کوردستان بەرامبەر KCKش پێشبخرێت. قوتابخانە ئایینگەراکانی دواناوەندی و وانەکانی قورئان خوێندنیش لەپێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجە بە خێرایی دادەمەزرێن و بەکاردەهێنرێن. سەرۆکایەتی کاروباری ئایینی سەرجەم مزگەوتەکانی خستۆتە ژێر خزمەتی لەناوبردنی کلتوورییەوە. ئایین بەتەواوی پۆلیتیزە کراوە و بۆ ئامرازێک بچووک کراوەتەوە کە بۆ نکوڵیکردنی بوونی کوردان و ناوزڕاندنی تێکۆشانی ئازادیخوازی کوردان بەکاردەهێنرێت.

بەهەزاران کردەوەی هاوشێوە تەنیا نیاز و سیاسەتەکانی هێزی هەژموونگەرایی نوێ روون ناکاتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پیلانە مەترسیدارەکانی قەڵاچۆکردن و لەناوبردنیش پیشان دەدات. وەک چۆن CHP پارتی دەوڵەت ـ نەتەوەی قۆناغی ١٩٢٥ ـ ١٩٤٠ لەناوبردنی خوێناوی بوون و بەرخودانی کوردانە، ئەوا لە ساڵانی ٢٠٠٠ کانەوە AKPش پارتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە لەسەر بنەمای هەلومەرجی قورستر لەناوبردنی راستینەی کورد و بزووتنەوە ئازادیخوازەکەی کردۆتە ئامانج. بێگومان هەندێک دەنگی جیاواز و کردەوەی کاتی جیاواز ئامانجە ستراتیژییەکەی ناگۆڕێت. بە پێچەوانەوە

دەیسەلمێنێت. ئەو بزاوتە تەسفیەکاریەی لە کۆتاییەکانی ساڵی ٢٠٠٢ AKP ژێر بە ژێر لەناو PKK بەڕێوەی برد (هەوڵە تەسفیەکاریەکەی لەلایەن ئەمریکا، دەسەڵاتی باشووری کوردستان و ئەندامە بەکرێگیراو و تەسفیەکارەکانی ناو PKK)، ئەو دانوستاندنانەی لەساڵی ٢٠٠٦وە لەژێر ناوی دیالۆگ لەگەڵ نوێنەرانی پارتی کۆمەڵگای دیموکراتیکDTP و KCK لە ئەوروپا ئەنجام دەدرێت و تا لای عەبدوڵلا ئۆجەلانیش رەنگیدایەوە، وێڕای نیازباشی هەندێک لە کاربەدەستانی دەوڵەت، بەر دیوارەکانی هەمان ستراتیژی کەوت و مایەپووچکرایەوە. زۆر روون و ئاشکرایە ئەگەر دەستبەرداری ئەو ستراتیژییە تەسفیەکاریەی دوژمنی ئاشتی نەبن، ئەوا لەژێر هەژموونگەرایی AKPدا شەڕی تایبەت خەستتر دەبێت و درێژە دەکێشێت. ئەگەر AKPو هێزە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی پشتی پێدەبەستێت بەشێوەیەکی ئاشکرا هەڵوێستێکی ستراتیژی سەبارەت بە مەسەلەی ئاشتی بۆ رای گشتی رانەگەیەنن و بریاری یەکلاکەرەوە دەرهەق بە دەستوورێکی دیموکراتیانە نەدەن، ئەوا هەر هەڵوێست، چالاکی، گوتە و رەفتارێکی سەبارەت بە راستینەی کورد و بزووتنەوەی ئازادی پیشانی بدەن جگە لە تەسفیەکاری و قەڵاچۆکردن هیچ مانایەکی دیکە نابەخشێت.

ئەنجام؛ ئەو شەڕەی دووسەد ساڵی دوایی دژی راستینەی کورد و بزووتنەوە ئازادیخوازەکەی بەڕێوە دەبرێت هەنگاو بەهەنگاو بۆ ژینۆسایدێکی کلتووری خەست وەرچەرخاوە. لە ژێر شالاو و پەلامارە بێبەزەییەکانی کۆمەڵکوژیدا کوردان هەوڵی بەردەوامبوونی بوونی خۆیان و تامەزرۆیی ژیانی ئازادیان داوە. بزاوت و هێرشەکانی لەناوبردنی دەسەڵاتی میرنشین، شێخایەتی و سەرۆک خێڵەکانی کوردستان کە لەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی هاوچەرخبووی عوسمانی دەستی پێکرد هەنگاو بەهەنگاو بەرەو لەناوبردنی راستینەی کلتووری کوردان ئاراستەی گرتووە. لەیەکەمین قۆناغی کۆماردا فاشیزمی تورکی سپی ئەو سیاسەتەی قووڵتر کردەوە و لەناو تەواوی کۆمەڵگای بڵاوکردەوە، کوردانی لەناو دەوڵەت ـ نەتەوەدا تواندەوە و رووبەڕووی لەناوچوونی کردەوە. ئەو بەرخودانەی لەبەرامبەریشیدا پێشکەوت بەهۆی ئەو بنچینە کۆمەڵایەتیەی پشتی پێدەبەستن و کارەکتەری رێبەرایەتیەکەیان لە قووڵکردنەوەی زیاتری توانەوە و لەناوچوون بەولاوە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەکەوتۆتەوە. لە قۆناغی کاملبوونی کۆماریشدا لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لەراستینەی کورد زیاتر پەرە بە چینە بەکرێگیراوە مۆڵەتپێدراوەکان دراوە و ژینۆسایدی کلتووری قووڵتر کراوەتەوە. لە قۆناغی هەرەسیش کە لە ١٩٨٠کان دەستی پێکردووە، لەمیانەی ئەو پشتگیرییەی ئەمریکا لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی خۆی پێشکەشی کردبوو پەنایان بردە بەر رێگا و رێبازگەلێکی بێهاوتای شەڕی تایبەت، ئەمجارە تەنیا ئامانجیان بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد نەبوو، بەڵکو بەتایبەتی هەوڵی لەناوبردنی خودی بوونی کورد دراوە. ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازییەی بە پێشەنگایەتی PKK بەرامبەر ئەو بزاوتە بێ هاوتایانەی قڕکردن سەریهەڵدا وێڕای چەندین هەڵە و کەموکوڕیش، تەنیا بوونی کلتووری کوردانی یەکلا و مسۆگەر نەکرد،

بەڵکو وەک بوونێکی ئازادیش بە قۆناغێکی گرنگی گەیاندووە. ئەو گۆڕانکاری و پێشکەوتنانە کاریگەری کردۆتە سەر بەشەکانی دیکەی کوردستانیش؛ لەکاتێکدا لە باشووری کوردستان رێخۆشکەر بوو بۆ قەوارەیەکی سیاسی کە لایەنی دەوڵەت ـ نەتەوەی لەپێشە، لە خۆرهەڵات و خۆرئاوای کوردستانیش گەل هۆشیار بۆتەوە، تەقلی ریزەکانی بزووتنەوەی ئازادی بوون و بە پێشخستنی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتییان ئەنجامگیر بووە.

مسۆگەرە کە شەڕی تایبەتی لەناوبەرانەی هێزە هەژموونگەراکانی تورک دژی KCK لە قۆناغی داهاتوو رێگا لەپێش گۆڕانکارییەک دەکاتەوە کە لە بوارەکانی ستراتیژی، سیاسی و کۆمەڵایەتی گرنگی و بایەخێکی زۆریان دەبێت. ئەگەر بڕیار لەبارەی ئاشتی ستراتیژییەوە نەدرێت، ئەوا گرنگترین ئەگەری لە کوردستان و جوگرافیا دراوسێکەیدا جێگای باس بێت روودانی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕییە لە ئاستێکی بەرزدا کە خاوەن دید و رێنمایی مۆدێرنیتەی دیموکراتییە؛ بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ شەڕی بەرگری خۆیی ئاواکردنی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتییە لە بوارەکانی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری، یاسایی و دیلۆماسیەوە.

### ب ـ ناسنامەی کوردی هاوچەرخ لە خۆرئاوا و باشووری کوردستان

لە شیکارکردنی ناسنامەی هاوچەرخی کورددا پێگەی ئەو کوردانەی لەناو سنوورەکانی هەردوو دەوڵەتی ئێراق و سوریا ماونەتەوە کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی ئاواکران، وانە و ئەزموونی فێرکەرمان پێشکەش دەکات. لە قۆناغی دابەشبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا وەک پێویستیەکی رێککەوتننامەی سایکس ـ بیکۆ (١٩١٦)، لە ژێر هەژموونگەرایی بریتانیا و فەرەنسا رژێمی ماندا (ئینتیداب) لە ئێراق و سوریا پێکهێنران. رژێمی مانداش مانای بەڕێوەبەرایەتی کۆلۆنی کاتی دەبەخشێت. هێڵی شەمەندەفەر بە سنووری نێوان کۆماری تورکیای نوێ و سوریا دانراوە. سنووری نێوان ئێراق ــ تورکیاش لەچوارچێوەی رێککەوتنی موسڵ دیاریکراوە، لە دیاریکردنی سنوورەکانیشدا بەرژەوەندی نەوت بە بنەماگیراوە، هەردوو رێککەوتنی دەرهەق بە سنوور لەچوارچێوەی پێشێلکردنی میساقی میللی ئیمزا کراوە کە لای تورکەکان بە پیرۆز دادەنرێت. لەسەر بنەمای رەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانی فەرەنسا کە یەکێک لە هاوپەیمانە سێیانیەکەی یەکەمین جەنگی جیهان بوو، هەر لە سەرەتای شەڕی رزگاری نیشتیمانیدا لە مانگی ١ی ١٩٢١ رێککەوتنی ئەنقەرە ئیمزا کرا. بوونی کوردان و تەنانەت تورکمانەکانیش رەچاو نەکراوە کە خراونەتە ناو سنوورەکانی ئەو دەوڵەتەی دواتر وەک کۆماری عەرەبی سوری راگەیەندرا و تەنیا حیساب بۆ هاوسەنگییە سەربازی و سیاسیەکان کراوە. کەچی لە راستیدا پێگەی عەرەبەکانیش بەهیچ چوارچێوەیەکی یاسایی گرێنەدرا و تەنیا بەرژەوەندی دەوڵەتی ماندا کار (فەرەنسا) رەچاوکراوە.

هەر لەو ستاتۆیەی سەرەتا ئاواکراوە دیارە کە ئەو دۆخە رێگا لـەپێش کێشـەگەلێکی چەندە سەخت و جددی دەکاتــەوە. هەربۆیــەش لەسـاڵی ١٩٢٠ تـا ئێستا دەوڵـەتی سـوریا بەهیچ جۆرێک ئاسایی نەبۆتەوە. تا ئێستاش بە فەرمی لەلایەن رژێمی باری نائاساییەوە بەڕێوە دەبرێت. خاوەن سیستەمێکی دەستووری نییـە کـە بـە رێککەوتنێکی کۆمەڵایەتیـدا گوزەری کردبێت. بەشێکی هەرە زۆری کوردانی خۆرئاوای کوردستان و سوریا تا ئێستاش هاوڵاتی نین، واتە لە بواری یاساییدا بوونیان نییە. ئەوانی دیکەش هیچ مافێکی یاسایی، کلتـووری، ئـابووری، ئیـداری و سیاسـییان نییــە. سـەرەتا بــەهۆی بەرژەوەندییـەکانی دەوڵــەتی مانـداکار (فەرەنسـا)، دواتــریش وەک پێویسـتی بەرژەوەندییــە میللییــەکان (قەومیەکان)ی عەرەبەکان دۆخی کوردان لـە پێگـەی کۆلـۆنی دواکـەوتووتر بـوو، قۆنـاغی نکـوڵیکردن، لــەناوبردن و ژینۆسـایدی کلتـووری لەسـەر بوونەکـەیان دەسـتی پێکـردەوە (هەروەک لە سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکێتی جێگای باسە). بەگوێرەی لێکدانەوەی دەسەڵاتی هەژموونگەراکان بۆ هاوسەنگی ئەو ستاتۆیە لەمیانەی گۆڕانکـاری سنووردار و قاڵبوونەوە تا رۆژی ئـەمڕۆمان بـەردەوام بـووە. ئـەو پیلانگێڕییـەی لـەکاتی دیـاریکردنی سنووری ئێراق ـ تورکیا لەسەر راستینەی کـورد پێشـخراوە گرنگـی و بایـەخێکی تایبـەتی هەیە. کاتێک ئەو پیلانگێڕییە دژ بەیەکپارچەیی کوردان پێشخرا حیسابی چەندین سـەدەی دواتر کراوە. ئەو پیلانگێڕییە سەرەتای فەرمانی ژینۆسایدە دژ بە کـوردان. لـەم قۆنـاغـەدا ئەدەبیاتێکی زۆر سەبارەت بە پارچەکردنی کوردستان بـۆ چـوار بەشـەوە دەکرێـت، بـەڵام چەندە جێگای داخە کە ناوەڕۆکەکەی بەشێوەیەکی واقیعی و بابەتیانە روون نەکراوەتەوە و راڤە ناکرێت. چونکە لەراستیدا ئەگەر ئەو واقیعە بەشیوەیەکی روون و ئاشکرا بەهەموو راشکاوییەکەوە شیکار و راڤـە نـەکرێت، ئـەوا بـە شـێوەیەکی راست و دروسـت نـاتوانین رووداوەکانی کوردستان، راستینەی کورد و بوونە کۆمەڵایەتیەکەی پێناسە بکەین.

دابەشـکردن و پارچـەکردنی کـورد و کوردسـتان لـەچوارچێوەی دیـاریکردنی سنووری ئێراقدا یەکێک لە رووداوە هەرە تراژیدیەکانی مێـژووی سـەدەی بیستەمە. لـەو رێگایــەوە تەنیا بۆمبا لە ژێر مێـژووی کـوردان دانەنرایــەوە، بـەڵکو لـەپاڵ کـوردان بۆمبێـک لـەژێر بناغەی میژووی عـەرەب، عەجـەم و تورکـەکانیش دانرایـەوە کـە زۆر لـە بـۆمبی ئـەتۆمی بەکاریگەرترە. لەو قۆناغەدا نارەزاییەکی زۆر لـەناو ئەنجوومـەنی تورکیـا بەرامبـەر بـەو رووداوانە هاتبووە ئاراوە. رۆشنبیر و ئەفسەرە کوردەکانی ناو سوپا لەسەر پێیان بوون. ئــەو راســتییە لــەژێر ســەرهەڵدانی ١٩٢٥دا شــاراوەیە. بــە پێچەوانــەی بانگەشــە هەڵبەستراوەکانی مێژووی فەرمیەوە ئەوەی لەگـەڵ هەژموونگـەرایی ئینگلیـز رێککـەوتووە کـورد نییــە، بـەڵکو رژێمـی تـورکی سـپی بـوو. بەسـوربوونەوە ئامـاژە بـە خەسـڵەتی پیلانگێڕییانـەی رژێمـی تـورکی سـپی دەکـەم. پێویسـتە چـاک بـزانین لەمیانـەی ئـەو پیلانگێڕیانەوە تەنانەت مستەفا کەمالیشی بێکاریگەر کرد. وەک دەزانرێت مستەفا کـەمال ئەو رێککەوتنەی بە سەختترین و ناخۆشترین رووداوی ژیانی داناوە و گوتویـەتی؛ ئەگـەر ئیمـزای نەکـەین ئـەوا کۆمـار بەگشـتی دەکەوێتـە ژێـر هەڕەشـە و مەترسـیەوە. ئـەو

دەستکەوتانەی سەرەتا لەمیانەی ڕێککەوتنامەی قارس (١٩٢١) لە خۆرهەڵات، دواتریش لە ڕێگای پەیماننامەی لۆزان لە ڕۆژئاوا بە دەستی هێنابوون، لە ئاکامی ڕێککەوتنی موسڵ - کەرکوکی ٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦ دووچاری دۆڕانێکی ستراتیژی هاتووە. لە داگیرکردنی ئەم دواییەی ئێراق بە شێوەیەکی زۆر ئاشکرا دەرکەوتووە کە ئەو زیانە یان دۆڕاندنە چەندە ستراتیژی بووە. دیسان بە پێچەوانەی مەزەندەکان، لە ئاکامی جیاکردنەوەی ئەو سنوورە تەنیا پەترۆڵی موسڵ - کەرکوک لە دەستنەدراوە، لە هەمان کاتدا کوردان لە دەستدراون، برایەتی دێرۆکی نێوان کورد - تورک لە دەستدراوە، یەکێتی و یەکپارچەیی کلتووری تەواوی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین لەدەستدراوە.

تا ئێستاش لەو بڕوایەدان لەمیانەی خزاندنی هێڵی جوگرافی، بەرزکردنەوەی شورا و دیوارەکانی بە درێژایی سنوور، دانانی تەلبەندی کارەبایی، پڕکردنی سەربازگە و قەڵا پۆلایینەکان و پاراستنی لە ڕێگای سوپای تایبەتەوە ئەو سنوورە ڕێکدەخرێت و دەپارێزرێت. پەنابردنە بەر ئەو ڕێچکە و ڕێبازانە خەفڵەتێکی تەواوە، پەند و ئەزموون وەرنەگرتنە لە مێژوو، مانای پشتبەستنە بە پیلانگێڕی یاخود بوونە بە ئامرازی پیلانگێڕی. تەنیا کاتێک هەڵە بنەڕەتیەکان بەلاوەبنرێن و ڕاستییە بنەڕەتیەکان لە شوێنی دابنرێت ئینجا ڕاست دەکرێتەوە. لە ڕاستیدا ئینگلیزەکان ئەو گەمەیان لە تەواوی کیشوەرەکانی ئەورووپا، ئاسیا، ئەفریقیا، ئەمریکا و تەنانەت ئوسترالیاش بەڕێوەبرد و بەمجۆرە هەژموونگەرایی خۆیانیان ئاواکرد و توانیان درێژەی پێبدەن. بەسەدان و هەزاران کلتووری کۆمەڵایەتی لەسەر بنەمای ئەو سنوورانەی بەهێڵکێش کێشراون و لێکجیاکرانەوە دابەش و پارچە کراون و لەڕێگای بەگژ یەکترەوەنانیان بەڕێوەبران. دەوڵەت - نەتەوەکانیش مەترسیدارترین شێوەی ئەو گەمەیە کە لە ئاستی پێکدادانی دەسەڵاتەکان ئامادەکراوە. ئەگەر دونیا بۆ ئەو دووسەد دەوڵەت - نەتەوەی ڕۆژی ئەمڕۆمان دابەش نەکرابوایە، ئەوا هەژموونگەرایی سەرمایەداری بەدینەدەهات و دەرفەتی بەردەوامکردنیشی نەدەبوو. مێژووی ڕاستەقینە تەنیا ئەو کاتە دەرکی پێدەکرێت و ئاشکرا دەبێت کە ڕوون ببێتەوە لەمیانەی ئەو ڕێبازەوە کێ سوودمەند بووە و کێ زیانی بەرکەوتووە، کامە ئایدیۆلۆژیا و کلتوور سەرکەوتوون، کامەشیان ونبوون و لەناوچوون.

مێژووی کوردی هاوچەرخ و بوونەکەشی تەنیا لەناو ئەو هەمووێتییە و پەیوەست بە دابەشکردنی لەسەر بنەمای سنوورەکانی ئێراق و سوریا دەشێت ڕۆشن بکرێتەوە. ئەوە جۆرە دابەشکردنێکە کە وەک پۆتانسێل سەرجەم بژارەکانی قڕکردن - ژینۆسایدیشی لەناودا - لەخۆوە دەگرێت. حیسابگەلێکی فرەلایەنی لەسەر دەکرێت. یەکەمیان، کوردەکانی ئێراق لەپێناو کۆنترۆڵکردنی عەرەبەکانی ئێراق کراونەتە هێزێکی یەدەگ. کارەکتەر و خەسڵەتی جوڵانەوەی کوردانی ئێراق بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەو ڕاستییەی سەلماندووە. هەرە دواییش لەچوارچێوەی پشتبەستن بە کوردان ڕژێمی سەددام حوسێن ڕووخێنراوە. دووەم، لە ناکۆکی نێوان ئێران - ئێراقدا گرنگترین ئامرازی بەکارهێنانە. مێژوو ئەو ڕاستیەشی سەلماندووە. سێیەم، لەپێناو کۆنترۆڵکردنی کۆماری

تورکیا کراوە بە هێزێکی یەدەگ. لە ساڵی ١٩٢٥ەوە، بگرە لەسەردەمی یەکەمین سەرهەڵدانی هاوچەرخی ١٨٠٦ سۆران بە ڕێبەرایەتی عەبدولرەحمان پاشای بابانەوە سەرجەم گۆڕانکارییە مێژووییە گرنگەکانی کوردستان بوونەتە گرنگترین ئامرازی سەرقاڵکردن و کۆنترۆڵکردنی فەرمانڕەوایی کۆمار و عوسمانیەکان. چوارەمیان، بووە بە یەکێک لە گونجاوترین ئامرازەکانی کۆنترۆڵکردنی خۆرهەڵاتی ناوین بۆ هێزە هەژموونگەراکانی جیهان ئینگلتەرا (لە ١٨٠٠کانەوە تا ١٩٤٥کان ئینگلتەرا هێزی هەژموونگەرایە، لە ١٩٥٠کانەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان ئەمریکایە)و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. پێنجەم کە لەهەمووان گرنگترە، وەک پێگەی سەرەکی چاودێریکردنی تەواوی کوردستان و پوتانسیلی شۆڕشگێڕانەی گەلی کورد و بەلاڕێدابردنی (لە ساڵی ١٩٢٠بەدواوە هەوڵدەدرێت بەڕێوەبەرایەتی کوردانی ئێراق بە ستاتۆیەک بگەیەنرێت. هەروەها باشوری کوردستان کراوە بە ناوەندی ئایدیۆلۆژیای بەرایی خێڵایەتی، ئایینگەرایی و مۆدێرنیست) بەکاردەهێنرێت. بەو مەرجەی بەو بەشە بچووکە و فەرمانڕەواکانی بەسترابێتەوە تەواوی کوردستان و گەلی کورد بە ئامرازێکی ستراتیژی کۆنترۆڵکردن بەستراوەتەوە. شەشەم، زۆر بە ئاسانی سامانە دەوڵەمەندەکانی ژێر زەوی، ئاو و جوگرافیا جوانەکەی دەقۆزرێتەوزە و بەکار دەهێنرێت.

کاتێک لە نزیکەوە ئەو ڕاستیانە شیکاربکرێت کە لە شێوەی شەش سەرەدێڕ خستمانەروو دەبینرێت کە: لە بنەڕەتدا دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووک بەردەوام وەک پۆتانسێلێک لەیەدەگ دادەنرێت. لەمیانەی بەڵێنەکانی ئاوادەکرێت و ئاواکرا، هەم دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە کۆنترۆڵ و ڕام (تەربیە) دەکرێن، هەم لە جیاتی پشتبەستن بە هێزی خۆیان کوردان بە هیوای ئاواکردنی قەوارەیەک دەبەستنەوە، کە لەلایەن هێزە هەژموونگەرا دەرەکیەکان ئاوا دەکرێت، بەمجۆرەش بزووتنەوەی بەرگریکردن لە بوونی کوردان و پەرەپێدانی ئازادی ئیفلیج دەکەن و لە پەلوپۆی دەخەن. لەسەر ئەو بنەمایەش کوردان لە متمانە بەخۆکردن بێبەش دەکەن، بەردەوام ناچاری وابەستەبوون بە هێزە دەرەکیەکانی دەکەن. بەمجۆرە مەحکومی ڕێگایەکی دەکەن کە هەر ئان و ساتێک شیمانەی ژینۆسایدکردنی هەیە و دەیانکەن بە بەندە و کۆیلە دڵسۆزەکانی ئاغا و سەردارەکانیان. لەکەسایەتی ئەواندا هەمان یاری لەسەر تەواوی کوردان بەڕێوە دەبرێت. بزووتنەوە نیشتیمانپەروەر، نەتەوەیی، دیموکراسیخواز و شۆڕشگێڕەکانی هەوڵی تێکدانی ئەو گەمە و پیلانەیاندەدا زۆر بەئاسانی گۆشەگیرکران و بەوە تاوانباریان کردن گوایە کوردان دەخەنە مەترسیەوە (لە ڕاستیدا ئەمە گەمەیەکە خۆیان ڕۆڵی تێدا دەبینن)، دیبلۆماسی نازانن (وابەستەبوون بە ئاغاکانیان)، کوردان پارچە دەکەن (خۆیان ئەو سنوورانەیان ڕەواکردووە کە کورد و کوردستانی پارچە کردووە)و هاوسەنگیەکانی دونیا (بەرگریکردن لەو ستاتۆیەی هێزە هەژموونگەراکان ئافراندوویانە) ڕەچاو ناکەن. لەبواری تیۆری و کرداریدا بەردەوام کار بۆ ئەوە دەکەن کە گەلی کورد بە تەنیا ناتوانێت هیچ شتێک بکات (واتە پێویستە بەوە ڕازی بێت کە هێزە هەژموونگەراکان خێری

پێدەکەن). بەمجۆرەش ئاواکردنی کۆمەڵگایەکی دیموکرات، یەکسانیخواز، ئازادیخواز بە مەحاڵ دادەنێن. لەمیانەی ئەو زهنیەتە هەژموونگەرایییەوە خوازیارن یەکێک لەو گەلانەی پاڵێوراوە ببێت بە یەکێک لە شۆڕشگێڕترین گەلانی سەردەم، بیکەن بە دواکەوتووترین گەلی دونیا کە لە دۆخی کۆیلایەتی و لەژێر هەڕەشەی ژینۆسایدا دەژیت. کوردان بە "گەلی بێ پارێزەر" ناودەبەن، بەمجۆرەش هەوڵدەدەن بەردەوام بەدوای پارێزەرێکی ساختەدا رابکات. کەچی هەنگاوی راست ئەوەیە کە گەل خۆی ببێتە پارێزەری خۆی.

یارییەکی دیکەی گرنگی سەر ئەو کوردانەی ناو سنووری ئێراقدا ئەنجامدەدرێت زەقکردنەوەی کارەکتەری گومڕا، درۆزن و دروستکراوی بۆرژوازی سوننییە لە ئاواکردنی ناسنامەی نەتەوەیی کورددا. کلتووری دەوڵەمەندی باوەڕی، خێڵ و قەبیلەکانی راستینەی گەل و قەومی کورد بە نەبوو دادەنێت کە یەکێک لە کلتوورە دەوڵەمەندەکانی بەرۆژی ئەمڕۆمان گەیاندووە، خوازیارن نەتەوەیەکی ساختەی کورد ئاوا بکەن کە لەسەر دواکەوتووترین و خڵتەترین میللیگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و کۆنەپەرستی ئیسلامی سوننی تێرخۆراک دەبێت. هەوڵدەدەن هەست و دیاردەیەکی دروستکراوی حەقیقەت بخولقێنن کە لە جیاتی کۆمەڵگای نەتەوەی دیموکرات دەوڵەت ـ نەتەوە بە ئۆتۆپیای پیرۆزی خۆی دادەنێت، کلتوورێکی نەتەوەیی نادیموکراتیک، داخراو بەرامبەر ئازادی و یەکسانی و دوژمنی ژن وەک تاکە راستیەکی کۆمەڵایەتی پێشکەش دەکەن و خۆشیان بە تاکە نوێنەری دادەنێن.

حیسابێکی دیکەی قووڵی سەر ئەو کوردانەی لەناو سنووری ئێراق دەژین هەوڵەکانیانە بۆ دروستکردنی ئەو بڕوایەی کە تاکە رێگای چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا گوزەر دەکات. لە پیلاننامەی درێژخایەنی پەیوەندی هەژموونگەراکان کوردانی ئێراق بەردەوام وەک کەرەستەیەکی تاقیگە بەکار دەهێنرێن. بەجۆرێک پرۆژە بۆ دیارده و بونیادی کورد دانراوە کە تەنیا لە رێگای پەیوەندییە سەرمایەداریەکانەوە راستینەی نەتەوەیی کورد بوونی دەبێت. بەردەوام تێگەیشتنێکی لەو جۆرە دەخرێتە رۆژەڤەوە کە راستیەکی نەتەوەیی خاوەن ماهیەتێکی سۆسیالیستی، دیموکراسیخواز و شۆڕشگێرانە بەدینایەت و دەرفەتی نییە. لێرەدا گرنگترین ئامرازی دەست هێزە هەژموونگەراکان میللیگەرایی عەرەب ـ سووننی یاخود شیعەی تەوەرەی بەغدادە. بەردەوام هەڕەشەی میللیگەرا عەرەبەکانی سەریان زیندوو دەکەنەوە، بەمجۆرە کوردان مەحکومی دۆخێک دەکەن بەردەوام لە پشت و پەنایەک بگەڕێت. هەمان هەڕەشەی کوردان بۆ سەر عەرەبەکانیش بە زیندوویی دەهێڵنەوە. بەهەمان شێوە لەمیانەی گوتەی "ها ئەوەتا دەوڵەتی کوردی ئاوا دەبێت و ئاوا بوو" هەڕەشە لە رژێمی دەوڵەتەکانی تورکیا، سوریا و ئێران دەکرێت. لە لایەکی دیکەشەوە ئەو فاکتەرە سێیانە یان چوارینە هەریەکە و وەک سەرچاوەیەکی هەڕەشە لە ئامادەباشیدا رادەگیرێن، بەمجۆرەش دڵسۆزی و وابەستەیی کوردان بەدەست دێنن. وەک دەبینرێت تاقیگەکە لە هۆنینەوەی گەمە سیاسیەکاندا زۆر خوڵقێنەرە. سیستەمەکان یەک لەدوای یەک دەڕووخێن و هی نوێتر ئاوا

دەکرێن، بەڵام بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکان کەرەستە (سیاسەت)یەکی هەمیشەیی لە تاقیگەی کوردی ئێراق پێکناهێنرێت و لە بواری کرداریدا بەرجەستە ناکرێت. کوردان بەردەوام لەژێر فەرمانی سەردارەکانیاندا دەژین و هەر ئاغاکانیشیان خولقێنەرن. وێڕای ئەوەی کۆنترین کێشەی خۆرهەڵاتی ناوینە، بەڵام ئەو لۆژیکە ڕۆڵێکی سەرەکی بینیوە کە تا ئێستا کێشەی کورد چارەسەرنەکرێت.

وەک چۆن نەتەوەپەرستی تورکی سپی لە ئەنادۆڵ سەبارەت بە زایۆنیزمی ئیسرائیل ڕۆڵی ئیسرائیلی بەرایی بینیوە، میللیگەرایی کورد لە باشووری کوردستان بەتایبەتیش لە ڕێگای بارزانییەکانەوە ڕۆڵێکی هاوشێوەی بینیوە. بەجۆرێک لە جۆرەکان ناسیۆنالیزمی کوردی سپییە. لە بواری سیاسی و ئایدیۆلۆژییەوە لەلایەن هەمان هێزەوە ئاواکراوە. نەک تەنیا لە بواری تیۆری بەڵکو لە بواری کرداریشدا پەیوەندی بەهێز لە نێوان ناسیۆنالیزمی تورکی سپی و ناسیۆنالیزمی کوردی سپی جێگای باسە. پارتی دیموکراتی کوردستان PDK وەک CHPی کوردان بەرنامەڕێژکراوە، بەشێکی کردەی هێزە پیلانگێڕیەکانە کە لە ساڵی ١٩٢٥ەوە لە سەرکارە. هێزە پیلانگێڕەکان لە کاتێکدا لە قۆناغی ١٩٢٥ - ١٩٤٠ هەوڵی کۆمەڵکوژکردنی کوردان دەدەن، لەلایەکی دیکەشەوە لە ١٩٢٦ تەنیا بە دابەشکردن و پارچەکردنی زۆرەملێیانەی کوردستان ناوەستن؛ ئەوجارە لە پارچەی ژێر دەستی ئێراقدا بناغەی میللیگەرایی کوردی سپی دادەنێن کە ڕۆڵ و پێگەی ڕزگارکەری پێدەدەن.

لە ڕاستیدا سەرجەم پرۆڤەقاسیۆن (هاندان یان دنەدان)ەکان هەریەکە و بەردێکی بناغەی ئەو هەنگاوانەن کە بەرەو ئیسرائیل دەچێت. دەشێت هەمان شت سەبارەت بە میللیگەرایی بەعسی عەرەبی و شیعەش بیربکەینەوە. ڕەوتە میللیگەرا و نەتەوەگەراکانی (میللیگەرایی ئایینشی لەناودا)ی خۆرهەڵاتی ناوین چەندە لە ڕووخساردا خۆیان بە ئانتی - ئیسرائیل و ئانتی - زایۆنیزم پیشانبدەن، بەڵام لە بواری ئۆنتۆلۆژی (وەک بوونێک لەبواری زهنیەتی بونیادنانەوە)یەوە هەریەکە و لقێکی میللیگەرایی ئیسرائیلن. وەک چۆن ئایینە تاکخوداییەکان هەریەکەیان دەرهاوێشتە و لقێکی ئایینی موسەوی (تەوراتن)ن، ئەوا نەک تەنیا لە ئاستی ناوچەکەماندا، بەڵکو سەرجەم نەتەوەگەرایی و میللیگەراییەکانی دونیا کە لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدان هەریەکەیان لقێکی میللیگەرایی ئیسرائیلن. میللیگەرایی ئیسرائیل لە سەنتەری کۆماندەکردن و ئاراستەکردنی میللیگەرایی دونیادا جێگیر بووە، دەوڵەت - نەتەوە و پارتە نەتەوەپەرست و میللیگەراکانی دیکەش چەندە لە پێگەی بەرهەڵستکاردا دیار بن، بەڵام بەهۆی سیفەتە ئۆنتۆلۆژییەکەیان لە خزمەتکردنی هێزی کۆماندەی سەرەکی ڕزگاریان نابێت. چونکە سیستەم (میللیگەرایی و دەوڵەتگەرایی - نەتەوەگەرایی) لەسەر ئەو بنەمایە بونیادنراوە. کۆتاییە تراژیدیەکەی سەددام حوسێن کە سەرچاوەی خۆی لە نەناسینی سیستەم و شێوازی چەوتی بەرەنگاربوونەوە وەردەگرێت، لەو بارەیەوە نموونەیەکی بەکاریگەر و سەلمێنەرە. تەنانەت ئەزموونی حەفتا ساڵەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی ڕووسیای سۆڤێتیش لە

دواشیکاردا لە ئاکامی پێگەی سەرەکی هێزە بونیادنەرەکانی سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوەی سیستەمی هەژموونگەرایی لە هەڵومشانەوە رزگاری نەبووە. هەڵسەنگاندنێکی راستی سیستەمەکان چەندە پێویست بێت، ئەوا لەبەر ئەو هۆکارەش بەرەنگاربوونەوە و رکابەرایەتیکردنیان بەشێوەیەکی سیستەماتیک گرنگە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا رێگری لە تراژیدیاکان ناکرێت. ئەگەر حەفتا ساڵیش بەسەر دامەزراندنیاندا تێپەڕێت، ئەوا کۆتایی سیستەمە چەوتەکان دۆڕان دەبێت. لەبەر ئەو هۆکارەیە کە مۆدێرنیتەی دیموکراتی لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەبارەت بە ئێراق و کوردانی ئێراق گرنگی و بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە. چونکە ئێمە مەحکومی دەوڵەت ـ نەتەوە میللیگەرایی و ئایینگەراکان نین. تەنیا کاتێک لە پارادایمی نابیناکاری میللیگەرایی و دەوڵەت ـ نەتەوە رزگاری بێت دەشێت کۆمەڵگای راستەقینە دەرکی پێبکرێت و دیموکراتیزە بکرێت.

وەک لەو پێناسە کورتانەشدا بینیمان دابەشکردنی کوردان لەسەر بنەمای قەوارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق و سوریا کاریگەرییەکی جەرگبڕانەی لەسەر راستینەی کۆمەڵگای نەتەوەیی کورد کردووە و رێگای لەپێش بێناوەڕۆک بوونی کردۆتەوە؛ زەبرێکی کوشندە بووە بۆ سەر پەرەسەندن و یەکێتی کۆمەڵگای نەتەوەیی. ئەمەش بەجۆرێک لە جۆرەکان مانای بێبەشکردنی جەستەیە لە دەست و قاچێک. کەواتە رێگرتن لەگەیشتنی کوردان بە کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی، هێشتنەوەی لە دۆخێکی سەقەت و برینداریدا، تاوتوێکردن و هەڵوەستەکردنێکی بایەخدار سەبارەت بە نەخشەکێشانی سنووری ئێراق و سوریا و پێشخستنی مۆدێرنیتەی دیموکراتی لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداریی بەرپرسیاری ئەو دۆخە، دەکاتە پێویستییەک. کاتێک باسی یەکێتی نەتەوەیی کوردان دەکرێت پێویستە وەک دەوڵەت ـ نەتەوە تێنەگەین، بەپێچەوانەوە پێویستە وەک کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتیانە دەرکی پێبکرێت. هەربۆیەش پێویستی بە سنووری دەوڵەت ـ نەتەوە نوێیەکان نییە. پێویستیەکی ژیانیی بەو رێگەچارانە هەیە کە پشت بەبونیادە دیموکراتیەکانی خۆبەڕێوەبەرێتی سەرجەم کلتوورە کۆمەڵایەتییە تێکەڵەکان دەبەستێت، بەتایبەتیش گەلە دراوسێکان. بەشێوەیەکی روون ئاشکرا بووە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە زادەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین، ناتوانن بە شێوازێکی ئاشتیانە لەگەڵ یەکتردا بژین و کۆمەڵگاکانیشیان بەختەوەر ناکەن. لە بەرامبەر ئەوەشدا سیستەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتی کە ئازادی، یەکسانی و خۆبەڕێوەبردنی میراسە کلتوورییە هەزاران ساڵیەکانی کردۆتە ئامانجی خۆی، رێگای راستتر، چاکتر و جوانتری ئاشتی کۆمەڵایەتی و ژیانێکی بەختەوەرە.

### ج ـ ناسنامەی نەتەوەیی کورد لە خۆرهەڵاتی کوردستاندا

وەک وڵات ئێران رۆڵێکی گرنگی هەبووە لە پێکهاتن و نەشونماکردنی ناسنامەی کورددا. لێکنزیکی زمان و کلتووری نێوان کورد و فارسەکان جێگایەکی گرنگ لەو

پێکهاتنەدا دەگرێت. ناوی ئێران سەرچاوەی خۆی لە دەستەواژەی ئاریان وەردەگرێت کە ڕەگەکەی بۆ کۆمەڵگای نیولیتیک (چاخی بەردینی نوێ) درێژ دەبێتەوە؛ مانای "وڵاتی جڤاتە ئاریانیەکان" دەبەخشێت. هەرچی جڤاتەکانی ئاریانە، جڤاتی کلان و قەبیلە جووتیار و شوانکارەکانە کە شۆڕشی نیولیتیکیان ئەنجامداوە. ئەوانە یەکەمین پێشەنگە گروپن کە وەک کوردە یەکەمینەکان لە بواری کلتووریدا هاتنە سەر شانۆی مێژوو. لە بنەڕەتدا دەستەواژەی ئاری بە ئامانجی پێناسەکردنی ئەو گروپانە بەکار دەهێنرێت. مانایەکی ئەرد (عەرد) = خاک، ماناکەی تری ئار = ئاگرە، بەهەردووماناش گوزارشت لە هەمان راستی دەکات. پیرۆزی ئەرد و ئار لە دەستەواژەی ئێراندا شاراوەیە. لە بنارەکانی شاخی زاگرۆس زستانان ئاگر، هاوینانیش کشتوکاڵ فاکتەرە سەرەکیەکانی ژیانن. شارستانیەکانی سۆمەر و ئێران بەرهەمی کلتووری کۆمەڵایەتی ئاگر، کشتوکاڵ و ئاژەڵداری بنارەکانی چیای زاگرۆسن. دەشێت لە قەوارە و پێکهاتەکانی سۆمەر ـ گۆتی، ماد ـ پارس و ساسانیەکانی درێژایی مێژوو تا ئێرانی رۆژی ئەمڕۆ ئەو راستینە تێبینی بکرێت. یەکەمین ناسنامەی قەوم یش لە سەردەمی کۆنفیدراسیۆنی میدیا بەڕێبەرایەتی کاهینەکانی زەردەشت هەڵمەتێکی گرنگی ئەنجامداوە و قۆناغێکی ئەو ناسنامەی بڕیوە. سەبارەت بەناسنامەی کورد؛ مادەکان (میدیاییەکان) خاوەنی ناسنامەی یەکەمی باپیرە ناسراوەکانی مێژووی نووسراوی قەومی کوردن. ناسنامەی پارس یش سەبارەت بەبوونی خۆی لەبنەڕەتدا قەرزاری ماددەکانە. لە مێژووی هێرۆدۆتدا مادەکان وەک پێشکەوتوترین قەومی قۆناغی خۆی هەڵدەسەنگێنرێت، پارس و گریکەکانیش لە پێگەی ئەو شاگردانەدان کە لە مادەکانەوە فێری کلتوور دەبن. مادەکان بەلانی کەم هێندەی سۆمەریەکان رۆڵیان لە قۆناغ بڕین و قەڵەمبازی سیستەمی شارستانی ناوەندیدا هەبووە. کلتووری میدیایە کە بناغەی شارستانیەکانی پارس، ئیجە، هێلین و رۆمای داناوە و دەرفەتی بۆ رەخساندوون.

هەمان میراسی مێژوویی رۆڵیکی گرنگ لە پێکهاتنی کلتووری ئیسلامی چاخی ناویندا دەبینێت. بەشێکی زۆری قورئان لە باوەڕی زەردەشتی وەرگیراوە و کۆکراوەتەوە. بەشێکی گرنگی پۆلێنە ئەخلاقی و باوەڕیەکانی سەرچاوەی خۆی لەو نەریتە وەردەگرێت. ئێزیدی بەشێکی بچووکی ئەو نەریتەیە کە تا ئێستاش زیندووە و دەژیت. بەشی ئەو میراسە لە نەریتی لوڕ، سۆران و کوردە عەلەویەکاندا هەیە.

ئێرانی شیعە بەشێوەیەکی ئاشکرا لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی بوونی قەومی کورد، فارس و تورکمان لە بەرامبەر ئیسلامی سوننی دەسەڵاتگەرا ئاواکراوە. کوردێکی خاوەن ئۆجاخ (ئاتێشگا) کە ناوی شێخ سەفوەدینی ئەردەبیلییە بناغەی مەزهەبی یەکەمین خانەدانی شیعەی سەفەویەکانی داناوە. خانەدانە تورکمانەکانی بەقورسایی شیعەبوون و دژی خانەدانی عوسمانی تورکی سوونني بوون، ئەوانیش لە تووشبوون بە نەخۆشی دەسەڵات رزگاریان نەبووە. لە کۆنفیدراسیۆنێکی سیاسی کە نەریتی دیموکراتیانەی لە پێشبوو بۆ سیستەمێکی دەوڵەت وەرچەرخان کە لایەنی بیروکراتی ناوەندی لەپێشە.

شیعەگەریش بووە بە بەشێکی ئایدیۆلۆژیای فەرمی دەسەڵات. هەرچەندە لە بەشێکی گرنگیدا تا ئێستاش نەریتی ئانتی ـ دەسەڵاتگەرایی زیندووە، بەڵام ئیسلامی شیعەش وەک ئیسلامی سوونی دەسەڵاتگەرا و دەوڵەتگەرایە. بەشی زۆری کوردانی ئێران بەشێوەیەکی سەیر لەمیانەی نەریتێکی ئیسلامی سوونی دوور لە بیروشکی بەرامبەر دەسەڵاتەکانی شیعەگەرایی نوێنەرایەتی ئۆپۆزسیۆنی دیموکراسیخواز دەکەن، لەو سۆنگەیەوە؛ نوێنەرایەتی راستی دەکەن. کوردایەتی هاوچەرخی ئێران لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە لە بەرامبەر دەسەڵاتی شیعەگەری هەوڵی شێوەگرتنی داوە. سەرهەڵدانی ١٩٢٠ی سمکۆ و ئەزموونی کۆماری کوردستان لە مهاباد ١٩٤٦ گوزارە لەو راستییە دەکەن. ئەو راستی و نەریتەی بەرخودان هەرەدوایی بە هەڵویستی بەرەنگاربوونەوەی کۆماری ئیسلامی ئێرانی بە رێبەرایەتی خومەینی (دەسەڵاتی زۆرداری ئێران) دیسان خۆی سەلماندووە. کلتووره ئیسلامییە دەسەڵاتگەراکان جا ئەوە سوونیگەرایی بێت یان شیعەگەرایی وەک پۆشاکێکی قێزەون و ناشایستە بەسەر کوردانەوە دیارە کە بەزۆرەملێیانە بە بالایاندا پۆشیون. هەرکاتێک کوردان دەرفەت و هەلی ئازادییان دۆزیەوە ئەو پۆشاکە قێزەونانە فڕێدەدەن و پۆشاکی کلتووری راستەقینەی خۆیان دەپۆشن.

رێککەوتننامەی قەسری شیرینی ١٦٣٩ کە لەنێوان سەفەوی و عوسمانیەکان ئیمزاکرا لە دابڕاندنی کوردانی ئێران لە یەکپارچەیی کوردان و کوردستان رۆڵێکی گەورەی هەیە. ئەو رێککەوتنە مانای دابڕاندنی کوردانی زاگرۆسە لە یەکێتی و یەکپارچەیی کوردان. کوردانی ئێران رۆڵی خانەی بنەڕەتی ناسنامەی کوردیان دەبینی. نوێنەری راستەقینەی نەریتی زەردەشتی بوون. پێگەی ئیسلامییان لە بەرامبەر دەسەڵاتە شیعەگەراکان دیموکراتیانەترە. هاوشێوەی خەباتی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەی کوردە عەلەویەکانی باکوری کوردستان بەرامبەر نەریتی دەسەڵاتی سوونی، بە شێوەیەکی سەرەکی کوردە سوونیەکانی خۆرهەڵاتیش بەرامبەر دەسەڵاتی شیعە ئەنجامی دەدەن. ئەو دۆخەش گرێدراوی سەرچاوە کلتووری ـ ئایدیۆلۆژیەکانی دەسەڵاتە. کلتووری زاڵ لە راستینەی کوردانی ئێران لە ئایینی و مەزهەبی زیاتر ماهیەتێکی ئەتنیکی و قەومی هەیە. لە کاتێکدا خەسڵەتی قەومی فارس و ئازەریەکان لەناو کلتووری شیعەدا لاوازتر دەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کوردان بەرهەڵستکاری کلتووری شیعەن زۆربەی زۆری خەسڵەتە قەومیەکانی خۆیانیان پاراستووە. لە بەرامبەر ئەوەشدا کوردە شیعە و لۆڕەکان (یەکێکن لە کۆنترین لقی کلتووری کوردان) تایبەتمەندێتییە قەومیەکانیان لاواز بووە و توانەوەی خێرایان لەناو کلتووری شیعەدا جێگای باسە. هەروەها کوردانی خوراسانیش کە ژمارەیەکی بەرچاوی کوردان پێکدێنن کرمانجی شیعەن؛ وێڕای هەوڵە بەردەوامەکانی ئاسیمیلەکردنیان و بێکاریگەرکردنیان لەبواری سیاسیدا، بەڵام پێداگریان لەسەر پاراستنی ناسنامە و کلتووری خۆیان کردووە. ئەو بەرخودانەی لە ساڵی ١٨٠٦ بەڕێبەرایەتی بابانیەکان دەستی پێکرد و تا رۆژی ئەمڕۆشمان بەردەوامە کاریگەریەکی زۆری لەسەر پێکهاتنی ناسنامەی هاوچەرخی کورد لە خۆرهەڵاتی کوردستان هەبوو. ئەو سەرهەڵدانانەی لە سەرەتاکانی

سەدەی نۆزدەهەم ڕوویاندا کاریگەریەکەیان گشتییە. بزاوتـەکانی بـەهێزکردنی دەسـەڵاتی ناوەندی کە ئامانجیـان لـەناوبردنی دەسـەڵاتی خێڵ و میرنشینەکان بـوو وێـڕای ئـەوەی دەسەڵاتە بەکرێگیراوە باوەکانیان لەناوبرد، بەڵام کاریگەریەکی ئەوتۆی بۆ سەر کلتووری کۆمەڵگا نەبوو. جۆرێکی کوردێتی دەسەڵات لەناوبراوە، هەرچی کوردایەتی کۆمەڵگایە بە قۆنـاغێکی نـوێتر گەیشـتووە. یاخیبوونـەکانیش زیـاتر بـە ئامـانجی بەدەسـتهێنانەوەی دەسەڵاتی لەدەستدراو ئەنجامدروان. لـە ئامـانجی پاراستنی بـوونی نەتـەوەیی کـوردان و پەرەپێدانی دوور بـوو. پێویسـتە زۆر بەباشـی دەرک بـەو تایبەتمەندێتیـەی ئۆتۆنـۆمی ئەرستۆکراتەکان بکەین و جیاوازیەکانیان لەگەڵ بزووتنەوەکانی بەرگریکردن لـە بـوون و بەدەستهێنانی ئازادی دەستنیشان بکەین.

شـەڕ و پێکـدادانی ئۆتۆنۆمییـە نادیموکراتیـەکان بـەهۆی پێکهاتـەی چینایـەتی پێشەنگەکانیان زۆربـەیان بـە شکست کۆتاییـان هـاتووە، ئـەوەش وێرانکاریـەکی قـووڵی لەسەر بوونی نەتەوەی کورد و ئازادییەکـەی دروست کـردووە. هـەر شکسـتێک ڕێگـای بـۆ کۆمـەڵکوژی کردۆتـەوە، هـەر کۆمەڵکوژیـەکیش هـەنگاوێک زیـاتر ژینۆسـایدی کلتـووری بەرەوپێشەوە بردووە. بزووتنەوەکانی شـێخ عوبەیـدوڵڵای نـەهری ١٨٧٨، سمکۆی ١٩٢٠و قازی محەمەد ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ لە خۆرهەڵاتی کوردستان ڕێگای لـەپێش ئـەنجامێکی هاوشێوە کردۆتەوە. ئەزموونی کۆماری کوردستان لە مـەهاباد کـە قـازی محەمـەد ڕێبەرایـەتی کـرد وێڕای خەسڵەتی مۆدێرن و جـەماوەریبوونی، بـەڵام لـە دووبارەکردنـەوەی چارەنووسی سەرهەڵدانەکانی دیکە ڕزگاری نەبووە. ئەو ڕێککەوتنـەی لەسـاڵی ١٩٣٧ بـەناوی پـەیمانی سـەعد ئابـاد لـەنێوان فاشـیزمی تـورکی سـپی و فاشـیزمی ڕەزا پەهلـەوی ئیمزاکـراوە، لەناوەڕۆکـدا شـێوەی هاوچـەرخی ڕێککەوتننامـەی قەسـری شـیرین بـوو، ئامـانجی قووڵکردنەوەی دۆخی پارچـەبوونی کوردان و لـەناوبردنی بزووتنـەوەی ئـازادی بـوو. لـە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا چەندین ڕێککەوتنی نهێنی لەنێوان دەسەڵاتی فاشیزمی سەوزی تورکیا و دەسەڵاتی فاشیزمی ئیسلامگەرایی ئێران دژی تێکۆشانی پاراستنی نەتەوەیی کوردستان و بەدەستهێنانی ئازادی لە ئارادایە و پەیڕەو دەکرێت.

ئەو کوردانەی لە ئەورووپا، فیدڕاسیۆنی سۆڤێتی جاران و چەندین وڵاتـی خۆرهـەڵاتی نـاوین بڵاوبوونەتـەوە و دەتـوانین بەراسـتی ڕەوەنـدی کـورد نـاوی ببـەین هوشـیاری نەتەوەییان لە پەرەسەندن دایـە و دەبـن بـە بەشـێکی گرنگـی ناسنامەی نەتـەوەیی. ئـەو توێژانـە بەتایبـەتی بـۆ فاکتـەری هوشـیاری کلتـووری کـراوەن. لـە دەسـتەبەرکردنی یەکپارچەیی ناسنامەی نەتەوەییشدا پێویستە ڕۆڵی کاراکردن ببینن.

لێرەدا بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەرکـەوت کـە بەسیفەتی ڕاستینەی نەتەوایـەتی لەسـەردەمی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری کوردایـەتی زەبرێکـی کوشـندەی بەرکـەوتووە. لێرەشدا گرنگترین ئەنجامی کە هەڵێنجرێت: بـوونی نەتـەوەی کـوردان لەمیانـەی ئـامرازە سەرەکیەکانی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری (سـێیانەی سـەرمایەداری قۆرخکـار، دەوڵـەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم کە لە سۆسیۆلۆژیای ئازادی بە شێوەیەکی تێروتەسەل شیکار

کراوە) بەدەست ناهێنرێت و ناپارێزرێت. حیساب و لێکدانەوەکانی ئەندامە سەرەکیەکانی سیستەمی هەژموونگەرایی (ئینگلتەرا، ئەمریکا، ئەڵمانیا...هتد)یان ئەندامە بەکرێگیراوەکانیان (رژێمی فاشیستە سپیەکانی ناوچەکە، سەرمایەداری کۆمپرادۆر و پیشەسازی خڵتە کە وێرانکاری ژینگەیە) لەسەر دابەشکردنی کوردستان، مانەوەی لە دۆخی پارچەکراوی، بەتەواوی ئاسیمیلەکردنی بوونی نەتەوەی کورد و ژینۆسایدکردنی یاخود لەمیانەی ئەو پەیرەوانەی تەواوکەریانن، واتە لە رێگای پێکهاتەکانی کوردایەتی ساختەوە بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. ئەگەر ئەو لێکدانەوانەیان بەشێوەیەکی راست و دروست بەگوێرەی ئارەزووەکانیان جێبەجێ بێت، نە کوردستان و نە بوونی نەتەوەیی کورد هیچ یەکێکیان لەئارادا نامێنن. رۆڵی فاکتەرە بەکرێگیراوەکانیش کە سیستەمی هەژموونگەرایی لە گشت پارچەکانی کوردستان ئاوایکردوون و کوردایەتیەکی ساختە و گومڕا وەک دەمامک بەکاردەهێنن، لە بنەڕەتدا رەواکردنی ژینۆسایدی کلتووری کوردانە کە لەرێگای ئاسیمیلاسیۆنەوە لە ماوەیەکی درێژخایەن جێبەجێ دەکرێت. یەکێک لەو خاڵانەی ئەو رۆشنبیر، سیاسەتمەدار و کەسانەی لە بواری ئەخلاقی و ئەستاتیکاوە کار سەبارەت بە بوونی نەتەوەیی کوردان دەکەن و پێویستە بۆ ساتێکیش لەبیری نەکەن و لە دونیای هەست و سۆزەکانیاندا بە زیندوویی بیهێڵنەوە ئەوەیە کە بزانن پێکهاتەکانی ئەو کوردایەتیە ساختە، پەردەپۆش و دەمامککراوە هەریەکەیان پیلان و تەڵەزگەیەکن. هەر چ نیازێکیان هەبێت، رۆڵیان رەواکردنی ژینۆسایدە. لە رووخساردا بانگەشەی ئەندامێتی راستینەی نەتەوەی کورد دەکەن و هەوڵی واقیعیکردنی دەدەن؛ لە ناوەڕۆکیشدا فاکتەرە پۆتانسیێلەکانی بوونی نەتەوەی کورد دەکرتێنن؛ ئەو کرمانەی ناو دارن کە رەگ و ریشەکەی دەخۆن. چەندە جێگای داخە کە زۆربەشیان بە نەزانی و لەپێناو بەرژەوەندییە رۆژانەییەکانیان و لەوەش مەترسیدارتر بە نیازپاکیەوە رۆڵی کرمی دار دەبینن.

لە رەوشێکی بەمجۆرەدا دەردەکەوێت کە راستینەی نەتەوەیی کوردی هاوچەرخ لەمیانەی دوو مەیلی پێچەوانەی یەکترەوە هەوڵی بەدەستهێنان و ئازادکردنی بوونی خۆیان دەدەن. یەکەمیان؛ مەیلی لەناوبردنە، کە لەمیانەی کردەوەکانی دەستبەسەرداگرتن، داگیرکردن، راگواستن، سەرکوتکردن، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدکردنی زادەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە ژێر ستاتۆیەکی خراپتر لە کۆلۆنی هەوڵی لەناوبردن، بێناوەڕۆککردنی نەتەوە و رێگیریکردن لەپێش گەیشتن بە کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی ئازاد دەکرێت. سەرەکیترین خاڵی لەو مەیلەدا تێبینی بکرێت لە ژینۆسایدە هاوشێوەکانی هیندە سوورەکان، یەهودی و ئەرمەنیەکان زیاتر کە لایەنی جەستەییان لەپێشە، رێبازی ژینۆسایدی کلتووری جێبەجێ دەکرێت، کە لە رێگای گروپی خائین و کوردایەتی ساختەوە رەوا دەکرێت و لە رووکەشدا بەجۆرێک خۆیان دەنوێنن گوایە کوردایەتی زیندووە و ناهێڵێت کەس دەستی بۆ ببات. مەیلی دووەم؛ مەیلی ژیاندنەوەی بوونی نەتەوەی کورد و درێژەپێدانیەتی بەرامبەر بە مەیلی یەکەم: یان بەشێوەیەکی هەڕەمەکی یان بەشێوەیەکی هۆشیار، رێکخراو و کردەیی بەرێوەدەبرێت و

لەمیانەی ئەو بوونەوە یەکێتی و ئازادکردنی تەواوی بەشەکانی و بونیادنـانی کۆمـەڵگای نەتەوەیی کوردی ئازاد بە بنەما دەگرێت. ئـەو دوو مەیلـە بەشێوەیەکی دژ لـە ناسنامەی کوردی هاوچەرخ لە ئاراداں. تێکۆشان و ململانێی نێوانیـان دیاریـدەکات کـە ئـەو مەیلـەی بکوژە، رۆژ لەدوای رۆژ ژیان لە ئارادا ناهێڵێت و بێواتای دەکـات سـەردەکەوێت، یـاخود ئەو مەیلـەی رۆح بەبـەر ژیـان دەکاتـەوە، یـەکێتی دەستەبەر دەکات و ژیـانی مانـادار و ئازادی بەدیدێنێت. ئەو تێکۆشانەی هێزەکانی ئازادی و دیموکراسی لـەرێگای ستراتیژی و تەکتیکی تێروتەسەلەوە ئەنجامی دەدەن یەکلاکەرەوە دەبێت کە تا مردن بەرخودان بەبنەما دەگرێت و دووسەد ساڵە ئەو پرۆسە هاوچەرخە لەژێر ناوی تێکۆشـانی پاراستنی بـوونی نەتەوەیی و بەدەستهێنانی ئازادی بەردەوامـە و لـە بوارەکـانی ئایـدیۆلۆژی، سـەربازی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابووری و دیبلۆماسییەوە بەرێوەدەچێت.

## ٢ . رەهەندی کۆمەڵایەتی راستینەی کورد

ناسنامەی کورد یاخود هەر ناسنامەیەکی دیکە جێگای باس بێت، یەکەمین خـاڵێک کە پێویستە مایـەی تێگەیشتن بێـت ئەوەیـە: ناسـنامە راسـتنەیەکی کۆمەڵایەتییـە. کۆمـەڵگا بـەرفراوانترین دیاردەیـە کـە جـۆری مـرۆڤ لـەخۆوە دەگرێـت. لـەو سـۆنگەیەوە؛ کاتێـک دەستەواژەی کۆمەڵگا بەکاردەهێنرێت، لەوانەیە پێویست بینین بە دەستەواژەیەکی دیکـەی ئینتیما وەک زیادە ببینرێت. لەوانەیـە راسـتترین پێناسـەکردنی کۆمـەڵگا بێـت لەمیانـەی ناسنامە ناوەکیەکانەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی کۆمەڵگاکان بریتین لە هەمەڕەنگیەکی شکۆدار ناولێنانیان دەبێت بـە هـەنگاوێکی دەست لێبەرنـەدراو. ئـەوەی لێـرەدا گرنگـە گـەردوونی بوونی دەستەواژەی بنەڕەتی کۆمەڵگایە. لە گەردوونیبووندا دەشێت نوێنەرایەتی سەرجەم ناسـنامەکان بکرێـت. دابەشـکردنی گـەردوونی بـۆ هەمـەڕەنگی جیـاواز کاریگـەری لــە ناوەڕۆکەکەی ناکات. کۆمەڵگای ئەمریکا و ئەورووپا لە ناوەڕۆکدا هـەمان شـتن. جیـاوازی نێوانیان سەبارەت بە رووخسارەوەیە. کاتێک باسی راستینەی کورد دەکـەین لـە راسـتیدا کۆمـەڵگای کـورد پـۆلێن دەکـەین. لێـرەدا دووبـارە ئەگـەر بگوترێـت کۆمـەڵگای کۆمـەڵگا لەوانەیە نابەجێ و بێهودە بێت. گوتەی راستینەی کورد لەگەڵ گوتەی کۆمەڵگای کورد لە بـواری مـاددی و ئایدیۆلۆژیـدا یەکسـانە. لـەو سـۆنگەیەوە؛ کاتێـک باسـی رەهەنـدی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای کورد بکرێت لەوانەیە بێواتا ببینرێت. بەڵام ئەو وردەکاریەی لێرەدا هـەوڵی ئامـاژەپێکردنی دەدەیـن پەیوەنـدی بـە رایەڵـەی نێـوان گـەردوونی و بـەش هەیـە. لەکاتێکدا راستینەی کـورد نـاوەڕۆکی کۆمەڵگایـە کـە نـەگۆڕە و وەک خـۆی دەمێنێتـەوە، رەهەندی کۆمەڵایەتی کوردیش دۆخی شێوە جیاوازەکانی ئەو ناوەڕۆکەیە. رەهەندی کـلان و رەهەندی نەتەوەش لەچوارچێوەی راستینەی کورد دان. لە کاتێکدا راستی هەمان شـتە، کـلان و نەتــەوەش گوزارشـت لــەو کۆمەڵگایـە دەکـەن کـە گـۆڕاون و شـێوەیان گرتـووە.

شانبەشانی ئەو روونکردنەوە تاوتویکردنی رەهەندی کۆمەلایەتی فێرکەر و ئەزموون بەخش دەبێت.

راستەوخۆ دەتوانین جیاوازییە گەورەکەی نێوان کوردایەتی چاخی کۆن و نیولیتیک لەگەڵ کوردایەتی ناو مەنگەنەی مۆدێرنیتە دەستنیشان بکەین. وەک سەرجەم کۆمەڵگاکانی دیکە کۆمەڵگای کوردیش راستیەکی نیولیتیک و چاخی کۆنی هەیە، بەڵام راستیەکی هاوچەرخ و مۆدێرنیشی هەیە. کۆمەڵگایەک جێگای باس نابێت کە راستیەکی مۆدێرنی هەبێت بەڵام ناسنامەی کلان، قەبیلە، خێڵ یاخود قەومی بەدەست نەهێنابێت. کاتێک قۆناغی قەوم بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەگات ئیتر ناسنامە گۆڕاوە. ئەگەر لەناونەچووبێت و لەسەر پێیان مابێت، واتە ئاشنابوونی لەگەڵ تایبەتمەندێتی ناسنامەی نەتەوەیی دەستی پێکردووە. نەتەوایەتیش ئیتر شێوەیەکی سەرووتری کۆمەڵگای قەومە. تێگەیشتنی کۆمەڵگا لەمیانەی خەسڵەتە نەتەوەییەکەیەوە لە راستی نزیکترە. ناوبردنی بە کوردێتی ئەتنیکی مانای چەواشەکارییە جا بە ئەنقەست بێت یان بێئاگایی. لە رۆژی ئەمرۆماندا بەشێوەیەکی بەردەوام پەنا بۆ ئەو چەواشەکارییە دەبرێت. کاتێک دیاردەیەکی وەک ئەتنیک کە ٥٠٠٠ پ.ز پەیدابووە بۆ رۆژی ئەمرۆمان دەگواسترێتەوە راستینەی کۆمەڵگای نەتەوەیی کوردان نکوڵی لێدەکرێت کە لەمێژە بووە بە شێوەیەکی بالا، دووچاری چەواشەکاریەکی لەوجۆرە دەکرێت گوایە ئەو قۆناغەی بەخۆوە نەدیوە. لەو سۆنگەیەوە ئەوەی لەژێر ئەو سەردێرەوە شیکاردەکرێت و بەسیفەتی کۆمەڵگا بووە بە ناسنامەیەکی نەتەوەیی راستینەی کوردە. ئاشکرایە کە سۆسیۆلۆژیا ئەزموونی زانستێکی زۆر بە گرفتە، هەربۆیەش ئەو جۆرە روونکردنەوانە زۆر پێویستن.

رەهەندی کۆمەلایەتی لە چوارچێوەیەکی بەرتەسکدا بۆ ئەو کۆمەڵگایانە بەکار دەهێنرێت کە سیفەتی چینایەتیان بەدەستهێناوە. بۆ نموونە؛ ئەو راستیانەی خەسڵەتی قەبیلە، کلان و قەومی بەدەستهێناوە بەشێوەیەکی راستەوخۆ ناوبردنیان بە ناوی ئەو قەبیلە، کلان یاخود قەومە هەڵوێستێکی راستە. تەنیا کاتێک کۆمەڵگا خەسڵەتی چینایەتی بەدەستهێنا ناوبردنی بەکۆمەڵگای کورد یاخود هەر کۆمەڵگایەکی دیکە کاراتر دەبێت.

بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین؛ بەدرێژایی مێژوو کوردان ئاشنای مەیلەکانی جیابوونەوەی چینایەتی بوون، ئینجا ئەمانە زادەی ناوخۆ بن یان دەرەکی. کوردە بەراییەکانی بە شێوازێکی شۆڕشگێڕی و لە قوولاییدا نیولیتیک ژیابوون، لەسەردەمی کۆمەڵگای چینایەتی سۆمەرەوە ئاشنای جیابوونەوەی چینایەتی ببوون. جیابوونەوەی چینایەتی دەرەکی هەنگاو بەهەنگاو بۆ رەهەندی ناوخۆیی دەگوازێتەوە. بۆ نموونە؛ خانەدانی گۆتی (٢٢٥٠ ــ ٢١٥٠ پ.ز) بۆ فیدراسیۆنی تیرەگەلێکی کوردە بەراییەکان دەگەڕێتەوە کە لە کۆمەڵگای سۆمەر بە جیابوونەوەی چینایەتیدا تێپەڕیون. گۆڕانکاری و پەرەسەندنی هاوشێوەی لە ژمار نەهاتوو جێگای باسبوون. فیدراسیۆنی خێڵە کوردەکان واتە بەشێوە بەرجەستەکەی خوریەکان کاریگەرییەکی گەورەیان لەسەر پێکهاتەی دەوڵەتی بابلی، هیتیت، ئاشوور و ئورارتووی چاخی کۆن هەبوو. یان جگە لە خۆیان چەندین

خانەدان رۆڵیان لە بونیادنانی ئەو دەوڵەتانەدا بینیوە یان ئەو دەوڵەتانە لەناو جڤاتەكانی خوریەكاندا چەندین خانەدانی وابەستەی خۆیان ئاواكردووە، ئەمە مسۆگەرە. وێڕای ئەمانەش كوردە بەرایيەكان (یەكەمینەكان) گرنگیەكی مەزنیان بە پاراستنی تایبەتمەندێتی قەبیلە و خێڵە راستەقینەكانی خۆیانداوە. لە تەواوی ئەو دۆخانەدا قەبیلە و خێڵەكان لە قووڵاییدا ئاگادارن كە تەنیا لەمیانەی ئاواكردنی فیدراسیۆنێكی دیارەوە دەتوانن بوونی خۆیان بپارێزن و بە ئازادی بژین. لە كۆتاییەكانی ٦٠٠پ.ز كە دیرۆكی رووخانی ئیمپراتۆریەتی ئاشورییە، كۆنفیدراسیۆنی ماد (میدیا) ببوو بە گەورەترین ئیمپراتۆریەتی سەردەمی خۆی. لەسەردەمی ئەو ئیمپراتۆریەتەدا، كە دواتر لەمیانەی پارسەكانەوە بەردەوام بوو، دیاردەی چینایەتی لەناو بنەچەی كوردان جێگیر كردووە و رەگ و ریشەی خۆی داكوتاوە. دەتوانین بڵێین؛ لەو مێژووە بەدواوە سیستەمی میرنشینی دەبێتە دیاردەیەكی كۆمەڵایەتی. لەسەردەمی هێلینیەكان، ساسانیەكان و رۆمانیدا كوردە یەكەمینەكان لەسەر بنەمای سیستەمی خێڵایەتی و میرنشینی (فیدراسیۆنەكان) لەمیانەی چەندین رێككەوتنی ناوخۆیی و دەرەكی بایەخیان بە پاراستنی بوون و بەرگریكردن لەئازادی خۆیان داوە.

وەک كۆمەڵگابوونێكی نوێ كاریگەری ئیسلام لە رێگای جەماعەتە ئایینیەكانەوە لەسەر بنەڕەتی كوردان (كوردە یەكەمینەكان) لەسەر بنەمای بەهێزكردنی سیستەمی میرنشینیەوە بووە. لە كاتێكدا گروپە ئایینیەكان زیاتر بە شێوەی تەریقەتەكان كۆمەڵی مەدەنییان پێكدەهێنا، سیستەمی میرنشینی باویش لە حاڵەتی سیستەمی چینایەتی و سەربازی پێشكەوتووتر خۆیان نوێكردەوە و بەهێزتر كرد. دوای كۆمەڵگای راهیبی زەردەشتی، وەک دیارە تەریقەتەكان هەریەكە و بە سیفەتی رێكخراوێكی كۆمەڵی مەدەنی لە بونیادی كۆمەڵگادا رەگ و ریشەیان داكوتاوە. لەراستیدا بە دۆخە سافەكەیان تەریقەتەكان دامەزراوەی بەرخودان بوون بەرامبەر بە جیابوونەوەی چینایەتی پشتبەستوو بە دەسەڵات؛ رێكخراوگەلێكی كۆمەڵی مەدەنی بوون كە لە رێكخراوەكانی رۆژی ئەمڕۆمان رادیكاڵ و كاراتر بوون. بەڵام بەهۆی دەستێوەردانی بەردەوامی دەسەڵاتەكان و هاوكاری چینی سەروو لەگەڵیان، چەواشەبوون و دژی ئامانجەكانیان كەوتنەوە. لە ناوەڕۆكدا دەشێت كۆمەڵگای چاخی ناوین بە دەركەوتنە پێشی میرنشینە دەرەبەگایەتی و تەریقەتەكان وەسف بكرێت. هەردوو دیاردەش لە كۆمەڵگای كورد بەشێوەیەكی بەرچاو سەریانهەڵداوە. زۆربەی میرنشینەكانیش بۆ دەوڵەتی بەرفراوانتر گۆڕابوون. تا سەدەی شانزدەهەم میرنشینە كوردەكان لە پێگەیەكی نزیک بە سەربەخۆیی دەژیان. گرێدانێكی سیمبۆلییان بە خەلیفەوە جێگای باس بوو. كاتێک لە بەرامبەر سەفەویەكان بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیەوە وابەستە بوون، ئیتر هەنگاو بەهەنگاو ئۆتۆنۆمی خۆیانیان لەدەستدا. لە ساڵی ١٨٤٧دا كاتێک لە كەسی بەدرخان بەگ دواترین میرنشینی بۆتان لەناوبرا ئیتر كۆتاییان پێهات. تەریقەتەكان بەتایبەتیش قادری و نەقشبەندی بەردەوام وەک رێكخستنگەلێكی هاوتەریب وەک ئەلتەرناتیفێک بەرامبەر میرنشینەكان بەكارهێنران.

بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانیان سوڵتانەکان هەردووکیان بەکارهێنان و لێیان سوودمەند بوون. دوای نەهێشتنی میرنشینە کوردەکان لەسەدەی نۆزدەهەم ئەو تەریقەتانەی زەقکرانەوە لە ئاست نوێنەرایەتیکردنی کۆمەڵگای کورد پێشکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا. بێگومان بەهۆی بەکارهێنانیان دژی سەرهەڵدانەکان ئەو رۆڵە نەرێنی بوو. هەربۆیەش رێگای بۆ وێرانکاریەکی قووڵی سەر کۆمەڵگا کردەوە. سوارەی حەمیدییە (فرقەی حەمیدییە) لەناو کۆمەڵگای کورددا رێگای لەپێش دەرەنجامێکی وێرانکارتر کردەوە. هەم چینی سەرووی کوردی لەناوخۆیدا بەگژ یەکترەوەنا، هەمیش لەگەڵ خێڵە ئەرمەنی، سریانی و عەرەبەکانەوە خستییە ناو شەڕ و پێکدادانەوە. بەمجۆرە ئیتر خراپترین قۆناغی کوردە بەکرێگیراوەکان دەستی پێکردبوو.

ئەو گۆڕانکاریانەی لەسەدەی نۆزدەهەمدا لە کۆمەڵگای کورد روویدا ئەنجامێکی دینامیزمە ناوخۆییەکان نەبوو. بەڵکو شێوازی کۆنەپەرستی، بەکرێگیراوی و نکوڵیکارانە مۆرکی خۆی لە پەرەسەندنەکان دەدا. چینەکانی سەروو لە بەرامبەر وابەستەبوون بە دەسەڵات و بەرژەوەندیپەرستی دەستبەرداربوون لە کوردێتییان بە سیاسەتی سەرەکی دانابوو، بە مانایەکی تر؛ کردبوویان بە بێ سیاسەتی خۆیان. کۆمەڵگای کورد لەو دووسەدساڵەی دواییدا گرێدراو بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دووچاری گەورەترین خیانەتی مێژووی خۆی هات. ئەوەی لێرەدا دیاریکەربوو بەرژەوەندییە ماددیەکانی چینی سەروو بوو. پابەندبوون بە کۆمەڵگای کورد پێوستی بە تێکۆشان لە پێناو کۆمەڵگای نەتەوەیی و شەڕکردن هەبوو. کاتێک ئەو یاخیبوونانەش سەرکەوتوو نەبوون کە لەسەر ئەو بنەمایە روویاندا، ئیتر بەخێرایی رادەستبوون بە دەسەڵات، بەرامبەر بە بەرژەوەندی دەستبەردان لە کوردێتی، خیانەتکرن و تەنانەت رۆڵ بینین لەنەهێشتن و لەناوبردنی کوردێتیدا بۆ ئەوان دەست لێبەرنەدراو بوو. لە دۆخێکی پێچەوانەدا نەیاندەتوانی درێژە بە ژیانی ماددی خۆیان بدەن. ئەوەی دەمایەوە کۆمەڵێکی بێ رێبەر و نەزان بوو. ئەوانەش بۆ فورمەکانی هەزاران ساڵ بەر لەو کاتە دەگەڕانەوە، واتە بۆ کۆمەڵگای کلانی سەرەتایی و قەبیلە دەگەڕانەوە. ئەوانەی دەکەوتنە ناو لەپی تەریقەتەکانیش بەتەواوی لە راستی کۆمەڵگا دادەبڕان. چونکە لەو سەدانەدا لە سەرەوە تاخوارەوە لە بنەڕەتدا تەریقەتەکان بۆ دامەزراوگەلێکی کاریگەری سیخوڕی گۆڕابوون. گرنگترین گۆڕانکاری لەو قۆناغە لە بواری کۆمەڵگادا تێبینی بکرێت پێکهاتنی توێژگەلێکی بەرفراوانی ئەو کەسانەیە کە چوونەتە دەرەوەی قەبیلە و خێڵەکان، جێگایان لەناو رێکخستنی تەریقەت و میرنشینەکان نەدۆزیوەتەوە، بە مانایەکی تر بەدەرنران. پرۆلیتاربوونێک جێگای باسە کە بە شێوەیەکی ناراستەوخۆش بێت لە ئاکامی پەرەسەندنی سەرمایەداری و دروستبوونی هەژاری (بێ موڵکی) ناچاربوون بەرامبەر بە کرێ رەنجی خۆیان لە بازاڕەکان بفرۆشن. ئەوانە خەڵکانێکی نیمچە جووتیار و کارکەرە وەرزییە کرێدارەکان بوون، بەمانایەکی تر بێکەس بوون. تا دەچوو ژمارەکەیان زیادی دەکرد. ئەو توێژەی لە خوارەوە واتە لە بنکە پێکهاتبوو وەک گروپ بە کرمانج "مرۆڤی کود" ناو دەبران. تا دەچوو کرمانجێتی و

کوردێتی ناکۆک دەبوون. لە سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەمدا کاتێک باسی کورد دەکرا بەگشتی بە کرمانج دەناسرا و مایەی تێگەیشتن بوو.

ئەوەی لێرەدا سەیرە هاوشێوەیەکی ئەو گۆڕانکارییەی لە تیرە تورکەکەکاندا ڕوویدا ئەگەر بە درەنگیشەوە بێت لە خێڵە کوردیەکانیشدا ڕوویداوە. ئەوەش بەرامبەرەکەی مەدەنی ـ بەدەوی (عەرەبی شار ـ عەرەبی بیابان) بوو کە پێشتر لەناو عەرەبەکان دەرکەوتبوو. چەندەی چینی سەرووی تورک لەسەر بنەمای دەسەڵات لە چینی خواروو جیادەبوویەوە، جڤاتە تورکمانەکان پێکدەهاتن و بەرفراوان دەبوون. تورکمانەکان لەلایەن چینی سەرووی خۆیانەوە بەسووک دادەنران و مۆرکی "تورکی بێ ئیدارک"یان لێدەدرا. کەچی لە ڕاستیدا تورکێتی نەریتی لای تورکمانەکان دەژیا. ئەگەر بەشێوەیەکی درەنگتریش بێت هەمان ڕەوش لە جیابوونەوەی کۆمەڵگای کوردیشدا دەرکەوت. جیاوازی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە: لە کاتێکدا چینەکانی سەروو لای عەرەب و تورکەکان زیاتر ئەندام و فاکتەرە حوکمڕانەکانی دەوڵەت بوون، چینی سەرووی کوردان زیاتر پێکهێنەری توێژێکی بەکرێگیراو بوون. لە کاتێکدا چینی سەرووی تورک و عەرەبەکان خاوەن تورکێتی و عەرەبێتیەکی تایبەت بەخۆیان بوون، چینی سەرووی کوردانیش لەبەرامبەر شوێنگرتن لە دەسەڵاتدا تارادەیەکی زۆر لە کوردێتی دادەبڕێت بە تایبەتیش لە کوردێتی نەتەوەیی و سیاسی دادەبڕێت، زیاتریش خیانەتی لە کوردێتی دەکرد. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو توێژەی بەردەوام لە زیادبووندا بوو کرمانجەکان بوون. دیاردەی کوردیش لە بنەڕەتدا دەبوو بە خەسڵەت و ماهیەتی ئەو خەڵکە. ئەو شێوە سەرەتاییەی وەرچەرخان لە کۆمەڵگای قەبیلە و خێڵەوە بۆ کۆمەڵگای نەتەوەیی دەبێت بەو توێژە بنەڕەتیەی دواتر کۆمەڵگای هاوچەرخی کورد پێکدێنێت. ئەو کرمانجانەی بە دۆخێکی سەربەست گەیشتبوون و خاوەن هێزی کاربوون لەبەر ئەوەی بەبێ شۆڕشی پیشەسازی دەرکەوتوون زۆربەیان بێکاربوون. سەپانی شێوەی نیمچە پرۆلیتاری بوو کە زیاتر لە بواری کشتوکاڵدا پەرەیسەندبوو. دوای ئەویش هێزی کاری ڕەنجبەری وەرزی (وەرزێر) بوو. ئەمەش دۆخێکی هاوشێوەی ئەو ڕەوشە بوو کە لە کۆمەڵگا کۆلۆنی و نیمچە کۆلۆنیەکاندا لە ئارادابوو. ئەو کرمانجێتیەی سەرەتا لەگوندەکان دەرکەوت و پەرەیسەند، لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا بوونە کۆمەڵە سەرەکیەکەی گەڕەکەکانی دەرەوەی شار. کۆمەڵی سەرەکی کۆچکردن بۆ دەرەوەش بوون. شتێکی ڕێکەوت نییە ئەو کۆمەڵەی لە بۆشاییەکی سیاسی و کلتووریدا دەژیت جەماوەری سەرەکی PKK پێکدێنێت کە بەبانگەشەی نوێنەرایەتیکردنی ڕەهەندی کۆمەڵایەتی هاوچەرخی ئەو خەڵکە سەریهەڵداوە.

ئەو گۆڕانکارییە هاوچەرخانەی لە چینی سەروو و خوارووی کوردان هاتەئاراوە جیاوازی تایبەت بەخۆی هەیە. ئەگەر چینی سەرووی کوردان بە بۆرژوا ناوببرێت سنوور بەزاندن دەبێت. وەک چینێکی ئافرێنەر بۆرژوابوون هێزی قەڵەمبازی ئەورووپای ڕۆژئاوایە بۆ سیستەمێکی نوێ. بۆرژوازی تەکنۆلۆژیا و کلتوورێکی تایبەت بە خۆی داهێنا. کلتووری سیاسی خۆشی بە دەسەڵات گەیاند. ئەو کەرتە ئابوورییانەی دەرخستە پێش کە لەسەر

بنەمای بەدەستهێنانی قازانجن. لەو چوارچێوەیەشدا هەژموونگەرایی خۆی لەسەر ئاستی جیهان ئاواکرد. ئەو بۆرژوابوونانەی لە جوگرافیا وابەستەکان ئاوابوون ناچاربوون لاساییکەرەوە بن. سەرجەم سیستەمە هەژموونگەراکان تایبەتمەندێتیەکی هاوشێوەیان هەیە. ئەوەی لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوینیشدا روویدا، شێوەیەکی ئەو پەرەسەندنە گەردوونیە بوو. بەڵام خۆرهەڵاتی ناوین کە پێشەنگایەتی بۆ سیستەمێکی شارستانی ناوەندی هەزاران ساڵی کردووە، بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرخودانێکی زیاتری کرد. ئەوە ئەو راستییە بوو کە لە ئیمپراتۆریەتی ئێران و عوسمانی روویاندا. بۆ ماوەیەکی درێژ بەرخودان بەرامبەر بۆرژوابوون جێگای باس بوو. کاتێک بڕیار سەبارەت بە بۆرژوابوونیش درا لەجیاتی لەناوچوونێکی تەواو شێوە بیرۆکراتیەکەی بە بنەماگیرا. بۆرژوازی بیروکراتی واتای بۆرژوابوون بە دەستی دەوڵەتە. هەربۆیەش ئەو چەشنە بۆرژوازیانەش تایبەتمەندێتی ئافرێنەری و قەومییان ( میللییان) سنووردارە، زیاتر خەسڵەتی کۆمپرادۆرانەیان هەیە.

چینی دەسەڵاتداری کوردیش دەرفەتی بۆرژوابوونێکی بەمجۆرەی هێندە کەمە دەتوانین بڵێین نییە. لەبەرئەوەی خۆی خاوەنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ یان نیمچە سەربەخۆ نەبووە و لەمێژووشدا تکوڵیکاری و بەکرێگیراوێتیەکی ریشەیی بەخۆوە بینیوە. هەربۆیەش بۆرژوابوونی کورد تەنیا زارەکی دەبێت. نە خاوەن هێزێکە لەپێناو بازاڕی نەتەوەییدا بجەنگێت نە لەو بوارەشەوە خاوەن کلتوورێکی سیاسییە، هەردووکیشیان جێگای باس نین. بەپێچەوانەوە تەنیا کاتێک دەستبەرداری تێکۆشانی بازاڕی خۆی و کلتوورە قەومیەکەی بێت، بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت دەرفەتی ژیانی پێدراوە. لەو سۆنگەیەوە؛ بەدرێژایی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم جگە لە دەنگی تاکە کەسەکان ئاشنای ئاواز و ئیقاعی بۆرژوازی کورد نابین. بە پێچەوانەوە لەمیانەی هەڵوێستی خزمەتکار لە پاشا پاشاترە (نموونەیان لەمێژوودا زۆرە) چەندەی رۆڵیان لە لەناوبردنی کوردێتیدا بینیوە بەرژەوەندی و قازانجی خۆیان زیاتر دەکرد. لەجیاتی ئەوەی سەبارەت بە نەتەوایەتیەوە پێشبڕکێ لەگەڵ یەکتریی بکەن، بەگوێرەی ئەو مەیلە؛ بووە بەرێسایەک کە لەسەر تکوڵیکردنی نەتەوەیی کێبڕکێیان بێت. رەگە مێژووییەکەشیان تادواڕادە بۆ ئەو مەیلە لەباربوو. جگە لە هەندێک فاکتەری تاکەکەسی تایبەت، ناشێت باسی چینێکی سەرووی کورد بکەین کە ئافرێنەرە یان بۆرژوازی بیروکراتیکە. باسکردنی کلتووری چینی بۆرژوازی زۆر ئەستەمترە.

تا رادەیەک ماهیەتی بۆرژوازی تورکی سپیمان روونکردەوە کە لە سەدەی بیستەم بەشێوەی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی و کۆماری تورکیا خۆی رێکخستبوو. بەراستیش بۆرژوازیبوونێک لەژێر ئەو قاڵبانەدا جێگای باس بوو کە لایەنی بیروکراسی لەپێش بوو. مسۆگەرە کە ئەوە بۆرژوابوونێکی پشتبەستوو بە دەسەڵات بوو. هەروەها بەبێ پشتبەستن بە هێزێکی هەژموونگەرایی دەرەکی ئاوا نەدەبوو. لە ناوەوەش لەمیانەی لەناوبردنی بۆرژوازی کرستیان، ئەرمەنی و رۆمەکان — کە پێشتر ببوون بە بۆرژوا — توانی

پەرەبسەنێت. شیکارکردنی قەڵاچۆکردن (ژینۆسایدکردن)ی ئەرمەنی و ڕۆمەکان لەسەر بنەمای ئەو واقیعە چینایەتی و هەژموونگەراییە ڕاستترین هەنگاوە. لە بنەڕەتدا سەرمایەدارە یەهودی و فاکتەرە کلتووریەکانیان هێزی هەژموونگەرایی بۆرژوازی تورکی سپی بوون. بە واتایەکی دیکە؛ هەم لە بواری ماددی هەمیش لەبواری ئایدیۆلۆژیەوە ئەوانە لە پێگەیەکی هەژموونگەراییدا بوون. هەروەها چەندین سەدە بوو بۆرژوازی ئەرمەنی و ڕۆمیەکانیان وەک کۆسپێکی پێش خۆیان دەبینی. وەک پێویستیەکی یاسای زۆرترین قازانجیش دەبوایە لەو کۆسپانە ڕزگاریان بێت. یەکەمین جەنگی جیهانی و شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساندن. بەشێوەیەکی شارەزایانە پێکهاتە نانەتەوەییەکانی کەمینەی موسڵمان و تورکەکانی لە نەمامگەی خۆیان پێگەیەنرابوون؛ لەژێر پێشەنگایەتی خۆیان کۆیانکردنەوە و کردیانن بەیەک. لە ئاکامی هەردوو شەڕیشدا وەک هێزی حوکمڕان و زاڵ هاتنە ئاراوە. هەروەها پێگە بەهێزەکەیان لەناو هەژموونگەرایی ئینگلیزەکان لەئاستی جیهاندا چانسێکی زۆر باشی بۆ دەرەخساندن. ڕاگەیاندنی کۆمار لەسەر بنەمای ڕێککەوتن لەگەڵ ئینگلیزەکان دەرفەتێکی بێهاوتای بۆ ئەو توێژانە ڕەخساند. لەبواری جوگرافیا و ژمارەی دانیشتوانیشەوە کۆمار پۆتانسێلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجی بۆ سەرمایەداری لەخۆوە دەگرت. ئەرمەنی و ڕۆمەکان تەسفیەکران، چەرکەسە خاوەن هەڵوێست و خۆڕاگرەکانیش نەخرانە ناو سیستەمەوە. کادیرە بیروکراتە نموونەییەکانی کۆماریش لە پاشماوەی موسڵمانە بە ڕەچەڵەک بەڵقانی و قەفقاسەکان کۆکرانەوە. تاکە سەرچاوەی گەورە هەڕەشەی شیمانە بۆکراو تەنیا کورد مابوویەوە.

هەرچەندە لەمێژبوو ببوون بە بەکرێگیراو، بەڵام دیسانیش هەوڵەکانی چینی سەرووی کوردان لەپێناو بەدەستهێنانی پشکی زیاتر لە دەسەڵات و گەڕاندنەوەی ستاتۆی جاران مەترسی لێدەکەتەوە. هەروەها پۆتانسێلی گەل و جەماوەرێک دروستببوو کە هەر ئان و ساتێک بۆ سەرهەڵدان ئامادەبوو. وەک دەبینرێت ئەو ڕاستییە بنەڕەتیانە لە قڕکردنی کورداندا دیاریکەر بوون، کە لە ساڵی ١٩٢٥ ئینگلیزەکان سیناریۆکەیان ئامادەکرد. هەروەک قڕکردنی ئەرمەنی، ڕۆم و سریانیەکان گەرەنتیکردنی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج لە ئەنادۆڵ پێویستی بە چارەسەرکردنێکی ڕیشەیی بوونی کوردان هەبوو. بە سیفەتی هێزی هەژموونگەرایی ئینگلیزەکان و سەرمایەدارە یەهودی و کادیرە زایۆنیستەکان لەو بارەیەوە لەسەربنەمای پەیمانێکی زۆر نهێنی و پیلانگێڕانەوە لەگەڵ بۆرژوا بیروکراتە تورکەکان ڕێککەوتن. سەبارەت بە تێگەیشتنی دیاردەی تورکی سپی ئەو ڕێککەوتنە ڕۆڵی کلیل دەبینێت. یەکەمین بەرهەمی ئەو ڕێککەوتنە پلیشاندنەوەی بێبەزەییانەی ئەو بەرخودانە بوو کە شێخ سەعید ڕێبەرایەتی دەکرد و دنەدرابوو و (پرۆڤەقە) کرابوو، دواتریش دەستبەردان لە موسڵ ــ کەرکوک و بەجێهێشتنی بۆ هەژموونگەرایی ئینگلیزەکان بوو. هەروەها دیسان وەک پێویستیەکی ئەو ڕێککەوتنە بەشێوەیەکی بێبەزەییانە سۆسیالیست و ئوممەتگەرا ئیسلامیەکان لەناوبران. سەڵتەنەت

و خەلیفایەتی هەڵوەشێنرانەوە. ئایدیۆلۆژیا و کلتووریکی سیاسی سەیر داهێنرا کە مێژووەکەی لە ١٩٢٠وە دەست پێدەکات، پەیوەندی بە کلتووری ئیسلامی و خودی تورکەوە نییە، هەروەها هیچ پەیوەستبوونێکی بە رۆشنگەری ئەوروپاشەوە نییە کە لاساییان دەکردەوە، بەڵکو دەتوانین بە ئیلاهیبوونێکی نوێ ناوی ببەین. ئەو کلتوور و ئایدیۆلۆژیایە نوێیە ئامانجی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەنی وشک بوو. بەدوای ئیتاعەت و ملکەچبوونێکی رەهاوە بوو. پاشماوە و فاکتەرەکانی دیموکراسیش لەناوبرابوون. لەو سۆنگەیەوە؛ بەگشتی سەرجەم تایبەتمەندێتییەکانی کوردێتی، بەتایبەتیش چینی دەسەڵاتدارێتی، یان بەشێوەیەکی خۆبەخشانە یاخود زۆرەملێیانە لەناو ئەو کۆمەڵگا هۆمۆژەنە وشکە ئامانجکراوە دەتوێنرانەوە یان لەناو دەبران. بە بیانووی ئەو یاخیبوونانەی دژ بە لەناوبردن تەقینەوە تەسفیەکردنی جەستەیی پەیڕەوکرا. وەک پێویستیەکی فەلسەفەی پۆزیتیڤیست باوەڕیان بەمە هێنا و بەهەمان ئاستی بڕیاردارێشەوە جێبەجێ کران. ئەگەرنا وەک بانگەشە دەکرێت لەو قۆناغەدا بەرخودانێکی هۆشیار و رێکخراوی کوردان جێگای باس نییە کە مەترسی دروست بکات. بەڵام پۆتانسێلێکی بەهێزی بەرخودان لە قۆناغی پێکهاتن و نەشونماکردن دابوو. ئەوەی جێگای باس بوو لەناوبردنی ئەو پۆتانسێلە بوو بە بیانووی یاخیبوون و پیلانگێڕیەکانەوە. هەر ئەمەش بوو کە ئەنجامدرا.

بۆرژوا بیروکراسییە تورکەکانی رۆڵێکی گرنگیان لەو تەسفیەکردنەدا هەبوو، لەپێناو زیادکردنی پشکی خۆیان لە بەدەستهێنانی قازانجدا، لە ساڵانی دووەمین جەنگی جیهاندا لەژێر ناوی "باجی هەبوون"دا رێبازێکی هاوشێوەی ئەڵمانیایان لەسەر دەوڵەمەند و سەرمایەدارە یەهودیەکان پەیڕەو کرد. وەک چۆن سەرمایەدارە یەهودیەکان لە ئەڵمانیای هیتلەریدا بەدەستی بۆرژوازی ئەڵمانی لەناوبران، کە خۆیان مامانێتیان بۆ کرد بوو، دواتر دەست بەسەر سەرمایەکانیاندا گیرا، هاوشێوەکەیشی لە ساڵانی دەسەڵات و کاریگەری هیتلەردا لەلایەن بۆرژوازی بیروکراتی تورکی لاو و لە چوارچێوەیەکی سنووردار دژی سەرمایەی یەهودی ئەنجامدرا کە مامانێتی بۆ کرد بوو. یەهودیەکان کە سەرمایەکانیان تا دوایی لەت و پەت بوو یان بەرێژەیەکی زۆر سنووردار رازیبوون یان زۆربەیان لە ئاکامی خێرابوونی کۆچبەریەوە ئەنادۆڵیان بەجێهێشت. بۆرژوازی بیروکراتی تورک لە دەرەوەی خۆی ئەو بزاوتەی لەناوبردنی دژی چینی سەرووی تورکیش بەکارهێنا. بەتایبەتیش نەیهێشت خاوەن زەوی و بازرگان ـ پیشەکاران چاوهەڵێنن. کوردانیش وەک نەژاد و رەچەڵەک بەردەوام بە ئامانج دەگیران. قۆناغی کودەتاکان، شەڕی ناوخۆ و پیلانگێڕیەکانی دوای ١٩٥٠کان سەردەمی بەردەوامکردنی ئەو نەریتەیە بە شێوەیەکی قووڵ و بەرفراوانەوە. ئەو پیلانگێڕیی، قڕکرن، ئەشکەنجە، چۆڵکردنی گوندان و قەدەغەکردنی زمانی کوردی کە دوای ١٩٨٠کان لەسەر کوردان بەلوتکە گەیشت جگە لە بەرفراوانترین و دواترین کردەوەکانی هەمان هێزی هەژموونگەرایی بەپشتگیری ناتۆ ـ

گلادیۆ بەولاوە شتێکی دیکە نییە. واتە جگە لە جێبەجێکردنی نەریتێکی سەدساڵی کە لەبواری خێرایی و چوارچێوە گەورەبوونێکی بەخۆوە دیوە هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

لە حاڵەتێکی بەمجۆرەدا لە تورکیای کۆماریدا راستینەی کۆمەڵایەتی کورد واقیعێکە دووچاری لەناوبردنێکی قورس هاتووە. لەکاتێکدا سووربوون لەسەر ژیان و بوون بیانووی بەرخودانە، پیلانی لەناوبردن بەناوی "ئافراندنی کۆمەڵگای هۆمۆژەن"یش پاساوی تەسفیەکردنە. لەو سۆنگەیەوە؛ راستینەی کۆمەڵایەتی کورد وەک راستینەیەکی کۆمەڵایەتی ئاسایی نییە. چونکە لەکاتێکدا چینی سەروو (دەسەڵاتدار) دابڕانێکی سیاسی و کلتووری لە راستینەی کۆمەڵایەتی کورددا ئەنجامداوە و بە پێگەیەکی بەکرێگیراوی و خیانەت گەیشتووە، جەماوەرە سەرەکیەکەی دەمێنێتەوەش بێ رێبەر و بێ ئایدیۆلۆژیا دووچاری ئاسیمیلاسیۆن هاتووە. ئەگەر ئەوەش مەبەست جێبەجێ نەکات، ئەوا بەهەر بیانوویەک بێت پلیشاندنەوە و سەرکوتکردن دەکەوێتە گەڕ. ئامانجیان هێشتنەوەی کوردایەتیەکە بەتەواوی دەستبەرداری جڤات و کۆمەڵگا بووە، هیچ بانگەشەیەکی نییە، شەرم لە کوردایەتی خۆی دەکات، کاتێک تێکەڵ بە کوردایەتی بێت دووچاری گەورەترین مەترسی دێت، بێکار دەمێنێت و بێبایەخ دەکرێت. لەو بڕوایەدام کە نموونەیەکی دیکەی ئەو واقیعە کۆمەڵایەتییە لە دونیای هاوچەرخدا بوونی نییە. لایەنی هەرە مەترسیداری مەسەلەکەش لەوەدایە کە یان بەهیچ شێوەیەک دەرک بەو راستییە نەکراوە یان زۆر کەم دەرکی پێکراوە. نە بۆرژوازیەکی کورد، نە پرۆلیتاریایەکی هاوچەرخ یان وردەبۆرژوازیەکی کوردی رێکخراو و هوشیار هیچ یەکێکیان لە ئارادانین. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا پێویستە باس لە چینە سێبەر و گریمانەییەکان بکەین. لەو بڕوایەدام لە رێگای ئەو شیکارانەوە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە بونیادنانی نیشتیمانپەروەری، نەتەوایەتی و کۆمەڵگابوونی کوردان لە بەرامبەر ئەو راستینەیەی تا رادەیەک بەدۆخی گریمانەیی گەیەنراوە چەندە زەحمەتە.

ئەو زەمینەیەی بزووتنەوەی کورد، بەتایبەتیش بزووتنەوەیPKK، خوازیاربوو پشتی پێ ببەستێت زەمینەیەک بوو کە بوونی کوردان لە راستینەی خۆی دوورخرابوویەوە، تەنانەت لە ئاستی بیرکردنەوەشدا بوێری بەدەستهێنانی هوشیاری نەبوو، رەوشێک بوو کاتێک مرۆڤی کورد هەوڵی بەرخودانی دەدا هەزاران جار پەشیمان دەکرایەوە، یان هیچ نەببوو بە خاوەن بانگەشەی نیشتیمان، نەتەوایەتی و راستینەی کۆمەڵایەتی خۆی یاخود لە مێژ بوو دەستبەرداری ببوو. بەمجۆرە باشتر روون دەبێتەوە لە زەمینەیەکی بەمجۆرەدا لەمیانەی ئایدیۆلۆژیایەکی بوون و ئازادیەوە بوون بە بزووتنەوەی بەرخودان ـ ئازادی چەندە سەختە.

لە ساڵانی ٢٠٠٠کانەوە گۆڕانکارییەک لەسیستەمی هەژموونگەرایی تورکی سپیەوە لە ئارادایە. هەرچەندە پاشخانەکەی بۆ ١٩٧٠کان بگەڕێتەوە، بەڵام گواستنەوەی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی لەو ساڵانە دەستی پێکردووە. ئەو گۆڕانکارییە کە گرێدراوی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی جیهانە، گوزارشت لە رەنگدانەوەی تیۆری "پشتێنەی سەوز"ی ئەمریکا

دەکات لە کۆماری تورکیا. گۆڕانکاری لەناوەڕۆکدا نییە بەڵکو لە شێوەدایە. سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری، بەتایبەتیش ئەو سیستەمە هەژموونگەراییەی ئەو دوو سەدەیەی دوایی لەژێر ڕێبەرایەتی ئینگلتەرا و ئەمریکا بونیادنراوە، سەرقاڵی ئەو کێشانەن کە لە حاڵەتی پاراستن، پەرەپێدان و گۆڕانی سیستەمدا دووچاری تێکشکان و لەدەست چوون نەبێت، هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگەچارەی ئەو کێشانە دەدرێت. لەسەردەمی یەکەمین جەنگی جیهانیدا، تەنانەت لەڕێگای هیتلەرەوە ئەڵمانیەکان تا دووەمین جەنگی جیهانیش بانگەشەی هەژموونگەراییان سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوین هەبوو. هەڵکشانی یەکێتی سۆڤێت دوای یەکەمین جەنگی جیهانی و دوای دووەمین جەنگی جیهانیش هەنگاونانی بۆ کێبڕکێ کردن لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین ڕێگای لەبەردەم "شەڕی سارد" کردەوە. "پشتێنەی سەوز" لە بنەڕەتدا بە ئامانجی شکاندنی هەژموونگەرایی رووسیای سۆڤێتی بوو سەبارەت بە ناوچەکە. لە ئاکامی تێکشکانی رووسیای سۆڤێتی لە ئەفغانستان لە راستیدا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو. هەرچەندە شۆڕشی ئێران سەبارەت بە تیۆری "پشتێنەی سەوز" پشێویەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا، بەڵام لە ناوەڕۆکدا ئەمەی نەگۆڕی. لە بنەڕەتدا ئاراستەکەی بەلایەنی شکاندنی وەرچەرخانی دیموکراسیانەی گەلانی ناوچەکە بەردەوام بوو.

سەنتێزی تورک ـ ئیسلام کە لە ڕێگای کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول لە کۆماری تورکیا بوو بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی لە بنەڕەتدا هەنگاوێکی زادەی ئەمریکا و ئینگلتەرا بوو. شۆڕشی ئێران و داگیرکردنی ئەفعانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە (١٩٧٩ ـ ١٩٨٠)، سیستەمی هەژموونگەرایی بەرێبەرایەتی ئەمریکا و ئینگلتەرا لە ڕێگای تورکیاوە ناچاری تەگبیر وەرگرتن بوو. ئەنجام هاوشانی سەرکوتکردنێکی بێبەزەییانەی تێکۆشانی دیموکراسیخوازانەی تورکیا و قووڵکردنەوەی ڕێبازەکانی ژینۆساید لە کوردستان، تورکیا بوو بە جەندرمە متمانەپێکراوەکەی خۆرهەڵاتی ناوین. لەچوارچێوەی ئەو ئامانجەدا رژێمی دەوڵەتی تورکیا تەواو بوو بە گلادیۆ. لە راستیدا ئەوەی روویدا بەکارهێنانێکی هەمەلایەنی سوپای نهێنی ناتۆ، واتە گلادیۆ بوو. لە بنەڕەتدا ئەو شەڕەی ئەمڕۆ لە ئێران و ئەفغانستان لەئارادایە بۆ یەکەمین جار ئەو گلادیۆیە بەڕێوەی دەبات کە لە تورکیا خراوەتەگەڕ و دەستبەکارە. دوالوتکەی ناتۆ (لوتکەی لیزبۆن لە کۆتاییەکانی ٢٠١٠) ئامادەکاری دەکات تا ئەو پیلانەی شەڕ وەک ستراتیژی نوێی ناتۆ راگەیەنێت.

فاشیزمی تورکی سپی سوودی لەو توانایانە بینی کە گلادیۆ پێشکەشی کردبوون و لە ساڵی ١٩٨٥دا هەوڵیدا بە تەواوی کوردان لە مێژوودا بسڕێتەوە. لەو بارەیەوە ناکۆکیەک لە نێوانیاندا دەرکەوت. هەروەکو ناکۆکی موسڵ ـ کەرکوکی ١٩٢٣، کاتێک فاشیزمی تورکی سپی هەوڵیدا کوردستانی ئێراقیش بخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، دیسان وەک سەردەمی سەرهەڵدانیەوە هاوپەیمانی ستراتیژیەکەی ئینگلتەرا و ئەمریکای لە بەرامبەر خۆی دۆزیەوە. دیسان ناکۆکییە کۆنەکان زیندوو بوونەوە. لە رووالەتدا فاشیزم ئامانجی لەناوبردنی PKK بوو، بەڵام بەشێوەیەکی بابەتی تەواوی کوردان دەکران بە ئامانجی

پێکان. لەو سۆنگەیەوە؛ ناکۆکی لەگەڵ هێزە پەیوەندیدارەکان زیادی کرد. ڕژێمەکانی ئێران، ئێراق و سوریاش هاتنە ناو پرۆسەکەوە. هەروەها ئەوەش تێگەیشتبوون وەک کارەکتەرەکانی بزووتنەوەی بەرخودانی ١٩٢٥ ـ ١٩٤٠بە ئاسانی لەناو ناچێت. ئەو دۆخەش مانای شلەژان و هەرەسهێنانی هەژموونگەرایی هەشتا ساڵەی (١٩٢٥ ــ ٢٠٠٢) فاشیزمی تورکی سپی بوو. بۆرژوازی بیروکراتی فاشیزمی تورکی سپی کە لەلایەنی کۆمەڵایەتیەوە لە تەواوی رکابەرە ناوخۆییەکانی رزگاری ببوو (بۆ یەکەمین جار بوو زەبری لە شەریکە زایۆنیستەکانیان وەشاندبوو و بەشێکی گرنگیشیان پەراوێز کردبوون) هەژموونگەرایی خۆی ئاواکردبوو (گلادیۆی تورک لە شەڕکردن لەگەڵ PKK دا سەرجەم کەناڵەکانی سیستەمی کۆنترۆڵ کردبوو) بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو هەژموونگەرایی ئەمریکا ــ ئینگلتەرا بەربەستی کرد. لە راستیدا ئەمریکا، ئینگلتەرا و هاوپەیمانە رۆژئاواییەکانی دیکەیان رەزامەندی تەواویان نیشاندابوو سەبارەت بە بەخشینی دەسەڵاتی بێ سنوور بە رژێمی گلادیۆی تورک (بەتایبەتیش قۆناغی دۆغان گورێش، تانسۆ چیلەر، سلێمان دیمرال، ئەردال ئینۆنو و محەمەد ئاغار). ناکۆکیەکە سەرچاوەی خۆی لە بوونیPKK لە باشووری کوردستان(کوردستانی ئێراق)ەوە وەردەگرت. بەو ئامانجەشەوە تا کۆتاییەکانی قۆناغی (١٩٨٤ ـ ١٩٩٩) بەیەکەوە بڕیاریان لەسەر گشت کار و کردەوەکانی کۆنتر گەریلا دا و جێبەجێیان کردن. هێزە بەکرێگیراوەکانی باشووریش پشتگیری تەواوی ئەو هەنگاوانەیان کرد. بەڵام فاشیزمی تورکی سپی خوازیاری زیاتر بوو، پیلانی بۆ لەناوبردنی تەواوی کوردان دادەنا. سیستەمی رۆژئاوا لەو خاڵەدا وەستا. رژێمی فاشیستی سپی تەوەرەی ئەنقەرەش کاتێک خۆی تەنیا بینیەوە سەرسام بوو. ئەگەر زیاتر هەنگاو بنێت لەوانەیە وەک رژێمی هیتلەر رووبەڕووی دادگا بووبایەوە. لە کاتێکدا ئەو ناکۆکیە قووڵدەبوویەوە، ئۆپەراسیۆنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی لە ئەفغانستان و ئێراق دەستبەکار بوو. لەو رەوشەدا پەیوەندییە ستراتیژییەکانی گلادیۆی تورک لەگەڵ رژێمی سەددام حوسێن و دەزگای هەواڵگری سەربازی پاکستان ئاشکرا بوو. بەشێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو گلادیۆی ناتۆ و گلادیۆی تورک (لەو قۆناغەدا لەژێرناوی ئەرگەنەکۆن تەواو ببوو بە میلیگەرا و خۆجێیی) رووبەڕووی یەکتر بوونەوە. بوویەری "کیس لەسەرکردن" کە لە سلێمانی روویدا هێمایەکی سیمبۆلی ئەو شەڕەبوو. لە دەرەنجامی ئەو گۆڕانکارییەی ئەمریکا و ئینگلتەرا ئاگاداری بوون، پشتگیری خۆیان بۆ بۆرژوازی تورکی سپی کێشایەوە و وەک پێویستیەکی تیۆری (پشتێنەی سەوز) یەک لەدوای یەک ئۆپەراسیۆنەکانی دەرخستنەپێشی بۆرژوازی تورک ــ کورد لە پێناو کردنیان بە هێزی هەژموونگەرا کەوتەگەڕ کە پێشتر خۆراکیان پێدابوون و ئامادەیان کردبوون. بەهێزترین هێماکانی ئەوەش هاوشانی رووداوی "کیس لەسەرکردن"ی سلێمانی و تەقاندنەوەی سیناگۆکێک و بانقی جیهانگیری ئینگلیزی HSBCلە ئەستەنبوڵ، دووبارە خستنەوەگەڕی تاڵیبان و بەهێزکردنی ئۆپۆزسیۆنی ئێراق بوو. هەرچەندە لە رووخساردا شەڕ لەنێوان ئەمریکا و ئەلقاعیدە ببینرێت، لەناوەڕۆکدا ببوو بە شەڕی گلادیۆی تورک و ئەمریکا.

لــە ئاکامــدا AKP ی ڕێککــەوتنی هەژموونگــەرایی هێــزە بــەکرێگیراوە نوێیــەکانی ڕووخسار مەدەنیەکانی ئەمریکا و هاوپەیمانــە خۆرئاواییــەکانی دەرکەوتــەپێش. گلادیۆی تورک کە تەواو خۆماڵی بووە و بە تــەنیا ماوەتــەوە هــەرچەنــدە چوارچــار لــە بونیــادی سوپادا هــەوڵی کودەتــای داوە بــەڵام ســەرکەوتوو نــەبوو. گردبوونــەوەکانی کۆمــار و ڕێککەوتنی "سێوی سوور"ی نێوان MHPو CHP ڕەنگدانەوەی ئەو پەرچــەکردارە بــوو لــە بوارەکانی سیاسی و کۆمەڵی مەدەنیــدا. ئــەو ڕێککەوتنــەش پشــتگیری چــاوەڕوانکراوی لــە ڕووسیا، چین و ئەڵمانیا بەدەستنەهێنا. هەرچی ئەو پەیوەندییانەن کە لەگــەڵ ســوریا و ئێران ئاوایانکرد جێی متمانە نەبوو، زیاتر بەرەو گۆشەگیری بردن. لەو نێوانــەدا قــەوارە سیاسییە کوردیەکەی ئێراقیش مەودای بڕیبوو. گوایە هەنگاوە سەرکەوتووەکانیAKP لەو هەلومەرجــە بــەدیهات. شــرۆڤەکردنی ئــەو ڕووداوانــە وەک ســەرکەوتنی AKP لــە هەڵبژاردنــەکان و لێزانــی ڕەجــەب تــەیب ئــەردۆغان یارییــەکی پڕوپاگەندەکردنــە. هێــزە ڕاستەقینەکانی شەڕ بە شێوەیەکی نهێنــی و بــەرفراوان جموجۆڵیــان دەکــرد. وەک ســاڵانی ١٩٢٠کان شەڕێکی مەزنی هەژموونگەرایی لەسەر ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا لەئارادا بوو.

ئەوەی سەیرتر بوو پێگەی ســەرمایەی یــەهودی بــوو لــەو شــەڕەی هەژموونگەراییــدا. سەرمایەی یەهودی میللیگــەرایی زایۆنیست هاوپــەیمانی ســەرەکی هەشــتا ساڵەی شــەڕی هەژموونگەرایی بۆرژوازی تورکی سپی بوو. پرۆسەی ئاواکردنی ئیسرائیل ئەو ڕێککەوتنــە ستراتیژیەی دەکــردە پێویستییەک. هێــزی ئــەمڕۆی ئیســرائیل دەزانرێــت. وەک جــاران پێویســتی بــە بــۆرژوازی تــورکی ســپی نییــە. بــەڵکو پێچەوانەکــەی جێگــای باســە. لــەو سۆنگەیەوە؛ شــلەژانی پەیوەنــدی نێوانیــان چــاوەڕوانکراو بــوو. بــەڵام ئــەو مانایــەی نەدەبەخشی کە لە بونیادی هێــزی هەژموونگــەرایی نــوێ و پێکهاتــەکانی کۆمــاری تورکیــا سەرمایەی یەهودی کاریگەری نابێت. توێژگــەلێکی ئــەو ســەرمایە کەوتنەگــەڕ کــە نزیکی میللیگــەرایی زایۆنیســتی نابێتــەوە، بــەڵکو زیــاتر لــە چوارچێوەیــەکی جیهانگیریــدا دەجووڵێتەوە و بە تایبەتیش لە بواری سەرمایەی فینانسدا بەکاریگــەرە. ئــەو توێژانــە بوون کە تورکیایان لەناو "پارەی گەرم"دا خنکاند. لەبنەڕەتدا ئەو توێژانە بوون کە AKP یان پارەدار (فینانس) کرد. ئەو توێژەی دەتوانین بــە ئایدیۆلۆژیا و ســەرمایەی یــەهودی جیهــانگیری (Evangelism) نــاوی ببــەین، زۆر بەئاســانی لــە جێگــای ئایــدیۆلۆژیا و سەرمایەی زایۆنیستی جێگیرکــران. بێگومــان دیــواری چــین لــەنێوان نوێنــەرانی هــەردوو ئایدیۆلۆژیا و سەرمایە لە ئارادا نییە. بەکورتی؛ ئیتر قۆناغی کۆماری تورکیای ئیسلامی میانڕەو دەستی پێدەکرد کە بۆرژوازی تورکی سەوزی تەوەرەی قۆنیا ـ قەیسەری (یەکەمین نــاوەنــدی ئایــدیۆلۆژی، دووەمــین ســەرمایە) لەگــەڵ هێــزە هەژموونگــەرا نــاوخۆیی و دەرەکیەکاندا بونیادیان ناوە.

کاتێــک تــوێژی کۆمەڵایــەتی بەرپرســی ئایــدیۆلۆژیا و ســەرمایەی هەژموونگــەرایی یەکەمین ساڵانی دامەزراندنی کۆمار تا سەرەتاکانی ٢٠٠٠کان بە تورکی سپی ناو دەبەین کە لەگەڵیدا گەورە و بەهێز بووە، لێرەدا تەنیا مەبەستمان ڕەچەڵــەکی تــورک نییــە. بــەڵکو

پشک و ڕۆڵی ئایدیۆلۆژیا و سەرمایەی هەژموونگەرایی دەرەکی دیاریکەرە و ڕۆڵی پێشەنگایەتی دەبینێت. بەکورتی؛ ئەگەر بەگشتی ئەورووپا بەتایبەتیش سەرمایەی هەژموونگەرایی و هێزی ئایدیۆلۆژی و ڕێککەوتنی دیبلۆماسیانەی ئینگلتەرا ڕەچاو و حیساب نەکەین کۆماری تورکیا مایەی تێگەیشتن نابێت. بانگەشەکردنی تێگەیشتن، بۆ نموونە؛ ئەگەر بڵێن: کۆمار لەمیانەی سەرمایەی میللی سەربەخۆی ڕەها و ئایدیۆلۆژیای میللی خۆماڵی ئاواکراوە، خۆفریودان و مەحکومکردنە بەچەوتی. هەمان شت سەبارەت بە هەژموونگەرایی بۆرژوازی تورکی سەوزیش لە جێگای خۆیدایە کە هەوڵدەدرێت لە جێگای بۆرژوازی تورکی سپی جێگیر بکرێت. چونکە لە ساڵانی دەستپێکی کۆماردا ڕۆحێکی بەهێزی سەربەخۆخوازی زادەی شەڕی ڕزگاری جێگای باس بوو و دەرفەتی بزووتنەوەی ئازاد لەناوەوە زۆر زیاتر بوو. هەروەها هێزە هەژموونگەراکانی سەرمایەداری هێزێکی گەورەیان لە یەکەمین جەنگی جیهانی لەدەستدابوو. تەنانەت ئینگلتەرا لەناوخۆشیدا بەزەحمەتیەوە دەیتوانی لەسەر پێیان ڕابوەستێت. بۆ سەرجەم وڵاتانی ئەورووپا شۆڕش مەترسی هەرە لەپێش بوو. لەوەش گرنگتر بۆرژوازی تورکی سپی، هەم بەکرداری و هەمیش لەرووی بابەتیەوە، یارمەتی لە ڕووسیای سۆڤیەتی وەردەگرت. کەچی سەرمایەی سەوز و ئایدیۆلۆژیاکەی هەلومەرج و دۆخێکی بەمجۆرەی نەبوو. توانای ئێستای لەژێر کۆنترۆڵی توندی سەرمایەی بیروکراتی قۆرخکاری تەوەرەی ئەستەنبۆل و ئەنقەرە دایە. هەرچەندە پشت بە ئایدیۆلۆژیای ئیسلام (ئیسلامی دەسەڵات)و ناوەندەکانی سەرمایەی نێودەوڵەتی بەناو ئیسلامی ببەستێت، بەڵام ئەو توانایانە بۆ دامەزراندنی هەژموونگەرایی سنووردارە. لەو سۆنگەیەوە؛ تارادەیەکی زۆر وابەستەبوونی بە سیستەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداری دەست لێبەرنەدراوە. بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا دەکرێ ئەو دۆخەی وابەستەبوون لە ڕەوشی AKPدا بخوێندرێتەوە، AKP لە دەرەوە لەمیانەی بەستنی پەیوەندییەکی گەرم لەگەڵ سەرمایەی جیهانگیری، لە ناوەوەش لەرێگای بەرۆژەڤکردنی بەردەوامی دیموکراتیزەبوون و بەتایبەتیش بە ڕۆژەڤکردنی چارەسەرکردنی کێشەی کورد، بەڵام لەجیاتی چارەسەرکردن دۆخێک دەنوێنێت گوایە خوازیارە چارەسەری بکات و هەڵوێستی ناچارەسەری ناوەندەکانی هێزی (بەشێکی سوپا، دادوەری، MHPو CHPو ڕێکخراوە چەپرەوە وابەستەکان) بۆ پڕوپاگەندە بەکارهێنا و بەردەوامی بە هەڵکشانی خۆیدا. هەروەک ئاواکردنی هەژموونگەرایی ساڵانی سەرەتای کۆمار لە دامەزراندنی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی نوێدا هێزە دەرەکیەکان هێزی داینەمۆ بوون بەتایبەتیش ئینگلتەرا و ئەمریکا.

لەو چوارچێوەیەدا کۆمەک و یارمەتی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری یەکلاییکەرەوە بوو. لە بواری ئایدیۆلۆژیشدا لەجیاتی میللیگەرایی زایۆنیستی هاوشێوەی دەرهاوێشتەی تورکی سپی، هەڵوێستی ئایینی ئیڤانگالیست، قابالاجی و قارایمچیەکانی یەهودیەتی گەردوونی ڕۆڵی کاریگەری بینی. ئەو هەڵکشانە هەژموونگەراییە نوێیە بەردەوامە کە بە ئیسلامگەرا یاخود تورکی سەوز ناوی دەبەین لە بەکارهێنانی ئەو ستراتیژ و تەکتیکانە

شارەزاتر بووە کە پشتیان پێدەبەستێت. وەک ئامانجیش پێشبینی دەکات لە ١٠٠مین ساڵوەگەڕی کۆماردا بونیادنانی هەژموونگەرایی تەواو بێت.

بەگرنگیەوە تاوتوێکردنی ئەو هەژموونگەرا نوێیە سەبارەت بە کوردان پێویستیەکە. لە کاتێکدا ئەو هەژموونگەراییە لەو بارەیەوە (کێشەی کورد) هێرش دەکاتە سەر سەرمایە و دەسەڵاتی قۆرخکاری و بیروکراتی تورکی سپی (هەردووکیان بەردەوام لەناویەکتردا بوون) کە رۆڵێکی گرنگیان لەقڕکردنی کورداندا بینیوە و لەو بارەیەوە مەودای بڕیوە، لەلایەکی دیکەشەوە رێبازەکانی قۆناغی ئاواکردنی هەژموونگەرایی خۆیشی لەناودا، رێگا و رێبازی بەکاریگەرتر پەیڕەو دەکات و بەشێوەیەک جێبەجێیان دەکات کە لەهی پێشوو خراپترە. لەو کارەیدا لەکاتێکدا هێزی سەرەکی خۆی لە دەزگا ئایدیۆلۆژیی (دامەزراوەکانی لێکۆڵینەوە ستراتیژیەکان و سەرمایەی دەرەکی تینک ـ تانک) وەردەگرێت، بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری سوپاش شارەزایی بەکارهێنانی ئیسلام هەڕاج دەکات. لەجیاتی تێزەکانی فاشیستی تورکی سپی کە رەوابوونی خۆی لەدەستداوە، وەک ئایدیۆلۆژیای بەدەستهێنانی مەشروعیەت "برایەتی ئایینی"و "بەیەکەوەژیانی مێژوویی" (بە شێوازێکی دیماگۆجیانە) بەکاردێنێت. لەمیانەی قۆستنەوەی مایەپووچبوونی میللیگەرایی نەژادپەرستی و نەتەوەپەرستی نکوڵیکارەوە هەوڵدەدات سوپا و هەندێک دامەزراوەی بیروکراسی رازی بکات کە لەرێگای بەکارهێنانی ئیسلامەوە ئەگەر هەمووشی نەبێت دەتوانێت بەشێکی گرنگی کوردان بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە. بەکورتی؛ کاریگەرییە نەریتیەکەی ئایین لەسەر کوردان شوێنێکی گرنگی لە لێکدانەوە هەژموونگەراییەکانی سەرمایەی سەوزدا هەیە. لەو بارەیەوە تەریقەتە باوەکان، کردنەوەی حوجرەکانی قورئان خوێندن، قوتابخانە دواناوەندیەکانی ئیمام و خەتیب و چەندین ئامراز و دەزگای دیکەی ئایدیۆلۆژی بەو ئامانجە خراوەتە گەڕ. هەروەک لە مێژووشدا روویداوە چینی سەرووی تەریقەتەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە تەریقەتی نەقشبەندی و قادری بەردەوام لەسەر دەسەڵات ژیاون و لە قۆناغەکانی دواییشدا بوونەتە کۆمپانیا و هۆڵدینگ، رێبەری تەریقەتەکان وەک قۆزێکی گرنگ بەکارهێنراون. هەندێکیان رۆڵی هێزی زەبروەشێن (باڵەکانی حزبوڵلا)دەبینن. هەژموونگەرایی سەرمایەی سەوز لەمیانەی بەکارهێنانی ئایین وەک ئامرازێکی قۆستنەوە چاوەڕوانی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکی مەزن دەکات.

دووەمین کۆڵەکەی گرنگی قۆستنەوە ئاواکردنی بۆرژوازیەکی کوردی ساختە و دروستکراوە. لەجیاتی بەکرێگیراوێکی دەرەبەگایەتی باو، بەکرێگیراوێتی بۆرژوازی کوردی مۆدێرن ئاوا دەکرێت. قەوارە سیاسیەکەی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)یش بەشێوەیەکی بەرفراوان لەپێناو ئەو ئامانجە بەکاردەهێنرێت. چانسی پێشەنگایەتی وەبەرهێنانی ئابووری لەو بەشە بۆ سەرجەم گروپەکانی سەرمایەی کوردستان رەخسێنراوە. خوازیارن هەمان رۆڵی دوبەی لە عەرەبستان دەیبینێت لە کوردستان هەولێر ئەو رۆڵە ببینێت. وەک کۆڵەکەی دووەم بیر لە سلێمانی و دیاربەکر دەکرێتەوە. لەو چوارچێوەیەشدا پارتی سیاسی و رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی ئاوادەکرێن. وەک بڵێی

ماڵ، گیان و هێزی ئەقڵیان پێشکەش بە دۆزی کوردایەتی کردووە کوردایەتیەکی ساختەش لەو پرۆژەدا بەشێوەی بەربەستێک بەکاردەهێنرێت. سەرمایەی جیهانگیری پشت ئەو قەوارەیە هەروەک تورکیا لەو کارەشدا ڕۆڵی دیاریکەر دەبینێت.

سەرمایەی جیهانگیری و سەرمایەی تورک هەردووکیان پەیوەندی گەرم پێشانی پێکهاتەی بۆرژوازی کورد دەدەن، پێکهاتەیەکی کۆمەڵایەتی ئاوا دەکەن کە پاشکۆ و بووکەڵەی دەستیان بێت. ئامانجی سەرەکییان پارچەکردن و بێکاریگەرکردنی بزووتنەوەی دیموکراسیخوازی و شۆڕشگێڕانەی ئەو هێزە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییانەیە کە لە بواری گیان، ماڵ و فیکر قوربانی مەزنی لەپێناو کوردستان پێشکەش کردووە. لەو بڕوایەدان بەڕادەی سەرکەوتنیان لەو هەنگاوەدا، بە ئەندازەی بەرژەوەندییە نەریتیەکانی خۆیان ئەوا دەتوانن دەرفەتە نوێیەکانی بەدەستهێنانی سەرمایە و داهاتیش بپارێزن و پەرەی پێبدەن. ئەو بەرژەوەندیانەی پێشتر لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لە کوردایەتی بەدەستیان هێنابوو و پارێزگارییان لێدەکرد، ئەوجارە لەسەر بنەمای کوردایەتیەکی ساختە (وەک چۆن هیچ فیداکاریەکیان لە پێناو کوردایەتیدا نەکردووە، ئەوانەی کە ماڵ و گیانیشیان کردۆتە قوربانی بەلایەنگری توندوتیژی تاوانبار دەکەن)وە خوازیارن بەردەوامی پێبدەن و گەورەتری بکەن. لەو بارەیەوە لە بواری مێژووییدا بەکرێگیراوە کوردەکان شارەزان و بەگوێرەی ئاراستەی با شەنە دەکەن. فیدراڵیزمی دەوڵەت و دەوڵەت ـ نەتەوە بچکۆلەکەی تەوەرەی هەولێر کە خراوەتە ڕۆژەڤەوە لە نزیکەوە گرێدراوی سەرمایەی جیهانگیرییە. جۆرێک لە ڤێرسیۆنی کوردی دەوڵەت ـ نەتەوە بچکۆلەکانی عەرەب و تورک ئاوادەکرێت. بەمجۆرە بەرامبەر پرۆژەی کوردستانی خۆسەری دیموکراتییانەی تەوەرەی مۆدێرنیتەی دیموکراتییانە ئەلتەرناتیڤێک پێشکەش دەکرێت.

هەوڵەکانی موتوربەکردن و جێگیرکردنی بۆرژوازی میللی (ألبورجوازیة ألقومیة) لە راستینەی کۆمەڵایەتی کورددا لە دینامیزمی ناوخۆ بێبەشە، دروستکراوە و داسەپاندنێکی دەرەکییە. بەجۆرێکە هەرکاتێک هێزە ژینۆسایدکارەکان فشاریان بۆ بێت، لە ئافراندنی کەرتێکی ساختەی بۆرژوازی و رۆشنبیری کوردی بەکرێگیراو دوودڵی ناکەن. وەک بڵێی بەگوێرەی هەلودەرفەتی لەئارادایە هەوڵدەدرێت لە ڕێگای ئەو چینە بۆرژوا و رۆشنبیرە ساختەیە لە بەرامبەر بەرژەوەندیپەرستیدا درێژە بە فرقەکانی حەمیدیە و جاشایەتی بدەن. بەجۆرێک لە جۆرەکان تەواوکردنی "گوندپارێزی"(جاشایەتی) و تەسلیمکاری لەمیانەی بواری رۆشنبیری، سیاسی و کۆمەڵایەتی مۆدێرندا جێگای باسە. رادەیەکی زۆری دۆخی شکاوی دینامیزمی ناوخۆی راستینەی کۆمەڵایەتی کورد بوێری بەو فاکتەرە ساختە و دروستکراوانە دەدات. ئەو رەوشە پێویستی بە هەڵوێستێکی هەستیار و شارەزایانە هەیە تا دەمامکەکانیان داماڵێت و رووی راستەقینەیان ئاشکرا بکات.

حیسابەکانی هەژموونگەرایی نوێ تەنیا بە خستنە جووڵەی فاکتەرە نوێیە ساختە و ئیسلامییە باو و نەریتیەکان سنوردار نییە. ئەو هەژموونگەراییە سەرجەم ئەو رێ و رێبازانەی دیکە پەیڕەو دەکات کە فاشیزمی تورکی سپی بەکاریهێناوە. هەژموونگەرایی

ئـابوری، کۆمەڵایـەتی، سیاسـی و کلتـووری لەمیانـەی ئـەو کـردەوە هەمەچەشـنانەوە درێژەیان پێدەدرێت کە بە ئاستی ژینۆساید و ئاسیمیلاسیۆن دەگەن. بـەڵام بـە مافـەکانی مرۆڤ و مافی تاکی کورد جیلوە کراوە (پێویستە تـەواو دەرک بـەوە بکرێت کـە تـا مافـە جڤاتییەکان بەدینەیەت، ئـەوا مافـە تاکەکەسیەکان بەدینایـەت، ئەگـەر بێتـەدیش، هـیچ واتایـەکی نییـە). واتـا دان نانرێت بـە وڵات و نەتـەوە و ناسنامە کۆمەڵایەتییەکـەیـان و گوتەکانی "یەک زمان، یەک وڵات، یەک نەتەوە، یەک کۆمـەڵگا، یـەک ئـاڵا" وەک خـۆی درێژەی پێدەدرێت. وەک چۆن کوردان خاوەن هیچ پێگەیـەکی دەستووری و یاسـایی نـین، بگـرە داواکردنـی شـتێکی لـەو جـۆرەش بـەتاوان دادەنرێـت. تەنانـەت ئەگـەر لـە ئاسـتی گـوزارەکردنیش ئامـاژە بـە مـافی پـەروەردە و تەندروسـتی، مـافی خۆپێناسـەکردن بـە ناسنامەی کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی خۆت بکەیت ئـەوا بابـەتێکی تاوانبارکردنـە. هەڵبەتـە مافە سیاسیەکان هەرگیز جێگای باس نابێت. هەژموونگەرایی نوێ تەنیا بە درێژەدان بـەو بـەیرەوە وشکانەی مـاف زەوتکـردن ناوەسـتێت؛ لـە رێگـای سـوپا سـەربازی، سیاسـی، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کلتووری، سایکۆلۆژی و دیپلۆماسیەکانی ژمارەیـان بـە ملیۆنـان گەیشـتووە بـوونی کـوردان و ئیـرادەی ژیـانی ئازادیـانی خسـتۆتە ژێـر ئابلۆقـەی حـەوت شوراوە، سەرجەم تواناکـانی دەوڵـەت و دەوڵەتـە هاوپەیمانـەکانی سـەفەربەر کـردووە و تەسفیەکردنی بە ئەرکی سەرەکی خۆی داناوە. ئەو ئاسیمیلاسیۆن و قڕکردنانـەی نـەریتی ئیتحـاد و تـەرەقی CHP بـەدرێژایی سـەدەی بیسـتەم دژی دیموکراسـی، سۆسـیالیزم و پێکهاتە کلتوورییـەکان بـەڕێوەیبرد، لـە سـەدەی بیست و یەکـەم لـە رێگـای AKPوە لـە میانەی جیلوەی جیاوازەوە هەوڵی تەواوکردنی دەدرێت.

لە بەرامبەر ئەو فاکتەرە وشک و نامۆبووەی لەگەڵ ریشەی مێژوویی رەهەندی چینـی سەرووی پێکهاتـە کۆمەڵایەتییـە هاوچەرخـەکانی راستینەی کۆمـەڵگای کـورد گونجـاون، گۆڕانکارییـە هاوچەرخـەکانی رەهەنـدی چینـی ژێـرەوەش بـە نـەرێنی کاریگـەر بـوون. پێکنـەهاتنی ئـەو چینـە مۆدێرنانـەی پێویسـت بـوو نوێنەرایـەتی کلتـووری نەتـەوەیی و کۆمەڵایەتی بکەن؛ ئەوانەی کـە ئـاواش بـوون بـەهۆی نـامۆبوون و بوونیـان بـە پاشکۆی واقیعی نەتەوە دەسەڵاتدارەکان، وەک ئەو پەندەی دەڵێت ماسی لەسەریەوە بۆگەن دەبێت: رێگای وێرانکاریەکی مەزنیان لەسەر چینەکانی کرمـانج و کارکـەر کردەوە. راستینەیەکی کۆمەڵایەتی پڕ لە زام و پووکانەوەیە. ئەو راستینەیە چەندە نـوێ و هاوچـەرخیش بێـت، ئـەوا بـرین و پووکانـەوەش بـەو رادەیـە قـووڵ و بەرفراوانـە. نـەک هـەر تـەنیا بـواری کۆمەڵایەتی و چینایەتی بۆخۆی نائافرێنێت، تەنانەت لەخۆیشیەوە نابێت بـە راسـتینەی کۆمەڵایەتی و چـین؛ ئـەو هێـز و هەوڵـەی نییـە کـە بـۆ ئـەو دۆخـە پێویستە. ئـاواکردنی کلتوورێکی کۆمەڵایەتی و چینێکی نوێ لەولاوە بمێنێت، تەنانەت لە نەریتیەکەش بێبەشە. راسـتینەی کۆمەڵایـەتی کـورد تـەنیا لـە ئاسـتێکی مارژینـاڵ و بێکاریگـەر لـە چینـەکانی خـوارەوەدا جێگـای باسـە. لـە هێـزی خـۆ تواندنـەوە لـەناو هێـزی کۆمـەڵگا و نەتـەوە دەسـەڵاتدارەکان بێبەشـە، لـە دۆخـی جەسـتەی کۆمەڵایـەتی و ئۆرگانـەکانی جەسـتەدان.

چونکە توانەوە لەناو کلتووره باڵادەستەکانیش پێویستی بە لێهاتوویی و هێز هەیە. کاتێک ئەوانە روونەدەن، ئەوەی دەمێنێتەوە فاکتەرەکانی کوردایەتی مارژینالە؛ کوردایەتی خێڵایەتی، ئایینی و کرمانجی مارژینالی دەرباز ناکات و بەدۆخی چین و توێژی کۆمەڵایەتی مۆدێرن ناگات.

تەواوی ئەو رەوشانە تەنیا ئەنجامی ئەو چەوسانەوە و فشارانەی واقیعی کۆمەڵگا و نەتەوە دەسەڵاتدارەکانی گرێدراو بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نییە کە بەدرێژی تاوتوێمان کرد. ئەو فشار و چەوساندنەوە پەیوەستی سیاسەتەکانی ژینۆسایدی کلتوورییە کە ئامانجی دوورخستنەوەی کوردانە لە راستییە نەتەوەییەکەیان، نیشتیمان، کۆمەڵگا، ئابووری و راستییە کلتوورییەکەیان. راستینەی کۆمەڵایەتی کورد رووبەڕووی کردەوەگەلێکی لەناوبردنە کە زۆر دەگمەن لە دونیادا دەبینرێت. تا سروشتی سەرجەم ئەو کردەوانە شیکار نەکرێت دەرک بە دیاردەی کورد ناکرێت؛ ئەگەر دەرکیشی پێبکرێت هەڵەی مەترسیدار لەخۆوە دەگرێت. ئەنجام "کوردێتی"یەکە لەخۆی دەترسێت و رادەکات، نکوڵی لەخۆی دەکات، لەو بڕوایە دایە چەندە نکوڵی لەخۆی بکات وەک مرۆڤێکی مۆدێرن دەبێتە خاوەن ناسنامە؛ خافڵ، ساختەکار، نەزان، خۆبەزانازان، خۆبەزلزان، بێئاگا لە ماف و یاسا، ناسیاسی، نائاسایی و لەناوچووە. دەشێت ئەوە بە کوردێتی مارژینالیش ناوببرێت. لەوانەیە بەهۆی نەمانی شێوەیەک کە نۆرمی بەدەستهێناوە دیاردەیەک جێگای باس بێت کە پێناسە نەکراوە. یەهودیەکان ئەدەبیاتێکیان سەبارەت بە ژینۆسایدی خۆیان هەیە کە لە ئاستی دونیادا پەسەندکراوە، نەهامەتیەکانیان بووە بە رۆژەڤی چەندین فیلم، رۆمان، بەرهەمی زانستی، مۆسیقا و تابلۆ، بەڵام سەبارەت بە کارەسات و نەهامەتیەکانی کوردان رەوشێکی پێچەوانە جێگای باسە. هیچ کارێکی ئەدەبی، سینەمایی یاخود لێکۆڵینەوەیەکی زانستی سەبارەت بە ناسۆری و بەسەرهاتەکانیان ئەنجام نەدراوە. تەنیا لە بواری مۆسیقادا جۆرێک لە چیرۆکی نەریتی جێگای باسە. ئەویش لەناودەچێت، لەناو دەبرێت.

کاتێک بوێری تاوتوێکردنی واقیعی کوردم پیشاندا، بەردەوام کاریگەری بێزارکەری ئەو حەقیقەتانەم بەرگوێ دەکەوت. هەوڵمدا لە ڕێگای زانستەوە گوزارشت لە گونجاوترین ڕێبازی روونکردنەوەی بکەم. تەنیا روونکردنەوە بەس نەبوو، ویستم سیاسەتەکەی ئەنجام بدەم. ئەویش بەس نەبوو، تێکۆشان و جەنگەکەیم بەڕێوەبرد، ئەویش بەس نەبوو، هەنگاوم بۆ ئاشتی هاوێشت. چەندە هەوڵ دەدەم ئەویش جێگیر نەبوو. تەواوی ئەمانەش دەیسەلماند کە دۆخی هاوچەرخی و راستینەی کۆمەڵایەتی کورد لە رەوشێکی چەندە مەترسیدار دایە. ئاگادارم کە لەمیانەی ئەو دێرانەوە بە زەحمەتیەوە ئاماژەکردن بە راستیەکان سەرکەوتنێکە ناشێت بچووک بکرێتەوە. کاتێک بیر لەو دۆخانە دەکەمەوە و سەبارەت بە دۆست و هەڤاڵانی دەرەوە خەمگینم، رق و نەفرەتم بەرامبەر شمشێری بێرووو یان دووڕووەکانی راستینە دەپارێزم.

**٤ . ڕەهەندی ئابووری لە راستینەی کورددا**

هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی کۆمەڵگا لەمیانەی جیاکردنەوەی سروشتی کۆمەڵگا بۆ ڕەهەند یاخود بواری جیاوازەوە بەرهەمێکی چەمکی زانستی مۆدێرنیتەیە. ئەو ڕێبازە گرێدراوی هەڵکشانی سەرمایەدارییە بەشێوەی سیستەمێکی هەژموونگەرایی. کاریگەری و چالاکیەکانی سەرمایەداری لەسەر ئابووری ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو لەوەی ئابووری - سیاسی ببێتە بواری هەرە بەرچاوی زانستی کۆمەڵایەتی. چالاکی سەرمایەداری کە لە رووکەشدا خۆی وەک بوارێکی سەربەخۆ و جیاواز لە سیاسەت و دەسەڵات پیشاندەدات، لە ناوەڕۆکدا گوزارشتی چڕکراوەی سیاسەت و دەسەڵاتە، لەو سۆنگەوە؛ گوزارشتی چڕکراوەی توندوتیژییە؛ گوزارشتی زەبر و توندوتیژییە، گوزارشتی ئەو دیاردەیە کە حوکم بەسەر کۆمەڵگا دەکات و بەزۆرترین قازانج ناوی دەبەن و لەپارە (دراو)دا بەرجەستە بووە. کاریگەری نامۆکەرانەی سەرمایەداری لەسەر کۆمەڵگا لەکاتی بەسیستەمبوونی دەگاتە بەرزترین ئاست، ئەوەش لە نزیکەوە گرێدراوی پەیوەندی نێوان پارە و توندوتیژییە. پارە پاڵوتەترین شێوەی توندوتیژییە، ناوەڕۆکە دڵۆپێنراوەکەیەتی. هەرچەندە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا وەک دژە دەوڵەت و دەسەڵات پێشکەش بکرێت، بەڵام فاکتەری بناغەی دەوڵەت و دەسەڵاتە. سەرمایەداری تەنیا سیستەمێکی پشتبەستوو بە زەوتکردنی زێدە ـ بەرهەم نییە، بەڵکو ناوەڕۆکی بناغەی سەرجەم سیستەمەکانی زەوتکردن، تالان و بونیادەکانی دەسەڵاتە. تەنیا وەسفکردنی لەمیانەی ئیندوستریالیزم، زۆرترین قازانج، بەرهەمی هاوچەرخ و بازاڕ ڕێگا لەپێش خەڵەتان و بەهەڵەداچوونی گەورە دەکاتەوە. بەڵکو ناوی سیستەمێکە پێشکەوتووترین شێوەکانی ڕێبازی چەوسانەوە و سەرکوتکردن بەکاردێنێت، لەرێگای هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژییەوە خۆی ڕەوا و دەمامکداوە، لەمیانەی شێوەیەکی دەسەڵاتەوە (دەوڵەت ـ نەتەوە) ڕێکخراوە، کە لە بەرزترین ئاستدا توندوتیژی لەناو کۆمەڵگا چاندووە و بە ئیندوستریالیزم دژی ژینگەی سروشتی کەوتۆتە هێرشەوە (هێرشی تەکنۆلۆژی). سیستەمێکە کۆمەڵگای خستۆتە ناو "قەفەسی ئاسنین" و دیلی کردووە. ئایدیۆلۆژیا و پراکتیکێکە کە توندوتیژی بە بەرفراوانترین شێوەکانی ژینۆساید گەیشتووە.

ئەو دۆخەی راستینەی کورد لەئاکامی ڕووبەڕووبوونەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دووچاری هات، بەکاریگەرترین بەڵگەکانی ئەو پێناسانە پێشکەش دەکات. ئەوانەی خوازیارن لە هەژموونگەراترین سیستەمی چاخەکەمان واتە لە سەرمایەداری تێبگەن، کوردستان و راستینەی کورد تاقیگەیەکی بەرکەماڵە. لەهێڵی ئامەد – هەولێر– مەهاباد – قامیشلۆ ئاشنای ڕووی راستەقینەی سەرمایەداری دەبین نەک لە لەندەن و نیویۆرک. لەپێناو تێگەیشتنێکی ڕوونی ئەو دۆخەی وڵاتێک و سەرجەم سروشتی کۆمەڵایەتی گەلەکەی دووچار کردووە، پێناسەکردنی ئەو هێڵانە بە دەوروبەرەکانیانەوە، ئێمە بەرەو

دۆخە رووتەکەی راستی دەبات کە چیتر ناتوانێت خۆی بشارێتەوە و خۆی رەوا بکات. کاتێک ئەوە ئەنجامبدرێت ئەوا لە سەرەنجامدا دەبینین کە چۆن لە پێناو بەرژەوەندی رۆژانەی سەرمایەداری تایبەت و بیروکراتیدا لە رێگای ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆساید، تالآن و بێکاری، هەموو شێوەکانی ستەمکاری و کردەوە لەناوبەرە سنوور نەناسەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا راستینەی کورد لە دۆخی کۆمەڵگابوون دەرخراوە، بە نەتەوە و نیشتیمان دانەنراوە و لە دۆخی مرۆڤبوون دوورخراوەتەوە.

لەو سۆنگەوە؛ دۆخی رەهەندی ئابووری هاوچەرخ لە راستینەی کورددا تەنیا وەک دەرکەوتن لە دۆخی ژیانی ئابووری راڤە ناکرێت، چونکە ئەوە راڤەیەکی بەرتەسک و هەڵخەڵەتێنەر دەبێت. لە رووخساردا دەشێت لە بواری ئابووریدا بێکارییەکی لەسەدا هەشتای دەرباز کردبێت، کشتوکاڵ و ئاژەڵدارییەکی مایەپووچکراو، سەرچاوە دەوڵەمەند و تالآنکراوەکانی ژێرخان و سەرخان وەک هێما سەرەکییەکان پێشکەش بکرێت. ئەوانە راستن، بەڵام نیشانەگەلێکن چەندین کەموکوڕی لەخۆوە دەگرن، بە ناتەواوی گوزارشت لە حەقیقەتی ئەو دیاردە دەکەن کە بە ئابووری ناودەبرێت. لێرەدا ئاشکراکردنی ماهیەتی چەواشەکاری و بێماناکاری ئابووری ـ سیاسی بۆرژوازی ئاسانتر دەبێت. ئەوەش مانای پارچەپارچەکردنی راستییە، واتە لەت لەتکردنی ژیان و پێشکەشکردنێتی بۆ لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوە. رێبازی "بکوژە، لەتوپەتی بکە و لێتوێژینەوەی لەسەر بکە"! رێبازێکە هێندەی خودی سیستەمەکە هۆڤانەیە، رێبازێکە نکوڵی لە ژیان دەکات! کاتێک کۆمەڵگاش جێگای باس بێت لەجیاتی سیستەمێکی یەکپارچە، زیندوو، ئەخلاقی و بەئیرادە، لە دۆخێکدا پێشکەشکردنی جێگای باسە کە دابەشکراوە، بێرۆح کراو، کراوە بە ئۆبژە، لە ئیرادە و ئەخلاق (سیاسەت بەمانا راستەقینەکەی) بێبەشکراوە، لەجیاتی مانا، بێمانایی، بێویژدانی و نابینایی پەرە پێدەدات.

لەرووخساردا وەها مەزەندە دەکرێت کە کاریگەری فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر راستینەی کورد هێندە نییە، بگرە پەیوەندی لەگەڵ رووداوەکان نییە یاخود زۆر سنوورداره. ئەو مەزەندە دووەمین بە هەڵەداچوونی جددییە. ئەگەر فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (یاسای زۆرترین قازانج، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم) نەبووایە، ئەوا راستینەی کورد بە سەرجەم رەهەندەکانیەوە (نیشتیمان، نەتەوە، کۆمەڵایەتی، ئابووری، کلتووری، دیبلۆماسی) لە لێواری نکوڵی و قڕکردندا نەدەبوو. وەک پێویستیەکی ناوەڕۆکی سیستەم لەو بوارەوە لەناوچوونێک لە ئارادایە. ئەو فاکتەرانەی لەژێر ناوی راستینەی کوردەوە ئاوادەکرێن و رۆحیان بەبەردا دەکرێت لەلایەک لە نکوڵیکردنی دیاردەی کورد بەکاردەهێنرێت و لەناو خیانەتێکدا دەژیت کە هاوتاکەی دەگمەنە، لەلایەکی دیکەشەوە هەمان فاکتەر وەک پێویستیەکی بەرژەوەندیەکانیان لە نواندنی کوردایەتیەکی ساختە، ئاواکردنی سیستەم و رێکخستنە دەمامکدراوە تەڵەزگەییەکان دوودڵی ناکەن. لە کاتێکدا لەژێرناوی وەبەرهێنان، ئاواکردنی کارگە، رێگا، بەنداو (قڕکردنی جوگرافیا و کشتوکاڵ)، قوتابخانە (دەزگاکانی ژینۆسایدی

کلتووری) و مزگەوت (بەکارهێنانی ئایین وەک ئامرازێکی پەردەپۆشکردنی لەناوبردن) و لەژێر ناوی بەرگریکردن لە وڵات چوونە خزمەتی سەربازی (بەلانی کەم سەبارەت بە پەسەندکردن ـ رەتکردنەوەی راستینەی کورد هونەری خۆکوشتنە) وەک خزمەتی هاوچەرخ پێشکەشی دەکەن، لەلایەکی دیکەشەوە لەسەرجەم بەرە و لایەنە کۆمەڵایەتیەکانەوە هێرش دەکەنە سەر تێکۆشانی بەرگریکردن لە بوونی خود و بەدەستهێنانی ئازادی، وەک بەشێکی قڕکردنیش پێکەوەنان و ئاواکردنی بەکرێگیراوێتی و ئەو کرمانە پشتگوێ ناخەن کە وەک پەندی کرمی دار لەداره، دارەکە دەکرتێنن. لەبەر ئەو هۆکارەش ئابووری وەک ئامرازێکی لەناوبردن رۆڵ دەبینێت.

کوردە یەکەمینەکان (بنەچەی کوردان) خاوەنی ئەو کلتوورەن کە لە مێژوودا بناغەی ئابووری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری داناوە. بەیەکەوە لەگەڵ کلتووری گەلە دراوسێکانی دیکە بۆ یەکەمجار لە مێژوودا ئابووری بازاڕیان لەسەر بنەمای کانزاگەری، بازرگانی و قاروم (بریکاری) و دەزگاکان (ورشة) ئاواکردووە. کاتێک بەسەدەی نۆزدەهەم گەیشتن، واتە تا ئەو کاتەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەستڕۆیی(نفوذ) لەناوچەکەیاندا پەیداکرد یەکێک لە فاکتەرە پێشەنگەکانی ئابووری جیهان بوون. هەم بەسیفەتی کلتووری دەزگای ماددی، هەم بە سیفەتی مەعنەوی، ئەخلاقی و زهنیەت ئابوورییان فێری مرۆڤایەتی کردبوو. مۆدێرنیتە تۆڵەی خۆی لە ئافرێنەرە راستەقینەکانی ئابووری دەکردەوە. بەر لە هەموو شتێکیش کشتوکاڵ، ئاژەڵداری، سەرچاوەکانی سەرزەمین و ژێرزەمین داگیرکران، تاڵان و وشک کران. زۆربەی زۆری دانیشتوان و چینە زەحمەتکێشەکان کران بە سوپایەکی زەبەلاحی بێکاران. بەکەمترین کرێیەوە ناچاری خڵتەترین کار کران، کراون بە کۆمەڵێک کە هەرزانترین هێزی کار لە جیهان بخاتە بازاڕەوە. جگە لە گروپێکی هێزی زاڵ و زۆرداری چەوسێنەر و سیخوڕە کۆمپرادۆرەکان (گوایە بۆرژوازی خۆجێیین)، تەواوی کۆمەڵگا دووچاری دۆخێکی برسێتی، بێکاری و نەخۆشی هات، بێبەروەرده و بێچارە هێڵرایەوە. بەمانایەکی تر، لەمیانەی ئەو کار و کردەوانەی بەشێوەیەکی نەخشەبۆکێشراو لەلایەن دەسەڵاتەوە دەسەپێنران ناچاری رادەستبوونی تەواویان دەکرد.

لە کوردستانی ئەمڕۆماندا ئابووری تەواو وەک ئامرازێکی زۆرداری و بەسیخوڕکردن بەکاردەهێنرێت. لەرێگای بێکاری و برسیکردنی کۆمەڵگا هەوڵدەدرێت دامالینی سەرجەم سیفەتە کۆمەڵایەتیەکانی بەسەردا بسەپێنرێت. لەسەر بنەمای دەستبەردان لە کوردێتی بەڵێنی نان و کاری پێدەدرێت. پەسەندکردنی سەرجەم بەهاکانی نەتەوەپەرستی حوکمڕان کراوە بەمەرجی سەرەکی بوون بە خەباتکارێکی باشی دەوڵەت یاخود کۆمپانیایەک. سووربوون لەسەر کوردێتی و ناسنامەی کورد رێگا لەپێش ناوزڕاندن و لەدەستدانی دەرفەتەکانی کار دەکاتەوە، دەکرێتە بیانوویەکی هەژاری و برسیکردن. ئەو کۆمپانیا و زانکۆیانەی ئاواکراون وەک ناوەندێکی پووچکردنی کوردێتی دەستبەکارن. بەنداوەکانیش رۆڵی ئەو جانەوەرە دەبینن کە شوێنەوارە مێژووییەکان، ناوچە کشتوکاڵیەکان، گوندەکان و ئیکۆلۆژی قووتدەدات. سەرجەم ئەو دامەزراوە ماددی و مەعنەویانەی دەتوانن

خزمــەت بــە دیــاردەی کــورد بکــەن بێنــاوەرۆک دەکــرێن، دواتــریش داگیردەکــرێن و بــۆ ئامرازگەلێک دەگۆڕدرێن کە تایبەتمەندێتیەکانی کوردان قووتدەدات. لەو پێناوەشدا هەموو جــۆرە ئــامرازێکی تونــدوتیژی و ئــابووری (پــارە، کــار، بــازاڕ، پیشــە) وەک چــەک بــەکاردەهێنرێت. بــوارە ئابوورییــەکان کــە لــە ڕووخســاردا پێویســتە لەگــەڵ سیاســەت و دەسەڵاتدا تێکەڵ بەیەکتر نەبن، بەڵام کراوە بە بوارێک کە بەرادەیەکی زۆر ڕاستینەی کورد دەکرێنــێ و لــەناوی دەبــات. لــەو پێناوەشــدا دوکــانێکی ســادەی تــەڕە فرۆشــیش بــــەکاردەهێنرێت، ڕێگــــای خاوەنــــدارێتی بانــــک، هــــەرەوەزی و کارگــــەکان بــــە ماڵئاوایی(خوداحافیزی) کردن لە ڕاستینەی کوردایەتیدا تێپەڕ دەبێت. پەرەپێدانی ئــامرازە تاکەکەسی و هاوبەشــەکان بــە ئامــانجی زینــدوو هێشتنەوەی ڕاســتینەی کــورد کراوەتــە چوارچێوەی قەدەغەنامەکانەوە، کۆنترۆڵێکی توند خراوەتە سەر ئــەو جــۆرە هەوڵانــەوە. بەهیچ جۆرێک دەرفەت بــە پەرەپێدان و پاراستنی بــازاڕی خــۆجێیی (مەحــەلی) نادرێــت. ئامرازە هــەرە تاڵانکارەکــانی ســەرمایەداری کراوەتــە باڵادەستی ڕەهــای ســەر بازاڕەکــان. بێگومان دەرفەتی کێبڕکێی نێوان کاڵا خۆجێییەکان ـ کە یەکجار کەمن ـ و کاڵا هێنراوەکان نادرێــت، خۆپاراســتن لــە نرخــە قۆخکاریــەکانیش ئەســتەم دەکرێــت. لــە کردەوەکــانی قەرزبەخشــین، خــەرجی و بــاج وەرگرتنیشــدا هــەمان ئامــانج جێگــای باســە، واتــە دوورخستنەوە لە کوردایەتی و تواندنەوە لەناو نەتەوەی دەسەڵاتداردا پەیڕەو دەکرێت.

کاتێــک بۆیــان ڕوون بوویــەوە کــە تێکۆشــانی پاراســتن و ئــازادکردنی بــوون لــەناو نابرێت، بەڵکو لەسەر ئەو بنەمایــە ڕێکخستنی بــەرخودان و بوارەکــانی ژیــانی ئــازاد لــە پەرەسەندن دایە، سەرلەنوێ بواری ئابووری دیزاین دەکەنەوە. لەو دەڤەرانەی پۆتانسیێلی ئابوورییان بەرزە، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەناوەندی شــارە گــەورەکانی کوردســتان، کۆمپانیا و هۆلدینگ لەگەڵ شەریکە بەناو بۆرژوازی کورد ئاوادەکرێت کە پاشکۆیە و بــە تەواوەتی گرێدراوی ناوەندی شارە گەورەکان (مەترۆپۆلەکان)ە. تەنانەت لەو بوارەدا باس لە کارساز و بەڕێوەبەری کوردیش دەکرێت. چەندین بەناو کوردی بــەمجۆرە هــەن کــە لــە کەسانی ناو سۆزانیخانە خراپتر ئامادەن هەر شتێکیان پێشکەش بکــەن و هەنگاوگــەلێکیان بەناوی کوردێتی و کۆمەڵی مەدەنییەوە دەست پێکردووە. ژوور و یەکێتیەکان دادەمــەزرێن. بێگومان کەسانێکی دڵسۆز و پابەند بە ناسنامە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکەی خۆی لــەناو ئــەو بــوار و دەستپێشــخەریانەدا جێگــای باســن. بــەڵام وەک ســەرجەم بوارەکــانی دیکــە دەرئاساکان (ألأستثنائات) یاسا تێکنــادەن، بــە پێچەوانــەوە دەیســەلمێنن. لێرەدا ئــەوەی گرنگــە لەیــەکتر جیاکردنــەوەی ئــەو فاکتــەر و دەستپێشــخەریانەیە کــە ئامانجیــان زەبــر وەشاندن و لەناوبردنی ڕاستینەی کوردە لەگەڵ ئەو فاکتەر و دەستپێشخەریانەی لەســەر بنەمای پاراستن و ژیانداریکردنی ڕاستینەی کوردە. بەگوێرەی ئەو واقیعەی کە تا کۆمەڵگا هەبێت بواری ئابووریش دەژیت، پێویستە ڕێگری لێبکرێت بۆئەوەی زەبر لــە ڕاستیەکانی خــودی کۆمــەڵگا نەوەشــێنێت و لــەناوی نــەبات، لــەجیاتی ئــەوە بکرێــت بــە ئــامرازی پەرەسەندن و ئازادکردنی بوونی کۆمەڵگا.

کردەوەگەلێکی سەرەکی وەرچەرخێنراو ـ ئابووریشی لەناودا ـــ لەسەر کوردستان و راستینەی کۆمەڵگای کورد جێگای باسە کە بەهۆی داگیرکرنی ئێراق (٢٠٠٣) گرنگییە ستراتیژیەکەی بۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری زیادی کردووە. بەتایبەتیش هەوڵی پەرەپێدانی ئابوورییەکی خۆشگوزەرانی دەدرێت کە ناوەندەکەی باشووری کوردستان بێت. هاوشانی قەوارەی سیاسی پێکهاتە ئابوورییەکانیش لێرەدا لەژێر کۆنترۆڵی هێزە هەژموونگەرا جیهانگیری، هەرێمی و خۆجێییەکان پەرەی پێدەدرێت و وەک مۆدێلێک پێشکەش دەکرێت.

ئەمجۆرە گۆڕانکارییانەی لە چەندین ناوچەی جیهانەوە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەخۆیەوە دەبینێت، پێویستە لەژێر دونیابینی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا شیکاربکرێت و ئامرازەکانی رێگەچارەی ئەلتەرناتیڤ پێشبخرێن. زۆر گرنگ و جێگای بایەخە دەرفەت بە چەکی ئیمپریالیستی ـ داگیرکاری نەدرێت بەتایبەتیش رێ و رێبازە ئابوورییەکانی کە وەرچەرخانی دیموکراتییانە بێکاریگەر بکەن. لەو پێناوەشدا پێویستە پەرەپێدانی سێ ئامرازە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە؛ نەتەوەی دیموکرات، پیشەسازی ژینگەپارێز و ئابووری بازاڕی جڤاکی(سۆسیال)ی کە ئامانجی بەکارهێنانە، بەبنەما بگیرێت. پێویستە پیشەسازی ژینگەپارێزی و ئابووری بازاڕی کۆمەڵایەتی ـــ کە لەسەر بنەمای پێداویستییە سەرەکیەکانی مرۆڤە، ئامانجی قازانج نییە و خزمەت بە هاوکاری کۆمەڵگا دەکات ـ وەک سەرەکیترین ئامراز ببینرێن.

### ٥ ـ رەهەندی کلتووری لە واقیعی کورددا

پێویستە لە مانای بەرتەسکدا باسی رەهەندی کلتووری بکرێت. چونکە رەهەندی کلتووری زیاتر پەیوەندی بە رەوشی زهنیەتەوە هەیە. هەروەها لەبەرئەوەی ئامرازی سەرەکی گوزارشتکردنە زمان جێگای گرنگی و بایەخە. زمان یەکێکە لە ئامرازە هەرە کۆنەکانی بەکۆمەڵگابوون؛ هێندەی یەکەمین ئامرازەکانی کۆمەڵگابوون ـــ بەردە داتاشراوەکان ـ رۆڵی بینیوە. بە مانایەکی تر، پەرەسەندنی زمان گرێدراوی پەرەسەندنی ئامرازەکانە و بەردەوام کاریگەری لەسەر یەکتری دەکەن. سیستەمی زمانی هێمایی گرنگترین هۆکاری قەڵەمبازی هۆمۆساپیانسە. لە رێگای ئەو سیستەمەی زمانەوە مرۆڤایەتی هێزی بیرکردنەوەی بەرەوپێشەوە بردووە. ئەوەش دواتر رێگای لەبەردەم پەرەسەندنگەلێکی شۆڕشئاسای یەک لەدوای یەکتر کردۆتەوە. سیستەمی زنجیرە شاخی زاگرۆس ـ تۆڕۆس بەهۆی پێگە جوگرافیەکەیەوە ناوەندی سەرەکی ئەو شۆڕشانە بوو کە جۆری مرۆڤ قەڵەمبازی کۆمەڵایەتی تێدا ئەنجامداوە. پێشتر هۆکارەکانیمان تاوتوێ کردبوو. دایک و باپیرەکانی کوردان گروپی سەرەکی ئەو سیستەمە بوون. کۆنترین گروپە زمانیان پێکهێنا، واتە کلتوور و زمانی ئاریان رۆڵێکی سەرەکی لە شۆڕشی نیولیتیک و پەرەسەندنی پرۆسەی شار ـ شارستانیدا بینیوە. دەشێت سەرجەم ئەو گۆڕانکاری و

پەرەسەندنانە بۆ بیست هەزار ساڵ بەر لە ئێستا درێژ بکرێتەوە. لەو سۆنگەوە؛ دەشێت شوێنپەنجەی پرۆسەکانی نیولیتیک و شارستانی لە دونیای زهنیەتی کورداندا بخوێنرێتەوە. ئەو پەرەسەندنەی دواتر هاتنەئاراوە و بە گروپی زمان و کلتووری هیندۆ ـ ئەوروپی ناودەبرێت ریشەی خۆی لەو رابردووەوە وەردەگرێت. ئەندامانی ئەو گروپە زمان و کلتوورە بەردەوام دوو گروپی جیاوازی کلتووری و زمانییان لە بەرامبەر خۆیان بینیوەتەوە. بەبەراورد لەگەڵ گروپی سەمیتیک (کلتووری ناوچە گەرم و بیابانیەکان) کە لە نزیکەوە پەیوەندییان لەگەڵ بەبنەچە ئەفریقیەکانی باشووری خۆیان هەبووە، هەروەها گروپەکانی ئۆراڵ ـ ئالتای (کلتووری ناوچە سارد و وشکهەڵاتووەکان) سەرچاوەیان لە باکوور لە بنارەکانی سیبیریاوە وەردەگرت. گروپەکانی ناوچەکانی ناوەڕاست ئەوەنتاژکارترین گروپ بوون. ئەوەنتاژ(خاڵی بەهێز)ی هەڵکەوتەی جوگرافی رۆڵێکی دیاریکەری لەپەرەسەندندا بینی. هەر ئەو هۆکارەش وایکرد گروپەکانی ناوچەکانی ناوەڕاست مۆرکی خۆیان لە قەڵەمبازە گەورەکان بدەن. هەربۆیەش رۆڵی سەرەکییان لە پەرەسەندنەکانی کلتووری ماددی و کلتووری مەعنەویدا مایەی تێگەیشتنە.

بەدرێژایی مێژوو کلتووری کورد رۆڵێکی لەپێشی لە پەرەسەندنی کلتووری رووبار یان سەرچاوەی بنەڕەتیدا بینیوە و بەهەمان رادەش بەو کلتوورە کاریگەر بووە. بەڵام بەهۆی ژیانکردنی لە گۆڕەپانی شەڕەکانی مێژووی شارستانی، تەنیا لە میانەی پاشەکشەکردن بۆ ترۆپکی شاخەکان توانیویەتی بەرگری لە بوونی خۆی بکات. بۆ نازناوی کۆنترین گەل قەرزباری ژیانی ئەو شاخانەیە. هەرچی ئەنجامە نەرێنیەکەیەتی: هێندە جێگای بە کلتووری شار نەداوە. بەردەوام لەگەڵ شارستانی شار ناکۆک و رکابەر بووە، شاری وەک درندەیەکی دژ بینیوە کە قووتی دەدات. لەو سۆنگەیەوە؛ کلتووری نەریتی قەبیلە و خێڵ توانیویانە تا رۆژی ئەمڕۆمان بوونی خۆیان بپارێزن. فۆرمی قەبیلە و خێڵ قاڵب و شێوەی سەرەکی کلتووری کوردن. وەک لە سۆسیۆلۆژیادا هاتووە پێویستە کلتووری تیرە وەک کلتوورێکی پشتبەستوو بە پەیوەندی خوێن پێناسە نەکرێت، بەڵکو وەک کلتووری ژیانی ئازاد و شێوازێکی بوون پێناسە بکرێت کە بەرخودانی بەرامبەر شارستانی دەستنیشانی کردووە. بەهێزی کلتووری تیرە و خێڵ لەناو کوردان بۆ ئیرادەی ژیانی ئازاد و دۆخی بەرخودانی دەگەڕێتەوە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی بەردەوام بووە. پەیوەندی خوێن یاخود خزمایەتی لەو رەوشەدا دیاریکەر نییە. لە نەریتی ئایینی سەمیتیک جیاوازتر نەریتی زەردەشتی، لەجیاتی بەکۆیلەکردن لەبواری ژیانی ئازاددا کاریگەر بووە. جیاوازیەکی بنەڕەتی بەمجۆرە لە نێوانیاندا جێگای باسە. لەسەردەمی حوکمڕانی ئیسلامدا لەگەڵ لێدانی نەریتی زەردەشتی، کۆیلایەتیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. هۆکاری سەرەکی دوژمنایەتی ئیسلامی دەسەڵات بۆ نەریتی زەردەشتی بۆ ئەو دیاردە وشکەی کۆیلەکردن و جیاوازی چینایەتی دەگەڕێتەوە کە بنەماکەی پێکدێنێت. ئەو خاڵە زۆر گرنگە کە بەڕادەی تەقلیبوونی کوردان بۆ ئیسلامی دەسەڵات بوونەتە بەندە و کۆیلە. لەمیانەی ئیسلامی دەسەڵاتەوە ئیرادەی ژیانی ئازادی کلتووری کوردان دووچاری

شکاندنێکی مەزن هاتووە. لە بەرامبەریدا ئەو بەرخودانەی لەسەر بنەمایی عەلەویتی و ئێزیدیتی پیشان دراوە پەیوەندی بە نەریتی زەردەشتی کۆنەوە هەبووە، رۆڵێکی سەرەکی لە دەستبەردارنەبوون لە ژیانی ئازاد و کلتوورەکەی هەبووە کە دەرفەتی پێداوە. ئەو مەزهەب و تەریقەتانەی لە ئیسلامی دەسەڵات دووردەکەوتنەوە، بەو رادەیەی دووچاری نەخۆشی دەسەڵات نەدەبوون، رۆڵ و کۆمەکیان بۆ ژیانی کۆمەڵگایەکی ئازاد و ئەخلاقی هەبووە. ئەمانە جۆرێک لە رێکخراوەکانی بەرگری خۆیی چاخی ناوین بوون. لە بنەڕەتدا کلتووری کورد لەو دوو رێگایەوە لە چاخی ناویندا هەم بوونی خۆی پاراستووە، هەمیش لە قووڵاییدا کۆیلایەتی نەژیاوە و دریژەی بە تامەزرۆ و وابەستەبوون بە ئازادی داوە.

وەک چۆن لە بواری کلتووری ماددیدا بینرا؛ سەبارەت بە کلتووری مەعنەویش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەڵوێستێکی ئاسیمیلاسیۆنیست و ژینۆسایدکارانەی پیشان داوە، ئەوەشی لە رێگای میکانیزمەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بۆ لەناوبردن ئەنجامداوە. دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب، تورک، ئێران کە دامەزراوە سیخوڕییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین و رۆڵی هۆبەیەکی دەبینن، سوودیان لە بونیادە باوەکانی دەسەڵات بینی و کلتووری کوردیان ئابلۆقە داوە، لەسەرجەم دەرفەتەکانی پەروەردەی زمانی زگماکی بێبەشیان کردووە، سیستەمە نەریتیەکانی مەدرەسەشیان رووخاندووە و قەدەغەیان کردووە، بەمجۆرەش کلتوور و زمانی کوردانیان مەحکومی تواندنەوە لەناو دامەزراوەکانی کلتوور و زمانە دەسەڵاتدارەکان کردووە. وەک چۆن هەوڵە لاوازەکان (خەباتی زمان و وێژە)ی میللیگەرایی کورد بۆ پاراستنی کلتووری کورد سەرکەوتوو نەبووە، بەڵکو بەرامبەر رەقیبە بەهێزەکانی کاریگەریەکی پێچەوانەی هەبوو. کاتێک کلتووری بەرخودان بەهێز نەبێت هەروەک لە گشت دیاردەکاندا دەبینرێت، ئەوا توانەوە و لەناوچوون دەست لێبەرنەدراو بووە. هەروەها فۆرمەکانی میللیگەرایی بۆرژوازی بەشێوەیەکی گشتی توانا و چوارچێوەی ژیاندن و پەرەپێدانی کلتووری گەلان نین، بە پێچەوانەوە رۆڵی چەواشەکردن و بێناوەرۆککردنی دەبینن. بەهۆی ئاسیمیلاسیۆن و قەدەغەکاریەکانیەوە لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا کە کلتووری نووسراو بە لووتکە گەیشتووە جگە لە هەندێک کار و خەباتی لاواز کلتووری کورد بەرهەمگەلێکی زۆر سنوورداری هەبووە. لەو بەرهەمانەشدا ژیانی ئازاد بە گوزارشتێکی راست نەگەیشتووە، زیاتر ئەرستۆکراسی خێڵ، سیستەمی میرنشینی و دەسەڵاتە ئایینیەکان دەرخراونەتە پێش.

رۆڵی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە پەرەسەندنی کلتووری نەتەوەیی راستینەی کوردا نەرێنییە. بگرە سەبارەت بە پێکهێنانی کلتووری نەتەوەیی بۆرژوازیش نزیکی راستی نەبۆتەوە. کلتووری پەیڕەوکراو کلتووری قڕکردن، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدی دەوڵەت ـ نەتەوەی زاڵ و دەسەڵاتدارە. گوتەی "یەک وڵات، یەک نەتەوە، یەک دەوڵەت، یەک زمان، یەک ئاڵا" کە دروشمێکی فاشیستانەیە و رۆژانە دووبارە دەکرێتەوە گوزارشت لەو راستییە دەکات. فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە خاوەن سیستەمێکە فشار و ئاسیمیلاسیۆنی کلتووری چاخەکانی کۆن و ناوین تێپەڕ دەکات، بەو سیفەتەی سێ

ئەسپسوارەکەی مەحشەر، هەوڵدەدات ساتێک زووتر مەحشەر رووبدات. کلتووری دەوڵەت ـ نەتەوە، ئیندوستریالیزم و زۆرترین قازانج لەپێناو لەناوبردنی کلتوور و نەریتی کوردان ـ کە لە مۆدێرن بوون دوورە ـ لەنەتەوەبووندا لە جێبەجێکردنی سەرجەم ڕێگا و ڕێبازەکانی لەناوبردن دوودڵی ناکات.

چیرۆکی پێکهاتن و نەشونمای بۆرژوازی تورکی سپی بەتەواوی پیلانگێڕییە کە سەرمایەداری بیروکراسی تورک ئافراندوویەتی. هەر لەسەرەتاوە پیلانگێڕی کلتووری باوی ئیمپراتۆریەتی وەک پەیژە و دەمامکێک بەکارهێناوە، بەمجۆرە لە ناوەندە ناوخۆ و دەرەکییەکان کۆمەڵگای بە بارمتە گرتووە. لەو کلتوورەدا کۆمەڵگا بەندکراوە. دەستەبژێرێکی چینایەتی کە کلتوورە کۆمەلایەتیەکەی بە ڕەچەڵەکی خۆیشی دادەنێت (ئەتنیکی تورک و ئیسلامی سوونی) وەک بارمتەیەک بەکاردێنێت، ئاشکرایە کە ڕۆڵێکی زۆر وێرانکارتر بۆ سەر ڕاستینەی کلتووری کوردان دەبینێت. تەواوی مێژووی سەدەی بیستەم پڕ لە نموونەی سەرنجڕاکێشی بەمجۆرەیە. کلتووری ئیتحاد و تەرەقی کە لەسەر بنەمای عەلمانیەت خاوەن بانگەشەی قەڵەمباز بوو ئەو شێوانەی کە بە تایبەتی لە ڕێگای CHP وە زیاتر بوو بە دەسەڵات دوای تەواوکردنی لەناوبردنی کلتووری ئەرمەنی، هێلین و سریانی بە تەواوی هێزەکانیانەوە قورسایی خۆیان خستە سەر تەسفیەکردنی کلتووری کوردان. لە قۆناغی یاخیبوونە پرۆفەقەکراوەکانی ١٩٢٥ ــ ١٩٤٠ دابێت، یان لە بێدەنگیەکەی دواتری مردنی سپی تا دوا ڕادە ڕێگا و ڕێبازەکانی لەناوبردن پەیڕەوکراون. لەگەڵ ئەوەی جێبەجێ ژینۆسایدی جەستەیی ئەنجامدراون، بەڵام ئەوەی بە شێوەیەکی سەرەکی جێبەجێکراوە مۆدێلی ژینۆسایدی کلتووری بووە.

لەو قۆناغەدا کلتووری کوردان بە هەموو فاکتەرە مادی و مەعنەویەکانیەوە دووچاری نکوڵیکردن و قەدەغەکاریەکی ڕەها هات، لە ڕێگای کردەوە سنوور نەناسەکانی ئاسیمیلاسیۆنەوە هەوڵی تەواوکردنی ژینۆسایدی کلتووری دراوە. تەنانەت دەرفەت بەکردنەوەی ئاکە "دایەنگە"یەکیش نەدراوە تا کوردان بوونی کلتووری خۆیان بژێنن. ڕەفتار و کردەوەگەلێک جێگای باسە کە نموونەیەکی دیکەی لە دونیادا نابینرێت. کلتووری کورد بە هەموو لق و فاکتەرەکانیەوە (وێژە، مێژوو، مۆسیقا، وێنە، زانست ... هتد) بە نایاسایی دانراوە. ئەوەش نموونەی دووەمی لەسەر ڕووی زەوی نییە. ئەو فاکتەرانەی کوردایەتی کە پێویستە بڕووخێنرێن و لەناوببرێن تەسفیەکراون، ئەوانەی کە پێویست بوو بەکاربهێنرێن لەگەڵ کلتووری بۆرژوازی دەوڵەت ـ نەتەوە گونجێنراوە و لەمیانەی تواندنەوە بە کلتووری تورکان لە قەڵەمداروە. لەگەڵ قەدەغەکردنی زمانی کوردی سەرجەم ناوە مێژووییەکانی گوند، شار، دەڤەرەکان و نیشتیمان قەدەغەکراوە، لە جیاتی ئەویش ناوە تورکیەکانی "تورکی سپی" جێگیرکراوە، لەو بڕوایە دابوون کە بەمجۆرە ڕاستیەکان بە ئاسانی لەناو دەچن. سەرجەم گوزارشتەکانی کلتووری کوردی وێژە، مۆسیقا، وێنە، مێژوو و زانست خراونەتە ناو هەمان چوارچێوەی قەدەغە نامەکانەوە؛ لەوەش زیاتر ڕۆیشتوون، ئەوانەی لەو بوارەدا کار و خەباتیان کردووە تەنیا بە نایاسایی

ڕانەگەیەنراون، بەڵکو بێکاری و هەژارییان بەسەردا سەپاندوون، بەمجۆرەش ئیفلیج کراون. دەستبەردان لە کلتووری خۆیی وەک مەرجێکی ژیان سەپێنراوە و جێبەجێش کراوە. بەتایبەتیش دوای قۆناغی یاخیبوون و سەرهەڵدانەکان ئابووری، یاسا و سیاسەت وەک چەکە بەکاریگەرەکانی لەناوبردن بەکارهێنراون. ئەوەی وەک پاشماوەیەکی ئەو کردەوە و پەیڕەوانە ماوەتەوە: لەتە کلتوورێکی کوردی ماوەتەوە کە دەستی لەخۆی بەرداوە و نزیکبوونەوە لێی گەورەترین بەڵا دێنێتە سەری مرۆڤ. لاشەیەکە چەندە هەرسی دەکەیت دەتوێتەوە و لەناو دەچێت! هەڵبەتە لاشەیەک لەجۆری پاشماوەی ئەو جەستانەی لاشەخۆرە دەیانخوات! قۆناغێکی مەترسیداری پووکانەوە لەدیاردەی کلتووری کورد ڕوویداوە، ئێستاش بەردەوامە.

نەریتی ئیسلامی دەسەڵاتگەرای بە بۆرژوابوو توانای دەربازکردنی هەڵوێستی تورکێتی سپی پیشاننەداوە. بگرە هەڵوێستێکی دواکەوتووتری نواندووە. وێڕای ڕێبازەکانی مۆدێرنیستی عەلمانیگەرایی نەریتە ئیسلامیەکانیشی دژی بوونی کلتووری کوردان بەکارهێناوە، لەژێر ناوی سەنتێزی تورک ـ ئیسلامەوە میللیگەرایی تۆختر کردۆتەوە و پەیڕەوی کردووە. بەتایبەتیش کاتێک تورکاندنی عەلمانییگەرا کورتی هێناوە، نموونەکانی تورک ـ ئیسلامگەرا خراوەتە کار. سەرجەم ئامرازە ئایینیەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە تەریقەتەکانی نەقشبەندی و قادری، لەو بارەیەوە وەک ئامرازەکانی لەناوبردنی کلتووری بەکارهێنراون. هەرچی سەرۆکایەتی کاروباری ئایینی فەرمییە هەر لە دامەزراندنیەوە، واتە لەسەردەمی کۆمارەوە لە خزمەتی عەلمانیگەراکان بەکارهێنراوە، بەتایبەتیش پەیوەستبوونی کوردان بە کلتووری ئایین قۆستراوەتەوە، قورساییەکی زۆر خراوەتە سەر شێوازی پیلانگێڕانەی بەکارهێنانی ئایین. خەسڵەتە نەریتیەکانی بەرخودانی تەریقەتەکان بێناوەڕۆک کراون و لە پێناو ئامانجی پێچەوانەوە بەکارهێنراون. لەجیاتی میللیگەرایی تورکی سپی کە لە شەڕی دژی کلتووری بەرخودان و ژیانی ئازادانەی PKK کورتی هێنا یاخود لەگەڵ ئەو، وەک پێویستیەکی سیاسەتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دوودڵی لە بەکارهێنانی ئەو ڕێکخراو و پێکهاتانە نەکراوە کە نوێنەرایەتی تورک ـ ئیسلامگەرایی دەکەن (وێڕای ناکۆکبوونی لەگەڵ بنەماکانی کۆماری ئەتاتورکچێتی). کاتێک بوونی کلتووری کوردان جێگای باس بێت، زۆرێک لە پارت و ڕەوتە ئیسلامگەراکان بەجۆرێک لەجۆرەکان کەوتنەخۆیان شێوازی "هێرشی خاچپەرستی" بیان بە پێویستیەکی "یەکێتی و یەکپارچەیی نەتەوەیی" داناوە.

لەو قۆناغەی دواییدا کاتێک تێگەیشتن لەناوبردنی بوونی کلتووری کوردان تەواو نابێت، بەداسەپاندنەکانی هەژموونگەرایی جیهانگیرییەوە سیاسەتە باوەکانی لەناوبردن و ژینۆساید خاوکراوەتەوە، ڕێگا لەپێش ئەو قەوارانە کراوەتەوە کە سەرێکی بە کلتووری دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ساختە دەگات. هۆکار و فاکتەری دیاریکەری ئەوەش کلتووری بەرخودان و ژیانی ئازادی کوردانە. لەمیانەی ئەو کوردێتییە ساختە و بێناوەڕۆکەی بە شێوازێکی پیلانگێڕانە ئافرێنراوە لە بنەڕەتدا ئامانجیان لێدانی کلتووری کۆمەڵگای

نەتەوەیی شۆڕشگێڕی ـ دیموکراتیانـەی کوردانـە. هەوڵـدەدرێت تـا شێوازێکی بۆرژوازی لیبراڵـی کـوردێتی بـە هـەبوو دابنـێن و لـەجیاتی کلتـووری بـەرخودان و ژیـانی ئازادانـە جێگیری بکەن.

لـەو ڕۆژەوە کـە دەرکـەوتوون ئـەو ڕێبـاز و کردەوانـە لەلایـەن هەژموونگـەرایی ئایـدیۆلۆژی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەدارییەوە دژی ئایـدیۆلۆژیا شۆڕشـگێڕییەکان، سۆسـیالیزمی بونیـادنراو و ئـەو کلتوورانـە پـەیڕەکراوە کـە تێکۆشـانی ڕزگارییـان ئەنجامداوە، لەو بوارەشەوە سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. لـەو سێسـەد ساڵەی دوایـی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبراڵدا بەتایبـەتی لەسـەردەمی شۆڕشـەکان ئـەزموونێکی گەورەی بەکارهێنانێکی سەرکەوتووانەی ئـەو ڕۆڵـەی لەمیانـەی ئـامرازە ورد و قەبـەکان بەدەسـت هێنـاوە. ئەزموونـە سۆسیالیسـت، دیموکراسـیخواز و نیشـتیمانیەکانی سـەرکەوتنیان بەدەست هێنـابوو، بـەهۆی خـۆ ڕزگارنـەکردنیان لـە هەژموونگـەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دەستنیشان نەکردنی هێڵی جیاواز لەگەڵیدا، لـە توانـەوە لەناویدا ڕزگاریـان نـەبووە. هەڵبەتـە ئـەوە مانـای لـەناوبردنی یەکجارەکی کلتـووری بـەرخودان و ژیـانی ئـازاد نابەخشێت؛ بـەڵکو بەڵگـەی پێشخستنی شێوەیەکی لە پێشتری فشاری هەژموونگەراییە کە بەدرێژایی مێژووی شارستانی بەردەوام لەئارادا بووە.

ئەو ئایدیۆلۆژیا هەژموونگەرا و کلتـوورە دروسـتکراوانەی بـەدرێژایی مێـژوو بەسـەر کلتـووی بـەرخودان و ژیـانی ئـازادی کوردانـدا سـەپێنراوە لەسـەردەمی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری وێرانکـارترین و ئاسیمیلاسـیۆنترین کـردەوە پـەیڕەوکراوە. ئـەو دۆخـەش گرێدراوی ناوەڕۆکی فاشیستانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. پشت بە ئیندوستریالیزمی بەدەسـتهێنانی زۆرتـرین قـازانج دەبەسـتێت، ئیندوسـتریالیزمیش ناچـارە پشـت بـە سیستەمێکی کۆیلایەتی ببەستێت کە دەوڵەت ـ نەتەوە دەکاتە ناچارییەک. ئەو ژینۆسایدە کلتوورییانەی لە ئاستی دونیادا ڕوودەدەن کردەوەگەلێکن بەردەوام لەپێناو کارابوونی ئەو سیستەمە پەیڕەوی لێدەکرێت. ژینۆسایدی کلتووری کوردان لە سەرووی ئـەو نموونانـەوە دێت کە ئـەو خەسڵەتە ژیانییـەی سیسـتەم ئاشکرا دەکـات. وەک بانگەشـەی بۆ دەکرێت ژینۆساید سەرچاوەی خۆی لە هیچ یەکێک لـە دیـاردە نەتەوەییـەکانی تـورک، عـەرەب، یـەهودیو ... هتـد وەرناگرێـت کـە هەریەکـەیان دیاردەیـەکی کۆمەڵناسـین. ژینۆسـاید دیاردەیەکی پەیوەست بە شێوازی چەوسـانەوەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەدارییە، بـەڵام لـە ڕووخساردا ژینۆسـاید بـەجۆرێک پیشـان دەدرێـت وەک بڵێی دیاردەکە لـە ئاستی نێوان نەتەوە مۆدێرنەکاندا بەدیهاتووە. ئەگـەر کلتوورەکـان تـا ئاسـتی ژینۆسـاید بەگژیـەکتردا نەکرێن، ئەوا مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجی تایبەت بە سەرمایەداری کارا نابێت.

کردەوەی ئـەو ژینۆسـایدەی کـە لەلایـەن دەوڵـەت ـ نەتـەوەی تورکـەوە دژی بـوونی کلتووری کوردان ئەنجامـدراوە، بەشێوەیەکی هاوشێوە و وابەستە، لەلایـەن دەوڵـەت ـ نەتـەوەکانی دیکـەی عـەرەب و ئێـرانیش لەسـەر بەشـەکانی تـر پـەیڕەو دەکرێـت. وەک

پێویستیەکی لۆژیکی سیستەم، دابەشکردن و لەناوبردنی هاوبەشی بەمەرجێکی سەرکەوتن دادەنرێت. ئەو هاوپەیمانێتیەی لەو قۆناغانەی دوایی لەنێوان دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئێران، سوریا و تورکیا دژی کوردان هاتۆتە ئاراوە بناغەیەکی مێژوویی خۆی هەیە. بەڵام کاتێک بەهۆی نەوت و ئاسایشی ئیسرائیل بەرژەوەندی هەژموونگەرایی جیهانگیری و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی هەرێم ناکۆک دەبن، ئەو کردەوانە وەک جاران بە ئاسانی جێبەجێ نابێت. ئەو ناکۆکیانەش جێبەجێ درز لەناو سیستەمدا دروست دەکات. لەو دۆخەشدا جارێکی دیکە چانسی رۆڵیکی مێژوویی بۆ بزووتنەوەی ژیانی ئازاد و بەرخودانی کلتووری کوردان دەرەخسێت؛ دەرفەت بە مۆدێرنیتەی دیموکراتییانە دەدات خۆی وەک بژارێکی بەهێز بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێشکەش بکات کە دواترین هێزی ناوەندی شارستانییە. لەبەر هۆکارگەلێکی تایبەتەوە کلتووری مۆدێرنی کوردان تەنیا لەچوارچێوەی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتییانەوە دەتوانێت خۆی بە سەرکەوتن بگەیەنێت. کاتێک دەڵێین سەرکەوتن، مەبەستمان بوونی هەمیشەیی کلتووری ژیانی ئازادە. فۆرمە سەرەکیەکانی ئەو ژیانە نەتەوەی دیموکرات، پیشەسازی ژینگەپارێز و ئابووری کۆمیناڵە کە شوێن بە بازاڕی کۆمەڵایەتیش دەدات. وەک چۆن کوردستان و راستینەی کوردی هاوچەرخ لە مێژوودا بوونە لانکەی لەدایکبوونی شارستانی، ئەو چانسەشی هەیە کە لانکایەتی بۆ سیستەمی مۆدێرنیتەی دیموکراییانەش بکات تاخۆی بسەلمێنێت. کلتووری دیموکراتیانە نەک تەنیا بۆ کلتووری هاوچەرخی کوردان، بەڵکو وەک چانسێکی مرۆڤایەتی ناوچەکە و جیهان رۆڵ ببینێت، گرنگیەکی مەزنی مێژوویی دەبێت.

**ئەنجام**؛ زەحمەتیەکانی پێناسەکردنی راستینەی کورد سەرچاوەی خۆی لە خودی راستینەکەوە وەردەگرێت. کورد هەر تەنیا راستینەیەکی کۆمەڵایەتی خاوەن کێشەیەکی زۆر قورس نییە، بەڵکو لە بواری پێناسەکردنیشیاندا زەحمەتیەکان زەق دەبێتەوە. هۆکاری سەرەکی گفتوگۆکردنی بوون و نەبوونیان لەمێژوودا بەتایبەتیش لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە سیستەمی سەرکوتکردن و چەوسانەوەی پەیڕەوکراو تایبەتمەندیگەلێک لەخۆوە دەگرێت کە تا ئاستی ژینۆسایدەکان دەچێت. خودی کوردبوون یان کوردێتی تەنیا ئەوە نییە کە بەشێوەیەکی ئازادانە پێکنەهاتووە، لە هەمانکاتدا پارچە پارچە کراوە، لە کۆلۆنیش خراپتر بۆ لاشەی کۆمەڵایەتی دابەشکراوە و هەوڵی لەناوبردنی دراوە. بەڵام دیسانیش بەهیچ جۆرێک لەناو ناچێت. ئەوەی لێرەدا رۆڵی سەرەکی دەبینێت پێکهاتە لەبارەکەی جوگرافیا و پاراستنی تایبەتمەندێتییە کۆمەڵایەتییەکانی تەریقەت و خێلایەتییە بەدرێژایی مێژوو. کاتێک ویستوویەتی بەدۆخی کۆمەڵگایەکی سیاسی، دەسەڵات و دەوڵەتی بگات بە گەمارۆی دژوار و هێرشەکانی لەناوبردنەوە وەڵامدراوەتەوە، دەرفەتی ئاشنابوون بەمجۆرە پەرەسەندنانەی پێنەدراوە. کاتێک دووچاری ئەو دۆخانەش هاتووە ناچاربووە بۆ یەکینە کۆمەڵایەتییە بچووکەکان دابەش بێت و لە شاخەکان بگیرسێتەوە. ئەو یەکینە بچووکانەش کۆمەڵگای قەبیلەکان

دەرباز ناکات کە لەسەردەمی نیو لیتیکەوە پێکهاتوون. دابەشبوونی بۆ یەکینە بچووکەکان پەیوەندی بە دواکەوتوویی کۆمەڵایەتییەوە نییە، پەیوەستە بەهێزەکانی شارستانی دەوروبەری(شار، چین و دەوڵەت) و پاشکۆ ناوخۆییەکانیەوە. ڕاستینەی قەبیلەگەرایی و خێڵایەتی کوردان، هەروەها سووربوون لەسەر ئەو ڕاستینەیە؛ سەرچاوەی خۆی لە دینامیزمی ناوخۆی وەرناگرێت. پێگەی ستراتیژی جوگرافیای کورد ڕۆڵێکی دیاریکەری لە پێکهاتن و بەردەوامبوونی سیستەمی شارستانی ناوەندیدا هەیە. پێگە جوگرافیەکەی و قۆناغی پێکدادان لەگەڵ شارستانی، بەسەر ڕاستینەی کۆمەڵگای کوردان دادەسەپێنێت بەشێوەی جڤاتە شاخاویەکانی خێڵ و قەبیلە بوونی خۆیان بپارێزن و درێژەی پێبدەن. هەمان خاڵ بۆ ڕاستینە کۆمەڵایەتیەکانی عەرەب و تورکیش لەجێگای خۆیدایە. بیابانەکانی نیمچە دورگەی عەرەب و ئاسیای ناوین و سیستەمەکانی شارستانی دەوروبەریان، بەدرێژایی مێژوو عەرەب و تورکەکانی ناچار کردووە هەڵگری تایبەتمەندێتی قەبیلەگەریتی و خێڵایەتی بن.

قۆناغی شار و جیابوونەوەی چینایەتی ڕاستینەی کورد ڕێگای لەپێش وەرچەرخانی کۆمەڵایەتی گرنگ کردۆتەوە. لەو قۆناغەی وەرچەرخان کە بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆژیای ئایینی و دامەزراوەکانی ڕەنگیداوەتەوە، کوردان ئاشنای ئەو شێوانەی کۆمەڵگا بوون کە کۆمەڵگای قەبیلە و خێڵ دەرباز دەکەن. ئایدیۆلۆژیای ئایینی ڕێگای لەپێش دوو جۆر کاریگەری کردەوە، لە کاتێکدا چینی سەرووی قەبیلە و خێڵەکانی ناچاری دەوڵەتبوون کرد، چینەکانی خوارەوەشی کردووە بە جڤاتەکانی تەریقەت. بەدۆخە سافەکەیانەوە دەشێت تەریقەتەکان بەجۆرێک لە جۆرەکانی جڤاتەکانی بەرگری خۆیی بەرامبەر پلەداری ئایینی ــ بەدەوڵەت بوو، بەدەسەڵات بوو ــ پێناسە بکرێت. دەشێت ئەو دوالیزمە بەشێوەیەکی خەست لە نەریتی زەردەشتی چاخی کۆن و نەریتی ئیسلامی چاخی ناویندا ببینین کە لە جڤاتەکانی بنەچەی کورد لە ئارادابوون. سەبارەت بە کوردان زەردەشتی نموونەیەکی بژاردەی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقییە کە لە مێژوودا گوزارشت کراوە. لە کۆنفیدراسیۆنی میدیا و بەردەوامیەکەی، واتە ئیمپراتۆریەتی پارس، ئەو دوالیزمە بەشێوەیەکی بەهێز لەئارادا بووە. ئەوە سەلمێنراوە کە لە گۆڕانکاری دەسەڵاتی نێوان مادەکان و پارسەکاندا موغەکان زۆر کاریگەربوون و تێکۆشانێکی مەزنیان کردووە. لە ئیسلامی چاخی ناوینیشدا ئەو جۆرە دوالیزم و تێکۆشانانە دۆخێکی ئاشکرا و دیارتر بەخۆیانەوە دەبینن. لەسەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلامەوە دوالیزمێکی لەجۆری ئیسلامی دەوڵەت و ئیسلامی قەبیلە هاتۆتەئاراوە یاخود لەبەرامبەر دەوڵەتبوونی چینی دەسەڵاتداری قەبیلە یاخیبوونی چینەکانی خواروو بەشێوەی چەندین شەڕ و پێکدادانی تەریقەت و مەزهەبی بێ ژمار ڕەنگیداوەتەوە.

ئەو قۆناغەی تێکۆشان و پێکدادان کە لەسەرجەم جڤاتە ئیسلامیەکاندا دەبینرێت لە ڕاستینەی کۆمەڵگای کوردیشدا بەشێوەیەکی بەردەوام لەئارادا بووە. لەکاتێکدا لای کوردە یەکەمینەکانی چاخی کۆن کۆمەڵگای قەبیلە و خێڵ سەرەکیبوون، لەسەردەمی شارستانی

ئیسلامی چاخی ناوین هەم وەک ناو هەمیش لە بواری دیاردەییدا کوردێتی دەتوانێت باشتر خۆی پێناسە بکات. بەڵام هەمان قۆناغ دابەشبوونێکی قووڵیشی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. لە کاتێکدا تا ئاستێکی گرنگ کوردێتی خەسڵەتە خێڵەکی و قەبیلەگەرێتیەکەی خۆی پاراستووە، بەشێوەی کوردێتی دەوڵەتی ـ ئەو کوردانەی جیابوونەوەی چینایەتیان بەخۆوە بینیوە و بوونەتە شارستان ـ لەگەڵ کوردێتی مەزهەب و تەریقەتە سفیلەکانی لە دۆخی بەرگریدابوون جیابوونەوەیەکی قووڵی بەخۆوە دیوە. مێژووی کۆمەڵگای چاخی ناوین لە بنەڕەتدا پشت بەو دیاردە و جیابوونەوە دەبەستێت. باسەکان بەهەر یەکێک لە شێوەکانی گوزارشتکردن بکەن، بەڵام دیاردە ماددیەکانی بنچینەکەی هەر وەک خێڵ، تەریقەت و مەزهەب دەمێنێتەوە. سەرجەم ئەو یەکینانەی پێکدادانەکانی قەوم و چینەکان پشتی پێدەبەستێت جێگای خۆی لەناو ئەو کۆمەڵە سێیانیەدا دەگرێت. ئەو شێوازانەی دابەشکردن بۆ سەرجەم کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین پەیڕەو کراوە، بگرە تایبەتمەندێتی گەردوونیشی بەدەستهێناوە. سەبارەت بە راستینەی کوردیش رەوشەکە جیاوازتر نییە. زیان و دەستکەوتەکان یەکتری تەواو دەکەن. سەرباری بوونە قڕکەر و ئاسیمیلاسیۆنیستەکەی بژاری دەسەڵات، بەڵام توێژە چەوساوە و سەرکوتکراوەکانی خێڵ، مەزهەب و تەریقەتەکان بە توندی خۆیان لە بوونی کۆمەڵایەتییان پێچاوە و بەرگری لە ژیانی ئازاد دەکەن.

خزینی سیستەمی شارستانی ناوەندی بۆ ئەورووپای خۆرئاوا لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا وەرچەرخانی ریشەیی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. سیستەمی شارستانی کە بەردەوام لەمیانەی تەنگژە خولیەکانەوە درێژە بە بوونی خۆی دەدات، لەو قۆناغە نوێیەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لە قووڵاییەوە بە قۆناغی هەرەسهێنان گەیشتووە. هەژموونگەرایی خۆرئاوا کە لە سەدەی نۆزدەهەم لەسەر ناوچەکە پەرەیسەند، لەمیانەی ئەو گۆڕانکاریانەی لەرێگای دامەزراوە سیخوڕی و لقەکانی گرێدراو بەخۆیەوە ئەنجامیدان هەرەسهێنانی خێراتر کرد. مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج لەسەرمایەداریدا تەنیا لە رێگەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە توانای بەردەوامکردنی هەبوو کە ئەوانیش گوزارشتی چڕکراوەی ستەمکارین. ئەو ستاتۆ نوێیەی لە شۆڕشی پیشەسازی بێبەشە و زۆرتریش دووری شۆڕشی سیاسییە، وەک تەواوی کۆمەڵگاکان ئەوا لە راستینەی کوردیشدا رێکردنەوەی لە پێش دوالیزمی بوون ـ نەبوون دەست لێبەرنەدراو بوو. هەم بە سیفەتی دەوڵەت هەمیش وەک کۆمەڵگا خۆ لەسەرپێ راگرتن ببوو بە دۆخێکی گفتوگۆکردن. دەشێت ئەو دۆخە لە ئیمپراتۆریەتەکانی ئێران و عوسمانیشدا ببینرێت. دەسەڵاتدارە عەرەب، فارس و تورکەکان کە لە سەردەمی شارستانی ئیسلامیدا لە پێگەی سەرەکیدابوون لەکاتێکدا ئاواکردنی دەوڵەتیان بۆ خۆیان کردبوو بە مەسەلەی سەرەکی، جڤات و میللەتە سەرکوتکراوەکانیش رووبەڕووی کێشەی پاراستنی بوونی خۆیان بوونەتەوە. بەهۆی پێگەی جیۆستراتیژی جوگرافیاکەیان و بونیادە بڵاوەکەی کۆمەڵگاکەیان لەو قۆناغەدا کوردان دووچاری زیاترین کردەوە باوەکانی چەوسانەوەو سەرکوتکردنی ستاتۆ هاتن.

ڕێبازی رژێمە سیخوڕیەکانی هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە سەرووی هەموویشیانەوە ئیمپراتۆریەتی بریتانیا ئاوایکرن لەچاو سەرتاسەری جیهان بەشێوەیەکی زۆر بەربلاوتر لە ناوچەکەدا ڕێگای کارەساتێکی گەورەی بۆ ئەو قەوم و جڤاتانە کردەوە کە لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا لە دەرەوەی دەسەڵات مابوونەوە. گەلە کرستیانیەکانی مەحکومی ستاتۆیەک بوون کە لە ئاکامی فەتحگەراییەک و لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژیا باوەکانی ئوممەت ئاواکراوە، دووچاری گەورەترین کارەسات بوون، واتە تووشی ژینۆساید هاتن و لەگەڵ کلتووره هەزاران ساڵیەکەیاندا لەناوچوون. جڤاتە موسڵمانەکانی دووچاری چەوسانەوە و سەرکوتکردنی باو هاتبوون پشکی خۆیان لەو کارەساتە وەرگرتووە. بەئەندازەی ئەرمەنی، هێلینی و سریانیەکان، جووتیار و بەدەوییە عەرەبەکان، تورکمانەکان، عەجەمەکان، بەربەر و کوردەکانیش بەیەکەوە دووچاری ئەو کارەساتە مەزنە هاتن کە لەلایەن دامەزراوە سیخوڕیەکانی ناوچەکە پێشخراوە کە پشتبەستووە بە سیستەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری.

کلتوور و بوونی قەوم کە بەدرێژایی چاخی ناوین ڕاستینەی کورد ئاوایکردبوو تارادەیەکی مەزن لەو قۆناغە لەدەستیدا. ئیتر ئاراستە بەرەو خوار بوو، بەمانایەکی تر بۆ دواوەی دواوە بوو. نەک هەر بەگوێرەی ناوەڕۆکی سیستەم نەبوونە خاوەن سیستەمێکی سەرمایەداری، پیشەسازی و دەوڵەت ـ نەتەوە، بەڵکو لەلایەن خودی هێزە هەژموونگەراکان و دەزگا سیخوڕیەکانیانەوە لەژێر ئەو کۆڵەکە ستیانیەیانەوە ڕووبەڕووی سووتان کرانەوە. کاتێک گەیشتینە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، لەجیاتی بابەتەکانی ئازادی، یەکسانی و دیموکراسی هاوچەرخ بابەتی سەرەکی گفتوگۆکردن سەبارەت بە کوردان لەدەورووبەری دوالیزمی "بوونمان هەیە، یان نا؟ " دەخوولایەوە.

هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بایەخێکی تایبەت بەوە دەدەن کە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە وەک بەرپرسیاری ئەو ڕەفتار و کردەوانە پیشانبدەن کە لەسەر گەلان و نەتەوەکانی ناوچەکە پەیڕەو کراوە و بە ئاستی ژینۆسایدی هەمەجۆر گەیشتووە. بەڵام ڕاستیەکەی جیاوازترە، چونکە خودی سەرمایەی هەژموونگەرایی و قۆرخکارییە ئایدیۆلۆژیەکانن کە نوخبەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەیان ئافراندووە، لەبواری ئایدیۆلۆژی، سەربازی و ئابووریشەوە پڕ چەک و تێرخۆراکی کردوون. بۆ نموونە؛ فاشیستەکانی تورکی سپی کە بە بەرپرسیاری کردەوەکانی ژینۆسایدی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا دادەنرێن، هەم لە بواری ئایدیۆلۆژی هەمیش لەبواری پرچەککردنی مادیدا لەسەرەتاوە تاکۆتایی بە کۆمەکی هێزە هەژموونگەراکان (ئینگلیز، فەڕەنسا، ئەڵمانیا، ئەمریکا) بونیادنراوە. ئەگەر یارمەتی و پشتگیری ئەو هێزانە نەبێت ئەوا ئەگەری پێکهاتنیشیان جێگای باس نابێت. وەک کلتوور هیچ یەکێک لە ئیسلامیەت، کرستیانی و موسەویەت هەڵگری ئەو چوارچێوە نین کە پراکتیکی ژینۆساید بەرهەم بێنن. فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەڵگری ئەو چوارچێوە و توانایەن. بەڵام لە ڕووخساردا وەک پۆلێن و کۆمەڵێکی گشتی عەرەب، تورک، یەهودی و کوردەکان بەرامبەر ژینۆسایدەکان

بەرپرسیار دەبینرێن. لەڕۆژی ئەمڕۆشماندا لەرێگای ئەو ئایدیۆلۆژییە میللیگەرایانەی لەژێر ناوی ئیسلامگەراییەوە ئاواکراون هەوڵی کردەوەگەلێکی هاوشێوە دەدەن. کەچی لەراستیدا دیسان لەژێر ئەو سەرهەڵدانە ئایدیۆلۆژی و رێکخستنیەشدا پشکی نەریتی ئینگلتەرا و هەنووکەیی ئەمریکا دیاریکەرە. ئەگەر پشتگیری هێزە هەژموونگەراکان نەبێت، ئەو ناوەندانەی بەهێزی ئیسلامگەرا ناودەبرێن تەنانەت ناتوانن هەناسەش بدەن. فاشیزمی تورکی سەوزیش کە پێویستە بە بەرپرسیاری کردەوە نوژەنەکانی ژینۆساید دابنرێت کە لە رۆژی ئەمڕۆمان لەسەر راستینەی کورد جێبەجێدەکرێت لە سەرەتاوە تاکۆتایی ناوەندەکەیان لەندەن، واشنتۆن و بەرلینە. پشتگیری ئەو ناوەندانە نەبێت، فاشیزمی تورکی سەوز ناتوانێت هەنگاوێکیش بهاوێژێت. لێرەشدا بەرپرسیارێتی دەخرێتە ئەستۆی ئایینی نەریتی ئیسلام. لەراستیدا وەک چۆن فاشیزمی تورکی سپی پەیوەندییەکی زۆر کەم و سنووورداری بە تورکێتیەوە هەیە، فاشیزمی تورکی سەوزیش پەیوەندییەکی زۆر کەمی بە ئیسلامی سۆسیۆلۆژی و باوەوە هەیە. مسۆگەر پەیدابوون و شێوەکانی گرێدراو بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و هێزە هەژموونگەراییەکانەوە ئاواکراون. بەردەوامکردنیشیان بە کۆمەکە نزیکەکانیانەوە مەیسەر دەبێت. بۆ نموونە؛ وەک سەرجەم وڵاتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لە تورکیاش ئاواکردن و بەردەوامبوونی پێکهاتەکانی دەسەڵاتی خاوەن مەیلی ئیسلامی لە مۆدێلە عەلمانیەکان زیاتر لە ناوەندەکانی هێزە هەژموونگەراکان بونیاد دەنرێن و پشتگیری دەکرێن.

جیاواز لە کۆمەڵگاکانی دیکەی نەریتی ئیسلامی راستینەی کورد نەیتوانیوە خۆی بە دۆخی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی بگەیەنێت، وەک ئەوان توانای دەوڵەت ـ نەتەوەکانی بەکار نەهێناوە. بە پێچەوانەوە بەو ئامانجەی بە دۆخی کۆمەڵگای نەتەوەیی نەگات بەردەوام لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە حوکمڕانەکانەوە دووچاری رژێمێکی سەرکوتکردن و تاڵان بۆتەوە کە بەشێوەیەکی سیستەماتیک بەئاستی ژینۆساید گەیشتووە. پشتگیری هێزە هەژموونگەراکان نەبێت ئەو رژێمانەی تاڵان و ژینۆساید ناتوانن بەردەوام بن. شانبەشانی کاریگەری کلتووورە خێڵایەتی و قەبیلەگەراییەکانی پاشماوەی سەردەمی نیولیتیک و کلتووری مەزهەبی و تەریقەتەکانی چاخەکانی یەکەم و ناوین و کاریگەرییە کوێرکەرەکەی بەرژەوەندیپەرستی سیستەمی دەوڵەتی ـ پلەداری کۆمەڵگای کورد لە دینامیکی ناوخۆیی بێبەش بوو: ئەوانەش نەیانهێشت بە دۆخی کۆمەڵگای نەتەوەیی بگەن. وەک بڵێی لەدۆخی لاشەیەکی کۆمەڵایەتیدا هێڵراوەتەوە. کردەوەگەلێکی سنوورنەناسی قڕکردن و تاڵانی هێزە هەژموونگەراکان و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی لەسەر جێبەجێدەکرێت. ئەو راستینە لەژێر گفتوگۆکانی بوون ـ نەبووندا شاراوەیە. لە دواشیکاردا ئەو راستینە بەتەواوی لەلایەن فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دەزگا سیخوڕییەکانی بەکرێگیراوەکانی ئاوادەکرێت، دەبێت بە کردەیی.

بێگومان وەک چۆن لەهەر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتیدا بەشێوەیەکی گەردوونی جێگای باسە، لە راستینەی کوردیشدا هەر لە سەرەتای پەیدابوونیەوە تاڕۆژی ئەمڕۆمان

جەمسەرەكانی بەرخودان لەئارادابوون. بگرە لە پێكهاتنی یەكەمین قەبیلە و خێڵدا ئەوەی دیاریكەرە، پەرچەكرداری خۆپاراستنە بەرامبەر هەڕەشەكانی جڤاتە ركابەرەكان و هەلومەرجە سروشتیەكان، فیكر و ڕێكخستنی پاراستنی سەرەتاییە. لەو بارەیەوە شرۆڤە داروینستیەكان راستی پیشاننادەن، بەڵكو چەواشەی دەكەن. لایەنی دیاریكەری قەبیلە و خێڵەكان پەیوەندی خوێن و خزمایەتی نییە، بەڵكو خۆ پاراستن بەرامبەر هەڕەشەكان، خۆراك و زۆربوونە. بونیادی بەرهەمهێنەر، وەچەخەرەوە و بەرخودانی كلتووری قەبیلە و خێڵایەتی راستینەی كورد مسۆگەر ئەو گریمانە دەسەلمێنێت. هەمان خاڵ سەبارەت بە پەیوەندی دۆخی سافی كلتووری تەریقەت و مەزهەبەكانی دواتر پێكهاتوون، لەگەڵ شێوازی تەندروستانەی زۆربوون، بەرهەمهێنان و بەرخودانی كۆمەڵگا جێگای باسە. رۆڵی پاراستنی كۆمەڵگا، درێژەدان بە بوونەكەی و ئازادكردنی مەزهەب و تەریقەتەكان لە بەرامبەر ناوەندە ناوخۆیی و دەرەكیەكانی دەسەڵات، دەستڕۆیی (نفوژ) تێكدەرانەی شار و جیابوونەوەی چینایەتی گرنگە. هەر لەبەر ئەو خەسڵەتەشە ویستوویانە یان لەناوی ببەن یان بەكرێگیراوییان لەناو جێگیركردوون و هەوڵیانداوە لەرۆڵی بەرخودان، ئافرێنەر و ئازادیخوازەكەیان دووریان بكەنەوە.

بزووتنەوە یەكسانیخواز، ئازادیخواز و دیموكراسیخوازە هاوچەرخەكانی لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئاواكراون هەوڵی بەردەوامكردنی نەریتی مێژووییان داوە. هەلومەرجە تایبەتەكانی راستینەی كورد دەرفەتی نەداوە كۆمەڵگایەكی نەتەوەیی هاوچەرخ بە دەستی فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئاوا بكرێت. هەوڵە لاوازەكانی بۆرژوازی بچووك و دەرەبەگەكان لەو بارەیەوە بێ ئەنجام بووە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووكە دروستكراوەی بەو دواییانە پەنای براوەتەبەر، ئەگەر بە پێكهاتە بەرفراوانەكانی كۆمەڵگای نەتەوەی دیموكراتیك دەورە نەدرێت ئەوا جگە لە بانگێشتكردنی كارەساتی گەورە و ژینۆساید بەولاوە ئەنجامێكی دیكە لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت. بونیادگەرایی كۆمەڵگای سۆسیالیستی دیموكراتیك كە گوزارشتی خۆی لە PKKدا دەدۆزێتەوە راستینەی كورد ئاوێتەی چەمكی مۆدێرنیتەیەكی جیاواز دەكات، بە گوتە و كردار لە ڕێگای تیۆری و كرداری مۆدێرنیتەی دیموكراتیكەوە بەرگری لە بوونەكەی دەكات، یەكێتیەكەی بەدەست دێنێت و ئازادیەكەی دەستبەر دەكات.

ئەلتەرناتیڤی مۆدێرنیتەی دیموكراتیانە تەنیا ئۆتۆپیایەكی سەبارەت بە ئایندە یاخود میتۆلۆژیایەكی كۆمەڵایەتی نییە لە رابردوو مابێتەوە، بژاریكە بە شێوەیەكی هاوتەریب لەگەڵ سروشتی راستینەی كۆمەڵگا پەرەیسەندووە. سەرەرای ئەوەی مۆدێرنیتەی دیموكراتیانە بەگوێرەی قۆناغەكان شێوەی خۆی گۆڕیوە، بەڵام راستینەیەكە بەدرێژایی مێژووی شارستانی خۆیشی خاوەن مێژوویكی دژە. نوێنەرایەتی تەواوی مرۆڤایەتی مێژووی گەردوونی ئەو هێزانە دەكات كە لە دەرەوەی هێزە ستەمكار و چەوسێنەرەوەكان ماونەتەوە، بەمانایەكی تر گوزارشت لە سیستەمەكەی دەكات. هەرچەندە راستینەی كوردە یەكەمینەكان بەشێوەیەكی رەسەن رۆڵی لانكەی ژیار و

شارستانییان بینیبێت، ئەوا گوزارشت لەو کلتوورەش دەکات کە وەک ئەو دایکەی دووچاری ستەمی ڕۆڵەکانی بووە، زیاترین زەبری هێزەکانی شارستانی بەردەکەوێت و دووچاری تەسفیەکاری ئەو هێزانە هاتووە. لەو سۆنگەیەوە؛ تەنیا لەناو ژیارێکی دەرەوەی شارستانی باوی چینایەتی، واتە لەناو شارستانێتیەکی کۆمەڵگای دیموکراتیانە دەتوانێت بوونی خۆی فەراهەم بکات. ئەگەر مێژوویێکی واتاداری کوردان بنووسرێتەوە، تەنیا دەشێت لەو چوارچێوەیەدا بنووسرێت. گوزارشتەکەشی لەڕۆژی ئەمڕۆماندا مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەیە. تەنیا لەژێر ڕۆشنایی مێژووی شارستانێتی دیموکراتیدا کوردان دەتوانن بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەشەکانی دیکەی بوونەکەیان ببینن، لەو چوارچێوەیەدا مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە لەڕێگای نەتەوەی دیموکرات، پیشەسازی ژینگەپارێز و ئابووری بازاڕی کۆمەڵایەتی سەرلەنوێ خۆی بونیاد دەنێتەوە.

جوگرافیای زاگرۆس ـ تۆڕۆس لەمێژوودا هەر تەنیا بە ڕۆڵی لانکەی شۆڕشی هۆمۆساپیانسی نێوان ئەفریقیا و ئۆراسیا و شۆڕشەکانی کشتوکاڵی نیولیتیک و شارستانی شار هەڵنەستاوە، بەڵکو ئەوانەی گەورەش کردووە و بۆ مێژووی نزیک واتە بۆ شۆڕشی پیشەسازی ئەورووپای گواستۆتەوە. هەرچی ئێستایە لە قووڵترین قەیرانی مرۆڤایەتی ـــ کە ڕەگەکەی بۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەگەڕێتەوە ـــ ڕووبەڕووی قڕکردنە، وەک گۆڕستانێک وایە. جارێکی دیکە لەهەمان جوگرافیادا مێژوو بەناوی مرۆڤایەتیەوە کوردان ناچاردەکات لەپێناو پاراستنی بوونی کۆمەڵایەتیان و ئاواکردنی مرۆڤی ئازاد شۆڕش بکات و مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە بونیاد بنێت.

## بەشی سێیەم

# کێشەی کورد و بزووتنەوەی کورد لە سەردەمی سەرمایەداریدا

بەشێوەیەکی گەردوونی دەشێت دەستەواژەی کێشە وەک قۆناغێک پێناسە بکرێت کە زەحمەتی لە بوون و نەبووندا دەبینرێت و زۆر بە ئازارە. دۆخێکە لە سەرجەم دۆخەکانی ژیان یان پەیدابووندا روودەدات. کاتێک کۆمەڵگاش جێگای باس بێت، دەشێت کێشە لە چوارچێوەی تەسک و بەرفراوانیشدا پێناسە بکرێت. کێشەی کۆمەڵگا لەچوارچێوەی بەرفراواندا گوزارشت لەو زەحمەتیانە دەکات کە سروشتی کۆمەڵگا لە بەرامبەر سروشتی یەکەم دووچاری هاتووە. بۆ نموونە؛ لە بەرامبەر وشکانی، گەرمایی یاخود سەرمایەکی لە رادەبەدەردا کاتێک ژینگە لە بواری بایۆلۆژیدا دووچاری دۆخێکی نالەبار بێت رێگا لەپێش کێشەگەلێکی کۆمەڵایەتی جددی دەکاتەوە. هەروەها دەشێت لەناو ئەو جڤاتانەی لەناو هەمان ستاتۆدا دەژین کردەوە زۆرەملێیەکانی بەهێزەکان بەرامبەر بە لاوازەکان لەو چوارچێوەیەدا هەڵسەنگێنرێت. لە چوارچێوەی بەرتەسکیشدا دەشێت کێشەی کۆمەڵایەتی بەشێوەی ئەو کردەوە و گۆڕانکاریانە پێناسە بکرێت کە لەسەر بنەمای ئەو چەوسانەوە و سەرکوتکردنەدا روودەدات کە گرێدراو بە دەرکەوتنی دیاردەکانی کۆمەڵگای پلەداری، شار، چین و دەسەڵات ـ دەوڵەت دێنە ئاراوە. لە روانگەی سۆسیۆلۆژیشەوە کێشە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان ئەوانەن کە سەرچاوەی خۆیان لە چەوسانەوە و سەرکوتکردن وەردەگرن. دەشێت کێشەکانی دیکە لە چوارچێوەی جیاوازدا تاوتوێ بکرێن.

وێڕای ئەوەی پلەداری و دەوڵەت سەرەتا بە ئامانجی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتیەکان ئاواکران کە بە لوتکە گەیشتبوون، بەڵام لەگەڵ تێپەڕبوونی کات خۆیان بوون بە سەرچاوەیەکی گرنگی کێشەکانی کۆمەڵگا. لە کۆمەڵگایەکدا چەندە دامودەزگاکانی دەوڵەت و پلەداری قورساییان هەبێت، واتە بەو رادەیە لەناو کێشەدا دەژین. لەبەرئەوەی یەکەمین پلەداریەکان بەگشتی بەشێوازی پیاوسالاری سەر ژنانە، دەشێت یەکەمین کێشەی کۆمەڵایەتی بە کێشەی ژن ناو ببرێت. دواتر لەمیانەی ئیلهام وەرگرتن لە کۆیلایەتی ژنان چینە کۆمەڵایەتییەکان ئافرێنران، لەگەڵ پێکهاتنی چینی کۆیلەشدا قۆناغی ئەو کێشە کۆمەڵایەتیانە دەستپێکرد کە جیاوازی لەنێوان رەگەزدا ناکات. بەمجۆرەش لەمیانەی بەناویەکداچوونی پلەداری و جیابوونەوەی چینایەتی لەناو کۆمەڵگادا، قۆناغی کۆمەڵگا بە

کێشـەکان دەسـتی پێکـرد کـە هـەنگاو بـە هـەنگاو لەسـەرجەم بوارەکـان بەکاریگـەر بـوو.
ڕەگەزگەرایی و چینگەرایی مۆرکی خۆی لە سەرجەم بوارەکانی کۆمـەڵگادا. ێ مۆنتاگنارەکان
ەو کێشانەی یەکینە و گروپە کۆمەڵایەتیەکان لەناوەوە دووچاری هـاتبوون بـۆ جڤاتـەکانی
دەرەوەش گواستراپەوە. دیاردەی چەوسانەوە و سەرکوتکردنی کۆمەڵگا لەلایەن کۆمـەڵگاوە
سەرپهەڵدا. بەشێوەیەکی بەرجەستەتر کێشەگەلێک دەرکەوتن کە لە کلانێکەوە بـۆ کلانێکـی
دیکە، لە خێڵ و قەبیلەیەکەوە بۆ خێڵ و قەبیلەکانی دیکـە، لـە قـەوم و نەتەوەیەکـەوە بـۆ
قەوم و نەتەوەکانی دیکە درێژ بوویەوە. ئـەو شارستانیانەی بـە ئـاوابوونی شـار، چـین و
دەوڵـــەت ســـەرپانهەڵدا کێشـــەکانیان کـــرد بـــە گـــەردوونی و سیســـتەماتیک. ســـەرجەم
سیستەمەکانی شارستانی چاخـەکانی کۆن و نـاوین لـە بنەڕەتـدا دەشـێت لەسـەر بنـەمای
دیاردەی فشار و چەوسانەوە پێناسـە بکرێت. بـەو سیفەتەی دوا سیسـتەمی شارسـتانیەتە
دەشێت مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە بەرزکردنەوەی سەرکوتکردن و چەوسانەوە بۆ زیاترین
ئاسـت پێناسـە بکرێـت. لـە سـەرجەم قۆناغـەکانی شارسـتانی بەتایبـەتیش لـە قۆنـاغی
مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداریدا کێشـە کۆمەڵایەتیـەکان ڕێگـای لـە پـێش قـەیرانی تراژیـدی و
هەلومەرجی کائۆتیک کردەوە. قۆناغی سەرمایەی فینانس (رأس المال ألمـالي)یش کـە لـە
ساڵانی ١٩٧٠نـەوە تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان مـۆرکی خـۆی لـە مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری داوە،
دەشێت وەک سەردەمێک پێناسە بکرێت کە قووڵترین و هەمیشەییترین قەیرانی کۆمەڵگا لـە
ئارادایە.

کۆمەڵگاکانی جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین کە کوردستان ناوەندەکـەی پێکـدێنێت، لـە
سەدەی نۆزدەهەمەوە کەوتۆتە ناو قەیرانێکی قووڵـەوە کـە سـەرچاوەکەی بـۆ مۆدێرنیتـەی
سەرمایەداری دەگەڕێتەوە. دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە پێگەی هەژموونگەرایی پێـنج
هـەزار سـاڵەی سیسـتەمی شارسـتانی ناوەنـدییان لـە بەرژەوەنـدی ناوەنـدی شارسـتانی
ئەوروپای خۆرئاوا لەدەستدا، لەسـەرەتای سـەدەی بیستەمدا دووچـاری دۆخـی کۆمـەڵگای
داگیرکراو هاتن. ئەوەی لە ئارادابوو تەنیا کێشـەی کۆمەڵایـەتی نـەبوو، بـەڵکو قـەیرانێکی
سەرتاسـەری سیسـتەم بـوو کـە سـەرجەم بوارەکـانی دەسـەڵات، ئـابووری و ئایـدیۆلۆژی
گرتبوویەوە. لە ڕۆژی ئەمڕۆشماندا ئەو قەیرانە بەهەموو هێز و دژواریەکیـەوە بەردەوامـە.
یەکێک لە تایبەتمەندێتییە گرنگەکانی ئەو قەیرانە درێژخایەنە و دۆخێکی کائۆتیک(گێژاو)ی
بەخۆوە گرتووە. ئەو هەلومەرجە کائۆتیکە تەواوی خۆرهەڵاتی ناوین و دراوسێ نزیکەکانی
خستۆتە ژێر کاریگەری خۆیەوە، کاریگەری کردۆتە سـەر سـەرجەم ئـەو کۆمەڵگایانـەی لـە
ئاسیای ناوین، قەفقاسیا و بەلقان و باکووری ئەفریقیا و ئەفریقیای ناوەڕاستدا دەژین.

جوگرافیای کوردستان کە لە زنجیـرە شـاخەکانی زاگرۆس ـ تـۆرۆس درێژخایـەنترین
ڕۆڵی بونیادنانی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا بینیوە، بۆ یـەکەمین جـارە لـە ڕۆژی ئەمڕۆمانـدا
بەهۆی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە بە قووڵاییەوە لە هەلومەرجی پارادۆکسـی (دووفـاقی)
ئەو زەمینە کائۆتیکەدا دەژیـت. پـارادۆکس گوزارشـت لـەو دۆخـە دەکـات: ڕووبـاری ژیـاری
مرۆڤایەتی کە دوای شۆڕشگەلێکی مێژوویی مەزن بە گوڕتر دەبوو، لە قۆناغی مۆدێرنیتـەی

سەرمایەداریدا وشک دەبێت. کوردان بەو سیفەتەی یەکێکن لە کۆنترین گەلانی ناوچەکە بوونەتە بە ئازارترین قوربانیەکانی ئەو دۆخە کائۆتیکە. ئەو جوگرافیایەی بووە بە لانکەی زۆربەی سەراوژێربوون و شۆڕشە مێژووییەکان: لە شۆڕشی هومۆساپیانسەوە تا دەگاتە شۆڕشەکانی نیولیتیک، کالکولیتیک، مس، شار و ئاسن کە مرۆڤایەتییان گەیاندۆتە رۆژگاری ئەمڕۆمان؛ گەیشتن بە دۆخی گەلێک کە تۆزێک ماوە لە مێژوو بسڕێتەوە، بێگومان تراژیدیایەکی زۆر گەورەیە. ئەوەی رووەدات گلۆڵەیەکی سادەی کێشە کۆمەڵایەتیەکان نییە. لەهەر کۆمەڵگایەکی مرۆییدا کێشەی هاوچەرخی هاوشێوە لەئارادایە. هەرچەندە رەگ و ریشەی کوردان لە قووڵایی مێژوو دابێت، بەڵام ئەو کێشانەی بە دەستیەوە دەناڵێنن بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەناو گەدە و لەژێر لەپەکانی کۆڵەکە چەوسێنەر و زۆردارەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا گیانەڵایەتی.

ئەو کێشە و قەیرانانەی لە ئارادان، هەلومەرجە کائۆتیکەکەی کۆمەڵگای تێئاخێنراوە، تەنیا سەرچاوەی خۆی لە یاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجی تایبەت بە سەرمایەداری وەرناگرێت؛ بەڵکو شانبەشانی ژینۆسایدە کلتووریەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە سەرجەم ئەو هەژاری، بێکاری، بێپەروەردەیی، نەبوونی هەلومەرجی تەندروستی و لەدەستدانی زهنیەتیش لەخۆوە دەگرێت کە ئیندوستریالیزم رێگای لەپێش کردۆتەوە. ئەو رەوشەی لەئارادایە لە کێشە قورسترە، گەورەترین کارەساتی کۆمەڵگایە. ئەو دۆخەی جێگای باسە لەودیو بێناوەرۆکبوونی هەرەمەکی کۆمەڵگایە، بەڵکو لەت لەتکردن و پارچەکردنێک لە ئارادایە کە پەرتەوازە بووە، ناوەندی هەستەوەری خۆی لەدەستداوە و کەمتەرخەمکراوە. کاتێک باسی کێشەی کورد دەکرێت، باسی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی یاخود هەنووکەیی ئاسایی ناکرێت. وەک لە سەرجەم شیکارەکاندا هەوڵی روونکرنەوەماندا مانای تووشبوونی کۆمەڵە کارەساتێکی گەورەی یەک لەدوای یەکە کە بە ئاستی ژینۆسایدی کلتووریش گەیشتووە، سەرجەم بوارە کۆمەڵایەتیەکانی گرتۆتەوە و لەماوەیەکی مێژوویی درێژخایەندا پەیرەوکراوە و سەرچاوەی خۆی لە پێگەی تایبەتی راستینەی کورد وەردەگرێت.

### أ . پەرەسەندنی مێژوویی و دۆخی ئێستای کێشەی کوردان

ئاوابوونی پلەداری، شار، چین و دەوڵەت لە هەناوی کۆمەڵگای نیولیتیکی هیلالی بەپیت کە نەک تەنیا کورد بەڵکو بەشی زۆری مرۆڤایەتی تێداژیاوە، سەرچاوەی کێشەی کوردی رۆژی ئەمڕۆمان پێکدێنێت. شارستانی سۆمەری میزۆبۆتامیای خواروو (٢٠٠٠ ـ ٣٠٠٠ پ.ز) وەک رێگەچارەیەک بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە ئافرێنرا کە کۆمەڵگای نیولیتیکی میزۆبۆتامیای سەروو رێگای لە پێش کردبوویەوە. کێشەکانیش سەرچاوەی خۆیان لە زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان، کورتهێنان یان بەشنەکردنی زەوی و زیادبوونی کێشمەکێشەکان وەردەگرت. لە میزۆبۆتامیای خوارووش لەمیانەی پشتبەستنی کاهینە

سۆمەریەکان بە داناییە بەرکەماڵەکەیان و بەکارهێنانی سەرجەم فاکتەرە ماددی و مەعنەویەکانی کلتووری نیولیتیک، لە تەوەرەی پەرستگاوە شار، چین و دەوڵەتیان ئاواکرد و بەدوای وەڵامی مێژوویی ئەو کێشانەدا گەڕان. بە پێی ئەو ئەنجامانەی دەرکەوتوون ئاشکرا بووە کە سەرەتا بەهەڵەدا نەچووبوون. ئەو سەردەمە نوێیەی پشتی بە سێیانەی شار، چین و دەوڵەت دەبەست، وەک بڵێی بووە بە چارەسەرییەکی پەرچووانەی کێشەکانی ئەو قۆناغە. میتۆلۆژیای ئەو سەردەمە لە خۆڕا گوزارشتی لەو سیستەمە ئیلاهییە نوێیە نەدەکرد، کە مانای سەرەتا و هەنگاوی یەکەمینی سەرجەم پەرەسەندنەکانی مێژووی مرۆڤایەتی دەبەخشێت. پەرچووی (موعجیزە) نیولیتیک بۆ پەرچووی شارستانی گۆڕا بوو. سیستەمی بونیادنراو لەوانەیە درێژخایەنترین سیستەمی مێژوو بێت کە بێ وەستان دەستبەکارە. بەڵام کاتێک ناکۆکیەکانی ناواخنی پێگەیشتن، ئەوجارە ڕۆڵی یەکەمین مامانی کێشەکانی کۆمەڵگای بینی. لە یەکەمین بەڵگە نووسراوەکانیشدا هاتووە کە سافترین دۆخی کێشەی کۆمەڵگا لە مێژوودا لە کۆمەڵگای سۆمەر ڕوویداوە. لەڕاستیدا ئەو ململانێ و ناکۆکیانەی لەنێوان خودی خوداوەندەکان و لە نێوان خوداوەند و بەندەکانیان پیشاندەدرێت لە بنەڕەتدا ڕەنگدانەوەی ئەو ناکۆکی و شەڕانەیە کە بەهۆی کێشەکانی کۆمەڵگا لە نێوان خودی دەسەڵاتداران و لەگەڵ ئەو مرۆڤانەوە دێتەئاراوە کە وەک کۆیلە بەکاریان دێنن. کۆمەڵگای سۆمەر کە مۆرکی خۆی لە چەندین یەکەمینەکانی مێژوو داوە، لە بواری ئەو کێشانەی ڕێگای لەپێش کردوونەتەوەش نوێنەرایەتی یەکەمینێکی دەگمەن و بێهاوتا دەکات.

دەشێت یەکەمین کێشە کۆمەڵایەتییە جددیەکانی جڤاتەکانی بنەچەی کوردان بە شارستانی سۆمەر ببەستینەوە. لە ڕاستیدا داستانی گلگامێش سەبارەت بەو کێشانە هۆنراوەتەوە. ئەگەر کلتووری پلەداری ئەلعوبێد (٤٥٠٠ ـ ٣٥٠٠ پ.ز) بێت یان کلتووری شاری ئوروک (٣٠٠٠ ـ ٤٥٠٠ پ.ز) ناچاربوون بەرەو خۆرهەڵات و باکوور بەرفراوان بێت. بەو سیفەتەی یەکەمین پێکهاتەی کلتووری شار، چین و دەوڵەتی بوون، لە پێناو ژیان ناچاربوون لە کۆمەڵگای نیولیتیکەوە تێرخۆراک بن کە لەسەر هەردوو ئاراستە بوون. ناچارییش پێکدادان لەگەڵ خۆیدا دێنێت. پەیوەندی نێوان گلگامێش و ئەنکیدۆ گوزارشت لە کێشەکانی پەیوەندی نێوان یەکەمین ئیمپریال ـ کۆڵۆنی مێژوو دەکات. جڤاتەکانی بنەچەی کوردان لە کەسایەتی خومبابادا نوێنەرایەتی بەرخودان دژی پەیوەندی ئیمپریال ـ کۆڵۆنی دەکات. پاراستنی ژیانی یەکسان و ئازادی کۆمەڵگای نیولیتیک لە بەرامبەر ژیانی شار، چینایەتی و دەوڵەتی بناغەی کێشەکە پێکدێنێت. وەک بەندییەک یان دیلێک ئەنکیدۆ دێننە ئوروک، ماڵیدەکرێت و وەک بەکرێگیراو و ڕێنیشاندەرێک لەلایەن کۆمەڵگای شارەوە دژی جڤاتەکانی خۆی ـ کە لێیەوە هاتووە ـ بەکاردەهێنرێت.

بەرامبەر بە هەڵکشانی شارستانی شار بەردەوام قەبیلە خوریەکان لە دۆخی بەرخودانداا بوون. ئەو بەرخودانانەی پشت بە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس دەبەستێت پیشانیدەدات کە کێشە کۆمەڵایەتیەکان چەندە بەربڵاو و درێژخایەن ببوون. گۆتیەکان گوزارشت لە بونیادی کۆنفیدراسیۆنی ئەو قەبیلانەی زاگرۆس دەکەن کە ناوی خۆیان لە مێژوودا تۆمار کردووە و

بۆ یەکەمین جار بەرامبەر بە فەرمانڕەوایانی سۆمەر سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە. لەو قۆناغەدا لە نزیکەوە تێبینی یەکەم نموونەکانی ئەو کلتوورە دەبین کە دواتر بە درێژایی مێژووی شارستانی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە: دۆڕاوەکان لەناو کلتووری باڵادەستی سەرکەوتووەکاندا دەتوێنەوە. ئەو هەژموونگەرایانەی هونەری شەڕ ئافراندوونی بەردەوام سیستەمی دەسەڵاتدار بەهێز دەکات. لە کاتێکدا هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدرێت، بە شێوەیەکی پارادۆکسی گەورەتر دەکرێت. دەسەڵات ڕێگای زیاتر بۆ دەسەڵات، دەوڵەتیش زیاتر ڕێگا بۆ دەوڵەت دەکاتەوە. بەمجۆرە کێشەکان دوو هێندە گەورە دەبن.

هەژموونگەرایی بابل و ئاشوور کە نەریتی دەسەڵاتیان لە سۆمەریەکان وەرگرت (١٩٥٠پ.ز - ٦٠٠ پ.ز) کاتێک بە قووڵایی و فراوانیەوە سیستەمیان بڵاوکردەوە دووچاری هەمان ڕەوش دێن. لە کاتێکدا ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆیان لە شار، چین و دەسەڵات - دەوڵەت وەردەگرت بە قووڵایی و فراوانیەوە گەورە دەبوون، لەناو هەمان بازنەی خاڵیدا بەشێوەیەکی قووڵتر و بەرفراوانتر گەڕان بەدوای چارەسەریدا جێگای باس بوو. بەرفراوانبوون ڕێگای لەپێش ئیمپریالیزم و داگیرکاری دەکردەوە، قووڵبوونیش ڕێگای لەپێش جیابوونەوەی چینایەتی و چەوسانەوەی زیاتر دەکردەوە. میکانیزمی ئەو سیستەمە کە دواتر تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەدووبارەبوونەوە گەورە دەبێت هەروەک خۆی دەمێنێتەوە: لە دەرەوە پەرەپێدانی ئیمپریالیستی داگیرکەر، لە ناوەوەش ئاواکردنی باڵادەستی چینایەتی. دۆڕاو و سەرکەوتووش قوربانی هەمان سیستەم بوون. لە بەرامبەر ئەوەشدا بەرخودانە دووبارەبووەکەی ئانتی - شارستانی بنەچەی کوردان لە زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس - تۆرۆس بەردەوام گەورە دەبوو. میکانیزمی ئازادانەی تایبەت بەخۆی ئاوا دەکرد. لە چوارچێوەی میکانیزمی ئازادی بەرخودان و هۆشیاری قەبیلە و خێڵدا زیاتر پەرە دەسەنێت، ڕێکخستنیان بەرفراوانتر دەبێت، بەمجۆرەش قەبیلە و خێڵگەلێکی زیاتر هەوڵی ئازاد مانەوەیان دەدا. لە هەردوو میکانیزمیشدا دیالیکتیکی ژیان یان پەیدابوون کاردەکات، هەردوو ڕێکاری دیالیکتیکیش بەردەوام خۆیان گەورە دەکەن.

ئەو وەڵامەی بنەچەی کوردان داویانەتەوە کێشەکانی شارستانی کە سەرچاوەی خۆی لە پەلهاوێژکاری کلتووری سۆمەر وەردەگرێت و لەگەڵ هەژموونگەرایی بابل و ئاشوور دژوارتر بووە لە نەریتی زەردەشتی و مەزدا - میترا ڕەنگ دەداتەوە. ئەوەی لە ناوەڕۆکی ئەو نەریتە جێگای باسە وەک خۆی پەسەندکردنی کلتووری سۆمەر نییە، بەڵکو وەرچەرخاندنی و پیشاندانی داهێنانی خۆیان بەبنەما دەگرن. وەرچەرخان مێژووییە. هەر ئەو وەرچەرخانە مێژووییەشە کە دەرفەتی بۆ نەریتی کلتووری گریک - ڕۆما ڕەخساندووە. ئەگەر ئەو نەریتە دۆگماتیزمی کۆمەڵگای کۆیلەداری لە مێژووی مرۆڤایەتی تێک نەشکێنێتیش، بەڵام نەرمی دەکات، دەیشکێنێ و ناوە بەناوەش بژاردەی نوێ پێشکەش دەکات. مرۆڤ و ئەخلاق، لەو سۆنگەشەوە ئیرادە بۆ قۆناغێکی دیکە بەرزدەکاتەوە. پەیوەندی ئازادی مرۆڤ لەگەڵ ئەخلاق و ئیرادە دروست دەکات. ئەو مرۆڤایەتییەی لە ڕوانگەی خوداوەندەکان و پاشا - خوداوەندەکانی پێشووتر هیچ نەبوو تەنیا کۆمەڵێک بەندەی بێنرخ نەبێت ئیتر سیفەتی ئازاد بەدەست دێنێت: یاخی دەبێت، ئیرادەی خۆی

پیشاندەدات و سەرلەنوێ ئەخلاقی خۆی بونیاد دەنێتەوە. کلتووری بنارەکانی زاگرۆس بەتایبەتیش وەڵامە زەردەشتیەکە سەبارەت بە تێگەیشتنی کێشە سەرەکیەکانی ئەو قۆناغە رۆڵی کلیل دەبینێت .

ئەو وەڵامە ئیسلامیەی دراوەتەوە کێشەکانی زادەی شارستانی دەشێت لە نزیکترەوە شیکار بکرێت. دەشێت وەک وەڵامێکی شۆڕشگێڕانە راڤە بکرێت بەرامبەر بەو کێشە کۆمەڵایەتیانەی کە لەلایەن نوێنەرانی هەر سێ ناوەندی هێزی هەژموونگەرایی ئەو قۆناغە بێزەنت، ساسانی و حەبەشەوە، کە لە هەر چوارلاوە کاریگەرییان کردۆتە سەر ژیانی قەبیلەکانی نیمچە دوورگەی عەرەبەوە. ئەو سێ شارستانیەی دوا نوێنەری کلتووری چاخی یەکەم بوون، لە جیاتی وەڵامدانەوەی ئەو کێشانە بە درێژایی چاخی یەکەم چڕبوونەوە، جگە لە قووڵکردنەوەی کێشەکانی لە گۆڕەپانێکی بەرفراوان هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەمابوو. هەرچی نەریتی وەڵامی ئایینی ئیبراهیمییە، لە بنەڕەتدا دەشێت وەک شێوازێکی چارەسەری تایبەت بەو کێشانە شرۆڤە بکرێت کە سەرچاوەی خۆی لە کلتووری پاشا ـ خوداوەندەکانی چاخی کۆن وەردەگرێت. قۆناغی حەزرەتی ئیبراهیم تا موسا دەشێت وەک سەردەمی وەڵام و لێگەڕینی پێغەمبەرانە بۆ کێشەی ئەو کۆمەڵگایە شرۆڤە بکرێت کە لە نێوان نەمروودەکانی بابل و ئاشووری بەردەوامی سۆمەریەکان و فیرعەونەکانی میسردا ماونەتەوە. وێڕای سەرجەم تایبەتبوونەکەی، وەڵامی موسەویەت سەبارەت بە کێشەکانی قەبیلەی ئیبراهیمی لە پاشایەتیەکی بچووکی ئیسرائیل زیاتر بڕی نەکردووە. ئەو پاشایەتیەی بەتایبەتی لە وێنەی پێغەمبەران داود و سلێماندا رەنگیداوەتەوە، سەنتێزێکی قەبەی کلتووری بابل و میسرە، گوزارشت لە چیرۆکی پاشایەتی چینی سەروو دەکات .

نەریتی عیساییش وەڵامێکە سەبارەت بە هەژاران، کۆیلە و توێژە بێکارەکانەوە دراوەتە کێشەکانی کۆمەڵگای کۆیلەداری نەریتی کۆن کە لە سەردەمی ئیمپراتۆریەتی رۆمادا بە ئاستێکی نائاسایی گەیشتووە. کێشمەکێشی کریستانیەت لەگەڵ موسەویەتدا سەرەتا چینایەتییە. ئەو کەلێن و لەتبوونەی رۆما لەناو قەبیلە عیبرانیەکان و کلتووری قەبیلە دراوسێکاندا دروستیان کرد بەشێوەی دابڕانی ئایینێکی نوێ رەنگیداوەتەوە. دەرکەوتنی نەریتی عیسایی لەو شوێنانەی کە کێشە کۆمەڵایەتیەکانی چاخی یەکەمی تێدا چڕببوویەوە و نەریتی سەرهەڵدان تێیدا ریشەدارە، ئەگەر هێندەی نەریتی زەردەشتیش نەبووبێت، دیسان پۆتانسێلی گۆڕینی سەردەمی مێژووی مرۆڤایەتی هەبووە. کرستیانی خۆی وەک وەڵامێک بۆ سەرجەم ئەو کێشانە پێشکەش کردووە کە لە کلتووری قەبیلەکان لە ئارادابوون. بۆ یەکەمین جار بە شێوەیەکی بەرفراوان کۆمەڵگاکانی جەماعەتی ئایینی پێکهاتوون کە کۆمەڵگاکانی قەبیلە دەرباز دەکەن و جارێکی دیکە ناسرێنەوە. خەڵکانی هەر قەبیلە و گروپێکی ئەتنیکی بە ئەندامە پیرۆزەکانی ئایینی نوێ دادەنرێن. لە بواری کۆمەڵگابوونەوە ئەوە قۆناغێکی زۆر گرنگە. ئیتر کۆمەڵگاکانی گەل بە شێوەیەکی ئاشکرا و بەدەنگی بڵند جێگای خۆیان لەسەر شانۆی مێژوودا دەگرن. ئەرمەنی، سریانی، گریک و لاتینەکان زیاتر لە رێگای کرستیانیەوە هاتوونەتە سەرشانۆی مێژوو و خۆیان نواندووە .

محەمەدیەتیش وەڵامی مێژوویی قەبیلە عەرەبەکانە کە لە هەرچوار لاوە فشاری نوێنەری ستەمکارانی چاخی یەکەمیان لەسەربوو کە کێشەکانی هەمان نەریتی چارەسەر نەکردبوو، بێناوەڕۆکی کردبوو. لەکاتێکدا حەزرەتی محەمەد لە لایەکەوە بانگەوازی رووبەڕووبوونەوەی ئیمپراتۆریەتەکانی حەبەشە، ساسانی و بێزەنتی دەکات، لەلایەکی دیکەشەوە رادەگەیەنێت کە موسەویەت و مەسیحیەت کاتی خۆیان پڕکردۆتەوە کە وەک ئایینی هەق پەسەندی کردبوون: ئەو راستیە پیشاندەدات. نە یەهودیەت و نە کرستیانی هەردووکیان نەیانتوانیوە وەڵامێکی کێشەکانی جڤاتی قەبیلە عەرەبەکان بدەنەوە کە هەم لە ناوەوە هەمیش لە دەرەوە بە ئاستێکی رادەبەدەر گەیشتبوون. لەو قۆناغەدا یەهودیەت و کرستیانی لە مێژبوو ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕانەی خۆیان لە دەستدابوو، ببوون بە میللیگەرایی‌یەکی محافەزەکاری قەوم و قەبیلە. ئەو کێشە و پێکدادانانەی دوا نوێنەرانی ستەمکاری باوی پاشا ـ خوداوەندەکان لە ناوەخۆیان و لەگەڵ یەکتردا دووچاری هاتبوون هەم لاوازی دەکردن هەمیش بێمانا. لەو سۆنگەیەوە؛ مایەی تێگەیشتنە کە حەزرەتی محەمەد لەمیانەی نەریتێکی نوێی ئایینیەوە پێشوازی لە حەسرەتی زیندووی قەبیلەکانی بیابان بۆ ئازادی و تامەزرۆیی چینی سەرووی هەڵگری ئارەزووی فەتح بۆ دەستبەسەرداگرتنی دەڤەر ـ وڵاتانی بەهەشت کرد.

نەریتی ئیسلامی لە سەردەمی دەرکەوتنیدا لەمیانەی لێکدانەوەی واقیعی قەبیلەکانی عەرەب و راستینەی شارستانی خاوەن تایبەتمەندییەکانی خۆ بونیادنانە. لە بواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیدا سەنتێزی دوو بژاری کلتوورییە: واتە شارەزایی سەنتێزکردنی بژاری کلتووری قەبیلە هەژارەکان و بژاری شار، چین و دەوڵەتی چینی دەسەڵاتدارە. شاری مەککە کە کەوتۆتە سەر رێگای کاروانەکانی ئەو قۆناغە خاڵی بەهێز (ئەوەنتاژ) و پێگەی بەیەکگەیشتن و سەنتێزبوونی ئەو دوو کلتوورەی هەیە. گرنگی مێژوویی حەزرەتی محەمەد لەوەدایە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە ئەو سەنتێزەی ئەنجامداوە و مۆرکی خۆی لێداوە. گرنگترین ئەنجامی شۆڕشی ئیسلام لە بواری کۆمەڵایەتیدا گوزەرکردنە لە کۆمەڵگایەکی وشکی قەبیلەگەراییەوە بۆ کۆمەڵگایەکی جیاوازی ئوممەت. لە شوێنێکی لاتەریکی وەک نیمچە دوورگەی عەرەب گوزەرکردنی لە کۆمەڵگایەکی نەریتی قەبیلەگەرایی هەزاران ساڵە بۆ کۆمەڵگای ئوممەت شۆڕشێکی گەورەی کۆمەڵایەتییە. کۆمەڵایەتیبوون یان جڤاتیبوونە نوێیەکە هەر لە سەرەتاوە هەڵگری دوالیزمێک بوو. مەیلی چینی سەروو بۆ بوون بە چینێکی دەوڵەتی کە لە ئەرستۆکراسی قەبیلە مابوویەوە بەردەوام لەگەڵ مەیلی یەکسانی و دیموکراسیخوازانەی چینی هەژار لە دۆخی ململانێدابوو. کێشەی کۆمەڵایەتی گشتگیرانەتر سەرلەنوێ شێوەی دەگرتەوە. ئەو کێشە و ململانێیانەی لە کۆتاییەکانی ژیانی حەزرەتی محەمەددا دەستیپێکرد کاریگەریەکەی تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە.

ئەو گەورە شۆڕشە کۆمەڵایەتیەی چاخی ناوین یەکسەر کاریگەری کردۆتە سەر جڤاتەکانی بنەچەی کوردان. لە ماوەیەکی درێژخایەنی پێکدادان و پەیوەندی مەیلی فەتحکاری ئەرستۆکراسی عەرەب و لێکەڕینەکانی چینی دەسەڵاتداری کورد لە پێناو دەسەڵات ـ دەوڵەت کۆمەڵگای ئوممەتی لەناو کوردانیش ئاواکرد. وەک چۆن لە گشتیدا

جێگای باس بوو، کۆمەڵگای ئوممەتی نوێش بەکێشە بوو. مەیلی شار، چین و دەوڵـەتی و مەیلی یەکسانیخواز و دیموکراسیخوازی بەشێوەی جیـاوازی تەریقـەت و مەزهـەب ڕەنگیـان دایەوە. کاتێک نوێنەرانی هەژموونگەرایی دەسەلاتی ئیسلامی مۆرکی خۆیـان لـە کۆمـەڵگای ئوممەت دا، تەریقەتە سۆفیگەراییەکان، کوردە زەردەشتی و عەلەویـەکانی نـەریتی کۆنیـان وەک بیانووی بوونیان بەکاردەهێنا لە ژێرەوە لەسەر ئاواکردنی گروپی بەرخودانی تایبەت بە خۆیان سووربوون. وێڕای دروستبوونی دیاردەیەک کە دەتوانین بە کۆمەڵگای کورد ناوی ببەین، بە شێوەی چین و توێژگەلێک درێژەی بە بوونی خۆیدا کە ئادوارادە پارچـە پارچـە بووە و بە یەکتر نامۆبوون. کێشە کۆمەلایەتیەکانیش زیاتر بەشێوەی تەریقەتە جیاوازەکان ڕەنگیدەدایـەوە. ناکۆکیـەکانی نێـوان شـار و لادێ بەشـێوەیەکی تێکـەڵ بـە دابەشـبوونی چینایەتی پەرەیدەسەند. لە چاخی ناویندا هەموو شتێک لـە چـاخی یەکـەم زیـاتر دابـەش ببوو و ببوو بە کێشە. لەپاڵ کێشەکانی نیشتەجێبوون ـ ڕەوەندی قەبیلـە و خێڵـەکان، ئـەو کێشانەشی هـاتبووە سـەر کـە سـەرچاوەی خـۆی لـە نـاکۆکی شـار ـ گونـد و دابەشبوونی چینایەتی شار وەردەگرت. لە کاتێکدا چینە دەسەلاتدارەکانی قەبیلە بە شێوەی دەوڵەت چڕ دەبوونەوە، بەشە هەژارەکانی قەبیلە بچووک کراوەکە دەبوو بە قەبیلەیـەکی نـوێی هـەژار. کلتووری ژیانی پشتبەستوو بە لادێ بەرامبەر بە کلتووری پشتبەستوو بە شار دوا دەکـەوت. پێکدادان و ناکۆکی کۆمەلایەتی ناو کۆمەڵگای شاریش زیادی دەکرد. لە ئەنجامدا لە دەزگای دەوڵەت بەدوای چارەسەرکردنی تەواوی ئەو ناکۆکیانەدا دەگەڕان. هەرچی دەوڵەتـە مانـای خانەدانگـەلێکی مشـەخۆری زیـاتر و کەڵەکـەبوونی زیـاتری کێشـەکانی دەبەخشـی. ئیـدی کۆمەڵگای چاخی ناوین مەحکومی بازنەی دووبارەی ئەمجۆرە کێشانەی کۆمەڵگا ببوو.

جیاواز لە نوخبەکانی دەسەلاتی عەرەب، فـارس و تـورک کۆمـەڵگای کورد لـە چـاخی ناویندا نوخبەی بەهێزی دەسەلاتی تایبەت بەخۆی ئاوا نەکردبوو. نـە لـەڕێگای پاشـایەتی ناوەندی و یەکگرتوو دەتوانێت چارەسەری بۆ کێشە سەرەکیەکانی بدۆزێتەوە، نە بەشێوەی کۆمەڵگای نەریتی، مەبیو و داخـراوی قەبیلـەی جـاران دەتوانێـت بژێـت. زیـاتر لـە ڕێگـای کۆمەڵگای جەماعەتەکانی تەریقەتگەراو مەزهەبگەراییەوە هەوڵی وەلامدانەوەی ئەو کێشانە دراوە کە لەو ناکۆکیانەوە هـەڵقولابوون. ئیتـر زەردەشـتێتی پارچـە پارچـە و لاواز دەبـوو. عەلەویەتیش تەنیا لە ناوچە شاخاوییە سەختەکاندا دەیتوانی بوونی خۆی بپارێزێت کە بۆ فەتحکردن ئەستەم بوون. ئیسلامگەرایی دەسەلاتگەرای زاڵـیش بەسـەر خـەڵکی دەشـت و شـار چەنـدەی بڵێـی خەسڵەتی قۆسـتنەوەی هـەبوو. نوێنـەری سـوڵتانەکان و میرنشینە خۆجێییەکان کۆمەڵگایان لەناو کێشەگەلێکدا نقووم کردبوو کە بەرگەگرتنی زەحمـەت بـوو. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا لە جیاتی چارەسەرکردنی کێشەکان تەنیا ڕاکـردن و خۆدزینـەوە لـە کێشـەکان جێگـای بـاس بـوو. لـەو سۆنگەیەوە؛ ئوممەتگـەرایی و تەریقەتگـەرایی کـە وەک ڕێگەچارە پەنایان برابوویە بەر بەخێرایی دەبوون بە ئامرازەکانی نـامۆبوون و ڕاکـردن لـە ڕاستینەی خود. بە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بڵێین دیالیکتیکی چاخی ناوین بـە ڕێکـارێکی بەمجۆرە ڕەنگیدەدایەوە.

کێشە سەرەکیەکانی کۆمەڵگای کورد لە چوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا رەگی خۆی داکوتا و بوو بە فرە رەهەند. خودی مۆدێرنیتە وەک سیستەم هەوڵدەدات بە هەموو لایەن و بوارەکانیەوە کۆمەڵگا بخاتە ناو قەفەسەوە. خستنە ناو قەفەس مانای تێوەگلانی تەواوی کۆمەڵگایە بۆ ناو کێشە. لەپێناو کاراکردنی یاسای زۆرترین قازانج ئاواکردنی سیستەمێکی بەرفراوانی فشار و چەوسانەوە لەسەر کۆمەڵگا دەست لێبەرنەدراوە. بەڵام ئەو سیستەمەی فشار و چەوساندنەوە سەبارەت بە قووڵایی و بەرفراوانیەوە لە ئەوانەی چاخەکانی یەکەم و ناوین جیاوازترە. تەنیا جیاوازی لەنێوان ئەو زێدە ـ بەهایەی بۆ تێرخۆراککردنی خانەدانێتی پاشایەتی چاخی یەکەم و هەزاران قۆرخکاری پیشەسازی سەردەمی سەرمایەداری پێویستە، جێگای باس نییە، بەڵکو هەڵدێرێکی زەبەلاح لە نێوانیاندا لە ئارادایە. سەرجەم ئەو تەگبیرە ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابوورییانەی بەدرێژایی مێژوو لە پێناو نەبوونی سەرمایەداری بە سیستەمێکی زاڵ وەرگیران بەهۆی ئەو ترسە بوو کە ئەمجۆرە شێوازەی چەوسانەوە بەری پێناگیرێت. لەو قۆناغەدا کۆمەڵگا وەک سیستەمێکی زاڵ پێشوازی لە سەرمایەداری نەدەکرد. چونکە لە بەرامبەر سەرمایەداری مەحاڵە کۆمەڵگا لەسەر پێیان بمێنێتەوە. هۆکاری سەرەکی ئەمەش نەبوونی وەڵامێکی شێوازی چەوسانەوەی سەرمایەدارییە کە لە سروشت و ژینگەدا بەردەوام بێت. گەورەترین چەکی دەستی سەرمایەداری گۆڕینی دەسەڵاتی دەوڵەتە بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە تا بتوانێت خۆی وەک سیستەمێکی زاڵ ئاوا بکات. خودی دەوڵەت ـ نەتەوەش لەمیانەی بڵاوبوونەوەی دەسەڵات تا دەمارە ریشاڵەییەکانی کۆمەڵگا بەدیدێت. هەرچی ئەو کۆمەڵگایەیە کە دەسەڵات تا ناو دەمارە ریشاڵەییەکانی بڵاوبۆتەوە تەنیا تا مۆخی ئێسقان لەناو کێشەدا نقووم نابێت، بەڵکو پارچە پارچە دەکرێت و مەحکومی پەرتەوازەبوون دەبێت. لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا تەواوی کۆمەڵگا خراوەتە ناو قەفەسەوە. سنووری وڵات، سوپای نەتەوەیی، بیروکراسی ناوەندی سڤیل، کارگێڕی ناوەندی و خۆجێیی، بازاڕی نەتەوەیی، باڵادەستی ئابووری قۆرخکاری، دراوی نەتەوەیی، پاسپۆرت، ناسنامەی هاوڵاتی، پەرستگای میللی، قوتابخانەی سەرەتایی، یەک زمان و هێماکانی ئاڵا هەموویان بەیەکەوە ئەنجامێکی لەجۆری کاراکردنی یاسای زۆرترین قازانجی سەرمایەدارییان لێدەکەوێتەوە. ئەو پرۆسە و قۆناغەی لەلایەن سۆسیۆلۆگەکانی مۆدێرنیتە وەک دەربازکردنی کۆمەڵگای نەریتی و پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی مۆدێرنی هۆمۆژەن پێناسە دەکرێت، لە ناوەڕۆکدا گوزارشت لە کۆمەڵگایەک دەکات کە خراوەتە ناو قەفەسی ئاسنین و دەرگای لەسەر قوفڵ کراوە. تەنیا کاتێک بەگوێرەی یاسا و رێساکانی سەرمایەداری کۆمەڵگاکەی ناو قەفەس تەواو ماڵیکرا ئینجا سەربەست دەکرێت. ئەو سەربەستیەی بە لیبرالیزم ناو دەبرێت جگە لە کۆیلایەتیی هاوچەرخ هیچ مانایەکی دیکە نابەخشێت. لە کۆمەڵگای چاخی سەرمایەداری سووربوون لەسەر ئازادی وەڵامەکەی بەرامبەری فاشیزمە. فاشیزمیش ناوی خوێناویترین و ستەمکارترین سیستەمە. لێرەدا لە جیاتی بوونی کۆمەڵگا باسکردنی نەبوونەکەی واقیعیترە.

سۆسیۆلۆژیای ئەو سەردەمەمان بە ئەنقەست کۆیلایەتی سەرمایەداری شیکار ناکات، وەک پێویستیەکی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزمیش ڕەواکردنی کۆیلایەتی چینایەتی وەک ئەرکی سەرەکی دەستنیشان کردووە. لەو سۆنگەیەوە؛ زانستی نییە، خاوەنی تایبەتمەندیگەلێکی ئەفسانەیی کۆنەپەرستە. حوکمڕانی "پارە" سەردەمی فینانسی سەرمایە کە کۆنەپەرستترین و ستەمکارترین قۆناغی سەرمایەدارییە، گوزارشت لە هێزێک دەکات کە هیچ یەکێک لە خوداوەندە مێژووییەکان پێی نەگەیشتوون و لەوانەیە بە بەهێزترین خوداوەندی حوکمڕان و فەرمانڕەواکان ناوببرێت. ئەو خوداوەندە نەبێت، هیچ یەکێک لە سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزمیش بوونیان نابێت. لەسەرپێ هێشتنەوەی کۆمەڵگا لە بەرامبەر خوداوەندی پارە پێویستی بەهێزێکی گەورەی مانای مرۆیی و هێزی ژیانی کۆمەڵایەتی هاوبەش هەیە. شوێنەوارێکی ئەوتۆی ئەو کۆمەڵگایە نەماوە کە خاوەنی هێزێکی بەمجۆرە بێت. ئەزموونەکانی کۆمەڵگای سۆسیالیستیش کە بەو بانگەشە سەریانهەڵدا هێزێکی سنوورداری سەرکەوتنیان پیشانداوە، بەڵام زیاتریش لە تێکشکان ڕزگاریان نەبووە.

بەڵام چەندە شێوەیەکی مەحکوم بەرامبەر بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە ئارادابێت، دیسان جگە لە سووربوون لەسەر کۆمەڵگابوون و پاراستنی کۆمەڵگا هیچ ڕێگەچارەیەکی دیکەی نییە. کێشەکان چەندە بە ئاستی شێرپەنجەیی و ڕەهەندەکانی قەیران و کائیوس گەیشتبن، بەڵام بەرگریکردن لە بوونی کۆمەڵگا و هەوڵدان لە پێناو ئازادکردنی، مەرجی دەست لێبەرنەدراوی ژیانی مرۆیانەیە. ژیانی ئەلتەرناتیف یان ئەو ژیانە سەیرە ئەبستراکتەیە کە زۆرترین قازانج ئافراندوویەتی و لەسەرجەم بەها مرۆییەکانی داماڵیوە، یانیش ئەو ژیانەیە کە لە گۆڕستان ڕووبەڕووی ڕزین بۆتەوە .

ئەو سیستەمەی کۆیلایەتی کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر واقیعی کۆمەڵگایدا دەسەپێنێت، ڕوونترین دۆخەکەی لەو ڕەوشەدا دەبینرێت کە ڕاستینەی کۆمەڵگای کوردەواری تێی خزێنراوە. ڕاستینەی کۆمەڵگای کورد زۆر لەو دیوی کێشەیەکی کۆمەڵایەتی، لەڕێگای ژینۆسایدێک لەناو دەبرێت کە درێژخایەنە و سەرجەم پێکهاتەکانی گرتۆتەوە. کۆمەڵگای کورد وەک هەر کۆمەڵگایەکی دیکەی بە کێشە نییە، ئەو بوویەرانەی ڕوودەدەن گوزارشت لە دۆخێک دەکات کە بە کێشەبوونی دەرباز کردووە. سەبارەت بە تێگەیشتنی ئەو دۆخە بە عیبرەت و مەترسیدارەی تێی کەوتووە تەنیا سەیرکردنی زمانەکەی بەسە. دێرینترین زمانی مێژوو کۆت و بەندکراوە. تەنانەت خاوەن دایانگەکانیش نییە. لەوەش مەترسیدارتر خاوەنداریکردن لە زمانی کوردی و هەوڵدان لەو پێناوەدا، باجەکەی برسێتی و بێکارییە لەناو سیستەمدا. خودی کوردێتیش کراوە بە ئۆبژەیەکی بێنرخ. لەوەش خراپتر کێ زیاتر شەق لەو ئۆبژەیە هەڵبدات، سیستەم خاوەنداریتی لێدەکات و چانسی ژیانی پێدەدات. چەندە نکوڵی لە ڕاستینەی خودی کۆمەڵگای خۆت بکەیت و بچووکی ببینیت، بەو ڕادەیە لەناو سیستەمی نەتەوەی دەسەڵاتدار پەسەند دەکرێیت، چانسی دۆزینەوەی کار و پلە و پایەت بۆ دەڕەخسێت. ئەو ڕەوشە سیستەماتیکە سەبارەت بە سەرجەم ئاستەکانی بەهای کۆمەڵگای کورد پەیڕەو دەکرێت. لەکوێ کوردێکی بەناوبانگ هەبێت، پارەی زۆری هەبێت و لە کارەکەشی دڵنیابێت، مسۆگەر ئەو کوردە یان فێڵێک لە

کۆمەڵگای خۆی دەکات، یان لەناو هەوڵێکی بە ئەنقەستی نکوڵیکردن و نامۆبوون دایە. هەرچەندە لەو قۆناغانەی دوایی هەندێک کەسایەتی کورد وەک رووخسارێکی نەتەوەیی پێشکەش بکرێن، بەڵام پێویستە زۆر باش بزانین کە تەواوی ئەو هەوڵانە لە نزیکەوە گرێدراوی بەرژەوەندییە جیهانگیریەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە.

سەرباری سەرجەم ئاسیمیلاسیۆن، داگیرکاری و فەتحکارییەکانی هێزە باڵادەستەکان، لەسەرووی هەمووشیانەوە فەتحکاری قەومی عەرەب، تورک و فارس، بەڵام بە کۆمەڵگابوونی کوردە یەکەمینەکان لە چاخی ناوین پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی. کۆمەڵگای قەبیلە و جەماعەت بە ئاراستەی کۆمەڵگای قەوم خۆیان بەرەو پێشەوە دەبرد. ئەو کێشانەی سەریانهەڵدا کێشەکانی زادەی دەوڵەت و دەسەڵاتی پلەداری بوو کە بۆ سەرجەم کۆمەڵگاکان جێگای باس بوو. دەتوانین بڵێین؛ کاتێک کۆمەڵگای کورد چاخی ناوینی بڕی لە زۆر کۆمەڵگاکانی ئەو سەردەمە پێشکەوتووتر بوو. بە ئەندازەی ئەو کێشانەی دووچاری هاتووە وەڵامیش دەداتەوە، بگرە لە چارەسەرکردنی کێشەکانیدا پێشەنگایەتی بۆ چەندین کۆمەڵگاش دەکرد. وێڕای سەرجەم هێرش، دەستدرێژی، داگیرکاری و چەوساندنەوەکانی فەتحکاران، تێکۆشانی بەرگری خۆیی کۆمەڵگا و ژیانی ئازاد بێوچان بەردەوام بوو. بەمجۆرە کێشەیەکی جددی بوون و کۆیلایەتیەکی زۆر جیاوازتر لە هاوشێوەکانی جێگای باس نەبوو.

لەسەردەمی سەرمایەداریدا ئەو دۆخە بەشێوەیەکی ریشەیی گۆڕاوە. لەبەرئەوەی خۆی بەگوێرەی یاسای زۆرترین قازانج رێکنەخست، بە شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبوو بە دامەزراوەیی و پیشەسازی سەفەربەر نەکرد گەلی کورد خۆی لە بەرامبەر هێرشی هەمەلایەن، داگیرکاری، چەوسانەوە، ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان، قۆرخکاریەکانی سەرمایەداری و هەژموونگەراکانی سیستەم بینیەوە. ئەو دۆخەش لەگەڵ هیچ یەکێک لە رووداوەکانی فەتحکردنی کیشوەری ئەمریکای سەدەی شازدەهەم و کۆلۆنیکردنی ئاسیا لەسەدەی هەژدەهەم و داگیرکردنی ئەفریقیا لە سەدەی نۆزدەهەم بەراورد ناکرێت. ئەو واقیعە زاڵەی مۆرکی خۆی لە ژیانی کۆمەڵگای کوردەواری داوە زۆر جیاوازتر بوو. ئەو رژێمەی حوکمڕانی کوردانی دەکرد رژێمێکی قڕکردن و لەناوبردن بوو کە بەر لە هەموو شتێک دانی بە بوونێک دانەدەنا کە ناوی کورد بێت، ئەگەر بوونیشی هەبێت ئەوا بە ئامانجی تواندنەوەی لەناو بۆتەی خۆیدا خۆی رێکخستووە، بە بایەخەوە کۆڵەکە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی ئاواکردووە و بووە بە دامەزراوە و بەردەوام لەمیانەی ستراتیژی و تەکتیکی پیلانگێرانەوە بەڕێوە دەبرێت. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە کرانەوە بەرووی گلۆلە قورسەکەی کێشەکان و کۆمەڵکوژییە یەک لەدوای یەکەکان، لەژێر مەنگەنەی وشکی فەتحی نوێ و دەوڵەت ـ نەتەوە کرانەوە بۆ تاڵانی سەرمایەداری جێگای باسە. مەحاڵە سیستەمێکی بەم چەشنە بە ژینۆساید ئەنجامگیر نەبێت. هەڵبەتە رووداوەکانیش بەو ئاراستەیەدا بوو .

لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا هەروەک گشتی کێشەی کوردیش هەوڵیدا خۆی لە ئاستی "نەتەوەیی"دا بخاتەڕوو. کاتێک دەڵێن کێشەی کورد، یەکسەر وەک کێشەی نەتەوەیی

بەبیری مرۆڤدا دێت. لە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەل زیاتر وەک پێویستیەکی هەلومەرجی سیاسی بووە. ئەوە هەڵسەنگاندنێک بوو کە ماهیەتە ڕاستەقینەکەی لە یەکێتی یان یەکپارچەییەکەی کۆمەڵگای - مێژوویی دوور بوو. پشتی بە هەڵوێستێک دەبەست کە لە شێوەی خۆنواندن بوو تا دۆستان لە بازاڕ ببینن. هەڵوێستگەلێکی دوور لە پێناسەی واقیعی و چوارچێوەی تیۆری جێگای باس بوو. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەبوو کە تەنیا ڕاستینەی کورد بە کێشە نەبوو؛ هەر کەس و هەر شتێکی پەیوەندی بە کوردێتیەوە هەبوو بە کێشە دادەنرا. هیچ کەسێک نەبوو بە هەست و فیکر خۆی بە کێشە دانەنێت. لە بنەڕەتدا ئەوەی کێشە بوو سەبارەت بە ماهیەتی واقیعی ژیانکراو بوو، هەڵوێستە جیاوازەکانی سەبارەت بە چییەتی و چۆنێتی سروشتی کۆمەڵگای کورد بوو. هەڵبەتە کاتێک هەر کەس و هەموو شتێک بە کێشە دابنرێت، ناوەرۆکی کێشەکانیش لەبەرچاوان بزردەبێت، لێکۆڵینەوە و توێژینەوەکانیش بەهایەکیان نامێنێت.

وەک کەس لەژێر بەرپرسیارێتی خۆمدا بەردەوام شکاندنی ئەو بازنە دووبارە بۆوەم بە مەسەلەی سەرەکی داناوە. یەکلاکردنەوەی دیاردەی کورد و ڕوونکردنەوەی لایەنە تایبەتەکانی کە دیماگۆژیەتێکی زۆری لەبارەوە دەکرێت، بەڵام لە دۆخێکی زۆر قورستر لە ڕەوشی دیاردا دەژیت: ناوەڕۆکی کێشەکەی پێکدەهێنا. ئەو هەڵوێستانەی سەرەتا لەمیانەی گەردوونیبوونی کێشەی نەتەوەیی هەوڵی پیشاندانیم دا، لەماوەیەکی کورتدا بە چەسپاندنی "کوردستان کۆلۆنییە" ئەنجامگیر ببوو کە ئەویش گەردوونییە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو ڕەچەتەیەی بۆ کێشەی کوردستانی کۆلۆنی بیری لێدەکرایەوە تیۆری بەرچاوی ئەو قۆناغە "ڕزگاری نیشتیمانی"و پراکتیکە بەرچاوەکەی "شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی"بوو. بێگومان لەمیانەی ئەو دەستەواژە، تیۆری و کردارانەوە زۆربەی کێشەکانی ناواخنی ڕاستیەکە دەستەبەر کرابوون. بەڵام هەروەکو لە هەر گشتێکردنێکدا جێگای باسە، ئەو گشتێکردنەش لایەنە هەڵە و ناتەواوەکانی ئاشکرا دەبوو. بەتایبەتیش ئەگەری دیالۆگی نێوان موخاتەبەکانی کێشەکە، هەڵوێستی کۆنکرێتی دەرهەق بە واقیعەکەی دەکرد بە ناچارییەک. کاریگەریەکانی پۆست مۆدێرنیزمیش کە لە ساڵانی ١٩٩٠کان بە بەسەرچوونی مۆدێرنیتە لە تەواوی جیهان دەستی پێکرد ڕۆڵی لەو فشار و ئەستەمکردنەدا دەبینی. هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە ڕاستیدا مانایەکی لەجۆری هەڵوەشانەوەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبرالیشی لەخۆوە دەگرت. ئەوەی دۆڕا و هەڵوەشایەوە سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو مەزهەبەکانی لادانی چەپڕەوی لیبراڵ و گومڕا بوو. هەڵوێستێکی بەرجەستەتر سەبارەت بەڕاستینەکە، لە نزیکەوە گرێدراوی ئەو هەڵوەشانەوەیەی لیبرالی چەپڕەو بوو. لە ئاکامدا چەندە لایەنی دۆگماتیک ـ پۆزیتیفیستەکانی ناواخنی تێگەیشتنی ڕاستینەی مارکسیستی خۆی دەدا بە دەستەوە، دەرفەتی تاوتوێکردنی ڕاستینەی کۆمەڵگا لەمیانەی دیدگایەکی مێژوویی، فەلسەفی، هونەری و زانستی دەڕەخسا. بەتایبەتیش لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەدا لێکۆڵینەوە، توێژینەوە و ڕاڤەکردنی سەرمایەداری لەسەر بنەمای هەر سێ کۆڵەکە سەرەکیەکەی: مەیلی زۆرترین قازانج، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم لە بواری زانستی کۆمەڵایەتیدا ماهیەتێکی قەڵەمبازانەی هەبوو. ئەو شتەی لەسەر ئەو بنەمایە

هاتەئاراوە شۆڕشی بواری زانستی کۆمەڵایەتی بوو. ئیتر ئاشکرا دەبوو کە مارکسیزم و پراکتیکەکەشی سۆسیالیزمی بونیادنراو، کە خوازیاربوون خۆیان وەک زانستی کۆمەڵایەتی و سۆسیالیستی بنوێنن، لەراستیدا خۆیان لە زهنیەتی دۆگماتیک، پۆزیتیڤیستی میتافیزیکانە جیا نەکردۆتەوە .

کاتێک لەمیانەی ئەو دیدگا نوێیەی زانستی کۆمەڵایەتیەوە سەیری راستینەی کورد و بونیادە بەکێشەکانی هەناوی بکرێت، ئەو کاتە دەکرێت بەشێوەیەکی بەرجەستە و یەکپارچە شرۆڤە بکرێت. وەک چۆن دەرک بە ماهیەتی دۆگماتیکانەی هەڵوێستە رەهاکان کرا، دەرک بەوەش دەکرا کە رێژەییکردنی زێدەڕۆییانەش مەترسی هەمان ئەنجامی دۆگماتیکانە لەخۆوە دەگرێت. لە ئەنجامدا دەرفەتی پیشاندانی هەڵوێستێکی نزیکتر بە حەقیقەت سەبارەت بە راستینەی دیاردەی کورد و کێشەکانی دەڕەخسا: کە دیاردەیەکی زۆر ئاڵۆزە، پارچەکراوە و بەخێرایی لەناو دەچێت، کێشەکانیشی زۆر بەرفراوان و یەکپارچەیە. بە ئەندازەی دۆخە بونیادیەکەی ریشەی مێژوویی خۆی هەیە. شیکارە کۆنکرێتی و بەرجەستەکان، دەرفەتی ئەو رێگەچارە بەرجەستانەی دەڕەخساند کە بەهای پراکتیکی و جێبەجێکردنی لەسەر کێشەکان بەرزترە .

سۆسیۆلۆژیا و زانستە کۆمەڵایەتیە مۆدێرنەکانی بە ئاساییکردن و رەواکردنی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەرکدارکراون، بە پێچەوانەی بانگەشەکانیان لە تاوتوێکردنی راستینەی کۆمەڵگای مێژووییدا جگە لە سەرلەنوێ داهێنانەوەی دوالیزمە نموونەییەکانی چاخی ناوینی لە جۆری سپی ـ رەش و باش ـ خراپ تێپەڕیان نەکردووە. تەنیا دیاردەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەس بوو تا راستینەی کۆمەڵگای مێژوویی تەخت بکات. بگرە دەکرێ بگوترێت پشتی بە میتافیزیایەکی زۆر رووکەشیانە دەبەست کە ناتوانێت ببێتە پۆتانسێلی هزر و هەستە بەرهەمدارەکان. دەوڵەت ـ نەتەوەش وەک پۆتانسێلێک لەدوا قۆناغدا جگە لە ئافراندنی فاشیزم ئەنجامێکی دیکەی لێنەدەکەوتەوە. پێکهاتەکانی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج جگە لە لەناوبردنی کۆمەڵگا و ژینگەکەی رۆڵێکی دیکەی نەبوو. ژیانێکی کۆمەڵایەتی یان بایۆلۆژی جێگای باس نەدەبوو کە پشت بە ئیندوستریالیزم ببەستێت. ئەوەی خودی زانستەکانی مۆدێرنیتە بە پێی تواناکانی رەوای کردووە و کردوویەتی بە پێوەر جگە لەو فاکتەرانە شتێکی دیکە نەبوو .

کاتێک لە قووڵاییەوە هەڵوێست سەبارەت بە کێشەی کورد پیشانبدرێت، ئەو کاتە دەبینرێت خودی ئەو هەڵسەنگاندنانەی بەناوی کێشە و رێگەچارە پێشکەشکراون خۆیان بە کێشەن. چونکە فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەژێر کێشەی کورددا شاراوەیە. لەو سۆنگەیەوە؛ لەمیانەی پشتبەستن بەو فاکتەرانەوە ئەنجامدانی شیکار و پێشخستنی رێگەچارەی کرداری جگە لە خۆخەڵەتاندن هیچ رۆڵێکی دیکەی نابێت. دیالیکتیکی کێشە ـ چارەسەری کە بەشێوەیەکی گەردوونی لە ئارادابوو، لە ئاکامدا لەمیانەی قەیرانە قووڵەکەی سەرمایەی فینانسی جیهانگیری بێچارەیی خۆی سەلماند. ئەو کێشانەی دەوڵەت ـ نەتەوەی زادەی مۆدێرنیتە لە خۆرهەڵاتی ناوین ئافراندوویەتی لە رۆژی ئەمڕۆماندا ئەنجامەکەی ناوچەیەکی کائیوس و کۆمەڵگا بە قەیرانەکانە. ئایدیۆلۆژیاکانی میلیگەرایی

و دەوڵەتگەرایی و هەوڵەکانی بە دامەزراوەکردنیان لە ئەفغانستانەوە تا لوبنان، لە چاچانستانەوە تا دەگاتە یەمەن لە چەندین وڵات مەیدانیان کردووە بە گۆلی خوێن. دەوڵەت ـ نەتەوەی سوننی ئێراق کە کەوتۆتە ناوەڕاستی هەردوو هێڵ، وەک فیلمێکی دۆکۆمێنتی تراژیدی لە کەسایەتی خۆیدا مایەپوچبوونی شارستانی نەریتی و شارستانی سەرمایەداری پیشاندەدا، ڕاستیەکی زۆر بە ئێش و خوێناویی بەرجەستەی خستەڕوو.

سەرجەم ئەو فاکتەرانەی لە چوارچێوەی ڕاستینەی کورد هەوڵی شیکارکردنیمدا، لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەدا لەجیاتی نەتەوەبوون کەوتنە قۆناغی دەرکەوتن لە دۆخی نەتەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ لە جیاتی کێشەی نەتەوەیی کورد، کێشەی بە نەتەوە نەبوون دەردەکەوێتە پێش. نیشتیمانی دایک ناکرێت بە نیشتیمانی نەتەوەیی، بە پێچەوانەوە وەک وڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان پیشاندراوە. واتە شوێنە سەرەکیەکەی نەتەوەبوون لە دۆخی نیشتیمانی دایک دادەماڵرێت، لە چوارچێوەی موڵکی نیشتیمانی نەتەوەکانی دیکە هەڵدەسەنگێنرێت. خودی بوونی نەتەوەیی بەر لەوەی ببێت بە بوونی نەتەوەیی کورد، هەوڵدراوە لەناو بۆتەی نەتەوە دەسەڵاتدارەکاندا بتوێنرێتەوە. لەلایەن کلتووری دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب، تورک و فارس دەکرێت بە ئۆبژە، داگیردەکرێت و لە ڕێگای ئاسیمیلاسیۆنیشەوە دەتوێنرایەوە. سەرجەم هێزەکانی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەش لەو پێناوەدا سەفەربەر دەکران. لەو خاڵەدا کێشەکە هێندە قورس دەبوو کە بەئاستی دەرکەوتن لەدۆخی نەتەوە دەگەیشت. ئەو چین و توێژە کۆمەڵایەتیانەی وەک هێزی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی لە مۆدێرنیتەدا هاتنە مەیدانەوە هەڵوێستیان سەبارەت بە کێشەی کورد دووفاقی بوو. کاتێک چینی باوی دەسەڵاتدار بوو بە بۆرژوازی، لە بەرامبەر وەرگرتنی پشک لە داهاتی دەوڵەت بەکرێگیراوێتیشی دەربازکرد، ئیتر دەبوو بە ئامرازی تکوڵیکردن و هەموو جۆرە لەناوبردنێکی کوردان. چینی بۆرژوازی بچووک بەهۆی لاوازیەکەیان و پێویستییان بە داهاتی دەوڵەت، جگە لە فاکتەرە دیماگۆژیەکانی کێشەکە ڕۆڵێکی دیکەیان نەدەبینی. بەمجۆرە هەردوو هێزی مۆدێرنیش لە دۆخی فاکتەری چارەسەرکردنی کێشەکە دەردەکەوتن. توێژەکانی دیکەش کە زۆربەیان بێکار، نیمچە پرۆلیتار و زەحمەتکێش بوون بەشێوەیەکی بابەتی دەبوون بە هێزە سەرەکیەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد. لەو چوارچێوەیەدا کێشەی کورد کێشەیەکی بۆرژوازیەکان نەبوو، بەڵکو دەبوو بە کێشەی کۆمەڵگای ڕەنجدەر و زەحمەتکێش.

هەر سەرهەڵدانێکی ئیرادەی سیاسی کە بۆ نەتەوەبوون پێویستە بەشێوەیەکی بێبەزەییانە سەرکوت دەکرێت. ئەمانەش لەژێر ناوی چەواشەکاریەکانی "یەکێتی و یەکپارچەیی دەوڵەت" ئەنجامدەدرێن؛ یەکسەر مۆرکی "جوداخوازی"و "پارچەکردنی وڵات"یان لە کلتووری سیاسەتی دیموکراتیانە دەدا کە مەرجێکی ژیانی بوونی کۆمەڵگایە، بەمجۆرە ئەو کردەوانە پەردەپۆش دەکران کە بەئاستی ژینۆساید دەگەیشتن. بواری ئابووری وەک ئامرازی تێکدانی دۆخی نەتەوە یان دەرخستن لە نەتەوە بەکاردەهێنرێت. خودی ئابووری کراوە بە گرنگترین ئامرازی پێشگیریکردنی نەتەوەبوون. سەبارەت بە ناسنامەی کورد دەرفەت بەهیچ ستاتۆ و بەڵگەیەکی یاسایی نادرێت. بەر لەوەی ناسنامەی کورد بۆ

نەتــەوەبوون وەرچــەرخێت بــە ناپاســایی و بێمــافی دادەنــێن و لــەو بارەیــەوە بــە نــەبووی لەقەڵەم دەدەن؛ مەحکومی ناسنامەیەک دەکرێت کە هــیچ پەیوەندییــەکی بــە یاســاوە نییــە، بێناو و بێ پێناسەیە. کۆمەڵگایەکی نزیکەی چل ملیۆنی لە یاسای نەتەوەیی و نێودەوڵەتی بە نەبوو دانرابوو. لە کاتێکدا لە مۆدێرنیتەدا پەروەردە گرنگترین ئامرازی بەنەتەوەبوونە، هەر لە قۆنــاغی قوتابخانەی ســەرەتاییەوە ناســنامەی مێژوویــی و کۆمەڵایــەتی کــوردان لــە سیستەمی پەروەردەی نکوڵیکاری نەتەوە دەسەڵاتدارەکان لە ناسنامەی خۆی دادەبڕێنرێت. ئامرازێکی گرنگی کۆمــەڵگابوونی وەک پــەروەردە، ســەبارەت بەناســنامەی کــورد کــراوە بــە ئامرازێکی دەستبەردابوونی ناسنامە و کۆمەڵگابوون. وەک چۆن پەروەردە بەزمانی دایک لە زۆربــەی بەشــەکان قەدەغــە کــراوە، زمــانی نەتــەوە دســەڵاتدارەکان لــەجێگای زمــانی دایــک جێگیرکراوە؛ لەجیاتی بــەکارهێنانی زمــانی دایــک وەک ئــامرازێکی کۆمــەڵگابوون، دەکرێــت بەبیانووی راکردن لــە کۆمــەڵگابوون. لــەجیاتی ئــەوەی وەک زهنیــەتی کلتــووری کــوردێتی گەیشتن بە هۆشیاری خود بە بیری مرۆڤدا بێنێت، دەکرێــت بــە نیشــانەی رادەســتبوون بــە کلتووری نەتەوەی دەسەڵاتدار.

بۆ نموونە؛ ئەگەر لەگەڵ گەلانی ئەفریقیا بەراورد بکرێت، ئەوا زۆر بە روونی دەبینرێت کە ئاستی نەتەوەبوونی گەلی کورد زۆر لەهی گەلانی ئەفریقیا دواکەوتووتر هێشتراوەتەوە. بێگومــان ئــەوەش پەیوەنــدی بــە جیــاوازی نێــوان ئــەو دەوڵــەت ـ نەتەوانــەوە هەیــە کــە مۆدێرنیتــەی ســەرمایەداری پــەیڕەو دەکــەن. کــوردان بــە ئیــرادەی خۆیــان فاکتــەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پەیڕەو ناکەن. دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکانن کە پــەیڕەو و جێبــەجێی دەکــەن. کاتێــک بــەمجۆرەش بێــت ئــەو دەوڵەتانــەی دان بــە مــافی نەتــەوەبوونی راستینەی کورد دانانێن، رژێمێکی فاشیستانەی تایبــەت ســەبارەت بــە کــوردان دەدۆزنــەوە، بەردەوام چەرخی نکوڵی و قڕکردن دەخەنەگەڕ. ئەو ئەنجامــەی دێتــە ئــاراوەش دەرکــەوتنی کوردانە لە دۆخی نەتەوە و کێشەی بەنەتەوە نەبوونە.

لە هەلومەرجە جیاوازەکــانی کــات و شــوێن و رەهەنــدە هەمــەجۆرەکان کێشــەی کــورد لەمیانــەی ماهیەتــە جیاوازەکانیــەوە خــۆی دەخاتــەڕوو. بــە ئەنــدازەی ئــەو خەســڵەتە ســەرەکیانەی ئــەو رەهەندانــە بــە هەلومەرجــەکانی کــات و شــوێن دەبەســتنەوە، کــوردان تایبەتمەندیگەلێکیان هەیە کە جیایان دەکاتەوە و دەیانکات بە تاقانــە. هەوڵــدەدەین ئــەوە بەرجەستەتر بکەین.

أ ـ شێوازی ژیان و پەرەسەندنی راستینەی کورد و کوردستانی ژێر حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک هــەر لــە ســەرەتاوە رووبــەڕووی رژێمێکــی وشکی نکوڵی و قڕکردنــە. ئــەو دۆخــەش هــەر لەســەرەتاوە بــەهۆی کێشــە قورســەکانەوە رێگــا لــە پــێش ســەقەتبوون و ئیفلیجبوونی راستینەکە دەکاتــەوە. بــەپێی بەســەرچوونی کــاتیش فاکتــەرەکانی ناسنامەی لەدەستدەدات. بەر لە نەتەوەبوون، سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک، بەنەتەوە نەبوون بە مانایەکی دیکە دەستبەردان لە نەتەوەبوون، رەدکردن و نکوڵیکردن لە خود دەسەپێنێت. ئەو دۆخەش واقیعێک پیشاندەدات زۆر لەودیوی کێشەیە، لە هەر لایەنێکەوە ســەیر بکرێــت رژێمێکــی ژینۆســاید پێناســە دەکــات کــە ناوەکــەی دانــەنراوە. ئــەوەی جیــاوازە، رژێمێکــی

ژینۆسایدە کە بەشێوەیەکی نهێنی و داپۆشراو پەیڕەو دەکرێت. جیاواز لە دۆخی ئەرمەنی و هێلینیەکان، لەکاتێکدا ئەو گەلانە لەمیانەی پەیڕەوی ئاشکراوە لەناو دەبران، کوردان دووچاری لەناوبردنێکی بەفێڵ و تەڵەکەبازانەی پڕ لە خیانەت، بەکرێگیراوی، ناسۆری، بێکاری، برسێتی و ئەشکەنجەیەک دێن کە بەنهێنی و داپۆشراوی بەڕێوە دەچێت. ئەوەی لە ئارادابوو کێشەی بوون بەنەتەوە نەبوو، بەڵکو مەسەلەی بێکاریگەرکردنی ڕێگا و ڕێبازەکانی لەناوبردن بوو. بەشێوەیەکی سروشتیش ناچارییە کە ناوی وەستاندنی ئەو قۆناغەش بزووتنەوەی زیندووکردنەوە (ژیانەوە)ی ئازادی کوردان بێت. جگە لەمەش هیچ ڕێبازێکی دیکە، بەتایبەتیش بۆرژوازییە لیبراڵە ساختەکارەکان و ڕێبازی وردەبۆرژوا خۆ بەزلزانە بەناو میللیگەرا و چەپڕەوەکان توانای وەستاندنی قۆناغی نکوڵی و قڕکردنیان نەبوو: نەیاندەتوانی لەو پێناوەدا دەستەواژە و کردارگەلێک داهێنن. بەرامبەر ئەوجۆرە ڕژێمانە کێشەی بوون جێگای باسە. ڕێگەچارەکەشی تێکۆشانی زیندووبوونەوە و هێزی ژیانی ئازادە.

ب ـ دۆخی ژیانی ڕاستینەی کوردان و کوردستانی ژێر حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێران لە مۆدێلەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک زۆر جیاوازتر نییە، جیاوازیەکەیان سەرچاوەی خۆی لە جیاوازی مۆدێرنیتەکەیان وەردەگرێت. ئەو ڕاستییە کۆمەڵایەتی و مێژووییە جیاوازەی پێیدا دەربازبوون لە مۆدێلەکانی جێبەجێکردنیشدا ڕێگای لەپێش جیاوازی ڕووکەشی کردۆتەوە. میراسی ئەو دەسەڵاتەی هەردووکیان پشتی پێدەبەستن پەیمانامەی قەسری شیرینی ساڵی ١٦٣٩یە کە بە فەرمی کوردستانیان دابەشکرد و کوردانیان لاوازکرد، لە سەردەمی مۆدێرنیتەشدا بەیەکەوە دژی سەرهەڵدانەکانی کوردان وەستاونەتەوە، بەمجۆرەش ڕێگایان لەپێش ڕژێمێکی هاوبەشی نکوڵی و قڕکردن کردۆتەوە. سنووری نێوانیشیان لەسەر بنەمای چارەسەرکردنی کێشەی کوردە لە بەرژەوەندی خۆیان و لەو چوارچێوەیەدا بەیەکەوە هەنگاو دەنێن. ئەو ڕێککەوتنە ئانتی ـ کوردەی لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا لەنێوان هەردوو دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک و ئێران ئەنجامدراوە ئەو ڕاستییە مێژووییە دەسەلمێنێت.

ج ـ ڕاستینەی کورد و کوردستانی ژێر حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئێراق تا ڕادەیەک ڕێچکە و ئاراستەیەکی جیاوازتری گرتۆتەبەر. هەژموونگەرایی ئینگلیز ڕۆڵی دیاریکەری لەو دۆخەدا هەبووە. درەنگ ئاواکردن و لاوازی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەب تۆزێک دەرفەتی پەرەسەندنی بوونی نەتەوەیی کوردانی داوە. ڕژێم چەندە دژوار بووە بەرخودانی کوردانیش دژوار بووە. کاتێک ئەو دژواربوونە بەشێوەیەکی دوولایەنە بەردەوام بووە، قۆناغێک بۆ کوردان دەستپێکردووە کە لەلایەنی لەناوچوون زیاتر لایەنی بوون دەرکەوتۆتەپێش. لەگەڵ جێگیربوونی هەژموونگەرایی ئەمریکا لەو قۆناغانەی دواییدا ئەگەر ماهیەتێکی فیدڕالیشی هەبێت بەڵام کوردان چانسی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووکیان بەدەست هێناوە. بەڵام ئەو چانسە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە دراوسێکان و بگرە خودی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی ئێراق بەردەوام وەک هەڕەشەیەک دەبینرێت و لە یەکەم دەرفەتیشدا ئامانجیان لەناوبردنێتی. لە هەردوو دۆخیشدا ڕێگای نەتەوەبوون و دەرکەوتن لە دۆخی نەتەوە

کراوەیە، هەربۆیەش کێشەی بوون و ئازادی کوردانی باشوری کوردستان و ئێراق بەردەوامە.

د ـ ئەو کێشانەی کوردانی ژێر حوکمڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی سوریا دووچاری هاتوون لە توانەوە لەناو سیستەم زیاتر سەرچاوەی خۆی لە پەراوێزکردن و دوورخستنەوەیان لە سیستەم وەردەگرێت. بەشێکی کوردان بە نەبوو دادەنرێن. پشتێنەی عەرەبی پێشخراو لەسنوورەکان لەماوەی درێژخایەندا ئامانجی تواندنەوەی کوردانە. ئەو سنوورانەی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لەلایەن هەژموونگەرایی بریتانیا و فەرەنسا کێشران دووەمین دابەشبوونی مەترسیداری کوردان بوو. لەسەربنەمای بەرژەوەندی هاوبەشیان لەگەڵ هەژموونگەرایی تورک ئامانجیان لەناوبردنی کوردان بوو. سەبارەت بە کوردان ئەو دابەشکردنە جەرگبڕترین هەنگاوی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو. وەک چۆن نەتەوەبوونی کوردانی بەربەست کرد، دەرکەوتن لە دۆخی نەتەوەشی ئاسان کرد. بەتایبەتیش هەژموونگەرایی بریتانیا سەبارەت بە بەڕێوەبردنی خۆرهەڵاتی ناوین بەکارهێنانی دۆخ و کێشەی کوردی بە گونجاوترین رێبازەکانی بەدەستهێنانی بەرژەوەندیەکانیان بینیوە. بەمجۆرەش بە ئەنقەست کێشە ئافرێنران و کراون بە یەکێک لە ستوونە سەرەکیەکانی بەردەوامکردنی سیستەم.

لە ئەنجامدا سەرجەم کردەوەکانی پارچەکردنی نیشتیمانی کوردان و نکوڵیکردنی، لە قووڵاییەوە دابەشکردنی راستینەی کۆمەڵگایان و دوورخستنەوەیان لە خاوەنداریێتیکردنی خۆیان، بەربەستکردنی ئیرادەی سیاسییان، ناچارکردنیان بۆ ملکەچکردن بەرامبەر رێبازەکانی نکوڵی و قڕکردنی دەوڵەتان، گۆڕینی دابینکردنی پێداویستییە ئابوورییەکان بۆ ئامرازی دەستبەرداربوون لە ناسنامەی خۆیان، داننەنان بە ستاتۆ و دەرفەتێکی یاسایی بوونێکی ئایدیۆلۆژی و کلتووری پشتبەستوو بە ناسنامەی خۆیان، بێبەشکردنیان لە ئامراز و کردە هاوچەرخەکانی پەروەردە وایدەکرد کێشەی کورد بۆ کێشەیەک بگۆڕێت کە بوون و ناسنامەکەیان بە نەبوو دادەنرێت و دەرفەتی ژیانی ئازادییان پێنادرێت. بە مانایەکی تر ئیتر کێشەی کورد کێشەیەکی نەتەوەیی نەبوو، دەبوو بە کێشەی دەرخستن لە دۆخی نەتەوە .

لەگەڵ بەردەوامبوونی پارچەبوون و بەهێزبوونی رژێمەکانی نکوڵی و قڕکردن لەسەر هەر بەشێک ئیتر کێشەکە وەک کێشەی نەتەوەبوون نامێنێت، بۆ کێشەی درێژەپێدانی بوون بچووک دەکرێتەوە. ئەگەر لە پاکتاوکردنی یەکجارەکی بووندا لەناوبردنی جەستەیی رێبازی سەرەکیش نەبێت، بەڵام ژینۆسایدی رەهەندی کلتووری واقیعێکە کە بەردەوام روودەدات. وەک چۆن لە ژینۆسایدی ئەرمەنی و یەهودیەکان روویداوە ئەنجامنەدانی راستەوخۆی قڕکردنی جەستەیی پرۆسەکەی بە ئێش و ئازارتر دەکرد. ئاشکرایە کاتێک سەرجەمی ئەو هۆکار و فاکتەرانە رەچاو بکرێت لە کێشەی کورد زیاتر باسکردنی گرێکوێرەی کورد واقیعیترە. وەک چۆن ئەسکەندەر بە شمشێرەکەشی بێت کاتێک گرێکوێرەی گۆردۆنی کردەوە دەرفەتی فەتحکردنی تەواوی ئاسیای رەخساند،

چارەسەرکردنی گرێکوێرەی کوردیش فەتحی دیموکراتیانەی سەرجەم کۆمەڵگاکان ــ لە سەرووی هەموویانەوە خۆرهەڵاتی ناوین ــ و چانسی ژیانی ئازاد دەڕەخسێت.

### ب ـ مێژووی بزووتنەوەی کورد

بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان بوویەرێکی پەیوەست بە هۆشیارین. بگرە ئەگەر هۆشیارییەکی سەرەتاییش لەئارادا نەبێت بزووتنەوەکان لە خۆیانەوە توانای ژیانیان نییە. کاتێک کۆمەڵگا جێگای باس بێت، هۆشیاری و سۆبژەبوون دۆخێکی تایبەتتر وەردەگرێت. ئەوەی لە چوارچێوەی گەردوونیدا دەرفەتی بە بزووتنەوە یان جوڵە داوە وەرچەرخانی دیالیکتیکیانەی وزەیە بۆ دۆخی جیاواز. خودی وزەش لوغزێکە؛ بەڵام ئاگادارین کاتێک گۆڕانکاری بەسەردا دێت جوڵە یان بەمانایەکی تر پێکهاتە ئاوا دەکات. هەروەها ئاگاداری ئەوەشین ئەگەر بوون و کات نەبێت جوڵەش جێگای باس نابێت. ئەو لوغزەی بە وزە ناو دەبرێت کاتێک لە زەماندا خێرایی بەدەست بێنێت، لە شوێنیشیدا مەودا ببرێت دەبێت بە جوڵە. ئەوەش مانای پێکهاتن و پەیدابوونە. کاتێک ئەو پەرەسەندنانە راڤەبکەین کە لە یەکەمین گەورە تەقینەوە(بیگ بانگ)ی بانگەشە بۆکراو تا کۆمەڵگای مرۆڤ روویانداوە، دەبینین کە ئەوانەی باسدەکرێن جگە لە دۆخە جیاوازەکانی وزە شتێکی دیکە نییە. باسی خۆبونیادنانی گەردوون دەکەین لە ڕێگای وزەوە. لە فیزیاوە تا دەگاتە بایۆلۆژی لەو بارەیەوە زانستەکان پێناسەی زانستی گرنگییان داهێناوە. ئەوانەش هەموویان پەیوەندییان بە وەرچەرخانی وزە بۆ دۆخی ماددە هەیە. بۆ ئەوەی زانست فەراهەم بێت، بەلانی کەم سەبارەت بە زهنیەت و ڕێبازی خۆرئاوا پێویستی بە پێشخستنی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە هەیە. سیستەمی شارستانی خۆرئاوا لە نزیکەوە گرێدراوی ئەو پەرەسەندنە زانستییە کە لەناوەرۆکدا پشتدەبەستێت بە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە. مێژووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پشت بە ڕێبازی زهنیەت و زانستێک دەبەخشێت کە لەسەر بنەمای جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژە وەک ڕێگایەکی رەهای حەقیقەت بووە بە هێزی هەژموونگەرایی. ئەگەر جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژە لە بواری هوشیاری و کردارەوە قووڵ نەکرێتەوە، هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری مەیسەر نابێت. لەو ڕەوشەدا توێژینەوە لەسەر ئەو بزووتنەوانەی پشت بە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە دەبەستن گرنگیەکی زۆری هەیە.

کۆمەڵگاکانی نیولیتیک و پێشووتر کێشەیەکی لە جۆری جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژەیان نەبوو. چونکە لەگەڵ سەرهەڵدانی شارستانی شار، چینایەتی و دەوڵەتی، بناغەی ئەو جیاوازییە دانراوە. وەک دەزانرێت کاهینەکانی یەکەمین شارستانی واتە شارستانی سۆمەر لە چوارچێوەی خوداوەند و بەندەکان یەکەمین جیاوازی سۆبژە ــ ئۆبژەیان داهێناوە. دەستەواژەکانی خوداوەند و بەندە لە ناوەڕۆکدا سەرچاوەیان بۆ حوکمڕانی شار بەسەر لادێ، چینی سەروو بەسەر چینی خواروو، دەوڵەت لەسەر کۆمەڵگا و ئاواکردنی پاوان و

دەستبەسەرداگرتنی زێدە ـ بەرهەمدا دەگرێت. شێوەیەکی میتۆلـۆژی و سـەرەتایی جیـاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەیە. لەو دۆخەدا میتۆلۆژیا دەبێتە یەکەمین زانست یاخود شـێوەی هوشـیاری پشتبەسـتوو بـە جیـاوازی سـۆبژە ــ ئـۆبژە. دەسـتەواژەی خـودا ــ بەنـدەی ئـەو شـێوە هوشیارییەی وەک پەرچەکردارێک بەرامبەر میتۆلۆژیەکانی سۆمەر و میسر سەرپهەڵدا و لە خۆرهەڵاتی ناوین بە نەریتی پێغەمبەرایـەتی دەناسرێت جیـاوازی سۆبژە ــ ئـۆبژە بـەرەو پێشـتر دەبـات. لێرەدا خـودا سـۆبژەیە، بەنـدەش ئۆبژەیـە، بـەڵام جیاوازیەکـەی لەگـەڵ میتۆلۆژیا لەوەدایە کە بەندایەتیەکـە نـەرمترکراوە، ئەگـەر زۆر کـەم و سنووردارێش بێت دەرفەتی جموجۆڵی بە مرۆڤی کۆیلە داوە.

لە نەریتی زەردەشتیدا سەرهەڵدان بەرامبەر بە دۆخی بەندایەتی دەکرێت، دەستەواژەی خوداوەند لێپێچینەوەی لەگەڵدا دەکرێت و هەوڵـدەدرێت کۆتـایی بـە جیاوازییـە وشکەکەی سۆبژە ـ ئۆبژە بهێنرێت. ئەگـەر سنووردارێش بێت لـە دەستەواژەی مرۆڤـی ئـازاد نزیـک دەبێتەوە. لێرەدا بەبێ ئەوەی پێویستیی بە خوداوەنـد ببینێت مـرۆڤ دەتوانێت لـە ڕێگـای ئـەخلاقی ئازادانـەی خۆیـەوە بجوڵێتـەوە و ڕەفتـار بکـات. کاتێـک نـەریتی زەردەشـتی لـە کلتووری ئیۆن زیاتر بەرەو پێشەوە دەبرێت سەربەخۆیی کلتووری فەلسەفی فەراهەم دەبێت. خودی مرۆڤ دەکرێت بـە سۆبژە، ئـۆبژەکتیڤیتیش لـە سروشـتدا ڕەنگدەداتـەوە. لـەجیاتی سۆبژە ـ ئۆبژە بوونی خوداوەند ـ بەندە، دوالیزمی مرۆڤی سۆبژە ـ سروشتی ئۆبژە جێگیـر دەکرێـت. لـەچاخی ناوینـدا دیسـان بـۆ دوالیزمـی خوداوەنـد ــ بەنـدە دەگەڕێنـەوە، فەلسەفەکەشـی دادەهێنرێـت. دوالیزمـی خوداوەنـد ــ بەنـدە لـە کرسـتیانی و ئیسـلامیەتدا بەجۆرێک لە جۆرەکان بە شێوەی ئایینی فەلسەفی پێشکەش دەکرێت.

جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە کە لە ڕێگای ئەوروپای خۆرئاوا (دیکارت، سپینۆزا) پێشخراوە لە دۆخە نیوەچڵەکەی چاخی یەکەم و ناوین بە تۆکمـەترین دۆخ دەگەیـەنرێت. لـە کاتێکدا هەر سێ دۆخی سروشت فیزیا، بایۆلۆژی و کۆمەڵگا دەکرێن بە ئۆبژە، مـرۆڤ لـە شـوێنی خوداوەند دادەنرێت و وەک سۆبژە پێشکەش دەکرێت. ئەو شۆڕشەی زهنیەتە کە زەمینە بـۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئامادە دەکات و مەشروعیەتی بۆ فەراهـەم دەکـات. سـۆبژەبوونی ڕەهـای مـرۆڤ و ئۆبژەبـوونی ڕەهـای سروشـت چانسـی هەژموونگـەرایی بـۆ سیسـتەمی سەرمایەداری دەڕەخسێنێت. ئەو چانسەی لەسەردەمی هیچ شارستانیەتێک بە سەرمایەداری نەدراوە، تەنیا ئەو هاوتاکردنە مەیسەری دەکات کە لە نێوان سۆبژەکتێڤیتی ڕەهای مـرۆڤ و ئـۆبژەکتێڤیتی ڕەهـای سروشـت ئـاواکراوە. لـەو دوالیزمـەدا مـرۆڤ بـە تـەواوی ڕۆڵـی خواداوەنـد دەبینێـت. سروشـتیش بەهـەر سـێ شێوەکەیەوە لـە دۆخـی ئـەو ئۆبژەدایـە کـە بەتەواوی لە خزمەتی مرۆڤ ـ خوداوەند دایە. هەڵبەتە سۆبژەی ڕەها لە کۆتاییدا لەمیانەی دەوڵـەت ــ نەتـەوە گوزارشـت دەکرێـت کـە لـە بـەرزترین ئاسـتدا یـەکێتی سـێ فاکتـەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەدیدێنێت. مرۆڤی سۆبژە کە لەمیانەی فەلسـەفەی هیگڵەوە بە لوتکە گەیشت لە ڕێگای دەوڵەت ـ نەتـەوەوە پرۆسـەی جێگیربـوون لـە جێگـای خوداوەنـد تـەواو دەکـات. سەرکێشـی ڕۆحـی ڕەهـا بـەمرۆڤی هـەرە ئـازاد و زۆر هوشـیاری دەوڵەت ـ نەتەوە بەشێوەی خوداوەنـدێتی نـوێ تـەواو دەبێـت. کاتێـک دەوڵـەت ــ نەتـەوە

بەسەرجەم ڕەهەندە مێژوویی و کۆمەڵایەتیەکانیەوە شیکار بکرێت، ئەو کاتە دەبینرێت کە پێشخراوترین خوداوەندە، هاوڵاتیەکەشی پەرەسەندووترین بەندەیە. بە مانایەکی تر پێگەی سۆبژەکتی ئایدیۆلۆژییە ئیلاهیەکانی مێژووی شارستانی لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا گوزارشت لە کامڵترین خوداوەندێتی دەکات، ئایدیۆلۆژیای بەندەی ئۆبژەش بەشێوەی هاوڵاتی ـ بەندە گوزارشت لەخۆی دەکات.

خوداوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوە کە لە دووەمین جەنگی جیهانیدا لە کەسایەتی هیتلەردا نوێنەرایەتی خوداوەندێتیەکەی کراوە، دوای جەنگ بە بەرپرسیاری مەرگی زیاتر لە پەنجا ملیۆن کەس دانرا و دەست بە لێپرسینەوەی کراوە. لەراستیدا لەکاتی هەڵکشانیشدا لەلایەن هەندێک فەیلەسوفەوە (بۆ نموونە نیچە) بە مەترسی دادەنرا و ڕەخنە کرابوو. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمیشدا دەمامکەکەی داماڵرا و ئاشکرابوو کە بکوژترین خوداوەندە. شیکارکردن و هەرەسهێنانی شانبەشانی یەکتر بەڕێوەچوون. دەستپێکردنی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە لە ١٩٧٠کان لەکاتێکدا لە لوتکە دابوو، گوزارشتی لەو ڕاستیە دەکرد. لەو سۆنگەیەوە؛ کاتێک بەهێزترین کۆڵەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەڵدەوەشایەوە، ئیتر هەڵوەشاندنەوەی سیستەمیش دەست لێبەرنەدراو بوو. خوداوەندێتی پارەی سەردەمی سەرمایەی فینانس (دوای ١٩٧٠کان) کە هەرە دوایی پەنای بۆ بردووە، مانای خێرابوونی هەڵوەشانەوە بوو. کاتێک دەمامکی سیفەتی خوداوەندی شەڕ داماڵراوە، ئاشکرابووە کە ئەو خوداوەندێتییە بە سیفەتی خوداوەندی پارەش چەندە قێزەونە و دوژمنی سروشت و مرۆڤە. لەمیانەی تاڵانکاریەکی بێهاوتای مێژوویی ڕێبازە وەهمی ـ گریمانەییەکانەوە سەلماندوویەتی هێزێکی ڕاستەقینەیە کە داڕووخاندنی کۆمەڵگا و وێرانکردنی ژینگەی سروشتی فەراهەم کردووە. پێویستە بوونی بەهێزێکی گریمانەیی وەک پوختەی مێژووی شارستانی شرۆڤە بکرێت. ئەو ڕەوشەش ئاشکرابوونی سەرجەم خوداوەندێتییە دەمامکدراوەکان، ئاشکرابوونی کارەکتەرە ڕاستەقینەکەیانە.

لوتکە و بناری زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس ئەو شوێنەیە کە خوداوەندێتی ئەو شارستانیەی تێدا هەوێن بووە. لە هەناوی کۆمەڵگای نیولیتیکدا دەرکەوت، بەڵام وەک نموونەی کرمی دار لەمیانەی خواردنی کۆمەڵگای نیولیتیکەوە پەیدابوو. ڕێکخستنەکانی شار، چین و دەوڵەت لە دەشتەکانی میزۆپۆتامیا سەردەمە ڕاستەقینەکەی لاوێتی و پێگەیشتنی بوو. شارستانی ئەوروپای خۆرئاواش بوو بە سەردەمی پیربوون و مردنی.

کوردستان وەک نیشتیمان و کوردیش وەک کۆمەڵگا بەدەست کوشندەترین ئازاری سەردەمی مردنی ئەو خوداوەندێتییە دەناڵێنێت کە لە هەناوی خاکەکەی و کۆمەڵگاکەی لەدایکبوو و پەرەیسەند. کاتێک فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەک دۆخی سەردەمی پیربوون و مردنی خوداوەندی شارستانی شرۆڤە بکەین، ئەوە ڕاستی بەرجەستەتر دەبێت. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە سیفەتی سۆبژەکتیڤی لەگەڵ ڕاستینەی کورد و کوردستان بە سیفەتی ئۆبژەکتیڤی لەنێو دۆخێکی خنکان و گەمارۆداندا دەژین کە لە هیچ شوێنێکی دیکەی جیهان نەبینراوە. وەک چۆن لە چەندین شۆڕشی مەزندا ڕوویداوە؛ وەک بڵێی جارێکی دیکە تەواوی مێژوو زیندوو بۆتەوە و بە هەموو توانا و هونەرێکیەوە

دەچەنگێت. ئەوەی لەمیانەی ئەو شەڕەوە رووخاوە و هەڵوەشاوەتەوە تەنیا کۆڵەکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە، یاسای زۆرترین قازانج، ئیندوستریالیزمی "سێڵی سوور" نییە، بەڵکو جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەش دەڕووخێت. پوختەی کورتەی شۆڕش لە نەمانی ئەو پارچەکردنەی دەستەواژەدا شاراوەیە. هەڵکشانی ئایدیۆلۆژیای سۆبژە ـ ئۆبژە، وشکبوون (دۆگماتیکبوون)ی و هەڵوەشانەوەی، باجەکەی سیستەمێکی چەوسێنەر و خوێناوی بوو کە بەلانی کەم نزیکەی پێنج هەزار ساڵی خایاند. ئەو سیستەمە تەواو رۆڵی دێوەزمەیەکی سەر مرۆڤایەتی بینی. تازە بە تازە مرۆڤایەتی لەو دێوەزمەیە بێدار دەبێتەوە. ئەو بزاوتەی رابوون و هۆشیاربوونەوەی کورد و کوردستان وەک مرۆڤ و نیشتیمانی ئازاد هیوابەخشە .

شۆڕشی نیولیتیک کە بنەچەی کوردان لە بناری زنجیرە شاخەکانی زاگرۆس ـ تۆرۆس ئەنجامیاندا ئاشنای جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە نەببوو، جیاوازی مرۆڤی سۆبژە ـ سروشتی ئۆبژەش جێگای باس نەبوو. ژیان وەک پەرچوویەکی ئەفسوونی و خرۆشان مانادار ببوو. خودی ژیان سەرگوزشتەیەکی پڕ لە پەرچوو بوو. لەو سۆنگەیەوە؛ بزاوتی ئازاد هەر شتێکی ئەو مرۆڤایەتیە بوو کە لەو قۆناغەدا بەشێوەی قەبیلەکان بە کۆمەڵگابوون. تەنیا بزاوت و جوڵە لە ئارادابوو، ئەویش بە شێوەیەکی ئازاد و مەستانە بوو. ژیان لە دەوروبەری ژن ـ دایکدا رێکدەخرا. لەو سۆنگەیەوە؛ پەرچووەکان دەکران بە موڵکی ژن؛ هەر لەو چوارچێوەیەشدا ژن بە مێخوداوەندێتی گەیشتبوو. مێخوداوەندی هەڵکشانێک نەبوو بە هێزی قەبە بەدەست هێنرابێت، شکۆداربوونێکی زهنی پەیوەست بە فەراهەمکردنی ژیان و خاوەندارێتیکردنی بوو. کۆمەڵگای نیولیتیک بە دەست، دڵ و زهنی ژن ـ دایک دادەهێنرا. سەرجەم دۆزینەوەکانی پەیوەست بە کشتوکاڵ و ئاژەڵداری مۆرکی ئەوی پێوە بوو. یەکەمین داستانی باسی تێکۆشانی مێخوداوەندی ئوروک ـ یەکەمین شار ـ دەکات لە بەرامبەر یەکەمین نێرخوداوەندی فێڵباز و تاڵانکار ئەنکی بۆ بەدەستهێنانەوەی " ١٠٤ دانە دۆزینەوە و داهێنانەکان" ی کە بە بەهاکانی خۆی ناودەبرد، گوزارشت لەو راستییە دەکات. وێڕای دەستپێکرنی قۆناغی شار بەڵام کاتێک هێشتا ژنێک خوداوەندی یەکەمین شارە و لەگەڵ نێرخوداوەندەکاندا ململانێ دەکات هەڵگری مانایەکی قووڵە. ئاماژە بە هێزی کلتووری ژن ـ دایک، بزووتنەوەکەی و بەرخودانەکەی بەرامبەر بە شارستانی دەکات. ئەستەمە لەمیانەی زهنیەتی شارستانی پیاوسالاری رۆژی ئەمرۆماندا بتوانین کلتووری دایک ـ ژن شرۆڤە بکەین. ئەو کلتوورە راستیەکە هەزاران ساڵ بەردەوام بووە. پەرەسەندنی سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە بە شێوەی سیستەمێکی پیاوسالاری ئەو راستییە دەسەلمێنێت. هەروەک لە سروشتدا جێگای باسە بەگوێرەی ئەوەی لە کۆمەڵگاشدا هەموو شتێک بە دژەکەیەوە پەرەدەسەنێت، ئەوا پەرەسەندنی پیاوسالاری سیستەمی شارستانیش تەنیا لەمیانەی سیستەمی دەستڕۆیی ژن ـ دایک واتایەکی دەبێت .

پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە بۆ یەکەمین جار لە کۆمەڵگای سۆمەر سەریهەڵداوە. ئەو راستیەش سەبارەت بە کوردە یەکەمینەکان بۆ ماوەیەکی درێژ مانای شەڕ و ململانێی دەستڕۆیی دایک و کۆمەڵگای قەبیلە دەبەخشێت. بەدرێژایی تەمەنی شارستانی سۆمەر جڤاتەکانی قەبیلەی نیولیتیکی پشتبەستوو بە زنجیرە شاخەکانی

زاگرۆس ـ تۆرۆس خۆیان لەناو بزاوتێکی بەردەوامی دژ بەو شارستانیە بینیوەتەوە. وەک چۆن سۆسیۆلۆژیای خۆرئاوا بانگەشەی بۆ دەکات قەبیلە یەکێتیەک نییە تەنیا لەسەر بنەمای پەیوەندی خوێن و خزمایەتی بێت، بەڵکو یەکینەیەکی زۆربوون، بەرهەمهێنان و بەرگری لەخۆکردنە بەرامبەر بە شارستانی. ئەو قۆناغەی لەساڵانی ٥٠٠٠ ـ ٤٠٠٠ پ.ز دەستی پێکردووە تا رۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بووە. وێڕای دەرکەوتنی هێزە بەکرێگیراوەکان لە ناواخنیدا، بەڵام جڤاتەکانی قەبیلە کارەکتەری سەرەکی و بنەڕەتی خۆیان پاراستووە. واتە قەبیلەکان بە بەرهەمترین یەکینەی کۆمەڵگان کە بەرگری خۆیی، بەرهەمهێنان و زۆربوون فەراهەم دەکەن. لایەنی لەپێشی بزووتنەوە و هۆشیاری قەبیلە بزاوت و هۆشیاری کۆمیناڵە( هەرەوەزی)کە دەرفەت بە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە نادات. واتە سەرەڕای شاڵاوەکانی شارستانی تەنیشتیان، قەبیلەکان بەرگرییان لەو هۆشیارییە هاوبەش و بزووتنەوەکەیان کردووە و تەنانەت بەرەو پێشەوەیان بردووە.

چەندە پلەداری و بەکرێگیراوێتی شارستانی پەرەیسەند، پارچەبوونی کلتووری قەبیلە و دەرکەوتنی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە لە هەناوی بزووتنەوە و هۆشیاری قەبیلە دەست لێبەرنەدراو بوو. بەرامبەر بەو بزووتنەوە هۆشیاریەی کە رەنگدانەوەی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی سۆمەر بوو لەمیانەی کلتووری نەریتی مێخوداوەندی دایک (کلتووری مێخوداوەند عەشتار) ـەوە بزوتنەوەی باوەڕی مەزدای نوێخواز دەرکەوت. سیستەمی باوەڕی مەزدایی لەسەر بنەمای دوالیزمی هێزەکانی تاریکی ـ ڕووناکییە. ناوەڕۆکەکەی بۆ دوالیزمی دیالیکتیکی گەردوونی دەگەڕێتەوە. گەیشتن بە هوشیاری بزووتنەوەی دیالیکتیکی تێز ـ دژەتێز پیشاندەدات کە بۆ پەیدابوون پێویستە. لەو لایەنەوە بزووتنەوەیەکە زۆر لە دوالیزمی خوداوەندی ئافرێنەر و بەندەی ئافرێنراوی داهێنانە قەبەکەی میتۆلۆژیای سۆمەر پێشکەوتووترە. ناوەڕۆکی باوەڕی مەزدایی لە بەبنەماگرتنی دیالیکتیکی گەردوونیدایە. وەک چۆن ئایدیۆلۆژیای خوداوەندی ئافرێنەر و بەندە ـ ئۆبژەی ئافرێنراو گوزارشت لەراستینەی گەردوونی ناکات، بۆ یەکەمین جار جێگیرکردنی لە هۆشیاری مرۆڤدا ڕێگای لەپێش چەواشەکاریەکی زۆر قووڵ کردۆتەوە. بزووتنەوەی ئەو هۆشیاریەی مۆرکی خۆی لەسەرجەم ئایینەکان داوە، بەتایبەتیش ئایینە تاکخوداییەکان، بناغەی ئەو بزووتنەوانە پێکدێنێت کە لەسەر بنەمای جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەن و تا رۆژی ئەمڕۆمان هاتوون. لەگەڵ تائۆگەرایی چین و هەندێک شێوەی هوشیاری هیندستان باوەڕی مەزدایی نوێنەرایەتی زهنیەتێکی جیاواز دەکات. لەجیاتی دوالیزمی ئافرێنەر ـ ئافرێنراو لەو زهنیەتەدا بە کەناری پەرەسەندنێکی دیالیکتیکی دەگەن کە خۆی ئافرێنەری خۆیەتی.

بزووتنەوە و هوشیاری زەردەشتیش، کە بەردەوامی شێوەی هوشیاری و باوەڕی مەزداییە، ئەخلاقی مرۆڤی ئازاد فەراهەم دەکات. باوەڕی زەردەشتی یەکەمین شێوەی بزووتنەوە و هوشیارییە کە لێپرسینەوە لەگەڵ خوداوەندی ئافرێنەر دەکات. گوتەی "پێم بڵێ تۆ کێی؟" کە لە نەریتی زەردەشتیەوە بۆ رۆژی ئەمڕۆمان ماوەتەوە ناوەڕۆکی ئەو فەلسەفە پێکدێنێت کە لێپرسینەوە لەگەڵ خوداوەندە ئافرێنەرەکە دەکات. شارستانی ئیۆن ئەو فەلسەفەیەی لە مادەکان وەرگرت، زیاتر بەرەو پێشەوەی برد و بناغەی شێوە فیکرێکی

داناوە کە مۆرکی خۆی لە سەردەمەکەمان داوە. بەشێوەیەکی دابڕاو لە خوداوەند، لەمیانەی پەرەسەندنی شێوەی هزری دیالیکتیکیانەی پشتبەستوو بە هێزی مرۆڤ ڕێگای مرۆڤی ئازاد کراوەتەوە. سەرکەوتنی مادەکان بەسەر شارستانی زۆرداری ئاشووری دوا نوێنەری شارستانی سۆمەری، هەنگاوێکی مێژوویی بوو. ئەو بزووتنەوە هوشیارییە سیاسی و ئەخلاقیەی مادەکان کە نزیکەی سێسەد ساڵی خایاند هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنیان بوو بەسەر ئاشووریەکاندا. هەر ئەو گۆڕانکارییە مێژووییەش بوو کە ڕێگای بۆ شارستانی ئیۆن کردەوە. ڕێکەوت نییە کە هەردوو بزووتنەوەش لە ساڵانی ٦٠٠پ.ز مۆرکی خۆیان لە مێژوو داوە، تەنیا کاتێک بەشێوەیەکی پەیوەست بەیەکترەوە تاوتوێ بکرێن دەشێت ڕاست دەرکیان پێبکرێت. کاتێک فاکتەری ماد ـ کورد لەژێر باڵادەستی بزووتنەوەی ئیمپراتۆریەتی پارس و ساسانی کەوتە پلانی دووەمەوە بزووتنەوەکانی هوشیاری ئازادیش زەبریان بەرکەوت. داخران بەرووی فۆرمەکانی هوشیاری خێڵ و قەبیلەی سەرەتایی هاتەئاراوە کە لەدواوە مایەوە. چەندە هوشیاری و باوەڕی زەردەشتی بوو بە ئامرازی پاراستنی ئیمپراتۆریەت، ئەوەندەش ناوەڕۆکە ئازادیخوازەکەی لەدەستدا و پووکایەوە. ئەو دۆخەش لە سەرکەوتنی ئەسکەندەر (٣٣٠پ.ز)دا ڕەنگدەداتەوە. فەلسەفەی ئیۆن ـ کە لە کەسایەتی ئەرستۆدا بەهێزترین نوێنەرایەتی دەکرێت ـ ڕۆڵێکی دیاریکەری لەو سەرکەوتنەدا هەبوو. قۆناغی شارستانی هێلینییش کە دواتر پەرەیسەند (٣٠٠ پ.ز ـ ٢٥٠ زایینی) ئەو قۆناغەی بۆ یەکەمین جار سەنتێزی خۆرهەڵات ـ خۆرئاوا ئاوایکرد هوشیارییەکەی مۆرکی خۆی لە تەواوی شێوەکانی باوەڕی و هزردا، کە دواتر دەرکەوتن. ئاشکرایە کە هەڵکشانی ڕۆما و کلتووری ئیمپراتۆریەت لەسەر ڕێچکەی ئەو باوەڕی و هزرانە پەرەیان سەندووە و مانادار بوون .

شارستانیەکانی کۆما گەنە (ناوەندەکەی فوراتی سەروو بوو)، ئابگار (ناوەندەکەی فوراتی ناوین ـ ئورفا بوو) و تەدموور (ناوەندەکەی فوراتی خواروو ـ تەدمور) کە لەو قۆناغە پەیوەندییەکی نزیکیان بە فاکتەرەکانی شارستانی کوردەوە هەبوو نوێنەرایەتی شکۆداریەکی بەرچاو دەکەن. هەم بەرخودان بەرامبەر بە ڕۆما دەکەن، هەمیش لەمیانەی تەبایی و ڕێککەوتنە سەرکەوتنەکانیانەوە لەبواری بزووتنەوەکانی هوشیاریدا بەردەوامی بە هەڵکشانی خۆیان دەدەن.جولانەوەی هوشیاری کرستیانی کۆتایی بەو قۆناغە دێنێت.

کرستیانی لەسەر بنەمای نکوڵیکردن لە یەکەمین فەلسەفەی ڕۆشنگەری (فەلسەفەی ئیۆن)و خراپ پیشاندانیەوە پەرەیسەندووە. بزووتنەوەی هوشیارییەکی نەرێنی و بێ هیوایە؛ گوزارشت لە هوشیاریەکی ڕەشبینی ئەو بێبەزەییانە دەکات کە باڵادەستی ڕۆما ڕێگای لەپێش کردەوە. وێڕای ئەوەی لەبواری فەلسەفەی ڕۆشنگەرییەوە گوزارشت لە دواکەوتنێکی مەزن دەکات، بەڵام سەبارەت بە بزاوتی هاوبەشی هەژاران مانای پێشکەوتنێکی گەورە دەبەخشێت. نوێنەرایەتی شێوەی سەرەتایی هوشیاریی چینایەتی پێشوەخت دەکات. گۆڕانی و بوونی بە ئایدیۆلۆژیای ئیمپراتۆریەت و میرنشینی (لە ساڵانی ٣٠٠زایینی) لەدەستدانی ئەو ماهیەتەی لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

مانیزمیش(٢٥٠زایینی) کە وەک پەرچەکردارێک بەرامبەر سیستەمی شارستانی دەرکەوت و پێگەیشتووترین بزووتنەوە و هوشیاریی ڕۆشنگەری دوای زەردەشتییە تا بڵێی بە کاریگەر بووە. ئەگەر مانی لەلایەن ئیمپڕاتۆرە ساسانیەکان مەحکوم نەکرابووایە، لەوانەبوو بەر لە ئەوروپا لە خۆرهەڵاتی ناوین ڕێگای لەپێش دووەمین گەورە هەڵمەتی ڕۆشنگەری کردبایەوە. خودی مانی سەنتێزێکی فەلسەفەی ئیۆن، باوەڕی کرستیانی و نەریتی زەردەشتی پێکهێنا و گەورەترین ریفۆرمی هزر و باوەڕی ئەو قۆناغەی بەرجەستە کرد. ئەو بزووتنەوەی لە کەنارەکانی دیجلە دەستی پێکرد لەماوەیەکی کورتدا لە ڕۆماوە تا دەگاتە دۆڵی هیندۆس لە گۆڕەپانێکی بەرفراوان بڵاوبوویەوە. بەڵام لەبەرئەوەی نەریتە گەندەڵبووەکەی ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی دەرفەتی بە پەرەسەندنی نەدا (مانی بە کەوڵکراوی لە سێدارە دراوە ٢٧٦ زایینی) ئەو هەلە مێژوویيە بەفیڕۆ دراوە. بەمانایەکی تر شوێنێکی شایستەی خۆی پڕ نەکردۆتەوە، مۆرکی خۆی لە ڕۆژگار نەداوە.

بە بەراورد لەگەڵ مانیگەرایی و زەردەشتیەت راهیبە سریانیەکان (راهیبە کرستیانییە بنەچە ئاشووریەکان) سەرکەوتوتر بوون. ئەوەی تا هاتنی هوشیاری و بزووتنەوەی ئیسلام مۆرکی خۆی لە ناوچەکە داوە هوشیاری و بزووتنەوەی راهیبە سریانییەکانە. لە ساڵانی نێوان ٣٠٠ - ٦٠٠ زایینی بزووتنەوەیەکی بەهێزی هوشیارییان لە دەریای سپیەوە تا هیندستان و ناوەوەی چین بڵاوکردەوە و گروپە کرستیانیەکانیان پێکهێنا. هوشیاری کورد لەو سەردەمەدا بە تەواوی لە زەردەشتی دانەبڕاوە، تەواو مانیزمیشی پەسەند نەکردووە و ڕێبەرە سریانیەکانیشی قبوڵ نەبووە. کوردان پارێزگارییان لە فۆرمە سەرەتاییەکانی هوشیاری مارژینالەکانی خۆیان کردووە. ئایدیۆلۆژیای باوی قەبیلە کە زۆر لەدواوەی قۆناغ مابوویەوە تەنیا توانیویەتی بوونی قەبیلەکان لەسەر پێیان بهێڵێتەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ کوردان لەو قۆناغەدا لەو پەرەسەندنانە بەدواکەوتن کە کۆمەڵگاکانی ئەرمەنی و ئاشووریەکان بە خۆیانەوە بینی. لە کاتێکدا هوشیاری کرستیانی جڤاتە بەبنەچە ئەرمەنی و ئاشووریەکانی بە دۆخی گەلانێکی یەکگرتوو و پێشکەوتووتر گەیاندووە، فۆرمە سەرەتاییەکانی هوشیاریش جڤاتی کوردی لەناوەخۆیدا داخستووە و تەنیا توانیویەتی بوونەکەیان بپارێزێت. بێچارەیی ئایدیۆلۆژی زەبری لەپەرەسەندنی کۆمەڵایەتی داوە و بەربەستی کردووە، بەمجۆرەش ڕێگای لە پێش تەنگژە کردۆتەوە.

دەرکەوتن لە تەنگژەی هوشیاری چاخی یەکەم لە ڕێگای ئیسلامیەتەوە بووە. دوای یەهودیەت و کرستیانی لە بواری ئایینیدا ئیسلامیەت دواترین بزووتنەوەی گەردوونی هوشیاری و کۆمەڵگابوونی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوینە. هەرچەندە فۆرمی هوشیاری ئیسلامی خۆی وەک سروشتێکی ئیلاهی نوێخواز پێشکەش بکات، بەڵام گوزارشت لە ئاوێتەگەری و تێکەڵترین فۆرمەکانی هوشیاری خۆرهەڵاتی ناوین دەکات. کاریگەری سەرجەم فۆڕمە کۆنەکانی هوشیاری لە ریشەکەیدا دەبینرێت. لە ڕوحگەراییەوە تا دەگاتە تاکە ئافرێنەری رەها سەرجەم فۆڕمەکانی هۆشیاری سیستەمێکی تێکەڵ پێشکەش دەکات. بەتایبەتیش لە ڕێگای ئایینە ئیبراهیمیەکانەوە فۆڕمەکانی میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر کاریگەرییەکی زۆر و بەهێزی هەیە. دوای یەهودیەت و کرستیانی سێیەمین ڤێرسیۆنی

فۆرمەکانی میتۆلۆژییە. تەنیا هەڵگری شوێنپەنجەی ڤێرسیۆنی فۆرمەکانی میتۆلۆژیا نییە، تارادەیەکی زۆر هەڵگری کاریگەریەکانی فەلسەفەی زەردەشت و ئەفلاتون ـ ئەرستۆشە. پێویستە کاریگەری ئایینە باوەکانی پاگانیزم (بتپەرستی) یشی بخەینە سەر. یەکێک لە هۆکارە سەرەکیەکانی بڵاوبوونەوەی خێرای ئایینی ئیسلامی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لەمیانەی فۆرمێکی تێکەڵی هوشیاری خۆی نواندووە. هەرچڤاتێک دەتوانێت بەگوێرەی خۆی راڤەی بکات و پەسەندی بکات. لە راستیدا هەر ئەوەش روویداوە. وەک دەرمانی هەر دەردێکە.

ئەو رەوشە جیاوازەی هوشیاری ئیسلامی لە هەمانکاتدا لاوازیەکی سەرەکی پێکدەهێنێت؛ لە تایبەتبوون و رەسەنێتی بێبەشی دەکات. گەردوونیبوونە زێدەڕۆییەکەی تایبەتمەندێتیە تاکانەییەکەی لاواز کردووە، رێگای لە پێش مەترسیەک کردۆتەوە کە بۆ سرووتێکی سادە بگۆڕێت. لەو لایەنەوە لە یەهودیەت و کرستیانیش بێ بەرهەمتر بووە. لەجیاتی ئاواکردن و پەرەپێدانی فۆرمێکی هزری دیالیکتیکی، بووە بە تورەگەی هوشیارییەکی بەربڵاو، بێ سیستەم و چەشنی چیرۆک. ئەو تورەگانەی هوشیاری کاریگەریەکی زۆریان لەدۆخی پاشکەوتوویی کۆمەڵگا بەناو ئیسلامیەکان هەیە. لەهوشیاریی یەهودی و کرستیانیدا رەوش جیاوازترە. یەهودیەت بەردەوام دەستەواژە لەخوداوەندێتی خۆیەوە دەئافرێنێت و بەمجۆرەش درێژە بە باڵادەستی ئایدیۆلۆژی خۆی دەدات. کرستیانیش لەرێگای رێکخستنە توندەکانی کڵێساوە جەماعەتی بەرجەستە پێکدێنێت. داخراوبوونی نائاسایی کڵێسا بەرامبەر بە عەلمانیەت رێگا بۆ عەلمانیەت و سیکۆلاریزم دەکاتەوە و کەمەندکێشیان دەکات. لەژێر کاریگەری هەردوو ئاییندا وەک پێویستیەکی دیالیکتیکی ئەوروپای چاخی ناوین لە ئاواکردن و پێشخستنی فۆرمەکانی هوشیاری و هزری عەلمانی و سیکولاردا زەحمەتی نابینێت. دۆگماتیزمی وشکی هەردوو ئایین رێگایان لە پێش بزووتنەوەی مۆدێرنیتەی ئەوروپا کردەوە. هوشیاری دۆگماتیک هێندە بێواتا دەبن، لەدایکبوونی فۆرمی نوێ لەسەر بنەمای دژایەتی دەست لێبەرنەدراو دەبێت. بەڵام پێویستە زۆر باش بزانرێت کە هەردوو هوشیاری ئایینی رۆڵێکی دیاریکەریان لە بزووتنەوەی شارستانی ئەوروپادا بینیوە. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ناتوانین پێناسەیەکی راست بۆ فۆرمەکانی  هوشیاری مۆدێرن و بزاوتە کۆمەڵایەتیەکانی ئەوروپا بکەین و دەرکیان پێناکەین.

ئیسلامیەت ئاراستەیەکی جیاوازتری هەبووە، لەپاڵ باوەڕی و هزری تێکەڵدا، لە بونیادی خۆیدا هەڵگری چەندین فاکتەری عەلمانیەت و سیکولاریزمیش بووە. کاتێک خۆی وەک ئایینێکی دونیایی و ئاخرەتیش پێشکەش دەکات، رێگای لەپێش دووفاقێتی و بنەستبوونی ناوخۆی کردۆتەوە. گفتوگۆ فەلسەفیەکانی نێوان سەدەکانی ٩ ـ ١٢ کە دەتوانین بە رێنسانسی ئیسلامی ناوی ببەین، هەروەک رۆشنگەری ئەوروپا بە قازانجی فەلسەفە ئەنجامگیر نەبوو. ئەوەی وەک فۆرمی ئایدیۆلۆژی ماوەتەوە سێبەری شێوەی پاشا ـ خوداوەندە (ظل الله) کە لەسەردەمی سۆمەریەکانەوە هەیە. رژێمەکانی میرنشینی و سوڵتانێتی زۆردار کە پەنایان بردۆتە بەر ئەو شێوە و فاکتەرانە لە سەدەی دوازدەهەمینەوە

تا رۆژی ئەمڕۆمان جگە لە پێشکەشکردنی نموونە لە ژمار نەهاتووەکانی دەسەڵاتە هەڕەمەکی و دۆگماتیزمی محافەزەکار رۆڵێکی دیکەیان نەدیوە. لەکاتێکدا ئەوروپا و بگرە چینیش لەو سەدانە پەرەسەندنی گرنگیان بەخۆیانەوە بینی، شوێنە سەرەکیەکەی پێشکەوتنی مێژوویی مەحکومی سەردەمێکی زۆر دواکەوتوانە بووە؛ لە سەدەی نۆزدەهەمدا لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە پەرتەوازەبوون رزگاری نەبووە.

هەرچەندە لەو قۆناغەی پەرتەوازەبووندا هەوڵی سەرلەنوێ راڤەکردن و بونیادنانەوەی هوشیاری ئیسلامی درابێت، بەڵام لە ماهیەتێکی راستەقینەی ریفۆرم دوورە. تەنانەت هێندەی کرستیانیش ریفۆرماسیۆنێکی بەخۆیەوە نەدیوە. کاتێک ئاشنای شۆڕشە فەلسەفی و زانستیەکانیش نەبوو، پەرتەوازە و هەرەس دەست لێبەرنەدراو بووە. لێگەڕینەکانی ئیسلامی نوێ کە لە راستیدا جگە لە مۆدێرنبوون هەڵگری هیچ مانایەکی دیکە نییە و هەوڵی خۆگونجاندن لەگەڵ سەرمایەداری دەدات، لەهەرجۆرە رەسەنێتی و داهێنانێک دوورە.

هەرچەندە جڤاتەکانی کورد ماوەیەکی درێژ لەبەرامبەر ئیسلامیەت لە دۆخی بەرخودانیدا بوون، بەڵام کاتێک چینی سەروو لەرێگای شرۆڤەی سوننی ئیسلامی چانسی دەسەڵاتی بەدەستهێنا گۆڕانکارییەکی ریشەیی لەگەڵ خۆیدا هێنا. کۆمەڵگابوونێکی دوو لایەنە هاتە ئاراوە. لەکاتێکدا چینی سەروو لەمیانەی شۆڕشی دەرەبەگایەتیەوە هەرەسئاسا کۆمەڵگاکانی میرنشینی خۆیانیان ئاوا و گەورە دەکرد، چینی خواروو و خەڵکی ناوچە شاخاویەکانیش بەرامبەر چەوساندنەوە و زۆرداری دەسەڵات پەنایان بۆ تەریقەت و مەزهەبەکان برد کە جۆرێک لە رێکخراوی بەرگری خۆیی بوون، هەنگاونانیان بۆ پەرەسەندنی کۆمەڵگایەکی بەمجۆرە دەست لێبەرنەدراو بوو. فۆڕمە جیاوازەکانی هوشیاریی ئیسلامی کە دابەشبوونی چینایەتییان قووڵکردەوە خۆیان بەشێوەی مەزهەب و تەریقەتەکان نواند. کاتێک هوشیاری قەبیلە و خێڵ تێپەڕکران فۆڕمە هوشیارییەکانی هەنگاویان بۆ هاویشترا سەبارەت بە چینی سەرووی پلەداری ئیسلامی سوننی و مەزهەبە جیاوازەکانی بوون، سەبارەت بە چینەکانی خوارووش بەشێوەی تەریقەتە سۆفیگەراییەکان بەرجەستە بوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە عەلەوێتی. کوردێتی میرنشینی سوننی لەلایەک لەدژی چینەکانی خواروو خۆی بەرەو پێشەوە دەبرد، لەلایەکی دیکەشەوە ململانێ و پێکدادانێکی توندی لەگەڵ فۆڕمە هوشیارییەکانیان دەکرد. کوردێتی عەلەوی و سۆفیگەراییش بەردەوام خۆی بۆ رێکخراوی سیاسی و سەربازی وەردەچەرخاند و پێگەی بەرگری دەگرت. لەئاکامی ئەو شەڕ و دابەشبوونانەش تەواوی کۆمەڵگا زیانێکی گەورەی بەردەکەوت و ناسۆریی دەچەشت. بۆ کۆتایهاتنی ئەو رەوشەش یان خۆیان بە هیواکانی ئاخیرەت دەبەستەوە، یان هیواو چاوەڕوانییان لە رژێمێکی پاشایەتی بەهێز و یەکگرتوو دەکرد. ئیتر فۆرم و لێگەڕینە ئایدیۆلۆژیەکانی کوردایەتی چاخی ناوین لەو بارەیەوە بەهێز دەبێت .

لێگەڕین و فۆڕمە هوشیاریەکانی ئیدریسی بەدلیسی (سەدەی شازدەهەم) و ئەحمەدی خانی (سەدەی حەڤدەهەم) هەوڵێکن بۆ وەڵامدانەوەی ئەمجۆرە چاوەڕوانیانەی کۆمەڵگای کورد. لەبەرامبەر ئەوەشدا کەسێک بەناوی سەیفەددین کە سەر بە سولالەی شێخێکی کوردە رێبەرایەتی بزووتنەوەی قزلباشی ــ شیعە دەکات، لەئاکامدا ئەو بزووتنەوە بە

ئیمپڕاتۆریەتی سەفەوی ئەنجامگیر دەبێت کە خانەدانێکی نوێی دەسەڵاتە. لەکاتێکدا شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسی (کۆتایی سەدەی شازدەهەم) شرۆڤەی میرنشینی و پاشایەتی کوردێتی دەکات، تەریقەتەکانی لەجۆری نەقشبەندێتی و قادری دەرەوەی دەسەڵاتیش بەرەو پاراستن و بەرگری کردن لە کۆمەڵگا هەنگاو دەنێن. کاتێک چینی دەسەڵاتداری کورد لەنێوان سەفەوی و عوسمانیەکان بەدوای گونجاوترین پارێزگاری خۆیاندا دەگەڕێن، ئەحمەدی خانی چارەسەری ریشەیی لە پاشایەتی کوردستانی گەورەدا دەبینێت.

مەدرەسەکانیش شوێنێکی گرنگیان لە هوشیاری ئیسلامی کوردان‌دا هەیە. هەموو کاتێک چینێکی بەهێزی رۆشنبیرانی کورد لەئارادا بووە. چەندینیان شوێنی خۆیان لە کۆشکەکانی عەرەب، فارس و تورکەکاندا کردۆتەوە. لەگەڵ ئەوەی جۆرە پەیوەندییەکیان بە کوردێتیەوە هەبووە، بەڵام ئەو پەیوەندییە بە کارەکتەری ئەو دەسەڵاتانەوە سنووردار بووە کە پێیەوە گرێدراو بوون. بە درێژایی چاخی ناوین هوشیاری قەبیلە و خێڵ بوونیان هەبووە. ئەو قەبیلە و خێڵانەی گەورەبوون و زیادیان کرد سەرەکیترین سەرچاوەی خۆراکپێدانی کوردایەتی تەریقەت و میرنشینین.

هوشیاری ئیسلامی جڤاتەکانی کوردانی بەختەوەر نەکردبوو، هێندەی کرستیانی کۆمەڵگای نەکردبوو بە هۆمۆژەنیش. کردبوونی بە چەندین جڤاتی تەریقەتەکان، بەرادەیەک چاوەڕوانی ئاخیرەت بن کە لەخۆیان نامۆ بن. ناشێت و ئەستەمە کۆمەڵگایەکی بەپێت لە نامۆبوون و پارچەبوون چاوەڕوان بکرێت و بونیادبنرێت. کاتێک بە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم دەگەین ئیتر پەرەسەندن، داواکاری باج و سەربازی بیروکراسی ناوەندی ژێر کاریگەری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێگەی کوردانی چاخی ناوینیش تێکدەدات. لەبەرامبەر ئەو رەوشەدا چەندە میرنشینە کوردیەکان و تەریقەتە سۆفیگەراییەکان هەوڵی پاراستنی پێگەی خۆیان دەدەن پێکدادانیش دەست لێبەرنەدراو دەبێت، کۆمەڵگای باویش دەکەوێتە ناو کائیوس و قەیرانێکی قووڵەوە.

### ج . بزووتنەوە هاوچەرخەکانی کوردان

هەوڵێک لەلایەن زانستی کۆمەڵایەتی مۆدێرنیتەوە جێگای باس بووە کە لەمیانەی کۆدەکانی چین و نەتەوە بزووتنەوە کۆمەلایەتیەکان پێناسە بکرێت، لەو پێناوەشدا تیۆریگەلێک داهێنران. شرۆڤەکردنی راستینە بەو شێوازە پۆزیتیفیستەوە پەرەسەندنێکی گرنگی دەرهەق بە حەقیقەت بوو. ئەنجامە سەلمێنراوەکان لە بواری پراکتیکیدا، متمانە بەخۆبوونی زانا کۆمەڵایەتیەکانی زیاتر کرد. لەو بڕوایەدابوون کە ئەو هەڵوێستە تاکە رێبازی راستییە. ئیتر رۆڵی رێبازی پۆزیتیفیست لەگەڕان و لێکۆڵینەوەی حەقیقەتدا هەنگاو بە هەنگاو بوو بە باوەڕیەکی وشک. زانستگەرایی لەجێگای زانست جێگیر کرا. خودی پۆزیتیفیزمیش کە بانگەشەی دەربازکردنی ئایین و میتافیزیا دەکات، بوو بە قەبەترین

ئایین و میتافیزیای ماتریالیست. کاتێک دۆخەکە بەمجۆرە بوو، زانستە کۆمەڵایەتیەکان بەخێرایی چەواشەبوون. لەلایەکەوە پۆلێنە گەردوونیەکانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان دەئافرێنران و راستینەی بەرجەستە نکوڵی لێدەکرا، لەلایەکی دیکەشەوە لە تاکە بەشەکاندا چەقیان دەبەست و یەکپارچەیی یان هەمووێتی راستینە پشتگوێ دەخران. ئیتر قۆناغی لقە نارەسەنەکانی زانستی کۆمەڵایەتی و لێکۆڵینەوە تاکانەییەکان دەستیپێکرد. کاتێک هەوڵی رزگاربوون لە دۆگماتیزمی چاخی ناوین دەدرێت، دۆگماتیزمی مۆدێرن دەکرێت بە ئامرازێک هەڕەشە لە ژیانی کۆمەڵگا بکات. بەتایبەتیش لەکاتێکدا تیۆریەکانی ئابووری ـ سیاسی، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم رۆڵی پەردەپۆشێکی تاریک و نابینایی بەردەم حەقیقەتی کۆمەڵگای دەبینی، مەیلەکانی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج، دەوڵەت ـ نەتەوە و پیشەسازی هەریەکە و بوون بە میکانیزمێکی وێرانکاری سەر کۆمەڵگا.

بزووتنەوە کۆمەڵایەتییە هاوچەرخەکانی بۆ ئاستی نەتەوە و چین بچووککرانەوە، هەریەکە وەک گەردوونیبوونێک لەسەرەوە هەمان رۆڵیان بینی. راستینەی ئاڵۆز و بەگرفتی وەک کۆمەڵگا تا دوارادە بە شێوازێکی مۆدێلی بچووککردنەوە خرایە ناو قالبە نەتەوەیی و چینایەتیەکانەوە، بەمجۆرەش هەوڵی پێناسەکردن و تیۆریزەکردنی بزووتنەوەکان و پراکتیزەکردنیان درا. لەکاتێکدا تیۆری و دەستەواژەکانی پەیوەست بە میللیگەرایی دیاردەی نەتەوەیان کرد بە ئیلاهی، تیۆری و دەستەواژەکانی پەیوەست بە سۆسیالیزمی بونیادنراویش دیاردەی چینیان کرد بە سۆبژە یاخود کردیان بە ئیلاهی. لەکاتێکدا هەوڵی رزگاربوون لە هزرەکانی چاخی ناوین دەدرا، لەژێر ئەو قالبە قەبانەی مۆدێلی بچووککردنەوە دووچاری دۆگماتیزمێک بوون کە لەوان چاکتر نەبوون. قەیران و خەسڵەتە کائیوسیەکانی مۆدێرنیتە کە هەر لەسەرەتاوە لە ئارادابوون بەم شێوازە لەسەر قەیرانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان رەنگیدایەوە. قەیرانی سیستەمی بونیادی و جیهانگیری کە لە ساڵانی ١٩٧٠کان بە شێوەیەکی خەستتر روویدا، ئیتر کاریگەریەکانی لەسەر ئابووری، ژینگە و دەسەڵاتیش رەنگیدەدایەوە و هەستی پێدەکرا. لەکاتێکدا لە سەردەمی هەژموونگەرایی فینانسدا ئابووری لەژێر سیستەمێکی بێهاوتای تاڵانکاری مێژوو لەگیانەڵڵا دابوو، لەمیانەی نەزۆکی و نارەسەنی دەوڵەت ـ نەتەوەوە دەسەڵات تەواو بوو بە ئامرازی چەواشەکردن. ژیانی پیشەسازی رێگای لەپێش کارەساتێکی سەر ژینگە و کەشوهەوا کردەوە. بەرامبەر بەو گۆڕانکاریانە ئەستەم بوو زانستە کۆمەڵایەتیەکان نەکەونە قەیرانەوە. لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە ١٩٩٠کان ماهیەتی راستەقینەی لیبرالیزمی چەپڕەو و راستڕەو ئاشکراتر بوو. قەیرانی هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای لیبڕال کە یەکێک لە فاکتەرە گرنگەکانی قەیرانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بوو لەو قۆناغەدا بەباشی هەستی پێدەکرا. رەچێتەکانی پۆست مۆدێرنیزم بۆ چارەسەرکردنی قەیرانەکە تەنیا بەڵگەی سەلمێنەری قەیرانی بواری ئایدیۆلۆژی ـ زانستی مۆدێرنیتەیە. بەمجۆرە ئیتر شیکارە تیۆرییە چینایەتی و نەتەوەییەکان ناتوانن هەمان رۆڵی جاران لە دەربازکردنی قەیرانی سیستەماتیکی مۆدێرنیتەدا ببینن. بگرە ئەگەر هەوڵێکی لەو جۆرەش

بدەن، ئاشکرا بووە کە یۆتۆپیاکانی رزگاری نیشتیمانی و چینایەتی توانای تێگەیشتن و چارەسەرکردنی سروشتە ئالۆز و بەگرفتەکەی کێشە کۆمەلاّیەتیەکانی نییە.

کاتێک لەو چوارچێوەیەدا شرۆڤە بکرێت دەبینرێت کە بزووتنەوە هاوچەرخەکانی کوردان دیاردەی نەتەوایەتی و چینایەتییان پیشانندداوە. لە ئاشنابوون بە بزووتنەوەیەکی رزگاری نیشتیمانی هاوچەرخ زۆر دوور بووە. بزاوتێکی دواکەوتوو و لاوازی میللیگەرایی سەرەتایی جێگای باسە. نابینە شاهێدی بزووتنەوە چینایەتییە مۆدێرنەکانیش. ناتوانین بڵێین بزووتنەوەکانی تەوەرەی چینی بۆرژوا، پرۆلیتاریا و بۆرژوازی بچووکی شێوازی ئەوروپاش بالاّیان کردووە. لەبواری ئایدیۆلۆژی، رێکخستنی و چالاکیەوە ئەستەمە بتوانین بزووتنەوەکانی کوردان لەمیانەی قالبە مۆدێرنە نەتەوایەتی و چینایەتییەکانی خاوەن پلان و پرۆژە پێناسە بکەین. بەلاّم دیسان ئەو دووسەد ساڵەی دوایی زۆر خوێناوی و بەهەوراز و نشێو بووە. ئەوانە ساڵانێکی پڕ لە سەرهەڵدان و شەڕ و شۆڕن. سەرباری ئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە و سوپای مۆدێرن لەبەرامبەر یاخیبووەکان جێگای باس بوون، بەلاّم ئەوان بەهەمان ئامانجی دەوڵەت و سوپای مۆدێرن نەکەوتنە خۆوە، بگرە کەوتنە جوڵە لەولاوە بمێنێت، تەنانەت بە کەناریشیاندا تێپەڕ نەبوون. ئەوەی بزووتنەوەکانیانی فەراهەم کرد، ئەندێشەکانی پاراستنی دەسەلاّتی میرنشینەکانیان و بەرژەوەندییە بە ئایین پەردەپۆشکراوەکانیان بوو. سەرکوتکردنی ئەو رابوونە ئایدیۆلۆژی و کردارییانەی ئامانجیان درێژەپێدانی پلەداری و پاراستنی دەسەلاّتەکانی پاشماوەی چاخی ناوینە، لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە و سوپا مۆدێرنە پرچەک و بالاّترەکان زەحمەت نەبوو. چاوەڕوانی سەرکەوتنی پێکهاتە نەریتی و ئایدیۆلۆژیا و دامەزراوەکانی کوردستان بەسەر هێزەکانی مۆدێرنیتە نەدەکرا. لەمیانەی چەند نموونەیەکەوە دەشێت باسەکە رۆشنتر بکەینەوە.

أ ـ پێگەی باوی میرنشینی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەمەوە کەوتبووە ژێر هەڕەشەوە. ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی کە هەستی بە پێویستی مۆدێرنبوون کردبوو، بەتایبەتی لە سەردەمی سوڵتان مەحمودی دووەم (١٨٣٩) هەنگاوی بۆ بزاوتەکانی ریفۆرم هاوێشت. ریفۆرمەکان پەیوەندییان بە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی دەوڵەت هەبوو. لە هەنگاونان بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەدا سەرلەنوێ رێکخستنەوەی بیروکراسی ناوەندی، باج و سیستەمی سوپا لەسەرووی هەموو شتێکەوە بوو. بەرامبەر بەو ریفۆرمانە دەرفەتی بەردەوامبوونی میرنشینی باوی کوردان لەئارادا نەدەما. پەسەندکردنی سیستەمی باج، سوپا، مانای لەناوچوونی میرنشینە کوردیەکان بوو. یان دەبووایە خۆیان پاکتاوبکەن یان یاخی ببن. یەکەمین یاخیبوونی بە بنەما تەریقەت و میرنشینی کە لە تەوەرەی سلێمانی دەستی پێکرد (یاخیبوونی ١٨٠٦ بنەماڵەی بابانیەکان و تەریقەتی قادری) دەست پێکردنی ئەو قۆناغەیە. لایەنی سەیر و گرنگی سلێمانی لەوەدایە دەکەوێتە ئەوپەڕی کوردستان، پەیوەندی لەگەڵ قەبیلە و خێڵە دراوسێکانەوە هەیە کە تا ناوەوەی ئێران درێژ دەبنەوە و هەروەها خاوەنی توانایەکی رۆشنبیری بەهێزە. هەروەها یەکێکە لە ناوەندەکانی تەریقەتی قادری و نەقشبەندی. شارەزایی میرنشینە کوردیەکان سەبارەت بە سیاسەتکردن لەسەر

هاوسەنگیەکان پەرەیسەندبوو. یەکەمین تێکەڵەی مۆدێرنیتە و نەریتی باو لەو ناوچەیە پێکهاتبوو. یەکێک لەو شوێنانە بوو کە یەکەمجار هەژموونگەرایی نوێی جیهان ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا دەستی تێخست. لەژێر ئەو هەلومەرجانەدا کوردایەتی یاخود بزووتنەوەی کورد دەستیپێکرد. ئەو بزووتنەوەیەی تایبەتمەندێتییە ئایینی، میللی، قەبیلە و خێڵەکیەکان بەشێوەیەکی تێکەڵ رۆڵی تێدابینی لە خۆجێیی (مەحەلی) بوون رزگاری نەبوو. ماوەیەکی درێژ لەبەرامبەر سیاسەتە باوەکانی ئیمپراتۆریەت و پەلامارەکانی سەرکوتکردن بەرخودانی نەکرد. بەڵام لەهەمانکاتدا ئەو بزووتنەوە مانای دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ بوو. هەروەک دواتر بەرەو دەڤەرەکانی باکوور بزووتنەوەی هاوشێوە یەک بەدوای یەکتر سەریانهەڵدا. لەوانەیە گرنگترین و دواترینیان ئەو بزووتنەوەیە بووبێت کە میری بۆتان بەدرخان بەگ رێبەرایەتی کرد.

بەدرخان بەگ کە بەتایبەتی وانەی لە نموونەی میسر وەرگرتبوو کە بەرامبەر عوسمانیەکان یاخی ببوو لە ساڵانی ١٨٢٠کان بەدواوە بەردەوام سنووری میرنشینی خۆی بەرفراوان کرد؛ بەرەو سیستەمی دەوڵەتێکی مۆدێرنی دەبرد. هەڵگری خەسڵەتی بزووتنەوەیەکی میللی پێشوەخت بوو. سەرکوت نەکرابووایە لەوانەبوو بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوە بەرەو پێش چووبووایە. بەو سیفەتەی نزیکترین بزووتنەوەی نزیک بە وەسفی مۆدێرنە، ئەو بوویەر و سیاسەتانەی لە چواردەوری رێبەرایەتی بەدرخان بەگ روویانداوە سەبارەت بە رۆژی ئەمرۆشمان پڕ لە وانە و ئەزموونە. ئینگلیزەکان لە هەوڵی ئەوەدابوون لە رێگای سریانیەکانەوە دەڤەرێکی تامپۆن لەناوچەکە ئاوابکەن. بژاریان بەو لایەنە دابوو. قەیسەری روسیاش لە باکوور بەنیازی میکانیزمێکی تامپۆنی هاوشێوەی پشتبەستوو بە ئەرمەنیەکان بوو. ئیمپراتۆریەتەکانی عوسمانی و ئێرانیش لەهەوڵی بەرفراوانترکردنی دەسەڵاتە ناوەندیەکەیاندا بوون. کوردان لە چوارلاوە گەمارۆ درابوون. جیاوازی گەمارۆکە لەوەدابوو ئەو هێزانەی دەهاتن بە ئارەزوو و ئامرازی مۆدێرن تەیار کرابوون. لەگەڵ بوونی بژار، بەڵام بژارەکانی بەدرخان بەگ سنووردار بوو. بە ئامانجگرتنی سریانیەکان هەڵەیەکی ستراتیژی بوو. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندییان لەگەڵ ئەرمەنیەکان باش بوو، بەڵام لە دۆخێکی ستراتیژی دوور بوو. گرنگترینیشیان لە هێزێکی هەژموونگەرایی بێبەش بوو تا پشتی پێ ببەستێت. لەکاتێکدا نموونەی میسر بە پاڵپشتی ئینگلتەرا بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی نوێ هەنگاوی دەنا، ئیمپراتۆریەتی رووسیا و ئینگلتەرا کە هەڵوێستیان لە دژی یاخیبوونی بەدرخات بەگ نواند، پشتگیری سوڵتانی عوسمانییان دەکرد. هەڵوێستی ئێرانیش نەرێنی بوو. هەروەها لە ناوەخۆش هەنگاوی بۆ ئاواکردنی سوپایەکی شێوازی گەریلا نەهاوێشت، تەشکیلاتی سەربازی چەمکی سوپای نیزامی دەرباز نەکرد. نیاز و ئامادەکاریەکی لەپێناو بەرخودانی درێژخایەن نەبوو. لەمیانەی ئایدیۆلۆژیا و رێکخستنە نەریتییە باوەکان دەجوڵایەوە. لەجیاتی سیستەمێکی یاسایی، لە رێگای فەرمانەوە درێژەی بە حوکمڕانی خۆیدەدا. لەناو بنەماڵەشدا (یەزدان شێر) کێشمەکێشی سەبارەت بە میرنشینی لەئارادابوو، لەوانەبوو هەر ساتێک بەرەو خیانەت ئاراستەی گرتبووایە. شانبەشانی تەواوی ئەو خاڵانە لە کات و هەلومەرجی لەباردا نەکەوتە جوڵە و کەوتنە ناو تەڵەزگەی

تەکتیکەکانی سوڵتان کۆتایی پێهێنا. ئەو شەڕ و پێکدادانەی لە بەهاری ساڵی ۱۸٤۷ دژوار بوو، لەگەڵ خیانەتی یەزدان بەگ هەمان ساڵ سەرکوتکرا. بە پشتگیری هێزەکانی خۆرئاوا سەرکوتکردنی نزیکترین بزووتنەوەی کوردان لە هاوچەرخبوون، لەلایەنی نەرێنیەوە ئەنجامی ستراتیژی لێکەوتەوە.

دەزگا کلتووریەکانی کوردان کە خاوەن ئۆتۆنۆمیەکی بەرفراوانی شێوازی نەریتی باو بوون، چیتر نەیاندەتوانی درێژە بە زیندوویی و بژێوی جاران بدەن. بیروکراسی ناوەندیش هەنگاو بە هەنگاو جێگیر دەبوو، لەهەر لایەک هەوڵی بڵاوکردنەوەی دەسەڵات و دەستڕۆیی خۆی دەدا. ئیتر پێگەی ویلایەتی کوردستان تا دەچوو سنووردارتر دەکرا؛ لە ۱۸٦۰کان کۆتایی پێهێنرا و جوگرافیای کوردستانیش تەنیا وەک زاراوەیەک مایەوە. ئیتر سیستەمی میرنشینی کوردان، کە لەسەردەمی میتانی و هیتیتەکان (۱٦۰۰ ــ ۱۲۰۰ پ.ز)ەوە خاوەن نەریتێکی ریشەدارە، کۆتایی پێهات. ئەو پاشماوانەی لە میرنشینەکان دەمانەوە لە مۆدێرنبووندا بەدوای چانسی ژیاندا دەگەڕان، بەرەو مەترەپۆلەکانی داگیرکەران دەڕۆیشتن و بەشێوەی بەکرێگیراوێتی هەوڵی مانەوەیان دەدا. لەو بارەیەوە سەرگوزەشتەی بەدرخانی و بابانیەکان زۆر سەیر و سەرنجڕاکێشە. لەلایەک کە دەرفەتیان بۆ رەخسابوو یاخیبوونەکانیان هانداوە، لەلایەکی دیکەیشەوە وەک بەکاریگەرترین کادیران رۆڵیان لە پێکهاتنی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکاندا بینیوە. چەندین کادیری سەر بەو بنەماڵانە جێگای باسن کە بەمجۆرە رۆڵیان لە ئاواکردنی ئیمپراتۆریەت و کۆماردا هەبووە. هەروەها رۆڵی باوکی میللیگەرایی سەرەتایی کوردیش دەبینن. سەرنجڕاکێشترین نموونەش پێشەنگایەتی نەوەی بەدرخان بەگ جەلادەت عەلی بەدرخانە بۆ یەکەمین هەوڵە ئایدیۆلۆژی (رۆژنامەی کوردستان و گۆڤاری هاوار...)و رێکخستنی (لە سەروویانەوە رێکخستنی خۆیبوون)یەکانی میللیگەرایی. هەروەها لە پەیوەندی دیبلۆماسیشدا کە باپیرەی نەیتوانیوە تێیدا سەرکەوتوو بێت، شارەزایی سەبارەت بە زمان و کلتووری خۆرئاوا شایستەی ئاماژە پێکردنە.

سەیرتریشیان لەوەدایە بناغەی سیاسەتی ئەو کوردایەتیەی داناوە کە سەرجەم دەوروبەر و کەسایەتییە ئەرستۆکراتە کوردەکانی دوای خۆی وەک مۆدێل بەبنەمای دەگرن. ئیتر کوردبوون و کوردایەتی بەدەستی ئەو ناوەند و کەسایەتیانە ببوو بە ئامرازی ژیاندنی خۆیان و بنەماڵەکانیان. سەرجەم رەفتار و مامەڵەکانیان لە چوارچێوەی مانەوە و درێژەدان بە بوونی خۆیان بەڕێوەچووە. ئەو رەفتار و مامەڵانەی بە سەربەخۆخوازیەوە دەستی پێکردووە، تا ئاستی داواکردنی لێبووردن و بەخشینی کەسی (شخصي) بچووککراوەتەوە. ئەو رێگایەی بە بەدرخان بەگەوە دەستی پێکرد، لەمیانەی جەلادەت عەلی بەدرخانەوە کراوە بە مۆدێل یاخود رێبازێک. کامەران عەلی بەدرخان هەوڵیداوە لەرێگای کۆماری تورکیاوە هەمان مامەڵە لەگەڵ مستەفا کەمالیش بکات. وەک پێویستیەکانی هەلومەرجی هەراج یان بازاڕیکردن هەندێک جار کوردێتی زۆر گرانبەهایە، جارانێکیش زۆر هەرزان دەبێت. هیچ کوردێتی و بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی کوردان لە ئارادا نییە کە لەمیانەی ستراتیژی و تەکتیکێکی بەرنامەیی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بەڕێوەبرێت. تەواو

لەو خاڵەدا مەسەلەی چینایەتی و نەتەوایەتی بایەخدار دەبێت. لەکاتێکدا بزاوتە چینایەتیەکانی سەردەمیان بەسەر چووە ئەو کەسانە تەنگەتاو دەکات و دەیانخاتە ناو نیگەرانی و لێکدانەوە شەخسیەکانیان، بزووتنەوە نیشتیمانییە گەشەنەکردووەکانیش بەرەو بزاوتی ئایدیۆلۆژیا و ڕێکخستنە سەرەتاییەکانیان دەبات کە ڕێگا لەپێش هەمان ئەنجام دەکاتەوە.

هەندێک جار ئەو کارەکتەرانە لەگەڵ ئیدریسی بەدلیسی بەراود دەکرێن کە لەسەردەمی قۆناغی پێگەیشتنی میرنشینەکاندا ژیاوە. ئیدریسی بەدلیسی نوێنەرایەتی ڕووخسارێکی بەرچاوی سیاسی دەسەڵاتگەرای قۆناغی خۆی دەکات کە لەسەرەتای سەدەی شازدەهەم لە کۆشکی سەفەوی و عوسمانیەکان کاریگەر بووە. میرە کوردەکانی نەیانتوانی ڕژێمێکی پاشایەتی سەربەخۆی تایبەت بەخۆیان ئاوا بکەن، لە کۆشکی هێزە هەژموونگەراکان لە دەرەتانێک دەگەڕێن. میرنشینە کوردیەکانی پێشتر ڕۆڵێکی کاریگەریان لە دامەزراندنی خانەدانی سەفەویدا بینی، کاتێک شیعە کرا بە مەزهەبی فەرمی ئیتر هەستیان بە مەترسی کرد. بەهۆی ئینتیمایان بۆ مەزهەبی سوننی بەرەو بەکرێگیراوێتی بۆ خانەدانی عوسمانی ئاراستەیان گرت. بەرژەوەندی گرنگیان لەوەدا هەبوو. ئیدریسی بەدلیسی ئەندازیاری سیاسی و ئایدیۆلۆژی بەدواداگەڕانی ئەو خانەدانە نوێیە بوو. زۆربەی زۆری میرنشینەکانی کوردستان لەبارەی ڕێککەوتنێک لەگەڵ خانەدانی عوسمانی ڕێککەوتن کە لەسەر بنەمای هێزی هاوتا و دابەشکردنی دەسەڵات بێت. ئەوە ڕێککەوتنێکی ئارەزوومەندانە بوو کە هەلومەرجەکان ڕەخساندبووی. لە سیستەمی دەسەڵاتی عوسمانیدا خاوەن پێگەیەکی تایبەت بەخۆیان بوون. میرنشینە کوردیەکان لەمیانەی دەستنیشانکردنی میری میران لەناوەخۆیاندا لەوانەبوو سەربەخۆتر بوونایە و دواتر دەرفەتی ئاواکردنی سەڵتەنەتێکی ناوەندییان بۆ بڕەخسابووایە. بەڵام پێویستە لەبیری نەکەین کە هەلومەرجەکانی ئەو قۆناغە لەجیاتی چەندین ڕژێمی سەڵتەنەت، سیستەمی دەسەڵاتی خۆی لەسەر بنەمای چەند هێزێکی هەژموونگەرایی بەڕێوە دەبرد. ستاتۆی ئەو قۆناغە بەم شێوازە خۆی بونیاد نابوو. پاشایەتی سەربەخۆ ڕێسا نەبوو، بەڵکو لە ڕێسابەدەر بوو. لەو سۆنگەیەوە؛ هەوڵەکانی ڕێککەوتن کە بە ڕێبەرایەتی ئیدریسی بەدلیسی بەڕێوەچوون بەگوێرەی قۆناغی خۆی گونجاو و سەرکەوتووە. مەترسیەکەی لەوەدایە: حیساب بۆ ئەو هەلومەرجە ئەرێنی و نەرێنیانە ناکات کە دواتر دێنە ئاراوە و زیاتر بەگوێرەی ئەو کاتەیە. ناشێت دۆخەکەی ئیدریسی بەدلیسی لەگەڵ ئەو بەکرێگیراوێتییە بەراورد بکرێت کە لەسەدەی نۆزدەهەم دوای هەڵوەشانەوەی سیستەمی میرنشینی هاتەئاراوە. بەراوردکاریەکی بەو شێوازە پشت بە پێوەر و ئەنالۆژیەکی چەوت دەبەستێت کە هەلومەرجەکانی قۆناغ ڕەچاو ناکات و قۆناغەکان تێکەڵ بە یەکتری دەکات.

تا سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم ستاتۆی کوردان لە ستاتۆی تورکەکان یاخود تورکمان و عەرەبەکان دواکەوتووتر نییە، بەڵکو لەپێشترە. داڕووخانی بنەڕەتی و جیاوازی ستاتۆ لەسەدەی نۆزدەهەمدا دەستی پێکرد. کاتێک دەرک بە بەسەرچوونی سەردەمی میرنشینەکان کرا، میراتگرەکانیان داوای هیچ ستاتۆیەکیان بۆ گەلی کورد نەکرد، بگرە

هەڵوێستی خراپتریان پیشاندا و دەستبەرداری داواکردنی ئۆتۆنۆمی باویش بوون، هەوڵی پێشخستنی مۆدێلێکیان داوە کە لەسەر بنەمای بەکرێگیراوێتی بەرژەوەندیەکانی بنەماڵە و شەخسی خۆیان گەرەنتی بکات. هەڵبەتە بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە هەنگاویان بۆ ئەو ستاتۆ نوێیە نەهاوێشت. چیتر هەلومەرجەکانی سەدەی شازدەهەم لەئارادا نەبوو. هەوڵی یاخیبوون و سەرهەڵدانیان داوە، داکۆکییان لەسەر ستاتۆی باو کردۆتەوە، بگرە بەرەو پێشتر هەنگاویان ناوە و لیگەڕینی دەوڵەتی سەربەخۆشیان کردووە. بەڵام بەهۆی کارەکتەری چینایەتی و هەلومەرجەکانی چاخی مۆدێرن، لەو هەوڵ و کۆششانەیاندا لە شکست رزگاریان نەبووە. تاکە بژاریان کە ماوەتەوە، دیسان وەک پێویستیەکی کارەکتەری چینایەتییان، بەرەو جۆرێکی نوێی بەکرێگیراوێتی مەترسیدار رۆیشتن کە لەسەر بنەمای داخوازی شەخسی و بەرژەوەندی بنەماڵەگەری کوردێتییان کردووە بە کاڵایەکی هەرزانی بازاڕ. دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکانیش زۆر بەباشی ئەو خاڵە لاوازانەیان قۆستۆتەوە، لەپێشخستنی رژێمێکی مۆدێرنی داپلۆساندن و چەوسانەوە ئەوانیان وەک بەکاریگەرترین و مەترسیدارترین ئامراز بەکارهێناوە.

ئەو توێژانە هەوڵیانداوە لاسایی چینی بۆرژوازی بکەنەوە، تا ئێستاش لاسایی دەکەنەوە. بەڵام هەلومەرجە ماددیەکان، پەیوەندییەکانیان لەگەڵ ئابووری و دەسەڵاتەوە، هەروەها دۆخی ئایدیۆلۆژی و رێکخستنیان دەرفەتیان پێنادات ببن بە چینێکی بۆرژوازی مۆدێرن. لەوانەیە خودی کامەران عەلی بەدرخان ناسیۆنالیستێکی ئایدیالیست بووبێت. بەڵام ئەو واقیعە بابەتییەی تێیدا ژیاوە ئەو بانگەشانەی کردووە بە ئارەزوویەک کە لە گەدەیدا ماوەتەوە. ئەو دۆخەشی بەربەست نییە کە ئەو مۆدێلە بەکرێگیراوێتیەی تێی کەوتووە بەرەو خیانەت نەچێت و مەترسیدار نەبێت. هەروەک ئەو پەندەی دەڵێت؛ ماسی لەسەریەوە بۆگەن دەبێت، ئەو مۆدێلە تا رۆژی ئەمڕۆمان کاریگەریەکی زۆری هەبووە، وەک بڵێی شێوازێکی ئاسایی ژیانی کۆمەڵایەتییە، رۆڵێکی سەرەکی لەدیاریکردنی سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتییەکان و کارەکتەری کەسایەتییەکانیان بینیوە. رۆڵی ئەو چینە ئەرستۆکراتییە بۆ ئامرازێک بچووککراوەتەوە کە ستەمکاری دەوڵەت ـ نەتەوە و شێوازەکانی چەوساندنەوەی سەرمایەداری لەسەر کورد و کوردستان مسۆگەر دەکات. لەو دوو سەد ساڵەی دواییدا ئەو دۆخەیان وەک ئامرازێکی سەرەکی لەناوبردنی کوردێتی قۆستراوەتەوە: بەتایبەتیش لەرێگای "ژینۆسایدی تایبەت و پەردەپۆشکراو"دا کە لەمیانەی فشار و توندوتیژییەوە ئامانجی تێکدانی سەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگایە. کاتێک رەنگدانەوەی نەریتە ئەرستۆکراتی و تەریقەتگەراییەکان لەراستینەی کورد و بزووتنەوەکانیان تاوتوێ دەکەین و بەتایبەتیش مۆدێلەکانی پەیوەندی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەگەڵ فاکتەرە زاڵەکانی شیکار دەکەین، ئەو لایەنانەی چەندە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت هەر کەمە. ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی قووڵ لەسەر پێگەکەیان و دەست نیشانکردنی رەنگدانەوە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانیان گرنگیەکی مەزنی هەیە.

کاتێک سەبارەت بە میراتی چینی سەروو بیردەکەینەوە، ئەوەی ئەنجامبدرێت تەنیا پێوەلکاندنی نیشانەکانی خیانەت نییە، بەڵکو هەوڵدانە لەپێناو تێگەیشتنی مانای

ناسنامە و خەسڵەتی کەسایەتی سەرجەم چین و توێژە کۆمەڵایەتیەکانی ڕاستینەی ئەو کۆمەڵگایەی دووچاری ژینۆسایدی کلتووری هاتووە و ئاشکراکردنی چۆنیەتی کاریگەربوونیانە. کۆمەڵگای کوردەواری کۆمەڵگایەکی ئاسایی نییە تا شیکارگەلێکی ئاسایی ئەنجام بدەین. یەهودیەکان بە سووربوونەوە دەستەواژەی "تایبەت"و "تاقانە" بۆ ئەو ژینۆسایدە بەکاردێنن کە دووچاری هاتوون؛ داکۆکی لەسەر ئەو خاڵە دەکەن کە دووچاری ژینۆسایدێکی بێهاوتا هاتوون. دەشێت پێناسەیەکی هاوشێوە سەبارەت بە ژینۆسایدی کوردانیش بکرێت. بۆ نموونە؛ دووچاری ژینۆسایدێکی کلتووری "تایبەت"، "تاقانە" هاتووە و ئەمڕۆش بەردەوامە. هەر لەو سۆنگەیەوە؛ پێویستی بە لێکۆڵینەوە و لێتوێژینەوەی تایبەت بەخۆی هەیە. لەو چوارچێوەیەدا هەڵسەنگاندنی میراسی چینی سەرووی کورد و پاشماوە هەنووکەییەکانیان کە پێگەیەکی دیاریکەریان لە ئەنجامدانی ژینۆسایدی کلتووریدا هەیە، سەبارەت بە پاراستن و ئازادکردنی بوونی کلتووری کوردان گرنگی و بایەخێکی ژیانی هەیە.

ب ـ هەرەسهێنانی سیستەمی میرنشینی پلەداری ئایینی دەرخستەپێش. شکستهێنانی بەدرخان بەگ و یەزدان شێر ڕێگای لەپێش دەزگای شێخایەتی کردەوە کە دەستپێشخەری و ڕۆڵی ڕێبەرایەتی کۆمەڵگا بەدەست بێنن کە لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمەوە هەنگاو بە هەنگاو بەهێز دەبوون. بەتایبەتیش شێخەکانی قادری و نەقشبەندی گرنگیەکی زۆریان پەیدا کرد. هەردوو تەریقەتیش پێگەیەکی بەهێزیان لە کوردستان هەیە. بەڵام پێویستە نەریتی شێخایەتی تەنیا وەک دەزگایەکی تایبەت بە چاخی ناوین نەبینرێت. ڕەگەکەی تا دەوڵەتی کاهینی سۆمەر درێژ دەبێتەوە. کاهینەکانی زەقورەی سۆمەر یەکەمین ئافرێنەرانی ڕێکخستنی دەوڵەتن. ئاواکردنی دەوڵەت پەیوەندی بە داناییەوە هەیە. چونکە دەوڵەت تەنیا ڕێکخستنی هێزی قەبە نییە، ماناکەی دیاریکەرترە. بۆ ماوەیەکی درێژخایەن کاهینەکان دەوڵەتی کاهینی سۆمەریان بەڕێوەبردووە، بەزمانی عەرەبی واتە شێخەکان بەڕێوەیان بردووە. زۆر دواتر سیاسەتمەدارە عەلمانیەکان دەستیان بەسەر بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتدا گرتووە. هەروەها ململانێی نێوان هەردوو نوخبە سەبارەت بە دەسەڵاتی دەوڵەت هەمیشەیی بووە، لە سەردەمی لەدایکبوونیەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆشمان بەردەوامە.

لەکاتێکدا دەزگای کاهینی ڕۆڵی سەرەکی لە ئافراندن و لەدایکبوونی دەوڵەتدا دەبینێت، بەڵام لە بەردەوامکردن و بەرفراوانبوونیدا ڕۆڵی خانەدانە عەلمانیەکان دەرکەوتۆتە پێش. لە دەستەبەربوونی پلە و پایەی دەسەڵاتی کوردە یەکەمینەکانیش پەرەسەندن و گۆڕانکاری هاوشێوە لەئارادا بووە. هیچ کاتێک کێشمەکێشمی دەسەڵات لەنێوان خانەدانە عەلمانی و کاهینەکانی کۆنفیدراسیۆنی خوری، هیتیت، میتانی، ئورارتوو و میدیا کەم نەبۆتەوە و هەر بەردەوام بووە. هەرچەندە لەمیانەی دەستەواژەی پاشا ـ خوداوەند هەوڵی ئافراندنی سەنتێزێکی نێوان هەردووکیان دراوە، بەڵام ئەو کێشمەکێشانە هەر بەردەوام بوون. بە سیفەتی ئایینە تاکخوداییەکان کێشمەکێشی هاوشێوە لە ئایینە ئیبراهیمیەکانیشدا جێگای باسە. لەیەکەمین ڕێکخراوی قەبیلەی ئیبراهیمیدا کاهینێتی لەپێشەوەیە. موسا بەخۆی پێغەمبەرە، هارونی براشی سەرۆکی کاهینەکانە. ئەو کێشمەکێشەی لە قەبیلەی عیبرانی

لەئارادا بووە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بووە. خودی عیسا حاخامێکی یەهودی پلە نزمە. سێسەد ساڵ دوای عیسا لە دەرەوەی کاهینەکان ئاشنای حوکمڕانی کەسانێکی تر دەبن. مێژووی هەزار ساڵی دوایی ئەوروپا پڕ لە ململانێ و تێکۆشانی نێوان کڵێسا و عەلمانیەکان دەرباز بووە. کاتێک ئیسلامیەتیش وەک ئایینێک سەریهەڵدا، هەر زوو پێشوەخت ئاشنای دەسەڵاتی سیاسی بوو. هێشتا سی ساڵ بەسەر دامەزراندنی دەوڵەتی ئیسلامی تێپەڕ نەببوو، شەڕێکی گەورە لەنێوان ئەهلی بەیت (خانەدانی کاهین) و خانەدانی ئەمەوی عەلمانی سەریهەڵداوە. شەڕ و ململانێی نێوان دەوڵەتی ئایینی و دەوڵەتی عەلمانی بووە بە یەکێک لە سەرەکیترین کێشەکانی مێژووی ئیسلام.

ئەو نەریتە مێژووییە درێژخایەنەیە کە لە کۆمەڵگای کوردەواری و کێشمەکێشەکانی دەسەڵاتەکەیدا ڕەنگیداوەتەوە. لە کوردستان نەریتی ئایینی ڕۆڵێکی مەزن لە پێکهاتنی دەسەڵات و پشککردنیدا دەبینێت. لە کاتێکدا بەهێزبوونی نەریتی قەبیلە و خێڵ نەریتی ئایینی سنوردار دەکات، بەهۆی ئازادی و یەکسانی بونیادەکەی پێکهاتنی میرنشینە عەلمانیەکانیشی سنووردار کردووە. لە کوردستان بەدرێژایی مێژوو دەستڕۆیی(نفوذ)ی سیاسی لە نێوان ئەو بونیادە سێیانەیە دابەشکراوە. کاتێک هاوسەنگی نێوانیشیان تێکچووە کێشمەکێش و شەڕی نێوانیان کەم نەبۆتەوە. هیچ یەکێک لەو دەزگایانەی دەستڕۆیی یان دەسەڵات بەتەواوی لەناو سیستەم پاکتاو نەکراون. لە کاتێکدا ڕێککەوتن و شەڕی دابەشکردنی دەسەڵاتی چینەکانی سەروو لەنێوان ئەو دەزگایانە ڕوویدەدا، لەناو چینی خوارووشدا پاشکۆکانیان بە کاریگەربوون. لە بەرامبەر ئەوەشدا دابەشکردنێکی دیموکراتیانەی دەستڕۆیی لەناو بونیادی هەرسێ دەزگادا هەستی پێدەکرێت. ناشێت باس لە دەسەڵاتی ڕەها بکرێت. ئەو سنووردارکردنانەی نەریتی دیموکراسی بەشێوەیەکی بەهێز ئەنجلمیداون بەردەوام هەبووە. هەر دەزگایەک تەنیا لەمیانەی جەماوەرەکەی و دیمۆسەکەیەوە توانیویەتی درێژە بە بوونی خۆی بدات. هەرچەندە ماوە بە ماوە یەکێک لەو دەزگایانە دەرکەوتبێتە پێش، بەڵام بەردەوام لەرێگای دیمۆسەوە هاوسەنگیەکان ڕەچاوکراوە.

لە دووەمین نیوەی سەدەی نۆزدەهەمدا تاڕادەیەکی زۆر دەستپێشخەری میرنشینەکان شکاوە کە ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو. ئەو دۆخە لەلایەن دەزگای شێخایەتی قۆستراوەتەوە. سوڵتان مەحمودی دووەم کە گەورەترین زەبری لە میرنشینێتی وەشاند کاتێک ئۆجاخی یەنی چەری تەسفیە کرد، زەبری لە بەگتاشێتیش وەشاند کە تەریقەتە فەرمیەکەی بوو. مەحموودی دووەم هەوڵی داوە بۆشاییەکەی مەشروعیەت بە تەریقەتێکی نوێ، بە نەقشبەندێتی پڕ بکاتەوە. لەو قۆناغەدا شێخە کوردەکان دەرکەوتنە پێش کە لە تەریقەتی نەقشبەندی کاریگەرییان هەبوو. لەوانە مەولانا خالیدی خەڵکی سلێمانی دوای پاکتاوکردنی یەنی چەری و بەگتاشێتی یەکێک لەو شێخە بەهێزانە بوو کە قوتابخانەی سیستەم دەریخستە پێش. بە سیفەتی بەکرێگیراوە نوێکانی سوڵتان و سەڵتەنەت شێخەکان لە جێگای میرەکان جێگیرکراون. ڕۆژ لەدوای ڕۆژ کاریگەرییان لە کۆشک زیادی کرد. ڕۆڵێکی هاوشێوەی تەریقەتی قادریش دەرکەوتە پێش. دیسان شێخە کوردەکان لە پێشەوە

بوون. لە بزووتنەوەی هاوچەرخی کورددا لێتوێژینەوەیەکی زۆر کەم سەبارەت بە ڕۆڵی شێخەکان ئەنجامدراوە. کەچی لە راستیدا ئەو دەزگایەی دوای لاوازبوونی دەزگای خێڵ و میرنشینی، بەهۆی ئەو هاوکاریەی لەگەڵ کۆشکەکان ئەنجامیداوە بەخێرایی بەهێز بووە و دەستپێشخەری بەدەستهێناوە دەزگای شێخایەتی بووە. لەو بارەیەوە بەڕێوەبەرایەتی کۆشک بە ئاگایی و هۆشیارانە مامەڵەی کردووە. لە سەدەکانی ١٩و٢٠دا دامەزراوەکانی تەریقەت رۆڵێکی دیاریکەریان لە پەرەسەندنی چەمکی جەماعەت لەناو کۆمەڵگای کوردستان بینیوە. بەڵام ئەو بەکرێگیراوێتییەی جۆرێک لە سیخوڕێتیە و بۆ کۆشکیان ئەنجام دا رۆڵێکی گرنگی لە پەرەسەندنە خێراکەیان بینیوە. سیستەم ئەوانە وەک هێزە نوێیەکانی بەدەستهێنانی مەشروعیەت بەکاردێنێت. ناکەونە ناو چوارچێوەی پۆلێنی ئەو کۆمەڵگا مەدەنیەی بەشێوەیەکی هەرەمەکی لەخۆیانەوە پێکهاتوون. بەمانایەکی تر ئەو لایەنەیان هەر بەلاوازی ماوەتەوە. گەل ئاگاداری لایەنی سیخوڕی و بەکرێگیراوێتی دەزگای شێخایەتی نییە. بەردەوام ئەو لایەنە پەردەپۆشکراوە و بەشاراوەیی ماوەتەوە. رۆڵی شێخەکان لە هەردوو سەدەدا ئاواکردنی دڵسۆزیەکی نوێ و بەهێزی ژێر رێبەرایەتی خۆیانە لەجیاتی سەداقەت و دڵسۆزی میرنشینەکان. هەروەک رۆڵی ئەرستۆکراسی میرنشینەکان لە رەواکردن و بەردەوامکردنی سیستەم، پێویستە رۆڵی شێخەکانی تەریقەتیش لە رەواکردن و درێژەپێدانی سیستەم بەگرنگیەوە توێژینەوەی لەبارەوە بکرێت و ئاشکرابێت.

لەوانەیە لەمیانەی باسکردنی رووداوێکی نموونەییەوە ئەو بابەتە رۆشنتر ببێتەوە. بزووتنەوەی شێخ عوبەیدوڵڵا پەیوەست بە شەڕی نێوان عوسمانی - روسی (١٨٧٧ ـ ١٨٧٨) سەریهەڵداوە. سوودی لەو دۆخە بینیوە کە عوسمانیەکان لەبەرامبەر رووسەکان تووچاری هاتبوون. هەوڵیداوە سوود لەو ناکۆکیانەی ببینێت کە لەگەڵ دەرەوە هەیبوو. هەروەها کاریگەری بزووتنەوە میللیەکانی ئیمپراتۆریەتیشی لەسەرە. ئەو چاوەڕوانییە نوێیانە رەچاوکراوە کە لەناو کۆمەڵگای کوردەواری سەریهەڵداوە. نەک تەنیا بە پشتگیری زانا ئایینیەکان، بەڵکو بە پشتیوانی ناوەندە کاریگەرەکانی دیکەشەوە لە ماوەیەکی کورتدا گەورە بووە. لەمیانەی رێکخستنی کۆبوونەوەکانەوە گوێڕایەڵی سکاڵاکانی سەبارەت بە بیروکراسی ناوەندی و داواکارییە میللیەکان کراوە و خراونەتە ناو چوارچێوەی ئامانجەکانەوە. بزووتنەوەکە لەبەشێکی بەرفراوانی خۆرهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێران) و کوردستانی ژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکان خاوەن کاریگەری بووە و فۆرمێکی بەدەستهێناوە. بۆ ئەوەی ببێت بە دەوڵەتێکی فەرمی پشتگیری یەکێک یان چەند هێزێکی هەژموونگەرایی ئەو قۆناغە بەس بوو. بەڵام ئەو پشتگیرییەی لێنەکراوە. پەسەندکردنی سەرجەم داواکاریەکانی هێزە هەژموونگەراکانی خۆرئاوا لەلایەن دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانیەوە، رۆڵی سەرەکی هەبوو لە بەدەست نەهێنانی ئەو پشتگیرییە. کاتێک پشتگیریکردن بەلایەنی دەوڵەتی عوسمانی و ئێرانی شکاوەتەوە لەناوبردنی ئەو بزووتنەوە گەورەیەش زەحمەت نەبووە. سەڵتەنەت وانەی گرنگی لەو بزووتنەوە وەرگرتووە کە لە سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم روویدا. هەمان ئەو رێبازەی لەسەر بنەماڵەی بەدرخان بەگ پەیڕەوکراوە بەهەمان شێوە لەسەر خانەوادەی عوبەیدوڵڵای نەهریش

تاقیکراوەتـەوە. بـۆ ئەسـتەنبۆل گواسـتراوەتەوە و لـە ڕێگایانـەوە هـەوڵی کـۆنترۆڵکردنی بەشێکی کوردان دراوە.

ج ـ سیاسەتی کورد لە سەردەمی عەبدولحەمید (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩) شایستەی ئەوەیە لە ژێر سەرەدێرێکی جیاوازدا توێژینـەوەی لـەبارەوە بکرێت. ئیلهـام لـە مۆدێلی ئـاڵایی(فیرقـەی) قـازاخی رووسـەکان وەرگیـراوە و بـەمجۆرە ئـاڵایی (فرقـەکانی) حەمیدیـە ئـاواکراون. ئـەو پەرەسـەندنانەی بزووتنـەوەکانی کـوردان و ئەرمەنیـەکان ڕێگایـان لـەپێش کردنـەوە بیروکراسیەتی ئیمپراتۆریەتی بەرەو تەگبیری ڕیشـەیی بـردووە. یەکـەمیان، بـە ئاراسـتەی دروستکردنی ناکۆکیەکی ئەرمەنی ـ کورد و بەکارهێنانی بووە. هـەمان ڕێبـاز لـە پەیوەنـدی نێوان کورد ـ سریانیش تاقیکراوەتەوە. ئەو گەلانەی نەک سەدان ساڵ بەڵکو هـەزاران سـاڵ بوو بەیەکەوە دەژیان، بەهۆی چاوچنۆکی قازانج ـ داهاتەوە کە مۆدێرنیتەی سـەرمایەداری ڕێگای لەپێش کردبوویەوە خرابوونە ناو دۆخێکی نـاکۆک لەگـەڵ یـەکتردا. بەمانایـەکی تـر لەلایەن هێـزە هەژموونگەراکانـەوە نـاکۆکی لـەنێوان چینـەکانی سـەروویان دروستکراون و بـەکارهێنراون، گـەلانیش کـراون بـە ئـامرازی ئـەو دۆخـە. مێـژوو سـەلماندوویەتی ئەگـەر بەدرخـان بەگ ڕێککەوتنی لەگەڵ سریانیەکان کردبووایە ئەوا دەستکەوتێکی زۆر لـە بـواری ئـازادی و مافـەکانی هـەردوو گـەل بەدەسـت دەهـات. سیاسـەتی "پەرتکـە ــ زاڵبـە" زۆر بەگرنگیەوە بە ئامانجی زیان و شکستی هەردوولا بەکارهێنراوە. لەو سیاسەتەشدا ئینگلتەرا ڕۆڵـی سـەرەکی بینیـوە. لـەو قۆناغـەدا لەمیانـەی ئـەو ڕێبازانـەوە ئۆپەراسیۆنی ئێـراق ئەنجامدەدرێت.

مێژووی پەیوەنـدی نێـوان کـورد ــ ئەرمـەنی کۆنـە و دابەشکردنێکی سروشـتی کـار لـە نێوانیاندا هەبووە. پیشەکاری ئەرمەنیەکان و کشتیاری کوردان یـەکتریان تـەواو کـردووە. جیاوازی ئایینی فاکتەری ناکۆکی و شەڕ نییە. جموجۆڵی میللیگـەرایی ئەرمـەنی دابـڕاو لـە دیرۆک و واقیعی کۆمەڵگای خۆرهەڵات، ئەو هەلومەرجەی پێشکەش بە سوڵتان کردووە کـە بۆ بەکارهێنان پێویستی پێی بوو. هەروەک لە نموونەی بزووتنەوەی سریانی رووی‌دا، ئـەو کوردستانەی دەبووایە وەک وڵاتی هاوبەش ببینرێت، وەک پێویستیەکی وڵاتی یەک میللەت وەک ئەرمەنسـتانێکی سـاف بیـری لێکرابوویـەوە. گـەورەترین وێرانکـاری ئایـدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوە لەوەدایە کە بەردەوام ئەتنیکێک یان نەتەوەیەکی زاڵ بـە بنـەما دەگرێت. ئەوانی تریش یان وەک کەمینە یان وەک نەتەوەیەکی تر نامۆ دەکرێن. ئـەوە پێویسـتیەکی لۆژیکەکەیەتی. ئەنجام گەل و کلتوورە تێکەڵەکانی دراوسێی دێرینی یـەکتر لەگـەڵ یـەکتردا دەکەونە ناو شەڕی کێبڕکێوە. کاتێک لایەنەکانی سەر هەمان جوگرافیا هەڵگری بانگەشـەی میللیگەرایی هاوشێوە بن ئەوا شەڕ و پێکدادان دەست لێبـەرنـەدراوە. لـۆژیکی میللیگـەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە لـەژێر شەڕ و پێکدادانەکانی پەیوەندی نێوان کورد ــ تـورک ــ ئەرمـەنی ــ سریانی شاراوەیە.

سوڵتان عەبدولحەمید کە لە ناکۆکیـەکی بـەمجۆرەوە هـەنگاوی هـەڵهێنا "سـواریەکانی ئاڵایی حەمیدیە"ی خستە جوڵەوە کە لە ساڵی ١٨٩٢ەوە لە خێڵـە کوردەکـان کۆکرابوویـەوە. میللیگـەرا ئەرمەنیـەکانی متمانـەیان بـە پشـتگیری قەیسـەری رووسـی هـەبوو سـتراتیژ و

تەکتیکەکانیان لە بەرامبەر یەکینەکانی سوڵتان سەرکەوتوو نەبوو کە لە خێڵە کوردەکان کۆکرابوویەوە. کەچی لەراستیدا ئەگەر ئەرمەنیەکان ستراتیژ و تەکتیکەکانیان لەسەر بنەمای دۆستایەتی گەلانی دراوسێ دارشتبووایە، ڕێگایان لە پێش گۆڕانکاریەکی شۆڕشگێڕانە دەکردەوە کە بەشێوەیەکی رادیکاڵانە چارەنووسی خۆرهەڵات بگۆڕێت. ئەرمەنیەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەیانتوانی رۆڵێکی هاوشێوەی یەهودیەکانی رووسیا ببینن کە لە شۆڕشی رووسیا بینیان. بەڵام لۆژیکی نابینا و جوداخوازی میللیگەرایی بۆرژوازی چانسی بە پەرەسەندنێکی بەمجۆرە نەدا.

بەڵام وێرانکاری بنەڕەتی ئالایی حەمیدیە (پێویستە مەکتەبەکانی عەشیرەتیشی بخەینەسەر) لەسەر کوردان بووە. لەرواڵەتدا ئالاییەکانی حەمیدیە بەرامبەر هەڕەشەکانی میللیگەرایی ئەرمەنی دامەزراوە، بەڵام لەناوەرۆکدا دژی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد پێشخراوە کە لە گەیشتن بە شێوە مۆدێرنەکان نزیک ببوویەوە. هەوڵدراوە بە بەردێک چەند چۆلەکەیەک بپێکن. ئەو بزاوتەی پێویستە وەک جێبەجێکردنێکی پێشوەختی "گوندپارێزی" (جاشایەتی) هەڵسەنگێنرێت تەنیا هەڕەشەی ئەرمەنی (مێژووی فەرمی بەمجۆرە باسی دەکات؛ بەڵام پێویستە بزانرێت گەلی ئەرمەنی داوای مافە نەتەوەییە دیموکراتیەکانیشی دەکات، لەبنەڕەتدا ئەو داواکاریانە سەرکوت دەکرێت) بنبڕ ناکات، بەڵکو رێ لەئەگەری لەدایکبوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردیش دەگرێت. ئەوە مەترسیدارترین لایەنێتی. هێزێکی بەرتەسکی خێڵ چەکدار دەکرێت، بە موچە و پلە و پایە دەبەسترێتەوە و سەرجەم خێڵ و ئەندامەکانی کۆنترۆڵ دەکات و بەگوێرەی داخوازیەکانی سوڵتان بەکاردەهێنرێت. ئالاییەکانی حەمیدییە رۆڵێکی دیاریکەریان لەوەدا بینیوە جارێکی دیکە بزووتنەوە پێشەنگەکانی هاوشێوەی بەدرخان بەگ و عوبەیدوڵڵای نەهری سەرهەڵنادەن. بزووتنەوەی دیموکراتی نەتەوەیی کورد گورزی کوشندەی بەرکەوت کە ئەگەری سەرهەڵدانی لە ئارادابوو. هەروەها لەمیانەی ئەو ناکۆکیانەی لەنێوانیان دروستکراوە خێڵەکانیش کراونەتە دوژمنی یەکتر. لە زەمینەی ناکۆکی و شەڕ و پێکدادانندا تەنیا گرنگترین سەردەمێکی نیو سەدەیی مێژووی کوردستان بەفیڕۆ نەچووە، بەڵکو ناکۆکی و پێکدادانەکان دژی خۆیشی بەکارهاتووە و کۆمەڵگای کوردەواری خزێنراوەتە ناو دۆخێکی زۆر خراپەوە، لەمیانەی ناکۆکی و شەڕی ناوخۆییەوە دووچاری دۆخێک بووە کە چاک(ئیفلاح) نابێت.

ئەو سیاسەتانەی شانبەشانی دەزگاکانی شێخایەتی و میرنشینی بەکرێگیراو پشت بەهێزە بەکرێگیراو و میلیتاریزەکراوەکانی خێڵ دەبەستێت زۆر بەباشی روونی دەکاتەوە کە بۆچی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردان هاوشێوەی نموونەکانی دیکە گەشەی نەکرد. لێرەدا زۆر گرنگ و بایەخدارە کە بزانین چینی دەسەڵاتداری کورد لە سەردەمی مۆدێرنیتەدا رۆڵێکی زۆر خراپی بینیوە یاخود رۆڵێکی زۆر خراپی پێدراوە. وەک بڵێی قەوارەیەکی تایبەت جێگای باسە کە بەرامبەر بە بوون و ناسنامەی کۆمەڵایەتی خۆی دەخرێتە جەنگەوە. لەراستیدا رووبەڕووی قەوارەگەلێکی دروستکراوین کە دژی ناسنامەی خۆیان دەخرێنە جەنگەوە و بەرهەمی ئەندازیارێتی مۆدێرنیتەیە. پێویستە زۆر بەباشی لۆژیکەکەی ئێرە دەستنیشان

بکرێت. کاتێک هێزی باوی خۆیان لە دەستدەدەن، لەو سۆنگەیەوە کاتێک بەرژەوەندیەکانیان لەدەستدەدەن (چەندین هۆکار رۆڵ لەو دۆخە دەبینێت، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەو سەرهەڵدانانەی بە شکستهێنان ئەنجامگیر بوون) تاکە ئامرازی لەسەرپێ مانەوەی خۆیان و بنەماڵەکانیان هەراجکردنی ئەگەری بزووتنەوەکانی کوردە. هەموو جۆرە رێگا و رێبازێک لەو حیسابانەی هەراجکردندا بەکاردەهێنرێت: لەدەستبەرداربوونی رێبەرایەتی بزووتنەوە شیمانەکراوەکان دەست پێدەکات و تا دەگاتە ئاواکردنی بزاوتە پیلانگێرییە (کۆنترگەریلای پێشوەخت) دژبەرەکان. بەکاریگەرترین رێبازیش، بەدەستهێنانی بەرژەوەندی ماددی و مەعنەوی بووە بەرامبەر دەستبەردان لە دیاردەی کوردێتی و بوون بە بەشێکی بەرچاوی دیاردەی نەتەوەی زاڵ و دەسەڵاتدار. ئەمە ئەو رێگە و رێبازە بووە کە تا رۆژی ئەمڕۆمان بە شێوەیەکی سەرکەوتوو و بەرفراوان لەسەر چین و توێژەکان، بنەماڵە و کەسایەتیەکانیان پەیڕەو و جێبەجێکراوە. ئەو فەرمانە ئاشکرایە کە کراوە بە دروشم: واز لە کوردایەتی بێنە، دەتوانی ببیت بە هەموو شتێک، هەرشتێک بەدەست دێنیت!.

ئەنجامێکی دیکەی ئەو رێبازە رێگای بۆ چەمکێکی کراوەی کوردایەتی ساختە خۆش کردووە. کوردایەتی ساختە وەک ئامرازێکی بەرژەوەندی و کردە شەخسی و خانەوادەییەکان پێشخراوە و بەکار هێنراوە. بێگومان لەناو هەر کۆمەڵگایەکدا کەس و بنەماڵەی بەکاریگەر جێگای باسن. لەو کاریگەریانەشدا قەرزباری ئەو بەهایانەن کە بۆ کۆمەڵگاکەیان بەدەستیان هێناوە. هەرچی لەناو کوردانە بوون بەخانەوادەی بەکاریگەر لەمیانەی هەراجکردنی بەهاکانی کۆمەڵگا، خیانەتکرن لەو بەهایانە و بگرە شەڕکردن لە دژی ئەو بەهایانە بەدیدێت. ئەوەی مەترسیدار و تایبەتە ئەو جۆرە هەڵوێست، حیساب و پەیڕەوانەی سەبارەت بە راستینەی کۆمەڵگایە. بێگومان لەهەر چین و توێژێکدا خانەوادە و کەسی دەرڕێسا هەیە کە بەهادارە و رۆڵێکی ئەرێنی دەبینێت. بەڵام ئەوەی باوە دەرڕێسا نییە، بەڵکو ئەو رێبازە نەفرین لێکراوانەن کە ریشەی خۆیان داکوتاوە.

د ـ سیاسەتی دەوڵەت لەسەردەمی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی، واتە سەردەمی دەرکەوتنی فاشیزمی تورکی سپی، سیاسەتی دەوڵەت دەرهەق بە بزووتنەوەی کورد قووڵکردنەوە و تۆکمەکردنی فرقەکانی حەمیدیە بووە لەمیانەی دامەزراوەکردنی هەمەلایەنیەوە. فرقەکانی حەمیدیە مایەوە. منداڵ و لاوانی نوخبەی بەکرێگیراوی کورد لەجیاتی مەکتەبەکانی خێڵ ژمارەیەکی زیاتریان لە قوتابخانە فەرمیەکان وەرگیران. یەکەمین گروپە رۆشنگەریەکانی کوردان پێکهات کە سەرچاوەی خۆیان لە نوخبەی ئەرستۆکراتی باو، ئایین و خێڵ وەردەگرت و ئاشنای مۆدێرنیزم ببوون. ئەو توێژەی لە رێگای دامەزراندنی جەمعیەت، گۆڤار و رۆژنامەوە بوونی خۆی راگەیاند پێکهاتەیەکی نوێ بوو. دەشێت ئەوە بە یەکەمین بزووتنەوەی بۆرژوازی هاوبەشیش ناوببرێت. ئەو ناوەندانەی تێگەیشتن چیتر ناتوانن بە هوشیاریی میرنشینی، شێخایەتی و خێڵایەتی رۆڵ ببینن، هەروەک بەگشتیش نموونەکانیان دەبینرێت، وەرچەرخانی چینایەتییان ئەنجامداوە. لە کاتێکدا رۆم، ئەرمەنی و سریانیەکان بەهۆی کاریگەری سەرمایەداری

ئەوروپا و كرستیانبوونیان زووتر و خێراتر بوون بە بۆرژوازی، كۆمەڵگا موسڵمانەكان دواتر ئەو پرۆسەیان بەخۆیانەوە بینی. ئەوەی لای كوردانیش روویدا ئەو گۆڕانكارییە درەنگە بوو. مایەی تێگەیشتن بوو كە لەرێگای میللیگەرایی سەرەتاییەوە گوزارشت لەخۆی بكات. هاوشێوەی جۆن توركەكان (توركە لاوەكان) نوێنەرایەتی كوردە لاوەكانیان دەكرد. لەراستیدا لەگەڵ توركە لاوەكان لەناو یەكتردا پێكدەهاتن. تەواو لەژێر هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژیای خۆرئاوا پەرەسەندنیان بەخۆیانەیەوە بینی. لە دۆخێكی وەهادا نەبوون پێهەڵگرتنێكی رەسەن ئەنجامبدەن. لەجیاتی پەسەندكردنی فەلسەفە و زانستی خۆرئاوا، بە گواستنەوە نیوەچڵەكان سنووردار بوون.

بەهۆی تێكشكانی بونیادی چینی باو و بەستنەوەی بە بەكرێگیراویتی سیستەماتیك، رابوونی لاوە كوردە رۆشنبیرەكانیش نادروست و لەناسنامەی خۆی بێبەش بوو. خەبات، توێژینەوە و لێكۆڵینەوەیەكی جددییان سەبارەت بە مێژووی كورد و واقیعی كۆمەڵگا نەبووە. توانا و بەهرەیان بۆ ئەنجامدانی ئەو كارە لەبار نەبوو. بەڵگە و فاكتەرەكانی میللیگەرایی سەرەتایی كە لە ئاوێتەگەری، گواستنەوەكار و دروشمبازی زیاتر تێپەڕیان نەدەكرد، خۆراكە ئایدیۆلۆژییە بنەڕەتیەكانیانی پێكدەهێنا. چاوەڕوانییان لە مەشروتییەت هەبوو. لە یەكەم ساڵانی مەشروتیەتدا لەمیانەی رۆژنامە، گۆڤار و جەمعیەت تۆزێكی تر پەرەسەندنیان بە خۆیانەوە بینی. بەشداری كێبڕكێی میللیگەراییان كرد. هەنگاو بەهەنگاو زیاتر خۆ كاریگەركردنی میللیگەرایی تورك و لێدانی مۆركی خۆی لە دەوڵەت كێبڕكێی نێوانیانی زیاتر كرد. بزووتنەوە و بونیادە بەهێزەكەی میللیگەرایی ئەرمەنی بەشێوەیەكی نەرێنی كاریگەری كردە سەر كێبڕكێی نێوانیان و گەرمتری دەكرد.

بەخێرایی هەڵكشانی هەر سێ میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم) بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوە، پەیوەندییەكانی نێوانیانی بۆ شەڕ و پێكدادان گۆڕی. شەڕەكانی بەلقان و یەكەمین جەنگی جیهانی بوو بە خاڵی وەرچەرخان. بزاڤی ئەرمەنی بە ژینۆساید ئەنجامگیر بوو، بزووتنەوەی كوردیش بوو بە دوو پارچە. جیابوونەوە لەنێوان ئەوانە هاتەئاراوە كە خوازیار بوون لەسەر بنەمای هەمان ماف بەیەكەوە لەگەڵ بورژوازی تورك بجوڵێنەوە، لەگەڵ ئەوانەی لایەنگری جیابوونەوە لە بۆرژوازی تورك بوون. ئەو دابەشبوونەی تا شەڕی رزگاری نیشتیمانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٢ بەردەوام بوو، بە دۆڕاندنی ستراتیژی بزووتنەوەی كورد ئەنجامگیر بوو. بەشداریكردنێكی شەخسی و دوور لە هۆشیاری و رێكخستنی تایبەت بەخۆیان، لەكاتی شەڕ و بەتایبەتیش رێگای لەپێش ئەوە كردەوە لە دیدارەكانی پەیماننامەی لۆزان و راگەیاندنی كۆماردا ئامادەبوونێكی زۆر لاوازیان هەبێت. ئەو چاوەڕوانییەیان مایەپووچ بوو كە لەگەڵ توركەكان ببن بە خاوەنی هەمان ماف. جێبەجێنەكردنی قانونی تەشكیلاتی ئەساسیەی ١٩٢١ و یاسای ئۆتۆنۆمی كوردانی ١٠ی ئاداری ١٩٢٢و تەنیا مانەوەی لەسەر كاغەز بوو بە كۆتایی سەرجەم ئارەزوو و خەیاڵەكان. كەچی لە راستیدا ئەندامی بنەڕەتی شەڕی رزگاری نیشتمانی بوون. ئەو ئەزموونەی میللیگەرایی سەرەتایی كورد پێویستی بە تاوتوێكردنێكی گرنگ و هەڵێنجانی وانە و ئەزموونە.

ئەزموونی سەرهەڵدانی کۆچگری (١٩١٩ ـ ١٩٢٠) مەیلی جوداخواز گرنگ بوو. ئەگەر وانەی پێویست وەرگیرابووایە، لەوانەبوو بەرەو خۆسەری کورد چووبایە. بەڵام کەموکوڕی رێبەرایەتیەکەی و لاوازی و نەبوونی ئامادەکارییان لە بەرامبەر رێککەوتنە بەهێزەکەی تورکی ئیتحادگەرا و یەهودیەکان (پێکهاتەی فاشیزمی تورکی سپی) رێگای لەپێش تەسفیەبوونی پێشوەختیان کردەوە. ئەو سەرهەڵدانەی جەمعیەتی ئازادی (بەدرەنگەوە ئاوابوو ١٩٢٤)وەک پەرچەکردارێک خوازیاری رێبەرایەتی کردنی بوو لە ئاکامی هاندان و گێرەشێوێنیەکەی ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ لە ناوچەی دیجلەی دیاربەکر دووچاری لەدایکبوونێکی پێشوەخت کرا. ئەو سەرهەڵدانە بێ رێکخستن و پەرشوبڵاوەی خرایە ئەستۆی شێخ سەعیدی نەقشبەندییەوە ئاشکرابوو کە لەلایەن بۆرژوازی تورکیای لاو دووچاری پاکتاو و تەسفیەکردنێکی گران دەبێتەوە. تایبەتمەندێتی سەیر لەو یاخیبوونەدا جێگای باسە. خودی جەمعیەتی ئازادی رێکخستنێکی میللیگەرایە (ناسیۆنالیست). خالید جبرانی رێبەری یاخیبوونەکە (بەرلە یاخیبوون دەستگیرکرا و بەبێ دادگاییکردن لە بەتلیس درایە بەر دەستڕێژی گوللە) فەرماندەیەکی بەکاریگەری فرقەی حەمیدیەیە. لە شەڕی رزگاری نیشتیمانی لە بەرەی رۆژهەڵات رۆڵێکی گرنگی هەبووە. خەسڵەتی رۆشنبیری هەیە. شێخ سەعیدیش یەکێک لە رێبەرە گرنگەکانی مەزهەبی شافیعی و تەریقەتی نەقشبەندییە. هەروەها لە بازرگانیکردنی مەڕ و ماڵاتیش قورساییەکی تایبەتی هەیە کە لە بینگۆلەوە تا حەلەب درێژدەبێتەوە. دەشێت بە بۆرژوازی بازرگانی دابنرێت. سەید عەبدولقادریش کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای رێبەری سەرهەڵدانی نەهری ١٨٧٨ە. ئەویش شێخێکی نەقشبەندییە. هەروەها پاشماوەی چەندین میرنشینی خۆجێیی پەیوەندییان بە سەرهەڵدانەوە هەیە.

وەک دەبینرێت هەموویان نوێنەرایەتی چینێک دەکەن کە وەک بەرهەمێکی سیاسەتەکانی حەمیدییە گەشەیان کردووە. بۆ هاوکاری لەبارن. بەڵام رێککەوتنی بیروکراتە تورکەکانی لایەنگری ئەڵمانەکان و سەرمایەی یەهودی (تورکی سپی لە بنەڕەتدا گوزارشت لەو پێکهاتەیە دەکات) کە لەسەرەتاوە لەژێر ناوی جۆن تورک ناوکی کادیرانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقییان پێکدەهێنا لەناوبردن و پاکتاوکردنی سەرجەم ئەتنیک و ئایینەکانی دیکەی دەرەوەی خۆیان (کرستیانی، موسڵمانێتی، کورد، عەرەب، چەرکەس)ی وەک سیاسەتێکی سەرەکی دەستنیشان کردووە. هەنگاو بە هەنگاو ئەو پاکتاوکردنە ئەنجامدراوە. لە ساڵی ١٩١٥ ئەرمەنیەکان، ١٩٢١ چەرکەسەکان، ١٩٢٣ رۆمەکان، ١٩٢٣ سریانیەکان، ١٩٢٤ تورکە موسڵمانەکان (لایەنگری خەلیفە)، لەساڵی ١٩٢٥ وە کوردان پاکتاو (تەسفیە) کراون. بە ژینۆساید ناوی بنێین یان شتێکی تر بە گوتەی رۆژی ئەمڕۆمان لە دەرەوەی خۆیان (تورکی لاو = بۆرژوازی بیروکراتی تورک + کادیران و سەرمایەدارانی ماسۆنی و یەهودییە هەڵگەڕاوەکان = ناسیۆنالیزمی تورک + جەمعیەتی ئیتحادوتەرەقی + پارتی گەلی کۆماریCHP = فاشیزمی تورکی سپی) سەرجەم توێژەکانیان پاکتاو کردووە.

سەرکردایەتی مستەفا کەمال پاشای ئەو قۆناغە پێویستی بە شیکارێکی گرنگ و بایەخدارە. تا میتۆلۆژیای کەمالیستی یاخود ئەتاتورکچێتی شیکار نەکرێت کە بەبێ ویستی

مستەفا کەمال پێکهێنراوە، ئەوا بەشێوەیەکی ڕاست دەرک بە واقیعی کۆمار و شۆڕشی ڕزگاری نیشتیمانی ناکرێت.

لەجیاتی ئەوەی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی ۱۹۱۹ ــ ۱۹۲۲ زیاتر دژ بە دەرەوەی هەڵبسەنگێنین وەک شەڕێکی ناوخۆیی تاوتوێی بکەین ئەوا زیاتر حەقیقەتەکان ئاشکرا دەکات. ئەوەی ڕوویداوە یاخیبوونێکی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیایە. پەیوەندی بەو جێگۆڕکێ گرنگانەی هەژموونگەرایی هەیە کە لەناوەوە و دەرەوە ڕوودەدەن. لە کاتێکدا هەژموونگەرا پلەداری و دەسەڵاتە نەریتیەکان لەناوەوە دەستکۆڕکێ دەکەن، لە ئاستی دەرەوەش بەرخودان بەرامبەر هەوڵەکانی جێگیرکردنی هەژموونگەرایی خۆرئاوا جێگای باسە. هەروەک چۆن بەدرێژایی مێژوو بەمجۆرە بووە جارێکی دیکەش گرنگی ستراتیژی جوگرافیای ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا ئاشکرا دەبێت. فەتحکردنی تەواوەتی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا بالآبوونێکی مەزن بە هەژموونگەرایی خۆرئاوا دەبەخشێت. چونکە هەژموونگەرایی سوڵتانێتی باو هەڵوەشێنراوەتەوە، لە دۆخێکدا نییە گواستنەوەیەکی بەم چەشنەی هەژموونگەرایی بەربەست بکات. هەرچی پێکهاتەی تورکی سپی ئیتحادگەرایە لەبەرامبەر ئینگلیزەکان ژێرکەوتوون. بەڵام هەژموونگەرایی ئینگلیزیش لە ناوەوە و دەرەوەش دووچاری زەحمەتیەکی جددی هاتووە. شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە سۆڤێت سەرکەوتووە. هەوڵی پەیوەندی بەستن لەگەڵ یاخیبونەکەی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا دەدات. لە هەلومەرجێکی بەمجۆرەدا ئەو هەڵمەتەی بە سەرکردایەتی مستەفا کەمال پاشا دەستیپێکرد هەم سەیرە هەمیش زۆر گرنگە. وەک دەزانرێت لەناو کادیرانی دەسەڵاتی ئیتحادگەرایی پەراوێزخراوە. بەهۆی پێگە یاخیبوویەکەیەوە ئەستەمە لایەنگری ئینگلیز بێت. لە ناپلیۆن زیاتر ڕەوشی بە ڕۆبسپیری شۆڕشی فەڕەنسا دەچێت.

وەک دەزانرێت لەبەرامبەر ئەو شۆڕشەی تەقیەوە لویسی شازدەهەمی پاشای فەڕەنسا پەنای بردبوویە بەر هێزەکانی پاشایەتیی لایەنگرەکانی لە ئەوروپا و داوای داگیرکردنی فەڕەنسای لێکردبوون. ئەو دۆخەش زۆر لەو پەیماننامەی نێوان سوڵتان وەحدەددین و ئینگلیزەکان دەچێت. لە فەڕەنسا ڕۆبسپێر یەکێک لە سێ ڕێبەرە گرنگەکەی مۆنتاگنارەکان[1]، وەک ڕێبەرانی پارتی شۆڕشی ڕادیکاڵی بۆرژوازی بچووک ڕێبەرایەتی دەگرێتە دەست (۱۷۹۱ ـ ۱۷۹٤)و کۆمار ڕادەگەیەنێت. ئەوەش لە هەلومەرجێکدا ئەنجامدەدات کە لەناوەوە و دەرەوە توندوتیژییەکی دژوار لەئارادایە. مستەفا کەمال کە زۆر باش شارەزای شۆڕشی فەڕەنسایە، ئەگەرێکی بەهێزە بە مەبەست ڕۆڵی ڕۆبسپێری گرتۆتە ئەستۆ. وەک دەزانرێت لەناو پێنج پاشا گرنگەکەی یاخیبوون (عەلی فوئاد جەبسۆی، کازم قەرەبەکر، ڕەئوف ئۆبای و ڕەفعەت بیلا) وەک پاشایەک دەردەکەوێتە پێش کە لەوانەی تر دەستپێشخەرترە. دوای شەڕ و پێکدادانێکی چڕی ناوخۆیی و دەرەکی هەنگاو بۆ ڕاگەیاندنی

---

[1] چیاییەکان (Montagnar):بە بزووتنەوەی یەعاقیبەکان (یەعقوبیەکان) دەگووترا چیاییەکان. لەناو کۆمەڵەی نیشتمانی فەرەنسایدا دوو ڕەوت هەبوو: یەکەمیان: جیرۆندییەکان بوون کە ڕەوتێکی میانڕەو بوون. دووەمیان: چیاییەکان بوون کە ڕەوتێکی توندڕەو بوون، ڕۆبسبێر بەناوبانگترینیان بوو. (وەرگێڕ)

کۆمار دەهاوێژێت. ئاشکرایە کە شۆڕشگێڕێکی نموونەیی کۆمارە. ڕۆڵی لە هەنگاوەکانی شۆڕشدا دیاریکەرە، لە سەرووی هەمووشیانەوە لە نەهێشتنی سەڵتەنەت و خیلافەت. بەڵام ڕاستیەکی دیکەی گرنگ؛ ئینگلیزەکان کاتێک تێگەیشتن مستەفا کەمال ـ کە خستبوویانە ژێر چاودێری نزیکەوە ـ سەرکەوتوو دەبێت یەکسەر تەکتیکی خۆیانیان گۆڕیوە. فەوزی پاشا و سەرهەنگ عیسمەت بەبێ نارەزاییەکی ئەوتۆی ئینگلیزەکان دەخرێنە ناو کادیرانی شۆڕشەوە، بەمانایەکی تر دزەیان پێدەکرێت. ئەگەر مێژووناسان ئەو کارەی دزەکردن ڕۆشن بکەنەوە کە زۆر بە نهێنی ڕاگیراوە ئەوا ئەنجامگەلێک لەگەڵ خۆیدا دێنێت کە ئاراستەی ڕاستیەکان دەگۆڕێت.

دوای شەڕی سەقاریا ۱۹۲۲ ئینگلیزەکان بەخێرایی وازیان لە پشتگیریکردنی یۆنانیەکان هێنا و هەوڵیاندەدا لەگەڵ کادیرانی شۆڕش ڕێکبکەون. چەرچەل ڕۆڵێکی گرنگ لەوەدا دەبینێت. لە ساڵی ۱۹۲۲ بەدواوە یاخیبوون لەژێر کۆنترۆڵی نزیکی ئینگلیزەکان دایە. رادیکاڵبوونەکەی بەربەست دەکرێت و پەیوەندییەکەی لەگەڵ ڕووسیای سۆڤێتیش مەودای تێدەخرێت. کۆمۆنیستەکان، ئوممەتگەراکان و کوردان پاکتاودەکرێن. لە کەسایەتی ئەدهەم چەرکەسیشدا کادیرە شۆڕشگێڕەکانی بنەچە قەفقاسیەکان پاکتاو دەکرێن. گرنگترینیشیان چوار لە پێنج ژەنراڵە گرنگەکەی شۆڕش تەسفیە دەکرێن. بەبیانووی سەرهەڵدانی کوردان فرقەی جەمعیەتی تەریقەتپەروەریش پشکی خۆی لە پاکتاوکرن وەردەگرێت کە تورکی سپی نییە. خۆی پارتێکی میللیگەرا و موقەدەسگەرایی ئۆپۆزسیۆنی تورکە. یاخیبوونەکانی کوردان ڕۆڵی نوێڵ دەبینن لە دەستگۆڕکێ و فاشیستەکردنی دەسەڵاتدا. مستەفا کەمال کە بەر لە شەڕ لەساڵی ۱۹۱٦ وە پەیوەندی باشی لەگەڵ ڕیشسپیەکانی کوردان (بەتلیس، سێرت، دیاربەکر) هەبوو، لەکاتی شەڕدا ئەو پەیوەندییانە بەهێزتر دەکات. ئەوەش سەرهەڵدانی کۆچگری بەرێککەوتن ئەنجامگیر دەکات. لە ساڵی ۱۹۲۱ لەمیانەی قانونی تەشکیلاتی ئەساسیە یەکسانی ئەندامە کوردەکان گەرەنتی دەکرێت. لە ئاکامی یاسای ئۆتۆنۆمی کوردان (۱۰ی ئاداری ۱۹۲۲) متمانەکردن بەیەکتری تۆکمە دەکرێت. دوای دامەزراندنی کۆماریش لە کۆنفرانسی ئیزمیت ۱٦ ـ ۱۹۲٤/۱۱/۱۷ مستەفا کەمال باسی بەرفراوانترین ئۆتۆنۆمی کوردان دەکات. کاتێک کوردان ناچاری یاخیبوون و سەرهەڵدان دەکرێن، فەتحی ئۆقیاری نزیکترین هاوڕێی سەردەمی منداڵی مستەفا کەمال و سەرۆک وەزیران، لەبەرئەوەی دەڵێت: "من دەستی خۆم بە خوێنی کوردان سوور ناکەم" ناچاری دەست لەکارکێشانەوە دەکرێت. بەبیانووی یاخیبوونەوە ئیتر هەنگاو بۆ سەردەمی عیسمەت ئینۆنۆ و فەوزی چەکماک دەنرێت.

لەگەڵ هەوڵە تیرۆرکارییەکەی ئەزمیر قۆناغی بێکاریگەرکردنی مستەفا کەمال خێرا دەبێت. مستەفا کەمال وەک ڕۆبسپێر دووچاری پاکتاوکردنی جەستەیی نەهات، بەڵام ئابلۆقەدانی کۆشکی چانقایا لەلایەن عوسمان تۆپاڵ و هەوڵەکەی تیرۆرکردنی ئەزمیر (کادیرە ئیتحادگەراکانی لایەنگری فەرەنسا گەمارۆکەیان بەرتەسکتر دەکردەوە) دەشێت وەک کردەی کوشندە ڕاڤە بکرێت. ئەوەی وەک پاشماوە لە مستەفا کەمال دەمێنێتەوە، شێوەیەکی ئیلاهییە کە لە کۆشکی چانقایا داخراوە و لەبواری سیاسی و سەربازیەوە کاریگەری

نەماوە. لەکاتێکدا تەواوی خراپەکاریەکانی دیکتاتۆریەتی فاشیستی بەرایی لەو شێوە و وێنەیە باردەکرێت، سەرجەم نیعمەتەکانی ئەو دیکتاتۆریەتەش دەکرێتە بەشی پاشماوەی ئەو ئیتحادگەرایانەی لە CHP دا کۆبوونەتەوە. هەوڵ و ئەزموونی فرقەی سەربەستی ١٩٣٠ مستەفا کەمال پەرچەکردارێکە بەرامبەر بەو قۆناغە. بەڵام هێندە لاوازە سەرباری ئەوەی نزیکترین هاورێکەی فەتحی ئۆقیار و خوشکەکەی مەقبولە خان ئەو پارتە دادەمەزرێنن ــ وێڕای ئەوەی زۆر بەهێز دەبێت ــ بەڵام تەمەنەکەی تەنیا سێ مانگ بووە. ئەوجارەش سەرکردایەتی عیسمەت ئینونۆ و فەوزی چەکماک لە رێگای هاندان و پرۆڤەقاسیۆنی مەنەمەن[٢]ـەوە لە مایەپووچکردنی ئەو هەڵمەتە گرنگەی دیموکراسی دوودڵییان نەکردووە.

بەکورتی؛ لەیەکتری جیاکردنەوەی راستینەی مستەفا کەمال لەگەڵ راستینەی فاشیستی تورکی سپی CHPو ئیتحاد و تەرەقی، بە ئامانجی گەیشتن بە هەڵسەنگاندنی راست و پێشخستنی شیکاری تەندروست گرنگی و بایەخێکی یەکجار زۆری هەیە. لەژێر رۆشنایی ئەو شیکارە نوێیانەوە دەشێت بەشێوەیەکی راستتر دەرک بە باسەکانی نکوڵی و قڕکردنی کوردان و بزووتنەوەکەی، هەوڵەکانی لەناوبردنی بکەین کە لەمیانەی رێبازەکانی ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسایدی کلتووری پەیڕەو دەکران. یەکێک لە بابەتە سەرەکیەکانی ئەو بەرگرینامەیەش هەوڵدانە بۆ پێشخستنی شیکارێکی بەمجۆرە.

بەبڕوای من کوردان لە ئاکامی پیلانگێڕی فاشیزمی تورکی سپی کە لە ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ دەستی پێکرد کەوتوونەتە قۆناغی گەورەترین کارەساتی مێژووییانەوە. ئەو پیلانگێڕییەی لە ١٩٢٥دژی کوردان ئەنجامدراوە زۆر لەو پیلانگێڕییە بەرفراوان و درێژخایەنترە کە لە ١٩١٥ دژی ئەرمەنیەکان ئەنجامدراوە. گوتەی "چۆن تورکەکان ئەرمەنیەکانیان لەناو برد، بەڵام کێ توانی شتێک بکات؟" هیتلەر لەکاتی ئەنجامدانی ژینۆسایدی یەهودیەکان زۆر بە روونی و ئاشکرایی پیشانیدەدات کە ریشە و بنەڕەتی پیلانگێڕی فاشیستانە چەندە گرنگە. بەو ئامانجەوە شیکاری مۆدێرنیتەی سەرمایەداریم پێشخست تا بیسەلمێنم کە لە دوا شیکاردا ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوە و خودی دەوڵەت ـ نەتەوە سەرچاوەی فاشیزم پێکدێنێت، بەمانایەکی تر روونی بکەمەوە سیستەمی فاشیزم چۆن سەریهەڵداوە کە یەکێک لە تایبەتمەندێتیە گرنگەکانی دەوڵەت ــ نەتەوەیە و پەیوەندییەکەی لەگەڵ سیستەمی سەرمایەداری بخەمەڕوو. دەستەواژەی "لێویاتان" (جانەوەر) کە تیوریزانی باڵادەستی سەرمایەداری هۆبز لە تەوراتی وەرگرتووە و گوزارشت لە دەسەڵاتی دەوڵەت دەکات بە بەرجەستەترین شێوە لە سەرمایەداری، بونیادنانی

[٢] ڕووداوی ئاژاوەگێڕی (پرلواکیسۆن)ی مانامان: لەساڵی ١٩٣٠دا دەروێش محەمەد و شەش لە هاورێ نوسوڵگەراکانی خۆیدا بەچەکەوە هەڵیانکوتایە سەر مزگەوتی شارۆچکەی مانامانی سەر بە پارێزگای ئەزمیر و بە بەرزکردنەوەی لافیتەی ئایینی داوایان لە ئامادەبووانی مزگەوتەکە و دەوروبەری کرد کە بچنە ریزەکانیانەوە بۆ ئەوەی لەژێر سەرکردایەتی خەلیفە عەبدولمەجیددا شەریعەتی ئیسلام جێبەجێ بکرێت. پاشان بەخۆیان و لافیتەکانیانەوە چوونە بەردەم بینای حکومەت. حکومەتیش تیمێکی سەربازی بەمەبەستی دەستگیرکردنی چەکدارە نوسوڵگەراکان رەوانەی شوێنی ڕووداوەکە کرد. لەئاکامدا پێکدادانێکی دژوار لەنێوانیاندا روویدا و لەکۆتاییدا ئەو کەسە یاخیبووانەیان دەستگیر کرد. هەروەها حکومەت بۆ ماوەیەک رەوشی ئاوارتەی راگەیاند. (وەرگێڕ)

دەسەڵاتەکەی و کارەکتەری فاشیستیانەی ئەو بونیادەیدا گوزارشت دەکرێت، چونکە ئەزموونی دەسەڵاتی جۆن تورک (ئەو دەستەواژە لە بواری سۆسیۆلۆژی، کۆمەڵایەتی و مێژوویییەوە هیچ پەیوەندییەکی بە تورکەکانەوە نییە) بەشێوەیەکی سەرنجڕاکێش نوێنەرایەتی ئەو بەرجەستەبوونە دەکات و بەهایەکی گەردوونی هەیە، بە بایەخەوە پێویستی بە هەڵوەستە لەسەر کردن هەیە. لەچوارچێوەی ڕەشنووسیش بێت هەوڵی تاقیکردنەوەیم دا.

جووڵانەوە کوردییەکانی قۆناغی ١٩٢٥ ــ ١٩٤٠ کە هەوڵدرا وەک سەرهەڵدانی کۆنەپەرستانەی دژی ڕژێمی کۆمار مەحکوم بکرێت، لەناوەڕۆکدا ئامانجی پاراستنی خۆیەتی لە بەرامبەر فاشیزمی تورک، بەرخودانکردنە دژی تەسفیەکردنی ناسنامەی کوردان. کوردان وەک گەل دڵسۆزانە بەشدارییان لە شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی و دامەزراندنی کۆمار کردبوو. لە بەڵگەکانی تەواوی کۆبوونەوەکان، پرۆتۆکۆڵی ئاماسیا، بەڵگەی کۆنگرەکانی ئەرزرۆم و سیواس، چەندین یاسای ئەنجوومەنی نوێنەران و بگرە لە قانوونی تەشکیلاتی ئەساسیەی ١٩٢١یشدا وەک ئەندامی بنەڕەتی بەشداریکردنیان دەستنیشان کراوە. ڕزگاری نیشتیمانی چ مانایەکی بۆ گەلی تورک هەبێت، هەمان مانای بۆ گەلی کوردیش هەبوو. کۆمار تەنیا وەک کۆماری ئەتنیکی تورک بونیاد نەنرابوو، بەڵکو لەسەر بنەمای ئەتنیکی هەمەڕەنگ لەسەرووی هەمووشیانەوە کوردان ئاواکرابوو، بەمجۆرەش مانادار کرابوو. هەروەها ناسنامەی ئوممەتی ئیسلامی و ڕەنجدەرانیش بەناسنامەی دامەزرێنەر لەقەڵەم درابوون. ئاشکرا بوو کە سۆڤێت پشتگیری کردووە. کاتێک نەریتی ئیتحادگەرایی ڕەوتی تورکێتی پشتبەستوو بە یەک گروپی ئەتنیکی وەک ئایدیۆلۆژیای فەرمی پەسەند کرد، ئەوا سەرجەم ئەندامە دامەزرێنەرەکانی دیکە پەراوێز خران و بوون بە ئەوانی دیکە. داواکردنی بچووکترین ماف ئەنجامەکەی لەناوچوون بوو. گەورەیی گەلی کورد و ئەو کۆسپ و زەحمەتیانەی لە لەناوبردنی جەستەییاندا ڕووبەڕووی دەبوونەوە ڕۆڵێکی گرنگی هەبوو تا سازشکاری لەسەر میساقی میللی بکەن و موسل ــ کەرکوک بۆ هەژموونگەرایی ئینگلیزەکان بەجێبێڵن، لەگەڵ ئینگلیزەکان ڕێکبکەون و بڕیار لەبارەی پاکتاوکردنی کوردان و بزووتنەوەکەیان بدەن. وەک چۆن ڕێککەوتنیان لەگەڵ ئەڵمانیا بۆ قڕکردنی ئەرمەنیەکان بەکارهێنراوە، ڕێککەوتنیان لەگەڵ ئینگلیزەکانیش دەرهەق بە بابەتی موسڵ ـ کەرکوک بەهەمان شێوە لە قڕکردنی کوردان بەکارهێنراوە. وەک زۆرجار بانگەشەی بۆ دەکرێت لە سەرهەڵدانەکانی کوردان کۆمەک و یارمەتی دەرەکی بەلایەنی کوردانداا نەبووە، بەڵکو دژی کوردان پشتگیرییان لە ڕژێمی فاشیست کردووە. پشتگیری ڕووسیای سۆڤێتیش لەو چوارچێوەیە دابوو.

زۆر پێش گلادیۆی ناتۆ ئەندامە فاشیستەکان شەڕێکی تایبەتی ئاشکرا ــ نهێنییان دژی کوردان دەست پێکردبوو. لە ڕووخساردا وەها خۆیان دەنواند گوایە لەبەرامبەر ئانتی ــ کۆمارییە کۆنەپەرستەکان بەهاکانی کۆمار دەپارێزن. کەچی لەڕاستیدا کوردان هیچ جموجۆڵێکیان دژی کۆمار نەبوو. ئەگەر لاوازیش بێت داوای ئەو مافانەیان دەکرد کە لە پرۆسەی ڕزگاری نیشتیمانی بەڵێنیان پێدرابوو. ئەو داوایانەش ڕیشەی مێژوویی و

بەیەکەوە ژیانی درێژخایەنی هەبوو کە لە شەڕی ١٠٧١ی مەلازگرد دەستی پێدەکرد، لە شەڕەکانی چاڵدێران و مەرج دابقی ١٥١٤و ١٥١٦، شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٢ و بەڕێوەبردنی هاوبەشی نزیکەی نۆسەد ساڵەی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەیەکەوە ژیانی گەلانی دۆست و دراوسێ لەئارادابوو. هیچ بیانوویەکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی پەراوێزکردنیان لەئارادا نەبوو. بەڵام کوردان نەک تەنیا شارەزایی واقیعی فاشیستانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەبوون، بەڵکو دەرکیان بە تەڵەزگە فاشیستیەکەی بەرامبەریان نەدەکرد. لە چوارچێوەی ڕێسای گەلانی دراوسێ و دەوڵەتی نەریتی هاوبەش دەجوڵانەوە. لە چاوەڕوانیەکی بەمجۆرەدا بوون.

لە ڕاستیدا پرۆژەی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی هۆمۆژەن کە لەو سێسەد ساڵەی دواییدا لە ئەوروپا بەڕێوە دەچێت نموونەیەکی دیکەی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا نییە. بۆ نموونە یەهودیەکان هوشیارترین و دەوڵەمەندترین گەلی مێژوون ئاشکرایە کە چاوەڕوانی کردەوەکانی ژینۆسایید نەبوون کە دووچاری هاتن؛ لە دۆخێکی پێچەوانەدا تاکە یەهودیەکیش لە ئەوروپا نەدەمایەوە. بەشێوەیەکی گشتی سەرمایەداری، بەتایبەتیش سەرمایەداری دەوڵەت ڕێکخستەبوونی بەشێوەی هێزێکی دیکتاتۆری فاشیستانە بەبێ ژینۆسایید بەڕێوە نەدەچوو. فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە لە دەرەوە سەپێنراوە و بۆ کۆماری تورکیا گواسترابوویەوە، تەنیا بەدەستی دەوڵەت و لەمیانەی مۆدێلی دەسەڵاتی فاشیزمەوە بەڕێوە دەچوو. ڕۆڵی کاریگەرانەی فاشیزم لە ئەزموونی چەندین دەوڵەت ـ نەتەوەی درەنگوەختدا بەهۆی سەرمایەداری دەوڵەت بوو. چونکە ناتوانرێت باسی سەرمایەداریەک بکرێت کە پشتی بە دەوڵەت ـ نەتەوە نەبەستبێت. بەگوێرەی هەلومەرجە ماددییە بەرجەستەکان ئەزموونەکانی فاشیزم یان زۆر وشک و توند دەبوو یان لەوانەبوو جۆرێکی میانڕەو بێت. بۆ نموونە؛ لە دەوڵەتی هاوشێوەی وەک ئینگلتەرا و ئەمریکا کە هەلومەرجەکانیان گونجاو بوو هەرچەندە سیستەمێکە لە هەندێک بواری سنووردارا پەنای بۆ دەبرێت، بەڵام هەندێک جار لەمیانەی بانگەشەکانی ڕژێمی لیبراڵەوە دەیانتوانی دژی بوەستنەوە. میانڕەویەکەی سیستەم دەرفەتی بەوە دەدا. هەروەها ئەزموونەکانی تێکۆشانی دیموکراتیانەی کۆمەڵگاکان لەهیچ وڵاتێکدا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن دەرفەتیان بە ڕژێمە فاشیستەکان نەداوە. ئەو گۆڕانکاریی و پەرەسەندنانەی لە کۆماری تورکیاش ڕوویاندا لەگەڵ ئەو مەیلە گشتیەدا تەبا و گونجاو بوو. پێکهاتەی فرە ئەتنیکی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی و دەسەڵاتی دەوڵەت بەدرێژایی مێژوو، دەرفەتی پەرەسەندنی هەمیشەیی بە فاکتەرە فاشیستەکانی سەرمایەداری نەدەدا تا هەموو بوارەکانی کۆمەڵگا بگرێتەوە. کلتووری ئیسلامی و بزووتنەوەکانی چینی زەحمەتکێشیش لە فاکتەرەکانی سنوردارکردنی فاشیزم بوون. بەڵام ئەزموونە بەهێزەکانی دەوڵەتی فاشیستی کە لە ئەوروپای ئەو قۆناغەدا (١٩١٩ ـ ١٩٤٥) بەکاریگەر بوون، کاریگەرییان لەسەر ڕژێمی کۆماریش هەبوو. ئەو سیاسەتە فاشیستیانەی لەسەر ئەندامە دامەزرێنەرەکانی دیکەش پەیڕەوکراوە، کوردان پشکی شێریان بەرکەوتووە.

وەک لەمیانـەی ماهیـەتی ئاسیمیلاسیۆن و ژینۆسـایدکارانەی کردە و پەیڕەوەکانـەوە دەرکی پێدەکرێت؛ سەرهەڵدانەکان بناغەیەکی فیکری، پلان، پرۆژە و بەرنامەیەکیان نییە کە پێشووتر ئامادەکرابێـت. لـە هەڵوێستی ستراتیژی و تـەکتیکی بێبەشن. ئامادەکاری بۆ نەکراوە و کاتێکی گونجاویشی بۆ دەست نیشان نەکراوە. لە قانونی ئیسلاحاتی شەرق ی ١٩٢٥ وە تا قانونەکانی ئیسکانی مەجبووی (١٩٣٥) سەرجەم ئەو پیلانانـەی جێبەجێکراون ئامانجیـان لـەناوبردنی بوونی کوردان بـووە. نـەک تـەنیا بزاوت و چالاکیـەکان، بـەڵکو پێشبینی پاکتـاوکردنی بـوونی کوردانیـان کـردووە. لێرەشـدا ڕێساکە هـەمان شتە: ئەگـەر دەتەوێت بەزیندوویی بمێنیتـەوە و دەوڵەمەنـد بیـت، واز لـە ناسنامەی کـورد و کـوردێتی بێنە!.

ئەگەر دەرک بـەو مۆدێلـەی ژینۆسـاید نـەکرێت کـە مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری تـورک تایبەت بـە کوردان پـەرەی پێداوە، ئـەوا هـیچ فاکتـەرێکی ناسنامەی کوردی هاوچـەرخ و بزووتنەوەکەی ڕاست پێناسە ناکرێت و شیکاری ناکرێت. تا ڕۆڵی قۆرخکاری ئایدیۆلۆژی و سەرمایەی یەهودیش دەستنیشان نەکرێت شیکارکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تورکیش ئـەنجامنادرێت. شـیکارە ئەبسـتراکتەکانی سـەرمایەداری، شـیکردنەوەکانی دەوڵـەت و ئەنالیزەکانی کۆمەڵگا و مێژوو بەتەنیا توانای ڕوونکردنـەوەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری تـورکی نییـە. لـەوەش گرنگتـر ناسـنامەی کـورد و بزووتنـەوەکانی کوردان، کـە لـەنێوان بەرداشی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تورک دایە، بەگوێرەی خۆیان ئـەوانیش "تاقانـە" یـان هەیە. ناڵێم هیچ تایبەتمەندێتیەکی گەردوونییان نییە. ئەوەی پێویستی بە ئاماژە پێکردنـە لێکچوونە گەردوونیەکان نییە. هەر کەسێکی پەیوەندی بە بابەتەکەوە هـەبێت کـەم تـا زۆر ئەوانە دەزانێت. ئەوەی نازانرێت، ناخوازن بزانرێت، کراوە بە تابۆ، واتە ئـەو ڕاستییەی شاردراوەتەوە و شێوێنراوە، ئەو "تایبەت"و "تاقانانە" تایبەتمەندیگەلێکی بێهاوتـان و بـۆ خۆیان نموونەن. شاردنەوە یان پەردەپۆشکردنی مێژووی کورد و تورکیای سەردەمی نزیک، نکوڵیکردنی ئەو تاقانـە و تابۆیانەیە؛ بەمانایـەکی تـر ئەنجامنـەدانی شیکارێکی ڕاسـت و تەواوە. هۆکاری ئەوەش پەیوەندی ڕژێمی پەیڕەوکراوە لەگەڵ پیلانە نهێنیەکان، پیلانەکانی شـەڕی تایبـەت و پـەیڕەوەکانی ژینۆسـایدی کلتـووری و ئاسیمیلاسـیۆنی سەرتاسـەرییە. پیلانەکانی پاکتاوکردن و لەناوبردنی ئەرمەنیەکان، کە تاقیکردنەوەیەکی بەرایی بـوو، زۆر بەباشی پەیڕەوە هاوشێوەکانی دواتر ڕوون دەکاتەوە. لەراستیدا ئـەو پـەیڕەو و کردەوانـە تەنیا بەسەر گەلان و فاکتەرە ئەتنیکیەکاندا نەسەپێنراوە؛ بـەڵکو سۆسیالیست، لیبـراڵ و ئوممەتگەراکانیش بەزیادەوە بەشی خۆیان بەرکەوت. ئەو کردەوانەی بە ئاشکراترین شێوە لـە دەوڵـەت ـ نەتـەوەی تـورک ڕەنگیدایـەوە سیسـتەماتیکە و تـا ڕۆژی ئـەمڕۆمان بـە قورسکردنەوە درێژەی پێدراوە. واتە کردەوەگەلێک نییە کە کاتی و دەرەکی بێت و ناوە ناوە پەنای بۆ ببرێت؛ بەڵکو چەمک و کردەوەگەلێکی فەرمییە، خاوەن قۆرخکاری ئایدیۆلۆژییـە و بەسـەر تـەواوی دامـەزراوە ستراتیژیەکاندا زاڵـە. بێگومـان واقیعـی دونیـای هاوچـەرخ، ڕێککەوتننامە نێودەوڵەتیەکان، گرنگترینیشیان تێکۆشانی گەلان و بەرگری خـۆیی کلتـوورە

کۆمەڵایەتیەکان سەرکەوتنی ڕەهای ڕژێمی فاشیستی بەربەست کردووە و تارادەیەکی زۆر سنووورداری کردووە.

لە قۆناغی نێوان ساڵانی ١٩٢٥ ـ ١٩٤٥ زیندوویی و بوونی کورد شتگەلێکی زۆری لەدەست داوە و کەوتە دۆخی بێدەنگی گۆڕستانەوە، تەنیا لەبواری جەستەییەوە توانیویەتی لەسەر پێیان بمێنێتەوە. ئەگەر هاوشێوەی ئەرمەنیەکان دووچاری لەناوبردنی جەستەیی نەهاتوون، هۆکارەکەی بەزەیی هاتنەوەی ئەنجامدەران نییە، بەڵکو حیسابەکانی بەدەستهێنانی بەرژەوەندی و قازانجی زیاتر لە دۆخی بە ئۆبژەکراوی کوردەکان (سەرباز، کشتیار، ئاژەڵدار، سەپان و سوپاکانی نیمچە بێکارەکان) بووە. ئەرمەنی، سریانی و ڕۆمەکان گەلانی خاوەن کلتوورن. تەنیا بە ژیانی فیزیکی سنووردار نابن. بەڵام لای کوردان ڕەوش جیاوازترە. بە ئۆبژەکردن و بە ئامرازکردنی تەواوەتی جێگای باسە. جیاوازی نێوانیان سەرچاوەی خۆی لەو ڕاستیەوە وەردەگرێت. کەمایەتیەکانی دیکەش کە لەدەرەوەی پاکتاوکردن ماونەتەوە، بەتایبەتیش بە بنەچە بەلقان و قەفقاسیەکان و یەهودیەکان تەنیا کاتێک لەتورکەکان زیاتر پەیڕەویان لە تورکچێتی کردووە توانیویانە بوونی خۆیان بپارێزن. جگە لەو نموونە تایبەت و سنوورداراەنەی تێکۆشانی دیموکراتیانەی شۆڕشگێڕی ڕێگای لەپێش کردۆتەوە، تا ئێستاش ڕەوشەکەیان بەمجۆرەیە. یەهودیەکان جڤاتێکن خاوەنی تایبەتترین دۆخن. بوونیان لە ئەنادۆڵ، هێزی ئایدیۆلۆژی و پێگەی سەرمایەیان و پێویستیەکانی ستراتیژی زایۆنیستی لە تورکێتی سپیدا کردوویەتی بە پێشەنگ. بەڵام سەبارەت بە بابەتی یەهودیەکانیش گشتگیرکردن ڕاست نابێت. لە قۆناغی ڕزگاری نیشتیمانیدا کۆمەکی ئەوانیش بۆ تێکۆشانی شۆڕشگێڕی دیموکراتیانە بچووک ناکرێتەوە.

لە بەشەکانی دیکەی کورستانی پارچەکراویشدا کەم تا زۆر ڕووداوەکانی هاوشێوەی ئەو بوویەرانە بووە کە لە بەشی ژێر دەستی مۆدێلی مۆدێرنیتەی توركدا ڕوویانداوە. ئەوەی مۆرکی خۆی لە سیاسەتی کوردێتی ئەو قۆناغە داوە و کاریگەریەکی دیاری هەبووە مۆدێلی ئانتی ـ کوردی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تورکە. بەردەوامبوونی ڕژێمی ماندای فەڕەنسی لە سوریا تا دووەمین جەنگی جیهانی زەمینەیەکی ڕێژەیی ئازادی بۆ ڕۆشنبیرانی کورد ڕەخساندووە. لە دەرخستنی گۆڤار و دامەزراندنی ڕێکخراودا ڕووبەڕووی زەحمەتیەکی ئەوتۆ نەبوونەتەوە. بەڵام ستاتۆیەکی یاسایی کوردانیش جێگای باس نەبووە. چاودێریکردنی جەلادەت عەلی بەدرخان و دەوروبەرەکەی بۆ کردەوەکانی ئانتی ـ کوردی ئەو قۆناغە و لە بەرامبەریدا هەنگاونانیان بۆ ئەزموونی تێکۆشانی چەکداری (ئەزموونی گەریلایی عوسمان سەبری لەشاخەکانی کاختا)، هەروەها هەوڵەکانی دامەزراندنی ڕێکخراوی خۆیبوون(ناوێکە لەجێگای خۆیدایە کە واتای: وەک خۆ بوون، وەک خۆ مانەوە دەبەخشێت) بۆ یاخیبوونی ئاگری و دەرخستنی گۆڤاری هاوار کارو خەباتێکی گرنگی ئەو قۆناغەن. چەندین هەوڵی دیبلۆماسیشیان لەئارادا بووە. بەڵام سەرکەوتنی خوازراو لە هەموویان بەدەست نەهێنراوە. کاتێک هەوڵ و تەقەلاکانی ئەو قۆناغە لەپێناو سڕینەوەی یادەوەری بێنینە بەرچاوان، ئەو کاتە ڕوون دەبێتەوە کە ئەو کار و خەباتانە چەندە گرنگ

بوون. چیرۆکی بزووتنەوەی گروپێک رۆشنبیر لە سوریا زۆر خەمگینە. بە ئامانجی تێگەیشتنی ئەو قۆناغە ئەزموونێکن کە پێویستە لێکۆڵینەوەیان لەبارەوە بکرێت و وانەی لێ فێرببین. خاڵێکی پێویستە بە گرنگیەوە ئاماژەی پێبکەین: ئەگەر وەک ئەوەی ئینگلیزەکانیش نەبێت کە سەبارەت بە ئێراق ئەنجامیاندا، بەڵام فەرەنسیەکانیش لەمیانەی پەرەپێدانی پەیوەندیەکانیان لەگەڵ تورکیا و دەستنیشانکردنی سنوورەکان کوردانیان وەک قۆزێک بەکارهێناوە. لەقۆناغی هاوچەرخدا لەرێگای پەیماننامەی ئەنقەرەی ۱۹۲۱ فەرەنسا رەفتارێکی خۆپەرستانەی لە پارچەکردنی کوردان پیشان داوە و رۆڵی پێشەنگایەتی بینیوە.

لەو قۆناغەدا جموجۆڵەکەی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) زۆر گرنگترە. کوردانی ئەو بەشە هەژمونگەرایی ئینگلتەرایان وەک خۆی پەسەند نەکردووە، بەرامبەر بە سیاسەتەکانی لایەنگریکردنی عەرەبەکان بەرخودانیان کردووە. لەو قۆناغەشدا سلێمانی ناوەندی بزاوتەکانە. بەرخودانی شێخ مەحموودی بەرزنجی گرنگە کە تایبەتمەندیەکانی شێخ، سەرۆک خێڵ و بەگایەتی لە کەسایەتی خۆیدا کۆکردۆتەوە. بۆ یەکەمین جار بە شێوەیەکی ئاشکرا لەپێناو دەسەڵاتێکی سیاسی تایبەت بە کوردستان کەوتۆتە جوڵەوە. بەئاسانی ملکەچی بۆ ئینگلتەرا نەکردووە، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەرخودانی کردووە. هەر لە سەردەمی یەکەمین جەنگی جیهانیەوە رەوشێکی هاوشێوە بۆ بارزانیەکانیش جێگای باسە. لەسێدارەدانی شێخ عەبدولسەلامی بارزانی لە ۱۹۱٤ پەیوەندی بە درێژەپێدانی ئەزموونی شێخ عوبەیدوڵڵاوە هەیە. داکۆکی لەسەر بەدەستهێنانی مافەکانی کوردان کردووە. سەرهەڵدانی کوڕەکانی دیکەی بارزانی، بەتایبەتی ئەوەی بە سەرکردایەتی مستەفا بارزانییە، یەکێکە لە بزاوتە گرنگەکانی ئەو قۆناغە. لە سێگۆشەی تورکیا - ئێران - ئێراقدا ژیانێکی بە جموجۆڵی هەبووە. هەردوو سەرکردایەتیش تا دووەمین جەنگی جیهانی رۆڵی دوا نوێنەرانی سەرکردایەتی نەریتی باویان بینیوە.

خراپترین گۆڕانکاری مێژووی هاوچەرخی کوردستان کێشانی هێڵی سنوورەکانی ئێراق - تورکیا بوو لەنێوان کۆماری تورکیا و ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرا. ئەوەش مانای پارچەکردنی جەستەی کوردستان بوو. گرنگترین مەسەلەی کێشان و دەست نیشانکردنی سنوورەکان، ئەندێشەی بەربەستکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی دیموکراتیانەی کوردان بوو کە بە خێرایی کەوتبووە رۆژەڤەوە. ئەگەر بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردان بە ماهیەتێکی هاوچەرخ بەرەو پێشەوە چووبایە، نە داواکاریەکانی ئینگلتەرا سەبارەت بە نەوتی ئێراق بەدیدەهات، نە کۆماری تورکیاش بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی خاوەن ماهیەتی فاشیستانە دەگۆڕا. لە دۆخێکدا کوردانی ئێرانیش تەڤلی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد ببوونایە، مەیسەربوونی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا لەسەر ناوچەکە زۆر زەحمەت دەبوو. بەمجۆرە پاکتاوکردنی کوردانیش ئەنجامگیر نەدەبوو کە کۆماری تورکیا کردبووی بە ئامانجی خۆی. ئەمەیە گوزارشتی لۆژیکی ئەو رێککەوتنەی بابەتی موسڵ - کەرکوک سەبارەت بە هەردوو لایەن. بناغەی ئەو رێککەوتنە بۆ کۆنفرانسی ۱۹۲۰ قاهیرە دەگەڕێتەوە. یەکێک لە چەسپاندنە گرنگەکانی کۆنفرانسەکە: لەپێناو جێگیرکردنی هەژموونگەرایی سەرمایەداری لە خۆرهەڵاتی ناویندا، پێویستە بەردەوام کێشەی کورد لە رۆژەڤدا بمێنێتەوە. کاتێک کێشەی ئیسرائیل ـ

فەلەستینی خرایە سەر ئەوا لە گۆڕانكاری و پەرەسەندنەكانی دواتر دەركی پێدەكرێت كە هێزە هەژموونگەراكان لە دابەشكردنی وڵاتان و گەلان و ئاواكردنی ستاتۆگەلێكی وابەستە بەخۆیانەوە چەندە بەشێوەیەكی درێژخایەن بیریان كردۆتەوە و لەو چوارچێوەیەشدا پیلانی خۆیانیان داڕشتووە. هۆكاری سەرەكی نزیک نەبوونەوەیان لە چارەسەركردنی كێشەی كورد حیساب و لێكدانەوەكانیانە سەبارەت بە هەژموونگەرایی سەر ناوچەكە. گۆڕانكاریەكانی باشووری كوردستان (كوردستانی ئێراق) بە هەموو روونی و راشكاویەكەوە ئەو لێكدانەوانەی خستۆتەڕوو. ناشێت ڕۆڵی هەمان لێكدانەوە لە قورستربوونی كێشەی پارچەكانی دیكەش بچووک بكەینەوە. وەک دەبینرێت لە هەڵوێستیان سەبارەت بە PKK ش هەمان لێكدانەوە لە رۆژی ئەمڕۆماندا بەردەوامە.

لە هەمان قۆناغدا پەرەسەندنی هاوشێوە لە خۆرهەڵاتی كوردستان (كوردستانی ئێران)یش روو دەدات. ئەو مۆدێلەی پاكتاو و تەسفیەكردن كە توركیا پەیڕەوی كرد لەلایەنی رەزا شاوە وەک مۆدێلێک پەسەندكراوە. دیسان لەگەڵ هەردوو هێزی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا و رووسیا رێككەوتووە و بە هەموو خێراییەكەوە هێرشی لەناوبردنی دژی كوردان بەڕێوەبردووە. لە ئاكامی هاوكاری و پشتگیری توركیا و ئینگلتەرا بۆ رژێمی شا ئەو بزووتنەوە لەناوبراوە كە دوای یەكەمین جەنگی جیهانی بەڕێبەرایەتی سمكۆ ئەنجامدراوە. كۆماری كوردستان لە مەهابادیش كە دوای دووەمین جەنگی جیهانی راگەیەنرا، دوای ئەوەی رووسیای سۆڤێتیش خرایە ناو هەمان رێككەوتنەوە كۆتاییان پێهێنا.

قۆناغی نێوان هەردوو جەنگی جیهانی سەردەمێک بوو كە بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد بەرەو پێشەوە بچێت. بەڵام دابەشكردنی كوردستان، لەناوبردنی بزووتنەوە لاوازەكانی و دواتریش جێبەجێكردنی سیاسەتە قورسەكانی ئاسیمیلاسیۆن، چانسی بوون بە بزووتنەوەیەكی نەتەوەیی هاوچەرخی لەئارادا نەهێشتۆتەوە. ئاڵاییەكان (فرقەكان) ی حەمیدیەش بەر لە یەكەمین جەنگی جیهان هەمان ڕۆڵی بەربەستكردن و كۆسپ نانەوەیان بینیوە. هەردوو قۆناغیش مانای نیو سەدە دەبەخشێت. لەو قۆناغە پەنجا ساڵیەدا لە تەواوی دونیا بزووتنەوەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانی گەلان پەرەیان سەند و پێگەیشتن. لە ئاكامی ئۆپەراسیۆنەكانی پارچەكردن و فرقەكانی حەمیدییە كوردان چانسی بزووتنەوەی نەتەوەیی هاوچەرخ و سەركەوتنیان لە دەستدابوو. كاتێک ئەو بێچارەییە حیساب بكەین كە تارۆژی ئەمڕۆمان بەردەوامە ئەوا باشتر تێدەگەین كە سەدەیەكە لە ئاكامی گەمەكانی ئیمپریالیستی داگیركەرەوە چیمان لە دەستداوە.

پێویستە بەشێوەیەكی ریشەدارتر لێكۆڵینەوە لەبارەی هۆكارەكانی سەرهەڵنەدانی یان لاوازی بزووتنەوەی نەتەوەیی كورد بكەین كە بەڕێبەرایەتی بۆرژوازییە و لەو قۆناغەدا لەسەرتاسەری دونیا پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینی. كاتێک لەمیانەی هەڵوێستێكی قەبەی ماتریالیستیەوە ئەو رەوشە بە پەرەنەسەندنی سەرمایەداری و دیاردەی بابەتی چینی بۆرژوا ببەسترێتەوە، ناشێت روونكردنەوەیەكی تێروتەسەل بێت. لە چەندین وڵاتی هاوشێوەدا بزووتنەوەی نیشتیمانی سەركەوتوو سەریانهەڵداوە. بۆ نموونە؛ بزووتنەوەی نیشتیمانی تورک كە بەیەكەوە لەگەڵیدا دەژیا پەرەیسەند و سەركەوتوو بوو. ئەوەش راست

نییـە کـە پەرەنەسـەندنی بزووتنـەوەی نەتـەوەیی کـورد بـە کـەمی هـەوڵ و چالاکیـەکان و گوڕنەکردنی شەڕ ببەسترێتەوە. بە پێچەوانەوە بزووتنەوەگەلێکی زۆر ئـاواکراوە و شـەڕ و پێکدادانیش روویداوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبووە.

یەکەمین هۆکاری بنەڕەتی پەرەنەسەندنی بزووتنـەوەی هاوچـەرخی نیشتیمانی کـورد پەیوەندی بـە شێوازی پێکهـاتنی مێژوویـی چینـی سـەروو (دەسـەڵاتدار)ی کـوردەوە هەیـە. لەسەردەمی رووخانی کۆنفیدراسیۆنی میدیاوە گومڕاییەک لە شێوازی پێکهاتنی ئەو چینەدا جێگـای باسـە. لـەمێژووی هیرۆدۆتـدا لـەبارەی رووخانیـەوە باسـی چیرۆکێکـی بـەمجۆرە دەکرێت: ئاستیاک ی دوا پاشای مادەکان بەمجۆرە خیتابی هیرباکۆس دەکـات کـە خیانـەتی لێکـردووە: ئـەی چەپـەڵ خیانـەتت لێکـردم و پاشـایەتیەکەمت رووخانـد، خۆزگـە خـۆت بهاتبایتـە جێگـام. کـە ئەوەشت نـەکرد، هـەر هـیچ نەبووایـە پاشـایەتیەکەت بـۆ مادەکـان جێهێشتبوایە. بۆچی بەشێوەیەکی چەپەڵانـە چوویـت پاشـایەتیەکەت رادەسـتی خزمـەتکارە پارسەکەمان (کۆرش) کرد؟" نازانین کە چیرۆکەکە راستە یان نا، بەڵام ئەو چیرۆکە زۆر بـە روونی باسی پێکهاتنی چینی سەرووی بەکرێگیراوێتی کورد دەکات. ئەندامانی چینی سەروو بەردەوام لەپێناو بەرژەوەندییە شەخسـی و بنەماڵەییـە بچووکـەکانیان هێـزی دەسـەڵاتیان پێشکەش بەوانە کردووە کە گەلەکەیانی خستۆتە ژێر چەپۆکی حوکمڕانی خۆیانەوە. لەگەڵ ئەوەی دۆخی دەرپێسا(ألأستثناء) جێگای باس بووە، بەڵام ئەو هزر و هەڵوێستـە تـا رۆژی ئەمرۆمان کاریگەری هەبووە. کێبڕکێی نێوان قەبیلە و خانەوادەکان رۆڵـی لـەوەدا هـەبووە. بـەدرێژایی مێـژوو تایبەتمەندێتیـەکانی شەخسـی، خانـەوادەیی و خۆپەرسـتی لـە هـزری کوردایەتیدا لەپێشەوە بووە. لە ئیمپراتۆریەتەکانی پارس و ساسانیشدا پێگە و دۆخەکەیان بەمجۆرەیە. هەرچەندە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا هەلومەرجەکان زۆر لەبارە، بـەڵام هێزی دەسەڵاتیان پێشکەش بـە خانەدانـەکانی ئەمـەوی و عەباسی، سـەلجۆقیەکان، ئـاق قۆینلـو، سـەفەوی و عوسـمانیەکان کـردووە. ئـەو هێزەیـان هەیـە کـە زۆر بـە ئاسـانی سەڵتەنەتێکی ناوەندی دامەزرێنن. ئەحمەدی خانی لە شاکارەکەیدا بەخەم و پەژارەوە باسی ئەو حەسرەتە دەکـات. بگـرە یـاوز سـەلیمی سوڵتانی عوسمانیش پێشنیاز بـۆ ئیدریسـی بەدلیسی دەکات کە میرێکی میران لەناوەخۆیاندا هـەڵبژێرن. بـەڵام بیسـت و هەشـت میـری کورد دەڵێن لە ناوەخۆمانـدا رێکنەکـەوتین، هـەر بۆیـە داوا لـە یـاوز سـەلیم دەکـەن خـۆی میرێکی میران ئەرکدار بکات. ئەوەی لە سەدەی نۆزدەهەم زەبری کوشندە لە بەدرخان بـەگ دەوەشێنێت یـەزدان شێری برازایـەتی. چەندین بزووتنـەوەی هـاوشێوە دووچـاری هـەمان چیرۆک هاتوون. ئەوەی هەرە دوایی بەدەیان جار لە بوویەری PKK روویداوە خـودی ئـەو سەرگوزەشتەیە. هەمان واقیع لەسەرجەم بزاوتەکانی تەسفیەکاریدا رۆڵی خۆی دەبینێت.

دووەمین هۆکاری بنەڕەتی گرێدراو بە فاکتەری یەکـەم پەیوەنـدی بـە دونیـابینی چینـی سـەروو، بەرنامـە و شـێوازی رێکخسـتنبوونیانەوە هەیـە. چونکـە بەشـێوەیەکی ریشـەیی سەربەخۆیی و ئازادی لە هزریاندا سڕاوەتەوە. لـە پەنجەرەیـەکی وشکی وابەسـتەبوونەوە تەماشـای جیهـان دەکـەن. وەک بڵێـی سـەربەخۆیی و ئـازادی دوژمنـی بـن؛ تـۆزێکیش بەمجۆرەیە. چونکە لەمیانەی خیانەتکردن لە کلتووری کۆمەڵگای ـ مێژوویـی گەلەکـەیان،

هەروەها بایەخ نەدان بە ژیانی ئازادی ئەو کلتوورە و ژیانکردن لەناو کلتووری نامۆدا خۆیانیان ئاواکردووە.

سێیەمین هۆکاری بنەڕەتی، دیسان گرێدراو بە هەردوو فاکتەری یەکەمەوە، مانەوەی چینی خواروو لەناو فۆرمە دواکەوتووەکانی قەبیلە و بنەماڵە، خنکانی بوو لەناو کێشە شەخسی و خانەوادەییەکان و ئەو پێکدادانانەی لە ئەنجامی ئەو گرفتانەوە دەهاتنە ئاراوە. بۆ کوردی ئاساییش ناموس جگە لە پاراستنی بەرژەوەندییە خۆپەرستەکانی و خانەوادەکەی خۆی هیچ مانایەکی دیکەی نییە. ئەمە ئەو چەمکەی ناموسە کە لە گەورەکانی خۆیەوە فێری بووە. بیر لەوە ناکاتەوە ناموسی خۆی و خانەوادەکەی بە ئەخلاق و ناموسی کۆمەڵگا (ناموس = نۆمۆس= ڕێسای کۆمەڵایەتی= ئەخلاق) ببەستێتەوە؛ ئەخلاق ناکات بە پرەنسیپ و هەڵوێست.

ر ـ لەگەڵ لەناوچوونی کۆماری کوردستان لە مەهاباد دوای دووەمین جەنگی جیهانی بزووتنەوەی کورد دووچاری بێدەنگیەکی قووڵ هاتووە. تێکشکانە قورسەکەی بزووتنەوەکانی لەمیانەی ڕێبەرایەتی بەگایەتی، شێخایەتی و میلیگەرایی سەرەتایی گوزارشت لەخۆی دەکات ڕێگای لەپێش ئەو بێدەنگیەی مەرگ کردۆتەوە. قۆناغێکی بێ هیوایی و ڕەشبینی دەستی پێکردبوو. PDK کانی لە ساڵانی ١٩٤٥ ـ ١٩٤٦ ڕاگەیەنران هەوڵیاندا خۆیان وەک پارتێکی هاوچەرخ بناسێنن. بەشێوەیەکی سروشتی هەڵگری شوێنپەنجەی قورسی ڕابردووی نزیک بوون. بناغەی چینی بۆرژوازییان لاواز بوو. ڕۆشنبیرانیان زۆر کەم بوو. ئەو بێ هیواییەی شکستەکان ڕێگای لەپێش کردبوویەوە وایکردبوو بەرامبەر بە گۆڕانکاری نوێ بە تەدبیر و محافەزەکار بن. زۆر لە دواوەی نموونەکانی دیکەی جیهان بوون. دۆخەکەیان زۆر لە ڕەوشی بزووتنەوە و ڕۆشنگەری کوردانی سەردەمی مەشروتیەتی دووەم دواکەوتووتر بوو. ئەوەش پیشانیدەدات کە هێرشەکانی قەڵاچۆکردن چەندە گرنگ و کاریگەر بوون. سەرکردایەتی قۆناغیش لە کەسایەتی مستەفا بارزانیدا نوێنەرایەتی دەکرێت. دوای ڕۆڵەکەی لە مەهاباد (لێرەدا مستەفا بارزانی کاربەدەستێکی سەربازییە) لەئاکامی کاروانێکی سەرکێشانە گەیشتۆتە یەکێتی سۆڤێت. شۆڕشەکەی ساڵی ١٩٥٨ی ئێراق ڕێگای گەڕانەوەی بۆ کردۆتەوە. دەرفەتی چارەسەریەکی بێ خوێن و ئاشتیانە لەئارادایە. کاتێک لایەنەکان وەڵامی چاوەڕوانیەکانی یەکتریان نەدایەوە، لە ساڵی ١٩٦١ ڕێگای لەپێش قۆناغێکی پڕ لە شەڕ و پێکدادان کردەوە. وێڕای ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٤ بە ڕێککەوتنامەی ئۆتۆنۆمی گەیشتوون، بەڵام ئەو ڕێککەوتنە جێبەجێ نەکراوە. ڕێککەوتنەکەی ١٩٧٠ زۆر بەرفراوانترە، بەڵام ئەویشیان بەردەوام نەبووە و جێبەجێ نەکراوە. ڕێککەوتنەکەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ی نێوان دەوڵەتەکانی ئێراق و ئێران کە لەسەر بنەمای سازشکاری بوو (زۆر لە سازشکاریەکەی ١٩٢٦ نێوان تورکیا ـ ئینگلتەرا دەچێت) مانای کۆتاییهاتنی قۆناغێکی دیکەی بزووتنەوەکە بوو. سەرکردایەتی ئیبراهیم ئەحمەد و جەلال تاڵەبانی کە بەهۆی سازشکاری ١٩٦٢ بوون بە ڕکابەری سەرکردایەتی مستەفا بارزانی، ڕێگای لەپێش پێهەڵگرتنێکی نوێ کردەوە کە نەریتی باوی سلێمانی بناغەکەی پێکدەهێنا. لە ساڵی ١٩٧٥ لەمیانەی دامەزراندنی یەکێتی نیشتیمانی

کوردستانYNK هەوڵیانداوە بزووتنەوەیەکی هاوچەرخ ئاوا بکەن. ئەو پێکهاتە کلتووری و زەمینە جوگرافیەی ئەو بزووتنەوە ماهیەت لیبراڵ و چەپە رادیکاڵە پشتی پێدەبەست، سەبارەت بە بانگەشەکانی نوێنەرایەتیکردنی تەواوی کوردستان لەبار و گونجاو نەبوو. هەروەک لە رابردوو روویدابوو مەترسی بنبەستبوون و مانەوەی وەک جەمسەرێک لەئارادا بوو.

لە پارچەکانی دیکەی کوردستانیشدا سەرەتا پاشکۆکانی PDK و دواتریش ئەلتەرناتیفە چەپەکان سەریانهەڵدا. پاشکۆکانی PDK لە باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا) سەرەتا لە ساڵی ١٩٥٩ خۆیان وەک نەوەی چل و نۆیەکان[٣] ناساند، دواتر لە ساڵی ١٩٦٥ وەک PDK ــ تورکیا خۆیان نواند. کاتێک هێشتا زۆر لاواز بوون لە یەکەم هەنگاوەکانیاندا کەوتنە ژێر کۆنترۆڵی کۆنتر گەریلای تورک. لە ئاکامی کوشتنی فائیق بۆجاق ی یەکەم سەرۆکیT_PDK لەمیانەی پیلانێکی داپۆشراو بە دەمامکی ململانێی ناوخۆیی عەشیرەت، سیفەرەک ـ عەشیرەتی بۆجاق کرا بە ناوەندێکی گرنگی کۆنترگەریلا. پاشکۆکانی چەپی تورکیش لە کوردستان جگە لە هەڵگرتنی نەخۆشیەکانی نەتەوەی دەسەڵاتی ناوبراو بە شۆڤینیزمی سۆسیال هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەدەبینی. هەبوونی کورد و کوردستان سەرەکیترین بابەتی گفتوگۆکردن بوو. سەرەتا هەوڵدەدرا لە رێگای ئەو دەستەواژانەوە تابۆکان بشکێنرێت. بەرنامە و رێکخستنێکی واقیعی نەدەکرایە جێگای باس. کێشەی کورد لە دروشمێک زیاتر تێپەڕی نەدەکرد. کار و خەباتە سۆسیۆلۆژیەکانیش نموونە قەبەکانی پۆزیتیڤیزم بوون. ئۆجاخی شۆڕشگێری کلتووری رۆژهەلات[٤] (DDKO) کە لە ١٩٦٩ دامەزرا ئاستی جەمعیەتی تەعالی کوردی سەردەمی مەشروتیەتی دووەمی دەرباز نەدەکرد. وێڕای بەلاوەنانی بێدەنگییە مەرگەساتیەکەی دوای ١٩٤٠ کان، بەلام هێشتا زۆر لە گەیشتن بە ئاستی بزوتنەوەیەکی نیشتیمانی هاوچەرخ دوور بوون. PKKش کە لەو سەردەمەدا بناغەکەی دانرا هەوڵی دۆزینەوەی راستینەی خۆیدەدا.

لە خۆرهەلاتی کوردستان (کوردستانی ئێران)یش کە دوای کۆماری کوردستان لە مەهاباد کەوتە ناو قووڵایی بێدەنگیەوە، PDK وەک ئەزموونێکی نوێ پەرەیسەند. PDK ـ ئێران لەژێر سەرکردایەتی رۆشنبیرێکی وەک عەبدولرەحمان قاسملۆ بە ئاراستەی پارتێکی مۆدێرن گەشەی دەکرد. لەمیانەی شۆڕشی ئێرانی ١٩٧٩ وە دەرفەتی سەرکەوتنی بۆ رەخسا بوو، بەلام لەبەر هۆکارگەلێکی جیاواز نەقۆزرایەوە. دوای شەهیدبوونی قاسملۆ و

---

[٣] لە ساڵی ١٩٥٩دا بەتۆمەتی جوداخوازی و پارچەکردنی کۆماری تورکیا بۆ بەرژەوەندی دەوڵەتانی بیانی، چل رۆشنبیری کورد دادگایی کران. پاشان دە کەسی دیکەشیان لەسەر زیاد کردن، بەلام یەکێکیان هەر لە زیندان لە ژوورەکەی خۆیدا بە مردوویی دۆزرایەوە، بەمەش بوونە چل و نۆ کەس. بۆیە دۆزەکە بە دۆزی چل و نۆیەکان ناسرا. سەرەڕای ئەوەی پاشان دوو کەسی دیکەشی لەسەر زیاد کرا، بەلام ناوەکەی هەر وەک خۆی مایەوە. هەندێک لەو رۆشنبیرانەی ئەو تۆمەتەیان خرابووە پاڵ ئەمانەن: موسا عەنتەر، سەعید قورمزی تۆپراک، شەرفەددین ئاڵچی، ناجی کوتلای. (وەرگێڕ)

[٤] ناوەندەکانی کلتووری شۆڕشگێڕانی خۆرهەلات (Doğu Devrimci Kültür Ocakları): لە ساڵی ١٩٦٩دا لە باکووری کوردستان دامەزرا و بەهۆی کودەتای ساڵی ١٩٧١وە داخرا. پاشان ئەو ناوەندانە چەندین ناوی دیکەیان لێنرا. وەک کۆمەلا، رێیا ئازادی، کاوە. (وەرگێڕ)

شەرەفکەندی لە ئاکامی پیلانگێرییەکانی ئێرانەوە، ئیتر بزاڤەکە بوو بە بزووتنەوەیەکی پەنابەر. گروپە چەپڕەوەکان و کۆمەڵەش کە لە حەفتاکان دامەزران بە گوێرەی پێویست کاریگەریان نەبوو.

کار و خەباتە ئەدەبیەکانی لەناو کوردانی سوریا سەریهەڵدا دوای دووەمین جەنگی جیهانیش بەردەوام بوو. شاعیرێکی وەک جگەرخوێن پێگەیشت. خەباتی هاوشێوەی عوسمان سەبری لە ئارادابوو. هەوڵیانداوە درێژە بە نەریتی بەدرخانیەکان بدەن. پاشکۆکانی PDK لە سوریا دامەزران. هەروەها رێکخستنەکانی پارتی کۆمۆنیستیش زۆر بە کاریگەر بوون. هاوشێوەی PDK ـ ئێراق پارتە کۆمۆنیستە نەریتیەکانیش لە تەواوی بەشەکانی کوردستان پاشکۆیان هەبوو. بەڵام لەبەر ئەوەی پشتیان بە ناسنامەی خۆیی نەدەبەست و سروشتی کوردستانیان شیکار نەکردبوو چانسی سەرکەوتنیان نەبوو. بە گشتی دووچاری نەخۆشیەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو هاتبوون.

ئەنجام، بزووتنەوەکانی کوردان دوای دووەمین جەنگی جیهانی لە قۆناغی گوزەرکردندا بوون. سەرکردایەتی باوی چینی سەروو دۆڕا و مایەپووچ ببوو. تابلۆیەکی رەشبینی لەدوای خۆیەوە جێهێشتبوو. بێ باوەڕییەکی قووڵ سەبارەت بە حەسرەتی بوون و ژیانی ئازادی کوردان هاتبووە ئاراوە. وەکو دیارە لەوانەیە یەکەمین جار بوو بێ متمانەیی و بەخۆ باوەڕنەبوون لە مێژوودا جێگای باس بووبێ. بەجۆرێک لە جۆرەکان نیگەرانی و مەترسی تووشبوون بە چارەنووسی هیندیە سوورەکان جێگای باس بوو. ئەو دیاردە زیاتر لەناو کوردە عەلەوی و زازاکان رەنگیدەدایەوە. بەمانا هاوچەرخەکەیەوە بەرلەوەی کوردێتی لەدایک بێت مردوو بوو. بەمانایەکی تر لە کەسایەتی چینی سەروودا بە مردوویی لە دایک ببوو. رۆشنبیر و چینە مۆدێرنەکانی دەبووایە خاوەنداریتی لە ناسنامە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکانیان بکەن لە سەر شانۆ نەبوون. سیاسەتە وشکەکانی ئاسیمیلاسیۆن ئەنجامی خۆی بەدەست هێنابوو. بەناو رۆشنبیرێک جێگای باس بوو وەک چۆن لە دەرد رادەکەن ئاوەها لە کوردایەتی رایان دەکرد. گشت خەمی گەل لەوەدابوو بتوانێت بەردەوامی بە بوونی خۆی بدات. ئەو بۆرژوازیبوونەی هاتبووە ئاراوە، لە هی یەهودیەکان زیاتر، بۆرژوابوونێکی لەسەر بنەمای هەڵگەڕانەوە بوو. لەبەر ئەوەی بەرادەی دوورکەوتنەوە و راکردنیان لە کوردایەتی پارەیان دەست دەکەوت، وەک سەگەکانی باڤلۆڤ خۆیان بە گوێرەی ئەوە راهێنابوو. کوردستان و کۆمەڵگای کوردەواری ١٩٧٠ کان وڵات و کۆمەڵگای ئەو مرۆڤانە بوو کە هیچ بانگەشەیەکیان لەبارەی خۆیانەوە نەمابوو یاخود زۆر لاواز بوو. ئیتر بوختان و پروپاگەندەی "کوردی کلکدار" جێی خۆی گرتبوو. لەو دۆخەدا هەرکەس بۆ ئەوەی باوەڕ بەخۆی بێنێت کە کلکدار نییە دەستبەرداری کوردێتی خۆی ببوو یان کاتێک بەشێوەیەکی شەرمنانە باسی بێ کلکبوونی خۆی دەکرد ناوە بە ناوەش تەماشای دواوەی خۆی دەکرد.

خۆشم لەو واقیعەدا ژیام. ئەگەر دەرەتانێکم بدۆزیبایەوە وازم لە کوردێتی و کوردستانی بوون دەهێنا. بەڵام دوای ئاشنابوونم بە زانستی هاوچەرخ ئیتر راستی فشاری بۆ هێنام، وەک دێوەزمەیەک بەسەرمدا دادەباری. بریسکەکانی مۆدێرنیتە منی کەمەندکێش

دەکرد. بەڵام دانەبڕانم لەو جوگرافیایەی لە مێژە ناوەکەی لەبیرکراوە و گەلەکەشم کە تا دەچوو ناوەکەشی لەبیردەکرا، منی لەو بریسکانە دوور دەخستەوە. مۆدێلی مۆدێرنیتەی تورک مسۆگەر بەشێوەیەکی ڕەها وازهێنانی لە کوردێتی و کوردستانیبوون کردبوو بە مەرج. هەندێک جار کاتێک وەک ژنێکی جوان خۆی پێشکەش دەکرد، مسۆگەر بۆ ئەوەی بتوانی لە گەڵیدا بژیت دەبووایە نکوڵی لەخۆت بکەیت. تەنانەت کاتێک دەتویست کوڕێکیش بکەیت بە برادەر و هاوڕێی خۆت دیسان هەمان مەرجی دەسەپاند. تۆزێک خۆییبوون مانای تەنیاییەکی ڕەها بوو. تەواو لە ئەعرافدا بووم. نە هیوای بەهەشت نە ترس لە دۆزەخ، هیچ یەکیانم نەمابوو. وەک مەجنون دەگەڕام و دەسوڕامەوە. لەبەرامبەر ژیانی مۆدێرندا کوردێتی تەواو ببوو بە کۆت و بەندێک.

زەمینەی ئەو چینەی دەبوایە بزووتنەوەی نەتەوەیی بۆرژوازی ئاوا بکات هەر لە سەردەمی لەدایکبوونییەوە ناچاربوو خۆی وەک تورک پێناسە بکات. پێگەی ڕۆشنبیران لە نزیکەوە گرێدراوی نکوڵیکردن لە کوردێتی بوو: ڕۆشنبیر ئەو کەسە بوو کە کورد نییە. ساڵانی ١٩٧٠کان قۆناغێکە کە پێویستە بڕیار لەبارەی دەستنیشانکردنی بنەچەی ئاراستەی هاوچەرخێتی کورد و کوردستان بدرێت. ئێستاش لەیادمە: کاتێک بۆ یەکەمین جار دەستەواژەی "کوردستان کۆلۆنییە"م لە هزر و دڵی خۆمدا چەسپاند بورامەوە. کاتێک هاوڕووەکەم، کەسایەتی و مرۆڤی مەزن حەقی قەرار ئەو دۆخەمی بینی، وێڕای ئەوەی کوردیش نەبوو، بەڵام وەک سەرکردەیەکی ڕاستەقینەی پێکهاتە نوێیەکە تا شەهید بوون بێ هیچ دوودڵیەک لە خەبات و تێکۆشان بەردەوام بوو. نموونەی بەرزی هەڤاڵێتی ڕاستەقینە بوو. دۆخی کۆرپەلەیی بزووتنەوەکان زەحمەتیەکانی زۆر لە دۆخی کەوتنە ناو منداڵدان زیاتر و سەختترە. دۆخەکانی کۆرپەلەی بایۆلۆژی یاساگەلێکی هەیە کە لەمیانەی ئارەزووە زایەندییە خۆڕسکەکانەوە دەست نیشانکراون. حوکمی هەڕەمەکی جێگای باسە. ئەگەر بزووتنەوە کۆمەڵایەتیەکان لەو چەشنەبن کە شوێنپەنجەی خۆیان لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی بەجێ بێڵن، ئەوا ماوەیەکی درێژ و لە هەلومەرجێکی دژواری شوێندا چاوەڕوانی کەوتنە ناو منداڵدان دەکەن. تابلۆ و شانۆی چوون بۆ شاخ و گیرسانەوە لە ئەشکەوتەکان کە لە نەریتی پێغەمبەرەکاندا دەبینرێت تەواو گوزارشت لەو سات و قۆناغە دەکات کە بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان ــ کە پێغەمبەران ڕێگایان لەپێش کردۆتەوە ــ بەرەو منداڵدان دێنە خوارەوە. یەکەمین دیداری حەزرەتی محەمەد لەگەڵ جبرائیلی فریشتە و وەرگرتنی سروشی "بخوێنە!" و نۆرەکانی لەرزین و بورانەوە کە دواتر دووچاری هات گوزارشت لەو ساتە شکۆدارە دەکات.

پشتبەستن بەهەر هێزێکی بونیادنراو مانای لەدایکبوونێکی نوێ نابەخشێت. ژیانێک بە گوێرەی ڕێساکانی ئەو هێزە تەنیا سوود بە دووبارەبوونەوەی دەبەخشێت. هەمان خاڵ بۆ وابەستەبوونی دۆگماتیکانە بە هێزەکانی باوەڕیش لە جێگای خۆیدایە. تەنانەت هەنگاونان بەئاراستەی هزری زانستیشدا، بەرەو بوون بە بزووتنەوەیەکی نوێی کۆمەڵایەتیت نابات، مەگەر بتکات بە خەتیبێکی باوەڕپێکراو. لە هەلومەرجی ساڵی ١٩٧٠کاندا بڕیاردان لەبارەی بوون بە بزووتنەوەیەکی ئازادیخوازی بنەڕەتی کوردان، وەک نموونەی وەرچەرخان لە

جوجەڵەوە بۆ بەچکە باز، مانای گەورەکردن و بە باڵکردنێتی لە هەلومەرجێکدا کە بەدوژمنەکانی بازەوە دەورە دراوە. هەلومەرجەکان پێویستی بە بەرزەفڕیەکی بەردەوامی بازەکانە. لەکاتی نووسینی ئەو دێرانە چەسپاندنێکی شەهیدی مەزن مەزڵوم دۆغانم بیرکەوتەوە کە لەبارەی منەوە دەستنیشانی کردووە. گوێم لێ بوو کە گوتویەتی: "بەڕێوەچوونی ئەو هەڤاڵە لە بەرزەفڕی هەڵۆکان دەچێت. بەردەوام لە بەرزاییەکان دەفڕێت".

## بەشی چوارەم

# بزووتنەوەی PKK و شەڕی شۆڕشگێڕی گەل

ئەو لەرزین و بورانەوەیەی دەستەواژەی "کوردستان کۆلۆنییە" لەمێشک و دڵمدا ڕێگای لەپێش کردەوە یەکەمین و دوا ڕووداوی لەمجۆرە بوو. لەراستیدا لام زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر بوو، بەڵام گۆڕانکاری و پێشهاتەکانی دواتر دەیانسەلماند کە بۆچی دەستەواژەیەک کاریگەریەکەی هێندە زۆرە. بەڵام تا ئێستاکەش ڕوونکردنەوەی کاریگەرییەکەی سەرەتا لای من زەحمەتە. لەسەردەمێکدا و لەشوێنێکی وەک ئەنقەرە فەرمانی مەرگی کورد و کوردستانی لێدەدرا و بە خەستترین شێوەش پەیڕەو دەکرا، بە تەنیا بڕیاردان لەسەر زیندووکردنەوە یان ژیاندنەوەی دەستەواژە، پێویستی بە شیکارێکی هێندە جددییە کە ببێتە بابەتی ڕۆمانێک.

لە زەمینەی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی لاوانی کورد و تورکدا دەژیام. ئاشکرایە کە ئەو بزووتنەوانە کاریگەرییان لەسەرم هەبوو. لە ساڵانی سەردەمی ئۆجاخی شۆڕشگێڕی کلتووری ڕۆژهەڵات (DDKO) و لاوانی شۆڕشگێر (Dev- Genc) بوون بە لایەنگری ئەو ڕێکخستنانە ڕووداوێکی کەمبایەخ نەبوو. گوێم لەناوی ڕێکخستنەکانی THKO,TKPML,TIKKO-THKPC ببوو، شاهێدی شەهیدبوونی ئازا و نەبەردانەی سەرکردەکانیان بووم. سەرەتا بەرخودانی ڕێبەری THKPC ماهیرچایان و حوسێن جەواهیری هاوڕێی لە ماڵتەپە، دواتریش ڕاکردنی لەبەندیخانە و لەگەڵ نۆ لەهەڤاڵانیەوە شەهیدبوونی لە قزلدەرە تابلێی بە کاریگەر بوو. کاریگەریەکی ئەوتۆی کردبوویە سەرم کە پێشەنگایەتی یەکەمین گروپی پرۆتستۆکردنی ئەو کۆمەڵکوژییە بکەم. هەروەها بوومە شاهێدی لەسێدارەدانی دەنیز گەزمیشی ڕێبەری THKOو دوو لە هاوڕێیانی. هەروەها شەهادەتی ڕێبەری TIKKO ئیبراهیم قایپاک قایاش زۆر کاریگەر بوو کە لە زیندان بەرخودانی کرد و لەژێر ئەشکەنجەدا شەهید بوو. هەرچەندە باجەکەی لەدەستدانی ژیانیان بوو، بەڵام هەرسێ سەرکردەش ئاماژەیان بە ڕاستینەی گەل و نەتەوەی کورد کرد، بووم بە شاهێدی ئەو واقیعەش. بێگومان لەپاڵ چەندین فاکتەری دیکەی لە پلەی دووەم دەهاتن، لەپێناو حەقیقەتدا شەهیدبوونی ئەو سەرکردانەی لە هەناوی بزووتنەوەی لاوان دەرکەوتبوون، یەکێک بوو لەو هۆکارە سەرەکیانەی بوێری پێبەخشیم و بەرەو ڕاستینەی ڕەسەنی خۆم ئاراستەی کردم.

پیشاندانی بوێری هەنگاونان بەرەو ڕاستینەی ڕەسەنی خود شتێكە، زانینی چۆنیەتی ڕۆیشتنیش شتێكی دیكەیە. لەسەردەمی قوتابخانەی سەرەتایی خاوەن ئەزموونی پێكهێنانی گروپی نوێژكردن بووم. هەروەها ئەزموونەكانی گروپەكانی یاریكردن و چۆلەوانیشم هەبوو. بەڵام پیشاندانی بوێری ڕۆیشتن لەسەر ڕاستینە كوشندەكە و هاوێشتنی یەكەمین هەنگاوەكانی، پێهەڵگرتنێكی تاقانە و بێهاوتایە. دواتر گفتوگۆیەكی زۆر كراوە كە "بۆچی ئاسایش نەیدیوە و لەكاتی خۆی تەگبیری پێویستی وەرنەگرتووە؟" و بەمجۆرە یەكتریان ڕەخنە كردووە. ڕەوشێكی ئاسایشی لەئارادا نەبوو. بەڵكو ڕابوون و هەنگاونانێكی سەیری هاوشێوەی مەجنوون جێگای باس بوو. هەنگاوێكی هێز و حەقیقەتە، بەڵام ئاگادار نەبیت دەبێتە سەرچاوەی لاوازی و چەوتی. زەحمەتە وەڵامی ئەو پرسیارە بدرێتەوە كە چەندە بزاڤی ئەقڵ و بەرهەمی هەست و سۆز بوو، ئەو پرسیارگەلە مانایەكی ئەوتۆی نەبوو. لەتوركیای ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٨٠ زۆر گرنگ بوو كە بە پشتبەستن بە دوو وشە بتوانیت لەڕێگای دەستەواژەیەكەوە ڕێگا ببڕیت و بژیت. نەك ساڵان بەڵكو ڕۆژانیش زۆر بە هێواشیەوە تێپەڕدەبوون. خودی ئەو ئامانجەی چاوەڕوانی بەدیهاتنی دەكرا؛ لە خەیاڵیش داخراو و نادیارتر بوو. بەڵام دڵنیابووم كە بوون بە گروپ هەنگاوێكی زۆر مەزن دەبێت. زەحمەت نەبوو شیمانەی ئەو واقیعە بكەین كە یاریەكەی گروپەكەمان كە لەبەر چاوی ناقۆڵاترین هەواڵگری ئاسایش بەڕێوەدەچێت بەهێندی وەرنەگرن، سووكی ببینن و گاڵتەی پێ بكەن. هەروەك گوتەی "تۆ قسە بۆ تەختەدارێك دەكەیت، چۆن ئەو پارچە تەختەیە زیندوو دەكەیتەوە؟" ئەو لادێییەی كە باسی یەكەم ئەزموونی كۆمەڵایەتی خۆمم بۆ كرد، ئاشكرا بوو كە باوەڕیان پێنەدەكرد. لە ڕاستیدا چەندین گروپی دیكەی هاوشێوەمان ئێمەیان بە "چەتە بێهێز و بێچارەكان" ناودەبرد. ئیتر ڕزگاریخوازە نیشتیمانیەكان و ئاپۆچی ببوون بەیەكەمین ناوی گروپەكەمان. ناولێنان جێگای شانازی بوو. وەك چۆن ناو لە منداڵێك دەنرێت. بەڵام ئەو ناولێنانانە بڕیاری خودی خۆمان نەبوو. لەسەردەمی گروپدا تەنیا دەمانتوانی خۆمان بە شۆڕشگێڕانی كوردستان ناو ببەین. تەنیا پێنج ساڵ دوای ئەوەی وەك گروپ لەدایكبووین بوێری ئەوەمان كرد كە ناوی ڕاستەقینە لەخۆمان بنێین. ئەو كاروانەی لە نەورۆزی ١٩٧٣ لەكەنار بەنداوی چوبووك ی ئەنقەرە دەستی پێكرد و بەجۆش و خرۆش و دێوانەیی بەردەوام بوو، كاتێك لە ١٩٧٨/١١/٢٧ لە گوندی فیسی سەر بە ناوچەی لیجەی شاری ئامەد بە ناوی (پارتیا كاركەرێن كوردستان) PKK ئەنجامگیر بوو، ئیتر خۆمانمان بە فریادرەسی ناموس دەزانی. ئایا ئامانجێكی لەوە مەزنتر جێگای باس دەبوو؟ هەرچیەك بێت ئیتر ڕێكخستنە مۆدێرنەكەی چینی مۆدێرن ئاواكرابوو.

## أ . PKK و ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت . نەتەوە

ئەگەر ئەمڕۆ ئاوڕێک لە رابردوو بدەینەوە ئەوا دەتوانین بەشێوەیەکی واقیعیتر ئەو زەمینە و هەلومەرجانە راڤەبکەین کە بەرەو راگەیاندنی PKK چوو. بەر لە ئەنجامدانی ئەو راڤەکارییە پێشخستنی شیکاری زیاتر لەبارەی شێوەی هزری پشتبەستوو بە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە بابەتەکە رۆشنتر دەکاتەوە. پێشتر ئاماژەمان پێکردبوو کە ئەو شێوە هزرییە رۆڵێکی سەرەکی لە هەڵکشانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەوروپا بینیوە. جیاوازی خوداوەند ـ بەندە کە دەستەواژەی رەواکردنی دابەشبوونی بنەڕەتی کۆمەڵگایە و سیستەمی شارستانی پشتی پێدەبەستێت و گوزارشتی خۆی لە سێیانەی شار ـ چین ـ دەوڵەتدا دەدۆزێتەوە، لەمیانەی راڤەی فەلسەفی هەرە پەتی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی شارستانی خۆرئاوا بە بەرزترین ئاستی خۆی گەیشت. دەستەواژەی سۆبژە ـ ئۆبژە دەستەواژەیەکی سەرەکی سیستەمی شارستانییە. وەک چۆن ئەو شرۆڤەیە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هێنائاراوە، لەرێگایەوە بە کاملترین راڤەی خۆی گەیشت.

وەک دەزانرێت فەلسەفەی پشتبەستوو بە دەستەواژەی سۆبژە ـ ئۆبژە لە بواری حەقیقەتدا رێگای لەپێش پەرەسەندنی مەزن کردۆتەوە. لەمیانەی ئەو مەودایەی فەلسەفە لەپێکهاتنی هوشیاریی حەقیقەتدا بڕیویەتی سەرمایەداری خۆرئاوا هەژموونگەرایی خۆی لەسەرتاسەری جیهاندا سەقامگیر کرد. پێویستە لەبیری نەکەین هەر سیستەمێکی هاوچەرخ لەمیانەی تێگەیشتن و هەستی حەقیقەتی سەردەمی خۆی هەوڵدەدات خۆی بکات بە یەکەمین و سەرەکیترین سیستەم. لەدەرەوەی دەرکپێکردنی حەقیقەت هیچ حوکمڕانیەک چانسی سەرکەوتنی هەمیشەیی نییە. وەک چۆن ئەو سیستەمە شارستانییەی خاوەن بەرزترین ئاستی هەست و دەرکپێکردنی حەقیقەتە خۆی دەکات بە هەژموونگەرا، ئەوا تەنیا ئەو سیستەمانە دەتوانن دەربازی بکەن کە خاوەنی دەرکپێبردنێکی بەرزتری حەقیقەتن. سەرەکیترین فاکتەری سیستەمی شارستانی هەڵکشاوی ئەورووپای خۆرئاوای لە ئاستی جیهان کردووە بە هەژموونگەرا بالآبوونێتی لەبواری هەست و دەرکپێبردنی حەقیقەت. لەوەشدا قەرزداری پێشخستنی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە و کردنیەتی بەفەلسەفەی سەرەکی ( فەلسەفەی کارتزیان) ـە. ئەو خاڵەی پێویستە لێپرسینەوە و لێپێچینەوەی لەبارەوە بکرێت ئایا ئەو دەستەواژە گوزارشتی حەقیقەتی رەهایە یان نا؟. شیکارەکانی تیۆری فیزیای کوانتەم سەلماندوویەتی کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە ناکرێت بە رەها. لەدوا شیکاردا جیاوازی چاودێر ـ چاودێریکراو واتای خۆی لە دەستدەدات. کاریگەریکردنە سەر یەکتری دەبێتە بنەما و مەرج. ئەو ئەنجامەی دەرکەوتووە، کارەکتەری رێژەیی حەقیقەتە. وەک چۆن سۆبژەکتیفی رەها (ماتریالیزم) بوونی نییە، ئۆبژەکتیفی رەها (ئایدیالیزم)ش جێگای باس نابێت. چونکە لەهەردوو چەمکی زێدەڕۆدا

حەقیقەت بەهای خۆی لەدەست دەدات. دەستەواژەی ڕێژەییبوون کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە رەها ناکات، ئەو دەستەواژەیە کە خاوەن زیاترین توانای ئافراندنی حەقیقەتە. هەڵبەتە ئەو راستینەی سەرچاوەی ئەو شۆڕشە پێکدێنێت کە ئەلبرت ئەنشتاین لە فیزیادا ڕێگای لەپێش کردەوە و لەمیانەی دەستەواژەی ڕێژەییبوون سەلماندی، راڤەکەیەتی لەبارەی حەقیقەتەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئاشکرابوو کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پشتبەستوو بە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە هەڵگری بەهای رەها نییە و پێویستە دەرباز بکرێت. لە شرۆڤەی کارل مارکس سەبارەت بە سەرمایەداری زیاتر، راڤەی ئەنشتاین لەبارەی حەقیقەت پێویستی دەربازکردنی سەرمایەداری خستۆتەڕوو. لەبەرئەوەی فەلسەفەی ماتریالیستی مارکس و ئەنگلس لەبارەی مێژوو، کۆمەڵگا و سروشت جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی دەرباز نەکردووە، مرۆڤی ئازادی نەئافراندووە. بە واتایەکی تر هەوڵەکانیان لەو بارەیەوە کورتی هێناوە. وێرانبوونی ژینگە و داڕووخانی کۆمەڵگا گرێدراوی ئەو هێزەی واتا و جێبەجێکردنە کە دەستەواژەی سۆبژە ـ ئۆبژە لە سەرمایەداری بەدەستی هێناوە. بەگوێرەی ئەوەی ژیان بە بێ ژینگە و کۆمەڵگا ئەستەمە و لەسەر بەردەوامکردنی ژیانی مرۆڤ سوورین، ئەوا دەربازکردن و بەلاوەنانی سەرمایەداری دەست لێبەرنەدراوە. فەلسەفەی ڕێژەییبوون ئەو دەرفەتەی دەربازکردن دەڕەخسێنێت کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی رەها نەکردووە.

کاتێک هەنگاومان بۆ دامەزراندنی PKK دەهاوێشت گرنگیەکی زۆرمان بە دڵسۆزی لە ئاست ڕێبازی سۆسیالیزمی زانستی مارکس پیشاندەدا. ئەگەر سۆسیالیزمی بونیادنراو نەبووایە رەنگە ڕێکخستنێکی لە جۆری PKK پێکنەهاتبووایە. بەڵام ئەو واقیعەش ئەوە ناسەلمێنێت کە لەقۆناغی لەدایکبوونیدا PKK پێکهاتەیەکی سۆسیالیستی بونیادنراو بووە. هەرچەندە تارادەیەکی زۆر پێیەوە کاریگەر بووبێت، بەڵام ناشێت هەموو راستینەکەی لەمیانەی سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە روون بکرێتەوە. بەو ئامانجەی لێرەدا بە شرۆڤەیەکی راستتر بگەین؛ پێویستە پەنا ببرێتە بەر دەستەواژەکانی ڕێژەییبوون و جیاوازی. ئێستاش لە یادمە بەهۆی جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەپێناو بونیادنان و دامەزراندنی PKK بەدوای زەمینەی ماددی و شرۆڤەی ماتریالیستیدا دەگەڕام. ئەو لێگەڕینەش پرەنسیپێکی ژیانی و دەست لێبەرنەدراو بوو. دیاردەی هاوشێوەی چینی کارکەر لەناو کوردان و کوردستان لەئارادابوو. هەست بە بۆرژوازیبوون دەکرا. ئەو دیاردانەش بۆ رەهەندی واقیعەکە بەس دەبینرا. بەڵام راست نییە ئەگەر بڵێم تەواو دڵنیا بووین. وەک پێویستیەکی پرەنسیپ ئەوە پەسەندکرن بوو. کاتێک دۆخەکە بەمجۆرە بوو، ئیتر بە تەواوی بە شێوازێکی دۆگماتیکانە خۆم یان خۆمان بەرامبەر بە شەپۆڵی سروشتی ژیان دانەدەخست. تا دەچوو ئەو لایەنەشمان کرانەوەی ئەنجامدەدا و جیاوازیەکەمانی دروست دەکرد.

هەموو کاتێک مەترسی ئەوە لەئارادایە کە پرەنسیپ بەرەو دۆگماتیزمت ببات. بۆ ماوەیەکی درێژ دۆگماتیزم کاریگەری لەسەر ئێمەش هەبوو. ئێستاش ناشێت

کاریگەریەکەی بچووک بکرێتەوە. بەڵام ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت کراوەییمان بۆ دەستەواژەی ڕێژەییبوون دەبوو بە گرنگترین چەکی خۆپاراستنمان لە بەرامبەر هەڕەشە و مەترسیەکانی دۆگماتیزم. ئەگەر فەلسەفەی ڕێژەییبوون بە تەواوەتی لە پشکی حەقیقەت لە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە بێبەش نەکەین و دەرفەت بەوە نەدەین لەسەر بنەمای رکابەرێتی بۆ رەهابوون وەرچەرخێت و بەمجۆرە بەکاری بێنین، ئەوا دەتوانین بە بەرزترین ئاستی راڤەی حەقیقەت بگەین: لەهەر هەلومەرجێکی هەستیاردا لەمیانەی گەڕانەوە بۆی دەکرێت دەرفەتی پێهەڵگرتنی سەرکەوتووانە و بوون بە مرۆڤی ئازاد بڕەخسێنین. ئەگەر ئەمڕۆ ئاوڕێک لە رابردوو دەدەینەوە و هەوڵدەدەین سەرلەنوێ PKK راڤە بکەین، ئەوا لەو پرۆسەیەدا قەرزاری ئەو وەرچەرخانە فەلسەفیەین کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژەی رەها نەکردووە و گرنگی بەوەش داوە خۆیشی نەکات بە موتڵەق. پێویستە ئەو وەرچەرخانە فەلسەفییە بچووک نەکەینەوە کە جیاوازی سۆبژە ـ ئۆبژە دەرباز دەکات. ئەگەر بە بێ خزان بۆ ناو شپرزەییەکانی پۆست مۆدێرنیزم سەرجەم ڤێرسیۆنەکانی شرۆڤە فەلسەفیەکان (شرۆڤەی مارکسیشی لەناودا) دەرباز بکەین کە بناغەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێکدێنن، ئەوا مانای بونیادنان و ئافراندنی گەورەترین شۆڕشی فیکرییە. بێگومان هێشتا لەسەرەتای ئەو شۆڕشە هزرییە داین، بەڵام دیسان ناشێت ئەنجامە پراکتیکیەکانی ئەو شۆڕشە بچووک بکرێتەوە. لەو چوارچێوەیەدا سەرلەنوێ شرۆڤەکردنی PKK؛ کە لەسەرەتای ١٩٧٠کان پشتی خۆی بە کامە هەلومەرجی جیهان و فاکتەری کلتووری ماددی دەبەست؛ هەروەها کامە پێوانەی سەرەکی هوشیاری، ڕێکخستن و کردار و کلتووری مەعنەوی بە بنەما دەگرت، بەرادەی پێناسەکردنێکی راستی PKK ئەوا رۆڵەکەی رۆژی ئەمڕۆشی رۆشنتر دەکاتەوە.

## ١. پێناسەکردنێکی راست بۆ هەلومەرجەکانی دونیای ١٩٧٠کان

هیچ بزووتنەوەیەکی فیکری بەشێوەیەکی سەربەخۆ و دابڕاو لەو فۆڕمە ماددیانە گەشە ناکات کە مرۆڤ تێیدا دەژیت. ئەوەی گرنگە هزر (فیکر) کامە فۆڕمی ماددی دەخاتەڕوو؟. کاتێک راستینەی کۆمەڵایەتی جێگای باس بێت، ئەوا خودی فۆڕمە ماددیەکانیش دۆخی بونیادنراوی و دامەزراوەبووی فۆڕمە هزریەکانە. پێویستە فۆڕمە کۆمەڵایەتییەکان ــ زمانیش لەناودا ــ وەک سروشتگەلێکی نەرم هەڵبسەنگێنرێت کە رێژەی فیکریان بەرزە. سروشتە نەرمەکانیش لەمیانەی وەرچەرخانی بەردەوامی وزەی هزری و بەدەستهێنانی فۆڕم دێنە ئاراوە.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سیستەمی هەژموونگەرایی دونیای ١٩٧٠کانە. هەڵکشانی ئەو سیستەمەی ئەوەرەی ئەورووپای خۆرئاوا و بوونی بە خاوەنی کارەکتەری هەژموونگەرایی بەرهەمی ئەو پێنج سەدەیەی دواییە. لە سەدەی شازدەهەمەوە تا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم لەمیانەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری بازرگانی، لە

کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم تا ١٩٧٠کان لەڕێگای سەرمایەداری پیشەسازییەوە، لە ١٩٧٠کان یش بەدواوە لەمیانەی هەژموونگەرایی سەرمایەی فینانسەوە خۆی کرد بە جیهانگیری و بەردەوام دەبێت. جیاوازی نێوان سەردەمەکان پەیوەندی بە گۆڕانکاری چۆنایەتی سەرمایەدارییەوە هەیە؛ بە واتایەکی دیکە گرێدراوی بڕی ئەو قازانجەیە کە دابینی دەکات. سەرمایەداری بازرگانی لەمیانەی وەرچەرخانی پیشەسازی مانیفاکتۆرا و پەرەپێدانی سیستەمەکانی فینانس خەسڵەتی خۆی دەنوێنێت. بازرگانی درێژ مەودا قازانج دەگەیەنێتە بەرزترین ئاست. هەربۆیەش پەرە بە بازرگانی ڕێگای دەریایی و نێوان کیشوەرەکان دەدرێت. سەرمایەداری پیشەسازیش لەڕێگای بەکارگەکردنی بەرهەمهێنان زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت. لە سەرمایەداری بازرگانی و پیشەسازیشدا بەشێوەیەکی سەرەکی ئامرازەکانی فینانس (دراو، سەنەد، هتد...) ڕۆڵ لە خێراکردنی گۆڕینەوە و بەرهەمهێناندا دەبینن. هێشتا بەو دۆخە نەگەیشتوون بە تەنیا زۆرترین رادەی قازانج بەدەست بێنن. دەرفەتێکی بەمجۆرەش لە دونیای ١٩٧٠کان لەگەڵ گۆڕانی سیستەمی دراو دێتەئاراوە، واتە لەمیانەی دەستبەردان لە چاپکردنی دۆلار بەرامبەر بە زێڕ هاتۆتە ئاراوە. لەو ڕوانگەیەوە؛ دونیای ١٩٧٠کان گوزارشت لە بەرزترین ڕێژەی قازانجکردنی پارە بە پارە دەکات. ئەوەش یەکەمینە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. لە هەردوو سەردەمی یەکەمدا لە بەرهەمهێنانی فیکری و کاڵاشدا داهێنانێک جێگای باسە. بە بەراورد لەگەڵ سیستەمەکانی دیکەی چەوساندنەوەدا باڵابوونێکی بەرچاوی سەرمایەداری لە بواری پێکهاتە فیکرییەکان و بەرهەمهێنانی کاڵا لەئارادایە. لەهەمان ئاستدا باڵابوونی دەسەڵات و زاڵبوونی خۆی بەسەر کۆمەڵگاشدا چەند قات کردووە. دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم مانای سەرکەوتنی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە. تەنیا ئەو کاتە زۆرترین قازانج فەراهەم دەبێت کە ئیندوستریالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە بەسەر کۆمەڵگادا زاڵبوون.

لە سەردەمی سەرمایەی فینانسدا چیتر پێویستی بە داهێنانی فیکری و ئەخلاقی بەرهەمهێنان نەماوە. باڵادەستی پارە (دۆلار) یاخود بە خوداوەندکردنی (دەوڵەت ـ نەتەوە خوداوەندی سەرمایەداری پیشەسازییە، پارەش خوداوەندی سەرمایەداری فینانسە) تایبەت بە سەرمایەداری فینانسە. لەسەردەمی سەرمایەی فینانسدا پارە تەنیا ئامرازی خێراکردنی ئاڵوگۆڕ، کەڵەکەکردن و بەهەمهێنان نییە، بەڵکو ئەو ئامرازە یاخود سۆبژەیە کە حوکم بەسەر هەموو شتێکی پەیوەست بە کۆمەڵگا (دەوڵەت ـ نەتەوەیشی لەناودا) دەکات. ئاشکراکردنی چۆنیەتی بەدەستهێنانی ئەو تایبەتمەندێتیە پێویستی بە شیکارکردنێکی بەرفراوانی مێژووی شارستانی هەیە. بەڵام ئەگەر بەکورتی خوازیارین لێی تێبگەین، ئەوا دەشێت وەک زۆرترین قاڵبوونەوەی دیاردەی بازاڕ و دەسەڵات پێناسە بکرێت. وەک پێویستیەکی پێناسەکە گوزارشت لە باڵابوونێک دەکات بتوانێت بازاڕی ئابووری دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوەش بەخۆیەوە گرێبدات. ئەوەی دەمێنێتەوە یاریکردنە بە ئامرازەکانی پارە و دیاردەکانی بۆرسە، پارەگۆڕینەوە و سووش دەرفەتی پێویست

پێشکەش دەکەن. خاوەن پارەکان (سەرمایەداران) بەبێ ئەوەی پەنا ببەنە بەر فیکری نوێی داهێنەرانە و ڕێبازەکانی بەرهەمهێنان، لە ڕێگای ئەو ئامرازانـەوە قازانجـەکانی ئەوەنـدە گەورە دەکات کە ناشێت لەگەڵ قازانجەکانی هەردوو سەردەمی یەکەمدا بەراورد بکرێت.

ئەو واقیعـەی بەدەستهێنانی زۆرتـرین قـازانج هاوواتـای هەرەسـهێنانی کۆمەڵگایـە. بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگا لەمیانەی پێوانەی سیاسی و ئەخلاقی زۆر توندەوە پـەرەی بـە بوونی خۆیداوە و بەردەوام بووە. هەڵبەتە بەر لەمێژووی شارستانی مرۆڤایەتی ئاشـنای مەسەلەی قازانج نەبوو. بەرهەمهێنان و فیکر هـەم دەرفـەت بـە دیـاردەی قـازانج نـادەن، هـەمیش کاتێـک زیـاد بێـت لـەڕێگای "ئـابووری دیـاری" یـەوە بڵاودەکرێتـەوە. قـازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە بە گـەورەترین گونـاح دادەنێت. بـەدرێژایی مێـژوو کاتێـک لـەناو بونیـادە مارژینالـەکانی کۆمـەڵگا و ڕێـڕەوە نهێنیـەکان سـەرمایە دەرفـەتی زۆربـوون دەدۆزێتەوە، ئەوا چانسێکی زۆر سنووورداری ژیانی پێدەدرێت، بەردەوام دەستی بەسـەردا دەگیرێـت. بەتایبـەتی ئایینـەکان سیسـتەمی سـووخۆرییان بـە گـەورەترین گونـاح لەقەڵەمداوە، تەنانەت لە ئاست شەریک دۆزینەوە بۆ خودایان لەقەڵەمداوە و قەدەغەیان کردووە. بێگومان چونکە لە کەڵەکەکردنی سەرمایە دەچێت. سەرەکیترین هۆکاری شاراوەی ژێـر ئـەو هەڵوێستە دەستنیشانکردنی پێشوەختی پەیوەنـدی کەڵەکـەکردنی سـەرمایەیە لەگـەڵ ئـانتی ـ کۆمـەڵگایی و داڕووخـانی کۆمـەڵگاوە. ئـەو هەڵوێستانەی خاوەنـەکانی دەسـەڵاتی کۆمـەڵگای شارسـتان و ئاراسـتەکارانی ئـابووری سـەبارەت بـە قـازانج پیشانیدەدەن لەپێناو بەردەوامبوون و دانەڕووخانی ئەو پێکهاتە کۆمەڵایەتیەیە کە لـەژێر حوکمڕانی و چەپۆکیان دان. ئەو هێزانە دەرک بەو مەترسییە دەکەن کە قازانج و سەرمایە ڕێگای لەپێش دەکەنەوە.

لەهەردوو سەردەمی یەکەمی سـەرمایەداریدا دەرنەکەوتنەپێشی سیسـتەمی فینـانس و نەبینینی ڕۆڵی سەرەکی و نـەبوونی خولیایـەکی بـەمجۆرە گرێـدراوی بـەهێزی کاریگـەری هەڵوێستی نەریتییـە. سـەرمایەداری کـە لەناوەڕۆکـدا سیسـتمێکی ئافرانـدنی قەیرانـە، هەزاران ساڵ وەک جانەوەرێک زنجیر کرابوو، سوودی لە تەنگژە قورسەکەی دەسـەڵات و کڵێسای ئەورووپای خۆرئاوا بینی و قەفەسەکەی خۆی شکاندووە و وەک خوداوەندێتیـەکی نوێ حـوکمڕانی کۆمـەڵگای کـردووە. پێویسـتە زۆر بـە باشـی بزانرێـت کـە سـەرمایەداری سیستەمێکی کۆمەڵایەتی ئاسایی نییە و نابێت. بانگەوازی بۆ سەرجەم ڕەوتە فەلسـەفی و زانستە کۆمەڵایەتییەکان (بە ڕێژەیەک سۆسیالیزمی زانستیشی لەناودا) کردووە بۆ ئەوەی ڕازییان بکات کە سیسـتەمێکی ڕەوایـە و بـەمجۆرە وەک فریاگوزارێـک پشـتگیری لێبکـەن. بەتایبەتیش ئابووری ـ سیاسی پەرتووکە پیرۆزەکەی ڕەواکردنی سەرمایەدارییە. پێویستە بەمجۆرە شرۆڤە بکرێت. سیستەمێکی زۆرداری و چەوسانەوە کە لـەمێژووی مرۆڤایـەتی و ڕاستینەی کۆمەڵایەتیدا بەمجۆرە دەرکی پێکراوە، لەگەڵ دەسـتپێکردنی سـەردەمی فینـانس بەتـەواوی لەژێر کـۆنترۆڵی دەردەکـەوێت، هەرشـتێکی پەیوەست بەکۆمـەڵگا و ژینگەکـەی

دەخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە. بەمجۆرە پێناسەکردنی دژە شۆڕشە گەورەکەی ١٩٧٠کان گرنگی و بایەخێکی ژیانی هەیە.

لە یادەوەرییە تازەکەمانەوە ئاگادارین کە دژە شۆڕشی ١٩٧٠کان دژی شۆڕشی کلتووری ئانتی ـ مۆدێرنیست پێشخراوە کە لە ساڵی ١٩٦٨ گەیشتە لوتکە. ناشێت لە ١٩٧٠کان هەنگاونانی سەرمایەی فینانس بۆ سەردەمی باڵادەستی بە دەمامکی وەرچەرخانی ئابووری بێگەرد روونبکرێتەوە. باڵادەستی سەرمایەی فینانس لەسەر دوو جەنگی جیهانی، شەڕەکانی سەدەی بیستەم کە خوێناویترین سەدەی مێژووە، لە هەمووشی گرنگتر لەسەر دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەرزبۆتەوە کە میراسی شەڕەکانی کۆلۆنیالیزم و باڵادەستی پێنج سەد ساڵە و ئەو شەڕە سەرتاسەرییە کە بەرامبەر کۆمەڵگا بەڕێوە دەچێت. پشت بە سیستەمێکی کائیوس یاخود رژێمێک دەبەستێت کە تەنیا گرنگی بە بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج دەدات، ئابووری لەناوەڕۆک و رەوشی ئابووری دوورخستۆتەوە، لەلایەک چلێسی و چاوبرسێتی بەکاربردن قووڵدەکاتەوە، لەلایەکی دیکەشەوە هەرەسئاسا سوپاکانی بێکاری و برسێتی گەورە دەکات. لەرێگای شەڕێکەوە کە لەمیانەی هەژموونگەرایی راگەیاندن بیست و چوار کاتژمێر زهن و ئەخلاق بۆردومان دەکات؛ هەر چ میراسێکی ئەو پێنج سەد ساڵەی مرۆڤایەتی و دەسکەوتەکانی شۆڕشەکان (بەتایبەتیش شۆڕشە مەزنەکانی فەرەنسا و روسیا) هەیە شەڕی لەگەڵدا دەکات. وەک دەزانین رەوتی نیوو ـ کۆنفۆرمیزم[1]ی رۆناڵد ریگان، مارگرێت تاتشەر و میخائیل گۆرباتشۆف گوزارشت لە تەسفیەکردنی میراسی شۆڕشە دووسەد ساڵییە مەزنەکەی فەرەنسا و رووسیا دەکەن. رێکەوت نییە کە بوونی سەرمایەی فینانس بەهێزی هەژموونگەرایی هاوکاتی نیوو ـ کۆنفۆرمیزمە.

تورکیای ١٩٧٠کان تورکیایەکە هێدی هێدی دەکەوێتە ژێرکاریگەری ئەو شۆڕش و دژە شۆڕشانەی لەئاستی دونیادا روودەدەن. هەربۆیەش لە ئاکامی شۆڕشی لاوانی ١٩٦٨و دژە شۆڕشە ئابووری و سەربازیەکانی ١٩٨٠ (بڕیارە ئابوورییەکانی ٢٤/١و ئۆپەراسیۆنە سەربازیەکانی ١٢ی ئەیلول)، لە تەڤلیبوون بۆ ئەو دونیایە رزگاری نەبوو کە لەرێگای شورا و دیوارە ئەستوورەکانەوە هەوڵی پاراستنی خۆیدەدا. تەنگژەی سیستەمی سەرمایەداری جیهانی لە تورکیا بەشێوەی تەنگژەی فاشیزمی تورکی سپی رەنگیدایەوە. تەنگژەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری مانای تەنگژەی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک بوو.

---

[1] کۆنسەرڤاتیزم: سیاسەتی محافەزەکاری یان رەوتی محافەزەکاری؛زاراوەیەکە بۆ ئەو بیرمەندە سیاسیانە بەکاردەهێنرێت کە پەیڕەوکردنی دابونەریت بە بنەما دەگرن. بۆ یەکەمجار لە کۆتاییەکانی سەدەی هەژدەهەم وەک پەرچەکردارێک دژی سەردەمی رۆشنگەری لە فەرەنسا سەریهەڵدا. رەوتێکە ئاماژە بەو فەلسەفە سیاسیو کۆمەڵایەتیانە دەکات کە نەریت بە بنەما دەگرن. لایەنگری دۆخی ئاواکراونو نەفرەت لە گۆڕانکاری خێراو داهێنان دەکەن.لەجیاتی ئەقڵ بانگەشە بۆ باوەڕی، نەریت لەجیاتی لێکەڕینی ئازاد، ریزبەندی پلەداری لەجیاتی یەکسانیو بەها دەستە جەمعیەکان بە بنەما دەگرن.

کودەتا سەربازیەکانی ١٢ی ئاداری ١٩٧١و ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ پیشانی دەدات کە ئەو بزووتنەوە شۆڕشگێڕیانەی فاشیستە سڤیلەکان نەیانتوانیوە سەرکوتی بکەن تەنیا لەڕێگای کودەتای سەربازیەوە هەوڵی بەربەستکردنیان دراوە. ئەو قەڵا پتەوەی سیستەم تەنیا لەڕێگای کودەتا سەربازیەکانەوە دەپارێزرێت کە ئەویش بەردەوام لەڕێگای بزاوتە فاشیستە مەدەنیەکانی دژە شۆڕشەوە بەهێزدەکرێن. سیستەمی پیلانگێڕی فاشیستی تورک لەساڵی ١٩٢٥ەوە کە لە بەرامبەر پێکهاتە کلتووریی و بزاڤە دیموکراتیەکانی دژ بە مۆدێرنیتەی فاشیست، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەرامبەر بە ناسنامەی کورد لەشەڕدا بوو، چەندە ئاشکرا و ریسواتر دەبوو، هارتریش دەبوو. خاوەنی بەتواناترین هێزەکانی ئۆپەراسیۆنی گلادیۆی ناتۆ بوو. سەرجەم بونیادە سیاسیەکانی خستبووە چنگی خۆیەوە. سەرکێشیەکی زۆر بچووک و سنوورداریش لەڕێگای ناوەندەکانی فاشیزمی سڤیل سەرکوت دەکرێت، کاتێک ئەو هێزانەش کورت بێنن ئەوا تەواوی سوپا دەخرایە جوڵەوە. لەبەر ئەوەی وەک سیستەمێکی بەرایی زایۆنیست رۆڵی دەبینی لەلایەن هێزەکانی هەژموونگەرایی جیهانگیریەوە پشتگیری دەکران. نموونەیەکی دیکە نابینرێت کە بەمجۆرە گەلی خۆی کۆنترۆڵ کردبێت. لەو سۆنگەیەوە؛ تەنگژەی مۆدێرنیتەی تورکی سپی لە نزیکەوە سیستەمی جیهانگیری پەیوەندیدار دەکرد. لەڕێگای کودەتای فاشیزمی ١٢ی ئەیلولەوە هەوڵی رزگارکردنی داوە تا لەو تەنگژە دەربکەوێت. لە بواری ئابووریدا کرانەوە بەڕووی دەرەوە و یەکبوون لەگەڵ سیستەمی فینانسی جیهانگیری، لە بواری ئایدیۆلۆژیشدا لە پاڵ میللیگەرایی عەلمانی رووکردن لە میللیگەرایی تورک ـ ئیسلام و بەهێزکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەلمانی لەڕێگای دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک ـ ئیسلام بوو بە سەرەکیترین سیاسەتەکانی رزگاربوون و هەنگاونانیان. کودەتای ١٢ی ئەیلول بەرفراوانترین کردە و چالاکی گلادیۆی ناتۆیە. ئەرکی سەرکوتکردنی هەمیشەیی چالاکییە شۆڕشگێڕیی ـ دیموکراسیخوازەکانی تەواوی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بوو. بەیەکەوە لەگەڵ سەرجەم ناوەندە فاشیستە سڤیلەکان و فاکتەرە نیمچە ـ ملیتارەکانی سیستەم تا رۆژی ئەمڕۆمان هەوڵی جێبەجێکردنی ئەو رۆڵەیان دەدەن. سەرجەم پارتە سیاسیەکان بە دەسەڵات و ئۆپۆزسیۆنەوە هەریەکەیان وەک ددانێکی هەمان چەرخ گرنگترین رۆڵ دەبینن.

## ٢ ـ تەنگژەی سۆسیالیزمی بونیادنراو و هەنگاوی شۆڕشگێڕانە

ئەو تەنگژەی سیستەم لەبواری کلتوورییەوە تووشی هاتبوو نەدەبوو لەبواری ئایدیۆلۆژیشدا رەنگنەداتەوە. شۆڕشی ١٩٦٨ لەبنەڕەتدا وەک شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی لەبواری کلتووری مەعنەوی تەقیەوە. بەرامبەر بە کلتووری مۆدێرن و سەرجەم دەرهاوێشتە لیبراڵ، راستڕەو و چەپڕەوەکانیەوە سەریهەڵدابوو. لەو لایەنەوە شۆڕشێکی گرنگ بوو. شۆڕشێکی ئایدیۆلۆژی بوو کە بەلایەنی کەم هێندەی شۆڕشە سیاسیەکانی فەڕەنسا و رووسیا رۆڵی بینی. لەو کاتەوە کە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی مۆدێرنیتە

جێگیر کراوە یەکەمجار بوو دووچاری شکست بێت. چەندین فاکتەری کۆمەڵایەتی، کلتووری، ڕەگەزی، ئەتنیکی، ئایینی و خۆجێیی کە سەدان ساڵ بوو لەژێر ناوی کۆمەڵگای هۆمۆژەنەوە بەندکرابوو، دووچاری ئاسیمیلە و کۆمەڵکوژی هاتبوو ئیتر دەستی بە شەڕ و تێکۆشانی ناسنامە کرد. هەروەها پێشەنگایەتیکردنی لاوان بۆ ئەو تێکۆشانە مانایەکی تایبەتی خۆی هەبوو. چونکە لاوان ئەو توێژە بوون کە کەمترین کاریگەری مۆدێرنیتەیان لەسەر بوو. شۆڕشی ئایدیۆلۆژی تەنیا دژی لیبرالیزمی سەرمایەداری بەڕێوەنەدەچوو، بەڵکو هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوەی لیبراڵ پردەکانی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیستی بونیادنراویش بەلاوە نرابوو. بۆ یەکەمین جار بوو ڕووبەڕووبوونەوەی ئایدیۆلۆژیانەی ئیندوستریالیزم لەمیانەی باسی تیۆری بەهێزەوە پیشاندەدرا. بەلانی کەم هێندەی تیۆریەکانی چینایەتی فێمێنیزمیش بە بەڵگەی تیۆری گرنگ گەیشتبوو. ناسنامە کلتوورییە خۆجێییەکان سەلماندوویان کە هێندەی ناسنامە مۆدێرنەکان بەهادار و دەست لێبەرنەدراون. ئیتر ئاشکرا ببوو کە تیۆری نەتەوەپەرستی مۆدێرن جگە لە ئامراز و سەلماندنی مەشروعیەتی ئەتنیکی زاڵ و دەسەڵاتدار هیچی تر نییە. ئاشکرا دەبوو کە وەک باسدەکرێت بەرچاوترین ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕی ئەو قۆناغە هزر و پراکتیکی ڕزگاری نیشتیمانی مۆدێرن ئانتی ـ سەرمایەدار و ئازادیخواز نییە. هەروەها گفتوگۆیەکی گەرمیش لەو بارەیەوە لە ئارادابوو کە سۆسیالیزمی بونیادنراو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز نەکردووە، بەڵکو بووە بە سیستەمێک کە بەهێزی دەکات. دیموکراسیخوازی سۆسیال دیموکراتەکانیش لەمێژبوو ببوو بەو پەردەیەی عەیبە و لەنگیەکانی سەرمایەی دەشاردەوە.

تەنگژەی ئایدیۆلۆژی سیستەم لە تورکیاش ڕەنگدانەوەیەکی زۆر بەهێزی هەبوو. تەنگژەی بونیادی فاشیزمی تورکی سپی لەبواری ئایدیۆلۆژیدا ڕەنگیدابوویەوە، لەژێر گورزەکانی ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕیەوە کەوتبووە قۆناغی ڕیسوابوون و گۆشەگیرییەوە. جیلوەی مۆدێرنیستی میللیگەرایی عەلمانییش سەرکەوتوو نەبوو. هێندەی ئایدیۆلۆژییە ئایینیە باوەکان ئایدیۆلۆژیا شۆڕشگێڕییە مۆدێرنەکانیش دەنگدانەوەیەکی مەزنیان هەبوو. بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی١٩٧٠کان لەبنەڕەتدا بزووتنەوەی ئایدیۆلۆژی بوون. تایبەتمەندێتییە سیاسیەکانی پەرەی پێنەدرابوو. گرنگیەکەیان لەوەدا بوو کە سیستەمیان ڕیسوا دەکرد. یەکەمین جار بوو ئاماژە بە ڕاستینە کۆمەڵایەتیەکان دەکرا. ئەو ڕاستیەی مەزندەی لە گۆڕنانیان کرابوو، لەڕێگای تێکۆشانی ئایدیۆلۆژییەوە یەک بەیەک زیندوو دەبوونەوە. ئایدیۆلۆژیا سۆسیالیستیەکان بەدوای ئایدیۆلۆژیا ئیسلامگەراکانەوە هاتن. دوای هەربووکیشیان هێدی هێدی فۆرمگەلێکی ئایدیۆلۆژی دەرکەوتن کە ئاماژە بە دیاردەی کورد دەکەن. وەک پەرچەکردار میللیگەرایی نەژادپەرست بەرزکرایەوە. تورکیای ١٩٧٠کان شاهێدی گەورەترین شەڕی ئایدیۆلۆژی مێژووی خۆی کردووە. لەکاتێکدا میللیگەرا نەژادپەرستەکان زیاتر هەڵپەی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی زۆر بەهێزی لەجۆری ئەڵمانیای هیتلەر دەکەن، ئایدیۆلۆژیا ئیسلامگەراکانیش خوازیاربوون سەرلەنوێ ئەو ڕۆڵەی جاران

ببیننەوە کە لە بەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەلمانی لەدەستیان دابوو و بەوجۆرەش جێگای خۆیان لەناو دەوڵەتدا بکەنەوە. ئایدیۆلۆژیا چەپڕەوەکان لەناو تەنگژە قووڵەکانی دەستەواژەوە خەریکی کۆمەڵگاگەرایی ئەبستراکت (دەرهەست) بوون. کۆمەڵگابوون و دەوڵەت – نەتەوەگەراییان تێکەڵ بەیەک کردبوو. ئەزموونە دیموکراسیەکان زۆر سنووردار بوو کە دەبووایە ریشەدارترین بانگەشەیان هەبێت. لەجیاتی چالاکی دیموکراسیخوازی گەل، لەچالاکیەکانی گروپی بەرتەسکدا بنبەست ببوون. بەڵام هەموویان بەگشتی رۆڵی روونکردنەوەی حەقیقەتە کۆمەڵایەتیەکانیان دەبینی.

ئەو حەقیقەتانەی تەنگژەی بونیادە مۆدێرنەکان (سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم)ی تورکیا و دونیای ١٩٧٠کان و تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی هێنایە ئاراوە رۆڵێکی گرنگیان لە پێکهاتن و دەرکەوتنی PKK دا هەیە. هەرچەندە هەڵگری چەندین هەڵە و کەموکوڕی بن، بەڵام رۆڵێکی دیاریکەریان لە پێکهاتنی تێکۆشانی شەهیداندا هەبووە.

## ٣ ـ PKK و ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوە

کێشەی سەرەکی لە پێکهاتنی PKK دا داخراوی و نادیاریەکەیەتی سەبارەت بە ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوە. بەتایبەتیش تێزەکانی ستالین سەبارەت بە بابەتی کێشەی نەتەوەیی لەو بارەیەوە بەکاریگەر بوون. ستالین کێشەی نەتەوەیی وەک کێشەی ئاواکردنی دەوڵەت تاوتوێ دەکات. ئەو هەڵوێستەشی کاریگەری کردۆتە سەر تەواوی سیستەمی سۆسیالیستی و بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی. ئەو مافەی لینینیش پەسەندی کرد و مافی چارەی خۆنووسینی لە ئاواکردنی دەوڵەتدا قەتیس کرد، بوو بە هۆکاری سەرەکی خزانی سەرجەم پارتە کۆمۆنیستی و سۆسیالیستیەکان بۆ ناو ئاڵۆزی ئایدیۆلۆژیەوە. ئەو مۆدێلەی PKK لەسەردەمی دەرکەوتنیدا بانگەشەی بۆ دەکرد و لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بەبنەمای دەگرت، مۆدێلی ئاواکردنی دەوڵەت بوو کە ستالین پێشیخستبوو و لینینیش پەسەندی کردبوو. ئەنجامگیربوونی زۆربەی زۆری بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی بە دەوڵەتی سەربەخۆ کە لەو قۆناغەدا (١٩٥٠ ـ١٩٧٠) بە لوتکە گەیشتبوو، بگرە ئەو مۆدێلەی دەکرد بە تاقانە. دەوڵەتی جیاواز ببوو بە پرەنسیپێکی پیرۆزی باوەڕهێنان بە سۆسیالیزم. سۆسیالیستبوون هاوتای لایەنگریکردنی گەلان و نەتەوە کۆڵۆنی و چەوساوەکان بوو بۆ مافی ئاواکردنی دەوڵەت. پێچەوانەی ئەمە دوورکەوتنەوە بوو لە سۆسیالیزم و سۆسیالیستی. لەراستیدا مافی چارەی خۆنووسینی گەلان پرەنسیپێک بوو بۆ یەکەمجار دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لەلایەن سەرۆکی ئەمریکا ویلسن پێشخرا و لەنزیکەوە گرێدراوی هەژموونگەرایی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. لینینیش بۆ ئەوەی لە دواوەی ویلسن نەمێنێتەوە و نەتەوە چەوساوە و گەلە ژێردەستەکان بە لای یەکێتی سۆڤێتدا رابکێشێت، هەمان پرەنسیپی

رادیکاڵتر کردووە و بۆ ئـاواکردنی دەوڵـەت بچـووکی کردۆتـەوە. پێشبڕکێیەکی بـەمجۆرە لەنێوان هەردوو سیستەم دەستی پێکردبوو. بەرچاوترین نموونەی ئەوەش هەوڵی هـەردوو هێـز بـوو بـۆ پشتگیریکردنی ئـەو بەرخودانـە نیشتیمانییە نوێیـەی لـە ئـەنادۆڵ دەسـتی پێکردبوو و دواتر ئەو هەڵوێستە لەلایەن هەردوو سیستەمەوە بە لوتکە گەیشت.

دامەزرێنەرانی سۆسیالیزمی زانستی کارل مارکس و فریدریک ئەنگلسیش لەو بـارەوە هەڵوێستێکی روون و ئاشکرایان نییە. بەڵام هیچ نارەزایی و رەخنەیەکیشیان سەبارەت بە دەوڵـەت ـ نەتـەوە نـەبوو کـە لـە فەلسـەفەی هیگـل وەک مـۆدێلی سـەرەکی دەوڵـەت تیۆریزەکراوە. ئەوانیش ناچاربوون مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتـەوە وەک شـێوەیەکی دەوڵـەتی نـوێی ئاسـایی مۆدێرنیتـە و سـەردەم ئـەرێ بکـەن. بـۆ نموونـە؛ لەیـەکێک لـە کێشـە نەتەوەییەکانی قۆناغی خۆیدا واتە لە کێشەی یەکێتی ئەڵمانیادا هەڵوێستیان بـە لایـەنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ناوەندی بەهێز بووە. بەتایبـەتیش لـە بەرامبـەر ئەنارشیستەکان بـەرگرییان لـەو چارەسـەرییە دەکـرد. لـەو بارەیـەوە مێـژوو سـەلماندوویەتی کـە ئەنارشیسـتەکان راسـت و مافـدار بـوون. بەتایبـەتیش بیـر و بۆچوونـەکانی بـاکۆنین و کرۆپۆتکین راست و مافدارن. ئـەوەی کۆتـایی بـە سۆسیالیزمی زانسـتی و جێبـەجێکردنی سۆسـیالیزمی بونیـادنراو هێنـا، بـە مانایـەکی تـر یـەکێک لـە هۆکـارە سـەرەکیەکانی هەڵوەشانەوەی لەناوەوە مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتـەوەی بـەهێزە کـە پشت بـە بیروکراسـی ناوەنـدی زێـدەڕۆ دەبەسـتێت. بەگشـتی دەوڵـەت بەسیفەتی دیکتاتۆریـەتی پرۆلیتاریـا، بەتایبەتیش شێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە کە ناوەندیترین جۆرە و تا دەمارە ریشـاڵەییەکانی کۆمەڵگا تەشەنەی کردووە، هۆکاری سەرەکی هەرەسهێنان و هەڵوەشانەوەیە لەناوەوەدا. هۆکارەکانی دیکە رۆڵێکی لاوەکی دەبینن. ئـەوەی دەسکەوت و بـەهاکانی مێژووی سـەد و پەنجا ساڵەی سۆسیالیزمی بونیادنراو ـ کە باجەکەی قوربانی و فیداکاریەکی مەزن بووە ـ ی رووبەرووی پووکانەوە کردەوە، بێبەشبوونی سۆسیالیزمی زانستی بوو لە تیۆریەکی تایبەتی خۆی سەبارەت بە بابەتەکانی دەوڵەت و دیموکراسی.

مـارکس و ئـەنگلس کاتێـک دەوڵـەت ـ نـەتـەوەی ئـەڵمانیایان شـکۆدار کـرد و وەک نموونەیـەک پێشکەشیان کـرد کـە لـە سـەرەتاکانی ١٨٧٠ بونیـادنرا، ئـەوا سـەرەکیترین هەڵەیان بەرامبەر بە سۆسیالیزمی زانستی کردووە کە بە دەست و هزری خۆیان کردیان بە نموونـەییترین یۆتۆپیـای مرۆڤایـەتی. ئەگـەر رەخنـەکانی ئەنارشیسـتەکانیان لـەبارەی خۆیانەوە رەچاو کردبووایە، بەتایبـەتیش رەخنـەکانی بـاکۆنین و کرۆپـۆتکین، مسـۆگەر چارەنووسی سۆسیالیزمی زانستی جیاواز و سەرکەوتوو دەبوو؛ بـەهاکانی ئـازادیخوازی، یەکسـانیخوازی و دیموکراسـیخوازی سۆسـیالیزم لەبەرامبـەر مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری دەبـوو بـە سیسـتەمێکی ئەڵتـەرناتیڤی سـەرکەوتوو و هەمیشـەیی. بەشێوەیەکی گشـتی و سەرتاسەری فاکتەرەکانی بونیادنانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی (ئابووری بازاڕی سۆسـیال، پیشەسـازی ژینگەدۆسـت و نەتـەوەی دیمـوکرات) بەرامبـەر فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتـەی سەرمایەداری (مەیلی زۆرترین قازانجی سەرمایە، دەوڵـەت ـ نەتـەوە و ئیندوسـتریالیزم)

پەرەسەندنێکی گەورەی بەخۆیەوە دەبینی. وەک ئاگادارین مارکس و ئەنگلس لەدوا قۆناغەکانی ژیانیاندا وەک بڵێی دەرکیان بەو کەموکوڕیە بنەڕەتیە کردووە، بەتایبەتیش زۆر شت لەکۆمەڵگای کۆمۆنەی سەرەتایی فێربوون، هەستیان بەوە کردووە کە سەردەمی سەرمایەداری ناچاری نییە و بایەخیان بە تاقیکردنەوەی شێوەکانی سۆسیالیزمی پشتبەستوو بە کۆمەڵگای کۆن داوە. مارکس خواستوویەتی شاکاری سەرمایە لەمیانەی شیکاری دەوڵەت تەواو بکات. وەک دەزانرێت تەمەنی بەشی ئەوەی نەکردووە. ئەنگلسیش لەرێگای بەرهەمە بەناوبانگەکەیەوە بنەچەی خێزان، دەوڵەت و موڵکایەتی تایبەت قووڵایی و رەهەندی دیرۆکی بە سۆسیالیزمی زانستی بەخشیبوو. لەجیاتی خۆیان ئەنجامدانی ریڤزیۆن (هەموارکردن) لەلایەن برنشتاینەوە، بێ چانسیەکی مەزن بوو سەبارەت بە تیۆری سۆسیالیزمی زانستیەوە. ئەوەی دواتر قووڵکرایەوە راستیەکان نەبوو چەوتیەکان بوو. بەتایبەتیش هەڵوێستە لیبراڵە بۆرژوازیەکانی برنشتاین سەبارەت دیموکراسی، لینین و ستالینیش دەرهەق بە کێشەکانی دەوڵەت و نەتەوە بووە بە گەورەترین هەڵە و لادانەکانی مێژووی سۆسیالیزمی زانستی. تەنیا لادان و چەوتی جێگای باس نییە، بەڵکو وەک سۆسیالیزمی بونیادنراو لە شوێنی راستییە سەرەکیەکان بونیادنراوە.

رەخنەکانی لینین دەرهەق بە برنشتاین لایەنی راستی هەبوو. رەخنەکانی لەو بارەیەوە راست بوو کە برنشتاین دیموکراسی سۆسیال (لەو قۆناغەدا پارتە سۆسیالیستیەکان بەمجۆرە ناودەبران)ی کردووە بە کلک و پاشکۆی لیبرالیزمی بۆرژوازی. هەڵبەتە پێشهاتەکانی دواتر ئەو بۆچوونەی لینینی سەلماند. ریفۆرمی برنشتاین لادانێکی راستڕەوانە بوو و یەکەمین گورزی بەهێند بوو کە بەر سۆسیالیزمی زانستی کەوت. بەڵام هەڵە و کەموکوڕیەکی زۆر گرنگی سۆسیالیزمی زانستی لەژێر کاریگەربوونی ئەو گورزە شاراوە بوو. ئەویش نەبوونی دیموکراسی کۆمەڵایەتی و جێگیرکردنی بونیادگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە بوو لە شوێنیدا. ئەو کەموکوڕی و هەڵە سەرەکییە بوو کە برنشتاینی کاریگەر کرد. برنشتاین خوازیار بوو لەرێگای دوورخستنەوەی دیموکراسی کۆمەڵایەتی لەتیۆری دەوڵەت و دیکتاتۆریەت و نەرمکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمان بە ئاراستەی دەوڵەتی سۆسیال، چەوتیەکەی سەبارەت بە بابەتی دیکتاتۆریەت بەلاوە بنێت و کەموکوڕی دیموکراسیش نەهێڵێت. هەردوو هەڵوێستیشی هەڵپەرستانە بوو. بەڵام رەخنە راستەکانی لینین لە راستی ئەلتەرناتیف بێبەش بوون. ئەو شتەی لینین لەجێگای دیموکراسی سۆسیالی برنشتاینی پاشکۆی چەپڕەو و دیموکراسی بۆرژوا پێشنیازی کرد دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و دەوڵەتی سۆسیالیستی بوو. لەو بارەیەوە لینین لە بنبەستبوونێکی مەزندایە و بە درێژایی ژیانیشی ئەو بنبەستبوونەی تێپەڕ نەکردووە. بابەتەکانی دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و دەوڵەتی سۆسیالیستی لینینی زۆر سەرقاڵ کردووە. لەو بارەیەوە هەوڵ و کۆششێکی زۆریداوە، بەڵام نەیتوانیوە بە رێگەچارەی راست بگات. دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا کە کارل مارکس بەهۆی کۆمۆنەی پاریس (١٨٧١)

چەند جارێک تەنیا وەک دەستەواژە ئاماژەی پێکردووە بابەتێک نییە لە بواری تیۆری لێکۆڵینەوەی لەبارەوە کرابێت. ئیلهامی لە بۆرژوازی وەرگرتووە و گوتویەتی "ئەگەر ئەوان دیکتاتۆریەتیان هەبێت، بۆچی پرۆلیتاریا دیکتاتۆریەتی نەبێت؟" بەمجۆرەش ئەنالۆژیەکی قەبەی ئەنجامداوە.

دوای سەرکەوتنی ئەزموونی سۆڤێت لە سەرەتای ١٩٢٠کان لینین سەرقاڵی تیۆری دەوڵەتی سۆسیالیستی بووە. وەک ئاگادارین تەمەنی بەشی ئەوەی نەکردووە. وەک دەزانرێت لەو قۆناغەدا کرۆپۆتکین بە تایبەتی پێشنیازی بۆ خودی لینین کردووە کە سۆڤێتەکان وەک مۆدێلێکی دیموکراتیک بە دامەزراوەیی و هەمیشەیی بکرێت. لینین گوێی بۆ ئەو پێشنیازە شل نەکردووە، بەتایبەتیش بەهۆی کەسایەتی ئەنارشیستی کرۆپۆتکینەوە گومانی لێکردووە و پشتگوێی خستووە. قۆناغی دواتریش دەزانرێت. سەمەرەکەی دەستی ستالین کە بە دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا ناودەبرێت سەرجەم مەیلە شۆڕشگێڕی، دیموکراسیخواز و سۆسیالیستیەکانی قووتداوە و هەرە دوایی خودی ستالینیش لەسەر بنەمای پیلانگێڕی خودی ئەو ئامێرە قووتدراوە. لینین لە یەکێک لە گوتەکانی دەڵێت؛ ڕێگای سۆسیالیزم بە بەرفراوانترین دیموکراسیدا تێپەڕدەبێت. بەڵام بەشێوازێکی کوێرانە ڕەفتار لەگەڵ ئەو گوتەیە کراوە و تیۆریەکەی پێشنەخراوە و پراکتیکەکەی ئەنجام نەدراوە. بە شێوەیەک باوەڕییان بەوە هێناوە کە پرۆلیتاریا بە بێ دیکتاتۆریەت و دەوڵەت ناژیت، تەنانەت لە پێناسەکردنی دەستەواژەی دیموکراسی پرۆلیتاریا وەک شێوەیەکی دەوڵەت و دیکتاتۆریەت دوودڵیان نەکردووە. واتە دیموکراسییان بە شێوەیەکی دەوڵەت و دیکتاتۆریەت لە قەڵەمداوە. هەڵە روون و مسۆگەرەکەی لێرەدایە. لە دیرۆکەوە ئاگادارین کە دیموکراسی نە دیکتاتۆریەت نە شێوەیەکی دەوڵەت هیچ یەکێکیان نییە. بە پێچەوانەوە شێوەیەکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگایە کە دژی یاخود ئەڵتەرناتیڤی دیکتاتۆریەت و دەوڵەتە. کۆمەڵگای دیموکراتیک ناوی سیستەمێکی بەڕێوەبەرایەتییە کە دیکتاتۆریەت یاخود دەوڵەت لە ئارادا نییە یان لەگەڵ کۆمەڵگا ڕێککەوتووە. ئەو شتگەلەی لە کارل مارکسەوە تا دەگاتە لینین سۆسیالیستە زانستیەکان ئاوایان نەکرد و دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و دەوڵەتی سۆسیالیستییان لەجێگای دانا، کۆمەڵگای دیموکراتیکە یاخود سیستەمی دیموکراسی کۆمەڵایەتییە کە هەمان واتا دەبەخشێت. ئەو هەڵە گەورەیەی (دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا و دەوڵەتی سۆسیالیستی) دەرفەتی بۆ ڕیڤزیۆنیزمی برنشتاین ڕەخساند کەموکوڕی کۆمەڵگای دیموکراتیک یاخود کەماسی سیستەمی دیموکراسی کۆمەڵایەتییە.

ئەو بیر و بۆچوونانەی لە بەرگەکانی دیکەی بەرگرینامەکەم سەبارەت بەو بابەتە هەوڵی شیکارکردنیمدا لێرەدا تەنیا بە پوختی دووبارەی دەکەمەوە. کۆمەڵگای دیموکراتیک شێوەیەکی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگایە کە دەوڵەت و دیکتاتۆریەت نییە یان پێویستە وەها نەبێت. سەرجەم نموونە مێژووییەکان (لەسەرووی هەمووشیانەوە دیموکراسی ئەسینا) سەلماندوویانە ئەگەر باسی دیموکراسی بکرێت ئەوا یان بە سیفەتی شێوەیەکی

بەڕێوەبەرایەتی بێدەوڵەت هاتۆتە ئاراوە، ئەگەر لەبواری دیرۆکیشەوە هەڵومەرجەکانی نەڕەخسابێت، لەسەر بنەمای رێککەوتنێکی بە پرەنسیپانە لەگەڵ دەوڵەت پشکداری بەڕێوەبەرایەتی کردووە و بەمجۆرە هاتۆتەئاراوە. دیکتاتۆریەت و دەوڵەتی سۆسیالیستی وەک دەستەواژەش هەڵەیە. بەشێوەیەکی ئۆنتۆلۆژی دیکتاتۆریەت تەنیا دیاردەیەکی تایبەت بەو چینە نوخبانەیە کە قۆرخکاری هێز و چەوسانەوەیان بەدەستەوەیە. دیاردەیەکە بە خوێن، ئێش و چەوسانەوە شێلراوە و کراوە بەدەستەواژە. ناشێت رەنجدەران، زەحمەتکێشان و چەوساوەکان لەبواری هزری بەشێوەیەکی تیۆری، لەبواری کرداریش وەک ئامرازێک پەیوەندییان بە ئامرازێکی بەمجۆرەوە هەبێت. ئەگەر بڵێن؛ دەبێت، ئەوا ئەمڕۆ لە قۆناغی پێشووتر (سۆسیالیزمی بونیادنراو) ئاسانتر و بەرچاوترە کە ئەنجامەکانی ئەزموونی سۆڤێت و هاوشێوەکانی وەک بەڵگە پیشانبدرێت و چەوتیەکان بخرێتەڕوو، دەشێت هەمان شت سەبارەت بە دەوڵەتی سۆسیالیستیش بگوترێت. ئەگەر سەرکەوتنی سیاسیش بەدەست بێنن، ئەوا دوای ئەو سەرکەوتنە رەنجدەران، زەحمەتکێشان و چەوساوەکان نابنە خاوەن دەوڵەتێکی کۆمەڵایەتی (سۆسیال)؛ بەپێچەوانەوە دەبنە خاوەنی دیموکراسی کۆمەڵایەتی یاخود کۆمەڵگای دیموکراتی کە خۆیان ئاوایدەکەن. ناو و ناوەڕۆکەکەی هەرچیەک بێت، ئەگەر بە تەواوی بێکەڵک نەبێت و رۆڵی گرنگی پەیوەست بە بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگاشەوە هەبێت، بەڵام لەدوا شیکاردا دەوڵەت سیستەمێکی قۆرخکاری چەوسانەوەیە کە لەکۆنەوە لەسەر کۆمەڵگا ئاواکراوە. لە بواری ئۆنتۆلۆژیەوە بۆ بوونەکەی قەرزداری ئەو واقیعە و ناوە کۆنەکەیەتی. هەربۆیەش ناشێت "دەوڵەتی سۆسیالیستی" هێلکەباران بکرێت. وەک چۆن بەهۆی خستنەوەی گوێرەکە مانگا هێلکە باران ناکرێت، ئەوا دەوڵەتیش بێچووە دەوڵەتی شێوەجیاواز دەخاتەوە. هەمان دەوڵەت ناتوانێت هێلکە بخاتەوە و بێچووی سۆسیالیستی ببێت. چونکە باڵندەکان هێلکە دەکەن، لەسەر هێلکەکانیان کڕدەکەون و لە رێگای گەرمییەوە جووجەڵە هەڵدێنن. لەوانەیە شوبهاندنەکە قەبە بێت، بەڵام پێویستە هەرگیز گومان لە راستیەکەی نەکرێت.

بە بێ ئاماژەکردن بەو خاڵەی دەرهەق بە ئەنارشیستەکان تێپەڕ نابم. رەخنەی ئەنارشیستەکان سەبارەت بە جێبەجێکردنی زێدەڕۆییانەی ناوەندگەرایی دەوڵەت ــ نەتەوە و دیکتاتۆریەت راستە. لەو لایەنەوە مێژوو رەخنەکانیانی مافدار بینیوە. بەڵام ئەوانیش کە ئازادی تاکەکەسی و هەڵوێستی گەڕانەوەیان بۆ ئەو کۆمەڵگایانەی سەرلەنوێ بۆ جڤاتە سەرەتاییەکان گەڕاوەتەوە وەک ئەلتەرناتیف پێشکەش کردووە، هەروەک لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا روویداوە، لە دواشیکاردا ئەوانیش جگە لە پاشکۆ چەپرەوەکانی لیبرالیزمی بۆرژوازی بەولاوە رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. کاتێک رەخنەی بەجێیان لەگەڵ پراکتیکی راست یاخود لەگەڵ تیۆری و پراکتیکێکی راستی کۆمەڵگای دیموکراتیک تەواو نەکرد، ئەوا لە مایەپووچبوون و بوون بە مەزهەب یاخود ڤێرسیۆنێکی جیاوازی لیبرالیزم رزگاریان نابێت. لێرەدا ئەوەی سەبارەت بە سەرجەمی ئەو بابەتانە

دیاریکەرە داخوازییە نیازپاکەکانی یەکسانی و ئازادی نییە، هەڵوێستی تیۆری و جێبەجێکردنی کردارییانەی ڕاستە دەرهەق بە ڕاستینەی کۆمەڵگای مێژوویی.

ئەو ئاڵۆزییەی PKK لە قۆناغی پێکهاتنی ئایدیۆلۆژیدا بەخۆیەوە بینی، سەرچاوەی خۆی لەو کەموکوڕی و هەڵانەوە دەگرت کە بە گشتی سۆسیالیزمی زانستی بەدەستیەوە دەناڵاند و هەوڵی ئاماژەپێکردنیمان دا. ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوە و ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگای دیموکراتیک بەشێوەیەکی تێکەڵ و ئاوێتەگەرایی لە ئارادابوون. سەرجەم ئەو پارتە کۆمۆنیستی و کارکەرییانەی بە نموونە وەرگیرابوون پشکی خۆیان لەو هەڵە و کەموکورتیانە وەرگرتبوو کە سۆسیالیزمی بونیادنراو دووچاری هاتبوو. لەو قۆناغەی ڕزگاریدا ئەو بەهرە و هێزەمان نەبوو جیاوازی لەنێوان ئایدیۆلۆژیای دەوڵەتی و ئایدیۆلۆژیای کۆمەڵگای دیموکراتیک بکەین. وەک چۆن نموونەیەکی ڕاست و تەندروست لەئارادا نەبوو کە وەک مۆدێل بە بنەما بگیرێت، خاوەنی توانستێکی زانیاری و توانایەکی تیۆری ئەوتۆش نەبووین کە بەشێوەیەکی ڕاست ئەزموونی مێژوویی شرۆڤە بکەین. پێویستییە کردارییەکانی تیۆری ئاوێتەگەرایی ڕزگاری نیشتیمانی پشتبەستوو بە دەستەواژەی "کوردستان کۆلۆنییە" دیاربوو. بە ئامانجکردنی دەوڵەتێکی نەتەوەیی بوو لەڕێگای شەڕی گەلی درێژخایەنەوە. شەڕەکانی ڕزگاری نیشتیمانی کە بەشێوەیەکی ڕۆژانە لە ئەفریقیا دووبارە دەبوویەوە و دواتریش دەوڵەتە سەربەخۆکان ڕادەگەیەنران، بەبێ ئەوەی پێویستی بەهیچ تیۆری و پراکتیکێکی تر هەبێت ئەو ڕێگایەی دیاری دەکرد کە لە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد بگیرێتەبەر. بێ ئەوەی هێندە بە ناخی تیۆری ڕزگاریدا شۆڕبینەوە، لێتوێژینەوە سەبارەت بە پراکتیکەکانی ڕزگاری نیشتیمانی بەس بوو. هەروەها ئەو مۆڵەتەی لە مامۆستا مەزنەکان (لینین، ستالین) وەرمانگرتبوو، تەواوی ئەو خۆراکە تیۆری و قالبە پراکتیکیانەی پێشکەش دەکرد کە پێویست بوون. ئەوەی دەمایەوە، بەخێرایی تەواوکردنی گروپی ئەو چوارچێوە ئایدیۆلۆژییە و کردنی بوو بە موڵکی جەماوەر. هەر ئەوەش ئەنجامدرا.

ئەگەر ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٦ وەک قۆناغی گروپی بەرتەسک تاوتوێ بکەین، ئەوا ماوەی ١٩٧٦ ـ ١٩٧٨ قۆناغی بە جەماوەریبوون بوو. هەردوو قۆناغیش بە سەرکەوتوویی تێپەڕ ببوو. کێشەکە ئەوەبوو کە دواتر چی دەکەین و چۆن دەبێت. هەنگاوی دوای گروپی لاوان و پەلهاوێشتنی لەناو گەلدا گرێدراوی وەڵامدانەوەی پرسیاری پارتیبوون یاخود ڕێکخراوی چالاکی سەربازی بوو. لەڕێگای پارتیبوونەوە هەوڵماندا وەڵامی ئەو پرسیارە تەکنیکیە بدەینەوە. هەرچۆنێک بێت شۆڕشی ڤێتنام لەو لایەنەوە نموونەیەکی سەرکەوتوو و پرشنگداری پێشکەش دەکردین. چالاکیش ئەنجامدەدران. ڕێکخراوی لەجۆری سوپا و بەرەی چەپەکانی تورکیاش وەک ئەزموونێک لەئارادا بوون. بە جۆرێک لە جۆرەکان دەرفەت هەبوو لەمیانەی یەکێتی ڕزگاری نیشتیمانییەوە چالاکیەکان بەرفراوان بکرێن. ئەوانە پێشهاتگەلێکی گونجاوبوون لەگەڵ ڕۆحی سەردەم. ئەزموونێکی سەرکەوتوومان بەگوێرەی دۆخی بەرجەستەی کوردستان پێشخست. ئیتر

گویمان لە دەنگی پێی کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلوولی دژە شۆڕش دەبوو. کۆمەڵکوژییەکانی مەرعەش، چۆرم و باخچەلی ئەفلەر و تیرۆرکردنی ژمارەیەکی زۆر لە لاوان و شۆڕشگێڕان پیشانیدەدان ئەگەر بەرەو دەرەوەی وڵات نەڕۆین دەرفەتی رزگاربوونمان نییە و لەناو دەچین. ئەزموونی ١٢ی ئاداری ١٩٧١ بەپێی پێویست وانەبەخش بوو. ئەوەی نیشاندابووین لە حاڵەتێکدا کادیرە پێشەنگەکان لەناو ببرێن رێکخستنەکان زۆر بە ئاسانی ناتوانن پشتی خۆیان راست بکەنەوە. لە ٢ی تەممووزی ١٩٧٩ لەرێگای سروجەوە هەنگاونانمان بەرەو خۆرهەڵاتی ناوین بەگوێرەی رۆحی تێکۆشانی درێژخایەنیش بوو. لەپێناو شەڕی گەلی درێژخایەن و پشتگیری دیبلۆماسی هەنگاوێک لە کات و شوێنی گونجاوی خۆیدا هاوێشترا بوو. لەکاتێکدا لە ئاکامی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠دا گروپە چەپڕەوەکان گورزی ستراتیژییان بەرکەوت، PKK ش هەنگاوی بۆ قۆناغێکی نوێ و هیوابەخش دەهاوێشت. ئاشکرایە کە ئەوانە هەنگاوگەلێکی تەکتیکی سەرکەوتوو بوون.

کاتێک سەرلەنوێ ماوەی ١٩٧٠ ـ ١٩٨٠ هەڵسەنگێنین ئەوا بە دڵنیاییەوە دەبینین کە بۆ یەکەمین جارە کێشەی کورد لە بابەتی گۆڤار، رۆژنامە و کۆمەڵە دەردەکەوێت و دەبێتە خاوەنی پارتێکی هاوچەرخ و پێشەنگی خاوەن کارەکتەری چینایەتی و بونیادێکی کردەیی کە بەیەکەوە پەرە دەسەنن. ئەوەی لێرەدا گرنگ بوو توانای بەهێزی رێکخستن و کرداری پارت نەبوو. چونکە پارتی دیکەی کوردی خاوەن هەمان ماهیەت جێگای باس بوو. لەمێژ بوو پارتەکانی لە جۆری PDK و PSKT لەئارادابوون. نوژەنبوون لەوەدابوو کە بۆ یەکەمین جار بوو رێکخستن و چالاکی لەناو یەکتردا ئەنجامدەدران. سەبارەت بە واقیعی جوگرافیای کوردستان و کۆمەڵگای کوردەواری ئەوە یاخیبونێکی نوێ بوو، بەتایبەتیش مانای سەرهەڵدان و شەڕێک بوو کە خاوەن رێکخستن و پارتێکی پێشەنگ بوو. بەلانی کەم لە بواری تیۆریدا کارەکتەری درێژخایەنی و قۆناغە ستراتیژییەکانی شەڕ پەسەند کرابوو. هەنگاوی ستراتیژی و تەکتیکی سەرکەوتوو بەگوێرەی واقیعی نێودەوڵەتی و نەتەوەیی ئەو قۆناغە جێگای باس بوو. بەڵام هەرچەندە واقیعەکە لە رووخساردا بەمجۆرە خۆی بنوێنێت، بەڵام لە قووڵاییدا هەست بە کەموکوڕی و ئەندێشەی قووڵ دەکرا.

کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول روویدابوو و رووی ملیتاریستانەی دەوڵەت بەتەواوی ئاشکرا ببوو. وەک بڵێی کۆمەڵگا بە مێردە پلەدارییە راستەقینەکەی خۆی گەیشتووە خۆی ئاسوودە و دڵنیا دەبینی. ئەو رەفتارانە دیاربوو کە لە رابردووی نزیک لە کوردستان نواندی. کردەوەکانی نکوڵی و قڕکردن بە دژوارییەوە لەئارادا بوو. هیچ چەشنێکی سەرکوتکردن، توندوتیژی، ئەشکەنجە و کۆمەڵکوژی نەمابوو کە فاشیزمی ملیتاریست ــ کە ناتۆ ئەرێی کردووە ــ تاقی نەکاتەوە. کاتێک راستینەی کورد و کوردستان جێگای باس بێت، کۆمەڵکوژی و ژینۆسایدێک لە رۆژەڤدا بوو کە بە ئاستی سڕینەوە دەگات لە مێژوو و جوگرافیادا. ئەوەی بەسەر بەرخودانی ئەرمەنی، رۆم، سریانی و بەرخودانی قۆناغی نزیکی کوردان هاتبوو لە یادەوەریماندا تازەبوو. ئەمانە سەرچاوەی ئەندێشە و

نیگەرانییە قووڵەکانمان بوون. کەموکوڕی سەرەکیش نەبوونی ئەو هێزە ساغلەمانە بوو کە لەناوەوە و دەرەوە پشتی پێببەستین.

چەمسەرگیری سەرمایەداری و سۆسیالیزم هیوایەکی ئەوتۆیان نەدەبەخشی. بۆن و دووکەڵی ریفۆرمیزمیش بە هەموو لایەکدا بڵاوببوویەوە. لەبەر چەندین هۆکاری ناوخۆیی و دەرەکی چەپی تورک بنبەست ببوو، گورزێکی ستراتیژی بەرکەوتبوو. هەر بۆیەش قۆناغە نوێیەکەی PKK پڕ لە پەنهانی و نادیاری بوو.

## ٤ . راست ڕەنگدانەوەی شەڕی هوشیاری و رۆحی قۆناغێک

بەرامبەر بە مۆدێرنیتە بەرگری لەخۆم دەکەم. بەو رادەیەی لەمیانەی قالبە زانستیەکانەوە بیشێلم ئەوا گوزارشتی زانستیانەی بەرگرینامەکەم هەڵدەبژێرم. تائێستاش هەر وامکردووە. بەڵام ناخم دەیچرپاند و پێی دەگوتم شتێک ناتەواوە. هەروەها هەستم دەکرد کە چەشنی ڕوونکردنەوەی زانستی بەها و باجەکەی قوربانیدان بوو بەشتێک. دڵنیابووم کە ئەو چەشنە بۆ ڕوونکردنەوەی ژیان پێویستە، بەڵام بەش ناکات. چەندە سەبارەت بە بابەتەکە دەهەژریم و قاڵدەبوومەوە، ئەو دۆخە رەوشی جادووگەر و کاهینەکانی سۆمەر و میسری دەهێناوە بیری مرۆڤ ـ کە تەلیسم و پیرۆزی خۆیان لە دەستدابوو ـ کە دەرهەق بە چارەنووسی ژیانی مرۆڤ لەپەرستگاکان نوشتەیان دەنووسی. زمانی مۆدێرنیتە کە تا دەچوو دەبوو بە ئاکادیمیک، پسپۆڕی و هێمایی، ئیتر بە زمانی جادووگەر و کاهینەکانی سەردەمی کۆن دەچوو کە هیوایەکی زیاتریان دەبەخشی. تەنانەت ببوو بە دەرهاوێشتەیەک کە زۆر لەوان بێ هیواتر، تەلیسمی خۆی لە دەستدابوو، بێڕۆح و بێ حەقیقەت بوو. لە دواشیکاردا جگە لە خزمەتکردنی سوڕانەوەی چەرخی سیستەم بۆ بەدەستهێنانی قازانج هیچ مانایەکی دیکەی نەبوو. لەو بارەیەوە هەڵسەنگاندنەکانی نیچەی فەیلەسوف سەرنجراکێش بوو کە دەڵێت: "هونەر باشتر گوزارشت لە ژیان دەکات، حەقیقەت باشتر لەڕێگای هونەرەوە ڕوون دەکرێتەوە".

تا ئێستاش زۆر بە باشی ئەو رۆژانەم لەیادە کە لەژێر مەقاشی قوتابخانەکانی مۆدێرنیتەی فاشیستی تورکی سپی بەسەرم بردن. تا ئێستاش ئەو رۆژانەم لەبیرە کاتێک یەکەم هەنگاوم بۆ قوتابخانەی سەرەتایی هاوێشت خەیاڵی بینینی چ جۆرە جانەوەر و درنجێکم دەکرد. چەندە سەیرە بووم بە رۆڵە ئازیزەکەی ئەو جانەوەرەی بۆ یەکەمجار چاوم پێی کەوت. ئیتر منیان لەسەر دەستان رادەگرت. منیش هێلکە و ماستم بۆ دەبردن. کاتێک یەکەمین پیتەکانی زمانی تورکی لە لێوەکانم داباری، بڕوام بەخۆم هێنابوو کە یەکەمین هەنگاوی سەرکەوتووانەم بۆ هوشیاری و رۆحی مۆدێرن هاوێشتووە. بەڵام ئەوکاتە لایەنێکم هەبوو کە بەردەوام دەمشاردەوە. بەردەوام ئەو دۆخەی خۆم دەشاردەوە کە رۆحم لە ترسان دەلەرزی و هەوڵمدەدا دیار نەبێت. لەوانەیە کەسایەتی دووڕوو بەمجۆرە پێکبێت. نەمدەزانی و تێنەدەگەیشتم کە گوند و خێزان چییان بە کەسایەتیم

بەخشیوە. نەببووم بە رۆڵەیەکی خێرداری گوند و خانەوادەکەم. هەرکەس ژێر بەژێر بڵاوی دەکردەوە کە کوڕەکەی عومەر یاخود عوەیش (زیاتر ناوم بە عەبدوڵڵای عوەیش دەرکەوتبوو) بوویەرێکی بێهیوایە. لەو دۆخە بێزار دەبووم و شەرم دایدەگرتم، بەڵام دەستبەرداری شێوازی کەسێتی خۆم نەدەبووم، تا دەچوو بە تەنیا دەمامەوە. هەرکەس هەوڵێکی تایبەتیدەدا منداڵەکانی لەمن دووربخاتەوە. تەنانەت لە ناخەوە رەزامەندییان لەسەر گەشتە سادەکانی چۆلەوانیش پیشاننەدەدا. چەند رێگایەک هەبوو تا خۆم بخەمە چاویان یان پەسەندم بکەن. راوکردنی چۆلەکە، کوشتنی مار و مارمێلکەکان سەرنجەکانی دەخستە سەرم. هەر لە قۆناغی قوتابخانەی سەرەتاییدا دەرخکردنی چەند ئایەتێک و جێگرتنم لەریزی پێشەوەی نوێژکردن و نزیک بە ئیمام زیاتر سەرنجەکانی راکێشابووە سەرم. هەر بۆیەش یەکەمین پێشبینی ئیمام موسلیم لەبارەی منەوە بڵاوبوویەوە "بەو خێراییە بەردەوام بیت دەفڕیت"، ئەو داوەرییە باڵداری کردبووم.

پێشتر ئاماژەم پێکردبوو بەو خێراییەوە لە ماوەی ئەو کاتژمێرەی بە پێ بەرەو قوتابخانەی سەرەتایی دەڕۆیشتین پێشنوێژیم بۆ ئەو گروپەی قوتابیان دەکرد کە پێشەنگایەتیم دەکردن. بەڵام پێشنوێژیکردن گوزارشت لە قۆناغێکی زۆر پێشوەخت دەکات و بەمجۆرەش مایەوە. چاوم کەوتبوە سەر مۆدێرنیتەی تورک. تێگەیشتبووم کە بە ئاسانی لێی دانابڕێم. پێشتر ئاماژەم پێکردبوو هەرچیەکی بەناوی کوردایەتی لەمندا مابوویەوە کۆسپگیری لە بەردەم یەکبوونم لەگەڵ مۆدێرنیتەدا دروست دەکرد. تا نەورۆزی ١٩٧٣ کە بوێری یەکەمین گروپی بەناوی کورد و کوردستانمان پیشاندا کاتێک هەوڵدەدەم ئەو ژیانە شرۆڤە بکەم کە لە قوتابخانەکانی مۆدێرنیتە هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ رۆبۆت نەبوو، پێویستە بڵێم کە هیچێتیەکی زەبەلاحە. بەرامبەر بە مۆدێرنیتەی تورک دەکرام بە هیچ. ئەو دۆخەش تەنیا بە رێکردنەوە لەپێش کەسایەتیەکی بەکۆمپلێکس سنووردار نەدەبوو؛ جگە لە کەسایەتیەکی بێناوەڕۆک و دابڕاو لە ژیان، بە مانایەکی تر جگە لە کەسایەتیەکی سەرکەوتنی رۆبۆتی بژارێکی دیکەی پێشکەش نەدەکرد. بەراستیش ئەوە کەسایەتیەک بوو کە پێناسەکردنی زەحمەت بوو. لەو بڕوایەدا نیم فیلمەکەشی بەرهەم هێنرابێت. بەڵام ناخوازم دووبارەی بکەمەوە کە بەو دۆخەشەوە بەرچاوترین و خۆشەویستترین خوێندکاری سەرجەم ژنان و پیاوان و مامۆستا (لە قوتابخانەی سەرەتایی تا دوا قۆناغی کۆلێژی زانستە سیاسیەکان) سفیل و سەربازیەکان بووم. لەوانەیە کێشەیەک بێت کە چارەسەرکردنی زەحمەتە.

بە درێژایی ئەو قۆناغە هیچ سازشێکم لەو کەشە سروشتییەی پێشەنگایەتی خۆم نەکرد. کەواتە ئەگەر دووبارە بپرسم؛ چ دۆخێکی رۆحیم هەبوو؟، ئەوە وەک پرسیارێک دەمێنێتەوە کە وەڵامەکەی زۆر نادیارە. لەراستیدا پێویستە ئەو پرسیارە بوروژێنرێت: ئایا بەراستی رۆحێکی ئاسایی لە مندا مابوو؟ بەمانایەکی تر، مۆدێرنیتەکەی بەرامبەرم رۆحێکی تایبەت بە منی هێشتبوویەوە؟ لەوانەیە گرنگترین ئەنجامی لێرەدا بەدەست بهێنرێت: بەجۆرێک رەفتارم دەکرد وەک بڵێی؛ هەر کاتژمێرێک خۆم بەرامبەر بە مۆدێرنیتە

تاقیدەکردەوە. بە پلەی زۆر باشە قۆناغەکانیم تێپەڕ دەکرد. بەڵام هەرگیز نەدەبووم بەو چەشنەی ئەو خوازیار بوو. ئەی کەواتە دەبووم بە چی؟ ئەوەش ئەو کێشە بوو کە بە هەڵواسراوی مابوویەوە. باسی هەڵواسراوی دەکەم، چونکە زۆر باش دەزانرێت لە بۆشاییدا لە چاوەڕوانیدا بیت چەندە زەحمەتە. ئەگەر بڵێم ژیانێک بوو بەمجۆرە تێپەڕی، لەوانەیە بتوانم هەندێک لە خەسڵەتەکانی روون بکەمەوە. بێگومان دەشێت ئەو ژیانە وەک جۆرێکی بێهاوتای بەرخودان شرۆڤە بکرێت لەبەرامبەر ئەو مۆدێرنیتەیەی لەسەر بنەمای سەپاندنی قڕکردن و نکوڵیکردنی ناسنامەکەم دەسەپێنرا. لەو لایەنەوە زۆر جار دۆخی خۆم لەگەڵ ئەو رەوشەی ناسنامەی ژنەوە بەراورد دەکرد کە بە درێژایی مێژووی شارستانی بەسەریدا سەپێنراوە. لێکچوونم لەنێوان ژیانە کورتە ئانتی ـ مۆدێرنیستەکەی خۆم و بەرخودانی هەزاران ساڵەی ئانتی ـ شارستانی ژن دەدۆزیەوە کە لە گەڵیدا بەراوردم دەکرد. بەمجۆرەش تا دەچوو نەفرەتم لە هەڵوێستی رەگەزپەرستانەی بەرامبەر بە ژن دەکرد، زۆر چەپەڵ و قێزەونم دەبینی. هەر زوو پەیم بەوە بردبوو کە هونەری ژنێتی کردن سەبارەت بە ژن زۆر ریسواکەرە.

لێرەدا خاڵێکی دیکەی گرنگ کە بە بێ ئاماژەپێکردنی تێپەڕنابم پەیوەندیەکەم بوو بە دەستەواژەی خوداوەندەوە. تا دوا پۆلی دواناوەندی زۆر پابەندی سروشەکانی نوێژ و رۆژووگرتن بووم و زۆر بە چاکی جێبەجێم دەکردن. بەڵام سەبارەت بە بوونەکەیەوە گومانێک دایگرتبووم کە چەندین جار منی بە ئاستی خۆکوشتن دەگەیاند. لەلای خۆمەوە لە گەڕدوونەوە تا دەگاتە گەردیلەیەکی زۆر ورد لەهەر شوێنێک بەدوایدا دەگەڕام. ئەو گەڕانەش جگە لە قووڵکردنەوەی گومانەکانم هیچ ئەنجامێکی دیکەی نەبوو. تەواو لەو ناوەدا ئاشنای ئایینی چەپ و پێغەمبەرە نوێیەکەی مارکس) دەبووم.

ئایا بەر لە ئاشنابوونم بە چەپ راستڕەو بووم؟ ئاشکرایە کە دوالیزمی راستڕەو ـ چەپڕەو دوالیزمێک نییە گوزارشتێکی راست لە واقیعەکەمان بکات. راستیەکەی دەبووایە مۆدێرنیتە ـ نەریت، یان بەمانایەکی تر دەبووایە راستیەکەی دوالیزمی راستینەی کۆمەڵگا ـ مۆدێرنیتە بووایە. ئەو شڵەژانەی دەستەواژەی خوداوەند رێگای لەپێش کردەوە، لە ناوەڕۆکدا رەنگدانەوەی ئەو شڵەژانەبوو لە کەسایەتیمدا کە کۆمەڵگای نەریتی بەرامبەر مۆدێرنیتە دووچاری هات. خوداوەند کە سیمبۆلی ناسنامەی زاڵی کۆمەڵگای نەریتی بوو بەرامبەر دەوڵەت ـ نەتەوە خۆڕاگری پێنەدەکرا کە خوداوەندە عەلمانیەکەی کۆمەڵگای مۆدێرنیتە بوو. زۆر دواتر ئەو دۆخەم شیکارکرد. کاتێک لەمیانەی ئاوڕدانەوە لە ساڵانی ١٩٧٠کان بەمجۆرە شڵەژانە رۆحییە گەورەکەم روون دەکەمەوە، تەواو لەو کاتەدا لە پێکهاتە چەپڕەو و راستڕەوەکان ــ کە لەگەڵ یەکتر لەناو شەڕ و پێکدادانەدا بوون ــ لە دەرەتانی رزگاربوون لەو شڵەژانەدا دەگەڕام. لەبیرمە بە نیازی پاکەوە یەکەمجار لە دەرگای راستڕەوەکانم دا. ئەو رۆژانەی لە مزگەوتی ماڵتەپەی ئەنقەرە نوێژم دەکرد ــ بۆ ١٩٦٩ درێژ دەبێتەوە ــ. ئەو رۆژانە زۆربوون کە ئیرشادم دەکرد. ئەگەر بەبێ مۆڵەتیش بێت، ئەو چانسەم بۆ رەخسا کە لە ئۆجاخی تورک گوێبیستی کۆنفراسەکەی خودی

"مامۆستای مەزن" نەجیب فازل قسەکورەک بم. زۆر خرۆشابووم. وەک خەیاڵێک گۆڤاری ڕۆژهەڵاتی مەزن م بەبیردێتەوە. ئاشکرایە ئەو خوداوەندەی دووچاری شڵەژان هاتبوو دەنگێک بوو کە هێزی بە خەیاڵم بەخشیبوو. لە کۆمەڵەی تێکۆشان دژی کۆمۆنیزم سولێمان دیمرال و ڕەفیق کۆرکوتم بینی. دواتر پەرتووکی "ئەلفبای سۆسیالیزم"م لەژێر دۆشەگەکەم دۆزیەوە. هەر لەخۆیەوە دەستم بە خوێندنەوەی کرد. تا ئێستاش لەبیرمە بەر لەوەی تەواوی بکەم هەستەکانم بەمجۆرە بێداربوونەوە: "محەمەد دەدۆڕێنێت، مارکس دەباتەوە". نەک بە زانین بەڵکو بژارەکە لە ڕێگای هەستەوە دەست نیشان دەکرا.

لە هەمان قۆناغدا تەرمی سەرۆکی ئەو کاتەی دادگای پێداچوونەوە عیمران ئۆکتەم بە بەردەم بەشی ناوخۆی قوتابخانەکەمان (دواناوەندی پیشەیی رووپێوی تاپۆ)دا تێپەڕ بوو. دیسان بە بێ هاندانی هیچ کەسێکەوە بەشێوەیەکی شەرمنانە چەند هەنگاوێکم هاوێشت و بەشداری ڕێورەسمی بەڕێکردنی تەرمەکە بووم. ئەوە بەشداریکردنێکی بە ئاگایی و باوەڕمەندانە نەبوو؛ بەڵکو لە هەلومەرجێکدا ڕوویدا کە هەوەس و مەراقم بۆ لایەنە ڕاستڕەوەکان و چەپڕەوەکان هەبوو. ئاشکرایە کە خاوەنی ئەو ئاگایی و زانیاریە نەبووم جیاوازی لەنێوان ڕاستڕەو ـ چەپڕەودا بکەم. لەو بارەیەوە گەڕان و بەدواداچوونێکی بەهێز جێگای باس نەبوو. تەنگژەی ڕۆحی منی زۆر سەرقاڵ دەکرد. لە جیاوازی ئایین ـ فەلسەفەدا زۆر خراپ لێدرابووم. زۆر دواتر دەرکم پێکرد کە جیاوازی نێوان کۆمەڵگای نەریتی ـ کۆمەڵگای مۆدێرن بنەماکەی پێکدێنێت. قوڵبوونەوە سەبارەت بە ئایین لە قۆناغەکانی سەرەتایی، ناوەندی و دواناوەندیش هەر بەردەوام بوو. ئاشنای پەرتووکەکانی سەید قوتبیش بووم، بەڵام کاریگەریەکەی لەو ئاستەدا نەبوو تەنگژەکەی من بڕەوێنێتەوە.

١٩٧٠ ئەو ساڵە بوو کە خوێندنگام تەواوکرد و لە دیاربەکر وەک فەرمانبەری دەوڵەت دامەزرام. لێرەدا ئاشنای مووچە و بەرتیل بووم. بەو بەرتیلە شلەژام کە یەکەمجار وەرمگرت. کاتێک قایەپنار (پەیاس) هێشتا گوند بوو، لە ئاکامی ئەو واژۆیەی لە بەرژەوەندی لادێییەکان خستمە سەر کاغەز هێندەی بیرم بێت چوار هەزار لیرەی ئەو کاتم خستە گیرفانمەوە. ئەو شەوە شلەژام. پرەنسیپە ئەخلاقیەکەم بەرامبەر بە بەرتیل ناڕازی بوو. بەڵام یەکسەر ڕێگەچارەیەکم دۆزیەوە. هزری بەکارهێنانی ئەو پارەیە بۆ ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی داهاتوو (پەیوەست بە کوردایەتیەوە) وەک چۆن شلەژانە ئەخلاقیەکەی دەرباز کرد، لای من ئەخلاقیتر بوو. ئامانجی مەزن ئامانجە بەرتەسکەکەی دەرباز دەکرد. لەو سۆنگەیەوە؛ بەهاندانەکانی هەلومەرجەکانی شارەوە مەیلم بەرامبەر بە کوردێتی زیادی دەکرد. ئەوە چیرۆکی یەکەمین پاشەکەوتم بوو سەبارەت بە کوردایەتیەوە. ئەوە لە هەمانکاتدا ڕووداوێک بوو کە کەسایەتی منی پیشاندەدا. لە یەکەم ڕۆژانی منداڵیم کە دێتەوە یادم لە ئاستی نەخۆشیدا ئەشقێکم بۆ کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگابوون هەبوو. بۆ نموونە؛ لە کاتێکدا هیچ حەزم بەوە نەدەکرد کە دایکم و خزمەکانم لە باوەشم بگرن، بەڵام هەڤاڵێتی و دۆستایەتیکردنی خانەوادە ڕەقیبەکانمان لای من زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

حەسەن بیندالّ کە یەکێک لە شەهیدە مەزنەکانمانە هەڤاڵێکی بەمجۆرەم بوو. ڕێسا بۆ کچانیش بەمجۆرە بوو. بەڵام هەستم پێکردبوو کە لەو بوارەدا پەیوەندی بەستن سنووردارە. بەڵام لەبیرمە بەردەوام قەدەغەکاریەکانم دەشکاند.

١٩٧١ ئەو ساڵە بوو کە ناوی خۆم لە کۆلێژی یاسای زانکۆی ئەستەنبۆڵ تۆمارکرد. هەم فەرمانبەرێتی لە گەڕەکێکی وەک باقرکۆی کە شوێنێکی بەرچاوی ژیانی مۆدێرنیتە بوو، هەمیش ئاشنابوون بە ئەستەنبۆڵ کاریگەریەکی زۆری هەبوو. ئەو کاتیش ڕۆژانی دەڤ ـ گەنج و DDKO بوو. مەیلم بۆ هەردووکیشیان هەبوو. بووم بە ئەندامی فەرمی DDKO. بیرەوەریم سەبارەت بە سمینارێک لەوانەیە سەرەداوێک سەبارەت بە ناسنامەکەم بە دەستەوە بدات. بە ڕەفتارێکی زۆر سەیرەوە گوتبووم؛ گوایە حەزرەتی محەمەدیش گوتویەتی:"ئەی خودایە دەرفەتی دەوڵەتبوون بە کوردان مەدە: کوردان ببن بە خاوەنی دەوڵەت تەنگ بە دونیا هەڵدەچنن". لاوان و ئەندامانی DDKO بە چاوێکی نیمچە گوماناویەوە سەیری منیان دەکرد. شوێنەکە کۆمەڵەی کلتووری ڕۆژهەڵات بوو. لە هەلومەرجێکی لەجۆری "ئاواکردنی دەوڵەت لەلایەن کوردانەوە مانای چییە؟" ، "ئایا کاتی گوتنی ئەو جۆرە قسانە بوو؟"، "تۆ بڵێی گێرەشێوێن نەبێت؟" گوماناویدا گفتوگۆیەکی زۆر و درێژخایەنم لەو بارەیەوە کرد.

یەکێک لە بیرەوەریەکانی ئەو ڕۆژانە کە گرنگی دەبینم سەبارەت بە دیالۆگێکە لەنێوان من و سەرۆکی ئەو کاتەی DDKO محەمەد تویسز. ڕێکخستنێکی لەجۆری DDKO و ئەو بیر و بۆچوونانەی بەرگری لێدەکرد، هێندە منی تێر و دڵنیا نەدەکرد. هەروەک لە مەسەلەی ئایین ـ دەوڵەتدا دەبینرا بەردەوام ڕێگام لەپێش گفتوگۆ دەکردەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی سەبارەت بە کێشەی کورد لە دۆخی شاگردابووم لە گفتوگۆکاندا هێزی پێشنیازکردنم پەرەی نەسەندبوو. دیاربوو سەرنجی سەرۆکە بە ئەزموونترەکەم بەلای خۆمدا ڕاکێشابوو، هەربۆیەش بەردەوام دەهاتە لام و دەیگوت: "ئاپۆ پێشنیاز پێشبخە پێشنیاز!" (گوتەیەکە هیچ کاتێک لە بیرم نەکردووە و هەوڵمداوە پێویستیەکانی جێبەجێ بکەم)، ئەوەش سەرنجڕاکێش بوو. ئەویش هەر وەکو سەرۆکی ئەوکاتی PDK فائیق بوجاق لەژێر پەردەی ناکۆکی خانەوادەیی لەلایەن کۆنترگەریلاوە کوژرا. دیسان هێشتا لەیادمە: کاتێک کودەتای ١٢ی ئادار ڕوویدا موسا عەنتەر بە گروپێکی بچووکی لایەنگرانی خۆی، بە ئێمەی گوت"ئەوان کەوتوونەتە یەخەی یەکترەوە، با ئێمەش خەریکی کار و یەکێتی خۆمان بین". لەوانەیە هەڵوێستەکەی ناسیۆنالیستانە بووبێت، بەڵام زۆر مانادار بوو. ئیتر گەردەلوولی ١٢ی ئادار دەستی پێکردبوو.

یەکێک لە دوا بیرەوەریەکانم لە ئەستەنبۆڵ سەبارەت بە کۆبوونەوەیەکە کە لە هۆڵی ماچکایITU (زانکۆی تەکنیکی ئەستەنبۆل) دا ئەنجامدرا. هەرچۆنێک بێت جێگای خۆم لە هۆڵی کۆبوونەوەکەدا گرتبوو. هۆڵەکە زۆر قەرەباڵغ بوو. یەکێک لە کۆبوونەوە هەرە هەستیارەکانی دەڤ ـ گەنج بوو. لەناکاو ماهیر چایان، یوسف کوپەلی و مونیر ڕەمەزان ئاکتۆلگا (لەوانەیە ئاکتۆلگا هەڵە بێت، لەوانەیە ڕاستەکەی سینان کازم ئۆزودۆغرو بێت)

کەوتنە هۆڵەکەوە. ماهیر پێشەنگیان بوو. بەشێوازێکی شۆڕشگێرانە دەستی بەسەر مایکرۆفۆندا گرت و گوتەیەکی درێژی پێشکەش کرد. لە گوتەکەیدا ئەوانەم لەیاد ماوە: "ریڤزیۆنیزم مەترسیەکی جددییە و مارکسیزمی هەژاندووە؛ وەک سەرجەم مەسەلەکان سەبارەت بە مەسەلەی کوردیش (یەکەم جار بوو گوێم لێبێت ناو بۆ مەسەلەکە دادەنرێت) هەڵوێستیان هەڵپەرستانەیە. مەسەلەی کورد مەسەلەی دەستنیشانکردنی مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکانە. ئەگەر کوردان خوازیار بن دەتوانن مافی ئاواکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ پەیڕەو بکەن. ئەو ئەرکەی دەکەوێتە سەر شانی ئێمەی مارکسیست پشتگیریکردنی تێکۆشانی کوردانە لە پێناو بەدەستهێنانی ئەو مافەیان". مسۆگەر ئەوە تێبینی و راوەستەیەکی جددی لای من دروست کرد. نموونە و کۆتەڵی شۆڕشگێڕی بوو. شۆڕشگێڕێک بوو لە تەوقی سەرەوە تا نینۆکەکانی گوتە و کرداری یەک بوو. ئاشکرایە کە ئەو کەسایەتییە بوو کە زۆرترین کاریگەری لەسەر من کرد. لە قووڵاییەوە هاوسۆزیی لا دروست کردبووم. لەو ماوە کورتەدا بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر روونیکردەوە کە پێویستە سەبارەت بە ناسنامەی کۆمەڵایەتیەکەم چی بکەم و بە چۆن ناسنامەیەکەوە بجوڵێمەوە کە گرنگیەکی ژیانیی بۆ من هەبوو. لە هەمان ساڵدا لەگەڵ هاوڕێکەی حوسێن جەواهیر لە ماڵتەپە بەرخودانێکی بەناوبانگیان بەرامبەر بە هێزە چەکدارەکانی دەوڵەت پیشاندا، بەبریندار کەوتە دەست، دوای رفاندنی لە زیندان و لە ئاداری ١٩٧٢ لە قزلدەرە لەگەڵ هاوڕێکانی شەهید بوو؛ ئەوە بوو بە بەردی بناغەی هەنگاونانم بۆ ئەو ژیانەی بە شۆڕشگێڕی ناو دەبرێت. ئەگەر لە بەرامبەر خۆم و کۆمەڵگاکەم راستگۆ و دڵسۆزبم، ئەوە جگە لەوەی لەسەر بنەمای ئەو بناغەیە درێژە بە رێگای خۆم بدەم هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو.

هەنگاوەکەی ماهیر چایان و هەڤالانی رۆڵێکی گرنگی بینی کە کۆی نمرەکانم لە ناو بیست کەسی یەکەمدا بێت و ناوی خۆم لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکانی ئەنقەرە تۆمار بکەم. کاتێک ماهیر چایان و نۆ کەس لە هاوڕێکانی لە قزلدەرە کوژران پێشەنگایەتی بایکۆتەکەی کۆلێژی زانستە سیاسیەکانم کردبوو. هەر بۆیەش قۆناغێکی زیندانم تێپەڕکرد کە لە ٧ی نیسان دەستی پێکرد و حەوت مانگ بەردەوام بوو. بەهۆی نەبوونی بەڵگەی پێویست سزایەکی کورتخایەنی زیندانیم لەلایەن رائید باقی توغەوە بۆ بڕایەوە کە یەکێک لەو دادوەرانە بوو کە سزای لەسێدارەدانی بۆ دەنیزگێزمیش و هاوڕێیانی بڕیبوویەوە (لەو بڕوایەدام کاتێک لەگەڵ دۆغان فرتنەی ئەندامی C_THKP بەیەکەوە دەستگیرکراین دەبوایە بەهۆی ئەندامێتی رێکخستنەوە سزای ١٥ ساڵ زیندانیمان بەسەردا بسەپێنن. بەڵام لەبەر ئەوەی باوکی ئەو یەکێک لە دادوەرە (ئاڵبای)کانی ئەو قۆناغە بوو رزگارمان بوو) هەر بۆیەش سزایەکی چەند مانگی بۆ بڕیبووینەوە. وەک بەرگوێم کەوتەوە دواتر باقی توغ لەبەر ئەو کارەی غەمگین بووە و پەشیمان بۆتەوە. لە ساڵی ١٩٧٢ ببووم بە لایەنگری C_THKP. لە کەنارەکانی ئەندامێتیدا بووم. بەشێوەیەکی کرداری بە ئەندامیش دادەنرام. بەڵام بەهۆی ئەو پەرتەوازەیی و پاکتاوکارییەی C_THKP دوای دەستگیرکردنەکان و

کۆمەڵکوژی قزلدەرە دووچاری هات ئێمەی لەو نێوەندەدا هێشتبوویەوە. ساڵی دواتر، واتە لە سەرەتاکانی ۱۹۷۳ لە دەورەی تێزی"کوردستان کۆلۆنییە" ئامادەکاری ئاواکردنی گرووپێکم دەست پێکردبوو. ئیتر ڕێکخستنی جیاواز دەست لێبەرنەدراو بوو. بەڵام لەناو هەڵوێستێکی ناسیۆنالیستانەدا نەبووین. حەقی قەرار لە ڕیزی یەکەمی ئەوانە دابوو کە لەگەڵم بوون. ئەو هەڤاڵە خەڵکی ناوچەی ئولوبەیلی ـ ئۆردوی دەڤەری قەرەدەنیز بوو، لە ڕاستیدا یەکێک لەو کەسانە بوو کە لە هەڵوێست نیشاندانی مندا ڕۆڵێکی لەپێشی هەبوو. یەکەمین و دواترین بوویەری لە هۆشخۆچوونم کە ئاماژەم پێکرد لای ئەو هەڤاڵە ڕوویدا. ئاشکرایە کە هەڤاڵێتی سەردەمی لەدایکبوونە فیکرییە شکۆدارەکان گرنگیەکی مێژوویی هەیە. تا سەرەتاکانی ۱۹۷۵ بەبێ ئەوەی پەنا بۆ هیچ ماتریاڵێکی نووسراو ببەین، وەک بڵێی نهێنیەک ئاشکرا دەکەم، بەشێوەیەکی نهێنی و شێوازێکی زارەکی پڕوپاگەندەی گرووپم دەکرد. هەروەک باسم کرد لە ساڵی ۱۹۷۵ یەکەمین ڕەشنووسی نووسراومان نووسی: لە ماڵێکدا من و هەڤاڵ محەمەد خەیری دورموش بووین، من لەسەر پێیان بە دەنگ دەمگووت ئەویش بە خامەکەی دەینووسیەوە. ئەو ئاخافتنە ڕەشنووسی گەڵاڵەیەک بوو سەبارەت بە هەڵسەنگاندنی ڕاستینەی کوردستان. ڕەشنووسێکی درێژمان ئامادەکردبوو. ئەگەر لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت دەبینرێت کە کارێکی تێروتەسەلە. هەوڵدرابوو شیکارێکی ڕەوشی جیهان و هەلومەرجە خۆجێییەکان بکرێت کە گرووپ پشتی پێدەبەست. بەگوێرەی قۆناغی خۆی ئەو ئاستەی پێی گەیشتبووین بۆ چوارچێوەیەکی تیۆری بەس بوو. بە پێچەوانەی مەزەندەکان، گرووپەکەمان خاوەنی تێروتەسەلترین مۆتیڤ و ئامادەکاری ئایدیۆلۆژی بوو. ئەو گرووپەی بەلایەنی چالاکیەوە دەرکەوتبوویە پێش، لە میانەی تێزە بەهێزەکانیەوە جیاوازی خۆی لەگەڵ گرووپەکانی دیکە زیاتر دەکرد. وەک گرووپێکی باوەڕمەندان بوو.

نووسینەوەی فیکرێک لە لەدایکبوونی منداڵێک دەچێت. سەرەکیترین کێشەی دواتر، کە هەزار هێندەی گەورەکردنی منداڵێک لە بواری بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتی زەحمەتترە گەورەکردنی هزرە لەبواری سیاسی ـ کرداریەوە و پێگەیاندنێتی. لە دیرۆکی هزر و چالاکی سیاسیدا گەواهی هەزاران نموونەین کە بەباشی لەدایکبوون، بەڵام لە تەمەنێکی بچووکدا مردوون. زۆر کەمیان توانیویانە سەرکەوتووانە پێ بگەن. قۆناغی ۱۹۷٤ ــ ۱۹۷۵ لەبواری چالاکی یان کرداریدا بە ئەزموونی ADYOD (کۆمەڵەی دیموکراتیانەی خوێندنی باڵای ئەنقەرە) بەسەرچوو. ئەرکێکی مەترسیداری لە جۆری سەرۆکایەتی کۆمەڵەکەم گرتبووە ئەستۆ. یەکەمین ئەزموونی جددی هزرە تیۆریەکەم بوو. ئەنجام، دابڕانی ستراتیژی بوو لە چەپی تورک. لە ساڵی ۱۹۷٦دا لەگەڵ گرووپێک لە هەڤاڵانی بە بنەچە تورک (حەقی قەرار، کەمال پیر و دوران کاڵکان) بەیەکەوە دابڕاین. تیۆری گرووپیش بۆ ئەوە گونجاو بوو. ئەوە بانگەشەکەمان بوو: چەپی تورک کە لەژێر چەپۆکی شۆڤێنیزمی کۆمەڵایەتی دایە تەنیا لەمیانەی پەرەپێدانی بزووتنەوەی ڕزگاری نیشتیمانی کوردستانەوە دێتە هۆش

خۆی. ئەو گوتەیەی هەڤاڵ کەمال پیر زۆر باش دۆخەکەی بوخت دەکردەوە: "رزگاری گەلی تورک بە رزگاری گەلی کوردا تێپەڕ دەبێت". مێژووش ئەو بۆچوونەی سەلماندووە.

لە ساڵی ١٩٧٧ بە گەشتێکی پڕوپاگەندەی سیمبۆلیەوە هەنگاوم بۆ کوردستان هاوێشت. بۆ یەکەمجار لە هۆڵە گەورەکەی ژووری بیناسازانی ئەنقەرە لە مانگی ئادار تێزەکانی خۆم بۆ گروپێکی قەڵەباڵغ باسکرد. دواتر لەگەڵ نەجاتی قایا ـ کە دەستبەرداری ئەفسەری فڕۆکەوان ببوو و لە کۆلێژی زانستە سیاسیەکان دەیخوێند ـ ی خەڵکی ئاگری ـ تاشلی چای دەستم بە گەشتەکە کرد. ئاگری و دۆغوبایەزید وێستگەی یەکەمم بوو. خاڵێکی گرنگ کە پێویستی بە ئاماژەکردن هەیە سەبارەت بە ناسنامەی نەجاتی قایایە. دواتر گفتوگۆ لەبارەی ئەگەری سیخوڕێتی ئەو کەسەوە کرا. وابزانم کاتێک لە ئەنتاڵیا سەرقاڵی بەکارهێنانی فڕۆکەی دەرمانڕشێن بوو بەهۆی کەوتنی فڕۆکەکەی مرد. پەیوەندییەکەی لەگەڵ مندا بێ کێماسی بوو. مرۆڤێکی زۆر بە دسپلین بوو. لە سەری ساڵی ١٩٧٧ یەکەمین کۆبوونەوە جددیەکەی خۆمان لەماڵی ئەودا ئەنجامدا. لەو کۆبوونەوە گرنگەی شانبەشانی کادیرەکانمان لە ئەنقەرە بانگهێشتی نوێنەرەکانی کوردستانیشمان کردبوو، وەک تەگبیرێک بەرامبەر هەر ئەگەرێکی رووبدات دەرگای سۆپاکە کراوەبوو. لە دۆخی هێرشی پۆلیسدا کاغەزەکانی تێبینی نووسینمان دەخستە ناو سۆپاکە و لەناومان دەبرد. وەکوتر هیچ بەڵگەیەکی دیکەی نووسراویشمان نەبوو. دیسان هێندەی بەبیرم دێتەوە لە هەمان کۆبوونەوە لەکاتی نانخواردندا نەجاتی قایا خوێدانەکەی بەدەستەوە گرتبوو و قسەیەکی کرد کە مانای "چۆلەکەکان راو دەکرێن و دەبرژێن، بەو خوێدانەش خوێیان پێدادەکرێت و دەخورێن" دەبەخشی. هیچ مانایەکم پێنەدابوو. دواتر لەگەڵ هەڤاڵ کەمال پیر بە سووربوونەوە پێشنیازی بڕینی بانک و رفاندنی سەبیحە گۆکچەن (یەکەم فڕۆکەوانی ژن، کچی مەعنەوی مستەفا کەمال) یان کرد. لەبەرئەوەی ئەو رووداوەم لەبیر بوو کە چۆن رائید ئەلیاس ئایدن لەمیانەی چالاکییە گێرەشێوێنییەکانەوە ماهیر چایان و هاوڕێکانی ئاراستە کردبوو، هەروەها لەو بڕوایەدابووم کە دۆخی گروپەکەمان بۆ ئەوە لەبارنییە رێگام بەمجۆرە چالاکیانە نەدا. ئەگەر ئەو چالاکیانە ئەنجامدرابووایە، لەوانە بوو ببوایە هۆکاری لەناوچوونمان؛ بەلانی کەم قۆناغێک بە شێوەیەکی جیاوازتر کۆتایی پێدەهات. لێرەدا هەڵوێستی بە تەگبیرم لە جێگای خۆی دابوو.

هەروەها بەو پارەیەی گوایە بەهۆی تەزمیناتەوە بە دەستی هێناوە نەجاتی قایا مەسرەفێکی باشی بۆ گروپەکەمان دەکرد. خۆی تایبەت جارێکیان پێی گوتم: "تەنیا تۆ فەرمان بکە لەو نهۆمەی چوارەمەوە بەتەقڵە خۆم فڕێدەدەمە خوارەوە"، یەکێک بوو گوتەی خۆی نەدەخواردەوە، لەوانەیە جێبەجێشی کردبووایە. خۆشی بەشداری یەکەمین و فراوانترین کۆبوونەوەی گەشتەکەی کوردستانم بوو کە لەبناری چیای ئاگری ئەنجامماندا. دوای ئەوە رۆیشت. ئەگەر بە هەڵەدا نەچم وابزانم یان هیچ نەمبینیەوە یان زۆر دەگمەن چاوم پێی کەوت. لە قۆناغی چوونە دەرەوە هەوڵێکی زۆری دابوو تا چاوی پێم بکەوێت.

مسۆگەر دەیویست بمبینێت. تەنانەت تا گوند بۆ ماڵەکەمان ڕۆیشتبوو. دوای چوونە دەرەوە کاتێک هەواڵی مردنیم بیست خەمگین بووم. گفتوگۆیەکی زۆر لە بارەی سیخوڕبوونی یان نەبوونیەوە کرا، لە میدیاکانیش ڕەنگیدایەوە. منیش لەبەر ئەوەی ئەندێشە و گومانم هەبوو زۆر بە تەگبیر لە بەرامبەریدا ڕەفتارم کرد. لە ئەنجامدا ئەگەر سیخوڕ نەبووبێت و تەنانەت سیخوڕیش بووبێت. بەڵام بە ئەنقەست پێویستیەکانی جێبەجێ نەکردبێت، پێویستە وەک کادیرێکی بەهاداری قۆناغی گروپ لە قەڵەمبدرێت. بەهایەکە پێویستە شایەن و ئیعتیباری بۆ بگەڕێندرێتەوە. ئەگەر ئەندامێکی کۆنترگەریلا بووبێت، بەڵام پیلاننامەکەی سەرکەوتوو نەبووە و نەیتوانیوە جێبەجێی بکات، ئەوا هەڵوێست و ڕەفتاری بە تەگبیرم ڕۆڵی لەوەدا بینیوە.

کاتێک لە گەشتەکەی کوردستان هێڵی ئاگری، بایەزیدی ڕۆژهەڵات، قارس، دیگۆر، دێرسیم، بینگۆل، ئەلازخ، دیاربەکر، ماردین، ئورفا، گازی عەنتاب و ئەنقەرەم تەواوکرد، لە بیرمە هەستێکی وام لا دروستبوو وەک بڵێی هەڵمەتێکی ڕاستەقینەی شەڕم ئەنجامداوە. ئاخافتنەکانی ئەو گەشتەم نووسرانەوە. کاتێک لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت دەبینرێت کە دۆخی پەرەپێدراوی ئەو گەلاڵەیە کە بۆ هەفاڵ خەیریم گووت. بەدرێژایی چەند ساڵێک ئەو ئاخافتنانە بوون بە خۆراکی ئایدیۆلۆژی گروپ. ئەو کارەی گروپەکانی دیکە بە ڕۆژنامە و گۆڤار ئەنجامیاندەدا من لەمیانەی ئەو ڕێبازە وەک ڕۆژنامە و گۆڤاری سەرپێیی ئەنجامدەدا. قۆناغی دواتر قووڵکردنەوەی ناوەڕۆکی ئەو ئاخافتنانە بوو. لە ساڵی ١٩٧٨ لەڕێگای سەرخۆبوون (سەربەخۆبوون؛ خۆبیبوون دێنێتەوە یاد)ەوە هەنگاومان بۆ قۆناغی نووسراوی هاوێشت. لە یەکەم ژمارەیدا ڕێگای شۆڕشی کوردستان بە ناوەکەی تر مانیفستۆ بڵاوکرایەوە کە هاوینی ١٩٧٨ نووسیبووم.

لە ئەنقەرە هێشتا چەند ڕۆژێک تێپەڕنەببوو لە عەنتاب هەواڵی شەهیدبوونی هەفاڵ حەقی قەرارمان پێگەیشت. دەتوانم بڵێم کە بەرامبەر بەو هەواڵە داڕووخام. دڵنیابووم کە زەبرێکی زۆر جددیمان بەرکەوتووە. گرنگیەکەی لەوەدابوو وەڵامێکی ڕاست بدەینەوە یادەکەی. خۆم بەشداری مەراسیمی بە خاکسپاردنی نەبووم. دواتر لە ئولوبەی ـ ئۆردو سەردانی گۆڕەکەیم کرد. ئەو پەیمانەی لەسەر بنەمای وابەستەبوون بە یادەکەی دام گواستنەوەی گروپ بوو بۆ قۆناغی پارتیبوون. لە پاییزی هەمان ساڵدا خۆم دەقی ڕەشنووسی بەرنامەکەم ئامادە کرد. ئەوەی ئەنجاممدا بەردەوامکردنی شوێنپەنجەی شەهادەتێک بوو کە لە گەڕەکێکی کەناری عەنتاب ڕوویدابوو.

لەو نێوانەدا دوو ڕووداوی دیکەی گرنگ لە ژیانمدا ڕوویاندا کە وەک بوویەرێکی پەیوەست بە ژیانی تایبەت دەبینرێت. بەڵام لەناوەڕۆکدا مانایەکی ئایدیۆلۆژی ـ سیاسییان هەیە. یەکەمیان، کۆچی دوایی باوکم بوو لە ساڵی ١٩٧٦. کاتێک لە ئەنقەرە گوێبیستی هەواڵی کۆچی دوایی بووم ئارام بووم، لەبیرم نییە کە گریابم. بەمجۆرەش پێشبینیەکی بەدیهاتبوو کە گووتبووی:"کە مردم فرمێسکم بۆ نارێژن". لەو بڕوایەدام کە ڕۆحی زەمانی خوێندبوویەوە. ئاماژەی بە واقیعی مۆدێرنیتە دەکرد. هێندەی ناکۆکیەکانم

لەگەڵ دایکم ناکۆکیم لە گەڵیدا نەبوو. گرنگترین ناکۆکیم ئەو رۆژانە روویدا کە یەکەمین یاخیبوونم بەرامبەر گوند ـ خێزان ئەنجامدابوو. بە پێچەوانەی دەوروبەر، هیوای بەمن هەبوو، مژدەی سەرکەوتنیشی پێدابووم. زۆر دواتر کاتێک رەوشیم شرۆڤەکرد، بۆم دەرکەوت کە وەک ئەندامێکی راستگۆ و پاکژی نەریت بەرگری لەخۆی کردووە. وەک کەس خاوەنی ئەخلاقێکی ئایینی بەهێزبوو. لە دۆخی تاکێکی لاوازی نەریتی خێزان دابوو کە لە رابردوو بەهێزبوو. هێزی پیاوسالاری خۆی لەدەستدابوو. لایەنی دایکسالاری لەناو خێزان لە پێشتربوو. هاوسەنگی نێوان هەردوو هێز دەرفەتی بۆ هەنگاونانی من رەخساندبوو. بانگەشەکانی هەردوولایەنیان لەبارەی منەوە تۆزێک مابوو مایەپووچ بێت. لەو بڕوایەدام کە تاڕادەیەکی باش لەناو خانەوادە ئازادی خۆم بەدەست هێنابوو. تەواو نازانم کاتێک منیان بە تەنیا رووبەڕووی دونیای مۆدێرن هێشتەوە ـ کە دەرکیان پێنەکرد، بەمانایەکی تر هەستیان پێکرد بەڵام لە بەرامبەریدا پێچارەبوون ـ هەستیان بە چی کردووە. بەڵام متمانە و باوەڕییان پێم هەبوو. پێویستە ئەندامێتی خانەوادەیەکی راستگۆ، لاواز و پابەند بە کەرامەت و سەرفرازی خۆی بچووک نەبینرێت.

رووداوی دووەم، نامەزرۆیی ژن بوو کە لەو سالانە سەریهەڵدایەوە. بەر لە گرووپ ئەو هێزەم نەبوو لە هەلومەرجی مۆدێرنیتە نزیکی ژنێک ببمەوە. یەکێک لەو دونیایانەی ئاشنای نەبووم و خۆمم لێی بەدوور دەگرت دونیای ژنان بوو. تەنیا لە ناخمدا خاوەن هەست و سۆزێکی پلاتۆنی بووم. هەرگیز نەدەبوو لە بەرامبەر یەکێکیاندا دان بەو هەست و سۆزانەم دابنێم. لە سەردەمی گوندەوە نیگای ژنان بەرامبەرم سەرنجڕاکێش بوو. بەڵام من لە ماناکەی تێنەدەگەیشتم. دواتر کاتێک شرۆڤەم کرد، لەو بڕوایەدام کە دەرکم بە جیاوازیەکەی یان هۆکارەکەی سەرنجڕاکێشی کردووە. ئەوان بە بایەخەوە هەستیان بە جیاوازیەکانم کردبوو. لەوانەیە تۆزقاڵێک هیوایان لەمندا بینیبێت. وەک بڵێی پێم بڵێن:"کوڕەلاو نازانیت دووچاری چی هاتووین. رەوشمان زۆر جیاوازترە لەوەی دەبینرێت. ئەگەر بەسەرهاتەکانمان دەزانیت! هەرچەندە پیاویش بیت، بەڵام دیسان جێگای هیوامانی". هەستم بە جوانیەکەی ژن دەکرد. لە بیرمە کاتێک لە ناخمدا داوەرییەک پێشکەوت و بە کچە شۆخێکی کورد بڵێم "تۆ، رەچەڵەک و قەومەکەشت شایەنی ئەوەن شەڕی سەربەخۆییتان لەپێناو بەرپا بکرێت".

لەبەر ئەوەی هاوشاری هەڤاڵ مەزلووم دۆغان بوو لە قۆناغی گرووپ کەسێکمان بەناوی کەسیرە یلدرم ناسی. بەهۆی مەیلەکەی بۆ گرووپ ئەویشمان بە ئەندامێکی گرووپ دانا. هیچ شتێکم لەبارەی ژیانی رابردوویەوە نەدەزانی. بەڵام بەهۆی بیرکردنەوەم لەو رۆڵە نائاساییەی (تێکدانی رێک و پێکی گرووپ) لەوانەیە بەشێوەیەکی بابەتی بیبینێت، هەر لە سەرەتاوە ئەندێشە و نیگەرانیم هەبوو. ئەو هێزەم نەبوو بتوانم کۆنترۆڵی بکەم. لەپێناو سەلامەتی گرووپەکەمان، پێویستی پێشنیازکردنم بینی تا پەیمان لەگەڵ هەر یەکێک لە هەڤاڵان ببەستێت ـ هەرچەندە ئەمە شوێنپەنجەی نەریتی و محافەزەکاریش لەخۆوە بگرێت ـ . دەیتوانی لەگەڵ من یان هەر یەکێک لە ئەندامانی گرووپ پەیمان

ببەستێت. لەراستیدا چاوەڕوان بووم من هەڵبژێرێت. ئەو ژنە خاوەن کەسایەتیەکی هاوشێوەی گورگ بوو. لە راستیەکە تێکەیشتبوو، واتە دەیزانی لەو ڕێگایەوە هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدەم. یەکێکی تری هەڵبژارد. غروری نەریتی منی شکاندبوو، بەڵام بێدەنگ بووم. نارەزایی دەربڕینم شایەنی سەرفرازی کەسێتی خۆم نەبینی. دیسان بە دوعایەکمان گوت ئامین کە سەری نەدەگرت. پەیوەندیەکەی بەردەوام نەبوو، راستیەکەی نەیتوانی درێژەی پێبدات. کاتێک دووبارە پەیوەندیم لەگەڵ بەست هەم خۆم زۆر شپرزەببووم، هەم ئەندامێکی زۆر بە نرخی گرووپەکەمان لە دەستدابوو.

ئیتر دۆخە سۆزداریەکەم ببوو بە کێشەیەکی جددی. بەڵام لەراستیدا بە بایەخەوە هەوڵمدا کە کێشەکانم لای گرووپ، پارتی و HRK(هێزی رزگاری کوردستان) رەنگنەداتەوە. ئەو تەنگژەی لە کۆتاییەکانی ١٩٦٠کان سەبارەت بە خوداوەند دووچاری هاتم لە دەوروبەری ئەو ژنەدا دووبارە بوویەوە؛ بەجۆرێک لەجۆرەکان جێی ئەوی گرتەوە. هۆکارەکانی نزیکبوونەوەی ئەو ژنە لە گرووپەکەمان نازانم. لەو بروایەدانیم مەیلێکی زایەندی هەبووبێت. مسۆگەر لە بواری مەیلی زایەندی یان سێکسیەوە یەکێکی زاڵ بوو. لەو لایەنەوە بە هەڵەداچووبووم. سەرەڕای نەبوونی ئەو هێزەی بە دەستی بێنم، بەڵام دیسان پێداگریم کرد. پەیوەندیەکەم تا ئاستی هاوسەرگیریەکی رووکەشی و یەکلایەنە برد. لە هاوینی ١٩٧٨ بە کارتی هاوسەرگیریەوە بۆ یەکەمجار بە فرۆکە لە دیاربەکر دابەزیم. لەوانەیە لە مێژووی پەیوەندی نێوان مرۆڤدا کەسێک بوویم کە سەیرترین و خێراترین مانگی هەنگوینی بەسەر ببەم. کاتێک ژنە بوو بە قالبێک سەهۆڵ، هیچ چانسێکی چارەسەریم نەبوو. لە دۆخێکدا نەبووم دەردی خۆم بۆ یەکێک باس بکەم. چونکە من خۆم تاکە بەرپرسیار بووم. لەو پەیوەندیەدا ژنە بەرپرسیار نەبوو. ئیتر چیم چاندبوو ئەوەم دەدوریەوە. لەراستیدا هیچ زانیاری و چاوەڕوانیەکم نەبوو کە ناسنامەیەکی بەمجۆرەی هەبێت. بە گشت خەسڵەتەکانی گورگەوە ژنە لە بەرامبەرم بوو. لەو بڕوایەدام کە سەیر و ئارامیەکی بەمجۆرە لەنێوان دوو مرۆڤدا بوونی نییە کە من بەدرێژایی دە ساڵ پیشانمدا تا هاوینی ١٩٨٧ ئەو کاتە بە ئیرادەی خودی خۆی لە بزووتنەوەکەمان دابڕاوە. ئەزموونێکی زۆر سەیر و سەرسوڕهێنەر بوو.

بە ساغی دەرکەوتن لەو پەیوەندییە پێویستە وەک موعجیزەیەک ببینرێت. زەحمەتیەکە سەرچاوەی خۆی لەوە دەگرێت کە توانیم کەسایەتی خۆم بەرامبەر ئەو گۆڕانکاریانە لەسەر پێیان بهێڵمەوە کە لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا ستاتۆی ژن سەراوبن دەکات. شەڕ و تەڵاقدان نەدەبوو بە چارەسەری. لەبەر ئەو هۆکارە بوو کە رەوشی خۆم بەرامبەر یەو کەسە بەو تەنگژە چواند کە بەهۆی گومانەکانم سەبارەت بە بوون و نەبوونی خوداوەند دووچاری هاتم. لەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیەوە دەبووایە ئەو پەیوەندییە شیکار بکەم. هەروەها ئەگەر پەرەم بە شیکارەکانی دەرهەق بەژن نەدابووایە، ئەوا چارەسەری ئایدیۆلۆژی و سیاسیش تەواو نەدەبوو. لەو قۆناغەدا هێشتا هێزی شیکارکردنم لە بارەی ژنەوە پێشنەکەوتبوو. تەنیا لە ١٩٨٧ بەدواوە توانیم پەرەی

پێبدەم. بەڵام وەک چۆن لەمیانەی ڕەشنووسی بەرنامە وەڵامی شەهیدبوونی هەڤاڵ حەقی قەرارم دایەوە، ئەوا وەڵامەکەم بەرامبەر ئەو شەڕە سایکۆلۆژیەش نووسینی ڕێگای شۆڕشی کوردستان بوو. ئەو بەرهەمەی هاوینی ١٩٧٨م وەک بناغەی تیۆری بەرنامە ئامادە کرد. لە هەلومەرجێکی سایکۆلۆژی بەمجۆرەدا نووسینی مانیفستۆی شۆڕشی کوردستان پێویستی بە بەهرە و هێزێکی مەزن هەیە. کاتێک باسی پەرچووم کرد مەبەستم ئەو واقیعە بوو.

هەڤاڵان کەمال پیر، جەمیل بایک و محەممەد خەیری دورموش کە چاودێری یەکەمین ساڵانی ئەو پرۆسەیان کردبوو و نەیاندەویست لەو بێ ڕێزییە ببوورن کە ئەو ژنە لەبەرامبەرمی پیشاندەدا، هەربۆیەش بە بێ ئاگایی من نیازی کوشتنیان هەبوو، بەڵام هەڤاڵ کەمال پیر بە هەڵوێستە هەڤاڵێتیە بێهاوتاکەی لەمیانەی داوەریی "با پەنجەی بۆ نەبەین لەوانەیە شتێک هەبێت هەڤاڵ دەیزانێت و ئێمە لێی بێ ئاگاین" تۆزێک دۆخەکە روون دەکاتەوە. بەهۆی پەیوەندی بەکرێگیراوی ـ سیخوڕی باوکی لە سەرهەڵدانی ١٩٢٥وە لەگەڵ خودی عیسمەت ئینۆنۆ، وەک لەنموونەی نەجاتی قایاش بینرا گفتوگۆیەکی زۆر لەبارەی ئەگەری سیخوڕێتی ئەویش کرا. لەراستیدا نازانین، نازانم کە سیخوڕبوو یان نا. لەو بڕوایە دابووم کە پێویستە بەهۆی باوکیەوە حوکم بەسەر مرۆڤێکدا نەدرێت. هەڵوێستم بەرامبەر بەو رەخنانە بەو شێوەیە بوو "لەناو گروپدا ژیان لەگەڵ کەسێکی عەلەوی، چەپڕەو، بە بنەچە کورد کە بە باشی خۆی پێگەیاندووە، کۆمەکەکەی زۆر لەوە زیاترە کە لە دەرەوەی گروپ بێت". نەبوونی ژیانێکی سۆزداری ئەرێنی و سەرکەوتوو لەگەڵیدا، دەبووایە ڕێگا لەپێش داوەریەکی نەرێنی نەکاتەوە. ئەو بڕیارەی لە بارەیەوە بدرێت دەبووایە لە چوارچێوەی یاسا و ڕێساکانی ڕێکخستندا بێت. تاخۆی لەناو ڕێکخستن رایکرد ئەو هەڵوێستەی خۆم پاراست. بەڵام ئاشکرابوو کە لەپشت منەوە کاری تەسفیەکاری زۆر کاریگەری ئەنجامداوە، بەشێوەیەکی بابەتی ئەو رۆڵەی بینیوە. دەتوانین بڵێین کە خەسڵەتە باشەکانی خۆی نەخستە خزمەتی ڕێکخستنەوە.

ئەویش ئەگەر بیویستبایە یان لەبەرنامەیدا بووایە دەیتوانی بمکوژێت. زۆر باش لەبیرمە کاتێکی نزیک بەر لە راکردنەکەی پێی گوتم "مەترسە، ژەهرخواردت ناکەم". کەچی لەراستیدا لە هەمان قۆناغ چەندین سیخوڕ بە ئامانجی کوشتن بەدوامەوە بوون، بەڵام دیسان پێویستە بە تەگبیرەوە هەڵوەستە بکەین. لەدوا قۆناغی خۆیدا دوو لە شۆفێرەکانمی گەیاندە ئاستی خۆکوشتن، یەکێک لەو هەڤاڵانە (فەرحان) گوتبووی "پێویستە بە چوار ئەسپەوە بیبەستینەوە و بە راکێشان پارچەپارچەی بکەین"، ئەویتریش (سەبری) رایکرد، هەروەها تاکە هەڤاڵی ڕێگای خۆرهەڵاتی ناوینم ئەدهەم ئاکچان کە دەیگوت: "چی یارییەک لە پشت سەرۆکەوە دەکرێت" و بەهۆی ئەو ئێش و ئازارەیەوە گیان لەدەستدانی لەئاکامی نەخۆشی گەدەوە، سەرجەم ئەو رووداوانە جێگای هزراندن و بیرکردنەوە بوون. لە زۆرێک لە تەسفیەکارییە هەستیارەکاندا رۆڵی ئەکتەری پشت پەردەی بینیوە، ئەوەش خاڵێکی گرنگە. لەمیانەی بێکاریگەرکردنی چەندین هەڤاڵ

لەرێگای مەستکردن و لە هۆش خۆبردنیانەوە ویستویەتی بە تایبەتمەندییە بەهێزەکانی دەستەگەری و گروپچێتییان ببەستێتەوە. پەیوەندی و کەسایەتییەکە تا ئێستاش پێویستی بە هەڵوەستەکردن و لێکۆڵینەوە هەیە.

کەسایەتیەکی دیکەی بەمجۆرە زۆر جێگای هەڵوەستە کردن بوو دلاوەر یڵدرم بوو. هەڤاڵێکی لەپێش و جێگای هیوابوو. لە ١٢ ئەیلول لە زیندان مایەوە. جێگای خۆی لەناو گروپە تێکەڵەکاندا گرت. بە تەنیا سەربەخۆ لە ڕێگای بولگاریاوە چوبووە ئەوروپا، ماوەیەک لە ئەوروپا گەڕابوو، دواتر هاتە لام، زۆر کەم قسەی دەکرد، هێندەی بە بیرم دێت جارێکیان پێی گوتم "بەمجۆرە گەڕانت مەترسیدارە"، لە کامپی بیقاعیش دوای ئەوەی دوو کچی سووک پێی دەڵێن "تۆ چاوت بڕیوەتە شوێنەکەی سەرۆک" دوای نووسینی نامەیەکی خوداحافیزی کۆتایی بە ژیانی هێنابوو، بەراستی ئەو بوویەرە زۆر سەیر بوو. یەکێک لەو هەڤاڵانەیە کە پێویستە لێکۆڵینەوەی لەبارەوە بکرێت و ناسنامە راستەقینەکەی ئاشکرا بکرێت.

لەسەر بنەمای بەرنامەی پارت کە بە یادی هەڤاڵ حەقی قەرار ئامادەکرابوو لە ڕێککەوتی ٢٦ و٢٧ ـ ١١ ـ ١٩٧٨ لە گوندی فیسی ناوچەی لیجەی دیاربەکر کۆبوونەوەیەکی ٢٢ کەسیمان بەست کە سیفەتی کۆنگرەی دامەزراندنی وەرگرت؛ ئەوەش میلێکی دیکەی ئەو ڕێگایەبوو کە ئیتر گەڕانەوەی نەبوو. ناولێنانی PKK و راگەیاندنی لەراستیدا کۆتایی قۆناغێک بوو. ئەوەی هەم لە هەلومەرجەکانی جیهان و تورکیا هەمیش لە پراکتیکی گروپدا پێویستی بە جێبەجێکرن بوو لەبنەڕەتدا جێبەجێ کرابوون. لێرەدا شێوازی شۆڕشگێڕی گرنگە. چونکە تەنیا بە گوتە و تیۆری سنووردار نەبووین؛ بەڵکو لەگەڵ چالاکی و کردارێکی چڕوپڕ لەگەڵ یەکتر بوون. ئەو شتەی پێویست بوو لە هەلومەرجی بابەتی ئەو کاتە دەرکی پێبکرێت، لە هەناوی شار، چین و دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەنگاونان بوو بە ناوی چینی "کارکەر"ەوە. ئاستی تیۆری و پراکتیکی بۆ ئەو کارە کۆک و گونجاو بوو. چەندین گروپی هاوشێوە لەئارادابوون. بەڵام هیچ یەکێک لەوانە هاوشێوەی ئێمە شۆڕشگێڕیەکی گشتگیر و سەرتاسەری لە خۆیدا بەرجەستە نەکردبوو. هەر بۆیەش لە بەرامبەر کودەتای سەربازی هیچ ئامادەکاریەکیان نەبوو.

لە سەرەتاکانی ١٩٧٩ لە دوولایەنەوە هەوڵی تەگبیر وەرگرتنم دا. لەلایەکەوە ئامادەکاریەکانی تێکۆشانێکی درێژخایەنی شاخم دەکرد، لەلایەکی دیکەشەوە بچمە دەرەوەی نیشتیمان و بۆڕیەکی یەدەگی هەناسەدان بۆ بزووتنەوەکەمان بکەمەوە. ئەگەر سەرکەوتوو بین ئەوا مانەوە و هەمیشەییبوونی بزووتنەوەکە مسۆگەر دەبێت. ئەنجامدانی هەڵمەتی تەکتیکی گونجاو بەگوێرەی هەلومەرجەکانی قۆناغ، هێندەی پێشخستنی ستراتیژی گرنگە. لە قۆناغێکی بەمجۆرەدا دەژیاین. لە مانگەکانی سەرەتایساڵدا هەڤاڵ فەرهاد قورتایم بانگ کرد کە دواتر لە زیندانی دیاربەکر شەهید بوو. ئامێری فۆتۆکۆپیمان گواستەوە. بە ئۆتۆمبێلە فەرمیەکەیەوە منی گەیاندە قزلتەپە. لەو نێوانەدا نزیکەی مانگێک دوای کۆبوونەوەی دامەزراندنی PKK کۆمەڵکوژی مەرەش روویدا. مەرەش

دەڤەرێک بوو تێیدا بەکاریگەر بووین. لەو ناوچەیەی بە رۆژئاوای فورات ناودەبرێت و لە ساڵی ١٩٢٥وە بڕیاری تەسفیەکردنی کوردانی لەبارەوە دراوە و جێبەجێ دەکرێت بزاوتێکی بە تورککردن جێگای باس بوو. لێرە تارادەیەک کوردیتیمان زیندوو کردبوویەوە. بەهەمانشێوە لەمیانەی کۆمەڵکوژیەکانی مەلاتیا، ئادیامان و ئەلازغ وەڵامی ئەو هەوڵەمان دەدرایەوە. کۆمەڵکوژیەکان چالاکی سادە و بچووکی فاشیستە سفیلەکان نەبوو؛ بەردەوامی ژینۆسایدی مێژوویی بوو کە لەلایەن ناتۆ ـ گلادیۆوە پشتیوانی دەکرا. لە ڕێگای ڕاگەیاندنی PKK لە دیاربەکر وەڵامی ئەو کۆمەڵکوژیانەمان دەدایەوە. لەو ساڵەی کە کابینەکەی بلند ئەجەوید گیانەڵڵای بوو ئەو هەنگاوە مێژووییانە نران و لە بەرامبەریشدا کۆمەڵکوژیەکان ئەنجامدران. ساڵێک بوو کۆنترگەریلا دەستپێشخەری گرتبووە دەست. تەنانەت هەوڵی تیرۆرکردنی ئەجەویدیشیان دابوو. کۆمەڵکوژی تەقسیمیش کە ساڵی پێشووتر ڕوویدابوو لەلایەن هەمان هێزەوە ئەنجامدرابوو.

کاتێک گەیشتینە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٧٩ هەڤاڵ ئەدهەم ئاکجانی خەڵکی سروجم ئاگادارکردەوە کە بۆ دەربازکردنی سنوور ئامادەکاری بکات. چل ڕۆژی تەواو لە ئورفا لە چاوەڕوانیدا بووم. تەواو لە دۆخێکی هاوشێوەی حەزرەتی ئیبراهیم خەلیلدا دەژیام. چەندین بتی شارستانیم شکاندبوو. لەو ڕۆژانەی کە نەمرودەکان بە ڕق و قینەوە وەستابوون مانەوەمان لە شاری نەمرود ڕێکەوتێکی زۆر سەیر بوو. لەسەر هەمان ڕێگای دەرکەوتنەکەی حەزرەتی ئیبراهیم بووم. لە پەرتووکی پیرۆزدا ناوی سروج بە سەروجیش دەربازدەبێت. لەهەر دەرکەوتنێکی دوای سەرهەڵدانەکان ڕەوشی هاوشێوە جێگای باسبوون. لەو نێوەندەدا چوومە سەر قەڵای ئورفا. سەرتاسەر بە تەواوی قەڵاکەدا گەڕام. ماوەیەکی درێژ لای ئەو دوو ستوونە وەستام کە بەمەنجەنیق حەزرەتی ئیبراهیم یان فڕێدرایە ناو ئاگرەوە، لە سەیرکردنی خوارەوە بە خەیاڵاچووم. چەند ڕۆژێک دواتر هەڤاڵ ئەدهەم ئاگاداری کردمەوە کە هەلومەرجەکان بۆ دەرکەوتن لەبار و ئامادەیە. ئەو شتەی بە ئامادەکاری ناوی دەبرد، سواربوونی پاسی گوندێک بوو تا بگەینە سنوور. سواری پاسەکە بووم. لە نێوان لادێیەکان لە گوندێکی سنوور دابەزین. تا ئێستاش بیردەکەمەوە کە سواربوونی ئەو ئامێرە یان ئامرازەی مۆدێرنیتە ڕاست بوو یان نا. گرنگترین ئەنجامی بەدەستم هێنا ئەوەبوو؛ کارکردن بە ئامرازە زهنی و فیکریەکانی مۆدێرنیتە، لە سپاردنی چارەنووس بە دەستی خوداوەندەکانی چاخی کۆن مەترسیدارترە. لەگەڵ تاریکبوون دووەمین هەنگاوی ئامادەکاری کەوتەگەڕ. ڕێزانێک بەناوی جەنی گوتی "هایدێ!"و هەڵساین. کاتێک سەربازە زێرەڤانەکە تەلبەندەکەی هەڵگرت و گوتی: "دەی هاوشاریەکەم خێرابە" بە هەنگاونانێکی بزنە کێویانەوە پێیەکانمان لە شوێن پێی هەڤاڵ ئەدهەم دادەنا و کێڵگە مینکراوەکەمان دەربازکرد. ئەو ئەزموونەی بۆ ئەوانی تر کارێکی ڕۆژانە بوو، بۆ من هەم مێژوویی هەمیش یەکەمین بوو. بگرە وەک دۆنکیشۆتیش چەکدار نەبووم. ئەدهەم ئاکە یارمەتیدەرەکەم بوو. وڵاتێک کە هەزاران ساڵ بوو لەلایەن نەمرودەکانەوە داگیر و

تالان دەکرا، هەوڵمدەدا سەرلەنوێ بیهێنمەوە سەر باوەڕ و ئیمانەوە. گەلێک جێگای باس بوو کە بە کەناری قڕکردن، نکوڵی و لەناوچوون گەیشتبوو. ئەو گەلە دووچاری نکوڵی و قڕکردنێکی هێندە دژوار هاتبوو، تەنانەت بنگەلیکیشی نەمابوو کە بیپەرستێت. بتە شکێنراوەکان بتەکانی مۆدێرنیتە بوون کە زادەی دەرەوەن.

وەک حەزرەتی ئیبراهیم دوای ڕێبوارییەکی دوو مانگی خۆم لەناو فەلەستینیەکان بینیەوە. ئیتر ڕۆژانی بێ زمان و بێ وەرگێڕ بۆ من دەستی پێکردبوو. ڕۆژانێک بوو جگە لە گرنگی ئامانج هیچ شتێکی دیکە نەیدەتوانی لەسەر پێیانمان بهێڵێتەوە. ئەگەر فیداکارییەکانی ئەدهەم نەبووایە، هەوڵەکانم هیچ نەبوو. تەنیا ئەو کەسانەی بەوجۆرە ئەزموونانە گوزەریان کردووە دەزانن کە ڕێکخستن و پەیوەندی گرنگیەکی چەندە گەورەیان بۆ کۆمەڵایەتیبوون یان کۆمەڵگابوونێکی نوێ هەیە. ئەو بەسەرهاتانەم حەقیقەتێکە کە لەناو PKK دا زۆر کەم دەرک بە ڕاستی و گرنگیەکەی کراوە. وێڕای ئەوەی ئەو پەیوەندییەی لەو دەڤەرە پێشمان خست لە شەڕێکی مەیدانی گرنگترە بەڵام گرنگی و بایەخی پێنەدرا، بەهاکەی نەزانرا و زۆر بە بێنرخی بەکارهێنرا. سەرجەم هەڤاڵە ڕاستگۆ و دڵسۆزەکانمان باجێکی بە ئێش و تراژیدییان دا، هەندێک لە تەڵەکەبازەکانیش بە شێوەی قارەمانێتیەکی هەرزان بەکاریان هێنا و بۆ خۆیان دەژیان. قەبیلەکەی حەزرەتی ئیبراهیم لەڕێگا تووشی کۆسپ و زەحمەتی دژوار هاتبوو. هی ئێمەش بە جۆرێک لە جۆرەکان قەبیلەی هاوچەرخ بوو. لە هەمان ڕێگا و بەڵکو لە هەمان شوێنیشدا دووچاری زەحمەتی هاتین. لە لایەنێکەوە دەرکەوتنەکەمان بە دەرکەوتنەکەی حەزرەتی موسای میسرەوە دەچوو. لەڕاستیدا وەک هەمان قەبیلە وابووین. لە سەردەمی نەمرود و فیرعەونەکانی میسر و سۆمەرەوە هەمان بەسەرهات بە هەزاران جار لە هێڵی ئورفا ـ حەلەب ـ شام ـ قودس ـ میسر ڕوویداوە. بەبڕوای من لەو سەردەمەوە کە یەکەمین جڤاتەکانی مرۆڤ لە ئەفریقیاوە بەرەو ناوەوەی ئاسیا و ئەورووپا ڕۆیشتوون مێژووی مرۆڤایەتی لەلایەن ئەو هێڵەوە دەستنیشان کراوە. دەرکەوتن یان کۆچەکەی من، ئێمە، ڕێکەوت نەبوو، یەکێک لەو کۆچە مێژووییانە بوو کە سەرجەم ساتە دیرۆکیەکان دەیکەن بە ناچاری.

جگە لە هەڵسەنگاندنی ئایدیۆلۆژی و سیاسی قۆناغی ١٩٧٠ ـ ١٩٨٠ هەوڵدان بۆ هەڵسەنگاندنێکی ئەدەبی و دیاریکردنی پەیوەندییەکەی بە ژیانی بەرجەستەوە ڕۆڵێکی تەواوکەر دەبینێت. ئەگەر پەیوەندی بزووتنەوە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکان بە هونەرەوە نەبەسترێت لە سەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ ئەدەبیات، بگرە بە وردەکاری هونەرییەوە ئاراستە و مۆتیڤە نەکرێت، ئەوا کەموکوڕیەکی گەورە لەخۆوە دەگرێت. تەنانەت نەخۆش و دەردەداریش دەبێت. چونکە حەقیقەت تەنیا بە ڕێبازی ئایدیۆلۆژی و زانستیەوە ڕوون ناکرێتەوە؛ ئەگەر بەمجۆرە ڕوون بکرێتەوە ناتەواو دەمێنێت. ڕوونکردنەوەی بەم چەشنە پێویستە وەک بیروشکی مۆدێرنیتە ببینرێت. وەک لە بەشەکانی داهاتوو زیاتر ڕوونی دەکەمەوە تا ئەو هەڵوێستەی مۆدێرنیتە دەربازنەکرێت کە کەسایەتی بۆ تاکە ڕەهەند

بچووک دەکاتەوە (ئابووریزان، سیاسەتمەدار، ئایدیۆلۆگ، ئەکادیمی، سەرباز، کارکەر، زانـا، روونـاکبیر ....هتـد)، ئـەوا ناشـێت تێکۆشـانێکی بەپرەنسـیپ، سەرتاسـەری و سەرکەوتوو بەرامبەر مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ئـەنجام بـدرێت. ئەگـەر خۆتـەیارکردنی رێکخسـتن، کەسـایەتی و رابوونـە شۆڕشگێڕیەکان هەمەلایەنـە نـەبێت، پەیوەنـدی بـە کلتووری کۆمەڵگای ـ مێژوویی و دۆخـەکانی ئێستایان نەبەستێت کە نوێنەرایـەتی ئـەو کلتوورە دەکەن، لەو چوارچێوەیەشدا خۆی تـەیار نەکـەن، ئـەوا مسۆگەر دەکەوێتـە نـاو تەڵەزگەی ژیانی لیبراڵـەوە. مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری لەمیانـەی چەکـە ئایـدیۆلۆژی و تیۆریەکانی ژیانی لیبراڵەوە رکابەرەکەی خۆی دادەڕووخێنێت. وەها مەزەندە دەکرێت کـە تاکی لیبراڵ خاوەن ژیانێکی سروشـتی و ئـازادە، کـەچی لـە راسـتیدا ئـەو چەشـنە ژیانـە ژیانێکی یەک رەهەندییە و لە وشـکترین ئایینـەکانیش دۆگمـاتیکترە. ئەگـەر بزووتنـەوەی PKK ش هاوشێوەی نموونـەکانی سۆسـیالیزمی بونیـادنراو دووچـاری پەرتـەوازەبوون و تەسفیەی تەواو نەهاتووە، لەناو نەچووە، هۆکـاری سـەرەکی بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە بەشێوەیەکی گشتگیر وابەستەی حەقیقەتی کۆمـەڵگا ماوەتـەوە و بـە هـەمان گشـتگیریەوە هەنگاوە تیۆری و کرداریەکانی کردووە بەیـەک کـە هـەڵگری نوێخـوازین. لەئاکامـدا ئـەو جۆرە رابوون و کاروانە رێگای لە پێش پەرەسەندنی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیمـوکراتی کـردەوە کـە ئەڵتـەرناتیڤی فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەدارییە. بچووککردنـەوەی رابوونـە شۆڕشـگێڕیەکان بـۆ هێـزی فیزیکـی یـاخود تاکـە رەهەنـدێک، زوو یـان درەنـگ لەرووی هەمەلایـەنی و گشـتگیری ژیانـەوە دەربـاز دەکرێـت. لـە بەرامبـەر ناهاوسـەنگییە لەرادەبەدەرەکەی هێزی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و شارستانی هاوچەرخەوە تێکۆشانی هوشیاری و رۆحی ئازاد ریشەی خۆی لەناو تاشە بەردەکانیشدا جێگیرکردووە، خونچەی کردووە و میوەی داوە.

### ب ـ ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی PKK و ئەنجامەکانی

دانانی بنـاغەکانی PKK لە ئەنقەرە رەنگدانەوەیەکی نموونەیی سیاسـەتی داگیرکـاری کلاسیکە. لە تەواوی جیهاندا چەندین نموونەی هاوشێوەی چوارچێوەی پەیوەندی کۆڵۆنی ـ مەترەپۆڵ دەبینرێت. هەوڵمدا روونی بکەمەوە کە دەرکەوتن لە ئەنقـەرە زۆر بـە ئـێش و ئازار بوو. ئاشکرایە کە ئەوە یەکێک لە قۆناغە هەرە سەختەکان بوو. سـەختی بۆ هێـزی قەبە نەدەگەڕایەوە، بەڵکو سـەرچاوەی خـۆی لـە تایبـەتبوونی فاشـیزمی تـورکی سپی و هەلومەرجـە سـایکۆلۆژی ـ کلتوورییـە خنکێنەرەکـەی وەردەگـرت. سـەرهەڵدان چەنـدە زەحمەتە، پێهەڵگرتنیشی هێندە سەخت بوو. ئەوەی جێگـای گرنگـی بـوو لەمیانـەی کامـە رۆح و کلتوورەوە هەنگاو دەنرێت. لە هەلومەرج و زەمینەیەکدا ژینۆسـایدی کلتـووری لـە نەشوەی سەرکەوتن دابوو زیندووکردنەوەی بزاڤـی نەتـەوەیی ـ نیشـتیمانی کـورد، لـەوە دەچوو مردوو لە گۆڕدا زیندوو بکەیتەوە و بیهێنیتـە دەرەوە. ئـەو دۆخـەش گوتـەی "ئـەو

ڕۆحەی نەکێشرابێت هیوای لێنابڕێت" دێنێتەوە بیری مرۆڤ. هەڵگرتنی نەخۆشەکەمان کە هێماکانی زیندووبوونەوەی بەدەرکەوت و گواستنەوەی بۆ زەمینە و هەلومەرجێکی دیکە تا تەندروستی باشتر بێت ئەرکی سەرەکی بوو. ڕەوشەکەمان لە ئورفا لە نەخۆشیەکەی حەزرەتی ئەیوبیش دەچوو. بەجێهێشتنی وڵات (ترک ألدیار) بە پەلەترین بژار بوو. هەڵبژاردنی گەرمترین ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوین وەک شوێنی خەباتی ستراتیژی پەیوەندیەکەی بە ئامانجەوە جێگیر و پڕەنسیپانەتر بوو. چەندین هێزی دیکە بەرەو ئەورووپا ڕۆیشتبوون. ئیتر لەمێژبوو ئەورووپا ناوەندی خەباتی شۆڕشگێڕی نەبوو. باوکە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی تورک بوو کە کردبووی بە بەڵایەک بە سەرمانەوە. ئەو شۆڕشگێڕانەی لە تورکیا بە لێدانی قەبا هەوڵی تەربیەکردنیان دەدرا، لە ئەورووپا بە چارەسەری سایکۆلۆژیەوە دەهێنرانەوە هۆشی خۆیان. دەکرێ لە ئەورووپا خەبات بکەیت، بەڵام نەدەبوو بکرێت بە ناوەندی ستراتیژی.

ساڵی یەکەممان بە دابینکردنی پێداویستییە لۆجستیکیەکان و سەرلەنوێ کۆکردنەوە و ڕێکخستنەوەی گرووپ گوزەری کرد. بەسەرهاتەکەی بۆ دواتر جێدەهێڵین، بەڵام هەڵسەنگاندنێکی ڕاست بۆ کات و شوێنە نوێیەکە گرنگیەکی زۆری هەبوو. PKK ی کوردستان و تورکیای ١٩٧٠کان ئایدیۆلۆژیک بوو. ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراوی پەسەند کردبوو. تایبەتمەندێتییە دیموکراسیەکان وەک پۆتانسێل و وزەیەکی شاراوە لە PKKدا هەبوو. ئەو توانایەشیان نەبوو تێکۆشان بەرامبەر ڕیڤزیۆنیزمەکەی سۆسیالیزمی بونیادنراو بکات. بە هێزی بازوومان دەمانتوانی تێکۆشانێکی سەرکەوتوو بەرامبەر بە ئایدیۆلۆژیای میلیگەرایی سەرەتایی و شۆڤینیزمی کۆمەڵایەتی بکەین. وەک چۆن لەو کات و شوێنە نوێیەی خۆرهەڵاتی ناویندا پێویست بەوە نەبوو، لە هەمانکاتدا هەلومەرجەکانیشی لەئارادانەبوو. هەلومەرجەکان لەناوەوە PKKی شەڕی شۆڕشگێڕییان دەکرد بە پێویستیەک، لە دەرەوەش پێویستی ڕێککەوتنی لەگەڵ ڕێکخستنەکانی دیکە و دەوڵەتە سۆسیالیستە بونیادنراوەکان دەسەپاند. وێڕای فاکتەرە داخراوەکانی ئایدیۆلۆژیەکەی، PKKی ئایدیۆلۆژیک بەزیادەوە هیوای ژیانێکی ئازادی دەبەخشی. بەڵام بەڵێنە ئایدیۆلۆژیەکان هەرگیز بۆ بەدیهێنانی ژیانی ئازاد بەس نەبوو. لەو پێناوەشدا PKKی شەڕ و تێکۆشان قۆناغێکی ناچاری بوو. بەبێ ڕەچاوکردنی شەڕ هیچ ئازادییەک بەدەست نەدەهێنرا؛ ژیانی ئازادیش بەلاوە بنێین، بگرە نەماندەتوانی ناسنامەی خۆشمان بەدەست بێنین. ئەو شتەی لە ئەنقەرە خەیاڵمان بۆی دەکرد لە ژیانی ئازاد دوور بوو؛ ئەو شتەی خەیاڵدەکرا بە دەستهێنانی ناوێک بوو سەبارەت بە ناسنامەی خۆمان. تەنانەت ئەوەش ریسکی گەورەی هەبوو. ئەگەر جێگای ریسک و مەترسیداریش بێت لە ئەنجامدا وەک ناو ناسنامەی کوردی بەدەست هێنرابوو. دووەمین هەنگاوی گەورە نەدەبوو دووبارەکردنەوەی هەمان دەسکەوت بێت. ئیتر دەبووایە شەڕ لەپێناو ئازادی ناسنامەکە دەست پێ بکەین.

دیسان ئەو کێشە سەرەکیەی لە بەرامبەرمانە تا بڵێی فەلسەفییە. کێشە فەلسەفییە بنەڕەتیەکە پەیوەندی نێوان ناسنامە و ئازادییە. ئایا بەبێ ئازادی دەشێت ناسنامە بژیت و بژێنرێت؟ ئەگەر ناسنامەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا نەبێت دەشێت ئازادی تاکەکەس جێگای باس بێت؟ ئەگەر وەڵامێکی ئەرێنی نەدرێتەوە ئەو دوو پرسیارە، ئەو کاتە پێویستە کردار و چالاکی، بە گوتەیەکی تر پێویستە پەیوەندی نێوان ئیرادە و ئازادی مانادار بکرێت. بۆ نموونە؛ شێوازی چەوساندنەوە و سەرکوتکردنی ناسنامەی کورد وەک چەوساندنەوە و سەرکوتکاریەکانی هیچ یەکێک لە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەوروپا نییە. ڕێبازەکانی ژینۆسایدی کلتووری دەستبەکارە کە لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵگا و ماوەی درێژخایەندا بڵاوبۆتەوە. تا ئەو کاتەی ئەو ڕێبازانە بەردەوام بێت نەدەبوو بوون یاخود ناسنامە جێگای باس بێت. هەرچی ئازادییە تەنیا بۆ فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار جێگای باسە. لەوێشدا زۆربەی زۆری هاوڵاتیان لە دۆخی کۆیلایەتی مۆدێرندا دەژین. کوردانیش وەک ناسنامە و بوون پارچە پارچە تەسفیە دەکرێن و لەناودەبرێن. لەو پێناوەشدا سەرجەم ئامێر و ئامرازەکانی ئاسمیلاسیۆن و ژینۆساید دەستبەکارن. تەنیا چەوسانەوەی ئابووری، فشار و سەرکوتکردنی سیاسی جێگای باس نییە. بەڵکو خودی کۆمەڵگای ـ مێژوویی و ناسنامەکەشی دووچاری پرۆسەی نکوڵی و قڕکردن هاتووە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئازادییەک جێگای باس نەبوو بە تێکۆشانی سیاسی و ئابووری چەشنی ئەوروپا بەدەست بهێنرێت. لە ئەوروپا پێویستی بە شەڕی مانەوە نەبوو. جگە لە حاڵەتی زۆر دەگمەن نەبێت، ئەگەر ناسنامەکان لەژێر فشاریشدا بن، بەڵام لەژێر پرۆسەی نکوڵی و قڕکرندا نەبوون، هەرچەندە بگوترێت کە؛ بەبێ ئەوەی ئازاد بیت ژیاندنی ناسنامەکەت بەهایەکی ئەوتۆی نییە، بەڵام دیسان بوون بە خاوەنی هەبوون و ناسنامە گرنگە.

لە دیاردەی کورددا ڕەوش جیاوازترە. نکوڵی لە خودی بوون و ناسنامەکەی دەکرێت و پرۆسەیەکی بێ بەزەییانەی قڕکردن و لەناوبردن لەسەر پارچەکانی دیکەی بەڕێوە دەبرێت. لەو دۆخەدا بوون و ئازادی دەبن بە دوو دەستەواژەی تێکەڵ بەیەکتر. یەکێکیان نەبێت ئەویتریان بەدینایەت. ئەگەر ئازادیت دەوێ پێویستە بوونی خۆت بەدەست بێنیت؛ بوونی خۆت دەوێت، پێویستە ئازادی بەدەست بێنیت. سەرباری ئەوەی ئامرازە کلتووری و سایکۆلۆژیەکان (دامەزراوە ئایدیۆلۆژیەکان) بەشێوەیەکی بەرفراوان لە پرۆسەی نکوڵی و قڕکردن دەستبەکارن، بەڵام ڕێبازە سەرەکیەکانی جێبەجێکردن پشت بە هێزی فیزیکی (جەستەیی) دەبەستن. سوپا، پۆلیس، کۆنترگەریلا، فاشیستە سڤیلەکان، جاش و سیخوڕە ملیسەکان وەک تۆڕێک لە بەرامبەر سەرجەم جومگەکانی بوون لەسەرکارن. ناتۆ و هێزە هاوپەیمانەکانی دیکەش پشتیوانییان دەکەن. هێزەکانی لەناوبردنی جەستەیی کە بەلانی کەم خاوەنی پاشخانێکی مێژوویی سەد ساڵیین، بەردەوام هەوڵدەدەن هێزە دەسەڵاتگەرا و پلەدارییە نەریتیەکانیش بەکاربێنن. بە بێ ڕەچاوکردنی واقیعی ئەو هێزە جەستەییە، یان ئەنجامدانی چالاکی و تێکۆشان لە بەرامبەریان: بوون بە خاوەن بوون و ناسنامە و بەدەستهێنانی ئازادی جێگای باس نابێت.

هەنـدێک هـەنگاوی لاواز و ناکـامی پاشـکۆی چینـی بـۆرژوازی کـە لـە کـوردە بەکرێگیراوەکانی سەردەمی مۆدێرن، میللیگەرا سەرەتایی و شۆڤینیزمی کۆمەڵایەتی تورکی بەکرێگیراوی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتداردا دەبینرێت، بەبێ ئەوەی سیستەمی نکوڵی و قڕکردنی سەر بوون و ناسنامەی کورد، ڕێباز و ئامرازەکانی جێبەجێکردنی ژینۆسـاید ڕەچاو بکەن باس لە تێکۆشانێکی ئازادی گشتی و نادیار دەکەن. ئەگەر ئەوانـە راستگۆش بن، بەڵام لەبەر ئەوەی بەشێوەیەکی بابەتی ستاتۆی جێبەجێکردنی ژینۆسـاید پشتگوێ دەخەن، ئـەوا رۆڵێکـی زۆر خراپتر لـە هێزەکـانی نکوڵی و قڕکردن دەبینـن. بـە زارێکـی ناپەسـەند، ساختە و دیماگۆژیەتـەوە باسی بەدەستهێنانی ناسنامە و ئـازادی دەکـەن. دەخوازن بە دوعایەک بگوترێت ئامین کە قبوڵ نییـە و جێبـەجێ نابێت. بوونێک کـە لـە کـەناری نکوڵی و قڕکردن دایـە، بۆ نموونـە؛ پێشـنیاز دەکـەن نەخۆشـی شێرپەنجە بـە ئەسپرین چارەسەر بکەن، واتە هەوڵدەدەن نەخۆشەکە بکوژن. سەرباری ئەوەی سـاڵانێکی درێـژ ئــەو ڕێبازەیــان تــاقی کردۆتــەوە، بــەڵام ئەنجامــەکانیان لەبەرچاوانــە. بــە ساختەکاریەکی گەورەوە مافی مرۆڤ و ئازادیـەکانی بوونیـان نییـە، بەهـەبوو دادەنـێن و مەزەندە دەکەن کە لەمیانـەی خـەباتی ئایـدیۆلۆژیی و سیاسـیەوە دەتـوانن بەشـێوەیەکی تەواو و ئازادانە ناسنامەی خۆیان بژێنن. لە مەزەندە زیاتریش پڕوپاگەندەی بۆ دەکەن و هەوڵی کوێرکردنی هوشیاری و ئیرادەی گەل دەدەن.

ئاشکرایە کـە بـە جـۆرێکی دیکـەش بێت، بـەڵام بـە ڕێبـاز و ئامرازگـەلێک تێکۆشـان بەرامبەر ڕێبازەکانی سیستەمی نکوڵی و قڕکردن بکرێت کە کاریگەریەکەیان بشکێنێت، بـۆ بەدەستهێنانی بوون، ناسـنامە و ئـازادی مەرجـە. وێـڕای ئـەوەی ئـامرازە ئایـدیۆلۆژی و سیاسیەکان پێویستن، بەڵام لەو هەلومەرجانەدا دیاریکـەر نـابن. تـەنیا کاتێـک لـەڕێگای ڕێباز و ئامرازە شۆڕشگێڕیەکانەوە سنوورێک بۆ ئامرازەکانی نکوڵی و قڕکردن دادەنرێت دەشێت کاریگەری ئەو ئامرازانە جێگای بـاس بێـت و ڕۆڵێکـی مانـاداری هـەبێت. هەڵبەتـە هۆکاری سەرەکی پشتگیری بەهێزی گەل بۆ دۆخی چالاکی سەردەمی سەرهەڵدانی PKK ــ ئەگەر ناتـەواویش بێـت ــ بـۆ ئـەو خاڵـە دەگەڕێتەوە؛ واتـە لـە ڕێگـای ئـامراز و ڕێگـای ڕاستەوە تێکۆشانی ڕەچاوکرد. هەرچەندە هەندێ لایەنی نادیاریش لەخۆوە بگرێت، بەڵام ستراتیژیەتی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی ئانتی ـ داگیرکـەر لـەکاتی سـەرهەڵدانیدا ڕاسـتی گرنـگ لـەخۆوە دەگرێـت، هەربۆیـەش پشـتیوانی دەکرا. دیسان هەنـدێک لـەو چالاکییـە سنووردارانەی لە چوارچێوەی ئەو ستراتیژیە پێشـخران مـەیل و پشتگیریەکی نائاسـایی بەخۆیـەوە بینـی. کاتێـک داکەوتینـە مەیـدانی خۆرهـەڵاتی نـاوین، گفتوگـۆی لـەو جـۆرە سەبارەت بە کێشەی بوون و ئازادی لە ئارادابوو. هەندێک لە ڕووداوەکان ڕەخنە دەکران، گەڕان بە دوای ستراتیژ و تەکتیکی نوێ و ڕاستتر لە ئارادابوو.

### ١ . شەڕی شۆڕشگێڕی گەل، تەسفیەکاری و خیانەت

وەک دەستەواژە هیچ گومانێکمان لە پێویستی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل نەدەکرد. پرۆسەیەکی بەمجۆرە بەڕێوە نەچێت نە ناسنامە نە ئازادی، هیچ یەکێکیان جێگای باس نەدەبوو. هەر بەو ئامانجەش لە هەنگاوەکانی سەرەتا کارمان لەسەر ڕۆڵی زەبر لە کۆمەڵگای مێژووییدا دەکرد. چونکە لە ڕاستیدا هێزەکانی توندوتیژی ڕووت لە مەیدان بوون کە هەر ڕۆژ و کاتژمێرێک تا مۆخی ئێسقانمان هەستمان پێیان دەکرد. فەتحکاری لە ڕێگای توندوتیژیەوە تەنیا وەک مافێکی باڵادەستی نەبوو، بەڵکو بە پێویستیەکی فەرمانی ئیلاهیش دادەنرا. هەروەک بە گشتی بەمجۆرە بوو، هێزە دەسەڵاتدارەکانی سەر کوردستانیش بەو ڕادەیەی ئەوە نەریتێکی باویان بوو، بەڵام بانگەشەکانی پشتبەستوو بە مۆدێرنیتەش بەو ئاراستەیە بوو. لە ڕابردووەوە کوردستان وڵاتێک یاخود پارچە خاکێکی فەتحکراو بوو. پێویستیەکانی فەرمانی خوداوەند جێبەجێکرابوو. کاتێک مۆدێرنیتەش هاتەئاراوە، ئیتر لەڕێگای بیانووی زیاترەوە هەرگیز مافی باڵادەستی جێگای گفتوگۆ نابێت. یاسای زۆرترین قازانج و پێداویستیەکانی پیشەسازیبوون خاکی بەرفراوان و بازاڕی دەکرد بە ناچارییەک. چەمکی سەروەری دەوڵەت ـ نەتەوە پشت بەو تیۆریەی هێز دەبەستێت کە هەرگیز پارچە نابێت و کەسی دیکەش پشکداری تێدا ناکات. تەنانەت ڕێگا نادرێت یاری بە بستێکی سنوورەکان بکرێت. بگرە دەستبەرداری لەبەردێکیشی ناکرێت. ئیتر خوداوەندێتیەک لەئارادایە کە دەڵێت: کون فەیەکون، بەمانایەکی تر خوداوەندێتی دەوڵەت ـ نەتەوە هەزار هێندەی خوداوەندە کۆنەکان خۆی بەهێز کردووە و لەمیانەی چەمکەکانی سەروەری، هێزی ناوەندی، کۆمەڵگای هۆمۆژەن، هاوڵاتی کۆیلەی ڕەها و چەمکی یەکانەیی هەر بوارێک (یەک وڵات، یەک زمان، یەک کلتوور، یەک ئاڵا، یەک سروود ...هتد) و هێزەکانی ژێر فەرمانی دەستلێنەدراوە و حاشا هەڵنەگرە. بچووکترین گفتوگۆ و تێزی بەرامبەر وەک مەترسیدارترین تاوان بەرامبەر بە"یەکێتی و یەکپارچەیی وڵات" دادەنرێت و بە قورسترین سزا دادگایی دەکرێت. لە زەمینەیەکدا کە تەواوی گوتە و کردارەکانی ئەمجۆرە هەلومەرجانە خۆیان سەپاندووە، پیشاندانی بچووکترین دژە بانگەشە تەنیا لەمیانەی خۆپاراستن لەڕێگای ڕێبازەکانی توندوتیژیەوە بەدیدەهات. ئەوە جێگای گفتوگۆکردن نەبوو، بەڵکو گفتوگۆ لەبارەی پێویستییە ستراتیژی و تەکتیکیەکانیەوە بوو. هەربۆیەش لەسەردەمی دەرکەوتنی PKK بەبێ هیچ دوودڵیەک ئامرازەکانی بەرگری ڕەوا بەکارهێنران. PKK ناچار بوو خۆی وەک جۆرێکی هێزی ملیس ڕێکبخات. لە دۆخێکی پێچەوانەدا بۆ تاکە ڕۆژێکیش نەیدەتوانی لەسەر پێیان بمێنێتەوە. لەسەر پێیانیش مابایەوە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ هێزەکانی دیکە نەدەما و لە تەسفیەبوون ڕزگاری نەدەبوو.

لێکۆڵینەوە لەبارەی شەڕەکانی گەلی شۆڕشگێڕی ئەو قۆناغە کرابوو. بە تایبەتیش ئەزموونەکانی ڤێتنام و ئەفریقیا ئەو بابەتانە بوون کە زۆرترین لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیان لەبارەوە کرابوو. لەو هەلومەرجانەی کە شەڕ و پێکدادانی دژوار لەنێوان هێزەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو و هەژموونگەراکان لە ئارادابوو، بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی سەرکەوتنی مەزنیان بەدەست هێنابوو. چەندین نموونە تیۆری رزگاری نیشتیمانیان دەسەلماند. لە دۆخێکی بەمجۆرەدا بەبنەماگرتنی مۆدێلی شەڕی رزگاری نیشتیمانی بۆ کوردستانیش دەستنیشانکرابوو کە داگیر کرابوو. ئەوەی لە قۆناغی گرووپەوە تا ئامادەکاریەکانی خۆرهەڵاتی ناوین مۆرکی خۆی لەو سەردەمەدا ئەو جۆرە مۆدێلەی شەڕبوو. لەسەرجەم کۆبوونەوەکانی پەروەردە، بەڵگەکانی کۆنگرە و کۆنفرانسەکان شەڕی شۆڕشگێڕی گەل لە سەرووی بابەتەکانی لێکۆڵینەوە، توێژینەوە و بڕیارەکانەوە دەهات. ئامادەکارییە کردارییەکانیش بەو ئاراستەیەوە بوو.

کردەوەکانی کودەتای سەربازی ١٢ ئەیلول، ئەشکەنجە ترسناکەکانی لە زیندانەکان لە سەرووی هەمووشیانەوە لە زیندانی دیاربەکر پەیڕەوکران و هەلومەرجەکانی ژیانی کۆمەڵگا کە بە تەواوی کرابوون بە کەمپەکانی کۆکردنەوە (گیتۆ) ساتێک زووتر دەستپێکردنی هەڵمەتی ستراتیژی نوێی دەسەپاند. لە سێدارەدان دەستبەکاربوو. چالاکیەکانی مانگرتن تامردن دەستی پێکردبوو. هەرچیەکی بکرێت تەواو کاتی خۆی بوو. مێژوو لێبوردنی بۆ درەنگ خستن نەبوو. لەراستیدا چالاکیەکانی لە چوارچێوەی بەرگری لەخۆکردندا بوون هیچ نەوەستان؛ بە ئاراستەیەکی کەم و زیادکردنەوە هەر بەردەوام بوو. ئەوەی پێویست بوو ئەنجام بدرێت، بەرەو پێشبردنی ئەو چالاکیانە بوو بۆ ئاستێکی بەرزتر. بە زیادیشەوە ئامادەکاری لەو پێناوەدا کرابوو. چاوەڕوانیکردن و خۆ خەریککردن لەپێناو ستراتیژی شەڕی گەلەری پشتبەستوو بەهێزی خۆیی، مانای هەڵپەرستی و ئۆپۆرتۆنیزم بوو، بەر لەوەی کودەتای ١٢ئەیلول رووبدات، لە چوارچێوەی ئەو راستیانەوە لە مانگی تەمموزی ١٩٨٠ بە پێشەنگایەتی هەڤاڵان کەمال پیر و مەعسوم قۆرقماز یەکەمین گرووپمان رەوانەی نیشتیمان کردەوە. دواتر لە رێگای سنوورەکانی ئێران و ئێراقەوە ناردنی گرووپ بەردەوام بوو. لەو سۆنگەیەوە؛ بە بڕوای من دەبووایە ساڵە هەستیارەکەی ١٩٨٢ (بەتایبەتیش بەهۆی ئەشکەنجە و مانگرتنەکانی دیاربەکرەوە) مسۆگەر ببێتە ساڵی هەڵمەتی نوێ. ناوەندی هەڵمەتی پراکتیکیمان بۆ وڵات، بۆ لۆلان گواستبوویەوە. چاوەڕوان بووین لەوێوە دەست بە هەڵمەتەکە بکەن. لەمێژبوو پەیوەندی پێویست و ناردنی هێز تەواو ببوو. ئەوانەی رۆڵی سەرکردایەتی مەیدانیان دەبینی بەبڕوای من لەبەر هۆکارگەل و پاساوێکی تا ئێستاش لەناوەڕۆکیان تێنەگەیشتم کەوتبوونە ناو هەڵوێستێکی پاسیفی راستڕەوانەوە. خۆیان بە دووبارەکردنەوە و کۆپیەکردنی هەمان پرۆسەی ئامادەکاریەکانی خۆرهەڵاتی ناوین سەرقاڵ کردبوو. ئەوە یەکەمین لادانی جددی بوو. ئەو لادانە تا رۆژی ئەمڕۆمان کاریگەربوو. نیگەرانیەکانم زیادی کردبوو، ئیتر یەکەمین رەخنە جددیەکانی خۆم دەست پێکردبوو. لە چەندین

ئاخافتن و ڕێنومابیدا دەشێت ئەو ڕەخنانە ببینرێت. هەرە دوایی لە مانگی یەکی ١٩٨٤ لە کۆبوونەوەی کۆمیتەی ناوەندیدا لەمیانەی بەرفراوانترین ڕەخنەوە گۆڕانکاری و پێشهاتەکان هەڵسەنگێنران.

لە هەمان ساڵدا هەڵمەتی ١٥ی ئاب زۆر درەنگ و ناشارەزایانە و بە شێوازێک دەستی پێکرد کە وەڵامی ئامادەکاریەکانمانی نەدەدایەوە. لە خودی چالاکیەکە زیاتر مانا هەنووکەیی و مێژووییەکەی گرنگ بوو. لەو سۆنگەیەوە مۆرکی خۆی لە قۆناغ داوە. سوپای تورک کە خۆی بە گوێرەی سەرکوتکردنی یاخیبوونە کلاسیکیەکانی کوردستان ئامادە و جێگیر کردبوو ئەو هێزەی نەبوو یەکسەر ئەو هەڵمەتە سەرکوت بکات کە خاوەن ستراتیژی و تەکتیکێکی جیاوازتر بوو. ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگر بوو کە ئەو سوپایە لە بەرامبەر تەکتیکە ئاساییەکانی گەریلایی شەڕی گەلەری کلاسیک بێچارە دەبێت. گۆڕانکاریەکانی سەرەتا ئەو ڕاستیەی سەلماند. بەڵام جێبەجێکردنێکی شارەزایانەی تەکتیکی گەریلایی شەڕی گەل لەلایەک دابنێین، بەڵکو جێبەجێکردنێکی ئاساییش جێگای باس نەبوو. ئەگەری مایەپووچکردنی هەڵمەت و دەرفەتێکی مێژوویی لەئارادابوو. سەرکردایەتی مەیدانی ناوەوەی وڵات بە سووربوونەوە بەرپرسیارێتی نەدەگرتە ئەستۆ. لەبەرامبەر سووربوونی ڕێبەرایەتی بەشێوەیەکی هەڕەمەکی کەوتبوونە ناو کار و خەباتی گروپەوە. بۆ یەکەمین جار هەڤاڵ مەعسوم قۆرقماز سەرنجی بۆ ئەم مەترسییە ڕاکێشابوو. دوای هەڵمەتەکە بەشێوەیەکی تێروتەسەل لەگەڵیدا ئاخافتم و دوای بەبیرهێنانەوەی پێویستیەکانی بەرپرسیارێتی دووبارە ناردبوومەوە کوردستان. وەک دەستگیرکردنە بێ چانسیەکەی هەڤاڵ کەمال پیر، شەهادەتی هەڤاڵ مەعسوم ـ بەبڕوای من هێشتا پێویستی بە ڕۆشنکردنەوە هەیە ـ یش چانسی سەرکەوتنی هەڵمەتەکەی کەمدەکردەوە. هەربۆیەش سەرجەم ئەو هەڤاڵانەی لە پێگەی سەرکردایەتی مەیدانیدابوون بۆ لای خۆمانمان بانگهێشت کردن. هێندە لێیان تووڕە ببووم بەبێ بەشداریکردنی هەمووانیان کۆنگرەی ١٩٨٦ ممان ئەنجامدا، زۆربەیانم بۆ ئەوروپا ڕەوانە کرد. لە ساڵی ١٩٨٧ەوە تا ٩/ ١٠/١٩٩٨ کە لە سوریا دەرکەوتم خۆم هەڵمەتە بەردەوام و نەپساوەکانم ئامادە دەکرد و دەمخستە جوڵەوە، بەمجۆرەش هەوڵمدەدا ئۆپۆرتۆنیزمی سەپێنراو و ژێتەم و کۆنترگەریلا مایەپووچ بکەم کە ئەو دۆخەیان بەباشی بۆ خۆیان بەکار دەهێنا. بەردەوامبوون و گەورەبوونی هێزی تێکۆشان فەراهەم ببوو. ئەو هەوڵانە بەتەنیا نەیاندەتوانی سەرکەوتن بەدەست بێنن؛ بەڵام دەیتوانی پیلانی تەسفیەکاری ئۆپۆرتۆنیزم و کۆنترگەریلا مایەپووچ بکاتەوە. هەرواش ڕوویدا. کاتێک گەیشتینە کۆتاییەکانی ساڵی ١٩٩٨ هەڵمەتی مێژوویی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕیمان مایەپووچ نەببوو. بەڵام زۆر لە سەرکەوتنی چاوەڕوانکراویش دوور بووین. ئەگەر هەڵوەستەیەک لەسەر هۆکارە ناوخۆییەکانی بکەین بە کورتی دەتوانین ئەوانە بڵێین:

أ ـ هەر لە هەنگاوی یەکەمەوە ستراتیژی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل و تایبەتمەندێتییە تەکتیکیەکانی بەلاوە نرابوون. جێگیربوونم لە خۆرهەڵاتی ناوین دۆخێک بوو بۆ یەکەمین

جار لە مێژووی هاوچەرخی کوردستاندا پێویستیی ستراتیژی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی جێبەجێدەکرد. ئەو هەلومەرجەی تێیدا جێگیربووم هەلومەرجێکی هاوسەنگیەکان بوو، ئەویش هیچ مەرجێکی بەسەر ئێمەدا نەدەسەپاند؛ نەک سازشکردن لەشەڕی گەل، بەڵکو هەڵگری هەلومەرج و دۆخێک بوو کە بۆ پشتیوانیکردن لەباربوو. پێگەیەکی ستراتیژی زۆر گرنگ بەدەست هاتبوو. هەم لەبواری پێشخستنی پەیوەندی ستراتیژی، هەمیش بۆ بەدەستهێنانی پشتگیری تەکتیکی بەتایبەتیش لەبواری پەروەردە و لۆجستیکدا هەلومەرجەکان بۆ پێشخستنی شەڕی گەل زۆر لەبار بوو. تا دوارادە قۆستنەوە و بەکارهێنانی ئەو هەلومەرجانە هەڵوێستێکی راست بوو و هەڵگری مانای مێژوویی بوو. ئەو کارەی دەبووایە ئەو گرۆپانە ئەنجامی بدەن کە پێشتر یان تازە چووبوونە وڵات، ئاواکردنی بڕیارگایەک نەبوو کە هەمان رۆڵ ببینێت. چونکە ئەوە پێویست نەبوو، بەمجۆرە دەبوو بە هەوڵێکی مایەپووچکردنی ئامادەکاریەکان. کامپەکانی لە ناوچەکانی لۆلان، خواکورک، گارا، زاپ، مەتینا ...هتد بوون نەیاندەتوانی رۆڵی بیقاع ببینن؛ تەنیا دەیانتوانی رۆڵی یارمەتی تەکتیکی ببینن. نە ئەو هێزەیان هەبوو نە پێویستیشیان پێی هەبوو. هەروەها دەیانتوانی سوود لە شەڕی نێوان ئێراق و ئێران ببینن. بە هەمان شێوە دەیانتوانی لەسەر بنەمایەکی راست ململانێ و شەڕی نێوان YNKوPDK تاوتوێ بکەن، بەشێوەیەکی گونجاو بۆ ستراتیژی و تەکتیکەکانی ستراتیژی شەڕی شۆڕشگێڕی بقۆزرێتەوە و سوودی لێببینرێت. بەر لە هەموو شتێک ئۆپۆرتۆنیزم لەو پەیوەندیانەدا سەریهەڵدا. جگە لە لاساییکردنەوەی پێگەکەی بیقاع؛ لاساییکردنەوەیەکی زۆر ناتەواو و دواکەوتوو، شتێکی دیکەی نەکرد. بەشێوەیەکی بابەتی هێزەکانمان کران بە پەدەگی ئێران، ئێراق، YNK و PDK.

لە راستیدا پەیوەندی لەگەڵ ئەو هێزانە کە دەبوو لە خزمەتی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل بەکاربهێنرێت و رێگا لە پێش گۆڕانکاری مەزن بکاتەوە، بووە هۆکاری زیادبوونی کاریگەری لادانی راستڕەوانە بەسەر هێزەکانمانەوە. هێزەکانمان تا بینەقاقایانەوە کەوتنە ناو نابەرپرسیارێتیەکەوە کە چاوەڕوانیم نەدەکرد. لە لایەکەوە پەیوەندی هاوچەشنی پاشکۆیەتی، لەلایەکی دیکەشەوە پەیوەندییە نابەرپرس و جڵەوکارەکان هەموو لایەکی پێچایەوە. لە کاتێکدا بڕیارگاکەی لۆلان خەباتە مێژووییەکەی بیقاعی بە نەبوو دانابوو، مێژووی لە خۆیەوە دەست پێدەکرد، ئەو گرۆپانەی رەوانەی باکووری کوردستان کرابوون جگە لە ئەحباب چاوشێتی بیریان لە پێشخستنی جۆرێکی دیکەی پەیوەندی نەکردبوویەوە. وێڕای ئەوەی چەندین ملیتان بە دەستی ئەندامە کۆنترگەریلا کۆنەکانی PDK کوژران، بەڵام هیچ تەگبیرێکیان وەرنەگرت. یەکینەکانی گەریلا کە لە باکوور و باشووری کوردستان زۆر بە ئاسانی دەیانتوانی هەرەسئاسا خۆیان گەورە بکەن و بەرەو پێشەوە ببەن، ببوون بە گرۆپی ئەحباب چاوش یاخود ئاوارە سەرخۆشەکان. تەنیا دەیانتوانی پەیوەندییەک پێشبخەن کە خۆراکیان دابین بکات. زۆربەشیان بە تەڵەوە دەبوون و راو دەکران. لە کاتێکدا لە هەلومەرجی شەڕ و پێکدادانی نێوان YNK و PDK دەرفەتی

پێشخستنی دەستپێشخەری شۆڕشگێڕی و هەنگاوێکی مێژوویی لە ئارادابوو؛ گەل لەژێر کۆنترۆڵی ئەو هێزانە دەربخرێت و بە ئاقاری شەڕی رزگاریدا ئاراستە بکرێت و ئامادەکاریەکان بەرامبەر بە کۆمەڵکوژیەکان ئەنجامبدرێت، لەژێرناوی ناوبژیوانی کردن خۆیان مایەپووچ دەکەن، هەروەک لە شەهیدبوونی هەڤاڵ محەمەد قەرەسونگور بینرا گورزی ستراتیژییان بەرکەوت. تا ١٩٩٠کان لەمیانەی ئەو چەشنە پەیوەندیانەوە تەنیا لە دەستدانی ئەو دەرفەتە مێژووییانە جێگای باس نییە، لەوەش مەترسیدارتر کەوتنە سەر هێڵی پاسیڤەوە. لە کاتێکدا دەرفەت هەبوو کە هەڵمەتی ١٥ی ئاب دەیان جار هێندەی تر کاریگەرتر ئەنجامبدرێت، بەڵام هەم درەنگ وەخت دەستیان پێکرد، هەمیش بەجۆرێک رووکەشی بوو کە لە چوارچێوەی "با دۆستان لە بازاڕدا بمان بینن" بەڕێوەچوو.

سیستەمی بڕیارگای ساختە کە لە ناوچەکانی ناوەوەی باکووری کوردستان بە تایبەتیش لە دەڤەری بۆتان ئاواکرابوون، وەک سێیەمین ڤێرسیۆن خۆی دووبارە دەکردەوە. کەمترین و سووک و چروکترین حیسابەکانی "ئاغایەتی شەڕ" یان لەسەر پشتگیرییە بەنرخەکەی گەل، توانا لۆجستیەکان و پاڵێوراوە بێ هاوتاکانی گەریلا دەکرد کە بە هەوڵ و رەنجێکی مێژوویی ئامادەکرابوون. هەر فەرماندەیەکی بەناو سەروو(باڵا) لەلایەک حیسابی باڵاترین ئاستی فەرماندەیی بۆخۆی دەکرد، لەلایەکی دیکەش سایوونی دەخستە ژێر پێی ئەوانەی لە هەمان پێگەدابوون. تەواوی مەسەلەکە بۆ ئەوە بچووک کرابوویەوە "کێ دەبێت بەکاریگەرترین کەس؟". کەسانێک کە لە خەونی خۆشیاندا هێندە ئامراز، پەیوەندی و پارە و پولەیان نەبینیبوو سەرقاڵی جێبەجێکردنی لێکدانەوە خۆپەرستیەکانیان بوون. لەو گرێیەی هەستکردن بە بچووکێتی هاتبوونە مەیدانەوە کە ریشەکەی بۆ سەدان ساڵ دەگەڕایەوە و کۆت و بەندەکانی خۆی شکاندبوو. بەهۆی ئەو لێکدانەوانەوە تۆزێک مابوو ئەزموونێکی شەڕی گەل مایەپووچ بێت کە دەرفەتی گەیشتن بە لوتکەی هەبوو. پاڵێوراوە بەنرخ، دڵسۆز، دلێر و فیداکارەکانی گەریلا دەبوونە قوربانی ئەو جۆرە ناڕەسەنی و نابەرپرسیارێتیانە. بەمجۆرە جاشایەتی بەسەر گەلدا سەپێنراو کەوتە ژێر کاریگەری کۆنترگەریلاوە؛ لە کاریگەری زیاتر بەڵکو بەجۆرێک لەجۆرەکان پێشکەشیان کرا و خرانە ژێر کۆنترۆڵیانەوە. سەرجەم گرووپ، پەیوەندی، پارە و ئامرازەکانی دیکە لەپێناو خزمەتکردن و خۆشگوزەرانی فەرماندە ساختە و دەوروبەرەکانیان سەفەربەر کران. ئەو لادانە راستڕەویەی لە ئاستی سەرەوە دەستی پێکردبوو بەشێوەی زنجیرەیەک تا خوارووترین ئاستی بەرپرسیاری یەکینە رەنگیدایەوە. سەرجەم ئاگاداری و رەخنەکانمان لەلایەن ئەو زهنیەتە و پەیڕەوکارەکانیەوە مایەپووچ دەکرایەوە. چەمکی چەتەی "چوارینە"، "سێیانە"و "تاکانە" کە دواتر لە هەر ناوچە و دەڤەرێک سەریانهەڵدا لە رۆژێکدا پەیدا نەبوون. ئەو لادانە راستڕەوانەی لەسەرەتاوە روویدابوو لە قۆناغی ٢٠٠٢-٢٠٠٤ دا رۆڵێکی دیاری لە راکردنی رەوەئاسای خائینەکان هەبوو.

ب ـ چەمکی لادانی ڕاستڕەوانە کە لەمیانەی ئەو جۆرە نموونانە لە بواری فەرماندەیی و ڕێکخستنیدا ئاشکرابوو، ڕەنگدانەوەی لەسەر شێوازی شەڕ زۆر وێرانکارتر بوو. نوێنەرانی ئەو چەمکە لەجیاتی پەرەپێدان و پێشخستنی شەڕی گەل، لە پێناو پاراستنی پێگەی خۆیان ئاشقی شێوازێک بوون کە لە هی سیخوڕێتی قێزەون و خراپترە. لەسەر ئەو بنەمایەش لەکاتێکدا گەریلاکانیان لە چالاکی بێمانا خەرجکرد، هێندە نارەسەن ببوون لەپشتەوە خەنجەر لەو فەرماندە ڕاستگۆ و دڵسۆزانە بدەن کە توانای پێشخستنی شەڕی گەریلایان هەبوو. بە تایبەتیش چەتەی چوارینە (شەمدین ساکک، شاهین باڵیچ، خلیل قایە ـ کۆرجەمال و جەمیل ئیشک ـ هۆگر) لەو بارەیەوە ببوون بە پسپۆڕ. سەرۆک چەتەکان لەوانەیە لەو لێکۆڵینەوە و ئەشکەنجەدانانەی لەژێر ناوی "سیخوڕەکان دەستنیشان دەکەین" بەڕێوەیان دەبرد شیمانەیەکی بەهێزە ڕێگایان لە پێش کوشتنی سەدان هەڤاڵی ڕاستگۆ و دڵسۆز کردۆتەوە. چەندین سەرۆک چەتەی وەک تەرزی جەمال (عەلی ئۆمورجان) و دکتۆر سلێمان (سەعید چروقایە) ببوون بە ئامێری هاڕینی شەڕڤانان و کادیران. وەک کونێکی ڕەش سەرجەم خەسڵەتە ئەرێنی و ڕەونەقدارەکانیان قووتدا. لەجیاتی پێشخستنی شەڕی گەل، بوون بە ئەندامێکی ڕێگریکردن و بەربەستکردنی شەڕ و تێکۆشان؛ بە جۆرێک کە ناقۆڵاترین ئەندامانی کۆنترگەریلایان دەربازکرد. لەو بڕوایەدام کە ئەوانە زۆربەیان سیخوڕ نەبوون. لەوانەیە هەندێکیان سیخوڕ بووبن. دڵنیام کە زۆربەیان لە ئاکامی کاریگەرییە سایکۆلۆژی ـ کلتووریەکەی پراکتیکی چەتەگەرێتی، ئەنجامی چەمکی لادانی ڕاستڕەوانە، شۆڕشگێڕێتی ناتەواو و جێبەجێنەکردنی بەرپرسیارێتی هاتوونەتە ئاراوە.

وێڕای ئەوەی لە گۆڕەپانی بەرپرسیارێتی خۆشمدا چەندین فاکتەری بەمجۆرە یاخود هاوشێوە لە ئارادا بوون، بەڵام چەمکی شۆڕشگێڕێتی و بەرپرسیارێتی تەواوم بەلانی کەم خراپەکارییە ڕۆژانەییەکانی ئەوانەی بەربەست دەکرد. ئەوەی لە ئارادابوو شەڕی گەل یان شەڕی گەریلایی نەبوو، بەڵکو چەمک و پراکتیکی چەتەگەرێتی سەرەتایی بوو. بەبێ ئەوەی سەرچاوە لە ناوەندێکی هێزی دەرەکی وەربگرن، خۆیان تەسفیەکارییان دەرهەق بە خۆیان جێبەجێ دەکرد. چەند چالاکیەکی کە بەڕێوەیان بردبوو کردبوویان بە بیانوویەکی خۆپاراستن بەرامبەر بە ڕێکخستن. کەچی لەڕاستیدا ئەو چالاکیانەی پشکێکی ئەوتۆی کەسێتی ئەوانی تێدا نەبوو، لەمیانەی بەکارهێنان و قوربانیکردنی فیداکار و بوێرترین گەریلاکانەوە ئەنجامیان دەدان. هەر یەکەیان تۆڕێکیان پێکهێنابوو کە کەسێتیان بپارێزێت و ڕەمەکە قێزەونەکانیان تێر بکات، ئەوەی پەنجەی بۆ ئەوە بردبایە دەسووتا. هەرچی ئەو هێزانەی بۆ دەستێوەردان و ڕاستکردنەوە ڕەوانەمان دەکردن لەنیوەی ڕێگا لەناو دەبران، بۆ نموونە؛ وەک لەناوبردنی هەڤاڵ هارون (حوسێن ئۆزبەی) و گرووپەکەی لەساسۆن. ئەوەی ڕوویدەدا شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی نەبوو، بەڵکو لە کەسایەتی کەسەکاندا ببوو بە شەڕ و ململانێی سەرەتایی نێوان چین، بنەماڵە و کەسەکان. بەمجۆرە دەرفەت و چانسی ئازادی لە دەستدەدرا. هەڵبەتە کاریگەری کۆنترا، دزەکردن و هاندانیان

لەئارادابوو، بەڵام دیاریکەر نەبوون. ئەوەی دیاریکەر بوو چەواشەکردن و شێواندنی شێوازی تێکۆشان و ژیانی پارتی شۆڕشگێڕی گەل، تیرکردنی هەوەس و بەرژەوەندییە شەخسی و چینایەتییە خۆپەرستەکان و حیسابەکانی گەیشتن بە پلەی سەرۆکایەتی بوو. لەو بڕوایەدابوون کە دەرفەتیان بۆ رەخساوە؛ لە بەکارهێنانی ئەو دەرفەتەش لەپێناو ناسنامە بنەماڵەیی و چینایەتیەکەیان دوودڵیان نەکرد.

کاتێک لادەرە راسترەوەکان هێزی جێبەجێکردنی سەرکردایەتی هاوبەشیان پێشاننەدا و رکابەران چاوی خۆیان تێبڕی، ئەوا چاوەڕوانی کوشتنی شێوازی تێکۆشان و ژیانی هەڤاڵانەیان لێدەکرا. هەر ئەوەش روویدا. هەروەک چۆن مێژووی شۆڕشەکان سەلماندوویەتی ئەگەر بەشێوەیەکی راست، لێهاتووانە و لەکاتی خۆیدا بۆشاییەکانی بوارەکانی سیاسی و رێکخستنی پڕنەکرێتەوە، ئەوا لەلایەن رکابەرانی شۆڕش پڕدەکرێتەوە؛ بەتایبەتیش لەریزەکانی شۆڕشدا لەلایەن رادیکاڵترین چەنەبازی و هەڵوێستە داپۆشەرەکانەوە پڕدەکرێتەوە. ئەو رێسایەی شۆڕشەکان جێبەجێ دەبوو. ئەو ئەندام و گرووپە دژە شۆڕشانەی لە کوردستان تەسفیە بوون، سەرلەنوێ کەسایەتی و مەیلەکانی چینی بەکرێگیراوێتی پشتیوانیان لەناو PKKدا زیندوو بوویەوە و تۆڵەیان لە کوردایەتی ئازاد دەکردەوە. ئەو چەشنە فاکتەرانە لە ناسنامەی کورددا مێژوویین، لە قووڵایی چینی سەروودا نەخشێنراون، هەڵپەرست و خائینن. لەو زەمینە، کات و شوێنەی چاوەڕوانی ناکرێت لە نواندنی چەپەڵێتیەکەیان دوودڵی ناکەن. تەنیا ئەوە بەسە کە ئەو ساتە بۆ بەرژەوەندیەکانیان لەباربێت و شوێنەکە دەرفەتی پێبدات. بە ئامانجی ئاشکراکردنی دەمامکی ئەو جۆرە کەسانە هەر لە سەرەتاکانی ١٩٨٠ کانەوە شیکاریم لەبارەی کەسایەتی، ناسنامە و چین پێشکەش کرد، بەڵام دەسکەوت و سەرکەوتنەکانیان سنووردار بوو. هەمان کەس بەو ئامانجەی ئەو شیکارانە لەبواری کرداریدا جێبەجێ نەکرێن هەموو جۆرە تەگبیرێکیان بۆ خۆیان دەکرد. هەروەها تاوتوێنەکردنی شیکارەکانم لە پەروەردەکاندا، هێشتنەوە و شاردنەوەی لەلای خۆیان هەندێک لەو رێگا و رێبازە سەرەکیانە بوون کە بەردەوام پەنایان بۆ دەبرد.

ج ـ شەڕی شۆڕشگێڕی گەل ماهیەتی شەڕی گەلی نەمابوو، ببوو بە شەڕی بەکارهێنانی توندوتیژی و سەپاندنی باڵادەستی بەسەر گەلدا. پشتگیرییە پێویست و مەزنەکەی گەل بۆ شەڕی گەل لەمیانەی رێبازە نائاساییەکانی گێرەشێوێنیەوە پێچەوانە کرابوویەوە، توێژێکی بەرچاو چارەسەری لە هانابردنە بەر هێزەکانی کۆنترا بینیبوو. خەڵکانێکی زۆر کە بە ئاسانی دەتوانرا بە ئاراستەی شەڕی گەل هۆشیار بکرێنەوە و رێکبخرێن و بکرێن بە سوپای گەریلا، بەڵام بەشێوەیەکی راست و تەندروستانە پەروەردە نەکران و رێکنەخراون؛ تەنیا وەک سەرچاوەیەکی دابینکردنی ئازووقە بەکارهێنراون. ئەندامانی کۆنترگەریلاش کە ئەو دۆخەیان وەک دەرفەتێک بینیوە، هەندێک تاوانی زۆر مەترسیداریان ئەنجامدا، بەمجۆرە بە زۆرەملێیانە گەلیان بەرەو خۆیان راکێشا، هێزەکانی دەوڵەت هەزاران گوندی خۆراگریان وێرانکرد، دەستیان بەسەر هەموو شتێکی

ملیۆنان لادێیدا گرت، بە هەژاری و نەداریەوە بەرەو مەترەپۆلەکان ناچاری کۆچیان کردن. یەکێک لە شاڵاوەکانی لەناوبردنی گەورەترین گەلی مێژوویان ئەنجامدابوو. زیاتر لە دە هەزار تاوانی تیرۆرکردن ئەنجامدرابوون. موڵک و سامانی گەل دەستی بەسەردا گیرابوو، چاویان بڕیبووە ناموسەکەی.

بەڕێوەبەرایەتی گەریلاش لە لادەرە ڕاسترەوەکان خراپتر جگە لە تێرکردنی خۆپەرستییە دواکەوتووەکەیان زیاتر نەڕۆیشتوون، ئەو فێڵبازە لادێیی و تەڵەکەبازە وردە بۆرژوازیانە سەیری ئەو کۆمەڵکوژیانەیان کردووە، بگرە لەڕێگای پراکتیکە چەوت و ناتەواوەکەیانەوە گەورەترین یارمەتیان پێشکەش بەئەنجامدەرانی ئەو کردەوانە کردووە. دیرۆک ئاشنای نموونەگەلێکی زۆر دەگمەنی بەمجۆرە بووە کە تا ئەو رادە بێ کەرامەت و بێ بەرپرسیارێتی بەرامبەر گەلەکەی رەفتار کردبێت و لە ئاست ژینۆسایدکردنی گەلەکەی بە داماوی و بێچارەیی بمێنێتەوە. چەند گرووپێکی گەریلایی هەبووایە کە بەشێوەیەکی وریا، تێرو تەسەل و بە پرەنسیپانە لەکاتی خۆیدا توانای پێشخستنی تەکتیکی شۆڕشگێڕانەیان هەبووایە، بەدڵنیاییەوە لەو قۆناغەدا دەیانتوانی سوپایەکی پەنجاهەزاری گەریلا بئافرێنن. بەڵام ئەو کەسانەی ئەو ئەرکەیان رادەپەڕاند دەستیان بۆ ئەو گەلە درێژنەکرد کە دووچاری شاڵاوی کۆمەڵکوژی هاتبوو. بگرە چالاکی بەرامبەر ئەشکەنجە، تاڵان و دەستدرێژیەکانیش جێگای باس نەبوو. سەدان لاوی بە ئامانجی بەشداربوون لە ریزەکانی گەریلا کەوتنەڕێ لەنیوەی رێگا رووبەڕووی لەناوچوون هێڵرانەوە. جگە لەو هێزەی دەیانپارێزێ و تێر خۆراکیان دەکات، وەک بڵێی خیانەت لەهەر شتێک کرابێت، پەیوەندیدار نەبوون. لە راستیدا لادانی راسترەوانەش هەندێک پێوەری تایبەت بەخۆی هەیە. بەڵام ئەو واقیعەی دەرکەوتە مەیدان راستی کەسایەتییەکی نا بەرپرسانە، لەهۆش خۆی چووە، بەهۆی بێ هیوایی یاخود ئاشق بەخۆبوونەوە ناناسرێتەوە، خاوەن پراکتیکێکە ناکەوێتە چوارچێوەی هیچ چەمکێکەوە. لەدوا شیکاردا ئەوانە رشانەوەی کلتووری نکوڵی و قڕکردن بوون. نەخۆشی زۆر لە قووڵاییدا بوو، لەو سۆنگەیەوە پێویست بوو رێبازەکانی چارەسەرکردنیش ریشەیی بێت.

د ـ تەکتیکەکانی گەریلا بەلاوەنرابوون. لەکاتێکدا هێزەکانی گەریلا بەشێوەیەکی دۆنکیشۆتانە هێرشیان دەکردە سەر قایمترین و پتەوترین سەربازگە و بەدەیان قوربانییان دەدا، هیچ بیریان لەو شێوە و شێوازانەی چالاکی نەدەکردەوە کە بە کەمترین زیان گەورەترین ئەنجامیان بەدەستدەهێنا. هیچ تەکتیکێکی نەخشە بۆدانراوی شەڕی گەلیان دانەهێنا. لەکاتێکدا لایەنی بەرامبەر زۆر پێشتر ئامانجی چالاکیەکانیانی شیکار دەکرد و بەگوێرەی ئەوەش تەگبیری خۆی وەردەگرت، گەریلا لەشێوازە بەهێزەکەی "لە کوێ، چۆن و چ کاتێک گورز دەوەشێنێت" دوورکەوتبوویەوە و پێچەوانەکەی پەیرەو دەکرد. هەرچی پێچەوانەی تەکتیکەکانی هێرش و بەرگری بوو ئەنجامیان دەدا. لە هەلومەرجە نالەبارەکانی کات و شوێندا بێمانانترین و مەترسیدارترین شێوەکانی هێرش و پاشەکشێ ئەنجامدەدران. بگرە نەیاندەویست بیر لەشێوە سەرکەوتووەکانی قەڵەمباز و پاشەکشێکان

بکەنەوە. بەشێوەیەکی بابەتی ئەوەی ڕوویدەدا کۆنتر گەریلایی بوو. ئەو کارانە بەرهەمی ئەو کادیرە نوێیانە بوو کە دوای کشاندنەوەی کادیرە کۆنەکان لە گۆڕەپانەکانی گەریلا، لە ساڵی ١٩٨٧وە لەو بڕوایەدابوون ڕێکخستنیان خستۆتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. ئەوانە لەلادانی ڕاستڕەوانەش خراپتر، تەواو ببوونە نموونەیەکی بێ بەرپرسیارێتی و ئارەزووپەرست. شتێکیان بە مێشکدا تێپەڕ نەبوو کە بە پەیوەندی و رایەڵەی ڕێکخستنی ناودەبرێت. تەواوی هونەرەکەیان ئەوەبوو تاکە کەسێکیش لە دەرەوەی کۆنترۆڵیاندا نەمێنێتەوە. تەنانەت بە ئامانجی کۆنترۆڵکردنی منیش، ئەگەر کۆنترۆڵ سەرنەگرێت لە پێناو لەناوبردنی من بیریان لە هەموو شتێکی چەپەڵ دەکردەوە. دەستبەسەرداگرتنی PKK ببووە ئەو تاکە ئامانجەی هەوڵیان بۆ دەدا. دەستیان بەسەر PKK دا گرتبووایە چیان دەکرد؟ تەسفیەکاریەکەیان ئەنجامگیر بووایە شانبەشانی پارە و پول پیاوان دەستی ژنێکیان دەگرت، ژنانیش دەستی پیاوێکیان دەگرت و پەنایان دەبردە بەر باشووری کوردستان یان ئێران، ئەوەشیان بەس نەبینیبووایە ڕێگای ئەوروپایان دەگرتەبەر و ئەو ژیانە سووک و ڕیسوایە دەژیان کە لە خەیاڵیاندا هەبوو. تەسفیەکاری ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ بەوپەڕی ڕاشکاوییەوە ئەو واقیعەی خستەڕوو.

دەتوانین بەڕیزکردنی خاڵە سەرەکیەکان لیستەکە درێژ بکەینەوە. لێرەدا خوازیاری پیشاندانی ئەو کارانە بووم کە بەناوی شەڕی گەل ئەنجامدرابوون. کاتێک ئەو قۆناغە هەڵدەسەنگێنم کە لە بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوە نادیاریەک لە ئایدیۆلۆژیای پارتیمان جێگای باس بوو، بەڵام ئێستاش لەو بڕوایەدام کە ستراتیژی شەڕی گەل ڕاست بوو و ئەنجامی بەدەستدەهێنا. شەڕی شۆڕشگێڕی گەل تاکە ستراتیژی ڕاستی ئەو قۆناغە بوو. ڕێبازەکانی دیکە جگە لەخزمەتکردنی کۆمەڵکوژی هیچ ڕۆڵێکی دیکەیان نەدەبینی. بەشێوەیەکی گشتی هەنگاوە تەکتیکییە بنەڕەتیەکانیش ڕاست بوون. جێگیربوون لە خۆرهەڵاتی ناوین، بەڕێوەبردنی پەروەردە و دابینکردنی پێداویستی لۆجستیکی، گەڕانەوە بۆ وڵات، پەرەپێدانی ئامادەکاری لە پێگە کاتیەکان و پێشخستنی پەیوەندی تەکتیکی لەو پێناوەدا ڕاست و تێروتەسەل بوون. ئەوەی نەبوو، سەرکردایەتی مەیدانی و نیازی جێبەجێکردنی تەکتیکە ئاساییەکانی گەریلا بوون. باسی پسپۆری پراکتیزەکردن ناکەم، چونکە ڕێگریێکیش بێت بەو هێزەی بەردەستی دەیتوانی ئاستێکی بەرزتری دەسکەوت و سەرکەوتن بەدەست بێنێت. ساڵانێکی درێژ هەوڵمدا هۆکارەکانی تووشبوونیان بەو دۆخە شیکار بکەم. بەهەمان شێوە هەوڵێکی مەزنمان دا تا ئەنجامەکانی و کاریگەرییە تەسفیەکاریەکەی بەربەست بکەین. کەموکورتی لە پەیوەندیەکانی گەلدا نەبوو؛ پشتگیری گەل بۆ شەڕێکی سەرکەوتوو بەس بوو. کەمی کادیران و جەنگاوەرانیش جێگای باس نەبوو. ئەوانەش زیاد بوون. چەک و تەقەمەنی و لۆجستیک، دەفەرەکانی جێگیربوون و گیرسانەوە لەناوەوە و دەرەوەی وڵات بە زیادەوە بەردەست بوون و لەباربوون. تەنیا ئەو کادیر و شەڕڤانانەی لەماوەی ١٩٨٠ تا کۆتاییەکانی ١٩٩٨ من ڕەوانەی نیشتیمانم کردنەوە ١٥ هەزاری دەرباز کرد. چەک و تەقەمەنی و پێداویستیە لۆجستیکیەکان هەموویان دابین

کرابوون. قورسترین بەرپرسیارێتم دەگرتە ئەستۆی خۆم، بەزەحمەتیەکی زۆرەوە بەشی هەرە زۆریانم بۆ دەڤەرەکانی کار و خەباتیان ڕەوانە دەکرد. کێشە، لادان و خیانەت دواتر سەپێنرا. سەرجەم پێدراو و نیشانەکان پیشانی دەدەن ئەگەر ئۆگۆیستی، لادان و خیانەت ڕوویندابووایە، ئەگەر سەربەخۆیی نەتەوەییش بە تەواوی بەدەست نەهاتبووایە، ئەوا بە دڵنیاییەوە چارەسەریەکی گونجاو دەهاتە ئاراوە. ئەو کار و خەباتەی بەڕێوەمان بردبوون بە زیادەوە شایستەی ئەنجامێکی بەمجۆرە بوو.

لەو بارەیەوە تا ئێستاش لێپێچینەوە لەگەڵ خۆمدا دەکەم؛ درێژە بە قاڵبوونەوە دەدەم تا بزانم هەڵە و کەموکوڕیەکانم کامانە بوون. پرسیارێکی دیکەی بەردەوام لە خۆمی دەپرسم ئەوەیە "ئایا دەبووایە سەرکردایەتی مەیدانی، واتە سەرکردایەتی ناوەوەی نیشتیمانیش بگرمە ئەستۆ؟". تا ئێستاش بەئاسانی ناتوانم وەڵامی ئەو پرسیارە بدەمەوە. دەتوانم بۆچوونێکی بەمجۆرەش بخەمەڕوو: کاتێک سەرکردایەتی مەیدانی بە داکۆکی و سووربوونێکی زۆرەوە هەوڵیدەدا من ڕاکێشێتە ناو وڵات بە ئەنقەست بێت یاخود بێئاگایی بەشێوەیەکی بابەتی زەمینەی بۆ تەسفیەکردنم ئامادە دەکرد. چونکە پێگەکەم لە دەرەوەی وڵات حیسابەکانی دەسەڵات و تەسفیەکاری زۆربەیانی مایەپووچ دەکرد. هەر لەبەر ئەوەش ناتوانم بیر لەوە نەکەمەوە بۆچی لە نزمترین ئاستیشدا بەشداری کار و خەباتیان نەدەکرد. شێوازی مانەوەم لە خۆرهەڵاتی ناوین لێکدانەوەی چەندین دەوڵەت، کەس و هێزی دەرەوە و ناوەوەی سەراوبن دەکرد. پەرچەکرداری هێزەکانی ناو ڕێکخستن بەرامبەر بەو دۆخە، بگرە لە نزمترین ئاستیشدا ئەرکەکانی خۆیانیان جێبەجێ نەدەکرد و مایەپووچیان دەکرد. سەرجەم کادیران و سەرکردایەتی مەیدانی ناوەوە تاوانبار ناکەم. بەهیچ جۆرێک گومان لە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی بەشی هەرە زۆریان ناکرێت. هەڵبەتە ئەو هەوڵ و کۆششەی زۆربەی زۆری کادیران و جەنگاوەران بە بوێری و فیداکاریەکی مەزن پیشانیان داوە مێژوویی و حاشاهەڵنەگرە، کەس ناتوانێت زمانی بۆ درێژ بکات. بێگومان سەرجەم دەسکەوتەکان ئەنجامێکی ئەو هەوڵە بەهادارانەن. کێشەکە لەوەدایە بۆچی ئەو ئەندامانە سنوورێکیان بۆ ئەو کەموکورتیانە و ئاراستەیە دانەنا کە تا خیانەت بەردەوام بوو. ڕەخنەیەکی زۆری ئەو کەموکوڕیە ئایدیۆلۆژی و سیاسیانەمان کرد کە ڕۆڵی لەو دۆخەدا بینی. جێگای پرسیار و لێپرسینەوەیە کە بۆچی لەو ساڵانەدا کەموکورتیەکانی خۆیانیان دەرباز نەکرد. ئەگەر لەسەر زەمینەی وڵاتیش بوومایە کارێکی لەوە زیاتر نەبوو بیکەم. چونکە لەڕاستیدا لەدەرەوە دەمتوانی کۆمەک و پشتگیری زیاتریان بکەم. بەردەوام ماتریاڵی نووسراو و زارەکی (بێتەل)ی پێویست لە خزمەتیان دابوو. هەربۆیەش کێشەکە سەرچاوەی خۆی لەوە نەدەگرت کە لە ناوەوەی وڵات نیم. ڕۆڵی فاکتەرە دەرەکیەکان لەوەدا بەشێوەی سەرەدێری سەرەکی دەستنیشان دەکەم، بەڵام ئەوەی دیاریکەرە فاکتەرە ناوخۆییەکانن.

ئێستاش لەو بڕوایەدام ئەگەر لەسەر بنەمای سیاسەتی دیموکراتیانە چارەسەریەک پێشنەکەوێت، ئەوا ناچارین ستراتیژی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی وەک ئامرازی سەرەکی

بەدەستهێنانی ناسنامە و ئازادی تاقی بکرێتەوە. لەو بڕوایەدام کە چارەسەری لەڕێگای سیاسەتی دیموکراتیانەوە بەدیدێت. تاکە مەرجی لەو پێناوەدا ئەوەیە کە پێویستە حکومەتەکانی تورکیا، سوریا و ئێران (هێزە دیاریکەرەکانی دەسەڵات) ئیرادەی رێگەچارەی سیاسیانە پیشانبدەن. لە دۆخێکی پێچەوانەدا ئەوەی دەکەوێتە رۆژەڤەوە چالاکی شۆڕشگێڕانەی گەل و پێشکەوتووترین شێوەکەی شەڕی شۆڕشگێڕی گەلە کە کۆنە بەڵام تا ئێستاش نۆژەنبوونی خۆی دەپارێزێت. شەڕی شۆڕشگێڕی گەل کە لە رابردوو لەمیانەی تەکتیکە ئاساییەکانەوە سەرکەوتنی خۆی سەلماندووە، دوای ئەو هەموو ئەزموونە سەرنەکەوتنی چاوەڕواننەکراوە. تەنانەت ئەگەر ژینۆسایدیش ئەنجامبدرێت ئەنجامەکە ناگۆڕێت. دوای ئەو هەموو گۆشەگیری و ریسواکردنەوە چاوەڕوانی بەردەوامکردنی ئەو رێبازانەی ئێستای کۆمەڵکوژی کلتووری ناکرێت. لەوانەیە هەندێک هێز داکۆکی لەسەر درێژەپێدانی ئەو رێبازانەدا بکەن، بەڵام ئەوەش وا دەکات ئەنجامەکە لە دژیان بشکێتەوە. لێرەدا کێشەی سەرەکی جێبەجێکردنی تەواو و راستی پێویستیەکانی شەڕی گەلە کە لە رابردوودا سەرکەوتنیان تێدا بەدەست نەهێنابوو.

## ۲ . شەڕی شۆڕشگێڕی گەل و رێککەوتنەکان

أ - هەر شۆڕشێک رێککەوتنێکە. لە شۆڕشەکاندا تەنیا دوو هێز لەبەرامبەر یەکتر نین، بەڵکو دوو دونیا رووبەڕووی یەکتر دەبنەوە. گەشەکردنی کۆمەڵگای گەردوونی لە ئایدیۆلۆژیای شۆڕشەکاندا کورت کراوەتەوە. لە ئایدیۆلۆژیای دژە شۆڕشیشدا هەمان رێسا جێگای باسە؛ لەمیانەی پوختەی ئەزموونی گەردوونی هێزە دژەکان دەجولێنەوە. لە واقیعی سیاسیدا رێککەوتنەکان کۆنکرێتی ترن. دۆخی رۆژانەیی سیاسەت زیاتر رێککەوتنەکان دەخاتەڕوو. ئەوەی ئایدیۆلۆژیای PKKی هێناوەتە ئاراوە، ئەزموونی سۆسیالیزمی بونیادنراوە. سۆسیالیزمی بونیادنراویش راستینەیەکە بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا کارەکتەری ئەنتەرناسیۆنالیستانەی خۆی خستۆتەڕوو. تەنانەت مانای وشەی ئەنتەرناسیۆنالیزمیش هاوکاری و رێککەوتنی نێو نەتەوەیی لەخۆوە دەگرێت. لە بواری سیاسیدا لە هەلومەرجەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراودا PKK هەوڵی بوونی خۆی داوە. بەگوێرەی هەلومەرجە نەتەوەیی و نێونەتەوەییەکان لایەنگریکردنی کامپی سۆسیالیستی بونیادنراو، لە سەردەمی دەرکەوتنی بزووتنەوەکەمانەوە دەستنیشان کراوە. کێشەکە سەرچاوەی خۆی لەچەمکی رێککەوتنی تیۆری وەرنەدەگرت، بەڵکو پەیوەندی بە چۆنیەتی شێوەگرتنی بوو لە بواری پراکتیکیدا. هەوڵەکانی چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە هەلومەرجەکانی سۆسیالیزمی تورکیادا بژارێکی راستە. ناکرێ لە دەرکەوتنی PKK دا نکوڵی لە رۆڵی بزووتنەوەی سۆسیالیستی تورکیا بکرێت. بوێری بزووتنەوەی سۆسیالیستی تورکیا بۆ شەڕ نەبووایە، بانگەشەکردنی بوێری PKK بۆ راگەیاندنی شەڕی شۆڕشگێڕی تەنیا شیمانەیەک بوو. کەواتە بەر لە هەموو شتێک رێککەوتنی نێوان

پێشەنگی شۆڕشگێڕی گەلان پێویستیەکی سروشتی کۆمەڵایەتیانە کە چارەنووسیان لەژێرچەتری هەمان دەوڵەت دایە.

بەشێوەیەکی تیۆری هاوکاری تورک، کورد و گروپە کلتووری و چینایەتیەکانی دیکە حاشاهەڵنەگرە. ئەوەی جێگای گفتوگۆیە، ئەو دابڕان و پچڕانەیە کە لە پراکتیزەکردندا ڕوودەدات. هەوڵەکانی هێزە تەسفیەکار و خیانەتکارەکان ڕۆڵیان لەوەدا بینیوە کە بەرژەوەندییەکانیان زیانی بەرکەوتووە و دزەیان کردۆتە ناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕییەوە. هەرسنەکردنی بزووتنەوەی PKK کە وەک بەشێکی ناو بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی تورکیا گەشەیکرد و خۆ دەرهەستکردن لێی، مسۆگەر تەنیا لەمیانەی ئەو سیخوڕانەوە ڕوودەدات کە بە ئەنقەست یاخود بێ ئاگایی وەک ئایدیۆلۆژیای نەتەوەی دەسەڵاتدار دزەیان کردۆتە ناو ریزی شۆڕشگێڕانەوە. جیاوازی نەتەوەیی و چینایەتی نابێتە کۆسپی بەردەم ڕێککەوتنەکان. بە پێچەوانەوە وەک ئەنجامێکی ئەو جیاوازیانە ڕێککەوتنەکان گرنگ و بایەخدارتر دەبن. لە ئامانجە شۆڕشگێڕیەکاندا ڕێککەوتنی نێوان بچووکترین یەکینەکانیشی پێویستە. وەک چۆن دەشێت لەناو خودی هەمان ڕێکخراو جێگای باس بێت، دەشێت لەنێوان ڕێکخراوە جیاوازەکانیشدا ئەنجام بدرێت. ئەنجامنەدانی ڕێککەوتنی جێگیر لەناو بزووتنەوە سۆسیالیستی و دیموکراسیخوازەکانی تورکیادا، لەنزیکەوە گرێدراوی هەوڵی هێزە دژە دیموکراسی و دژە ـ سۆسیالیستیەکانە. بەبێ ئەوەی ببێتە هێزێکی سیاسی، ئایدیۆلۆژیای شۆڤینیزمی کۆمەڵایەتی خۆی ئاشکرا دەکات. ئەو گۆشەگیری و بە ئەویدی کردنەی سەبارەت بە کێشەی کورد و چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە پەیڕەو دەکرێت، پەیوەندی بە کاریگەری دژە شۆڕش و سیاسەتەکانی پەرتکە ـ زاڵبەوە هەیە. سەرجەم ئەو گۆڕانکاری و پەرەسەندنانەی لە سەردەمی دەرکەوتنی PKK هاتنەئاراوە ڕۆڵی کاغەزی شیکردنەوە و پێوانی بینی؛ ناسنامەی ڕاستەقینەی سەرجەم ئەو ئەندامانەی ئاشکراکرد کە دزەیان کردبوویە ناو تێکۆشانی شۆڕشگێڕییەوە. دوای کودەتای ١٢ی ئەیلول هەڵواسینی چالاکی گروپە سۆسیال شۆڤینیەکان ناشێت تەنیا لەمیانەی سیاسەتەکانی فشار و سەرکوتکاری فاشیزم ڕوون بکرێتەوە. جێگیری و پەرەسەندنی ئەو هێزانە تەنیا لەمیانەی لایەنگیریکردنی ناسنامەی کورد و تێکۆشانی ئازادیخوازی دەبوو، واتە تەنیا لەمیانەی بوێری ڕێککەوتن لەگەڵ PKKدا بەدیدەهات.

دوای ١٩٨٠ جارێکی دیکە PKK لە خۆرهەڵاتی ناوین هەوڵیدا سەرجەم هێزە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکان پشکداری لە دەرفەتی سەرلەنوێ خۆڕێکخستنەوە و تێکۆشاندا بکەن. بەو ئامانجە چەندین دیدار و کۆبوونەوەمان ئەنجامدا. پلاتفۆرمی بەرەی بەرخودانی یەکگرتووی دژە فاشیزممان دامەزراند. بەڵام کە کاتی هەنگاونانی کرداری هات، پێشوەخت ئەو هێزانە هەمان ئەو کارانەیان کرد کە دواتر تەسفیەکارانی ناوخۆ هەوڵی ئەنجامدانیان دا و ڕێگای ئەورووپایان گرتەبەر. لە ئەورووپا سەرقاڵی تەسفیەکردنی ناوەڕۆکی شۆڕشگێڕانەی بزووتنەوەکانیان بوون. بەتایبەتیش ئەندامە دەسەڵاتدارەکانی ناو Dev–yol هەوڵێکی زۆریان دا کە شانبەشانی ڕێکخستنی خۆیان ناوەڕۆکی

شۆڕشگێڕانەی PKKش لە ناوبەرن. لەراستیدا پەیوەندی و تواناکان، لایەنگران، کادیران و جەماوەری Dev-yol لە هەموو لایەنێکەوە لەهی PKK بەهێزتر و پێشکەوتووتر بوو. ئەگەر ستراتیژی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی پەسەندکرابووایە، ئەو پەیوەندیی و دەرفەتانە بخرابایە گەڕ و لەمیانەی تەکتیکی هاوبەشەوە دەستبەکار بووایە، ئەوا وەرچەرخانی سۆسیالیستی و دیموکراسیخوازانەی تورکیا ئاستی زۆر جیاوازتری بەدەستدەهێنا و بە قۆناغی جیاوازتر دەگەیشت. بەتایبەتیش ئەو تەسفیەکاریەی لە کەسایەتی تەنەر ئاکچامی سەرۆکی کرێکارانی شۆڕشگێڕی ڕێکخستنی ئەوروپای Dev-yol خۆی سەپاند، ڕۆڵێکی گەورەی لە تەسفیەکردنی بزووتنەوەی سۆسیالیستی و دیموکراسیخوازی تورکیادا بینی. ئەو مەیلە تەسفیەکارییە چەندین هێزی لەگەڵ خۆیدا پەلکێشی ئەوروپا کرد و هەوڵیدا ستراتیژی شەڕی شۆڕشگێڕی گەلی PKK گۆشەگیر بکات. هەندێک لە ئەندامە بەرپرسەکانی PKK ی لە ئەوروپای کردە ئامراز و وێرانکاریەکی مەزنیان ئافراند. لەوە بەدواوە چیترDev – yol نەهاتەوە هۆش خۆی. ئەگەر ئەو هێزە لە خۆرهەڵاتی ناوین جێگیر بووایە و بەرخودانێکی سنووورداریشی کردبووایە، ئەوا لەمیانەی هێزێکی چینی شۆڕشگێڕی زۆر گەورەتر لەهێزی فاشیزمی MHP وە دەیتوانی دەمامکی سۆسیال دیموکراتی CHP داماڵێت و خۆی ببێتە سەرەکیترین پارتی ئۆپۆزسیۆنی دژ بە سیستەم. چەندین نموونەی هاوشێوە لە تەواوی جیهاندا ڕوویداوە. هەروەها ئەگەر ئەو هێزە ڕێککەوتنی لەگەڵ PKK ئەنجام دابووایە، ئەوا لە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد و کرانەوە دیموکراسیەکاندا دەیتوانی ببێتە هێزی پێشەنگ. بەمجۆرەش زەمینەی بۆ کرانەوە ساختەکانیAKP ش نەدەڕەخسساند. مەیلی تەسفیەکارانە بە ئەنقەست و بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو ئەو دەرفەتە مێژووییەی بە فیڕۆدا. پێویستە سۆسیالیست و شۆڕشگێڕە بەهەڵوێستەکان زۆر بە باشی لێکۆڵینەوە دەرهەق بەو مێژووە کورتە بکەن. زۆر باش ئاگادارم کە ئەو مەیلە تەسفیەکاریە ئەندامی زۆر بەهاداری بزووتنەوەکەمانی لەناوبرد. هەروەها ئەگەر ئەو مەیلە تا ئێستاکەش دژ بە کەسایەتی من درێژە بە پروپاگەندە چەواشەکاریەکانی دەدات خاڵێکە پێویستە بەتایبەتی هەڵوەستەی لەسەر بکرێت.

سەرکردایەتی Devsol (چەپی شۆڕشگێڕ)یش هەڵوێستێکی جێگیر و بە پرەنسیپانەی پیشاننەدا. سەبارەت بە جێگیربوون لە خۆرهەڵاتی ناوین و بڵاوکردنەوەی بەرخودانی شۆڕشگێڕی لە کوردستانەوە بۆ تەواوی تورکیا کراوە نەبوو. نەیویست هەندێک هەڵوێستی دۆستانە پێشبخات، بەلای کاری هاوبەشدا نەهات. ئەگەر هەندێک لە کادیرانی Devsol بە تایبەتیش ئەوانەی پەیوەندییان لەگەڵ بەستبووین، واتە بەدری یاغان و گروپەکەی پاشەکشێی ئەستەنبوڵیان نەکردبووایە و لەناو نەچووبانایە، بەشێوەیەکی هاوبەش و برایانە لەگەڵ هێزەکانماندا بجوڵابانایەوە، ئەوا دەیتوانی ئەو بۆشاییە شۆڕشگێڕییە پڕبکاتەوە کە Dev – yol دروستی کردبوو، بەمجۆرەش دەبوو بە

بەهێزترین بزووتنەوەی ئۆپۆزسیۆنی شۆڕشگێڕی تورکیا. ناجێگیری و بێ پرەنسیپی سیاسەتەکانی ڕێککەوتن ئەوانیشی تووشی تەسفیە کرد.

بێگومان چەندین گروپ و کەسایەتی ئازای لە نەریتی گەلی تورکەوە هەڵقوڵابوون و خۆیان بە چەپ پێناسە دەکرد، جێگای خۆیان لەناو تێکۆشانی ئازادیخوازی و ناسنامەی ئەنتەرناسیۆنالیستی PKK دا گرت و لایەنگریان کرد. ڕێککەوتن و یەکێتییان لەگەڵ PKK پەرەپێدا. چەندین کادیری کوڕ و کچی بە بنەچە تورک، لەسەرووی هەمووشیانەوە هەڤاڵان حەقی قەرار و کەمال پیر، وەک بەنرخترین کادیرانی PKK تا شەهیدبوون لەریزی پێشەوەی تێکۆشان جێگای خۆیان گرت. تا ئێستاش چەندین هەڤاڵی بەو شێوە لەناو ریزی بزووتنەوەکەمان دان. هەروەها لە سەرەتاوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان چەندین کەسایەتی و گروپ پێویستیەکانی دۆستایەتی و ڕێککەوتنیان جێبەجێ کردووە. بەڵام زۆربەی زۆری هێزە چەپڕەوەکان یان لەژێر هەژموونی سەربازی و ئایدیۆلۆژی فاشیزمی تورکی سپی بێدەنگ کران، یان بە ئەنقەست یاخود لەخۆیەوە بوو بە یارمەتیدەری ئەو هەژموونگەراییە. ئەو هەڵوێستەی پشتگیریکردنی هەژموونگەرایی ئەو مانایە دەگەیەنێت کە ئەندامانی کۆمەڵگای تورکی مۆدێرن ئەو پەیوەندییە ستراتیژیەیان لەبیر کردووە یاخود نایانەوێت لێی تێبگەن کە بووە بە نەریتێک و لەسەردەمی شەڕ و سەرکەوتنی هاوبەشی تورک ـ کورد لە ساڵی ١٠٧١ لە مەلازگرد دژ بە ئیمپڕاتۆریەتی بێزەنتیەوە بەردەوامە. هەروەها ئەو هەڵوێستەیان سەرچاوەی خۆی لە نکوڵیکردنی ئەو ڕاستییە وەردەگرت کە دەسەڵات و ژیانی هاوبەش بەردی بناغەی پەیوەندی مێژوویی نێوان ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا پێکدێنێت. کاتێک ئەندامانی مۆدێرنیتەی تورکی سپی مێژوو بە ژینۆسایدی ١٩٢٥ ی کوردان دەست پێدەکەن، سەرچاوەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هوشیارییەکی ساختە و نکوڵیکارانەی مێژوو و کۆمەڵگایان ئافراندووە. بە هەمان شێوە کاتێک سەنتێزەگەرا تورک ـ ئیسلامیەکانی قۆناغی کۆن و نوێ کوردێتی پەراوێز دەکەن و پشتگیری لە ئاسیمیلاسیۆن دەکەن سەرچاوەی خۆی لە نەخۆشی دەروونی ئوممەتگەرا ئیسلامیگەراکان وەردەگرێت کە کاریگەری هەمان چەمکی ژینۆسایدیان لەسەرە. هوشیارییەکی ڕاستی کۆمەڵگا و مێژوو پیشانیدەدات کە هاوبەشێتیەکی قووڵ و پەیوەندییەکی ئازاد و یەکسان بەگشتی لەنێوان کلتوورەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا، بەتایبەتیش لەنێوان کلتووری کۆمەڵایەتی تورک و کورد لەئارادایە، ئەو پەیوەندیانەش مانایەکی ستراتیژی و ژیانییان هەیە.

ئایدیۆلۆژیای تورکێتی مۆدێرن بەسەرجەم فاکتەرە ڕاستڕەو، چەپڕەو و ناوەندگەراکانیەوە خاوەنی هەمان شێوەی هوشیاریی کۆمەڵگا و مێژوون. تورکێتیەکی هۆمۆژەن، هوشیاریی کۆمەڵگا و مێژوو وەک بۆچوونێکی پیرۆز و نەگۆڕ دەبینن. بەشێکی چەمکی ئوممەتی نەریتییان بۆ میللیگەرایی عەلمانی، بەشێکی تریشیان بۆ سەنتێزی تورک ـ ئیسلام گۆڕی و جێگیریان کرد، بەمجۆرە ئایدیۆلۆژیایەکیان ئاواکرد کە ساختەیە و لایەنی نکوڵیکردنی لەپێشە. لە ئایدیۆلۆژیای تورکی مۆدێرندا؛ "هەر لە سەرەتاوە

تورکێتی نەتەوەیەکی هۆمۆژەن و جیهانگیرە. بەردەوام بەشێوەیەکی ئازاد و سەربەخۆ ژیاوە. بەبێ پشتبەستن بە هیچ ڕێککەوتنێک، بەدوای حوکمڕانیکردنی جیهانەوە بووە و ماوەیەکی درێژخایەنیش حوکمڕانی کردووە. بونیادە کۆمەڵایەتیەکەی یەکپارچەیە و دابەشبوون پەسەند ناکات. کۆمەڵگایە کە سوپا وەک شکۆدارترین بەها پەسەند دەکات. لە نەژادێکی ساف و پەتی پێکهاتووە". بەڵام لە ڕاستیدا ئەو ئایدیۆلۆژیایەی لەژێر ناوی جۆن تورک لەلایەن بیانیەکانەوە بەتایبەت لەلایەن ئایدیۆلۆگە زایۆنیستەکانەوە ئاواکراوە وەک ڕاستیەکی کۆمەڵایەتی مێژوویی هیچ پەیوەندیەکی بە کلتووری کۆمەڵگای تورکیەوە نییە یاخود ئەو کلتوورە بەبنەما نەگیراوە. شێوازێکی دەربڕینی میتۆلۆژیانەیە. ئەوەی لەژێر دەمامکی تورکێتیدا بونیادنراوە دیکتاتۆریەتی وشکی چینایەتییە، بە مانایەکی تر قۆرخکاریی فاکتەری مۆدێرنیتە بەشێوەی ئیسرائیلی ــ بەرایی وێناکراوە و بونیادنراوە. لەو سۆنگەوە؛ ڕۆڵێکی هەژموونگەرایی لەسەر ئەو کلتوور و گرۆپە کۆمەڵایەتییانە بینیوە کە لە هەلومەرجی مۆدێرندا پێکهاتوون و پەراوێزخراون. یەکپارچەیی پێکهاتەیەک جێگای باسە کە لەژێر هەژموونی ئایدیۆلۆژی و سەربازیدا لاڕێکراوە، نکوڵی و ئاسیمیلە کراوە. لەجیاتی حەقیقەتی هوشیاریی کۆمەڵگا و مێژوو، سەرجەم بۆچوونە ڕاسترەو، چەپڕەو و ناوەندگەراکانی پشکی خۆی لەو ئایدیۆلۆژیا ساختە، نکوڵیکار، قڕکەر و ئاسمیلاسیۆنیستە وەرگرتووە لە بینینی ڕۆڵێکی تاکڕەوانە، ئۆگۆیست و شۆڤێنیستانە دوور ناوەستن و دوودڵی ناکەن. لەوەش مەترسیدارتر؛ لەبەرئەوەی کراوە بە ئایدیۆلۆژیای فەرمی، بەشێوەیەکی ناچاری لە قوتابخانەی سەرەتاییەوە تا ئاستی ئەکادیمی بەسەر هەر کەسێکدا دەسەپێنرێت و لە زهنیاندا جێگیر دەکرێت؛ زەحمەتە لەدەرەوەی کاریگەریەکانیدا بمێنیتەوە. کاتێک ئەوە ببێتە مەرجی سەرەکی فەرمانبەرێتی، دۆزینەوەی کار، قەرز وەرگرتن و پەسەند کردنت لەلایەن دەوڵەت و چینی دەسەڵاتدار وەک ئەندامێکی سوودبەخش، ئەوا زۆر ئەستەمە هاوبەشێتی تێدا نەکرێت. ئەو واقیعە لەژێر دۆخی بەتەنیا مانەوە و گۆشەگیری هێزە رکابەرەکانی سیستەم شاراوەیە کە ناتوانن دۆستایەتی و ڕێککەوتن پێشبخەن.

نەک تەنیا بۆ پێشخستنی ڕێککەوتن و دۆستایەتی مانادار لەنێوان هێزە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکانی کورد و تورک، بەڵکو بۆ پێشخستنی وەها دۆخێک لەنێوان سەرجەم هێزە کۆمەڵایەتیەکانی گەلان بەر لە هەموو شتێک پێویستی بە هوشیارییەکی ڕاستی دیرۆک و کۆمەڵگا هەیە. ئەگەر پێناسەیەکی ڕاست بۆ ئەو پەیوەندییە نەکرێت کە بە درێژایی مێژوو لەنێوان کلتوورەکاندا هەبووە، ئەوا لە ڕۆژی ئەمڕۆماندا ناشێت ڕێککەوتن و پەیوەندی دادپەوەر، یەکسان و ئازادانە پێشبخرێت؛ دەستوورێکی دیموکراتیک بەرهەم نایەت کە بەرجەستەترین گوزارشتی ئەو پەیوەندی و ڕێککەوتنانەیە. لەو پێناوەشدا پێویستە مۆدێرنیتەی تورک دەستبەرداری زهنیەتی فاشیزمی تاکپەرستی بێت کە نکوڵی لە مێژووی تورکیش دەکات و بەها کلتووریەکان بە نەبوو دادەنێت، لەجیاتی ئەوە

پێکهاتەی فرەکلتووری کۆمەڵگا و مێژووە دەوڵەمەندەکەی پەسەند بکات. وەک چۆن ئەو هێزە کۆمەڵایەتیانەی بەلانی کەم بەرژەوەندییان لە بەیەکەوە ژیانێکی دۆستانە و برایانەی ناو هەمان سنوور دایە کاتێک ڕێز لە ڕاستینەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی یەکتری دەگرن و بەشێوەیەی ئازاد و یەکسان یەکتری پەسەند دەکەن، وەک چۆن دەبێتە بناغەی دۆستایەتی و ڕێککەوتنی درێژخایەن و هەمیشەیی، ئەوا بنەمای یەکێتی هێز و چالاکی ڕۆژانەییشە؛ ناوەڕۆکی بونیادنانێکی هاوبەشانەی ڕژێمێکی دەستووری دیموکراتیانەیە.

ب ـ PKK پارتێکە لەناو سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراودا هاتۆتە ئاراوە. لە هەردوو بواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیشەوە ئەو سیستەمەی بەبنەما گرتووە. هەرچەندە لەسەرەتاوە هەڵوێستی بەرامبەر ئەو لادانە ڕاستڕەوە ریڤزیۆنیستە پیشانداوە کە دزەی کردۆتە ناو بونیادەکەیەوە، PKK بەشێوەیەکی ڕێزدار نزیکی سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوویەوە. هەڵوێستی بەرامبەر وڵاتە سۆسیالیستەکان لەسەرووی هەمووشیانەوە یەکێتی سۆڤێت ڕەخنەگر و دۆستانە بوو. بەهەمان شێوە بەرامبەر بزووتنەوە سۆسیالیستیەکانی وڵاتانی دیکەش درێژەی بە هەڵوێستی بە پرەنسیپانەی خۆی داوە. هەوڵیدا کێشەی کورد وەک مەسەلەیەکی دونیای هەژموونگەرایی سەرمایەداری نەمێنێت و بیکات بە بەشێکی سیستەمی دونیای سۆسیالیستی. دوای دەرکەوتنی بۆ دەرەوەی نیشتیمان لە ١٩٨٠ بەدواوە ئەو هەڵوێستە ئایدیۆلۆژیەی بۆ گۆڕەپانی نێونەتەوەیی گواستەوە. پەیوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت بەست کە ئەوکاتە نوێنەری سیستەمی سۆسیالیستی بوو. پەیوەندی هاوشێوە لەگەڵ پارتە سۆسیالیستیەکانی ئەوروپاش پێشخران. بەڵام بەهۆی ئەو ریڤزیۆنیزمەی لە ئاستی دونیادا مۆرکی خۆی لە سیستەم دابوو ئەو پەیوەندیانە بە ئاستی خوازراو و چاوەڕوانکراو نەگەیشتن؛ سنوورە تەکتیکی و ئامانجە بەرژەوەندیخوازەکانی تێپەڕنەکرد. هەڵوێستە بەرژەوەندیخوازیەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیستی بونیادنراو دەرباز نەکران. سیستەمی سۆسیالیستی سیاسەتی قۆستنەوەی بەرژەوەندیخوازی دەوڵەت ـ نەتەوەی سیستەمی سەرمایەداری بەبنەما گرت. ئەو چەمکەی هەر لە سەرەتاوە بەسەر سیستەمدا زاڵ بوو وەک چۆن دەسکەوتە سۆسیالیستیەکانی لەناوبرد، پەرەسەندنی ئەڵتەرناتیڤانەی پەیوەندییە ئەنتەرناسیۆنالیستەکانیشی بەربەرست کرد. ئەو پەیوەندییانە کران بە ئامرازی بەرژەوەندی هەژموونگەرایی.

بەڵام دیسان بەکارهێنانی ئەو زەمینە لەلایەن PKKوە، بە مانایەکی دیکە ڕەفتارەکانی وەک پارتێکی ڕاستەقینەی ئەنتەرناسیۆنالیست گرنگیەکی مەزنی هەیە. گەیاندنی بزووتنەوەی کورد بە ماهیەتێکی دیموکراسیخوازی و سۆسیالیستی، بەستنەوەی بە ستراتیژیەتی شەڕی گەلی درێژخایەن، ناساندنی لە ئاستی جیهان و لەسەر بنەمای ئازادی و یەکسانیەوە ئامادەکردنی بۆ ژیانێکی هاوبەش لەگەڵ گەلە دراوسێکاندا، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ گەلی تورکدا، ئاکامی پابەندبوونە بە ئەنتەرناسیونالیزم. خۆڕاگری و لەسەرپێ مانەوەی لەسەردەمی هەڵوەشانەوەی

سیستەمی سۆسیالیستیدا پابەندبوونی بە ناوەڕۆکی سۆسیالیزمی زانستی پیشاندەدات. وەک بزووتنەوەکانی دیکەی رزگاری نیشتیمانی PKK بەرەو میللیگەرایی (ناسیۆنالیزمی) بەرتەسک نەڕۆیشت. توانی ئەو نادیارییە ئایدیۆلۆژییە دەرباز بکات کە سەرەتا لە ئارادابوو. تێکۆشانێکی سەرکەوتووانەی بەرامبەر فاکتەرەکانی ئیندوستریالیزم و دەوڵەت - نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەڕێوەبرد کە مۆرکی خۆی لە سۆسیالیزمی زانستی یاخود بونیادنراو دابوو. لەمیانەی گۆڕانکاری و وەرچەرخانەوە رۆڵێکی گرنگی بینی لە پێشخستنی پارادایمی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەی ئەڵتەرناتیڤی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دانانی سنوورێک لەنێوان خۆی و رێبازی دیکەی مۆدێرنیتەدا. لە خۆرهەڵاتی ناوینی دوای ١٩٨٠کان دوای ئیسرائیل و رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستین PKK وەک سێیەمین هێزی دینامیک جێگای خۆی گرت.

ج - وەک هێزێکی سیاسی رێککەوتنەکانی PKK لە خۆرهەڵاتی ناوین، ئەورووپا و ناوچەکانی دیکە گرنگ و بایەخدارە. هۆکاری هەڵبژاردنی گەرمترین ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوین وەک شوێنی جێگیربوونی PKK دوای ١٩٨٠کان پەیوەندی بە تایبەتمەندییە شۆڕشگێڕیەکەیەوە هەیە. ئەو دەڤەرە رۆڵێکی ستراتیژی هەبوو سەبارەت بە دانەبڕان لە تێکۆشانی شۆڕشگێڕیەوە. ئەو رۆڵەی درایە ئەورووپا بەردەوام لە ئاستی تەکتیکیدا بوو. ئەوە هەڵوێستێکی راست بوو، لەهەمانکاتیشدا ناوەڕۆکی رێککەوتنی لەگەڵ بزووتنەوەی رزگاری نیشتیمانی نەتەوەکان پێکدەهێنا کە دینامیزمێکی گرنگی ئەو قۆناغە بوون. پێشخستنی پەیوەندیەکانی رزگاری نیشتیمانی لە چوارچێوەی سوریا، لوبنان، فەلەستین و ئیسرائیل مانای پەیوەندیداربوون بوو بە گەرمترین، زیندووترین و بەرفراوانترین واقیعی سیاسی دونیا. لە قۆناغێکی نزیکەی بیست ساڵیدا ئەو پەرەسەندنانەی لە چوارچێوەی خودی ئەو پەیوەندییە بەدیهات تەنیا بە ناساندنی ناسنامەی کورد و بزووتنەوەی ئازادی لە ئاستی ناوچە سنووردار نەبوو؛ وەک چۆن بە جیهانیشی ناساند بە پێگەیەکی ستراتیژیشی گەیاند. لە راستیدا ئەو پەیوەندیانە ئەمڕۆش ناوەڕۆکەکەی خۆیانیان پاراستووە. ئەو پەرەسەندنانەی PKK رێگای لەپێش کردەوە، بەرەو سیاسەتێکی دۆستایەتی لەگەڵ جەمسەری دژە رێککەوتنی ستراتیژی ئیسرائیل و تورکیا ئاراستەی گرت. پەیوەندیەکانی ئەمڕۆی تورکیا ـ سوریا ـ لوبنان ـ فەلەستین رێگای لەپێش ئەنجامگەلێک کردۆتەوە کە سەبارەت بە ئیسرائیل لە هەڕەشەی PKK قورسترە. ئەوەش دەیسەلمێنێت کە PKKچۆن هێزێکی گرنگی دینامیکە. ئەو هێزانە هەرچەندە لە پێگەی دژ بەیەکتریدا بن، بەڵام پەیوەندیەکانی نێوانیان لە دواشیکاردا لەلایەن بزێوی PKK وە پەلکێش و ئاراستە دەکرێت. هەمان دینامیزم سەبارەت بە چوارچێوەی پەیوەندی دووانە و سێیانەی تورکیا - ئێران و تورکیا - ئێراق - ئەمریکاش جێگای باسە. دینامیکیەت و کارابوونی PKKنەبووایە ئەوا پەیوەندیەکانی دەرهەق بەو مەسەلەیە بەو شێوازە پێشنەدەکەوت. ئەو پەیوەندیانە قەرزداری ئەو جموجۆڵە دیبلۆماسیەن کە لە چواردەوری PKK هەوڵی هۆنینەوەی دەدرێت. ئەو خەسڵەتە شۆڕشگێڕی، دیموکراسیخوازی و

سۆسیالیستیەی ناوەڕۆکی PKK، ئەو هێزانەی دەسەڵات بەرەو جەمسەرگەری بەو چەشنە دەبات.

هەمان خاڵ سەبارەت بە پەیوەندیەکانی تورکیا لەگەڵ ئەوروپاش لەجێگای خۆی دایە. ئەوەی ئەمڕۆ تورکیای لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا خستۆتە ناو دانوستاندنەکانی ئەندامێتیەوە پەرەسەندنەکانی تەوەرەی کێشەی کورد و PKKیە. هەڵوێستی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا، لە سەرووی هەمووشیانەوە هەڵوێستی ئەڵمانیا، سەبارەت بە PKK؛ سەرەتا بەشێوەیەکی ئەرێنی رەفتاریان کرد و دواتریش هەمان ئەو ڕێبازەی بەسەر دەڤ ـ یۆڵ و ڕێکخستنە شۆڕشگێڕیەکانی دیکەیان پەیڕەوکرد، پەلکێشی ناوخۆیان بکەن و لە ڕێگای هێزی نەرمەوە ئاسیمیلەی بکەن. ئەو شێوە پەیوەندییە ماوەیەکی درێژ بەردەوام بوو. بەڵام سووربوونمان لەسەر پێگەی شۆڕشگێڕیمان لە خۆرهەڵاتی ناویندا، ئەو وڵاتانەی بەرەو گۆڕانکاری ڕێباز برد. سەرەتا وەک یەکە یەکەی حکومەتەکان، دواتریش بەناوی یەکێتی ئەوروپا PKKیان وەک "تیرۆریست" ڕاگەیاند و ڕێبازی پەراوێزکردنیان گرتەبەر. ئامانجی هەردوو سیاسەتیش بەربەستکردنی ڕێگەچارەی شۆڕشگێڕی، دیموکراسیخوازی و سۆسیالسیتیانەی کێشەی کورد بوو. لەجیاتی ئەوە "ئازادی و مافەکانی تاکەکەس" سەپێنرا کە بە مافەکانی مرۆڤ سنووردار بوو. هەڵوێستێکی دووڕوویانەی لەوجۆرەیان پێشخست وەک بڵێی مافی تاکەکەس دابڕاو لە مافە جڤاتی و کۆمەڵایەتیەکان جێگای باس دەبێت. لە مامەڵەکانیان لەگەڵ کۆماری تورکیا خوازیارن هەردوولا واتە PKKو تورکیاش بەخۆیانەوە ببەستنەوە. هەوڵی پەیوەندیی هەژموونگەراییان دەدا. خۆیان لە ڕێگەچارەکانی دیموکراسیخوازی و سۆسیال دزیەوە. وەک پێویستیەکی ئەو ڕێبازە، دوای تەسفیەکردنی PKK هەوڵدەدەن ئەو کەس و ڕێکخراوانەی ناوەڕۆکە شۆڕشگێڕی، دیموکراسیخوازی و سۆسیالیستیەکەیان خاڵی کراوەتەوە وەک فاکتەرێکی سیاسی خۆیان لەناو کوردان و تورکیا جێگیریان بکەن. وەک هێزگەلێکی ئەرکدار بۆ هەندێک ڕۆڵی دیار ئامادەیان کردن. بەدرێژایی سی ساڵ (لەمیانەی گلادیۆی ناتۆ) چاوەڕوانی سەرکەوتنی ئەو پیلانەی لەناوبردن بوون. هەروەک لە تەواوی جیهان روویدا لە تورکیا و کوردستانیش خوازیاربوون ڕۆڵی پێشەنگایەتی لە نوێبوونەوەی دوا دژە شۆڕشدا ببینن. بەسووربوونەوە بە (تیرۆریست) ڕاگەیاندنی PKK لە پێناو یارمەتیدانی تورکیا نەبوو، بەڵکو پێویستیەکی بەرژەوەندی خۆیان بوو.

ئەو پیلانەی تەسفیەکردنی کورد ــ بزووتنەوەی PKK کە یەکێتی ئەوروپا بە پسپۆڕیەکی مەزنەوە ئامادەی کردبوو و جێبەجێی دەکرد، بەشێوەیەکی زۆر بایەخدارتر لە پیلانی تەسفیەکاری قوبرس ـ تورک بەڵام بەنهێنی و لە قووڵاییەوە بەڕێوەبراوە. مامەڵەی گرنگ و بایەخدار لەگەڵ کۆماری تورکیا ئەنجامدراوە، تا ئێستاش ئەنجام دەدرێت. سەبارەت بە پەیوەندی کورد و تورک هێندەی پەیماننامەی سایکس ـ بیکۆ گرنگ و بایەخدارە. هەوڵەکانی کۆماری تورکیا بۆ چارەسەریەکی دەرەوەی کورد و PKK، سەپاندنی یەکلایەنەی بەناو مافی مرۆڤ و دیموکراسی لێکەوتەوە و ئەنجامێکی ئەو

دانوستاندنە نهێنی و فێڵبازیانە بوو. لەبەر ئەوەی نەیانتوانی PKKو بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد لەناو ببەن، ئەو دیدارانەش بۆ هەمان ئەو رۆتینە بێ ناوەڕۆکانە گۆڕاون کە لە پەیوەندیەکانی ئیسرائیل ـ فەلەستین لەئارادایە. هاوشێوەیەکی ئەو گەمەیە لەسەر کوردان پەیڕەوکرا کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لەسەر کوردان (لەسەر ئوممەتگەرا و سۆسیالیستە تورکەکانیش) بەڕێوەبران. دوای گەرەنتیکردنی بەرژەوەندیەکانی خۆیان تەنیا بە چاونوقاندن بەرامبەر بە پرۆسەی کۆمەڵکوژی کوردان نەوەستان؛ لەژێر ناوی مۆدێرنیزمی عەلمانی تا دوایی پشتگیری فاشیزمی تورکی سپییان کرد. هەمان یاری لەسەر رۆم، ئەرمەنی و سریانیەکانیش پەیڕەوکران و لەناویشیان بردن.

ئەمریکا کە پلە یەکی رێکخراوی گلادیۆیە رۆڵێکی ئاکتیڤی بینی لە پشتگیریکردنی کودەتای فاشیستی ١٢ ئەیلول و هەوڵی لەناوبردنی تەواوی هێزە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکان و بزووتنەوەی کورد و PKKش کە بەشێکی ئەو بزووتنەوانەیە. پشتگیری لە سەرجەم ئەو ئۆپەراسیۆن و پەلامارە سەربازیانە کرد کە دوای ١٩٨٤ بە ئامانجی لەناوبردن بەڕێوەبران. گۆشەگیریەکی دیبلۆماسی و سیاسی بەڕێوەبرد. تەواوی ناتۆ و سیستەمی سۆسیالیستی بونیادنراو لە تەسفیەکردنی عەبدوڵلا ئۆجالانی سەرۆکی PKK دا بەکارهێنا کە بەرفراوانترین کردەوەی گلادیۆ بوو. تورکیای هاندا هێرش بکاتە سەر سوریا. ئیسرائیلیش خودی هێزی نەخشەدانەر و جێبەجێکاری شارەزایانەی بوو. لەو چوارچێوەیەدا سوریا بۆ ماوەیەکی درێژ بەرامبەر بەو بزاوتانەی لەناوبردن بەرخودانی کرد. بەڵام لە کۆتاییدا ئەوان و رووسیاش وەک پێویستی بەرژەوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەکانیان لەمیانەی چەند رێککەوتنێکی نهێنیەوە سازشیان لەگەڵ سیستەمی زاڵدا کرد. لەو قۆناغەی تەسفیەکرندا بەهەموو راشکاوییەکەوە ئاشکرابوو کە هەژموونگەرایی سەرەکی و دیاریکەر سیستەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە کە ئەمریکا پێشەنگایەتی دەکات.

وێڕای ئەو تەسفیەکاریانەی هەم لە ناوەوە هەم لە دەرەوە دووچاری هات، بەڵام PKK توانی خۆی لەگەڵ هەلومەرجەکان بگونجێنێت، بەشێوازێکی خولقکارانە وەرچەرخانی پێویستی ئەنجامداوە، لە رێگای ئەڵتەرناتیڤی مۆدێرنیتەی دیموکراتیەوە توانیویەتی لە چوارچێوەی سەرکەوتنی سیاسی و پرەنسیپدا هەڵوێستی خۆی لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پیشانبدات. درێژەی بە رۆڵی فاکتەری لە پێشینەی وەرچەرخانی شۆڕشگێڕی ـ دیموکراسیخوازانەی خۆرهەڵاتی ناوین داوە.

## ٣ . ئەزموونی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل و نەتەوەی دیموکرات

یەکێک لەو ئەنجامە گرنگانەی ئەزموونی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل رێگای لەپێش کردۆتەوە کە PKK پێشەنگایەتی کردووە راستینەی نەتەوەی دیموکراتە. راستینەی

نەتـەوەی دیمـوکرات لەبنەڕەتـدا بـە شـێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لـەبونیادی ئایـدیۆلۆژی PKK دەستنیشان نەکراوە و نەخراوەتە بەرنامەوە. ئەو دەستەواژەی سەبارەت بە نەتەوە لە ئایدیۆلۆژیەکەیدا زاڵە ڤێرسیۆنی سۆسیالیستی بونیادنراوانەی دەوڵـەت ـ نەتەوەیـە. لـەوەش گرنگتـر، کاتێـک دەڵێـی نەتـەوە تاکـە چـەمکێکی ڕەهـا جێگـای باسـە؛ ئـەویش نەتەوەگەرایی دەوڵەتی هێگیلستە. لە دەرەوەی ئـەو دەسـتەواژە و واقیعەکەیـەوە بیـر لـە راسـتیەکی دیکـەی نەتـەوە ناکرێتـەوە. بێگومـان لەوەشـدا شـرۆڤەی هێگلیانـەی چـەمکی سۆسیالیزمی زانستی مارکسیست بـە بنـەما دەگیرێت. لـە سـەردەمی مـارکس و ئەنگلسـدا کاتێک باسی نەتەوە کراوە ئەوەی بە بیری مرۆڤدا هـاتووە کۆمـەڵگای نەتـەوە بـووە کـە لەسەر بنەمای بـەلاوەنانی پـەرژینی دەرەبەگایـەتی و چوارچێوەی سنوورەکانی یـەکێتی زمان ـ کلتـوورەوە بەدەسـتی دەوڵـەتی ناوەندییـەوە ئـافرێنراوە. بـەمجۆرەش دەوڵـەت ـ نەتـەوە وەک راسـتینەیەکی تـاک و ڕەهـا تـاوتوێ دەکرێت. دەوڵـەت ـ نەتـەوە پـۆلێنی سـەرەکی فەلسـەفەی هیگلـە. دواتـرین وێسـتگەی شـێوەگرتنی دەوڵـەت و پەرەسـەندنی کۆمەڵایەتییـە. ئـاواکردنی لەلایـەن بـۆرژوازی یـان پرۆلیتاریـاوە تایبەتمەنـدێتی ڕەهـا و یەکانەیی دەستەواژەکە ناگۆڕێت. کاتێک دەڵێن دەوڵـەت، تاکـە دیـاردەی بـە ئەقڵدا دێت نەتەوەی دەوڵەتە. ئەو چەمکەی دەوڵەت ـ نەتـەوە هۆکـاری دەربازنـەکردنی مۆدێرنیتـەی سەرمایەدارییە لەلایەن مارکسیزم و توانەوەیەتی لەناویدا. کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوە وەک فـۆرمی کۆمەڵایـەتی بنـەڕەتی پەسـەندکرا (بـە شـێوەیەکی ڕوون و ئاشـکرا پشـتگیری لـە راگەیاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەڵمانیای ١٨٧١ دەکرێت)، ئـەو پرۆلیتاریایـەی مایـەوەش کشایەوە ناو ئەو سنوورانە و خزمـەتی دەوڵـەت ـ نەتـەوەی خـۆی کـرد، لـە بەرامبـەردا لەمیانەی هەندێک مافی ئـابووری و کۆمەڵایەتیـەوە درێژەپێدانی بـوونی خـۆی بـە بنـەما گرتووە. ئەوەی سەد و پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا چارەنووسی سۆسـیالیزمی بونیـادنراوی دیـاریکردووە ئـەو پەسـەندکردنەیە. لـە ئەنجامـدا راگەیانـدنی سـەرکەوتنی فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە چوارچێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە، لە سەرووی هەمووشیانەوە ئەزموونـەکانی یـەکێتی سـۆڤێت و چـین، پەیوەنـدی ئـەو دەسـتەواژە و واقیعـەی لەگـەڵ سەرمایەداری سـەلماندووە. جگـە لـەو هۆکـارە ناشـێت بەشـێوەیەکی دیکـە وەرچـەرخانی سۆسیالیزمی بونیادنراو بۆ سەرمایەداری شرۆڤە بکرێت.

لە ئەزموونی شەڕی شۆڕشگێڕی گەلـدا هەڵوێسـتە سۆسیالیسـتیە بونیادنراوەکـانی PKK زیاتر سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوە زەحمەتی بینی. واقیعی کۆنترگەریلایی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لە بەرامبەری وەستابوو، سەبارەت بە مانا و ئامـانجی شـەڕی شۆڕشگێڕیەوە دوودڵیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا. لـەوەش خراپتر، چەنـدەی بەسـەر دەچـوو ڕێبازی هەردوو لایەنیش ئیتر بەیـەکتری دەچـوون. سۆسیالیزمی ئایدیالیسـتی PKK تـا دەچوو بەرامبەر واقیعی دەوڵەت ـ نەتـەوە لاواز دەکـەوت و فشـاری بـۆ دەهـات. ئـەوەش بناغەی ئەو تەنگژەیە بوو کە لە ١٩٩٥ بەدواوە سەریهەڵدا. دەوڵەت ـ نەتەوە تاچ رادەیەک دیاردەیەکی سۆسیالیستیە، چەندە دەتوانرێت جێبەجێ بکرێت؟ بەگوێرەی ئەو وەڵامانەی

بدرێتـەوە ئـەو پرسـیارە یـان تەنگژەکـە رێگـا لـەپێش لـەناوچوون دەکاتـەوە یـان بەرێگەچارەیەکی دیکەی نیشتیمانی ئەنجامگیر دەبوو. لەو دۆخەدا دەستەواژەی نەتـەوەی دیموکرات بوو بە دەستەواژەی کلیل بۆ دەرکەوتن لەو تەنگژە ئایدیۆلۆژییە.

لە سەردەمی دەرکەوتنیدا وەسفکردنی گروپی PKK بە "نیشتیمانیەکان" هەڵە نـەبوو. وەسـفەکانی "رزگـاریخوازە نیشـتیمانییەکان"و "ئارتەشـی رزگـاری نیشـتیمانی" دەربـڕی هەمان مانایە و گوزارشتی لە راستینەی نوێنەرایەتیکراو دەکرد. پڕوپاگەندەکانی قۆنـاغی ئایـدیۆلۆژی لەبنەڕەتـدا شـیکارکردنی ریالیتـەی نەتـەوەیی کـوردی بـە بنـەما دەگـرت. پابەنـدبوونی بـەهێزمان بـە ئەنتەرناسیۆنالیزمەوە رێگـای نـەدەدا و نەماندەویسـت بـە ناسیۆنالیست و میللیگەرا ناوبنرێین و شرۆڤە بکرێین. بەڵام نەمانـدەتوانی لـە ریالیتـەی نەتەوەییش داببڕێین. لەو سۆنگەیەوە؛ کاتێک خـزان لـە نەتەوەییـەوە بـۆ نەتەوەگـەرایی روویدەدا، ئیتر مەترسی لێکچوونی ئایدیۆلۆژیا نەتەوەگەرا و میللیگەراکان سـەریهەڵدەدا کـە ئامانجیـان دەوڵـەت ـ نەتەوەیـە. هـەروەها لـە قۆنـاغی ئایدیۆلۆژیـدا ئـەو توانـا و بـەهرەمان نـەبوو بتـوانین ئـەو عـەیارە وردە بکـەین. کاتێـک هەڵمـەتی ١٩٨٤ بـە ئاسـتی رەهەنـدی نەتــەوەیی گەیشـت و رێگــای لــەپێش هەلومەرجـەکانی شـەڕی شۆڕشـگێڕی نیشتیمانی کـردەوە، بەشـێوەیەکی دەسـتلێبەرنەدراو ئێمـەی رووبـەڕووی دەسـتەواژەکانی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوە کردەوە. لەرێگای هێزەکانی گەلـەوە شـەڕمان بـەڕێوەدەبرد. ئەگەر دەرەبەگەکان بن یاخود بۆرژوازیەکان، سنوورێک لەنێوان ئێمـە و چینـی سـەروودا هەبوو. هەڵکشانمان بۆ ئاستی نەتەوەیی دەستەواژەی شـەڕی گـەلی بـێ بنـەما نـەدەکرد. لەجیاتی میللیگەرایی بۆرژوازی هێدی هێدی دەستەواژەی نەتەوایـەتی گـەل پێشدەکەوت. کاتێک لە چوارچێوەی ئەو پەرەسەندنانە تەماشـای تـەواوی کوردسـتان بکـەین دەتـوانین ئەو چەسپاندنانە بکەین:

أ ـ لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا، بەتایبەتیش دوای دابەشکردن و پارچەبوونەکەی ١٩٢٠ کان لە باشووری کوردستـان (کوردسـتانی ئێـراق) بـە پشتبەسـتن بـە چینـی سـەروو بـزاوت و جوڵـەیـەک خێرابـوو کـە دەتـوانین بـە میللیگـەرایی سـەرەتایی نـاوی ببـەین. دەربـازکردنی چوارچێـوەی تەسـکی رۆشـنبیران و بەدەسـتهێنانی خەسـڵەتی جـەماوەری میللیگەرایی خێرا دەکرد. راگەیانـدنی PDKدوای دووەمـین جـەنگی جیهـانی گوزارشـت لـە هەنگاوێکی گرنگی ئاراستەی میللیگەرایی مۆدێرن دەکات. کۆمـاری کوردسـتان لـە مـەهاباد وەک یەکەمین ئەزموونی میللی (قەومی) سەرنجڕاکێشە. شەڕی گـەریلایی (پێشـمەرگایەتی) کـە لەسـاڵی ١٩٦١ تەقیـەوە لــە سەرتاســەری کوردســتان هەســتە میللیگەراییــەکانی هۆشیارکردەوە و بەهێز بوو. سەرباری ئەو شکستەی بزووتنەوەکە دووچاری هـات و ئـەو پارچەبوونــەی بـەهۆی ناکۆکییــە ناوخۆییــەکان هاتنــەئاراوە، بــەڵام گۆڕانکاریــەکان دەســەڵاتێکی میللیگـەرایی کـورد و دەوڵەتگـەرایی ـ نەتـەوەیی کـرد بـە ناچارییـەک کـە ماهیـەتێکی فیدڕالیانـەی هەیـە. دەوڵــەت ـ نەتـەوەی فیدڕالیانـەی کـورد کـە لەلایـەن ئیمپریـالیزم و زایۆنیزمـەوە پشتگیری دەکرێت، وەک مۆدێلێـک خرایـە کـار بـەلانی کـەم

هێندەی دەوڵەت ـ نەتەوەکەی ئیسرائیل لە فەلەستین گرنگ و بایەخدارە. ئەو خاڵە تابڵێی گرنگە. وەک چۆن دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک، بەمانایەکی تر لە ساڵی ١٩٢٣ەوە کە شۆڕشی کۆمار وەک دەوڵەت شێوەی گرت، تا دوای ١٩٢٥ وەک دەوڵەت ـ نەتەوە شێوەی گرت؛ وەک چۆن وەک پرۆتۆ ـ ئیسرائیل بیری لێکراوەتەوە (لەو بارەیەوە پێویستی بە توێژینەوەیەکی بەرفراوان هەیە)، ئەگەر بە درەنگ وەختیشەوە بێت لەدوای ١٩٤٥ بە پێشەنگایەتی PDK بڕیار لەبارەی مۆدێلێکی پرۆتۆ ـ ئیسرائیلی کورد دراوە. جیاوازی کات و تایبەتمەندییە میللیەکان جیاوازی هێزەکانە. واتە بۆ داهاتووی ئیسرائیلێکی باوەڕپێکراو پێویستی بە ئاواکردنی دوو دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد و تورک دەبینرێت کە هەریەکەیان ڕۆڵی ئیسرائیلی ـ بەرایی ببینێت. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە تورکە ئیسرائیلە ـ بەراییەی لەڕێگای CHP بەدیهات، لەناو کوردانیشدا لەمیانەی PDKوە وەک دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردی ـ بەرایی ئاوا دەکرێت.

ئەو بابەتەی بە نیازم لە بەشەکانی داهاتوو بەشێوەیەکی تێروتەسەل تاوتوێی بکەم، لێرە بەو ئامانجە ئاماژەم پێکرد کە بەشێوەیەکی ڕاست هەرێمی فیدراڵی کورد شرۆڤە بکرێت کە لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە لە چوارچێوەی یەکەمین و دووەمین شەڕی کەنداوەوە هاتۆتە ئاراوە. یەکێک لە ئامانجە سەرەکیەکانی یەکەمین شەڕی کەنداو کە لە ١٩٩٠ دەستی پێکرد هەنگاونان بوو بە ئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردەوە. ئەگەر ئەو دیاردەیەی دوای ١٩٩٠ لە چوارچێوەی شەڕی کەنداو لە خۆرهەڵاتی ناوین دەستی پێکرد وەک ڤێرسیۆنێکی گرنگی "سێیەمین جەنگی جیهانی" شیکار بکەین، دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک وەک پرۆتۆ ـ ئیسرائیل لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ژێرکەوتوو دروستکرا، دوای دووەمین جەنگی جیهانیش دەوڵەتی راستەقینەی ئیسرائیل ئاواکرا، لە ڤێرسیۆنی "سێیەمین جەنگی جیهان"یشەوە دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردی پرۆتۆ ـ ئیسرائیلی ئامرازی سەرەکی ئاسایشی دەوڵەتی ئیسرائیل ئاوادەکرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ لە ١٩٩٠ بەدواوە دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردی کە لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (ئەمریکا و هێزەکانی یەکێتی ئەوروپا ... هتد) و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورک و ئیسرائیل لە ناوچەکە پشتگیری دەکرێت هەوڵدەدرێت وەک ئەڵتەرناتیڤێک بەرامبەر بە PKK قووت بکرێتەوە. شەڕەکانی دوای ١٩٩٠ کان کە گلادیۆ بە پشتگیری ناتۆ لە دژی PKK بەڕێوەی برد بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا ئەو واقیعە دەسەلمێنێت. لەمیانەی بونیادی نەتەوە ـ دەوڵەتەوە هەوڵدەدرێت تەگبیر بەرامبەر ئەو نەتەوایەتیەی گەل بگرن کە ئەڵتەرناتیفی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی PKK لە ئاستی کوردستان ڕێگای لەپێش کردۆتەوە و بەمجۆرەش دەیانەوێت مایەپووچی بکەن و لەناوی ببەن. سەرباری هەڵە و کەموکوڕیەکانی، بەڵام ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی دوای ١٩٩٠ کان سیاسەتی هێزە هەژموونگەراکانی رۆژئاوا و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی هێزی ناوچەکە (تورک و ئیسرائیل)ی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دەرهەق بە کوردستانی مایەپووچ کردبوو، وەک دەستەواژە و دیاردەش دۆخەکە بەمجۆرە بوو. لەمیانەی دووەمین

شەڕی کەنداوەوە (٢٠٠٣ ـ ٢٠١٠) ئەو ئاشکرابوونە تەواو بوو بە راستیەکی بەرجەستە. سەرەکیترین مەسەلەی لەو قۆناغەدا سەلمێنراوە؛ PKK دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد بونیاد نانێت، لەبواری ئایدیۆلۆژی و کرداریەوە رەوشی بۆ ئەو هەنگاوە لەبار نییە، بەڵام لە پێشخستنی نەتەوەیی گەل دوودڵی ناکات کە وەک پۆتانسیێلێک لە بونیادە ئایدیۆلۆژیەکەیدا لەئارادایە.

ب ــ نەتەوەی دیموکرات تەنیا دەستەواژەیەک نییە، بەڵکو وەک راستیەکیش بەرجەستە دەبێت. ئەو تێکۆشانەی PKK لە قۆناغی گروپی ئایدیۆلۆژیدا بەرامبەر میللیگەرایی هەردوو نەتەوەی دەسەڵاتدار و ژێردەست ئەنجامیدەدات، لەسەر بنەمای ئەزموونی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل دیسان وەک تێکۆشانی نەتەوەی دیموکرات بەرامبەر بە هەردوو دەوڵەت ـ نەتەوە بەردەوامە. لە کاتێکدا دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان تەنیا لەمیانەی هێزەکانی توندوتیژی رووت و بەکرێگیراوە خۆفرۆشەکانەوە هەوڵی لەسەرپێ مانەوە دەدەن، بەڵام وێڕای میللیگەراکانی دەوروبەری و تەواوی پشتگیرییە ناوخۆیی و دەرەکیەکانی دەوڵەت ــ نەتەوەی کورد لەو گۆشەگیرییە رزگاری نابێت کە لەلایەن بزووتنەوەی نەتەوەی دیموکراتەوە تووشی دەبێت. یەکەمین جارە لە شۆڕشی کوردستاندا بژاری دەوڵەت ـ نەتەوە و بژاری نەتەوەی دیموکرات هەوڵدەدەن بەیەکەوە رۆڵ ببینن.

ئەو دوو بژارەی لە شۆڕشەکانی فەرەنسا و رووسیا و چەندین شۆڕشی دیکەی مۆدێرن لەناویەکتردا بوون جیابوونەوەیان لە شۆڕشی کوردستاندا و دیاریکردنی هێڵێکی دیاری ئایدیۆلۆژی، سیاسی و کرداری لەنێوانیاندا پەرەسەندنێکە گرنگی مێژوویی خۆی هەیە. لە سەرجەم شۆڕشە مۆدێرنەکاندا یان بە تەواوی دەسەڵاتی چینی سەروو یان بە پێچەوانەوە بالایی چینی خواروو بە تەنیا جێگای باس بووە. لەکاتی بەیەکەوە بوون و لێکجیابوونەوەشدا سنووری سافیان لەنێوان خۆیاندا دیاری نەدەکرد. لەنێوان خۆیاندا لەناوبردنی یەکتریان کردبوو بە سەرەکیترین رێبازی تێکۆشان. ئەو دۆخەش جگە لە بەهێزکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هیچ رۆڵێکی دیکەی نەبینی. چەمکێکی هەڵەی تێکۆشان هەم لەنێوان دوو چین هەمیش لەنێوان دوو نەتەوە جێگای باس بوو. ئەگەر ئەو نادیاری یان ئاڵۆزییەی ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی کوردستان سەرەتا بە نموونەکانی پێش خۆی بچێت، بەڵام ئەو تێکۆشانە بەردەوامەی بەرێوەچوو لە ئاکامدا جیابوونەوەی خێراکرد و یەکلایی کردەوە. لەو قۆناغەدا دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو تەنیا دەرباز نەکراوە؛ بەڵکو مۆدێلێکی لەجیاتی ئەو پێشخست کە لە بواری ئایدیۆلۆژیدا دەوڵەت ـ نەتەوەی بۆرژوازی هەناوی سۆسیالیزم دەرباز دەکات، کە کێشەی نەتەوەیی لە چوارچێوەی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە دەردەخات و بونیادنانی نەتەوەی ئازاد و یەکسان لەلایەن خودی گەلەوە بەبنەما دەگرێت، واتە لە چوارچێوەی نەتەوەی دیموکرات بونیادی دەنێت. لەچارەسەرکردنی کێشە چینایەتی و نەتەوەییەکانیشدا پۆلێنی نەتەوەی دیموکراتی کرد بە مۆدێلێکی ئەڵتەرناتیف. نەتەوەی دیموکراتی کرد بە گرنگترین فاکتەری مۆدێرنیتەی دیموکراتی (پیشەسازی ئیکۆلۆژی و ئابووری کۆمیناڵ فاکتەرەکانی

دیکەن). لەمیانەی دەربازکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی هیگل کە نزیکەی سەد و پەنجا ساڵە بۆتە بەڵای سەر سۆسیالیزمی زانستی ڕێگای سۆسیالیزمێکی کردەوە کە نزیکترینیانە لەزانستەوە. گرنگترین کۆمەکی پێشکەش بە بونیادنانی سۆسیالیزمێکی فەلسەفی، زانستی، ئەخلاقی و ئەستاتیکی کرد.

ج ـ لە بەرامبەر ئەو کۆمەکە مێژووییەی بواری تیۆری، لە بواری پراکتیکیشدا پێکهاتەکانی نەتەوەی دیموکرات و مۆدێرنیتەی دیموکراتیک لە دۆخی بەرجەستەی کوردستان و راستینەی کۆمەڵگای کورد خێرا بوو. لەمیانەی پێکهاتەی نەتەوەی دیموکراتەوە سنوورەکانی نێوان هەر چوار پارچەی کوردستان بێمانا کرا. لەکاتێکدا سنوورەکان بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەکان هەر شتێکن، بەڵام لای نەتەوەی دیموکرات بووە بە هیچ. لەکاتێکدا نەتەوەی دیموکرات وەک گرنگترین شۆڕشی هوشیاری لە زهنیەتی گەلدا وێنا دەکات، خۆبەڕێوەبەریی (خۆسەری) دیموکراتیشی وەک گرنگترین شۆڕشی بەرجەستەبوون لەهەر پارچەیەک بونیاد نا. لەکاتێکدا ئارادەیەکی مەزن چەرخی میکانیزمی کۆمەڵکوژی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورکیا، ئێران، ئێراق و سوریای مایەپووچ کرد، هەر بەشێکی گەلی کوردی لەو پارچانەی کوردستان کرد بە ئافرێنەر، بونیادنەر و بەشێکی نەتەوەی دیموکرات. شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی کە تەنیا بە ئاشکراکردنی پیلانگێڕی دەوڵەت ـ نەتەوەی سیخوڕ و کۆمەڵکوژی کلتووری زادەی هەژموونگەرایی ئەو دوو سەدەیەی دوایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سنووردار نەبوون، بەڵکو پێشخستنی نەتەوەی دیموکرات وەک ئەڵتەرناتیڤێک لە هەر پارچەیەک و زهنی هەر کوردێکی دڵسۆز و جەستەی هەر جڤاتێکی کوردەواری سەرکەوتنێکی مەزنە. لەمیانەی هاوکاری دۆستانەی نێوان گەلە دراوسێکان (تورک، عەرەب، فارس)، کلتووری گەلە کەمینەکان و ئەو گەلانەی دووچاری لەناوبردن هاتوون (ئەرمەنی، گریک، سریانی ....هتد) بەو سیفەتەی جڤاتەکانی نەتەوەی دیموکراتن و لەسەر بنەمای ڕۆڵی پێشەنگایەتی لە بونیادنانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا تادوایی ڕێگای پەرەسەندنی ئەو سەرکەوتنە مێژووییەی لە ئاستی ناوچەکە و جیهانگیریدا ئاوەڵا کرد.

## ٤ ـ شەڕەکانی گلادیۆی ناتۆ بەرامبەر شەڕی شۆڕشگێڕی گەل

ئیتر ئاشکرا و یەکلایی بۆتەوە کە ئەو هێزە سەرەکییەی لە کوردستان دژی هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ شەڕی کرد سوپا نهێنیەکەی ناتۆ واتە هێزەکانی گلادیۆ بوو. گرنگترین بوویەری بێچارەیی سیستەمی ئاسایشی تورک بەرامبەر بە تێکۆشانی PKK دەسەلمێنێت هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ـە. کورتهێنانی سیستەمی ئاسایش لەبنەڕەتدا بەدەرکەوتنمان لە ئەنقەرە دەستیپێکرد و بە جێگیربوونمان لە خۆرهەڵاتی ناوین مسۆگەر بوو. ئەنجامدانی هەڵمەتەکە ئەو مسۆگەرییەی خستەڕوو. دوای ئەوە لە ساڵی ١٩٨٥ دا گلادیۆی ناتۆی تەوەرەی ئەڵمانیا کەوتە جووڵەوە. لەبەر ئەوەی ئەڵمانیا ناوەندی سوپای گلادیۆ بوو،

یەکەم دەوڵەت بوو کە لە ساڵی ١٩٨٥، PKK ی بە "تیرۆریست" لە قەڵەمدا. کاتێک گلادیۆی ناتۆ بونیادنرا ناوەندەکەی ئەڵمانیای کرا بە بەرپرسیاری بەشەکەی ئەوروپا. سەرەتا ئەو راستیانەمان نەدەزانی. بگرە ئەڵمانیا لە سەروویانەوە یەکێتی ئەوروپا و وڵاتانی دیکەی ئەوروپاشمان بە دۆستی تێکۆشانی شۆڕشگێڕی دادەنا. زۆر دواتر تێگەیشتین کە شەڕێکی نهێنی دژی گەلان (گەلانی ئەوروپاشی لەناودا، لە سەرووی هەموویشیانەوە گەلانی ئیتاڵیا، یۆنان و بەلقان) جێگای باسە. لەکاتی دامەزراندنی ناتۆ ئەو سوپایەش لە بەرامبەر دزەکردنی کۆمۆنیزم دامەزرا. کەسانێکی سنووردار دەرکیان بەوە کرد. ئەو سوپایە نهێنیە زیاتر لە ئیتاڵیا، یۆنان، تورکیا و ئەڵمانیا بەرامبەر شۆڕشگێڕان خرایە کار. کاتێک رووسیای سۆڤێتی وەک هەڕەشەیەک نەما و یەکێتی سۆڤێت هەڵوەشایەوە، جگە لە تورکیا لە وڵاتەکانی دیکەی ئەندامانی ناتۆ گرنگی خۆی لەدەستدا. لە تورکیاش بە پێچەوانەوە بە ئاستی زۆر بەرزتر گەیشت. شۆڕشی ئێران (١٩٧٩) و داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە (١٩٨٠) رۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینی. هەروەها بەهۆی رۆڵی جەندرمەیی کە لە خۆرهەڵاتی ناویندا دەیبینی پشتگیریکردنێکی بێ سنووری گلادیۆی تورکیا جێگای باس بوو. پاراستنی ئیسرائیلیش هۆکارێکی گرنگی ئەو دۆخەیە. هەروەها پاراستنی سەرچاوەکانی نەوت و دەسەڵاتە بەکرێگیراوەکان هۆکارێکی دیکەی گرنگ بوو کە بەردەوام گلادیۆی لەسەر کار دەهێشتەوە.

هەنگاوی چاوەڕواننەکراوی هەڵمەتی ١٥ی ئاب لەو هەلومەرجەدا روویدا. گلادیۆی تورکیا لەمیانەی کودەتای سەربازی ١٢ ئەیلولی ١٩٨٠ دا دوا پاشماوەکانی شۆڕشگێڕانی تورکی سڕیبوویەوە. هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ لە حیسابدا نەبوو. کاتێک روویدا، سەرەتا وەک سەرکێشیەکی سادەی چەپڕەوان مەزەندەکرا. لەو بڕوایەدابوون کە بەهێزە کلاسیکیەکانی سوپا، پۆلیس و هەواڵگریەکانەوە یەکسەر دەتوانن چارەسەری بکەن. بەڵام کە لە ساڵی یەکەم نەیانتوانی چارەسەری بکەن، مەسەلەکەیان بۆ ناتۆ گواستەوە. بەگوێرەی ماددەی پێنجەمی یاسای دامەزراندنی ناتۆ لەساڵی ١٩٨٥ بڕیاری دەستێوەردانیان دا. بەهۆی ئەو بڕیارە بوو لەهەمان ساڵدا دەوڵەتی ئەڵمان PKKی بە "رێکخراوێکی تیرۆریست" لەقەڵەم دا. لەساڵی ١٩٨٥ بەدواوە لە رووخساردا شەڕمان لەگەڵ هێزەکانی ئاسایشی تورکیا بوو؛ بە ئەنقەست ئەو دیمەنەیان پیشاندەدا. بەڵام لە ناوەڕۆکدا شەڕ لەگەڵ گلادیۆی ناتۆ بوو. بێگومان باڵەکەی گلادیۆ لە تورکیا رۆڵێکی مەزنی دەبینی. بەڵام تاکە باڵ نەبوو. گەورەبوونی لەبواری چەندایەتیدا بۆ بەدەستهێنانی ئەنجام بەس نەبوو. هێزەکانی ئاسایشی تورکیا نەک تەنیا ساڵانێک بەڵکو بۆ تاکە ساڵێکیش نەیاندەتوانی بەتەنیا شەڕێکی وەها بەرفراوان بەڕێوەببەن. ئەگەر بەڕێوەشی ببەن لە ماوەیەکی کورتدا دەوڵەت مایەپووچ دەبێت. لەو سۆنگەیەوە هەرچەندە بە ئاشکرا نەبێت و میکانیزمەکەی بە نهێنیەکی زۆرەوە بسوڕێت، بەڵام شەڕەکە شەڕێکی ناتۆ بوو. شەڕێک بوو رەهەندەکانی زۆر لە سەرووی ئەو شەڕانەبوو کە ئەمڕۆ لە ئەفغانستان و ئێراق، لە رابردووشدا لە سۆماڵ بەڕێوەبراون و زۆر درێژخایەنتریش بوو. ئێمە وەک

PKK لەو ڕووە نهێنی و ڕاستەقینەی شەڕ تێنەگەیشتبووین. ڕەخنەکانمان سەبارەت بە ئەوروپا و ئەمریکا لە ئاستێکی ئایدیۆلۆژیدا بوو. ئەو توانا هزریەمان نەبوو شیکاری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و شەڕەکانی هێزەکانی هەژموونگەرایی بکەین کە لەو دوو سەدەیەی دوایی، دوای ١٩٢٠کان، بە تایبەتیش ئەوەی لە دوای ١٩٨٤ لە کوردستان دژی گەلی کورد و PKK بەڕێوەچوون. هەربۆیە شیکارەکانمان دەرهەق بە ناتۆ زۆر ناتەواو بوو. هەڵوێستی سۆسیالیزمی بونیادنراوی دروشمداری دەرباز نەدەکرد. بگرە لە ئاستی ناویشدا هیچ ئاگاداری و زانیاریەکمان سەبارەت بە گلادیۆ نەبوو. چەندە ئاستی شەڕی گەل لە کوردستان بەرز و فراوانتر دەبوو، ئەو ڕاستیەش هێدی هێدی ئاشکرا دەبوو. کاتێک دوای ئەڵمانیا لە ١٩٩٠کان بەدواوە ئەمریکا و ئینگلتەراش PKKیان وەک "تیرۆریست" ڕاگەیاند، هەروەها هەوڵی پێشتریش تیرۆرکردنی پاپا و تاوانی کوشتنی ئۆلف پاڵمەش ڕاستیەکەی تۆزێکیتر ڕوون کردەوە. ئاشکرابوونی گلادیۆی ئیتاڵیاش پەرەسەندنێکی دیکەی زۆر گرنگ بوو.

بەر لە شەڕەکانی گلادیۆی دژی PKK و شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی پێویستە ئەو پیلانگێڕیانەی سەردەمی دامەزراندنی کۆمارمان بەبیربێتەوە کە دژی ئۆپۆزسیۆنی سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکان و بوونی گەلی کورد بەڕێوە چوو. لە ساڵی ١٩٢٠ سەرهەڵدانی کۆچگری سەرکوت کرا، لە کۆتاییەکانی مانگی یەکەمی ١٩٢١ ١٥کەسی ئەندامی ناوەندی پارتی کۆمۆنیست کە مستەفا سوبحی سەرکردایەتی دەکرد لە دەریای ڕەش نقوومی ئاو کران، لەهەمان ساڵدا هێزەکانی ئەدهەم چەرکەس بڵاوەی پێکرا، هەروەها یاخیبوونەکانی لایەنگری سوڵتان و خەلیفەش سەرکوتکران. کۆمۆنیستەکان، ئیسلامییە ئوممەتگەرا و کوردەکان کە هاوپەیمانی بنەڕەتی بوون لەو سیستەمە نوێیە بەدەرنران کە لە کۆتایی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی دامەزرا. ئەو کاردانەوەی بەرامبەر ئەو دۆخە هاتنەئاراوە بەشێوەیەکی زۆر دژوارتر سەرکوتکراون. هەوڵدراوە سیستەمی پرۆتۆ - فاشیستی یەک پارتی ڕەوا بکرێت. ئەو فاشیزمەی لەهەمان ڕێکەوتدا لە ئەڵمانیا و ئیتاڵیا لە هەڵکشان دابوو لە کۆماری تورکیاش ڕەنگیداوەتەوە. پەیڕەوەکانی ئاسیمیلاسیۆن و کۆمەڵکوژی کە دژی بوونی کوردان بەڕێوە دەچوو لەمیانەی گێرەشێوێنیەکەی ١٥ شوباتی ١٩٢٥دا بە شێوەیەکی فەرمی دەستپێکرد، ئەو بەرخودانانەی بەرامبەر ئەو دۆخەش هاتنەئاراوە هەرە دوایی لە ڕێگای کۆمەڵکوژی ١٩٣٨ی دێرسیم سەرکوت کرا، بەشە هەرە زۆرەکەی دیکەی گەلیش دووچاری ڕاگواستن و نیشتەجێبوونی زۆرەملێیانە (ألأسكان ألأجباري) هاتووە. لەسەر بنەمای ئەو ڕێککەوتنەی لەگەڵ ئیمپریالیزمی ئینگلیز و فەڕەنسا بەدیهات هەموو جۆرە ڕێبازێکی سەرکوتکردن، چەوسانەوە و ئاسیمیلاسیۆن لەپێناو پارچەکردنی کوردستان و دوورخستنەوەی کوردان لە ناسنامەکانیان پەیڕەو کراوە. ئامانج ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی هۆمۆژەنە.

دوای ئەوەی لەسەرەتای ١٩٥٠ بوو بە ئەندامی ناتۆ دەستەی تەدقیقی سەفەربەری (سەفەربەری تەتکیک کورولو لجنة ألتدقيق و ألتفتيش) پێکهات کە باڵی گلادیۆیە لە

تورکیا. لەو مێژووە بەدواوە ئەو هێزەی سەرجەم هێزە رکابەرەکان و دەسەڵاتی سیاسی کۆنترۆڵ دەکات گلادیۆی تورکە. بوویەرەکانی ٦ - ٧ ی ئەیلول و جوڵەپێکردنی تەشکیلاتی موقاوەمەتی قوبرس یەکەمین کردەوەکانی گلادیۆی تورک بوو. لەوانەیە تەوقیفاتی کۆمۆنیستەکان لە ١٩٥١ چالاکی سەرەتای بووبێت. کودەتای ٢٧ ئایاری ١٩٦٠، سەرجەم رێکخستنەوەکانی دەسەڵات و بێکاریگەرکردن و لەناوبردنی ئۆپۆزسیۆن کە دواتر ئەنجامدران بە تەواوی لەژێر کۆنترۆڵی گلادیۆی تورک بەڕێوەچوون. هەرچەندە ئاسایش، هەواڵگری و سوپاسالاری وەک هێزی سەربەخۆ دیار بن، بەڵام بەکارهێنان و کۆنترۆڵی هێزی سەرەکی لەمیانەی رێکخراوی گلادیۆوە ئەنجامدەدرێت. لەناوبردنی بزووتنەوە شۆڕشگێڕی و دیموکراسیخوازەکان لەرێگای کودەتای ١٢ ئاداری ١٩٧١ وە لەمیانەی رێکخراوی گلادیۆ بەڕێوەبراوە کە بەتەواوی بەسەر سیستەمدا زاڵ ببوو. کۆمەڵکوژیەکانی تەقسیم و مەرعەش، هەوڵی تیرۆرکردنی بلند ئەجەوید، سەرجەم کۆمەڵکوژی و تیرۆرەکانی دژ بە شۆڕشگێڕان، رۆشنبیران و گەل لە چوارچێوەی پیلان و کردارەکانی گلادیۆی ناتۆدا بووە. کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول یەکێک لە چالاکییە هەرە گرنگەکانی گلادیۆی ناتۆ بوو. تا ئەو قۆناغە ناتۆ و گلادیۆی تورک تێکەڵ بوون و هەم لە هێزەکانی دیکەی ئاسایش سەربەخۆبوون هەمیش رۆڵەکەیان لەسەرووی ئەوانەوە بوو. ئەگەر لەو قۆناغە بەدواوە کرۆنۆلۆژیەک دەرهەق بە PKKرێکبخەین بەمجۆرەیە:

أ - لە قۆناغی گرووپەوە تا کودەتای سەربازی ١٢ ئەیلول هەرچەندە لە هێرشەکانی چاودێریکردن و لەناوبردنی PKKدا هێزەکانی گلادیۆش دەستبەکار بن، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەلایەن هێزە باوەکانی ئاسایش (میت، ئاسایش و جەندرمە)وە بەڕێوەدەبرێت. لەو بڕوایەدام لەبەرئەوەی شیمانەی پەرەسەندنمانیان نەدەکرد هێندەی رێکخستنە ئاکتیف و خاوەن رۆڵەکان چاودێری گرووپەکەمانیان نەکرد. گرووپ وەک پاشکۆیەکی THKP – C بینراوە، لەو بڕوایەدابوون دوای لەناوبردنی THKP – C گرووپەکەشمان نامێنێت. لەوانەیە هەوڵیاندابێت لەرێگای چەند کەسێکەوە گرووپەکە کۆنترۆڵ بکەن و بیخەنە ژێر رکێفی خۆیانەوە. دوای ١٩٧٥ کاتێک تێگەیشتن گرووپەکە سەربەخۆیە، لەرێگای PDK وە بە دەستی ستێرکا سۆر پەلاماریان داین، کەسێکی بەناوی عەلائەددین قەپان یان بەکارهێنا کە دواتر هەڤاڵ حەقی قەراری تیرۆر کرد. مسۆگەرە کە هەر لە سەرەتاوە PDK هاوتەریبی ئیسرائیل و گرێدراوی ناتۆ جوڵاوەتەوە و وەک رێکخراوێکی کۆنترۆڵکردنی تەواوی کوردستان پشتگیری لێکراوە. دەکرێ بگوترێت؛ لەژێر کۆنترۆڵی گلادیۆ دایە و بەتایبەتیش لە ١٩٦١وە بە یارمەتی گلادیۆی تورک چەکدارکراوە و هانی سەرهەڵدانی چەکداری دراوە. لەمیانەی چەندین بەڵگەوە سەلمێنراوە کە هەمان پشتگیری لە شیعەگەرایی ئێرانیش وەرگرتووە. لەو سۆنگەیەوە؛ بینینی پشتگیری ناڕاستەوخۆی گلادیۆ بۆ ئەو دەستێوەردانانەی لەرێگای PDK وە لە کوردستان بەرامبەر گرووپە چەپڕەوەکان ئەنجامدراون گرنگ و بایەخدارە.

بانگەشە زارەکییە "پێنج پارچەخوازی" (لەو بڕوایەدان بەشێکی بچووکی کوردستان لە یەکێتی سۆڤێتە!) کانی ستێرکاسۆر ئەو بۆچوونەی دەسەلماند. ئەو دەستێوەردانەی دواتر لەرێگای KUK[٢]وە بەهێزتر کرا، بە ئامانجی تەسفیەکردنی گرووپەکەمان بوو بەر لە دەرکەوتنی لە ئەنقەرە یان بەر لە گەیشتنی بە رۆژهەڵاتی فورات. نەجاتی قایای فرۆکەوان کە لە ساڵی ١٩٧٦وە کەوتە جوڵە ئەگەر سیخوڕ بێت (دڵنیانین، پێویستە یەکلایی بکرێتەوە) لەوانەیە ئەندامی گلادیۆی تورک بێت. ئەگەر پیلانێکی سەبارەت بە تەسفیەکردنی گرووپ هەبێت، دەرفەتی جێبەجێکردنی ئەو پیلانەی نەبووە. زۆر بە وریاییەوە گرووپ بەو تەڵەزگەوە نەبووە. ئەگەر لەرێگای عەلی یلدرم ی باوکیەوە سیخوڕێتی کەسیرە یلدرم جێگای باس بێت (لەوەشدا مسۆگەر نین پێویستە یەکلا بکرێتەوە)، بەشێوەیەکی باو دەشێت لە تەوەرەی کادیرانی میت دابێت. بۆ ئەوەی هیچ هەڵەیەک لەبارەی مەسەلەی دلاوەر یلدرمیش نەکرێت پێویستە لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی لەبارەوە بکرێت. لەوانەیە تەڵەدانانەوە و تیرۆرکردنی هەڤاڵ حەقی قەرار لەلایەن عەلائەددین قەپانەوە یەکەمین چالاکی گلادیۆی ناتۆ و تورک بێت کە لە قۆناغی گرووپ دژی PKK ئەنجامدراوە. دەکرێ بڵێین؛ کە بۆ یەکەمین جار لەساڵی ١٩٧٧ گرووپ بەشێوەیەکی جددی خرایە نێو چوارچێوەی تەسفیەکردنەوە. ئەگەر بەرنامەی پارت بڵاو نەکرابایەوە، لەمیانەی ڕاگەیاندنی PKKوەڵام نەدرابایەوە و عەلائەددین قەپان سزا نەدرابووایە، گرووپ بە تەواویش لەناو نەچووبایە، بەڵام دووچاری گورزێکی جددی دەهات. دەشێت کۆمەڵکوژی کۆتاییەکانی ١٩٧٨ وەک دووەمین گەورە چالاکی گلادیۆ بەرامبەر گرووپەکەمان هەڵسەنگێنرێت کە لەو دەفەرە بەخێرایی پێشدەکەوت. مەرەش ناوەندێکە کە لەمێژە بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ تەسفیەکردنی کوردانی تێدا پیلانکراوە. هەمان خاڵ بۆ سەرجەم کوردانی ڕۆژئاوای فورات جێگای باسە. بەگوێرەی پیلانی ئیسلاحاتی شەرقی ساڵی ١٩٢٥ نابێت تاکە کەسێک لە دەفەری ڕۆژئاوای فورات بمێنێت کە بە زمانی کوردی قسە بکات، لەمیانەی ڕێگا و ڕێبازی جیاوازەوە ـ لە سەرووی هەموویانەوە ئاسیمیلاسیۆن – تەسفیە بکرێت. پێویستە کۆمەڵکوژی مەرعەش لە چوارچێوەی ئەو پیلانە تاوتوێ بکرێت کە تا ئێستاش جێبەجێ دەکرێت. بەتایبەتیش ئەو کردارانەی گلادیۆ و ئاسمیلاسیۆنەی بەشێوەیەکی سیستەماتیک لە ناوچەکانی مەلاتیا، ئادیامان، ئەلازغ، دێرسیم، سیواس، ئەرزینجان و عەنتاب جێبەجێ دەکرێت پێویستە لەو چوارچێوەیەدا هەڵسەنگێنرێت.

بەکورتی چاودێری و فشارێکی گلادیۆ لەسەر ئۆپۆزسیۆنی چەپڕەو و کوردان لەزیادبوون دایە کە دوای ١٩٦٠کان پەرەیسەند. ئەو چاودێری، سەرکوتکردن، پێکدادان و تیرۆرکاریانەی لەمیانەی کودەتای ١٢ ئاداری ١٩٧١ چڕبوویەوە سیستەماتیکە و گرێدراوی

---

[٢] ڕزگاریخوازانی نیشتمانی کوردستان (Kürdistan Ulusal Kurtuluşçuları) KUK: ئەو ڕێکخراوە لە ساڵانی نێوان ١٩٧٨ – ١٩٨٠دا دووژمنایەتییەکی سەرسەختی پەکەکەی دەکرد. خاوەن بیری میللیگەراییە و پشت بە دەرەبەگایەتی پاشڤەڕۆ دەبەستێت. دوای کودەتای ١٢ی ئەیلول پێگەی جەماوەرییان نەما. (وەرگێڕ)

ئەو ڕێکخستنەیە. بە ئەندازەی گرووپە ئیسلامیگەرا و گورگە بۆرەکان گرووپە دروستکراوەکانی چەپڕەوی کورد و تورکیش لەچوارچێوەی شەڕەکانی گلادیۆ بەکارهێنراون. لە ساڵانی ١٩٥٥ - ١٩٦٠بەدواوە ڕێکخراوی گلادیۆ لەسەرجەم ئاواکردنەکانی حکومەت، پێکدادانی نێوان گرووپە راستڕەو و چەپڕەوەکان، نەخشە بۆ دانان و جێبەجێکردنی کودەتاکان، کۆمەڵکوژی و تیرۆرە گرنگەکانی تورکیا تا دوا رادە خاوەن کاریگەرییە. ڕۆڵی سەربەخۆی ڕێکخراوەکانی دیکەی ئاسایش و هەواڵگری سنووردار دەکرێت، تەنانەت کۆنترۆڵیش کراون. تەواوی چالاکیەکانی دەرهەق بە ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری، دیبلۆماسی و دەسەڵات دەخرێتە چوارچێوەی ئاسایشی دەوڵەتەوە، لە تەوەرەی ستراتیژی و تەکتیکەکانی گلادیۆ تاوتوێ دەکرێت و هەوڵی ئاراستەکردنی دەدرێت. هەنگاو بە هەنگاو ئۆپەراسیۆنی بەرفراوانتر بەرامبەر بزووتنەوە کۆمۆنیستی و چەپڕەوەکان، بزووتنەوەی سۆسیالیستی و شۆڕشگێڕی کوردان بەڕێوەبراوە کە دواتر لە دەرەوەی کۆنترۆڵیان پەرەیسەند. قۆناغی نێوان ١٩٧٠ - ١٩٨٠ چڕترین قۆناغی ئۆپەراسیۆنەکان بوو، بە کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول و وەشاندنی گورزێکی کوشندە لە چەپڕەوەکان ئەنجامگیر بوو. جێگیربوونی بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی - سۆسیالیستی کورد لەخۆرهەڵاتی ناوین ئەو ئۆپەراسیۆنانەی مایەپووچ کرد.

ب - دووەمین قۆناغی شەڕەکانی گلادیۆ بە کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول دەست پێدەکات و تا ساڵی ١٩٨٥ بەردەوام دەبێت. ئەو کودەتایەی کۆنسوڵی ئەمریکا لەبارەی ئەنجامدەرانیەوە دەیگوت: "ڕۆڵەکانمان کارێکی باشیان کرد" ئامانج و ئەنجامەکانی سەبارەت بە کورت ماوە ئاشکرابوو و لای هەموومان زانراوە. ئامانجی کودەتاکە بۆ دەنگکردن و لەناوبردنی سەرجەم بزووتنەوە بەرهەڵستکارەکان و ناوەندەکانی ناڕازیی و بەگوێرەی دەستووری ڕژێمەکەش دامەزراندنی سیستەمێکی نوێی فاشیستی کلتووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی لەجێگایدا کە گرێدراوی هەژموونگەرایی سەرمایەی فینانسی جیهانگیرییە و لەسەر بنەمای سیستەمێکی ئابووری وابەستە بە هەناردەکردن (کرانەوە بەڕووی داگیرکەری دەرەکی)و ئایدیۆلۆژیای تورک - ئیسلام. وەک چۆن خوازیارن پیشانی بدەن ئەوە سیستەمێک نییە لەژێر کۆنترۆڵی هێزەکانی ئاسایشی تورک ئاواکرابێت؛ ئەنجامێکی ئاسایی پێکدادانەکانی کۆتایی ١٩٦٠ کان کە لەمیانەی ئاگادارکردنەوەی ١٢ی ئادار بە لوتکە گەیشت. ئەوەی دیاریکەرە ناوەندی گلادیۆ و ناتۆ و پاشکۆکانێتی لە تورکیا. ڕۆڵی هێزەکانی ئاسایشی تورکیش تەنیا یارمەتیدان بوو.

لەو قۆناغەدا بزاوتەکانی گلادیۆ بەرامبەر بە PKK بەگشتی لە چوارچێوەی هێرش بۆ سەر بزووتنەوە چەپەکان تاوتوێ کراوە. هەمان ئەو ڕێبازانەی سەرکوت و لەناوبردن کە لەسەر هەر ڕێکخراوێکی چەپڕەو پەیڕەوکراوە لەسەر PKKش بەڕێوەبراوە. بەهۆی شێوازی کارکردن و جوڵانەوەی ڕێبەرایەتی PKK پیلانەکانی هێزە دژەپێکراوەکان بۆ ناو PKKو کۆڵەکەکانیان سەرکەوتوو نەبووە. جگە لە خۆم و هاوڕێیە ڕێزانەکەم بێ ئاگایی هەمووان لە چوونە دەرەوەی وڵات ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینیوە. پێویستە هەڵوەستە

لەسەر سووربوون و داخوازی نەجاتی قاپا بۆ بینینی من و ئەو حاڵەتە روحیەی بکەین کە لەو قۆناغەدا پێیدا تێپەڕ دەبوو. هەروەها هەڵوێستی گوماناوی هەندێک کەس لەکاتی کارکردنمان بۆ ئاواکردنی بەرەی یەکێتی دژی فاشیزم کە لە ساڵی ١٩٨٢ لەگەڵ دەڤ ـ یۆڵ و هێزە چەپڕەوەکانی دیکە کارمان لەسەر دەکرد و بوونە هۆکاری مایەپووچ بوونی، دەشێت پەیوەندی بەهێزەکانی دزەکردن و تەسفیەکردنەوە هەبووبێت. پراکتیکی تەسفیەکارانەی تەنەر ئاکچام ی بانگەشەی ڕێبەرایەتی دەڤ ـ یۆڵ ی دەکرد و ئەو کەسەی بە ساری جەمال ناو دەبرا، نەک تەنیا سەبارەت بە لەناویردنی دەڤ ـ یۆل، بەڵکو پێویستە لەچوارچێوەی هەوڵەکانی تەسفیەکردنی PKKش تاوتوێ بکرێت. هەوڵەکانی هاوشێوەی تەسفیەکردنی ڕێکخراوی ئەسالا و تیرۆرکردنی سەرۆکەکەی یاقوب یاقوبیان[٣] (کە تێیدا سەرکەوتوو بوون) لەو قۆناغەدا بەرامبەر PKKش تاقیکراونەتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون. دوای کودەتای فاشیستی ١٢ئەیلول تەنیا سەرکوتکردن و ئەشکەنجەی قەبە رۆڵی لە تەسفیەکردنی چەپدا نەبینیوە؛ بەڵکو دزەکردن بۆ ناو بونیادی ئەو ڕێکخستنانە (سەرجەم ڕێکخستنەکان، PKKشی لەناودا) رۆڵی گرنگیان لەو تەسفیەکردنەدا هەبووە. درەنگخستنی هەڵمەتی ١٥ی ئاب، دوای ١٩٨٢ راستەوخۆ هاتنی حوسێن یڵدرم بۆ گۆڕەپانی سەرۆکایەتی و دەستپێکردنی چەند هەوڵێک، هەندێک ڕێکخراوی گوماناوی وابەستە بە ڕێکخراوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین و هەڵوێستی PDK لەو چوارچێوەیەدا سەرلەنوێ پێویستی بە هەڵوەستەکردن و تاوتوێکردن هەیە.

پەیوەندیەکان لەگەڵ PDK زۆر هەستیارە. لەوانەیە ویستبێتیان هەمان ئەو هەڵوێستەی PDK بەرامبەر دکتۆر شڤان (سەعید قرمزی تۆپراخ سەرۆکی PDK ـ تورکیا)، واتە هەمان هەڵوێستی هاوشێوە بەرامبەر PKKش جێبەجێ بکەن، کە بە کوشتنی دکتۆر شڤان و دوو لە یاریدەدەرە گرنگەکانی و پەرتەوازەبوونی ئەندامەکانی دیکەی ڕێکخستن ئەنجامگیر بوو. نوێنەرانی PDK لایەنگری ئەنجامدانی هەڵمەتی گەریلاییمان نەبوون. کۆسپگەلێکی زۆریان بۆ دروست کردین. بەتایبەتیش لەکاتی دەربازکردنی سنوورەکان و گەڕانەوە بۆ نیشتیمان زۆرێک لە هەڤاڵانی ئێمەیان شەهید کرد. دواتریش پێکدادان و تیرۆرکردن بەردەوام بوو. کاتێک لە ساڵی ١٩٨٥ لە دیمەشق لە سەردانێکیدا مەسعود بارزانی داوای وازهێنانی هەڵمەتی ١٥ ئابی لێکردین گومان و ئەندێشەیەکی زۆرم هەبوو کە ئەوە تەنیا داسەپاندنی هێزەکانی ئاسایشی تورکیا نییە، بەڵکو هەوڵێکی ئیسرائیل و گلادیۆی ناتۆیە. پێویستە پەیوەندی و پێکدادانەکان لەگەڵ PDK تەنیا وەک رووداوگەلێک نەبینرێت کە هێزەکانی ئاسایشی تورکیا ئاراستەی کردووە، بەڵکو تاوتوێکردنی لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی ئیسرائیل و ناتۆ گرنگی و

---

[٣] ئەکوب ئەکوبیان (هاکوب هاکوبیان ١٩٥١- ١٩٨٨ Agop Agopyan): دامەزرێنەر و سەرۆکی ڕێکخراوی ئەسالای ئەرمەنییە. لە شاری موسڵ لەدایکبووە، پاشان بەرەو لوبنان رۆیشتووە. پێشتر بەشداری چەندین ڕێکخراوی سیاسی بووە و چەندین چالاکی کوشتنی دیپلۆماتی تورکی لە جیهاندا ئەنجام داوە. لەناوەڕاستی شەقامێکی ئەسینا بەدەستی "یەکینەکانی دژ بە تیرۆری تورک" تیرۆر کرا. (وەرگێڕ)

بایەخێکی زۆری هەیە. بابەتێکە پێویستی بە توێژینەوەیەکی بەرفراوان هەیە. هەرچەندە پێشتر شیمانەی هەڵمەتی ١٥ ئاب و ساڵی دواتری کرابێت، بەڵام سیستەم زانیاری مسۆگەری لەو بارەیەوە نەبوو. نازانێت بەکام ئاراستەدا دەڕوات. ناتوانێت شیمانەیەکی راست بۆ ئاراستە و بەرفراوانیەکەی بکات (بۆ خۆشمان بەهەمان شێوەیە). مسۆگەر رێگای لەپێش قۆناغێکی نوێ کردۆتەوە. بەڵام لەو بڕوایەدام کە بە درێژایی ساڵی ١٩٨٥ لەلایەن هێزە ئاسایشیەکانی تورک، ناتۆ و گلادیۆوە گفتوگۆ سەبارەت بە ئەنجامەکانی کراوە.

ج - سێیەمین و گرنگترین قۆناغی شەڕەکانی گلادیۆ لە ١٩٨٥ تا کوشتنی تۆرگۆت ئۆزال لە ساڵی ١٩٩٣ بەردەوام دەبێت. لە ساڵی ١٩٨٥ ماددەی پێنجەمی یاسای دامەزراندنی ناتۆ کەوتەکار کە تێیدا هاتووە "هەر هێرشێک بکرێتە سەر وڵاتێکی ئەندام بە هێرش بۆ سەر تەواوی وڵاتانی ئەندام دادەنرێت". جێبەجێکردنیشی لە چوارچێوەی گلادیۆدا بووە. لەبەر ئەوەی ناوەندی جێبەجێکردن لە ئەڵمانیا بوو، بۆ یەکەمین جار دەوڵەتی ئەڵمانیا بڕیاری دا PKK وەک "رێکخراوی تیرۆریست" رابگەیەنێت. ئەڵمانیا، ناوەندی گلادیۆی ناتۆ و پاشکۆکانی لە تورکیا و هێزەکانی ئاسایشی تورک PDK شیان خستە نێو خۆیان و لەچوارچێوەی پیلانی داڕێژراودا دژە هێرشێکیان دەست پێکرد. ئەو چاوپێکەوتنانەی بەتایبەتی لە رێگای PDK و بارزانیەکانەوە لەگەڵ من ئەنجامیاندەدا داواکاری سەرەکییان ئەوە بوو کە خۆمان کۆتایی بە هەڵمەتەکەمان بێنین. ئەو داواکاری یاخود پێشنیازە مانای رۆژانەییکردنی ئەو بڕیارەبوو کە هەژموونگەرایی سەرمایەداری لە ساڵی ١٩٢١ لە کۆنفرانسی قاهیرە پێی گەیشتبوو. وەک دەزانرێت؛ بەئامانجی سەپاندنی هەژموونگەرایی خۆیان بەسەر خۆرهەڵاتی ناویندا ئەو بڕیارە چارەسەرنەکردنی کێشەی کورد و بەزیندوویی هێشتنەوەی بەبنەمادەگرێت. ئەو رۆڵەی بۆ بارزانیەکان و PDK دیاریکراوە پەیوەندی بە جێبەجێکردنی ئەو پێشبینی و پیلانەوە هەیە. لەبەر ئەوەی ئامانجێکی پێشبینیەکە ئاواکردنی قەوارەی ئیسرائیل و هەمیشەییکردنێتی، ئەوا سەرجەم رێکخراو و پێگەکانی کوردستان ئەگەر لە چوارچێوەی پرۆتۆ ـ ئیسرائیل نەبێت دەستێوەردانی بۆ کراوە و بێکاریگەر کراوە. لەو سۆنگەیەوە؛ هێرشی هاوبەشی ئیسرائیل، تورکیا، هێزەکانی PDK و گلادیۆی ناتۆ بۆ سەر PKK مایەی تێگەیشتنە. بڕیارێکی مێژوویی و بەرژەوەندی رۆژانەیی ژیانی پاشخانەکەیە.

وێڕای ئەو پەیامانەی لەرێگای مەسعود بارزانیەوە گەیاندیان، کاتێک تێگەیشتن واز لە هەڵمەتەکەمان ناهێنین، لە ساڵی ١٩٨٦دا رێکخراوەکانی ژیتەم و حزبوڵڵا خرانە گەڕ. ژیتەم رۆڵی "تەشکیلاتی مەخسوسە[٤]"ی قۆناغی خۆی دەبینی کە هەموو جۆرە دەسەڵاتێکی پێدرابوو. وەک دەزانرێت؛ تەشکیلایەتی مەخسوسە کە لە ساڵی ١٩١٤ دامەزرا یەکێکە لەو رێکخراوە فاشیستە یەکەمینانەی لەپێناو ئافراندنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی تورکی

---

[٤] تەشکیلاتی مەخسوسە (Teşkilatı Mahsusa): رێکخراوێکی نهێنی راستەوخۆ سەر بە ئەنوەر پاشا بوو. لەزەمینەی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقیدا لە ساڵی ١٩١٤دا دامەزرا و پەیڕەوی تورکگەرایی و ئیسلامەگەرایی سیاسی لە پروپاگەندە فاشیستییەکانیدا دیار بوو. چەندین چالاکی تیرۆریستی لە تورکیا و دەرەوە ئەنجام داوە. (وەرگێڕ)

هۆمۆژەنی نەژادپەرست رۆڵێکی گرنگی لە کۆمەڵکوژی ئەرمەنیدا بینیوە و دەسەڵاتی پەیڕەوکردنی هەموو جۆرە ڕێگا و ڕێبازێکی پێدراوە. باڵێکی ئایینگەرا ـ ئیسلامگەرای سەعید نورسی و محەمەد عاکیف یش جێگای خۆیان تێدا دەگرت لەگەڵ ئەو ڕێکخراوە بەیەکەوە خراونەتە جوڵەوە. ئەو مۆدێلەی کۆمەڵکوژی لە ساڵی ١٩٨٦ بە شێوازی کردەوەکانی ژیتەم و حزبوڵلا (حزبوڵلای تورکیا و کوردستان) رۆژانەیی کراوە، هەردوو ڕێکخراویش لە هەمان چوارچێوەدا ئەرک و دەسەڵاتیان پێدراوە. هەمئاهەنگیەک لەنێوان هێزەکانی ئەمریکا، ناتۆ، گلادیۆ و هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و PDK پێشخراوە. حزبوڵلاش هەوڵیداوە سوود لە سیاسەتە ئیسلامگەراکانی ئێران و سعودیەش ببینێت.

ئەو دزەکردنانەی لەو قۆناغەدا بۆ ناو PKK ئەنجامدراوە لەڕێگای PDK وە بووە. سامی عەبدولڕەحمان بەرپرسی قیادە موەقەتە بوو کە ئەو قۆناغە ئەرکی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی PDK ی گرتبووە ئەستۆ. لە بنەڕەتدا سامی عەبدولڕەحمان هەوڵەکانی تەسفیەی پراکتیکی و دزەکردنی دەرهەق بە PKKی بەڕێوە بردووە. گرنگترین ئامرازی بەکاریهێناوە ڕێکخراوی KUK(رزگاریخوازە نیشتیمانیەکانی کوردستان. لەو قۆناغەدا ئێمە خۆمان بە " رزگاریخوازە نیشتیمانیەکان" پێناسە دەکرد. لێرەشدا بەکارهێنانی ناوی ڕێکخراوی ڕەسەن یاخود یەکێک لە سیفەتەکانی لەلایەن هەر ڕێکخراوێکی سیخوڕەوە جێگای باسە) کوردایەتی ساختەیە. چەندین ئەندامانی PKK و نیشتیمانپەروەرانی کورد بە دەستی ئەو ڕێکخراوە تیرۆرکران. ئەو رۆڵەی بەKUK سپێردرابوو؛ بەهەر چ شێوازێک بێت نەهێڵێت PKK هێڵی رۆژهەڵاتی بینگۆل ـ ماردین ببەزێنێت. وەک یەکێک لە دامەزرێنەرانی ژیتەم ئاڵبای عارف دۆغانیش دانی پێداناوە لەو قۆناغەدا هێزێکی دەهەزار کەسی بە ئامانجی لەناوبردن ئەرکدار کراوە. خاڵی گرنگ ئەوەیە کە ئەو هێزە لە سەرووی یاساوەیە. بەبێ پرس و وەڵام دەسەڵاتی ئەنجامدانی هەر جۆرە تاوانێکیان هەبووە. سیفەتی ڕێکخراوی کۆمەڵکوژی لێرەوە وەردەگرێت. هەمان دەسەڵات بە حزبوڵلای کوردستانیش دراوە کە گەل بە (حزبول کۆنترا) ناویدەبات. نزیکەی دەیان هەزار تاوانی تیرۆر و بکەری نادیار لەسەر بنەمای ئەو دەسەڵاتانەی سەرووی یاسا و دەستوورەوە ئەنجامدراوە کە بەو دوو ڕێکخراوە برایە درابوون. بەڵام کوشتنی هونەرمەند هۆزان سەفقان(جەلال ئەرجان) و گروپەکەی لەسەرەتای ئەو قۆناغە (١٩٨٥) دا، و کوشتنی هەڤاڵ مەعسوم قۆرقماز (١٩٨٦)، هەوڵەکانی تەسلیم گرتن لە ڕێگای سەلاحەدین چەلیکەوە و تەنگژەی PKK لە کۆنگرەی سێیەمی ١٩٨٦ ڕووداوگەلێکن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ پەیوەندییان بە ژیتەمەوە هەیە. هەروەها وەک چۆن عارف دۆغان دانی پێداناوە تیرۆرکردنی هەڤاڵ ئیبراهیم (دارار ئاگای)ی نوسیبینی ـ کە لای من هەڤاڵێکی هێژا و زۆر بەنرخ بوو ـ لە لایەن ژیتەمەوە (لە گوندی شاخی سلۆپی) ئەنجامدراوە. کاریگەریەکانی ڕەوشی نائاسایی، ژیتەم و حزبوڵلا لە ساڵی ١٩٨٦ لەسەر PKK ڕەنگیداوەتەوە و ڕێگای لەپێش تەنگژەیەکی ڕێژەیی کردۆتەوە. کۆنگرەی سێیەم ئەنجامی پێویستی بەدەست نەهێنا. گۆڕانکاریەکی بەرفراوانی فەرمانداریتی مەیدانیمان ئەنجامدا.

بە ئامانجی نەهێشتنی ئەو کاریگەرییە نەرێنیانەی لە ساڵی ١٩٨٧ەوە تا کوشتنی تۆرگۆت ئۆزال ساڵانە هەزار ئەندامی گەریلام پەروەردە کرد و بە تەواوی پێداویستیەکانیانەوە دەمانگەیاندنە شوێنی کار و خەباتیان. پێشتر و دواتریش بە هەزاران گەریلا، پێداویستی و پارەم بۆ رەوانە دەکردن، بەمجۆرە یارمەتیم دەدان. بەڵام لەو ساڵانەی تەسفیە و کۆمەڵکوژیدا گەورەترین کۆمەکم پێشکەش کردن. سەیرترین رووداوی ناردنەوەی هێز بۆ وڵات کە لە ساڵی ١٩٨٧ەوە سەرلەنوێ خێرابوو؛ یەکێک لەسەرانی ئەو گرووپەی دواتر بە چەتەی چوارینە ناومان بردن هۆگر (جەمیل ئیشک) بە بیانووی تێکۆشان بەرامبەر بە جاشایەتی دوای پەڕینەوەی سنوور بە شێوەیەکی هەڕەمەکی چالاکی ئەنجامدا، لەئاکامی ئەو کردەوانەدا دەیان کەس کوژران کە ژن و منداڵیشیان لەناودابوو. لەرێگای ئەو کردەوانەوە سیستەمی تەکتیکی PKK مایەپووچ بوو کە بەبایەخەوە رێکم خستبوو. لەوە بەدواوەش PKK لە جێبەجێکردنی تەکتیکەکانی خۆی سەرکەوتوو نەبوو.

لەبەر ئەوەی هەڤاڵ مەعسوم قۆرقماز یەکێک لەو فەرماندە یەکەمینانە بوو کە سەرەتا ئەو مەترسیانەی بینی و هەوڵیدا تەگبیر وەربگرێت بەتایبەتی هەڵبژێردراوە و تیرۆر کراوە. کوشتنی داراریش لەو چواچێوەیە دایە. کوشتنی هۆزان سەفقان و گرووپەکەشی بەردەوامی هەمان زنجیرەی پیلانەکانە. شێوەی کوشتنی مەعسوم و ئەو هەلومەرجانەی تێیدا ژیانی لەدەستدا رۆڵی کەسانی دزەپێکراو دێنێتە بیری مرۆڤ. رەوشی شەمدین ساکک و ئەو لاوەی خەڵکی ئەرۆ کە نازناوی فەرهاد بوو و لە زستانی ١٩٨٧ لە بیقاع خۆی کوشت، ئەو شیمانە بەهێز دەکات کە هەڤاڵ مەعسوم تیرۆرکراوە. کاتێک جەمیل ئیشک سوودی لە گۆڕینی فەرماندارى مەیدانی ساڵی ١٩٨٧ بینی و جڵەوی دەستپێشخەری گەریلای گرتە دەست، باجەکەی بۆ PKK زۆر قورس بوو. گەورەترین زیانیش مایەپووچ کردنی پلانی شەڕی گەریلایی بوو کە PKK بە هەوڵ و کۆششێکی زۆرەوە نەخشەی بۆ دانا و ئامادەی کرد و تاڕادەیەکی زۆریش تەواو ببوو. سەرانی دیکەی گرووپی چەتەی چوارینە: شەمدین ساکک، شاهین بالیچ و خەلیل قایا (جەمالە کوێر) بەردەوامییان بە رێگای هۆگر دا و لە سەرووی ئەو ناوانەوە بوون کە سیستەمی گەریلایان مایەپووچ دەکرد. پەیوەندی زۆربەی ئەوانە لەگەڵ PDK و پێنج پارچە خوازەکان (پێنج پارچە خوازەکانیش گرێدراوی PDK ن. بە تایبەتیش وابەستەی قیادە موەقەتە بوون) مەسەلەی دزەکردن بەهێز دەکات. لەو قۆناغەدا کوشتنی نزیکەی سەد فەرماندەی مەیدانی ـــ کە خۆم دەمناسین ـــ لەژێر ناوی "لەکاتی شەڕدا مردن" گەورەیی پیلانگێڕیەکە دەخاتەڕوو.

تەڵەزگەی پیلانگێڕی زۆر ئاشکرایە. بناغەی مێژووییشی هەیە. لە سەردەمی ئیتحاد و تەرەقی بەردەوام پەیڕەو کراوە. هەروەها بەرامبەر سەرهەڵدانەکانی کوردان و تەسفیەکردنی پارتی کۆمۆنیستیشدا بەفراوانی بەڕێوەبراوە. ئەوەش تایبەتمەندێتییە سەرەکیەکانێتی: یەکەمیان؛ لەپێناو پچڕاندنی پەیوەندی هێزە شۆڕشگێڕەکان بە گەلەوە و

هاندانی گەل دژی ئەو هێزانە لەژێر دەمامکی گەریلا یاخود یاخیبووەکان یەکینەکانی تاوان ئاوا دەکەن و دەیانخەنە کارەوە. چەتەی چوارینە و هاوشێوەکانیان لەو بارەیەوە تا دواڕادە سەرکەوتوو بوون. ئەوانە چەندین کردەوەی پیلانگێڕانەیان بەرامبەر گەل بەتایبەتیش بەرامبەر ئەو بنەماڵە و خێڵانە ئەنجامداوە کە خواستوویانە دژی ئێمەیان بەکار بێنن و بیانکەن بە دوژمن. ئەنجامدانی توێژینەوەیەکی تایبەت بەو کردەوانەی پیلانگێڕی گرنگی و بایەخێکی زۆری دەبێت. مسۆگەر پێویستە ئەو توێژینەوە ئەنجام بدرێت کە دەرەنجامی گرنگی لێدەکەوێتەوە. دووەمین ڕێبازی پیلانگێڕی؛ بەئامانجگرتن و لەناوبردنی ئەو کادیرە بەهادارانەیە کە بەهرەی بوون بە فەرماندەی گەریلایی یاخود سەرکردایەتیکردنی سەرهەڵدانیان هەیە. لەو بارەشەوە سەرکەوتوو بوون. بەبێ هۆکار مردن یاخود کوشتنی چەندین هەڤاڵی بەهرەی فەرماندارێتییان هەبوو گەورەیی پیلانگێڕی ناوخۆ پیشاندەدات. لە تەسفیەکردنی سەرکردەی یاخیبوونە کوردیەکان و چەپڕەوانی تورکیا ڕێگا و ڕێبازی هاوشێوە بەکارهێنراون و کادیرە پێشەنگەکان لەناویران. دواترین ئەڵقەشی ئەو پیلانگێڕییە گەورەیە بوو کە لە ١٩٩٠ بەرامبەر خۆم ئەنجامدرا. ئەو پیلانگێڕیەی شاهین بالیج، محەمەد شەنەر و جانگیر حازر (ساری باران) سەرکێشی و جێبەجێیان کرد بە شەهیدبوونی هەڤاڵ هەمزە بیندال ئاشکرا بوو و مایەپووچ کرا. بەڵام لە دوو بواری دیکەی گرنگدا سەرکەوتوو بوون. لە دابڕانی ڕێژەیەکی خەڵک لە PKK و پەلکێشکردنیان بۆ ناو سیستەمی جاشایەتی سەرکەوتوو بوون. لەمیانەی لەناوبردنی فەرماندە مەیدانیەکانەوە گەریلایان بێ سەر هێشتەوە، لە هێڵی تەکتیکی سەرەکی دووریان خستنەوە و کردوویانن بە گروپگەلێکی ئاوارە و سەرلێ شێواو. هەرچەندە گلادیۆی ناوخۆیی و دەرەکی نەیتوانیوە ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی و PKK سەرکوت و تەسفیە بکات، بەڵام نەیهێشتووە شەڕی گەریلایی بەگوێرەی تەکتیکە تایبەتەکانی خۆشی بەڕێوە بچێت.

یەکێک لەو بابەتە گرنگانەی بەرپرسانی PKK تێیدا سەرکەوتوو نەبوون و هەستیان پێنەکرد هۆکاری پراکتیزەنەبوونی پلاننامەی تەکتیکی و ئەو ڕۆڵە بووە کە گلادیۆ ـ ژیتەم لەو بارەیەوە بینیویانە. سەرکەوتنی هەردوو لایەنیش بە نیوەچڵ ماوەتەوە. ئەو کارەی لەو قۆناغەدا توانیومە ئەنجامی بدەم هەمیشەییکردن و بەردەوامی شەڕی شۆڕشگێڕی و بەربەستکردنی تێکشکانی بوو. ئەگەر سەرکردایەتی مەیدانی ناوەوەی وڵات هەوڵێکی ئاسایی و جێگیری دابووایە ئەوا لە ئاستێکی بەرزدا دەرفەتی سەرکەوتن لەئارادا بوو. دیسانیش مایەپووچکردنی پیلانگێڕی ١٩٩٠و ئەنجامەکانی شەڕی کەنداو پیشانیدەدات کە لە چوارچێوەی گشتیدا کاریگەری هاوبەشی بزووتنەوەی PKK لە بەرزبوونەوە دایە. لەبەر ئەوەی شیکارێکی ڕاست بۆ هاوسەنگی ناوچەکە کرابوو کە مانایەکی گەورەی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی هەیە، تەنانەت جێبەجێکردنێکی ئاسایی شەڕی شۆڕشگێڕیش ڕێگای لەپێش ئەنجامگەلێکی گرنگ و سەرکەوتوو کردۆتەوە. ئەگەر سەرکردایەتی تەکتیکی (مەیدانی) قۆناغی نێوان ١٩٩٠ ـ ١٩٩٣ ی بەشێوەیەکی ڕاست شیکار کردبووایە و لەبواری

چەندایەتی و چۆنایەتیەوە درێژەی بە گەورەکردنی گەریلا دابووایە و پلاننامەی تەکتیکی جێبەجێ کردبووایە، لەوانەیە ئاراستەی مێژوو زۆر جیاوازبووایە، لە سەرەتای ١٩٩٣دا چارەسەریەکی مێژوویی فەراهەم دەبوو. سیستەمی گلادیۆ لە لێواری هەرەسدا بوو. چونکە تۆرگۆت ئۆزال ئەو دۆخەی بینیبوو، هەر بۆیەش ڕێککەوتنی گونجاو بینیبوو. لەو بڕوایە دابوو لەجیاتی لەدەستدانی کوردستان، لەچوارچێوەی پەیوەندی فیدڕال مانەوە لەژێر چەتری دەوڵەتێکی هاوبەشدا گرنگە و ڕێگای برایەتی و بەیەکەوە ژیانی هەمیشەیی گەلانە. لەبەر ئەوەی گلادیۆی ناوەوە و دەرەوە ئەو هەڵوێستەیان وەک لەناوچوونی خۆیان بینی، دەرەتان و ڕێگای ڕزگاربوونیان لە تەسفیەکردنی تورگوت ئۆزالدا بینی. لەوەش گرنگتر تورگۆت ئۆزال لەچوارچێوەی رایەڵەی فیدڕالی و پێویستیەکی میساقی میللی پێشبینی بەستنەوەی موسڵ ـ کەرکوکی بە کۆماری تورکیاوە دەکرد. لەسەر ئەو بنەمایە پەیوەندیەکی توند و تۆڵی لەگەڵ جەلال تاڵەبانی هەبوو. هەر بەو ئامانجەش پێشنیازی دیالۆگی لەگەڵ مندا کردبوو. لە ڕاستیدا پێشبینی هەنگاوێکی مێژوویی کرابوو. وەک دەزانرێت فەرماندەی گشتی جەندرمە ئەشرەف بتلیسیش لەگەڵ تورگۆت ئۆزال لەچوارچێوەی هەمان پلان لە هەوڵ و کۆششدا بوو. ئەمریکا و ئیسرائیل کە سەبارەت بە ئێراق خاوەن پیلانی جیاوازتر بوون، هەڵوێستەکانی تۆرگۆت ئۆزال و ئەشرەف بتلیسیان بۆخۆیان مەترسیدار دەبینی، ئەو کودەتایەیان جێبەجێ کرد کە ڕێگای لەپێش بە دەسەڵات گەیشتنی سولێمان دیمرێل و تانسو چیللەر(ئەردال ئینۆنۆشیان لەگەڵ بوو) کردەوە.

ساڵی ١٩٩٣ ساڵێکی نائاساییە. ئەو تیرۆرە گەورە و بەناوبانگانەی لە یەکەمین مانگەکانی ساڵ بە کوشتنی ئۆغور مومجو دەستی پێکرد (کوشتنی عەدنان قەهوەجی، تۆرگۆت ئۆزال و ئەشرەف بتلیس، کۆمەڵکوژی ئۆتێلی مادماک لە سیواس، تیرۆرکردنی بەختیار ئایدن، کوشتنی ٣٣ سەرباز کاتی گواستنەوەیان بە ئۆتۆمبێلی سڤیلەوە، کوشتنی چەندین بەرپرسی مەدەنی و سەربازی) پێویستە لە چوارچێوەی کودەتا بیری لێبکرێتەوە. باڵێکی زۆر بەهێزی ناو دەوڵەت لەو قۆناغەدا بۆ ڕێگەچارەی ئاشتیانەی کێشەی کورد ئامادەبوو. لە کۆبوونەوەوی ئەنجوومەنی ئاسایشی میللی ٢٥ ئایار لێبوردنی سیاسی لە ڕۆژەڤدابوو. ئەوەش کودەتایەک بوو ڕێگای لەپێش ئەنجامگەلێک کردەوە کە بەلانی کەم هێندەی کودەتای سەربازی ١٢ ئەیلول کاریگەری قورسی هەبوو. هەڵبەتە بەهۆی ڕێکخراوی گلادیۆی خاوەن دەسەڵاتی سەرووی یاسا و دەستوورەوە پێویستی بە ئەنجامدانی کودەتای سەربازی نەبوو. ئامانجی کودەتاکەی ئەوجارە لایەنگرانی ڕێگەچارەی ئاشتیانە بوو لەناو هێزەکانی دەوڵەتدا. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەوانەی لەلایەن ئەو کودەتایە درێژخایەنەدا لەناوبران ئەو هێزانەی دەوڵەت بوون. ئەو کودەتایەی تا ئێستاش بە شاراوەیی ماوەتەوە مسۆگەر پێویستە ڕۆشن بکرێتەوە. تا پاشکۆی کودەتاچیەکان لەناو PKK و دەوڵەت ئاشکرا نەکرێت، ئەوا بە ئاسانی ڕێگای ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیانە ناکرێتەوە.

پێویستە ڕۆڵی دیاریکەری گلادیۆ لەو تەسفیەکاریانەدا ببینرێت کە لە کۆتاییەکانی ئەو قۆناغەدا واتە دوای ١٩٩٠ لە هەرێمەکانی دێرسیم، ئامەد، گارزان و تۆڵهەڵدان ڕوویاندا. ئەو هەوڵە تەسفیەکاریانەی لە هەردوو لای سنووری ئێراق لەگەڵ PDK بەڕێوە دەبران، ئەگەرێکی بەهێزە لە هەرێمەکانی گارزان و ئامەد لەلایەن شەمدین ساکک و سەعید چروقایە، لە دێرسیم لەلایەن خدر ساری قایا و لە هەرێمی تۆلهەلدانیش لەلایەن تەرزی جەماڵەوە ئەنجامدرابێت. بە دڵنیاییەوە دەتوانرێت بگوترێت کەسانێکی زۆر بەشێوەیەکی ئەنقەست یاخود بێ ئاگایی ڕۆڵیان لە تەسفیەکاری ئەو قۆناغە ئاڵۆزەدا هەبووە. لەئاکامی ئۆپەراسیۆنەکان و هێرشە هاوبەشەکانی دەوڵەتی تورک لەگەڵ YNK و PDK دا بەرەی بەرخودانی بۆتان ـ بادینان زیانێکی گەورەی بەرکەوت. لەگەڵ ئەو تەسلیمیەتکاریەی عوسمان ئۆجەلانی ناپاک سەرەکەی بوو، بە لێواری دۆخێک گەیشتبووین کە واتای زیانێکی ستراتیژی دەگەیاند. لەمیانەی ئەو بەرخودانە بە بڕیار و لێهاتووانەی لە سەرجەم گۆڕەپانەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە لە شوێنی جێگیربوونمان لە خۆرهەڵاتی ناوین پیشاندرا، لە کەناری تەسفیەی ستراتیژی گەڕاینەوە. کەچی لەراستیدا باڵابوونی ستراتیژی گەریلا جێگای باس بوو، کە پشتگیریەکی مەزنی گەلی لەپشت بوو. کاتێک ئەو کۆمەڵکوژیانەی گلادیۆ لەچەندین شار و شارۆچکە ڕێکیخست، لەگەڵ هەوڵەکانی تەسفیەکردنی گەریلا و ڕێکخستن و هێرشەکانی YNK و PDK بوونە یەک، ئیتر کارەکان پێچەوانە بوویەوە. بەڵام دیسان دەرفەتی باڵابوونی ستراتیژی گەریلا جێگای باس دەبوو. بەڵام بەهۆی جێگیرنەبوونی سەرکردایەتی تەکتیکی، ئەو دەرفەتە مێژووییە بەشێوەیەکی شایستە نەقۆسترایەوە. لەبەر ئەو هۆکارەشPKK زیانێکی ئەوتۆی بەرکەوت کە شایەنی نەبوو؛ هەربۆیەش بەو سەرکەوتنە گەورانە نەگەیشت کە شایستەی بوو. ڕۆشنکردنەوەی ڕووداوەکانی ئەو قۆناغە، بە تایبەتیش ئەو بوویەرانەی لە کۆتاییەکانی ئەو قۆناغە ڕوویاندا، ئێستاش وەک کێشەیەکی سەرەکی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە.

د ـ چوارەمین قۆناغی شەڕەکانی گلادیۆ ساڵانی ١٩٩٣ ـ ١٩٩٨ دەگرێتەوە. ڕکابەرانی هەڵوێستی ڕێگەچارەی سیاسی و ئاشتیانە سەبارەت بە کێشەی کورد کە تورگۆت ئۆزال پێشەنگایەتی دەکرد کاتێک قۆناغی نوێیان دەستپێکرد خاوەن چەندین خاڵی بەهێز بوون. لە دەرەوە لەسەر بنەمای پشتگیری مەزنی ئەمریکا و ئیسرائیل دەستبەکار بوون. سوپاساڵاری ئەو کاتە دۆغان گورەش لە سەرەتای ١٩٩٠کان لەکاتی گەڕانەوەی لەسەردانێکی لەندەن کاتێک گوتی: "بۆ سەرکوتکردنی PKK لامپی سەوزیان بۆ داگیرساندووین" لەراستیدا مەبەستی ئەو پشتگیریە بوو. یارمەتیدانی بەمجۆرەی ئیسرائیل بۆ تورکیا بەهۆی نیگەرانیەکانی بوو بەرامبەر جێگیربوونی PKK لە خۆرهەڵاتی ناویندا. ئیسرائیل بە سووربوونەوە دەیخواست PKK ببێتە پاشکۆیPDK. نەیدەویست بزووتنەوەی کورد لەسەربنەمای هێزی خۆیی و بەشێوەیەکی سەربەخۆ و ئازاد پەرەبسەنێت. بەتەواوی دژی بزووتنەوەی کورد نەبوو، دژی شێوازی PKK بوو. بەهۆی

فاکتەری PKKوە سالانی نێوان ١٩٩٣ ـ ١٩٩٦ پەیوەندیەکانی ئیسرائیل ـ تورکیا بە توندوتۆلترین قۆناغی خۆی گەیشت. بەشێوەیەکی نەریتی ئەمریکا و ئینگلتەرا لەرێگای گلادیۆی ناتۆوە تورکیایان کۆنترۆل کردبوو. بەشێوەیەکی سەرەکی پشتیان بە رێکخراوی گلادیۆ دەبەست. لەناوەوە لەگەل جەمسەری سولێمان دیمرێل، تانسوچیللەر و ئەردال ئینونو رێککەوتن و سەرجەم ئامادەکاریەکانی پیلانی لەناوبردنیان تەواو کرد. لەناو پارتی نیشتیمانی دایک (ANAP)یشدا تورگۆت ئۆزالیان گۆشەگیرکرد و بە تەنیایان هێشتەوە. بەهەمان رێباز واتە لەمیانەی گلادیۆوە مەندەرەس، ئۆزال و ئەجەویدیان لە تورکیا تەسفیە کردبوو. گلادیۆ ئەزموونێکی گەورەی لە تەسفیەکردنی ئەو کەس و دامەزراوە گرنگانە بەدەست هێنابوو کە رۆلی کلیلیان دەبینی. ئەگەر کاریگەری گلادیۆی ئەو پەنجا ـ شەست سالەی دوایی لەسەر حوکمڕانی تورکیا رەچاو نەکەین، ئەوا هیچ رووداوێکی جددی سیاسی، سەربازی و ئابووری بەشێوەیەکی دروست شیکار ناکرێت. گلادیۆ دوایین ئەلقەی ئەو کودەتا و پیلانگێڕیانەیە کە بناغەکەی لە سالی ١٩١٤ دانراوە، بگرە پێشتر لەگەل لە دەسەلات لادانی سولتان عەبدولحەمید لە سالی ١٩٠٩ دەستی پێکردووە. لە بنەڕەتدا فاشیزمی تورکی سپی لەلایەن رێکخراوەکانی لەجۆری گلادیۆوە بەڕێوە دەبرێن کە جێگای خۆیان لەناو ئەو زنجیرەی پیلانگێڕیەکاندا دەگرن. ئەوانە هێزی دیاریکەرن. ئەوەی لە رووکەشدا رەنگدەداتەوە، بەتایبەتیش سیاسەتمەدارە سڤیلەکان تەنیا رۆلی دەمامک دەبینن. گفتوگۆ دروستکراوەکانی نێوانیشیان تەنیا لەپێناو دەمامککردن و رەواکردنی تەلەزگەکان و یاریزانە راستەقینەکانی دەسەلاتە.

لەکاتێکدا لە سالی ١٩٩٣ لایەنگرانی ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە لەناو دەولەت تەسفیەکران، یەکێک لە گەورەترین هێرشەکانی لەناوبردن لەسەر گەلی کورد و PKK بەڕێوەچوو. نزیکەی چوار هەزار گوند رووخێنران و سووتێنران؛ بەملیۆنان کورد بەشێوەیەکی زۆرەملێیانە و بەبێ پێشاندانی هیچ پاساوێکی یاسایی ناچاری کۆچکران. مال، مولک، سامان و کێلگەکانیان تالانکرا؛ پێشکەشی جاشەکان کرا. بەهەزاران لادێنشین بە دەستی جاش، حزبوللا و ژیتەم (هەرسێکیان تێکەل بەیەکتر ببوون) کوژران. دەستدرێژی کرایە سەر ژنان. منداڵان لە شوێنەکانی لەناوبردنی بەکۆمەل (لە رێگای رێبازەکانی ئاسیمیلاسیۆن و دەستدرێژی بەردەوامەوە) بێ ناسنامە کران کە بە قوتابخانەکانی شەوانەی ناوچەکە ناو دەبرێن. لەو گوند و شار و شارۆچکانەی دیکەش خۆراک بە پێی پسوولە و لەژێر کۆنترۆلدا بلاودەکرایەوە. دەستیان بەسەر بەڕێوەبەرایەتی قاچاخچێتیدا گرت و تەنیا لەسەردەمی تانسۆ چیللەردا ئەو غەنیمەتە ٢٠ ملیار دۆلاریە (ئەوەی بە بەلگە راگەیەنراوە) ی بەدەستیان هێنا لەنێوان خۆیان دابەشیان کردن. پیشەکار و کارسازە دلسۆزەکانی کوردیان خستە لیستەوە، هەندێکیان تیرۆر کردن، ئەوانەی کە نەهاتنەڕێش مایەپووچ کران. ئەوانەی دیکەشیان کرد بە پاشکۆی کۆنترگەریلا. ژمارەی جاشەکانیان کرد بە سەد هەزار. هەر کەسێکی بەکرێگیراوێتی پەسەند نەکرد بە دوژمنیان دانا. بەرفراوانترین پەلامار و ئۆپەراسیۆنی مێژووی کۆماریان

بەرامبەر PKK ئەنجام دا. لەو هێرشانەدا لەڕیزی هەرە پێشەوە PDK، جاش و ئیعتیرافکارەکانیان بەکارهێنا. لەڕێگای هێزێکی زۆر گەورەتر لەو هێزەی لە شەڕی دژی یۆنان بەکاریانهێنان ئۆپەراسیۆنەکانی شەڕێکی درێژخایەنیان بەڕێوەبرد. پەیوەستی هیچ یاسا و ڕێسایەکی شەڕ نەبوون. بگرە تەرمی گەریلاکانیشیان پارچە پارچە کرد.

لە هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ زیاتر هێزەکانی گلادیۆ ـ ژیتەم ـ حزبوڵڵا شەڕیان بەڕێوە دەبرد. ئەو هێزانەی دەسەڵاتێکی سەرووی یاسا و دەستووریان پێدرابوو گوایە شەڕی مان و نەمانیان بەڕێوە دەبرد. "مەترسی کورد" دوو هێندەی مەترسی یۆنان و ئەرمەنی بوو. لەراستیدا لەو بارەیەوە دووچاری گرێی دەروونی هاتبوون. هەوڵی لەناوبردنێکی مسۆگەر و ڕەهایان دەدا. چەندین پیلانگێڕی تایبەتیان بەڕێوەبرد. تەنیا لەبەر ئەوەی ڕاپۆرتێکی سەبارەت بە کێشەی کورد ئامادەکرد ساقب ساپانجی[٥] کەوتە ناو لیستی ڕەشی تیرۆرکردنەوە. خودی ئەلپ ئەسلان تورکێش[٦] گوتی"سنوور تێپەڕ دەکەن"و هەڕەشەی لێکرد. ڕۆژنامەوان نەما ئاگادار نەکرێتەوە. هەروەها تەقاندنەوەی بۆمبایەکی یەک تۆنی لەدوا پیلانگێڕی ٦ئایاری ١٩٩٦دژی من ئەنجامدرا (ئەو پیلانەی عەبدوڵڵاچاتلی، سادات بوجاق و قەلەشی ئەدیب ئۆغلوی سەرۆک شارەوانی ویرانشار بەیەکەوە ڕۆڵیان تێدا بینی) دیسان یەکێک لە نیشانەکانی ئەو قۆناغە بوو. پارچەبوونی ناو سوپا قووڵتر بوویەوە. هەوڵەکانی مەودا دانان لەگەڵ گلادیۆ کە بە ئیسماعیل حەقی قەرەدایی دەستی پێکرد (سوپاسالاری قۆناغی ١٩٩٤ ـ ١٩٩٨) ئەنجامێکی شێوازی شەڕی شێتانەی ئەو قۆناغە بوو. تەنانەت ئەویشیان بێ کاریگەر کردبوو. دوای لەناوبردنی تۆرگۆت ئۆزال و گروپەکەی ئیتر سەرانی گلادیۆ بەتەواوی ببوون بە خاوەنە ڕاستەقینەکەی دەسەڵات. ئەوانەی بەرچاویش جگە لە ئەکتەرێکی سیاسی ڕۆڵێکی دیکەیان نەبوو. وەک چانسێک ڕزگاربوونی حوسێن کڤرک ئۆغلو ـ کە لە ساڵی ١٩٩٨ بوو بە سوپاسالار ـ لە هێرشەکەی قوبرس و کوژرانی سەرهەنگەکەی پشتی ڕووداوێکی دیکەی گرنگە و پیشانی دەدات کە بۆ لەناوبردنی ئەو کەسانەی بەدڵییان نییە چەندە چاو سوورن.

هەروەک قۆناغی ١٩٨٥ ـ ١٩٩٣ لەو قۆناغە نوێیەشدا بەو ئامانجەی تامپۆی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی کەم نەبێتەوە و نەپچڕێت، بەکارهێنانی سەنگەر و پێگەکەی خۆرهەڵاتی

---

[٥] ساقب سابانجی: دەوڵەمەند و کارسازێکی بەناوبانگی تورکیا و سەرۆکی دەستەی بەڕێوەبەری کۆمپانیاکانی سابانجی بوو. بەوە دەناسرا کە لە گەلەوە نزیک بوو. چەند پەرتووکێکیشی نووسیوە. لەوانە؛ ئەمەیە ژیانم، لە ڕووسیاوە بۆ ئەمریکا، سەرکەوتنی ئێستا لەدەمی شێرەوە... لە کاتێکدا بۆ چارەسەری شێرپەنجەی گورچیلەکانی چووبووە ئەمریکا لە یەکێک لە نەخۆشخانەکانی ئەمریکا بەشێوەیەکی گوماناوی مرد. (وەرگێڕ)

[٦] ئەلپ ئەرسەلان تورکێش (١٩١٧ ـ ١٩٩٧): ئەفسەرێکی میللیگەرای تورک بەپلەی عەقید بوو. بەشداری لە چەندین خوولی سەربازی لە ئەمریکا و وڵاتانی دیکەدا کردووە. شارەزایی لە ئەتۆم لە ئەڵمانیا بەدەستهێنا. لەساڵی ١٩٦٥دا بووە سەرۆکی پارتی میللیگەرایی گوندی کۆماریخواز، پاشان ناوەکەی بۆ پارتی بزووتنەوەی میللیگەرایی MHP گۆڕدرا. بووە بە سەرۆکوەزیر. لەدوای کودەتای ١٩٨٠دا دەستگیر کرا. لە ساڵی ١٩٨٧دا چالاکی سیاسی لێ قەدەغە کرا. لەگرنگترین پەرتووکەکانی: نۆ ڕووناکیبەخشەکە، ڕووداوە میللییەکان، بەرەو ئاسۆیەکی نوێ، بۆچوونی سیاسی. (وەرگێڕ)

ناوینم وەک تەکتیکی سەرەکی دەستنیشان کرد. لەو بڕوایە دابووم کە ئەوە بەکاریگەرترین خەباتی تەکتیکیە. دیسان زۆربەی زۆری ئەو گەریلایانەی سالآنە نزیکەی هەزار کەس پەروەردە دەکران لەگەڵ دابینکردنی سەرجەم پێویستیەکانیانەوە گەیەنرانە شوێنی کار و خەباتیان. لەناو وڵات دەستبەرداری هیچ سەنگەر و خاڵێکی جێگیربوونی گەریلا نەبووین. کەناڵ و ڕێگای دیکەش کرایەوە. ئەو زیانانەی بەریشمان کەوتن جگە لەبڕینی لقەکانی دار هیچ کاریگەریەکی دیکەی نەبوو. لەو شەڕە سیاسی و ئایدیۆلۆژیەی نەفەس بە نەفەس بەڕێوەچوو هەنگاوێکیش بۆ دواوە نەگەڕاینەوە. بەڵام وێڕای ئەوەش بە سەرکەوتنی چاوەڕوانکراو و دۆخی هاوسەنگی نەدەگەیشتین. هەرچەند هەوڵێکی زۆریان دەدا، بەڵام شەڕی گلادیۆی دەرەوە لەو دۆخەدا دیاریکەر نەبوو؛ بەڵکو جێگیرنەبوونی سەرکردایەتی تەکتیکی و فەرماندارێتی گەریلا دیاریکەربوو. هەرچەندە دژەکردنەکان رۆڵێکی کاریگەر و هەوڵی تەسفیەکارانەیان هەبێت، بەڵام کێشەی سەرەکی سەرچاوەی خۆی لە فەرماندارێتیەوە دەگرت. لەبواری چینایەتی و کەسایەتیدا شەڕ زیاتر لەو بوارەدا ڕەنگیدەدایەوە. هەرچەندە هەوڵە تیرۆرکاریەکەی ٦ی ئایار سەرکەوتوو نەبوو، بەڵام ئەو چالاکییە گیانبازیەی هەڤاڵ زەینەب کەناجی ـ کە زۆر باش دەرکی بەو مەترسییە گەورەیە کردبوو کە ئەو هەوڵە هەڵگری بووـ لە ٣٠ حوزەیران لە شاری دێرسیم ئەنجامیدا، ساڵی ١٩٩٦ ی کرد بە ساڵێک کە ڕێگا بنبەستبووەکەی تەکتیکی کردەوە و ڕێگای سەرکەوتنی زەلالتر کرد.

لەو قۆناغەدا بینیم کە شەڕی گەل لەهەمانکاتدا شەڕی چینایەتیشە. لەو شیکارانەی ئەنجامدەدان شوێنێکی بەرفراوانم بۆ ئەو راستیە تەرخان کرد. وەک سەرەتاکانی ١٩٩٠کان لە کۆتاییەکانیشیدا دەرفەتی سەرکەوتن هەبوو. هەوڵەکانی دیالۆگ کە بە دەستپێشخەریەکانی تۆرگۆت ئۆزال دەستپێکرد لە ساڵی ١٩٩٧ لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتە نەجمەدین ئەربەقان و باڵێکی سوپا بەردەوام بوو. دیسان زۆر نزیکی ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیانە بووینەوە، مەزەندە دەکەم دیسان هەمان گلادیۆ دەستی لە مەسەلەکە وەردا و هێزە ناوخۆ و دەرەکییە پاشکۆکانی کەوتنە جوڵە و هەلی ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی چاوەڕوانکراو نەقۆسترایەوە، دەرفەتیان پێنەدا. ڕێگەنەدان بە ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیانە کە لەئاستی سەرۆکایەتی وەزیران و سەرۆکایەتی ئەرکانی سوپا مەبەستیان بوو، بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پیشانیدەدات کە ناتۆ، گلادیۆ و پاشکۆ ناوخۆ و دەرەکیەکانی چەندە کاریگەرییان لەسەر رژێمی تورکیا هەیە. سیستەمێک جێگای باسە کە وەک دێوەزمەیەک خۆی لە کۆمار پێچاوە.

لەمیانەی هەڕەشەی شەڕی دەوڵەتی تورکیا بۆ سوریا لە ئەیلولی ١٩٩٨ خواستیان کۆتایی بە پێگە ستراتیژیەکەی خۆرهەڵاتی ناوینم بێنن. پێگەی ستراتیژی من و ناوچە رۆڵیان لە گەیشتن بەو خاڵە هەبوو، بەڵام بەبڕوای من هۆکارە سەرەکیەکەی دیسان بە رۆژەڤبوونی جددیانەی ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی بوو. زۆر پێشتریش دەیانتوانی لەبواری سەربازیەوە فشار بخەنە سەر سوریا؛ لەو بارەوە کۆسپێکی جددیان لە پێش

نەبوو. هەڵبژاردنی ئەو قۆناغە یاخود ئەو ساڵە لەنزیکەوە پەیوەندی بە ئەگەری ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیەوە هەیە. بەکورتی تا ئێستاش دەیانەوێت بڕیارەکەی ۱۹۲۰ کارا بێت و کاری پێ بکرێت کە لە کۆنفراسی قاهیرە وەریانگرتووە. چارەسەرنەکردنی کێشەی کورد گرنگیەکی ژیانی بۆ کۆنترۆڵکردنی تورکیا و خۆرهەلاتی ناوین هەیە کە بۆ ئەوان زۆر بایەخدارە. لە چوارچێوەی ئەو پێوەرەدا هەڵسەنگاندنی هەڵوێستی زۆربەی هێزە ناوخۆیی و دەرەکیەکان سەبارەت بە PKK و کوردان بەگشتی ڕۆشنکەرەوەتر دەبێت. لەراستیدا دەبووایە ساڵی ۱۹۹۸ بۆ منیش ببووایە بەخاڵی وەرچەرخان. وەک چۆن لە شیکارەکاندا بەردەوام تاوتوێم دەکرد، شەڕی گەریلا کە دووچاری گێژاو ببوو، بە مانایەکیتر لە سێیانەی گلادیۆ ـ ژیتەم ـ حزبوڵڵا بە هەڵواسراوی مابوویەوە، تا ئەو گێژاوە ناپەسەند و مەنگەنە سێیانەیە نەشکێت نەیدەتوانی شەڕ بۆ ئاستێکی تر بەرز بکاتەوە. لەو بارەیەوە کەموکورتییە ناوخۆییەکان هەر دیاریکەر بوون. کە ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی سەرنەگرێت، جگە لە بەرزکردنەوەی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی بۆ ئاستێکی سەرووتر بیر لە ڕێگایەکی دیکە نەدەکرایەوە.

### ج) پێشخستنی شەڕی شۆڕشگێڕی و ئافراندنی ملیتان لەناو کوردانادا

کێشەی سەرەکی قۆناغی گرووپی PKK پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی و سیاسییە. خەباتی تیۆری و کادیرانیش ناوەڕۆکەکەی پێکدەهێنا. گرووپەکەمان کە چارەسەرکردنی کێشەی کوردی بە کلیلی چارەسەرکردنی تەواوی کێشە کۆمەلایەتیەکانی کوردان، تورکیا و خۆرهەلاتی ناوین دادەنا توانستە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکەی توانای جێبەجێکردنی پێویستیەکانی ئەو راستییەی نەبوو. ئەو کەسانەی ژمارەی پەنجەکانی دەستیان تێپەڕ نەدەکرد، زەحمەتییان لەدابینکردنی پێویستیەکانی ژیانی رۆژانەدا دەبینی، زۆربەشیان لەناو دوودڵیدا بوون و شەقی فەلەک (دەتوانین بڵێین شەقی شارستانی)یان خواردبوو، پێشەنگایەتی ئایدیۆلۆژی و سیاسی لای ئەوان تەنیا خەیاڵێک بوو. هەڵبەتە بەبێ خەیاڵیش کاروان دەست پێناکات؛ بەڵام تەنیا بەرێگای خەیاڵ و هیواشەوە ژیانی راست و ئازاد بەدینایەت. ئافراندنی کادیری پێویست و گەیشتن بە تیۆری و دەستەواژەی پێویست شێوەی سەرەکی کار و خەباتی دە ساڵی یەکەم بوو. بە مانایەکیتر خەباتی بوون بە تێکۆشەر و ملیتانێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بوو. هەوڵماندا هێڵە سەرەکیەکانی چیرۆکی ئەو خەباتە بخەینەڕوو.

دەرکەوتن بەرەو دەڤەرە پیرۆزەکەی کۆچی خۆرهەلاتی ناوین مانایەکی زۆر جیاوازی هەبوو. سەرگوزەشتەی دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیمی هاوشاریمان لە ئورفاوە گرنگترین چیرۆکی پەرتووکەکانی هەر سێ ئایینی تاکخوداییە. چەندە سەیرە دوای نزیکەی سێ هەزار و پێنجسەد ساڵ بەهۆی هەمان بیانوو و بەهەمان ڕێگا و ژمارەی قەبیلەیەکی باوەڕمەندانەوە بەرەو هەمان شوێن ڕێگامان گرتەبەر. دیسان لە هەمان دەڤەر و هەمان

شوێن خێوەتەکانمان دامەزراند. شەڕەکانی حەزرەتی ئیبراهیم لەو دەڤەرە و ئەنجامەکانی دەزانرێت. لەراستیدا ئەو بوویەرەی بە شەڕی ئایینی ناودەبرێت، گوزارشتکردنی ململانێی ئایدیۆلۆژی و سیاسییە بەشێوازی ئایینییەوە. لە عەهدی قەدیمدا باسی زۆرانبازێی یەعقوبی کوڕی حەزرەتی ئیبراهیم لەگەڵ خوداوەند دەکرێت. خودی ناوی ئیسرائیلیش مانای زۆرانبازێ لەگەڵ ئەل واتە ئەڵلا دەبەخشێت؛ زمانی بەکارهێنراو زمانی شەڕە و دەربڕی تێکۆشانی ئایدیۆلۆژییە. گوزارشت لە تێکۆشانی سیاسی و ناکۆکیەکانی لەگەڵ قەبیلەکانی وڵاتی کەنعان دەکات.

نزیکەی سێسەد ساڵ دوای حەزرەتی ئیبراهیم ئەوجارە موسای سەرۆکی قەبیلەی عیبرانی لە میسرەوە بەرەو هەمان شوێن واتە بەرەو وڵاتی کەنعان رێگا دەگرێتەبەر. بە بەراورد لەگەڵ دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا بەشێوەیەکی بەرجەستەتر باسی بوویەرەکە دەکرێت. مانای ئەو کۆچەی لە حەزرەتی موسادا بووە سیمبۆل لە هی حەزرەتی ئیبراهیم جیاوازترە. ئیتر لە بەدواداچوون و بژاری ئایدیۆلۆژی و سیاسی زیاتر جەنگاوەرێتی قەبیلە و خەسڵەتی شەڕڤانێتی جێگای باسە. سێسەد ساڵ پێشتر قەبیلەی عیبرانی ببووە خاوەن ئایین و خوداوەندی خۆی، واتە ناسنامەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بەدەست هێنابوو و لەو ساڵە درێژانەدا پتەوی کردبوو. ئەو شتەی حەزرەتی موسا بەدوایدا دەگەڕا ئایینی نوێ و خوداوەندەکەی نەبوو؛ بەدوای ئیلهامدا دەگەڕا، ئەویش دە فەرمانەکەیە. بە زمانی ئایینی و ئەدەبی قۆناغی خۆی باسکراوە کە چۆن ئەو فەرمانە وەردەگرێت. "فەرمان" دەستەواژەیەکی سەربازییە و پەیوەندی بە فەرمانداریێتیەوە هەیە؛ مانای فەرمان پێکردنی قەبیلە و راکێشکردنێتی بۆ ناو سیستەمی شەڕەوە. بەو شێوەیەی لە تەورات باسدەکرێت دوای دەرکەوتنی حەزرەتی موسا لە میسر و بەسەربردنی چل ساڵی تەمەنی لە شەڕەکانی بیابانی سینادا لە کەنارەکانی ئەریحا (شارێکی فەلەستینی ئەمڕۆیە) کاتێک هەوڵی فەتحکردن دەدات کۆچی دوایی دەکات و سەردەمێک کۆتایی دێت. لێرەدا دەردەکەوێت کە شەڕ زمان یاخود شێوازی ئەو سەردەمەی تێکۆشانە کە لە دەوروبەری ساڵانی ١٣٠٠ پ.ز روویداوە. بەو رادەیەی بتوانین لەرێگای دەقەکانی تەوراتەوە راڤەی بکەین دەبینین کە سەرگوزەشتەی ئەو چل ساڵە پڕ لە پەیام و بانگهێشتە بۆ رۆژی ئەمڕۆمان. لەکاتێکدا رزگاربوونی حەزرەتی ئیبراهیم لە نەمرودی هەژموونگەرا (پاشا ـ خوداوەند) لەئاکامی تێکۆشانێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی دژوار و کۆچکردنەوە ئەنجامگیر بوو، بەڵام رزگاربوونی حەزرەتی موسا لە فیرعەونی پاشا ـ خوداوەند بە رێبازێکی جیاوازی تێکۆشانەوە بەدیهات، لەرێگای جەنگاوەرێتی قەبیلەی عیبرانی ملیتان و چەکدار فەراهەم بوو. دیسان شەڕ دەرهەق بە دەڤەرە پیرۆزەکەیە. بەدەستهێنانی سیفەتی پیرۆزی دەڤەرەکە پەیوەندی بەو بابەتەوە هەیە.

لە سەردەمی کۆچی حەزرەتی ئیبراهیمەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان بگرە بە درێژایی مێژووی شارستانی قودس و دەوروبەری رۆڵی ناوچەی تامپۆنی بۆ هێزە هەژموونگەرا جیاوازەکان بینیوە. بۆ یەکەمین جار ئەو رۆڵەی لەنێوان شارستانیەکانی سۆمەر و میسر

دەست پێکردووە. لە سەردەمی ٣٠٠٠ ـ ٢٠٠٠ پ.ز ناوچەکە دەڤەرێکی خۆسەر و مارژینالی هەردوو شارستانی سەرەکی و هێزی هەژموونگەرایە. جڤاتی قەبیلەکانی ئەو دەڤەرە لە ڕێگای بازرگانی لەگەڵ هەردوو شارستانیدا دەوڵەمەند بوون و تۆوی سێیەمین شارستانی دەچێنن. لەسەردەمی دەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم (١٧٠٠ ـ ١٦٥٠ پ.ز) قەبیلەکان ئەو تایبەتمەندێتیەی خۆیان دەپارێزن. ژمارەیەکی زۆری گرووپی باوەڕی و قەبیلەی ئۆتۆنۆم سیفەتێکی خۆسەر و پیرۆزی جیاواز بە دەڤەرەکە دەبەخشن. هەر جڤاتێکی بیەوێت لە هێزی زۆرداری فیرعەون و نەمرودەکانی قۆناغ و گوزارشتی ئایینی ئەو ستەمکارییە ڕزگاری بێت ئەوا هەم هێزی قەبیلەی خۆی دەکات بە خاوەنی بەرگریی خۆیی، هەمیش ئایینی ئەو قەبیلەی خاوەن بەرگری خۆیی ئاوادەکات. لەبنەڕەتدا تەورات سەرگوزەشتەی تێکۆشانی ئەو قەبیلانەی دەڤەرەکەیە کە خاوەنی بەرگری خۆیین. لەوانەیە ئەو ڕووداوانەی حەزرەتی ئیبراهیم و موسا دووچاری هاتوون زیادکردنی مۆدێلی خۆیان بووبێت بۆ سەر ئەو سەرگوزەشتانەی هەزاران ساڵ پێشتر ڕوویانداوە.

ئەوەی حەزرەتی عیسا لەمیانی قەبیلە بچووکەکەی (گرووپی دوازدە کەسی حەوارییەکان) باوەڕی خۆیەوە لە سەرەتاکانی ساڵی زایینی هەوڵی ئەنجامدانی دا ڤێرسیۆنێکی دیکەی هەمان سەرگوزەشتە بوو. دیسان ئامانج قودسە، فەتحکردنی دەڤەرە پیرۆزەکەیە. جیاوازیە گرنگەکەی لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم و موسا، حەزرەتی عیسا سەرۆکی ئایینی و سیاسی و سەربازی قەبیلەی عیبرانی نییە. وەک کاهینێکی زۆر هەژار بە ئامانجی ئەنجامدانی ڕیفۆرم لە ئایینی یەهودی خاوەن بونیادی پلەداری هەنگاو دەنێت. هەوڵدەدات قەبیلە (قەبیلەی یەهودی نیشتەجێ)و ئایینەکە پارچە بکات. بەپێی زانیارییە پێدراوەکان یەکێک لە جددیترین و یەکەمین شۆڕشە کۆمەڵایەتیەکانی مێژوو جێگای باسە. هاوسەردەمی سپارتاکۆسە. ئەوەی سپارتاکۆس هەوڵیدا لەبواری سەربازیەوە لە ڕۆما (٧٠ پ.ز) سەرکەوتن بە دەست بێنێت، عیسای مەسیح لە دەورووبەری قودس لە ڕێگای گرووپی ئایدیۆلۆژیەوە هەوڵی بۆ دەدات. دەیەوێت قودس فەتح بکات. لەو قۆناغەشدا دیسان دوو هێزی سەرەکی هەژموونگەرا لەسەر ناوچەکە ململانێیانە. هەژموونگەراکانی ڕۆما و پەرسەپۆلیس پەلاماری بەردەوام بۆ سەر دەڤەرەکە ئەنجامدەدەن و هەوڵی جێگیرکردنی بەکرێگیراوەکانی خۆیان دەدەن. پاشا هێلینیەکانی دوای ئەسکەندەر (کۆتاییەکانی ٣٠٠ پ.ز)یش ڕێگەیەکی هاوشێوەیان هەیە و لەسەر ئەو بنەمایەش ململانێی نێوان خۆیان جێگای باسە. حەزرەتی عیسا و گرووپەکەی هەم بەرامبەر بە هەژموونگەرایی هەمیش بەرامبەر بە یەهودییە بەکرێگیراوەکان جۆرێک لە تێکۆشانی سەربەخۆیی و ئازادی دەست پێدەکەن. بەڵام وەک پێویستیەکی هەلومەرجەکان ئەو تێکۆشانە لەبواری ئایدیۆلۆژیەوە (لەمیانەی قەڵەمبازێکی نوێی ئایینیەوە) ئەنجامدەدرێت. ئەنجامەکانی ئەو پەرەسەندنەش دەزانرێت کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتووە.

قەڵەمبازی حەزرەتی محەمەدیش کە لە نزیکەوە زیاتر زانیاریمان لەبارەیەوە هەیە سەرەتا قودسی کردووە بە ئامانج. لە قورئانی پیرۆزدا باسدەکرێت کە میعراج

(بەرزبوونەوە بۆ ئاسمان، بینینی خوداوەند، واتە پێکهێنانی ئایینی نوێ) لە قودس روویداوە. لە راستیدا ئەو کۆچەی بۆ مەدینەش ئەنجامدراوە سەرەتا بە ئامانجی قودسە. قودس یەکەمین قیبلەی نوێژکردنە. قیبلەی حەزرەتی محەمەد جیاوازە. هەرچەندە هەڵگری تایبەتمەندێتی هاوشێوەی قەبیلەی عیبرانی (تایبەتمەندێتی سامی) بێت، بەڵام بەخۆی قەبیلە عەرەبەکانی دەڤەری مەککە و مەدینەی ئەو قۆناغە (ساڵانی ٦٠٠ زایینی) وەک هێزی سەرەکی دەبینێت و تاوتوێ دەکات. وەک ئایین (چوارچێوەی ئایدیۆلۆژی تێکۆشان)یش سێیەمین ڤێرسیۆنی نەریتی ئیبراهیمی پێکدێنێت. چوارچێوەیەکی ئایدیۆلۆژی جێگای باسە کە زیاتر ئامانجی کۆمەڵگای بازرگانە. لەکاتێکدا لەراستینەی حەزرەتی ئیبراهیم و موسا پلەداری سەرووی قەبیلە مۆرکی خۆیان لە ئایین دەدەن، لە ئایینی حەزرەتی عیسادا هەژارانی قەبیلە بە بنەما دەگیرێت. لای حەزرەتی محەمەدیش بەرژەوەندیەکانی توێژی ناوینی بازرگانانی قەبیلە بە بنەما دەگیرێت، لەو سۆنگەیەوە؛ کۆمەڵگای چینی ناوین مۆرکی خۆی لە ئایینی نوێ دەدات. جیاوازی بنەڕەتی پێهەڵگرتنی حەزرەتی محەمەد لەگەڵ ئەوانەی پێشووتری یەکێتی تێکۆشانە ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازییەکەی بوو. یەکێتی و یەکپارچەیی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی دەرکەوتنی ئیسلامی دیاردەیەکی دەگمەنە و لە زۆر ئاییندا نابینرێت. لەماوەیەکی زۆر کورتدا گەیشتنی بە سەرکەوتنی گەورە و گرنگ گرێدراوی ئەو واقیعەیە. سەرکەوتنێکە لە شۆڕشە هاوچەرخەکانیشدا نموونەکەی زۆر کەم و دەگمەنە. لە کاتێکدا لە سەرەتای دەرکەوتنی لە پاشماوەکانی قەبیلە، کەسانی بێکار، ژنێکی بازرگان و کۆیلەیەک پێکهاتبوو، لە ماوەیەکی کورتدا (نزیکەی چل ساڵ) توانی سێ ئیمپراتۆریەت (بێزەنتی، ساسانی و حەبەشی) ی جیهانی بڕووخێنێ، هێزەکەی بۆ یەکێتی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی کۆمەڵگای نوێ دەگەڕێتەوە. دواترین ئەڵقەی گەردوونی نەریتی ئیبراهیمی پێکدێنێت.

گەردوونیبوونی سەرمایەداری لەمیانەی ئەو شەڕەی بەرامبەر هەرسێ ڤێرسیۆنی گەردوونیبوونی ئیبراهیمی (موسەوی، مەسیحی، محەمەدی) ئەنجامیداوە هەژموونگەرایی خۆی بونیاد ناوە. بێگومان ئەگەر هەرسێ بەها گەردوونییە ئیبراهیمیەکان نەبووایە، ئەوا سەرمایەداریش وەک سیستەم بەهای گەردوونی بەدەست نەدەهێنا. باڵابوونی کلتووری شارستانی ماددی کەڵەکەبووی سەردەمی شارستانیەکانی سۆمەر و میسر بەرامبەر کلتووری شارستانی مەعنەوی ( کاهین و ئایینی) لەژێر بناغەی سەرمایەداریدا شاراوەیە. هەردوو کلتووریش پەیوەندییان بە شار، چین و دەوڵەتەوە هەیە. سەبارەت بە دەسەڵات و قۆستنەوە بەردەوام ململانێی نێوانیان جێگای باسە. لە رۆژگاری ئەمڕۆشماندا هەمان نەریت بە دۆخە هەنووکەییەکەیەوە بەردەوامە. لە کێشمەکێشی ئیسرائیل ـ فەلەستیندا دەتوانین تێبگەین کە تارادەیەکی زۆر ئەو تێکۆشانە پەرەسەندنە جیهانگیریەکان دیاری دەکات.

کەواتە زەمینەی قەڵەمبازەکەی دوای ١٩٨٠ راستیەکی مێژوویی هەیە. لەسەر شوێنپێی ئەو راستییە مێژووییە رۆیشتووین. لەو شیکارانەی تا ئێستا پێشمان خستوون روون

دەبێتەوە کە فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەم لە بواری زۆرداریەوە هەمیش لە بواری ژمارەوە لە فیرعەون و نەمرودەکانی چاخی کۆن زیاتر و زۆردارتن. نامەوێت بە هەڵە تێبگەن، بەڵام تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی دە ساڵی یەکەمی گروپەکەمان لە ناوەندی ئەنقەرە و تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی قۆناغی یەکەمی حەزرەتی ئیبراهیم، موسا و عیسا لێکچوونی سەیر جێگای باسن. بەتایبەتیش ئەو لێکچوونە سەرنجڕاکێشەی لەگەڵ تێکۆشانە ئایدیۆلۆژیەکەی دە ساڵەی حەزرەتی محەمەد لە مەککە ناشێت پشتگوێ بخرێت. ئەو تێکۆشانەی ئەوان لەبەرامبەر فیرعەون، نەمرود و ئیمپراتۆرەکانی قۆناغی خۆی ئەنجامیاندا، ئێمەش بەرامبەر ڤێرسیۆن و دەرهاوێشتەکانیان واتە بەرامبەر فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامماندان کە هەم ژمارەیان دە هێندە زیاتر و هەمیش بەو رادەیە لەوان مەترسیدارترن. تێکۆشانی کۆمەڵایەتی بەردەوام مێژووییە. هیچ تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی جێگای باس نییە کە رەگ و ریشەی قووڵی مێژوویی نەبێت، هەر بۆیەش لەو بەرگرینامەیەدا ئەو زەمینە مێژوویی ـ کۆمەڵایەتییە روون دەکەینەوە کە ئێمە پشتمان پێی بەستووە، ئەوەش خودی حەقیقەتە. بە کورتی ئێمەش وەک لقێکی رووباری بنەڕەتی لێشاوی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی هەڵقووڵاوین.

پێویستە بەرامبەر ئەو ئەنالیزانە زۆر وریا بین کە کۆمەڵگا لەناو راستینەی رۆژانەیی خۆیدا تاوتوێ دەکات. سۆسیۆلۆژیای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری راستینەی کۆمەڵایەتی لە "ساتی ئێستا"دا دەخنکێنێت. لەژێر ناوی زانستیبوون و بەشێوەیەکی بێبەزەییانە لەمیانەی درۆیەکی گەورە، چەواشەکردن و پەردەپۆشکردنەوە پەیوەندی کۆمەڵگا بە مێژوو و رابردوو دەبڕێت. ئەو ئایینەی مۆدێرنیزەش کراوە لەسەر شوێنپەنجەی هەمان سۆسیۆلۆژیا بەردەوام دەبێت؛ ئەوە شێوەی سۆسیۆلۆژیای بە ئایین پەردەپۆشکراوە. لەو بارەیەوە لە بەرامبەر حەقیقەت (تەریتی ئایینیشی لەناودا) لە سۆسیۆلۆژیا (مۆدێلی پۆزیتیڤیست) درۆزنتر و چەواشەکارترە. دەمەوێت بڵێم: دۆخی شەڕی بیست ساڵەمان کە لە دوای ١٩٨٠کان لە بنارەکانی جەبەل ئەلشەیخ دەستی پێکرد، تێکۆشانێکە لەسەر بنەمای کۆمەڵگای ـ مێژوویی و مانایەکی مەزنی هەیە. هەڵگری شوێنپەنجەی قووڵی تێکۆشانی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئەلخەلیل، موسا لە سینا، عیسا لە قودس و تێکۆشانی مەدینەی حەزرەتی محەمەدە. بەوەش سنووردار نابێت؛ بەڵکو بە شوێنپەنجەی برونۆ، ئەراسموس، بابوف، باکۆنین، مارکس، لینین و ماو کاریگەر دەبێت. لە شوێنپەنجەکانی زەردەشت، بودا، کۆنفۆشیۆس و سوقراتیش بێبەش نابێت. هەروەها بەشی خۆی لە شوێنپەنجەی مێخوداوەند عەشتار تا ئینانا، کیبەلە، مەریەم، فاتیمە و رۆزاش پشتگوێ ناخات. هێندەی دەستی پێ بگات لەسەرجەم راستیەکانی حەقیقەتی کۆمەڵگا دەخوانەوە.

باسکردنی بەسەرهاتەکانی دەرهەق بەو کۆچەی لە تەمموزی ١٩٧٩ لە ڕێگای ئورفا ـ سوروج ئەنجامماندا دەشێت فێرکەر و ئەزموونبەخش بێت. بەتایبەتیش ئەو رۆژانە شایستەی تێگەیشتنە کە بەر لە دەرکەوتن لەگەڵ هەڤاڵ فەرهاد کورتای لە سەرەتای نیسان لە دیاربەکر جیابووینەوە و ماوەیەک لە قزلتەپە و گوندی خورسماینەوە.

بێگومان گەورە شەهیدمان فەرهاد کورتای کۆتەڵ و سیمبۆلی ئەو ڕۆژە مانادارانەیە. کاتێک لە کۆتاییەکانی بەهار لە قزلتەپەوە گەیشتینە ئورفا پڕ لە یادگاری بەجۆش و سەرکێشانە بوو. هەر خاڵ و شوێنێکی بۆی چووین مانایەکی مێژوویی هەیە و خەسڵەتگەلێکی شایانی باسکردن لەخۆوە دەگرێت. ئەو جارەش شەهیدی مەزن هەڤاڵ محەمەد قەرەسونگورم لەگەڵدا بوو. ئەو چل ڕۆژەی لە ئورفا ماینەوە کتومت بە دوا ڕۆژەکانی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا دەچێت. بەسەر شوێنپێیەکانیدا تێپەڕین. لە مۆخی ئێسقانمانەوە هەستمان بە نەفرینی نەمرود دەکرد. دۆخی ڕۆحی سێیەمین گەورە شەهیدی قۆناغ ئەدهەم ئاکچام کە بەهیچ جۆرێک لەیاد ناکرێت دۆخی بەرجەستەی پیرۆزیەکانی رابردوو بوو. لە پراکتیکی چوار پێنج ساڵەکەی دواتر سیمبۆلی پابەندبوونی راستەقینە، خەباتکاری، لێهاتوویی و کارزانی بوو ( خوێندەواریەکەی لاواز بوو. بەخۆی خۆی پەروەردە دەکرد). گیانبەختکردنیشی بەڵگەی سەلماندنی ئەو راستییە بوو.

کاتێک پەیوەندیمان لەگەڵ رێکخراوە فەلەستینیەکان بەست لەمێژبوو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خراپی کردبوون، بەڵام بە تەواوی لە کەشی شۆڕشگێڕی دانەبڕابوون. ناشێت لە سەربازیبوونی PKKدا نکوڵی لە رۆڵیان بکرێت. بەڵام جێگای داخە کە ئەو پەیوەندییە زهنیەتە سەرمایەداریەکەیانی نەشکاند. بەرژەوەندی رۆژانەیی کورتخایەن پەیوەندییەکی دیالیکتیکی بە نەزۆکی هێشتەوە کە دەبووایە مانایەکی مەزنی هەبێت. ئەو قەبیلە شەڕڤانەی بە زەحمەتی و هەوڵێکی زۆرەوە کۆمانکردبوونەوە، فەرماندە فەلەستینیەکان دەیانویست لەسەر بنەمای ستاتۆی سەربازی مووچەدار بەکاریان بێنن. رێگامان پێنەدان. هیچ سازشکاریەکمان سەبارەت بە بەرخودان و رۆحی شۆڕشگێڕیمان نەکرد. ئەوەی بە فەلەستینیەکانمان گوت هەمان ئەو شتە بوو کە بە شۆڕشگێڕانی تورکمان گوتبوو: بەگوتەی هەڤاڵ کەمال پیر دەمانگوت" شۆڕشی کوردستان نەبێت، نە تورک، نە عەرەب و نە رزگاری گەلێکی دیکەی خۆرهەڵاتی ناوین جێگای باس نابێت". بەمجۆرە دەمانتوانی رۆڵی مێژوویی و ئەنتەرناسیونالی خۆمان ببینین. دیسان بەشێوەیەکی نموونەیی وەڵامی ئەرکە شۆڕشگێڕییە کۆنکرێتیەکانی دەرهەق بە ناوچەکەمان دایەوە. وەک چۆن هیچ هێرش و پەلامارێکی تایبەتمان نەکردە سەر ئیسرائیل، لە ئاکامی هێرشی ساڵی ١٩٨٢ ئیسرائیل بۆ سەر لوبنان دوای بەرخودانێکی ئەفسانەیی بێ وێنە پشکی ئێمەش شەهیدبوونی دە هەڤاڵی هێژا و قارەمان بوو. یادگاری ئەو شەهیدانەمان سەرچاوەی سەرەکی مانەوەی بیست ساڵەمان بوو لە دەڤەرەکە. هەرگیز لەبیرناکرێن و ناشێت یادەکەیان بچووک بکرێتەوە. ئەو شەهیدە نەمرانە بەها ئەنتەرناسیۆنالیستە راستەقینەکانمانن.

تا دەچوو بزووتنەوەکەمان گەورە دەبوو، یەکسەر لەگەڵ کوردەکانی لوبنان و سوریا گەرم بووین. ئەو کوردانە بەشێکی کۆمەڵگای بنەڕەتی کوردان بوون کە لە ئاکامی یەکەمین جەنگی جیهانی دابەشکران. دووچاری ستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەکان هاتبوون، ناچاری جۆرێک لە ژیانی پەنابەرێتی کرابوون. خەڵکانێک بوون تووشی کەمترین ئاسیمیلاسیۆن

هاتبوون و ئاگاداری کوردێتی خۆیان بوون. کوردە کرمانجە نموونەییەکان بوون. بەرادەی پەرەسەندنی سەرمایەداری ئەوانیش بێکار دەبوون. ئەو خەسڵەتەشیان بەخێرایی بەرەو قەبیلەکەی شەڕی خۆمانی دەهێنان. ئاشنابوون بە چەکی پێشکەوتووتر و ژیانی سەربازیەوە گرنگ بوو. بۆ یەکەمین جار بوو بەو شێوەیەی ئێستا پەروەردەی سەربازی بەکۆمەڵ لەناو بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد ئەنجامبدرێت. هەڕەشە و هێرشی بەردەوام ئەزموونی شەڕی پێدەبەخشین. بەڵام دیسان ئەو کێشانەی کەسایەتی دەردەکەوتن کە خۆسەپێن بوون. لەراستیدا ئەوەی ڕوویدەدا پەیوەندی بە بونیاد و نوێبوونەوەی کۆمەڵایەتییەوە هەبوو و زۆر لە مەزەندەکانمان زیاتر قووڵتر دەبوویەوە. هەروەک یەکەمین ساڵانی ئیسلامیەت نموونەی ئافراندنی کۆمەڵگایەکی نوێ لەو مرۆڤانەوە جێگای باسە کە لە قەبیلەی جیاوازەوە هاتوون، زۆربەشیان کۆکراونەتەوە و لە یەکتری دابڕاون. لەو بارەیەوە وەک نموونەیەکی مێژوویی لە ڕێگای تەوراتەوە ئاگادارین کە بۆ دیسپلینەکردنی لقەکانی قەبیلەی عیبرانی حەزرەتی موسا زەحمەتیەکی چۆنی بینیوە. ئاواکردنی کلتوورێکی نوێی کۆمەڵایەتی کە کلتووری قەبیلەی باو دەرباز بکات، بەجۆرێک لەجۆرەکان لە دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی کۆمەڵایەتی دەچێت. دوای لەخاچدانی حەزرەتی عیسا بۆ ماوەیەکی درێژ بوون و نەبوونی حەوارییەکانیش وەک یەک بوو. لە سەرپێ هێشتنەوەی ئەو مرۆڤانەی کلتووری کۆمەڵایەتی کۆن نەیتوانی بەرامبەر تیۆری بێئامانی گلادیۆ بیانپارێزێت پێویستی بە هەوڵ و بەهرەیەکی تایبەت هەبوو. دەربازکردنی سنووری دەوڵەت ـ نەتەوە وشکەکان، دابینکردنی کارتی ناسنامە و شوێنی مانەوە، بگرە تێرکردنی سگیان کێشەگەلێکی گەورە بوون. ئاواکردنی ڕێکخستنێکی ملیتان و شەڕڤان بەرامبەر بەهێزترین توندوتیژی سەردەم (گلادیۆ)، لەمیانەی هێزێکی نائاسایی ئیقناعکردنەوە پێویستی بە هیوا بەخشین و پێشخستنی بیروباوەڕی هەبوو. چەپی تورک و بەرخودانی گەل بەهۆی پیشاننەدانی ئەو بەهرەیەوە بەخێرایی پەرتەوازە ببوون.

کاتێک لە نیشتیمان بووین ڕێگای شۆڕشی کوردستان دواترین بەرهەم بوو کە نووسیمن. ئەو پەرتووکەی هەڵگری سیفەتی مانفیستۆ بوو جگە لە پیشاندانی ئاراستەیەکی گشتی و بەخشینی دیدگایەکی ئایدیۆلۆژی بە لاوان ڕۆڵێکی دیکەی نەدەبینی. گرنگ بوو بەڵام بەس نەبوو. کێشەیەکی سەختی درێژخایەنی لەجۆری ژیانی سەربازی جێگای باس بوو. هەربۆیەش پێویستیمان بە دیدگا و ڕێنمایی نوێ هەبوو. وەک هەنگاوی یەکەمیش ساڵی ١٩٨١ پەرتووکێک لەژێرناوی پرسی کەسایەتی لە کوردستان، ژیانی پارت و تایبەتمەندێتیەکانی ژیانی شۆڕشگێڕی لە ئاخافتنە تۆمارکراوەکانم کۆکرایەوە. لە تەمموزی ١٩٨١ بە ئامانجی خۆکۆکردنەوە ئەو کۆبوونەوەمان ئەنجامدا کە بە کۆنفرانسی یەکەم ناومان برد و بۆ منیش تاقیکردنەوەیەکی گرنگ بوو. ئەو ڕاپۆرتە سیاسیەی پێشکەش بەو کۆبوونەوەیەم کرد ئێستاش بە نووسراوی لەبەردەستانە. سەبارەت بە تێگەیشتنی قۆناغ و کێشەکان بەڵگەیەکی باشە. ئەو کۆنفرانسە یەکێک لە هەنگاوە جددییەکانی کۆکردنەوەی ڕێکخستن بوو. یادگاریەکەی بەشێکی بەنرخی ژیانمە. بەڵام

کێشـەکان هێنـدە زۆر و ئـاڵۆز بـوون، وەک دۆمینـە یـەک لـەدوای یـەک پێویسـتی بـە پەرەپێدانی ئایدیۆلۆژی، ڕێکخستن و چالاکی هەبوو. گرووپەکانی سـەرەتا بـە ڕێکرابـوون. جێگیربوون لە لۆلان و خواکورک دەستی پێکردبوو. دەبووایە شەڕی گەریلا دەست پێبکات. ئەو هاوارەی لە زیندانەکانی دیاربەکر بەرز دەبوویەوە ناچـاری دەکـردین سـاتێک زووتـر جموجۆڵ بکەین. لەو ناوەدا بەرهەمێکی تێروتەسەل و جـددی وەک ڕۆڵـی زەبروزەنـگ لـە کوردسـتان م نووسـی. ئـەو جـارە دوران کاڵکـان یاریـدەدەرم بـوو. دەبـوو ئـەو شیکارانە ڕۆڵێکی ئیقناعکارانە بۆ قۆنـاغ و ئـەو گرووپانـە ببینێت. مسۆگەر دەمانویست وەڵامێکی مانگرتنە مەزنەکە بدەینەوە کە بـە شـەهیدبوونی هـەڤاڵان کـەمال پیـر، محەمـەد خـەیری دورمـوش، عـاکیف یلمـاز و عـەلی چیچـەک ئـەنجامگیر بـوو، بـەڵام ئـەو هەڵوێسـتەی گرووپەکانی ناوەوەی وڵات لە سەرەتاوە تێـی کـەوتن، بەمانایـەکی تـر دووبارەکردنـەوەی کارە ئەنجامدراوەکان لەلایەن گرووپی بەرپرس، هەروەها پێشنەخستنی شیکارێکی ڕاست سـەبارەت بـەو سـاتە مێژووییـە و خۆخـەریککردنیان بـە کەشـفی نابـەجێ و ناپێویسـت وەڵامدانەوەمانی درەنگخست. ئەگەر لەکاتی خۆی وەڵامدرابووایەوە لەوانە بوو زووتر لـە سێدارەدانەکان وەستێنرابووایە و مانگرتنەکانیش بە مردن ئەنجامگیر نەبووایە. لەبەر ئەو هۆکارەش ساڵی ١٩٨٣ بە ساڵێکی لەدەست چوو دادەنێم.

بەبڕوای من مسۆگەر دەبووایە هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ بەشێوەیەکی بەرفراوانتر لـە بەهاری ١٩٨٣ ئەنجام درابووایە. ئامادەکاریەکانمان بـۆ ئـەو هـەنگاوە لـەباربوو. یـەکێک لـەو زەبـرە جـددی و یەکەمینانـەی بـەر پلاننامـەی گـەریلا کـەوت ئـەو درەنگکەوتنـە و سـەرقاڵبوونە بـوو بـەو کەشـفە بـێ بەرپرسـیارێتی و نابەجێیانـەی ئەنجامـدران. ڕۆشـنکردنەوەی ئـەو ڕەوشـە لەلایـەن بەرپرسـەکانیەوە پێویسـتیەکی بەرپرسـیارێتی شۆڕشگێڕییە. لـە ڕاستیدا لـە هـاوینی ١٩٨٠دا لـەڕێگای هـەڤاڵ کـەمال پیـر و گرووپەکـەی هەوڵماندا دەستێوەردانێکی بەرفراوان ئەنجامبدەین. ئەوەیان هەوڵێک بوو بـەبێ پێویست بینینی جێگیربوون لە باشووری کوردستان یەکسەر ئامـانجی گەیشتن بـوو بـە دێرسیم. ئەگـەر بەوشـێوە ڕێکـەوت و نـەخوازراوە هـەڤاڵ کـەمال پیـر دەسـتگیر نەکرابووایـە ــ دەستگیرکردنی ڕووداوێکی بێ چانسی و خەسارەتێکی بزووتنەوەکە بـوو ــ ئـەوا واقیعـی ڕاسـتی فەرمانـدارێتی PKKدۆخێکـی زۆر جیـاوازتری بەخۆیـەوە دەبینـی. هـیچ هـەڤاڵێک نەیتوانی جێگاکەی پڕ بکاتەوە. لـەو سـاڵانە یـەک لـەدوای یـەک دەسـتگیرکردنی هـەڤاڵان مەزلوم دۆغان و محەمـەد خـەیری دورمـوش ڕووداوگـەلێکی نابـەجێ بـوون کـە بەئاسـانی توانای بەربەستکردنی هـەبوو، بـەڵام زیـانێکی گـەورە بـوو. دڵ و جگـەرمان پارچەپارچـە ببـوو. لەلایەکـەوە دەبووایـە لـەناو گێـژاوی خۆرهـەڵاتی نـاوین ملیتـانی شۆڕشـگێڕ و ڕێکخستنێکی جـەنگاوەر بئـافرێنین و هیوامـان بـەو گەریلایانـە بێت کـە گەیەنراونەتـەوە ناوەوەی وڵات، لەلایەکی دیکەشەوە بەرگەی هاوارەکانی زیندان بگرین و کرانەوە بەڕووی ئەوروپادا ئەنجامبدەین. جگە لە ئەدهەم ئاکچان ئەو کەسانە زۆر کەم بوون کـە یارمـەتیم بدەن. هەرکەسە و بەشێوەیەک لە شێوەکان خۆی دەسەپاند.

سەرکردەکانی دەڤ ـ یۆڵ لە ئەورووپا وەک بڵێی پەلکێشکردنی ڕێکخراوەکەیان بۆ ئەورووپا و تەسفیەکردنی بەس نەبوو بێت، بەئامانجی شکاندنی بەرخودان و خۆڕاگرییەکەی هێرشیان دەکردە سەر PKKش. وەک ئاشکرادەبێت ئەگەرێکی بەهێزە ئەرکێکی بەمجۆرەیان پێسپێردرابێت. PDKش نەک هەر تەنیا یارمەتی نەدەداین، بەڵکو بەسووربوونەوە درێژەی بە ڕۆڵی بەربەستکردنی شۆڕشی باکووری کوردستان دەدا. تا دەچێت زیاتر ئاشکرادەبێت کە پشتگیریکردنی ئەو سیاسەتە بەردەوام بوو کە لە ڕێککەوتنی ١٩٢٦ موسڵ بڕیاری لەسەر درابوو و بریتی بوو لە دەستبەردان لە باکووری کوردستان و لە بەرامبەریشیدا پشتگیریکردن لە PDK و بنەماڵەی بارزانی. ئەو ڕۆڵە سەرەکییەی بە PDK سپێردرابوو، پشتگیری کردنی سیاسەتەکانی پاسیڤکردن بوو کە لە خۆرهەڵات و باکووری کوردستان (کوردستانی ئێران و تورکیا) پەیڕەو دەکران. بەمجۆرەش پشتگیرییان بۆ بزووتنەوەی ئۆتۆنۆمیخوازەکەی خۆیان بەدەستدەهێنا. ڕووبەڕووی واقیعی ئەو جۆرە سیاسەتە وشک و دژوارانە ببووینەوە. شەڕی نێوان ئێراق ـ ئێران ڕەوشێکی نوێی ئافراندبوو، بەڵام سەرکردایەتی مەیدانی ئەو ڕەوشەی تاوتوێ نەکرد و نەیقۆستەوە. جگە لەوەش سەرکردەی لێهاتووی بەرخودانی حیلوان ـ سیڤەرەک (١٩٧٨ ـ ١٩٨٠) محەمەد قەرەسونگور لە دەستپێشخەرییەکی بێواتا و بێ ئەنجامی ناوبەینکاری نێوان YNK و PDK شەهید بوو. لە ٢ ئایاری ١٩٨٣ بەشێوەیەکی لەناکاو، بێ چانسی و نابەجێ هەڤاڵ قەرەسونگور و ئیبراهیم بلگینمان لەدەستدا. لەگەڵ هەڤاڵ کەمال پیر، محەمەد قەرەسونگور ئەو هەڤاڵانە بوون کە دەیانتوانی چارەنووسی گەریلا بگۆڕن. کاتێک هەواڵی شەهیدبوونی محەمەد خەیری دورموش، عاکف یلماز، فەرهاد کورتای و هەڤاڵانی دیکەی زیندانمان پێگەیشت جگە لە فشاری زیاتر خستنە سەر دڵ و مێشکمان ڕێگەچارەیەکی دیکەمان نەدۆزیەوە. ڕۆژ ڕۆژی بەرگەگرتنی ئێش و ئازار بوو.

هەرچەندە بەدرەنگیشەوە ئەنجامدرابێت کاتێک هەواڵی هەڵمەتی ١٥ی ئابمان پێگەیشت بەسەربردنی ڕۆژ و سەعات ببوو بە مەسەلەیەک. ئەنجامەکانی گرنگ بوون. یەکەمین جار بوو بەشێوەیەکی ڕێکوپێک نەخشە بۆ چالاکیەکی سەربازی دابنرێت و جێبەجێ بکرێت. ئیتر دەرگای پەرەسەندنێک کرابوویەوە کە بەتەواوی ڕەوشەکەی دەگۆڕی. ئەوەی گرنگ بوو، پەرەپێدان و بەردەوامکردنی هەڵمەتەکە بوو. تابڵێی گرانی خۆمانمان خستە سەر ئەو ئەرکە. گرووپمان بۆ هەر هەرێمێک ئامادەکرد و بەدەگەکانیشیان لە ئامادەباشیدا بوون. دەبوو ١٩٨٥ ببێت بە ساڵی هەڵمەتێکی گەورەتر. بەتایبەتیش هێندەی هەرێمی بۆتان دەبووایە قورسایی بخرێتە سەر هەرێمەکانی دێرسیم و تۆڵهەڵدان. هێزەکانمان لە هەرێمەکانی ئامەد، گارزان و سەرحەد کەوتبوونە جوڵەوە. بەهۆی دەستگیرکردنی بێ چانسانەی هەڤاڵ سەبری ئۆک لە ناوەراستی زستان و شەهیدبوونی گرووپەکەی هەڤاڵ حاجی (سەبری گۆز بویوک)و خدر پێشەنگایەتییان دەکرد جوڵەکەمان لە ئادیامان سەری نەگرت. شەهادەتگەلێکی زۆر بە ئازار و پڕ لە ئێش ڕوویاندا. شەهیدبوونی هەڤاڵ سەلیم و گرووپەکەی لە هەمان ڕێگا ڕوویدا کە ویستبوویان لە ڕێگای

عارەبان دەوە بڕۆن. وێڕای ئەوەش تا دوایی لە هەرێمەکە مانەوە. هەرچەندە لە دێرسیم، ئامەد و گارزان لە ئاستێکی بەرزدا نەبوون، بەڵام یەکینەکانی گەریلا بەردەوام لەو ناوە بوون. گروپەکانی سەرحەدیش لە چیای ئاگری کەوتبوونە جووڵەوە. هاوشارییە لاوەکەی ئاشنایەتیمان هەبوو محەمەد ئەرتورک لێرە شەهید بیوو. هەواڵی شەهیدبوونی چەندین عەگید و قارەمانانی خەڵکی ئاگریشمان پێگەیشت. لە ساڵی ١٩٨٥ هەڵمەتی چاوەڕوانکراومان ئەنجامنەدا، بەڵام نەیانتوانی لەناویشمان ببەن. ساڵێک بوو کە بە پشتگیری ناتۆ بەهێزترین هێرشی کلاسیکی سوپای تورکی تێدا ئەنجامدرا. بۆ هەردوولاش مانای کۆتاییهاتنی قۆناغێک بوو. هەرچەندە نەگەیشتنی هەڵمەتی گەریلا بەئاستی پێویست سەبارەت بە سوپای تورک سەرکەوتنێک بێت، بەڵام جێگیربوونی گەریلا ژێرکەوتنێکی گەورەیان بوو. لە کاتێکدا لەسەر بنەمای ئەو ئامادەکارییە بەرفراوانانەی ئەنجامدرابوون دەرفەتی پەرەپێدانی شەڕی گەریلایی هەبوو کە لەهەموو ناوچەکان پشتگیرییەکی بەهێزی گەلی بەدەست هێنابوو، بەکارنەهێنانی ئەو چانسە بۆ PKK زیانێکی مەزن بوو، بەڵام جێگیربوون و خۆپاراستنی لەسەرجەم هەرێمەکاندا سەرکەوتنێک بوو نەدەبوو بچووک بکرێتەوە.

ساڵی ١٩٨٦ بۆ هەردوولاش بوو بەساڵی سەرلەنوێ خۆ ئامادەکردن. خەمناکترین هەواڵی ساڵی ١٩٨٦ بۆ من و بزووتنەوەکەمان شەهیدبوونی هەڤاڵ مەعسوم قۆرقماز بوو. هەواڵێک بوو هەڵگری سەرجەم ئەو هەڕەشە و مەترسیانە بوو کە چاوەڕوانی دەکردین. وەک بڵێی سەرلەنوێ ئابلۆقەیەک لە دەوروبەرم دروست دەبوو. زۆر توڕەببووم و ئەو رووداوانەم پەسەند نەدەکرد. بەشێوەیەکی هەرزان و نابەجێ زیانمان بەرکەوتبوو، هەڤاڵانمان شەهید دەبوون. بەو ئازارەوە بەشداری بەشێکی کۆنگرەکەی ١٩٨٦م نەکرد. کۆنگرەی سێیەممان بوو. لە ساڵی ١٩٨٢ دووەمین کۆنگرەمان لە سەربازگەی بەرەی رزگاری گەلی فەلەستین ئەنجامدا کە دەکەوتە باشووری سوریا. بەجۆرێک لە جۆرەکان دووبارەکردنەوەی کۆنفرانسی یەکەم بوو، بەڵام کۆنگرەی دەستپێکردنی گەڕانەوەی بەرفراوان بوو بۆ نیشتیمان. هەواڵی ئەو رووداوەی لە کاتی کۆنگرە پێم گەیشت: کاتێک عەدنان زنجیرقران ی هاوشاریم ــ کە لە ئەوروپاوە هاتبووە ناو ریزەکانی بزووتنەوەکەمانەوە ـ لە کەناری رووباری فورات دەستگیر دەکرێت رائیدێکیش لەگەڵ خۆیدا فڕێدەداتە هەڵدێر و ئەو هەڤاڵەمان شەهید دەبێت، تا ئێستاش وەک رووداوێکی دڵتەزێن دێتەوە یادم. هەواڵی بەمجۆرە هێندە زۆر بوون، وەڵامدانەوەم هەڵگرتنی باری زیاتر و فشارخستنە سەر خۆم بوو.

کۆنگرەی سێیەم تەواو بوو بە کۆنگرەیەکی دادگایی کردن. هەرکەسە و ئەویتری دادگایی دەکرد. کەسیرە و سەلاحەددین چەلیک بە کۆتایی رێگا گەیشتبوون. لەبارەی هەردووکیشیانەوە کۆنگرە بڕیاری کوشتنەی وەرگرتبوو. دۆخەکە بەجۆرێک بوو فەرحانی شۆفێرم گوتبووی پێویستە دەست و پێیەکانی کەسیرە بەچوار ئەسپ ببەسترێتەوە و پارچەپارچە بکرێت. رزگارکردنیان لەمردن دیسان کەوتبووە سەر شانی من. باس لەوە

دەکرا کە سەلاحەددین لە چیای جودی دیداری تەسلیمبوونی لەگەڵ دەوڵەتی تورک ئەنجامداوە. ئەی چی لەدوای هەڵوێستە سارد و سڕەکانی کەسیرە شاراوەبوو کە شیکارکردنی لەلای منیشەوە زەحمەت بوو؟ فەرحان (شۆفێرەکەی ترم ناوی سەبری بوو) چی دەستنیشان کردبوو تا بە ئەنجامێکی وەها بگات. هەڤاڵ محەمەد سەعید (ئەدهەم ئاکچان)یش بەر لە مردنی گوتبوی "چی تەڵەکەبازیەکی مەزن لەپشت سەرۆکەوە ئەنجام دەدرێت"، لە قەهران کۆچی دوایی کرد. بەردەوام گومانێکی بەمجۆرەم هەبوو کە دوای ١٩٨٠ یەکێک لە پیلانگێڕیەکانی دژم لەناو دەڤ - یۆڵ ڕێکخرابوو. ئەگەر پیلانێکی لەو جۆرە دانرابێت لەو بڕوایە دام کە گلادیۆی تورک و هێزەکانی ئاسایشی ناوخۆ ئەو ڕێگایەیان بۆ تاقیکردنەوەی پیلانگێڕییەک بەکارهێناوە. هەوڵە ئاشکراکانی تەسفیەکاری هەندێک ئەندامانی دەڤ ــ یۆڵ لە ئەوروپا، بەدەستهێنانی پشتگیری دەوڵەتی ئەڵمان و دەستنیشانکردنی PKK وەک یەکەمین ئامانجی خۆیان و لە ساڵی ١٩٨٣ پشتگیرییان بۆ گێرەشێوێنی و پرۆڤاکسیۆنی سەمیر (چەتین گۆنگۆر)، پیشانی دەدات کە پێویستە ئەو ئەگەرە بچووک نەبینرێت.

هیچ هەڤاڵێک بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا هۆکاری رقە مەزنەکە و بڕیاری کوشتنی کەسیرەیان بۆمن باس نەکرد. بێ رێزی و بێ حورمەتی لەرادەبەدەری بەرامبەر کەسایەتی من جێگای باس بوو. بەڵام ئەوانە بیانووی پێویستی بڕیاری کوشتن نەبوون. ئەوەی مەراقم کرد و لەبارەیەوە گومانم لێکرد: ئایا لە ڕێگای دەستەمۆکردنی شۆفێرەکانم بیری لە ئەنجامدانی پیلانگێڕییەک دەکردەوە؟ راکردنی یەکێک لە شۆفێرەکانم، هەوڵی ئەویتریان بۆ خۆکوشتن و دواتر شەهیدبوونی لە شاخەکانی کوردستان، بەردەوام جێگای تێڕامان و بیرکردنەوە بوو. بەدەستی خۆم سەلاحەددین چەلیکم ناردە ئەوروپا. کەسیرەش لە ساڵی ١٩٨٧ لە ئەسینا ئەگەری هەیە بە یارمەتی هەواڵگری یۆنانەوە ون بوو بێت.

لەو ماوەیەدا لە ساڵی ١٩٨٢ گەشتێکم بۆ بولگاریا ئەنجامدا. بەبڕوای من گەشتێک بوو دەیانویست هەڵوێستی من سەبارەت بە کۆچ پێکردنی ناچاری ئەو تورکانە بزانن کە لە وڵاتەکەیاندا دەژیان. بۆ یەکەمین جار لەوێ تێبینی مەنگبوونی سۆسیالیزمی بونیادنراوم کرد. هەموو لایەک بۆنی ریڤزیۆنیزمی لێدەهات. دووەمین گەشتم لە ساڵی ١٩٨٧ بە یارمەتیKGBبۆ بولگاریا و چەند وڵاتێکی سۆسیالیستی ئەنجامدا. یەکێک لەو دەوڵەتانە بوو کە بەر لە هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤێت سەردانم کردن. ئەنجامگیرنەبوونی ئەو سەردانانە بە کۆمەک و پشتگیریەکی مەزن لەوانەیە سەرچاوەی خۆی لە ناکۆکییە ناوخۆییەکانیان وەرگرتبێت کە تووشی هاتبوون. لەوانەیە تاکە سوودیان ئەو پشتگیرییە بووبێت کە بۆ ئاسایش و مانەوەم لە سوریا پیشانیان دا. لەو ساڵانەدا چاوپێکەوتنمان لەگەڵ چەندین ڕێکخراوی ئێراقی، لوبنانی و فەلەستینی ئەنجام دا. پەیامی دۆستایەتیمان بە یەکتری دا. بەڵام بەڵێنەکانی یارمەتیدان هێندە پراکتیزە نەدەبوو. بەتایبەتی ئەلفەتح ئەو ڕێکخراوە بوو کە بەهۆی پێگەکەمان زۆرترین سوودی لە تورکیا بینی. هەڵوێستی هەردوو براکەی بنەماڵەی ئەسەد (حافز، جەمیل) بەرامبەر ئێمە شەخسی

بوو نەک ڕێکخستنی. زۆر بە ئەزموون بوون. هەڵوێستەکانیان لە ڕێگای هەواڵگریشەوە زۆر وەستایانە بوو. نیازیان هەبووایە دەیانتوانی ڕێگا لەپێش پەرەسەندن و گۆڕانکاریی مەزن بکەنەوە. ترسیان لە تورکیا هەبوو. ئامانجیان ئەوەبوو لەڕێگای ئێمەوە هاوسەنگییەک لەگەڵ تورکیا دروست بکەن. لەو سیاسەتەیان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. بەڵام بزووتنەوەی ناسنامە و ئازادیخوازی کورد توانی ئەنجامگەلێکی مێژوویی بەدەست بێنێت. پەیوەندییەکی هاوشێوە لەگەڵ یۆنانیش پێشکەوت. بەڵام ئەوان چاوەڕوانیەکانی خۆیان لە تورکیا بەدەست نەکەوت. سیاسەتی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا بە شێوەی "کەروێشک ڕاکە، تانژی بیگرە" بوو. هیچ کاتێک لەو سیاسەتە باوە لایاننەدا. نە بەو ڕادەیە سەرکوتت دەکەن تا بمریت، نە بەو ڕادەیەش پشتگیریت دەکەن چارەسەری بەدیبێت. زۆر باش ئاگادارن کە سوودی مەزن لە بێچارەیی بەدەست دێنن. ئەو سیاسەتەی لە سەدەکانی ١٩و ٢٠ پێشیانخست خوازیارن لە سەدەی ٢١یش پەیڕەوی بکەن.

یەکەمین هەڵمەتی گەریلایی PKK دووچاری ناتەواوی فەرمانداریێتی هاتبوو و بە هەڵواسراوی مابوویەوە. محافەزەکاری و کەموکوڕیەکی جددی سەریهەڵدابوو. ڕاستینەی سێیەمین کۆنگرەمان لە بیقاع گوزارشتی لەو دۆخە دەکرد. پێویستی ئەنجامدانی شیکار سەبارەت بە ڕاستینەی فەرمانداریێتی ڕوون و ئاشکرا بوو. یەکەمین ئەزموونەکانی نووسینم تاقی کردەوە. چەندین کاسێتم پڕکردەوە. وەک تەگبیرێکی پراکتیکی هەڤاڵانی سەردەمی گرووپی یەکەم ڕەوانەی ئەوروپا کران. دوای شەهیدبوونی هێژاترین و بەهادارترین فەرماندە مەیدانیەکانمان، ئەوانەی بە فێڵبازیەوە لەسەر پێیان مابوونەوە و هەندێک لەوانەی گومانی دزەکردنیان لەسەربوو، هەوڵیاندەدا بۆشایی فەرمانداریێتی مەیدانی پڕبکەنەوە. لە هەوڵی خیانەت و تەسفیەکاری ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ دەمامکی ئەوانەی داماڵی و ڕووی ڕاستەقینەیان ئاشکرا بوو. کەسانێکی وەک فەرهاد (عوسمان ئۆجالان)، بۆتان (نیزامەددین تاش)، ئەبوبەکر(خەلیل ئاتاج)، سەرحەد (خدر یالچین)، ئەکرەم (خدر ساری قایا)، جەلال، دۆغان (شرناخی)، کانی یلماز (فەیسەڵ دونلایجی) و داروودەستەکانیان بەیەکەوە لەگەڵ چوارچەتە و چەتەکانی چروقایا بەشێوەیەکی بابەتی جڵەوی بزووتنەوەیان بەدەستەوە گرتبوو. خاوەنداری نەکردنی کادیرە کۆنەکان لە ڕۆڵی ناوەندی خۆیان و لە ئاکامی پیلانگێڕیشەوە شەهیدبوونی ژمارەیەکی زۆری ئەو هەڤاڵە دڵسۆز و بەتوانایانەی بەهرەی فەرمانداریێتییان هەبوو ئەو ڕێگایەی بۆ کردنەوە. لە سەرووی هەمووشیانەوە هەڤاڵانی وەک مەعسوم قورقماز و محەمەد قەرەسونگور. چەندین نیشانە پیشانیدەدات کە لە سەرەتاکانی ١٩٩٠ لەمیانەی ئەو پیلانگێڕیەی دژی من نەخشەی بۆ کێشرا بوو ئامانجیان دەستبەسەرداگرتنی تەواوی ڕێکخستن بووە، کوشتنی جەم ئەرسەڤەری یەکێک لە دامەزرێنەرانی ژیتەم لە نزیکەوە گرێدراوی ئەو پیلانەیە. دانپێدانانی دوو سیخوڕی بۆ ستار تیڤی دەئاخافتن و دەیانگوت "فەرمانمان پێکرابوو ئۆجالان بە زیندوویی بێنین نەک مردوو" سەرەداوێکی گرنگی دەرهەق بە بابەتەکە بوو و ڕۆشنی دەکردەوە. هەروەها شەهادەتی هەڤاڵ حەسەن بیندال هێمایەکی ئاشکرا بوو. جگە

لە چەتەکانی وەک سەعید چروقایا و شەمدین ساکک شەهیدبوونی تەواوی فەرماندە ڕاستگۆ و دڵسۆزەکان لە ئامەد، لەناوبردنی دکتۆر باران یش لە دێرسیم لەو قۆناغە بوو. هەروەها هەرێمی بۆتانیش بۆ جەمیل ئیشق و هاوشێوەکانی بەجێما بوو. ئیتر نۆرەی چارەسەرکردنی ڕەوشی بیقاع هاتبوو.

سەرجەم کێشەکانی PKK یی بوون (پارتیبوون)، بەسوپابوون و ئاواکردنی بەرە (ERNK) ییی بوون وەک خۆی مابوویەوە. تەواوی کێشە و گرفتەکان بەسەرمدا کەڵەکە ببوون. هەڤاڵە ڕاستگۆ و دڵسۆزەکان تەنیا دەیانزانی خۆیان بەخت بکەن. چارەسەرکردنی کێشە تەکتیکیەکان بە ئەقڵیشیاندا نەدەهات. نموونەی بوێری و فیداکارییە مەزنەکانیان کەم وێنە بوو، بەڵام فیداکاری و بوێری بەتەنیا بەشی چارەسەرکردنی کێشە کرداریەکانی تەکتیکی نەدەکرد. لەگەڵ گەیشتن بە بەهاری ١٩٨٧ بە ئامانجی نۆژینەوەی ڕێگەچارە بۆ ئەو کێشانە میتۆدی ڕاڤەکاری و شیکارم پەیڕەو کرد. لەکاتێکدا ئەو بابەتانەی پێشووتر تاوتوێم کردبوون کردبوومان بە نامیلکە، ئەوجارە لەمیانەی تۆمارکردنی دەنگ و ڕەنگەوە هەوڵمدا بە قووڵی کێشەکان شیکار بکەم. ئیتر گرووپی پەروەردەی چوارسەد کەسی لە خولە سێ مانگیەکان پەروەردە دەکران. ماوەیەکی نوێی پەروەردە جێگای باس بوو کە ساڵانە نزیکەی هەزار بەرئەندامی گەریلای تێیدا پەروەردە دەکران. هەوڵم دەدا لەڕێگای ئەو خولە پەروەردەییانەوە ڕێگری لە سەرجەم تەسفیەکارییە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بکەم. ئیتر وەک بڵێی تەسفیەکاری مەحاڵ ببوو، ئەوانەی چاوەڕوانیەکی لەو جۆرەیان هەبوو ئارەزووەکانیان لە قوڕگیان مابوویەوە. وەک دواتر ئاشکرابوو، هەندێکیان بە چوار چاوەوە چاوەڕوانی لەناوچوونی من بوون. ئەو چاوەڕوانییەی زۆر بەهێز بوو تائێستاش شوێنپەنجەیان ماوە. هەڤاڵەکانی گرووپی کۆن کە ناردبوومانە ئەورووپا لەئاکامی ئەو هێرشەی بە پێشەنگایەتی ئەڵمانیا دەستیپێکرد لەساڵی ١٩٨٧ دەستگیر کرابوون. تەنیا ئەو بوویەرە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو ڕاستییە بەسە کە ئەڵمانیا سەنتەری گلادیۆی ئەورووپا و شاڵاوی گلادیۆیە بۆ سەر PKK. لە دەوڵەتی تورک زیاتر ئەڵمانیا بەشێوەیەکی تەڵەکەبازی و نەخشە بۆکێشراو سەرقاڵی لەناوبردنی PKKبوو. وێڕای ئەوەش پابەندبوونی گەلی کوردی نیشتەجێی ئەورووپا بە بزووتنەوەکەمان و مافەکانی ناسنامە و ئازادی بەس بوو بۆ ئەوەی سەرجەم ئەو پیلانانە مایەپووچ بکاتەوە کە لەڕێگای ئەورووپاوە پێشدەخران. ئەگەر پابەندبوون و دڵسۆزی بێهاوتای گەلەکەمان لە سوریا و ئەورووپا نەبووایە، ئەوا لەسەرپێ هێشتنەوەی PKK و بەردەوامکردنی شەڕی شۆڕشگێڕی زۆر زەحمەتتر دەبوو. پێویستە بەردەوام بەڕێزەوە یادی کوردانی هەردوو ناوچەکە بکەینەوە و پیرۆزباییان لێبکەین.

بۆ یەکەمین جار لە ئاداری ١٩٨٧ شیکردنەوەکانم سەبارەت بە بابەتی ژن دەستپێکرد. تا مۆخی ئێسقان هەستم بەو بەڵایە کردبوو کە لەڕێگای ژنەوە بەسەر من و بزووتنەوەکەماندا کەڵەکە ببوو. بۆ یەکەمین جار بوو هەوڵمدا لەمیانەی ڕێبازێکی نوێوە، واتە لەڕێگای شیکارەکانەوە وەڵامی ئەو هەڵوێست و ڕەفتارانە بدەمەوە کە هەڤاڵە

هێزاکانمی شێت کردبوو. هەروەها بە کوشتن سزادانی هەندێک لە ژنان، لە سەرووی هەمووشیانەوە عائیشە ئاقارسووی خەڵکی پازارجک، سایمە ئاشکن ی خەڵکی دێرسیم و ئایتانی خەڵکی نووسەیبین و پەسەندکردنی ئەو سزایانەش ڕۆڵیان لەو هەنگاوەم هەبوو. کێشەی ژن کێشەیەک بوو بەپێی کات جددیتر دەبوو. لە هەر خولێکی پەروەردەدا شیکارەکانم لەو بارەیەوە هەنگاوێک بەرەو پێشتر دەچوو و قووڵترم دەکردەوە. زیادبوونی ژمارەی کچان لە ڕیزەکانی بزووتنەوەکەمان دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەکی ڕیشەیی بۆ کێشەی ئازادی ژنی دەکرد بە ناچارییەک، بەڵام بەلا بێئامانەکەی سەرم کەسیرە ڕۆڵی سەرەکی لەو خەباتە هەبوو. کوشتنی ڕاست نەبوو، بەڵام بۆ کانژمێرێکیش دەرفەتی بەیەکەوە ژیانی نەهێشتبوو، ئەستەمی کردبوو. بۆخۆی کەسێکی ژیربوو. هەربۆیەش ئەو گوتانەی لەکاتی شەهیدبوونی هەڤاڵ مەعسوم گوتبووی پیشانیدەدات کە کەسێکی چەندە ژیربووە و چۆن بەشێوەیەکی ڕاست بەدواداچوونی بۆ ڕێکخستن کردووە، بەڵێ گوتبوی: "ئەو کەسەی زۆرترین متمانەت پێی هەبوو، مەعسوم قورقماز، ئەویش نەما. ئێستا چی دەکەیت؟" وەک بڵێی چاوەڕوان بوو پاشەکشێ بکەم و ڕادەستی ببم. بەو ئێش و ڕقە گەورەیەی ئەو جۆرە هەڵوێستانە ئافراندیان هەڵمەتی ١٩٨٧م دەستپێکرد. بەگوێرەی ڕێگە و ڕێبازی باو دەمانتوانی لەڕێگای کوشتن یاخود تەڵاقدان مەسەلەکە چارەسەر بکەین. بەڵام هەڵوێستێکی بەمجۆرە بۆ من مانای شکستی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بوو. هەروەها ڕادەستکردنی ڕێکخستن بەو یاخود دابەشکردن لەگەڵیدا دیسان بەرەو هەمان ئەنجام دەچوو. ئەگەر کەسێکی پاکیش بووبێت، بەڵام هیچ ڕەنجێکی نەبوو. تەنیا بەشێوەیەکی شارەزایانە چاودێری و پێشبینی دەکرد، بەشێوەیەکی نەرێنی ڕۆڵی لە هەڵمەتە تەکتیکیەکاندا دەبینی. لە کەسایەتی ئەودا دەمویست هەر شتێک شیکار بکەم کە پەیوەندی بە ژنەوە هەیە. هەروەها لەپاڵ ئەوەشدا دەمویست وەڵامێکی ڕیشەیی ئازادیخوازیی و یەکسانیخوازی بدەمەوە پەیوەندیەکانی نێوان ژن ـ پیاو کە تا دەچوو زیاتر خۆی دەسەپاند.

بەشداری پێکردنی ژنان لە خەباتێکی وەک ڕێکخستنی سەربازی کە سەداسەد مۆرکی ئایدیۆلۆژیای پیاوسالاری و پیاوانی پێوەیە زۆر مەترسیدار بوو؛ وەک ئەوەبوو دینامێت بخەیتە ناو کار و خەباتەوە. چەمکە باوەکانی پیاوان و ژنان کە لە ئارادابوون، لە چەمکی باو و قەبەی ڕەگەزپەرستی زیاتر بڕی نەدەکرد. جگە لە وروژاندنی یەکتری و ئیشارەتەکانی چاونوقاندن و برۆ هەڵتەکاندن بەولاوە خاوەن چەمکێک نەبوون. بەدەستەکانم بەڵایەکی گەورەم بۆخۆم دروست کردبوو. بگرە فەرماندەیەکی گەریلایی بەناوبانگی وەک گیڤاراش کاتێک ژنان بەشداری ڕیزەکانیان دەکەن تێرکردنی زایەندی ڕەت نەکردۆتەوە، وەک پێویستیەکی ناچاری پەسەندی کردووە. پەسەندکردنی شتێکی بەمجۆرە لەلای من، سەپاندنی بەسەرخۆم و کار و خەباتی ڕێکخستنی، بەتایبەتیش کار و خەباتی سەربازی، هەرلەسەرەتاوە مانای لەناوبردنی خۆمان بوو. هێشتنەوەی ژن لە دۆخی خۆیدا، بە تەنیا بۆ لەناوچوونمان بەس بوو. هەڤاڵێک یاخود گرووپێک لە ئارادا

نەبوو کە بەسەر ڕەمەکی زایەندیدا زاڵ بێت؛ بەشێوەیەکی ڕاست و لەسەر بنەمای بەرژەوەندیەکانی ڕێکخستن و هونەری سیاسەت تاوتوێی بکات. بەتەواوی بەدەرنانی ژن، ئەنجامدانی شۆڕشێک بە بێ ژن بۆ من و ڕێکخستنیش ڕاست نەبوو. ڕێگەیەکی دیکەی چارەسەری هەبوو: بە گوتەی عامیانە ئەویش "بەستنەوە" بوو، هەروەها "هاوسەرگیری شۆڕشگێڕیش" ڕێگەچارەیەک بوو کە ڕێکخراوە چەپڕەوە شۆڕشگێڕیەکان کردبوویان بەمۆدێلێک. بەڵام ئەو ڕێبازانەم بەراست نەدەزانی. جگە لە مایەپووچکردنی وزەی شۆڕشگێڕی، هەلومەرجە ماددی و جەستەییەکانیش دەرفەتی بەو جۆرە بەستنەوە و هاوسەرگیریە شۆڕشگێڕیانە نەدەدا. ئەوە جگە لە گرتنەبەری ڕێگای پەنابەرێتی ئەوروپا یاخود تێکەڵبوون بە خەڵک و ژیانێکی پارازیتی بەناوی ڕێکخستن هیچ ئەنجامێکی دیکەی لەگەڵ خۆی نەدەهێنا. ئەوەش شێوەیەکی دیکەی تەسفیەکاری بوو.

ئەو ڕێگایەی تاقیم کردەوە، بڕیاردان بوو لەسەر شێوازێکی پەیوەندی کە لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بیری لێنەکراوەتەوە و بە خەیاڵیشدا نەهاتووە؛ ئەویش ڕەچاوکردنی ژیان و شەڕکردنەکەی تا دوایی بوو لەناو پەیوەندی و ناکۆکیەکی دیالیکتیکی دەرەوەی هاوسەرگیری کە بە پێویستیەکی ناچاری دادەنرێت. بەمجۆرەش دەمویست پیاو و بەتایبەتیش ژن ئاشنای بوونی ڕاستەقینەی مرۆیی و ئازادیەکەی خۆی بکەم. ئەوەش تاقیکردنەوەیەکی گەورەی شۆڕشگێڕی ناوخۆیی بوو. قۆستراپەوە، خراپ بەکارهێنرا و بوو بە ئامرازی سەدان تەڵەکە و فریودان. بەڵام دیسانیش هەر ئەو کار و خەباتە ژنانی ئازا و بەگەوهەر، ئاقڵ و شۆخی ئافراند. چەندین کچی شۆخ و ژیرمان لێ شەهید بوو. لەپێناو وەڵامدانەوەی تامەزرۆیی و حەسرەتەکانیان ڕۆژانە سەرلەنوێ خۆم دەئافراندەوە. بەڵام بەهۆی وەڵامنەدانەوەیەکی تەواو بەردەوام لەناو ئێش و ئازاردا ژیام. بەیەککەیشتنێکی مێژوویی و ئازادانەم لەگەڵ ژن ئەنجام دابوو. بەڵام منیش وەک فەرهادی هاوچەرخ بەهیچ جۆرێک نەمدەتوانی بە شیرین بگەم. بەڵام لەو بڕوایەدام کە فەراهەمکردنی ساتێکی حەسرەتی بەمجۆرە مانادار و پێویستیش نییە. زۆرباش ئاگادار بووم کە بە یەککەیشتن لەو هەلومەرجەدا (لە سیستەمە هەژموونگەراکاندا) مردنی ئەشقە. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەوەی گرنگ بوو بە ئەشقەوە کارکردن بوو لەپێناو چارەسەکردنی گشت کێشە کۆمەڵایەتیەکان. بەمانایەکی تر ئەخلاقی ڕاستەقینەی ئەشق مانای پیشاندانی هێزی شەڕکردن لەگەڵ کێشە کۆمەڵایەتیەکان و بەهرەی چارەسەرکردنیان بوو. ئەوانەی خاوەنی ئەو هێز و بەهرەیە نەبوون، یان ئەو هێز و بەهرەیان لەخۆیاندا پێشنەخست نەدەبوون بە خاوەنی ئەشق و ئەخلاقی ئەشق.

مەرجی پێویستی فەراهەمبوونی ئەشق لە فەلسەفەی هیگلدا بەدیهاتنی هاوسەنگی هێزە لە نێوان ژن و پیاودا. ئەو مەرجە پێویستە بەڵام ناتەواوە و گوزارشت لەو ژنە دەکات کە بەهێز بووە. باس لە هاوسەنگی هێزی ماددی و قەبە ناکرێت. ئەوەی باس دەکرێت هاوسەنگی هێزی جەستەیی، سایکۆلۆژی و کۆمەڵایەتییە. واتە ئەو ژنەی لەناو کۆنترین و قووڵترین کۆیلایەتیدا دەژیت ناشێت خاوەن ئەشق بێت. لەپێناو پڕکردنەوەی

ناوەڕۆکی ئەو بۆچوونە فەلسەفیەی لایەنی راست لەخۆوە دەگرێت بەشێوەیەکی هەمەلایەنە ئەولەویەتم دا بە بەهێزکردنی ئەو ژنانەی لە ریزەکانماندا بوون. لە چوارچێوەی تێگەیشتنی ئەو راستیەی کە رێگای رێزگرتن بەرامبەر ژنان، خۆشەویستی و هەڵوێستی بە پرەنسیپانە، راستی و جوانی بە بەهێزکردنی ژناندا دەربباز دەبێت پەیوەندیم بەرامبەر ژن پیشان دا. لەو سۆنگەیەوە؛ ژن بەهێز نەبێت ئەشقەکەشی جێگای باس نەدەبوو. مسۆگەر باوەڕی تەواوم بەراستی ئەو پێناسەیە هەبوو. دڵنیابووم کە بابەتێکە نابێت سازشکاری لەبارەوە بکرێت. دوای بەدەستهێنانی ئەو هێز و بەهرەیە ئیتر کار و خەباتەکانم سەبارەت بە ژن هێژا و بەهادار دەبوو. کچان بەجۆرێک سەیریان دەکردم و یەکتریان لە باوەش دەگرت وەک بڵێی لەخەو و دێوەزمەیەکی هەزاران ساڵی بێدار بوونەتەوە. بگرە سەرباری ئەوەی سەبارەت بەو بابەتە زۆر بە تەگبیرم، تەنانەت خۆشم هیچ دوودڵیەکم لەوەدا نەکرد کە بیانکەم بە تاجی سەرم و لە باوەشیان بگرم.

لەو بارەیەوە بەردەوام دوو چەمکی هەڵە خۆیان سەپاند: ئەوانەی لەژێر ناوی موڵکایەتی وابەستە بە زایەندگەرایی قەبە و بێ هیچ بنەمایەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و کرداری کاتێک دەرفەتیان دەبینی رەفتاری هەرزان و سووکیان دەنواند، زۆر وێرانکەر بوون. لەبەرامبەر ئەوەشدا سۆفیگەرایی قەبە، واتە بەلاوەنانی کاریگەری زایەندی لەمیانەی سەرکوتکردن و فشار لەخۆکردن جگە لە گەورەکردنی کێشەکە هیچ ئەنجامێکی دیکەی لێنەدەکەوتەوە. ئەو کار و خەباتانەی لە چوارچێوەی رێڕەوی یەکسانی و ئازادی و دیموکراسیخوازانە پێشخران بوو بە پێوەرە تۆکمەکەی ئازادی کۆمەڵایەتی. پەرەسەندنە پراکتیکیەکان راستی، چاکی و جوانی هەڵوێستی بە پرەنسیانەی سەلماند.

ئەو شێکارانەی تا سەرەتاکانی ١٩٩٠ کان بۆ ئەو گروپانەی پەروەردە ئەنجامدەدران کە کۆی ژمارەی ساڵانەیان هەزار کەسی دەرباز دەکرد بەزیادبوونی تامپۆوە بەردەوام بوو. ئەو کار و خەباتە تەنیا بە دەربازکردنی ئەو تەنگژە نەوەستا کە ساڵی ١٩٨٦ هەڵمەتی گەریلا دووچاری هات، شەڕی گەریلای بە قۆناغێکی جیاوازتر گەیاند و بەدۆخی هاوسەنگی ستراتیژی گەیشت. پشتگیرییە بەرفراوانەکەی گەل کە دووبارە لە ساڵانی ١٩٩١ ـ ١٩٩٢ چڕبوویەوە بەشێوەیەکی جددی رێگەچارەی سیاسیانەی خستە رۆژەڤەوە. لەراستیدا لە ساڵی ١٩٨٥ وە تورگۆت ئۆزال لەمیانەی پیلانێکی شەڕەوە هەڵوێستێکی شەڕخوازانەی گرتبووە بەر. لە ساڵی ١٩٨٧ رەوشی باری نائاسایی راگەیەنرا بوو. رێکخراوی ژیتەم کە خاوەن دەسەڵاتێکی سەرووی یاسا بوو، بەجۆرێک ئەرکدار کرابوو سەرجەم ئۆرگانەکانی دەوڵەت بکات بە پەدەگی خۆی. چالاکییە نابەجێ و بەدەر لەتەکتیک (بە ئامانجگرتنی ژنان و منداڵان)ی چەتەی جوارینە و کەسانی هاوشێوەیان بەشێوەیەکی راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ گرێدراوی ژیتەم بوو. لەهەمان قۆناغدا دەستگیرکردنی هەڤاڵانمان لە ئەڵمانیا و دەستبەکاربوونی حزبوڵڵا هەریەکە و بەشێکی شاڵاوی لەناوبردن بوون و ئەو راستییەی دەخستەڕوو کە گلادیۆ تەنیا دژی PKK و بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان بەشێوەیەکی کاریگەر لەسەر کارە. هەروەها شاڵاوی

گلادیۆی دژە شۆڕش لەبەرامبەر هەڵمەتە نوێیەکەی شەڕی شۆڕشگێڕی لەئارادا بوو. لەمیانەی بەرزکردنەوەی ئاستی ئەو هەڵمەت و شاڵاوە دژانە بەسەرەتای ساڵانی ١٩٩٠کان گەیشتین. بۆ یەکەمین جار بوو لە مێژووی کوردستان لەسەرجەم پارچەکانی کوردستان و تەواوی دەڤەرەکان هەر بەشێکی نیشتیمان بەشێوەیەکی هەمووێتی و یەکپارچەیی ئاشنای تێکۆشانی ئازادی و ناسنامە ببوون. لە مێژووی کۆماری تورکیادا بۆ یەکەمین جار لەو قۆناغە بەشێوەیەکی جددی بیر لە بژاری رێگەچارەی سیاسی دەکرایەوە.

تۆرگۆت ئۆزال ئاماری شەڕی حەوت ساڵەی تاوتوێی کردبوو و بۆی روون ببوویەوە کە تورکیا کەوتۆتە ناو بنبەستبوونێکی قووڵەوە. لەمیانەی هەڵوێستێکی رادیکاڵانەوە (لەکاتی خۆیدا ئەوەمان دەستنیشان نەکرد) بەدەستپێشخەری خۆی بژارێکی ئاشتی و چارەسەرکردنی پێشخست کە موسڵ ـ کەرکوکیش (باشوری کوردستان) لەخۆوە بگرێت. لەبەرەی سوپا و ئۆپۆزسیۆندا خۆڕاگریەک بەرامبەر ئەو دۆخە دەستپێکرد. ئەمریکا و ئینگلتەرا کە لە ساڵی ١٩٢٥ موە ئێراق بەگشتی، بەتایبەتیش باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) لەژێر هەژموونگەرایی خۆیاندا دەبینن، ئەو هەڵوێستە نوێیەی ئۆزالیان پەسەند نەکرد. ئیسرائیلیش کوردستانی ئێراقی وەک پرۆتۆ ــ ئیسرائیل هەڵدەسەنگاند. دابڕاندنی موسڵ ــ کەرکوک (کوردستانی ئێراق) لە سەروەری کۆماری تورکیا لەئاکامی رێککەوتنی یاخود سازشی مستەفا کەمال لەگەڵ ئینگلیزەکان (کە لەقۆناغی دامەزراندنی ئیسرائیل پارێزەری بزووتنەوەی زایۆنیزم بوو) ئەنجامگیر بوو کە رووبەڕووی دووڕیانی "یان کۆمار یان موسڵ ـ کەرکوک" ببوویەوە. واتە ئەگەر موسڵ ــ کەرکوکی نەدابووا بە ئینگلیزەکان کۆمار ئاوا نەدەبوو. وەک دەزانرێت مستەفا کەمال بە ناچاری موسڵ ــ کەرکوکی پێشکەش بە ئینگلیزەکان کرد. ئەگەر سازش نەکات ئەوا پشتگیریکردنی یاخیبوونەکانی ١٩٢٥ کوردان و تیرۆرکردنی جێگای باس بوو. ئەو ئەگەرانە دەخرایە بەرچاو. ئەو سازشە سەرەکیترین فاکتەری شاراوەی ژێر کێشەی کوردە و تا ئێستاش وەک هۆکارێکی بەهێز بەردەوامە. سێ سەرۆک وەزیرانی نیازیان بەلاوەنانی یان نەهێشتنی ئەو ستاتۆیە بوو بە ژیانی خۆیان باجەکەیان دا. لەسێدارەدانی مەندەرەس، کوشتنی ئۆزال و ئیفلیجکردنی ئەجەوید و دواتر مردنی لەنزیکەوە گرێدراوی سیاسەتەکانی دەرهەق بە کوردستانی ئێراقە. لێکۆڵینەوەکانی یالچین کوچوک لەو بارەیەوە رۆشنکەرەوەیە. ئەو راستیەی دەردەکەوێتەڕوو: چارەسەرکردنی کێشەی کورد یەکپارچەیە. هیچ پارچەیەک بە تەنیا بە چارەسەری ناگات. تا کێشەکە لە باکووری کوردستان (کوردستانی تورکیا) چارەسەر نەبێت کە گەورەترین پارچەیە، زەحمەتە لە بەشەکانی دیکە بکەوێتە سەر رێچکەی چارەسەری. هەروەها خاڵی هەرە سەرنجڕاکێش ئەوەیە، چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانەوە قوفڵ کراوە؛ بەبێ ئەوان، بە ئاسانی رێگەچارەیەک سەرناگرێت کە بەرژەوەندییەکانیان لەبەرچاو نەگرێت. هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت، پێویستە قوربانیەکی زۆری لەپێناودا بدرێت. هەوڵەکەی تۆرگۆت

ئۆزال بۆ چارەسەرکردن بە ترسناکی و بێرەحمیەکەیەوە سەرجەم ئەو ئەگەرانەی سەلماندبوو.

وێڕای بێ ئەزموونی بواری سیاسی و دیبلۆماسی کاتێک بانگەوازی دیالۆگ ـ چارەسەری ئۆزال (لەرێگای جەلال تالەبانیەوە) مان پێگەیشت، چەند مانگێک باوەڕم نەدەکرد. بیرم لە دوو ئەگەر کردەوە: یەکەمیان؛ لەوانەیە ئۆزال یاریەکی تەکتیکی بکات. دووەمیان؛ نازانێت سەرقاڵی چییە. لەماوەیەکی کورتدا مێژوو بۆچوونی منی سەلماند. بەکوشتنە دڕندانەکەی ئۆزال خەمگین بووم و جێگای پەژارە بوو. بەدواداچوون و چاودێریکردنی هەوڵەکانی ئاشکراکردنی نهێنی و پەردەی سەر کوشتنەکەی بۆخۆم بەئەرک و بەرپرسیارییەک دەزانم. سەرۆکی AKPرەجەب تەیب ئەردۆغان کە خۆی لەگەڵ ئۆزال بەراورد دەکات یان راستیەکەی نازانێت یاخود هەوڵی چەواشەکردنی دەدات. ئۆزال نەیدەگووت "من پەیوەندی لەگەڵ رێبەرایەتیPKKنابەستم". بەگەرمایی مرۆڤە داناکانەوە گوتبووی:"هەر شتێکی ئەنجامتان داوە هەڵە نییە " (جەلال تالەبانی ئەوەی پێراگەیاندین). بگرە بەراشکاوی روونی کردبوویەوە کە گرنگی دیالۆگ لەجێدایە و بۆچی چارەسەری بۆ لایەنەکان ژیانییە. لەراستیدا لە ترسناکی وێرانکاری شەڕ تێگەیشتبوو، بەمجۆرەش بە خاڵی رێگەچارەی سیاسی گەیشتبوو. لەرێگای یاسای کەمکردنەوەی مەرجداری سزاکانەوە بەبێ هیچ مەرجێکی لەپێشینە هەندێک زیندانیانی PKK ی سەربەست کرد. لەو سۆنگەیەوە؛ خۆبەراوردکردنی رەجەب تەیب ئەردۆغان لەگەڵ ئۆزال واتای نییە. سیاسەتەکانی زۆر لە هی چیللەر قووڵتر و تەڵەکەبازانەترە. دیسان بۆ دەستنیشانکردنی بڕیاری دوایی لەبارەیەوە پێویستە چاوەڕوانی بکەین و ببینین.

لەبەرئەوەی ساڵی ١٩٩٣ ساڵێکی دراماتیک بوو زۆر لەسەری رۆیشتم. بە بڕوای من ساڵی ١٩٩٣ ئەو ساڵە بوو کە گلادیۆ دەستی بەسەر دەوڵەتدا گرت. تەنیا ساڵی کودەتای سیاسی و تیرۆر نییە، بەڵکو ساڵێکە چەندین کودەتای نهێنی، پیلانگێڕی و کۆمەڵکوژی تێدا ئەنجام دراوە. لەوەش زیاتر ساڵێکی مێژوویی کورستانە کە بەرفراوانترین کۆچبەری و دەربەدەرکردنی کوردان دەستیپێکرد. ئەو ساڵەیە کە تیرۆری کۆمەڵکوژی لەلایەن فاشیزمی تورکی سپی ـ بە پشتگیری ناتۆ و ئیسرائیل ـ بەبەرفراوانی دەستیپێکرد و تا ساڵی ١٩٩٦ بەردەوام بوو. ساڵی بە لوتکە گەیشتنی کۆمەڵکوژییە. ساڵی مان و نەمانی ملیۆنان کوردە. لەو ساڵە لە چەندین شار و شارۆچکەدا (لەسەروی هەموویانەوە شرناخ، جزیرە، نوسەیبین، لیجە) کۆمەڵکوژی مەترسیداری گەل ئەنجامدرا، رووخاندن و سوتاندنی نزیکەی چوار هەزار گوند، ئەوەش جگە لە کوشتنی لادێنشینەکان و تەرحیلکردنی زۆربەیان بۆ شارە گەورەکانی تورکیا. تایبەتمەندییەکی دیکەی گرنگی ئەو ساڵە تەسفیەکردنی دەوڵەتی یاسایی بوو. چەشنێکی نوێی دەوڵەت هاتبوویە ئاراوە کە بە "دەوڵەتی چەتە" ناودەبرێت. ئەنجامدەرانی ئەو تاوانانە لەو بڕوایە دابوون کە کاریگەری هاوشێوەی شەڕی رزگاری نیشتیمانی مستەفا کەمالی بەرامبەر یۆنانیان ئەنجامداوە، تەنانەت کارەکەی خۆیانیان بە گەورەتر دادەنا. سیفەتی "ئەنا تورک(دایکی تورکان)"ی

چیللەر ئەو زار و ئەم زاری دەکرد. لەڕاستیدا کوردان هاوبەشی ڕەسەنی چوار هەزار ساڵی دەسەڵات ـ دەوڵەتی ئەو جوگرافیایە بوون. کەچی دەیانەویست بەتەواوی لەناویان بەرن.

نەخۆشـی و کەموکوڕییـە کۆنـەکانی نـاو ئـەو تێکۆشـانە شۆڕشـگێڕییەی PKK پێشەنگایەتی دەکرد بە قووڵبوونەوە بەردەوام بوو. هەندێک فاکتەری تـریش لەسـەر ئـەو نەخۆشیانە زیاد ببوو. نەوەیەکی بەناوی "نـەوەی نـاوین" دەرکـەوتبوو کـە بەشـێوەیەکی چاوسوورانە، بێ دوودڵی و سڵەمینەوە هەڵە و کەموکوڕیەکیان ئەنجامدەدا هەزار هێندەی نەوە یان کادیرە کۆنەکان بوو. ئەوانەی لەسەرپێ مانەوەیان بە سەرکەوتنی خۆیان دادەنا تادوایی کەوتبوونە ناو نەشوەی سەرکەوتنەوە. کەچی لەڕاستیدا ئەوانە ئەنـدازیاری ئـەو تەسفیەکارییە قورسە بوون کـە لـە مانگـەکانی هـاوینی ١٩٩٢ ڕوویـدا. سـاڵی ١٩٩٢ سـاڵی چارەنووسی گەریلایە. ئەگەر فەرماندارییە سـاختەکەی گـەریلا ئاشـقی خـۆی نەبووایـە و لەمانای ئەو کۆمەک و یارمەتییە مێژووییە تێگەیشتبووایە کـە پێشکەشمان کـرد، ئـەوا لەبواری چەندایەتی و چۆنایەتی گەریلاکان دەیانتوانی لەسەر بنەمای دەستبەسەرداگرتنی ناوچەی جوگرافی بەسەر ڕەوشـەکەدا زاڵ بـن. دەیـانتوانی بـە سـوپایەکی پـەنجا هـەزاری گـەریلا بکـەن. هـەموو جـۆرە دەرفـەتێک لەبەردەسـتدا بـوو. هەربۆیـەش ئەگـەری بـژاری ڕێگـەچارەی سیاسـی کـەوتبووە ڕۆژەڤـەوە. بـەڵام ئـەو دەرفەتـە مێژووییـە نەقۆزرایـەوە. لەجیاتی ئەوە بەشێوەیەکی سەرشێتانە کەوتنە ناو هەوەسی سەرۆکایەتیەوە.

تابلۆی بەمجۆرە لە مێژووی کورد زۆرە. بەدرخان بەگیش لە ساڵی ١٨٤٧ لە بۆتان لە ڕەوشێکی هاوشێوەدابوو. بە سوپایە پازدە هەزار کەسیەکەیەوە حوکمڕانی ناوچەکە بـوو. هێرشەکانی سوپای عوسمانی بێ کاریگەری کرابوون. بەڵام نەیانتوانی بۆ ماوەیەکی درێژ خۆڕاگری بکەن. ئا لەو کاتەوە خیانەتی یەزدان شێری برازای سەریهەڵدا. دواتر بەجۆرێک قۆنـاغی رووخـانی میرنشـینی بۆتـان دەسـتیپێکرد کـە جـارێکی دیکـە نـەتوانێت سەرهەڵبرێتەوە. بەبێ هۆ نـەریتێکی هـەزاران سـاڵی لەدەست چـوو بـوو. یـەزدان شێر بەگایەتی بە مافی خۆی دەزانی. دواتر بنەماڵەکەیان بـەجۆرێک نـەفی کران کـە جـارێکی دیکـە نەگەڕانـەوە بۆتـان. ئیتـر جـارێکی دیکـەش میرنشینی بۆتـان ئـاوا نەکرایـەوە. لای ئێمـەش لـە کەسـایەتی چەنـدین فەرمانـدەی سـاختەوە عوسـمانی ناپـاکیش لەسـەرووی هەموویان ئارەزوویەکی بەمجۆرەیان جووڵابوو گوایە سەرۆکایەتی مافی خۆیانە. ئەوانەی نەریتی بارزانی و تاڵەبانییان بە بنەما گرتبوو. هەروەها بەگووتەی "ئێوە زۆر لـە ئـاپۆ بەهێزترن. ئـەو جگـە لـەوەی بۆخـۆی لـە شـام دانیشـتووە چیتـر دەکـات! پێویسـتە ئێوە خاوەنی هەموو شتێک بن" فووکرابوون. ئەو فتنەیان لە دڵ و مێشکیاندا جێگیـر کربـوو. لەکاتێکدا هێرشە هاوبەشەکانی هێزەکانی YNK و PDK یێ نزیک بە سوپاسالاری تـورک لـە باشـوور، سـوپای تـورکیش لـە بـاکوور بەشـێوەیەکی نەخشـە بۆکێشراو بـە لوتکـە گەیشـتبوو، بزووتنەوەکـەمانیان خسـتە نـاو سیسـتەمێکی شـەڕەوە کـە بـە لێـواری لەناوچوونی دەگەیەنێت و پێشوەخت شکستەکەی دیارە. ئەنجام مەترسیدار بوو؛ بەسەدان بەهادارترین فەرمانـدە و گـەریلا شـەهید بـوون. بەهەزارانیشـیان ناچـاری هەلومـەرجێکی

تەسلیمیەت بوون. ڕۆڵی ئاشکرا و بەرچاوی YNK و PDK لەو هێرش و ئۆپەراسیۆنانەدا ناشێت جیاواز لە گلادیۆی ناتۆ ببینرێت و بیری لێبکرێتەوە. لەبەرامبەر ئەوەشدا تورکیا ڕێگای بەجێگیربوونی هێزی "چەکوشی ئامادە" لە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) دا و بە پێکهاتە فیدراڵیەکەی ڕازی بوو. بەمجۆرەش درێژە بەرێککەوتننامەی ١٩٢٥ دەدرا.

PKK لە لێواری سەرکەوتنی سەربازی گەڕابوویەوە. ئەوەی ڕۆڵی دیاریکەری لەوەدا هەبوو: لاوازییە ناوخۆییەکانمان، پاشکۆکانی پیلانگێڕیی و خیانەتی هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان؛ لەدەرەوەش داخوازی بەردەوامکردنی هەمان هەژموونگەرایی بوو کە لە ساڵی ١٩٢٠وە ستاتۆی کوردستانیان دیار کردووە. ڕاستیەکی دیکەی لە ئاکامی ئەو دۆخە ئاشکرابوو و سەلمێنرا؛ هێزە هەژموونگەرا ناوخۆیی و دەرەکیەکان چەندە بەهێزیش بن دەرفەتی سەرکەوتنی ئەو گەلە لەئارادایە کە لەپێناو مافەکانی ناسنامە و ئازادییە بنەڕەتیەکانی ڕابووەتە سەر پێیان. لەڕاستیدا دوای لەدەستدانی دەرفەتی سەرکەوتنە سەربازیەکەی ١٩٩٢ چارەنووسی هەوڵەکانی دیالۆگ و ئەزموونەکانی ئاگربەستی بەهاری ١٩٩٣ دیار ببوو. جەمسەرەکەی دژ بە تۆرگۆت ئۆزال و ئەشرەف بەتلیسی، زۆر لە دەستبەسەرداگرتنی تەواوی دەسەڵاتدا نزیک ببوویەوە. بڕیاری لەناوبردنی ئۆزالیان دابوو. هەوڵی ئۆزال بۆ پێشخستنی دیالۆگ لەگەڵ سەرۆکایەتیPKKیان بەبیانووی خیانەت دادەنا و لەپێناو لەسەر کارلابردنی بەکاریان دەهێنا. لەسەر کار لابردنی ئۆزالیان بە دەرفەت دەزانی و لە سەپاندنی بێدەنگی مردن بەسەر باکووری کوردستان بە بڕیار بوون. نیازی سەرکوتکردنی هەر هێزێکیان هەبوو کە کۆسپ بنێتەوە. دژە هاوپەیمانێتیەکی زۆر بەهێزیان ئاواکردبوو. تا ڕادەیەکی مەزن دیمرال، چیللەر، ئینۆنۆ، تورکێش، ئەربەقان و میدیای تورک ببوون بە یەک. خنکاندنی هەوڵەکانی کوردان لەپێناو ناسنامە و ئازادی تاکە ئامانجی ئەو هاوپەیمانێتیە بوو.

سەرەکیترین کار و خەباتی بەرامبەر ئەو جەمسەرە فاشیستە ئەنجامدرا کە ئەمریکا و ئیسرائیل بەتەواوی، وڵاتانی یەکێتی ئەورووپاش بەرێژەیی پشتگیرییان دەکرد، هاوشێوەی ئەو کار و خەباتە بوو کەدوای ١٩٨٦ ئەنجاممان دابوو. کاتێک ناچاری بەجێهێشتنی کامپی پەروەردەیی بیقاع بووین، ئەو ماڵانەمان کردە شوێنی پەروەردە کە لە لوبنان و شارەکانی سوریا لە سەرووی هەمووشیانەوە لە دیمەشق و حەلەب بەکارمان دەهێنان. لە ساڵی ١٩٩٣ تا کۆتاییەکانی ١٩٩٨ لەسەر بنەمای شێکار و شیکردنەوەی قووڵترەوە ساڵانە نزیکەی هەزار کەسمان پەروەردە کرد و هەوڵماندا تامیۆی بزووتنەوەکەمان و بەردەوامبوونەکەی بپارێزین. هەوڵێکی زۆرمان دا ئۆپەراسیۆنە گەورەکانی گلادیۆی ساڵانی ١٩٩٤، ١٩٩٥، ١٩٩٦، ١٩٩٧و ١٩٩٨ لە بۆتان و بادینان مایەپووچ بکەین کە بە پشتگیری PDKئەنجامدران. بەبێ وەستاندنی کار و خەباتی هیچ گۆڕەپان و هەرێمێک بەهێزمان کردن و درێژەمان پێدان. دۆخی بە گرفتی سەرکردایەتی مەیدانی ناوەوەی وڵات بەردەوام بوو. وەک بڵێی دەرفەتیان بۆ ڕاکردنی محەمەد شەنەر، جانگیر حازر و شەمدین ساکک رەخساندووە. بەهۆی لاوازی و بۆشایی فەرمانداریێتی ژمارەیەکی زۆری گەریلا

شەهید ببوون. وێڕای تەواوی ئەو رەوشانەش دیسان بزووتنەوە دەرفەت و توانایەکی زۆر بەرفراوانی هەبوو. بەڵام ئەو دەرفەت و توانایانە بە ئاراستەی بەرزکردنەوەی تێکۆشان و پێشخستنی بەهرە و تواناکانی گەریلا بەکار نەهێنران. خاوەنداریێتی لە خەڵکە تەرحیلکراوەکە نەکرا. تیرۆری جاشەکان و حزبولڵا لە دەشت و شار هەناسەی لەبەر خەڵک بڕیبوو. سەدان کۆمەڵکوژی ئاشکرا جێگای باس بوو کە کوژەرەکانیان دەشاردنەوە و دەیانکردن بە تاوانی بکەری نادیار. دان بەهیچ ڕێسایەکی ئەخلاقی نەنرا. ڕێبازگەلێک جێبەجێکران کە بەسەر هیچ گەلێکدا پەیڕەو نەکراون؛ ڕەفتار و کردەوەی زۆر ترسناک و خراپتر لە کۆمەڵکوژی جەستەیی سەپێنران. ملیۆنان کەس برسی و بێکار کران. دەست بەسەر گوند، ماڵ، موڵک و سامانیان داگیرا. منداڵەکانیان لە کامپە شەوینەکانی بەناو YIBO کۆکردەوە و هەوڵی تورکاندنیان درا. ئایین خرایە ژێر خزمەتی فاشیزمەوە. ئابووریش بەتەواوی گرێدراوی شەڕبوو. ناڕەزایی و رەخنەیەکی بچووکیش بەرامبەرەکەی مایەپووچکردن بوو.

سەرباری ئەوەش ژیان و خۆڕاگریمان بە بنەما گرت. ئەو شەڕانەی هێزەکانی باشووری کوردستان لە بەرامبەر بە دەستهێنانی ستاتۆی فیدڕالی دژی ئێمە ئەنجامیاندا نەیتوانی هێزەکانمان لەو دەڤەرە لەناو ببەن. بە پێچەوانەوە لە تەواوی باشووری کوردستاندا بڵاوبووینەوە. سوپای تورک سەرکەوتنی ستراتیژی سەربازی ئێمەی بەربەست کردبوو، بەڵام لەمیانەی ڕێخۆشکردن بۆ کوردستانی فیدڕال گورزێکی ستراتیژی بەرکەوتبوو. وێڕای ئەوەی ئەو سەرکەوتنە سەربازییە ستراتیژیەی لەدەست چوو بوو کە بە لێوارەکەی گەیشتبوو، بەڵام ئارادەیەکی مەزنPKK توانیبووی هێزی سەربازی و سیاسی خۆی بپارێزێت. لە ئاستی نێونەتەوەییدا ناسرابوو و لەچەندین وڵاتدا بەجۆرێک جێگیر بوو کە جارێکی دیکە دەرنەکەوێت. لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و باشووری کوردستان (کوردستانی ئێران، سوریا و ئێراق) ڕۆڵی پارتی پێشەنگی بەدەستهێنا بوو. پشتگیری زۆربەی زۆری کوردانی نیشتەجێی ئەوروپای بەدەست هێنابوو، لە زۆربەی وڵاتانی بەلقان، قەفقاسا و ئاسیای ناوین بە ئاستی کردنەوەی نوێنەرایەتی گەیشتبوو.

لە ساڵانی ١٩٩٧ و ١٩٩٨ لە ڕێگای سەرۆک وەزیران نەجمەدین ئەربەقان و باڵێکی سوپا جارێکی تر ڕێگای دیالۆگی ناڕاستەوخۆ کرایەوە. هەوڵەکانی دیالۆگ ئەنجامێکی رەوشی بنبەستوو بوو. کاتێک چاوەڕوانی ئەنجامی دیالۆگ بووین، ئاخافتنە هەڕەشە ئامێزەکەی ئاتیلا ئاتێشی فەرماندەی هێزەکانی زەمینی لە ١٨ ی ئەیلول دژ بە سوریا مانای کۆتاییهاتنی قۆناغێک بوو. ئەو ئاخافتنە هەم رەنگدانەوەی هەڵمەتی لۆبیە بەهێزەکەی شەڕ بوو لەناو سوپادا، هەمیش مانای پچڕاندنی دیالۆگ بوو. هەروەها هێزە پیلانگێڕ و کودەتاچیەکانی گرێدراوی هێزەکانی دەرەوە هەم نەجمەددین ئەربەقانیان لە دەسەڵات هێنابوویە خوارەوە هەمیش بەرامبەر ئەگەری هەڵوێستێکی ئاشتیخوازانەی سوپاسالاری نوێ حوسێن کفرک ئۆغلو لە ڕێگای هەوڵی تیرۆرکردنیەوە ئاگاداریان کردەوە. جارێکی دیکە هەوڵی ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیانە مایەپووچ کرابوو کە بەلانی

کەم هێندەی هەوڵەکەی سەردەمی ئۆزال گرنگ بوو. لە لێواری قۆناغ و سەردەمێکی نوێ بووین. ئیتر بە کۆتایی گێژاوە زێدەڕۆکەی سوپا و خۆرهەڵاتی ناوین گەیشتبووین. ئەو گێژاوە نەزۆکە منیشی زۆر ماندوو کردبوو. تەواو کاتی ئەنجامدانی گۆڕانکاری بوو. وەک بڵێی چاوەڕوانی شکانی ئەو گێژاوە بووم. وەک چۆن بەربەستکردنی سەرکەوتنی سەربازی PKK مانای کۆتایهاتنی پەرەسەندن و سەرکەوتنیان نەبوو، لەهەمان کاتدا نەیتوانیبوو ڕێگری لە بەدەستهێنانی ئەو ئەزموون و هێزە شاراوەیە بکات کە هەر کات و ساتێک بتوانێت هەڵمەتی گەورەتر ئەنجام بدات. لە حاڵەتێکدا سەرکردایەتی مەیدانی لاوازیەکانی خۆی چارەسەر بکات ئەوا زۆر بە ئاسانی دەتوانێت هەڵمەتی نوێ و قۆناغی شەڕی لە جاران بەهێزتر دەست پێ بکات و چالاکیەکانی گەریلاش بە ئاستێکی چۆنایەتی بەرزتر بگەیەنێت.

ئەزموونی بیست ساڵەم لە خۆرهەڵاتی ناوین زیاتر بە ئەزموونە چل ساڵیەکەی حەزرەتی موسای سینا دەچوو. موسا هەوڵ و کۆششێکی زۆری دابوو تا تیرەکانی هۆزگەلی عیبرانی دیسپلین نەناس بکات بە هۆزگەلێکی جەنگاوەر و شەڕکەر. لقەکانی قەبیلە زۆر بەئاسانی لە سرووشەکانی یاهۆڤای خوداوەند هەڵدەگەڕانەوە و بتەکۆنەکانی خۆیانیان دەپەرست، بە ئاسانی دەستبەرداری ڕەفتارە گومڕاکانی خۆیان نەدەبوون. دانیان بە دە فەرمانەکەی خوداوەند دانەدەنا و بە ئاسانی بەدوای ئارەزوو و هەوەسەکانی خۆیان دەکەوتن. چیرۆکەکە بۆمان روون دەکاتەوە کە گەڕانی گرووپە پەنابەرەکان بەدوای نیشتیماندا نەریتێکی چەندە کۆنە. ئەگەر گرووپەکان نەکرێن بە گرووپی ئایدیۆلۆژی و جەنگاوەر، ئەوا پەرتەوازەبوون و توانەوەیان ڕێگیری لێناکرێت. لەلایەکی دیکەشەوە ژیانێکی هاوشێوەی چیرۆکی حەواریەکانی حەزرەتی عیسامان هەبوو. حەواریەکانی عیساش لەکاتێکدا هەوڵیاندەدا خۆیان لە ستەمی نەمرود رزگار بکەن ئەوجارە دووچاری ستەم و زۆرداری فیرعەون هاتبوون. لەژێر سێبەری گلادیۆکانی رۆما لە خاچ درابوون. ئێمەش هەموو کات و ساتێک ڕووبەڕووی هەڕەشەی لەخاچدان بووین. ئیتر تۆزێکیش لە موجاهیدەکانی حەزرەتی محەمەد دەچووین. ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی بووین. لەپێناو ژیاندا دوودڵیمان لەهێرش و بەرگری لەخۆکردن نەدەکرد. تەنیا بەرەو "خاکی بەڵێن پێدراو" نەدەڕۆیشتین، بەڵکو هەرگیز دابڕانی تەواوەتیمان لەو خاکەش پەسەند نەدەکرد. هیچ کاتێک لە لوتکە و بناری شاخەکان دانەبڕاین. وێڕای سەرجەم دابەشکردن و پارچەکردنەکان، لە بەدەستهێنانی دەرفەتی یەکێتی دوور نەکەوتینەوە.

لە ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٨٠ ئامانجم ئافراندنی ڕێکخستن و پارتی پێشەنگ بوو. لەوەدا سەرکەوتوو بووم. دوای ١٩٨٠ باجەکەی هەرچیەک بێت ئامانجم ئافراندنی ڕێکخستنێکی ملیتانی شەڕ و گەلەری بوو. لەراستیدا لەمێژ بوو لە خۆرهەڵاتی ناوین بەو ئامانجە گەیشتبووین. ئەوەی لە ١٩٩٠کان یاخود دوای ١٩٩٥ ڕوویدا خۆ دووبارەکردنەوەیەکی بێرەحم و بێمانا بوو. هەڵوێستی سوودخوازانە منی خزاندبوویە ناو ئەو دووبارەبوونەوە زێدەڕۆییەوە. ناوچەکە بۆ تێکۆشانی ناسنامە و ئازادی کوردان زۆر گرنگ بوو، تا دوایی

نیازی بەکارهێنانیم هەبوو. لە مێژبوو بۆ جیابوونەوە ئامادە بووم. ئەوانەی ئامادە نەبوون هەڤاڵان، دۆستان و گەلەکەمانی شوێنەکانی دیکە یان مەیدانەکانی دیکەی خەبات بوون.

## بەشی پێنجەم

# تەنگژەی سۆسیالیزمی زانستی، پیلانگێڕی مەزن و وەرچەرخانی PKK

### أ . تەنگژەی سۆسیالیزمی زانستی

ئەو ئاڵۆزی و ناڕوونییەی لە پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی PKK سەبارەت بە بابەتی دەوڵەت ـ نەتەوە لە ئارادابوو سەرچاوەی خۆی لە بونیادەکانی پەیوەندییە ئایدیۆلۆژییە گەردوونیەکانمان وەردەگرت کە هەوڵماندا وەک سۆسیالیزمی زانستی گوزارشتی لێبکەین. وەک زۆر جار ئاماژەم پێکردووە؛ ئەو هەژموونە ئایدیۆلۆژییەی لەگەڵ بەدەستهێنانی خەسڵەتی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەستپێکرد وەک سەرجەم بوارەکانی دیکە کاتێک دەرهەق بە بواری جڤاکیش سەرلەنوێ خۆی بونیاد نایەوە لە قووڵاییەوە کاریگەری لەسەر پەرەسەندنی زانستی کۆمەڵایەتی کردووە. هەر سیستەمێکی کۆمەڵایەتی لە هەڵکشان دابێت، خوازیارە بەشێوەیەکی هەمەلایەن و سەرتاسەری ببێتە پێشەنگ. ئەو خاڵە بەشێوەیەکی زەق لە سیستەمەکانی شارستانیدا دەبینرێت. هەژموونگەرایی تەنیا بە بوارە ئابووری و سەربازییەکانەوە سنووردار نابێت؛ بەڵکو هەوڵدەدات لە گشت بوارەکانی کۆمەڵگادا، واتە هەربوارێکی ئایدیۆلۆژی، یاسایی، سیاسی، کۆمەڵایەتی، کلتووری و ژینگەییدا پەیوەست بە ژیانی کۆمەڵایەتی خۆی جێگیر بکات. هەژموونی شارستانی سەرمایەداری یاخود هەژموونی سیستەمی مۆدێرنیتە سەبارەت بە بوار و کایە کۆمەڵایەتییەکان هەم زۆر چڕە هەمیش فاکتەری توندوتیژی مۆرکی خۆی لەو هەژمونگەراییە دەدات. کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە خۆرئاوای ئەورووپا هەڵکشا (سەدەی شانزدەهەم) و لە هەموو بوارێکدا لەگەڵ کۆمەڵگای نەریتی باودا کەوتە ململانێ و شەڕەوە، لەپێناو رەواکردنی خۆی ئامرازی ئایدیۆلۆژی گرنگی پێشخست. بەتایبەتیش شەڕ و تێکۆشانێکی خەستی دژی هەر سێ ئایینە مەزنە تاکخوداییەکە دەستپێکرد. مەزهەبی کاسۆلیکی کرستیانی ناچاری گۆڕان کرد کە لەو قۆناغەدا زیاتر لە ئەورووپا زاڵ بوو. مەزهەبی پرۆتستانتی کە بەجۆرێک لە جۆرەکان مانای میللیکردنی ئایینی کرستیانی دەبەخشێت لەو قۆناغە بەشێوەیەکی فەرمی راگەیەنرا. پرۆتستانتی کە بۆ یەکەمین جار

لە ئەڵمانیا (٢٣) ڕاگەیەنرا، یەکەمین سەرکەوتنی ئایدیۆلۆژی سەرمایەدارییە. دواتر وەرگێڕانی فەلسەفەی چاخی کۆن لەگەڵ سەرهەڵدانی ڕێنسانس و گواستنەوەی کلتووری ئیسلامی ڕێگای لەپێش فەلسەفە کردەوە کە سەرلەنوێ وەک بابەتێکی ئایدیۆلۆژی بەهێز سەرهەڵداتەوە. بەمانایەک لەماناکان سەدەی حەڤدەم سەدەی شۆڕشی فەلسەفییە. دیکارت، سپینۆزا، برۆنۆ و ئەراسموس لەسەرووی ڕێخۆشکەرانی ئەو شۆڕشەوە دێن. پەرەسەندنی سەرمایەداری کاریگەری لەسەر دواکەوتنی ئایدیۆلۆژی ئایینی و پەرەسەندنی قوتابخانە فەلسەفیەکان هەبوو کە بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری ڕەوا دەکرد.

لەگەڵ شۆڕشی فەلسەفی لە سەدەی هەژدەهەم شۆڕشی زانستیش ئەنجام درا. سەدەی هەژدەم کە لە هەمان کاتدا "سەدەی ڕۆشنگەری" یە فیکری عەلمانی دوور لە ئایین پەرەسەندنێکی مەزنی بەخۆوە بینی. شۆڕشی سیاسی فەڕەنسا و شۆڕشی پیشەسازی فەڕەنسی کە لە کۆتایی ئەو سەدەیە ڕوویاندا لەبواری زانستە کۆمەڵایەتییەکانیشدا شۆڕشیان کرد بەناچاری. لەولایەنەوە سەدەی نۆزدەهەم وەک سەدەی شۆڕشی زانستە کۆمەڵایەتییەکانیش دەناسرێت. هەرچەندە سۆسیۆلۆژیا ناوە نوێیەکەی زانستە کۆمەڵایەتییەکان بێت کە ئاگۆست کۆمت هەوڵی بەزاراوەکردنی داوە، بەڵام کارل مارکس و فریدریک ئەنگلس لەژێر ناوی "سۆسیالیزمی زانستی"یەوە سۆسیۆلۆژیای ڕاستەقینەیان بونیاد نا و ڕایانگەیاند. سۆسیالیزمی زانستی خاوەن بناغەی مێژوویی و ماتریالیستی، لە هزر و فیکردا ڕێبازی دیالیکتیکی بەبنەما دەگرت. هەروەها لەسەر بنەمای چینایەتی بوو و پرۆلیتاریای بە سۆبژە دادەنا. هیگل بەو سیفەتەی بە پێغەمبەرە نوێیەکەی فەلسەفەی دیرۆک و فیکری دیالیکتیکی دادەنرا، کاریگەرییەکی قووڵی کردبووە سەر سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتییەکان، بێگومان ئەو کاریگەرییەی لەسەر سۆسیۆلۆژیای ئاگۆست کۆمتە و سۆسیالیزمی زانستی مارکس و ئەنگلسیش هەبوو. هیگل دەوڵەت ـ نەتەوەی وەک بەرکەماڵترین و دواترین پۆلێنی کۆمەڵایەتی ڕاگەیاند. لەو بڕوایە دابوو کە لە ڕێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە تاک بە زۆرترین ئازادیەکانی خۆی دەگات. ئەوە ئەو بانگەشەیە بوو کە بەو سیفەتەی دەوڵەت ـ نەتەوە پێشکەوتووترین بونیادی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگایە زۆرترین دەرفەتی ئازادی بۆ تاک ڕەخساندووە. لەبەر ئەوەی خودی کارل مارکس و فریدریک ئەنگلس خۆشیان ئەڵمانی بوون بۆچوونەکەی هیگلیان لەبارەی ناوەندیبوونی دەوڵەتی ئەڵمانیا و شێوەگرتنی بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بە پەرەسەندنێکی پێشکەوتنخواز لە قەڵەم دا و لەو بارەیەوە هیچ دوودڵیان نەبوو. ئەنارشیستەکان، لە سەرووی هەمووشیانەوە باکۆنین، دژی ئەو داوەرییە وەستانەوە. لەو بڕوایەدابوون کە دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشت لە کۆیلایەتی مۆدێرن دەکات نەک پێشکەوتووترین ئازادی تاک، ژیانکردن بەشێوەی کۆمینەکان کۆمەکی زیاتر بە ئازادی تاکەکەس دەکات.

سۆسیالیزمی زانستی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی بە چەتری خۆی دانا. هەربۆیەش دەبوایە چینی پرۆلیتاریای هەر وڵاتێک بەر لەهەموو شتێک لەپێناو پەرەسەندنی ئەو

چەترە هەوڵبدات و هەمیش لەژێر سایەی ئەو چەترەشدا رێکخستنی چینایەتی خۆی بئافرێنێت. رێگای ئەنتەرناسیۆنالیزم بە دەوڵەتی چینی میللی دەرباز دەبوو. هەرچەندە سۆسیالیزمی زانستی ریالیزە دەبوو ئیتر بەشێوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو گوزارشت دەکرا. لەگەڵ ئاواکردنی سۆڤێتیش بە شێوەیەکی فەرمی خۆی وەک سیستەمی سۆسیالیستی بونیادنراو راگەیاند. دەوڵەتی سۆسیالیزمی بونیادنراویش دەوڵەت ـ نەتەوەیەک بوو کە پرۆلیتاریا پێشەنگایەتی دەکرد. بگرە دەوڵەت ـ نەتەوەی پرۆلیتاریا لە پێشاندانی جیاوازی ناوەندبوونی زیاتر و بڵاوبوونەوەی بەناو کۆمەڵگادا دەوڵەت ـ نەتەوەی بۆرژوازیشی دەربازکرد. بەجۆرێک لە جۆرەکان "سۆسیالیزمی فیرعەونی" پرۆلیتاریا سەریهەڵدابوو. نەتەوە و وڵاتە گەشە نەکردووەکانی گرێدراو بە هەژموونی سەرمایەداری بیروکراتییان بە سۆسیالیزم ناوبرد کە لە راستیدا مۆدێلی سەرمایەدارێتییە. سۆسیالیزمی زانستی ببووە سۆسیالیزمی بونیادنراو. ئەو سەرمایەدارییە بیروکراسییەی بەناوی سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە ئاواکرابوو ببوو بە سۆسیالیزم لەناوخۆیدا پووکایەوە و لە سەرەتای ١٩٩٠کانیش بووینە شاهێدی هەڵوەشانەوە و رووخانە بەهات و هاشەکەی. باوەڕیمان بەهەڵوەشانەوەی بەمجۆرەی سۆسیالیزم نەدەکرد، بەڵام هەرەسهێنان و رووخان واقیعی بوو. ئاشکرابوو ئەوەی هەڵوەشایەوە لەراستیدا سۆسیالیزم نەبوو، بەڵکو سەرمایەداری بیروکراتیک بوو؛ ئەویش خۆرێکخستنی خودی دەوڵەت ـ نەتەوە بوو بەشێوەی سەرمایەداری سۆبژە، واتە ئەو پرۆلیتاریایەی خوازیاری ئافراندنی کۆمەڵگایەکی بێ چین بوو خۆی ببوو بە درندانەترین چینی سەرمایەداری. بەمجۆرەش جیلوەیەکی دیالیکتیکی جێگای باس بوو.

PKK بەو چەمکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو کاریگەر ببوو کە لەمیانەی هێڵە گشتیەکانیەوە ئاماژەمان پێکرد. کاریگەرییەکی قەبە و رووکەشی جێگای باس بوو. ئاستی کلتووریمان تا ئەو رادەیە دەرفەتی پێدەداین. بە مانایەکی تر بەتەواوی نەماندەزانی دەوڵەتی سۆسیالیزمی بونیادنراو چییە. دەشیا باس لە مەعریفەیەکی داخراو بکرێت کە دەرگای بۆ هەموو جۆرە شرۆڤەیەک بە کراوەیی هێشتبۆوە. ئەگەر لە سەردەمی سەرهەڵدانی بۆچوونی ئایدیۆلۆژی و سیاسی، واتە قۆناغی پارتیبوون بێت، یاخود قۆناغی بوون بە رێکخراوێکی جەنگاوەر بێت بەردەوام دەستەواژەی "کوردستانێکی سەربەخۆ، یەکگرتوو دیموکراتیک" مان بەکارهێناوە. بەڵام بەشێوەیەکی روون و یەکلاکەرەوە پێناسەمان نەدەکرد کە ئەو کوردستانە چییە. کۆمەڵگایەکی ئازاد و یەکسان بوو یان دەوڵەتێکی هاوشێوەی دەوڵەتە سۆسیالیستیەکانی ئەو قۆناغە؟ یاخود دەبوو بە دەوڵەتێکی قەومی (میللی) کە شێوەیەکی دواکەوتووتر بوو؟ یاخود مەبەستمان کوردستانێکی خاوەن کۆمەڵگایەکی دیموکرات بوو؟ لە راستیدا وەڵامێکی روونمان بۆ تەواوی ئەو پرسیارانە نەبوو.

ئامانجی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی و رێکخراوی ملیتان لە چوارچێوەی ئەو پرسیارانە شاراوە بوو؛ دەشیا بە هەموو لایەنێکدا شرۆڤە بکرێت. وەک پێویستیەکی ئەو

هەلومەرجانەی تێیدا دەژیاین ڕووبەڕووی پرسیارگەلێک ببووینەوە کە لەوانەبوو ڕێگای بەلاڕێداچوون بکاتەوە. ئامانجەکانی شەڕ و سوپایەک ڕوون نەبێت، بەردەوام ئەگەری هەڵەکردن و بگرە خراپبوونیش لەئارادا دەبێت. ئەگەر بە لێواری سەرکەوتنیش بگات، بە شێوەیەکی تەواو و بەڕوونی نەزانرێت چی بکرێت ئەوا پەرتەوازەبوون لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بۆ نموونە؛ جەنگاوەرانی سپارتاکۆس دەیانتوانی ڕۆما بڕووخێنن، بەڵام نەیاندەزانی چی لە ڕۆما بکەن و چۆن بەڕێوەی ببەن. لەوانەیە تاڵانیان کردبووایە. تاڵانکردنیش خودی ئەو ڕێگایەیە کە بەرەو شکست دەچێت. ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕیشمان بە لێواری سەرکەوتنگەلێکی مەزن گەیشتبوو. بەڵام بەتەواوی نەماندەزانی دواتر چی دەکەین. لەزۆر ناوچەدا هەلومەرجەکانی دەستڕۆیی شۆڕشگێڕی ڕەخسابوو. بەڵام کادیران یاخود فەرماندەکانمان نەیاندەزانی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕی چییە. تەنانەت جارێکیان ئەو پەندەی پێشینان "قەرەج بکەیتە پاشا سەرەتا باوکی خۆی لەسێدارە دەدات"م بۆ ئاگادارکردنەوە بەکار هێنابوو. لای ئێمەش ڕەوشەکە تارادەیەک بەمجۆرە بوو. دەستڕۆیی شۆڕشگێڕیمان بەسەری گەلدا تەقاندەوە. ئێستاش لە یادمە: لاوێکی خوێندکاری زانکۆی خەڵکی هەکاری دێتە لای هۆگر – کە یەکێک لە چوار چەتەکەیە – بۆ خزمەتکردن و پێشکەشکردنی هەرجۆرە یارمەتی و کۆمەکێک. یەکەمین کاری ئەو ساختەکار و ناپاکەش ئەنجامی دەدات دەڵێ "سیخوڕە"و یەکسەر دەیکوژێت. هەروەها کوڕی سەرۆک عەشیرەتێک کە یارمەتیەکەیان و پێگەکەیان بۆ ئێمە گرنگ و هەستیارە لەگەڵ هەندێک لە ئەندامانی خێڵەکەی لە هەلومەرجێکی زۆر دژواردا بەردەوام هاتووچۆ دەکەن و خزمەت پێشکەش دەکەن: بە هەمات بیانو و تۆمەتەوە ئەویشیان دەکوژێت. هەڤاڵ جیهان یش کە تێکۆشەرێکی فیداکاربوو، بەهایەکی تایبەتیم پێدەدا و دواتر بۆم دەرکەوت تاقانایماڵەوە بووە (باوکەکەی دووچاری تراژیدیایەکی زۆر مەزن هات. یەکێکە لەو هەزاران تراژیدیایەی قەت لەبیرم ناچێتەوە) بەئامانجی یارمەتی ناردمە هەرێمی دێرسیم بۆ لای خدر یالچین (سەرحەد) و ئەیسەل چروقایا. تەنیا بەهۆی ئەندێشە و نیگەرانییان کە دەبێتە هاوبەشی دەستڕۆیی و دەسەڵاتیان بەشێوەیەکی خائین و نامەردانە کوشتیان.

ئەو تاوانانەی شەمدین ساککی ناپاکیش بەو شێوازە ئەنجامیداون لەژمار نایەن. گوتەی "نەدی و بدی" م بۆ ئەو تایبەتمەندێتیەی بەکارهێنابوو. نەک تەنیا ئەوانە، بەڵکو زۆربەی فەرماندە مەیدانیەکانمان دوودڵیان لە بەکارهێنانێکی ساختەکاری، خائینانە و بێ بەزەییانانەی دەستڕۆیی شۆڕشگێڕی گەل نەکرد کە بە لێواری سەرکەوتنێکی مێژوویی گەیشتبوو. لەو بڕوایە دابوون لەمیانەی ئەو ڕێبازەوە دەبنە دەسەڵات و هەرشتێکی ئەنجامی بدەن بۆیان دەچێتە سەر. دەتوانین بڵێین؛ کاتێک بە لێواری سەرکەوتن گەیشتبووین دووچاری ئەو شێوان و داڕزاندنەی دەستڕۆیی بووین. بێگومان ناشێت کاریگەری ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی گلادیۆ ـ ژێتەم لەو خراپبوون و داڕزینە پشتگوێ بخرێت. بەڵام زۆربەی زۆری ئەو خراپەکاریانە بەدڵنیاییەوە سەرچاوەی خۆی لە "نەخۆشی دەسەڵات و دەستڕۆیی" دەگرت. لەو قۆناغەی کە پشتگیری گەل بە لوتکە

گەیشتبوو هەڵوێستێکی خۆپەرستانە و بێنرخ بینینی گەل ڕێگای لەپێش ئەنجامگەلێک کردەوە کە لە گەورەترین خیانەت و ناپاکیش خراپەکارانەتر بوو. کاتێک ئەو هەڵوێستە لەگەڵ کردەوەکانی کۆنترگەریلا بوونە یەک، پشتگیری گەل تەنیا کەم نەبوویەوە یاخود نەما، بگرە کەسانێکی زۆر لەپێناو پاراستنی خۆیان لە جاشایەتیکردن دوودڵییان نەکرد. بەهۆی خاوەندارێتی نەکردنی دەسەڵاتی شۆڕشگێڕی بە ملیۆنان مرۆڤی فیداکار لە گەلە وڵاتپارێزەکەمان بەشێوەیەکی پەرێشان و شپرزە لە کەنار مەترەپۆلەکان کۆبوونەوە. بژێوییان لەسەر زبڵدانەکان بوو. ئەو جۆرە فەرماندە ساختە و ناپاکانەش لەهیچ شتێکیان کەم نەبوو. بێگومان لێرەدا ئەو هەڤاڵ و شەهیدە بێگەردانە جیادەکەمەوە کە بەفیداکاریەکی مەزن هەموو شتێکیان لەپێناو گەلەکەیان ئەنجامداوە، لەهەلومەرجی زۆر سەختدا بەبرسێتی و تینوێتی، لە بەفر و زستان تا دواهەناسەی خۆیان بەرخودانیان کردووە.

ئۆتۆریتە ( دەسترۆیی، نفوذ) یەکێک لەو بابەتە سیاسی و کۆمەڵایەتیانەیە کە لە بواری فەلسەفە زۆرترین گفتوگۆی لەبارەوە دەکرێت. کاتێک کۆمەڵگاکان گەشەدەکەن ئەوا پەرەسەندنی دەسترۆییش دەست لێبەرنەدراوە. لە کۆمەڵگای کلانەوە تا کۆمەڵگا هەژموونگەراکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان سەرجەم کۆمەڵگاکان بوونەتە شاهێدی جۆری جیاواز و هەمەڕەنگی دەسترۆیی. وەک ڕێسایەک ئۆتۆریتە بە خراپ دانانرێت. پێویستە بەخراپیش دانەنرێت. پێویستە دەسترۆیی لەژێر ڕۆشنایی هەلومەرج و ڕۆڵی خۆیدا شیکار و پێناسە بکرێت. دایکسالاریش دەسترۆییە، بەڵام زۆر بەهادار و ئافرێنەرە. باوکسالاری دەسترۆییەکی جیاوازترە. لایەنە باش و خراپەکانی تێکەڵ بە یەکترن. هەرچەندە دەسترۆیی پلەداری سەرەتا ڕۆڵێکی زۆر ڕێکخەرانە ببینێت، بەڵام دواتر هەنگاو بە هەنگاو خراپ بووە. ئەو دەسترۆییەی بۆ دەسەڵات گۆڕاوە مانای ئەو ئۆتۆریتە دەبەخشێت کە بە سنووری خراپی ڕەها گەیشتووە. بەهۆی خەسڵەتی بە کۆیلەکردن و تاڵانکاریەکەیەتی کە بە درێژایی مێژوو دەسەڵات بە سەرچاوەی خراپیەکانی ئۆتۆریتە دادەنرێت. ئۆتۆریتەی دەوڵەت بەیەکەوە هەڵگری تایبەتمەندێتییە باش و خراپەکانە. هەندێک لایەنی هەیە کە لە چوارچێوەی گشتیدا ناچارییە. لایەنگەلێکی نەرێنیشی هەیە کە بەردەوام بە ئامانجی دەسەڵات بەکاردەهێنرێن و ناچاریش نییە. دەسترۆیی دیموکراتییانە چەشنێکی زۆر جیاوازتری ئۆتۆریتەیە. مانای خۆبەڕێوەبردنی ڕۆژانەی کۆمەڵگایە. لەبەرئەوەی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی ناچارە گفتوگۆی هاوبەش و بەتایبەتیش بەرژەوەندییە ژیانیەکانی تەواوی گەل بە بنەما وەربگرێت زۆر بە نرخە و گەرەنتی ژیانی ئەخلاقییە، ئەوا بەردی بناغەی ژیانە. لە دەرەوەی ئەوانەش لە زۆر بواری هاوشێوەی زانستی، ئابووری و ئایینی و ...هتد ئاشنای شێوەی جیاوازی دەسترۆیی دەبین. بەو مەرجەی نەکرێن بە محافەزەکار و بۆ بەرژەوەندی کەسی و گروپەکان نەگۆڕێت سەرجەم دەسترۆیی ئەو بوارانە بە نرخ و دەست لێبەرنەدراون.

دەسترۆیی شۆڕشگێڕی گوزارشت لە ساتی لەدایکبوونی دەسترۆیی سەرجەم ئەو بوارانە دەکات. ئەو دەسترۆییە کە دواتر بە دامەزراوە دەبێت. هەرچەندە سەرەتا لایەنی کەسێتی لەپێش بێت، بەڵام بەردەوام دەستەجەمعیەکەی هەڵدەبژێردرێت. بێگومان هەر دەسترۆییەکی شەخسی خراپ نییە. کاتێک لەجێگای خۆی و بەمانا کۆمەڵایەتی ـ مێژووییەکەی بەکاربهێنرێت، دەسترۆیی شەخسی نرخ و بەهای مەزن دەئافرێنێت. دەرفەتی سەرکەوتن و خێراتر بوونی وەرچەرخان و گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی فەراهەم دەکات. بەڵام جارانێک پێچەوانەکەشی جێگای باس دەبێت. بە ئەندازەی کەسایەتییە ئەرێنییە مێژووییەکان کەسایەتییە نەرێنیەکانیشی جێگای باسن. لەو سۆنگەیەوە؛ پێویستە دەستبەرداری دەسترۆیی دەستەجەمعی نەکرێت. تەنانەت ئەگەر دەسترۆیی شەخسی ئەرێنیش بێت، هەبوونی دەسترۆیی دەستەجەمعی لە تەنیشتیدا گرنگیەکی مەزنی هەیە. ئەگەر دەستەجەمعی بێت یان شەخسی، لەبەرئەوەی دەسترۆیی شۆڕشگێڕی ڕێگا لەپێش بەدەزگابوونەکەی دواتری کۆمەڵگا دەکاتەوە زۆر بەهادار و هەستیارە. بەکارهێنانی بەشێوەیەکی ڕاست و لە شوێنی خۆیدا گرنگیەکی ژیانی هەیە. لەکاتی خۆیدا زۆر گرنگە. لە هەلومەرجێکی بەمجۆرەدا یاریکردن بە دەسترۆیی شۆڕشگێڕی، بەشێوەیەکی نەرێنی و خراپ بەکارهێنانی لەپێناو بەرژەوەندییە شەخسییە خۆپەرستیەکان گەورەترین خراپەکارییە بەرامبەر کۆمەڵگا، گەل و بگرە بەرامبەر دەوڵەتیش.

توانیبوومان ببین بە خاوەن دەسترۆیی و کاریگەری. یان ئەوەتا نەماندەزانی چی لەرێگای ئەو دەسترۆییەوە ئاوابکەین یاخود وەک مەسەلەی "ئۆخەی ئۆخەی هەرکەس بۆخۆی" هەرکەس بەلای خۆیەوە دایدەتاشی. کاتێک دەڵێم؛ هەرکەس مەبەستم ئەو بەناو فەرماندارانەیە کە پێویستیەکانی فەرمانداریتییان جێبەجێنەکردووە و بەشێوەیەکی هەڵپەرستانە دەسەڵاتی خۆیان بەکارهێناوە، نەک ئەو قارەمانە بەهادار و فیداکارە بێ ناوانەی هەموو شتێکی خۆیان لەپێناو گەلەکەیان بەخت کرد. نەک تەنیا نوێنەرایەتی ئۆتۆریتەی دەوڵەت یان دەسترۆییەکی دیکەیان نەکردووە، ئەو چەشنە کەسایەتیانە دەسترۆییان لەپێناو چەپەڵترین بەرژەوەندییەکانیان بەکارهێناوە. سەرهەڵدانی شێوە گومڕا، خراپ و تێکدەرانەکانی دەسەڵاتداریتی و دەسترۆیی بناغەی تەنگژەی PKK پێکدەهێنێت. ئەوەی ڕوویدا نەخۆشی دەسەڵاتداریتی بوو. نەخۆشیەکە بە خەستی لە سۆسیالیزمی بونیادنراویشدا سەریهەڵداوە. پێویستە زۆر باش بزانین کە هێزی دەسەڵات بەتایبەتیش سەرکوتکردن و قۆستنەوەی کۆمەڵگا لەلایەن ئەو هێزەوە لەژێر سەرجەم نەخۆشیەکان یاخود کێشە کۆمەڵایەتییەکانی مێژووی شارستانیدا شاراوەیە. لە دوای ۱۹۹۰دا کاریگەری ئەو نەخۆشییە بەهەموو قورساییەکەیەوە لەناو PKK دەستیپێکرد. بێگومان بناغەی کلتووری ئەو جۆرە چەمکانە بەردەوام لەناو کۆمەڵگاکاندا هەیە. خاوەنی ئەو چەمکانە کاتێک دەرفەت ببینن لەژێر ناوی چارەسەرکردنەوە دوودڵی لە گەورەکردن و گورترکردنی کێشەکان ناکەن. لەپێناو نەهێشتنی شێوە نەرێنیەکانی کاریگەری کلتووری

پێویستی بە پارتێکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی دەبینرا. بەڵام خودی پارت لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا بوو بە سەرچاوەی دەستڕۆیی و دەسەڵاتداریێتی بێ سنوور. مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە زیاتر لە ڕێگای پارتیبوونەوە خۆی دەئافراند. لەدەوڵەت ـ نەتەوەکان پارتیەکان ڕۆڵی ئامرازی دەستبەسەرداگرتی دەسەڵاتی دەوڵەت ــ نەتەوە یاخود ڕەواکردن و گواستنەوەی هەمان دەسەڵاتیان بۆ ناو کۆمەڵگا بینیوە. سۆسیالیزمی بونیادنراویش ئەو سیستەمەبوو کە زیاتر ئەو چەمکەی تێدا پەیڕەوکراوە و کردوویەتی بە تاکانە. سیستەمی تاک پارتایەتی مانای بوونە بە پارتی دەوڵەت. ئەو چەمکەی پارتی دەوڵەت بوو کە کۆتایی بە سۆسیالیزمی بونیادنراو هێنا.

ئەو تاکەی لە کۆمەڵگایەکی چەوساوەی وەک کۆمەڵگای کوردەواری شێوەی گرتووە کە بەسەدان ساڵ چەوساوەتەوە و ژێردەستە، هەر دەستڕۆیی و دەسەڵاتێکی بەدەستی بکەوێت بە ئاسانی دەستبەرداری ئەو شێوازەی جێبەجێکردن نابێت کە لەسەر خۆی پەیڕەوکراوە. چونکە بەو کلتوورەوە شێلدراوە کە لەدوژمن فێری بوون. وەک ئاگادارین لەجیاتی شکاندنی ئەو سوورە نەزۆک و ناپەسەندە لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا، قووڵترکرایەوە.

ئەو جۆرە دەستڕۆییەی PKK هەوڵیدەدا لە سۆسیالیزمی بونیادنراو فێری ببێت و لە دەرەوەی چەمکی دەوڵەت دەژیا و فاکتەرێکی دیکەی گرنگی زیادکردنی نادیاری و ئاڵۆزی بوو، سەرچاوەی خۆی لە سروشتی ئەو دەسەڵاتە وەردەگرت کە لەژێر ناوی کۆماری تورکیا دایە. ئیمپراتۆریەتی عوسمانی کە لەسەر میراتی دەسەڵاتی خۆرهەڵاتی ناوین و بێزەنتی دامەزراوە، ئەگەر بە شێوەیەکی ڕێژەییش بێت ئەو میراتەی وەک خۆی بۆ کۆماری تورکیا گواستۆتەوە. ڕژێمە نوێیەکە فاکتەری دەوڵەت ــ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەو میراتە موتوربە کردو کردی بە جانەوەر (لویاتانی هاوچەرخ)ێک کە کۆمەڵگا قووت دەدات. کوردان کە لە ئاواکردنی دەسەڵاتی کۆماردا ڕۆڵی ئەندامی بنەڕەتییان بینی، دوای ماوەیەکی کورت نکوڵی لە بوونیان کراوە. ئەو دۆخەش تەنیا بەوە نەدەوەستا کێشەی کورد بکات بە ئازارترین و خوێناویترین کێشە، لە هەمانکاتدا ڕۆڵێکی ئاڵۆز و کوێرکەرانەی سەبارەت بە کێشەی دەسەڵاتیش دەبینی. وەک چۆن پشکەکەی لە دەسەڵاتدا (بۆ چینی بۆرژوازی یان دەسەڵاتدارەکان) شاراوەیە و نەبینرا، وەک کۆمەڵگاش کوردانی بەهیچ دانا و لە بۆشاییدا هێشتنیەوە. ئەوەش بە شێوەیەکی سروشتی ڕێگای لەپێش چەمکێکی هەڵەی دەسەڵات و دەستڕۆیی دەکردەوە. لەڕاستیدا خودی ڕژێم ئەو هەڵوێستەی دەنواند کە بە جوداخوازی ناو دەبرێت، بەڵام هاوبەشەکەی خۆی بە جوداخوازی تاوانبار دەکرد کە نکوڵی لێکرابووە. درۆزنی و ساختەکاریەکی بەمجۆرە ئەنجامدەدرا. بێگومان لەپێناو ڕاستینەی دەسەڵات یاخود ڕێکخستنی هاوبەش ئاماژە بەو ڕاستییە ناکەم؛ هەوڵدەدەم چۆنیەتی گۆڕینی ڕاستی بۆ دیاردەیەکی چەواشەکاری و کوێرکەر ڕوون بکەمەوە. ئەو ڕاستیەش ڕێگا لە پێش داواکردنی دەوڵەت ــ

نەتەوەیەک دەکاتەوە کە بەهەڵە وێناکراوە. کاتێک هەڵەی سەرەکیش بێت ئەوا زیادبوونی ئاڵۆزی و نادیاری ئایدیۆلۆژی و سیاسی ڕێکخستن یاخود PKK جێگای باس دەبێت.

لەدوو لایەنەوە دووچاری ئاڵۆزی یان نادیاری هاتبووین: یەکەمیان؛ بە بنەماگرتنی مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوەی تاک پارتێتی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو؛ دووەمیان بونیادە ئاڵۆز و نابیناکەرەکەی ئاواکردنی دەسەڵات لەژێر ناوی کۆمار کە لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی کوردان بوو. کاتێک لاوازییەکانی ناسنامە ناکاریگەرەکەی کوردیشی هاتەسەر کە لەخۆی نامۆکراوە، ئەوا بەشێوەیەکی باشتر دەرک بە کێشە بونیادییەکانی PKK لە بارەی دەسترۆیی و دەسەڵاتەوە دەکرێت. کاتێک لە ١٩٩٠ کان کێشەکانی دەسترۆیی و دەسەڵات زیادیان کرد، پێویستی گەل بە دەسترۆیی و هێزێک بووە ڕۆژەڤ کە توانای پاراستنی هەبێت، بەڵام وەڵامێکی ڕاست و پێویستی نەدرایەوە، ئیتر کێشەکان دەبوون بە تەنگژە. لەدەرەوەی من کەسێک نەبوو بیر لەو کێشانە بکاتەوە، داخوازی بیرکردنەوەی هەبێت یاخود بەشێوەیەکی گشتی هەوڵی دۆزینەوەی چارەسەرییەک بدات. ئەوەی بەهەمووو هێز و توانایەکمەوە هەوڵم بۆ دەدا بەردەوامکردنی ڕێکخستن، چالاکی و چارەسەرکردنی ئەو کێشانە بوو کە دەیان خولقاندن و گەورەیان دەکردن. ئەو هەڵوێستەش لە ئەنجامدا کێشەکانی گەورەتر دەکرد. ساڵی ١٩٩٥ ئەو قۆناغە بوو کە بۆ یەکەمین جار هەستم بە بێزارییەک کرد. دەمزانی کە بەشێوەیەکی زێدەڕۆیانە هەمان ڕێبازم دووبارە کردۆتەوە. هەر تەنیا هەستم بە پێویستی دەستبەردانی ئەو شێوازە و پێشخستنی شێوازێکی دیکە و دەڤەرێکی دیکە نەدەکرد، بەڵکو بۆ شیکار و پەرەسەندنی زیاتریش پێویستم دەبینی. بەڵام لەبەر هۆکارگەلێکی سیاسی و ڕێکخستنی وازهێنانم لە پێگە ستراتیژیەکەی سوریا ڕاست نەدەبینی. لەو سۆنگەیەوە؛ دەتوانین بڵێین دووچاری جۆرێکی بنبەستبوون هاتبووم. بەڵام ئەو ڕەوشە هەرگیز بەرهەم و ئەنجامەکانی تێکۆشانی کەم نەکردەوە، ڕێگای لەپێش زیانێک نەکردەوە، بەڵکو ڕێگای لەپێش دەسکەوتێکی هەمەلایەنیش دەکردەوە. بەڵام دیسان لە قووڵاییەوە پێویستیم بە گۆڕینی ڕێگاو ڕێباز دەبینی.

ئەو دیالۆگەی لەساڵی ١٩٩٧ ــ ١٩٩٨ بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ (بە ڕێگای عەبدولحەلیم خەددامی جێگری سەرۆک کۆماری سوریا) دەستیپێکرد لەوانەیە ڕێگای لەپێش ڕێبازێکی نوێ کردبایەوە. بۆ جێبەجێکردنی ئەو ڕێبازەش سوریا گۆڕەپانێکی گونجاو بوو. هەر لەبەر ئەو هۆکارەش دەستبەرداری ئەو گۆڕەپانە نەبووین. هەروەها لە ١٩٩٠ کان کامپەکانی پەروەردەمان بۆ سوریا گواستەوە کە بە شێوەی ماڵ و خانووی گەورە کردبوومانەوە. پەیوەندیەکانیشمان لەگەڵ دەسەڵات زیاتر پەرەیسەندبوو. بەکورتی؛ باسکردنی کاریگەرییەکانی ئەو دۆخە نوێیە لەسەر ژیانی خۆم ڕۆشنکەرەوە دەبێت. ژیان لە سوریای حافز ئەسەد پێویستی بە بەهرە و بەرپرسیارێتیەکی گەورە هەبوو. پێگەیەک نەبوو بە ئاسانی بەرگەی بگیرێت. تاوتوێکردنی بوونی ئێمە وەک فاکتەرێکی گەرەنتی سوریا بەرامبەر هەر هەڕەشەیەکی لەلایەنی تورکیاوە بێت بنەمای ئەو

پەیوەندییەی پێکدەهێنا. لەبواری مێژووییشدا نیگەرانیەکانی سوریا بەرامبەر دراوسێیەکەی باکوور جێگای باس بوو. بوونی ئێمە لە هەموو لایەنێکەوە رۆڵی گەرەنتی دەبینی. لەلایەن PKK شەوە سوریا رۆڵی ولاتی کلیلی دەبینی بۆ کرانەوە بە رووی ناوچەکەدا. پێگەی کوردانی سوریاش گرنگی ئێمەی زیاتر دەکرد. ئەگەر بە شێوەیەکی راست هەڵبسەنگێنرێت پەیوەندییەکان گرنگیەکی ستراتیژییان بەدەستدەهێنا. هەروەها کوردان رۆڵێکی گرنگیان لەسەر هاوسەنگییە ناوخۆییەکانی دەسەلات هەبوو. هەروەها یەکێک لە وێستگە مێژووییەکانی کوردە نەفیکراوەکانیش بوو؛ شوێنی دۆستایەتی بەهادار بوو.

باسی خاڵە سەرەکیەکانی ژیانی بیست ساڵەی خۆمم لەو ناوچەیە کرد. لە دوا قۆناغی کار و خەباتم لە سوریا سەبارەت بە کاریگەرییە نزیکەکانی دەسەلات هەستم بە تەنگانە و نارەحەتی دەکرد. ئەو تەنگانە بەهۆی هیچ فشارێکەوە نەبوو. بەڵکو نیگەرانیەکەم بەهۆی کاریگەرییە تێکدەرانەکەی دەسەلات بوو. دیبلۆماسی پشتبەستوو بە دەسەلات لەگەڵ کار و خەباتی شۆڕشگێڕی ناگونجێت. کار و خەباتم لە لوبنان بە جۆرێک لە جۆرەکان کار و خەباتی شاخ بوو. لەوێ ئاسوودەتر بووم. دەرفەتی جموجۆڵ و مەرجەکانی تەندروستیش لەبارتر بوو. لە سوریا مەحکومی ماڵ و ئۆتۆمبێل کرابووین. پەروەردە لەسەر بنەمای شیکارییەکان لەهی لوبنان پاشکەوتووتر نەبوو؛ بەڵکو چڕتر ببوو، چۆنایەتیەکەشی باشتر بوو. سەرقاڵ نەبوونی رووبەڕووی بەردەوام لەگەڵ یەکە یەکەی ئەندامانی پەروەردەم بە کەموکوڕییەک دانا. ئەندامانی هێندە بەهادار لە پەروەردە هەبوون خوازیاربووم تەواوی تەمەنم لەگەڵیان بەسەر بەرم. بەڵام کار و خەبات منی هێندە سەرقاڵ دەکرد، هەربۆیەش بە دڵی خۆم نەمدەتوانی لەگەڵیان پەیوەندیدار بم. بەشی هەرە زۆریان شەهید بوون. خۆشەویستی و بەهایان مەراقێکە و لەدڵم دەرناکەوێت. لەراستیدا هۆکاری ئەو هەڵوێستەم بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بەهۆی بڕوای تەواوم بە شکۆداری تێکۆشانی شۆڕشگێڕییەوە پەیوەندییە شەخسیەکانم خستبووە پیلانی دووەمەوە. هەڵوێست و رەفتاری هاوبەش و دەستەجەمعی لای من وەک نەخۆشیەکی لێهاتبوو. پەیوەندی شەخسیم لە چوارچێوەی پەیوەندی تایبەت هەڵدەسەنگاند و بە بچووکم دادەنا. هەربۆیەش پێشوازینەکردنی تەواو لە تامەزرۆیی ئەو مرۆڤە هێژا و بەهادارانە تا ئێستاش جەرگ و دڵم دەتەزێنێت. وێڕای ئەوەش ئەگەر بە شێوەیەکی سیمبۆلیش بێت لەکاتی هاتنیان و گەڕانەوەیان هەروەها لەکاتی وانەکاندا دیالۆگم لەگەڵ ئەنجامداون. وەک پێویست بە دڵی خۆم سەردانی گەلیشم نەدەکرد. لەبەر ئەو هۆکارەش بە ساردی تەماشای ئەو پەیوەندیانەم دەکرد کە فەرمی بوون و بۆنی دەسەڵاتیان لێدەهات. وەک ئەلتەرناتیڤێکی دوورخستنەوەی من لە گەل دەهاتە بەرچاوم. پیشاننەدانی گەرمی پێویست بەرامبەر ئەو کەسایەتی و گروپە دۆستە جیاوازانەی دەهاتنە لامان وابزانم ئەنجامێکی دەسەلاتداربوون بوو. وەک بڵێی؛ لە نێوان گەل و دەسەڵاتدا هاتووچۆم بوو. لە

قووڵبوونەوەم سەبارەت بە دوالیزمی دەسەڵات و دیموکراسی شتگەلێکی زۆر قەرزباری ئەو پەیوەندییانەم.

ژنانم وەک گروپێک یان پۆلێنێکی جیاوازی گەل شیکار کرد. هەرچەندە هەلومەرجەکان زۆر لەباریش نەبووبن، بەڵام شوێن دۆزینەوە بۆ ژنان بابەتێک بوو کە بەردەوام ڕەچاوم کردووە. دوودڵیم نەکرد لەوەی بەرپرسیارێتی ئەو ماڵانەیان پێ بدەم کە تێیدا دەمانەوە. هەندێک لە ساختەکارەکان چونکە بە شێوەیەکی ڕاست ناسنامەی ژنیان شیکارنەکرد و لە خۆیاندا چارەسەریان نەکردبوو بەشێوەیەکی چەوت ئەو هەڵوێست و کار و خەباتەیان هەڵدەسەنگاند. کاتێک باسی ژنان و کچان کراوە بەردەوام زایەندی قەبە و پەیوەندی هەرزانیان بەبیردا هاتووە. کەچی من لە کار و خەباتی سەبارەت بە ژن زیاتر دەرکم بە ڕاستی و حەقیقەتی کۆمەڵایەتی و مێژوویی دەکرد. لای من ئەوان ناوەڕۆکی کارو خەباتی سۆسیۆلۆژیا بوون. ئەگەر بە شێوەیەکی سنوورداریش بێت شکاندنی سیستەمی پلەداری بونیادنراوی سەر ژنان لە مەیدانی خەباتی خۆمدا لەسەدان پەرتووک زیاتر وانەبەخشتر بوو. ئەو پلاتفۆرمی پەیوەندییانەی لەگەڵ ژنان پێشمدەخست ستاتۆی ژنایەتی - مێردایەتی پیاوسالاری پارچەپارچە دەکرد. لەراستیدا زۆرترین بەختەوەریم لە پارچەکردنی ئەو ستاتۆیە دابوو. چەندە زیاتر روون دەبوویەوە کە ئۆبژەیەکی زایەندی نین، بەڵکو مرۆڤێکی زۆر هێژا و بەهادارن زیاتر سەرفراز دەبووین. ئەو هەڵوێستە ئەو ڕێگایەشی دەکردەوە کە بەرەو خۆشەویستیەکی ڕەسەن دەچێت. دونیاکەی خۆشەویستی و ڕێز کە بەبێ هیچ فشارێک لە ناخی ڕاستینەی کۆمەڵایەتی و مێژووییەوە ئاوامانکردبوو خاوەن هێزێکی بێهاوتا بوو. هەرچەندە هەندێک نموونەیان لەناو دەربکەوێت کە ژنێتی نەفس نزم و ئاڵودەیان دەرباز نەکردووە و هەوڵدەدەن بە درۆ و دەلەسەکانیان لەکەداریان بکەن، بەڵام ژمارەیەکی زۆری ژنی بەهادار و ڕەسەنیش سەریانهەڵداوە. ئەوانیش زۆربەیان شەهید بوون. ئەوانە بە قارەمانە بێ ناوەکان ناو نابەم، بەڵکو بە قارەمانە ڕاستەقینەکان ناویان دەبەم. ئەگەر ژیانێکی کۆمەڵایەتی بێتەئاراوە کە دەرفەتی ژیانی تێدا هەبێت، ئەوا تەنیا لەمیانەی پابەندبوون بە یادەوەرییە نەمرەکانیان و بەردەوامکردنی ئەو ڕێگایە فەراهەم دەبێت کە ڕۆشنیان کردۆتەوە. تەنیا ژیانێکی شکۆمەندانەی بەمجۆرە لەگەڵ ژندا بەهادارە و هێژاترین ژیانە. جۆرەکانی دیکەی ژیان ئەگەر لەناو کۆشکی ڕازاوە و سەر نوێنی لۆکەیی و پەرەمووچکەش بەسەر ببرێت، بەبڕوای من هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەو ژیانە نییە کە لەناو چاڵدا پەلەقاژەیەتی. بەکورتی بەو ئەنجامە گەیشتم: ڕاستی، چاکە و جوانی ئیلاهی ژن بدۆزەوە و لە گەڵیدا بژی! ئەگەر تۆزێکیش بێت پشکی خۆمان لەو ژیانە وەرگرت، هاوبەشێتی ئەو ژیانەمان کرد و تێیدا ژیاین. کاتێک دەڵێم ژیاین، مەبەستم ئاماژەکردن بەو ڕاستیەیە کە فەلسەفەی ژیانی ئازاد تەنیا لەمیانەی ئەو هاوبەشێتی و پشکداریکردنە مانادار دەبێت و پێناسە دەکرێت.

لەو گۆڕەپانە لەگەڵ چەندین هونەرمەندی دۆست ئاشنا بووین. قەرزباری ئەو پەیوەندییە دۆستایەتیانەم لە گەیشتن بە ئاستی ئەو مەعریفەیەی کە هونەر شێوازێکی گوزارشتکردنی راستییە. بێگومان باسی ئاشنابوونم لەگەڵ ئارام تیگران دەکەم کە لەناو ئەو هونەرمەندانە لە ریزی یەکەمدا دێت و بەهایەکی مێژوویی مەزنی هەیە. هونەرەکەی لای من کورد و کوردستانی راستەقینە بوو. لەبیرمە کاتێک هێشتا لە قۆناغی خوێندنی ئامادەیی بووم و بەرێکەوت گوێم لە گۆرانیەکی ئەو بوو، لەخۆمەوە گووتم "مسۆگەر پێویستە ئەو راستینە بژێنرێت کە ئەو دەنگە دەیچرێت". رۆژێک بەر لە دەرکەوتنم لە سوریا بەیەکەوە بووین. هیچ بەخەیاڵمدا نەدەهات جارێکی تر یەکتری نەبینینەوە. هەرگیز خوازیاری جیابوونەوەیەکی بەمجۆرە نەبووم. ئەنجامدانی کۆنسێرت لە دیاربەکر بۆ ئەویش بەختەوەری بوو. ئەو ئێمە، ئێمەش بەدواداچوونمان بۆ ئەو دەکرد، ئەو دەنگە داودیەی قۆناغی سەپاندنی بێدەنگی مەرگ، وەک سوڵتانی دەنگی راستینەی ئازادمان بەردەوام لەگەڵ ئێمەدا دەژیت.

## ب) پیلانگێڕییە گەورەکەی گلادیۆ

### ١. دەرکەوتن لە سوریا

دەرکەوتنم لە سوریا گرێدراوی ئۆپەراسیۆنی ناتۆ ـ گلادیۆیە. ئەگەر جیاوازی ناو سوپای تورک و گلادیۆ رەچاو نەکەین، ناتوانین بەشێوەیەکی راست ئەو ئۆپەراسیۆنە شیکار بکەین. وەک مەزەندە دەکرێت لە سەردەمی سوپاسالاری ئیسماعیل حەقی قەرەدای و حوسێن کڤرک ئۆغڵو بەسەر هەموو شتێکدا زاڵ نەبوون. سەبارەت بە کێشەی کورد هەردووکیان نزیکی هەڵوێستەکەی ئەشرەف بتلیسی بوون. ئاراستەگرتنی شەڕیان بەرەو لەناوبردنی تەواوی کوردان بە نابەجێ و ئەستەم دادەنا. رێگەچارەی سیاسی و ئاشتیانەی تورگۆت ئۆزال و ئەشرەف بتلیسی نیازی دەستپێکردنیان هەبوو؛ هەم وەک پێویستییەکی نیشتیمانپەروەرییان دەبینی هەمیش بە گوێرەی چەمکی شەڕی کلاسیکی گونجاویان دەبینی. ساقب ساپانجیش لەناو توسیاد[1] نوێنەرایەتی لایەنگرانی ئەو هێڵەی دەکرد. هەڵوێستی سەرۆکی بەشی کۆنترگەریلای میت محەمەد ئەیمور و حەنەفی ئاوجی تەشکیلاتی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش لەسەر هەمان رێباز بوون. ئەو گروپە رووداوی سوسورلوکیان قۆستەوە و هەڵمەتێکیان لە بەرامبەر لۆبی شەڕ ئەنجامدا. لە بنەڕەتدا دۆغان گورەش و چەڤیک بیر نوێنەرایەتی گروپی بەرامبەر یاخود باڵی گلادیۆیان دەکرد. ئەو گروپە هەوڵەکانی تیرۆرکردنی ساقب ساپانجی و حوسێن کڤرک ئۆغلویان ئاراستە

---

[1] کۆمەڵەی پیشەسازکار و کارسازانی تورک (Türk Sanayicileri ve İşadamları Derneği): کارسازە وەبەرهێنەرەکانی تورکیا لە ساڵی ١٩٧١ دایانمەزراند و ناوەندەکەی لە ئەستەنبوڵە. (وەرگێڕ)

کردبوو. هەروەها ئەندامەکانی پێشووتری هەمان گروپ و پاشکۆکانیان پێشتر چەندین هەوڵ و تاوانی تیرۆریان ئەنجامدا کە ئامانجیان هەندێک کەسی ناو دەوڵەت بوو لە سەرووی هەمووشیانەوە تورگوت ئۆزال و ئەشرەف بتلیس. بەپێی میکانیزمەکانی ناو سوپا نۆرەی سوپاسالاری ساڵی ١٩٩٠ هی محی الدین فیسۆن ئۆغلو بوو. کاتێک بەشێوەیەکی یاسابەدەر دۆغان گورەش ئەرکی سوپاسالاری پێ سپێردرا، درزی نێوانیان گەورەبوو. گروپەکەی تر لە ڕێگای دوو سەربازی هەواداری PKK لەناو سوپا هەوڵی ژەهرخواردکردنی دۆغان گۆرەشیان دا. ئەو هەوڵە سەرکەوتوو نەبوو. لە ئیمرالی کاتێک دۆزگەری سەربازی تایبەت لەو بارەوە لێی پرسیم؛ کێ ئەو بڕیارەی دابوو؟ پێم گوتن ئەو دوو سەربازە لایەنگری PKK بوون و دوای ڕووداوەکەش رایان کرد و پەیوەندییان بە ریزەکانی PKKوە کرد و دواتریش شەهید بوون، بە بڕوای من بڕیاری سەرەکی لەناو سوپاوە درابوو. بەمجۆرەش لێپرسینەوەی ئەو بابەتە کۆتایی پێهات.

ئەو چەشنە ناکۆکیانەی ناو سوپا بۆ سەرەتاکانی سەدەی بیستەم بگرە بۆ پێشووتریش دەگەڕێتەوە. لەسەرجەم ڕووداوەکانی لەسەرکار لابردنی سوڵتان عەبدولحەمید (سوڵتان عبدولعزیزیش) و هەوڵی تیرۆرکردنی مستەفا کەمال، تا دەگاتە کردەوەکانی کۆمەڵکوژی کوردان کە لە ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ بە پیلانگێڕییەکەی دژ بە شێخ سەعید دەستیپێکرد و بە پیلانگێڕی دژ بە سەید ڕەزا و لەسێدارەدانی لە ١٨/ ١١/ ١٩٣٧ بەردەوام بوو، لە داخستنی فیرقەی سەربەست (١٩٣٠) و لەسەرکار لابردنی ئینۆنۆ لە سەرۆک وەزیری (١٩٣٧)، کودەتای سەربازی ٢٧ی ئایاری ١٩٦٠، تا کودەتای پۆست مۆدێرنی ٢٨ شوباتی ١٩٩٧ و ئەو قۆناغە سەد ساڵییەی تا ئامادەکارییەکانی دوای ٢٠٠٠ بۆ ئەنجامدانی کودەتا و ڕووداوە هاوشێوەکانیان ناکۆکی و ململانێی نێوان هەمان ڕێباز جێگای باسە. سەرەتا ئەڵمانیا، دواتریش بەڕیزە ئینگلتەرا و ئەمریکا وەک هێزە هەژموونگەراکان لە دەرەوە پشتگیری و کۆنترۆڵی ئەو ململانێیەیان دەکرد. سەرجەم ئەو ڕووداوانەی پیلانگێڕی و تیرۆر لە ناوەڕۆکدا هەریەکە و ڕەنگدانەوەی ئەو شەڕانەی هەژموونگەرایی بوو کە لەسەر گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بەتایبەتیش لە دژی گەلانی میزۆپۆتامیا و ئەنادۆڵ بەڕێوە دەبران. لەوانەش چوار قۆناغی گرنگی شەڕی گلادیۆ بووە بەشی بەرخودانی کورد کە PKK پێشەنگایەتی دەکات و لە بەشەکانی پێشووتر بە شێوەی گەڵاڵەیەک پێشکەشم کرد. شەڕی هەژموونگەرایی هێزە سەرمایەدارییەکان لەژێر پۆشاکی فاشیزمی تورکی سپی بەڕێوە چوو. لەسەردەمی مستەفا کەمالەوە بەردەوام توێژێک لەناو سوپا هەبووە کە لەو دۆخە نارەحەت بووە. ئەوانە نیشتیمانپەروەر و ئەنادۆڵخواز بوون. لە کودەتای ٢٧ ئایاری ١٩٦٠ وە تا ئامادەکاریەکانی کودەتاکانی دوای ساڵی٢٠٠٠ ئەو توێژەی دەتوانین بە نیشتیمانپەروەر و لایەنگرانی ئاشتی ناویان ببەین ڕەوشیان لە کودەتاچی و پیلانگێڕەکان جیاوازتر بوو. لەبنەڕەتدا ناتۆ ـ گلادیۆ لەپشت کودەتاچی و پیلانگێڕەکانەوە بوو. هەروەها هەردوو لایەنیش ناوەند و پاشکۆی بەهێزیان لەناو کۆمەڵی مەدەنی هەبوو. ئەوانە بەردەوام لەناو پەیوەندی و ناکۆکیدان. بەگوێرەی

سەردەمەکان بەسەر یەکتریدا زاڵ دەبن. لەبواری چینایەتیشدا نوێنەرایەتی بۆرژوازی میللی و بەکرێگیراو دەکەن.

بەر لە دەرکەوتنم لە سوریا جارێکی تر کێبڕکێ لەنێوان ئەو دوو گروپە یان باڵە سەریهەڵدابوویەوە. بەپشتگیری ئیسرائیل و ئەمریکا کێبڕکێی نێوان لایەنگرانی دیالۆگ و دژبەرەکانیان لە بەرژەوەندی باڵی ناتۆ ـ گلادیۆ واتە لایەنگرانی شەڕ و قڕکردن ئەنجامگیر بوو. ماوەیەکی زۆر کەم بەر لە دەرکەوتن لەرێگایەکی ناڕاستەوخۆوە هەواڵگری ئیسرائیل پەیامی پێویستی بە جێهێشتنی سوریای پێگەیاندم. جێهێشتنیم گونجاو نەبینیبوو. نەمدەویست پێگەکەمان لە سوریا زەبری گەورەی بەربکەوێت. هەروەها لەبواری ستراتیژی و ئایدیۆلۆژیشەوە بەراستم نەدەزانی. شەڕ لەسەر ڕێچکەی ئاسایی خۆی بەردەوام دەبوو، چارەنووس چییە ئەوە روویدەدا. لەسەر هێڵی قەدەرگەرایی نەبووم، بەڵام دەستبەردان لەرێبازی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازی سی ساڵە و ناراستەگۆڕینیش نەدەبوو بە هەڵوێستێکی مانادار؛ بەرامبەر ئەو قەدەرە پێویستی بەراستگۆیی و دڵسۆزی هەبوو، هەربۆیەش نەدەبوو خۆرزگارکردن بەبنەمابگرم. پاش دواترین ئاگاداریەکەی ئەتیلا ئاتێش کە بە ناوی گلادیۆی ناتۆوە رایگەیاند، تەنیا لە حاڵەتی پشتگیرییەکی بەهێزی سوریا و رووسیا دەمانتوانی شەڕ بۆ ئاستێکی بڵندتر بەرز بکەینەوە. بەڵام وەک چۆن ئەو پشتگیرییە دەستەبەر نەبوو، هەردوو دەوڵەتیش ئەو هێزە یاخود نیازەیان نەبوو شەخسی من هەڵگرن. لەراستیدا شتێکی وەها بۆ سوریا مەحاڵ بوو، چونکە لە باکوورەوە سوپای تورکیا، لە باشوورەوە سوپای ئیسرائیل لە رۆژێکدا دەیانتوانی سوریا داگیر بکەن. کەوتبوونە ناو ترسێکی گەورەوە، دەیانتوانی دەرفەتێکی گونجاوی جێگیربوونم بۆ بڕەخسێنن. ئەوەشیان رەچاو نەکرد. هەڵوێستی رووسیا زۆر بێشەرمانەتر بوو. لە بەرامبەر پرۆژەی گازی سروشتی و قەرزێکی دەملیاری سەندوقی نێودەوڵەتی دراو ئێمەی لە مۆسکۆ بەدەرنا.

بەر لە باسکردنی سەرکێشییەکەی ئەسینا و مۆسکۆ لە نزیکەوە بینینی هەلومەرجەکانی بەر لە دەرکەوتن و کاتی دەرکەوتن وانەبەخشە و گرنگیەکی مەزنی هەیە.

ئەگەر بەشێوەیەکی راست دەرک بە هەلومەرجەکانی کودەتای ٢٨ی شوبات نەکرێت ئەوا بە تەواوی لە رووداوەکان تێناگەین. باڵێکی کودەتاچیەکان لەمیانەی پێشنیازێکی واقیعی ئاشتیەوە لێمان نزیک ببوویەوە. لەو بڕوایەدام بەڵگەکانی لە ئەرشیفماندا ماوە. هەروەک هەڵوێستەکانی تورگۆت ئۆزال و نەجمەددین ئەربەقان لەو بڕوایە دابووین کە جددین و خوازیاری ئاشتین. ئەو هەڵوێستەی لایەنگری ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی لەناو کودەتا رێگایان لەپێش کودەتا کردبوویەوە. ئێستا بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەرکەوتووە کە لەو قۆناغەدا واتە تا دەستگیرکردنم ئیسرائیل و ئەمریکا بەهیچ جۆرێک لایەنگری ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی نەبوون. بە سووربوونەوە خوازیاری بەردەوامکردنی شەڕی خەستی ئاست نزم و چارەسەرنەبوونی کێشەی کورد بوون. لەپێناو کۆنترۆڵکردنی خۆرهەڵاتی ناوین، بەتایبەتیش بۆ رووخانی ئێراق پێویستیەکی زۆریان

بەو دۆخە هەبوو. تەنیا لەو رێگایەوە دەیانتوانی کاریگەری تورکیا نەهێڵن و پیلانەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن. بەهۆی رەچاونەکردنی ئەو پیلانانە و هەڵوێستی ئەنادۆڵخوازی، میللی و لایەنگریان بۆ ئاشتی و رێگەچارەی سیاسی کێشەی کورد تورگۆت ئۆزال، نەجمەدین ئەربەقان و بڵند ئەجەوید لەسەر کار لابرابوون. تا دوایی درێژەیان بە شەڕ دا، هەر کۆسپێکی پێش خۆیان بەلاوە دەنا و دەیانویست بە ئامانجەکانیان بگەن. لەناوبردنی راستینەی کوردان لەرێگای سەربازیەوە، واتە جۆرێک لە ژینۆسایدیش دەکەوتە چوارچێوەی ئەو ئامانجەیانەوە. ئەگەر هێزە هەژموونگەراکان پاڵپشتی ئەو چەمکە نەکەن کە بەردەوامی رێبازی کلاسیکی ئیتحاد و تەرەقییە هەرگیز چانسی سەرکەوتنیان نەدەبوو. چونکە ئەوانیش ئاگاداری ئەو رەوشە بوون، مسۆگەر پێویستیان بە پشتگیری ئەمریکا، ئینگلتەرا و ئیسرائیل دەبینی. لەساڵی ١٩٩٨ کاتی دەرکەوتنم لە سوریا ئەو پشتگیریەیان بەدەستهێنا بوو.

لە سەرەتای ١٩٩٠ کان پشتگیری ئەمریکا و ئینگلتەرا، لە ١٩٩٦ (پەیمانی هاوکاری ستراتیژی سەربازی نێوان تورکیا و ئیسرائیل) پشتگیری رەهای ئیسرائیل بەدەستهاتبوو. ئیتر نۆرەی چارەسەرکردنی لایەنی ناوخۆیی مەسەلەکە بوو، واتە ئەنجامدانی گۆڕانکارییە پێویستەکانی حکومەت و تەسفیەکاریەکانی ناو خودی سوپابوو. لەساڵی ١٩٩٠ بەدواوە هەنگاو بە هەنگاو پێویستیەکانی جێبەجێ دەکران. دوای وەرگرتنی ئەرکی سوپاسالاری و ئەنجامدانی یەکەمین گەشتی بۆ بریتانیا کاتێک دوای گەڕانەوە دۆغان گورەش گووتی: "بۆ لەناوبردنی PKK لامپی سەوزیان بۆ داگیرساندووین" ئەو راستییە روون دەکاتەوە. زۆر باش ئاگادارین کە قۆناغی دواتر تەنیا بە هێرشەکانی لەناوبردنی کوردان و PKK سنووردار نەبوون، بەڵکو لە کوشتنی سەرۆک کۆمارەوە، گۆڕینی حکومەت، تەسفیەکاری ناو سوپا، بزاوت و کردەوە ساختەکاریەکانی دژ بە کۆمەڵگا، تیرۆرکردنی چەندین رۆشنبیر و کارساز، کۆمەڵکوژی خەڵک و دەستەمۆکردنی میدیا، رووداو و شەڕی مەترسیدار هاتنەئاراوە. ئەوەی کەم بوو تێگەیشتنی پەیوەندی زنجیرە ئاسای نێوان ئەو رووداوانە بوو. ئەگەر لەو کاتەی بووە بە ئەندامی ناتۆ تا ١٩٩٨ رێبازە ئەستوورەکەی گلادیۆی ناتۆی ژێر سەرجەم رووداوە کۆمەلایەتی و سیاسییە گرنگەکانی تورکیا نەبینین ئەوا ناتوانین هیچ تیرۆر، شەڕ و رووداوێکی گرنگ بەشێوەیەکی راست شیکار بکەین. لەناوەڕۆکدا شەڕێکی ناتۆ دژی داواکاری ئازادی، یەکسانی و ئازادیخوازی گەلان راگەیەنرابوو، دەرکەوتنم لە سوریاش خرابوویە سەر دوا ئەڵقەی ئەو شەڕەوە.

لەکاتی دەرکەوتن دوو رێگام لەپێش بوو: یەکەمیان شاخ، دووەمیشیان ئەورووپا بوو. هەڵبژاردنی رێگای شاخ مانای دژواربوونی شەڕ بوو، هەڵبژاردنی رێگای ئەورووپاش مانای بژاری چانسی رێگەچارەی سیاسی ــ دیبلۆماسی بوو. وەک دەزانرێت پێشووتر ئامادەکارییەکانی رێگای شاخ تەواو ببوو. ئەگەری بەهێز گرتنەبەری رێگای شاخ بوو. بەڵام لەوکاتەدا سەردانی شاندێکی یۆنانی بۆ لامان و دیدارە تەلەفۆنییە بەردەوامەکانی نوێنەری یۆنانمان ئایفەر قایا لەگەڵ کاربەدەستانی یۆنانی، ئاراستەمانی بەرەو یۆنان

گۆڕی. کێشەی کاربەدەستانی سوریا ئەوەبوو بەخێرایی سوریا بەجێبێڵم. بەڵام سەبارەت بە چوونم بۆ ئەوروپا نارەحەتییان پێوە دیاربوو. لەو لایەنەوە دابین نەکردن یان پێشنیازنەکردنی ئەڵتەرناتیڤێک کەموکوڕییەکی جددی خۆیان بوو. لەراستیدا چوون بەرەو ئەسینا لە حیسابدا نەبوو. دەرفەتێک بوو، بڕوام بە جددیەتی دۆستەکانی یۆنان کرد و نەمویست ئەو دەرفەتەمان لەدەست بچێت. ئەگەر بمزانیبووایە وەک ئەو تابلۆیەن کە دواتر ڕووبەڕووی بوومەوە، بەدڵنیاییەوە بۆ دەرەوە نەدەچووم. لێرەدا پێویستە بپرسین: وەک دەزانرێت بەشی گلادیۆ کە لە یۆنانیش زۆر بەهێزە، ئایا ڕۆڵی لە ئامادەکردنی ئەو سیناریۆیەی چوونە دەرەوەدا بینی؟ ناتوانم وەڵامێکی مسۆگەری ئەو پرسیارە بدەمەوە. پێویستە لێکۆڵینەوە لەو بارەوە بکرێت. بەلانی کەم ئەگەری ئەوە هەیە کە لە چوارچێوەی ئەو رێککەوتنەی نێوان ئەمریکا و تورکیا لەبارەی رادەستکردنەوەی من هاتۆتەئاراوە رێککەوتنێکی پرسیپانە یاخود زارەکی سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەکان لەگەڵ یۆنان جێگای باس بووبێت. شیمانەیەکی بەهێزە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەکانی قوبرس و ئیجە نیازێکی بەمجۆرەیان پیشان دابێت. مسۆگەر پێویستە هەڵوێستە سازشکارانەکەی تورکیا سەبارەت بەو بابەتە رەچاو بکرێت.

کاربەدەستەکانی سوریا کاتێک لە ١٩٩٨/١٠/٩ پسپۆڕانە ئاراستەی فڕۆکەیان بەرەو ئەسینا گۆڕی و منیان هێنایە خوارەوە ئیتر ئاسوودە ببوون. کە لە ئەسینا دابەزیم کالاندریس لە بەرامبەرم بوو. کالاندریس ئەفسەرێکی ناتۆ بوو و ماوەیەکی درێژ لە تورکیا ئەرکدار ببوو. هەمان ئەرکی لە سوێدیش بەڕێوە بردبوو. ئەگەری هەیە ئەندامێکی گلادیۆی یۆنان بووبێت. خۆی وەک دۆستێک پیشاندەدا. تەتەرێکی سەیریش لە نێوانماندا هەبوو. هەندێک لە بەڵگەکانی ناتۆی بۆ رەوانە کردبووم. لەوانەیە بە ئامانجی بەدەستهێنانی باوەڕی ئەو هەڵوێست و رەفتارەی پیشاندابێت. لەهەمان فڕۆکەخانەدا منی بۆ لای ژەنراڵێکی هێزی ئاسمانی و ستافراکاکیسی سەرۆکی هەواڵگری برد کە لە ژوورێک چاوەڕوانیان دەکردین. ستافراکاکیس بە هەڵوێستێکی لێبڕاوانە پێی گوتم؛ "بەشێوەیەکی کاتیش بێت ناتوانی بێیتە یۆنان". ئەو دۆستانەش لە ئارادانەبوون کە بەڵێنیان پێدابووین. تا ئێوارە مشتومڕمان کرد. بەرێکەوت نوێنەرمان لە مۆسکۆ نومان ئوچار تەلەفۆنی کرد. بە فڕۆکەیەکی تایبەتی یۆنانی رۆومان لە مۆسکۆ کرد. بە یارمەتی جیرنۆفسکی سەرۆکی پارتی لیبرال دیموکراتی رووسیا لە مۆسکۆ دابەزین کە ئەو کاتە بەدەست کائیۆسێکی ئابوورییەوە دەیناڵاند. بەڵام ئەوجارە سەرۆکی هەواڵگری ناوخۆی رووسیا رووبەڕوومان بوویەوە. ئەویش هەمان هەڵوێستی ستافراکاکیسی هەبوو. لەو هەلومەرجانەدا مانەوە لە رووسیا زەحمەت بوو. نزیکەی سی و سێ رۆژ بە قسەی ئەوان بەنهێنی لەوێ مامەوە. ئەوانەی لایان مامەوە و لەگەڵم سەرقاڵ بوون سیاسەتمەداری بە بنەچە یەهودی بوون. لەو بڕوایە دابووم کە راستگۆن. بەراستیش دەیانەویست بمشارنەوە. بەڵام ئەو شێوازەم راست نەدەبینی. لەو ماوەیەدا هەم سەرۆک وەزیرانی ئیسرائیل شارۆن هەمیش وەزیری دەرەوەی ئەمریکا ئۆڵبرایت سەردانی رووسیایان کرد.

بریماکۆڤ سەرۆک وەزیرانی رووسیا بوو. هەمووشیان بە بنەچە یەهودی بوون. هەروەها سەرۆک وەزیرانی ئەو کاتەی تورکیا مەسعود یلمازیش لەناو جموجۆڵ دابوو. لە کۆتاییدا لەسەر پرۆژەی گازی سروشتی و قەرزە دەملیار دۆلاریەکەی سندوقی نێودەوڵەتی دراو رێککەوتن و بریاری دەرکەوتنی منیان وەرگرت.

بەهۆی ئەو باوەڕییەم کە "هەرچۆنێک بێت بە ئەزموونێکی حەفتا ساڵەی سۆسیالیزم تێپەڕیون، ئەگەر بەهۆی بەرژەوەندییەکانیانەوە بێت یان پێویستیەکی هەڵوێستی ئەنتەرناسیونالیستی بەدڵنیاییەوە بە ئاسانی پەسەندم دەکەن" یەکسەر مۆسکۆم هەڵبژارد. وێڕای هەرسهێنانی سیستەم بەڵام بەو رادەیە چاوەڕوانی کەوتنی ئاستی مۆراڵ و ئەخلاقییانم نەدەکرد. رووبەڕووی وێرانەیەکی سەرمایەداری بیروکراتی بووین کە زۆر لە سەرمایەداری لیبراڵ خراپترە. بەلانی کەم هێندەی هەڵوێستی دۆستەکانی ئەسینامان بەرامبەر هەڵوێستی دۆستانمان لە مۆسکۆش دووچاری هیواشکاندن هاتین. بەمانایەکی تر ئاشکرابوو کە ئەو پەیوەندییە دۆستایەتیانە جێگای باوەڕی و متمانە نین.

سێیەمین وێستگەمان دیسان بەرێکەوت لەسەر بنەمای سوودبینین بوو لە پەیوەندییەکانی رۆما. بەیارمەتی دوو ئەندام پەرلەمانتەری پارتی کۆمۆنیست ـــ سەرلەنوێ ئاواکردنەوە کە تازە پەیوەندیمان لەگەڵ بەستبوون سەرکێشی رۆمامان دەستپێکرد. ئەوجارە بە سیناریۆکەی هەواڵگری ئیتاڵیا رۆژانی رۆما دەستپێکرد کە شەست و شەش رۆژ بەردەوام بوو و بەشێکی لە نەخۆشخانە بەسەر چوو. هەڵوێستی سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی ئیتاڵیا راستگۆیانە بوو، بەڵام لە هەمانکاتدا ناتەواو بوو. گەرەنتی سیاسی تەواوی پێ نەبەخشین. دۆخی ئێمەی بۆ دادوەری بەجێدەهێشت. بەرامبەر ئەو رەوشە تووڕە و نارەحەت بووم. بۆیە بریارم دابوو لەیەکەم دەرفەتدا ئیتاڵیا جێبهێڵم. ماسیمۆ داڵێما لە دوا لێدوانیدا گووتبووی چەندەی بمەوێت دەتوانم لەئیتاڵیا بمێنمەوە. بەڵام من ئەوەم وەک هەڵوێستێکی ناچاری بینی. ئەگەر بە هەڵەدانەچووبم لەو ماوەیەدا دەستپێشخەرییەکی هاوبەشی عەرەبی جێگای باس بوو. باسی چوون بەرەو شوێنێکیان دەکرد کە ناوەکەیان ئاشکرا نەکرد. بەهۆی نەبوونی زامن و فەرمی نەبوونی پەسەندم نەکرد.

دووەمین جار چوونم بۆ رووسیا هەڵە بوو. بەڵام رۆڵی هەڵوێستە خاو و سواوەکەی نومان ئوچار لەو هەڵەیەدا هەبوو. باوەڕم بە هەڵوێستە سواوەکەی ئەو کەسە کرد کە تا ئێستاش لە ناوەڕۆکەکەی تێنگەیشتووم و کەوتمە رێ. ناوەڕۆکەکەیم زانیبووایە هەرگیز لە رۆما دەرنەدەکەوتم. دەستخەرۆیان کردبووم. کاتێک بە فرۆکە تایبەتەکەی ماسیمۆ داڵێما لە گۆڕەپان و سنووری ناتۆ دەرکەوتم ئۆخەیەکم کرد. بەڵام ئەو دەرکەوتنە وەک ئەوە وابوو کاتێک هەوڵمان دەدا لە باران رزگارمان بێت کەوتینە ژێر تەرزەوە. ئەوجارە دوای رازیکردنم لەلایەن هەواڵگری ناوخۆی رووسیا کە بەرەو ئەرمەنستان دەڕۆین منیان بردە فرۆکەخانە. لەو بڕوایەدام وەک پێویستیەکی سیناریۆی ئامادەکراو دەستبەرداری

مەسەلەی ئەرمەنستان بوون، بۆیە پێیان گوتم؛ بۆ هەفتەیەک دەتوانیت بچیتە تاجیکستان تا لەناو ئەو هەفتەیەدا شوێنێکی ئەلتەرناتیف ئامادە دەکەین. بەجۆرێک لەجۆرەکان منیان هەڵخەڵەتاند و بە فڕۆکەیەکی بارهەڵگر لە دۆشنبەی پایتەختی تاجیکستان دایانبەزاندم. بەبێ دەرکەوتن یەک هەفتەی تەواو لە ژوورێکدا چاوەڕوانیمان کرد. دووبارە گەڕاینەوە مۆسکۆ، بەناچاری دووبارە پەیوەندیمان بە دۆستە یۆنانیەکانەوە کرد. لەناو دوو رۆژدا دوای رۆژێکی سەرکێشانە، سارد و سڕ و بەفراوی مۆسکۆ دووبارە روومان لە ئەسینا کرد.

هێندەی لە بیرمە ئەو جارە بە ئەسپایی بە خۆمم گوت کە کەوتوومەتە داوی یاری خوداوەندەکانی ئۆلۆمپۆسەوە. تەواو لەنێو تارمایی ئەو خوداوەندانەدا بووم. بەتایبەتیش خوداوەند حەدەسم بەبیرداهات. لە هۆڵیVIPی فڕۆکەخانە چووینە ژوورەوە و دەست پێکردنی چاودێرییە بێئامانەکەی خوداوەندی دۆزەخ حەدەس بەیەکەوە بوون. شەوێک لە ماڵە پەرشوبڵاوەکەی خەسووی ناکازاکیسی دۆستم خەوتم کە بە ژنە جادووگەرەکانی چاخی کۆن دەچوو. لێم پرسیبوو "پانگالۆس چیدەکات" کاتێک گوتی:"لە هەڵبژاردنەکان بەکاری دێنێت"ئاشکرا دەبوو کە چەندە لە راستیەکانی سەردەم دابڕاوە. تۆزێکیش راستینە کۆن و رەسەنەکەی گەلی یۆنانی دەهێنایەوە بیری مرۆڤ کە زۆر بێهێز کراوە. دوای ئەو شەوە بە جۆرێک لە جۆرەکان هەنگاونان بەرەو سەربازگەی مەرگ دەستیپێکرد. حەدەس بە تەواوی دەست بەکار بوو. هەر قسەیەکی دەکرا، هەرکارێکی ئەنجامدەدرا ساختە و درۆ بوو. ئایا کەسی راستگۆ نەبوو؟ هەبوو، بەڵام هەموویان بەرامبەر جانەوەرەکەی مۆدێرنیتە بێچارە بوون. لەهەنگاونان بەرەو ئەفریقیا ئەوجارە فاکتەری ماندێلا خاوەن کاریگەری بوو؛ وەک چۆن فاکتەری لینین لە هەنگاونانمان بەرەو مۆسکۆ خاوەن کاریگەری بوو. گوایە دەچووینە باشووری ئەفریقیا، هەم پەیوەندی دیبلۆماسی تەندروستانەمان پێشدەخست، هەمیش پاسپۆرتی فەرمیم وەردەگرت. ساختەکاری یۆنان لەو تەڵەکەبازیەشدا سەرکەوتوو بوو. دەبووایە هەڵوێستم بەگوێرەی ئەو راستیە بووایە کە دیموکراسی گەلی یۆنان بەدرێژایی مێژوو لەلایەن ئەو ساختەکارە فریو دراوە و دووچاری تراژیدیای مەزن کراوە. باوەڕی بێگەردی منداڵانە بە دۆستایەتی کاریگەری لەسەر ئەو هەڵوێستەم هەبوو. لەکاتی دەرکەوتن لە یۆنان و چوونمان بۆ هەردوو فڕۆکەخانەکە شوفێری ئەو ئۆتۆمبێلانەی منیان هەڵگرتبوو بە ئەنقەست شتێکیان دەکرد تا هەست بە دۆخەکە بکەم و لە چوون پاشگەز ببمەوە. بەو ئامانجەی لە پیلانگێڕییەکی گەورە ئاگادارمان بکەنەوە راستگۆ بوون و هەرچیەکیان بۆ کرا ئەنجامیاندا. ئەگەری هەیە ئەوانیش ئەندامی پلە نزمی هەواڵگری بووبن. یەکەمیان ئۆتۆمبێلی بە فڕۆکە داکێشا و چوونمانی بەربەست کرد. هی دووەمیشیان سەرباری نهێنی چوونەکەمان بۆ فڕۆکەخانە بەڵام بە بیانووی خراپبوونی ئۆتۆمبێل حەوت جار چەندین دەقیقەیەک نزیک بە فڕۆکەخانەکە وەستا. هێندە بڕوامان بە بەڵێنەکانیان هەبوو ئەو دۆخەمان نەبینی. بە پێچەوانەوە پەلەمان دەکرد تا زووتر بزانین چی لە چارەنووسماندا هەیە. ئەو فڕۆکەی

سواری ببووین یەکێک لەو فڕۆکانە بوو کە گلادیۆ لە ئۆپەراسیۆنە نهێنیەکان بەکاری دەهێنان.

هەروەها بەر لەوە گەشتێکمان بۆ مینسک[٢] ئەنجامدا. بەر لە چوون بۆ نایرۆبی گوایە لە ڕێگای مینسکەوە دەچووینە هۆڵەندا. دیسان بە فڕۆکەیەکی تایبەت لە مینسک دابەزین و دوو کاتژمێر زیاتر لەژێر ئەو سەرما و سۆڵە بێ وێنەیە چاوەڕوانیمان کرد، فڕۆکە چاوەڕوانکراوەکە نەهات. پۆلیسەکانی فڕۆکەخانەی بیلارووسیا بۆ چەندین دەقیقە فڕۆکەکەمانیان پشکنی. وەک ئەگەرێک و دوا دەرفەت لەوانەیە منیان لە فڕۆکەخانەی مینسک جێهێشتبووایە. ئەویتریش بۆ ویژدانی بەڕێوەبەرایەتی بیلارووسیا مابوویەوە. ئەوەی سەیرە لە هەمانکاتدا عیسمەت سەزگینی وەزیری بەرگری میللی تورکیا بە سەردانێک لە مینسک بوو. کە فڕۆکەی چاوەڕوانکراو نەهات، گوایە دەرفەتی دوایش لەدەست چووبوو. گەڕانەوە بۆ دواوەش جۆرێک لە "مردنی سپی" بوو. لە شرۆڤەکانی دواترم لاربوونەوەی فڕۆکەکەی گلادیۆ بەسەر دەریای سپیم بە کاروانی ئەو شەمەندەفەرانە چواند کە لە کۆمەڵکوژی یەهودییەکان بەکاردەهێنران. هەستیارترین و مەترسیدارترین قۆناغی ڕژێمی کۆمەڵکوژی جێگای باس بوو کە لە کەسایەتی من دژ بە گەلێک پەیڕەو دەکرا. لەو گەشتانەدا ڕووی نهێنی و ڕاستەقینەی ناتۆم بۆ ڕوون بوویەوە. کاتێک لە مینسک گەڕاینەوە، بەو ئامانجەی فڕۆکەکەمان لەهیچ یەکێک لە فڕۆکەخانەکانی ئەوروپا نەنیشێتەوە بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێر ڕەوشی نائاسایی ڕاگەیەنرابوو. وەک ڕوون دەبێتەوە جگە لە فڕۆکەخانەی مینسک لە بیلارووسیای یاخی هیچ فڕۆکەخانەیەکی دیکە نیشتنەوەمانی پەسەند نەدەکرد. لە دۆزەخەکەی نایرۆبی سێ ڕێگایان لەپێش دانابووم: یەکەمیان؛ لەژێر بیانووی سەرپێچی فەرمانی بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، مردنێک بوو کە شێوەی پێکدادانی پێدەدرێت، دووەمیان؛ بەبێ ئەوەی قسەیەکی CIA بکەم بە دوو، فەرمانەکانیان پەسەند بکەم و بە تەواوی ڕادەستیان بم، سێیەمیان؛ قۆڵبەستکردنم و ڕادەستکردنم بە تیمەکانی هێزی تایبەتی تورک کە لە مێژ بوو ئامادە کرابوون.

کاتێک لە نایرۆبی بووین یەکێک لەو کەسانەی لەگەڵمدا بوو دیلان لە حاڵەتێکی ڕۆحی زۆر نائارام دابوو. ئەگەر بە تەواوی بۆچوونەکانی خۆی ڕوون کردبایەوە و توانای خستنەگەڕی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی هەبووایە، لەوانەیە پیلانگێڕییەکە تاڕادەیەک بەربەستکرابایە یاخود مایەپووچ کرابووایە. کاتێک پێشنیازی کرد بە دەمانچەیەک خۆمان بپارێزین، لام سەیربوو و پەسەندم نەکرد. ئەوە مانای خۆکوژی من و هەموومان بوو. نیازی خۆکوشتنم نەبوو. تادوا ساتیش لێم پاڕایەوە دەمانچەکەی لێوەربگرم. ئەگەر دەمانچەکەم لابووایە و هەوڵی ڕاکێشانم دابووایە، مسۆگەر ئەو هەڵوێستە مانای مردن بوو. دواتر لەکاتی لێپرسینەوە پێیان ڕاگەیاندم کە؛ لە حاڵەتی بەکارهێنانی چەک

[٢] پایتەختی رووسیای سپییە. بارەگای یەکێتی دەوڵەتە سەربەخۆکانی لێیە. (وەرگێڕ)

فەرمانی کوشتن هەبووە. هەروەها پێیان گوتم؛ دەرکەوتنت لە کۆنسوڵگەریش مانای مردن بوو، ئاقڵمەندانەترین هەڵوێستت پیشانداوە. نازانین تا چ رادەیەک راستی دەڵێن. تێگەیشتنی هەڵوێستی باڵوێز کۆستالس لەو پازدە رۆژەی نایرۆبی گرنگ و بایەخدارە. ئایا بەکاریان هێنابوو؟ یاخود زۆر پێشووتر وەک بەشێکی پیلانەکە ئامادەکرابوو؟ نەمتوانی ئەوە شیکار و یەکلایی بکەمەوە. بەر لە رادەستکردنەوەم بە هیچ جۆرێک سەردانی ئەو ماڵەی نەکرد کە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆی بوو. کاتێک ویستیان بە فشار لە کۆنسوڵخانە وەدەرم نێن بەتوندی بەرپەرچی زەبانیەکەی نایرۆبی دایەوە. بەڵام لەوانەیە ئەو هەڵوێستەی ساختەکارانەش بووبێت. ئەوجارەش گوایە پانگالۆس مۆڵەتی هۆڵەندای وەرگرتووە. بڕوام بەو قسەیە نەکرد. چونکە لە حاڵەتێکدا کە لە کۆنسوڵخانە دەرنەکەوتبامایە تیمە تایبەتەکانی یۆنان لە پسوودابوون تا بە ناچاری بەدەرم نێن. پۆلیسی کینیاش بۆ ئەنجامدانی هەمان کار ئامادەکرابوو. هەڵبەتە چیرۆکی باشووری ئەفریقیاش وەک هەڵخەڵەتاندنێک بوو و لە مێژبوو لەبیرکرابوو. پێشنیازەکانی لە جۆری پەنابردنە بەر نەتەوە یەکگرتووەکان و کڵێساش جێی گومان بوون. هەوڵ و بەرخودانم بۆ دەرنەکەوتن بوو.

قۆناغە چوار مانگیەکەی ٩ ـ ١٠ـ ١٩٩٨ تا ١٥ شوباتی ١٩٩٩ زۆر سەیر دەربازبوو. جگە لە ئەمریکای هێزی هەژموونگەرایی جیهان هیچ هێزێکی دیکە نەیدەتوانی ئەو ئۆپەراسیۆنە چوار مانگییە رێکبخات. رۆڵی هێزەکانی شەڕی تایبەتی تورک (ژەنراڵ ئەنگین ئالان سەرۆکی ئەو هێزانە بووە) لەو قۆناغەدا تەنیا بە فڕۆکە گواستنەوەی من بوو بۆ ئیمڕالی. مسۆگەر ئەوە یەکێک لە ئۆپەراسیۆنە گرنگەکانی مێژووی ناتۆ بوو. ئەوەش هێندە روون و ئاشکرابوو، بۆ هەر کوێیەک دەچوویت هەمان هەڵوێست جێگای باس بوو، کەس هەڵوێستێکی جیاوازی پیشاننەدەدا، کەسانێکی بەمجۆرەش هەبووایە یەکسەر بێ کاریگەر دەکران. بگرە رووسیای مەزنیش بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بێکاریگەر کرابوو. هەڵوێستی یۆنانیەکانیش بۆ روونکردنەوەی هەموو شتێک بەس بوو. ئەو تەگبیرە ئاسایشیەی لە ناوەوە و دەرەوەی ئەو ماڵە وەرگیرابوو کە لە رۆما لێی گیرسابوومەوە رەوشەکەی روون دەکردەوە. تەگبیری نائاسایی تایبەت بە زیندانییان وەرگرتبوو. نەمدەتوانی هەنگاوێک بۆ دەرەوە بهاوێژم. تیمە تایبەتەکانی ئاسایش ٢٤ کاتژمێر هەر شوێنێکیان خستبووە ژێر کۆنترۆڵەوە. حکومەتی داڵێما حکومەتێکی چەپی دیموکراتیخواز بوو. داڵێما بێ ئەزموون بوو، خۆی بە تەنیا بڕیاری نەدا. تەواوی ئەوروپا گەڕا. ئینگلتەرا پێی گوت پێویستە خۆت بڕیار بدەیت؛ هاوکاریەکی ئەوتۆی نەکرد. هەڵوێستی بروکسلیش روون نەبوو. لە ئاکامدا حەواڵەی دادوەری کراین. لەو هەڵوێستەدا ناشێت رۆڵ و کاریگەری گلادیۆ نەبینرێت. بێگومان ئیتاڵیا یەکێک لەو وڵاتانە بوو کە گلادیۆ تێیدا زۆر بەهێز بوو. بەرلسکۆنی هەموو هێزی خۆی خستبووە گەڕ. خۆی ئەندامی گلادیۆ بوو. کاتێک بینیم ئیتاڵیا توانای هەڵگرتنی نییە، ناچار بووم ئەوێش بەجێبێڵم. هەڵبەتە لە بەرامبەر ئەو دۆخەدا تورکیا کرابوو بە بڕواپێکراوترین و پاشکۆترین وڵاتی ئەمریکا و

ئیسرائیل. ئەو قۆناغەی بە خێرابوون و جیهانیبوونی سەرشێتانە دادەنرێت، لەڕاستیدا جگە لە چیرۆکی پێشکەشکردنی تورکیا بە سەرمایەی فینانسی جیهانگیری شتێکی تر نەبوو.

سیناریۆی داگیرکردنی ئێراقیش پەیوەندیەکی بەهێزی بەرادەستکردنەوەی منەوە هەیە. لەڕاستیدا لەگەڵ ئۆپەراسیۆنەکەی سەر من داگیرکردن دەستپێکرد بوو. هەمان خاڵ بۆ داگیرکردنی ئەفغانستانیش لە جێگای خۆیدایە. بەمانایەکی تر یەکێک و یەکەمین هەنگاوی بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن نراوە ئۆپەراسیۆنەکەی دژی من بوو. لەخۆڕا ئەجەوید نەیگووت: "بەهیچ جۆرێک تێنەگەیشتم بۆچی ئۆجالانیان تەسلیم بە ئێمە کردەوە". وەک چۆن یەکەمین جەنگی جیهانی بە کوژرانی شازادەی جێنشینی نەمسا بە دەستی ناسیۆنالیستێکی سربی دەستپێکرد، بەجۆرێک لەجۆرەکان "سێیەمین جەنگی جیهانی"ش بە ئۆپەراسیۆنەکەی سەر من دەستی پێکردبوو. بۆ تێگەیشتنی قۆناغی دوای ئۆپەراسیۆن، پێویستە دەرک بە ڕووداوەکانی بەر لە ئۆپەراسیۆن و کاتی ئۆپەراسیۆن بکرێت. بە ئامانجی تاوتوێکردنی مەسەلەی دەرخستنم لە سوریا سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا بیل کلینتۆن دووجار جارێکیان لە دیمەشق و جارێکیشیان لە سویسرا کۆبوونەوەی چوار کاتژمێری لەگەڵ حافز ئەسەدی سەرۆکی سوریا ئەنجام دابوو. لەو دیدارانە حافز ئەسەد هەستی بە گرنگی پێگەی من کرد. درێژکردنەوەی ئەو دۆخەی لە بەرژەوەندی خۆیدا بینی. بەشێوەیەکی کاتیش بێت داوای بەجێهێشتنی سوریایان لێنەکردم. بەنیاز بوو تاکۆتایی من وەک فاکتەرێکی هاوسەنگیکردن لە بەرامبەر تورکیا بەکار بێنێت. منیش سوریام ناچاری پیشاندانی هەڵوێستێکی ستراتیژی دەکرد. بەڵام هێزەکەم و دۆخەکەم بۆ سەرخستنی ئەو هەنگاوە لەبار نەبوو. ئەگەر لە ئێران بوومایە لەوانەیە ڕێککەوتنێکی ستراتیژیمان پێشخستبووایە. لەو بارەیەوە من بڕوام بە ئێران نەبوو؛ بەهۆی هەڵوێستە باوەکانی (پیلانگێڕیەکانی لە دژی سمکۆی شکاک و قاسملۆ و هاوشێوەکانی، لەسەرکارلابردنی ئەستیاغ لەلایەن هەرپاکۆسەوە) یان دوودڵ بووم. کلینتۆن و سەرکردە کوردەکانی ئێراق مانەوەی منیان لە سوریا بەگوێرەی بەرژەوەندی ستراتیژی خۆیان نەدەبینی. چونکە تا دەچوو کورد و کوردستان لەژێر کۆنترۆڵیان دەردەکەوت. ئیسرائیلیش زۆر لەو دۆخە نارەحەت و نیگەران بوو. کۆنترۆڵکردنی کوردستان ڕۆڵێکی گرنگی بۆ جێبەجێکردنی پیلانەکانی دەرهەق بە ئێراق هەبوو. مسۆگەر دەیانویست دەرچوونم لە سوریا و وازهێنان لە ڕێبازی ئازادی و ناسنامەی کوردی سەربەخۆم بەسەردا بسەپێنن.

هۆکاری بوونی ئێمەش پارتەکەمان و ڕێبازی ئازادی بوو. ئەمریکا و ئینگلتەرا پابەندی ئەو بەڵێنە بوون که لە ساڵی ١٩٢٥ بە تورکیایان دابوو (بەو مەرجەی پەنجە بۆ کوردستانی ئێراق نەبەن، کوردستانی تورکیا بکەنە قوربانی). لەسەر ئەو بنەمایە تورکیا ببوو بە ئەندامی ناتۆ و لەو چوارچێوەیەدا سەبارەت بە کێشەی کورد ڕێککەوتبوون. پێگە و ستراتیژییەکەمان هەڕەشەی لەو هەژموونگەرایی و هاوسەنگییەی خۆرهەڵاتی ناوین

دەکرد کە بەشێوەیەکی گشتی و هەلومەرجی هەنووکەییش گرنگی و بایەخێکی مەزنی هەبوو. یان دەچووینە ناو خولگەی ئەو هەژموونگەرایییەوە یان لەناویان دەبردین. دەوڵەتی تورکیا خوازیار بوو ئەو ڕێککەوتنانەی لە ساڵی ١٩٢٥ لەگەڵ هێزە هەژموونگەراکان ئەنجامیداوە (لە ساڵی ١٩٢٦دا ڕێککەوتن سەبارەت بە بابەتی موسڵ ـ کەرکوک، ئەو ڕێککەوتنانەی لە ١٩٥٨ و ١٩٩٦دا لەگەڵ ئیسرائیل ئیمزاکراون) لەسەر بنەمای سڕینەوەی کوردان لەمێژوودا بەکاربێنێت. ئایدیۆلۆژیای میللیگەرایی عەلمانی پۆزیتیڤیست ڕێگا و دەرفەتی بەو هەنگاوە دەدا. کادیرانی کۆمار بەوە ڕازی کرابوون. لەراستیدا ئەوە ڕەوشێکی زۆر پێچەوانە و دژی ڕێککەوتن و ڕۆحی پەیوەندی مێژوویی کورد ـ تورک بوو. بەڵام بەهۆی حیسابەکانی دامەزراندنی ئیسرائیل هیچ سەرشێتیەک نەبوو سیستەم ئەنجامی نەدات. پێکهاتە دروستکراوەکەی ئەو ئایدیۆلۆژیا، کادیر و چینەی بە واقیعی تورکی سپی ناو دەبرێت لەسەر ئەو بنەمایە بونیاد نرابوو. هەروەها PKK ش گورزێکی کوشندەی لەو پێکهاتەیە وەشاندبوو. چونکە پەسەندکردنی ناسنامەی کورد و دانتان بە ئازادییەکەی مانای تکوڵێکردنی ئەو پێکهاتەیە بوو، بەلانی کەم دەستبەردانی ئەو سیاسەتە کوشندەیەی دەکردە پێویستیەک. ئەو ڕێککەوتنانەی لەگەڵ ئیسرائیل ئەنجام درابوون گرنگیەکی ژیانیی بۆ ئەو پێکهاتەیە هەبوو. خۆی لەخۆیدا دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک وەک پرۆتۆ ـ ئیسرائیل بونیاد نرابوو.

لە چوارچێوەی PDKشدا هەوڵی ئاواکردنی پێکهاتەیەکی کوردی سپی هاوشێوە دراوە. هەمان ناوەند ئافراندنی دوو هێزی کورد و تورکی هاوشێوە و ناکۆک لەگەڵ یەکتریان بە پێویستیەکی ژیانیی بوونی خۆیان دەزانی (لەپێناو ئاسایشی ئیسرائیل و بەرژەوەندی هێزە هەژموونگەراکان لە خۆرهەڵاتی ناویندا، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکا و ئینگلتەرا). پاراستنی بەرژەوەندییەکانیان بە چوارچێوەی ئەو دوو هێزەی وابەستە بەخۆیان و ناکۆک بەیەکتر تا دوا ڕادە سیاسەتێکی ئاقڵانە بوو. بەڵام هەستانەوەی PKK ئەو تەڵەزگە مێژوویی و هەنووکەییەی تێکدەدا. سەرهەڵدانی دەرفەتی ئاشتی و ڕێگەچارە لە ١٩٩٣و ١٩٩٨ مانای کۆتایی ئەو تەڵەزگەیە بوو. هەربۆیەش مۆڵەتیان بەو شێوازەی چارەسەری نەدا. تیرۆر و پیلانگێڕی مەزن ڕێکخران. کاتێک PKK کوردان لەژێر کۆنترۆڵیان دەربخات و لەگەڵ دەوڵەت و کۆمەڵگاکانی دیکە ئاشتیان بکاتەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ تورکەکان، ئەوا گورزێکی ستراتیژی بوو بەرامبەر بەردەوامکردنی بەرژەوەندی و تەڵەزگە هەژموونگەراییەکانی ئەو هێزانە لە خۆرهەڵاتی ناویندا. ئەو خاڵانەی بەشێوەیەکی تێر و تەسەلتر دەتوانین ڕاستیەکانی ڕیز بکەین بەپێی پێویست ڕوونی دەکاتەوە کە بۆچی ئامانجی پیلانگێڕی ١٩٩٨ گەورە و ستراتیژی بوو.

لەو قۆناغەدا کلینتۆن گرنگیەکی زۆر بە شاڵاوە هەژموونگەراییەکەی خۆرهەڵاتی ناوین دەدات و جەختی لەسەر بایەخی ڕۆڵی تورکیا دەکردەوە. ڕاوێژکارە تایبەتەکەی ژەنراڵ گالتاری خۆی ڕایگەیاند کە ئۆپەراسیۆنەکەی دژی من بە فەرمانی خودی کلینتۆن

بەڕێوەبراوە. کاتێک دێینە سەر باسی "سێیەمین جەنگی جیهانی"ش، لە زۆر لایەنەوە دەربازکردنی ئاماری یەکەمین و دووەمین جەنگەکانی جیهانی لەلایەن ئاماری ئەو شەڕانەی لە ڕووداوەکانی زۆربەی وڵاتانی هاوشێوەی ئێراق، ئەفغانستان، لوبنان، یەمەن، سۆماڵ و میسر هاتۆتە ئاراوە بۆ تێگەیشتنی واقیعی ئەو شەڕە بەسە و ڕوونکەرەوەیە. هەڵبەتە ئەو خاڵە مایەی تێگەیشتنە کە بەهۆی چەکی ئەتۆمیەوە "سێیەمین جەنگی جیهانی" پارچە پارچە ڕوودەدات، ماوەیەکی درێژ دەخایەنێت و لەمیانەی تەکنۆلۆژیای جیاوازەوە بەڕێوە دەبرێت. دوا لوتکەی ناتۆ لە لیزبۆن و قووڵکردنەوەی ئابڵۆقەکەی ئەمریکا لە دەوروبەری ئێران زانیاری پێویست سەبارەت بە ئاراستەی سێیەمین جەنگی جیهانی پێشکەش دەکات.

"سێیەمین جەنگی جیهانی" واقیعێکە و جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین و زەمینە کلتوورییەکەی چەقی قورساییەکەیەتی. تەنیا ئەو بوویەرانەی لە چەقی قورسایی "سێیەمین جەنگی جیهان" ی لە ئێراق ڕوودەدەن بەشێوەیەکی بەرچاو ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو شەڕە تەنیا پەیوەندی بە وڵاتێکەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە بەرژەوەندی و بوونی هێزە هەژموونگەراکانی جیهانەوە هەیە. تەنیا دوای بێکاریگەرکردنی تەواوەتی ئێران، سەقامگیربوونی بارودۆخی ئەفغانستان و ئێراق، بەلاوەنانی دۆخی هەڕەشەی چین و ئەمریکای لاتین دەشێت ئەو شەڕە کۆتایی پێ بێت. لەو سۆنگەیەوە؛ هێشتا لە ناوەڕاستی شەڕەکە داین. هەرچەندە گوتنی شتێکی ڕەها و مسۆگەر لەبواری کۆمەڵناسیەوە ڕاست نەبێت، بەلانی کەم لەوانەیە شەڕەکە دە ساڵی دیکە بەردەوام بێت (دوا پیلانە ستراتیژیەکانی ناتۆش بۆ ماوەی دە ساڵ پێشبینی کراوە). هەندێک جار دیبلۆماسی، جارانێکیش توندوتیژی چڕ دەبێتەوە. لەمیانەی قەیرانی ئابووری دژوار و کۆنترۆڵکراوەوە دەستێوەردان بە ڕۆژەڤ دەکرێت. لە پێشینەیی ناوچەکان دەگۆڕێت، بەڵام بەجۆرێک لە جۆرەکان بەشێوەیەکی هەمەگیری شەڕ لە چەندین ناوچە ڕوودەدات. تەنیا کاتێک ئەو سروشتە بنەڕەتییەی شەڕ ڕەچاو بکرێت، ئەو کاتە باشتر دەرکی پێدەکرێت کە بۆچی ئۆپەراسیۆنەکەی ١٩٩٨ دژی من لە ئاستی نێودەوڵەتیدا بەڕێوەچوو، لەبەرچی گەورەترین ئۆپەراسیۆنی گلادیۆی ناتۆیە. بێگومان لە شەڕە گەورەکاندا بەردەوام هێزە هەژموونگەراکان سەرکەوتوو نابن. بەڵکو گەلانیش دەتوانن دەسکەوتگەلێکی زۆر بەدەست بێنن. بگرە لەوانەیە هێزە هەژموونگەراکان وەک سیستەم ژێر بکەون، گەلانیش وەک سیستەم سەرکەوتن بەدەست بێنن.

وەک بابەتێکی سەرەکی بابەتی دواتر هەوڵی شیکارکردنی ئەو بابەتە دەدەم.

## ٢ . قۆناغی ئیمرالی

گرنگترین بەشی پیلانگێرییە گەورەکەی گلادیۆ لە ئیمرالی هەوڵی جێبەجێکردنی دراوە. تەنیا ئەرکی ژەنراڵ ئەنگین ئالآنی سەرۆکی ئەو یەکینەیەی منی هێنایە دورگەکە بەسە بۆ روونکردنەوەی ئەو واقیعە. ئەنگین ئالآن فەرماندەی هێزە تایبەتەکانی ئەو قۆناغە بوو، واتە بەرپرسە فەرمیەکەی گلادیۆی تورک بوو. هەڵوێستی کاربەدەستەکەی کۆنسەی یەکێتی ئەوروپا کە لە دوورگە پێشوازی لێکردم، باشتر ڕەهەندی یەکێتی ئەوروپای پیلانگێرییەکەی روون دەکردەوە. بەمجۆرەش ڕێککەوتنی نێوان ئەمریکا، ئەوروپا و بەڕێوەبەرانی تورکیا ئاشکرا دەبوو. بەڵگەیەکی روونتر لەو سێ هێمایە (لێدوانەکانی راوێژکاری تایبەتی کلینتۆنی سەرۆکی ئەمریکا ژەنراڵ گالیتاری، هەڵوێستی ژنە کاربەدەستەکەی کۆمیساری سیاسی یەکێتی ئەوروپا و ڕۆڵی بەرپرسی فەرمانداریێتی هێزی تایبەتی تورک ئەنگین ئالآن) جێگای باس نابێت کە لەسەرەتاوە تا کۆتایی ئۆپەراسیۆنەکە لەژێر بەرپرسیاریێتی سیاسی ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا و لەلایەن گلادیۆی ناتۆوە بەڕێوە چووە. بەر لە ئاشکرابوونی ئەو راستیانەش هیچ گومانێکم نەبوو کە ئەو هێزەی منی بێکاریگەری کردووە هێزە ئاسایشیەکانی حکومەتی تورک نین، بەڵام تەواو لە میکانیزمی ئۆپەراسیۆنەکە تێنەگەیشتبووم. ئۆپەراسیۆنەکە لەواقیعەکەی خۆی زۆر جیاوازتر پیشاندەدرا. بەئەنقەست و بە سووربوونەوە کەشێکی لەو جۆرە دروست دەکرا کە گوایە حکومەتی تورکیا فشار دێنێت و ئەنجام بەدەست دێنێت. تەنانەت کاتێک سەرەتا بڵند ئەجەویدی سەرۆک وەزیریش بێ ئاگایی خۆی لە هۆکاری دەستگیرکردنم و رادەستکردنەوەم راگەیاند، بووە بەڵگەیەکی گرنگ و سەلمێنەری ئەو بانگەشەیەم. چەندەی ئەو بوویەرانە شیکارو یەکلا بکرێنەوە ئەوا بانگەشەکەم بەشێوەیەکی باشتر دەسەلمێت.

یەکەم کەسی لە دورگەی ئیمرالی پێشوازی لە من کرد سەربازێکی بەپلەی سەرتیپ بوو. خۆی وەک نوێنەری سوپاسالار ناساند. لە دانیشتنێکدا کە جەختی لەسەر نهێنیەکەی کردەوە ئاخافتنگەلێکی گرنگی کرد. دواتر کاتێک لێکۆڵینەوە بەشێوەیەکی فەرمی دەستپێکرد هەمان کاربەدەست ئاخافتنی جیاواز و گرنگی کردبوو. لێکۆڵینەوە راست و چەپەکەی ئەو گروپەی لەچوار یەکینەی ئاسایش (سوپاسالار، جەندرمە، ئاسایش و هەواڵگری میللی) پێکهاتبوو دە ڕۆژ بەردەوام بوو. لەو ناوەدا کاسێتێکم تۆمار کرد کە ئاخافتنەکانم روو لە فەرماندەی هێزەکان بوو. دواتریش بەدرێژایی چەندین مانگ بەشێوەی گفتوگۆ ئاخافتین. ناوە بەناوە کەسانی دیکەش نێوەندگیریان دەکرد، هەندێک جار شاند لە ئەوروپاشەوە دەهاتن.

ئەولەویەتم بە چەمکی بەرگرینامەیەکدا کە ماهیەتی پیلانگێڕی نێودەوڵەتی قۆناغی ئیمرالی ڕەچاو دەکات. ئەو هوشیارییە تورکێتیە وشکەی دووچاری هاتبوون، پەیوەندی ئەو کەسانەی بەراستیەوە بڕیبوو کە بەناوی تورکێتیەوە دەجوولانەوە. دەرککردنمان بە فەلسەفەکەی پشت پیلانگێڕیەکەوە پێچەوانەی سروشتەکەیان بوو. چونکە ئەوانیش بەرهەمێکی ئەو بونیادانە بوون کە بەلانی کەم ئەو فەلسەفە سەد ساڵیەی پیلانگێڕی بونیادیان ناون. لەو سۆنگەیەوە؛ چاوەڕوانی نکوڵیکردن و ڕەخنەکردنی ئەو بونیادانەیان لێنەدەکرا. چاوەڕوانیکردنی هەر ئیرادەیەکی ئەرێنی گۆڕانکاری چ لەکاتی کۆمیدیاکەی دادگایی کردن بێت یان لە قۆناغی حوکم دراویدا بێواتا دەبوو. بڕواکردن بەوەی بەگوێرەی گوتە بەچرپەکانی نوێنەری سوپاسالار دەجووڵێنەوە، لەو هەلومەرجە زاڵەدا سافێتی بوو. خۆشیان لەو هێزەی بڕیاردان بێبەش بوون کە گوتەکانیان جێبەجێ بکەن. سیستەمێکیان سەبارەت بە من دۆزیبوویەوە کە ئەمریکا پاڵپشتی دەکرد و یەکێتی ئەوروپاش کۆنترۆڵی کردبوو. وێناکردن و داهێنانی سیستەمەکە کاری ئینگلتەرا بوو، جێبەجێکردنیشی بەشی تورکەکان بوو.

تێگەیشتنی زهنیەتی فەلسەفی و سیاسی پشت پیلانگێڕییەکە بایەخدارە و گرنگیەکی مەزنی هەیە. بەردەوام باسی بنەما سەد ساڵیەکەی پیلانگێڕی دەکەم و هەوڵی ڕوونکردنەوەی دەدەم. باسی ئەو پیلانگێڕییانەم کرد کە بەردی بناغەی هەر قۆناغێکن. بەساتە وەختێک دەتوانرێت سەدان لەو پیلانگێڕییانەی دەرهەق بە کوردان ڕیزبکرێت: پیلانگێڕی فیرقەکانی حەمیدیە، ١٩١٤ لە بتلیس دژی مەلا سەلیم، ١٩٢٥ دژی شێخ سەعید، پیلانگێڕی ١٩٣٠ی ئاگری و ١٩٣٧ی دێرسم، دۆزی ٤٩ ی کەسی ١٩٥٩و ٤٠٠ کەسیەکەی ١٩٦٠، کوشتنی فائیق بوجاق و تیرۆرکردنی سەعید قرمزی تۆپراغ لەلایەن PDKوە، هەروەها سەدان پیلانگێڕی لە سەردەمی گروپی ئایدیۆلۆژیەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان دژی PKK ڕێکخراون. ڕێکخەرانی پیلانگێڕی ئەو پیلانگێڕییانە بە هونەرێکی دەسەڵات دادەنێن کە بەشێوەیەکی شارەزایانە ڕێکخراوە. واتە پیلانگێڕی گرنگترین ئامراز و ڕۆحی هونەری دەسەڵاتە. مسۆگەر لەسەر بنەمای پیلانگێڕی ئەو هونەرەیان لەسەر کوردان پەیڕەو دەکرد. جێبەجێکردنی پیلانگێڕی بەشێوازێکی ئاشکرا، وەک چیرۆکەکە وایدەکرد منداڵەکە بڵێ:"دایکە سەیرکە پاشا رووتە". هێزێکی دەسەڵات کە ئامانجی کردەوەگەلێکە تا ئاستی کۆمەڵکوژی دەڕوات، جگە لە پیلانگێڕی و زهنیەتێکی ئاراستەکاری پیلانگێڕی ئامرازێکی دیکەی لەدەستدا نییە. ئەوەی لێرەدا گرنگە ناسین و پێناسەیەکی ڕاستی ئەو هێزانەیە کە جێگای خۆیان لەناو پیلانگێڕیدا دەگرن.

پێویستە بڵێم؛ کە لە قۆناغی ئیمرالیدا لەو بارەوە زەحمەتیم بینی. چونکە زۆر هێزی ناکۆک لەگەڵ یەکتر جێگای خۆیان لەناو پیلانگێڕییەکەدا گرتبوو. لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە تا فیدراسیۆنی ڕووسیا، لە یەکێتی ئەوروپاوە تا کۆمکاری عەرەبی، لە تورکیاوە تا یۆنان، لە کینیاوە تا تاجیکستان چەندین دەوڵەت کەوتبوونە ناو پیلانگێڕییەوە. چی بوو ئەوەی تورک و یۆنانیەکانی دوژمنی سەدان ساڵەیان کردبوو

بەیەک؟ بۆچی ڕێککەوتنی هێندە بێ پرەنسیپانە یاخود یەکێتی بەرژەوەندی لەسەر پشتی من بەدیدەهات؟ هەروەها ژمارەی ئەو بەکرێگیراوە میللیگەرا و چەپڕەوە کورد و تورکانەش لە ژمار نەدەهاتن کە لەناخەوە بەهۆی بەئامانجگرتنی من دڵخۆش بوون. وەک بڵێی؛ لە کەسایەتی مندا دونیای فەرمی مەترسیدارترین ڕەقیبی خۆی بەتەڵەوە کردووە. هەروەها لەناو PKKشدا ژمارەی ئەوانە کەم نەبوو کە لەو بڕوایەدابوون ئیدی ڕۆژی خۆیان هات و ئەو دەرفەتەیان بۆ ڕەخساوە چۆنیان بوێت وەها بژین. بێگومان بەر لە هەموو شتێک و تێبینیەکی گشتی پیشانی دەدات کە سەرجەم ئەو هێزانە لەو چین و توێژانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێکدێن کە بەدوای بەرژەوەندییە لیبڕالەکانەوە بوون. منیش هەڕەشەم لە بەرژەوەندی و زهنیەتی فاشیستانەی لیبڕالیزمی زۆربەیان دەکرد.

بۆ نموونە؛ لەناو ئەو هێزانەدا ئینگلتەرا بە ئەزموونترینیان بوو. ئەو هێزەیە کە بەئامانجی بەربەستکردنی سیاسەتکردنم لە ئەوروپا یەکەمین فیشەکی تەقاند. هەرچۆن هەنگاوم بۆ ئەوروپا هاوێشت یەکسەر منی بە "کەسی نەخوازراو" ڕاگەیاند. ئەوە هەنگاوێکی بچووک و ئاسایی نەبوو، یەکێک لەو هەنگاوانە بوو کە پێشوەخت ئەنجامی دیاریدەکرد. ئەو هەڵوێستەی سەبارەت بە خومەینی و لینینیش پیشانندرا بۆچی یەکسەر بەرامبەر من پیشاندرا؟ لەچەندین بەشی بەرگرینامەکەمدا هەوڵی ڕوونکردنەوەی سەرەداوەکانی ئەو هۆکارەم داوە. هەر بۆیەش دیسان پێویستی بە دووبارەکردنەوە نییە. بەکورتی؛ وەک کۆسپێکی جددی بەردەم لێکدانەوە دووسەد ساڵیەکەی هەژموونگەرایی سەر خۆرهەڵاتی ناوین و سیاسەتەکەیان لەبارەی کوردستان (بە کورتی؛ بەهۆی سیاسەتی "کەرکوک ـ موسڵ مان پێبدە، کوردەکانی خۆت لەناو ببە") سەرم هەڵدابوو. ئیتر لەلایەن سەرجەم پیلان و جێبەجێکارەکانیانەوە بە هەڕەشە و مەترسی دادەنرام. مەسەلە و دەردی ئەمریکا جیاوازتر بوو. خوازیار بوون پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن بخەنەگەڕ. هەربۆیەش گۆڕانکاری و پەرەسەندنەکانی کوردستان ڕۆڵی کلیلی دەبینی. بێکاریگەرکردنم بەشێوەیەکی ڕەها بەلانی کەم پێویستییەکی هەلومەرجی زاڵ بوو. لەناوبردنم بەگوێرەی سیاسەتە جیهانگیرییەکانی ئەوکاتیان بوو. ڕووسیا ئەو کاتە کە دووچاری قەیرانێکی گرنگی ئابووری مێژووی خۆی هاتبوو پێویستییەکی پەلەی بە قەرز هەبوو. ئەگەر ببێت بە دەرمانی دەردەکەی ئەوا هیچ هۆکارێک نەبوو جێگای خۆی لە پیلانگێڕییەکەی دژی من نەگرێت و ڕۆڵی خۆی لەو چوارچێوەیەدا نەبینێت. ئەوانەی تریش برا بچووکی "برا گەورە" بوون. هەرچیەکی بڵێیت دەست لەسەر سینگ بۆی وەستابوون. دەرفەتێکی جددی ڕزگاربوون لە ڕەقیبەکەیان بۆ چەپڕەوێتی تورک (دەرئاساکان جیاوازن)، کوردە بەکرێگیراوەکان و ناڕازییەکانی ناو PKK ڕەخسابوو. فەلسەفەی بەرژەوەندییەرستی، پراگماتیزم و خۆپەرستی لە قووڵایی ئەو هەڵوێستانەی هەموویاندا شاراوە بوو.

کاتێک باسی ئەو خاڵانە دەکەم لەو بڕوایەدام کە تۆزێکیتریش ڕاستی ڕۆشن دەکەمەوە. لەو ڕۆژانەدا لایەنگریکردنی ئازادی کوردستان و بەدەستهێنانی ناسنامەی کوردان، پێویستی بە دەربازکردنی هەموو جۆرە بەرژەوەندییەکی ڕۆژانەیی لیبڕالیزم،

پراگماتیزم و خۆپەرستی هەبوو؛ فەرمانی پێدەکردین دەستبەرداری ژیانی راستەو و چەپڕەوانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بین یاخود بەرەنگاری ئەو ژیانە ببینەوە. بەپێچەوانەوە دونیای ئەو رۆژانە دونیایەک بوو کە لیبڕالیزمی جیهانگیری لە شەڕی فەتحکردنی جیهاندا گەورە دەبوو. سالانێک بوو کە فاشیزمی لیبڕال بالادەستی خۆی بەسەر جیهاندا راگەیاند. لەروانگەی سیاسیشەوە خۆرهەلاتی ناوین ناوەندی ململانێی هەژموونگەرایی بوو. تێکۆشان و ململانێی سەر کوردستان سەبارەت بە لێکدانەوەکانی هەژموونگەرایی رۆلی کلیلی دەبینی. پێگە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکەی PKK ناکۆکیەکی روون و ئاشکرای لەگەل حیسابەکانی هەژموونگەرایی هەبوو. لەو سۆنگەیەوە؛ تەسفیەکردنم مانای رێخۆشکردن بوو لەپێش ئەو حیساب و لێکدانەوانەوە.

لەگێژاو و سوڕی ناپەسەندی ئیمرالی سەرجەم ئەو حیسابە مێژووییانە سەرلەنوێ لە کەسێتی مندا زیندوو بوویەوە. لەپێناو شیکارکردنی قۆناغی ئیمرالی دەبووایە خاوەنی هوشیارییەک بم کە دەرک بە ململانێ هەنووکەییەکانی بەرژەوەندی بکات کە خاوەن ریشەیەکی مێژوویی درێژخایەنە. یەکێک لەو خالانەی حیسابەکانی پیلانگێڕی سیستەمی پیلانگێڕی کە پێویستە رەچاو بکرێت بە ئامرازنەبوونی سیاسەتەکانی پەرتکە ـ زالبەیە کە شارەزایانە پیلانی بۆ دانراوە و لەو دوو سەدەیەی دواییدا دەرهەق بە ناوچەکە پەیڕەو کراوە و لە قوولکردنەوەی شەڕی کورد ـ تورک ی ئامانجکراو لە بەرژەوەندی ئەو هێزانە بەکاردەهێنرێت. ئەرمەنی، گریک، گروپە ئەتنیکیەکانی بەلقان، عەرەب، سوریانی، تورک و کوردەکان کە بوونە ئامرازی ئەو سیاسەتە شکەلێکی زۆریان لەدەست دا و زیانێکی زۆریان بەرکەوتبوو. هەندێک لەوانە لە نیشتیمانی هەزاران سالەیان دەربەدەر بوون و بوونی کلتوورییان لەدەستدا، بگرە لەدۆخی کۆمەلگایەکی نەتەوەیی وەدەرنرابوون. هەروەها لەبەر ئەوەی لەگەل تورکەکان بەیەکەوە دەژیان چەندین هێز کین و تورەییان بەرامبەر کوردان هەبوو. ئەو یەکێتیەی لەسەردەمی شەڕی مەلازگردەوە گرنگی خۆی پاراستبوو، بەهۆی پەیڕەوکردنی سیاسەتی نکولی و قڕکردن لە ١٩٢٥ بەدواوە کۆتایی پێهێنرا. ئەگەر بەشێوەیەکی قوول لێکۆلینەوە سەبارەت بە پرۆسەی نکولی و لەناوبردنی ئەو ئەندامە بنەڕەتیەی کۆمار بکرێت و لەمیانەی فەلسەفەی مێژووەوە راڤە بکرێت، ئەوا ئاشکرا دەبێت کە لە ناوەڕۆکدا ئەو یەکێتییە ستراتیژییە کراوەتە ئامانج. فشاری ئینگلیزەکان و پاشکۆ ناوخۆییەکانی بۆ سەر مستەفا کەمال و ناچارکردنی گرنگترین هەنگاوی پیلانگێڕی بوو. دوژمنایەتی و ئاسیمیلاسیۆنی کوردان لە فەلسەفە و دیاردەی بەڕێوەبەرایەتی نەریتی تورکدا نەبوو. ئەو دوژمنایەتییە بە ئامانجی تایبەت پێشخرابوو. قۆناغەکانی سەرهەلدان و رووداوەکانی دواتر ئەو راستییە دەسەلمێنن. ئەو رەوشە کە لە ئیمرالی زیاتر سەرنجی راکێشام و لەبارەیەوە قوولتر بوومەوە، لە فەلسەفەی سیاسیمدا رێگای لەپێش وەرچەرخانێکی ریشەیی کردەوە.

لەو بەرگرینامانەی بەشێوەی سێ ڤێرسۆن پێشکەشم کردن دەمشێت پەرەسەندنی ئەو فیکرە سیاسیە ببینرێت. هێلە گشتیەکانی ئەو ئەنجامانەی پێی گەیشتووم بەم شێوەیە:

أ ـ لەکەسێتی مندا پیلانگێڕی تەنیا دژی کوردان ئەنجامنەدراوە، بەڵکو دژی تورکەکانیش ئەنجامدراوە. شێوەی رادەستکردنەوەم و نیازی ئەوانەی رۆڵیان تێدا بینی کۆتاییهاتنی تیرۆر و چارەسەری نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەک قووڵکردنەوەی بناغەی ئەو ناکۆکیە بوو تا سەدەیەکی دیکەش بەردەوام بێت. پاڵنانی من بۆ ناو تەڵەزگەی پیلانگێڕی و پێوەکردنم دەرفەتێکی بێ وێنەی پێشکەش بەو نیازەیان کردبوو. تادوایی خوازیاری بەکارهێنان و قۆستنەوەی ئەو دەرفەتە بوون. ئەستەم بوو بە پێچەوانەی ئەوە بیربکەنەوە. چونکە ئەگەر بیانویستبایە لەو بارەیەوە دەیانتوانی کۆمەک بە پەرسەندنە ئەرێنیەکان پێشکەش بکەن. کەچی بەردەوام کارەکانیان بەرەو هەڵدێر دەبرد، لەجیاتی چارەسەرکردنی کێشەکە تەواو دەیانکرد بە گرێکوێرە. دەیانویست دوالیزمێکی هاوشێوەی ئیسرائیل ـ فەلەستین بئافرێنن. وەک چۆن سەدەیەکە دوالیزمی ئیسرائیل ـ فەلەستین لە خۆرهەڵاتی ناوین خزمەت بە هەژموونگەرایی خۆرئاوا دەکات، دوالیزمی تورک ـ کوردیش کە زۆر لەو گەورەتر و فرە رەهەندترە بەلانی کەم سەدەیەکی تر خزمەتی بە حیساب و لێکدانەوەکانیان دەکرد. هەڵبەتە هەمان ئامانج لەژێر پێشخستنی چەندین کێشەی مەزهەبی و ئەتنیکی سەدەی نۆزدەهەمی ناوچەکە و بێچارە هێشتنەوەیاندا شاراوەیە. واقیعی قۆناغی ئیمڕالی زانیارییە خاوەکانمی لەو بارەیەوە پێگەیاند. بەڵام گرنگترین کێشەی رووبەڕووم دەبوویەوە، حاڵیکردن و تێگەیاندنی نوخبەی بەڕێوەبەرایەتی تورک بوو.

ب ـ لەو سۆنگەیەوە؛ گەورەترین کێشەم ئەوەبوو تێیان بگەیەنم کە لە من و کوردان زیاتر پیلانگێڕی دژی تورکەکان ئەنجامدراوە. بەردەوام ئەوەم بۆ لێکۆڵەرەوەکان دووبارە و روون دەکردەوە. بەڵام ئەوان خۆیان خستبووە ناو هەوەس و خۆشی سەرکەوتنەوە. ئەو هەڵویستەیان تا ساڵی ٢٠٠٥ بەردەوام بوو تا ئەو کاتەی زانییان بزووتنەوەی ئاسنامە و ئازادی کوردان لەجاران زیندووترە. کاتێک بەشێوەیەکی قووڵتر سەبارەت بە بابەتەکە قاڵبوومەوە، ئەوا لە نزیکترەوە فاکتەرەکانی پیلانگێڕی سەردەمەکانی مەشروتیەت و کۆمارم بینی. بۆم دەرکەوت ئەو بوویەرەی بە سەربەخۆیی تورک دادەنرێت یەکێکە لە خراپترین جۆرەکانی وابەستەیی. وابەستەیی تورکەکان ئایدیۆلۆژی و سیاسی بوو. تا دەچوو زیاتر دەرکەم بەوە دەکرد کە میللیگەرایی و نەتەوەپەرستی بونیادنراو زادەی دەرەوەیە و پەیوەندییەکی زۆر کەمی بە مێژوو و دیاردەی کۆمەڵگای تورکەوە هەیە. هێزە هەژموونگەراکان ئاگاداربوون کە نوخبە و هێزی بەڕێوەبەرایەتی تورک لەبارەی دەسەڵاتەوە چەندە لاوازن و ئەو لاوازیەشیان بەکاردەهێنا. ئەو ستەم و فەرمانڕەواییە سنوورنەناسەی لەسەر کوردانیشیان ئاواکردبوو بۆ هەمان لاوازی دەگەڕایەوە. ئەو زاڵبوون و ستەمە لە هەمانکاتدا مانای دەستەمۆبوون و مەحکومبوونیشیان بوو. فەرمانڕەوایەتیەکەیان بەردەوام پاشکۆ بوو، ئایدیۆلۆژیای خۆیان نەبوو؛ بە مانایەکی تر ڕێسای "زاڵبوون و فەرمانڕەوایەتی هەموو شتێکە، ئایدیۆلۆژیا هیچ نییە" پەیڕەو دەکرا.

ج ـ "کەرویشک ڕاکە، تانژی بیگرە" ئەو ڕێبازە بوو کە هێزە هەژموونگەراکان لە قووڵکردنەوەی دوالیزمی تورک ـ کورد بەکاریان هێناوە. ڕێبازێکە هەم تانژی هەم کەرویشک لەو ڕاکەراکەیەدا ماندوو دەبن، لەئاکامدا هەردووکیشیان دەکەونە ژێرخزمەت و فەرمانی خاوەنەکانیان. ئەوەی بەرامبەر منیش پەیڕەوکراوە مانای سەلماندنی ئەو ڕێبازەی دەبەخشی. هەڵوێستەکانی کۆنسەی یەکێتی ئەوروپا و بڕیارەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا بە تەواوی خزمەتی جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتەیان دەکرد. ئەو لۆژیکەی جێگای باس بوو: تادوا ڕادە بەخۆوە گرێدانی هەردوو لایەن بوو. ئامانج دادوەری و چارەسەری نەبوو. هەر بۆیەش زیاتر بە ئامانجی شەرمەزار و ریسواکردنی ئەو لۆژیکە بەرگرینامەکانم پێشکەش کرد. بەشێوەیەک جێگیرکردنی ڕێکخراوی گلادیۆ لە لوتکەی دەوڵەتدا کە لەهیچ وڵاتێکی ناتۆدا نەبینراوە ناشێت بەبیانووەکانی نیازپاکی و ئاسایش ڕوون بکرێتەوە. لەبەر ئەوەی جڵەوەکەی بەدەستی خۆیانەوە بوو و وڵاتیان بە ئارەزووی خۆیان بەڕێوە دەبرد، هێزە هەژموونگەراکان چاوپۆشیان لە پاشکۆی گلادیۆی تورکیا کرد. کاتێک بەشێوەیەکی گشتگیر لەنزیکەوە توێژینەوە لەبارەی گلادیۆوە بکرێت و فەلسەفەکەی ڕۆشن بکرێتەوە، ئەوا دەبینرێت کە ئامانجیان داگیرکردنی وڵاتە لە کورتترین ڕێگاوە و پارچەکردن و بەگژ یەکتروەنانی گەلە. بەتایبەتیش ئەو واقیعە بەردەوام لەناو پاشکۆکانیان لەخۆرهەڵاتی ناوین جێگای باس بووە و لەمیانەی کردارەکانیانەوە دەردەکەوتە ڕوو. بەکاریگەرترین ئامرازی بەڕێوەبردنی گەلێک بوو. هەم گەلەکەی دژی دەوڵەت ڕادەکاتە سەر پێیان، هەمیش هەردووکیان بەیەکترەوە سەرکوت دەکات. هەریەکێک یان هێزێکی بە هەڕەشەیان زانیوە بەو ڕێبازە لەناویان دەبردن. لەراستینەی بەڕێوەبەرایەتی شەست ساڵی دوایی تورکیادا ئەو دیاردەیە زۆر زەق و بەکاریگەر بوو. ئیتر وڵات کرابوو بە تاقیگەی شەڕ و ململانێکانی گلادیۆ. تەنیا ئەو شەڕ و پێکدادانانەی لەسەرجەم قۆناغە گرنگەکانی مێژووی PKKدا بەهۆی گلادیۆ هاتوونەتە ئاراوە بەس بوو بۆ کۆتاییهێنان بەو دۆستایەتییە نەریتییە سەدان ساڵییەی گەلان و دەوڵەت.

د ـ قۆناغی ئیمڕالیم وەک پلاتفۆرمێکی نموونەیی تێکدانی ئەو گەمەیە هەڵسەنگاند. هەربۆیەش بنەما تیۆریەکەی خۆم بەهێزتر کرد کە لەو پێناوەدا پێویست بوو. پەرەم بە سەرجەم بەڵگە و کۆڵەکە فەلسەفی و کردارییەکانی هەلومەرجەکانی ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسیانە دا. ئەو کار و خەباتە سەختانەی پێویستی بەخۆڕاگری و ئارامی هەبوو دەیتوانی سووڕە ناپەسەندەکانی پیلانگێڕی بشکێنێ و ئەڵتەرناتیڤەکانی چارەسەری پێشبخات. لەو بارەوە جگە لە متمانە بەخۆکردن هیچ چارەیەکی دیکەم نەبوو. لەبنەڕەتدا نیازی پیلانگێڕان و ئەو هێزانەی ڕۆڵیان تێدا بینی زۆر جیاواز بوو. لە کەسایەتی مندا خوازیار بوون PKKو بزووتنەوەی ئازادی لەناوببەن. کردەوە و ڕەفتارەکانی زیندان، هەڵوێستەکانی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا و یەکێتی ئەوروپا گرێدراوی ئەو ئامانجە سەرەکیە بوو. ئامانجیان بزووتنەوەیەکی کوردان بوو لەمن پاککرابێتەوە. خوازیاربوون

ڤێرسیۆنێکی مۆدێرنی بەکرێگیراوێتی نەریتی خەسێنراو ئاوا بکەن کە لە خزمەتی سەردارەکانی دابێت. بەتایبەتیش هەوڵە درێژخایەنەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا لەو چوارچێوەیەدا بوو. هێزی دەسەڵاتداری تورکیش لەسەر ئەو بنەمایە بۆ ڕێککەوتن کراوە بوو. بەکورتی؛ ئەو مۆدێلەی خەساندن کە بەتایبەتی هەژموونگەرایی ئینگلیز سەرەتا لەسەر بزووتنەوەی چینی کارکەر، دواتریش لەسەر بزووتنەوەکانی ڕزگاری نیشتیمانی و بزاوتە دیموکراسیخواز ـ شۆڕشگێڕەکان بەشێوەیەکی سەرکەوتوو جێبەجێی کرد، لەمیانەی ڕێبازی لیبڕالیانەی ئازادی و مافی مرۆڤ بە سەرکەوتن گەیشتبوو. ڕێکخستن و سەرکردە شۆڕشگێڕەکانیان لەناوبرابوون. هاوشێوەیەکی ڕێبازە سەدان ساڵیەکانی لەناوبردن لەسەرPKK و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی، یەکسانی و ئازادیخوازی هاوبەشیخواز جێبەجێ دەکرا. ئەوە ئەو ئەنجامە سەرەکیە بوو کە لە قۆناغی ئیمڕالی چاوەڕوانیان دەکرد، ئەوە ئەو پیلانە بوو کە کارێکی زۆریان بۆ کردبوو، بەشێوازێکی پسپۆڕانە هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدان. ستراتیژ و تەکتیکەکان لە چوارچێوەی ئەو پیلانەدا پێشدەخران. ئەو بەرگرینامەیەی لە بەرامبەریاندا ئامادەم کرد پشتی بە هەڵوێستی دۆگماتیکانەی ئۆرتۆدۆکسی کلاسیک و خۆرزگارکردن و باشترکردنی هەلومەرجەکانم نەدەبەست. ئەو شتەی بەرگرینامەکانمی ئاراستەکرد، ڕێبازی ئاشتی شەرەفمەندانە و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە بوو کە بە پرەنسیپە و بەگوێرەی ڕاستینەی کۆمەڵایەتی و مێژوویی گەلانە.

### ج) وەرچەرخانی ڕادیکالانە لە PKKدا

ئاشکرابوونی تەنگژەی سۆسیالیزمی زانستی لە هەڵوەشانەوە ناوخۆییەکەی یەکێتی سۆڤێت و پیلانگێڕییە گەورەکەی ١٩٩٨ی گلادیۆ؛ PKK ی ناچاری وەرچەرخانێکی ڕیشەیی کرد. نادیاریەکەی سەردەمی گروپی ئایدیۆلۆژی، چارەسەرنەکردنی کێشەی دەوڵەت، دەربازنەکردنی ئەو پیلانگێڕییە ناوخۆیی و دەرەکیانەی لە ئەزموونی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕیدا دەرکەوتن PKKی بەرەو سوورێکی ناپەسەندی درێژخایەن و خۆدووبارە کردنەوە دەبرد، ئەوەش بنبەستبوون و هەڵوەشانەوەی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا. زۆر پێشتر ئەو واقیعەم بینیبوو. ئاستە ڕۆشنبیرییەکە یان بەهرە و توانا ئایدیۆلۆژییەکانیان سنووردار دەکرد. قووڵایی چەواشەکاری و خراپەکاریەکانی سەر ناسنامەی کورد شەڕی مان و نەمانی بەرەو بێ هیوایی دەبرد. لەگەڵ بەرئەندامگەلێکی کادیران کە بە مانا لیبڕالیەکەشی خاوەن حەسرەتی ئازادی نەبوون، بە زۆر و زەحمەتیەکی زۆرەوە هەوڵی ئاواکردنی گروپمان دەدا. ئەگەر بیرەوەریەک بگێڕمەوە لەوانەیە دۆخەکە باشتر مایەی تێگەیشتن بێت. لەکاتێکدا بەهەموو هێز و توانایەکمەوە هەوڵی ئاواکردنی گروپم دەدا، کاتێک هەڤاڵێکی خەڵکی وارتۆی بەناو ئیسماعیلم بە برینداری و پێچراوی بینی، لێم پرسی؛ چی ڕوویداوە، لە وەڵامدا گووتی:"کاتێک خەریکی هەڵواسینی ئافیشەکانی "ڕزگاری

گەل" بووم کەوتم و ئەوەم بەسەرهات". بەشێوەیەکی بێ ئومێدانە سەیرم کرد و بەبێ ئەوەی پێویستی پرسینی هۆکاری ئەو کارەی لێ بکەم بەخۆمم گووت:"تا چەند دەتوانی ئەوکارە لەگەڵیان بەرەو پێشەوە ببەیت!". کەسانی هاوشێوە تەنیا ئەمجۆرە رەفتارانەیان لەناو گروپە چەپەکان پیشاننەدەدا، بەڵکو لەناو گروپە فاشیست و ئایینگەراکانیشدا پیشانیان دەدا. کاتێک تێکۆشان لەپێناو ناسنامە و ئازادی خۆشیان جێگای باس بووایە لەمەیدان نەدەمان و ون دەبوون. نامۆبوونێک جێگای باس بوو کە کەسایەتی کوردی پارچە پارچە کردبوو و تێکیشکاندبوو. لە چەوساوەترین و رەنجدەرترین کەسیەوە تا دەگاتە کۆمپرادۆر، ئاغا و سەرۆک خێڵ هەموویان بەمجۆرە بوون. لەبنەڕەتدا ئەو زەمینە کلتوورییە ماددییە و نەبوونی بەهای کلتووری خۆیی پەرەسەندنی گروپیان دەکردە ناچارییەک.

کاتێک ناوی PKK مان بۆخۆمان دانا، لەراستیدا لەدوا دەرفەتدا هەنگاوێکمان بۆ رزگارکردنی ناموس و رووسپیکردنەوە دەهاوێشت. ئەگەر سەرکەوتووش نەبێت وەک میراسێکی باش بۆ مێژوو دەمایەوە. قۆناغی کۆچکردن و جێگیربوون لە خۆرهەڵاتی ناوین هەم دەرفەتی بەرێکخستنبوونی رەخساند هەمیش وایکرد لەمیانەی شەڕی گەلەوە تۆکمەتر ببێت. وەک ئاماژەم پێکرد، وەک نموونەی تیرە عیبرانیەکانی حەزرەتی موسا بە زەحمەتیەوە بەڕێوەی دەبردن و دەستبەرداری پەرستنی گۆلکی زێڕین نەدەبوون، واتە بەهیچ جۆرێک وازیان لە ژیانە نامۆکەی خۆیان نەدەهێنا. چەندە چانس و دەرفەت بڕەخسێت و وەک حەزرەتی موسا هاوار بکەم، پەیامەکەم وەک تراویلکەی سەرابێکی بیابان دەمایەوە. سەبر و پێداگری ببوون بە گەورەترین چەکەکانم. جۆر و شێوازی رێکخستنی مۆدێرنیستم بەلاوەنا و بۆ زمانی خۆجێیی و خاک گەڕابوومەوە. لەخۆڕا یاخود بەئامانجی خۆ پیرۆزکردن باسی گەڕانەوە بۆ ژیانی پێغەمبەرانەم نەدەکرد. لە پێناو گەیشتن بە زمانی حەقیقەت پەنام بۆ ئەو رێبازە دەبرد. کۆبوونەوە فەرمیەکان مانای خۆی لەدەستدابوو. چیتر تەرمینۆلۆژی رێکخستنی فەرمی سۆسیالیزمی بونیادنراو کاری نەدەکرد. نەک تەنیا سێیەمین کۆنگرەکەی ساڵی ١٩٨٦، بەڵکو چەندین کۆبوونەوەی هاوشێوە مانایەکی زۆر کەمیان هەبوو. ئەوەی لە ئارادابوو بەرخودان بوو لەبەرامبەر سیاسەتکردن و رێکخستنی شۆڕشگێڕانە. لەناوەوە یاخیبوونێک بەرامبەر ئەو شێوازەی ژیان لەئارادابوو کە مانای سیاسی و رێکخستنی لەخۆوە دەگرت. ئەو قەوارانەی بە چەپی تورکیا ناودەبران لەبەر هەمان هۆکار لەمێژبوو خۆیان دووچاری تەسفیە کردبوو. وەک مەزەندە دەکرێت هۆکاری سەرەکی تەسفیەبوونی ئەو هێزانە فاشیزمی ١٢ ئەیلول نییە، بەڵکو پەیڕەونەکردنی رێکخستنی شۆڕشگێڕی و شێوازی ژیانی سیاسییە. منیش لەمیانەی نەسرەوتن و پێداگریکردن لەسەر رێکخستنی سیاسی و شێوازی ژیانی شۆڕشگێڕانە هەوڵی مایەپووچکردنی ئەو واقیعەم دەدا کە لەناو PKK شدا جێگای باس بوو. لە ساڵی ١٩٩٠ بەدواوە کاتێک شەڕەکانی گلادیۆ خەست بوویەوە و رەنگدانەوەی لەسەر پیلانگێڕییە ناوخۆییەکان زیادی کرد، دارزین و پووکانەوەی رێکخستن و شێوازی ژیانی

شۆڕشگێڕانەش پەرەیسەند. ئیتر زەمینەی ئاغایەتی شەڕ و چەمکی ڕێگری یاخی و ئاوارە ڕەخسابوو، زیادبوونی ڕێژەی شەهیدبوون و لە دەستدانی ئەو شەڕڤان و کادیرە هێژایانەی بۆ پارتیبوون گونجاو و لەباربوون PKKیان بە لێواری تەسفیەبوون گەیاند. ئیتر ئەو کارانەی بەناوی PKK ئەنجامدەدران بەئاشکرا وەک ئانتی پەکەکەییبوون ڕەخنەم دەکرد و تەنانەت تۆمەتبارم دەکرد. لەساڵی ١٩٨٦دا کاتێک بەشداری بەشێکی کۆنگرە نەبووم، هەروەها کاتێک لە ڕۆما بووم و لەو پەیامەی بۆ کۆنگرەی ١٩٩٨ ناردم گووتبووم: "ئەگەر وەها بەردەوام بێت لەناو PKK نامێنم و دەست لەکار دەکێشمەوە" دەمویست ئاماژە بەو واقیع و ڕاستیانە بکەم.

قۆناغی ئیمڕالی واقیع و ڕاستینەی ژیانکراوی ناو PKK ی ئاشکرا کرد. کاتێک لەدەرەوە بووم ئەو کەسانەی بە دەمامککراوی دەجووڵانەوە، سوودیان لە دۆخی دیلێتی من وەرگرت و لە پیشاندانی ناسنامە ڕاستەقینەکەی خۆیان دوودڵییان نەکرد. میراتێکی زۆر گەورە و جددی PKK لەئارادابوو. ئەو ڕووداوەی بە کێشمەکێشی ناوخۆ ناودەبرێت، لەڕاستیدا شەڕی میراتگری ئەو کەسانە بوو کە بەتەواوی هیوای سەرکەوتن و داهاتوویان لەدەستدابوو و لێکدانەوەیەکی بەمجۆرەیان نەمابوو. ئیتر ئاشکرا ببوو کە بەرەو گروپگەرایی چرووک هەنگاویان نابوو. گروپچێتی و لیبڕالیزم لەناویەکتر بوون. ژیانی هەرەمەکی و ئارەزووی تاکەکەسی تەنیا لەمیانەی گروپچێتیەوە فەراهەم دەبوو. لەو پێناوەشدا لەژێر ناوی تێکۆشانی ناوخۆیی پارت لەخستنەڕووی چاوچنۆکی و ئارەزووەکانی خۆیان دوودڵییان نەکرد. ئەنجام بەخێرایی بەرەو لەناوچوونی یەکێتیی PKK دەچوو. ئەو گروپە تەسفیەکارییەی کاتێک لەدەرەوە بووم ڕێگیرییان لێنەکرا، دۆخە نوێیەکەیان وەک دەرفەتێکی زێڕینی حیسابی دوایی دەبینی. لەو قۆناغەدا وەک پێویستییەکی پیلانگێڕی؛ یەکێتی ئەورووپا ئامادەکاری دەکرد PKK بخاتە لیستی "ڕێکخراوە تیرۆریستەکان"ـەوە. چاوەڕوانی درێژخایەنی بۆ وەرگرتنی ئەو بڕیارە هۆکارەکەی بۆ ڕازینەبوونی هەندێک لە وڵاتانی ئەورووپا دەگەڕایەوە. وابزانم دیلبوونم ئەو وڵاتانەشی هیواشکێن کردبوو. هەروەها ئەمریکا و ئینگلتەراش هەوڵی نەخشە بۆدانراویان بەو ئاراستەیەدا هەبوو. هاوکاریەکی بەهێزی تورکیایان دەکرد. یەکێک لە گرنگترین بیانووەکانی ئەو هاوکارییە ڕاگەیاندنی PKK بوو وەک "ڕێکخراوێکی تیرۆریست". زیادبوونی فشارەکان و ئەو بەڵێنانەی پێشکەشی یەکێتی ئەورووپا کران بە ڕاگەیاندنی PKK وەک "ڕێکخراوێکی تیرۆریستی" ئەنجامگیر بوو. ئێمەش دەستی خۆمان پێشخست و KADEK مان ڕاگەیاند. بانگەوازی دامەزراندنی کۆنگرەی گەلمان کرد.

### ١ ـ ئەزموونی KADEK و KONGRA GEL و وەرچەرخانی PKK

لەو هەلومەرجانەدا سیاسەتکردن بەناویPKK هەر تەنیا مەترسیدار نەبوو، بەڵکو مانای خۆ تەسفیەکردنیش بوو. خۆی لەخۆیدا PKK بێناوەڕۆک کرابوو، وەک ناویش

خزمەتی تەسفیەکارانی دەکرد. بەو ئامانجەی پارێزگاری لە میراتەکەی بکرێت و بەکەمترین زیانەوە لە قەیرانە بەرجەستەکەی دەرکەویت. بەباشمان زانی بزاڤی ئازادی لەژێر ناوێکی دیکە درێژە بە خەبات و تێکۆشانی خۆی بدات. پێویستی بە ناو و تەرمۆنۆلۆژییەکی نوێ هەبوو کە هەم هەلومەرجە دەرەکییەکانی ئەو قۆناغە هەمیش ئەو هەلومەرجە ناوخۆییانە ڕەچاو بکات کە ڕێگایان لەپێش تەنگۆ کردەوە. هەوڵدان و بەدواداچوونی تەرمۆنۆلۆژی نوێ مانای نکوڵیکردنی PKK نەبوو. تا تەواوبوونی جیابوونەوەکان بەشێوەیەکی کاتی بەلاوەنانی ناوی PKK لەبواری تەکتیکیدا گونجاو و ڕاستتر بوو. خوازیاربووین ناوی PKK لەدەست تەسفیەکاران دەربخەین تا وەک چەکێک بەکاری نەهێنن. ڕێکخراوەکانی لەجۆری کادەک و کۆنگرەی گەل دەیانتوانی وەڵامی پێویستییەکان بدەنەوە. لەوەش گرنگتر، بە وەرچەرخانێکی جددیدا تێپەڕدەبووین. ئەوە نوێبوونەوەیەکی ڕیشەیی بوو، لەو سۆنگەیەوە؛ بزووتنەوە لەژێر ناوێکی نوێ سەرکەوتووتر دەبوو. لە چەندین وڵاتی سۆسیالیستیدا ئەزموونی هاوشێوە جێگای باس بوو. ئەوەی هەوڵی ئەنجامدانمان دەدا، مانای لاسایی کردنەوەیان نەبوو. بەپێچەوانەوە داهێنانێکی جیاواز و مانادار لەئارادا بوو. لەیەکەم ڤێرسیۆنی بەرگرینامەکانم و ئەو نووسراوانەی بۆ PKK م ڕەوانە کردن هەوڵی دیاریکردنی هێڵە گشتیەکانی وەرچەرخانم دا. ڕێگەچارەی دیموکراتییانە کلیلی دەستەواژەی وەرچەرخان بوو. یەکەمین شیکارەکانی سەبارەت بە دەستەواژەی "دیموکراتیک" تا بڵێی بەرتەسک و ناتەواو بوون. بەڵام خاڵێک بۆ من زۆر ڕوون و ئاشکرابوو: هەڵوێستی یەکلاکەرەوە و مسۆگەرم بەرامبەر دیموکراسی لیبڕاڵ هەبوو کە دوای هەڵوەشانەوە و پەرتەوازەبوونی سۆسیالیزمی بونیادنراو بەشێکی بەرچاوی چەپی کۆن و پارتە کۆمۆنیستەکان ڕوویان تێکرد. سۆسیالیزمی بونیانراوم وەک سیستەمێک شیکار دەکرد کە لیبڕالیزمی بەهێزکردووە. لە لێگەڕین و بەدواداچوونێک دابووم کە هەردووکیان مەحکوم دەکات. لە هەوڵەکانی لێگەڕین و بەدواداچوونمدا دەستەواژەی "دیموکراتیک" ڕۆڵی کلیلی دەبینی بەڵام ناتەواو بوو.

دواتر سەبارەت بە دەستەواژەی سیاسەت ـ پۆلیتیکا قاڵبوومەوە. دەستەواژەی سیاسەت (پۆلیتیکا) کە دەوڵەت نییە و گوزارشت لە بەرژەوەندییە ژیانییەکانی کۆمەڵگا دەکات، وەک دووەمین دەستەواژەی گرنگ جێگای خۆی لە ڕۆژەڤی مندا کردەوە. سیاسەت وەک دژی ئیدارەی دەوڵەت هەڵدەسەنگێنم. لەو سۆنگەیەوە؛ فەلسەفەیەکی سیاسی و دیموکراتیک خۆی وەک ئەڵتەرناتیڤێکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگا لەلایەن دەوڵەتەوە پێشکەش و مانادار دەکرد. مایەپووچبوونی بونیادنانی سۆسیالیزم بەدەستی دەوڵەتەوە، منی بەرەو لێکۆڵینەوە دەرهەق بە چەمکێکی ڕاستی بونیادنانی سۆسیالیزم برد. لەوانەیە فەلسەفەی سیاسەتی دیموکراتیانە ببووایە بە هەنگاوێکی زۆر گرنگ کە بەو ئاراستەیەدا بهاوێژرێت. لەبواری کرداریشدا گەلەکەمان بەرخودان و خۆڕاگریەکی گرنگی بەرامبەر دەوڵەت ئەنجام دابوو. بەڵام بەهۆی دووری خەباتکار و کادیرانیPKK لەداهێنان و خولقکاریەوە تۆزێک مابوو ئەو خۆڕاگرییە بەفیڕۆ بچێت. کاتێک لێکۆڵینەوە و

بەدواداچوونم بۆ دۆزینەوەی ڕێگای بەربەستکردنی ئەو دۆخە دەکرد، بڕوام بەوە هێنا کە ڕێبازی سیاسەتی دیموکراتیانە و فەلسەفەکەی گونجاوترین هەڵوێستە. ئەوە گرنگترین وانەبوو کە لە ئەزموونی رووسیای سۆڤێت وەربگیردرێت. سووربوون لەسەر چەمکی پارتی کۆمۆنیستی کلاسیکی سۆسیالیزمی بونیادنراو کە لەمێژبوو بنبەست ببوو بە هەڵوەشانەوەی ناوخۆیی ئەنجامگیر ببوو، دەبوو بە محافەزەکاری و بێچارەیی. خۆی لەخۆیدا رۆڵی ئەو پارتانە لەبنبەستبوونی سۆسیالیزمی زانستیدا بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دەرکەوتبووە روو. بەمجۆرە پاراستنی PKK مانای ڕێگریکردن بوو لە محافەزەکاری و تەسفیەکاران. وێڕای ئەوەش شەنەکردن بەگوێرەی بای دیموکراسی لیبڕال پەسەند نەکراو بوو کە تەواوی میراتی سۆسیالیزمی بونیادنراو رەت دەکاتەوە و بەخراپی دادەنێت. دیموکراسی لیبڕال دیموکراسی ساختە بوو. چەمکی سۆسیالیزم و چەپگەرایی لیبڕالیش کە مانای لایەنە چەپەکەی دەبەخشی بەتەواوی واتای تەسفیەکاری بوو؛ بەمانایەکی تر، خاوەنداریێتیکردن بوو لە سەرمایەدارییەکەی بونیادی سۆسیالیزمی بونیادنراو و وەرچەرخاندنی بوو بۆ سەرمایەداری تایبەت. پاراستنی بەهاکانی بەرخودانی PKKو گەل لەو دوو چەمکە و کردارە مەترسیدارە گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. ئەوە ئەرکە بەپەلەکە بوو. خاوەنداریێتیکردنێکی راست لەو ئەرکە، پێویستترین و مانادارترین وەڵام بوو بدرێتەوە ئەو کەسانەی خوازیاربوون میراتیPKK بکەن بە ئامرازی هیوا خۆپەرستەکانیان و لیبڕالیزمێکی پووچ لەسەر بەهاکانی بەرخودانی مێژوویی گەل بونیاد بنێن.

لەو چوارچێوەیەشدا وەک دوو ئامرازی کاتی و قۆناغ بیر لە کادەک و کۆنگرەی گەل کرایەوە کە بتوانێت بە دروستترین شێواز خاوەنداریێتی لە میراتی مێژوویی شەڕی شۆڕشگێڕی گەل و PKK بکات. جێبەجێکردنی سەرکەوتووانەی رۆڵەکەیان لەمیانەی هەڵسەنگاندنێکی پووختی قۆناغ، دەستنیشانکردنێکی راست بۆ ئەرکەکانیان و خاوەنداریێتکردنیان فەراهەم دەبوو.

ئەو قۆناغ و پرۆسەیەی لەگەڵ دەوڵەت جێگای باس بوو، لە لێکۆڵینەوە و دادگاییکردن زیاتر، بەشێوەی هەوڵەکانی گەڕان بەدوای ڕێگەچارەی سیاسیدا بەڕێوەدەچوو. سەرەڕای ئەوەی تەواوی هەلومەرجەکان پێچەوانە بوون و PKKش بەهەموو هێز و توانای خۆیەوە شەڕی دژوار دەکرد، تاوتوێکردنی قۆناغی ئیمڕالیم وەک دەرفەتێکی ڕێگەچارەی سیاسیانە لەجێگای خۆیدا بینی. باجەکەی لە سێدارەدانیش بێت لەو بڕوایە دابووم کە ئەمە ڕێگایەکە پێویستە بەر لەهەموو شتێک تاقی بکرێتەوە. لەو بڕوایە دابووم کە تەنیا بەمجۆرە پیلانگێڕی مایەپووچ دەکرێت. دژواربوونی شەڕ، ئەگەرەکانی زیانی قورس و ژێرکەوتن، رەوشەکەی بەرەو دۆخێکی هاوشێوەی ئەو تابلۆیە دەبرد کە لە ماوەی نێوان ساڵانی ١٩٢٥ ــ ١٩٤٠ لە ئارادابوو. پێشبینی نەخشەی پیلانگێڕییش بەمشێوەیە بوو. نوێنەری سوپاسالاریش رەوشەکەی وەک پیلانگێڕی شیکار دەکرد. هەرچەندە ئامانجەکانیشیان جیاواز بوو، بەڵام دەبوو ئەو هەڵوێستە رەچاو

بکرێت. ڕێگایان دابوو نامەگۆڕینەوە لەگەڵPKK دا بکەم. لەنامەکاندا ئەنجامی دیدارەکانیشم پێ ڕادەگەیاندن. پاشەکشێی یەکلایەنەشم وەک تەکتیکێک بینی کە دەبووایە لەو هەلومەرجانەدا ئەنجام بدرێت. هەڵوێستێک بوو پەلەی لێکرا و هێندەش بیر لە هەلومەرجەکانی نەکرایەوە. داسەپاندنێکی بەمجۆرەی دەوڵەتیش جێگای باس نەبوو. بەڵام ئەوەی لە بنەڕەتدا منی بەرەو ئەمجۆرە تەگبیرە برد زهنیەتی پیلانگێڕی و کەشوهەوا قورسەکەی شۆڤینیزم بوو کە لە تورکیا ئافرێنرابوو. ئەو ئۆپەراسیۆنانەی لەکاتی پاشەکشێدا چڕبوونەوە و زیانەکانمان پیشانیدا کە هێزەکانی ئاسایش و دەزگاکانیان ئەو پاشەکشێیەیان وەک قۆناغێکی لەناوبردن بینیوە و لەوچوارچێوەیەدا قۆستوویانەتەوە. هەوڵیاندا هەنگاوێکی نیاز پاکیمان لەمیانەی لۆژیکی لەناوبردنەوە بەکاربێنن. ئەوەش هەڵەیەکی زۆر جددی بوو. بە ئەندازەی هاندان و گێرەشێوێنیەکانی هێزە دەرەکیەکان و کێشەی تەندروستی سەرۆک وەزیران بلند ئەجەوید و هەوڵەکانی تەسفیەکردنی، هەڵوێستە نەرێنیەکانی MHP و بڕیاری هەڵبژاردنی پێشوەخت ڕۆڵێکی گرنگی لەو دۆخەدا بینی.

زەمینەی ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانەی چاوەڕوانکراو ئەنجامگیر نەبوو. بەلانی کەم هێندەی ئەگەری ئاشتی و ڕێگەچارەی سیاسی ساڵانی ١٩٩٣و ١٩٩٨ ئەو هێزانەی لەساڵی ١٩٢٥ تورکیایان خستۆتە ناو زەڵکاوی دژە ـ کوردەوە و هەوڵی کۆنترۆڵکردنی دەدات ڕۆڵێکی گرنگیان هەبوو لە بەفیڕۆدانی ئەگەری ئاشتی و چارەسەری سەرەتای ٢٠٠٠ کان. زۆر لەوە زیاتر کە دیارە و دەبینرێت کێشەی کورد ئامرازی چەواشەکاری سیستەمی هەژموونگەراییە. بە بێچارەیی هێشتنەوەی ئەو ئەنجامەیە کە سیستەمی هەژموونگەرایی ئارەزووی دەکات. سەبارەت بە تورکە سپییە فاشیستەکانیش ئامرازی بەڕێوەبردنی سیاسەتی ناوخۆییە لەرێگای شەڕەوە. تا کێشەی کورد بە چارەسەرنەکراوی بهێڵرێتەوە، ئەوا بەڕێوەبردنی وڵات لەمیانەی لۆژیکی شەڕی ناوخۆییەوە دەست لێبەرنەدراو دەبێت. بەردەوام گوتەکانی "هەڕەشەی ناوخۆیی و دەرەکی" و"یەکێتی و یەکپارچەیی وڵات" لە ڕۆژەڤدا دەهێڵنەوە و دۆخی شەڕ بەردەوام دەبێت. بەمجۆرەش دەرفەت بۆ سەرمایەداری قۆرخکاری دەوڵەت دەڕەخسێت لەمیانەی سەرەڕۆییەکی بێهاوتای دەوڵەت ـ نەتەوەوە بە ئارەزووی خۆی وڵات بچەوسێنێتەوە و بەکاری بێنێت. واتە کوردان تەنیا لە دۆخی کۆمەڵگا و مرۆڤبوون بەدەرنانرێن، بەڵکو وەک لەبارترین ئامرازی یاسای زۆرترین قازانجی سەرمایەداری بەکاردەهێنرێن. سیاسەتی شەڕی ناوخۆیی داسەپێنراوی سەر کوردان نەبێت، سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوەکەی تورکیا بەڕێوە نابرێت. لەوەش مەترسیدارتر ئەوەیە کە ئەو سیاسەتەی شەڕی ناوخۆ بەشێوەیەکی یەکلایەنە و بە سیفەتی سیاسەتی شۆڕش بەڕێوە دەبرێت. هەرچی ئەو سیاسەتانەیە کە بانگەشە دەکرێت لەپێناو یەکپارچەیی و یەکێتی نەتەوەیی و دژی دوژمنە ناوخۆیی و دەرەکیەکان بەڕێوەدەبرێت، لەناوەڕۆکدا سیاسەتگەلێکە لەلایەن خودی سیستەمی هەژموونگەراییەوە ئاواکراوە و لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا بەڕێوەی دەبات.

ئەوەی لەسەرەتای ٢٠٠٠ کان دژی ئاشتی کوردان و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە وەستایەوە هەمان سیاسەتی نەریتی هەژموونگەرایی بوو. هەرچەندە لەژێر ناوی میللیگەرایی و نەتەوەپەرستیەوە بانگەشەی جێبەجێکردنی بکرێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا سیاسەتێکی ئیمپریالیستی، داگیرکاری و کۆمەڵکوژین.

کاتێک بەرگرینامەکانی ئیمڕالیم ئامادەکرد، شیکارکردنی ئەو گرێکوێرەی کوردم بە بنەماگرت. ئەوەش هەنگاوی هەرە راست بوو. زۆر بەڕوونی ئاشکرا ببوو ئەگەر ناڕوونی و تاریکیەکانی راستینەی کورد رۆشن نەکرێتەوە ئەوا راستینەی بەرگرینامەکانیشم هیچ مانایەکی نەدەبوو. دوای تاقیکردنەوەی هەر شتێک لەپێناو ئاشتی و چارەسەریدا، ئیتر نۆرەی شیکارکردنی هۆکارە مێژوویی ـ کۆمەڵایەتیەکانی ئافرێنەری ئەو تاریکییە هاتبوو. یەکەمین کورتە بەرگرینامەکەم لە دادگا بانگەوازییەکی خاکیانەی ئاشتی بوو. دووەمین گەورە بەرگرینامەشم توانای کردنەوەی گرێکوێرەکەی هەبوو. ئەو بەرگرینامەیەی بۆ دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپاش ئامادەکرابوو لەناوەڕۆکدا لێکۆڵینەوە بوو لەبارەی راستینەی کورد و بوونی کوردان لەبەرامبەر شارستانیی و مۆدێرنیتەدا. سەرمایەداری بە بەرپرسیاری سەرەکی سەرهەڵدانی کێشەی کورد دادەنا و بۆ یەکەمین جار بوو ناوەڕۆکی دیموکراتیانەی چارەسەری لە دەوڵەت ـ نەتەوە جیادەکرایەوە. هەر ئەو هەڵوێستەش ناوەڕۆکی وەرچەرخانەکەیPKK ی پێکدەهێنا. جیاوازی نێوان رێگەچارەی دیموکراتی و دەوڵەتی دەخستەڕوو کە لەسەردەمی گروپەوە یەکلا نەکرابوویەوە. لەو خاڵەدا لە سۆسیالیزمی بونیادنراو و روانگە مارکسیست ـ لینینستییە کلاسیکیەکەی پاشخانی جیادەبوویەوە. مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکانی لەچوارچێوەی مافی بۆرژوازی دەرخست، خستیە ناو چوارچێوەی دیموکراسی کۆمینالەوە. واتە بەبێ ئەوەی بە دەوڵەتگەراییەوە بلکێت و بکەوێتە ناو لێگەڕینەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و لەو چوارچێوەیەدا ناچاری چارەسەری بکرێت، کێشەی کورد لەناو مۆدێلە دیموکراتیەکانی بەڕێوەبەرایەتی کۆمەڵگادا چارەسەر بکرێت. ئەمەش ناوەڕۆکی وەرچەرخانەکەی PKK بوو. کادەک و کۆنگرەی گەلیش گوزارشتیان لەو راستینە و واقیعە دەکرد.

پێچەوانەی ناوەڕۆکی ئەو بەرگرینامانەی لەو قۆناغانە پێشکەشم کردن جارێکی دیکەش تەسفیەکاری ناوخۆیی لەساڵانی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ سەریهەڵدایەوە و بەشێوەیەکی بەرفراوان کەوتە رۆژەڤەوە. شانبەشانی تەسفیەکارییەکی بەرفراوان و هەمەلایەنەوە کاتێک پارێزەرەکانم لەکاتی خۆیدا و بەشێوەیەکی تێروتەسەل زانیارییەکانی سەبارەت بە رووداوەکانیان پێرانەگەیاندم لەلایەن دەستکەوت و بەهاکانی گەل و پارتی بەفیڕۆچوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە کادیران و شەڕڤانانی خاوەن بەهایەکی گەورەی ماددی و مەعنەوین. هەروەک چۆن بەشێوەیەکی گشتی لە شۆڕشەکان پارت و شەڕی گەل لە قۆناغی وەرچەرخان دووچاری دێن، ئەوا لە مێژووی ئێمەشدا لەنێوان دووجەمسەری تێژدا تووشی گەورەترین تەسفیەکاری هات.

## ٢ . واتای تەسفیەکاری قۆناغی ٢٠٠٢ . ٢٠٠٤ و گرنگی تێکۆشان لە بەرامبەریدا

مێـژووی PKK مێژوویەکــە بەیەکــەوە لەگــەڵ تەســفیەکاری پەرەیســەندووە. هــەر لەسەردەمی قۆناغی گروپەوە بەردەوام PKK دووچاری هەوڵەکانی تەسفیەکاری هـاتووە. چەندە پارتیمان پەرەیسەندووە دووچاری تەسفیەکاری قـەبارە گـەورەتر هـاتووە. ئـەوەی لەنێوان ساڵانی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ ڕوویدا لە تەسفیەکاری بەولاوەتر ڕەنگدانەوەی پیلانگێڕی بوو لەناوەخۆماندا. بەمانایەکی تـر پیلانگێڕی و تەسـفیەکاری تێکـەڵ بەیـەکتر ببـوون. لێک جیانەدەکرایەوە تا چ ڕادەیەک بە ئەنقەستە و تـا چ ڕادەیـەک بـە بـێ ئـاگـایی ڕوودەدات. زەمینەکە دەرفەتی لێک جیاکردنەوەیانی نەدەدا. بەهۆی ئەو زەمینەی پشتیان پێدەبەست کەسـایەتیەکان لەهــەمان سـاتدا بـۆ ژیـانکردنی تەسـفیەکاری و پیلانگێـڕی لـەبار بـوون. بەڕێوەبەرایەتیەک گرنگیەکی ژیانیی هەبوو کـە چـاودێری کەسـایەتی زادەی ئـەو زەمینـە بکات. بەردەوام سەرنجی ئەو خاڵەم داوە و لـەو بـارەوە ئاگـادارم کردوونەتـەوە. کاتێـک سەرقاڵی ئاواکردنی کۆمەڵگابوونێکی شۆڕشگێڕیت، ئەگەر لە قووڵاییدا دەرک بەزەحمەتی ئەو کارە نەکرێت ئەوا ئەسـتەمە ڕێکخسـتن و بزووتنـەوە لـە کۆمـەڵگابوونی کـوردا ئـاوا بکرێت. تەنانەت لەوەش بێ ئاگابوون کە بەڕێوەبەرایەتی پـارت و ڕێکخـراوی شـەڕ چۆن لەو بارەوە لەسەر پێیـان ماونەتـەوە. هـەروەها لەبەرئـەوەی کاریگـەری چـەپی تـورک و کلتـووری مەزهــەبی مێژووییــان لەســەر بــوو، لــە تێگەیشــتنی گرنگــی و جیــاوازی کۆمـەڵگابوونی شۆڕشـگێڕی و چالاکیـەکانی دوور بـوون. کاتێـک کـۆنترۆڵ و چـاودێری نزیکمــان جێگــای بــاس بــوو، لــە دەرخســتنی ئــەو جــۆرە لاوازییــەیان دوودڵ بــوون و کۆنترۆڵیان دەکردن. ئەگەر لە ناخەوەش نەبێت هەوڵیاندەدا خۆیـان لەگـەڵ کەشوهەوای ڕێکخستنی بگونجێنن. لەجیاتی ئەوەی دیسـپلینی ڕێکخسـتن و کرداری وەک پێویسـتیەکی ژیـانی ئـازاد ببیـنن، وەک کۆسـپێکی بـەردەم ژیـانی ئارەزوومەنـدی خۆیانیـان دەبینـی. زهنیــەتی قەبیلەگــەرایی و خێزانگــەرایی تــا مــۆخی ئێســقانیان چوبــوو. کاتێــک ئــەو هیچبوونەشی هاتەسـەر کـە وەک تـاک تێیـدا دەژیـان، بونیادێکیـان دەهێنـا ئـاراوە کـە بەرگەگرتن و ئیدارەکردنی زۆر ئاستەم بوو. سەرجەم ئەو خاڵانەی ڕیزمـان کـردن دەشێت وەک ڕاستییە گشتیەکان مایەی تێگەیشتن بێت. بـەڵام کاتێـک لـە هەستیارترین قۆنـاغی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی پەکەکەدا تـەواوی ئەوانـە بـە فۆرمی بزاوتێکـی تەسـفیەکاری و پیلانگێڕی تێکەڵ بەیەکتر شێوەی گرت، خۆیـان بـەو شـێوازە سـەپاند، واتـە گـەورەترین بزاوتی خیانەت کەوتۆتە ڕۆژەڤەوە. گرنگی و جیاوازی تەسفیەکاری قۆنـاغی ٢٠٠٢ ــ ٢٠٠٤ سەرچاوەی خۆی لەو تایبەتمەندێتیە ڕیشەییەی خیانەت وەردەگرێت.

ڕووبەڕووی جۆرێک لەو نەخۆشیە بووینەوە کە لە مێژووی کوردا بووە بە کانگرێن. وێڕای تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی، ڕێکخستنی و کرداری سی سـاڵە سـەرهەڵدانەوەی هـەمان نەخۆشی مەترسییەکی جددی بوو. هەلومەرجی ئەو شوێن و قۆناغەش کە تێیدا دەرکـەوت

تا دوارادە لەو پێناوەدا گونجاو و لەباربوو. هێزی هەژموونگەرایی سیستەم ئەمریکا، داگیرکردنی ئێراقی دەست پێکردبوو، لە ناوەوەشAKP ی وەک پاشکۆ نوێیەکەی خۆی هەڵبژاردبوو. هەروەک چۆن لە مێژوودا روویداوە دیسان راستەوخۆ هەوڵیدەدا بزووتنەوەی کورد چەواشە بکات و بەلاڕێیدا ببات. هێزی سەرەکی پاڵپشتکردنی شەڕەکانی گلادیۆی دژی بە PKKو ئێمە بوو. بەکرێگیراوی بەهێزی لەبەردەستدا بوو. سەرلەنوێ گلادیۆی تورکیان ئاوا کردەوە. کاتێک تەواوی ئەو هۆکار و فاکتەرانە هاتنە لای یەکتر ئۆپەراسیۆنێکی ناو PKK دەستلێبەرنەدراو بوو. ئامانجیان ئەنجامدانی دوا ئۆپەراسیۆن بوو کە پێشتر لەناوەوە و دەرەوە هەوڵیان بۆ دابوو. دەبووایە ئەو ئامانجە بەدیبێنن کە سی ساڵ بوو هەوڵیان بۆ دەدا. ئامانجی ئەو ئۆپەراسیۆنە کلاسیک و ناسراوە، ئافراندنی باڵێکی بەکرێگیراوی خۆیان لەناو PKKو لەناوبردنی ئەوانی دیکە بوو. ئەوەش رێبازێک بوو کە زۆر جار لە مێژوودا تاقییان کردبوویەوە و تێیدا سەرکەوتوو بوون. ئەو جارە کاتێک لەگەڵ پیلانگێرییە گەورەکەدا کردیان بەیەک لەو بڕوایەدابوون کە سەرکەوتنی تەواو بەدەست دێنن. هێزە پیلانگێڕەکانی ناو شەڕی تایبەتی تورک ئەو جارە بەدەمامکی سەوز و چوارچێوەی قاڵبی ئاکەپەدا کاریان دەکرد و لە جووڵە دابوون. پاشکۆ کوردەکانیشیان لە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) لە پێناو پێگەی فیدراڵی کە پێشکەشیان کرابوو ئامادەی هەموو جۆرە بەکرێگیراوییەک بوون. لەراستیدا لە ساڵی ١٩٨٥دا بەشێوەیەکی ئاشکرا یاخود نهێنی هەموو جۆرە یارمەتی و پشتگیرییەکیان پێشکەش بە تەواوی شاڵاوەکانی گلادیۆ کردبوو. ئەو جارەش بەو هیوایەی لەPKK و شەڕی گەل رزگاریان بێت هەر شتێکی لەدەستیان بهاتایە ئەنجامیان دەدا، هەر واشیان کرد، هەرجۆرە توانا و دەرفەتێکیان بۆ تەسفیەکاری ناوخۆ رەخساند. گوایە خۆیان بە خاوەنە راستەقینەکەی پارت و شەڕی گەل دادەنا، نەیاندەزانی خزمەت بە کامە سەردار دەکەن. ئەندامە محافەزەکار و دۆگماتیکەکانیش کە تەسفیەکاران بەردەوام بۆ خۆیان دەیانکردن بە بیانوو ئەو هێزەیان نەبوو بەرگری لە شەخسی خۆشیان بکەن. بەمجۆرەش بەدەستی خۆیان کۆتاییان بە بزووتنەوەیەکی مێژوویی سەرکەوتوو دەهێنا. بەڵام میراتی PKK میراتێک نەبوو بەمجۆرە لەناو ببرێت.

بۆ تێگەیشتنێکی باشتری چۆنیەتی گەیشتن بەو دۆخە پێویستە سەیرێکی رابردووی نزیک بکرێت.

بەر لە هەموو شتێک بێ ئیرادەیی و کەموکوڕی کەسێتی زادەی ناتەواوی ئازادی و داخورانی ناسنامەی سەردەمی دامەزراندن سەرەکیترین رۆڵی لە گەیشتن بەو دۆخەدا بینی؛ وەک لاوازییەکی گشتی کاریگەری هەبوو. هەوڵێکی زۆر و بەهێز بۆ دەربازکردنی ئەو لاوازیانە جێگای باس نەبوو. بەپێی پەرەسەندنی سەردەم و پرۆسەکە لاوازییە بونیادیەکان زیاتر بەدەرکەوتن. تا کۆنگرەکەی١٩٨٦ سەبرێکی لەرادەبەدەرم بەرامبەر کادیرە تووشبووەکان بەو دۆخە پیشاندا و هەوڵماندا بەیەکەوە بەردەوام بین. دوای ئەنجامدانی هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ لە قەیرانەکەی ١٩٨٦ دا هەڵوێستێکیان پیشاندا کە

مانای "ئێمە چیترمان بۆ ناکرێت" ی دەبەخشی. بەتایبەتیش فشاری زۆر خستنە سەر کادیرانی نەوەی یەکەم راست نەدەبوو. بەڵکو خاوەنداریتیان لە توانا بەردەستەکانیش نەدەکرد. دوای بێکاریگەرکردن و شەهیدبوونی ئەو فەرماندە مەیدانیانەی جێگای هیوا و چاوەڕوانی بوون، لەسەرووی هەمووشیانەوە کەمال پیر، محەمەد قەرەسونگور و مەعسوم قۆرقماز، ناچاربووین بە دووەمین نەوەی کادیرانەوە دەست بە هەڵمەتەکەی ۱۹۸۷ بکەین. وەک بڵێی؛ بە تەنیا قورساییمان خستە سەر ئەو هەڵمەتە. هەموو جۆرە یارمەتیەکیان پێشکەش کرابوو؛ تا کۆتاییەکانی ۱۹۹۲ ساڵانە زیاتر لە هەزار کادیر و جەنگاوەری پەروەردەکراو، بەچەک و تەقەمەنی و بوودجەی خۆیان رەوانە دەکران. پشتگیرییەکی مەزنی گەل لە ناوەوە و یارمەتی دیبلۆماسی و دەرفەتی جێگیربوون لە دەرەوەش جێگای باس بوو. لەناوەوەش سەرجەم سەنگەرەکانمان لەسەر پێ بوون. کاتێک فەرماندە مەیدانیەکانی بە نەوەی ناوین ناودەبران لەسەر ئەو ئامادەکارییە بێ هاوتایانە خەوتن، وەک ئەو شێخانەی خاوەن کەرامەتن ئاشقی خۆیان بوون. دووبارە هەڵکشانی بزووتنەوەیان بە مەعریفەت و لێهاتوویی خۆیان دادەنا. لەراستیدا رۆڵێکی ئەوتۆیان نەبوو. کاتێک لاوازی کەسایەتی و ئاشق بەخۆبوون یەکیان گرت، خۆیان لەناو کەموکوڕی و ناتەواویەک دۆزیەوە کە زۆر لە هی کادیرەکانی نەوەی کۆن خراپتر بوون. هەر نەبێت نەوەی کۆن خاوەنی پرەنسیپ و ئەخلاقێکی سیاسی و رێکخستنی بوو. لە تازە پێگەیشتووەکاندا ئەوەشیان جێگای باس نەبوو. ئەگەر تۆزقاڵێکیش هەبووبێت، لەجیاتی ئەوەی هەلومەرجە سەختەکانی تێکۆشان بەهێزیان بکات، لەناوی بردن. تا ئەو کاتەی جێگیربوونی رێبەرایەتی لە خۆرهەڵاتی ناوین و پشتگیری گەل خۆراکی پێدەدان و لەسەر پێیانیان رادەگرتن ئەوان زیاتر لەخۆبایی بوون.

بەتایبەتیش چەتەی چوارینە لەو بارەوە لە هەرێمی بۆتان پێشەنگایەتی دەکرد. هەرچی ئەوانە بوون کە ئەرکیان لێکۆڵینەوە و بێکاریگەرکردنی خراپەکارییەکانی چەتەی چوارینە بوو، لەژێر سایەی ئەوانەوە رۆژی خۆیانیان بەسەر دەبرد. نیزامەدین تاش (بۆتان)، خەلیل ئاتاج (ئەبوبەکر)، عوسمان ئۆجەلان (فەرهاد)و جەلالی شرناخ لەسەرووی ئەوانەوە دەهاتن. بەمجۆرە بەشێوەیەکی کرداری دەڤەرەکانی بۆتان، بادینان و زاگرۆس کەوتە ژێر کاریگەری گروپی تەسفیەکارەوە. هەرێمی ئامەد (دیاربەکر، بینگۆل، موش و دەوروبەریان) کرا بە کێڵگەی برایانی ساکیک و چروقایا. ئەوانە دەستێومردان و یارمەتیەکی زۆری کادیران و هێزیان مایەپووچ کرد. شیمانە دەکرێت ئامەد یەکەمین هەرێم بێت کە کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ژیتەمەوە. چالاکی پیلانگێڕی ناوخۆ و ژیتەمی پاڵپشت بە PDK ئادەچوو لە بۆتان، بادینان و زاگرۆس کاریگەرییەکەی زیاتر دەبوو. لەگەڵ مەرگی نادیار و شاراوەی دکتۆر باران دەستپێشخەری کەسانی وەک خدر ساری قایا (ئەکرەم) لە هەرێمی دێرسیم زیادی کرد. لەپاڵ تەسفیەکاریدا شەڕ و پێکدادانی بێواتا لەگەڵ رێکخراوە چەپڕەوەکانی دیکە و زیان و شەهیدبوونی نابەجێش خێراتر ببوو. تەرزی جەمال (عومەر ئۆمەرجان)لە هەرێمی تۆڵهەڵدان (مەرعەش، ئادیامان و دەوروبەری)، سەرحەد (خدر

پاڵچین) لە هەرێمی ماردین مەیلی تەسفیەکاری محافەزەکاری زاڵ کردبوو. لە خۆرهەڵاتی ناوینیش لەچوارچێوەی ژێتەمدا رێبەرایەتییان بە لێواری تەسفیەکردن گەیاندبوو. ئەو پیلانگێڕییەی لەسەرەتای مانگی یەکەمی ۱۹۹۰ رێگای لەپێش کوشتنی هەڤاڵ حەسەن بینداڵ کردەوە بەمجۆرە رۆڵی لەناوبردنی ستراتیژی دەبینی.

وێڕای تەواوی ئەو مەیلە پیلانگێڕ و تەسفیەکارانە بەرخودانی کادیران، شەڕڤانان و گەل لە ئاستی قارەمانێتی لە هەڵکشان دابوو. لەساڵانی ۱۹۹۰ بەدواوە هەستکردنی دەوڵەت بە پێویستیی دیالۆگی سیاسی بەرهەمی ئەو پەرەسەندنە بوو. بەڵام کار و کردەوە سنوور نەناسەکانی گلادیۆ و ژێتەمیش بە هەموو ترسناکیەکەیەوە دەستبەکار بوو. ئیتر درزێکی جددی لەناو خودی دەوڵەتیشدا سەریهەڵدابوو. لەژێر ئەو هەلومەرجانەدا ئەو کەسە تەسفیەکارانەی هەر لەسەرەتاوە بەشێوەی چەتەگەرێتی ئاشکرا یاخود بەشێوەیەکی تەڵەکەبازانەتر و لە ژێرەوە خۆیان دەسەپاند زۆر بەباشی دەدرەوشانەوە. زۆر لەسەرووی مەزەندە و شیمانەکانی منەوە هێندە زیادەڕۆییان کردبوو کە خۆیان بە خاوەنە نوێ و راستەقینەکانی گەل و پارت دابنێن. تا دوارادە ئاشقی خۆیان ببوون، بەڵام لە شاردنەوەی ئەو هەڵوێستەیان تا دوارادە شارەزا و پسپۆڕ بوون.

بۆ دەربازکردنی ئەو دۆخە رێبازەکانی پارتی کلاسیک گیرایەبەر. لەمیانەی کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی ناوەندی، کۆنفرانس و کۆنگرەکان هەوڵی دەربازکردنی کێشەکان درا. نوێکردنەوەی کۆمیتەی ناوەندی، دانانی نوێنەری نوێ و گەورەکردنی هێز وەک رێگەچارەیەک بیریان لێکرایەوە. ئاشکرایە کە ئەو جۆرە چارەسەرییانە رەهەندی تەکنیکی و رێکخستنی هەبوو؛ بۆ بناغە و ریشە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکەی شۆڕ نەدەبوویەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ جگە لە بەدەستهێنانی هەندێک ئەنجامی رووکەشی زیاتر بڕی نەدەکرد. لەراستیدا ئەو دۆخەی ئەزموونی یەکێتی سۆڤێت لە ئاستی دونیا دووچاری هاتبوو لە بونیادی پارتیشماندا سەریهەڵدابوو. ئەو هەڵوەشانەوەی دوای حەفتا ساڵ لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا روویدا، بیست و پێنج ـ سی ساڵ دوای دامەزراندنی لەPKK دووبارە دەبوویەوە. بگرە ئەگەر ببوایە بە خاوەنی دەوڵەتیش، دیسان ئەگەری هەڵوەشانەوەی هاوشێوە لە ئارادابوو. ئەو مۆدێلە سیاسی و ئایدیۆلۆژییانەی خۆیان لە دیدگای دەوڵەت ـ نەتەوە رزگار ناکەن لەبواری بونیادیدا بە گرفتن؛ ئانتی دیموکراتین و ناتوانن وەرچەرخانی سۆسیالیستانەی کۆمەڵگا ئەنجام بدەن. ئەگەر لەسەر بنەمای دەوڵەت بێت یاخود پارت، ئافراندنی کەسایەتی و هێزی قۆرخکار، سەرەڕۆ و دەسەڵاتگەرا پێویستییەکی سروشتەکەیەتی. بەڵام تێگەیشتنی ئەو راستییە بەشێوەیەکی بەرچاوتر لەمیانەی تەسفیەگەرێتی ۲۰۰۲ ـ ۲۰۰٤ روونتر بوویەوە.

خیانەتکارە تەسفیەگەراکان تەنیا لە نەرێتی تێکۆشان دانەبڕان، بەڵکو لەناوەخۆشیاندا لێکدابڕان. هەندێک حیسابی تەکتیکی گرنگیان هەبوو. بەر لە هەموو شتێک لەو بڕوایەدا بوون مسۆگەر راستینەی رێبەرایەتی دامەزرێنەریان بێکاریگەر کردووە. بەبڕوای ئەوان هیچ هێزێک نەیدەتوانی رێبەرایەتی رزگار بکات. لەو سۆنگەیەوە؛ خۆیان

بەرامبەر ئەو هەڕەشەیە بێباک دەبینی کە لەوێوە بهاتبووایە. ئەو هێزانەی پاڵپشتی دەکردن لەو بارەوە زەمانەتی پێویستیان پێدەدان. دووەمین لێکدانەوە تەکتیکیەکەیان؛ کادیرە کۆنەکانی لایەنی دۆگماتیکیان لە پێش بوو (خاوەن پرەنسیپیش بوون) ڕووبەڕوویان دەبوونەوە، بێکاریگەر بکرێن. لەو پێناوەشدا ئامادەکارییان کردبوو. زۆربەی بەهاکانی پارت و تێکۆشان لەژێر کۆنترۆڵیان دابوو. بەشێکی گرنگی کادیران و شەڕڤانانیان هەڵخەڵەتاندبوو. ئەو تەڵەکەبازی و فێڵبازییەی بە ساڵان لەنێو ڕیزەکانی تێکۆشان تاقییان کردبوویەوە بالادەستی کردبوون. سێیەمیان؛ خۆیان بە خاوەنە ڕاستەقینەکەی سەرجەم بەهاکان دادەنا. گوایە خۆیان شەڕیان بەڕێوە بردووە و متمانەی گەل و جەنگاوەرانیان بەدەست هێنابوو! ڕێبەرایەتیشی لەناودا تەواوی کادیرانی نەوەی کۆن ڕۆڵی خۆیانیان بینیبوو و ئیتر دەبووایە بەلاوە بنرێن! بەو سیفەتەی کەسانێکن بوونی خۆیانیان سەلماندووە ئیتر بەمافی خۆیانیان دەزانی هەموو شتێک کۆنترۆڵ بکەن و خاوەن گووتە و کردار بن! حیساب و لێکدانەوەکانیان لەمیانەی نەریتی میراتگری و بنەماڵەگەریتی بوو. چوارەمیان؛ ئەو هێزەی پشتیان پێدەبەست و بە ڕەوای دادەنان لیبراڵیزمی نوێی جیهانگیری بوو کە لە ئاستی دونیادا سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو. هەرچەندە زانیارییەکی ئەوتۆیان لەبارەوە نەبوو، بەڵام مەیلی نیوو ـ لیبراڵیزم تەواو بەگوێرەی خۆیان بوو. لەژێر ئەو فاکتەر و هەلومەرجانەدا زەحمەت بوو ڕێگیریان لێبکرێت. کەچی لەڕاستیدا دەرفەتی ئارەزووی ژیانی تاکەکەسیشیان بەدەست هێنابوو کە بەردەوام بە حەسرەتیەوە بوون. ئەگەر کەللەی خۆشیان لەپێناو دانابووایە کەس نەیدەتوانی ئەو گروپە تێکەڵە ژن و پیاوانەی یەکتریان ڕفاند (ڕەڤاند) لە "عەشقەکانیان" جیابکاتەوە. لە کۆتاییدا لەمیانەی بزاوتێکی مەزنی خیانەت بە "ئەشقەکانیان" گەیشتبوون کە ساڵانێک بە حەسرەتیەوە بوون. ئەو ڕاکردنە تەسلیمکارانەی پێشتر بەشێوەی تاک و تەرا ڕوویاندەدا و بە ئاستی ئیعتیرافکاری دەگەیشت ئەوان بەشێوەی گروپ و بزووتنەوەی لیبراڵیزمی نوێ ئەنجامیان دابوو. گوایە لەو ڕێگایەشەوە دەیانتوانی دەوروبەر بخەڵەتێنن و خۆشیان پاک و بێگەرد پیشان بدەن! کاتێک لەڕێگای بزووتنەوەیەکی بەناوبانگی وەکPKK خۆیان وەک گەلاڵەیەکی لیبراڵیزم پێشکەش بکەن لەوانەیە پەسەند کرابووایە. لەوانەیە کۆماری تورکیا، ئەمریکا و لایەنگرەکانی پشتگیرییان لێکردبووایە.

توێژگەلێکی پابەند بە بەهاکانی پارت و تێکۆشان و خاوەن پرەنسیپ کە تادوایی نەریتی ڕێبەرایەتییان ڕەچاو دەکرد، لەسەرووی هەمووشیانەوە کادیرانی نەوەی کۆن کە دۆگماتیزمیان دەرباز نەکرد و لەجێگای خۆیدا هەڵمەتی تەکتیکیان ئەنجامنەدا، هەرچەندە دژی تەسفیەکاران وەستانەوە، بەڵام لەپاراستنی بەهاکان سەرکەوتوو نەبوون. لەو بارەوە کەموکورییەکی زۆریان هەبوو. بەشێوەیەکی ئافرێنەرانە ڕێگریان لە تەسفیەکاران نەکرد و حیسابیان لێنەدەخواستن. بەهۆی کەموکوڕی، بێ تەگبیری و شێوازی کار و جموجۆڵیان کە لەهیچ شتێک نەدەچوو تا دوایی ڕێگای کەسە تەسفیەکارەکانیان ئاوەڵا

کردبوو. ئەوەی ئەنجامیاندا پاراستن یاخود رزگارکردنی کەرامەتی شەخسی خۆیان بوو. کەموکوڕی دۆگماتیزمی ساڵان، کردبوونی بە بینەرێکی بوویەر و رووداوەکان. لە پەیبردن بە گەورەیی شەپۆلە نوێیەکەی خیانەت و تەگبیر وەرگرتن دوور بوون. بەجۆرێک لەجۆرەکان لەپاشماوەی پارتە کۆمۆنیستە کۆنەکان دەچوون. لیبراڵەکان دەستیان بەسەر دەسەڵاتدا گرتبوو، ئەوانیش سەیریان دەکرد.

ئەو رەوشەی هاتەئاراوە، ئەو ئەنجامە بوو کە سۆسیالیزمی بونیادنراو لەPKK دا پێی گەیشتبوو. بەڵام ئەو بزووتنەوەیەی ئاوامان کردبوو لەمێژبوو سۆسیالیزمی بونیادنراوی دەرباز کردبوو، ریشەی خۆی لەناو قووڵایی بناغەی کۆمەڵگا داکوتابوو. هەرچەندە قاڵبی سۆسیالیستی بونیادنراوی دەرباز بکرێت، بەڵام خەسڵەتگەلێکی رەسەن بە دەستهاتبوون. پێشکەوتنی مەزن هەم لەبارەی بوون و ناسنامەی کورد هەمیش لەئاستی ئازادی کۆمەڵگا ئافرێنرابوون. کێشە لەخودی بزووتنەوەکەدا نەبوو، بەڵکو لەرێنمایی و رێبەرنامەکەیدابوو. زیندوویی و پەرسەندنی بزووتنەوە بەردەوام بوو. ئەگەر رەوشەکە و پرۆسەکە راست تاوتوێکرابوایە، بزووتنەوەی ناسنامە و ئازادی بەهێزتر دەبوو و هەنگاوێکی نوێی دەهاوێشت.

رەهەندەکانی تەسفیەگەرێتیم رەچاوکرد و هەوڵمدا ڤێرسیۆنی *بەرگریکردن لە گەلێک*ی بەردەوامی بەرگرینامەکانم وەک وەڵامێک پێشکەش بکەم. لە ئاراستەکردنی گەلێک بەرەو رزگاری، بگرە ئاواکردنی بەشێوەی کۆمەڵگایەکی سۆسیالیستی و کۆکردنەوەی لەژێر بانی دەوڵەتێکی سەربەخۆ هەنگاونان بۆ دواوە و گوزەرکردن بۆ پاراستن یاخود بەرگریکردن؛ ئەگەر لە روانگەی یەکەمەوە مانای دواکەوتنیش بێت، بەڵام لەبنەڕەتدا رەوشەکە جیاوازبوو. ئەوە مانای نزیکبوونەوە بوو لە گوتەی ئایدیۆلۆژییەوە بۆ دۆخی بەرجەستەی کۆمەڵگا؛ دەربازکردنی دۆخی ناکۆک و بۆشاییە گەورەکەی نێوان ئایدیۆلۆژیا و پراکتیک بوو. گوتە و باسی سۆسیالیستی بگرە سۆسیالیستی زانستیش وەڵامی ئەو رەوشە نوێیەی نەدەدایەوە کە هاتبووە ئاراوە. ئەو هەڵوەشانەوەیەی لە تەواوی جیهان و لەPKK شدا هاتەئاراوە، چەندە هەوڵ و کۆششی بۆ بدرێت، بەڵام بەشێوازی کۆن بەربەست نەدەکرا و رێگری لێنەدەکرا. پێویستی بە سەرلەنوێ ئاواکردنەوەی لایەنی ئایدیۆلۆژی زانستی هەبوو. هەروەها بەشێوازی کۆن دەرفەتی بەردەوامکردن و پاراستنی بوارە کۆمەڵایەتییە ئازادکراوەکان و راستینەی گەلی کوردیش نەبوو کە بەشێوەیەکی بەرجەستە هاتبوویە ئاراوە. تەنیا پێویستی بە گوتە و شێوەی چالاکی نوێ نەبوو، بەڵکو لە بواری چەمکی ئەخلاق، سیاسەت و زانستی کۆمەڵایەتیشدا پێویستی بە وەرچەرخانی ریشەیی هەبوو. کێشەکە تەنیا خۆجێیی نەبوو بەڵکو جیهانی بوو. قاڵبوونەوەم سەبارەت بە فەلسەفەی زانست و لقەکانی پەیوەست بە کۆمەڵگاوە، پێویستیی وەرچەرخانی دەخستەڕوو.

وێڕای تەواوی هێرشە ئایدیۆلۆژییەکانی لیبراڵیزم، بەڵام مۆدێرنیتەی سەرمایەرداری بەقووڵترین تەنگژەی مێژووی خۆیدا تێپەڕدەبوو، بەهۆی هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی

بونیادنراوەوە یەکێک لە کۆڵەکە بەهێزەکانی خۆی لەدەستدابوو. لەراستیدا سۆسیالیزمی بونیادنراو تەمەنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری درێژکردەوە کە لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا هەڵوەشایەوە. هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرکەوتنی لیبڕالیزم نەبوو، بەڵکو مانای لە دەستدانی بەهێزترین مەزهەبەکەی بوو. تێگەیشتنی ئەو راستیەش زۆری نەخایاند. پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن کە وەک ڕێگەچارەی تەنگژە ئابوورییەکەی دوای ۱۹۹۰ کان بیری لێکرایەوە، نەخشەی بۆدانراو لەمیانەی داگیرکردنی ئێراق و ئەفغانستان هەوڵی جێبەجێکردنی دراوە، هێندەی پێنەچوو تەواوی تەنگژە بونیادییەکەی سیستەمی ئاشکرا کرد. چین ی پاشماوەی سۆسیالیزمی بونیادنراویش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رزگار نەکرد، بەپێچەوانەوە؛ بەڵکو بەو سیفەتەی ناوەندە نوێیەکەی هێزی هەژموونگەراییە رۆڵی هەڕەشەی دەبینی. ئەو دۆخە نوێیەی دونیا تێی کەوتبوو، نابەردەوامی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و دەرنەکەوتنی ئەڵتەرناتیفی نوێ بوو. ئەو وەرچەرخانەی لە بوارەکانی زانستی کۆمەڵایەتی، سیاسەت، ئاکار و ئەستاتیکا روویدابوو گرێدراوی ئەو رەوشە بوو کە هاتبووە ئاراوە؛ هۆکار و ئەنجامەکەشی بوو.

ئەنجام؛ لەلایەکەوە لەپێناو پاراستنی دەستکەوتە پراکتیکی و بەرجەستەکان هەوڵی پێشخستنی مۆدێلی سیاسی نوێ دراوە، لەلایەکی دیکەشەوە لەبواری فەلسەفەی سیاسەت و شێوازی ژیاندا بەدوای وەڵامدا گەڕاین. بەتەواوی لە ئایدیۆلۆژیای کۆن و پێشکەوتنە سیاسییەکان دانەبڕاین. خۆمان لەو فاکتەرانە پاکدەکردەوە کە دەبوون بە کۆت و بەند، لەمیانەی فاکتەری ئافرێنەر و پێشکەوتنخوازتردا وەڵامی پێویستی و کێشەکانمان دەدایەوە و دەربازی قۆناغێک دەبووین کە هەمیشەبیتر بوو و تەسفیە نەدەکرا. نیشانەی ئاشکرای ئەوەش سەرلەنوێ بەکارهێنانەوەی ناویPKK و بەرجەستەکردنی ئازادی و ناسنامەی گەل لەژێر ناوی کۆما جڤاکێن کوردستان(KCK) بوو. بەمجۆرەش هەوڵماندەدا هەم نەریت هەمیش گۆڕانکاری لەقۆناغی نوێدا بکرێت بە واقیعێکی ژیانی. لەمیانەی دوا بەرگرینامەی بەردەستماندا هەوڵماندا روونکردنەوەی تیۆری سەرجەم ئەو پێشکەوتنانە پێشکەش بکەین. هەربۆیەش لەدوا دۆخی بەرگرینامەکەمدا بەباشترم زانی کە لە دەرکەوتنی جۆری مرۆڤەوە تا بەکۆمەڵگابوونی، لە شارستانییەوە تا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەوێشەوە تەواوی ئەو قۆناغانەی تا مۆدێرنیتەی دیموکراتی بەردەوام دەبێت بەیەکەوە لەگەڵ ناسنامەی گەلەکەم و کەسایەتی خۆم شیکار بکەم و بەمجۆرە کۆتایی پێ بێنم.

## بەشی شەشەم

# PKK، KCK و نەتەوەی دیموکرات

سالّی ٢٠٠٣ سەرەتای ئەو پرۆسەیە بوو کە بەشێوەیەکی فەرمی PKKو KCK لە چوارچێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک رایانگەیاند. دەشێت بە سێیەمین لەدایکبوون (میلاد)یش ناو ببرێت. یەکەمین لەدایکبوونی گەورە گوزارشت لە لەدایکبوونی هەرەمەکیانەی زهنیەتی کۆمەڵگای نەتەوەیی دەکات لە هەناوی ئایدیۆلۆژیای شۆڕشگێڕی گەردوونییەوە. لەبنەڕەتدا ناسنامەی کۆمەڵگای نەتەوەیی لەبواری زهنییەوە تاوتوێ دەکرێت. ئەگەر بەرجەستە بووبێت یاخود نا، کۆمەڵگای نەتەوەیی لە بواری زهنی و هزرییەوە وێنا کراوە و نەخشەی بۆ کێشراوە. وەک پرەنسیپ کوردایەتی بەبنەما وەردەگرێت، بەلاّم گفتوگۆیەکی چڕوپڕ سەبارەت بە چۆنایەتی ئەو کوردایەتییە دەکرێت کە لەئارادایە. ئەگەر بەشێوەیەکی نیوەچڵ و پارچەکراویش بێت، لەبواری مێژوویی و جوگرافیەوە بوون و ژیانی کوردان تاوتوێ دەکرێت. لەمیانەی قەبەترین زانیارییەکانەوە گفتوگۆ لەبارەی چۆنایەتی کۆمەڵگاکەی، نیشتیمانەکەی، زمانەکەی، سنوورەکانی، پارچەبوونی، دواکەوتوویی یاخود هاوچەرخیەکەی دەکرێت.

گرووپی ناوک کە ئەو گفتوگۆیانەی دەکرد ژمارەی پەنجەکانی دەستی تێپەڕ نەدەکرد. گرنگی لە چۆنایەتی بوو نەک چەندایەتی. حەقیقەت و گوزارشتێکی دروستی ئەو راستییە گرنگ بوو کە هەوڵی دەرخستنەڕوو و ئاشکراکردنی دەدرا. قۆناغی ١٩٧٣ ـ ١٩٧٩ کە بە سەرهەڵدانی گروپ لە ئەنقەرە و پەلهاوێشتنی بۆ کوردستان گوزەری کرد، ناوەڕۆکەکەی دەرکاندنی ئەو راستیە و ماناداربوونی بوو بەشێوەی حەقیقەتی کوردی نوێ. PKKش ناوی ئەو حەقیقەتە نوێیەیە. هەڤاڵ حەقی قەراریش گەورە شەهیدی ئەو قۆناغەیە. ژمارەی شەهیدانی ئەو قۆناغە ژمارەی پەنجەکانی دەستی تێپەڕنەدەکرد. هەرچی ئەو قۆناغەیە کە لە سالّی ١٩٨٠ دەست پێدەکات و تا سالّی ٢٠٠٥ بەردەوام دەبێت گوزارشت لە گوزەرکردنی دیاردەی کوردی ئۆبژە دەکات بۆ کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی هۆشیار، رێکخراو، جەنگاوەری کورد کە ئازاد بووە و بووە بە سۆبژە. گوزەرکردن لە کوردێتییەکی ئۆبژە بۆ کوردێتیەکی سۆبژە جێگای باسە. دەشێت ئەوە بۆ گوزەرکردن لە کۆنە کوردی کۆیلە و لاشە بۆ کوردێکی ئازادیش ناوببەین. لێرەدا لەدایکبوونی زهنی و ناوی گروپی بچووک جێگای باس نییە، بەڵکو وەرچەرخانی رەوشی ئۆبژەیی گەلێک و رابردووی

كۆیلایەتیەكەی بۆ ڕاستی گەلێكی ملیۆنی جێگای باسە كە خۆی ڕێكخستووە، دەجەنگێت و چالاكی ئەنجام دەدات و بەشێوەیەكی ئازادانە گوزارشت لەخۆی دەكات. دەشێت ئەوە بە سەرلەنوێ ئافراندن و بوونی گەلێكی هاوچەرخی نموونەیی ناوببەین كە بەشێوەی كۆمەڵگای نەتەوەیی دیموكرات هاتۆتە مەیدانەوە. بەرەی ڕزگاریخوازی نەتەوەیی كوردستان (ERNK) و هێزی ڕزگاری كوردستان(HRK) یەكەمین نەوەكانی قۆناغی بوون یان زیندووبونەوە بوون. ئەو قۆناغە خاوەنی زیاتر لە سی هەزار شەهیدە كە نەک تەنیا بۆ كوردان و بۆ توركەكان بەڵكو مانایەكی زۆری بۆ تەواوی مرۆڤایەتیش هەیە. خاوەن دەیان هەزار بەندكراوی سیاسییە. بە ملیۆنان كۆچبەرو كۆچپێكراوی زۆرەملێیانەی هەیە. لەژێر ئەو هەلومەرجانەدا بەراستینەی گەلێكی جەنگاوەر گەیشتووە. پێكهاتنی كۆمەڵگایەكی نەتەوەیی دیموكراتی (گەل)ێک جێگای باسە كە بەهۆی ئەو نكوڵی و قڕكردنەی لە رابردوو دووچاری هاتووە و لەسەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە ئاستی كۆمەڵكوژی گەیشتووە؛ خائین، هەڵگەڕاوە، بەكرێگیراو و بكوژانی، هەروەها ئەو لەهەنگ و شەهید و بەرخودانكارانەشی زۆرە كە بەرپەرچیان دەدانەوە.

ئەو جیاوازیەی ساڵانی ٢٠٠٥ و دواتر سەرچاوەی خۆی لە بەدەستهێنانی ناسنامەیەكی رەسەن و دۆخی بوونێكی هەمیشەیی و داكۆكیكردن لەسەر ژیانێكی ئازاد وەردەگرێت. واتە دوای قۆناغێكی پڕ لەئازاری هاوشێوەی لەدایكبوون و خولقان، واتە هاوشێوەی بەخێوكردن و گەورەكردنی كۆرپەیەک بەخێوكردن و گەورەكردنی بەخۆراكێكی ژەهراوی نەبوو، بە بەرگری خۆیی، گوزارشتكردنی ئازادانەی بوون و ژیانەكەی لە رۆژەڤ دایە. چیتر كێشەكان كێشەی لە دایكبوون و پێكهاتن نین، بەڵكو كێشەكانی ناسنامەی خود و ژیانی ئازادە كە سەرچاوەی خۆی لە گەورەبوون، پاراستن و جیاوازی وەردەگرێت. لەدایكبوونی زهنی جێگای خۆی بۆ لەدایكبوونی جەستەیی جێدەهێڵێت، لەوێشەوە وەرچەرخان و گۆڕانكاری بۆ ئۆرگانە جیاوازەكانی جەستە جێگای باسە. قۆناغی لەدایكبوون و نەشونماكردن بۆ سەرجەم نەخۆشیەكانی سەردەمی كۆرپەلەیی و منداڵی كراوەیە. لەپێناو درێژەپێدانی ژیانی كۆرپەلە پێویستی بە هەوڵگەلێكی شارەزا و زۆر پسپۆڕانە هەیە. بەر لەوە لەدایكبوونی زهنیش زۆر بە ئازارە. ئەو نەشونماكردنەی بەجۆرێک لە جۆرەكان لە دابەزین و جێگیربوون لەناو منداڵدانی دایک دەچێت، پێویستە تەندروستانە و رەسەن بێت و زۆڵ نەبێت. ئەوەش لەمیانەی گوزارشتێكی ڕاستی هەڵمەتی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بە دیاردەی كۆمەڵگای كورد بەدیدێت، واتە ئەو كاتە جێگای باس دەبێت كە ببێت بە حەقیقەتەكەی. پێویستە لەبیر نەكەین دایكمان خاكی كوردستان كە هەزاران ساڵە مەیدانی تەراتێنی هێزەكانە و شەڕ و ململانێیەكی زۆری لە پێناو ئەنجامدراوە كاتێک دوور لە لاقەكردن، بە ئیرادەی ئازاد و لە گۆشت و خوێنی خۆیەوە گەلێكی ئازاد و رەسەن بخاتەوە؛ یەكەمین و زەحمەتترین مەرجی بوونە. قۆناغی سێیەم؛ پێكهاتەی ئاماژە پێكراو بە دۆخی بوونێک دەگات كە گوزارشت لە خۆی دەكات، بوونێک یان قەوارەیەک ناسنامە و ئازادی خۆی بەدەستهێناوە. دیاردە تازە پێكهاتووەكە،

ئۆبژەیەکی بێناوەڕۆک کراو، پارچەکراو و قووتدراوی بوونە کۆنەکە نییە. کوردایەتی کۆن تەنیا بە سیفەتی ئۆبژە لە ئارادابوو. هەر هێزێکی فەتحکار، داگیرکار، زەوتکار، چەوسێنەر و کۆمەڵکوژ هەرجۆرە کردەوە، قڕکردن و ئاسیمیلاسیۆنێکی لەسەر پەیڕەو دەکرد کە خۆی خوازیاری بوو. ئامراز و کەرەستەیەکی بەکارهێنان بوو. سۆبژێکتیڤێتی هەرەوەزانەی گەشەی نەکردبوو یاخود رێگری لەگەشەکردنی کرابوو. لە گوزارشتکردن و بەرگری لەخۆکردن دوور بوو. لە دۆخی ئەو مانگا شیردەرە دابوو کە وەک لاشەیەک بۆ باڵندە لاشەخۆرەکان دانرابێت. لە روانگەی کۆمەڵایەتییەوە نەدەکرا ئەو واقیعە بە بوون ناوببرێت. زیاتر لە دۆخی ئەو ئۆبژەیە دابوو کە هەوڵی بێناوەڕۆککردن و بێ ناسنامەیی دەدرا.

کوردستان و کوردانی دوای ٢٠٠٠ کان بە دۆخی کەینونە و بەهایەک گەیشتوون کە لە رەوشی ئۆبژەکتیڤی دەرخراون، لەو سی ساڵەی دواییدا بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە وەک کۆرپەیەک لەدایکبووە. ناسنامەیەک و ژیانی ئازادی کوردان جێگای باسە کە دەتوانێت گوزارە لەراستینەی خۆی بکات، وەک حەقیقەتێک پێشکەشی بکات و بەرگریشی لێبکات. بێگومان ئەو واقیع و حەقیقەتە بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشتی لەخۆی نەکرد. دەستبەرداری ئەو جۆرە بانگەشەیە بوو کە سەرەتا جێگای باس بوو. بە مانایەکی تر سنوورێک و مەودایەکی خستە نێوان خۆی و ئەو واقیعەی بە سۆسیالیزمی لە قەڵەم دابوو، بەڵام دوای هەرەسهێنانی سۆسیالیزمی بونیادنراو ئاشکرابوو کە سۆسیالیزم نەبووە بەڵکو سەرمایەداری بووە. کۆمەڵگابوونی دیموکراتیانەی لەو دەوڵەت ـ نەتەوە ئاڵۆزە جیاکردەوە کە سەرەتا بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵیدا بیری لێکرابوویەوە. لە کاتێکدا لە دەوڵەت ـ نەتەوە دوورکەوتەوە، گشت هێزی خۆی لەسەر کۆمەڵگای دیموکرات چڕکردەوە. ئیتر کۆمەڵگای نەتەوەی دیموکرات خەیاڵ و یۆتۆپیایەک نییە، بووە بەراستینەیەک کە بە ئازادانە دەژێت. ئەگەر راستینە نوێیەکە هەندێک کێشەشی هەبێت، ئەوانە کێشەگەلێک نین سەرچاوەی خۆیان لە دۆخی جەنین، لەدایکبوون و بوون وەربگرن، بەڵکو سەرچاوەی خۆیان لە گەیشتنی بوون بە دۆخی ناسنامە و ژیانی ئازاد وەردەگرن. ئەگەر درێژە بە لێکچواندنەکەمان بدەین، ئیتر دۆخی منداڵێکی دەرباز کردووە، بە رەوشی کچە گەنجێکی خوێن گەرم گەیشتووە کە بەهێزی خۆی لەسەر پێیان رادەوەستێت. کێشەکان سەرچاوەی خۆی لەسەردەمی هەرزەکاری و گەنجێتی کچێتی وەردەگرت. لەو قۆناغەدا بەتایبەتی کێشەکانی ژیانی ئازاد بایەخدار ببوون. ئەگەر سەرنج نەدرێت هەر ئان و ساتێک لەوانەیە نەخۆشیەکانی کوردێتی کۆن سەرهەڵداتەوە. لەوانەیە خیانەتە ناوخۆیی و دەرەکییەکان و بەکرێگیراوان بەشێوەیەکی زۆر خراپتر لە جاران رۆحی ناسنامەی کورد و بوونە نوێیەکە بکێشن. واتە فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پلەداری کۆن ـ کە لە تەنیشتیانەوە درێژەیان بە بوونی خۆیاندەدا ـــ هەر ئان و ساتێک دەیانتوانی ئەو بوون و پێکهاتە نوێیەکە لەت و پەت بکەن و لەنێوان خۆیان دابەشی بکەن. بە مانایەکی تر ئەو پێکهاتانەی بەگوێرەی زهنیەتی کۆن بە موڵکی خۆیان

دادەنا و مامەڵەیان پێدەکرد، بەبێ ئەوەی جیاوازی نێوان کۆن ـ نوێ بکەن خوازیاری درێژەپێدانی چەوسانەوە و خواردنی بوون. کێشەکان بەرفراوان بوون و سەرچاوەی خۆیان لە تەواوی ئەو ڕەهەندانەوە دەگرت.

ئەو کێشانەی لە ئارادابوون؛ جا ئەوانەی سەرچاوەی خۆیان لە شارستانی کۆن و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەردەگرت یاخود ژیانی ناسنامەی ئازادانە: زۆر لە کێشە کۆنەکانی جیاوازتر و بەرفراوانتر بوون. لەو سۆنگەیەشەوە؛ ڕێباز و ئامرازەکانی چارەسەرکردنیشی جیاوازتر دەبوو. نەدەبوو وەک کورد و کوردستانی جاران، نەوەک نەتەوەپەرست، PKK، HRK و ERNKی ڕابردووی نزیک خەبات و تێکۆشان بکات. هەردووکیشیان نەدەبوون، دوژمنیش دوژمنە کۆنەکەی جاران نەبوو. ئەگەر جێگای متمانەش نەبێت، بەڵام ڕووچاری گۆڕانکارییەک هاتووە کە لەمیانەی هەڵوێستێکی سەرتاسەرییەوە ناسنامەی کوردی ئازادی ڕەتنەدەکردەوە و بەشێوەیەکی شەرمنانەش بێت کورد و کوردستانی پەسەند کرد. ئاشکرایە کە سەرجەم ئەو پرۆسە کۆمەڵایەتی ـ مێژووییانە پێویستی بە پێناسەیەکی نوێی کوردایەتی وPKKهەبوو: پێویستی بە دەستەواژە و تیۆری سیستەمی نوێ هەیە. لەسەر ئەو بنەمایەش لەمیانەی پێناسەی کوردایەتی و PKK ی نوێ هەوڵی پێشخستنی تیۆری و دەستەواژەکانی سیستەمی نوێ دەدەین.

### أ . PKK و ژیانی نەتەوەی دیموکرات

لە ٣٢مین ساڵوەگەڕی ناولێنانی بزووتنەوە بە PKK ئەو دێرانە دەنووسم: پێویستە ئەوەندە ساڵە بەس بێت بۆ نرخاندن و هەڵسەنگاندنی ناسنامە، ڕۆڵ و سەرکەوتنی پارتێکی هاوچەرخ. کاتێک سەردەمی گرووپیش بخەینە سەر ــ کە پێویستە وەها بێت ــ ژیانێکی چل ساڵەی پڕ لە باهۆز و گەردەلوول جێگای باسە. ساڵانی سەردەمی گروپ بێت یان ناولێنان لە بنەڕەتدا تا هەڵمەتی ١٥ی ئاب ١٩٨٤ قۆناغێکە بەشێوازی پارتیزانی بەردەوام بووە. دونیای سۆسیالیزمی بونیادنراو و بۆچوونی سۆسیالیستی زانستی پاشخانەکەی کە مەزەندەمان دەکرد سۆسیالیزمی بونیادنراو پابەندێتی ئەو دونیایە بوو کە بە سیفەتی ئایدیۆلۆژیای گەردوونی کاریگەری لێکردووین. سەبارەت بە تێگەیشتنی ناسنامەی PKK، دونیابینی سۆسیالیستی زانستی و ئەو نرخ و بەهایانەی پێیەوە پابەندبوون یان مەزەندەی پابەندبوونیان دەکرد خاڵێکی گرنگی ڕێنیشاندەرە. ئەگەر لەمیانەی نموونەیەکەوە هەوڵی شرۆڤەکردنی بدەین دەکرێ بڵێین؛ لەناو کۆمەڵگای خێڵێکی خۆ بە سۆسیالیست زان داوای دامەزراندنی هۆبەیەکی نوێمان دەکرد. ئەگەر مەزەندە و ڕەچاوی ئەو ڕاستییە بکەین کە چەندین هۆبە بەو شێوازە دامەزران، ئێمەش وەک گروپێکی بچووک دامەزراندن یان ئاواکردنی هۆبەیەکی بەمجۆرەمان بە مافی خۆمان دەزانی. ئەو هوشیاری و باوەڕییەی بەشێوەیەکی بابەتی سەبارەت بەڕاستینەی وڵاتێک

(کوردستانمان بە وڵاتێک دادەنا) و گەلێک (مسۆگەر کوردان گەلێک بوون) پێکهاتبوو هۆکار و بیانووی سەرەکی پەیڕەوکردنی ئەمجۆرە مافە بوو. وەک پێویستییەکی دونیابینیەکەمان چاوەڕوانکراو بوو خۆمان وەک هێزی پێشەنگی چەوساوە و ڕەنجدەرترین توێژەکانی گەل ناوببەین. وشەی "کارکەر" بەگوێرەی ڕەوشی ئەوکاتە مانای گەلێکی خەباتکار و چەوساوەی دەبەخشی، ئەو ناوەش بەگوێرەی ڕاستینەکەمان گونجاو بوو.

ئەگەر سەرنج بدرێت دەبینرێت کە لەساڵانی لەدایکبوون و پارتیزانیPKKوە دونیای هوشیاری و باوەڕییەکی پەسەندکراو هەیە. کاتێک دەڵێم ئەندامە نوێیەکەی قەبیلەی سۆسیالیستی مەبەستم ئەو ڕاستیەیە. وەک چۆن هەر منداڵێکی تازە لەدایکبوو بەبێ لێپرسینەوە ناچارە قەبیلەکەی پەسەند بکات، ئەوا دەبووایە بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەک ئێمەش قەبیلەی دونیای سۆسیالیستی بونیادنراو پەسەند بکەین. جیاوازییەکمان لەگەڵ قەبیلە و تیرە کلاسیکەکان هەبوو: قەبیلەکەمان پشتی بە بناغەیەکی زانستی بێگومان دەبەست. بەڵام بناغەکەمان چەندە مەزەندەی زانستیبوونی بۆ بکرێت (ئەو ڕەخنانەی لە بەرگەکانی پێشووتر سەبارەت بە سۆسیالیزمی زانستی پێشمانخستن هەوڵی خستنەڕووی لایەنە دۆگماتیکەکانیمان دا) شێوازی وابەستەبوونمان لایەنی هوشیاریی کەمتر و زیاتر لەسەر بنەمای باوەڕی بوو. هەر بۆیەش لایەنە دۆگماتیکەکەی لەپێش بوو. بە ئامانجی تەواو خراپ نیشاندانی دۆگماتیزم ئاماژە بەو خاڵە ناکەم. هیچ بۆچوونێک لە سروشتی مرۆڤ بوونی نییە کە دۆگماتیزم لە خۆوە نەگرێت. خودی ئایدیا و فیکر بەهای دۆگما و باوەڕییەکیان هەیە. دەشێت ئەوە بە بەهای پرەنسیپیش ناو ببەین. ئەگەر مرۆڤ بڕوا بە دۆگمای باوەڕی، هوشیاری و پرەنسیپێک نەکات زۆر ئەستەمە توانای بەردەوامکردنی ژیانی هەبێت. ئەگەرنا تەنیا پێویستە ببێت بە خوداوەند، تا بەبێ پشت بەستن بە هیچ پرەنسیپ و دۆگمایەک توانای ژیانی هەبێت. ئەگەر کەسانێکی زۆر دەرکەوتبن و بانگەشەیەکی بەمجۆرەشیان کردبێت یان کەسانی لەمجۆرە هەرگیز لەئارادا نین یانیش کەسایەتیەکی دەگمەن جێگای باسن کە لەهەندێک ساتی سنوورداری تەمەنیان بەو دۆخە گەیشتوون.

چەمکی هەڵە سەبارەت بەو بابەتە خۆی لەو بۆچوونەدا دەبینێتەوە کە دۆگماکان وەک حەقیقەتی وشک و نەگۆڕ پەسەند دەکات. هەربۆیەش بەمجۆرە دەرک بە دۆگما ئایینیەکان کراوە و مێژووی مرۆڤایەتی پڕ لە تراژیدیا کردووە. فەلسەفەو هزری زانستیش شێوە هزراندنێکی پۆزەتیڤی تەندروستانەترن کە بەرامبەر ئەو شێوازە دۆگماتیزمەی دۆگماکان پێشخراون. باڵاتربوونی فەلسەفە و زانست بەرامبەر دۆگماتیزم زادەی تێگەیشتنیانە بۆ ڕاستینەی ژیانی گەردوونی لەناو تەواوی جیاوازی و زیندوویتیەکەیەوە. لەبەر ئەو هۆکارەش هەر کۆمەڵگایەک لە بواری فەلسەفە و زانست پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینیوە، بەردەوام لەو کۆمەڵگایانە لەپێش و باڵاترە کە دۆگماتیزمیان دەرباز نەکردووە یان دۆگماتیزم بەسەریاندا زاڵە. ئەو بەها زانستی و فەلسەفیانەی دونیابینی و بۆچوونەکانیان بەردەوام لە تێکۆشانی کۆمەڵگاکان یەکلاکەرەوەن؛ بەمانایەکی تر ئاستی

تێگەیشتنیانە بۆ ڕاستینەی ژیانی گەردوونی لەناو تەواوی جیاوازی و زیندوویێتیەکەیدا. لە دۆخی بەمجۆرەدا واتە تەواوی جڤاتەکانی دیکەی ناوەوە و دەرەوەی کۆمەڵگا، بگرە سەرکەوتن بەرامبەر ژینگەی سروشتیش، گرێدراوی ئاستی تێگەیشتنی زیندوویێتی و جیاوازیەکانی شێوازی ڕوانگەی گەردوونییە.

تەنیا کاتێک بەشێوەیەکی دۆگماتیکانە پابەندی قەڵەمبازی بە پرەنسیپانە و دۆگماکان بێت ئەوا مەترسی و هەڕەشەکانی سەرهەڵدەدات. دۆگماکانی سۆسیالیزمی زانستی کە لەساڵانی دەرکەوتنی پارتیزانی پێیەوە پەیوەست بوو لە بنەڕەتدا ڕۆڵی ئەرێنی بینیوە. هەرچەندە سۆسیالیزمی زانستی بە تەواوی لە میتافیزیک پاک نەکرابێتەوە، بەڵام سەبارەت بەراستینەی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگا نزیکترین ئایدیۆلۆژیا بوو لە فەلسەفەی دیرۆک و زانست. پێشکەوتووترین نموونە و دونیابینی سەردەمی خۆی سەبارەت بە تێگەیشتنی فەلسەفەی زانستیانەی کۆمەڵگای پێشکەش دەکرد. ئەو بنبەستبوونەی لە سۆسیالیزمی بونیادنراودا هاتەئاراوە بەواتایەک لەواتاکان ئەنجامێکی لایەنە دۆگماتیکەکانی سۆسیالیزمی زانستی بوو. ئەو ڕەخنانەی لەسەرەتاوە ئاراستەی کران لایەنی ڕاست و مافداری هەبوون. کاتێک لەکاتی خۆیدا چارەسەر نەکران، لەگەڵ هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراودا دۆگما بونیادییەکان دەرەنجامی خۆی خستەڕوو. هەرچەندە لەئاستی دەوڵەت ـ نەتەوەشدا نەبێت، بەڵام بەو سیفەتەی پرۆتۆ دەوڵەت ـ نەتەوە بوو ئەنجامێکی هاوشێوە لەناو PKKشدا هاتەئاراوە. لەساڵانی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕیدا ئەو فاکتەر و ئەندامانەی لەناو PKK لە دۆگماکانەوە بەرەو زانستیبوون و فەلسەفەی مێژوو هەنگاویان نەهاوێشت بوون بە دۆگماتیک. لەئاکامی ئەوەشدا زیاتر فاکتەرە دەسەڵاتدارییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەرکەوتەپێش. چەندە ئەوانە دەرکەوتنەپێش دۆگماتیزمیش ڕیشەدارتر بوو. هەڵوێستە دەسەڵاتدارییەکان هەڵوێستە دیموکراسیخوازییەکانی سەرکوت کرد. دەسەڵات و توانای پارتی ڕێگای لەپێش دەسەڵات و توانای فەرماندەیی کردەوە، دەسەڵات و توانای فەرماندەییش ڕێگای لەپێش دەسەڵاتی شەخسی کردەوە. جۆرێک لە دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکان پێکهاتن. هەروەک لە دونیای سۆسیالیزمی بونیادنراو ڕوویدا شرۆڤەی دەسەڵاتگەرا و دەوڵەت ـ نەتەوەگەرایی چەمکی دەستڕۆیی مۆدێلی پارتی لینینیستی لەناو PKKشدا کاریگەر بوو نەک چەمکە دیموکراسیخوازەکەی. کاتێک ئەو چەمکە بەتەواوی زاڵ بوو، سوان و خراپبوونی دەسەڵاتیش دەست لێبەرنەدراو بوو. لەئاکامدا هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا سۆسیالیستە بونیادنراوەکان و دەوڵەت ـ نەتەوەکان ڕوویدا. لەگەڵ ئەوەی PKK بە دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردستانی یەکگرتوو و دیموکرات نەگەیشت کە کربووی بە ئامانجی خۆی، بەڵام لە چەندین بواردا لەئاستی میکرۆدا تێیدا ژیا. بەتایبەتیش لەسەردەمی ١٩٨٤ ـ ١٩٩٨ قۆناغێک بوو کە زیاتر دەوڵەت ـ نەتەوە کوردییە میکرۆکان لە ئارادابوون. PKK بە درەنگ وەختەوە دوای ساڵانی ١٩٩٨ دووچاری ئەو هەڵوەشانەوەیە بوو کە دەوڵەتە سۆسیالیستە بونیادنراوەکان تووشی هاتبوون. هەرچەندە بێکاریگەرکردنی ڕێبەرایەتی لەلایەن دەوڵەت

ـ نەتەوە فاشیستەکانی لیبرالیزمی جیهانگیری رۆڵی لەوەدا هەبێت، بەڵام قۆناغێک بوو زۆر پێشتر و بەتایبەتیش دوای ساڵی ١٩٩٥ دەستی پێکردبوو. لە چەندین پارتی دیکەی جیهان و خاوەن بونیادی هاوشێوە هەمان قۆناغ جێگای باس بوون. دوای هەڵوەشانەوە دوو رەوتی سەرەکی هەوڵی بوون و پێکهاتنیان دەدا. یەکەمیان؛ ئەو پارتە کۆمۆنیستیانەی لەسەر چەمکی ئۆرتۆدۆکسانەی سۆسیالیستی بونیادنراوی جاران سوور بوون؛ دووەمیشیان؛ ئەو پارتانە بوون کە بوون بە باڵی دیموکراتە لیبراڵەکانی ئەو پارتە لیبراڵانەی لە رابردوو لە وڵاتە کۆنەکانی سەرمایەداریدا ریشەی خۆیان داکوتابوو.

ئەگەر دوای هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو مەیلی هاوشێوە لەناو PKKشدا هەبێت، بەڵام ئەوانە نەبوون بە باڵگەلێکی زاڵ. بەتایبەتیش ململانێی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ نێوان باڵەکان زۆر رووخێنەر بوون، بەڵام سەرکەوتوو نەبوو. لەکاتێکدا چەتە ساختەکارەکانی دەمامکی لیبرالیزمیان پۆشیبوو راکردن و خیانەتیان هەڵبژارد، ئەندام یاخود باڵی نەریتخوازی دۆگماتیزمی دەرباز نەکردبوو بژاریان مانەوە بوو لە ناو رەوتی سەرەکیدا. سەرگوزەشتەی رەوتی بنەڕەتیش زۆر سەیرە. لەکاتێکدا هەردوو باڵ لەناو کێبڕکێ و ململانێیەکی پێوانەییدا بوون، لەو بڕوایە دابوون کە بەتەواوی پارتی بووە بە هی ئەوان. هەردوو باڵیش خوازیاری تێگەیشتنی دیالیکتیکی ئاواکردن و پێکهاتنی PKK نەبوون. بە مانایەکی تر لە پەرەسەندنی دیالیکتیکیانەی PKK بێئاگا بوون. چونکە گرنگترین جیاوازی PKK لەگەڵ هاوشێوەکانی، نەپچڕاندنی رایەڵەکەی بوو بە پەرەسەندنی دیالیکتیکیەوە. وێڕای سەرجەم هەوڵە چەواشەکاری و گێرەشێوێنیەکانی ساڵانی لەدایکبوون و پارتیزانی بێت یاخود ساڵانی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی پارتی گونجان و تەبایی خۆی لەگەڵ پەرەسەندنی دیالیکتیکی پاراستووە. ئەگەر کەڵەکەبوونی هێزی دیالیکتیکی پێشکەوتوو لەناوPKK بەدی نەهاتبێتیش، بەڵام بەشێوەیەکی کردەیی پرەنسیپی دیالیکتیکی شۆڕشگێڕی لەژیاندا پەیڕەو دەکران. خۆیشی بەشێوەیەکی دیالیکتیکی لەئارادابوو. باڵەکان یاخود فاکتەرە لادەر و گومڕاکانی بەهیچ جۆرێک لەو راستییە تێنەدەگەیشتن. لەکاتێکدا لەمیانەی هەر لادان و خیانەتێک لەو بڕوایەدابوون زەبرێکی کوشندەیان وەشاندووە، لەبەر ئەو هۆکارەش دەرکیان بە خێرابوونی پەرەسەندنی پارتیمان نەدەکرد. ئەوەی لەئاکامی لادان و راکردن لەناودەچوو پارت نەبوو بەڵکو خۆیان بوون. لە بەرامبەر ئەوەدا PKK پاکتر دەبوویەوە و لەمیانەی بەدەستهێنانی ناوەڕۆکی دیالیکتیکی زیاتر درێژەی بە پەرەسەندنی خۆیدەدا. لە سەرجەم قۆناغە هەستیارەکاندا ئاشنای ئەمجۆرە پەرەسەندنانە بووین.

لەسەردەمی هەڵوەشانەوە گەورەکەی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ لەو بڕوایە دابوون ئەو سەرکەوتنە بەدەست دێنن کە تا ئەو کاتە بەدەستیان نەهێنابوو، ئیتر پارتیان بەهی خۆیان دانابوو. لەمیانەی دەستێوەردانێکی ناتەواو و لەماوەیەکی کورتدا دەرکەوت کە رەوشەکە وەها نییە. پارێزەرەکانیش سەبارەت بە رووداوەکان بەشێوەیەکی راست و دروست هەواڵیان بۆ نەدەهێنام. ئەوەش وێڕای نەبوونی هیچ کۆسپ و تەگەرەیەک. لەو بڕوایە دام ئەوانیش

بەگوێرەی دۆخی باڵەکان هەڵوێستیان دەنواند، منیشیان بە بێچارەیەک دادەنا کە زەحمەتە لەسەر پێیان بمێنێتەوە. بەڕاستیش دۆخی ئەو کاتەم هێندە هیوا بەخش نەبوو. بەڵام من کەسێک نەبووم تەنیا بریتی بم لەڕووداوەکەی ئەوکاتە. تەنیا مێژووییەکم لە کەسایەتی خۆمدا زیندوو نەکردبوویەوە، لەمێژبوو ببووم بە ڕاستینەیەک کە دوای بوونی فیزیکی و جەستەییشم، تا ئەو کاتەی کۆمەڵگا بەشێوەیەکی جڤات و هەرەوەز لەسەر پێیان بمێنێت، بەتایبەتیش تا کوردان بە ئازادی بژین بە ئازادی دەژیم. بەمجۆرە خۆمم کردووە بە شێوازێکی بەمجۆرەی ڕاستینە و هێزی مانا. یان لەو ڕاستی و مانایە بێئاگابوون یاخود هێزی تێگەیشتنیان لاوازبوو و بەشی نەدەکرد. لەئاکامدا بەهۆی هەوڵ و ڕەنجی گروپێک لە هەڤاڵان و لێدوانم سەبارەت بە خاوەنداریێتیکردن لە لێشاوی سەرەکی و سەرلەنوێ بەکارهێنانەوەی ناوی PKK، قۆناغێکی زۆر بەهێزتری PKK دەستپێکرد. لەمێژبوو بەفر ئەو شاخانەی گرتبوویەوە کە چەتە ساختەکارەکەی لیبراڵیزمی ڕاسترەو باوەڕیان پێی کردبوو، خۆشیان لە یەخبوون ڕزگاریان نەبوو. هەرچی چەپڕەوە نەریتخوازەکان بوون ئەوجارە لەمیانەی ڕەخنەدانێکی جددییەوە هەوڵی تەقلیبوون و یەکگرتنیان لەگەڵ لێشاوی بنەڕەتی دا، هەڵبەتە بەئێش و ئازارترین ڕووداوی ئەو قۆناغە بە فیڕۆچوونی بەهایەکی ماددی زۆر، بەهایەکی زۆری مۆراڵی و مەعنەوی و نزیکەی هەزار ئەندامی دەیانتوانی لەگەڵ لێشاوی بنەڕەتی بەردەوام بن. بەمجۆرە لەکاتێکدا دوای هەڵوەشانەوە گەورەکەPKK بەسێیەمین لەدایکبوون (میلاد) یاخود هەڵمەتی نوێبوونەوەدا تێپەڕدەبوو، ئیتر کەوتبووە قۆناغی بوون بە پارتی قۆناغێکی جیاوازی کۆمەڵایەتی، قۆناغی نەتەوەی دیموکرات.

### ١ . ناسنامە و واتای PKK لەسەردەمی نوێدا

سەرلەنوێ بونیادنانەوەیPKK مانای بەدەستهێنانی ناسنامەیەکی جیاوازتر نەبوو، بەڵام کۆپیەکی سەردەمەکانی پێشووتریش نەبوو. ئەوەی ڕوویدا گۆڕانکارییەکی سادەی چەندایەتی نەبوو، بەڵکو گۆڕانکارییەکی چۆنایەتی بوو. ئەوە تەنیا وەرچەرخانێکی چۆنایەتی ناسنامەی PKK نەبوو، بەڵکو وەرچەرخانێکی چۆنایەتی کۆمەڵگای کوردیش بوو. چونکە لەڕاستیدا لەئاکامی پەرەسەندنە دیالیکتیکیە خەستەکەی نێوان هەردووکیان ئەو وەرچەرخانانەی ناسنامە ڕوویداوە. لەو سۆنگەیەوە؛ دەتوانین بەشێوەیەکی بەرجەستەتر پێناسەی ناسنامەی ئەو PKK بکەین کە قۆناغی کامڵبوونی مسۆگەر کردووە و پێگەیشتووە و هەندێک دەرەنجامی گەردوونی بەدەست بێنین.

أ ــ بەرلەهەموو شتێکPKK پارتە کۆنەکەی دەوڵەت ــ نەتەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو نییە. پارتە سۆسیالیستەکان ئامانجی ئاواکردنی دەوڵەتیان وەک پرەنسیپێک پەسەند کردووە. سۆسیالیزم لەمیانەی ئامێری دەوڵەتی مۆدێرنەوە بونیاد نانرێت. ئامێری دەوڵەت لەگەڵ سروشتی سۆسیالیزم ناکۆکە. دەوڵەت ــ نەتەوەی مۆدێرنیتەی

سەرمایەداری یەکێکە لە بەردە سەرەکیەکانی بناغەی یاسای زۆرترین قازانجی سەرمایەداری. سیستەمی بەدەستهێنانی قازانجی سەرمایەداری بەبێ دەوڵەت ـ نەتەوە بەدینایەت. هەر سیستەمێکی دەوڵەت ـ نەتەوەی تێدا بێت گرێدراوی بەدەستهێنانی قازانجی سەرمایەدارییە. لە سۆسیالیزمی بونیادنراویشدا رەوش جیاوازتر نییە؛ بگرە سەرمایەداری بیرۆکراتی پێویستی زیاتری بە دەوڵەت ـ نەتەوە هەیە. هەر رەوت یان لێشاوێک لە پارتی بۆ دەوڵەت، یان لە دەوڵەتەوە بەرەو پارتی بە نکوڵیکردنی دیموکراسی سۆسیالیستی ئەنجامگیر دەبێت. بەبێ ئەوەی لەهیچ قۆناغێک و بەهیچ پاساوێک پەنا ببرێتە بەر ئامرازی دەوڵەت گوزەرکردن بەرەو کۆمەڵگای کۆمۆنیستی ـ کە لە تیۆری وەک کۆمەڵگای بێ دەوڵەت بیری لێکراوەتەوە ـ پێویستیەکی شێوە و ناوەڕۆکی سۆسیالیزمە. سۆسیالیزم تەنیا ئەو کاتە بەدیدێت کە بەهەموو رەهەندەکانیەوە دیموکراسی بژێنێت و جێبەجێی بکات کە لیبڕالیزم بەشێوەیەکی دووڕووانە بەکاری دێنێت و لە ناوەڕۆکیشدا لەگەڵیدا ناکۆکە. وەک چۆن ناشێت بەبێ دیموکراسی بیر لە سۆسیالیزم بکرێتەوە، هەرگیز بە رێگا و رێبازێکی دەرەوەی دیموکراسیش بونیاد نانرێت. سۆسیالیزم تەنیا لەمیانەی ژیانێکی دیموکراسی فرە بەشدارییەوە بونیاد دەنرێت.

لەو سۆنگەیەوە؛ یەکەمین تایبەتمەندێتی پارتە سۆسیالیستەکان؛ وەک نموونەیەکی سەرەتایی دیموکراسی بونیادنراون. پارتێک خۆی دیموکراتیزە نەکردبێت ناشێت کۆمەڵگا دیموکراتیزە بکات. دیموکراسی نەبوونی دەسترۆیی نییە. جیاواز لە دەسەڵات و دەسترۆیی دەوڵەت، لەهەلومەرجەکانی کۆمەڵگای سیاسیدا دەرفەتی توانا و دەسترۆیی دیموکراسی هەیە. لە کاتێکدا دەوڵەت لەسەر بنەمای رەتکردنەوەی کۆمەڵگای سیاسی ئاوا دەبێت، هەرچی ئاواکردنی دیموکراسییە پێویستی بە بوونی کۆمەڵگای سیاسی هەیە. کۆمەڵگای سیاسیش ئەو کۆمەڵگایەیە کە ئازادی خۆی بەدەست هێناوە. دیاردەی سیاسەت بەدەستهێنانی هێزی فیکر، بڕیار و چالاکی کۆمەڵگایە سەبارەت بە بەرژەوەندییە ژیانیەکانی خۆی. وەک چۆن کۆمەڵگا ناسیاسیەکان ناتوانن چارەنووسی خۆیان دیاری بکەن، ئەوا ناتوانن خۆیان دیموکراتیزەش بکەن. رایەڵەیەکی نەپچڕاو لەنێوان دیاردەکانی سیاسەت، ئازادی و دیموکراسی جێگای باسە. یەکێکیان نەبێت ئەوانی دیکەش نابن. لەو دۆخەدا پارتە سۆسیالیستەکان تەنیا بەشێوەی نموونەیەکی سەرەتایی کۆمەڵگای دیموکراتیک، ئازاد و سیاسی دەتوانن ناسنامە بەدەست بێنن. بەشێوەیەکی گشتی دەسەڵات بەتایبەتیش مۆدێلەکانی دەسەڵات و دەوڵەت بۆخۆیان بە نموونە دانانێن. لەگەڵ ئەوەی دەسەڵات و دەوڵەت دوو دیاردەی جیاوازن، لەبنەڕەتدا پاوان و قۆرخکاری هێز و چەوسانەوەی چڕبووەن. لەگەڵ ئەوەی فاکتەرەکانی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی کۆمەڵگاش لەخۆوە دەگرێت، بەڵام ئەو فاکتەرانە رۆڵێکی لاوەکی دەبینن. بۆ رەواکردنی قۆرخکارییەکانی هێز و چەوسانەوە بەکاریان دێنن کە رۆڵی دیاریکەر دەبینن. سەرجەم ئەو بەڵگە و پاساوانە روونی دەکەنەوە کە بۆچی پارتێکی سۆسیالیستی بە ئاراستەی ئامانجە دەسەڵاتگەرا و دەوڵەتگەراییەکان بونیاد نانرێت. هەروەها دەیسەلمێنێت کە

بۆچی جگە لە بونیادنانێكی دیموكراتیانە ناشێت بەهیچ ڕێگا و ڕێبازێكی دیكە بونیاد بنرێت.

ب ـ لەگەڵ ئەوەی پارتە سۆسیالیستەكان دامەزراوەیەكی مۆدێرنن، لە بواری مێژووییدا ئەركیان پێشخستنی مۆدێرنیتەی ئەڵتەرناتیڤە لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری. مۆدێرنیتە دەستەواژەیەكی بێلایەن نییە؛ دەستەواژەیەكە بنەمای چینایەتی، سیاسی و ئایدیۆلۆژی هەیە. لەگەڵ ئەوەی مۆدێرنیتەی زاڵ خاوەن كارەكتەرێكی سەرمایەدارییە، بەڵام جۆری دیكەی مۆدێرنیتەش هەیە. مۆدێرنیتەی (تازەگەری) دیموكراتیش لەسەرووبانەوە دێت. مۆدێرنیتەكان گوزارشت لەو قۆناغانەی كۆمەڵگا دەكەن كە جیاوازی ڕیشەییان لەنێواندا هەیە. بونیادی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری، تەكنیكی و زانستی هەر مۆدێرنیتەیەك تایبەتمەندێتی تایبەت بە قۆناغی خۆی هەیە. هەریەكە لە سەردەمەكانی یەكەمین، ناوین و نزیك نوێنەرایەتی مۆدێرنیتەیەكی بەگوێرەی خۆیان دەكەن. هەروەها هەر مۆدێرنیتەیەكیش شێوەی چینایەتی، تەكنۆلۆژی، ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابووری زاڵی بەگوێرەی خۆی هەیە. هەریەكەیان بەگوێرەی ئەو شێوە زاڵانە جیادەبنەوە. لەگەڵ ئەوەی شێوازی توانستی سەرمایەداری هەر لەسەرەتاوە مۆركی خۆی لە چاخەكەمان واتە مۆركی خۆی لە هەلومەرجەكانی ژیانی مۆدێرنمان داوە، بەڵام ناشێت ئەو سەردەمە بەهەموو شتێكیەوە بكرێت بە موڵكی سەرمایەداری. ئەگەر سۆسیالیزمی بونیادنراویش بە سەرمایەداری ئەنجامگیر نەبووایە، لەوانەیە مۆركی خۆی لە مۆدێرنیتە دابووایە. لەراستیدا ماوەیەكی زۆر بەمجۆرە لەقەڵەم درابوو. پارتە سۆسیالیستیەكان فاكتەرە سەرەكیەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (قەیرانی كەڵەكەی سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم) دەرباز نەكەن و تێكۆشانیان لەبەرامبەردا نەكەن، ناتوانن مۆركی خۆیان لە مۆدێرنیتە بدەن. لەبەرئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو تێكۆشانی لەبەرامبەر فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامنەدا، بەپێچەوانەوە خەریكی پەردەپۆشكردنی ئەو فاكتەرانە بوو، ئەنجامەكەی سەرمایەداری بوو. پارتە سۆسیالیستەكان تەنیا لەمیانەی پێشخستنی فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی خۆیان (نەتەوەی دیموكرات، پیشەسازی ژینگەدۆست و ئابووری بازاڕی سۆسیالیستانە) دەتوانن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەربازبكەن و ڕۆڵی سەرەكی بۆ مۆدێرنیتەكەیان بەدەست بێنن.

PKK تەنیا بە دەربازكردنی دەوڵەت ـ نەتەوە ناوەستێت؛ تەنیا كاتێك خۆی وەك نموونەی بەرایی فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی دیموكراتیك بونیاد بنێت دەتوانێت ڕۆڵی پێشەنگایەتی ببینێت. بونیادنانی كۆمەڵگای كورد بەشێوەی نەتەوەی دیموكرات سەرەكیترین ئەركی قۆناغی ناسنامەی نوێی PKK یە. بۆ سەرخستنی ئەو ئەركەی بەر لەهەموو شتێك پێویستە سیستەمی خۆی بكات بە ئەڵتەرناتیڤی فاكتەرەكانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری. جیاوازییەكی گرنگ لەنێوان خود و بوون بە نموونەی مۆدێرنیتەی دیموكراتی هەیە. هەڵبەتە پارتەكان بۆ تێكشكاندنی ئەو زەحمەتیانە لە ئارادان؛ تەنیا

لەمیانـەی نـاوک و نوخبەیـەکی پێشـەنگ دەتـوانن ئـەو زەحمەتیانـە دەربـاز بکـەن. لەسەرجەم بوارە ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابوورییەکانی فاکتەرەکانی مۆدێرنیتە ململانێ و تێکۆشانێکی بەردەوام لە ئارادایە. ئەنجامی ململانێ و تێکۆشـانەکەی نێوانیـان یـەکلای دەکاتەوە کە کامە مۆدێرنیتە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت. پارتـەکانیش هێزی پێشـەنگی ئـەو تێکۆشانانەن. لەبەرئەوەی لە مارکسیزمدا تێکۆشان زیاتر بۆ ئیکۆنیزم بچووککراوەتـەوە بێ بەرهەم بوو و ئەنجامی لێنەکەوتەوە. چونکە لەو بڕوایە دابوون لەمیانەی ژیـانکردنی مۆدێرنیتە و سـەرجەم فاکتـەرەکانی دیکـەی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری بـەرەو کۆمـۆنیزم دەڕۆن. ئەوەی ئەنجامیشی دیاریکرد ئەو تێکۆشانەی مۆدێرنیتە بوو کـە لەلایـەن تـەواوی فاکتەرەکانی سەرمایەدارییەوە بەڕێوەچوون. لەبەر ئەو هۆکـارە سـەرەکییە پێویسـتی بـە تازەگەری (مۆدێرنیتەی) دیموکراتیک هەیە. ئەگـەر تێکۆشـان لەسـەر بنـەمای پێشخسـتنی ئەڵتەرناتیڤ نـەبێت، ئـەوا ئەستەمە تێکۆشـان بەرامبـەر سـەرمایەداری و سـەرجەم ئـەو فاکتەرانـەی دەیـژێنن سـەرکەوتوو بێـت. مـەرجی یەکـەمین سنووردار نەبوونـە بـەتیۆری شـیکارکردنی سـەرمایەداری، بـەڵکو تێکۆشـانکردنە لەمیانـەی ڕۆشـنکردنەوەی تیـۆری مۆدێرنیتـەی دیمـوکراتی و فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتـەی ئەڵتـەرناتیڤی ئـەو تیۆرییـە. لـە حاڵـەتێکی وەهـادا لـە بنەڕەتـدا پارتـە سۆسیالیستەکان لەمیانـەی تیـۆری مۆدێرنیتـەی دیموکراتی ڕۆشن دەبنەوە و تێکۆشان لەبەرامبەر سەرمایەداری دەکەن. تەنیا بە تێکۆشانی تیۆری سنووردار نابن. شانبەشانی ئەوەش لەمیانی پێشخستنی ئامرازەکـانی پیشەسـازی ژینگەدۆسـت و بـەکارهێنانیان و پـەیڕەوکردنی دیـاردەی بـازاڕی سۆسیالیسـتی دەتـوانن سەرکەوتن بەرامبەر فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەدەست بێنن.

لـە ناسـنامە نوژەنەکـەی PKKدا وەک جـاران زانیـاری خڵتـە سـەبارەت بەشـێوەی چەوسانەوەی سەرمایەداری لەئارادا نییە، بەڵکو لەسەر بنەمای شیکارکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پارادایمە نوێیەکەی تیۆری مۆدێرنیتەی دیموکراتی و پێشبینیەکی تەندروست جێگای باسە. تەنیا بە شیکارکردنی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری و سـەرجەم فاکتـەرەکانی سنووردار نابێت؛ وەک هێزێکی پێشەنگ دێتە مەیدان کە بنەما مێژووییـەکانی مۆدێرنیتـەی دیموکراتیـک و فاکتـەرە هەنووکەییـەکانی ڕۆژگـاری ئـەمڕۆمان پێشـدەخات و لـەپێناو سەرکەوتنیشیاندا ئەرکی پێشخستنی پرۆگرام، ستراتیژ و تەکتیکەکانێتی.

ج ـ هەرچەندە بوون بە هێزی پێشەنگ مۆدێلـەکانی پـارتی کلاسیک بێنێتـەوە بیـری مرۆڤ، بەڵام لە بواری چۆنایەتی و ناوەڕۆکدا جیاوازییان هەیە. هێزە پێشەنگە نوێیەکـە نموونـەی بـەرایی کۆمـەڵگای دیموکراتیکـە. مـۆدێلی لەپێشـینەیی کۆمـەڵگای نەتـەوەی دیموکراتە. هەرچەندە وەک جاران گوزارشت لە هەمووێتی بەرنامـە، ستراتیژ و تـەکتیک بکـات، بـەڵام نـاوەڕۆکی ئـەو دەسـتەواژانە بـە وەرچـەرخانێکی گرنگـدا تێپـەڕیوە. سـتراتیژییەکەی فاکتـەرەکانی مۆدێرنیتـەی دیموکراتیـک بەبنـەما دەگرێـت. بەرنامەشـی لـەبواری پرەنسیپیدا چۆنیـەتی بونیادنـانی هـەمان ئـەو فاکتەرانـە دەستنیشـان دەکـات. هـەرچی تەکتیکـە ئـەوە دەخاتـەڕوو کـە پرەنسیپەکانی بەرنامـە بەکامـە هێـز، ئـامراز و

شێوەکانی تێکۆشان بە ئاراستەی ستراتیژییەوە جێبەجێ دەکرێن. لە کاتێکدا بەرنامە ئامانجە سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری، بەرگری خۆیی و دیبلۆماسیەکان بەگوێرەی دونیابینی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەستنیشان دەکات، ستراتیژییەکەی پێشبینی جێبەجێکردنی ئەو ئامانجە لەگەڵ هێزە سەرەکی و تەکتیکیەکان دەکات. نەتەوەی دیموکرات، پیشەسازی ژینگەدۆست و ئابووری جڤاتی تەوەرەی بازاڕی سۆسیالیستی فاکتەرە سەرەکیەکانی ستراتیژین. هەرچی فاکتەرە سەرەکیەکانی تەکتیکن لەمیانەی شێوەکانی ئەو ڕێکخستن و تێکۆشانانە دەستنیشان دەکرێت کە ئامانجە سەرەکی و فاکتەرە ستراتیژییەکان بەدیدێنێت و بۆ بونیادنانی کۆنکرێتییان پێویستە.

کاتێک ڕێکخستن و تێکۆشان جێگای باس بێت، کێشەی کادیر دەردەکەوێتە پێش. لە کۆمەڵگای مۆدێرندا ڕێبەر و کادیران گرنگی خۆیان لەدەست نادەن. بە پێچەوانەوە لەبەرئەوەی کۆمەڵگا تووشی ئاڵۆزی و پەشێوی زیاتر بووە ڕۆڵیان گرنگ و بایەخدارتر دەبێت. ئەوەی لێرەدا گرنگە، کامە دیدگا و ڕێنمایی بەبنەما دەگرن. ئەگەر سەرکردە و کادیرە حزبیەکان دونیای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز نەکەن، زوو یان درەنگ دەگۆڕێن و دەبن بە فاکتەرەکانی چەوسانەوە و دەسەڵاتی سەرمایەداری. ئەگەر بەسووربوونەوە داکۆکی لەسەر فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک بکەن، سەرکردە و کادیرانیش بە گوێرەی ئەوە شێوە دەگرن. ئەگەر لەجیاتی دیدگای دەسەڵات و دەوڵەت، دەستبەرداری ڕێنمایی و دیدگای دەستڕۆیی دیموکراتیک و کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسی نەبن، ئەوا پێگەیشتنی کادیر و سەرکردە دیموکراتەکان پێویستییەکی ناسنامە نوێیەکەی پارتیمانە.

ئەرکی سەرەکی PKK لەسەردەمی نوێ لەگەڵ قۆناغەکانی دیکە جیاوازە. شانبەشانی ژیاندن و ژیاندارکردنی ئەو کاریگەرییە سیاسییەی کە لە تێکۆشان و چالاکی سەردەمی گروپ و کاریگەری ئایدیۆلۆژی بەبنەما دەگیرا، پێویستە ناسنامەی بەدەستهێنراوی کوردان و ئارەزووی ژیانی ئازاد بۆ بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات وەرچەرخێنێت. هەردوو قۆناغی یەکەم بەهاگەلێکی زۆری لەپێناو بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات کەڵەکە کرد. بەڵام تا ئێستاش بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات وەک ئەرکێک لەسەر شانی ماوەتەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ هەمووێتی و یەکپارچەیی بەرنامە، ستراتیژ و تەکتیکی سەردەمی نوێ ئەرکی جێبەجێکردنی ئەو بونیادنانەیە. لەبەشی KCKدا وردەکاریەکانی ئەو بابەتە تاوتوێ دەکەین. لێرەدا پەیوەندیPKK لەگەڵ KCK بایەخدار دەبێت. پێویستە هێزی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ڕێکخستنی PKK لەو ئاستە دابێت کە لە چوارچێوەی KCK دا ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات.

د ـ وەک چۆن لە تەواوی ئەو باسانە ڕوون دەبێتەوە لەمیانەی ڕەخنەکردنی سۆسیالیستی و سیستەمی سۆسیالیزمی بونیادنراودا توانستی ئایدیۆلۆژی PKK بەهێز بووە. لەجیاتی هەڵوێستێکی دۆگماتیکانە هەڵوێستێکی وردی لێپرسینەوەی پیشانداوە. لەبواری بیرکردنەوەی دیالیکتیکیانە و چالاکی و کرداردا پێشکەوتن جێگای باسە.

بەبەراورد لەگەڵ جاران توانای هەڵسەنگاندنی کۆنکریتی و ئەنجامدانی گۆڕانکاری و وەرچەرخانی پێویست بەکارەکتەرترە و هێز بە ژیانی ئازاد دەبەخشێت. مەودای نێوان ئایدیۆلۆژیا و سۆسیۆلۆژیا کورت بۆتەوە. جیاوازی نێوان سۆسیۆلۆژیا و سۆسیالیزمی زانستیش کەم بۆتەوە. ئاڵوگۆڕی نێوان ئایدیۆلۆژیا، سۆسیۆلۆژیا و هزری سۆسیالیستی زانستی بەهەمووێتی و یەکپارچەیی گەیشتووە، تا دەچێت زیاتر بەرەو زانستێکی کۆمەڵایەتی جێگیر و بە پرەنسیپ دەچێت. لەو بارەیەوە PKK لەسەرووی پارتە خاوەن بانگەشەکانەوە دێت. هێزی بنەڕەتی پارتێکی سۆسیالیستی لەمیانەی دەست ڕەنگینیەکەی سەبارەت بە زانستی کۆمەڵایەتیەوە دەپێورێت. هێزە یەکلاییکەرەوەکەی سەرچاوەی خۆی لە پەیوەندییەکەی بە زانستی کۆمەڵایەتیەوە وەردەگرێت. چەندە پشکی زانستیبوون لەتوانستە ئایدیۆلۆژی و سۆسیۆلۆژییەکەی پەرەبسەنێت، بەو ڕادەیەش ڕۆڵی پێشەنگایەتی پەرەسەندن بەخۆیەوە دەبینێت.

به بەراورد لەگەڵ جاران ئاستی سیاسی PKK لەسەردەمی نوێ پەرەسەندنێکی زۆری بەخۆوە بینیوە. لەبەر ئەوەی زیاتر لەرێگای ئەزموونەوە توانستی سیاسی بەدەستهێناوە لەو بارەوە لەدونیادا PKK یەکێک لەو پارتە دەگمەنانەیە کە پێگەیەکی تایبەتی هەیە. وێڕای ئەوەی دووچاری گەمارۆیەکی خەستی ئاستی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هات؛ لەسەرپێ مانەوە و تەسفیە نەبوونی، ئەزموونی سیاسی پێ بەخشیوە. لەو سۆنگەیەوە؛ هێزی بەدەستهێناوە، سیاسیبوونی کۆمەڵگای کورد و سیاسیبوونی ناو PKK بەشێوەیەکی تێکەڵ و لەسەر بنەمای یەکتری بەهێزکردنەوە بووە. لەکاتێکدا گەلی کورد بەهێزترین قۆناغی سیاسیبوونی بەخۆوە بینی، هەمان راستینە بۆ PKKش لەجێگای خۆی دایە. سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە لەناو PKKدا بەشێوەیەکی خەست تێکەڵ بە یەکتر بەڕێوە دەچێت. ئەو ئاستە سیاسییەی لەئارادایە پەیوەندی لەگەڵ راستییە مێژوویی و گەردوونییە هەنووکەییەکان گرێدراوە. هەروەها رایەڵەی نێوان سیاسەت و ئەخلاقیش بەشێوەیەکی تەندروستانە دانراوە. تێکەڵی و بەناویەکداچوونی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی بەبنەما دەگیرێت. فاکتەرەکانی ئایدیۆلۆژیا و سۆسیۆلۆژیا بنەمای سیاسەتەکەی پێکدێنێت، لەو سۆنگەیەوە؛ هێندەی فاکتەری زانستی فاکتەرە ئاکاری و ئەخلاقیەکانیشی پەیرەو دەکرێن. گرنگیەکی زۆر بە رایەڵەکەی لەگەڵ هونەر دەدات و پشتگوێی ناخات. تەنیا لایەنی ئایدیۆلۆژی و ئەخلاقی سیاسەت پێشناخات، بەڵکو لەبواری هونەریشدا بوون و مانای پێدەبەخشێت. لە سیاسەتی وشک دووردەکەوێتەوە و هەوڵدەدات بە دیاردەیەکی سیاسی دەوڵەمەندی بەمجۆرە و حەقیقەتەکەی بکات.

لەگەڵ ئەوەی لەناو PKKدا لەلایەنی رێکخستنیەوە کێشەی کادیر لەبواری چەندایەتییەوە جێگای باس نییە، لەسەرجەم قۆناغەکاندا کێشەی سەرەکی سەرچاوەی خۆی لە نەبوونی کۆلەکتیفیزم و هەرەوەزی دەگرت. نە تاکەکەس رۆڵی خۆی دەبینێت نەهێزی کۆلەکتیفیزم بەپێی پێویست بەرجەستە دەکرێت. بەو رادەیەی تاک رۆڵی خۆی

نابینێت، ڕاکردن لە هەرەوەزی و کۆلەکتیڤیزمیش دۆخێکە بەردەوام دەبینرێت. هەربۆیەش تاکەکەس و ڕێکخستنەکانیش هێزێکی زۆر لەدەست دەدەن. کێشەی ئافراندنی کادیری ڕێکخستنی؛ ڕۆڵی تاکەکەسی بەرێکخستندا تێپەڕ دەبێت، ڕێکخستنیش بەکادیرە دەستپێشخەرەکان دەرباز دەبێت؛ تا ئێستاش ئەو کێشە لە ڕۆژەڤدا ماوەتەوە.

## ٢. جێگای PKK لە ژیانی نەتەوەی دیموکراتدا

لەسەردەمەکانی پێشوودا داناکان، ڕاهیبەکان، لایەنەکانی سیاسەت و مەزهەبە ئایینیەکان ڕۆڵی پارتە مۆدێرنەکانیان بینیوە. ئەو خانەدانانەی لەزەمینەی ماددی لە ململانێ و پێکدادان دابوون هاوپەیمانگەلێکی زۆریان دەخستە پاڵ باڵە سەربازی و زانستیەکانی بیرۆکراسی و هەوڵی بەدەستهێنانی بالادەستی و دەسترۆییان دەدا. لەگەڵ سەرهەڵدانی کێشە کۆمەڵایەتیەکاندا پارتەکانی خاوەن تێڕوانین و ڕێبازە جیاوازیەکانی چارەسەریش لەدایک دەبن. بەشێوەیەکی نهێنی بێت یاخود ئاشکرا، بەدرێژایی چاخ و سەردەمەکان پارتەکان هەر هەبوون. لەکاتی دەستبردن بۆ هەر کێشەیەکی کۆمەڵایەتی ، یاخود بۆ بەرپەرچدانەوەی حوکمڕانە ناوخۆیی و دەرەکیەکان هێزی تاکەکەس لاواز بمێنێت و کورت بێنێت، هانا بردن بۆ هێزی پارت عاقڵانەترین ڕێگایە. هەر بەرپەرچدانەوەیەکیش پارتێکی خۆی هەیە، تەنانەت ئایین، مەزهەب و تەریقەتەکانیش لەکاتی سەرهەڵدانیاندا ڕۆڵی پارتی دەبینن. لەبواری ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئەخلاقییەوە خۆیان بەهەر کام لە ناسنامەکان ناوبنێن، لەئاکامدا هەریەکە و پارتیەکن. لە سەردەمی مۆدێرنیەتیش ئەو نەریتە مێژووییانە بە شێوەی نوێ دەگەن، هەنگاو بەهەنگاویش بە مانای پارتەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان گەیشتوون.

پارتەکان ڕۆڵگەلێکی گرنگ دەبینن، لەوانە: ئەو توێژە کۆمەڵایەتیانەی پشتیان پێدەبەستێت یان کردوونی بەئامانجی خۆی دەیانناسێنێت و پێشانیان دەدات، نوێنەرایەتیان دەکات، مافەکانیان بەدەست دەهێنێت و بەگوێرەی پێوەرە هاوچەرخەکان سەرلەنوێ شێوەیان پێدەدات. سەرجەم ئەو بەڵگانەش دەیسەلمێنێت کە لەناو کۆمەڵگادا بەئاسانی دەستبەرداری لە ڕۆڵی ڕاستینەی پارتەکان ناکرێت. دەرهەق بە کۆمەڵگایەک کە هەوڵی پەرەسەندن و بەرگری لەخۆکردن دەدات داکۆکیکردن لەسەر بێمانایی و پێویست نەبوونی پارت ئاسان نییە. بەڵام ئەو دۆخاناش مانای ئەوە نییە کە هیچ کاتێک پارتەکان بێواتا نابن. کۆمەڵگایەک گەشە بکات و پەرەبسێنێت، بەیەکەوە لەگەڵ تەواوی ئەندامانی کارەکانی ڕاپەڕێنێت، ئەو کاتە پارتیبوون مانای نامێنێت.هەروەها کۆمەڵگایەک لە دۆخی کلانی دێرین دابێت لە ڕەوشی تیرە و هۆزگەلدا بژیت، ئەویش پێویستی بە پارتیبوون نامێنێت. لەڕاستیدا تەواوی کلان یاخود تیرە وەک پارتێک وایە. ئاوابوون و پێکهاتنی پارتەکان پێویستی بە هەبوونی چین و بەرژەوەندی ڕکابەرە لەناو کۆمەڵگادا. کاتێک جیاوازی چینایەتی نەمێنێت و بەرژەوەندیەکان هاوبەش بن، پارتیبوونی جیاواز مانای

نامێنێت. هەندێک جاریش لەپێناو هەمان رۆڵی کۆمەڵایەتی چەندین پارتی جیاواز ئاوا دەکرێن. ئەو چەشنە پارتانەش لەپێناو پارتێکی بە پرەنسیپ، خاوەن رۆڵ و خۆسەلمێنەر لە مایەپووچبوون و لەناوچوون رزگاریان نابێت. ئەو باسەش بۆمان روون دەکاتەوە و دەیسەلمێنێت بۆچی دەستبەرداری پارتە کۆمەڵایەتییەکان نابین. تەنانەت بە دەوڵەتبوونیش ئەو هێزەی نییە شوێنی پارتیبوون پڕبکاتەوە.

هەر لەسەرەتای سەرهەڵدانییەوە هۆگربوون بەPKK و بەگرنگی و سەرنجەوە پێشوازیکردنی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بۆشاییەکی گەورەی ناو کۆمەڵگای کوردی پڕکردەوە و پێویستیەکانی ژیانی فەراهەم کرد. چەندە لەبواری زارەکی و کردارییەوەPKK راستگۆیی و دڵسۆزی خۆی سەلماند، بەو رادەیەش ئاستی پەسەندکردنی لەناو کۆمەڵگا زیادی کردووە. وێڕای کەموکوڕییەکانی بگرە زیانەکانیشی، بەڵام دیسان پارێزگاریکرنی لە رێز و پێگە و دەست لێبەرنەدراوییەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە پێویستییەکی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی دابین کردووە و رۆڵێکی لەوجۆرەی لەناو کۆمەڵگادا بینیوە. لەسەردەمی نوێشدا رۆڵبینینیPKK گرێدراوی وەڵامدانەوەی پێویستی مێژوویی و خاوەنداریکردنێکی راستی ئەرکە هەنووکەییەکانە. دانانان بە ناسنامەی کورد و دەرکەوتنی ئیرادەی ژیانی ئازاد مانای چارەسەرکردنی ریشەیی کێشەی کۆمەڵایەتی نابەخشێت، بەڵکو نیشانەی دەربازکردنی قۆناغێکی گرنگە. کاتێک ئارەزووی ناسنامە و ئازادی بەزامنی مسۆگەر بگات و هەمیشەیی بکرێت، لەسەرووی ئەو کێشانەوە دێت کە چاوەڕوانی چارەسەرکردنی دەکرێت. ئارەزووی ژیانی ئازاد و ناسنامەی کورد کە هیچ گەرەنتیەکی یاسایی، ئابووری، سیاسی و بەرگری نییە هەرساتێک ئەگەری ئەوەی هەیە لەلایەن دوژمنەکانییەوە سەرکوت بکرێت و دووچاری کۆمەڵکوژی بێت. لەبەر ئەو هۆکارانە پێویستە لەمە بەدواوە PKK بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە رۆڵە پۆزەتیڤەکەی خۆی ببینێت. تائێستاPKK خوازیار بوو لەئەرکە نێگەتیڤەکان سەرکەوتوو بێت، واتا هەوڵیداوە لە رێگرتن و بەربەستکردنی خراپیەکان سەرکەوتوو بێت. لەمە بەدواش پێویستە لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانی بونیادنانەوە سەرکەوتوو بێت کە لایەنی پۆزەتیڤی لە پێشە. تەنیا لەمیانەی بەدەستهێنانی ناسنامە و ماناکەی PKKدەتوانێت ئەو ئەرکانە جێبەجێ بکات کە بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات بناغەکەی پێکدێنێت. لەمیانەی PKK بێبوونێکی هەرەمەکی و ئاساییەوە ئەم ئەرکانە جێبەجێ ناکرێن.

بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لە بونیادنانی سۆسیالیزم لەپێشترە، چونکە ئەو رێگایەش دەکاتەوە کە بەرەو سۆسیالیزم دەچێت. لە کاتێکدا ئەو بونیادنانە لەبواری کۆمەڵایەتییەوە پێویستی بە شۆڕشە، لە هەمانکاتدا پابەندی جێبەجێکردنی ئەرکە ئەخلاقی و یاساییەکانیشە. وێڕای سەرجەم گەمارۆکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، ئەگەر پێشەنگایەتی PKKلەو چوارچێوەیەدا خاوەنداری لەرۆڵی خۆی بکات دەتوانێت سەرکەوتوو بێت. لەو دۆخەدا خۆپەروەردەکردنی کادیران و هەڵبژاردنی فەلسەفەی ژیانی ئازاد و کردنیان بەشێوازی ژیانی خۆیان مەرجە. پارتی تەنیا لەڕێگەی ناسنامە

ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکەیەوە لەبەرامبەر هەر هێرشێکی ناوخۆیی و دەرەکی دەتوانێت خۆی بپارێزێت؛ دەتوانێت هێزی هەڵمەت بەدەست بێنێت و لەگەڵ کۆمەڵگادا ببێت بەیەک. شانبەشانی تۆکمەیی ئایدیۆلۆژی و سیاسی پێویستە کادیرانی پارت ئەو هێزەیان هەبێت لەژێر هەر هەلومەرجێکدا پابەندی ئەخلاقی ژیانی ئازاد بن. پێویستە توانای هەنووکەییکردنی توانستی کەسێتی پێگەیشتووی هەبێت و ئەو کەسایەتیە بەدەست بێنێت کە لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بە "مرۆڤی کامڵ" ناو دەبرێت. پێویستە ئەو هێزە پیشانبدات کە توانای مایەپووچکردنی سەرجەم ئایدیۆلۆژیا و شێوازەکانی ژیانی دەسەڵاتگەرا، میللیگەرا (ألقوموية)، ڕەگەزگەرا (ألجنسوية) و ئایینگەرا (ألدينوية) و لیبراڵی هەبێت کە مرۆڤ لە حەقیقەت دووردەخەنەوە. ئەو پێویستییەی بەدرێژایی چاخ و سەردەمەکان بۆ مرۆڤی کامڵ جێگای باس بووە زیاتر لە مرۆڤی ئەمرۆمان دەرکەوتۆتە پێش، ئەوەش تەنیا لەمیانەی بوون بە کادیری سۆسیالیستی هاوچەرخ بەدیدێت. تەنیا لەسەر بنەمای هەبوونی ئەو چەشنە کادیرانە دەشێت هەنگاو بۆ پرۆسەی بونیادنانی ژیانی نەتەوەی دیموکرات بهاوێژرێت. لەکاتی پێویستدا هەر کادیرێک خۆی بۆ سەدان ڕێکخراوی نەتەوەیی دیموکرات وەردەچەرخێنێت و ئەرکی خۆی جێبەجێ دەکات. چونکە ڕێکخراوێک یان کادیرێک لەژێر کاریگەری شێوازی ژیان و ئایدیۆلۆژیا ئامادە پێکراوەکاندا بێت تەنیا دەشێت سەرچاوەی کێشەکان بن. خۆتەیارکردن و ئامادەباشی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی و ڕێکخستنی هەر کادیرێک گەرەنتی سەرکەوتنی هەر کادیرێکی پێشەنگە لەبونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا.

پێویستە زۆر بەباشی دەرک بە پەیوەندییەکانی هەڤاڵێتی بکرێت. پەیوەندی هەڤاڵێتی ناوەڕۆکی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە یاخود پێویستە وەها بێت. بەڕادەی کۆمەڵگای مێژوویی ڕەنگدەرەوەی کۆمەڵگای ئایندەشە. لەبنەڕەتدا پەیوەندی ئایدیۆلۆژییە؛ پەیوەندییەکانی حەقیقەتە کە ئایدیۆلۆژیا دەریخستۆتەڕوو و ڕێگای لەپێش دەرکەوتنی کردۆتەوە. لەو چوارچێوەیەدا یەکێتی دوو هەڤاڵ یان هاوڕێ تەنیا یەکێتیەکی ئایدیۆلۆژی نییە، ناچارە وەک یەکێتی حەقیقەت بژیت کە توانستی ئایدیۆلۆژی ڕێگای لەپێش کردۆتەوە. بەڕاستی ئەگەر دوو هاوڕێ بەنهێنی هەڤاڵێتی گەیشتبن و یەکێتیان ئاواکردبێت، پێویستە وەک نوێنەری بەهێزی حەقیقەت بناسرێت و دەرکی پێبکرێت. ئەوانەی هیچ دەردێکی حەقیقەتی مەزنیان نییە پێویستە نەکەونە سەر ئەو "ڕێبازە". ئەوانەی بەدوای حەزی وردیلە، ڕەمەک (غەریزە) و بەرژەوەندییەوەن هەرگیز نابن بە هەڤاڵ. هەڤاڵێتی لەگەڵ ئەوانەدا ناکرێت. ئەوانەی کەمەندکێشی باوەڕی کوێرانە و هەستە دەمارگیرییەکانیشن نابن بە هەڤاڵ. بەتایبەتیش ئەوانەی ئایدیۆلۆژیای ژنایەتی – مێردایەتییان دەرباز نەکردووە، پەیوەندییە هەرزانەکانی نێرینە ـ مێیینەییان نەشکاندووە و دونیای زهنیەتی خۆیان ئازاد نەکردووە، پێویستە باسی هەڤاڵێتی نەکەن و لەخۆڕا ئارەزووی هەنگاونان بۆ ئەو ڕێگایە نەکەن. پێویستە پەیوەندی هەڤاڵێتی لەهەر جۆرە پەیوەندی، هزر، گوتە و کردەیەکی هاوشێوەی پارە، سامان، موڵک، ژنایەتی –

مێردایەتی، خولیابوون بە شتوومەکی ماددی، راکردن بە دوای حەز و ئارەزووەکان، هەوڵدان بۆ دەسەڵاتگەرێتی و بوێری کوێرانە و ترس دوور بێت کە لە کاروانی حەقیقەت و ناسنامەی نوێنەرایەتیکردن دووری دەخاتەوە. پێویستە بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بە رووی ئەو چەشنە هەرەشانە بوەستێتەوە؛ لە هەمانکاتدا پێویستە خۆتەیارکردنێکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی و رێکخستنی ئەوتۆی هەبێت کە لەژێر هەر هەلومەرجێکدا بتوانێت حەقیقەتە مەزنەکان بدرکێنێت، تیۆریزە و پراکتیزەیان بکات. ئەو پارتەی بیر لە یەکێتیەکەی دەکرێتەوە تەنیا لە چوارچێوەی ئەو پەیوەندییانەی هەڤاڵێتیەوە دێتە بوون. دەتوانێت ببێتە گوتەبێژی کۆمەڵگای مێژوویی و ئایندەش. PKKتەنیا لەمیانەی ئەو پێوەرانەی پەیوەندی هەڤاڵێتیەوە دەتوانێت رۆڵی مێژوویی و کۆمەڵایەتی خۆی ببینێت.

PKKرووبەڕووی دوو کێشەی زەبەلاحە کە بەشێوەیەکی رۆژانەیی و بەرجەستە لە پێشیەتی. باسی کێشەکانی ئاشتی یاخود شەڕ دەکەین کە پەیوەندییەکی دیالیکتیکی بەهێزیان لەگەڵ یەکتردا هەیە. پەسەندکردنی مافی نەتەوەی دیموکرات کەمترین یاخود بچووکترین فۆرمیلەی رێگەچارەی کێشەی کوردە. بەڵام ئەو هێزانەی داکۆکی لەسەر ستاتۆی کۆمەڵکوژی زاڵی سەر کورد و کوردستان دەکەن بە هیچ جۆرێک ناخوازن نزیکی رێگەچارەی ئاشتی و دیموکراتیانەی ناو چوارچێوەی سنووری سیاسی ئێستاش ببنەوە. داکۆکی لەسەر ماف و هێزی نکوڵی و قڕکردن دەکاتەوە. پاوانەکانی چەوساندنەوە و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی کورد و کوردستانیان لەنێوان خۆیان دابەشکرد، بەکرێگیراوە بەبنەچە کورد و سیخوڕەکانیان لەژێر خەڵەتاندنی "مافەکانی تاکەکەس" سیاسەتی کۆمەڵکوژی دەڕازێننەوە و پەردەپۆشی دەکەن و خوازیارن دووبارە درێژەی پێ بدەن. ئەوەش بە مافە نەتەوەیی و چینایەتییە دەست لێبەرنەدراوەکانی خۆیان دادەنێن. ئەو هەڵوێستە لەناو سنوورەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەشدا دەرفەت بەئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە نادات. کاتێک ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە جێگەی باس نەبێت، لەبەرامبەردا شەڕێکی کۆمەڵکوژی سەرتاسەری بەڕێوەدەبات کە سەرجەم رەهەندە سەربازی ، سیاسی، کۆمەڵایەتی، کلتووری، ئابووری، دیبلۆماسی و دەروونییەکان دەگرێتەوە. لەڕاستیدا ئەوەی بەڕێوە دەچێت و بەشی هەرە زۆریشی شاراوەیە شەڕی ژینۆسایدکردنی گەلی کوردە. ئەو شەڕەی نزیکەی سەدەیەکە بەڕێوە دەچێت، فرە هاوپەیمانە و بەشی هەرە زۆری یەکلایەنەیە و ئامانجیشی سڕینەوەی کوردانە لە مێژوو و لەناوبردنی کۆمەڵگای ئازادە؛ شەڕی کۆمەڵکوژی و ژینۆسایدە.

لەمیانەی ئەو ئەزموون و وانانەی لەشەڕی ئەو سی ساڵەی دوایی وەرگیراون دەرفەتی بەدیهێنانی ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە هەبوو. پەسەندکردنی مافی بوون بە نەتەوەی دیموکرات ئاشتیخوازانەترین رێگەچارەیە کە بەبێ ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد و بەبێ ناچارکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکان بۆ شێوەی فیدڕالی، دەرفەتی جێبەجێکردنی هەیە. ئەو نەخشەڕێیە ١٦٠ لاپەڕەییەی لەئاکامی دیالۆگ و دانوستاندن لەگەڵ دەوڵەت پێشکەشکەم کردووە بەپێی پێویست پرەنسیپەکانی ئاشتی و چارەسەری

ڕوونکردبووەوە. بەڵام هەڵگرانی نەریتی بەهێزی کۆمەڵکوژی لەناو دەوڵەت و ئۆلیگارشی سیاسی (دەزگای پروپاگەندەی دەوڵەت) بەهیچ جۆرێک بڕیار سەبارەت بە ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە نادەن. وێڕای ئەوەی چەندین جار KCK ئاگربەستی یەکلایەنەی ڕاگەیاندووە، بەڵام وەڵامی پێویستی وەرنەگرتووە. دۆخێک لەئارادایە وەک بڵێی؛ بەردەوام لەسەر ئاگر بێت. زۆر ئاشکرایە کە ئەو دۆخەش درێژ ناخایەنێت. یان ئەوەتا قۆناغێکی ڕێگەچارەی دیموکراتی و ئاشتییەکی هەمیشەیی مانادار و شەرەفمەندانە دەستپێدەکات کە هەردوو لایەن سەبارەت بە پرەنسیپە سەرەکییەکان ڕێکدەکەون، یاخود قۆناغێکی نوێ و کۆتایی شەڕ ڕوودەدات کە زۆر لە شەڕی سی ساڵەی ڕابردوو توندتر و دژوارتر دەبێت. بە هەموو وردەکاری و لایەنەکانیەوە PKKناچارە سەبارەت بەهەردوو پرۆسە قاڵبێتەوە. ڕێگەچارەی دیموکراتیانە و ئاشتی شەرەفمەندانە پێویستی بە بەهرەیەکی سیاسی و ڕۆشنبیری مەزن هەیە. پێویستە ڕێگەچارەی دیموکراتیانە و ئاشتی پێشبینیکراو بکرێت بە موڵکی تەواوی گەل. ناکرێ تەنیا بە تێگەیشتنی سنووردار بن، بەڵکو پێویستە لەسەر ئەو بنەمایە گەلیش پەروەردە بکرێت، ڕێکبخرێت و بکرێت بە خاوەنی چالاکی؛ پێویستی بەهەزاران گفتوگۆ و کۆبوونەوەی دەرهەق بەبڕیاردان، ڕێکخستن و چالاکی هەیە. ئەوەی جێگای باسە ئاشتییەکی مێژوویی و شێوازێکی ڕێگەچارەی سیاسی و دیموکراتیانەیە کە بۆ تەواوی گەلانی ناوچەکە و مرۆڤایەتی ببێت بە نموونە.

پێویستە مێشکی خۆمان سەبارەت بە کێشەکانی شەڕیش ماندوو بکەین کە وەک ئەگەرێکی بەهێز لەئارا دایە. ئەزموونی شەڕی سی ساڵەی ڕابردوو بەشێوازێکی ناشارەزا و پڕ لە گێرەشێوێنی و کەمترین شێوازی گەریلایی و هاوشێوەی نیمچە ــ یاخیبوون و نیمچە ـ گەریلا بەڕێوەچوو. ناشێت شێوازی شەڕی داهاتوو بەمجۆرە بێت. بەر لەهەموو شتێک گەل گەلی جاران نییە؛ بەڕێوەچوونی شەڕی گەلی ڕاستەقینە دەسەپێنێت. دوای ئەزموونی سی ساڵەش ئەرکی سەرکردایەتی مەیدانی شەڕە: واتە ئەرکی HPGیە کە خۆی بۆ شەڕێکی سەرتاسەری شار ـ شاخ ئامادە بکات؛ بەبێ گوێدان بە شەو ــ ڕۆژ، هاوین ــ زستان، لادێ ــ شار، شاخ ــ دەشت ئەرکی پێشخستن، بەڕێوەبردن و کۆنترۆڵکردنی شەڕێکە کە لە هەمان سات و لە هەر دەڤەرێکدا ئەگەری بەشداریکردنی هەزاران کەسی هەیە. هەرچەندە لە چوارچێوەیKCK دا بەڕێوەبچێت، بەڵام لە قۆناغی نوێی شەڕ و تێکۆشاندا PKK ناچارە بەرپرسیارێتی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئەخلاقی و بڕیاڕدان بگرێتە ئەستۆ. پێویستە زۆرباش ئاگاداربێت کە قۆناغی شەڕی پارتیزانی، نیمچە یاخیبوون ـ نیمچە گەریلا و جۆرەکانی شەڕی چەتەگەرێتی دووبارە نابێتەوە، دووبارەش ببێتەوە پەسەند ناکرێت و بەگوێرەی ئەوەش ناچارە پەرە بە بەهرە و تواناکانی خۆی بدات. قۆناغە نوێیەکەی شەڕ و تێکۆشان چەندە پەرەبسەنێت، ناچارە بە لێهاتوویی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئەخلاقی و بەهرەی بڕیاربوونەوە لەکاتی خۆیدا و لەهەموو لایەکەوە وەڵامی هەر کێشەیەک بداتەوە کە سەرهەڵدەدات. بە ئەندازەی هەڵسەنگاندنی

سەرجەم هەلومەرجە ناوخۆیی و دەرەکییەکان، لەکاتی خۆیدا حیسابکردن بۆ سەرجەم ئەو ئەنجامانەی رەهەندەکانی شەڕ پێیدەگات و بەرپرسیارێتی پێچەوانەکردنەوەی دۆخەکە بەلایەنی تیکۆشاندا؛ دەکەونە ئەو چوارچێوەیەوە. کورتهێنان و وەڵامنەدانەوە دۆخێک نین کە وەک جاران لەناو PKKبە لێبوردەیی پێشوازییان لێوە بکرێت. هێندەی حیساب بەخشین، لێپرسینەوە و حیساب وەرگرتنیش کاریگەر دەبێت. چیتر وەک جاران ناتوانن بەرپرسیارێتی بخەنە ئەستۆی هەندێکی تر یاخود پشت بە پراکتیکە تەسفیەکارەکان ببەستن و بەمجۆرە خۆتان رزگار بکەن یان خۆتان بدزنەوە. ئێستاکە راستینەی گەل و پارتی رێگە بەوە نادەن. چونکە لەڕاستیدا وەک چۆن ئەندامە قاچاغ و تەسفیەکارەکانی جاران چارەنووسیان دیار نییە، پڕشنگداریش نییە. تەنانەت لەکاتێکدا دەوڵەتەکانیش هەوڵدەدەن رووبەڕووی رابردووی خۆیان ببنەوە و خۆیان پاک بکەنەوە، ئەوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا دۆخی مەترسیداری ئیعترافکار، بەکرێگیراو و تەسفیەکارەکانیش دەخاتەڕوو.

لەوە بەدواوە یان هەموو شتێک بەگوێرەی ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و رێگەچارەی دیموکراتیانە دەبێت، یان گرێدراو بە دواترین شەڕی سەرتاسەری واتادار دەبێت و بەهای ژیان بەدەستدێنێت. ئەوانەی لەو نێوانەشدا دەمێننەوە دەشێلدرێن و دەرباز دەکرێن. سەردەمە مێژووییەکان بە بڕیار و چالاکی مێژووییدا گوزەر دەکات. پاشماوەکانیش ئەو درۆ و خەیاڵانەن کە دەبنە بڵقی سەر ئاو و نامێنن. ئەو تاک، رێکخراو و گەلانەی، دەوڵەت و پارتانەی خۆیان بۆ قۆناغ و پرۆسەی لەوجۆرە ئامادە ناکەن، یاخود خۆیان ئامادە دەکەن، بەڵام ناتوانن وەڵامی بدەنەوە، لە کەوتنە ناو زبڵدانی مێژوو رزگاریان نابێت. تەنیا لەسەر بنەمای ئەو وانانەی لە ئەزموونی رابردووی وەردەگرێت PKK دەتوانێت سەرجەم لایەنەکانی هەلومەرجی ئێستا تاوتوێ بکات و بەوجۆرە ئامادەکاری پێویست بکات و بەهەمان بوێری و بڕیارداریی‌یەوە هەنگاو بۆ پراکتیک بهاوێژێت و دوو ئەرکە مێژووییەکەی خۆی جێبەجێ بکات. چاوەڕوانیکردنی سەرکەوتن یاخود شکستێکی گەورە لەو قۆناغ و پرۆسەیە واقیعی نییە. مسۆگەر ئەنجام لەبەرژەوەندی ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و رێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتدا دەبێت کە هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە. ئەویتر ونبوونە لەناو گێژاو و گەردەلوولی کۆمەڵکوژی، کە رەوشی ئێستای مرۆڤایەتی رێگەی پێنادات.

تەواوی هەلومەرجەکان هێندەی گەورە شۆڕشەکانی فەرەنسا و رووسیای مێژووی هاوچەرخ پێشهاتە چاوەڕوانکراوەکانی قۆناغی داهاتوو گرنگ و بایەخدار دەکات. ئەگەر لەرێگای شەڕەوە یاخود ئاشتییەوە بەدیبێت، گەلی کورد تەنیا لەپێناو خۆی کێشەی نەتەوەی دیموکرات چارەسەر ناکات، بەڵکو پێهەڵگرتنێک جێگای باسە کە بۆ تەواوی ناوچەی خۆرهەڵاتی ناوین و مرۆڤایەتی مانا و گرنگیەکی زۆری هەیە. لەمیانەی ئەو هەنگاوەیەوە دانەیەکی نوێ ناخاتە سەر ئامێرەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە رۆژانە لە زیادبوون دایە؛ ناچێتە ریزی دونیای ستاتۆی سەرمایەداری،

قۆرخکـاری و پیشەسـازی کـە لـەمێژە مۆدێرنیتـە ئامـادەی کـردووە؛ بـەڵکو بریسـکە و ڕوناکیەکانی ژیار و مۆدێرنیتەیەکی نوێ بڵاودەکاتەوە.

ئەو ڕابوونەی مۆدێرنیتە؛ کە دەتـوانین بـە مۆدێرنیتـەی دیمـوکراتیش نـاوی ببـەین، دەتوانێت ڕێگەچارەی پێویست پیشانی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین بدات، کە لەیەکێک لـە قۆناغەکانی پڕ لە گێژاوی دیرۆکی خۆیدا دەژیت. هەر لەئێستاوە بەهای چارەسـەرئامێزی ئەو ڕۆڵە بەتایبـەتی لەمیانـەی دۆخـی ئێراق (ئـوروک) موە سـەلمێنراوە. ئـەو قۆناغـەی لەئارادایە بەجۆرێک لە جۆرەکان دەتوانین بە "سێیەمین جـەنگی جیهـانی" نـاوی ببـەین. هەر وەک ئەو ڕۆڵـەی کوردە دێرینـەکان لـە بەرەبـەیانی مێژووی شارسـتانی لـە دامێنـی زنجیرە شـاخەکانی زاگرۆس ـ تـۆرۆس بینیـان و PKKشـی کردۆتـە پـاڵێوراوی ڕۆڵێکـی هاوشـێوە، بـەڵام ژیـانێکی نـوێ و مۆدێرنیتەیـەکی دیموکراتیـک کـە بـە ئاراسـتەی کۆمەڵگایـەکی دیموکراتیـک، بـێ چـین، بـێ دەوڵـەت، شـاری ئیکۆلـۆژی و ئـابووری بەکارهێنان بێت. هەر لەسەرەتاوەPKK خۆی بەگوێرەی ئەو ڕۆڵە مێژووییە پێناسە کرد. هەرچەندە کـەموکوڕی و ناتـەواویش جێگـای بـاس بێـت، بـەڵام ئـەو سی ساڵەی دوایـی سەلماندوویەتی کە توانای بینینی ئەو ڕۆڵەی هەیـە. گـەلی کوردسـتان وەڵامێکـی ئـەرێنی داوەتەوە بانگەوازییەکەی. چیتر کوردستان لە دۆخی گۆڕستانە بێدەنگەکەی جاراندا نییە. ئەگـەر بـەڕێگای ئاشـتیخوازانە بێـت یـاخود شـەڕ لەئەنجامـدا قۆنـاغی داهـاتوو دەبێتـە سەردەمی بونیادنانی نەتەوە دیموکراتەکان. بەمجۆرەش کلتووری شارسـتانی خۆرهـەڵاتی ناوین کە هەزاران ساڵە تەڵەزگەکانی شارستانی چینایەتی، شار و دەوڵـەتی کردوویـەتی بە دەریای خوێن؛ قەبیلە، ئـایین، مەزهـەب و نەتـەوەکان یـەکتریان لـەناوبردووە، ئیتـر دەبێتە سەردەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتیـک کـە لەسـەر هـەموویێتی و یەکپارچـەیی نەتـەوە دیموکراتەکان هەڵدەکشێت.

### ب ـ KCK و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات

دەکرێ بگوترێت؛ ئەو تێکۆشانەی تائێستا PKKبەڕێوەی بردووە لە بنەڕەتدا ئامانجی ئاشکراکردن و خستنەڕووی کێشەی کورد بوو. لـە هەلومەرجـەکانی سـەرهەڵدانی PKKدا نکوڵیکردن لە ڕیالیتەی کورد، بەشێوەیەکی سروشتی کێشەی بوونی دەخستە ڕۆژەڤـەوە. PKKش سەرەتا لەڕێگای بەڵگە ئایدیۆلۆژیەکانەوە هەوڵی سەلماندنی بـوونی کێشـەکەی داوە. تەنانەت هەڵوێستی ناواقیعیانەی چەپی تورکیش سەبارەت بـە کێشـەکە، پێویسـتی بیرکردنەوە و خۆڕێکخستنی لـە ئاستی وڵات و نەتـەوە هێنائـاراوە. سـەرهەڵدانی نـاوی PKKش گرێدراوی دۆخـی قۆناغەکـەی ئـەو کاتـە بـوو. کاتێـک لەمیانـەی ڕێبـازە ورد و تەڵەکەبازیەکانـەوە چـەپڕەوەکانیش درێژەیـان بـە نکـوڵیکردن دا، ئیتـر لەسـەر بنـەمای ناسنامە جیاوازەکانەوە ڕێکخستن و چالاکی بوو بـە ڕۆژەڤ. دەوڵـەت ـ نەتـەوەی تـورک کاتێک داکۆکی لەسـەر سیاسـەتی بـاوی نکوڵی و قڕکـردن کـرد و دەرفـەتی بـە هـەوڵی

ڕێگەچارەی سیاسیانە نەدا؛ بە پێچەوانەوە کاتێک لەمیانەی تیرۆری فاشیستانەی ١٢ی ئەیلولەوە وەڵامی ئەو هەوڵ و لێگەڕینانەی دایەوە، ئەو کاتە هەلمەتی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی PKKوەک تاکە بژاریک کەوتە رۆژەڤەوە. لەو رەوشەدا یان ئەوەتا PKK ش وەک گروپە چەپڕەوە دیموکراتەکانی تورکیا لەناو دەچوو، یانیش بڕیاری بەرخودانی دەدا. سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن کە بەشێوەیەکی شاراوە لەلایەن سیستەمەوە (ڕژێمەوە) بەڕێوە دەچوو، کاتێک لەلایەن فاشیزمی ١٢ی ئەیلولەوە بەشێوەی تیرۆری ئاشکرا هەوڵی بەڕێوەبردنی درا، رۆڵێکی دیاریکەری بینی کە کێشەی کورد لە کێشەی ناسنامەی ئایدیۆلۆژییەوە بۆ کێشەی شەڕ و تێکۆشان بگۆڕێت. لەو چوارچێوەیەدا تاوتوێکردنی هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ واقیعیتر دەبێت. لە سیفەتی رزگاری زیاتر هەڵمەتەکە لە ئامانجی سەلماندنی بوون و درێژەپێدانیەوە نزیکترە.

سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن تەنیا بەشێوەیەکی نهێنی و شاراوە بەڕێوە نابرێت. کردەوەی هەشتا ساڵی ئەو سیاسەتە ڕێگای لەپێش نامۆبوونێکی مەترسیداری کوردان کردەوە. کوردان ناچار کرابوون دەستبەرداری بوونی خۆیان بن. ئەو دەستبەردانەی لەڕێگای توندوتیژی و ئامرازە ئابوورییەکانیەوە بەدیهاتبوو تارادەیەکی زۆر هەرس کرابوو. راستینەی گەل و کۆمەڵگایەک جێگای باس بوو کە لەخۆی نامۆ کرابوو. لەبنەڕەتدا هەڵمەتی ١٥ی ئاب ئەو نامۆبوونەی دەشکاند، بەمجۆرەش سیاسەتەکانی نکوڵی و قڕکردن و ئەنجامەکانیانی مایەپووچ دەکرد. لەو بوارەشدا تا رادەیەکی زۆر سەرکەوتوو بوو. واتە سەرلەنوێ کوردایەتی سەریهەڵدەدایەوە، کوردان دەبوون بە دیاردە و واقیعێک کە خۆیان پەسەندیان دەکرد. پەسەندکردن لەئاستی دەوڵەتەکانیش جێگای باس بوو. پەسەندکردنی کێشەکە مانای چارەسەرکردنی نەبوو. کاتێک نیازەکانی چارەسەرکردن سەریهەڵنەدا، پێکدادان و شەڕی سنووردار زەمینەکەی تێکدا و بەردەوام بوو. هەردوو لایەنیش لەو دۆخە دووربوون کە بە ڕێبازی سەربازی کێشەکە چارەسەر بکەن. هەرچەندە ناوە بە ناوە ئەو چانسەیان بەدەستهێناوە، بەڵام توانا و بەهرەی قۆستنەوەیان پیشان نەداوە. کاتێک چانسی چارەسەرییەکەی ١٩٩٣ لەباربردرا، شەڕ و پێکدادان بەشێوەیەکی بێبەزەییانە و پێشێلکارانەتر بەردەوام بوو. لەو چوارچێوەیەدا دەشێت قۆناغی ١٩٩٣ ـ ١٩٩٨ بەشێوەی مایەپووچبوونی ڕێگەچارەی سەربازی هەردوو لایەن هەڵبسەنگێندرێت. ئەگەر هەوڵە سیاسییەکانی ١٩٩٣ لەڕێگای تیرۆر و پیلانگێڕییەکانەوە مایەپووچ نەکرابووایە لەوانەبوو قۆناغێکی زۆر ئەرێنی لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد و بونیادی کۆماری تورکیا دەستی پێکردبووایە. ئەو دەرفەتە مێژووییە لەدەست چوو یان بە فیرۆیاندا. هەوڵەکانی چارەسەری ١٩٩٧ ـ ١٩٩٨ یش دووچاری هەمان چارەنووس هات، یاخود بڵێین دووچاری هەمان چارەنووس کرا. هەمان هێزەکانی تیرۆر و پیلانگێڕی چانسیان بە ڕێگەچارەی سیاسی نەدا. قۆناغی دیدارەکانی ئیمراڵیش دۆخێکی پڕ لە ناکۆکی هێنایە ئاراوە. لە کەسایەتی عەبدوڵڵا ئۆجالان کێشمەکێشێکی مەزن لەنێوان لایەنگرانی ئاشتی و دژەکانیان روویدا.

سەرەتا ململانێ لەناو بونیادی هەردوو لایەنیش بەردەوام بوو، بەڵام کاتێک لەساڵی ٢٠٠٥ وەPKK خۆی بەشێوەی KCK یەکلایی کردەوە و پێشکەش کرد، گفتوگۆ و پێکدادانی دەسەڵاتی ناو کۆماری تورکیای خێراکرد. ئەو گفتوگۆ و پێکدادانە رۆڵی کلیلیان لە چارەسەرکردنی کێشەی کورددا دەبینی. هەڵوێستی عەبدوڵلا ئۆجالان هەم بەرامبەر PKK هەمیش بەرامبەر کۆماری تورکیا بەئاراستەی رێگەچارەیKCK بوو. هەرچەندە لەناو خۆیان بە رێککەوتنی تەواو نەگەیشتبوون، بەڵام سەرلەنوێ دیالۆگ لەنێوان PKK و دامودەزگاکانی دەوڵەت دەستپێکردەوە. رۆڵێکی ئەوتۆی AKP لەو دیالۆگەدا نەبوو. چونکە ئەوە دەستپێشخەرییەکی دەوڵەت بوو. رێککەوتنە نهێنییەکەی ٤ ی ئایاری ٢٠٠٧ ئاکەپە لەگەڵ سوپاسالار، دواتریش لە ٢٠٠٧/١١/٥ لەگەڵ ئەمریکا رەوشەکەی ئاڵۆزتر کرد. بەمجۆرە لەسەر بنەمای لەناوبردنی PKK ئاکەپە هەوڵەکانی چارەسەری دەستپێکرد. لە بەرامبەر چەند مافێکی رووکەشی پشتگیری دەرەوەشی بەدەستهێنا و شەڕ بە ئاست و رەهەندی جیاوازتر گەیشت. لە گوتارەکەی ساڵی ٢٠٠٥ لە دیاربەکر رەجەب تەیب ئەردۆغانی سەرۆک وەزیر هەڵمەتێکی تەکتیکی گرنگی ئەنجام دا و بەڵێنی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی دا. لەسەر بنەمای گۆشەگیرکردنی PKKو بەدەستهێنانی پشتگیری بۆ ئاکەپە نیازگەلێکی پشتبەستوو بە مافەکانی تاکەکەس لەو بەڵێنانە جێگای باس بوو. لەژێر ناوی "کرانەوەی دیموکراسیانە" پیلانێکی تەسفیەکردن کەوتەڕوو کە کارێکی زۆری لەسەر کرابوو، شانبەشانی ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا و دەوڵەتە دراوسێکان، لەناوەوەش پشتگیری پارتەکانی دیکەی دەوڵەت، زۆربەی دامەزراوەکانی راگەیاندن و رێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنیش سەرلەنوێ رێکخرانەوە و پشتگیری کوردە بەکرێگیراوەکانیشی بەدەستهێنا. شانبەشانی ئەم پیلانەش لەبواری سەربازی، سیاسی، ئابووری، کلتووری، سایکۆلۆژی و دیبلۆماسی سەفەربەری و هێرشێکی زۆر بەرفراوان و خەست کەوتە بواری کردارییەوە. هێزە نوێیەکانی میلیشیا حزبوڵڵاو گورگە بۆرەکانی جاران نەبوون، جۆرێک لە "حەماسی کورد" بوو کە بەتایبەتی لەژێر کۆنترۆڵی ئاکەپە پێشخراوە و بەچەند بەشێک بونیاد نراوە. ئەوە ئەو پیلان و شاڵاوە بوو کە سەرەتاCHPی دەنیز بایکاڵ و هەندێک لە فەرماندەکانی ناو سوپاش رێککەوتن و پشتگیریان لێکرد. هەرچەندە ناڕەزایی هەندێک لە دامەزراوەکانی ناو دەوڵەت جێگای باسیش بێت، بەڵام وازیان لە جێبەجێکردنی ئەو پیلانە نەهێنا. ئۆپەراسیۆنەکانیKCK بەشێکی ژیانیی و دەستلێبەرنەدراوی ئەو پیلان و کردەوانە بوو. هێرشە ئاسمانییەکان و رێگەدان بە ئۆپەراسیۆنەکانی باشووری کوردستان لەچوارچێوەی هەمان پیلاندا بوو.

پێویستە ئەوەش بڵێین کە ئەو هەڵوێست و پەیوەندییانەی تەسفیەکارانی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ پێشیانخست رۆڵێکی زۆری لە پاشخانی ئەو پیلان و کردەوانەدا هەبوو. لەڕاستیدا ئاکەپە و بە کرێگیراوەکانی سەرکەوتنی تەواویان لەو پیلان و کردەوانە چاوەڕوان دەکرد. ئەو پیلانەی زۆر ئاڵۆز و فرەرەهەند بوو بە بڕوای خۆیان سەرکەوتنێکی مێژوویی بەدەستدەهێنا. لەڕاستیدا PKK وەک تاکە کۆسپی بەردەم سەرکەوتنی ئەو کردار و پیلانە

دەبینرا کە بەشێوەیەکی زۆر ئاڵۆز و تەڵەکەبازانە دارێژرابوو. لەو سۆنگەیەوە؛ بە هەموو لایەنەکانیەوە شاڵاوەکە لەسەر گۆشەگیرکردن و بێ چەککردنی PKK قوفڵ ببوو. لەسەر ئەو بنەمایەش سەرجەم هێزەکان بەکارهێنران. وەک ئەو پەندەی دەڵێ: کڵاو فڕی و کەچەڵ ئاشکرا بوو، هیچ هێزێک نەما راستیەکەی ئاشکرا نەبێت. بەڵام لەبەر ئەوەی بەسیفەتی KCKخۆی لەسەر بنەمای ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات پێشکەش و پراکتیزە کرد، تارادەیەکی زۆر خۆی لەلاوازی و هەڵەکانی پێشووی رزگارکردبوو، تەسفیەکردنی PKK مەحاڵ بوو. ئیتر زەحمەت بوو وەک جارانیش زەبری بەرکەوێت. وێڕای ئەوەی وەرچەرخان و بزووتنەوەی راستکردنەوە نوێ بوو، بەڵام پەرسەندن و پێشکەوتنێکی بەرچاوی بەدەست هێنابوو. هەر لەسەرەتاوە مایەپووچبوونی ئەو پیلانە دیار بوو کە بۆ یەکەمین جار بوو ئاکەپە لەگەڵ بەشێکی گرنگی سوپا هەوڵی جێبەجێکردنی دەدا. بەڵام ئاکەپە لە بەکارهێنانی ئەو پیلانە و پشتگیری ناڕاستەوخۆی سوپا بۆ جێگیربوونی تەواو لە دەسەڵاتدا دوودڵی نەکرد. بەو رادەیەی تاقیکردەوە پێگەی خۆی لە دەسەڵاتدا پتەوکرد، وێڕای ئەوەی لەبواری تیۆری و کرداریدا ئامادەکاری، هەوڵ و بڕوایەکی جددی و راستگۆیانەی سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد نەبوو، وەک چۆن بنێشت دەجوێ لە دووبارەکردنەوەی گوتە و دەستەواژەی "کرانەوەی دیموکراتیک" بەردەوام بوو. حیسابێکی بازرگانان جێگای باس بوو کە دەسەڵات تەوەرەکەی بوو، لێکدانەوەی رۆژانە و بەدەستهێنانی قازانجی زیاتری بە بنەما دەگرت. لەو چوارچێوەیەشدا کێشەی کورد بەحاڵەتێکی ئاڵۆزتر گەیشت. ئەگەر چانسی ئاشتییەکی شەرەفمەندانە و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە نەدۆزێتەوە، ئەوا هەنگاو بۆ قۆناغی ژیانی ئازاد و بەرخودانی سەرتاسەری دەهاوێژێت کە "پاراستنی بوون و بەدەستهێنانی ئازادی " بەبنەما دەگرێت.

ئەرکی PKK ی سەرەتای ١٩٧٠ کان نەهێشتنی گومانەکان لەسەر بوونی کوردان و چارەسەرکردنی بوو بەگوێرەی چەمکی دەوڵەتێکی سۆسیالیستی بونیادنراو. سەرەڕای بەلاوەنانی گومان و گفتوگۆکانی سەر بوونی کوردان، بەڵام لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا بەچەقبەستی مایەوە. بەڕێوەچوونی پرۆسەی رەخنەدان کارەکتەرە ئانتی ـ سۆسیالیست و ئانتی دیموکراتیکەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەی خستەڕوو. PKKکە بەشێوەیەکی بەرجەستە بۆی دەرکەوت ئەگەر کۆمەڵگای دیموکراتیک نەبێت سۆسیالیزم بونیاد نانرێت، چارەسەرکردنی کێشەی کوردی لە بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا بینی. ئەو خزانەی ئێستا لەکێشەکەدا دەیبینین: ئایا لەڕێگای سیاسەتی دیموکراتیانە بەو ئامانجە دەگات یاخود لەمیانەی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی سەرتاسەرییەوە؟.

### ١ . خزانی دەسەڵاتی هەژموونگەریی لە کۆماری تورکیا

لە دوای شەڕی رزگاری نیشتیمانی سەرەتای ١٩٢٠کانی کورد ـ تورکەکان لە چوارچێوەی میساقی میللی و لەسەر پاشماوەکانی دەوڵەتی عوسمانی چانسی کۆمارێکی

دیموکراتیک ڕەخسابوو. لە گشتینامەی ئاماسیا (تعمیم أماسیا) ١٩١٩ و کۆنگرەکانی ئەرزڕۆم و سیواس هەنگاوە سەرەکییەکانی نرابوو. لەیەکەمین دەستوور(١٩٢١)ی پەرلەمانی تورکیا کە لەساڵی ١٩٢٠ کرایەوە، خەسڵەتە دیموکراتیەکانی ڕژێمە پێشنیازکراوەکە ڕەنگیدەدایەوە. لە ١٠ ی ئاداری ١٩٢٢ بە زۆرینەی دەنگ یاسای ئۆتۆنۆمی کوردان پەسەند کرا. لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٢٤ لە کۆبوونەوە ڕۆژنامەوانیەکەی ئیزمیت مستەفا کەمال وەک مۆدێلێکی چارەسەری باسی خودموختارییەکی بەرفراوانی بۆ کوردان دەکرد، بێ ئەوەی سنوورەکان بەبنەما وەربگیردرێت. واتە باسی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانەی دەکرد. لە قۆناغی دانوستان و ڕێککەوتن سەبارەت بە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)ی ڕۆژی ئەمڕۆشمان کە ئەوکات لە چوارچێوەی میساقی میللیدا بوو، هەنگاو بۆ مەترسیدارترین قۆناغی پیلانگێڕی دژی کوردان نرا. دوالیزمی "یان کۆمار یان موسڵ ـ کەرکوک" کە ئینگلیزەکان بەسەر مستەفا کەمالیان دادەسەپاند ئەو هەنگاوە سیاسییە بوو کە بناغەی پیلانگێڕییەکەی پێکهێنا. وەک ئاکامی دەستبەرداني موسڵ ـ کەرکوک بۆ ئینگلیزەکان بەشی کۆماری تورکیا نکوڵی و قڕکردنی کوردستان بوو. ئەو دوالیزمەش بە خێرایی کۆماری کرد بە بەرگی دیکتاتۆرییەتی یەک پارتی. لەمیانەی ئەو پیلانگێڕییەی لە ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ دژ بە ڕێبەرایەتی شێخ سەعید ئەنجامدرا، فەرمانی قڕکردنی کوردان درا. ئەو بابەتەی لە بەشە پەیوەندیدارەکانی پێشووتر بە درێژی باسمان کردووە، دەتوانین ئەو خاڵانە سەبارەت بە تاوتوێکردنی تێزە سەرەکییەکانیەوە بڵێین:

أ) ئەو جۆن تورک (تورکە لاوەکان)انەی لەسەردەمی دووەمین مەشرووتیەتی دەسەڵاتی ئیتحاد و تەرەقی لەلایەن سەرمایە و کادیرە یەهودییەکانەوە پشتگیریان لێدەکرا، واتە پەرەسەندنی بۆرژوازی تورکی لاو لەگەڵ دامەزراندنی کۆمار خێراتر بوو. تەنیا بە دوورخستنەوەی کۆمۆنیست، ئوممەتگەرا و کوردان نەوەستا کە لە شەڕی ڕزگاری نیشتیمانیدا هاوپەیمانی بوون، بەڵکو پەراوێزی کردن و بوون بە ئەوانیتر. تەنیا سەرمایەدار و کادیرە یەهودییە زایۆنییەکانی وەک هاوپەیمانی خۆی هەڵبژارد کە لەلایەن ئینگلتەراوە پشتگیرییان لێدەکرا. لەڕاستیدا قۆرخکاری ئابووری و دەسەڵات تەنیا لەنێوان ئەو دوو هێزە دابەشکرا. لەلایەن یەهودییەکانەوە ئەو سیستەمە واتای پرۆتۆ ـ ئیسرائیلی دەبەخشی. پشتگیری ئینگلیزەکان بۆ ڕژێمیش لەو چوارچێوەیە دابوو. دوای ئەوەی مستەفا کەمال لە هاوپەیمانە ڕاستەقینەکانی دابڕێندرا و لەمیانەی تیرۆر و پیلانگێڕی هەمەجۆرەوە بێکاریگەرکرا، خەسڵەتی خوداوەندێتی پێبەخشرا و وەک سیمبۆلێک لە پەرستگا نوێیەکەی چانقایە مەحکوم کرا. فیرقەی تەرەقی پەروەری کۆمار (١٩٢٥) و فیرقەی سەربەست (١٩٣٠) کە لەلایەن کادیرە دامەزرێنەرەکانی دیکەی کۆمار ئاواکرابوون تەسفیەکران و ڕژێمی یەک پارتی پرۆتۆ ـ فاشیزمی تورکی سپی مسۆگەر بوو. بەمجۆرە چانس و دەرفەتی بونیادنانی کۆماری دیموکراتیک لە بەین برا.

ب) کوردان کە ئەو ڕژێمەیان بە خیانەتکردن لە ڕۆڵەکەیان لە سەردەمی عوسمانییەکان و شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی دادەنا کە ڕێگای لەپێش کۆمار کردەوە،

خۆیان رووبەڕووی پیلانگێڕی ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ بینیەوە. کاتێک کوردان لە مێژوودا ئاشنای تورکان بوون بەهۆی بەرژەوەندی ستراتیژی هاوبەشەوە بژاریان بەلایەنی ژیانی ستاتۆی هاوپەیمانێکی نزیک بوو. بەهۆی فەتحکردن و زۆرەملێکردنەوە ئەو ژیانەیان هەڵنەبژارد، بەڵکو بەگوێرەی بەرژەوەندیەکانی خۆیانیان بینی. واقیعی شەڕەکانی مەلازگرد (١٠٧١)، چاڵدێران (١٥١٤) و ریدانیە (١٥١٧) و شەڕی رزگاری نیشتیمانی (١٩١٩ ـ ١٩٢٢) کە لەسەر بنەمای هەمان بیانووی ستراتیژی و بەشێوەیەکی هاوبەش ئەنجامدراون ئەو راستییە دەسەلمێنێت. پەیوەندی نێوان کورد ـ تورک پشت بە رەزامەندی هەردوولا دەبەستێت و خاوەن بنەمایەکی ستراتیژی، ئایینی، سیاسی، ئابووری و کلتووری بەهێزە. کاتێک کوردان لەناکاو کەوتنە ناو گەمارۆی یەکلایەنەی نکوڵی و قڕکردنی پیلانگێڕی پڕۆتۆ ـ فاشیستی تورکی سپی، کەوتنە دۆخی بەرگریکردن لە بوونی خۆیان. تەنانەت ناوبردنی ئەو قۆناغە بە یاخیبوونیش گونجاو نەبوو. لە بەرامبەر ئەو هێرشانەی لەمیانەی پیلانگێڕی یەکلایەنەوە بەڕێوە دەبرێن و ئامانجیان دوورخستنەوەی کوردانە لەدۆخی ناسنامەی ئەتنیکی و نەتەوەیی، واتە ئامانجی لەناوبردنی کوردانە؛ تا ئێستاش کوردان لە بەرامبەر ئەو هێرشانە لە سەرکوتکردن رزگاریان نەبووە. ئەو کەمپینەی نکوڵی و قڕکردن کە تا ساڵی ١٩٣٨ بەشێوەی جەستەیی بەڕێوە چوو، دواتر لەمیانەی رێبازەکانی ئاسیمیلاسیۆنەوە درێژەی هەبوو. کوردان لە سەرجەم بوارە سەربازی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتی و کلتوورییەکانەوە سڕانەوە و وەک کورد بوونیان نەما. بگرە ناوە کوردییەکانیش قەدەغە کران. ئیتر لە بازاڕیش نەیاندەتوانی زمانی خۆیان بەکار بهێنن. دەوڵەت ـ نەتەوەیەک لەسەر بنەمای هاوڵاتیەکی یەک شێوە و هۆمۆژەن بونیاد دەنرا. ئەو دەوڵەتەی مۆدێلی بڕووسیای بە بنەما دەگرت، ئاشکرایە کە شێوەی سەرەتایی دەوڵەتی فاشیستی ئەڵمانی پێکدەهێنا کە لەرێگای هیتلەرەوە پێی گەیشت؛ ئەوەش بەجۆرێک ریشەکانی خۆی داکوتا کە هیچ ناوەند، نوخبەیەکی سیاسی و هزری راستڕەو، چەپڕەو، ئیسلامگەرا و لیبراڵ نەما بەو مۆدێلە کاریگەر نەبێت. بەکورتی؛ دەشێت ئەو سەردەمە بەقۆناغی کۆماری یەکەمیش ناو ببەین. بونیادنەر و دامەزرێنەرەکەشی پارتی گەلی کۆماری (CHP) پڕۆتۆ ـ فاشیستی ١٩٣٠یەکانە. ئەگەر لەمیانەی کرداری جیاوازیشەوە جێبەجێ کرابێت، ئەو سیستەمە تا ١٩٨٠کان توانای بەردەوامبوونی هەبوو.

ج) بەهۆی زیادبوونی بەرهەڵستکاری گەلان لەناوەوە، لە دەرەوەش گۆڕانکاری هەلومەرجەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ( شۆڕشی ئیسلامی ئێران، داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤێتەوە) کودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ لەجیاتی کۆماری یەکەم "میللیگەرایی عەلمانی تورکی سپی" لەسەر بنەمای پشتبەستن بە میللیگەرایی تورکی سەوز ـ تورکی ئیسلامی هەنگاوی بۆ دووەمین کۆمار هاوێشت. لەبنەڕەتدا بەرهەڵستکارە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکانی تورک و بەرهەڵستکارە نەتەوەییەکانی کورد ئامانجی ئەو هەنگاوەی ئاواکردن بوون. ئوممەتگەراکان، بە مانایەکی تر ئەڤانگلیستە

ئیسلامگەراکان (تەریقەتە نوێخوازەکەی موسەوی ــ ئیسلامی) وەک زەمینەیەکی ئایدیۆلۆژی خۆی هەڵبژارد. لەراستیدا لە نورچیەکانەوە تا دەگاتە تەریقەتەکانی نەقشبەندی و قادری بە خێرایی نوێبوونەوە و بوون بە رەوتی ئیسلامی ـ یەهودی ڤێرسیۆنی ئەڤانگیستە کریستیان ـ یەهودییەکانی تورکیا. ئەو رەوت و قوتابخانەیە زەمینەی ئایدیۆلۆژی بنەڕەتی فاشیزمی ١٢ ئەیلولە. ڤێرسیۆنی هەژموونگەرایی ڕێگان ـ تاتشەر ــ کۆل لە تورکیا پێکهاتبوو. دوای تەسفیەکردنی هێزە سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکان لەلایەن ئەو سیستەمە نوێیەوە، ئیتر بە هەموو توانای خۆیەوە هێرشی کردە سەر کوردان کە بە پێشەنگایەتیPKK لە بەرخودانندا بوون. وەک بڵێی؛ دیسان بەجۆرێک لەجۆرەکان قۆناغی ١٩٢٥ ـ ١٩٣٨ی کۆمار دووبارە دەبوویەوە. واتە قۆناغی ١٩٨٤ ـ ١٩٨٨ کۆماری دووەم دووبارەبوونەوەی قۆناغی ١٩٢٥ ـ ١٩٣٨ کۆماری یەکەم بوو. لەگەڵ تەسفیەکردنی ئەوانەی رۆڵی بنبەستبوونی سیستەمیان بینی و لایەنگری ڕێگەچارەی سیاسیانەبوون، رژێم بەتەواوی خۆی بەدامەزراوە کرد. دووەمین کۆماریش بە فاشیزم ئەنجامگیر بوو. بەڵام هەوێنە ئایدیۆلۆژییەکەی ئەوجارە لە سپیەوە ببوو بە سەوز. هەڵگری مانای کۆمارێکی محافەزەکارتر بوو. هەمان سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنی جاران بەشی کوردان بوو. ئەو هێزە هەژموونگەرا جیهانگیرییەی لەقۆناغی ١٩٢٥ ـ ١٩٤٥ لە پشت سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنەوە بوو، ئینگلتەرا بوو کە لەبنەڕەتدا هێزی هەژموونگەرایی سیستەمی جیهانگیریش بوو. هەرچی هێزە هەژموونگەرا جیهانگیرییەکەی پشت کۆماری دووەمە، دیسان هێزی هەژموونگەرایی سیستەمی جیهانگیری ئەمریکا بوو. "ستاتۆی بەکێشە" کە هێزە هەژموونگەراکان لە ساڵانی ١٩٢٠کانەوە بۆ کوردانی رەوا بینیوە تا سەرەتاکانی ٢٠٠٠کان بەبێ هیچ گۆڕانکارییەک بەردەوام بوو.

د) کۆماری دووەم کە بە کودەتای ١٩٨٠ دەستیپێکرد، لەمیانەی ئەو تەنگژە سەختەی لە سەرەتاکانی ٢٠٠٠کان روویدا لە کۆماری یەکەم دابڕا. لە ئاکامی قەیرانەکە بونیادە ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی پاشماوەی کۆماری یەکەم گورزی قورسیان بەرکەوت و لاوازبوون. قۆرخکارییە ئابووری و ئایدیۆلۆژییە ئەڤانگیستە یەهودی ـ ئیسلامییەکانی بەر لە ١٩٨٠ بناغەکانی دانرابوو لەمیانەی پشتگیری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشەوە لە کەسایەتی پارتی داد و گەشەپێدان (AKP)دا دەستیان خستە ناو دەسەڵاتی دەوڵەتیشەوە. لە بەرامبەر زهنیەت و دامەزراوە لاوازبووەکانی کۆماری یەکەم، بە خێرایی هەنگاویان نا بۆ ئاواکردنی ژێرخان و ئایدیۆلۆژی کۆماری دووەم. ڕێککەوتنی نیو ـ جۆنلار (محافەزەکارە لیبراڵە نوێکان)ی ئەمریکا و قۆرخکاری سەرمایەی تەوەرەی قۆنیا ـ قەیسەری ئەنادۆڵ لە پشت ئەو دیاردەوەن کە بە دەسەڵاتی ئاکەپە ناو دەبرێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان سەرلەنوێ دەرگای دەوڵەت بۆ چەمکی ئیسلامگەرایی کرایەوە کە لە ساڵی ١٩٢٣ وە لە دەسەڵات دوورخرابوویەوە. بەڵام داخراوبوونی دەرگای دەوڵەت بە رووی سۆسیالیستەکان، دیموکراسیخوازە رادیکاڵەکان، ئازادیخوازەکان و ناسنامەی جڤاتی کورد بەشێوەیەکی دژوار بەردەوام بوو. بەجۆرێک

لەجۆرەکان لە ماوەیەکی زۆر کورتدا ئاکەپە ئەو رۆڵە لە کۆماری دووەمدا دەبینێت کە CHPلە کۆماری یەکەمدا بینیبووی. بێگومان لەنێوان قۆرخکارییەکانی دەسەڵات و سەرمایەدا دەشێت باسی خزانی هەژموونگەرایی بکرێت. هەڵبەتە دیواری چین لە نێوان هەردوو هێزی هەژموونگەرادا جێگای باس نییە. بەشێوەیەکی هاوبەش چەندین دامەزراوەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی کۆمار بەکاردێنن. بەڵام دیسانیش جیاوازی گرنگ لە نێوانیاندا هەیە، لەو سۆنگەیەوە؛ ناکۆکی لەنێوانیاندا هەیە. لە رووخساردا ململانێکان لە تەوەرەی عەلمانی ـ شەریعەت، بە تایبەتی لە گفتوگۆکانی حیجابدا چڕدەبێتەوە کە بووە بە سیمبۆلێک. لە ناوەڕۆکیشدا ناکۆکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری و کلتووری زۆر چڕ لە نێوان هەردوو چینی هەژموونگەرا جێگای باسە. ئەگەر ناکۆکییەکان بە پاشخانە دیرۆکیەکەی ببەستینەوە؛ ناکۆکی عوسمانی ـ کۆمار بە شێوەی ناکۆکی نێوان عوسمانیە نوێکان ــ کۆماریخوازە عەلمانیەکان بەردەوامە. هەڵسەنگاندنی ئاکەپە وەک دامەزراوەبوونی ئایدیۆلۆژی، سیاسی، ئابووری و کلتووری رژێمی ١٢ی ئەیلول واقیعیترە. CHPی کۆماری یەکەم چی بێت، ئاکەپەی کۆماری دووەمی ١٢ی ئەیلولیش هەمان شتە. ئاکەپە خوازیارە دەسەڵاتە هەژموونگەراییەکەی بە دەستوورەکەی خۆی (لەراستیدا ڤێرسیۆنە لیبراڵەکەی دەستووری ١٢ی ئەیلولە) تاجدار بکات. ئەمە ئامانجی سەرەکی هەڵبژاردنەکانی ٢٠١١ یە.

ە) سیاسەتی هەژموونگەرایی AKP سەبارەت بە کوردان لە سیاسەتەکانی هەژموونگەرایی CHPجیاوازتر نییە. ئەگەر هەردوو پارتیش وەک جاران نەتوانن درێژە بە سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنی کوردان بدەن، سەرچاوەکەی بۆ ئەو تێکۆشانە دەگەڕێتەوە کەPKK بەڕێوەی دەبات و سەرکوت ناکرێت. ئەگەر بۆ بژاری خۆی بمێنێتەوە ئەوا سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنی کوردان لەلایەن ئاکەپەوە هیچی لە CHP کەمتر نییە. بگرە لەهەندێک لایەنەوە بە تایبەتیش گرێدانی کوێرانە بە ئایدیۆلۆژیای ئایینگەراییەوە (وەک چۆن لە نموونەی حزبول ـ کۆنترا بینرا) زۆر لەCHP خراپترە. هێزە هاندەرەکەی پشت تەسفیەکاری ٢٠٠٢ ــ ٢٠٠٤ لەبنەڕەتدا ئاکەپە بوو. دیسان ئەو هێزەی هەوڵەکانی ڕێگەچارەی سیاسی ناو دەوڵەتی بنبەست کردووە لە راستیدا دیسان ئاکەپەیە. هەروەها مەیلی چارەسەری دەوڵەت لەپێناو هەڵکشانی هەژموونگەرایی خۆی بەکار دێنێت. هەم ناوەڕۆکی ئەم مەیلە کاڵ دەکاتەوە و لە پێناو پڕوپاگەندەکردن بەکاری دێنێت، هەمیش بێ ناوەڕۆک و مایەپووچی دەکات. لەو لایەنەوە زۆر لە MHP و CHP ــ کە هەڵوێستیان ئاشکراترە ـ مەترسیدارترە. دۆزەکانی ئەرگەنەکۆنیش بۆ هەمان ئامانج بەکاردێنێت. سەبارەت بە تەسفیەکردنی کوردان لەگەڵ کودەتاچییە راستەقینەکان ڕێکدەکەوێت و لەمیانەی خۆنواندنی دادگاییکردنی مەقاشەکانیان مەشروعیەت بەدەست دێنێت. بەرەنگاربوونەوەی وەسایەتی سوپا و هەڵوێستی دیموکراتیانە جێگای باس نین. بۆ یەکەمین جار لەسەردەمی ئاکەپە بەشێوەیەکی بەرفراوان و نەخشە بۆکێشراو بۆ سەرکوتکردنی کێشەی کورد ڕێککەوتن لەگەڵ سوپا جێبەجێکرا. "مافە تاکەکەسی و

کلتوورییەکان" کە یەکێکە لە دەستەواژە سەرەکییەکانی ئەو سیاسەتە لە ناوەڕۆکدا لەپێناو پەردەپۆشکردنی پیلان و کردەوەکانی لەناوبردنی ناسنامەی کوردی ئازاد و جڤاتییە. ڕێگەچارەی "مافە کلتوورییەکان و تاکەکەسی" کە دوای مایەپووچکردنی تەسفیەگەریتی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ پێشخرا، لەساڵی ٢٠٠٥ بەیەکەوە لەگەڵ فەرماندارێتی سوپا و پشتگیری ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا و بەڕێوەبەرێتی کورد و عەرەب لە ئێراق (هەروەها ڕێککەوتنێکی دیکەی پشتگیری لەگەڵ سوریا و ئێرانیش ئەنجامدراو دواتر کەوتە گەڕ) بەرامبەر ڕێگەچارەی KCK کەوتە بواری جێبەجێکردنەوە. بەگوتەی سەرۆک وەزیر ڕەجەب تەیب ئەردۆغان سەردەمی "سەفەربەرییەکی سەربازی، سیاسی، ئابووری، کلتووری، دیبلۆماسی و دەروونی دژی تیرۆر" دەستیپێکرد.

شەڕێک جێگای باسە کە هیچ حکومەتێک بوێری بەرپاکردنی پیشان نەداوە. حکومەتی ئاکەپە گلادیۆی خۆشی ئاواکردووە و (پێنجەمین قۆناغی شەڕی گلادیۆ) جێبەجێ دەکات. ئاکەپە دەستبەرداری شەڕ نەبووە: چوارچێوە و ڕەهەندەکانی شەڕی بەرفراوان و قووڵتر کردووە و بەمجۆرە درێژەی پێدەدات. ئاکەپە لەسەرجەم پارتە دەوڵەتیەکانی پێشووتری خۆی زیاتر پارتی دەوڵەتە، لەهەموو حکومەتەکانی پێشووتریش زیاتر حکومەتی "شەڕی تایبەتە". بەدوای ئافراندنی ڕێکخستنێکی ئیسلامی کۆنترایە کە زۆر لە ڕێکخراوی حزبوڵای مرۆڤکوژی پاشکۆی ژیتەم بەرفراوانترە. لەسەرووی هەموویانەوە ئیمام و خەتیبەکانی کادیری کاروباری ئایینی سەر بە حکومەت و ئەندامانی چەندین گروپ و کۆمەڵەی سەر بە تەریقەتەکان بەشێوەی ڕێکخستنێکی چەتر ئاسای هاوشێوەی حەماس بۆئامانجی جۆراوجۆر بەکاردێنێت. کۆنترۆڵکردنی ئابووری بۆ خزمەتی شەڕی تایبەت بەڕێوەدەبات. کلتووری ژیانی ئایینیش بۆ هەمان ئامانج بەکاردێنێت. قورسایی چەقی دیبلۆماسیش بەهەمان ئاراستە دەستبەکارە. بەکورتی؛ لەناوبردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان تەوەرەی کارەکانی حکومەت پێکدێنێت.

حکومەتەکەی ئاکەپە تەنیا هەنگاو بەهەنگاو دەستبەسەر دەسەڵاتی دەوڵەتدا ناگرێت، بەڵکو لەهەمانکاتدا دەیکات بە هەژموونگەرا. هەروەک لەسەردەمی دامەزراندنی کۆمار لەسەردەمی ڕووخانیشدا لەمیانەی هەژموونگەراییکردنی دەسەڵاتەوە هەوڵی بەردەوامبوون دەدات. وەک چۆن بزاوتی لەناوبردنی کوردان لەسەردەمی دامەزراندن بەرەو هەژموونگەرایی فاشیزمی تورکی سپی بردن، لەسەردەمی هەڵوەشانەوەی فاشیزمیشدا دیسان بزووتنەوەی ناسنامەی کوردی ئازاد کراوەتە ئامانج و هەمان هەژموونگەرایی سەرلەنوێ بونیاد دەنرێتەوە. لەناوبردنی کوردان لەسەرووی ئەو هۆکار و فاکتەرانەوە دێت کە کۆمار لەسەرجەم خەسڵەت و ناوەڕۆکە دیموکراسیخواز و ڕۆشنگەریخوازەکەی دوورەخاتەوە. وەک چۆن لەناوبردنی کوردان هۆکاری بنەڕەتی سەرجەم پێشهاتە خراپەکانی کۆمارە، پێچەوانەکەی ئەمەش ڕاستە. واتە پەرەسەندنی کۆمار لەسەر بنەمایەکی ئەرێنی، لەسەرووی هەمووشیانەوە دیموکراتیزەبوون، گرێدراوی ئازادبوونی

کوردانە. ئیتر مێژووی نەوەد ساڵەی کۆمار وەک ڕۆژی روون ئەو ڕاستییەی ئاشکرا کردووە.

و) لە قۆناغی داهاتوودا کۆماری تورکیا تەواو ڕووبەڕووی دووڕیانێک دەبێتەوە. ئەو کۆمارەی لەسەردەمی دامەزراندن لەلایەن ئینگلیزەکانەوە ئاراستەی شەڕی ئانتی ـ کورد کرا، دیسان لەلایەن هەمان ئینگلتەرا و هاوپەیمانە پلە یەکەکەی لەلایەن ئەمریکاوە لە ئاکامی ئەو شەڕەی لەسەر بنەمای دژە ـ کورد تێیەوەگلاوە خۆی لەناو بنبەستبوونی مەزن دەدۆزیتەوە. لەراستیدا ئەو سی ساڵەی دوایی کۆماری دووەم لەمیانەی پەلەقاژەی ناو ئەو بنبەسبوونە بەسەرچوو. ئەوەی ڕوویدا تەنیا "شەڕی توندی ئاست نزم" نەبوو؛ بەڵکو جیابوونەوە و خراپبوونی بەهاکانی کۆمەڵگا بوو تا ناو شانەکانیان. پەرتەوازە بوون و داڕزانێکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ ڕوویدا کە زۆر لە دەستەواژەکانی هەرەسهێنان و هەڵوەشانەوە قورستر بوو. ئەو ئیرادەیەی بەشێوەی ڕێکخستنی گلادیۆ بەرجەستە بووە لەوانەیە ببێت بە هەر چەشنە ڕژێمێکی نهێنی و شاراوە، بەڵام هەرگیز نابێت بە ڕژێمی کۆماری. سووربوون و داکۆکی کردن لەسەر شەڕ دەشێت دوا هەڵمەتی گلادیۆ بێت، بۆ بەلاوە نان و مایەپووچکردنیشی بەدەرنانی لە ژوورە تاریکەکان و ئاشکراکردنی بەسە. دووەمین ڕێگا کە لە دووڕیانەکەی پێش کۆمار دەردەکەوێت گرتنەبەری ئەو ڕێگایەیە کە سەرلەنوێ یەکێتی دیموکراتیانەی سەردەمی شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی بکاتە بناغەی کۆمار. ڕێککەوتنی شەڕی نیشتیمانی دیموکراتیانەی نێوان ساڵانی ۱۹۱۹ـ ۱۹۲۲ بوو کە کۆماری کرد بەکۆمار. ڕەتکردنەوەی ئەو ڕێککەوتنەی لایەنی ئانتی ـ هەژموونگەراییشی هەبوو، مانای لەدەستدانی چانسی کۆماری دیموکراتیانە بوو، لەجیاتی ئەویش ئەنجامگیربوونی دامەزراندنی دەسەڵاتە پیلانگێڕ، پرۆتۆ ـ فاشیست، کودەتای گلادیۆگەرایی و چەتەکان بوو. ئەو ڕێگایەی چەندین جار تاقیکراوەتەوە و شکستی هێناوە ئاشکرایە کە نابێت بەڕێگای ڕاستەقینەی کۆمار. ڕێگای کۆماری دیموکراتیانە کە هەر لەسەرەتاوە دەبووایە هەنگاوی بۆ بنرێت لەقۆناغی داهاتوودا تاکە ڕێگای ئاشتی کۆمەڵایەتی و چارەسەرکردنی کێشەکانە. لەو ڕێگایەی دوا چانس و دەرفەتی ئاکەپە و حکومەتەکەیەتی، KCKش کۆسپێک نییە، بەڵکو دەرفەتێکی چارەسەرییە.

### ۲. یەهودیەت، پەیوەندیەکانی تورک ـ ئیسرائیل و کێشەی کورد

تا بەشێوەیەکی ڕاست لە ڕاستینەی یەهودی ـ ئیسرائیل تێنەگەین، ئەوا دەرککردن بە کێشەی کورد و چارەسەرکردنی ئەستەمە. هەر لەبەر ئەو هۆکارەش بوو بە پێویستمان زانی مەسەلەی عیبرانییەکان بەشێوەی بەشێکی جیاواز تاوتوێ بکەین. تەنانەت کارڵ مارکسیش کاتێک هەوڵی چارەسەرکردنی گرفتەکانی سەبارەت بە سۆسیالیزم دەدات ناچار بووە نامیلکەیەک لەژێر ناوی "مەسەلەی یەهودییەت" بنووسێت. لەسەردەمی شارستانیەتی سۆمەر و میسرەوە مەسەلەی یەهودی هەبووە و وەک کێشەیەک تا ڕۆژی

ئەمڕۆمان هاتووە. لە عەهدی ئاتیک بەشێوەیەکی وردەکارانە باس لەوە دەکرێت کە حەزرەتی ئیبراهیم بەهۆی کێشەکانی لەگەڵ نەمرودەکانی بابل، حەزرەتی موساش بەهۆی کێشەکانی لەگەڵ فیرعەونەکانی میسر کۆچیان کردووە و لەگەڵ قەبیلەی عیبرانی بەرەو وڵاتی کەنعان ـ فەلەستین سەری خۆیان هەڵگرتووە. ئاواکردن و بەردەوامکردنی پاشایەتی یەهودی ـ ئیسرائیل کە لەلایەن داود پێغەمبەر دەستپێکرد و نزیکەی هەزار ساڵی خایاند ناوەڕۆکی کێشەکەی پێکهێناوە. کێشەکانی سەبارەت بە نیشتەجێبوون و ئایین کە پێشتر لەگەڵ قەبیلەکانی وڵاتی کەنعان دەستیپێکرد (ئەو قۆناغەی ١٦٠٠ــ ١٣٠٠ پ.ز کە بە حەزرەتی ئیبراهیم دەستیپێکرد؛ قۆناغی ١٣٠٠ــ ١٠٠٠ پ.ز کە بە حەزرەتی موسا دەستی پێکرد) لەرێگای داود پێغەمبەرەوە (١٠٢٠ــ ٩٨٠ پ.ز) لەمیانەی پاشایەتیەکی بچووکەوە هەوڵی چارەسەرکردنی دراوە. سەردەمی پێغەمبەر سولەیمان "چاخی زێڕین"ی ئەو پاشایەتیە بچووکەیە. لەپەرتووکە پیرۆزەکانیشدا بەشێوەیەکی جوان و هەمەڕەنگ باسی سەرگوزەشتەکەی دەکرێت. دواتر پاشایەتیەکە پەرتەوازە دەبێت. وێڕای ئەوەی شێخی قەبیلەکانی ناوبراو لەمیانی ڕێبەر و داناکانی بە پێغەمبەر دەناسرێن زۆر سەرقاڵی بوون، بەڵام جارێکی دیکە ناتوانن پاشایەتیەکە کۆبکەنەوە. لەراستیدا عەهدی قەدیم کۆی ئەو بەسەرهاتانەیە کە لە چواردەوری ئەو پاشایەتیە بچووکە ڕوویانداوە.

ئەو ناوچەیەی سەرەتا (٧٢٠ پ.ز) کەوتە ژێر کۆنترۆڵی ئیمپراتۆریەتی ئاشوور و دواتریش ئیمپراتۆریەتی ماد ـ پارس (٥٤٦ پ.ز) کێشەی یەهودی قورستر دەبێت. بەرخودان و یاخیبوون پەرەدەسێنێت. یەکەمجار لەسەردەمی نەبوخزنەسری پاشای بابل (٥٩٦ پ.ز) بە کۆمەڵ بۆ بابل نەفی دەکرێن. ئەو سەردەمە دەست پێدەکات کە بەسەردەمی نەفییە چل ساڵیەکە دەناسرێت. لەلایەن کۆرشی پاشای پارس ڕزگار دەکرێن و سەرلەنوێ بۆ وڵاتی یەهودا ـ ئیسرائیل ڕەوانە دەکرێنەوە. لەو قۆناغەدا زۆر بە بیروباوەڕی زەردەشت کاریگەر دەبن. دووبارە پەرستگا ڕووخێنراوەکەی سولەیمان بونیاد دەنێنەوە. بۆ یەکەمین جار لەژێر ناوی پەرتووکی پیرۆز (عەهدی قەدیم) سەرکێشیەکانی قەبیلەی عیبرانی دەنووسنەوە. پێغەمبەر ئەشعیا گرنگترین ڕۆڵ لەو کارەدا دەبینێت. ئیلهام لە میتۆلۆژیای سۆمەر و میسر و بیروباوەڕی زەردەشتی وەردەگرن و سەرگوزشتەکانی قەبیلەکەی خۆیان لەژێر ناوی عەهدی قەدیم (پەرتووکی پیرۆز) دەنووسنەوە و بەمجۆرە پێشکەشی دەکەن. ڕۆڵێکی گرنگ لەکاروبارەکانی کۆشکی ئیمپراتۆریەتی پارسدا دەبینن. شیمانە دەکرێت لەو سەردەمەدا ناکۆکی و پەیوەندییان لەگەڵ کوردە بەرابیەکان هەبووبێت. شوێنپەنجەکەی لە پەرتووکی پیرۆزدا دەبینرێت. زیاتریش ڕێککەوتنیان لەگەڵ پاشاکانی پارسدا ئەنجامداوە. وەک چۆن لەدەرکەوتنی حەزرەتی ئیبراهیم لە ئورفا شوێنپەنجەکەی دەبینرێت، شاهێدی پەیوەندییەکانێتی لەگەڵ کلتووری قەبیلەی خوری (کوردە بەرابیەکان). گفتوگۆیەک لەوبارەوە هەیە کە قەبیلەی عیبرانیش نیمچە (نیوە) خوری بێت. ئەگەرێکی بەهێزە نوێنەرایەتی کلتورێکی گوزەرکردنی نێوان کلتووری سامی و ئاریانی بکات.

لەسەردەمی پاشا و ئیمپڕاتۆرەکانی رۆما و هێلینی (٣٠٠ پ.ز-٧٠ زایینی) یەهودییەکان بەردەوام لە دۆخی بەرخودان دابوون. لەساڵی ٧٠ی زایینی جارێکی دیکە پەرستگای سولەیمان لەلایەن رۆما رووخێنراوەتەوە، ئەوجارەیان دووچاری نەفی کردنێک هاتوون کە زۆر درێژخایەن دەبێت. ئاراستەی نەفیکردنەکەیان بەرەو سەرجەم ناوچەکانی شارستانیەت بووە. نەفیکردن و کۆچکردنێک بۆ ناوەوەی ئاسیا، ئەفریقیا و ئەوروپا جێگای باسە. لەهەر شوێنێکی بۆی رۆیشتبن سەرقاڵی کاروباری پارە، بازرگانی و رۆشنبیری بوون. توێژگەلێک لەناو ئەو یەهودییانە سەرهەڵدەدەن کە بەباشترین شێوە سەرمایە کەڵەکە دەکەن. هەروەها ئیتر باشترین نووسەریش لەناو یەهودییەکان هەڵدەکەون. نووسەران بەجۆرێک لەجۆرەکان شوێنکەوتەی پێغەمبەرەکانن کە درێژە بە نەریتەکەیان دەدەن. دوای ئەوەی مەزهەبەکەی حەزرەتی عیسا – کە لەلایەن هەژاران و قەومە چەوساوەکانەوە لایەنگری لێکرا ـ بوو بە ئایینی کریستیانی، ناکۆکی لەنێوان کاهینەکانی چینی دەسەڵاتداری یەهودی و کریستیانەکان دەست پێدەکات. پەیوەندی و ناکۆکیەکانی نێوان موسەویەتی کۆن و ستیانی و ئەو شەڕ و پێکدادانەی سەرچاوەکەی پێکدێنن لەراستیدا گرنگترین تێکۆشانی چینایەتی چاخی کۆنی کلاسیکە (٣٠ ـ ٣٠٠) زایینی.

لەگەڵ سەرهەڵدانی ئیسلام لە چاخی ناوین یەهودییەت بەدۆخێکی بە کێشەتر گەیشت. بەتایبەتیش دیسان رێگای کۆچکردن بۆ یەهودییەکانی نیمچە دورگەی عەرەب بەدەرکەوت. ئەوانەی نیازی کۆچکردنیان نەبوو لەپێناو پاراستنی ژیانی خۆیاندا ناچاربوون دەمامکی ئیسلامی بپۆشن. بەمجۆرەش هەم گفتوگۆ و د[illegible]کییەکانی ناو ئیسلامیان قووڵکردەوە، هەمیش هەوڵی پاراستنی خۆشیاندا. کاتێک ناوەندی ئیسلام بۆ بەغداد گواسترایەوە تەریقەتی قەرایم یان پێکهێنا (٨٥٠ زایینی) کە تێکەڵەیەکی یەهودی ـ کریستیانی ـ ئیسلامە و لە تەریقەتی ئەڤانگالیستی رۆژی ئەمڕۆمان دەچێت. بەمجۆرە کەوتنە ناو ژیانێکەوە کە زیاتر سازش لەگەڵ کرستیانی و موسڵمانێتی دەکات، هەروەها دزەشیان کردە ناو تورکە رەوەندەکان و لە باکووری قەزوین دەوڵەتی تورکی خەزرایان دامەزراند. سەلجوق بەگیش جێگای خۆی لەناو ئەو نوخبە تورکە یەهودییە دەگرت کە بۆ یەکەمین جار لەناو ئەتنیکی تورکی بوو بە دەوڵەت و رێگای لەپێش خانەدانەکانی سەلجوقی و عوسمانی کردەوە. خۆی ئەفسەر بوو. لەمیانەی ئەو کلتوورەی لە دەوڵەتی تورکی یەهودی وەریگرتبوو سەردەمی دەوڵەتەکانی خانەدانی سەلجوقی دەست پێکردبوو. ئەوەی لێرەدا گرنگە چاندنی کاریگەرییەکی بەهێزی یەهودییە لەناو هێز و نوخبەی دەسەڵاتی تورکیدا، کە رۆڵی دامەزرێنەرییان لەو دەوڵەتە ئیسلامیانەدا بینی کە لە خۆرئاوا، لە نیمچە دوورگەکانی مەغریب و ئیبریک پێکهێنران. لەبواری ئابووری، دارایی و رۆشنبیرییەوە رۆڵیان لە پەرەسەندنیاندا بینی.

بەهۆی زیادبوونی ناکۆکیەکانیان لەگەڵ ئایینی کریستیانی لە کۆتاییەکانی سەدەی دوازدەهەمدا بەبڕیاری کۆنسلۆسی لاتران یەهودییەکان لە گیتۆکان کۆکرانەوە و بەندکران. دواتر لە دوو قۆڵەوە بەرامبەر کریستیانی کەوتنە ناو چالاکیەوە؛ ئاواکردنی باڵی ماسۆنی

عەلمانی و بزووتنەوەی ریفۆرمی میللی لە ئایینی کریستیانیدا. ئەو دوو بزووتنەوەیە کاریگەرییەکی زۆریان لەسەر دەرکەوتن لە چاخی ناوین هەبوو. کاتێک هەرە دوایی لەساڵی ١٤٩٢دا بەیەکەوە لەگەڵ موسڵمانەکان لە نیمچە دوورگەی ئیبریک بەدەرنران دیسان تووشی شەپۆلێکی دیکەی کۆچ هاتن. شانبەشانی خۆرهەڵاتی دەریای سپی و ئەنادۆڵ کۆچەکەیان بەرەو کەنارەکانی ئەوروپای خۆرئاوا بوو، لەسەرووی هەموشیانەوە بۆ هۆڵەندا. هەرچی لە ئەوروپای خۆرهەڵاتە زیاتر دووچاری فشاری کریستیانەکان هاتن. ئەو کۆمەڵکوژیانە دەستپێکرد کە بە پۆگرۆمی یەهودییەکان ناودەبرێت. ئەو وەڵامەی چینی سەرووی یەهودییەکان، توێژەکانی سەرمایە و ڕۆشنبیر ـ نووسەر بەرامبەر ئەو دۆخە پێشیانخست، بینینی ڕۆڵی پێشەنگ بوو لەپێناو پێشخستنی سەرمایەداری وەک سیستەمێک. لەمیانەی ئەو ڕۆڵەی لە بەرخودانی نیشتیمانی هۆڵەندا بینییان ئیمپراتۆرییەکی کاسۆلیکی (مەزهەبی گەردوونی) تەوەرەی ئیسپانیایان دووچاری شکستێکی ستراتیژی کرد. لە قۆناغی ئەو بەرخودانەدا میرنشینی هۆڵەندا وەک یەکەمین دەوڵەت ـ نەتەوەی مێژوو هاتەئاراوە. لە دەرەنجامی شەڕە مەزهەبییە خوێناویەکانی نێوان ساڵانی ١٥٥٠ ـ ١٦٥٠ هەم دونیای کاسۆلیکی پارچە بوو، هەم سەرمایەداریش وەک سیستەم هەڵکشانی بەخۆیەوە بینی. سەرمایەی یەهودی و ڕۆشنبیر ـ نووسەرەکانی ڕۆڵێکی گرنگیان لەوەدا بینی. دواتر لەگەڵ ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی سەنتەری بریتانیا ـ لەندەن ڕۆڵیان لە پەرەسەندنی قۆناغی بە ئیمپراتۆریەتبوونی ئینگلتەرادا بینی. بەمجۆرە لەرێگای مۆدێلە عەلمانی و پرۆتستانیەکەیان تۆڵەیان لە دونیای کاسۆلیک و ئۆرتۆدۆکس کردەوە کە ستەمیان لێکردبوون. بەمانایەکی تر لەسەر بنەمای مۆدێرنیتەوە تێکۆشانی نەتەوەیی و چینایەتییان چڕکردەوە و پەردەیان لەسەر چاخی ناوینی کاسۆلیک و ئۆرتۆدۆکس داخست. بێگومان ناشێت چاخی نوێ تەنیا بکرێت بە موڵکی یەهودییەکان. بەڵام ئەگەر ڕۆڵی یەهودییەکان نەبێت یاخود ئەو ڕۆڵە نەبینرێت، ئەوا ناشێت بەشێوەیەکی شایستە دەستپێکردن و پەرەسەندنی چاخی نوێ تاوتوێ بکرێت. دیسان ڕۆڵی سەرکردە بەبنەچە یەهودییەکان و ئایدیۆلۆژیای عەلمانی لەکوشتنی پاشا کاسۆلیکەکەی فەرەنسا و ئیمپراتۆریەتە ئۆرتۆدۆکسیەکەی ڕووسیا و کۆتاییهێنان بە خانەدانەکانیان لە شۆڕشی فەرەنسا و ڕووسیا زۆر ئاشکرایە. ئەو ڕۆڵە حاشاهەڵنەگرە تا ڕۆڵی یەهودییەت لەسەرجەم هەڵمەتە هاوشێوەکانی شۆڕش و سەرمایەی ئەوروپا نەخرێتەڕوو ناشێت ڕوونکردنەوەیەکی ڕاست و تەواویان بۆ بکرێت.

بوونی یەهودییەکان لە ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا کە پەیوەندی بە بابەتەکەمانەوە هەیە و ئەو کێشانەی ڕێگای لەپێش کردۆتەوە بەشێکی گرنگی هەمان پرۆسەی مێژووییە. بەدرێژایی مێژوویان یەهودییەکان لەو دوو ناوچەیە دانەبڕاون. لەراستیدا بنەچەکەیان گرێدراوی کلتووری میزۆپۆتامیایە. بەڵام ئەنادۆڵ یەکەمین ناوچە بووە کە تێیدا چڕبوونەتەوە. ئەو نیشتەجێبوونەش بۆ سەردەمی پارس درێژدەبێتەوە. ئەگەر بەهۆی دەرکردنیان بێت لە نیمچە دوورگەی ئیبریک یان ڕاکردنیان بێت لەدەست پۆگرامە

(کۆمەڵکوژی)ەکانی ئەوروپای خۆرهەڵات ئەوا ئەنادۆڵ بۆیان بووە بە پەناگەیەکی گرنگ. بێگومان ململانێ و پێکدادانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لەگەڵ دونیای کاسۆلیکی خۆرئاوا و ئەرتۆدۆکسی باکوور رۆڵێکی زۆر گرنگی لەو دۆخەدا بینیوە. لە دامەزراندنیەوە تا رووخانی رۆڵی یەهودییەکان لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی زۆر لەمەزەندەکان زیاتر بووە. ناشێت بەبێ بوونی کوردان و یەهودییەکان بیر لەو ئیمپڕاتۆریەتە بکرێتەوە. بەتایبەتیش لە سەردەمی سولەیمان قانوونی و سوڵتان حورەم، ئەو رۆڵەی هەردووکیشیان بەلوتکە گەیشتووە. هەروەها کاریگەری بزووتنەوەی سابیتای سیڤی ش لەسەر ئەزمیر زۆر بەهێز بووە کە سالانی ١٦٥٠ بە بانگەشەی پێغەمبەرایەتیەوە سەریهەڵدا. لەئاکامی بەرەنگاربوونەوەی لەلایەن سوڵتانەوە سابیتای سیڤی ئەو نەریتەی دەستپێکردووە کە بە "هەڵگەڕانەوە"[1] ناودەبرێت. لەو قۆناغە بەدواوە یەهودییە هەڵگەڕاوەکان چوونەتە ریزی سەرجەم تەریقەتە ئیسلامیەکانەوە، لەسەرووی هەمووشیانەوە بەکتاشی و نەقشبەندی؛ تەریقەتی نوێیان ئاواکرد و ریفۆرمیان لەزۆربەیان ئەنجام دا، بەمجۆرەش کاریگەرییەکی ئایدیۆلۆژی مەزنیان بەدەستهێنا. هەروەها تاڕادەیەکی زۆر دارایی ئیمپڕاتۆریەتیشیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە.

لەمیانەی یەکەمین کۆنگرەی زایۆنی ساڵی ١٨٩٦ کە میللیگەرایی بۆرژوازی یەهودی رێکیخست، قۆناغ و سەردەمێکی نوێ دەستیپێکرد. بەهۆی هەڵکشانی میللیگەرایی لە خۆرئاوای ئەوروپا و بەردەوامکردنی پۆگرامەکان لە ئەوروپای خۆرهەڵات وەک ناچارییەک یەهودییەکان بۆ دۆزینەوەی نیشتیمانێک کەوتنە خۆ. کاتێک پیلانی نیشتیمانێکی یەهودی سەری نەگرت کە سەرەتا لە ئەفریقیا بیری لێکرابوویەوە، ئەوجارە ئاوڕەکان کەوتنە سەر ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی. کاتێک پیلانی نیشتەجێبوون و بە نیشتیمانکردنی ئەزمیر، سیلانیک، ئەدرنە و بەشێکی میزۆبۆتامیا سەری نەگرت، لەکۆتاییدا دیسان بڕیار لەسەر کۆنە وڵاتی کەنعان ـ فەلەستینی نوێ درا. بەڵام بەربەستی سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەم (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩) جێگای باس بوو کە بۆ هاوکاریکردنی ئەو پرۆژەیە ئامادە نەبوو. ئەویش لەبەر هەمان هۆکار وەک پاشای فەرەنسا و ئیمپڕاتۆریەتی رووسیا بە پێگەیەک گەیشتبوو کە خۆی و خانەدانەکەی لە دەسەڵات دووربخرێنەوە. چڕبوونەوەی کار و خەباتی سەرمایەی یەهودی لەسەر ماسۆنیەت و سابیتایستەکانیش لەسەر جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی، لەمیانەی مەشروتییەتی دووەمەوە یەکەم بەرهەمەکانی خۆی بەدەستهێنا. رژێمی دەستووری مەشروتییەت کەوتەکار. دەسەڵاتەکانی سوڵتان

---

[1] بزاوتی هەڵگەڕانەوە (دۆنمە ـ Sabatarianism): مەزهەبی یەهودییە هەڵگەڕاوەکانە. ناوەکەی بۆ دامەزرێنەرەکەی دەگەڕێتەوە سەبتای تسفی (١٦٢٦ـ١٦٧٥)، کە لە ساڵی ١٦٤٨ خۆی بە مەسیح راگەیاند. دادگایی کرا، لە کاتی دادگایی کردن ئیسلامبوونی خۆی راگەیاند، بۆیە سوڵتان محەمەدی چوارەم لێی دەبورێت، بەمجۆرە سەبتای ناوی خۆی کرد بە محەمەد عەزیز ئەفەندی. بە هەڵگەڕاوە ناوبران چونکە لە رووخساردا خۆیان وەک موسڵمان پیشاندەدەن، بەڵام لە ناوەڕۆکدا یەهودین. ئەم رەوتە رۆڵێکی بە کاریگەری لە رووخاندنی دەوڵەتی عوسمانی و ئاواکردنی کۆماردا بینی، لە ناو کۆمەڵەی ئیتیحاد و تەرەقیدا بە کاریگەر بوون.

کەمکرایەوە. دواتر لەڕێگای پیلانی ٣١ی ئاداری ١٩٠٩ سوڵتان عەبدولحەمید لەدەسەڵات کەوت.

لەو پرۆسە خێرایەدا میللیگەرایی یەهودی بەشێوەی دووباڵ دەجولایەوە. یەکەمیان ئەو باڵەی لەگەڵ بۆرژوازی بیروکراتی ئەڵمان و تورک بوو. باڵی یەکەم لە چوارچێوەی یەکپارچەیی سنوورەکانی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لە نیشتیمانێک دەگەڕا. ئەزمیر- مانیسا، سیلانیک -ئەدرنە و باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)ی ئەمڕۆ، لەسەرووی ئەو شوێنانەوە دەهاتن کە بیریان لێدەکردەوە. ئەوانەش هەبوون کە بەبێ ئەوەی تەواوی ئیمپڕاتۆریەت بۆ ناوچە خۆجێییەکان جیابکەنەوە وەک وڵاتی خۆیان پەسەندیان دەکرد. بەتایبەتیش "هەڵگەڕاوەکان" واتە سابیتایستەکان زیاتر لەو گروپانەدا بوون کە خۆیان بە یەهودی تورک دادەنا. ناسنامەی (عەرەب، کورد، ئەڵبانی، چەرکەسی و ئەوانیتر) ماسۆنی زۆربەی کادیرە لە پێشەکانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی و خۆ بە تورک دانانیان پیشانیدەدات کە ئەو چەمکە بەهێز بووە. بەجۆرێک لەجۆرەکانی هاوپەیمانێتی " تورکە ناتورکەکانیان" پێکهێنابوو. خاوەنی ئەم چەمکانەش پێکهێنەری کادیرانی دەسەڵاتی ئیتحاد و تەرەقی و پارتی گەلی کۆماری (CHP) بوون. پۆزیتیڤیزمی قەبەی دورکهایمیش فەلسەفەکەیان بوو. وێڕای ئەوەی لە ڕووخساردا تورکپەرستن، بەڵام کاتێک هەلومەرج دەرەخسێت هەر یەکە و دەگەڕێتەوە سەر بنەچەی خۆی؛ دەبوون بە میللیگەرایی عەرەب، کورد، ئەلبانی، چەرکەس، ئەرمەنی، ڕۆم، بولگار...هتد.وەک کۆپیەی پلە سێیەمی ئەو ئەزموونە مامەڵەیان دەکرد کە لە ئەوروپا ڕوویدابوو. بە تایبەتیش کاریگەری دەوڵەت ـ نەتەوەی فەڕەنسا و ئەڵمانیایان لەسەر بوو.

باڵی دووەم؛ لە توێژەکانی لایەنگرانی ئینگلیز پێکدەهات کە لاوازتر بوون. سەرەتا بیریان لە نیشتیمانێک دەکردەوە لە ئەفریقیا بێت. بەڵام ئەو مەیلەی بە تێپەڕبوونی کات دەرکەوتەپێش؛ لەدەرەنجامی پارچەبوونی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی فەلەستینی جێگای پاشایەتی یەهودی ـ ئیسرائیلی کۆنیان وەک گونجاوترین شوێن هەڵبژارد. ئەو توێژە لەو بڕوایە دابوون کە ئیمپڕاتۆریەت تەمەنی تەواو بووە و پێویستە پارچە بکرێت. ڕێککەوتنی تیلسیتی[٢] ١٨٠٧ نێوان فەڕەنسای ناپلیۆن و ڕووسیای قەیسەری بناغەی ئەو بۆچوونەی پێکدەهێنا. وێڕای ئەوەی نوێنەرایەتییان لەناو جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقیدا هەبوو، بەڵام باڵێکی مەزن بوون. تەنیا بەپێویستی پەرتەوازەبوونی ئیمپڕاتۆریەت ناوەستن، بەڵکو لەناو هاوپەیمانیەتییەکەی لایەنگری ئینگلیزیش بەهەموو هێز و توانای خۆیانەوە

---

[٢] پەیماننامەی تیلسیت: ئەو پەیماننامەیە لە ساڵی ١٨٠٧دا لەنێوان فەڕەنسا و ڕووسیا واژۆ کرا. بەگوێرەی ئەو پەیماننامەیە پێویستبوو ڕووسیا پشتیوانی لە فەڕەنسا بکات و دەروازەی بازرگانی خۆی لەگەڵ بریتانیا دابخات، وەک بەشێک لە لەهەوڵەکانی ناپلیۆن بۆ جێگیرکردنی ئابلۆقەی کیشوەرەکە و تۆکمەکردنی پەیوەندییە ئابوورییەکانی وڵاتانی ژێر کۆنترۆڵی فەڕەنسا لە ئەوروپا. ئامانجی سەرەکی لەمەشدا داخستنی یەکێک لە گرنگترین بازاڕە دەرەکییەکانی بریتانیا و ناچارکردنی بە ملکەچیکردنیدا. لەبەرامبەر ئەوەشدا فەڕەنسا نێوانگیری لەنێوان ڕووسیا و عوسمانی بکات.

لەو پێناوەدا کاریان دەکرد. لە بەرەکانی چانەقەلا و فەلەستین بە یەکینە تایبەتەکانی خۆیانەوە لەپاڵ ئینگلیزەکان دەجەنگان. وەک دەزانرێت پیلانی سایکس ـ بیکۆ (١٩١٦)، راگەیاندن یان بەڵێنی بلفۆر (١٩١٧) و ریککەتننامەی رژێمی ماندای ئینگلیز لە فەلەستین (١٩٢٠) بە هاوکاری ئەو توێژانە ئامادە کران. لەجیاتی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئاواکردنی ژمارەیەکی زۆری دەوڵەت ـ نەتەوە لە خۆرهەلاتی ناوین ئەنجامی ئاسایی ئەو پیلان و ریککەوتنانە بوو.

هەردوو باڵیش خاوەن تایبەتمەندێتی هاوبەش بوون. مۆدێرنیست بوون، رۆڵی پێشەنگایەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان دەبینی. زۆربەیان ماسۆنی بوون. هەر لەسەرەتاوە ـ واتا لەکاتی دامەزراندنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی هۆڵەندا و بریتانیا لە سەدەی شازدەهەمەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان ـ لایەنگرانی ئینگلیز هەوڵیان دەدا ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتە گەورەکان پارچە بکەن و لەجیاتی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەی بچووک ئاوا بکەن کە دژی هەژموونگەرایی ئینگلیز نەوەستێتەوە و بەردەوام ناچاربن هاوکاری بکەن. وەک ئاکامێکی ئەو زهنیەتەش ئیسرائیل دادەمەزرا. بە جیاوازییەکەوە؛ بەو مەرجەی سەرەتا لەگەڵ ئینگلتەرا دواتریش لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ببێت بە هێزی هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانگیری. هەڵبەتە واقیعی نێودەوڵەتیش لەسەر ئەو بنەمایە ئاواکراوە و تا ئێستاش بەو جۆرە بەردەوامە. لە بنەڕەتدا هەر ئەو توێژانە بوون کە سەرمایەدارییان وەک سیستەمێکی هەژموونگەرایی جیهان بونیادنا. بەهەڵە تێنەگەن، ناڵێین ئەو توێژانە بە پیلانێکی نهێنییەوە دونیا بەڕێوەدەبەن. لەگەڵ ئەوەی ئەو جۆرە بۆچوونانە هەن، بەلام بۆچوونێکی زێدەڕۆ و ئەوپەڕگەرن. رۆڵی ئەو توێژانە (تەنیا لە یەهودییەکان پێکنایەن، تاکی هەموو نەتەوەکان جێگای خۆی تێدا دەگرێت؛ یەهودییەکان زیاتر لە پێگەی پێشەنگایەتی دان) جۆرێک لە تاودان و خێراکردنە؛ رۆڵی پێشەنگایەتییە لە بونیادنانی ئایدیۆلۆژیا، سیاسەت، جڤاکی، هونەری و ئابووری سیستەم. لایەنگرانی ئەڵمانیا سەرەتا بەهێز بوون. لەدوا قۆناغی خۆیدا جڵەوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانییان گرتەدەست. جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی لەبنەڕەتدا ریکخستنێک بوو کە ئەوانە مۆرکی خۆیان لێدابوو. هەر ئەوانەش بوون کە دەسەلاتیان ئاراستە دەکرد. مەشروتیەتی دووەم، رووداوی ٣١ی ئادار، یەکەمین و دووەمین شەڕەکانی بەڵقان و یەکەمین جەنگی جیهانی بوویەرگەلێک بوون کە رۆڵێکی گرنگیان تێدا بینی. دۆڕاندنی ئەڵمانیا و پەرتەوازەبوونی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی، دواتریش هەڵکشانی فاشیزمی هیتلەر مانای هەرەسهێنانی ئەو باڵە بوو. ئەوانەی کە مانەوەش بەشداری شەڕی رزگاری نیشتیمانی ئەنادۆڵیان کرد. تا بڵێی بەهێزبوون. بەلام کوشتنی ئەنوەر، تەلعەت و جەمال پاشا بۆ رێبەری هێشتبوونەوە. هەروەها بەر لە رووخان باڵی ئینگلیز لەرێگای سوڵتان وەحدەددین هەڵمەتێکی نوێی ئەنجامدا و هێزێکی گرنگی لەناو پاشماوەکانی دەوڵەت جێگیر کردبوو. ئەوانەش بەشداری شەڕی رزگاری نیشتیمانییان کرد. عیسمەت ئینۆنۆ و فەوزی چەخماخ

سەرکردە سەرەکییەکانیان بوون. چونکە ئینگلتەرا لایەنی سەرکەوتووی شەڕ بوو، تا دەچوو لایەنگرانی ئینگلیزیش پێگەیان بەهێزتر دەبوو.

لێرەدا دیاردەی مستەفا کەمال دەردەکەوێتە پێشمان. مستەفا کەمال نوێنەرایەتی رادیکالیزمی وردە بۆرژوازی نموونەیی هەلومەرجی کۆلۆنی هاوشێوەی رووسیا و چین بوو. ئەو دیاردە سەرەکییەی مستەفا کەمالی دەرخستۆتە مەیدان داگیرکاری کرداری ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیایە. داگیرکردنی کردەیی نەبووایە مستەفا کەمالیش نەدەبوو. لە شۆڕشی فەڕەنساش بوویەرێکی هاوشێوە روویدابوو. هاوشێوەی سوڵتان وەحدەددینی ئەو سەردەمە ئەگەر لویسی شازدەهەم بە ئامانجی هاوکاریکردن مۆنارشیەکانی ئەوروپای بۆ فەڕەنسا بانگهێشت نەکردبووایە، ئەوا رۆبسپێر و هاورێکانیشی بە سیفەتی وردە بۆرژوازی رادیکال دەرنەدەکەوتن. ئەوەی ئەوانی هێنایە مەیدان و بەرەو راگەیاندنی کۆماری یەکەمی بردن داگیرکاریەکەی قۆناغی نێوان ١٧٩٠ ـــ ١٧٩٤ و راستینەی بەرخودانەکەی بەرامبەری بوو. هەر لەو چوارچێوەیەشدا لەگەڵ کۆتاییهاتنی هەلومەرجەکانی داگیرکاری، رادیکالیزمی وردە بۆرژوازی لەناوبراوە. لەمیانەی هەلومەرجێکی هاوشێوەشەوە کۆماری تورکیا دامەزراوە. ئەگەر رادیکالیزمی وردە بۆرژوازی مستەفا کەمال نەبووایە، ئاواکردنی کۆمار زۆر ئەستەم بوو. بە دڵنیاییەوە سەبارەت بەبوونی خۆی کۆمار قەرزباری رادیکالیزمی مستەفا کەمالە. بەڵام کاتێک لەمیانەی رێککەوتننامەی لۆزان بە شێوەیەکی فەرمی کۆتایی بە داگیرکاری هات و کۆمار بە دەستوورە نوێیەکەی خۆی گەیشت (١٩٢٤) بەشێوەیەکی سەرەکی رادیکالیزمی مستەفا کەمالیش لەگەڵ هاوپەیمانەکانی تەسفیە کراون. ئەو دیاردەیەی لەلایەن مێژووناسانی تورک شاردراوەتەوە، واتە تا ئەو دیاردەی تەسفیەکردن دەرکی پێنەکرێت، هەڵسەنگاندنێکی بابەتی و واقیعیانەی دیاردەی کۆماری تورکیا ئەستەمە. دانانی مستەفا کەمال وەک سەرۆک کۆمار مانای بەردەوامکردنی رادیکالیزم نییە، بەڵکو بەڵگەیەکی لەناوبردنیەتی. کرۆنۆلۆژی و روونکردنەوەیەکی مێژوونووسی تورکیا جێگای باسە کە لە ئەنالیزی کۆمەڵناسیانە دوورە و مۆدێلێکی ئەنالیزی تێکەڵەی ئایین و پۆزیتیڤیزم ئەنجامدراوە. چەمکێک زاڵکراوە وەک بڵێی رێککەوتن، چین، نەتەوە و ئایدیۆلۆژیای جیاواز بوونیان نەبێت، هەموو شتێک لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە و شەڕی رزگاری نیشتیمانیش لەمیانەی ناسنامەیەکی هۆمۆژەن و یەکپارچە ئەنجامدرابێت. لە باسکردنی راستینەی مستەفا کەمال ئەو چەمکە زەق دەبێتەوە. بە ئەنقەست و بە سووربوونەوە خۆیان لە باسکردنێکی زانستیانە دزیوەتەوە. ئەگەر بچووککردنەوەی مستەفا کەمال بێت یاخود زلکردنی هەردووکیشیان لەجیاتی سوود زیانبەخشن. مستەفا کەمالی سەردەمی هەلومەرجەکانی داگیرکاری و ئەتاتورکی سەردەمی پێکهاتنی پێگە و ستاتۆ لێکجیاوازن. وەک بڵێی دژە شۆڕش لەناو شۆڕشدا ئەنجامدرابێت. دژە شۆڕش لە ١٩٥٠کان ئەنجام نەدراوە، بەڵکو لە ١٩٢٥کان ئەنجامدراوە.

ئەگەر دووبارە بگەڕێینەوە سەر واقیعی یەهودییەکان، پێویستە دەرک بەو رۆڵەی یەهودییەکان بکرێت کە لە دژە شۆڕشەکەی ١٩٢٥دا بینیان. وەک پێویستییەکی سروشتەکەی لە دەرەوەی هەلومەرجەکانی داگیرکاری مستەفا کەمال نەیدەتوانی درێژە بە رادیکالیزمی وردە بۆرژووازی بدات. لە مێژبوو هێزە چەپڕەوەکانی لایەنگری سۆڤێت تەسفیە کرابوون. لەمیانەی هەلومەرجەکانی ئەو دژە شۆڕشەی لە ئاکامی پرۆڤەقاسیۆنەکەی ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ دژ بە شێخ سەعید ئەنجامدرا ئەوجارە زهنیەت و کادیرانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی لەرێگای پارتی گەلی کۆماری (CHP)یەوە دەوڵەتە نوێیەکەیان خستە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە. خۆیان ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتەکەیان داڕشتبوو. پایەی سەرۆک کۆماری بەخشراو بە مستەفا کەمال پلەیەکی سیمبۆلی و رەمزی بوو. نیگەرانی و ناڕەحەتیەکانی مستەفا کەمال بەرامبەر بە پرۆسە و قۆناغەکە ئەو راستییە دەسەلمێنن. هەروەها ئەزموونی فیرقەی سەربەستیش بەڵگەیەکی دیکەی جددییە. ئەو بەرنامەیەی لەساڵی ١٩٣٥ بە سکرتێریتی رەجەب پەکەر بۆ CHP ئامادەکراوە بەهۆی لێکچوونەکەی بە فاشیزمی مۆسۆلینیەوە رەخنە دەکرێت.

لە ناوەڕۆکدا ئەوەی روویداوە بریتییە لە: بۆرژوازی بیرۆکراسی تورک کە لەسەردەمی دەسەڵاتی ئیتحاد و تەرەقیەوە بە تەسفیەکردنی کەمایەتیەکان دەرەوشایەوە، سیاسەتێکی پەیڕەو کردووە کە لەناوەوە کادیرە یەهودییەکان و پاوانەکانی سەرمایە، لەدەرەوەش هەژموونگەرایی بەبنەما گرتووە. ئەو رێککەوتنەی هاتۆتەئاراوە رێککەوتنی فاشیزمی تورکی سپی یاخود پرۆتۆ ـ فاشیزمە لەگەڵ دوو شەریک. لەمیانەی دابڕانی موسڵ ـ کەرکوک لە میساقی میللیەوە لە سێ لایەنەوە هەنگاو بۆ جێبەجێکردنی پرۆژەی پرۆتۆ ـ ئیسرائیل دەهاوێژرێت. کۆماری تورکیا، رژێمیماندای بریتانیا لە فەلەستین و میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم)ی کوردی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) هەریەکە و بە گوێرەی هەلومەرجی بەرجەستەی خۆی رۆڵی هاوشێوەیان هەیە. هەریەکەیان وێستگەیەکی ئەو رێگایەن کە بەرەو ئیسرائیل دەچێت. پرۆژە پەسەندکراوەکەی کە بەرەو ئاواکردنی ئیسرائیل دەچوو لەسەر ئەو بنەمایە بوو. داخراو بوون و تەمومژەکەی سەر کۆماری تورکیا و ئەو دۆخە هاوشێوەیەی لە قەوارە کوردییەکەی لە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) دەبینرێت گرێدراوی دەرکەوتنی ئیسرائیلە. ئەو چینە کۆمەڵایەتییەی لەژێر ناوی تورک ئاواکراوە هیچ پەیوەندییەکی بە تورکێتیەوە نییە، بەڵکو پێکهاتەیەکی ئەفسانەییە. هەمان شت بۆ قەوارە کوردییەکەی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)یش جێگای باسە. چوارەمین کۆپی دروستکراوی بۆرژوازی تورکە. ئەویش پێکهاتەیەکی کۆمەڵناسی نییە، ئەفسانەییە. لەراستیدا میتۆلۆژیایەک لە دەوروبەری هەردوو قەوارە دروستکراوە. هەردووکیشیان پێکهاتەیەکی دروستکراون کە هیچ پەیوەندییەکیان بە راستییە کۆمەڵایەتی ـ مێژووییەکانەوە نییە. تەنیا لە چوارچێوەی ئاواکردنی ئیسرائیل دەشێت بە تەواوی دەرک بە رۆڵەکانیان بکەین. بەرامبەر بە مستەفا کەمالی تورک هەوڵی بە ئەفسانەکردنی مستەفا بارزانی دراوە. بە ئامانجی بچووککردنەوە

یان زلکردنی ئەو دوو ناسنامەیە ئاماژە بەو خاڵە ناکەم، بەڵکو لەپێناو ڕۆشنکردنەوەی چۆنیەتی ئەو تەم و مژەی ڕاستینەی کۆمەڵگای کورد و تورکی خنکاندووە بەسووربوونەوە ئاماژەی پێدەکەم. کاتێک تورک و کورد وەک گەل کەوتنە قۆناغی دیموکراتیزەبوونەوە. دیسان لەڕێگای پیلانگێڕی و کودەتا بۆ هاوتاکانەوە پەردەیەکی فاشیستانەی بەسەردا دەکرێت. بەمجۆرە لەسێدارەدان، تیرۆرکردن، براکوژی و شەڕی ناوخۆ کۆتاییان پێنایەت. پێکداداندانە ڕاستڕەو ـــ چەپڕەو، مەزهەبی و ئەتنیکیە دروستکراوەکان ڕوودەدەن. تێکۆشانێکی کۆمەڵایەتی و جولانەوەکانی گەل جێگای باسن کە لاڕێ، بێناوەڕۆک و چەواشەکراون. بەڵام هەموویان ڕێگا لەپێش کێشەگەلێکی کۆمەڵایەتی گەلەری زۆر قورستر دەکەنەوە. واقیعی ئەو ئەنجامانەیە کە بە باشترین شێوە لۆژیکی پیلانگێڕی، کودەتا و گێرەشێوێنی ڕووندەکاتەوە.

لەگەڵ ڕاگەیاندنی ئیسرائیل لە ١٩٤٨دا هەمان پرۆژەی سێیانە لەسەر بنەمای چوارچێوەیەکی بەرفراوانتر درێژەی پێدەدرێت. ئەوانەی دژی دەوەستنەوە، خوازیارن پەیوەستی ناسنامە و ئامانجی خۆیان بمێننەوە، بە بێ ڕەچاوکردنی چەپڕەو ـ ڕاستڕەو، پێشکەوتنخواز ـ کۆنەپەرست و تورک ـ کورد لەمیانەی قورسترین سزاوە لەناو دەبرێن. ئەو واقیعە بێبەزەییە لە پشت ئەم کودەتایانەوەیە کە لە ١٩٦٠، ١٩٧١، ١٩٨٠، ١٩٩٣، ١٩٩٧، ٢٠٠٢ جێبەجێکراون. دیسان بەشێوەیەکی زەقتر هەمان زهنیەت و ڕۆڵ لەو لەناوبردن، ڕاگواستن، دەستگیرکردن، ئەشکەنجە و ئاسیمیلاسیۆنە دەبینێت کە لە ساڵی ١٩٢٥ بەدواوە بەرامبەر کوردان، چەپڕەوەکان، ئیسلامگەراکان، بگرە دژی میللیگەرا تورکەکانی لایەنگرانی ئەڵمانیاش ئەنجامدراون. ئەو زهنیەتە لەمیانەی ڕێکخراوەکانی گلادیۆ بەهێزتر بووە و وەک ڕۆڵایەک سەرجەم تووێژە ڕەنجدەرەکانی کۆمەڵگا، دیموکراسیخواز و سۆسیالیستە کورد و تورکەکانی شێلاوە. بێگومان کاتێک ئەو شیکارانە لەچوارچێوەی مۆدێرنبوونی چینی دەسەڵاتداری یەهودی ـ تورک ـ کورد پێشدەخەین ئامانجمان ئانتی ـ زایۆنیزم، ئانتی ـ تورکێتی یاخود ئانتی ـ کوردێتی نییە. بەپێچەوانەوە بەرامبەر ڕێککەوتنەکانی چینی دەسەڵاتدار تێکۆشان و بەرخودانی مەزن و هاوبەشی سۆسیالیست و دیموکراسیخوازەکانی یەهودی ـ تورک ـ کورد لەچوارچێوەی چینەکانی خوارەوە جێگای باسە. لە سەردەمی دووەمین مەشروتییەتەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام تێکۆشانی هاوبەشی ڕەنجدەران و گەلە چەوساوەکان ـ گەلی یەهودیشی لە ناودا ـــ لە ئارادابوو. لەتەواوی ئەوروپا و ڕووسیاش بەبێ یەهودییەکان ناشێت بیر لە سۆسیالیزم و دیموکراسی بکرێتەوە.

چەندە سەیرە کە لەڕۆژی ئەمڕۆماندا ناچارکردنی پەیوەندی ئیسرائیل ـ کورد بۆ پەیوەندییەکی مێژوویی جێگای باسە. لەجیاتی ڕێککەوتنی ئیسرائیل ـ تورک یاخود وەک هاوشێوەیەکی ڕێککەوتنی ئیسرائیل ـ کورد کەوتۆتە ڕۆژەڤی مێژووەوە. ئەو خزان و گۆڕانکارییەی هەژموونگەرایی کە لە ١٩٨٠کان بەدواوە بە تایبەتیش دوای ٢٠٠٠ کانیش لە کۆماری تورکیا ڕوویدا ڕۆڵێکی گەورەی لەمەدا بینی. ئەو ڕێککەوتنەی حکومەتەکانی

ئاکەپە بە ئامانجی گۆشەگیرکردن و لەناوبردنیPKK لەگەڵ دەوڵەتەکانی ئێران و سوریا پێشیخست ـ کە سەرەتا بە پشتگیری ئیسرائیل، ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا دەسەڵاتی گرتەدەست ـ ئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە؛ تووڕەیی ئیسرائیل، ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا و تۆمەتبارییەکانی لەجۆری گۆڕینی تەوەری لێکەوتۆتەوە. لەو قۆناغەی پێی گەیشتووین لەبەرامبەر ئەو ڕێککەوتنەی نێوان حکومەتی تورکیا، ئێران و سوریا لەچوارچێوەی ئانتی ـ کورد هاتۆتە ئاراوە، ئیتر خەریکە جەمسەری ئەمریکا، یەکێتی ئەوروپا، ئیسرائیل و کورد پێکدێت یان بەجۆرێک لەجۆرەکان پێکهاتووە. هەردوو جەمسەری ڕێککەوتنیش کە خوازیارن لە ڕەگەوە گۆڕانکاری لە خۆرهەڵاتی ناوین بکەن ئامانجیان KCK–PKK یە. لێرەدا پەیوەندی ئایدیۆلۆژی و سیاسی PKK و هێڵە بەرجەستەکەی KCK لە چوارچێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا لەگەڵ حەقیقەت دەکەوێتەڕوو. ئەوەی لەڕووداوە گەورەکانی کۆمەڵایەتی ـ مێژووییدا ئەنجام دەستنیشان دەکات ڕێککەوتن و درۆ گەورەکانی دیماگۆژیەت نییە، بەڵکو خودی حەقیقەتە. وەک بڵێی؛ مێژوو تۆڵە لەو ئەفسانە و دیماگۆژییانە دەکاتەوە کە بە ناویەوە ڕێکخراوە. ڕاستی بەشێوەیەکی ڕوونتر بەدەردەکەوێت، واتە بەشێوەی حەقیقەت دێتەئاراوە. لە کاتێکدا مێژوو لە "ئێستا"دا چڕدەبێتەوە، لە هەموو کاتێک زیاتر "ئێستا" ش دەبێت بە مێژوو. بەو ڕادەیەی لە بنەڕەتدا تێکۆشان لە هێڵی هەولێر ـ ئامەد (ئەربیل ـ دیاربەکر) دەبێت بە هەنووکەیی، دەبێت بە مێژووش. دڵی ناوچەکە و بگرە دونیاش لە چوارچێوەی "سێیەمین جەنگەکانی جیهان" بە ئاوازێکی خێرا لەو هێڵە لێدەدات. دڵی شۆڕش و دژە شۆڕش کە سەردەمێک لە هێڵی ئەمستردام ـ لەندەن ـ پاریس ـ پترسبۆرگ ـ مۆسکۆ لێیدەدا، ئێستا لە هێڵی هەولێر ـ ئامەد ـ بەغداد لێدەدات.

بەئەندازەی گرێکوێرەی ئیسرائیل ـ فەلەستین، گرێی ئەفغانستان و پاکستان، گرێدراو بەمانەشەوە کلتووری ئیسلامی تەواوی جوگرافیای ئەفریقیای ئیسلامی کە تا ئاسیا، لە ڕووسیاشەوە بۆ چین و هیندستان درێژ دەبێتەوە بە دوای ناوەندی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەی خۆیدا دەگەڕێت. لەو قۆناغەی پێی گەیشتووین چارەسەرئامێزترین هێڵی ناوەند، هێڵی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەی شۆڕشگێڕی خۆرهەڵاتی ناوینی چوارچێوەی ئێراق ـ ئێران ـ سوریا و تورکیایە، لەو سۆنگەیەوە؛ هێڵی ئامەد ـ هەولێرە کە دڵی باکوور و باشووری میزۆبۆتامیا تێیدا لێدەدات و مێژووی مرۆڤایەتیش شتگەلێکی زۆر قەرزباریێتی. لەو هێڵەدا قەبیلەی عیبرانی تووشی یەکەمین کێشەکانی خۆی هات. دوای بەسەرهاتێکی سەیری سێ هەزار و پێنج سەد ساڵە دیسان لە سەرچاوەکەی بەدوای ڕزگاربوون لەو کێشانەدا دەگەڕێت کە بەردەوام تێیدا دەژیت. وەک پێشینان گوتوویانە؛ گیا لەسەر بنجی خۆی شین دەبێتەوە. وەک دیارە کێشەی یەهودیش لەسەر ئەو ڕەگانە چارەسەر و ئەنجامگیر دەبێت کە لێی لەدایک بووە. چانسی جێبەجێکردن و سەرکەوتنی ئەو تۆڕەی دژە شۆڕش نییە کە نوخبەکانی تورکیا بە پەلەپڕوزێ هەوڵدەدەن لەنێوان هەردوو جەمسەرە دژ بە یەکەکەی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا ـ ئیسرائیل و ئێران ـ سوریا ـ

ئێراق پەرەی پێبدەن. ئەو کێشە کۆمەڵایەتییانەی دوو سەد ساڵە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەجیاتی چارەسەر قووڵی کردۆتەوە، بەو قۆناغە گەیشتووە کە لەلایەن مۆدێرنیتەی دیموکراتییەوە چارەسەر بکرێت. ئاواکردنی نەتەوەی دیموکرات لەلایەن KCK ەوە روناکییەکی رۆشنکەرەوە و دەنگێکی بانگەوازی ئەو ڕێگایەیە.

### ٣. کێشەی دەسەلات و دەوڵەت لە پەیوەندی تورک ـ کوردا

لەوانەیە شیکارکردنی پەیوەندی نێوان کورد ـ تورک سەختترین بابەتی کۆمەڵناسی بێت. ئەو زەحمەتییەی لە شیکارکردنی کێشەی کورد جێگای باسە، بە ئەندازەی زانینی ماهیەتی ئەو پەیوەندییە و نەبوونی داخوازیەک بۆ زانینی، سەرچاوەی خۆی لەو هەوڵانە دەگرێت کە لەمیانەی گوتە بەگایەتیەکانی هەڵە و ئارەزوومەندانەکانی هیچ بنەمایەکی زانستییان نییە خوازیارن بیبڕن و فڕێی بدەن. لەبەر ئەو هۆکارەش بەرگرینامەکەم تەواوی هێزی کۆمەڵناسی بەکار دێنێت و لەسەر ئەو بنەمایە بایەخێکی زۆر بە هەنگاونان بەرەو چارەسەری دەدات. دوای پیلانگێڕی کۆمەڵکوژییەکەی ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ لە تاکە رۆژێکدا ئەو پەیوەندییە بە نەبوو دانرا کە هاوشانی ماهیەتە ستراتیژییەکەی پاڵپشت بە ئەندامبوون لە هەمان ئوممەت پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی ـ مێژوویی نۆسەد ساڵە بوو. شتگەلێکی بگرە بە فەرمانی "کن فیکون!"ی خوداوەندیش رووناداد بۆیان بە دیدێت، واتە لەو بڕوایە دابوون کاتێک دەرهەق بە کوردان بڵێن: "لەناوبچە" ئیتر لەناو دەچێت. ئەو ماتریالیزمە میتافیزیکە قەبەی سەرچاوەی خۆی لە پۆزیتیڤیزمی بنەمای ئایدیۆلۆژی فاشیزمی ئەوروپا وەردەگرێت، لەو بڕوایەدان کاتێک فەرمانی "قڕکردن و نکوڵی" لەژێر فەرمانڕەوایی دەسەلات دەربچێت، ئەوا لە ماوەیەکی کورتدا کوردان لەناو دەچن. ئەوەی جێگای باسە پاشماوەی کادیرانی هەمان پێکهاتەی ئیتحاد و تەرەقییە کە لەو بڕوایەدان ئەو هەڵوێست و ڕێبازانەی بەشێوەیەکی سەرکەوتوو لە پاکتاوکردنی ئەرمەنییەکان پەیڕەویان کردن بەرامبەر بە کوردانیش هەمان ئەنجامی لێدەکەوێتەوە. وەک چۆن ئەو درۆیە و سیاسەتی نکوڵیکردنیان دەرخواردی گەل و نەتەوەی خۆیان داوە، لەبەرامبەر دونیاش بەجۆرێک دەجولێنەوە وەک بڵێی دیاردەیەک بە ناوی کورد بوونی نییە.

هەمان راستینە سەبارەت بە زانستی مێژووش لەجێگای خۆی دایە. دەکرێ بڵێین؛ ئەو پەیوەندییانەی مێژوو زۆر کەمن کە هێندەی مێژووی ئەو دەوڵەت و شارستانیانەی لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا ئاواکراون خاوەنی ئەو هێزە بن کە گوزارشت لە یەکپارچەییەکی دیالیکتیکی گرنگی نێوانیان بکات. هێڵی میزۆبۆتامیا ـ ئەنادۆڵ لە گەشەکردنی مێژووی مرۆڤایەتیدا رۆڵی بڕبڕەی پشت دەبینێت. لە سەردەمی کۆمەڵگاکانی سۆمەر و میسرەوە کە یەکەمین شارستانییەت و دەوڵەتیان لە مێژوودا ئاواکردووە تا راستینەی کۆمەڵگای رۆژی ئەمڕۆمان ئەو هێڵە رۆڵی ئەو یەکێتییە دیالێکتیکیە و بڕبڕەی پشت دەبینێت. وێڕای ئەوەش مۆدێرنیزمی دەوڵەت ـ نەتەوە لەو بڕوایە دایە کاتێک هێڵێکی سوور بەسەر ئەو

مێژووە دادێنێت و نکوڵی لێدەکات ئیتر لە سفرەوە مێژوو لەخۆیەوە دەست پێدەکات و ئەوەش بە زانست دادەنێت. ببڕای ببڕ پێویستە ئەو دڕندایەتییەی ژینۆسایدی کلتووری بەلاوە بنێین کە نکوڵیکردن لەراستینەی کلتووری گەلان بە نەتەوەپەرستی دادەنێت و بەمجۆرە هەوڵی زانینی مێژوو بدرێت. بەو ئامانجەی رووی شاراوەی ئەو کلتوورەی نکوڵی و قڕکردن ئاشکرا بکات بە سووربوونەوە بەرگرینامەکەم هەوڵی پێشکەشکردنی ئاراستەی هێڵی مێژوو دەدات.

ئەگەر کلتووری شارستانی چینایەتی، شار و دەوڵەتی بێت یاخود کلتوورەکانی کۆمەڵگا کە بەرامبەر ئەو سیێیانە بەرگری لە بوونی خۆی دەکات هەمووێتیەکی یەکپارچەن. یەکپارچەیی هەم لەسەر بنەمای دژێتی یەکتر هەمیش لەناو خۆیاندا جێگای باسە. بەدرێژایی مێژوو زیاتر لەنێوان کلتوورەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا چاومان بەو راستییە دەکەوێت. دیاردەکانی دەسەڵات و دەوڵەت کە بۆ چینە سەرمایەدارەکانی شارستانی جێگای باسە، لەو دوو جوگرافیایە بەردەوام لەناو یەکتر بوون و هەمووێتیەکیان پێکهێناوە. یەکپارچەیی یان هەمووێتی لەهەموو بوار و کایەیەکدا جێگای باسە. بەتایبەتیش لە بوارەکانی ئابووری، سیاسی و کلتووری بەردەوام دەکەوێتەڕوو. لە سۆمەر، ئەکاد، بابل، ئاشوور، هیتیت، میتانی، ئورارتوو، ماد، پارس، هێلین، رۆما، بێزەنت، عوسمانیەکان تا کۆماری تورکیا کلتوورێکی یەکپارچە بەشێوەی رووباری بنەڕەتی جێگای باس دەبێت. ئەگەر سەبارەت بە باڵادەستەکان بێت یاخود ملکەچەکان، دیسان هەمووێتی و یەکپارچەیی مەرجە. جیاوازییە خۆجێییەکان خاڵێکی دیکەیە کە پێویستە لەگەڵ یەکپارچەیی دەرکی پێبکرێت. بۆ بەدەستهێنانی هەمووێتی و یەکپارچەیی جیاوازی مەرجە. ئەوەی لەسەر بنەمای جیاوازییەکان نەبێت بە هەمووێتی یان یەکپارچەیی ناو نابرێت؛ دەکرێ بە ژیانێکی زۆرەملێیانە یان بە گوتەی رۆژی ئەمڕۆمان دەشێت بە ژیانێکی فاشیستانەی یەک چەشنی ناوببرێت.

پێویستە لەمیانەی ئەو یەکپارچەییە مێژووییەوە سەیری پەیوەندییەکانی کورد ـ تورکی درێژایی مێژوو بکرێت. لەبەر ئەو هۆکارە بوو لە بەشە پەیوەندیدارەکان هەوڵی پێناسەکردنی ئەو قۆناغە درا کە لە شەڕی مەلازگردی ١٠٧١ تا شەڕی رزگاری نیشتیمانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٢ ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا درێژ دەبێتەوە. لێرەدا تەنیا سەرنجی بۆ رادەکێشم. لەو پێناوە بە سووربوونەوە ئاماژە بەو خاڵە دەکەم؛ چونکە هەندێ دەورووبەر دەڵێن؛ کوردان دەسەڵاتدارێتیەک یان سیستەمێکی دەوڵەتی دیاریان پێکنەهێناوە. بەرامبەر بەو زهنیەتە هەوڵی پێناسەکردنی دەستەواژەکانی یەکپارچەیی و جیاوازیم دا. لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە تا رۆژی ئەمڕۆمان لە تەواوی ئەو شارستانییانەی لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا ئەو دەسەڵات و دەوڵەتانەی رێگایان لەپێش ئەو شارستانیانە کردۆتەوە، حکومڕانییەتی هاوبەشە. هەمووێتی و یەکپارچەیی جێگای باسە. ئەگەر بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بیر لە سەروەری و دەوڵەت بکەینەوە تووشی هەڵەی گەورە دەبین. دەوڵەت ـ نەتەوە فۆڕمی دەسەڵاتی سەرمایەدارییە کە دوو سەدەی خۆی دەرباز نەکردووە. لە فۆڕمە

هەزاران ساڵیەکەی دەسەڵاتدا دەوڵەت ـ نەتەوە جێگای باس نییە. فۆڕمە باوەکەی سەروەری دەوڵەتشار و ئیمپڕاتۆریەتی گەردوونییە. لەمانەشدا بەشێوەیەکی هاوبەش نوێنەرایەتی کلتوورەکان دەکرێت.

دەوڵەتی هیتیت کە یەکەم دەوڵەتی ئەنادۆڵە ناشێ بە بێ میزۆپۆتامیا بیری لێبکرێتەوە. لەڕاستیدا مێژوو سەلماندوویەتی کە شازادە، شازادە خاتوون و پاشایەتییەکانی هیتیت بە بنەچە خورییین، واتە پرۆتۆ ـ کوردن (کوردە بەراییەکان). هەروەها میتانیەکانیش کە هەم دراوسێ هەمیش خزمیانن، بەو سیفەتەی یەکەمین دەوڵەتی ناوەندی میزۆپۆتامیای باکوورە لەگەڵ هیتیتەکان لەناویەکدان. دیار نییە کە سنووری یەکێکیان لە کوێ کۆتایی پێدێت و هی ئەویتریان لە کوێ دەست پێدەکات. لای ئاشوور و ئورارتووش هەمان واقیع جێگای باسە. هەڵبەتە ماد ــ پارسەکانیش لەناویەکتردا گەشەیان کردووە و بڵاوبوونەتەوە. هەروەها زۆر باش ئاگادارین کە لە چوارچێوەی راستینەی کورددا هەمان واقیع لە هێلین، رۆما، بێزەنت و عوسمانیش جێگای باس بووە. نەک تەنیا لەبواری کلتووری دەوڵەت و دەسەڵاتدا، بەڵکو لەسەرجەم بوارەکانی کلتووری کۆمەڵگا هاوبەشێتی هاوشێوە لەئارادایە. ئیسلام، کریستیانی و موسەوی ئایینێکن کە هەمان رەگ و بنەچەیان هەیە. زەقترین نموونەی هاوبەشێتی کلتوورین. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەوروپا بەدەستی ئەنقەست فۆڕمی دەوڵەت ــ نەتەوەیان لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا زاڵ کرد. لەجیاتی دەوڵەت و دەسەڵاتی کۆن کە بەردەوام لەمیانەی فۆڕمی ئیمپڕاتۆریەتی گەردوونی نوێنەرایەتی کراوە، لەسەر بنەمای ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە لاوازانەی لەمیانەی پارچەکردنی گەلان بۆ دەیان بەشی دژی یەکتر، پارچەبوونی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین و داگیرکاری نوێ بەدیهاتووە. بەمجۆرەش ناوچەکە خراوەتە ژێر هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداری. بگرە کۆماری تورکیاش کە وەک هێزێکی هەژموونگەرایی ئاستی ژێر بونیادنراوە، گرنگترین بەشەکانی ئەو بناغەیەی لەسەری ئاواکراوە، واتە موسڵ ـ کەرکوکی ناو میساقی میللی لێ دابڕێنراوە، هەر لە سەردەمی دامەزراندنییەوە مەحکومی ژیانێکی سەقەت و ناتەواو کراوە. بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو، لەسەر بنەمای دژایەتی و نکوڵیکردن لەیەکتری هەمووێتی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیای باو پارچە کراوە. لەکاتێدا هەمووێتی یان یەکپارچەیی کراوەتە قوربانی ژیانی یەک چەشنی فاشیستانە، سەرجەم کلتوورە جیاوازەکانیش دووچاری نکوڵی و قڕکردن هاتوون و رووبەڕووی لەناوچوون کراونەتەوە.

چینی سەرووی کوردان واتە ئەو توێژانەی سەرقاڵی مەسەلەکانی دەوڵەت و دەسەڵات بوون لەسەردەمی سوڵتان ئەلپ ئەرسەلانەوە تا دەگاتە سەردەمی مستەفا کەمال بە کلتووری دەوڵەت و دەسەڵاتی هاوبەشەوە جولاونەتەوە، ئەو هەڵوێستەیان کردووە بەهەڵوێستی گەلیش. هەرچەندە پێشنەخستنی زامن و ستاتۆیەک بۆ جیاوازییە کلتوورییەکەیان گرێدراوی بونیادە چینایەتییەکەیان بێت، بەڵام گەل هەم لە بواری ستراتیژی، هەمیش لەبواری کۆمەڵگای مێژوویی کلتووری دەوڵەتێکی هاوبەشیان

بەگوێرەی بەرژەوەندی خۆیان بینیوە. ناشێت لەو بارەشەوە تاوانبار بکرێن. ئەوانەی پێویستە تاوانبار بکرێن ئەو کەس و دەوروبەرانەن کە لەجیاتی ئەوەی ئەم بەیەکەوە ژیانە مێژووییەی گەلان بە پێکەیەکی یاسایی و بەڕێوەبەرایەتییەکی دیموکراتی بگەیەنن، دووچاری نکوڵی و قڕکردنیان کرد.

هەرچەندە دواتر هەڵەکەی خۆی پەسەند کرد و لەسەر بنەمای ڕەخنەدان دەربازی کردووە، بەڵام مایەی تێگەیشتنە کە لەسەردەمی دەرکەوتنی PKKبە زهنیەتی دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیستی بونیادنراوانە تێکۆشانی دژی کلتووری نکوڵی و قڕکردن دەستپێکرد. هەرچەندە لەروانگەیەکی سۆسیالیستانەش بێت، بەڵام وەڵامدانەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی جوداخواز و جیاکار لەمیانەی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی ترەوە کەوتنە ناو تەڵە و گەمەی سەرمایەدارییە. لەسەر ئەو بنەمایەش گەلانی جیهان خراونەتە ناو تەڵەی سیاسەتی "پەرتکە ـ زاڵبە"وە. لەژێر هیچ هەلومەرجێکدا نابێت سۆسیالیستەکان لایەنگری دەوڵەت ـ نەتەوە بن و بەرگری لێ بکەن. یەکێک لە سەرەکیترین پرەنسیپەکانی دژایەتی یان ڕکابەرایەتیکردنی سەرمایەداری پەسەند نەکردنی فۆڕمی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، ئیتر ئەمە بە ناوی گەل و نەتەوە چەوساوەکان بێت یان چەوسێنەرەکان. دووەمین پرەنسیپی سۆسیالیست بوون: لەژێر هەر هەلومەرجێکدا بەرگری لەو یەکپارچەییە دەکرێت کە لەبناغەی کلتوورە هاوبەشەکاندا جێگای باسە؛ هەروەک بەگشتی جێگای باسە بەدرێژایی مێژوو لە پەیوەندییەکانی کورد ـ تورکیش لەئارادا بووە. لەڕاستیدا بەو ئاراستەیەی بەرەو دامەزراندنی کۆمار رۆیشت لە ڕاگەیاندنی میساقی میللی، گشتینامەی ئاماسیا و ئەنجوومەنی گەورەی میللەتی تورکیا لەلایەن سەرجەم سیما گرنگەکانی ئەو قۆناغە، لەسەرووی هەموشیانەوە مستەفا کەمال، جەختی لەسەر کراوەتەوە و سەلمێنراوە کە جگە لە هەڵوێستێکی ستراتیژی هەر هەڵوێستێکی دیکە هەردوو گەل هیلاک دەکات. بەیەکەوە و بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە و بەناوی هاوچەرخیەوە ستاتۆی هاوبەش پەسەندکراوە. هەڵوێستە پیلانگێڕی و کودەتاچییەکانی دواتر ناتوانن کۆتایی بە ڕاستینەی ستاتۆی هاوبەش و ئارەزوومەندانەی کوردان و تورکەکانی ئەندامە بنەڕەتییەکانی کۆمار بێنن. ئەو ڕێبازانەی ئاسیمیلاسیۆن و کۆمەڵکوژی کلتووری کە بەدرێژایی مێژووی کۆمار لەلایەن هەمان زهنیەتی پیلانگێڕ و نکوڵیکار سەپێنران ئەو ستاتۆیە مایەپووچ ناکات کە بەو ئەندازەی ئارەزوومەندانەیە بەهایەکی مێژوویی بەرچاویشی هەیە و لە یەکەمین دەستوور (١٩٢١)دا دەستنیشانکراوە.

ئەو ڕاستینەیە بۆ ژیانی کۆمەڵایەتی ئەو کوردانەش لەجێگای خۆیدایە کە لە ناوچەکانی دیکەی کوردستاندا دەژین. کوردان لەلایەن هیچ دەوڵەتێکەوە فەتح نەکراون. هیچ ستاتۆیەکی فەتح، داگیرکاری و لکاندنیان لە ئارادا نییە. واتە ستاتۆیان لە بواری سیاسی و یاسایی لەسەر بنەمای هاوبەشێتی ئارەزوومەندانە بووە. هەم لە بواری زهنیەتی مێژوویی هەمیش کلتووره کۆمەڵایەتیەکەیان ژیاندنی نەریتێکی بەمجۆرەیان بەبنەما گرتووە ـ هەرچەندە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەوە باجێکی زۆر

قورسیان لێبسەنن ــ بوونی ئەو نەریتە تا ئێستاش بەردەوامە. پێویستە دەوڵەت ــ نەتەوە پەیوەندیدارەکان زۆر بە چاکی دەرک بەو راستییە بکەن و واز لەسەپاندنی سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن بێنن، لەگەڵ مێژوو و کۆمەڵگا ئاشت ببنەوە و بەها بە حەقیقەت بدەن. لە دۆخێکی پێچەوانەدا هەروەک چۆن لە زووەوە روون بۆتەوە تەنیا بە بەڕێوەچوونێکی سەقەت ناوەستێت، هەروەک هەر دەوڵەت ــ نەتەوەیەکی فاشیست رووچاری هاتووە، ئەوا لەهەمان ئەو سیاسەتەی نکوڵی و قڕکردندا مەرگەساتی خۆشیان دەبینن.

لەئاکامی تێگەیشتنی ئەو راستینە مێژوویی و کۆمەڵایەتییە و دەرکپێکردنی ئەو راستینەیەی کە دەوڵەت ــ نەتەوە تەڵەیەکی سەرمایەدارییە، KCK وەک سیستەمی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەی گەل لەلایەنPKK ەوە راگەیەنرا. بەرامبەر دەوڵەت ــ نەتەوە KCK دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد نییە. لە بواری پرەنسیپەوە ئەمە رەتدەکاتەوە. ئەگەر لەژێر چەتری دەوڵەت ـ نەتەوە بێت (ئەگەر پابەندبوون بە دیموکراسی پەسەند بکات) یاخود بەشێوەیەکی سەربەخۆ بێت بەڕێوەبەرایەتی خۆسەری دیموکراتیانە ئەو دەستڕۆییە سیاسییە کە گەلی کورد پەسەندی دەکات. KCKش پشکێکی ئەو مۆدێلەیە کە بەر کوردان کەوتووە. مانای دیموکراتیبوونی کۆمەڵگا دەبەخشێت. بە سیفەتی سیستەمیش مانای ئاواکردنی دەسەڵاتی سیاسی هاوبەش و ئارەزوومەندانەی خۆیان دەبەخشێت، بەبێ ئەوەی بکەونە ناو شۆڤێنیزمی میللی، شەڕی سنوور، بیرۆکراسی، ناسیۆنالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوەوە. تەنیا بەو مەرجەی دان بە خۆبەڕێوەبەرایەتییەکانی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەدا بنێت ژیان لەژێر چەتری دەوڵەت ــ نەتەوەکان پەسەند دەکەن. ئەو شێوازەی ژیان مانای رێکخستنی دەوڵەتەکان لەسەر بنەمای فیدراڵی و کۆنفیدراڵی نابەخشێت. لەسەر ئەو بنەمایە رێککەوتنی دەستووری لەگەڵ دەوڵەتەکان جێگای باس نییە. بەڵکو لەسەر بنەمای داننان بە خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەی کۆمەڵگا "رێککەوتنی دەستووری دیموکراتیانە" ئەنجامدەدات. جیاوازی ریشەیی لەنێوان هەردووکیاندا هەیە.

وەک پێکهاتەیەکی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە نموونەییترین ژیانی هاوبەش، یەکسان و ئازادە لەناو دەوڵەتەکانی تورکیا، ئێران، ئێراق، سوریا هەروەها بەرامبەر بە دەوڵەتی فیدراڵی کوردی ئێراقیش. وەک چۆن راستینەی کۆمەڵگای مێژووییش سەلماندوویەتی ئەویش لەو بڕوایەدایە کە تەنیا لەسەر بنەمای خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە دەشێت لەمیانەی ئاشتی و رێبازەکانی سیاسەتی دیموکراتیانە تەواوی کێشەکانی لەگەڵ ئەو دەوڵەتانە چارەسەر بکرێت. لەناو هوشیاری، بڕیارداری و ئامادەکارییەکانی ئەوە دایە، ئەگەر دەوڵەت ــ نەتەوەکان ئەو راستیانە و رێگەچارەی دەستووری ـ دیموکراتیانە پەسەند نەکەن، ئەو هێز و بڕیارەی هەیە وەک هێزێکی سیاسی خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیانە بژیت و بەرگری لەخۆی بکات.

## ٤ . ئافراندنی ئاشتی، ڕێگەچارەی دیموکراتیانە و ئاواکردنی نەتەوەی دیموکرات

لەمیانەی شیکارێکی بەرفراوانی دەوڵەت ـ نەتەوەوە PKKهەوڵی دەربازکردنی ئەو بنبەستبوونەی دا کە سەبارەت بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد دووچاری هاتبوو. کاریگەری دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیستی لەسەر پێکهاتەی سیاسی و ئایدیۆلۆژی PKK زیاتر لە هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤ بینرا کە شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی تێدا بەرزبوویەوە. بەبێ شیکارکردنی ئەو کاریگەرییەی لەزیادبووندا بوو پێشکەوتن زەحمەت بوو. هەڵوەشانەوە خێراکەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لە ١٩٩٠کان ڕۆڵی لە باشتر تێگەیشتنی کاریگەری ڕیشەیی تەنگژەکە هەبوو. ئەوەی سۆسیالیستی بونیادنراوی هەڵوەشاندەوە کێشەکانی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوەی سۆسیالیستی بونیادنراو بوو. بە مانایەکی دیکە هۆیەکەی بۆ چارەسەرنەکردنی کێشەی دەسەڵات و دەوڵەت لەلایەن سۆسیالیزم دەگەڕایەوە. ئەو کێشەیە کاریگەری لەسەر ئەو تەنگژەیەی سۆسیالیزم هەبوو کە لەتەواوی جیهان لەئارادا بوو. ناکۆکی دەوڵەت و دەسەڵات کە کێشەی کورد دووچاری هاتبوو کاتێک لەگەڵ ئەو تەنگژە جیهانییەی سۆسیالیزمی بونیادنراو بوو بە یەک، شیکارێکی ڕیشەیی بۆ بابەتەکانی دەوڵەت و دەسەڵات بوو بە ناچارییەک.

هەر بەو ئامانجەش لە بەشێکی گرنگی بەرگرینامەکەم هەوڵمداوە بە درێژایی مێژووی شارستانی دیاردەی دەسەڵات و دەوڵەت شیکار بکەم. گرنگترین قاڵبوونەوەشم سەبارەت بەو وەرچەرخانە پیشاندا کە لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەدیاردەی دەوڵەت و دەسەڵات هاتوونەتەئاراوە. بەتایبەتیش ئەو خاڵەم خستەڕوو کە وەرچەرخانی دەسەڵات بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە بناغەی سەرمایەدارییە. ئەوەش تێزێکی گرنگ بوو. هەوڵمدا ئەو خاڵە شیکار بکەم: ئەگەر ڕێکخستنی سەرمایەداری بەشێوەی مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاوا نەکرێت ئەوا سەرمایەداری نابێت بە سیستەمێکی هەژموونگەرا. دەوڵەت ــ نەتەوە سەرەکیترین ئامرازە کە هەژموونگەرایی سەرمایەداری دەئافرێنێت. لەو سۆنگەیەوە هەوڵمدا بیسەلمێنم کە ئەو سۆسیالیزمەی خۆی بەشێوەی کۆمەڵگای ــ مێژوویی پێشکەشدەکات و بەو سیفەتەی ئانتی سەرمایەدارییە ناتوانێت پشت بە هەمان مۆدێلی دەوڵەت ببەستێت، واتە ناتوانێت خۆی بەشێوەی دەوڵەت ــ نەتەوەی سۆسیالیستانە بونیاد بنێت. هەروەها هەوڵمدا ئەو هەڵە سیستەماتیکەی سۆسیالیزمی زانستی بخەمە ڕوو کە دەڵێن؛ سۆسیالیزمی زادەی مارکس و ئەنگلس تەنیا دەشێت لە سەر بنەمای دەوڵەت ـ نەتەوە بونیاد بنرێت. ئەو تێزەم پێشکەشکرد کە لەمیانەی پشتبەستن بە دەوڵەت، بەتایبەتیش دەوڵەت – نەتەوە، سۆسیالیزم بونیاد نانرێت، سووربوون لەسەر ئەوەش هەروەک لەچەندین نموونە بینرا، لەسەرووی هەمووشیانەوە سۆسیالیزمی بونیادنراوی ڕووسیا و چین، بەخراپترین شێوەی سەرمایەداری ئەنجامگیر دەبێت. وەک پێویستییەکی ئەو تێزە هەوڵمدا شیکارێکی بەرفراوانی سیستەمی شارستانی ناوەندی

درێژایی مێژوو، دەستەواژەی دەسەڵات و شێوەی دەوڵەت و دەسەڵاتی مۆدێرنیتەی زاڵی ئەو سەردەمەمان پێشبخەین. سەرەکیترین ئەنجامی بەدەستم هێنا: پێویستە سۆسیالیستەکان پرەنسیپێکی بە ناوی دەوڵەت ـ نەتەوەیان نەبێت، نەتەوەی دیموکرات سەرەکیترین پرەنسیپی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانییە. ئەزموونی KCKش گوزارشتە بەرجەستەکەیەتی.

دووەمین راستکردنەوەی گرنگی PKK سەبارەت بە دەسەڵات دەرهەق بە بابەتێکی بەرجەستەترە. زۆر بە باشی دەرکی پێکراوە کاتێک پەیوەندییەکانی نێوان تورک ـ کورد لە چوارچێوەی قەوم و دەوڵەت تاوتوێ دەکرێت، رایەڵە ژیۆپۆلیتیک و ژیۆستراتیژیەکانی ئەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا رەچاو نەکرێت گەیشتن بەشیکاری راست جێگای باس نابێت. بەدرێژایی مێژوو ئاڵوگۆڕی کلتووری بەردەوام لەنێوان ئەو جوگرافیانەدا هەبووە کە هەردوو کۆمەڵگا بەچڕی تێیدا ژیاون و بەدرێژایی مێژووش هەڵوێستی ژیۆپۆلیتیکی و ژیۆستراتیژی دیار کردووە. ئەو پەیوەندییانەی هەنووکە و ئێستاش دەستنیشان دەکەن تەنیا لەمیانەی هەڵوێستێکی یەکپارچەدا شیکارێکی راستی بۆ دەکرێت. چینی سەرووی پلەداری کورد کە زیاتر رووبەڕووی کێشەکانی دەسەڵات و دەوڵەت بۆتەوە، لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمییەکی رێژەیی بە درێژایی مێژوو چارەنووسی خۆیان بەو دەوڵەت و دەسەڵاتانە بەستۆتەوە کە لەخۆیان بەهێزتر بوون. هێندە لەپێناو سیستەمی دەوڵەت و دەسەڵاتی سەربەخۆیی تایبەت بە کۆمەڵگای کورد هەوڵیان نەداوە. بەهۆی هەلومەرجە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکان هەوڵێکی بەمجۆرە بەگوێرەی بەرژەوندییەکانیان نەهاتۆتەوە. مێژووی هەزار ساڵەی رابردووی لەگەڵ تورکەکانیشی لەسەر ئەو بنەمایە هەڵسەنگاندووە. لەمیانەی شەڕی مەلازگردەوە کە بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە بەیەکەوە لەگەڵ ئەڵپ ئەرسەلانی سوڵتانی سەلجوقی بەسەرکەوتن گەیشتن لە جوگرافیای میزۆپۆتامیا و ئەنادۆڵ لەسەر بنەمایەکی ئیسلامی هاوبەشێتی دەسەڵات و دەوڵەتێکی نوێیان کردووە. واقیعە ژیۆپۆلیتیک و ژیۆستراتیژییەکەی سەرچاوەی خۆی لەهەردوو جوگرافیا وەردەگرت، هاوبەشێتی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی نێوان چینی دەسەڵاتداری هەردوو قەومی کردووە بە ناچارییەک. هەرچەندە بەرژەوەندی گەلان لەو هاوبەشێتییەی دەوڵەت و دەسەڵات جێگای باس نەبێت، ناوە بەناوە لەمیانەی بەرخودانەوە رووبەڕووی ژیانی ژێر چەتری دەوڵەت و دەسەڵاتی هاوبەش ببنەوە، بەڵام بەهۆی پێویستییەکانی ژیانی هاوبەش و شەڕە ئایینی و مەزهەبییەکانی ئەو قۆناغە لە بەیەکەوە ژیان دوودڵییان نەکردووە. ئەو هاوبەشێتییەی چینی سەرووی کوردان لەگەڵ چینی دەسەڵاتداری پلەداری قەومی تورک لەئارادا بووە بەردەوام لەسەر بنەمایەکی ئارەزوومەندانە بووە. دیاردەیەک بەناوی فەتحی کوردستان لەنەریتی فەتحی تورکەکان جێگای باس نییە. ئەو پەلامارانەی فەتحیش کە ناوە بە ناوە ئەنجامدراون بە کۆمەکی سەرکردە کوردەکان ئەنجامدراون. لەو سۆنگەیەوە ئەوجۆرە پەلامارانەش بە فەتح ناونابرێن.

لەرۆژگاری ئەمڕۆماندا لەپێناو چارەسەرکردنی کێشەی کورد پێویستە لە قووڵاییدا دەرک بەو راستینە مێژووییەی پەیوەندی کورد ـ تورک بکرێت. لە سیاسەتەکانی کرانەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی سەردەمی سوڵتان سەلیم بەرەو خۆرهەڵات (١٥١٢ ـ ١٥٢١)، ئاواکردنی فیرقەکانی حەمیدییەی سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید (١٨٧٦ ـ ١٩٠٩)، بەشداری ئەمری واقیعی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی لە یەکەمین جەنگی جیهانی و بەردەوامیەکەی، گرنگترینیشیان لەشەڕی رزگاری نیشتیمانی مۆدێرندا کە بەسەرکردایەتی مستەفا کەمال ئەنجامدرا پشتێنەی سەرەکی ئەو پەیوەندییە مێژووییەن، ئەو راستینە هەم بە بنەما وەرگیراوە هەمیش رۆڵی دیاریکەری لەئەنجامدا بینیوە. لەمیانەی پیلانگێڕی ١٥ی شوباتی ١٩٢٥ کە لە چوارچێوەی نکوڵیکردن لە بناغە دیموکراتییەکەی کۆمار پێشخرا، بۆ یەکەمین جار هەوڵدراوە کۆتایی بەو نوێنەرایەتییە ئارەزوومەندانە و هاوبەشێتییەی دەوڵەت و دەسەڵاتە مێژوویی و جوگرافییە بێنێت. لێکدانەوەکانی جیاکردنەوەی کۆمار لەسەر بنەمای ئەتنیکی و کۆنترۆڵکردنی دەڤەری پەترۆڵ موسڵ ـ کەرکوک (کوردستانی ئێراق) رۆڵی یەکلاکەرەوەی لەو پیلانگێڕییەدا بینی کە لەلایەن ئیمپراتوریەتی ئینگلیزی هێزی هەژموونگەرایی ئەو قۆناغە پێشخراو لە بەشە پەیوەندیدارەکانیش بە درێژیی باسمان کردووە. هەروەک تەواوی جیهان پرۆژەی بچووکترین کۆمار یاخود دەوڵەت ـ نەتەوە کە لەلایەن ئینگلتەراوە پێشخراوە لە جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین، ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیاش سەرکەوتوو بوو. سەرجەم کلتوور، گەلان بگرە دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە هەم لەبواری کۆمەڵایەتی، هەمیش لەبواری دەوڵەت پارچە و دابەشکراون لەئاکامی ئەو سیاسەتە هێزیان لەدەستداوە، بەردەوام پارچەبوون و لەناو خۆیاندا دووچاری شەڕ و پێکدادان هاتوون، لەو سۆنگەیەوە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە پەرە بە هەژموونگەرایی ئینگلیز دراوە.

گۆڕینی کارەکتەری کۆمار بۆ ئانتی ـ کوردێتی رێککەوتنە نەریتییەکەی تێکداوە، کوردان بەتەواوی لەناو سیستەم بە دەرنراون. ئەو پرۆژە یان پرۆسەیەی پێشکەش بە چینی دەسەڵاتدار یان سەردەستی کورد کراوە پشت بەو پرەنسیپە سەرەکییە دەبەستێت کە: لەبەرامبەر وازهێنان لە کوردایەتی و ناسنامەی کورد لەسەر بنەمای تاک ـ هاوڵاتی تورکێتییەوە دەتوانن بوونی خۆیان بپارێزن. بگرە لەوەش زیاتر دەڕۆن، وەک رێگایەکی بەدەستهێنانی هێز و بەرزبوونەوە لەناو سیستەمدا داکۆکی لەسەر نکوڵی و قڕکردنی کوردان و شکۆدارکردن و پەرەپێدانی تورکێتی سپی دەکەنەوە. بەمجۆرە "یاسای سوور" یان هێڵی سووری بوون بە خاوەنی کەینونە لەناو کۆمار فۆرمیلە دەکرێت. ئەو هەڵوێستەی چینی سەروو سەرەتا بەشێوەیەکی رێژەیی لەمیانەی ناڕەزایی و یاخیبوونەوە پیشانیدا، دوای بزاوتە توندەکانی تەمبێکردن و نکوڵیلێکردن "تەئدیب و تەنکیل"ی سیستەم بۆ ملکەچییەکی ماڵیکراو دەگۆڕێت. بۆ یەکەمین جارە لە مێژووی کۆمەڵگای کوردەواریدا چینی دەسەڵاتدار لەبەرامبەر پەسەندکردنی نکوڵی و قڕکردنی کۆمەڵگای خۆی بوون و ژیانی خۆی دەخاتە گەرەنتیەوە. ئیتر لە بوون و پەرەسەندنی

خۆیـان قـەرزباری خزمـەتکردنی تـورکێتی سـپین (بـە سـووربوونەوە ئـەو دەسـتەواژەیە بەکاردێنم، چونکە توێژێکن لە تورکێتی نەریتی و کۆمەڵایەتی جیاوازن، لەمیانەی ڕێبازی پیلانگێڕی هەژموونگـەرایی خۆرئـاواوە دەستنیشـانکراون، تـوێژێکی سیخوڕن لـە بـواری سۆبژەکتیف و ئۆبژەکتیـف ئامـادەکراون. بـووە بـە ناسیۆنالیستە تورکـە تونڕەوەکـانی لێویاتان و تادوایی بەتوندوتیژی بارکراوە)، بە ئەندازەی خزمەتکردنیانـدەتوانن بـوونی خۆیان بپـارێزن و پـەرەی پێبـدەن. توێژەکـانی دیکـەی گـەلیش کـە بـێ سـەرۆک و ڕێـزان ماونەتەوە ئیتر لەدۆخی ئۆبژە و شتومەک دان. بەرووی هەموو جۆرە نکوڵی، قڕکـردن و ئاسیمیلاسیۆنێکدا کـراون. تۆزقاڵێـک نزیکبوونـەوە یـاخود گەیشـتن بـە کـوردێتی مانـای مردنە. دەستبەردان لە کوردێتی ئیتر تاکە ڕێگای ڕزگـاربوون و ژیانـە. نـەک تـەنیا وەکو دیاردە، بەڵکو بەسـەرجەم نـاو و ڕەمزەکانییـەوە هـەوڵی لـەناوبردنی کـوردێتی دەدرێـت. تـەواوی مێـژووی کۆمـار وەک پڕۆژەیـەکی شـاراوەی کۆمـەڵکوژی کلتـووری سـەبارەت بـە کوردێتی (بۆ کلتوورەکانی دیکەش جێگای باسە، بەڵام لەبنەڕەتدا پڕۆژەکـە دژی کـوردێتی پێشخراوە) ڕۆژ بە ڕۆژ هەنگاو بە هەنگاو جێبەجێ دەکرێت. ئامـانجی سـەرەکی سـەرجەم سیاسـەتە نـاوخۆیی و دەرەکیـەکان وابەسـتەبوون بـەو یاسـا یـان هێڵـە سـوورە و خزمەتکردنیەتی. لەبەر ئەوەی تاڕادەیەکی زۆر بەنهێنی پێشدەخرێت و جێبەجێ دەکرێت، ئەو پـارت، ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگـەی مـەدەنی، دونیـای ئـابووری و سیاسـەت کـە بـەبێ ئاگاداربوونمـان لـەو سیاسـەتانە ئاوایاندەکـەین و پێشـیان دەخـەین، کەوتوونەتـە چوارچێوەی تـەوەرەی "یاسـای سوور"ەوە. ڕێکخـراوە دەرەکییـەکانی هاوشێوەی UN، NATOو یـەکێتی ئـەوروپاش لەسـەر بنـەمای خزمـەتکردنی هـەمان "یاسـای سوور یـان پـۆڵایین" تـاوتوێکراون. پشـکی ئـەو یاسـایە لەسـەرجەم کودەتـا، پـیلان، تیـرۆر، هەلومەرجێکی ئەشکەنجە و دەستگیرکردن دیاریکەرە.

أ) لەسەردەمی دەرکەوتنی PKKئاگاداری و زانیاری سەبارەت بەو ڕاستیانە سنووردار بـوو. بـە پێـی پێویسـت دەرک بـە یەکپارچـەیی نێـوان ئـەنادۆڵ و میزۆبۆتامیـا، یـەکێتی ژیۆپۆلیتیـک و ژیۆسـتراتیژیک و ڕەنگدانـەوەیان لەسـەر پەیوەنـدی کـورد ــ تورکـەوە نـەکرابوو. سیاسـەتەکانی بچـووکترین دەوڵـەت ــ نەتـەوە کـە هێـزە هەژموونگـەراکانی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ئینگلتـەرا و ئـەمریکا پـەیڕەوی دەکـەن وەک چـۆن کاریگـەری لەسەر سەرجەم زانستە کۆمەڵایەتییەکان کردووە، کاریگەری کردۆتـە سـەر سۆسیالیزمی زانستیش. پشکی PKKش دەوڵـەت ـنەتەوەی سۆسیالیسـتی خـۆی بـوو. ئـەو دەوڵـەت ــ نەتەوەیەی لەمیانەی ڕەخنەدانێکی ڕیشەییەوە دەربازکراوە لادانێک بوو. لەبەر ئەوەی لە بزووتنـەوە چـەپڕەوەکانی جیهـان و تورکیـا ئـەو لادانـە بـەلاوە نـەنرا هەڵوەشـانەوە دەستلێبەرنەدراو بوو. هۆکاری سەرەکی ئەو تەنگژەیەی ئێستاش سۆسیالیزم بە دەستیەوە دەناڵێنێت ئەو بنبەستبوونەیە کە لەو بارەیەوە دووچاری هاتووە.

ب) دوای ئەو وەرچەرخانەی بەخۆیەوە بینی ئەو مۆدێلە نوێیەی PKKلەسەر بنەمای کێشەی کورد بۆ کێشە نەتەوەییەکانی هێناوە نەتەوەی دیموکراتە کە لەهەر جۆرە دەوڵەت

ـ نەتەوەیەک داماڵراوە و پاککراوەتەوە. شێوازی بونیادنانی نەتەوەکان لە سەرمایەداریدا ناچارە خزمەت بەپاسای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج بکات. ڕێگاکەشی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە ئایینە نوێیەکەی مۆدێرنیتە واتە ناسیۆنالیزم کردوویەتی بەئامانجی خۆی. میللیگەرایی (ناسیۆنالیزم) دەوڵەت ـ نەتەوە دەئافرێنێت، دەوڵەت ـ نەتەوەش ناسیۆنالیزم دەئافرێنێت. لەسەردەمەکانی قووڵبوونەوەی تەنگژەکانی سەرمایەداری ناسیۆنالیزم و دەوڵەت ـ نەتەوە دەبن بە فاشیست. تەنیا بەو ئەندازەیەی سۆسیالیزم ناسیۆنالیزمی دەوڵەت ـ نەتەوەکەی دەرباز بکات دەتوانێت خۆی بکات بە ئەلتەرناتیف و وەک سیستەمێک بەرەو پێشەوە بچێت. ڕێگای ئەوەش نەتەوەی دیموکرات و ئابووری بازاڕی کۆمەڵایەتی بێ قازانجە؛ پیشەسازی ئیکۆلۆژییە لەبەرامبەر ئیندوستریالیزمی (پیشەسازی) سەرمایەداری کە ئامانجی زۆرترین قازانجە.

ج) KCK گوزارشتی پێشنیازکردن و جێبەجێکردنی مۆدێلی چارەسەری نەتەوەی دیموکراتە کە سەبارەت بە کێشەی کورد لە دەوڵەت ـنەتەوە پاککراوەتەوە، نەک تەنیا بۆ کوردان بەڵکو بۆ سەرجەم جڤاتە نەتەوەییەکان گونجاوە و لەجێگای خۆیدایە. ڕێگەچارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەدرێژایی مێژووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەردەمەکانی کێشەی نەتەوەیی وەک تاکە ڕێگای چارەسەری سەپێنراوە و مێژووی کردووە بە دەریای خوێن. چارەسەری دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێگای چارەسەرکردنی کێشەکان نییە، بەڵکو ڕێگای قووڵکردنەوەی کێشەکان و توندوتیژی و برەوپێدانی شەڕە، لەو چوارچێوەیەدا ڕێگای بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج و ئیندوستریالیزم و هەمیشەییکردنیانە. ڕێگەچارەی KCK دەستبەرداری ئەو کۆڵەکە سێیانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (دەوڵەت ـ نەتەوە، زۆرترین قازانج و ئیندستریالیزم) بووە و لەبەرامبەریشدا فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی دەکات بە ئەلتەرناتیف.

د) چارەسەرکردنی کێشەی کورد لەمیانەی ڕێگەچارەی ئاشتی و دیموکراتیانە لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تورک، ئێران، ئێراق، سوریا و بگرە لەگەڵ دەوڵەتی فیدڕالی کوردیش تەنیا لەڕێگای پەسەندکردنی مافی نەتەوەیی دیموکراتی گەلی کورد و ستاتۆی خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانەوە بەدیدێت کە ئەنجامێکی سروشتی ئەو مافەیە. یەکێتی ئەورووپا کە نیشتیمانی ڕێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کاتێک لەئێستاوە بەدوای ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتدا دەگەڕێت، هەنگاوێکی ئەرێنی و هیوابەخشە؛ لەپێناو پێشخستنی ئەو ڕێگەچارەیەدا پێویستە هەنگاو بەهەنگاو گۆڕەپانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەرتەسک بکاتەوە و گۆڕەپانی کۆمەڵگەی مەدەنی بەرفراوانتر بکات. ئەگەر دەوڵەت ـنەتەوەکانی ئێران، ئێراق، تورکیا، سوریا دەیانەوێت لەکێشەی کورد ڕزگاریان ببێت، ئەوا وەک هەنگاوی یەکەم ناچارن بکەونە سەر ڕێگایەکی هاوشێوەی یەکێتی ئەورووپا. لەسەر ئەو بنەمایە دۆخی KCK بۆ ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە لەبار و گونجاوە. پرۆژە، سیاسەت و کردەوەکانی کۆمەڵکوژی کلتووری شاراوە کە ئەو دەوڵەتانە بەسەر کوردانیدا دەسەپێنن کۆسپی بەردەم ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیین. لەحاڵەتێکدا

دەستبەرداری ئەو داسەپاندنانە بن و شانبەشانی نەتەوەی دیموکرات ئابووری بازاڕی کۆمەڵایەتی سنووردارکردنی قازانج و پیشەسازی ئیکۆلۆژی فاکتەرە سەرەکیەکانی دیکەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پەسەند بکەن، لەناو سیستەمدا جێی بکەنەوە و بە پێگەیەکی (دەستووری دیموکراتیک)ی بگەیەنن، ئەوا ڕێگای ئاشتی هەمیشەیی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە دەکرێتەوە.

ڕ) ئەو ڕێگەچارەیەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانگیری لەچوارچێوەی پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن بەسەر دەوڵەت ـ نەتەوەکانی کۆمەڵکوژی کلتووریدا دەیسەپێنێت لە دوولایەنەوە هەوڵی پێشخستنی دەدرێت. لایەنی یەکەم؛ قەوارەی دەوڵەت ـ نەتەوەی فیدراڵی کوردە، کە ناوەندەکەی هەولێرە و وەک یەکەمین هەنگاوی ڕێگەچارەی دەوڵەت ـ نەتەوەی درێژخایەن جێبەجێ دەکرێت. لایەنی دووەم؛ ڕێگەچارەی کێشەی کوردە لەسەر بنەمای (مافە کەسی و کلتوورییەکان) کە ناوەندەکەی دیاربەکر (ئامەد)ـە. ئەو پرۆژەی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا کە بە تایبەتی لەمیانەی حکومەتی ئاکەپەوە هەوڵی جێبەجێکردنی دەدەن ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ هەوڵدەدرێت بە شێوەیەکی یەکپارچەیی و تەواوکەر لەگەڵ دەوڵەتی فیدراڵی کوردی هەولێر جێبەجێ و بەڕێوەببرێت. وەک باجێکی لەناوبردن و ڕزگاربوون لە ڕێگەچارەی دیموکراتیانە کە لە PKKوKCK دا بەرجەستەیە، ئەو دوو ڕێگایەی ڕزگاربوون بەسەر دەوڵەت ـ نەتەوەکانی کۆمەڵکوژی کلتووریدا دەسەپێنێت. لەبەر ئەوەی پشتگیری گەلی لەپشتەوە نییە، ئەو پرۆژەیەی هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهانگیری دەیسەپێنێت چانسی سەرکەوتنی نییە. هەر لەئێستاوە لەو ڕوانگەیەوە لەسەدەی بیست و یەکەمدا کوردستان بووە بە ناوەندی شۆڕش و دژە شۆڕش. لاوازترین ئەڵقەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکانی گەلی کوردستان بەڕادەیەک قورس بووە کە بە ڕەچەتە لیبراڵییەکان و دیماگۆژیەتی مافە کەسی و کلتوورییەکان پەردەپۆش ناکرێت. کاتێک کێشەی کورد جێگای باس بێت، ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەی ڕێگای لەپێش کردەوەگەلێک کردەوە کە بە ئاستی کۆمەڵکوژی کلتووری گەیشت، ئیتر سەبارەت بە نەتەوە دەسەڵاتدارەکان یاخود ژێردەستەکان بێت، چیتر کێشەکان چارەسەر ناکات، بەڵکو لەمێژە خۆی بووە بەسەرچاوەی کێشەکان. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی ئیتر بۆ مۆدێرنیتەی سەرمایەداریش بووە بەکێشە، تادەچێت زیاتر هەڵدەوەشێتەوە. پەرەسەندنەکانی نەتەوەی دیموکرات کە میانڕەوترە، لەسەرووی پێشکەوتنە چارەسەرئامێزەکانی سەردەمەکەمانەوە دێت. مۆدێرنیتەی دیموکراتیکیش مانای گوزارشتی تیۆری و هەنگاوە کردارییەکانی ئەوجۆرە پەرسەندنانە دەبەخشێت. KCK بەو سیفەتەی گوزارشتی بەرجەستەی وەرچەرخانە نەتەوەیی ـ دیموکراتیەکانی کوردستانە ڕێگای ڕێگەچارەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانەی خۆرهەڵاتی ناوین ڕۆشن دەکاتەوە.

ز) لەڕۆژی ئەمڕۆماندا ڕێگەچارەی KCK لەدەروازەی ڕێگایەک دایە، یان چارەسەرکردنی کێشەکان لەڕێگای ئاشتی و سیاسەتی دیموکراتیانە لەمیانەی ڕێگا و

ڕێبازی دەستووری دیموکراتیانە بەدیدێت؛ لەدۆخێکی وەهادا دەوڵەت ـ نەتەوە پەیوەندیدارەکان تەنیا بە دەستبەردان لە سیاسەتی نکوڵی و قڕکردن ناوەستن، بەڵکو پێناسە واقیعیەکەی کێشەکە پەسەند دەکەن و لە دەستووری گەردوونی دیموکراتیکدا بەدوای چارەسەریدا دەگەڕێن، لەگەڵ موخاتەبەکانیان ناوەڕۆک و ڕێبازی دەستووری دیموکراتیانە دادەنێن. ئەو ڕێگاچارەیەی یەکێتی و هەمووێتی دەوڵەت و نەتەوەی وڵاتەکان دەستەبەر دەکات، پێویستی بە وەرچەرخانی رادیکالی دیموکراتیانە هەیە. بەڵام ئەگەر ئەو ڕێگایە بە سووربوونەوە بەربەست بکرێت، ئەوا ڕێگای بونیادنان و پاراستنی ئۆتۆریتەی دیموکراتیانە دەمێنێتەوە کە KCKیەکلایەنە و بەشێوازێکی شۆڕشگێڕانە ئاوایدەکات. چەندین فاکتەری سەرکەوتنی ئەو ڕێگایەش لەئارا دایە. ڕێبەرنامە ئایدیۆلۆژی و سیاسییە خاوەن ئەزموونە سی ساڵیەکەیPKK، پشتگیرییە بەهێزەکەی گەل بۆ شەڕی شۆڕشگێڕی، هێزە سەربازییەکەی کە لەهەر شوێن و ناوچەیەک بێت توانای بەرگری خۆیی هەیە، تۆڕە بەرفراوانەکانی پەیوەندی لەناوەوە و دەرەوە دەرفەت بە KCKدەدات نەتەوەی دیموکرات ئاوا بکات، بەڕێوەی ببات و بەرگریشی لێبکات. ئەو ڕێگایە جارێکی دیکە دووچاری ئەو بنبەستبوونە نابێت کە جاران ڕوویدا بوو. لەبەرئەوەی لەجیاتی دەوڵەت ـنەتەوە ئامانجی نەتەوەی دیموکراتە، وەک چۆن بەردەوام لایەنگری ئاشتی و چارەسەرکردنە و بۆ دیالۆگ و دانوستاندن لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کراوەیە، ئەگەر لەو بوارەدا سەرکەوتوو نەبێت لەسەر ڕێگاکەی و بە هێزی خۆی درێژە بە بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات دەدات و دەزانێت چۆن بەڕێوەی ببات و بیپارێزێت.

### C. KCK و ڕەهەندەکانی نەتەوەبوونی دیموکراتیک

لەمافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکان سەبارەت بە کێشەی کورد KCK گوزارشت لە راقە دیموکراتییە نادەوڵەتیەکەی دەکات. پێویستە وەک گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانی هەڵبسەنگێنرێت. ئەو کێشە نەتەوەییانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕێگای لەپێش کردۆتەوە بەردەوام لەمیانەی دونیابینی و زهنیەتی میللیگەرایی و دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەوڵی چارەسەرکردنیان دراوە. خودی دەوڵەت ـ نەتەوە وەک سەرەکیترین فاکتەری چارەسەری پێشکەش کراوە. کە باسی کێشەی نەتەوەیی ـ نیشتیمانی دەکرێت یەکسەر بۆچوونی "ئێمەش ببینە خاوەنی دەوڵەت ـ نەتەوەیەک" بەبیری مرۆڤدا دێت. تەنانەت وایلێهاتووە دەوڵەت بۆ هەر ئەتنیک و قەومیەتێک پێشبینی بکرێت. ئینگلتەرا ئەو هەڵوێستەی پێشخست کە لەسەر ئاستی دونیا هەوڵی هەژموونگەرایی دەدا، خوازیار بوو کۆسپی دەوڵەتە گەورەکانی لەجۆری ئیمپراتۆریەت و دەوڵەتە بچووکەکانی لە جۆری دەوڵەتشار بەلاوە بنێت و سیاسەتی "پەرتکە ـ زاڵبە" بەڕێوە ببات. دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێکخستنی دەسەڵاتە لەسەر بنەمای سیستەمی سەرمایەداری؛ گونجاوترین ڕێکخستنی دەوڵەتە بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین

قازانج و ئیندوستریالیزم. لەپێناو تێگەیشتنێکی ڕاست بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەکان، پێویستە شیکارێکی ڕاست سەبارەت بە پێگەکەیان لەناو سیستەمی هەژموونگەرایی و پەیوەندییەکەیان بە سەرمایەداری و پیشەسازیگەرایی بکرێت. دەوڵەتێک بۆ هەر ئەتنیک یاخود مەزهەب و قەومێک واتای جیهانگیری سەرمایەدارییە، لەو سۆنگەیەوە؛ مانای کۆمەککردنی زیادکردنی چەوساندنەوە و وێرانکردنی ژینگەیە بۆ بەرزترین ئاست. بە سوربوونەوە داکۆکیمان لەسەر ئەو خاڵە کردووە کە لە بنەڕەتدا ئەو مەیلەی کۆمەک کردن بوو سۆسیالیزمی بونیادنراوی بەرەو هەڵوەشانەوە برد. هەروەها هەوڵی شیکارکردنی ئەو ڕاستیەشمان دا کە لەناوەڕۆکدا ئەو هەڵوێستە سەرچاوەی بنبەستبوونیPKK سەبارەت بەکێشەی نەتەوەیی پێکدێنێت، کە لەسەردەمی دەرکەوتنیدا سۆسیالیزمی بونیادنراوی بەبنەما گرتبوو. لەو بارەیەوە لەمیانەی ڕەخنەدانێکەوە PKKوەرچەرخانی ئەنجام دا. هێڵی سەرەکی وەرچەرخان سەبارەت بە کێشەی نەتەوەیی وازهێنان لە چارەسەری دەوڵەت ـ نەتەوە و وەک ئەلتەرناتیڤێک بە بنەماگرتنی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەیە. ڕێگەچارەی دیموکراتیانە لەدەرەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە گوزارشت لە دیموکراتیزەبوونی کۆمەڵگا دەکات. وەک دەستەواژە لەگەڵ سەرمایەداری دەوڵەت ـ نەتەوە وەک سەرچاوەی کێشەکان هەڵدەسەنگێندرێت نەک بۆ چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان.

بەستنەوەی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییەکان بە دەوڵەت ـ نەتەوەوە زۆردارترین لایەنی مۆدێرنیتە پێکدێنێت. چاوەڕوانیکردنی چارەسەری لەئامرازێک کە خۆی سەرچاوەی کێشەکانە ڕێگا لەپێش گەورەبوونی هەرەسئاسای کێشەکان و کائیوس دەکاتەوە. خودی سەرمایەداری قەیراناویترین قۆناغی سیستەمی شارستانییە. لەو قۆناغە قەیراناویەدا دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێکخستنی توندوتیژییە کە بە درێژایی مێژووی کۆمەڵگا پەرەی پێدراوە. گەمارۆدانی تەواوی کۆمەڵگایە لەلایەن توندوتیژی دەسەڵاتەوە؛ ئەو ئامرازەیە کە سەرمایەداری هەوڵدەدات لەڕێگەیەوە ئەو کۆمەڵگا و ژینگەیە کۆنترۆڵ بکات کە لەمیانەی ئیندوستریالیزم و زۆرترین قازانج هەڵیوەشاندوونەتەوە. ڕێکخستنێکی توندوتیژی لە چەشنی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبێت، یاساکانی کەڵەکەکردنی سەرمایە کارناکات، ئیندوستریالیزم بەردەوام نابێت. لەسەردەمی سەرمایەداری فینانسی جیهانگیری کە دوا قۆناغێتی کۆمەڵگا و ژینگە ڕووبەڕووی پەرتەوازەبوونێکی تەواو بوونەتەوە. ئەو تەنگژانەی سەرەتا کاتیی و خوولی بوون کارەکتەرێکی هەمیشەیی و بونیادییان بەدەستهێناوە. لەوەها دۆخێکدا خودی دەوڵەت ـ نەتەوەش بووە بە کۆسپێک کە بەتەواوی سیستەمی قوفڵ کردووە. تەنانەت سەرمایەداریش کە بۆ خۆی بونیادێکی قەیراناوییە ڕزگاربوون لە بەربەستی دەوڵەت ـ نەتەوەی خستۆتە سەرووی ڕۆژەڤی خۆیەوە. سەروەری دەوڵەت ـ نەتەوە تەنیا سەرچاوەی کێشە کۆمەڵایەتییەکان نییە، بەڵکو لەهەمانکاتدا سەرەکیترین کۆسپی بەردەم چارەسەریشە. سیستەمێک کە سەبارەت بە چینی سەرمایەداری باڵادەست بەمجۆرەیە،

کاتێک وەک ئامرازێکی چارەسەری دەرهەق بە کۆمەڵگا، گەلان و رەنجدەران ببینرێت، پێچەوانەی سروشتی کۆمەڵگایە، مانای نکوڵیکردنی سروشتی کۆمەڵگایە. هەم بەهۆی پێویستی سروشتی کۆمەڵگا، گەلان و رەنجدەران، هەم بەهۆی کۆسپی دەوڵەت ـ نەتەوەی سیستەمی هەژموونگەرایی لە چارەسەرکردنی گرنگترین بەشی کێشە کۆمەڵایەتییەکان واتە لەچارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی ـ نیشتیمانیەکاندا پێویستە مۆدێلی دیموکراتیک بە بنەما بگیرێت.

مۆدێلی رێگەچارەی دیموکراتیانە تەنیا بژارەیەکی چارەسەری نییە، بەڵکو رێبازی سەرەکی چارەسەرییە. ئەگەر سۆسیالیزم و بزاڤەکانی رزگاری نیشتیمانی خوازیاری بەدەستهێنانی سەرکەوتنن، پێویستە لەدەرەوەی دیموکراسی لەئامرازەکانی چارەسەری نەگەڕێن. هەرجۆرە مەیلێکی دیکتاتۆرییەت ئینجا ئەوە راستڕەو، چەپڕەو یان ناوەندی بێت تەنیا بێچارەیی قووڵدەکاتەوە؛ سەرمایەداری دەکات بە تالانکار، چڵێس و وەهمیتر. پێویستە مۆدێلی رێگەچارەی دیموکراتیانە وەک دۆخی وەرچەرخان یان گۆڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی بۆ شێوە فیدڕالی یاخود کۆنفیدڕالییەکان نەبینرێت. دۆخی فیدڕالی و کۆنفیدڕالی رێگەچارەی دیموکراتیانە نییە، ئەوانە رێگەچارەی شێوە جیاوازەکانی دەوڵەتە، هەربۆیەش جگە لە قورسکردن و خەستکردنەوەی کێشەکان رۆڵێکی دیکە نابینن. لەوانەیە گۆڕانی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی وشک بۆ شێوە فیدڕالی و کۆنفیدڕالیەکان لەناو لۆژیکی سیستەمی سەرمایەداریدا کێشەکان نەرم بکات و تارادەیەکیش چارەسەر بەدیبێنێت، بەڵام رێگا لەپێش چارەسەری ریشەیی ناکاتەوە. دەشێت شێوەکانی فیدڕالی و کۆنفیدڕالی وەک ئامرازەکانی چارەسەری نێوان هێزەکانی رێگەچارەی دیموکراتیانە و هێزەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە تاقی بکرێتەوە. بەڵام لەژێر ناوی بەکارهێنانی ئەو ئامرازانەوە چاوەڕوانیکردنی چارەسەرییەکی ریشەیی، جارێکی دیکە خۆخەڵەتاندنە. وەک ئاگادارین ئەو شێوە دەوڵەتەی بە دەوڵەتی رزگاری نیشتیمانی یاخود دەوڵەتی سۆسیالیستی بونیادنراو ناوی دەبەین ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە بە دەمامکی چەپ رووپۆشکراوە. ئاشکرا بووە کە ئەوانە سیستەمێکی لەبارن بۆ دیکتاتۆرییەت و فاشیزم.

پێویستە بە گرنگییەوە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت کە مۆدێلی رێگەچارەی دیموکراتیانە بەتەواوی لە دەوڵەت ـ نەتەوە سەربەخۆ نییە. وەک دوو دەستڕۆیی و دەسەڵات دەشێت دیموکراسی و دەوڵەت ـ نەتەوە لەژێر هەمان چەتری سیاسیدا رۆڵ ببینن. دەستووری دیموکراتیانە سنووری چالاکی هەردووکیان دەستنیشان دەکات. لەگەڵ ئەوەی هەندێک هەنگاو بەو ئاراستەیە دەهاوێژێت، وەلێ لایەنی زاڵیان بالادەستی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. بەڵام لەتەواوی دونیادا گوزەرکردن بە ئاراستەی دەربازکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. سەرەکیترین وەرچەرخانی دونیا پشت بە دەربازکردنی تیۆری و کرداری دەوڵەت ـ نەتەوە دەبەستێت. رێگەچارەی دیموکراتیانە تا چ رادەیەک بتوانێت خۆی بکات بە ئۆتۆنۆم و سیستەماتیک بەو ئەندازەیە دەتوانێت کۆمەک بە وەرچەرخانی سیاسی بکات. وەرچەرخانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەئاراستەی ئەرێنی لە نزیکەوە گرێدراوی پێشخستنی

دیموکراتیزەبوون، خۆبەڕێوەبردنی دیموکراتیانە، بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات، دیموکراسی خۆجێیی و کلتووری دیموکراسییە.

لەکێشەی کورددا KCK گوزارشتی بەرجەستەی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەیە. لەهەڵوێستە باو و نەریتییەکان جیاوازترە. چارەسەری لە وەرگرتنی پشک لە دەوڵەتدا نابینێت. تەنانەت بە مانای ئۆتۆنۆمیش بەدوای دەوڵەتدا نییە. وەک چۆن دەوڵەتی فیدراڵی و کۆنفیدراڵی ناکاتە ئامانجی خۆی، وەک چارەسەری خۆیشی نابینێت. سەرەکیترین داواکاری لە دەوڵەت، داننان بە مافی خۆبەڕێوەبردنی ئیرادەی ئازادی کوردان و بەربەستنەکردنی کۆمەڵگابوونی نەتەوەی دیموکراتە. ئەگەر دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان نەک بەزارەکی بەڵکو بەکردەوە گرێدراوی پرەنسیپی دیموکراسی بن، ئەوا پشتیوانیشی لێنەکەن پێویستە ڕێگری نەکەن و قەدەغەکاری لەپێش دانەنێن. دەوڵەت یاخود حکومەتەکان ڕێگەچارەی دیموکراتیانە پێشناخەن، بەڵکو هێزە کۆمەڵایەتییەکان لەبەرامبەر چارەسەری بەرپرسن. هێزە کۆمەڵایەتییەکان لەچوارچێوەی دەستووری دیموکراتیانە هەوڵی ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەت یاخود حکومەتەکان دەدەن. دابەشکردنی بەڕێوەبەرایەتی هێزە کۆمەڵایەتییە دیموکراسیخوازەکان و هێزەکانی دەوڵەت یاخود حکومەت لەڕێگای دەستوورەوە دەستنیشان دەکرێت. بە ئەندازەی بەڕێوەبەرایەتی ڕەهای دەوڵەت داواکردنی دیموکراسی ڕەهاش وەک چۆن واقیعی نییە، لەگەڵ ڕۆحی چارەسەریشدا ناکۆکە.

ڕێگەچارەی دیموکراتیانە لە ناوەڕۆکدا دیاردەی بوون بە نەتەوەی دیموکرات و خۆبونیادنانی کۆمەڵگایە بەشێوەی کۆمەڵگای نیشتیمانی ـ نەتەوەیی دیموکراتیک. نەتەوەبوون یان دەرکەوتن لە نەتەوەبوون نییە بەدەستی دەوڵەتەوە؛ بەڵکو بەکارهێنانی مافی خۆبونیادنانی کۆمەڵگایە وەک نەتەوەیەکی دیموکرات. لەرەوشێکی وەهادا پێویستە سەرلەنوێ پێناسەی نەتەوە بکرێتەوە. بەر لەهەموو شتێک پێویستە بڵێین نەتەوە تاکە پێناسەیەکی نییە. کاتێک بەدەستی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاوابکرێت ئەوا گشتیترین پێناسەی نەتەوە نەتەوەی ـ دەوڵەتە. ئەگەر ئابووری فاکتەری یەکگرتن بێت دەشێت ئەوە بە نەتەوەی ـ بازاڕیش ناوببرێت. ئەو نەتەوەش کە یاسا تێیدا سەروەرە نەتەوەی ـ یاسایە. دەشێت پێناسەی نەتەوەی سیاسی و کلتووریش جێگای باس بێت. ئەو کۆمەڵگایەی ئایین کۆیدەکاتەوە بە میللەت(ملة) ناودەبرێت. ئوممەتیش کۆی ئەو میللەتانەیە کە هەمان ئایین کۆیان دەکاتەوە. هەرچی نەتەوەی دیموکراتە ئەو کۆمەڵگا هاوبەشەیە کە تاک و جڤاتە ئازادەکان بە ئیرادەی خۆیان پێکیانهێناوە. هێزی یەکگرتن لە نەتەوەی دیموکراتدا ئیرادەی ئازادی جڤات و تاکەکانی ئەو کۆمەڵگایەیە کە بڕیاری ئەندامبوونی هەمان نەتەوە (ئوممە) یان داوە. ئەو چەمکەی نەتەوە بە زمان، کلتوور، بازاڕ و مێژووی هاوبەش دەبەستێتەوە نەتەوەی ـ دەوڵەت پێناسە دەکات و ناشێت بگشتێنرێت، واتە ناشێت وەک چەمکی یەک نەتەوە بگشتێنرێت و ڕەها بکرێت. ئەو چەمکەی نەتەوە کە سۆسیالیزمی بونیادنراویش پەسەندی کردبوو دژی نەتەوەی دیموکراتە. بەتایبەتی ئەو

پێناسەیەی ستالین سەبارەت بە رووسیای سۆڤێتی پێشیخست، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی هەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤێت. تا ئەو پێناسەیەی نەتەوە دەرباز نەکرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کردوویەتی بە رەها، ئەوا بنبەستبوونی تەواوەتی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی ـ نیشتیمانییەکان بەردەوام دەبێت. بەردەوامکردنی کێشە نەتەوەیی ـ نیشتیمانییە قورسەکان بەدرێژایی سێ سەدە لەنزیکەوە گرێدراوی ئەو پێناسە رەها و ناتەواوەیە.

ئەو جۆرە کۆمەڵگا نەتەوەییانەی مەحکومی سنوورە وشکەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کراون و دەسەڵاتیش بۆ ناو بچووکترین خانەکانی دزەی کردووە، لەمیانەی ئایدیۆلۆژیا میلیگەرا، ئایینگەرا، رەگەزگەرا و پۆزیتیڤیستەکانەوە بێهۆش بوون . مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە تەواو تەڵە و تۆڕێکی سەرکوتکردن و چەوساندنەوەی کۆمەڵگاکانە. دەستەواژەی نەتەوەی دیموکرات ئەو پێناسەیە پێچەوانە یان سەراوژێر دەکاتەوە. پێناسەی نەتەوەی دیموکرات کە گرێدراوی سنووری وشکی سیاسی، راڤەی یەک زمان، یەک کلتوور، یەک ئایین و یەک مێژوو نییە، بەڵکو گوزارشت لەژیانی هاوبەش و هاوکاری جڤات و هاوڵاتییە ئازاد و یەکسانەکان دەکات. تەنیا لەمیانەی مۆدێلێکی بەم چەشنەی نەتەوەوە کۆمەڵگای دیموکراتیک ئاوا دەکرێت. وەک پێویستییەکی سروشتەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەرامبەر دیموکراسی داخراوە، گوزارشت لە هیچ یەکێک لەراستییە خۆجێیی و گەردوونییەکان ناکات؛ بە پێچەوانەوە مانای نکوڵیکردنە لە خۆجێیی و جیهانی. هاوڵاتیتی کۆمەڵگای هۆمۆژەن و یەک چەشنکراو مردنی مرۆڤە. لەبەرامبەر ئەوەشدا نەتەوەی دیموکرات دەرفەتی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی خۆجێیی و جیهانی دەرەخسێنێت. دەرفەت بە خۆ گوزارشتکردنی راستینەی کۆمەڵایەتی دەدات. سەرجەم پێناسەکانی دیکەی نەتەوە لە نێوان ئەو دوو مۆدێلە سەرەکییەدا جێگیردەبن.

هەرچەندە مۆدێلەکانی ئاواکردنی نەتەوە پێناسەی بەرفراوانیان هەبێت، دەکرێت پێناسەیەکی گشتیش پێشبخرێت کە هەموویان دەکاتە یەک؛ ئەویش پێناسەی پەیوەست بە زهنیەت، هوشیاری و باوەڕی نەتەوەوەیە. لەو حاڵەتەدا نەتەوە جڤاتی ئەو مرۆڤانەیە کە خاوەنی دونیای زهنیەتی هاوبەشن. لەو پێناسەی نەتەوەدا زمان، ئایین، کلتوور، بازاڕ، مێژوو و سنوورە سیاسییەکان دیاریکەر نین، ئەوانە رۆڵێکی جەستەیی دەبینن. لەبنەڕەتدا پێناسەکردنی نەتەوە وەک دۆخێکی زهنیەت کارەکتەرێکی دینامیکی لەخۆوە دەگرێت. لەکاتێکدا لە نەتەوەی دەوڵەتدا میلیگەرایی (ناسیۆنالیزم) مۆرکی خۆی لە زهنیەتی هاوبەش دەدات، لە نەتەوەی دیموکراتدا هوشیاری ئازادی و هاوکارییە. بەڵام ئەگەر نەتەوەکان تەنیا لەمیانەی دۆخی زهنیەتیانەوە پێناسە بکرێن، ئەوا پێناسەیەکی ناتەواوە. وەک چۆن ناشێت زهنیەت بێ جەستە بێت، ناکرێ نەتەوەکانیش بێ جەستە بن. دامەزراوەی دەوڵەت جەستەی نەتەوەکانی خاوەن زهنیەتی میلیگەرایین. بەم هۆیەشەوە ئەو چەشنە نەتەوانە بە نەتەوە ـ دەوڵەت ناودەبرێن. کاتێک دامەزراوەکانی یاسا یاخود ئابووری لە پێش بن، بە ئامانجی جیاکردنەوەی ئەو نەتەوانە دەشێت بە

نەتەوەی یاسا یاخود بازاڕ ناوببرێن. خۆبەڕێوەبەرێتی (خۆسەری) دیموکراتیانە جەستەی ئەو نەتەوانەیە کە خاوەن زهنیەتی ئازادی و هاوکارین. لەبنەڕەتدا خۆسەری دیموکراتیانە مانای خۆبەڕێوەبردنی ئەو تاک و جڤاتانەیە کە خاوەن زهنیەتی هاوشێوە و ئیرادەی خۆیانن. دەشێت ئەوە بە ئۆتۆریتە (دەسترۆیی) یاخود بەڕێوەبەرێتی دیموکراتیک ناوبنرێت. پێناسەیەکە بۆ جیهانیبوون کراوەیە.

لەژێر رۆشنایی ئەو پێناسە گشتیانەی دەرهەق بە نەتەوە لە چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی - نیشتیمانی کورددا KCK هەڵوێستەکانی نەتەوە - دەوڵەت رەد دەکاتەوە و لەمیانەی خۆسەری دیموکراتییەوە ئاواکردنی مۆدێلی نەتەوەی دیموکرات، مافی نەتەوەبوونی کوردان یاخود وەرچەرخانی بۆ دیاردەی کۆمەڵگای نەتەوەیی - نیشتیمانی بەبنەما دەگرێت. لێرەدا پێناسەی نەتەوەیەکی یەک جەستە جێگای باسە کە لەگەڵ نەتەوەیەکی وەک تورک بۆ پێناسەی نەتەوەیەکی سەروو کراوەیە. دەشێت پێناسەی نەتەوەی سەروو بە شێوازێک فراوان بکرێت کە چەندین نەتەوە لەخۆوە بگرێت. دەشێت ئوممەتی ئیسلامی وەک نموونەی بەرایی ئەو پێناسەیە ببینرێت. ئەگەرێکی زۆر بەهێزە زوو بێت یان درەنگ کلتووورە کۆمەڵایەتییەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەناو نەتەوەیەکی هاوبەش (ئوممەتی نوژەن) ببن بە یەک.

لەچوارچێوەی ئەو دەستەواژە سەرەکییانەدا پێویستە نەتەوەبوونی کوردان بەر لەهەر شتێک لە دوو رەهەنددا بیری لێبکرێتەوە. یەکەمیان؛ رەهەندی زهنییە. باسی رەهەندەکانی ئەو بوونانە دەکەین کە بەبێ پشتگوێخستنی زمان، کلتوور، مێژوو، ئابووری و چڕبوونەوەی ژمارەی خۆیان، دۆخی هوشیاریی دەرهەق بەو بوارە سەرەکیانە لەمیانەی هەستی هاوکاری و هاوبەشی دەکەنە یەک و خاوەنی هەمان دونیای زهنین (دونیای زهنیەتی هاوبەش). پێوەری سەرەکی ئەو رەهەندەی هاوبەشێتی زهنی پرۆژە یان خەیاڵی دونیایەکی ئازاد و یەکسانی پشتبەستوو بە جیاوازییەکانە. دەشێت ئەو دونیایەی زهنیەت بە یۆتۆپیا یاخود دونیای کۆمیناڵی تاک و کەسە ئازادەکانیش ناو ببرێت. ئەوەی گرنگە ژیانداریکردنی هەمیشەیی زهنیەتێکی ئازادی و یەکسانییە لەبواری رای گشتی و دونیای سیاسی و ئەخلاقی کۆمەڵگادا کە جیاوازییەکان پەسەند بکات: بیست و چوار کاتژمێر ژیانکردنە لەگەڵ زهنیەتی دیموکراتیک. رەهەندی دووەم؛ ئەو جەستەیە کە دونیای زهنیەت پشتی خۆی پێدەدات. مەبەست لەجەستە سەرلەنوێ رێکخستنەوەی بوونی کۆمەڵایەتییە بەگوێرەی دونیای زهنیەتەوە. بەگوێرەی دونیای زهنیەتی ئەو نەتەوەی بە هاویەشی پشکداری لێدەکرێت چۆن کۆمەڵگا سەرلەنوێ رێکدەخرێتەوە؟ کامە بیناسازی سەبارەت بە بوونە جەستەییەکەی پەیڕەو دەکرێت؟ بە کورتی؛ سەرلەنوێ رێکخستنەوەی کۆمەڵگای سروشتی و ژینگە رەهەندی جەستەیی پێناسە دەکات کە لە رابردوو و نەریتەوە ماوەتەوە و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەشێوەیەکی نەخۆش، قەیراناوی، فشار و چەوساندنەوە (پێویستە ئەو کردەوانەشی بخرێتە سەر کە بە کۆمەڵکوژی کلتووری دەگات) بەگوێرەی ئامانجی خۆی رێکیخستووە یاخود ئاڵۆز و تێکەڵی کردووە.

لەبەر ئەوەی رەهەندی زهنی هەستی هاوکاری و دونیای خەیاڵ و هزری ئەو تاک و جڤاتانە پەیوەندیدار دەکات کە خوازیارن ببن بە نەتەوە، پێویستی بە رێکوپێککردنێکی سنووردار هەیە. لەو پێناوەشدا پێشخستنی پەروەردەی زانست، فەلسەفە و هونەر و کردنەوەی قوتابخانەکانیان لەسەرووی کار و خەباتە کردارییەکانەوە دێت؛ پەروەردەی زهنیەت و هەستی نەتەوەبوون ئەرکی ئەو قوتابخانەیە. بەو رادەیەی سەبارەت بەبوونی کۆمەڵگای ـ مێژووییە، دەرککردن بەو کلتوورە کۆمەڵایەتییەی پەیوەندی بەئێستا و سەردەم هەیە، پشکداریکردن یان هاوبەشیکردنی لایەنە راست، چاک و جوانەکانی لەمیانەی هەست و هزری هاوبەش مەرجە. بەکورتی سەرەکیترین ئەرکی زهنیەت لەدۆخی بەرجەستەی KCKدا لەدونیای هەست و هزری چاک، راست و جوانی کوردان سەبارەت بەبوونی خۆیان هاوبەشێتی دەکەن وێناکردنیانە بەشێوەی نەتەوەیەک. بەمانایەکی تر بەنەتەوەبوونی کوردان لەمیانەی شۆڕشی زانستی، فەلسەفی و هونەرییەوە، ئافراندنی دونیای هەست و هزری ئەو نەتەوەبوونەیە؛ هاوبەشێتی ئازادانەی روونکردنەوەی حەقیقەتی زانستی، فەلسەفی (ئایدیۆلۆژی) و هونەری راستینەی کوردە. رێگاکەشی: بیرکردنەوەی رەسەن و خۆ پەروەردەکردنە، هاوبەشێتیکردنی چاکە و ژیانکردنی جوانە. ئەو خاڵە سەرەکییەی لە رەهەندی زهنیەوە داوا لە دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان دەکرێت پابەندبوونی تەواویانە بە ئازادی رادەربڕینەوە. ئەگەر دەوڵەت ـ نەتەوەکان خوازیارن لەژێر پێوەری هاوبەش لەگەڵ کوردان بژین، پێویستە رێز لە کوردان بگرن تا بە ئیرادەی خۆیان و لەسەر بنەمای جیاوازیەکانیان دونیای هەست و هزریان ئاوا بکەن و بە کۆمەڵگایەکی نەتەوەیی ـ نیشتیمانی بگەیەنن، مسۆگەر ئازادی هزر و رادەربڕین بخەنە ژێر گەرەنتی دەستووریەوە و پابەندبوونی تەواوەتی خۆیان پیشانبدەن. رێگای ئاواکردنی نەتەوە (ألأمة) یەکی هاوبەش بە پابەندبوونی تەواو بە ئازادی فیکر و رادەربڕیندا تێپەڕ دەبێت.

دووەمین رەهەندی نەتەوەبوونی دیموکراتیک سەرلەنوێ رێکخستنەوەی بوونی ماددی (جەستەیی)یە. خۆسەری دیموکراتیانە بناغەی رەهەندی جەستەیی پێکدێنێت. دەشێت لەچوارچێوەی بەرتەسک و فراوانیشدا خۆسەری دیموکراتیانە پێناسە بکرێت. بەمانا بەرفراوانەکەی خۆسەری (خۆبەڕیوەبردنی) دیموکراتیانە گوزارشت لە نەتەوەی دیموکراتیک دەکات. نەتەوەی دیموکرات رەهەندگەلێکی هەیە کە بۆ چوارچێوەی بەرفراوان جیابۆتەوە. دەشێ لەمیانەی رەهەندەکانی کلتووری، ئابووری، کۆمەڵایەتی، یاسایی، دیبلۆماسی و...هتد بە فراوانی پێناسە بکرێت. بە مانا بەرتەسکەکەشی خۆسەری دیموکراتیانە گوزارشت لە رەهەندی سیاسی دەکات، بەجۆرێک لەجۆرەکان مانای دەستڕۆیی (ئۆتۆریتە) یاخود خۆبەڕێوەبەرێتی دیموکراتیک دەبەخشێت. رەهەندی خۆسەری دیموکراتیانەی نەتەوەبوونی دیموکراتیک لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان زۆر بە کێشەیە. دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان بە گشتی نکوڵی لە خۆسەری دیموکراتیانە دەکەن. ئەگەر ناچار نەبن نایانەوێت وەک مافێک دانی پێدا بنێن. پەسەندکردنی خۆسەری

دیموکراتیانە بناغەی ڕێککەوتنی کوردان لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان پێکدێنێت. خۆسەری دیموکراتیک کەمترین مەرجی ژیانی ژێر چەترێکی سیاسی هاوبەشە لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەتنیکی دەسەڵاتدار. چارەسەرکردنی کێشە وەک بژارێک بناغەی ئەو دۆخە پێکناهێنێت، بەڵکو قووڵبوونەوەی بێچارەیی و پێکدادان لەژێریدا شاراوەیە. پرۆژەی "مافە کلتووری و کەسییە لیبراڵەکان" کە لەو سەردەمانەی دواییدا بەئامانجی ئاسانتر بەڕێوەبردنی چینی کارکەر و کۆلۆنییەکانیان لەلایەن سەرمایەداری ئینگلیز پێشیانخست، لە کۆماری تورکیاش بەدەستی ئاکەپە هەوڵی جێبەجێکردنی دەدرێت. ئەو پرۆژەیەی بە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین نامۆیە تەنیا خزمەت بە گەورەکردن و برەوپێدانی شەڕ و پێکدادان دەکات. خۆسەری دیموکراتیک گونجاوترین پرۆژەی چارەسەرییە کە لەدژی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە نەبێت. هەر بۆچوون و ئەزموونێک لەوە کەمتر بێت، خزمەتکردنە بە هەلومەرجی پێکدادان و شەڕەوە.

ڕێگەچارەی خۆسەری دیموکراتیانە دەشێت لە دوو ڕێگاوە جێبەجێ بکرێت: ڕێگای یەکەم؛ ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان بەبنەما دەگرێت. گوزارشتی بەرجەستەی خۆیشی لەڕێگەچارەی دەستووریدا دەبینێتەوە. میراتی کۆمەڵایەتی ـ مێژوویی گەلان و کلتوورەکان ڕێزی لێدەگیرێت. خۆ گوزارشتکردنی ئەو میراتە و ئازادی ڕێکخستنیان بە مافێکی دەستووری سەرەکی و دەست لێبەرنەدراو دادەنێت. خۆسەری دیموکراتیک پرەنسیپی سەرەکی ئەو مافانەیە. سەرەکیترین مەرجەکانی ئەو پرەنسیپە: دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار دەستبەرداری هەرجۆرە سیاسەتێکی نکوڵی و قڕکردن بێت، نەتەوە ژێر دەستەکەش دەستبەرداری فیکری ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆی بێت، هەردوو نەتەوەش دەستبەرداری ئەو جۆرە مەیلە دەوڵەتگەراییانە نەبن، جێبەجێکردنی پرۆژەی خۆسەری دیموکراتیانە ئەستەمە. ئەو قۆناغەی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا دوای ئەزموونی سێ سەد ساڵەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانیان پێی گەیشتن خۆسەری دیموکراتییان وەک باشترین مۆدێلی چارەسەرکردنی کێشە ناوچەیی، نەتەوەیی و کەمینەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە پەسەند کردووە. سەرەکیترین ڕێگای چارەسەرکردنی کێشەی کوردیش بە پەسەندکردنی خۆسەری دیموکراتیکدا تێپەڕدەبێت کە پشت بە جوداخوازی و توندوتیژی نابەستێت، بە پرەنسیپ و مانادارە. سەرجەم ڕێگاکانی تر یان کێشەکان دوادەخەن و بەمجۆرەش بنبەستبوونەکە قووڵتردەکەنەوە، یانیش بەرەو شەڕی دژوار و جیابوونەوە دەچێت. مێژووی کێشە نەتەوەیی ـ نیشتیمانییەکان پڕ لەو چەشنە نموونانەیە. وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا کە نیشتیمانی شەڕی نەتەوەیی ـ ئەتنیکییە بەهۆی پەسەندکردنی خۆسەری دیموکراتیکەوە، پێشخستنی هەڵوێست و کرداری نەرم و خولقکارانە سەبارەت بەکێشە هەرێمی و نەتەوەیی و کەمایەتییەکان لە شەست ساڵی دواییدا توانیویانە لەناو ئاشتی، دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانیدا بژین. بەڵام لە کۆماری تورکیادا پێچەوانەکەی ڕوویداوە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لەمیانەی سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنی کوردان هەوڵی تەواوکردنی دراوە کۆماری بۆ ناو ڕژێمێک پەلکێش کردووە کە هەرەس، گرفتی زەبەلاح و

قەیرانی هەمیشەیی لەخۆوە دەگرێت و دە ساڵ جارێک کودەتای سەربازی بەخۆوە دەبینێت و ڕژێمێکی شەڕی تایبەتە کە لەلایەن گلادیۆوە بەڕێوە دەبرێت. تەنیا کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک دەستبەرداری ئەو جۆرە سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکی و کردەوانە بێت و خۆسەری دیموکراتیانەی سەرجەم کلتوورەکان ( کلتووری تورک و تورکمانێتی لە ناودا) لەسەرووی هەمووشیانەوە خۆسەری دیموکراتیانەی قەوارەی کلتووری کوردان پەسەند بکات، ئەوا وەک کۆمارێکی ئاسایی (یاسایی)، عەلمانی و دیموکراتیک دەتوانێت لەناو ئاشتی، دەوڵەمەندی و خۆشگوزەرانی هەمیشەییدا بژیت.

دووەمین ڕێگەچارەی خۆسەری دیموکراتیانە: پشت بەرێککەوتن لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان نابەستێت و یەکلایەنە پرۆژەی خۆی جێبەجێ دەکات. لەچوارچێوە بەرفراوانەکەیدا ڕەهەندەکانی خۆسەری دیموکراتیک جێبەجێ دەکات، مافی نەتەوەبوونی دیموکراتیانەی کوردان دەستەبەر دەکات، بێگومان شەڕ و پێکدادان لەگەڵ ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارانە خەست دەبێتەوە کە ڕێگای نەتەوەبوونی دیموکراتیانەی یەکلایەنە پەسەند ناکەن. لەدۆخێکی وەهادا لەبەرامبەر هێرشی یەکە یەکەی دەوڵەت ـ نەتەوەکان یان هێرشی هاوبەشیان جگە لەپێگەی "بەرخودان و سەفەربەری سەرتاسەری لەپێناو بەرگریکردن لە بوون و ژیانی ئازاد" هیچ چارەیەکی دیکەی نابێت. تا لەرێگای شەڕەوە ئەگەرێکی ڕێککەوتن یاخود سەربەخۆیی بەدەست دێت، ئەوا لەسەر بنەمای بەرگری خۆیی و هێزی خۆییان سەرجەم ڕەهەندەکانی نەتەوەی دیموکرات پێشدەخەن و لە جێبەجێکردنی دواناکەون.

دەشێت بەمجۆرە وردەکاری ڕەهەندەکانی ئەو نەتەوە دیموکراتە ریز بکرێن کە لەسەر بنەمای ئەو دوو ڕەهەندە ئاوا دەکرێن:

### ١ ـ تاک ـ هاونیشتیمانی ئازاد و ژیانی کۆمۆنەی دیموکراتیک لە نەتەوەی دیموکراتدا

کاتێک ڕەهەندەکانی ژیانی نەتەوەی دیموکرات دەستنیشان دەکەین بەو ئامانجەی تووشی هەڵەیەک نەبین، سەرەتا پێویستە ئاماژە بە ئاگادارییەک بکەین. ئەویش لەو بارەوەیە کە نەتەوەی دیموکرات یاخود ژیانی چەشنە نەتەوەیەکی دیکە بەردەوام یەکپارچەیی و هەمووێتی زهنی و دامەزراوەیی لەخۆوە دەگرێت. بەئامانجی ئاسانکاریکردنەوە بەگشتی کۆمەڵگاکان بەتایبەتیش لەشیکارکردنی کۆمەڵگاکانی نەتەوەی دیموکراتدا بۆ بوار و ڕەهەندی جۆراوجۆر جیادەکرێنەوە. بەڵام هیچ یەکێک لەو جیاوازییانە بەشێوەیەکی سەربەخۆ و دابڕاو لە هەمووێتی نایەتە ئاراوە. ئەگەر کۆمەڵگاکان بەتایبەتیش نەتەوە دیموکراتەکانی ئەو سەردەمەمان بە ئۆرگانیزمایەکی زیندوو بچوێنین، ئەوا سەرجەم بوار و ڕەهەندەکانی وەک هەمووێتییەکی ئۆرگانیزمای زیندووی وابەستە بەیەکتر دەژین. لەو سۆنگەیەوە؛ هەرچەندە یەکە یەکەی ڕەهەندەکانی

تاوتوێ بکرێن، بەڵام پێویستە لە بیر نەکەین کە هەر یەکە و بەشێکی گشتی و هەمووێتین.

بەڕادەی ئازادیەکەی تاک ـ هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکرات ناچارە کۆمینال بێت. تاکە ئازادە ساختەکەی تاکڕەوێتی سەرمایەداری کە دژی کۆمەڵگا هاندراوە، لەناوەڕۆکدا لەدۆخی پەرەپێدراوترین کۆیلایەتیدا دەژیت. بەڵام ئایدیۆلۆژیای لیبرال ئیماژێکی وەها پێکدێنێت وەک بڵێی؛ تاک لەناو کۆمەڵگا خاوەنی ئازادییەکی بێکۆتایە. بەڵام لەڕاستیدا ئەو تاکە کۆیلەی رەنجی بە کرێیە و بەجۆرێک مەیلی زۆرترین قازانج بەدەست دێنێت کە لەهیچ سەردەمێکی مێژوو بەدینەهاتووە و بۆ سیستەمێکی هەژموونگەرایی گۆڕیوە و نوێنەرایەتی پێشخراوترین شێوەی کۆیلایەتی دەکات. ئەو چەشنە تاکە لە پەروەردە و کردەوە بێ ئامانجەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بەرهەم دەهێنرێت. لەبەرئەوەی ژیانی بە سەروەری پارە (دراو) بەستراوەتەوە، سیستەمی کرێ وەک ئەو تەوقەی بە ملی سەگەوە کراوە دەیبەستێتەوە و بەو لایەدا ئاراستەی دەکەن کە خوازیارن، چونکە لەپێناو ژیاندا هیچ چارەیەکی دیکەی نییە. ئەگەر رابکات، واتە دەبێت بێکاری هەڵبژێرێت، ئەوەش بەجۆرێک لەجۆرەکان مانای گیان لەدەستدانە. هەروەها تاکڕەوێتی یان تاکخوازی سەرمایەداری لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی کۆمەڵگا شێوەی گرتووە. لەو بڕوایە دایە کە بەو رادەیەی نکوڵی لە هەر جۆرە نەریت و کلتوورێکی کۆمەڵگای مێژوویی بکات خۆی دەئافرێنێت. ئەوە گەورەترین شێواندن و چەواشەکاری ئایدیۆلۆژیای لیبرالیزمە. دروشمە سەرەکیەکەی "کۆمەڵگا نییە، تاک هەیە" یە. لە بنەڕەتدا لەسەر بنەمای لەناوبردنی کۆمەڵگا سەرمایەداری سیستەمێکی نەخۆشە.

لە بەرامبەر ئەوەشدا تاک یان کەسی نەتەوەی دیموکرات ئازادی خۆی لە کۆمۆنالیتەی کۆمەڵگا وەردەگرێت، واتە ئازادی خۆی لەژیانی جڤاتە بچووک و چالاکەکان وەردەگرێت. جڤات یاخود کۆمۆنی ئازاد و دیموکرات سەرەکیترین قوتابخانەیە کە تاکی نەتەوەی دیموکراتی تێدا دەئافرێنرێت یان بەرهەم دەهێندرێت. ئەوەی کۆمۆنی نەبێت، بە هەرەوەزی نەژیت وەک تاکەکەسیش نابێت. کۆمۆنەکان تادوا رادە هەمەڕەنگن و لەهەر بوارێکی ژیانی کۆمەڵگادا لەئارادان. بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ جیاوازییەکانیاندا تاک دەتوانێت لەچەندین کۆمۆن و جڤات بەردەوامی بە ژیانی خۆی بدات. کۆمۆن یان کۆمینەکان تادوا رادە هەمەڕەنگن و لەهەر بوارێکی ژیانی کۆمەڵگادا جێگای باسن. ئەوەی گرنگە تاک بتوانێت بەگوێرەی بەهرە، رەنج و جیاوازییەکان لەناو جڤاتی کۆمینال یان هەرەوەزدا بژیت. تاک بەرپرسیارێتی خۆی بەرامبەر ئەو کۆمۆن یاخود یەکینە کۆمەڵایەتییەی ئەندامێتی بەسەرەکیترین پرەنسیپی ئەخلاقیبوون دادەنێت. ئەخلاق مانای وابەستەبوون و رێزگرتنی جڤات و ژیانی هەرەوەزییە. کۆمۆن یاخود جڤاتیش تا دوایی خاوەنداریێتی لە تاکەکانی دەکات، دەیانپارێزێت و ژیانداریان دەکات. لەڕاستیدا سەرەکیترین پرەنسیپی دامەزراندنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی ئەو پرەنسیپەی بەرپرسیارێتی ئەخلاقییە. کارەکتەر یان خەسڵەتی کۆمۆن یاخود جڤاتەکان ئازادی جڤات دێنێتە ئاراوە،

بەمانایەکی تر کۆمۆن یاخود جڤاتی سیاسی دەئافرێنێت. ئەو کۆمۆن و جڤاتەی دیموکرات نەبێت سیاسی نەبێت. ئەو کۆمۆن یاخود جڤاتەی سیاسیش نەبێت ئازاد نابێت. هاوتابوون و یەکسانبوونێکی بەهێز لەنێوان دیموکراتبوون، ئازادی و سیاسیبوونی کۆمۆن یان جڤاتدا هەیە.

لەدۆخێکی وەهادا لەچوارچێوەی ئەو تاک و کۆمۆنەی بەبنەمای وەردەگرێت پێویستە بەمجۆرە پێناسەی یەکەمین رەهەندی نەتەوەی دیموکرات بکات. یەکەمین مەرجی بوون بە نەتەوەی دیموکرات ئازادبوونی تاکە لەسەر بنەمای سیاسەتی دیموکراتیانە؛ ئەو ئازادییە لەگەڵ کۆمۆن یاخود جڤاتەکەی بەدەست بێنێت. لەبەر ئەوەی تاک ـ هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکرات لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە لەژێر هەمان چەتری سیاسیدا دەژین پێناسەکەی فراوانتر دەبێت. لەو حاڵەتەدا بەو رادەیەی لەچوارچێوەی "هاونیشتیمانی دەستووری" تاک ـ هاوڵاتی نەتەوەی دیموکراتە، هی دەوڵەت ـ نەتەوەشە. ئەو خاڵەی لێرەدا گرنگ و بایەخدار دەبێت؛ داننانە بەپێگەی نەتەوەی دیموکرات، واتە خۆسەری دیموکراتیانە وەک ستاتۆیەکی یاسایی لە دەستووری نیشتیمانیدا دەستنیشان بکرێت. پێگەی نیشتیمانی ـ نەتەوەیی دیموکراتیک دوو لایەنەیە؛ یەکەمیان، لەناوەخۆیدا گوزارشت لە دەستەبەرکردنی ستاتۆ، یاسا یاخود دەستووری خۆسەری (خۆبەڕێوەبردنی) دیموکراتیک دەکات. دووەمیان، ستاتۆی خۆسەری وەک بەشێکی خوارووتری پێگەی دەستووری نیشتیمانی ڕێکبخرێت. لەزۆربەی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپا و بگرە جیهانیش ئەمجۆرە ڕێکخستنانەی ستاتۆ لە دەستوورەکانیاندا جێگای باسە.

لەگەڵ ئەوەی بونیادنانی یەکلایەنەی نەتەوەی دیموکرات لەسەر بنەمای یەکێتی تاک ـ هاوڵاتی ئازاد و کۆمۆن لەلایەن KCKوە سەرەکییە، دەشێت لەژێر ستاتۆی دەستووری نەتەوەی دیموکرات و پەسەندکردنی پێگەی خۆسەری دیموکراتیانەدا لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان بە چارەسەری بگات. بونیادی KCK پێکهاتەیەکی کراوەیە بۆ هەردوو ژیانی تاک ـ هاوڵاتی ئازاد و جڤات، گرێدانیان بە ستاتۆیەکی یاسایی و دەستووری.

دەشێت ئەندامێتی KCK وەک تاک ـ هاوڵاتی ئازادی نەتەوەی دیموکراتیش پێناسە بکرێت. بەڵام پێویستە ئەو ئەندامێتی و هاونیشتیمانییە لەگەڵ هاوڵاتێتی دەوڵەت ـ نەتەوە تێکەڵ نەکرێت. هاوڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە ستاتۆی کۆیلایەتی مۆدێرنی سەرمایەداری دەستنیشان دەکات. تاکڕەوێتی یان تاکخوازی سەرمایەداری گوزارشت لە کۆیلایەتی رەها بۆ خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە دەکات، هەرچی هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکراتە بەمانا راستەقینەکەی مانای تاکی ئازاد دەبەخشێت. دەشێت خودی هاونیشتیمانیبوونی نەتەوەی دیموکراتی کوردان لەژێر ستاتۆی KCK بەدیبێت. لەو سۆنگەیەوە؛ بەخشینی ناسنامەی هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکرات بە ئەندامێتی KCKپێناسەیەکی گونجاوتر دەبێت. هاونیشتیمانی بوونی کوردان لە نەتەوەی دیموکراتی خۆیان مافێکی دەست لێبەرنەدراوە و ئەرکیشیانە. هاونیشتیمانی نەبوون لە نەتەوەی

خۆت گوزارشت لە نامۆبوونێکی مەزن دەکات و ناشێت بەهیچ پاساوێک بەرگری لێبکرێت.
لێرە ئەو کێشەیەی ڕووبەڕوومان دەبێتەوە سەبارەت بە چارەنووسی هاولاتیتی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. لەڕاستیدا هەردوو جۆرە هاولاتیبوون دەشێت لەناو یەکتر نوێنەرایەتیان بکرێت. ئەگەر لە ولاتی پەیوەندیداردا کێشەی کورد لەژێر سناتۆی هاولاتێتی دەستووری دیموکراتیک چارەسەر بکرێت، ئەوا هەڵگرتنی ناسنامەی هەردوو هاولاتێتی لەگەڵ ڕاستینەی کۆمەلایەتی گونجاوترە. بگرە ئەگەر تورکیا ئەندامی یەکێتی ئەوروپا بووایە ئەوا دەرفەتی پێناسەی هاولاتی سێیانە جێگای باس بوو. وەک چۆن هاونیشتیمانی کاتالۆنیا ـ ئیسپانیا ـ یەکێتی ئەوروپا لە ئیسپانیا مانایەکی سێیانەی هەیە، ئەوا هاونیشتیمانی کوردستان ـ تورکیا ـ یەکێتی ئەوروپاش هەمان مانای دەبوو. لە سەردەمی KCKدا لەهەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی پەیوەندیدار پێویستە تاکی کورد لەچوارچێوەی دوو هاولاتی ـ هاونیشتیمانی گرنگی بە پێناسەکردنی خۆی بدات، لە گرنگیدان زیاتر ناسنامەی دوو هاولاتێتی بەدەست بێنێت. KCKش ناسنامەی دوو هاونیشتیمانێتی بۆ ئەندامانی نەتەوە دیموکراتەکەی بەدەست دێنێت؛ ئەگەر لەمیانەی ڕێککەوتن ئەوەیان بەدینەیەت، ئەوا پێویستە ناسنامەی هاونیشتیمانی یەکانە دەستەبەر بکات. لەو پێناوەشدا پێویستە دۆخی سەرکوت و فشاری دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەلاتدارەکان ڕەچاو بکات، ئەرکی خۆی لە بەدەستهێنانی ناسنامەی نووسراو و ئاڕمی گونجاو بۆ هەر تاکێک بەدەست بێنێت.

پێویستە هەر ئەندام ـ هاونیشتیمانێکی KCK ئەو تاکەی سەرمایەداری دەرباز بکات کە لەڕێگای تاکڕەوێتی یان تاکخوازییەوە کردوویەتی بەهیچ و بەسیفەتی ئەندامی کۆمۆن بژیت. پێویستە ئەو ڕاستییە وەک پرەنسیپێکی سەرەکی ئەخلاقی بزانین و پەسەندی بکەین کە ئەوەی ژیانی کۆمینالی نەبێت ناشێت وەک تاکەکەسیش ژیانی هەبێت. پێویستە ئەو خالەش بەردەوام ڕەچاو بکرێت کە ئەندامبوون لە کۆمۆن یاخود جڤاتێک لەهەمانکاتدا لایەنێکی دیموکراسی یان دیموکراسیخوازی هەیە. کۆمۆن یاخود جڤات تەنیا لەمیانەی ڕێکاری دیموکراسیەوە دەبێت بە سیاسی، لەو سۆنگەیەوە؛ دەشێت ئازاد بێت. بەمجۆرە دەرکی پێدەکرێت کە هەر کۆمۆن یاخود جڤاتێک لەهەمانکاتدا یەکەیەکی کۆمەڵگای ئەخلاقی و سیاسییە. هەر کۆمین یاخود جڤاتێکی KCKلەهەمانکاتدا پێگەی یەکەیەکی ئەخلاقی و سیاسی هەیە. تاک ـ هاولاتیانیشی، تاک ـ هاونیشتیمانی ئەخلاقی و سیاسین. کاتێک باسی کۆمۆن یاخود جڤاتەکان دەکەین، مەبەستمان ئەو گروپە مرۆییانەیە کە لەهەر بوارێکی کۆمەڵگادا چالاکن. بۆ نموونە؛ وەک چۆن گوندێک مەرجەکانی کۆمۆن لەخۆوە بگرێت کۆمین یاخود جڤاتە، دەشێت ئەو پێناسەیە تا ئاستەکانی گەڕەک و شاریش ببەین. دەشێت کۆپەراتیف (هەرەوەزی)، کارگە، کۆمەڵە، وەقف و ڕێکخراوێکی مەدەنیش کۆمۆن بێت. هەروەها بەهۆی پێویستی دیموکراتبوونیان دەشێت ئەوانە بە سیستەمی کۆمۆنی دیموکراتیکیش ناوببەین. وەک چۆن دەشێت کۆمۆن بۆ سەرجەم بوارە پەروەردەیی، کلتووری، هونەری و زانستییەکانی ژیان بگوازرێتەوە، ئەوا دەشێت ژیانی

سیاسی و کۆمەڵایەتیش بکرێت بە کۆمۆن و بە دیموکراتیزەبوونیش بگەیەنرێت. تەنیا لەناو ئەو ژیانە کۆمیناڵە دیموکراتیکەدا تاک ــ هاونیشتیمانی ئازاد دەئافرێت. بەشێوەیەکی گشتی تاک ـ هاونیشتیمانی نەتەوەی دیموکرات، بەتایبەتی و بەشێوەیەکی بەرجەستەش تاک ـ هاونیشتیمانی KCKپێویستییەکی ئەخلاقی، سیاسی و بەرپرسانەیە. پێویستە ئەوەش لەهەمانکاتدا وەک ماف و ئەرکێکی سەرەکیشمان دەرکی پێبکرێت. کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوەکان ئەو ئەرک و مافە سەرەکیانەمان پەسەند بکەن، ئەوا کوردانیش دەتوانن ماف و ئەرکە سەرەکییەکانی ئەو دەوڵەتانە پەسەند بکەن.

## ٢ . ژیانی سیاسی و خۆسەری دیموکراتیک لە نەتەوەی دیموکراتدا

دەشێت ڕەهەندی سیاسی بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتی KCK بەخۆسەری (خۆبەڕێوەبردنی) دیموکراتیک ناوببرێت. بەبێ خۆبەڕێوەبەرێتی ناشێت بیر لە نەتەوەی دیموکرات بکرێتەوە. بەگشتی سەرجەم شێوەکانی نەتەوە، بەتایبەتیش نەتەوە دیموکراتەکان قەوارەیەکی کۆمەڵایەتین کە خاوەن خودبەڕێوەبەرێتین. ئەگەر کۆمەڵگایەک لە خودبەڕێوەبەرێتی بێبەش بێت، لەدۆخی نەتەوە یان نەتەوەبوون دەردەکەوێت. لەواقیعی کۆمەڵگای هاوچەرخدا ناشێت بیر لە نەتەوەیەکی بێ بەڕێوەبەرێتی بکرێتەوە. بگرە نەتەوە کۆلۆنیەکانیش، ئەگەر بنەچەیان بیانیش بێت دیسان بەڕێوەبەرایەتییەکیان هەیە. بەڵام ئەو کۆمەڵگایانەی لەقۆناغی پەرتەوازەبوون دان ناشێت باس لە بەڕێوەبەرایەتییان بکرێت. لەدۆخێکی وەهادا مەگەر پەرتەوازەبوونی ژێر کۆنترۆڵی هێزی پەرتەوازەکردن یاخود بەڕێوەبەرایەتییەکی تەسفیەکردن جێگای باسە. لەو سەردەمەی کوردان بێ ڕێکخستنی خۆیی بوون لەدۆخێکی وەهادا بوون. تەنیا نەتەوەبوونیان بەربەست نەدەکرا، بەڵکو لە دۆخی کۆمەڵگاش دەردەخران. پێشەنگایەتی PKK و سیاسەتی KCK تەنیا بە وەستاندنی ئەو پرۆسەیە نەوەستا، بەڵکو لە کۆمەڵگای سیاسییەوە پرۆسەیەکی بەرەو نەتەوەی دیموکرات دەستپێکرد. لەو قۆناغەی پێی گەیشتووین بەو ئەندازەیەی کوردان کۆمەڵگایەکن سیاسیبوونێکی خەستیان بەخۆیانەوە دیوە، بەڵکو بەچڕی لەدۆخێکدا دەژین کە ئەو ڕاستییە سیاسییە بەرەو بوون بە نەتەوەی دیموکرات ڕێکدەخەن.

لەو سەردەمەماندا بوون بە کۆمەڵگای سیاسی بە هێڵە گشتیەکانیەوە بە دوو ئاراستە بەرەو نەتەوەبوون دەچێت: ڕێگا باوەکەی سەرمایەداری ئەو ڕێگایەیە کە بەرەو دەوڵەت ــ نەتەوە دەچێت. لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەگەر کۆمەڵگایەک بێ دەوڵەت بێت، دەوڵەتەکەی ڕووخابێت یاخود لە دۆخی هەرەسدا بێت، ئەوا سیاسەتە میللیگەرا(ناسیۆنالیست) و ئایینگەراکان ئەو کۆمەڵگایە بەرەو دەوڵەتێکی نوێ، بەرەو دەوڵەت ـ نەتەوە دەبات. ئەگەر ئەو کۆمەڵگایە دەوڵەتێکی نەریتی هەبێت و لاواز بێت، ئەوا لەمیانەی دەوڵەت ــ نەتەوەوە جێگیری دەکات کە بەهێزترە. دووەمین ڕێگای

نەتەوەبوون، ڕێگای نەتەوەبوونی دیموکراتیکە. چونکە کارەکتەری دەوڵەت ـ نەتـەوەکان بـۆ ئافرانـدنی کێشـە لـەڕۆژی ئەمڕۆمانـدا کۆمـەڵگا سیاسـیەکان و هێزەکـانی بەڕێوەبەرایـەتییان بـە ئاراسـتەی نەتـەوەی دیمـوکرات دەخاتـە جووڵـەوە، لـەڕێگای ڕیفۆرمەوە بێت یان شۆڕشـەوە ناچـاری وەرچـەرخان بۆ نەتـەوەی دیموکراتیـان دەکـات. لەکاتێکـدا لەسـەردەمی هەڵکشـانی سـەرمایەداریدا دەوڵـەت ـ نەتـەوە مـەیلی زاڵبـوو، لەهەلومەرجـەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمانـدا کـە لـەدۆخی داڕووخـان دایـە زیـاتر بەئاراسـتەی نەتـــەوەی دیمـــوکرات لەپەرەســـەندنی پلـــە بەپلـــە (تـــەدریجی) دایـــە. لـــەو بارەیـــەوە هاوواتانەکردنی هێزی سیاسی لەگەڵ دەسەڵاتی دەوڵەت بایەخ و گرنگیەکی زۆری هەیـە. ناشێت سیاسەت لەگەڵ دەسەڵات و ئـەو شێوەی (دەوڵـەت) هاوواتـا بکرێـت کـە بـووە بـە خاوەن فۆڕم. چونکە ئازادی لە سروشتی سیاسەتدا هەیە. ئەو کۆمەڵگا و نەتەوانەی بوون بە سیاسی کۆمەڵگا و نەتەوەیەکی ئازادن.

وەک چۆن هەر کۆمـەڵگا و نەتەوەیـەک هێـزی دەسـەڵات و دەوڵـەتی بەدەسـتهێنابێت ئازاد نەبووە، ئەگەر تایبەتمەندێتی دیموکراتیشی هەبێت، ئەوا ڕووبەڕووی لە دەسـتدانی ئەو ئازادیەشـن کـە هەیانـە. هەربۆیـەش چەنـدە کۆمەڵگایـەک لـەدیاردەکـانی دەوڵـەت و دەسەڵات پاک بکەینەوە، بەو ڕادەیە بەڕووی ئازادیـدا دەیکەینـەوە. سـەرەکیترین مـەرجی پێویستیش بۆ ئازادکردنی ئەو کۆمەڵگا و نەتەوەیە، هێشتنەوەی بەردەوامێتی لەپێگەیەکی سیاسیدا. کۆمەڵگایەک لـە دەوڵـەت و دەسـەڵات پاککرابێتـەوە بـەڵام سیاسـی نـەبووبێت، دەکەوێتە دۆخی کۆمەڵگا یاخود نەتەوەیەک کە ڕادەستی ئەنارشیزم یاخود دێوەزمە بووە. ئەگەر کۆمەڵگا و نەتەوەکان بۆ ماوەیاکی درێژ لە ئەنارشیزم و کائیوس ڕزگاریان نەبێت، دەپووکێنەوە، پەرتەوازە دەبن و دەبن بە ئامرازی هێزە بیانییـەکان. تـەنیا بەشـێوەیەکی کاتی و بۆ ماوەیەکی کورت دەشـێت کـائیوس و ئەنارشیزم ڕۆڵـی دووگیـانی ببیـنن. لـەو پێناوەشدا مەرجە کە دیاردەی سیاسەت بکەوێتە گەڕ و دەسـتبەکار بێت. سیاسـەت تـەنیا کۆمەڵگا و نەتەوەکان ئازاد ناکات، بەڵکو ڕێکیشیان دەخات. سیاسەت هێزێکـی بێهاوتـای ڕێکخسـتن یـان ڕێکوپێککردنـە، جۆرێـک لـە هونـەرە. نوێنەرایـەتی دژەکـەی ڕێکخسـتنی سەرکوتکاری دەوڵەت و دەسەڵاتەکان دەکات. لە کۆمەڵگا و نەتەوەیەکدا چەندە سیاسـەت بـەهێز بێـت، هێزەکـانی دەوڵـەت و دەســەڵات بـەو ڕادەیـە لاوازن، پێویسـتە لاوازبـن. پێچەوانەکەشی ڕاستە. لە کۆمەڵگا و نەتەوەیەکدا هێزی دەوڵـەت و دەسـەڵات چەنـدە زۆر بێت، سیاسەت لاوازە، لەو سۆنگەیەشەوە؛ ئازادی بەو ڕادەیە لاوازە.

KCK (کۆما جڤاکێن کوردستان؛ واتە یەکێتی جڤاتە دیموکراتەکانی کوردستان) کە لە بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا ڕۆڵـی بڕبـڕەی پشت دەبینێت، دەشـێت وەک هاوتاکـەی خۆسـەری دیمـوکراتیش وەربگیڕدرێـت. گێڕانـی ڕۆڵـی ئۆرگـانی سیاسـەتی دیموکراتیانـە لەلایـــەنKCKوە پێویســـتیەکی دەســـتلێبەرنەدراوی نەتـــەوەبوونی دیموکراتیانەیـــە. تێکەڵکردنی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە شێواندن و چەواشەکردنێکی بـە ئەنقەسـتە. لـەبواری پرەنسیپدا KCK دەوڵەت ـ نەتـەوەی لـە ئامرازەکـانی چارەسـەری خـۆی بـەدەرناوە. نـە

یەکەمین و نە کۆتا هەنگاوی دەوڵەت ـ نەتەوە نییە. هەردووکیشیان دوو دەستەواژەی دەسەڵات و ئۆتۆریتەن کە لەناوەڕۆکدا لێکجیاوازن. ئەگەر لەبواری قالبی ڕێکخستنی تایبەتمەندێتی هاوشێوەی دامەزراوەبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەش لەخۆوە بگرێت، بەڵام لەناوەڕۆکدا جیاوازە. ئۆرگانی بڕیاردانی KCK، کۆنگرەی گەل مانای ئەنجوومەنی گەلە. گرنگیەکەی لەوەدایە کە گەل دەکاتە خاوەنی بڕیاری خۆی. ئەنجوومەنی گەل یاخود کۆنگرەی گەل ئۆرگانێکی دیموکراتیکە. ئەڵتەرناتیڤی پەرەسەندنی نەتەوەبوونە بەپێشەنگایەتی چینی سەروو یاخود ئەندامە بۆرژوازییەکان. کۆنگرەی گەل گوزارشت لە نەتەوەبوونێک دەکات کە بە پێشەنگایەتی توێژەکانی گەل و چینی رۆشنبیر بەدیدێت. لە ناوەڕۆکدا لەگەڵ سیستەمی پەرلەمانی بۆرژوازی جیاوازە. بەهۆی فشاری دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان ناچارە لەژێر هەلومەرجی گونجاودا سیستەمی هەڵبژاردن و ناوەندی کۆبوونەوەکانی دەستنیشان بکات. کۆنسەی بەڕێوەبەرێتیKCKش گوزارشت لە هەرەمی بەڕێوەبەرایەتی رۆژانەیی چڕ و ناوەندیکراو دەکات. هەماهەنگی ئەو یەکینانەی کار و خەبات دەکات کە لەناو گەلدا بڵاو بوونەتەوە. پێویستە هەوڵە رۆژانەییە ڕێکخستنی ـ چالاکییەکانی نەتەوەبوونی دیموکراتیک سەرپەرشتی بکات (کۆردینە بکات)، بەڕێوەیان ببات و بەرگریان لێبکات. تێکەڵکردنی کۆنسەی لەگەڵ ئۆرگانی حکومەتی دەوڵەتەکان راست نییە. زیاتر نزیکی سیستەمی کۆنفیدراسیۆنی کۆمەڵگای مەدەنییە دیموکراتییەکانە. دەزگای سەرۆکایەتی گشتی KCK کە پشت بە هەڵبژاردنی گەل دەبەستێت، گوزارشت لە بەرزترین ئاستی نوێنەرایەتی گشتی نەتەوەی دیموکرات دەکات. چاودێری هەماهەنگی و تەبایی نێوان سەرجەم یەکینەکانی KCK و جێبەجێکردنی سیاسەتە سەرەکیەکانی دەکات.

KCK کێشەی فەرمیبوونی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان هەیە. وێڕای ئەوەی ئەولەویەت بە چالاکی ئاشکرا دەدات، بەڵام پەسەند نەکردنی لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە، لە کوردستان ڕێگا لەپێش دەستڕۆیی (ئۆتۆریتە) و بەڕێوەبەرایەتییەکی دووانە دەکاتەوە. هەوڵەکانی دەسەڵاتی دەوڵەت و بەڕێوەبەرایەتی KCK تا لەسەر هەمان خاک و کۆمەڵگا کاریگەر بن ئاشکرایە کە ڕێگا لەپێش گرژی و پێکدادان دەکاتەوە. ئەگەر داواکارییەکانی خەباتی ئاشکرا و یاساییبوون بۆ دەوڵەتە پەیوەندیدارەکان وەڵام نەدرێتەوە، بە پێچەوانەوە پەنا بۆ چاودێری، دەستگیرکردن و توندوتیژی ببرێت، ئەوا ئاشکرایە کە KCK ش لە پەیرەوکردنی یەکلایەنەی دەستڕۆیی و بەڕێوەبەرایەتی خۆی دوا ناکەوێت. ئەو دیالۆگە راستەوخۆ و ناڕاستەوخۆیانەی لەکاتی راگەیاندنی KCK لەساڵی ٢٠٠٥وە تا رۆژی ئەمڕۆمان لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە پەیوەندیدارەکان لەئارادا بووە تا ئێستاکەش بە چارەسەرییەکی یاسایی ئەنجامگیر نەبووە. لەحاڵەتێکدا دیالۆگەکان ئەنجامێکی ئەرێنیان لێنەکەوێتەوە ئەوا لە قۆناغی پەیرەوکردنی یەکلایەنەی دەستڕۆیی و هێزی بەڕێوەبەرێتی KCK لە کوردستان دەستلێبەرنەدراو دەبێت.

پەیڕەوکردنی یەکلایەنەی خودی KCKلەتەواوی ڕەهەندەکانی نەتەوەی دیموکراتدا قۆناغ و سەردەمێکی نوێ دەست پێدەکات. ئەو سەردەمە لەگەڵ قۆناغی خۆ بونیادنانی PKK و هەوڵەکانی پێشخستنی شەڕی گەلی شۆڕشگێڕی جیاوازتر دەبێت. لەو سەردەمەدا تەنیا بەڕێوەبەرێتی پارت و شەڕ جێگای باس نابێت. دیسان لەپاڵ کار و خەباتەکانی PKKو HPG و شەڕەکانی بەرگری، ئەرکی سەرەکی ئەو قۆناغە بونیادنانی سەرجەم ڕەهەندەکانی نەتەوەی دیموکرات و بەڕێوەبردنێتی. ئاشکرایە لەو قۆناغەدا لەژێر هەلومەرجی نوێدا کێبڕکێ، ململانێ و پێکدادانێکی مەزن لەنێوان هێز و دەزگاکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و هێز و دامەزراوەکانی KCKڕوودەدات. لە شار و دەڤەرە دەشتایی و شاخاوییەکان دەسترۆیی و بەڕێوەبەرایەتی جیاواز جێگای باس دەبێت.

### ٣ ـ نەتەوەی دیموکرات و ژیانی کۆمەڵایەتی

لە پرۆسەی نەتەوەبوونی دیموکراتدا وەرچەرخانی گرنگ لەژیانی کۆمەڵایەتیدا ڕوودەدات. لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ژیانی نەریتی دووچاری گۆڕانکاری گەورە دێت. کۆمەڵگای کۆن گۆڕانکاری ڕادیکاڵ بەخۆیەوە دەبینێت. مۆدێرنیتە زیاتر لە گۆڕانکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیدا خۆی پیشاندەدات. بەشی زۆری گۆڕانکارییەکان سەبارەت بە مۆدێلە و ڕووکەشییە. خەسڵەتە سەرەکییەکانی شارستانی بەردەوام دەبێت. پەرەسەندن و وەرچەرخانی شار، چین و دەوڵەت سەبارەت بە ناوەڕۆک نییە. لەهەر سێ خەسڵەت یاخود کاتەگۆری ئاوسانێکی مەزن دێتەئاراوە. لەمیانەی سیستەمی کەڵەکەکردنی سەرمایەدارییەوە بونیادی شاری، چینایەتی و دەوڵەتی کۆمەڵگا دووچاری گەورەبوونێکی شێرپەنجەییانە دێت. لەگەڵ ئەوەی سیستەمی شارستانی کۆن بەهۆی ناوەڕۆکەکەی خاوەن بونیادێکە بەردەوام ناکۆکیەکانی ڕێگا لەپێش تەنگژەکان دەکاتەوە، بەڵام ئەو ناکۆکیانە ناوەڕۆکێکی ئەوتۆیان نییە تەواوی پەرەسەندنی کۆمەڵگا بخاتە مەترسیەوە، هەڵیوەشێنێتەوە و ڕێگا لەپێش گەورەبوونی شێرپەنجەیی بکاتەوە. وەک پێویستییەکی سروشتەکەی شێوازی کەڵەکەکردنی سەرمایەداری بەو ئامانجەی کارابێت گەورەبوونی کۆمەڵایەتی بۆ شێوازی شێرپەنجەیی دەگۆڕێت. ئەگەر لەرۆژی ئەمڕۆدا تەنیا بەگەواهیکردن بۆ گەورەشارەکانی ژمارەی دانیشتوانی بیست ملیۆنی تێپەڕکردووە، دەسەڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە کە تا ناو دەمارە ڕیشاڵەییەکانی کۆمەڵگا دزەی کردووە و ئەو جیاوازییە چینایەتییە سنووردار نەبین کە بە دوای کۆمەڵگایەکی هۆمۆژەن و یەکچەشنەوەیە، بەڵکو وەک مەیلێکی زاڵی ژیانی کۆمەڵایەتی ئاسایی ببینین، ئەمە مانای توشبوون بە شێرپەنجەی کۆمەڵایەتییە. سەرجەم نیشانە زانستییەکان پیشانیدەدەن کە مەسارەکەمان، ژینگە و کۆمەڵگا بەرگەی ئەو گەورەبوونە خێرایە ناگرن. لەوەها دۆخێکدا ناشێت باسی کۆمەڵگایەکی زیندوو بکەین، پێویستە باسی جانەوەر و دێوێک بکەین کە هەر شتێک لەناو دەبات. لە کۆمەڵگای کۆندا لەکاتێکدا لێویاتان تەنیا بریتی بوو لە

دەسـەڵاتی دەوڵـەت، خـودی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری لـەرۆژی ئـەمڕۆمان بـووە بـە درندەیـەک تـەواوی ژیـانی زینـدوو لـەناو دەبـات. خـودی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری جانەوەرێکە، لێویاتانێکی مۆدێرنە .

ژیانی مۆدێرنی زاڵ لەدەوروبەری کۆنترین کۆیلە، واتە لەدەوربەری ژن تەواو بووە بە تەڵەزگە. لە سەرمایەدارییدا ژن بە دۆخێکی ئـەوتۆ گەیـەنراوە، ئەگـەر بڵێـین؛ "شاژنی کاڵا" لەجێگای خۆیدا دەبێت. تەنیا بەبێ کرێ ناخرێتە کـارەوە، بـەڵکو خـاوەن کـەمترین کرێیە و سەرەکیترین ئـامرازی داخسـتن یـان کەمکردنـەوەی کرێیـە. لەپێشـترین فاکتـەری کارپێکردنی نەرمە. ئامێرێکی پیشەسازی زاوزێیە کـە بـەردەوام نـەوەی نـوێ بـۆ سیسـتەم بەرهەم دێنێت، سەرەکیترین ئامرازی پیشەسازی ڕێکلامە. ئامرازی بـەدیهێنانی دەسـەڵاتی رەگەزگەرایییـە. لـە ئیمپراتـۆری جیهانیگیریـەوە تـا دەگاتـە ئیمپراتـۆرە بچووکەکـەی نـاو خێـزان ئـامرازی دەسـەڵات و ئـارەزووی سنوورنەناسـی سـەرجەم پیـاوە سـتەمکار و باڵادەستەکانە. ئەو ئۆبژەیە کە دەسەڵاتی ئەو کەسانە دەئافرێنێت کە هـیچ دەسـەڵاتێکیان نییە. لەهیچ سەردەم و قۆناغێکی مێـژوودا وەک سـەردەمی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری ژن نەقۆزراوەتەوە و خراپ بەکارنەهێنراوە. لەبەر ئەوەی کۆیلایەتییەکانی دیکە ـ کۆیلایەتی منداڵ و پیاوان ـ لەسەر شـوێنپێی کۆیلایـەتی ژن پێشـخراوە، لـەو ژیانـە کۆمەڵایەتییـەی سەرمایەداری دەیسەپێنێت جگـە لـە سـەردارەکان، وەک چـۆن هەرکـەس دەکرێـت بەمنـداڵ کراویشن بەکۆیلە. ژیانی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای رۆژی ئەمڕۆمان هاوشێوەی بەمنداڵکردنی بەساڵاچوونێک هەم کراوە بە منداڵ هەمیش کراوە بە ژن. گوتەی " گـەلان و کۆمـەڵگاکان حەزدەکەن وەک ژن بەڕێوە ببـرێن "ی هێگـەر گوزارشت لـەو راستییە دەکـات. خێـزان کـە لەدەوروبەری ژن پێکهاتووە و کۆنترین دامـەزراوی کۆمەڵگایـە، دیسـان لـەدەوروبـەری ژن بەڵام ئەوجارە تەواو لەدۆخی هەڵوەشانەوەدا دەژیت. شێوازی کەڵەکەکردنی سەرمایەداری خێزانی هەڵوەشاندەوە. لەبەر ئەوەی تەنیا لەمیانەی لەناوبردنی ئەو شێوازەی کۆمـەڵگا کەڵەکەکردن بەدیدێت، ئەوا ئەنجامێکی چاوەڕوانکراوە کە بەو رادەیـەی خانـەی سـەرەکی کۆمەڵگا واتە بەو رادەیەی خێزان هەڵوەشێنێتەوە دەتوانێت کۆمەڵگا لـەناو ببـات و وەک ئەتۆم ورد وردی بکات.

هەرچەندە بواری تەندروستی و پزیشکی پێشبخرێت، بـەڵام ناتوانێـت گـەورەبوونی هەرەسئاسای نەخۆشیەکانی ناو کۆمەڵگا بوەستێنێت. پەرەسەندنی خودی بواری پزیشکی بەشێوەیەکی دیالیکتیکی بەڵگەی سـەلمێنەری ئاستی پێشکەوتنی نەخۆشیەکانە. خـودی سیسـتەمی سـەرمایەداری کـە خـۆی شـێرپەنجەیی و ئەعصـابە، خنکانـدنی تاکـەکانی کۆمـەڵگاش لـەناو ئـەو نەخۆشـیانەدا ئـەنجامێکی دیکـەی گرنگـی چـاوەڕوانکراوە. میللیگەرایی، ئایینگەرایی، دەسەڵاتگەرایی و رەگەزگەرایی لەبواری دامەزراوەیی و تاکیشدا بـۆهێڵی هەسـتی و زهنـی سـەرمایەدارین کـە بـەردەوام نەخۆشـی دەئـافرێنن. زیـادبوونی نەخۆشـییە جەسـتەییەکان نیشـانەی نەخۆشـییە زهنـی و دەروونییەکانـە، تـەواوی ئـەو

نەخۆشیانەش ئەنجامێکی سروشتی ئەو کۆمەڵگایەیە کە سەرمایەداری هەڵیوەشاندۆتەوە و پەرتەوازەی کردووە.

لە ژیانی کۆمەڵایەتی مۆدێرندا سیستەمی پەروەردە بە پێگەیاندنی شێوەی تاکخوازی دژە ـ کۆمەڵگا ئەرکدارە. ئەگەر ژیانی تاکخوازی لیبرالیزم بێت یان ژیانی هاوڵاتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەگوێرەی پێویستییەکانی سەرمایەداری بەرنامەڕێژ دەکرێت و بەمجۆرە ئاوادەکرێن. بەو ئامانجەش پیشەسازییەکی زەبەلاح ئاواکراوە کە بە کەرتی پەروەردە ناودەبرێت. بەدرێژایی بیست و چوار کاتژمێر لەبواری روحی و زهنییەوە تاک لەو کەرتە دووچاری بۆردومان دێت و دەکرێت بە بوونەوەرێکی ئانتی ـ کۆمەڵایەتی. ئەو تاکە لەدۆخی سیاسی و ئەخلاقی بەدەر دەنرێت. لەمیانەی ئەو تاکانەی کراون بە پارەپەرست، بەکاربەر، سێکسی، شۆڤینی و چەلاوخۆری دەسەڵات لەرەگەوە سروشتی کۆمەڵگا دەشێوێنرێ و وێران دەکرێت. پەروەردە لەپێناو رێکاری تەندروستانەی کۆمەڵگا بەکار ناهێنرێت، بەڵکو لەپێناو داڕووخانی بەکار دەهێنرێت. ئەو راستییەی شیکارەکانی دەرهەق بەژیانی کۆمەڵایەتی سەلماندوویانە ـ کە دەتوانرێت زیاتر پەرەی پێبدرێت ـ لەمێژە بەسنووری "یان کۆمەڵگا یان هیچ " گەیشتووە.

لەژێر ناوی ئەو زانستۆکانەی بە ئاراستەی بەرژەوەندییەکانی سەرمایەداری پێشخراون هەر جۆرە فێڵبازی و درۆزنییەکیش بکرێت، بەر لەهەموو شتێک ژیانی مرۆڤ ژیانێکی کۆمەڵایەتییە. دیسان بەر لە سەرهەڵدانی دەوڵەت و سەرمایەداریش کۆمەڵگا هەر هەبوو. لەمیانەی کۆمەڵگاوە مرۆڤ بووە بە مرۆڤ. ئەگەر کۆمەڵگای کلان نەبووایە کە لامان پەسەند نییە، ملیۆنان ساڵ بەردەوام بووە و لە خێزان یاخود ماڵباتێکی سادە دەچوو، ئەوا نە شار، نە چین، نە دەوڵەت و نە شارستانی هیچ یەکێکیان نەدەبوون. ئەوەی کۆمەڵگای ئافراندووە شار، چین، دەوڵەت و شارستانی نییە، بەپێچەوانەوە کۆمەڵگایە کە سەرجەم ئەو دیاردانەی داهێناوە. لەژیانی مرۆڤدا هیچ شتێک جێگای کۆمەڵگا ناگرێت. دەستبەرداربوون لە کۆمەڵگا، دەرکەوتن لەدۆخی کۆمەڵگا یان کۆمەڵگابوون، مانای وازهێنان لە مرڤایەتی و دەرکەوتنە لەدۆخی مرۆڤبوونەوە. بەر لەهەموو شتێک نەتەوەی دیموکرات سوورە لەسەر مانەوە لەدۆخی کۆمەڵگادا؛ بەدروشمی "یان کۆمەڵگا یان هیچ" لەبەرامبەر مۆدێرنێتەی سەرمایەداری دەوەستێتەوە. لەسەر هەمیشەییبوون و ژیانکردنی راستینەی کۆمەڵگای ـ مێژوویی کۆمەڵگا سوورە کە لەچەرخی مۆدێرنێتەدا هەڵوەشێنراوەتەوە. بەهۆی گرنگیەکەیەوە لەپاڵ ئەوەی لە بەرگرینامەکەمدا ماددەیەکی تایبەت سەبارت بە ژن و خێزان تەرخان دەکەین، بەڵام لەبنەڕەتدا پێویستە کۆمەڵگا وەک خێزانێکی مەزن تاوتوێ بکرێت. ئەوەی بەدرێژایی مێژوو مرۆڤی ئافراندووە ئەو خێزان یان ماڵباتەیە. ئایینەکانی مۆدێرنێتەی سەرلایەداری هاوشێوەی پارە، دەسەڵات، سێکس، تۆپی پێ و .. هتد کە لەرۆژی ئەمڕۆماندا هەرشتێکی تێدا چوککراوەتەوە زۆر دواتر پەیدابوون و هەرگیز تاک ئاوا ناکەن بەپێچەوانەوە لەناوی دەبەن.

نەتەوەی دیموکرات ئەو مۆدێرنیتە ئەلتەرناتیڤەیە کە تاک ـ هاونیشتیمانی ئازادی تێدا دەئافرێنرێت. نەتەوەی دیموکرات کۆمەڵگای ئەلتەرناتیڤە بەرامبەر بەهیچکردنی کۆمەڵگا، کۆمەڵگای دیموکراتە بەرامبەر بەکۆمەڵگا یاخود بێ کۆمەڵگایی دەوڵەت و دەسەڵات. لەبەرامبەر ئەو پووکانەوە کۆمەڵایەتییەی هەرجۆرە نایەکسانی و کۆیلایەتییەکی تێدا پەیڕەو دەکرێت و دەرخواردی دراوە ئەو کۆمەڵگایەیە کە بەشێوەیەکی ئازاد و یەکسان بە بوون و ژیان دەگات. کاتێک لەروانگەی ژیانی کۆمەڵایەتییەوە نەتەوەی دیموکرات هەڵبسەنگێنین، بەدڵنیاییەوە بەو پێناسانە دەگەین. بوون بە کۆمەڵگای نەتەوەی دیموکرات، لەپێشترین مەرجی ژیانی کۆمەڵگایەکی تەندروستانەیە. ئەو کۆمەڵگایەی دەوڵەت ـ نەتەوە پووکاندبوویەوە سەرلەنوی بۆ بنەڕەت و رەسەنێتی خۆی دەگەڕێتەوە. کۆمەڵگای تەندروستانە تاکی تەندروستانە پێدەگەیەنێت. ئەو تاکەی بە تەندروستی زهنی و رۆحی بگات بەرگرییەکەی بەرامبەر نەخۆشییە جەستەییەکان زیاد دەبێت و نەخۆشییەکانیش کەم دەبنەوە. لەبەر ئەوەی چەمکی پەروەردەیی نەتەوەی دیموکرات کۆمەڵگابوون و تاک ـ هاونیشتیمانی ئازادی کردۆتە ئامانج، سەرلەنوێ دیالیکتیکی پەرەسەندنی تاک و کۆمەڵگا لەگەڵ یەکتردا ئاوا دەکرێتەوە. سەرلەنوێ رۆڵی کۆمەڵگابوون، ئازادیخوازی و یەکسانیخوازی زانستەکان سەرهەڵدەداتەوە. نەتەوەی دیموکرات نەتەوەبوونی ئەو کۆمەڵگایەیە کە سەبارەت بە بوونی خۆی هوشیاری و زانیاری راستی بەدەستهێناوە .

KCK کە رۆڵی بربڕەی پشتی وەرچەرخاندنی کۆمەڵگای کورد بۆ نەتەوەی دیموکرات دەبینێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بە کەنارەکانی لەناوبردنی گەیاندووە؛ زامنی یاخود گەرەنتی ژیانی تاکی ئازاد و کۆمەڵگای دیموکراتیکە. ئامرازی سەرەکی گەیشتنی تاک و کۆمەڵگای کوردە بە هوشیاری بوونی رەسەنی خۆی. پەرە بەرەهەندی ئەخلاقی و سیاسی کۆمەڵگا دەدات و بەمجۆرە دەرفەتی گەیشتن بە هوشیاری راستینەی خۆی دەدات. لەسەردەمی ئێستاماندا نەتەوەی دیموکرات ئەو کۆمەڵگایەیە کە بە هوشیاری بوون و ژیانی خۆی گەیشتووە و لەمیانەی ئەو هوشیارییەوە بەرگری لەخۆی دەکات. کۆمەڵگای کورد کە لەژێر مەنگەنەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا دووچاری کۆمەڵکوژی کلتووری هاتووە تەنیا لەمیانەی نەتەوەبوونی دیموکراتیک دەتوانێت ئەو رژێمەی نکوڵی و قڕکردن دەرباز بکات کە بەسەریدا سەپێنراوە. نەتەوەی دیموکرات، KCK و تاکی ئازاد یەکێتیەکی لێکجیاوازن.

### ٤ . هاوژیانی ئازاد لە نەتەوەی دیموکراتدا

وەک ئاگادارین هەر یەکینەیەکی ژیانی زیندوو سێ چالاکی سەرەکی هەیە. ئەوانەش خۆراک پەیداکردن، پاراستنی بوون و درێژە پێدانی رەچەڵەکن. نەک تەنیا ئەو یەکینە بایۆلۆژیانەی بە ژیانی زیندوو ناوی دەبەین، بەڵکو هەر بوونەوەرێکی گەردوونی رۆڵێکی زیندووی بەگوێرەی خۆیان دەبینن چالاکی هاوشێوەیان هەیە. ئەو چالاکییە سەرەکیانە لە

مرۆڤدا بەئاستێکی جیاوازتر دەگات. لەکۆمەڵگای مرۆڤدا راسیۆنالی بە ئاستێکی ئەوتۆی پەرەسەندن دەگات، ئەگەر دەرفەتی پێبدرێت، لەوانەیە کۆتایی بە بوونی سەرجەم زیندەوەرەکانی دیکە بێنێت. ئەگەر جیهانی بایۆلۆژی لەئاستێکی دیاردا بوەستێنرێت، ئەوا نابەردەوامی جۆری مرۆڤیش لەخۆیەوە ڕوودەدات. ئەمە دووفاقیەکی جددییە. جۆری مرۆڤ کە لەئێستاوە ژمارەکەی بەحەوت ملیار گەیشتووە بەو خێراییە لەزیادبووندا بێت، ئەوا دوای ماوەیەکی زۆر کورت ئاستی بایۆلۆژی دەرباز دەکرێت و نابەردەوامی ژیانی مرۆڤ دێتەئاراوە. راسیۆنالیستی مرۆڤ ڕێگای لەپێش ئەو دۆخە کردۆتەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ بەر لەگەیشتنی مرۆڤ بەو ئاستە بایۆلۆژییە، پێویستە هەمان راسیۆنالیتە زیادبوونی زێدەڕۆییانەی ژمارەی جۆری مرۆڤ بوەستێنێت. پەیدابوون و زۆربوون ڕووداوێکی زۆر سەیرە. ئامێرێک کە دەشێت بە ئەقڵی سروشت ناوی ببەین بەردەوام ڕۆڵی هاوسەنگ کردن دەبینێت، هاوسەنگی نێوان بوون و زۆربوون دەپارێزێت. بەڵام بۆ جاری یەکەمین راسیۆنالیستی مرۆڤ بە ڕووی ئەو میکانیزمەی هاوسەنگی دەوەستێتەوە. لەراستیدا دەستەواژەی ئیلاهیبوونیش زادەی ئەو راسیۆنالیتەیە. خوداوەند مانای ئەو مرۆڤەیە کە لە راسیۆنالیتەدا سنوور ناناسێت. تایبەتمەندێتییە راسیۆنالییەکانی مرۆڤ ڕێگای لەپێش بونیادنانی خوداوەند، ئایین و سیستەمە ئافرێنەرەکانی دیکە کردۆتەوە .

خۆدووبەتکردن و زۆربوونی یەکخانە (ئەمیبیا) بەرامبەر بە لەناوچوون، سەبارەت بە بەردەوامی ژیان مایەی تێگەیشتنە؛ ڕەمەکی زۆربوونی هەر بوونەوەرێک تا گەیشتۆتە مرۆڤ گوزارشت لە ئارەزووی ژیانی بێکۆتایی دەکات. ئارەزووی ژیانی بێکۆتایی، ئارەزووێکە دەرکی پێنەکراوە، توانا و بەهرەی تێگەیشتنی زۆر سنووردارە. پێویستی یان پێویست نەبوونی گەیشتن بە هوشیاری ژیان گفتوگۆیەکی جیاوازترە. بەڵام ئەوەش مایەی تێگەیشتنە کە دوای گەیشتن بە هوشیاری ئارەزووی ژیان لەمیانەی درێژەدان بە ڕەچەڵەکەوە مانای ژیان بەدەست ناهێنرێت. ژیانی کەسێک و ملیۆنان کەسیش هەمان شتە. وەک چۆن زۆربوون ژیان مانادار ناکات، لەوانەیە هێزی هوشیاری دەرکەوتووش چەواشە و لاواز بکات. بەدەستهێنانی زانیاری و هوشیاری لەبارەی خۆیەوە، هیچ گومانی تێدا نییە پێکهاتەیەکی سەمەرەی گەردوونە. لەخۆیەوە نازناوی خوداوندێتی بە باڵا نەکراوە. دوای بەدەستهێنانی هێزی هوشیاری دەرهەق بەخۆیەوە، ناشێت کێشەی سەرەکی مرۆڤ بەردەوامکردنی ڕەچەڵەک بێت. درێژەپێدانی ڕەچەڵەک لەلایەن مرۆڤی هوشیارەوە تەنیا بە تێکدانی هاوسەنگی دژ بە زیندەوەرانی دیکە ناوەستێت، بەڵکو هێزی هوشیاری مرۆڤیش دەخاتە مەترسییەوە. بەکورتی کێشەی سەرەکی مرۆڤی خاوەن مەعریفە بەردەوامکردنی ڕەچەڵەک نییە. سروشت لە مرۆڤدا بە ئاستێکی وەها گەیشتووە درێژەپێدانی ڕەچەڵەکی خۆی لەدۆخی کێشە دەرخستووە. لەوانەیە بڵێین هاوشێوەی بوونەوەرانی دیکە ڕەمەکی بەردەوامکردنی ڕەچەڵەک لەمرۆڤیشدا ئەبەدییە و هەر بەردەوام دەبێت. راستە، بەڵام ئەوە راستییەکە لەگەڵ هێزی هوشیاری ناکۆکە. لەو سۆنگەیەوە؛ دەست لێبەرنەدراوە کە لە پێشینەیی بۆ هوشیارییە. بەو رادەیەی دەزانین ئەگەر گەردوون

بۆ یەکەمین جار لەمرۆڤدا بەبەرزترین ئاستی خۆ ناسینی خۆی گەیشتووە، پێویستە جێگای جۆش و خرۆشێکی مەزن بێت، واتە تێگەیشتنی گەردوون لەوانەیە مانای راستەقینەی ژیان بێت. ئەوەش مانای دەربازکردنی خولگەی نەزۆکی ژیان ـ مردنە، ناشێت بیر لە خرۆشان و جەژنێکی گەورەتری تایبەت بە مرۆڤ بکرێتەوە. ئەوەش بەجۆرێک لەجۆرەکان گەیشتنە بە نیروانا، فەنافیللاو هوشیاری رەها، لەوە زیاتریش نە مانای ژیان دەمێنێت ـ نە پێویستی بەختەوەری.

لە کۆمەڵگای کوردیدا دەشێت پووکانەوەی ژیان زیاتر لە چوار دەوری دیاردەی ژن ببینرێت. لە کلتوورێکی کۆمەڵایەتیدا کە بەشێوەیەکی زۆر واقیعیانە ناوەکانی ژن و ژیانی کردووە بە یەک، کۆتاییهاتنی ژیان لەژندا نیشانەی سەرەکی لەناوچوونی کۆمەڵایەتیشە. ئەوەی لە پاشماوەی کلتوورێکدا ماوەتەوە کە رێگای لەپێش کلتووری مێخوداوەند کردۆتەوە و لە دەوروبەری ژن بناغەی شارستانی داناوە؛ خراپییەکی مەزن و ئاڵوودەبوونێکی رادەستبووی رەمەکەکانە سەبارەت بە ژیان لەگەڵ ژندا. نەریتەکان و ئەو ژیانە کۆمەڵایەتییەی لەژێر مەنگەنەی نکوڵی و قرکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دایە، ژیانێکە بە تەواوی مەحکومی بێچارەیی ژن کراوە. وەک بڵێی دوا سەنگەرە لەدەستیدا مابێتەوە، چەمکی پاراستنی ناموسی پشتبەستوو بە ژن گوزارشت لەدۆخێک دەکات کە زۆر لەو واتایە دوورکەوتۆتەوە کە نۆمۆس (نۆمۆس = بە رێسا یاخود یاسا) دەیبەخشێت. ناموسپەرستییەکی توندی سەبارەت بە ژن، گوزارشت لە بێناموسییەکی زۆر توندی کۆمەڵایەتی دەکات. چەندە لە ناموسی کۆمەڵگا دوورخرابێتەوە، واتە لەو بەها سەرەکیانەی دووربکەوێتەوە یاخود دووربخرێتەوە کە لەسەر پێیانی دەهێڵنەوە: بەو رادەیە بانگەشەی ناموسپەرستی تەوەرەی ژن دووفاقییە.

تێنەگەیشتنی کوردان لەو راستییەی کە دوای لە دەستدانی ناموسی کۆمەڵگا ناتوانن ناموسی ژن بپارێزن تەنیا جەهالەت یاخود نەزانی نییە، بەڵکو بێ ئەخلاقییە بەناوی ئەخلاقەوە ئەنجامدەدرێت. ئەو چەمکەی ناموس کە لە ژێر ناوی ناموسی ژنەوە هەوڵی ژیانکردنی دەدرێت، سەرچاوەی خۆی لە هەوڵەکانی خۆسەلماندنی هێز یاخود بێ هێزی پیاو لە کۆیلایەتی ژن وەردەگرێت: بێگومان ئەو پیاوە کوردەی لە بواری ئەخلاقی و سیاسییەوە لەناوچووە. خوازیارە ئازاری ئەو کردەوانەی باڵادەستی بیانی بەسەر خۆی و کۆمەڵگاکەی سەپاندوویەتی، لەمیانەی سەپاندنی باڵادەستی خۆی بەسەر ژندا دەربیخات یاخود هەڵیانرێژێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان خۆی خاڵی دەکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی لە تەواوی جیهاندا دۆخی ژن زۆر قورسە، بەڵام ئاشکرایە کە لە هیچ شوێنێک کۆیلایەتیەکی قورسی هاوشێوەی ئەو ستاتۆیەی ژنی کورد جێگای باس نییە. فرەمنداڵی کە دۆخێکی گشتیی کۆمەڵگای کوردییە ڕوویەکی دیکەی ئەو راستیەیە. لە کۆمەڵگا هاوشێوەکانیشدا ئەو تاکە چارەسەرییە یاخود بێچارەییەی لە ئاکامی نەزانی و کۆیلایەتییەوە دەرهەق بە بەردەوامکردنی بوون دێتەئاراوە خستنەوەی منداڵێکی زۆرە. ئەوە دیاردەیەکە لە هەر کۆمەڵگایەک روودەدات کە هۆشیاری زاتی (خۆیی) تێدا پێشنەکەوتووە. دووفاقیەکە

لێرەدایە، لەبەر ئەوەی فاکتەرە دەستکیبەرنەدراوەکانی دیکەی ژیان ئاسایش و خۆراک لەئاردا نین، منداڵی زۆر ڕێگا لەپێش کێشەگەلێکی گەورە دەکاتەوە. بێکاری هەرەسئاسا گەورە دەبێت. هەڵبەتە ئەوەی سیستەمی قازانجی سەرمایەداری بۆ کۆیلایەتی هەقدەستی کەم پێویستی پێیەتی زیادبوونی زێدەڕۆیانەی ژمارەی دانیشتوانە. نەریتی شارستانی و مۆدێرنیتە دەستی یەکتریان گرت و بەمجۆرە تەواوی وێرانکارییەکان لەسەر ژن ئەنجامدەدات.

بەردەوام دووبارەی دەکەینەوە کە ئەو هەلومەرجانەی ژن و ژیانی تێدا بێناوەڕۆک کراوە داڕووخان و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگا پیشاندەدات. سەرجەم ئەو فاکتەرانەی بە شۆڕش، پارتی شۆڕشگێری، پێشەنگ و تێکۆشەر ناویان دەبەین ئەو ڕاستینە شیکار نەکەن و لەڕێگای ئازادییەوە سەفەربەری نەکەن ناتوانن ڕۆڵ ببینن. ئەوانەی خۆیان بوونەتە گرێکوێرە ئەستەمە بتوانن گرێکوێرەی خەڵکانی دیکە چارەسەر بکەن و بە ئازادییان بگەیەنن. گرنگترین ئەنجامی PKK و شەڕی شۆڕشگێڕی گەل سەبارەت بەو بابەتە هێناویەتە ئاراوە: ڕزگاری و ئازادی کۆمەڵگا بە شیکارکردنی دیاردەی ژن، ڕزگاری و ئازادبوونەکەیدا دەرباز دەبێت. بەڵام هەروەک ئاماژەمان پێکرد، پیاوی کورد ناموسە شێوێنراوەکەی خۆی یاخود لەمیانەی پێناسەیەکی ڕاستتری زانستییەوە بێ ناموسی خۆی لە باڵادەستی ڕەهای سەر ژندا دەبینێت. ئەوەی پێویستە شیکار و چارەسەر بکرێت ئەو ناکۆکیە مەترسیدارەیە .

لەبەر ئەوەی لەبەشەکانی پێشووتر باسی ئەمجۆرە هەوڵانەمان کرد دووبارەی ناکەینەوە. لەمیانەی هەنگاونان بەرەو بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا ئەوەی پێویستە ئەنجامبدرێت، پێچەوانەی ئەو کار و ڕەفتارانەیە کە تائێستا لەژێر ناوی ناموس کراون. لە پیاوێتی سەراوژێرکراوی کورددا تۆزێکیش باسی خۆم دەکەم. ئەویش پێویستە بەمجۆرەبێت: پێویستە بەتەواوی واز لە چەمکی موڵکایەتی دەرهەق بە ژن بێنین، پێویستە ژن تەنیا و تەنیا هی خۆی بێت. بگرە پێویستە زۆر باش بزانێت کە بێ خاوەنە و تاکە خاوەنیش بەخۆیەتی. پێویستە بەهیچ هەستێکی گرێدانی لەجۆری ئەشق و خۆشەویستی کوێرانە وابەستەی ژن نەبین. بەهەمان شێوە پێویستە ژنیش خۆی لەدۆخی وابەستەبوون و خاوەندار ڕزگار بکات. پێویستە یەکەمین مەرجی شۆڕشگێڕی و تێکۆشەر بەمجۆرەبێت. ئەوانەی لەو ئەزموونەدا سەرکەوتوو دەبن، بە واتایەک لە واتاکان ئەو کەسانەن کە ئازادییان لە کەسایەتی خۆیاندا دەستەبەر کردووە، دەتوانن کۆمەڵگای نوێ و نەتەوەی دیموکرات لە کەسایەتی ئازادی خۆیان دەستپێبکەن و بونیادی بنێن.

تەواو لێرە بەپێناسە ڕاستەقینەکەی ئەشق دەگەین. ئەوەی هەرەس و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگاکەی ناوەستێنێت پێویستە بەر لەهەموو شتێک لەو ناموسە یاخود بە واتا زانستییەکەی دەستبەرداری ئەو بێناموسیە بێت کە بەشێوەیەکی بەرامبەر چەمکی ناموسیان لەدەوروبەری ژن ئاواکردووە، لەحاڵەتێکدا بەشێوازێکی ملیتانانە هەنگاو بۆ

بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات بهاوێژرێت و بە واتا کۆمەڵایەتییەکەی بگات، ئەگەر زۆر زەحمەتیش بێت لەوانەیە بە پۆتانسێلی بەدیهاتنی ئەشق بگات.

لە پرۆسەی نەتەوەبوونی دیموکراتدا ئازادبوونی ژن بایەخێکی زۆری هەیە. ژنی ئازاد کۆمەڵگای ئازادە. کۆمەڵگای ئازادیش نەتەوەی دیموکراتە. باسی گرنگی شۆڕشگێڕانەی پێچەوانەکردنەوەی ڕۆڵی پیاومان کرد. ئەوەش مانای ئەوەیە لەجیاتی ئەوەی لە ڕێگای ژنەوە درێژەدان بە ڕەچەڵەک و باڵادەستی سەر ژن بدات، بە هێزی خۆی بەردەوامی بە نەتەوەبوونی دیموکراتیک بدات، هێزە ئایدیۆلۆژی و ڕێکخستنیەکەی ئاوا بکات و دەسترۆیی سیاسی خۆی زاڵ بکات؛ واتە خۆ ئافراندنێتی لەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیەوە. لەجیاتی زۆربوونی جەستەیی پێویستە زیاتر بەهێزبوونی زهنی و ڕۆحی بەدەست بێنێت. ئەو ڕاستیانە سروشتی ئەشقی کۆمەڵایەتی بەدیدێنن. بەدڵنیایەوە پێویستە ئەشق بۆ هەستگۆڕینەوە و کەمەندکێشی زایەندی نێوان دووکەس بچووک نەکرێتەوە. بگرە پێویستە گیرۆدەی ئەو جوانییە رووکەشیانەش نەبین کە واتای کلتوورییان نییە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سیستەمێکە لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی ئەشق ئاواکراوە. نکوڵیکردنی کۆمەڵگا، هاربوونی تاکڕەوێتی، داگیرکردنی هەر بوارێک لەلایەن ڕەگەزپەرستیەوە، بە ئیلاهیکردنی پارە، جێگیرکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە لەجێگای خوادوەند، گۆڕینی ژن بۆ ناسنامەیەکی بێکرێ یاخود خاوەن کەمترین هەقدەست بناغەی ماددی نکۆلیکردنی ئەشقە .

پێویستە زۆر بەباشی سروشتی ژن بناسین. نزیکبوونەوە لەسەر بنەمای سەرنجڕاکێشی بایۆلۆژی زایەندی ژن و لەو چوارچێوەیەشدا پەیوەندی بەستن لەگەڵ ژن هەر لەسەرەتاوە مانای لەدەستدانی ئەشقە. وەک چۆن بەیەکگەیشتنە بایۆلۆژیەکانی زیندەوەرانی تر بە ئەشق دانانێین، ئەوا جووتبوونی زایەندی بایۆلۆژی مرۆڤیش بە ئەشق ناو نابەین. دەشێت ئەوە بە چالاکییە ئاساییەکانی زۆربوونی بوونەوەران ناوببەین. بۆ بەڕێوەبردنی ئەو چالاکیانە بگرە پێویست ناکات مرۆڤیش بێت. هەڵبەتە مرۆڤە ئاژەڵەکان بە ئاسانترین شێوە ئەو کردار یاخود چالاکیانە بەڕێوەدەبەن. ئەوەی خوازیاری ئەشقی ڕاستەقینەیە پێویستە دەستبەرداری ئەو شێوازەی زۆربوونی مرۆڤ ـ ئاژەڵیانە بێت. بەو ڕادەیەی هەڵسەنگاندنی ژن وەک ئۆبژەیەکی کەمەندکێشی زایەندی دەرباز بکەین، دەتوانین ژن بکەین بە هاوڕێ و دۆستێکی بەهادار. زەحمەتترین پەیوەندی، ئەو هاوڕێتی و دۆستایەتییەی ژنە کە ڕەگەزگەرایی دەربازکردووە. تەنانەت ئەگەر لەهەلومەرجەکانی هاوژیانی ئازادیش ژیان لەگەڵ ژن جێگای باس بێت پێویستە ئەو دۆخە دەرباز بکەین کە بەردەوام وەک سنووره نەریتییەکان و مۆدێرنیتە ژن لە ڕۆڵی خێزان، دایک، خوشک و خۆشەویست دابنێین. بەر لەهەموو شتێک پێویستە پەیوەندی بەهێزی مرۆڤ لەسەر بنەمای یەکێتی مانا و مرۆیبوونی کۆمەڵگا زاڵ بکەین. ئەگەر گەرەک بێت پێویستە ژنێک یاخود پیاوێک دەستبەرداری هاوسەرەکەی، منالەکەی، دایک، باوک و خۆشەویستەکەی بێت، بەڵام هەرگیز دەستبەرداری ڕۆڵە سیاسی و ئەخلاقییەکەی

ناو کۆمەڵگا نەبێت. پیاوی بەهێز هەرگیز لە ژن ناپاڕێتەوە، بەدوای ناکەوێت، لێی نادات، جنێوی پێنادات و ئیرەییشی پێنابات. تەنانەت ئەگەر هاوژین و خۆشەویستەکەشی بێت، کاتێک داوای جیابوونەوە بکات پەنجەیەکیشی بۆ نابات. بگرە ئەگەر رەخنەشی هەبێت دوای ئاراستەکردنی رەخنەکانی لە بەسەربردنی ژیانی خوازراویشیدا یارمەتی دەدات. ئەگەر بیەوێت پەیوەندییەکی لەگەڵ ژندا هەبێت کە بناغە ئایدیۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکەی بەهێز بێت، پێویستە بژار و لێگەڕین بۆ ژن جێ بهێڵێت. چەندە ئاستی ئازادی ژن، بژاری ئازاد و توانای بزاوتی پشتبەستوو بە ئیرادەی خۆیی پەرەبسەنێت ئەوا بەو رادەیە دەتوانێت بەشێوەیەکی جوان و واتادارتر لەگەڵ ئەو ژنەدا بژیت.

نموونەبیترین هاوژیانی ئازادی نێوان ژن و پیاو لە هەلومەرجی رۆژی ئەمڕۆمان و راستینەی کۆمەڵایەتیماندا ئەوکاتە بەدیدێت کە سەرکەوتنی مەزن لە کار و خەباتە قورسەکانی بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات بەدەست بهێنرێت. لە کوردستانی رۆژی ئەمڕۆماندا دیالیکتیکی ئەشقێکی مانادار لەراستینەی کۆمەڵگای کوردا تارادەیەکی زۆر پێویستە پلاتۆنیک بێت. ئەو ئەشقە بەهادارە. ئەشقی پلاتۆنیک ئەشقی فیکر و کردارە. هەر بۆیە بەهادارە. ژیانێکی بەردەوام لەگەڵ ژنێکی شاجوانی جیهان ئەشق نییە. هەڵبەتە لەبەر ئەوەی ئەشق نییە، ماوەیەکی کورت دوای بەیەکەوە بوون دووڕوویی دەردەکەوێت. چونکە سەرچاوەی خۆی لە پەیوەندییەک وەردەگرێت کە بێواتا ئاواکراوە یاخود بنەماکەی جەستەییە. لەبەرامبەر ئەوەشدا لە پراکتیکی PKK و KCK دا چەندین کوڕ و کچی لاو کە کۆیلەی دوێنێ بوون، بە بێ ئەوەی بەیەکەوە بن و جووتبن، لەمیانەی ئەشقێکی پلاتۆنییەوە کاری گەوریان لە بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتی گەلەکەیان ئەنجامداوە و بەهێزی کەسایەتی خۆشیان سەلماندووە. لەو بارەیەوە بە سەدان شەهیدی هێژا و قارەمانمان هەیە. ئەوانە ئەو گەورە لەهەنگانەن کە بوونەتە مەم و زین .

بەو بۆنەیەوە ئاماژەکردن بە ئەزموونەکانی خۆم بە قەرز دەزانم. ئەوەندەی لە یادمە هەر لەتەمەنی منداڵیدا یاریکردن لەگەڵ کیژۆڵانم بە پێویستییەکی ئازادی دانابوو. لە کاتی شوکردنیان، خوشکەکانیشم لەناودا هەستێکم لا دروست ببوو وەک بڵێی؛ هەموویانم لەدەستداوە. کە تۆزێک گەورە بووم و رووبەڕووی ئەخلاقی ناموسی وشکی کۆمەڵگا بوومەوە بە تەواوی پاشەکشێم کرد. بەڵام ئەوە پاشەکشێیەک بوو کە بە دڵشکاوی بەسەر چوو. هێدی هێدی تێدەگەیشتم کە لەمێژە ژنانمان لەدەستداوە. هەرگیز لەو ستاتۆیە رازی نەبووم کە لەنێوان ژن - پیاو ئاواکرابوو. بەردەوام گومانم هەبوو کە ئەو ستاتۆیە لەسەر هەڵە بونیادنراوە. ستاتۆیەک بوو پەسەندم نەکرد. لەمیانەی پشتبەستن بەو ستاتۆیەوە هیچ کاتێک داخوازی بەیەکەوەبوونم لەگەڵ ژن پێشنەکەوت. لەو بڕوایەدام هەر لەتەمەنی بچووکیمەوە دایکم دەرکی بەو دۆخەم کردبوو، هەربۆیەش پێی گوتبووم: "بەو دۆخەتەوە ناتوانیت لەگەڵ ژن بیت" لەراستیدا منیش هیچ کاتێک نەمویستوە ببمە خاوەن ژنێک. بگرە داواشم بکردایە نەمدەزانی چۆن لەگەڵ ژندا بژیم. کاتێک گەورە بووم، ببووم بە منداڵێکی گەورە. واتە پیاوەکانی تەنیشتم هەریەکە و ببوون بەگورگی ژنان، منیش وەک

بەلەنگازێک لەو نێوانەدا مابوومەوە. وەک خەیاڵێک مەیل و هۆگری ژنانم بەرامبەر خۆم بەبیر دێتەوە. لەوانەیە بە چاوی " بوویەرێکی بێ هیوا " سەیری منیان کردبێت. بە مانایەکی تر ئەو هەستەیان پیشاندەدام کە: کەسێکی خۆشەویستی، بەڵام بەگوێرەی رۆژگار نیت. لەکاتێکدا هەرکەس هاوسەر و خۆشەویستێکی بۆ خۆی دەدۆزیەوە، لەو بارەیەوە توانای هەناسەدانیشم نەبوو. هاوشێوەی ئەشقی خوداوەند ئەشقم بۆ شتی دیکە نەبوو. تاکە مەسەلەی هۆگری ببووم بەدەستهێنانی هاوڕێی باش بوو.

بەر لەوەی باسی ئەو بوویەرە پووچەی هاوسەرگیری بکەم کە لە ناکاو روویدا، مەیلگەلێکم هەبوو کە دەشێت بە ئەشقی پلاتۆنیکی ناوی ببەم. چەندە جوانییە ئیلاهیەکەی ژنم بۆ روون دەبوویەوە دەکەوتمە ژێر کاریگەریەکەیەوە. بەڵام ئەو هێز و داخوازیەم نەبوو بە لایەنی بەرامبەری راگەیەنم. بەردەوام نیشتیمانی لەدەستدراو کوردستان، ناسنامەی ونبووی کوردانم لەژێر ئەو ئەشقە پلاتۆنییەدا دەبینی. بە بڕوای من ئەوەی نیشتیمان و ناسنامەکەی لەدەستداوە ناشێت ئەشقێکی بەهێز، ئارەزوومەندانە و بە ئیرادە و کردەی هەبێت. چەندە جێگای داخ و ئێش و ئازارە کە ئەو چەسپاندنەم راست بوو. ئەگەر بڵێم هەست لەژێر هاوسەرگیرییە پووچ و مەترسیدارەکەمدا نەبوو، راست نابێت. ئەگەر بڵێم تەنیا بە ئامانجی سیاسی بوو دەبێتە دووڕوویی. هەست و ئامانجی سیاسی هەردووکیشیان هەبوون. نازانم ئەو بوو یاخود من بووم کە یەکەمجار لە دەرگامدا. ئەگەر بڵێم رێکەوت بوو، واقیعی نابێت. بە بڕوای من تاکە روونکردنەوەی ئەو پەیوەندییە، وڵاتی ونبوو و ناسنامەی کۆمەڵایەتی لەدەستدراو ئەشقیان سەرناگرێت. رووداوەکان ئەو راستییە دەسەلمێنن. ئەو ساڵانە ساڵانێک بوون کە هەرگیز ئەشق سەرینەدەگرت. لەراستیدا پارچە مۆسیقاکەی ئارامیش کە ئەو کاتە گوێم لێی بوو باسی ئەو دۆخە مەحاڵەی دەکرد. پێویستە ئاماژە بەو خاڵەش بکەم ئەو رقە گەورەیەی بەرامبەر سەرنەگرتنی ئەشق لام دروست بوو رۆڵی لە هەنگاونانم بۆ بونیادنانی PKKو شەڕی شۆڕشگێڕی گەل هەبوو. کاتێک ژمارەیەکی زۆری کچان ـ ژنان بەشداری خەباتەکانم بوون، ئەشقێکی جڤاتی لەگەڵیاندا جێگای باس بوو. هەلومەرجەکانی ئەشقی تاکەکەسی لەئارادا نەبوو. بە هیچ جۆرێک بوێری ئەشقی تاکەکەسیم پیشاننەدا کە جگە لەمن لەناوPKK و دەرەوەش کەسانێکی زۆر تاقییان کردۆتەوە. دیسان کەوتبوومە ناو ترسەوە. بە واتایەکی دیکە بەردەوام بیرم لە مەحاڵبوونی ئەو جۆرە ئەشقانە دەکردەوە. ئەو بیرکردنەوەیەشم راست بوو. ئەوکاتە بەردەوام فیکری "بووکی کوردستان"م بەخەیاڵدا دەهات. هزری "بووکی من" هەرگیز جێگای باس نەبوو. بە سەدان کچ هەبوون کە لەمن بوێرو ژیرتر بوون. بەشێکی زۆریان شەهید بوون. بەردەوام هەوڵمدەدا پێیان بڵێم؛ کە هی ئەوانم و لایەنگریانم. بەڵام ئەوە هەوڵێکی بێ ئاکام بوو.

لەو دۆخانەدا پێویستە ئازادی نیشتیمان، رزگاری کۆمەڵگا و نەتەوەیەک لەتاک و فاکتەرەکانی ئەشق رەنگبداتەوە یان نوێنەرایەتی بکرێت. تەنانەت ئەوەش پێویستی بە تێکۆشانێکی چڕی سەربازی و سیاسی هەیە، پێویستی بەهێزێکی گەورەی سیاسی و

ئـەخلاقی هەیـە. هـەروەها بـۆ ئەسـتاتیکایی و بێبەشبوون لـە جـوانی پەسـەند ناکـات. ئەوانـەی بانگەشـەی ئەشـقی پلاتۆنییـان هەیـە کاتێـک ئەشـقەکەیان تایبـەت دەکـەن و خوازیارن لە دۆخی بەرجەستەدا ژیانداری بکەن، پێویستە تەواوی ئەو مەرجانە جێبـەجێ بکەن. ئەگەر هێزەکەیان توانای جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی نـەبێت پێویسـتە درێـژە بـە ئەشقی پلاتۆنیی خۆیان بدەن، ئەگەر هێزەکەیان بەشی ئەوەش نـەکات و واتـای پێنـەدەن ئـەوا هاوسـەرگیری شارسـتانی (نـەریتی)و مۆدێرنیتـە جێگـای بـاس دەبێـت کـە ڕێسـا بایۆلۆژییـەکان یـاخود بەیەکـەوەبوونی زایەنـدی کۆیلانـە لەئارادایـە. ئەشـقی ئـازاد و هاوسەرێتی بایۆلۆژی ـ کۆیلایـەتی یـان پەیوەندیـەکانی دەرەوەی هاوسـەرێتی بەیەکـەوە نابن. یاسای ئەشق ئەو جۆرە پەیوەندییانە هەڵناگرێت.

لە گەورە شەهیدە ژنەکان و ئەو بەها شکۆدارانە فێربووم کە ژن کەینونەیەکی هێژا و بەهادارە. ئەوەی لەگەڵیان هاتۆتەئاراوە سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ئازادانـەی ئەشـقی وڵاتی ونکراو و ناسنامە کۆمەڵایەتییە لەدەستدراوەکە بوو. لەڕاستیدا ئەویش بە ئەشقێکی زۆر بـەهادار، مـەزن و ڕاسـتەقینە دادەنـرا. ئەشـقێک بـوو کـە خـائین و دووڕووەکانیشـی زۆربوون. بەمجۆرە منیش هەم بیرەوەری مەم و زینم زیندوو کردەوە هەم بەدیم دەهێنا.

### ٥ . نەتەوەی دیموکرات و خۆسەری ئابووری

دەوڵەت ـ نەتەوە ئامرازی باڵادەستی مۆدێرنیتەی سـەرمایەدارییە لەسـەر ئـابووری و پشت بە بەدەستهێنانی زۆرتـرین قـازانج دەبەستێت. ئـەو ئـامرازە نـەبێت بەدەسـتهێنانی زۆرترین قازانج و کەڵەکەکردنی سـەرمایە بەدینایـەت. لـەمێژووی شارسـتانیدا گوزارشـت لەبەرزترین ئاستی تاڵانی ئابووری دەکات کە لەسـەر بنـەمای مەشروعیەتێکی دیـاریکراو ئەنجام دەدرێت. ئەگەر پەیوەندییەکەی لەگەڵ زۆرترین قـازانج و کەڵەکـەکردنی سـەرمایە بەشێوەیەکی ڕاست شیکارنەکرێت، ئەوا پێناسەیەکی ڕاست بۆ دەوڵەت ـ نەتـەوە ئـەنجام نادرێت. ناشێت دەوڵـەت ـ نەتـەوە بەتـەنیا وەک سیستەمێکی تونـدوتیژی و دەسـەڵات پێناسە بکرێت. تەنیا کاتێک دەسەڵاتی دەوڵەت بەشێوەی دەوڵـەت ـ نەتـەوە ڕێکدەخرێت مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری بەدیـدێت، بەتایبـەتیش زۆرتـرین قـازانج و کەڵەکـەکردنی سەرمایە دەستەبەر دەبێت کە لەسەر ئابووری بەدەستی دێنێت. ئـەوەش مانـای گەیشـتنی دەوڵەت ـ نەتەوەیە بە پایەی ئەو دەوڵەتـەی بـەدرێژایی مێژوو زۆرتـرین زێـدە ـ بـەهای تاڵان کردووە، مانای ئاواکردنی دەوڵەتێکی بەم چەشنەیە. جیلوەکردنی بە ناسیۆنالیزم و نیشتیمانپەروەری، بـە ئیلاهیکردنـی لەمیانـەی پـەروەردە و دزەکردنـی بـۆ نـاو وردتـرین دەمارەکـانی کۆمـەڵگا لـەپێناو ڕەواکردنـی سیسـتەمی زەوتکـاری سـەر ئابوورییـە. ئـەو دەستەواژە، تیۆری و دامەزراوانەی لەبوارەکانی یاسا، ئابووری ـ سیاسی، دیبلۆماسـی و .. هتد پێشدەخرێن بەهەمان ئامـانج لـەپێناو بەدەسـتهێنانی مەشـروعیەتدا هـەوڵ دەدەن. کاتێک شانبەشانی تیرۆرێکی بـۆ ئامـان بەدەسـتهێنانی زۆرتـرین قـازانج لەسـەر بـواری

ئـابووری پـەیڕەو دەکرێـت، لەلایەکـەوە لەبەرامبـەر سـک تێرکـردن مـەحکومی کرێکـاری هەقدەستی رۆژانە و کرێی دەکات، لەلایـەکی دیکەشەوە بەشـی هـەرە زۆریـان دەکـات بـە سوپای بێکاران. کۆیلایەتی کەمترین کرێ و گەورە سوپاکەی بێکاران ئەنجامێکی سروشتی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزمن. بەدیهاتنی ئەو سێ فاکتەرە سەرەکیەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنیا لەمیانەی لە بەینبردنی ئـازادی کۆمـەڵگا لـەبواری ژیـانی ئـابووری، مـەحکومکردنی بـە کۆیلایـەتی کـرێ و گـۆڕینی بەشـێکی زۆریـان بـۆ سـوپای بێکـاران و کۆیلایەتی بێکرێ ـ هەرزان کرێی ژنان دەستەبەر دەبێت. بەگشتی زانستە کۆمەڵایەتیەکانی سەرمایەداری، بەتایبەتیش زانستی ئابووری ـ سیاسی میتۆلۆژیایەکن لەپێناو شێواندن و شاردنەوەی ئەو راستینەوە رێکخراون، پێویستە هەرگیز باوەڕیان پێ نەکەین و ئاگـاداری رووی راستەقینەیان بین.

لەوانەیە کوردستان و کۆمەڵگای کورد یەکێک لەو نموونە دەگمەنانەی دونیا بێت کـە لەلایەن سێ فاکتەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریەوە سیستەمێکی تاڵان لەسـەر ژیانە ئابووریەکەی ئاواکراوە، بەئاستی قڕکردنی کلتووری گەیشتووە و ژن و پیـاوە کـەم هەقدەستەکانی بۆ سوپای بێکاران گۆڕیوە. لەمیانەی شەڕی تایبەتی یەکلایەنەی قڕکردنی کلتـووری شـاراوە و هەمیشـەیی دەوڵــەت ــ نەتــەوە دەسـەڵاتدارەکانی سـەر کوردسـتان هەوڵدەدرێت لە دۆخـی نیشـتیمان دەربخرێـت. لەراسـتیدا مێـژووی ئـەو دوو سـەد ساڵەی دوایی مێژووی نەهێشتنێتی وەک وڵات و تواندنەوەیەتی لەناو دەستەواژەی "یەک وڵات "ی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان. سەبارەت بە کۆمەڵگای کوردیش ئـەو مێـژووە دیرۆکـی تووشـبوون بــە ئاسیملاسـیۆن و کۆمەڵکوژییەکانــە، بێکــارکردن و کرێکــاری کــەمترین هەقدەستە، لەئاکامی زەوتکردنی ئازادی ژیانـە ئابوورییەکـەی مێـژووی پەرتـەوازەبوون، بـەئۆبژەکردن و بێنــاوەڕۆککردنێتی. لەگـەڵ زیــادبوونی هەرسـێ فاکتــەرە سـەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (تاڵانکردنی زۆرترین قـازانج، ستەمکاری دەوڵـەت ــ نەتـەوە، وێرانکاریەکانی ئیندوستریالیزم لەرێگای تەکنۆلۆژیاوە) بۆ سەر ئەو فەتح، داگیرکـاری، دەستبەسەرداگرتن، تـاڵان، چەوسانەوە و ئاسیمیلاسیۆنەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی کۆمەڵگای کـورد دووچـاری هـاتووە، لـەدەرەنجامی ئـەو قڕکردنـە کلتوورییـەی دووچـاری هـاتووە بـەدۆخێک گەیشـتووە لەخاوەنـداریێتی کردنــی خــۆی بترسـێت. کۆمەڵگایەکـە کۆنترۆڵکردنی ئابوورییەکەی و بژاری ئازادی خۆی لەدەستداوە، بەتەواوی کەوتۆتـە ژێر کۆنترۆڵی جانەوەرە مۆدێرنە سێ پێیەکەی فاکتەرە بەکرێگیراو و بیانییەکان. کارکردنی بە نان و سک (وەک ئەو ماسییەی بە سنارەوە بووە)یش پیشـانیدەدات کـە کۆمەڵگایەکە بـە ئامانجی کۆمەڵکوژی و قڕکردن بەستراوەتەوە. بەڵێ کۆمەڵگایەکـە ئافرێنـەرانی ئـابووری واتە ژنان بە تـەواوی بێکـارکراون و رەنجەکـەیان بێنـرخ دەبینرێت. کۆمەڵگایەکـە لـەژێر ناوی گوزەران و ژیانـدنی ماڵبـات پیـاوانی لـە هـەر چـوار لای جیهـان پەرتـەوازە بـوون. کۆمەڵگایەکە لەپێناو مریشکێک و بستێک خاک یەکتری دەکوژن. ئاشکرایە کـە ئـەوە ئـەو کۆمەڵگایەیە کە بێ ناوەڕۆک کراوە، پووکێنراوەتەوە و هەڵوەشێنراوەتەوە.

داگیرکاری ئابووری مەترسیدارترین جۆرەکانی داگیرکارییە. داگیرکاری ئابووری دڕندانەترین ڕێبازی خستن، پووکاندنەوە و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگایە. لە ستەم و سەرکوتکاریەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکانی سەر کورستان زیاتر، لەمیانەی زەوتکردن و دەستبەسەرداگرتنی ئامرازە ئابووریەکانیەوە ژیانە ئابووریەکەی کۆنترۆڵ کراوە و کۆمەڵگای کوردی هەناسەی لەبەربڕاوە. کۆمەڵگایەک کۆنترۆڵی خۆی لەسەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و بازاڕی خۆی لەدەست بدات ئەستەمە ئازادانە بەردەوامی بەژیانی خۆی بدات. کوردان تەنیا کۆنترۆڵی سەر ئامرازەکانی بەرهەمهێنان و پەیوەندیەکانی لەدەستنەداوە؛ بەڵکو کۆنترۆڵی بەرهەمهێنان، بەکاربردن و بازرگانیشیان لەدەست دەرهێنراوە. بە مانایەکی تر لەسەر بنەمای نکوڵیکردنی ناسنامەی خۆیان و ڕادەی وابەستەبوونیان بە دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەڵاتدارەکان دەرفەتی بەکارهێنانی موڵک و ڕۆڵ بینینیان لە بازرگانی و پیشەسازی بۆ ڕەخساوە. زینندانی ئابووری بوو بەکاریگەرترین ئامرازی نکوڵیکردنی ناسنامە و بێبەشبوون لە ئازادی. بەتایبەتیش بەکارهێنانی یەکلایەنەی سەرچاوەکانی ئاو و پترۆڵ، شانبەشانی پێکهاتە کلتوورییە مێژووییەکەیان زەوییە بەپیتەکانیشی لەناو برد. ئەو چەوسانەوە و داگیرکارییە ئابوورییەی دوای داگیرکاری سیاسی و کلتووری چڕترکرایەوە بوو بە دواترینی گورزە کوشندەکان و لەئاکامدا بەو حاڵە گەیشت "یان لەدۆخی کۆمەڵگابوون دەرکەوە، یان بمرە".

سیستەمی ئابووری نەتەوەی دیموکرات تەنیا بە بەربەستکردن و وەستاندنی ئەو کردەوە دڕندانە ناوەستێت، بەڵکو سەرلەنوێ کۆنترۆڵی ئابووری بۆ کۆمەڵگا دەگێڕێتەوە. خۆسەری ئابووری نزمترین ئاستی ڕێککەوتنە کە لەنێوان دەوڵەت ـ نەتەوە و نەتەوەی دیموکرات دێتەئاراوە، ڕێککەوتن یاخود چارەسەرییەک لەوە کەمتر بێت، مانای ڕادەستبوون و "لەناوچوون" دەبەخشێت. گەیاندنی خۆسەری ئابووری بەسەربەخۆیی مانای ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوە دەبەخشێت، لەئاکامدا ئەوەش ڕادەستبوونە بە مۆدێرنێتەی سەرمایەداری. دەستبەردان لە خۆسەری ئابووریش ڕادەستبوونە بە دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار. ناوەڕۆکی خۆسەری ئابووری نە سەرمایەداری تایبەت، نە سەرمایەداری دەوڵەت هیچ یەکێکیان بەبنەما ناگرێت. بەو سیفەتەی شێوەی ڕەنگدانەوەی دیموکراسییە لە ئابووریدا پیشەسازی ئیکۆلۆژی و ئابووری کۆمین (هەرەوەزی) بەبنەما دەگرێت. ئەو سنوورەی بۆ پیشەسازی، گەشەسەندن، تەکنۆلۆژیا، کارگە و موڵکایەتی دادەنرێت سنووری کۆمەڵگای دیموکرات و ئیکۆلۆژییە. لە خۆسەری ئابووریدا جێگای ئەو پیشەسازی، تەکنۆلۆژیا، گەشەسەندن، موڵکایەتی، نیشتەجێبوونی لادێ ــ شارە نابێتەوە کە نکوڵی لە کۆمەڵگای دیموکرات و ئیکۆلۆژی بکات. ئابووری وەک بوارێک بەجێناهێڵرێت کە کەڵەکەکردنی قازانج و سەرمایەی لەسەر بەدیبێت. خۆسەری ئابووری مۆدێلێکە کە کەڵەکەکردنی قازانج و سەرمایە بە نزمترین ئاست دادەبەزێت. لەگەڵ ئەوەی بازاڕ، بازرگانی، هەمەڕەنگی بەرهەمەکان، کێبڕکێ و بەرهەمداری ڕەدناکاتەوە،

بالادەستی کەڵەکەکردنی قازانج و سەرمایەی لەسەر پەسەند ناکات. بەو رادەیەی سیستەمی فینانس و دراو خزمەت بە بەپێتی ئابووری و رێکارەکانی بکات رێگای پێدەدرێت. قازانجکردنی پارە بە پارە بە ئاسانترین شێوەی چەوسانەوە دادەنێت، هەربۆیە ئەو چەشنەی چەوسانەوە لەناو خۆسەری ئابووریدا جێگای نابێتەوە. خۆسەری ئابووری نەتەوەی دیموکرات کارکردن بە زەحمەتی و سوغرەکردن نابینێت، بەڵکو بە چالاکی و کردارێکی ئازادبوونی دادەنێت. پرەنسیپەکەی بریتییە لە "کارکردن ئازادییە"، هەڵسەنگاندنی کارکردن وەک زەحمەتی و سوغرەکردن؛ سەرچاوەکەی لە نامۆبوون لەئاکامەکانی رەنجەوە دێت. کاتێک ئەنجامەکانی رەنج خزمەت بە ناسنامەی خود و ئازادیەکەی بکات، ئەوە چالاکیەکە بە دڵخۆشی و بەختەوەرییەوە پێشوازی لێدەکرێت.

ئەو چالاکیە ئابوورییەی رێگای بە قۆستنەوە نەداوە سەرەتا لە کۆمەڵگای نیولیتیک و سەرجەم جڤاتەکان بە جۆش و خرۆشانی جەژنەوە پیرۆزکراوە. خۆسەری ئابووری نەتەوەی دیموکرات سیستەمێکە کە دووبارە ئەو جۆش و خرۆشەی تێدا روودەدات. ئەو بەنداوانەی لەسەر سەرچاوە ئاوییەکانی کوردستان دروستکراون بەتەواوی رێگایان لەپێش وێرانکردنی مێژوو و کارەساتی ژینگەیی کردۆتەوە. ناشێت رێگا بەهیچ بەنداوێک بدرێت کە مێژوو، زەوی بەپیت و ژینگە رەچاو ناکات، بگرە ئەوانەی بونیادیش نراون کاتێک تەمەنیان بەسەرچوو بەنداوی نوێ لەجێگایان دروست ناکرێتەوە. دەرفەت هەبێت پێویستە دوودڵی لە رووخاندنی پێشوەختیشیان نەکرێت. بە رۆحی سەفەربەری دژی داخوران و لەناوبردنی دارستانەکان دەوەستێتەوە کە دوژمنایەتیکردنی کۆمەڵگا و بوونەوەرەکانە. پاراستنی خاک و دارستانەکان و چاندنی نەمام و درەخت بە پیرۆزترین جۆرەکانی رەنج دادەنێت، تەنیا کارەکانی ئەو دوو بوارە بەسە بۆ ئەوەی بەدرێژایی سەدان ساڵ کۆتایی بە بێکاری بێنێت. وەک چۆن ئەو بوارەی زۆرترین قازانج بەدەست بێنێت پیرۆزترین بواری چالاکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە، بوارەکانی دارستان و خاکیش کە بەدرێژایی مێژوو کۆمەڵگای ژیاندووە پیرۆزترین بوارەکانی کارکردنی نەتەوەی دیموکراتە. بەبێ سەرمایەداری و ئیندوستریالیزم ژیانی کۆمەڵایەتی و کۆمەڵگا بەردەوام دەبێت، بەڵام بەبێ خاک و دارستان ژیانی کۆمەڵایەتی بەردەوام نابێت. بێگومان لەڕاستیدا دابڕاندنی مرۆڤ و کۆمەڵگاکان لە خاک، لادێ و دارستان لەلایەن سەرمایەدارییەوە ریشەی بێکاری پێکدێنێت. هێزی کاری هەرزان و کۆگای بێکاران بەردەوام لەپێناو زۆرترین قازانجی سەرمایەداری پێویستن و دیاردەیەکە بە ئەنقەست و لەمیانەی فشارەوە ئافرێنراوە. دووبارە گەڕانەوە بۆ خاک و ئاوەدانکردنەوەی دارستانەکان، بەکورتی؛ گەڕانەوە بۆ ژیانی ئیکۆلۆژی تەنیا کۆتایی بە بێکاری ناهێنێت، لە کۆمەڵگا شێرپەنجەییەکەی شاریش رزگارت دەکات. بەمجۆرە شاریش رزگار دەکات. ئەو شارەی هاوشێوەی تەنێکی نەخۆشی گەورەدەبێت نەخۆشی شێرپەنجەیە. هەڵبەتە هاوشێوەی چەندین نەخۆشی دیکە شێرپەنجەی مرۆڤیش بەرهەمی ئەو ژیانەی شارە. لەو سۆنگەیەوە گەڕانەوە بۆ خاک، کار

و چالاکی دارستان، کشتوکاڵ و خۆراکی ئیکۆلۆژی تەنیا ڕێگەچارەی سەرەکی بێکاری نییە، بەڵکو دژە ژەهری سەرجەم نەخۆشیەکانی مۆدێرنێتە و شارە.

پێویستە ئابووری هەرەوەزی خۆسەری ئابووری لەگەڵ ئابووری و سەرمایەداری دەوڵەت تێکەڵ نەکرێت. بە هەوڵەکانی هاوبەشێتی سۆسیالیزمی بونیادنراویش ناچێت. باس لەیەکینەیەکی ئابووری دەکەین کە گونجاوترین یەکینەیە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ و ژینگە یان دەوروبەرەکەی. لە کۆمۆن (هەرەوەزی)دا جێگای سوغرە، کار و ڕەنجێک نابێتەوە کە ئازادی لەگەڵ خۆیدا ناهێنێت. باسی مۆدێلێک و سەرچاوەی خودی ژیان دەکەین کە بە درێژایی مێژوو کۆمەڵگا بە بنەمای گرتووە، لە ڕێگایەوە خۆی ئافراندوو، پیرۆزی کردووە و بە خرۆشەوە پێشوازی لێکردووە. بەرهەم، بەرەکەت و خرۆش لەکوێ بێت ئابووری کۆمۆن (هەرەوەزی) لەوێیە .

KCKش بەو سیفەتەی بڕبڕەی پشتی نەتەوەی دیموکراتە خۆسەری ئابووری و ئابووری هەرەوەزی بەلانی کەم هێندەی بەرگری خۆیی کۆمەڵگا بەپێویست دەزانێت و بەبنەمای دەگرێت. وەک چۆن بەرگری خۆیی نەبێت بوونی کۆمەڵگا بەردەوام نابێت، خۆسەری ئابووریش نەبێت: پشتبەستن بە پاراستنی خاک، زیندووکردنەوەی دارستان، ئیکۆلۆژی و هەرەوەزیش نەبێت، تێر خۆرک کردنی کۆمەڵگا جێگای باس نابێت، لەو سۆنگەیەوە؛ کۆمەڵگا ناتوانێت درێژە بەبوونی خۆی بدات. بناغەیەکی یاساییش بۆ خۆسەری ئابووری پێویستە. ئەو یەک شێوازی و ناوەندیگەراییەی لەیاساکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەسەلاتدارەکان لەئارا دایە، لەژێر ناوی یەکێتی یاساییەوە کۆسپە لەبەردەم داهێنانی ئابووری، ئیکۆلۆژی و کێبڕکێوە. لەجیاتی ئەو چەمکە یاساییەی ئابووری کە لەناوەڕۆکدا پشت بە داگیرکاری و چەوسانەوە دەبەستێت، پێویستییەکی ژیانی بە ئابوورییەکی خۆجێیی و ڕێکارە خۆسەرەکانی هەیە کە هەمئاهەنگی لەگەڵ ئابووری نەتەوەیی ـ نیشتیمانی ڕەچاو بکات. یاسایەکی ئابووری ژیانییە کە نکوڵی لەدیاردەی بازاڕی نیشتیمانی ناکات، بەڵام دینامیزمەکانی بازاڕی خۆجێییش ڕەچاو بکات. یەک سیستەمی یاسایی ناوەندی گەورەترین فاکتەری محافەزەکارییە. پاساوەکەی بەتەواوی سیاسییە و لۆژیکی ئابووری نییە.

لەرەهەندی ئابووری ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتی کێشەی نەتەوەیی کورددا پێویستە خۆسەری ئابووری خاوەن پێگەیەک بێت. ئاشکرایە ئەگەر ژێرخانی ئابووری نەبێت KCK بەردەوام نابێت. ڕادەی پەیڕەوکردنی یاسای خۆجێیی سەبارەت بەو بوارە ئابوورییانەی لەنزیکەوە بوونی کۆمەڵگای کورد و ئازادییەکەی پەیوەندیدار دەکەن گرنگی و بایەخێکی ژیانی هەیە. لەبابەتەکانی ڕێکخستنی موڵکداری، گەورەیی کۆمپانیا، بەکارهێنانی سەرچاوە ئاوییەکان، کانەکانی کانزاکانی سەرزەوی و ژێرزەوی، ئاواکردنی بازاڕ، سیستەمی بانک، پێکهاتەی بودجەی بەڕێوەبەرایەتییە خۆجێیە دیموکراسییەکان، باج و بابەتەکانی دیکە یاسا ئابوورییە خۆجێییەکان مەرجە. دەشێت تەبایی و گونجانی

نێوان یاسا ئابوورییە نەتەوەیی ـ نیشتیمانیەکان و یاسا ئابوورییە خۆجێییەکان ڕێکبخرێت.

بەڕێوەبەرێتی ئابووری KCK گرنگیەکی مەزنی هەیە. کۆمەڵگایەک بناغە ئابوورییەکەی لەناوبرابێت توانای ژیانی نییە. لەسەردەمی ئابووریەک داین کە لەسەر بنەمای سوود وەرگرتن لەیەکتری و بەرفراوانی خۆسەری ناوخۆییە، هیچ کاتێک سەربەخۆیی ئابووری تەواو بەدینایەت و خەیاڵێکە. لەسەردەمی فینانسی جیهانگیریدا ئاشکرابووە کە مۆدێرنێتەی سەرمایەداری چەندە سیستەمێکی ناپێویستە، هەڕەشە لەمرۆڤایەتی دەکات و دەرفەتی بەردەوامبوونی پێنادات. لەبەرامبەر ئەوەشدا پێویستە مۆدێرنێتەی دیموکراتی پشتبەستوو بە یەکینە نەتەوەییە دیموکراتییەکان وەک سیستەمی ئەلتەرناتیڤی رزگاربوون لە قەیرانە ئابوورییەکان، بێکاری و برسێتی مایەی تێگەیشتن بێت.

## ٦ . بونیادی یاسایی نەتەوەی دیموکرات

حقوقی دیموکراسیخواز یاسایەکە لەسەر بنەمای فرەرەنگییە. لەوەش گرنگتر بە دەگمەن پەنا دەباتە بەر ڕێکخستنی یاسایی و بونیادەکەی سادەیە. دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار ئەو شێوەیەی دەوڵەتە کە بەدرێژایی مێژوو زۆرترین ڕێکخستنی یاسایی ئەنجامداوە. هۆکارەکەشی دەستوەردانە لەهەرشتێکی کۆمەڵگا و بەتایبەتیش هەوڵەکانێتی لەپێناو لەناوبردنی کۆمەڵگای سیاسی و ئەخلاقی. کۆمەڵگا کۆنەکان تاڕادەیەکی زۆر لەمیانەی ڕێکخستنە سیاسی و ئەخلاقییەکانەوە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکانی دەدا. مۆدێرنێتەی سەرمایەداریش هەوڵیداوە تەواوی مەشروعیەتی خۆی بە یاسا پشت ئەستوور بکات. دەستێوەردانی زێدەڕۆیانەی بۆ کۆمەڵگا و چەوساندنەوەی کۆمەڵگا ڕێگای لەپێش پەنابردن بۆ ئەو ئامرازە ئاڵۆزە کردەوە کە بە یاسا ناودەبرێت و دادوەری دەکات بە شتگەلێکی رووکەشی. وەک ئەوەی زۆر جار ئاماژەی پێدەکرێت لەوە زیاتر کە حقوق بریتی بێت لەو یاسایانەی کە ئەرک و مافەکانی تاک و کۆمەڵگا ڕێکدەخات، هونەری بەڕێوەبردنی ئەو ناهەقیانەیە کە سەرمایەداری بەدرێژایی مێژوو ڕێگای لەپێش کردوونەتەوە؛ لەمیانەی ئەو ژمارە زۆرەی یاساکانی پشت بە رەوایەتی چەمکی دادوەری رووکەشانە دەبەستن. لەجیاتی ڕێسا ئەخلاقی و سیاسیەکانەوە بەڕێوەبردن لەڕێگای یاساکان زیاتر تایبەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. بۆرژوازی کە نکوڵی لە سیاسەت و ئەخلاق دەکات، پەنا بۆ هێزی یاسا دەبات کە هێزێکی گەورەی بۆ دەستەبەر دەکات. یاسا چەکێکی گەورەی دەستی بۆرژوازییە. لەڕێگای یاساوە خۆی لەبەرامبەر سیستەمە سیاسی و ئەخلاقییە کۆنەکە و زەحمەتکێشەکانی خوارەوە دەپارێزێت. دەوڵەت ـ نەتەوە هێزی خۆی لە دەسەڵاتی یاسا وەردەگرێت کە تاڕادەیەکی زۆر یەکلایەنە ڕێکخراوە. بەجۆرێک

لەجۆرەکان یاسا ئایەتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی خوداوەندە. بەڕێوەبردنی کۆمەڵگاکەی لەمیانەی ئەو ئایەتانەوە بە باش دەزانێت.

لەبەر ئەو هۆکارەشە کە نەتەوەی دیموکرات بەرامبەر یاسا، بەتایبەتیش بەرامبەر ماف و یاساکانی دەستوور وریایە. لە نەتەوەی یاسا ـ حقوق زیاتر نەتەوەی دیموکرات نەتەوەی ئەخلاقی سیاسییە. کاتێک لەژێر چەترێکی سیاسی هاوبەش لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان ڕێکبکەوێت و لەو چوارچێوەیەدا ژیان بەبنەما بگرێت، پێویستی بەیاسا دەبێت. لەو ڕەوشەدا جیاوازی نێوان یاسا نەتەوەیی ـ نیشتیمانییەکان و یاساکانی بەڕێوەبەرێتی خۆجێیی بایەخدار دەبێت. یاساکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە بەشێوەیەکی یەکلایەنە بەرژەوەندییەکانی بیروکراسی ناوەندی بەبنەما دەگرێت کاتێک بەردەوام ڕووبەڕووی بەرخودانی گروپە کلتووری و خۆجێییە دیموکراسیخوازەکان دەبێتەوە، بەناچاری یاساکانی بەڕێوەبەرایەتی خۆجێیی پەسەند دەکات. لەزۆربەی زۆری وڵاتانی جیهاندا، لەسەرووی هەمووشیانەوە ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا، سیستەمەکانی یاسای فیدراڵی و خۆجێیی لە ئارادایە. ئەو سیستەمانەی لەبەرامبەر بیروکراسی ناوەندی و سەرمایەداری قۆرخکار بەرژەوەندییەکانی گەلی خۆجێیی هاوسەنگ دەکەن زیاتر گەشەدەکەن.

لەبەر ئەوەی بوونی کورد و کوردستان حاشای لێکراوە و دووچاری قڕکردن هاتووە، یاسایەکی تایبەت بەخۆی نەبووە. لەسیستەمی عوسمانییەکاندا یاسایەکی نووسراو و نەریتی تایبەت بەخۆیان هەبووە. وێڕای ئەوەی لەسەردەمی ڕزگاری نیشتیمانیشدا ناسنامەی کورد و کوردستان، بگرە یاسای ڕیفۆرمی کوردان بەفەرمی پەسەند کرابوون، بەڵام لەساڵی ١٩٢٥وە لەمیانەی ڕێبازەکانی پیلانگێڕی، کودەتا و ئاسیمیلاسیۆنەوە ناسنامەکەیان حاشای لێکرا و هەوڵیاندا لەمێژوو بیسڕنەوە. سەرباری ئەوەی بەرخودانی PKK بوونی کوردی مسۆگەر کردووە، بەڵام تائێستا دانپێدانانی یاسایی بەدەست نەهێناوە. KCKش لەو قۆناغەدا دەوڵەت ـ نەتەوەکان ناچاری دان پێدانانی یاساییانەی بوونی کورد دەکات، لە حاڵەتێکدا ئەوە بەدینەیەت پێشخستنی یەکلایەنەی یاسای خۆسەری خۆی بە بنەما دەگرێت؛ جێگرتن لەناو دەستوورە نیشتیمانییەکان بە بژاری لەپێشینەیی خۆی دادەنێت. لەو چوارچێوەیەشدا هەوڵدەدات پێگەی خۆسەری دیموکراتیانەی خۆی لەناو دەستوورە نیشتیمانییە دیموکراسیەکان جێگیر بکات. لە زۆربەی وڵاتە ئەندامەکانی یەکێتی ئەوروپا کە کۆماری تورکیا هەوڵی بە ئەندامبوونی بۆ دەدات، ڕێکخستنی یاسای بەمجۆرە لەئارا دایە. بێگومان مەبەست لە ڕێگەچارەی ئاشتی و دیموکراتیانەی کێشەی کورد ڕێککەوتنی دەستووری نیشتیمانی دیموکراتیانەیە کە ستاتۆی خۆسەری دیموکراتیانە لەخۆوە بگرێت (بەیاسا). ئەوەی لە ئێراق ئەنجامدراوە، لە تورکیا و کوردستانیش گفتوگۆیەکی زۆری لەبارەوە دەکرێت چارەسەرییەکی بەمجۆرەیە. ئەگەر ڕێگەچارەی خۆسەری دیموکراتیانە لە چوارچێوەی دەستووری دیموکراتی ـ نیشتیمانی سەرکەوتوو نەبێت کە لەسەر بنەمای ڕێککەوتنەوە KCK ئەولەویەتی

پێدەدات، ئەوا هەنگاو بۆ بەڕێوەبەرایەتی خۆسەری دیموکراتیانەی یەکلایەنە دەهاوێژێت کە دووەمین بژاری لە پێشینەیەتی. بەڕێوەبەرایەتی خۆسەری دیموکراتیانە لە کوردستان بەڕێوەبەرایەتیەکی یاسای دەوڵەت ــ نەتەوە نییە، بەڕێوەبەرایەتی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکە لەئاستی خۆجێیی و هەرێمیدا.

## ٧ . کلتووری نەتەوەی دیموکرات

ڕەهەندی کلتووری فاکتەرێکی گرنگی پێکهاتنی نەتەوەکانە.

لە واتا بەرتەسکەکەیدا کلتوور گوزارشت لە حەقیقەتی سۆزداری و زهنیەتی باوی کۆمەڵگاکان دەکات. لەمانا بەرتەسکەکانیاندا ئایین، فەلسەفە، میتۆلۆژیا، زانست و لقە جیاوازەکانی هونەر کلتووری کۆمەڵگایەک پێکدێنن. بەجۆرێک لەجۆرەکان دۆخی زهنی و ڕۆحی کۆمەڵگا پیشاندەدات. کاتێک بەدەستی دەوڵەت ـ نەتەوە یاخود دەوڵەتەکان نەتەوە ئاوادەکرێت دونیای کلتوور دووچاری قڕکردن و چەواشەکردنێکی مەزن دەکرێت. مۆدێرنێتەی سەرمایەداری نەریت وەک خۆی بەهەموو حەقیقەتەکەیەوە پەسەند ناکات. ئەوەی بەکەڵکی بێت دەیپاڵێوێت و لەسەر بنەمای بەرژەوەندییەکانی خۆی دەیگۆڕێت. ئەوەی لەژێر ناوی مێژووی کلتووری مۆرکی خۆی لێداوە و پێشکەشی کۆمەڵگا و تاکی کردووە شتێکی زۆر جیاوازە، بەناوی مێژوو بێ مێژووییە، بەناوی کلتووریش بێ کلتوورییە. بەدەربڕینێکی دیکە تەواوی کلتووری مێژووی مرۆڤایەتی بەچاویلکە و ڕەمەکی سەرمایەداری دەبژێرێت، بەجۆرێک پێشکەشمان دەکات وەک بڵێی وێنە و تابلۆیەکی نوێ دەکێشێت. لەو چوارچێوەیەدا مۆدێرنێتەی سەرمایەداری و گرنگترین فاکتەرەکەی واتە دەوڵەت ــ نەتەوە بزووتنەوەی چەواشەکردن و شێواندنی کلتوور و نەریتێکی مەزن؛ لەبواری حەقیقەتدا گورزێکی گەورەیە بەر کلتوور و مێژوو دەکەوێت. چونکە بەشێوەیەکی دیکە ناتوانێت یاسای زۆرترین قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایە ڕەوا بکات. مۆدێرنیتە و دەوڵەت ـ نەتەوە سەرلەنوێ کلتوور و مێژوو بەگوێرەی خۆیان ڕێکنەخەنەوە ناتوانن خۆیان بونیاد بنێن. واقیعی مۆدێرنیتە و دەوڵەت ــ نەتەوە کە سەریانهەڵداوە، لەراستینەی کلتوور و مێژوو جیاوازترە، لەبواری حەقیقەتدا مانایەکی جیاوازتر دەبەخشێت.

نەتەوەی دیموکرات مانای راستەقینە بۆ کلتوور و مێژوو دەگێڕێتەوە و هەوڵی خۆبونیادنان دەدات. ئەو کلتوور و مێژووەی دووچاری قڕکردن و چەواشەکردن کراوە، لە نەتەوەبوونی دیموکراتدا ڕێنسانس بەخۆیەوە دەبینێت. هەڵبەتە ئەو ڕێنسانسەی لەسەردەمی دەرکەوتن لەچاخی ناوین لە ئەورووپا هاتەئاراوە، مانای سەرلەنوێ زیندووبوونەوە یاخود لەدایکبوونەوەی کلتوور و مێژووی گریک و ڕۆما بوو. دواتر سەرجەم وڵات و قەومەکانی ئەورووپا نموونەی ئیتاڵیایان بۆ خۆیان بەبنەما وەرگرت، ڕێنسانسی خۆیان ئەنجام دا و لە نەتەوەبوونی دیموکراتدا سەرکەوتوو بوون. سەرلەنوێ

بەیەکگەیشتنی هەر گەلێک لەگەڵ کلتوور و مێژووە ڕەسەنەکەی خۆی (لەمیانەی دەربازکردنی کاسۆلیکی یان گەردوونی) مانای خۆ بونیادنان بوو بە سیفەتی نەتەوەی دیموکرات. لە نەتەوەبوونی ئەوروپا سەرەتا ئەو فاکتەرانە زاڵبوون کە سەرچاوەی خۆیان لە کلتوور و مێژوو وەردەگرت. ئەو فاکتەرانەش لەبنەڕەتدا کلتووری مێژووی گەلان و قەومەکان بوو. لەو سۆنگەیەوە؛ مەیلی دیموکراسی لەنەتەوە پێکهاتووەکاندا لەپێش بوو. دواتر لەگەڵ دەرکەوتنی مەیلی چینایەتی بۆرژوازی و بەتایبەتیش جێگیرکردنی هەژموونگەرایی خۆی لە شۆڕشی فەڕەنسادا، خەسڵەتی نەتەوەی دیموکراتی بۆ نەتەوەی دەوڵەت گۆڕی کە مۆرکی دەسەڵات و دەوڵەتی پێوەیە. لەڕاستیدا ئەوەی لەسەرەتای سەرجەم شۆڕشەکانی ئەوروپا ڕوویدا، لەسەرووی هەمووشیانەوە گەورە شۆڕشی فەڕەنسا ـ بەدرەنگ وەختیشەوە بێت شۆڕشی ڕووسیاشی لەناودا ـ دژە شۆڕشی دەوڵەت ـ نەتەوەیە لەبەرامبەر نەتەوەی دیموکرات و شۆڕشی نەتەوەی دیموکرات. دەوڵەت ـ نەتەوە گەورترین بزاوتی دژە ـ شۆڕش بوو بەرامبەر گەورە شۆڕشە دیموکراسیخوازەکانی گەلان و زەحمەتکێشانی ئەوروپا ئەنجام درا. هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەک یاخود نەتەوەگەراییەک بەدەستی دەوڵەت سەرەتا لە ئەوروپا و دواتریش لە تەواوی دونیا ئاواکران هەریەکە و دژە ـ شۆڕشێکی گەورەی سەرمایەداری و بۆرژوازی بوون دژی سۆسیالیزم و پرۆلیتاریا، شۆڕشی نەتەوە دیموکراتەکانیان، هاوکاری نێوان گەل و نەتەوە شۆڕشگێڕەکان و ئەنتەرناسیۆنالیزم.

بەکورتی؛ هەر دەوڵەت ـ نەتەوەیەک دژە ـ شۆڕشێکە. دیکتاتۆرییەت و فاشیزمی سەرمایەداری و بۆرژوازی و شەریکەکانیانە. هەرچەندە سیستەمی سەرمایەداری و دامەزرێنەرەکەی چینی بۆرژوازی لەبەرامبەر سیستەمە بێکەڵکەکەی دەرەبەگایەتی و پاشایەتی و میرنشینە دەرەبەگایەتیەکانی نوێنەرایەتییان دەکرد دەمامکی شۆڕشگێڕییان پۆشیوە، بەڵام ئەوانەی لەبەرامبەریاندا جەنگان لەڕاستیدا گەلان بوون؛ بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی نەتەوەی دیموکراتی گەلان بوون. سەرکەوتنیش مافی ئەوانە بوو. بۆرژوازی دزەی کردە ناو تەواوی شۆڕشی گەلان و بزاڤەکانی نەتەوەی دیموکرات. هێزی ئابووری خۆی بەکارهێنا و بەشێوەیەکی هەمەلایەنە دژە ـ شۆڕشەکانی دەوڵەتی ـ قەومی و نەتەوەی ـ میللیگەرایی ناسیۆنالیزمی دژی شۆڕشەکانی نەتەوەی دیموکرات پێشخست و لەژێر هەژموونگەرایی خۆیەوە مۆرکی خۆی لەسەردەم دا. سەردەمی سەرمایەداریش هەژموونگەرایی شارستانی نوێ، واتە هەژموونگەرایی مۆدێرنیتە نوێیەکەی لەئاستی دونیا ئاواکرد و هەڵکشا. گەورەترین هەڵەی کارل مارکس و فریدریک ئەنگلسی دامەزرێنەرانی سۆسیالیزمی زانستی لەجیاتی ئەوەی دژی دژە ـ شۆڕشی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا بوەستنەوە کە لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەم سەرکەوتنیان بەدەستهێنا، پشتگیرییان کرد. دوای گورزەکەی بۆرژوازی، ئەوە دووەمین گەورە گورزە کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەر بزووتنەوە و شۆڕشەکانی نەتەوەی دیموکراتی

گەلان کەوتووە. تەواوی رەنجدەران، گەلان و نەتەوەکان زیانێکی گەورەیان بەرکەوت و لەدەرەنجامدا ئازارێکی زۆریان چەشت.

شۆڕشەکانی رزگاری نیشتیمانی کە لە ١٩١٩ ـ ١٩٢٢ لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا روویاندا بەڕاستی بەرهەمی گەلان بوون. رێککەوتنی گەلان سەرکەوتنی ئەو شۆڕشانەی مسۆگەر کرد. سەرجەم لێدوانەکانی ئەو سەردەمەی مستەفا کەمالی سەرکردەی ئەو شۆڕشە گوزارشت لەو راستییە دەکات. گەلانی کورد و تورک دوو فاکتەری بنەڕەتی شۆڕشی نیشتیمانی بوون. لەبواری ئایدیۆلۆژی و سیاسیشدا نیشتیمانپەروەری تورک، کورد، یەهودی (ساباتیست)و چەرکەس لەگەڵ ئوممەتگەرایی ئیسلام و کۆمۆنیستی لە رێککەوتن دابوون. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو سەرکەوتنەی لەمیانەی ئەو رێککەوتنەوە بەدیهات شۆڕشێکی نیشتیمانی دیموکراتیک بوو دژی ئیمپریالیزم و بەکرێگیراوەکانی. ئەی ئەو چینە چی کرد کە بۆرژوازی پێدەڵێن؟ واتە ئەو بۆرژوازییە ماسۆنیەی بە جۆن تورکەکان (زۆربەی زۆریان پەیوەندییان بە تورکێتیەوە نییە) ناودەبران و لەژێرناوی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی کۆببوونەوە لە کێ پێکهاتبوو و لەرێگای کامە پیلانگێڕییەوە مۆرکی خۆیان لە دەسەڵات و شۆڕشی نیشتیمانی دا؟ سەرجەم زانا و رۆشنبیرە بەویژدانەکان ئاگادارن کە جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی رێکخراوێکی پیلانگێڕی و کودەتایە. هەرکەسێکی پەیوەندیدار بە بابەتەکە دەزانێت کە دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت و مۆرکی خۆی لە دووەمین مەشروتیەت دا، لە یەکەمین جەنگی جیهانیش مۆرکی خۆی لەتەواوی دەسەڵات دا. هەروەها پێویستە زۆر بە باشی بزانرێت کە چۆن دزەیان کردە ناو شۆڕشی نیشتیمانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٢و بەتایبەتیش دەرک بەو پیلانگێڕی، تیرۆر و کودەتایانە بکرێت کە هاوپەیمانەکانی هەژموونگەرایی ئینگلیز پێشیان خستن. هەر ئەوانە بوون کە لەرێگای پیلانگێڕییەکەوە رێبەری پارتی کۆمۆنیستی تورکیا (TKP) و کۆمیتە ناوەندییە ١٥کەسیەکەیان لە دەریای سپی خنکاند. کەچی لەراستیدا بەلشەفیکەکان رۆڵێکی ستراتیژییان لەسەرکەوتنی شۆڕشی رزگاری نیشتیمانیدا هەبوو کە ئەوان نوێنەرایەتییان دەکرد. هەروها ئەدهەمی چەرکەس و هێزەکانی کە لە ئاکامی پیلانگێڕییەک ناچارکران پەنا بۆ سوپای یۆنان ببەن ئەو هێزەبوون کە چەندین دژە شۆڕشی سەردەمی شۆڕشی نیشتیمانییان سەرکوت کرد. بەشی زۆری ئەوانەی لەژێر ناوی دەمارگیرەکان لەناوبران و کوژران ئەو ئوممەتگەرا ئیسلامیانە بوون کە رۆڵێکی ستراتیژییان لە رزگاری نیشتیمانیدا بینی. محەمەد عاکیف و سەعیدی نورسیش کە دوای سەرکەوتن دوورخرانەوە تاسەرکەوتن لەخزمەتی شۆڕشی نیشتیمانی دابوون. وێڕای ئەوەی کوردە عەلەوی و سوننییەکانی لە کۆچگری تا دێرسیم، لە سلێمانیەوە تا ئامەد وەڵامێکی ئەرێنیان دایەوە بانگەوازیەکانی مستەفا کەمال بۆ رێککەوتنی ستراتیژی و رۆڵێکی ستراتیژیشیان لەسەرکەوتنی شۆڕشی نیشتیمانیدا بینی، بەڵام ئەوانەی لەکاتی شۆڕش و دواتر نکوڵی و قڕکردنێکی بێبەزەییانەیان لەسەر پەیڕەوکردن دیسان ئەو هێزە پیلانگێڕانە بوون. هەر ئەوانەش

بوون کە سەرەتا لەمیانەی هەوڵە تیرۆرکارییەکەی ئەزمیر، دواتر لەرێگای ئیلاهیکردنی میتۆلۆژییەوە مستەفا کەمالیان بێکاریگەر کرد و خستیانە تەنگژەیەکی قووڵەوە.

ئەوانە کێن؟ ئەوانە بە تورکی سپی ناودەبەین و بەشی زۆریشیان تورک نین، بە پاشماوەکانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی ناویان دەبەین. ئەوانە ناوەکەیان گرنگ نییە، بەڵکو ناوەڕۆکەکەیان گرنگە. زۆر ئاشکرایە کە ئەوانە دژە ــ شۆڕشە دەوڵەت ــ نەتەوەگەراکانن کە لەمیانەی دەستبەسەرداگرتنی دەسەڵاتی دەوڵەت بوون بە بۆرژوازی، لەرێگای پیلانگێڕی، کودەتا و تیرۆرکارییەکانیش بزاوتەکانی نەتەوەی دیموکراتی سەردەمی مەشروتییەت و قۆناغەکانی کۆماریان سەرکوت کرد و خستیاننە ژێر کۆنترۆڵی خۆیانەوە؛ تەنانەت خودی هیتلەریش دانی بەوە داناوە کە ئەوانی بەنموونەی خۆی داناوە. ئەگەر بمانەوێت بەشێوەیەکی بابەتی و واقیعی دەرک بکەین بە دیرۆکی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا، مێژووی مۆدێرنی تورکیا و کوردستان، ئەو شۆڕشە نیشتیمانیەی بەرێککەوتن ئەنجامیان داوە و لە کۆمەڵگای نیشتیمانی ـ دیموکراتی تێبگەین ئەوا ناچارین زۆر بەباشی دژە ـ شۆڕشەکانی نەتەوەگەرا دەوڵەتییەکان و دژە شۆڕشگێڕەکانی ئەو دژە شۆڕشانە بناسین. ئەگەرنا بەجۆرێکی دیکە بێت ئەوا تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بە مێژووی نزیک و مێژووی کۆمار جێگای باس نابێت. بە تایبەتیش بەشێوەیەکی راست و بەپێی پێویست فێری کلتوور و مێژووی گەلانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا نابین کە هێندەی مێژووی مرۆڤایەتی خاوەن کلتوور و مێژوویکی کۆنە و دووچاری نکوڵی و قڕکردن هاتووە. کاتێک فێرنەبین و هەرسی نەکەین ئەوا ناتوانین بزووتنەوە و رێککەوتنی نەتەوەی دیموکراتی گەلەکانمان لەسەر هەمان جوگرافیا سەرکەوتووانە بونیاد بنێین و بەرەو پێشەوەی ببەین.

ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتی کێشەی کورد بەر لە هەموو شتێک پابەندی پێناسەیەکی راستی کلتووری و مێژووی کوردە. پێناسەیەکی راستی کلتوور و مێژووەکەی، دانان بە بوون یان کەینونە کۆمەڵایەتییەکەی لەگەڵ خۆیدا دێنێت. بوون بە کۆمەڵگای نەتەوەیی، مانای خاوەندارێتیکردنی رۆح و هوشیاری کلتوور و مێژووە. قڕکردن و نکوڵیکردنی کوردان لە مێژووی کۆماردا (مێژووی دەوڵەت ــ نەتەوەکانی دیکەش کرداری هاوشێوەیان هەیە)، سەرەتا بە نکوڵیکردنی مێژووی کوردان و قڕکردنی بوون یان پێکهاتە کلتوورییەکەیەوە دەستی پێکردووە. سەرەتا فاکتەرەکانی کلتووری مەعنەوی، دواتریش فاکتەرەکانی کلتووری ماددی لەناوبران. هەر بۆیەش دەست پێکردنی بونیادنانیPKK بەهوشیاری کلتووری و مێژووییەوە سەرەتایەکی راست بوو. هەوڵی روونکردنەوەی کلتوور و مێژووی کورد لەمیانەی بەراوردکردنی لەگەڵ کلتوور و مێژووی گەلانی جیهان، راگەیاندنی لەژێر ناوی مانیفستۆی رێگای شۆڕشی کوردستان رۆڵی رێنسانسی شۆڕشگێڕانەی لەزیندووکردنەوەی کلتووری مێژووی کورددا بینی. دەتوانین بڵێین؛ کە ئەو مانیفستۆیە سەرەتایەکی رادیکاڵانەی نەتەوەبوونی دیموکراتیانەی کوردانە. بوونی کلتووری کوردان کە لەمیانەی هەڵمەتی ئابی ١٩٨٤ لەشەڕدا تاقیکرایەوە لەرێگای چەندین

رووداو و داستانگەلێکی قارەمانێتیەوە زیندووبوونی خۆی سەلماندووە. ئەگەرPKK و ڕێبازە ئایدیۆلۆژی ـ سیاسییەکەی ئەو شەڕەی گەل ڕاست نەبووایە کە پێشەنگایەتی دەکرد و بەشێوەیەکی ڕاست کلتوور و مێژووی کوردانی پێشان نەدابووایە، کوردان نەیاندەتوانی درێژە بە هەبوونی خۆیان بدەن. لەو قۆناغەدا چەندین گروپ و کەسایەتی بە بانگەشەی هاوشێوەوە نزیکی کێشەکە بوونەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خاوەندارێتییەکی ڕاستیان بۆ کلتوور و مێژووی کورد نەکرد لە لەناوچوون ڕزگاریان نەبووە.

بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتی کوردان لەبواری چۆنایەتییەوە زۆر لەو نەتەوە جیاوازترە کە لەمیانەی هەڵوێستە میلیگەرایی و دەوڵەتگەراییەکان هەوڵی ئاواکردنی دەدرێت. وەک چۆن لە نەتەوەگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەسەڵاتدار جیاوازترە، لە هەڵوێستە میلیگەرا و دەوڵەتگەراییە کوردییەکانیش جیاوازترە، بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لەبەرامبەر ئەوانەدا دەردەخاتەپێش کە بونیادنانی نەتەوەی ئەلتەرناتیڤە و پشت بە کلتوور و مێژووی گەلان و ڕەنجدەران دەبەستێت .

لە بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا KCK خاوەندارێتی لەو ڕۆڵەی کوردان دەکات کە لە شۆڕشی نیشتیمانی ١٩١٩ ـ ١٩٢٢وەک ئەندامێکی بنەڕەتی بەشداری تێداکرد، بەڵام بەدرێژایی مێژووی کۆمار نکوڵی لێکراوە. ئەو شۆڕشە نیشتیمانییە هێندەی تورکەکان بە شۆڕشی نیشتیمانی کوردان و هاوپەیمانەکانی دیکەش دادەنێت کە بەشدارییان تێداکردووە. دواتر بەدەرنانی هاوپەیمانەکان و نکوڵیکردن لە کلتوور و مێژوویان بە کودەتا لەدژی کارەکتەری گەلەری شۆڕش دادەنێت. بەرخودانی کوردان بەرامبەر ئەو کودەتایە بە ڕەوا، پێشکەوتنخواز و ئازادیخواز دادەنێت. هەروەها ڕادەگەیەنێت کە ڕێککەوتنی ستراتیژی کوردان کە بە شەڕی مەلازگرد (١٠٧١)دەستپێکردووە لەسەر بنەمای ئارەزوومەندییە، هەرچەندە دووچاری پیلانگێڕی هەمەجۆریش هاتبێت، بەڵام لە سەرجەم پێکهاتەکانی دەسەڵات و دەوڵەتی ئەو ڕێکەوتە بەدواوە کوردان و تورکەکان دوو شەریکی سەرەکی بوون. لەو سۆنگەیەوە؛ تێکەڵبوون و هاوبەشێتییەکی بەهێز لەنێوان کلتوور و مێژووی هەردوو گەلدا هەیە. لەو بڕوایە دایە کە لە مێژووی هەزار ساڵی دوایی خۆرهەڵاتی ناویندا کوردان و تورکان ڕۆڵێکی ستراتیژی هاوبەشیان بینیوە. لەمیانەی ئەو بۆچوونانەی سەبارەت بە کلتوور و مێژووی کوردان کە لەو بەرگرینامەیەدا چوارچێوەکەی فراوانتر کراوە PKKو KCK هەڵوێستە ئایدیۆلۆژی و سیاسیەکانی خۆیان زەلالتر و بەهێزتر کردووە. لەمیانەی چەمکی نەتەوەی دیموکرات کە جەمسەرەکەی بۆ گەلانی دیکەش کراوەیە بۆ ڕێککەوتن و یەکێتی نەتەوەیی دیموکراتی بەرفراوانتر کراوەیە. ڕۆژانەییکردنەوەی ئەو یەکێتی و گەردوونیانەی (ڕوونترین نموونەی ئوممەتگەرایی ئیسلامە ) بەدرێژای مێژوو لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا لەئارا دابوون و بونیادنانەوەیان بەڕێگای ڕاستەقینەی ڕزگاری و ئازادی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین دادەنێت.

نەتەوەی دیموکراتی کوردان کە لەسەردەمی KCK دا تادەچێت کارەکتەرێکی بونیادی بەدەستدێنێت ئەزموونێکی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی نەتەوە پێشکەش دەکات کە بە تەواوی ڕەهەندەکانییەوە بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین دەبێتە مۆدێل. لەبەرامبەر نکوڵیکاری کلتوور و مێژوو لەلایەن ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی ڕۆڵی سیخوڕێتی مۆدێرنیتەی خۆرئاوا دەرباز ناکەن، لەمیانەی ڕێنسانسی نەتەوەی دیموکرات و شۆڕشگێڕ سەردەمێکی نوێ، هەڵکشانی سەردەمی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەستپێدەکات.

## ٨ . سیستەمی بەرگری خۆیی نەتەوەی دیموکرات

لە دونیای گیانلەبەراندا هەر جۆرێک سیستەمێکی بەرگری تایبەت بەخۆی هەیە. تاکە جۆرێکی گیانلەبەریش بێ بەرگری نییە. تەنانەت ئەو خۆڕاگرییەی هەر گەرد و تەنۆلکەیەکی گەردوون لەپێناو پاراستنی بوونی خۆیان پیشانیدەدەن دەشێت وەک بەرگری راڤە بکرێت. ئەو خۆڕاگرییەی لەبەرامبەر تێکچوون و گۆڕیندا پیشانیدەدەن ئاشکرایە کە لەمیانەی دەستەواژەی بەرگری خۆیی (رەوا) گوزارشت دەکرێت. کاتێک ئەو خۆڕاگرییەیان لەدەستدا ئەو توخم یاخود تەنۆلکەیە تێکدەچێت، ناوەڕۆکەکەی نامێنێت و بۆ شتێکی دیکە دەگۆڕێت. هەرچی لە دونیای گیانلەبەرانە کاتێک ئەو خۆڕاگرییە تێکبشکێت، ئەو گیانلەبەرە یان دەبێتە خۆراکی گیانلەبەرانی دیکە یان دەمرێت.

هەمان سیستەم بۆ جۆری مرۆڤ و کۆمەڵگاکەشی لەجێگای خۆیدایە. جۆرێکی ناسکی وەک مرۆڤ و کۆمەڵگاکەی کە بوونێکە بۆ هەڕەشەکان کراوەیە، بەرگرییەکی خۆیی بەهێز نەبێت بۆ ماوەیەکی درێژ ناتوانێت بەردەوامی بە بوونی خۆی بدات. لەجۆری مرۆڤدا بەو رادەیەی پاراستن یاخود بەرگری جەستەییە، کۆمەڵایەتیشە. بەرگری جەستەیی لەلایەن ڕەمەکەکانی بەرگری هەر کەینونەیەکی زیندووەوە جێبەجێ دەکرێت. هەرچی بەرگری کۆمەڵایەتییە، تەواوی تاکەکانی جڤات بەشێوەیەکی هاوبەش بەرگری لەخۆیان دەکەن. تەنانەت ژمارەی جڤاتەکە و شێوەی ڕێکخستنی بەگوێرەی تواناکانی بەرگری بەردەوام لە گۆڕان دایە. بەرگری ئەرکێکی بنەڕەتی جڤاتە. هەرگیز ژیان بەبێ بەرگری بەردەوام نابێت. وەک دەزانرێت؛ دوو ڕۆڵ یان ئەرکە سەرەکیەکەی تری دونیای گیانلەبەران زۆربوون و خۆراک پەیداکردنە. وەک چۆن زۆربوون و خۆراک نەبێت بوونەوەرەکان ناتوانن درێژە بە ژیانی خۆیان بدەن، بەرگری خۆییش نەبێت ناتوانن بەردەوامی پێبدەن. ئەنجامێکی دیکەی گرنگی لەبەرگری خۆیی دونیای گیانلەبەران بەدەستیبێنین، ئەو بەرگرییە تەنیا سەبارەت بە پاراستنی بوونیانە. سیستەمێکی زاڵبوون بەسەر جۆرەکانی خۆیان، بگرە سەر بوونی جۆرەکانی دیکە و کۆلۆنیکردنیان نییە. بۆ یەکەمجار سیستەمی زاڵبوون و داگیرکاری لەجۆری مرۆڤدا پێشخراوە. گەشەکردنی زهنیەتی جۆری مرۆڤ و خواستی بەدەستهێنانی زێدە بەرهەم ڕۆڵ لەوەدا دەبینێت کە دەرفەت و توانستەکانی چەوسانەوە دەرەخسێنێت.

لەپاڵ پاراستنی بوون ئەو دۆخە بەرگریکردن لە بەهاکانی رەنج، واتە شەڕە کۆمەڵایەتیەکانیش لەگەڵ خۆیدا دێنێت.

بەگوێرەی ئەو هەلومەرجە بەرجەستەی تێیدا ژیاون بەدرێژایی مێژوو بەرگری خۆیی گرنگییەکی مەزنی بۆ کوردان هەبووە. لەبەر ئەوەی میراتگری یەکەمی بەردەوامی ئەو جڤاتانە بوون کە بەشێوەیەکی قووڵ و درێژخایەن شۆڕشی نیولیتیکیان بەخۆیانەوە بینیوە، بەردەوام دووچاری هێرش و پەلامار هاتوون. ئەو زێدە بەرهەمەی سەرچاوەی خۆی لە شۆڕشی کشتوکاڵی هیلالی بەپیت وەردەگرێت، بەردەوام زەمینەی هێرشی ئامادە کردووە. هەزاران ساڵ بەمجۆرە بەردەوام بووە. لەگەڵ پەرەسەندنی سیستەمەکانی شارستانی پشتبەستوو بە زیادبوونی بەرهەمەوە، سەردەمی هێرشی سیستەماتیک و نەخشە بۆکێشراوی هێزەکانی پشتئەستوور بە بونیادەکانی شار، چین و دەوڵەت دەستیپێکردووە. لە شارستانی سۆمەرەوە تادەگاتە ئەمریکای دواترین هێزی هەژموونگەرایی شارستانی زاڵی رۆژی ئەمڕۆمان هێرش و پەلامارە راستەوخۆ و ناراستەوخۆکانی هێزە لەژمار نەهاتووەکانی سەرمایەداری بۆ سەر هەمان ناوچە و جڤاتەکان کەم نەبۆتەوە.

هێرشەکانی ئەو دوو سەدەیەی دواییش کە لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاتەئاراوە کارەکتەرێکی جیاوازیان لەخۆوە گرتووە. پاراستنی بوون، واتە سیستەمی بەرگری خۆیی کە لەسەردەمەکانی کۆنەوە بەشێوەی یەکینەکانی تیرە و خێڵ پشت بەناوچە شاخاوییەکان ئاوایانکردبوو، بەرامبەر بەئامرازەکانی پەلاماردانی سیستەمی سەرمایەداری کورتیان هێناوە. بۆ یەکەمجار مەترسی لەدەستدانی بوونەکەیان کەوتۆتە رۆژڤەوە. بونیادی دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنیا نەبووە هۆی لەدەستدانی ئازادی کوردان، بەڵکو رووبەڕووی مەترسی لەدەستدانی بوونەکەشیان بوونەتەوە. بەرنامە و کردارەکانی ئافراندنی "یەک زمان"، "یەک نیشتیمان" لەناو سنووری سیاسیدا، رێگای لەپێش نکوڵی و قڕکردنی زمان، نەتەوە و نیشتیمانەکانی دیکەی ناو ئەو سنوورانە کردۆتەوە. کوردانی تەواوی پارچەکانی نیشتیمان کە بە زۆرەملێیانە دابەش کران لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە خرانە ناو پرۆسەی نکوڵی و قڕکردنەوە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانەوە پشتگیری دەکران لەناوبردنی کورد و کوردستانیان وەک سیاسەتی سەرەکی خۆیان دەستنیشان کرد. کاتێک بەرخودانەکانی بەرگرییە خۆییە ناتەواوەکەشیان شکستی هێنا، ئیتر نۆرەی پووکاندنەوە و هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگا و لەناوبردنی هات لەرێگای ئاسیمیلاسیۆنەوە.

بزووتنەوەی PKK کە وەک پەرچەکردارێک بەرامبەر ئەو شاڵاوە خەستە لەدایک بوو، لەبنەڕەتدا هەر لەسەرەتاوە بزاڤی بەرگری خۆیی گەلی کوردە. بزاڤی بەرگری خۆیی کە سەرەتا بەشێوەیەکی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بەڕێوەدەچوو، لەماوەیەکی کورتدا بۆ قۆناغێکی بەرگری خۆیی پشتبەستوو بەتوندوتیژی دوولایەنە گوزەری کرد. سەرەتا لەسەر بنەمای پاراستنی کادیر و لایەنگرەکانی بەرگری چەکداری پێشخست، بەڵام لەئاکامی

هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤دا گەلیشی خستە چوارچێوەی خۆی و بەرفراوان بوو. ئەو بزووتنەوەیەی وەرچەرخا و بوو بە شەڕی بەرگری خۆیی گەل، دووچاری هێرشی نەخشە بۆکێشراوی سەرجەم هێزە هەژموونگەرا پەیوەندیدارەکان هات، بەتایبەتیش هێزەکانی ناتۆ ـ گلادیۆ. سەرجەم ئەو هێزانەی ترسیان لەوە بوو کوردان لە کوردستان ببنە خاوەن گوتە و چارەنووسی خۆیان، پشگیری ئەو هێرشانەیان کرد. وێڕای ئەوەش شەڕ و تێکۆشانەکانی ئەو بەرخودانە زەبرێکی قورسی لە سیاسەتەکانی نکوڵی، قڕکردن و ئاسیمیلاسیۆن وەشاند. خاوەندارێتی گەلی لەناسنامەکەی و سووربوون لەسەر ئارەزووی ژیانی ئازادی مسۆگەر و یەکلاکردەوە. هەرچەندە هیوا کۆنەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەکان بۆ لەناوبردنی کوردان بەتەواویش کۆتایی پێنەهاتبێت، بەڵام وەک جاران خاوەن بانگەشە نین. پەسەندکردنی ناسنامەی کورد و ژیانی خۆسەر بەقۆناغی ڕێزگرتن گەیشتووە. سەبارەت بە شەڕی بەرگری خۆییەوە ئەوەیان دۆخێکی نوێیە. PKK ش هەوڵیداوە لەرێگای KCKوە ئەو دۆخە نوێیە هەڵسەنگێنێت.

یەکێک لە سەرە دێڕە گرنگ و دەستلێبەرنەدراوەکانی بەرنامەکانی بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لە KCKدا مەسەلەی چۆنیەتی گەیاندنی بەرگری خۆییە بە سیستەماتیکێکی هەمیشەیی. سیاسەتە نوێکانی نکوڵی، قڕکردن و ئاسیمیلاسیۆن کە تاکە پاوانی هێزی چەکداری دەوڵەت ـ نەتەوەکان دەرفەت ببینن لەپەیڕەوکردنی دوا ناکەون و دوودڵی ناکەن سیستەمی بەرگری خۆیی KCK ی ناچاری هەمیشەییبوون کردووە. کەمترین مەرجی ژیانی هاوبەش لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان گەرەنتیکردنی خودی ناسنامەی کورد و ژیانی ئازادە لەچوارچێوەی دەستووردا. گەرەنتی دەستووریش بەس نییە، هەروەها لەمیانەی ئەو ستاتۆیانەی بە یاساکانەوە دەستنیشان دەکرێت هەلومەرجە کۆنکرێتیەکانی ئەو گەرەنتیە دیاری دەکرێت. جگە لەبەرگری نیشتیمانی هاوبەش دژی دەرەوە، پێویستە کاروباری ئاسایش لەلایەن خودی کۆمەڵگای کوردەوە جێبەجێ بکرێت. چونکە کۆمەڵگایەک تەنیا خۆی دەتوانێت بەباشترین شێوە و بەپێی پێویستییەکانی ئاسایشی ناوخۆی دابین بکات. لەو سۆنگەیەوە؛ پێویستە دەوڵەت ـ نەتەوە پەیوەندیدارەکان ریفۆرمی گرنگ سەبارەت بە سیاسەتەکانی ئاسایشی ناوخۆ ئەنجام بدەن. لەحاڵەتێکدا ئاشتی و ریگەچارەی دیموکراتی جێگیربێت پێویستە KCKش هێزەکانی بەرگری خۆیی (هێزی پاراستنی گەل ) سەرلەنوێ ریکبخاتەوە. بێگومان سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە پێویستی بە یاسای نوێ هەیە. ئاشکرایە کە هەرگیز سیستەمێکی هاوشێوەی فیرقەکانی حەمیدیەی جاران و "گوند پارێزان ( جاشایەتی)" جێگای باس نابێت. بەڵام لەسەر بنەمای ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکان دەکرێ ڕێکخستنەوەی نوێ و یاسایی سەبارەت بە ئاسایشی ناوخۆ ئەنجام بدرێت.

ئەگەر ڕێککەوتن لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە پەیوەندیدارەکان بەدینەیەت، ئەوا لەسەر بنەمای پاراستنی سەرجەم رەهەندەکانی نەتەوەی دیموکرات KCKبەشێوەیەکی یەکلایەنە هەوڵدەدات دۆخی چەندایەتی و چۆنایەتی هێزەکانی بەرگری خۆیی بەگوێرەی پێویستییە

نوێیەکان ڕێکبخاتەوە. هێزەکانی پاراستنی گەل(HPG) کە سەرلەنوێ ڕێکخراونەتەوە ئەرکیان پاراستنی نەتەوەی دیموکراتە لەهەر بوار و دەڤەرێکدا و بەشێوەیەکی شایستە دەستڕۆیی نەتەوەی دیموکرات جێگیر دەکات. لەبەرامبەر پاراستن و ئاسایشی گیان و ماڵی تاک ـ هاونیشتیمانیانی نەتەوەی دیموکرات بەرپرسیار دەبێت. لەبەرامبەر سەرجەم کردەوە و ڕەفتارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەکان کە تا ئاستی کۆمەڵکوژی دەچێت (شەڕە سەربازی، سیاسی، کلتووری، کۆمەڵایەتی و دەروونییەکان ) بەردەوام لەدۆخی شەڕ و تێکۆشاندا دەبێت. بوون و ئازادی کورد و کوردستان بەبێ بەرگری خۆیی نابێت.

#### ٩ . دیبلۆماسی نەتەوەی دیموکرات

یەکێک لەو دەزگایانەی دەوڵەت ـ نەتەوە گرنگی پێداوە کاری دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوەکانە. دیبلۆماسی شێوەی کار و چالاکی بەر لەشەڕی نێوان دەوڵەتەکان پێناسە دەکات. دەشێت وەک بەشی ئامادەکاری شەڕەکانی مێژووی دەوڵەت ـ نەتەوەکانیش تاوتوێ بکرێت. هەرجۆرە پەیوەندییەکی دراوسێیانەی نێوان یەکینەکانی جڤات بەدرێژایی مێژوو ڕێورەسمێکی دیاری شێوە نەریتییەکانی گوزارشت کردنیان هەیە. نرخ و بەهایەکی زۆریان پێدەدرێت. بەدامەزراوەکردنی ئەو پەیوەندییە لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە گرێدراوی مەیلی قازانجی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. ئەگەر لەسەردەمی ئاشتیدا پەیوەندییەکان قازانجی زیاتر بەدەست بێنێت پێویستی بە شەڕ نییە. لەرێگای دیبلۆماسییەوە پەیوەندییە بەرژەوەندیخوازەکانی قازانج تەواو دەکرێت. ئەگەر مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج گرێدراوی شەڕ بێت، سەرجەم هێزە دیبلۆماسیەکانیش بێنە لای یەکتر، ناتوانن ئەو شەڕە بەربەست بکەن. لەو سۆنگەیەوە؛ کاری دیبلۆماسی تەواو بووە. ئەو دیبلۆماسیەی بۆ لۆژیکی قازانج بچووک کراوەتەوە هیچ پەیوەندییەکی بەو شێوازە هێژایەی پەیوەندییەوە نەماوە کە بەدرێژایی مێژوو لەنێوان کۆمەڵگاکان لەئارادا بووە. دیبلۆماسی کراوە بە ئامرازێکی ساختەکاری یارییەکانی شەڕە بەرژەوەندیخوازەکانی نێوان دەوڵەت ـ نەتەوەکان . ئیتر لەجیاتی ئاشتی، کراوە بە ئامرازی ئامادەکاری شەڕ.

دیبلۆماسی کە لەرێگای نەریتی نەتەوەی دیموکراتەوە دووبارە دەبێتەوە ئامرازی ئاشتی، هاوکاری و دانوستاندنی داهێنەرانەی نێوان کۆمەڵگاکان، بەشێوەیەکی سەرەکی سەرقاڵی چارەسەرکرنی کێشەکان دەبێت. دیبلۆماسی نەتەوەی دیموکرات ئامرازی ئاشتی و پەیوەندییە سوودبەخشەکانە، نەک شەڕ. گوزارشت لەپێگەیەک دەکات بەها سیاسییەکەی بەرزە و کەسە بلیمەتەکان ڕۆڵی تێدا دەبینن. بەتایبەتیش ڕۆڵێکی گرنگ لەپێشخستن و بەردەوامکردنی ئەو پەیوەندییە دۆستانە و پرۆسانەدا دەبینێت کە لەنێوان گەلانی دراوسێ و جڤاتە نزیکەکاندا دێتەئاراوە و سوود بە هەر دوولا دەگەیەنێت. هێزی بونیادنانی کۆمەڵگابوونی هاوبەش و سەنتێزەکانی کۆمەڵگایە لەئاستی بەرزتردا.

چەندین قۆناغی پەیوەندی دیبلۆماسی ئەرێنی یان نەرێنی لە مێژووی کورداندا جێگای باس بووە. پارچەبوونی لەرادەبەدەر و دابڕانی نێوان جڤاتەکان، ڕێگای لەپێش بایەخدان بەکار و چالاکی پەیامبەر کردۆتەوە، کاتێک بەشێوەیەکی راستیش جێبەجێ کراوە کۆمەکی گرنگ و بەنرخی پێشکەشی ژیانی کۆمەڵگا کردووە. کاتێک لەپای نیازی خراپ و بەرژەوەندییە کەسی و گروپە جیاوازەکان جێبەجێ کراوە خزمەتی بەدوژمنایەتی و شەڕ کردووە.

ئەگەر لەنێوان خۆیاندا بێت یان لەگەڵ دراوسێکانی یاخود لەئاستی جیهانگیریدا لەڕۆژی ئەمڕۆماندا کوردان پێویستییەکی زۆریان بە دیبلۆماسییەکی مانادار هەیە. چالاکییە دیبلۆماسییە ئەرێنییەکان رۆڵێکی مەزنیان لەپاراستنی بوون و بەدەستهێنانی ئازادییاندا هەیە. لەقۆناغی نزیک و سەردەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ئەو گەلەی زیاتر کراوەتە قوربانی یاری و پیلانە دیبلۆماسییەکان گەلی کوردە. بەدرێژایی سەدەکانی نۆزدەهەم و بیستەم کوردان رۆڵی قۆچی قوربانییان لە پارچەکردنی خۆرهەڵاتی ناوین و کەوتنە ژێر رکێفی هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداریدا بینیوە. بەتایبەتیش بوونەتە تراژیدیترین قوربانییەکانی یەکەمین و دووەمین جەنگی جیهانی. ئەو رۆڵەی لە دیبلۆماسی خۆرهەڵاتی ناویندا (دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوە) بۆ کوردان رەوا بینراوە بوون بە پیۆن و کارت بووە، ئەو دۆخەش ڕێگای لەپێش ئەنجامگەلێکی سەخت کردۆتەوە. کوردان رووبەڕووی تابلۆگەلێکی هێندە بەئازار بوونەتەوە کە بە قڕکردن و کۆمەڵکوژی گەیشتووە. بێگومان بەرادەی رۆڵی کوردە بەکرێگیراوەکان لەو دۆخەدا دابڕان یان بێبەشبوونی بەرخودانی کوردان لەرێبازە هاوچەرخەکانیش رۆڵێکی گرنگی هەبووە.

ئەگەر بەهۆی هەلومەرجە سیاسییە هەنووکەییەکان و بواری چینایەتییەوە ئەو خاڵە رەچاوبکرێت کە چانسی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی کوردی یەکگرتوو کەمە، ئەوا دەبینرێت ئەو دیبلۆماسییەی بەو ئامانجە بەڕێوە دەبرێت چانسی چارەسەرکردنی زۆر لاوازە. وەک دەزانرێت ئەنجامێکی سەرکەوتووانە لەو چالاکییە دیبلۆماسیانە بەدەستنەهێنرا کە لەو دوو سەدەی دوایی بەو ئامانجەوە بەڕێوەبران. سروشتی کێشەی کورد دەرفەت بە سەرکەوتنی ئەو جۆرە چالاکیانە نادات. دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوە سەبارەت بە کوردان چارەسەرئامێز نییە، بەڵکو بنبەستی دەکات و شاهێدی چەندین رۆڵی نەرێنییە کە ناکۆکی نێوان پارچەکان زیاد دەکات و بانگەوازی بۆ دەوڵەت ـ نەتەوە دوژمنەکان دەکات. هەربۆیەش پێویستیەکی زۆر بە دیبلۆماسیەکی نوێ، دیبلۆماسی نەتەوەی دیموکرات هەیە.

بەر لەهەموو شتێک پێویستە دیبلۆماسی نەتەوەی دیموکرات پلاتفۆرمێکی هاوبەش لەنێوان کوردان ساز بکات کە دابەشکراون و لەدەوروبەری بەرژەوندییە جیاوازەکان پارچە بووە. ئەو پلاتفۆرمەی کوردان پێویستیەکی ژیانیی و بە پەلەیان پێی هەیە، ناچارە لە ناوەندی چالاکییە دیبلۆماسیەکان جێگیر بکرێت. سەرجەم چالاکییە دیبلۆماسیەکانی دیکە، بەتایبەتیش ئەو چالاکییە دیبلۆماسیانەی هەر پارت و ڕێکخراوێک بەتەنیا و بەگوێرەی

بەرژەوندییەکانی خۆی ئەنجامیانداوە لەسوود زیاتر زیانبەخش بوون؛ خزمەتی بە پارچەبوونی زیاتر و شەڕی نێوان کوردان کردووە. لەو سۆنگەیەوە؛ پێشخستنی دیبلۆماسیەکی یەکگرتووی نێوان کوردان یەکێکە لە ئەرکە نەتەوەیی ـ نیشتیمانییە سەرەکیەکان. لەو پێناوەشدا ئاواکردنی کۆنگرەی نیشتیمانی ـ نەتەوەی دیموکرات و کاراکردنی ژیانیترین ئەرکی دیبلۆماسی کوردییە. هەم پێویستە کۆنگرەی نەتەوەی دیموکرات ئامانجی سەرەکی سەرجەم پارت و کەسایەتییە کورد و کوردستانییەکان بێت، هەم لەسەر بنەمای ساتێک زووتر بەستنی ئەو کۆنگرەیەدا پێویستیی بە ئاواکردنی دیبلۆماسیەکی کوردی ـ کوردستانی هەیە کە بەدامەزراوە بوو بێت، خاوەن سیاسەتێک و یەکدەنگ بێت. لەژێر هیچ بیانوو و پاساوێکەوە هیچ پارت یان ڕێکخراێک ناتوانێت ئەو ئەرکە ژیانیانە درەنگ بخات یان فەرامۆش و پشتگوێیان بکات. ئەوانەی بەردەوام ئەو ئەرکانە درەنگ و پشتگوێی دەخەن، ئەوانەن کە بەدوای بەرژەوەندی کەسی و ڕێکخستنی جیاوازەوەن. ئەو کارەسات و زیانە گەورانەی ئەو چەشنە زهنییەت و کەسایەتییانە لەمێژوو ڕێگایان لەپێش کردۆتەوە باش دەزانرێت، پێویستە بزانرێت. وێڕای ئەوەی دیبلۆماسی پشتبەستوو بە دەوڵەتی فیدراڵی کورد لە ئێراق گرنگە، بەڵام پێویستییەکانی تەواوی کوردان بەدیناهێنێت. نە توانا و بەهرەی وەڵامدانەوەی هەیە و نە هەلومەرجەکانیش دەرفەت بەوە دەدەن، هەردووکیشیان لەبارنین. ئەو دیبلۆماسییەی وەڵامی پێویستییەکانی تەواوی کوردان بداتەوە، ئەوەیانە کە لەسەر بنەمای کۆنگرەی نەتەوەی دیموکراتیک ئاوابکرێت و پێشبخرێت. لەو سۆنگەیەوە ئەرکی لەپێشینە کۆکردنەوەی کۆنگرەی نەتەوەیی دیموکراتیک و ڕاگەیاندنێتی وەک ڕێکخستنێکی نەتەوەیی دیموکراتی گشتی و هەمیشەیی.

دەشێت ئەرکە سەرەکیەکانی کۆنگرەی نەتەوەیی دیموکراتی پێشبینیکراو بەمجۆرە ڕیزبکرێت:

أ) پێویستە کۆنگرەی نەتەوەیی دیموکراتیک ڕێکخستنێکی هەمیشەیی بێت. نوێنەری سەرجەم ڕێکخستن و کەسایەتییەکانی چین و توێژە نیشتیمانی و دیموکراسیخوازەکان بێت و بە تەڤلیبوونێکی گونجاو جێگای خۆیان تێدا بگرن. لەوەشدا ژمارەی دانیشتوان و ڕۆڵی پارچەکان، ئیرادە و بڕیاری تێکۆشان ڕەچاو بکرێت.

ب) پێویستە کۆنگرە دەستەیەکی جێبەجێکردن واتە کۆنسەیەکی بەڕێوەبردن هەڵبژێرێت. پێویستە کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتی بەرامبەر پەیوەندییە پراکتیکی ـ سیاسییەکانی تەواوی کوردان بەرپرسیار بێت. پێویستە چالاکییە دیبلۆماسیە ناوخۆ و دەرەکییەکان، پەیوەندییە ئابووری، کۆمەڵایەتی و کلتوورییەکان بەشێوەیەکی دامەزراوەیی لەلایەن کۆنسەیەوە بەڕێوەببرێت.

ج) پێویستە سەرجەم پارت و ڕێکخستنەکان هێزەکانی بەرگری خۆیی لە ڕێکخستنێکی هاوبەشی پێشمەرگەدا کۆبکەنەوە. فەرماندەیی هاوبەشی هێزەکانی پاراستنی گەل

ئاوابکرێت. هەر رێکخستنێک بەگوێرەی هێزەکەی دەستپێشخەریەکی دیاری لەسەر هێزەکانی بەرگری خۆیی هەبێت.

د) نووسینگە یاخود کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە کە گرێدراوی کۆنسەی دەبێت، پێویستە بە تەنیا بەرپرسیاری ئەو پەیوەندیانە نەبێت کە لەسەرووی هەموویانەوە لەگەڵ دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکانی سەر کوردستان، بەڵکو لەگەڵ سەرجەم دەوڵەتەکانی دیکە و هێزەکانی کۆمەڵی مەدەنی بەڕێوە دەبرێت.

دەشێت پەیوەندییەکانی KCKو بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی کوردانی ئێراق لەگەڵ کۆنگرەی نەتەوەیی دیموکراتیک لەژێر ستاتۆیەکی گونجاودا رێکبخرێت، بەشێوەیەک لەشێوەکان هەردوو رێکخستنیش دەتوانن گرێدراو بە کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتی کار بکەن. بەیەکەوە کارکردن لەگەڵ ئەو دوو رێکخستنە کێشەیەکی گرنگە کە پێویستی بە گفتوگۆ و چارەسەرکردن هەیە. ئاشکرایە کە ماوەیەکی درێژ پەیوەندی و ناکۆکییەکانی نێوان بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لەلایەن KCKو بونیادنانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەلایەن بەڕێوەبەرایەتی فیدراڵی کوردانی ئێراق لەچوارچێوەی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بەردەوام دەبێت. لەو بارەیەوە دەشێت کۆنگرەی نەتەوەیی دیموکراتیک رێکخستنێکی چەتر ئاسای گونجاوی چارەسەری بێت. دەشێت دیبلۆماسی نەتەوەی دیموکرات لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا رۆڵێکی هەمیشەیی چارەسەری نێوان گەلان و نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ببینێت کە دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوە بەرەو پێکدادان و گێژاوێکی مەزنی بردووە.

## ١٠. پەیجوربوونی رێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات

بەهەر حاڵ سەختترین کێشە بۆ وەچە یان رۆڵەی مرۆڤ لە بەکۆمەڵگابوونییەوە دەست پێدەکات. کاتێک بۆ دواوە دەگەڕێمەوە و سەیرێکی دەکەم، سەختترین پەیوەندی کە بەبیرم دێتەوە، پەیوەندی "ناموس"بوو کە بابەتی شەڕەکەم بوو لەگەڵ دایکم. وەک دیاردەبێت لە هەلومەرجەکانی ئەوکاتەی گوند یەکەمین مەرجی کۆمەڵگابوون بە ناموسداری دەربازدەبوو. ناموسداریش مانای پابەندبوون بە رێساکانی ماڵبات، ژیانێکی وابەستە بە ناموسەکەیەتی. وەک منداڵێک نەدەشیا لەگەڵ هاتنە دونیا خاوەنی هوشیاری ئەو ناموسە بم. ناموسداری مەسەلەیەکی پەیوەست بە کۆمەڵگابوون بوو کە دواتر فێری دەبیت. بەهەرحاڵ دایکیشم بەگوێرەی خۆی هەوڵیدەدا کۆمەڵایەتیبوون یاخود کۆمەڵگابوون لەمندا پێشبخات. رێگاکەشی لە پابەندبوونی تەواو بە رێساکانی ماڵباتدا دەبینی. هەربۆیەش ململانێیەکی دژوار لەنێوانمان روویدا. وەک دیاردەبێت بە دۆخی منداڵیشمەوە رێساکانی ماڵباتم بە تەواو و راست دانەدەنا. یەکەم جار بوو هەڵوێست بەرامبەر نەریتی باو پیشان بدەم. ماوەیەکی درێژ ئەو جۆرە ناکۆکییە بەردەوام بوو.

کێشەی ماڵبات یاخود خێزان بوو بە کێشەی ژن، کێشەی ژنیش بوو بە کێشەی ئازادی و دیموکراسی، هەرە دوایی کێشەی دیموکراسیش بوو بە کێشەی نەتەوەی دیموکرات.

باسی پەیوەندی خۆمم بە مزگەوت و ئایینەوە کردبوو. سەرەتا وەک نموونەیەک گوێڕایەڵی ئایین ببووم. نزیکەی سی و سێ سوورەتم دەرخ کردبوو، ببووم بەگێنەی چاوی ئیمام. پێشنوێژیم بۆ ئەو گروپەش کردبوو کە لە منداڵانی قوتابخانەی سەرەتایی پێکم هێنابوو. لەو بابەتە نمرەی تەواوم هەبوو. بەڵام کێشە زهنییەکانم لەگەڵ خوادوەندەکەی ئایین سەریهەڵدابوو. پرسیارەکانی: ئەو خوادەوندە چییە؟، لەکوێیە و چۆنە؟ ئادەچوو زیاتر سەرقاڵی دەکردم. قوڵبوونەوە لە ئایین ئەو کێشەی چارەسەر نەکرد، بەپێچەوانەوە قورستری دەکرد. کاتێک هەوڵمدەدا ئەو ناکۆکییە لەڕێگای فەلسەفە چارەسەر بکەم، ئاشنابوون بە بزاوتی کۆمەڵایەتی و بڕیاردان بەلای سۆسیالیزمی زانستییەوە هەنگاوەکانی دواترم بوو. بژارگەلێکم جێگای باس بوو کە بەرگەگرتنیان زەحمەت بوو. هەرچی کێشەی ناسنامەی کوردە کە سەرەکیترین رایەڵەی کۆمەڵگابوونە، بەهۆی چوونم بۆ قوتابخانەی سەرەتایی زوو هەستم پێکرد، چونکە خوێندن بەزمانی تورکی بوو. کێشەکە لەناخەوە منی بریندار کردبوو؛ بەڵام لە دۆخێکدابووم ماوەیەکی درێژ نەمدەتوانی هەنگاو بۆ چارەسەرکردنی بهاوێژم. توانای تیۆری و کرداریشم دەرفەتیان پێنەدەدام بچووکترین هەنگاویش بهاوێژم. لەئاکامدا کاتێک هەستم کرد راکردن لە کێشەی ناسنامەی کورد سەرچاوەی کێشەکانی خێزان، ئایین، فەلسەفە و سۆسیالیزم پێکدێنێت، تێگەیشتم کە لە قاڵبوونەوە سەبارەت بە کێشەکە و گەڕان بەدوای چارەسەری رزگارم نابێت.

پەسەندکردنی ناسنامەی کورد و تێگەیشتنی وەک کێشەیەک لەساڵی ١٩٧٠وە تەواوی ژیانمی ئابلۆقە دابوو. سەرجەم ئەو کێشانەی پەیوەست بە کەسایەتیم دەهاتنە ئاراوە بە ناسنامەم دەبەستنەوە. لەو سۆنگەیەوە؛ تێگەیشتبووم و لەو بڕوایە دابووم ناسنامەی کورد شیکار نەکەم، ناتوانم هیچ یەکێک لە کێشە مادی و مەعنەویەکانم شیکار بکەم. ئەو سەرگوزەشتە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەی دوای ئەوە دەستیپێکرد، بەجۆرێک لەجۆرەکان ببوو بە چیرۆکی سەرلەنوێ گەڕان بە دوای خۆمدا. لێکۆڵینەوە سەبارەت بە ناسنامەی کورد و هەوڵەکانی چارەسەری بەجۆرێک لەجۆرەکان مانای سەرلەنوێ پێناسەکردن، شیکارکردن و کۆمەڵگابوونی خۆم بوو. لەبەر ئەوەی ناوە بە ناوە ئاماژەم بەچیرۆکی ئەو لێگەڕینانە کردووە دووبارەی ناکەمەوە. بەڵام بەشێکی راڤەی فەلسەفی چیرۆکەکان سەرنجڕاکێشە. رەنگدانەوەی زەلالی کلتووری کورد بۆ زهن و هەستەکانم، لەڕێگای مۆسیقاوە ئەنجامدەدرا کە بەهۆی قەدەغەکاریەکانەوە ئەویش دەرفەتێکی زۆر کەمی هەبوو. لەکاتی منداڵیمەوە گوێ بیستی لاوکە کوردییەکان ببووم. مەریەم خان و برا جەزیرییەکان یەکەم دەنگ بوون کە گوێ بیستیان بووم. بەڵام کاتێک لە هەلومەرجەکانی ئەنقەرە بۆ یەکەمین جار گوێم لە دەنگی ئارام تیگران بوو کاریگەرییەکی جیاوازی لەسەرم هەبوو. زۆر دواتر کاتێک راڤەم کرد بەو ئەنجامە گەیشتم هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە

دەنگێکی زۆر نزیک بە درکاندنی ڕاستینەی کورد، بەتایبەتیش ڕاستینەی گەلی کورد و حەقیقەتەکەیەتی. هەربۆیەش لام پەسەند بوو کە هونەر شێوەیەکی دیکەی ڕوونکردنەوەی حەقیقەتە: هەم بانگەوازییەک بۆ ڕاستینەی گەلی کورد لەناواخنی ئەو دەنگەدا لەئارا دابوو، هەم ئاماژەی بە "ئەشقی نائومێد" دەکرد. لەو سۆنگەیەوە؛ زۆر لەگەڵ ئەو واقیعە ڕێک بوو کە تێیدا دەژیام. لەکاتێکدا لەلایەکەوە لەمیانەی لێکەڕینە ئایدیۆلۆژییەکانەوە هەوڵی ڕوونکردنەوەی کێشەی کوردم دەدا، لەلایەکی دیکەشەوە تەواوکردن و بەهێزکردنی لەڕێگای مۆسیقاوە مایەی تێگەیشتن بوو. ئیتر مۆسیقا و لێکەڕینی ئایدیۆلۆژی سەبارەت بەکێشەی کورد دەستی یەکتریان گرتبوو.

هۆگریم بەرامبەر ژن لەو ساڵانە و بەهەمان شێوە سەریهەڵدا. بەشێوەیەکی سروشتی وابەستەبوونی کوێرانەی هەر گەنجێک لەو یەکەمین ساڵانەی دووچاری دێن لەوانەیە بۆ منیش جێگای باس بووایە. تا ڕادەیەک لە هەڵوێستی بایۆلۆژی و نەریتی دەرهەق بەژن دوورکەوتبوومەوە. مەیل و خولیایەکی بەمجۆرەشم بێدار نەببوویەوە. ئەو ژنەی لە هەلومەرجەکانی شار خۆی نمایش دەکرد ڕووخسارێکی مۆدێرنی هەبوو. سەرنجی ڕادەکێشام، بەڵام نزیکبوونەوەم لە کچێک کە وەک پێویستییەکی مۆدێرنیتەی تورک پێگەیشتووە، ئەگەرێک بوو هێندەی شاخی قاف بۆ من دووربوو. نە ئەو هێزەم لەخۆمدا دەبینی، نە بۆ بەدەستهێنانیشی هەوڵێکم هەبوو. کاتێک تێبینی چەند کچێکی بەرەچەڵەک کوردم کرد، چیرۆکی هەمان ئەو ئەشقە بێ ئومێدانەی بەبیر دەهێنامەوە کە لە مۆسیقا و سترانەکان گوێبیستی دەبووم. وەک پێشتر ئاماژەم پێکردبوو کاتێک سەبارەت بەهەندێک سیما دەمگوت:"پێویستە ڕەچەڵەکی ئەو کچەش شایستەی ئازادی بێت" لەنزیکەوە گرێدراوی ڕاستینە و کێشەی کورد بوو. مۆسیقاکەی ئارام چەند دۆخی "ڕووداوە بێ ئومێدەکە"ی ڕاستینەی کوردی پیشاندەدا، ئەو دیمەنەی لە ڕووخساری کچەکەشدا بینیم دیسان ڕووداوێکی زۆر بێ ئومێد بوو سەبارەت بەڕاستینەی کورد، بەڵام بەسووربوونەوە جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە: ئەگەر هەڵوێستێکی سنووورداری ناموسیش هەبێت پێویستە بەدوای ئەو بوویەرە بێ ئومێدە، واتە بەدوای ڕاستینەی کورد بکەوێت. بەو دۆخەی کە دایکم تێبینی کردبووم ئاشکرابوو کە بەشێوازی نەریتی ناتوانم لەگەڵ ژن بم. ژنانی مۆدێرنیتەش، تورکەکانیان هێندەی شاخی قاف لێم دوور بوون، کوردەکانیشیان دیمەنی ئەشقێکی بێ هیوایان دەخستەڕوو. ڕەفتارو هەڵوێستی کوڕە کورد و تورکەکانی لام سەبارەت بە ژن ئەخلاقی و ئەستاتیک نەبوو. لەو سۆنگەیەوە؛ هیچ کاتێک بیرم لەوە نەکردەوە کە لاساییان بکەمەوە و لە کچێک نزیک ببمەوە.

وێڕای ئەوەش لەناکاو تووشبوونم بە "کەللەڕەقی هاوسەرگیری" شایەنی تێگەیشتنە. وەک لەبەشە پەیوەندیدارەکان ڕوونم کردەوە، ئەوە هەڵوێستێکی ئایدیۆلۆژی، ئەتنیکی، سیاسی و دەروونی تێکەڵ بوو. لەو تەمەنەدا تاقیکردنەوەی هاوسەرگیریم وەک "مەیدان خوێندن" دیار کردبوو. لەبواری ڕۆحی و نەریتیدا هەرگیز هاوسەرگیریم نەکرد. ئەگەر بە زەحمەتیشەوە بێت خۆمم ڕازی کردبوو کە سەبارەت بە شیکارکردنی پەردە ئایدیۆلۆژی و

سیاسییەکەی دەوروبەری ژن ئەوە ئەزموونێکی زۆر گرنگە و پێویستە لەژیانکردنی نەترسم. بەڵام پێویستە بە بایەخەوە ئاماژەی پێ بکەم کە لەمیانەی ئەو پەیوەندییەوە گەیشتنم بە راستینەی عەلەوی و ژنی کورد و، بەستنەوەی بە ناسنامە و کێشەی کورد و چارەسەرکردنییەوە وانەیەکی "زۆر زەحمەت" بەڵام فێرکەر و ئەزموونبەخش بوو. ئەو کێشە دەربـاز نەکرابووایە و منـی تێکشکاندبووایە، ئەستەمە بڵێم هەوڵەکانم دەرهەق بەراستینەی کورد سەرکەوتوو دەبوون.

ئەگەر دۆخەکە لەبارەی خۆمەوە کورت بکەمەوە دەتوانم بەمجۆرە هەڵیسەنگێنم: ساڵانی ١٩٥٠ ـ ١٩٦٠ رەدکردنەوەی کۆمەڵگابوونیماڵباتە، ساڵانی ١٩٦٠ ـ ١٩٧٠ پەسەند نەکردنی کۆمەڵگای نەریتی، ساڵانی ١٩٧٠ ـ ١٩٨٠ قۆناغی پەسەند نەکردنی کۆمەڵگای مۆدێرنە. کەسایەتیەک بووم کە بەکۆمەڵگانەبووە و لەپێگەی پیاوێکی تەنیا دایە. گروپەکانی گەشتی چۆلەوانی سەردەمی منداڵیم، گروپە ئایدیۆلۆژییە ئایینی و چەپەکان هەنگاوگەلێکی ئەزموونی کۆمەڵگابوون بوون کە لە دەورەی خومدا پێشمخستبوون. هەنگاوە بە بانگەشەکانی لەجۆری ئاپۆچێتی و PKK لەگەڵ ئەوەی ئاراستەی کۆمەڵگابوونێکی نوێی تایبەت بەخۆی پیشاندەدا، بەڵام هێشتا لە بانگەشەیەک زیاتر تێپەڕیان نەدەکرد. ئەوەی لێگەڕینی بۆ کرا و خوازیاری پەسەندکردن بوو، کۆمەڵگابوونی کورد بوو. پەیجوربوونی حەقیقەت سەبارەت بە کوردان جێگای باس بوو. حەقیقەتێکی ئیسلام لەئارادا نەبوو کە سەبارەت بە کوردان گوزارشتی لێبکات. کاتێک لەگەڵ میللیگەراییشەوە دەگونجێنرا، زیاتر لەچوارچێوەی رۆڵی نکوڵیکردنەوە بەکار دەهێنرا. لەمیانەی هزر و بۆچوونی چەپیشەوە ناوی راستیەکە دادەنرا، بەڵام ناوەڕۆکەکەی روون نەدەکرایەوە. لە هەنگاونان بەرەو ١٩٨٠کانیش خۆپاراستنی چەکداری، بەرێزدارییەوە پابەندی ئەو راستییە بوو کە پێیەوە پەیوەست ببووین. کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ ئەزموونێکی گرنگی سەبارەت بە حەقیقەت بوو. خۆڕاگری و گەشەکردن بەڵگە سەلمێنەرەکانی بەهای حەقیقەتی ئەو راستییە بوون کە پێیەوە پەیوەست ببووین. ئەگەر بەرگەمان نەگرتبووایە و رامانکردبووایە راستینەی کورد گورزێکی توندی بەردەکەوت کە هەوڵماندەدا پەیوەستی ببین.

لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو بەرخودان و پەرەسەندنە ئایدیۆلۆژی ـ سیاسییانەی دوای ١٩٨٠ هاتنەئاراوە مانا و رۆڵێکی گرنگیان لەوەدا هەبوو کە راستینەی کورد وەک حەقیقەتێک گوزارشتی لێبکرێت. دەستپێکردنی بەرخودانی چەکداری و بەشداریکردنی گەل لە شەڕدا دەبوون بە هەنگاوگەلێکی مێژوویی. لەهەلومەرجێکدا کە هەرکەس دەستبەردار بوو، بەدەنگێکی بەرزتر دەیتوانی هاواری دەنگی حەقیقەت بگەیەنێت. تەواو لەو قۆناغانەدا تێکۆشانی چەکداری وەک بەهێزترین و دادوەرانەترین دەنگی حەقیقەت دەنگی دەدایەوە. هەر واش بوو. سەرباری ئەوەی لەبواری تەکنیک و تەکتیکەوە زۆر بەباشی دەستی پێنەکرد، بەڵام هەڵمەتی ١٥ی ئاب لەلایەن راستینەی کوردەوە پێشوازی لێکرا و دەنگی دایەوە. ئەو کوردانەی بە دوایاندا دەگەڕاین بوونی خۆیانیان پیشاندەدا، وێڕای سەرجەم

لایەنە نەرێنییەکانیشی شەپۆل بەشەپۆل بەشدارییان دەکرد. ستـرانبێژ و گروپە مۆسیقییەکان زیادیان دەکرد، ژمارەی دۆستانیش لەزیاد بوون دابوو. تەنیاییم دەپچڕاند و کۆمەڵگابوونم ئەنجامدەدا. ئەو حەقیقەتەی تامەزرۆی بووم راستی بەهێز دەکرد، راستیش حەقیقەتی بەهێز دەکرد. لەو ساڵانە هاتنی هونەرمەندان بۆ شوێنی گەریلاکان، کۆبوونەوەی دەهەزاران کەسی خەڵکی کورد لە رۆژانی نەورۆز چەندەی بڵێی ژیانبەخش و زیندووکەرەوە بوو. هاتنی ئارام تیگران بۆ گۆڕەپانی سەرۆکایەتی و کردنەوەی Med tv هیوای بۆ "ئەشقی بێ ئومێد" دەگەڕاندەوە. بەشداریکردنی بەلێشاوی کچانیش بەخرۆش بوو. بۆ یەکەمین جار بوو بەسەربەرزییەوە لەباوەشم دەگرتن. دووبارە بەیەکەوە یاریمان دەکرد و جارانێکیش دەم خستنە سەرشان و هەڵمدەگرتن. شەرمەکەی ژنم لەگەڵ زەوی تەخت دەکرد؛ چەندەی بەرجەستەبوونی ژیانی ئازادم لە کەسێتی ئەواندا دەبینی واتای ژیان زیاتر دەپشکوت و جوانتر دەبوو.

سەرباری ئەوەی گەلی کورد دووچاری خیانەت و ئازاری جگەرسووتێن هاتووە، بەڵام پیشاندانی هێزی خۆڕاگری و پابەندبوونی لەو ساڵانەدا، پەیوەندی بەهەستکردن بەحەقیقەتی خۆی و تێگەیشتنی ئەو راستییەیە کە ئەوە گرنگترین شەرەفی مرۆیی و سەرەکیترین پرەنسیپی ئەخلاقییە. ئەگەرنا خۆڕاگرییەکەی بەرامبەر فێڵبازانەترین شێوەی شەڕەکانی گلادیۆی بە تواناترین هێزە هەژموونگەراکانی جیهان بەجۆرێکی دیکە روون نەدەکرایەوە. لەو ساڵانەدا بەردەوام دروشمی "کوردستانێکی سەربەخۆ، یەکگرتوو، ئازاد" مان بەکاردەهێنا. پێویستە بەئاشکرا بیڵێم کە بەرامبەر واقیعبوونی ئەو دروشمە زۆر گەرم نەبووم. ئەو راستییەی منی زۆر گەرم کردبوو و هێزی پێبەخشیبووم رابوونی گەل بوو. مەحاڵ بوو بەرامبەر بە گەلێک نەخرۆشێم و رێزێکی گەورەی پیشاننەدەم کە دەستی بەتێکۆشانی خۆی کردووە، هەرجۆرە کۆمەکێک دەکات، هێژاترین و بەهادارترین کچ و کوڕەکانی وەک قوربانییەک بەختدەکات. ئەوەی من ئەنجامدا، تەواوی هێزی هەست و ئەقڵی خۆمم بەکارهێنا و کۆمەککردنی حەقیقەتی ئەو شەڕ و تێکۆشانە شەڕەفمەندانەیان بوو. هیچ هەوڵێک لەو کار و خەباتە هێژا و بەنرختر نەبوو. ئەو فیداکارییانەی گەل و پێشەنگەکانی تەنانەت یەکێکی زۆر بەگومان و خاوەن زەین و هەستێکی ناجێگیری وەک منیشی هێناوەتەوە سەرخۆ، بگرە سەرلەنوێ زیندووی کردبوویەوە. لەکاتێکدا من هەوڵی دۆزینەوەیانم دەدا، ئەوانیش سەرلەنوێ منیان ئافراندبوویەوە.

کاتێک پێویست بکات، بوونیان جێگای باس بێت، ئازادی و کەرامەتیان رووبەڕووی لەدەستچوون بێت، ئەوا شەڕی گەلان دەستلێبەرنەدراو دەبێت. چونکە جگە لە شەڕ هیچ رێبازێکی دیکە بوون، ئازادی و کەرامەتیان ناپارێزێت. سەبارەت بەکوردانیش ئەو قۆناغە سەردەمێکی بەمجۆرە بوو. بەر لە ئازادی و رزگاری شەڕکردن رێبازێکی ژیانەوە بوو. فاشیزمی ١٢ی ئەیلول لەمیانەی رەفتارێکی بێهاوتای جیهان لە جۆری قەدەغەکردنی زمان لەراستیدا لەرێگای پەیڕەوکردنی ئاشکرای لەناوبردنی کوردان کە پێشتر بەشاراوەیی بەڕێوە دەچوو، بڕیاری ئەنجامگیرکردنی دابوو. تاکە رێبازی ژیانی سەبارەت بە کوردان

شەڕ بوو. چونکە هەموو ڕێگاکانی خۆگوزارشتکردن داخراو بوو. کاتێک باسی داخستن دەکەم مەبەستم گروپەکانی دیکەیە. بەهیچ شێوەیەک دەرفەتی سەلماندنی بوون و ژیانی ئازاد بۆ کوردان لەئارادا نەمابوو. باجەکەی هەرچیەک بێت و ئەنجامەکانیشی هەرچۆنێک بێت، شەڕ تەنیا تاکە ڕێگای چانسی بوون و ژیانی ئازاد نەبوو، بگرە دەرمانی لەسەرپێ مانەوە بوو. لەبەر ئەوەی هێزەکانی دیکە بەشێوەیەکی شایستە پەنایان بۆ ئەو ئامرازە نەبرد لە ڕۆژەڤ و ژیانی کۆمەڵگا دەرکەوتبوون. ئەو ڕاستییەی نوێنەرایەتییان دەکرد بەشی ژیانداریکردنیانی نەکردبوو.

ئەوەی لەو قۆناغەدا بۆ من سەیر و سەرنجڕاکێش بوو، ئەو شەڕەی ناموس بوو کە دایکم دەیسەپاند بەبنەمای ڕاستەقینەی خۆی گەیشتبوو. لەڕاستیدا دایکم ویستبووی ڕێسایەکی ژیانی کۆمەڵایەتیم بۆ دەستنیشان بکات. بەڵام چونکە هێزی دەربڕینێکی ڕاستی واقیعی بەرجەستەی نەبوو، بەدوای ئامانج، کات و پەیڕەوی چەوتەوە بوو. لەڕاستیدا لەئاکامی ئەو شەڕ و تێکۆشانەی بوونی خود ناموسی کۆمەڵایەتی، واتە بوون و کەرامەتی کورد ڕزگاری ببوو. بۆ یەکەمین جار بوو لەڕێگای ئەو شەڕ و تێکۆشانەوە مافی ژیانی شەرەفمەندانە بەدەستهێنرا بوو. سەبارەت بەتەواوی ئەو کوردانەی ڕاببوونە سەرپێیان و خاوەندارێتیان لە شەڕ و تێکۆشانی بوونی خۆیان دەکرد بەدەستهێنانی مافی ژیان جێگای باس بوو. لەو ساڵانەدا مان و نەمان جیاوازییەکی ئەوتۆی نەبوو. ئەوەی گرنگ بوو، بەدەستهێنانی مافی ژیانی شەرەفمەندانە بوو. نموونەیەکی ئەوەش لە بەرخودانی زیندانی دیاربەکر نمایش کرابوو. چالاکییەکەی مەزڵوم دۆغان لە نەورۆز، خۆسووتاندنی فەرهاد کورتای، نەجمی ئۆنەر، ئەشرەف ئاینک و مەحمود زەنگین، مانگرتن و شەهیدبوونی هەڤاڵان کەمال پیر، محەمەد خەیری دورموش، عاکیف یلماز و عەلی چیچەک شەڕی کەرامەت و سەرفرازی بوون. هەریەکە و بەهایەکی بێهاوتای شەڕی گەل بوو. دروشمی "شەڕی کەرامەت سەردەکەوێت" کە هەموویان بەیەکەوە هاواریان بۆ کرد گوزارشتی لەو ڕاستییە دەکرد.

لەکۆتاییەکانی ساڵی ١٩٧٨دا کاتێک بڕیاری ڕاگەیاندنی PKKماندا تووشی دۆخێکی هاوشێوە ببووین. ئەوەی تێیدا سەرکەوتین تێکۆشانی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بوو. بەڵام زیادبوونی گروپە لایەنگر و هەوادارەکانمان بەڵگەی سەلمێنەری گرتنەبەری ڕێچکەی ژیانی شەرەفمەندانە و سەلماندنی بوون بوو. ئەوەی لەکۆتاییەکانی ١٩٩٨دا ڕوویدا لە بەڵگە زیاتر خودی ڕاستی بوو. کاتێک سیستەمی گلادیۆ لە بەرزترین ئاست و بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ هێرشی کردە سەر خودی خۆم، پەژارەو پەشێوی ساڵانی پێشووتر لەئارادا نەبوو. بگرە بەجۆرێک لەجۆرەکان هەستم بە بارسووکی دەکرد. ئەو بابەتەی زەحمەتیم سەبارەت بە لێکجیاکردنەوەی دەبینی: چی بوون ئەو مافانەی بەدەست هێنرابوون و چی بوون ئەو بارانەی پێویست بوو فڕێبدرێن. ئەو دوالیزمە بوو کە لە ڕۆژانی مۆسکۆ ـ ڕۆما فیکرمی سەرقاڵ کردبوو. کاتێک ئاوڕێک لەدواوە دەدەمەوە باشتر دەرکی پێدەکەم ئەوەی لەو ڕۆژانە بەلای منەوە ون و فەوتاو بوو یۆتۆپیای دەوڵەت ـ نەتەوە بوو. لەبەر ئەوەی

هەوڵمدەدا وەک زانست و ئایدیۆلۆژیا دەرک بە سۆسیالیزمی زانستی بکەم، لەمەسەلەی دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوە ئارام نەبووم. تەنیا بەهۆی ناڵەباری و ڕێپێنەدانی هەلومەرجی سیاسی نەبوو، بەڵکو لە لێگەڕین و توێژینەوە ئایدیۆلۆژی و زانستیەکەشم جێگام بۆ دەوڵەت نەدەدۆزیەوە. لەڕاستیدا خولیا دەسەڵاتگەراییەکانی خۆرهەڵاتی ناوین تابڵێی ئارامی لێبڕیبووم. سەرنجڕاکێشی دەوڵەت ـ نەتەوە منی هێندە کەمەندکێش نەدەکرد. زیادکردنی نموونەیەکی کوردی بۆ سەر سەدان دەوڵەت ـ نەتەوەکانی تر لەگەڵ ئەو دونیایەمدا کۆک نەبوو کە بەدوای توێژینەوە و لێگەڕینی گەردوونیەوە بوو. بەڵام بەهۆی کاریگەری سۆسیالیزمی بونیادنراوەوە ساڵانێک بوو نەمدەتوانی ڕزگارم بێت.

کاتێک لە ڕۆما بووم دیسان ئاشنابوونم بە مۆسیقایەک جێگای باس بوو. ئەو لاوکەی لە ڕۆژە ناخۆشەکانی نەخۆشخانە زیندانەکەم گوێم لێگرت دەروێشی عەبدی بوو بە دەنگی باوکی سەلاحەوە. چیرۆک و بەسەرهاتی داستانەکەم نەدەزانی بەڵام مۆسیقاکەی زۆر بەکاریگەر بوو. کاتێک دەنگبێژەکە لاوکەکە دەڵێت دیار نییە کە چەندە ئاگاداری ناوەڕۆکەکەیەتی. بەبڕوای من ئەو داستانە گوزارشتی لە گیانەڵڵای دەوڵەتگەرایی کورد دەکرد کە لەسەردەمی ئەحمەدی خانییەوە جێگای تامەزرۆیی و حەسرەتە. هەروەها لەگەڵ ئەو دۆخەدا ڕێک هاتبوو کە تێیدا دەژیام. ئەو هەستەی لەدەستمدا، لەدەستمدەدا سەبارەت بە دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد بوو. لەهاوسەنگی دونیای ئەوکاتە، لە هێڵی مۆسکۆ- ڕۆما و چاودێرییە بێ ئامانەکەی گلادیۆ ئەو هەستەم ڕۆحی دەدا. بەهۆی نەغمەی ئاوازی مۆسیقاکە تا مۆخی ئێسقانەکانم هەستم پێدەکرد. وەک دەزانرێت دەروێشی عەبدی هەم گوزارشتی لەدوا بەرخودانی ئێزیدییەکان دەکرد، هەمیش لەکەسێتی "عەدولێ"دا گوزارشتی لە بەرخودانی نائومێدانەی کوردێتی دەکرد لە بەرامبەر ئاسیمیلاسیۆن و لەناوبردنەوە و هەوڵی لەسەر پێ مانەوەی دەدا. وێڕای ئەوەی بە دەنگی لاوکبێژێکی پیاو گوتراوە، بەڵام هەر وشەیەکی عەدولێ وەک دوا هەناسەی کلتوورێک بوو کە هەزاران ساڵ لەسەر پێیان مابوویەوە. لەهەر دابەزینێکی دەروێش لە شاخی شەنگالەوە بۆ دەشتی موسڵ لەڕاستیدا بەرخودانێکی قارەمانانەی بەرامبەر دەرەبەگایەتی ئیسلامی عەرەبی پیشاندەدا. ئەوەش نەریتێکی هەزاران ساڵی بوو. ڕەگەکەی بۆ سۆمەرییەکان لەوانەیە بۆ دوورتریش دەگەڕایەوە. ڕەگ و ریشەکەی بۆ پێکدادانی نێوان قەبیلە سامییەکانی بیابان و قەبیلە ئاریانییەکانی شاخ ـ پێدەشتەکان دەگەڕایەوە. دەروێشی عەبدی دوا نوێنەری ئەو نەریتە بوو. گلانی دەروێش لەسەر ئەسپ و برینداربوونی، لەبنەڕەتدا کەوتن و برینداربوونی مێژو و کۆمەڵگابوونێک بوو. مەرگی لەسەرخۆی دەروێشی زامدار بەزمانی عەدولێ بە گوتەیەک گەیشتبوو، بەدڵنیاییەوە ئەوەش بۆ دەربڕینی مێژوویکی دە هەزار ساڵە و نەریتی کۆنترین گەل بەس بوو.

پێشتر وابزانم لە ساڵی ١٩٩٥ کاتی کردنەوەی مەد تیڤی بوو لەمیانەی ئەو پەیوەندییە تەلەفۆنیەی بەو بەرنامەیەم کرد کە ئارام تیگران یش وەک میوان ئامادە بوو و دیالۆگێکم لەگەڵ ئەنجامدا داوامکرد خۆشترین سترانی بەر دڵم "دەلالۆ" م بۆ بچڕێت. بە

بڕوای من گوتنی ئەو سترانە زۆر سەرسوڕهێنەر بوو. دواتر بۆم دەرکەوت کە سترانی "دەلالۆ"بەشێکی کورتی لاوکی داستانی دەرویشی عەبدییە. ئەو خاڵەی لەبارەیەوە سەرم سوڕماوە، شێوەی ژنێکی وەک عەدولێ دەتوانێت گوزارشت لەراستییەکی مێژوویی و کۆمەڵایەتی هێندە قووڵ بکات. بەبڕوای من ئەوە یەکێکە لە کێشە سەرەکیەکانی ئەدەبیاتی کوردی کە پێویستی بە روونکردنەوە هەیە. هەڵبەتە ئەو بابەتە لایەنی پەیوەست بە کەسی منەوە هەبوو. نەک تەنیا لە چیای شەنگال و دەشتی موسڵ، بەڵکو لە هێڵی شام ـ حەلەب ـ ئەسینا ـ مۆسکۆ ـ دۆشانبە ـ ڕۆما ـ نایرۆبی هەوڵیاندا گورز لە من بوەشێنن. ئەستەمە لێکچوون لەنێوان هەردووکیان نەکەیت. ئەوەی سەیرە، سەرباری ئەوەی چەندین جار کاسێتەکەم دووبارە کردەوە، بەڵام هیچ یەکێک لەو کوڕ و کچانەی لە نزیکمەوە بوون هەمان هەستی منیان نەبوو. کاتێک لە ڕۆما بووم هونەرمەند شوان پەروەر و مەحمود باکسی شاعیر- ڕۆماننووسیش سەردانیان کردم. شوان لەهەوەس و ئارەزووە کۆنەکەی خۆی دابوو. چاوەڕوانی لێنەدەکرا بە قووڵایی مێژوویی ـ کۆمەڵایەتی بگات. دۆخی مەحمود باکسییش زۆر بە ئازار و پەژارەتر بوو. دوا دیدارم لەگەڵ ئەو بوو. داوای کرد لەشاخێک بنێژرێت کە تەرمی گەریلای لێنێژرابێت. گەدەی وێران ببوو، چەند ڕۆژێکی مابوو. ئەویش بە ئەسپایی ماڵئاوایی دەکرد. وەک دەرویشی عەبدییەکی بێناوەڕۆک کراو دەهاتە بەرچاوم کە مۆدێرنیتەی خۆرئاوا لەسەرەخۆ دەیکوشت. زۆر هەوڵیان دابوو لەدژی من بەکاری بێنن. بەڵام هەرگیز لەناخەوە پابەندبوونی خۆی لەدەست نەدابوو. لەدوا ڕۆژانی مانەوەم لە ڕۆما دیسان کەوتنەژێر کاریگەری چیرۆکە تراژیدییە باوەکانی کوردان هێندەی سەیربوونەکەی لام مانادار بوو. سەرباری ئەوەی خوێکی بەمجۆرەم نییە، بەڵام دواتر وەک یادەوەرییەک بۆ داستانی دەرویشی عەبدی ئەو چەند دێرە هۆنراوەیەم بە فیکردا هات:

خۆزگە لەچیای شەنگال لەتەک دەرویشی عەبدی بوومایە !
بە سواری ئەسپە شێیەکان بە قووڵایی دەشتی مووسڵدا چوومایە
دەرویشی زامدارم لە کۆڵ کردایە و بەرەو کێوەکانی کوردستانم بردبووایە
پێم گوتبووایە "سەیرکە، بە هەزاران عەدولێ و دوازدە سوارە وا لێرەن "
لەو شاخانەی مێخوداوەندەکان تەختی خۆیان لێدانابوو بەئاسوودەیی سەر بنێوە
چیتر خەم مەخۆ مردن چۆن و لەکوێ دێت با بەخێر بێت!
ئیتر کوردایەتی مسۆگەر و ژیانی ئازادیش، ڕاستی ئەبەدین.

دواجار کاتێک لە ئورفاش دەرکەوتم چەند دێرە هۆنراوەیەک هات بە مێشکمدا کە پەیوەندییان بە یادی پێغەمبەران ئیبراهیم خەلیل و ئەیوبەوە هەبوو. لەراستیدا ئەو زمانەی نووسین کە جاران ڕێبازێک بوو و زیاتریش بەکار دەهێنرا و بەهادار بوو، بە بەراورد لەگەڵ زانستگەرایی بەشێوەیەکی بەهێزتر گوزارشتی لەحەقیقەت دەکرد، بەڵام

وەک ئەنجامێکی نەخۆشی شێوازی نووسینی مۆدێرن بەکارنەهێنانی ئەو زمانە مایەی تێگەیشتنە.

لە ڕاستیدا بیرکردنەوەم بۆ لەدەستدانی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوەیەی لەئارادا نەبوو ئەنجامێکی کاریگەری کوێرکەرانەی ناسیونالیزم بوو بۆ سەر زهن و هەستەکانم. کاریگەرییەکی میللیگەرایی جێگای باس بوو کە زهن و هەستەکانی کوێر کردبوو. دواتر هەستم پێکرد کە ڕزگاربوون لەوانە چانسێکی مەزن بوو. ئەوەی ڕوویدەدا خاڵیبوونەوەی دونیایەکی زهن و هەست بوو کە بەگشتی لە دەوڵەتگەرێتی بەتایبەتیش لە دەوڵەت ـ نەتەوەگەرێتیدا نقووم ببوو. هەر ئەو نەخۆشیە بوو کە لینینی شێت کردبوو، ستالینیشی کوشت. نەخۆشیەک بوو، بگرە شۆڕشە کلتوورییەکەی ماویش چارەسەری نەکرد و نەبوو بە دەرمان. ترسی من لەوەدابوو ئەو شەڕەی لەپێناو لەدەستدانی زهنیەتی دەوڵەت ـ نەتەوە لەئارادا بوو باجەکەی بۆ ڕاستینەی کورد و ئازادییەکەی چی دەبوون. لەمێژووەوە زۆرباش ئاگادارین کە لەدەستچوونی دەوڵەت، لەدەستدانی تەواوی خانەدان، ئایین و کۆمەڵگا بوو. گەرچی لە دەستدانی دەوڵەتێک، دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی کوردی کە خۆی لەئارادا نەبوو، جێگای باس نەبوو. بەڵام ئەو هەستانە مەترسیدار بوون کە لای مرۆڤ دروستی دەکردن. کاتێک فڕۆکەکەی گلادیۆ بەسەر دەریای سپییەوە بەرەو نایرۆبی تێدەپەڕی، ئەگەر بۆ تۆزێکیش بێت هەستێکی سەیرم لەلا دروست بوو. وەک کاروانی شەمەندەفەری پڕ لە یەهودییەکان بەرەو کامپەکانی مەرگەوە لە کەسێتی منیشدا کاروانی کۆمەڵکوژی کوردان دەستی پێکردبوو. ڕەفتارەکانم ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوەی لەوەدا دەبینی. لەکۆتایی سەدەی بیستەمدا ئەوەی لەکەسێتی مندا ڕوویدەدا تۆڵەکردنەوەی خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە بوو. دەوڵەت ـ نەتەوەی سیستەمی ئیلاهی شارستانیش لەوشکترین قۆناغی بتبوونی خۆی دابوو.

ژیانی ئیمڕالیم بەتەواوی بەهەوڵ و کۆششەکانی ڕزگاربوون لەژێر کاریگەری ئەو خوداوەندە بەسەرچوو. سەردەمی پیلانگێرییە گەورەکان وەرچەرخانی گەورەش لەگەڵ خۆیدا دێنێت. دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەرووی ئەو دیاردە مۆدێرنانەوە دەهات کە لەو چوار سەدەی دوایی زهنی مرۆڤی شێلا و سەرلەنوێ شێوەی پێداوە. سیستەمێکی چەوسانەوەی هاوشێوەی سەرمایەداری کە سروشتی کۆمەڵگا ماوەیەکی درێژ بەرگەی ناگرێت لەسایەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هاتەئاراوە. کاتێک ڕووم لە سۆسیالیزم کرد لەڕاستیدا دەمویست لەگەورەترینی ئەو جانەوەرانە ڕزگارم بێت. بەڵام کاتێک هەمان جانەوەر باڵی خۆی بەسەر سۆسیالیزمیشدا کێشا و خستبوویە ژێر ڕکێفی خۆیەوە، منی بەهەڵەدا بردبوو. گەورەترین سوودی ئیمڕالی، وایکرد دەرک بەو ڕاستییە بکەم. ئەوە حەقیقەتێک بوو کە گرامس یش زۆر لە تێگەیشتنی نزیک ببوویەوە. چەندە بەرگرینامەکانم قووڵتر دەکردەوە بە تەواوی ڕزگاری زهنیم بەدیدەهات. وەک چۆن ڕەدکردنەوەی بوێرانەی تەواوی سیستەمی گرێدراو بە دەوڵەت ـ نەتەوەوە هەرگیز گوزارشت لە دابڕان لە کۆمەڵگابوون ناکات، مانای نزیکبوونەوە لە پارادایم و ڕێبازێک بوو کە بەشی حەقیقەتی زۆر گەورە

بوو. بەدەستەواژەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەو چوارچێوەیەدا زەحمەت نەبوو، بەرگەکانی پێشووتری بەرگرینامەکەم بەپێی پێویست بابەتەکەی روونکردۆتەوە. پێشخستنی دەستەواژەی مۆدێرنیتە (تازەگەری)ی دیموکراتیک وەک دەستەواژەی مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیڤ پێویستییەکی دیالیکتیک بوو. وەک چۆن مارکس میتافیزیای دیالیکتیکی هیگل ی بۆ ماتریالیزمی دیالیکتیکی وەرچەرخاندبوو منیش هەوڵمدابوو مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بۆ مۆدێرنیتەی دیموکراتی وەرچەرخێنم. هەڵبەتە لەمیانەی شەپۆلی مێژووییەوە ئاکامەکانی دیاردەبێت. کاری ئەو راڤە نوێیەی ماتریالیزمی مێژووییە کە تاچەند وەڵامی سیستەمی سەرمایەداری داوەتەوە.

هەوڵەکانی وڵامدانەوەی کێشەی کورد لەرێگای تیۆری مۆدێرنیتەی دیموکراتیەوە هەم رەخنەدانێکی رادیکال بوو سەبارەت بە PKK هەمیش بناغەی رێگەچارەی دیموکراتیانە بوو. لەمیانەی ئەو پارادایمە نوێیەوە دەرفەتێکی بەهێز بۆ روونکردنەوەیەکی زانستیانەی سروشتی کۆمەڵگا رەخسا. مێژووییبوونی کۆمەڵگا و پشکی زهنیەت لەبونیادنانیدا، دەرفەتی تاوتوێ کردنێکی نەرمی دەرەخساند. هەرچی ئەو هەڵوێستەیە لەبواری مێژووییدا مانای گەورەترین زەبر بوو بەر دۆگماتیزم بکەوێت. ئەو دۆگماتیزمە مۆدێرنەی لەمەسەلەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا مۆرکی خۆی لەتەواوی زهنیەتەکان داوە، لەمیانەی هەڵوێستە ئاکپەرستیەکەیەوە وەک چۆن لەناوەرۆکدا درێژەی بە تیۆلۆژیای کۆن داوە، زەبرێکی کوشندەشی لە دیموکراسی وەشاندبوو. دۆگماتیزمی مۆدێرن کە سەرجەم شێوە مۆدێرنەکانی زهنیەتی راستڕەو، چەپڕەو و ناوەندی لەخاڵێکی هاوبەشدا دەکرد بە یەک، کاتێک دەوڵەت ـ نەتەوە دەکات بە تاقانە لەناوەرۆکدا لەدۆخی بەرجەستەی ئەودا هەم ئاکخوادوەندی پەیرەو دەکات، هەمیش بتێکی خۆی بەسەر هەر قەبیلەیەکی مۆدێرن واتە نەتەوەدا زاڵ دەکات و بانگەشەی فرەلایەنی (پلورالیزمی) ساختە دەکات. سەرجەم ئایینەکان لەرێگای دەوڵەت ـ نەتەوەوە دەکرێن بە یەک و کاتێک خوداوەندەکانیشیان دەکەن بەیەک، هەر قەبیلەیەکی نوێ (نەتەوە) بیەوێت بتێکی بە دیاری پێشکەش دەکرێت. ئایدیۆلۆژیای یەهودی کە ئەزموونێکی گەورەی لە ئافراندنی خوداوەندەکان هەیە هەڵبەتە رۆڵێکی دیاری لەوەشدا دەبینی. قەبیلەکانی خوداوەندی کۆنیش لەکێبڕکێکردن لەپێناو وەرگرتنی ئەو بەرهەمە دوودڵیان نەدەکرد. سەرکردەکانی سەرمایەی یەهودی لە ئەوروپای خۆرئاوا بەمانای هەژموونگەراییەکەی پێشەنگایەتی بەرهەمهێنانی کاڵا و فرۆشتنیان دەکرد و هەروەها رێبەرە ئایدیۆلۆژییەکانی یەهودیش خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەیان لەهەمان شوێن لە پەنتائۆن جێگیرکرد و لەفرۆشتنی هەزاران بتەکەشی بەهەر چوار لای جیهاندا زەحمەتییان نەدەبینی. ئایدیۆلۆگە یەهودییەکانی وەک مارکس لە دەرککردن بە فێڵبازییەکەی کاڵای نوێ ( مەیلی زۆرترین قازانج ) و خوداوەندێتی نوێ (ئایدیالیزمی بۆرژوازی) و ئاشکراکردنی راستییەکان دوورەپەرێز نەدەوەستان. بەڵام لەماوەیەکی کورتدا مارکسیش لە چارەنووسەکەی عیسا رزگاری نەدەبوو. ئەوەی زۆر سەیرە لە هەمان ئەو شوێنە لەدایکبووم کە لە شوێنی دامەزرێنەری ئەو نەریتە ئایدیۆلۆژییە واتە حەزرەتی

ئیبراهمی لێ لەدایک بوو، بەهەمان شێوە ڕۆڵێکی هاوچەشنی شکاندنی بتەکانم گرتەئەستۆ، هەروەها هاوشێوەی ئەویش ڕەفتارم بەرامبەر ئەو بتانە کرد کە بەناوی نەریتی ئەوەوە هەرشوێنێکیان داگیرکردووە، دیسان لەهەمان ئەو شوێنەی ئەو دەستپێکرد هەوڵدانم بۆ بەرێوەبردنی بزووتنەوەی شکاندنی بتەکان ئەنجامدانی پێهەڵگرتنێکی هاوشێوە و درێژەپێدانی هەمان کاروان بوو.

کەمێک ماوە دوازدە ساڵی خۆم لە دورگەی ئیمرالی پڕبکەمەوە. لەمێژووشدا دەست نیشانکراوە کە بەهۆی کەشوهەواکەی و هەڵکەوتەکەی لەناوەڕاستی دەریا ئیمرالی بە تێکدان و پووکاندنەوەی جەستەی مرۆڤ بەناوبانگە. لەسەردەمی ئیمپراتۆرییەتی بێزەنتییەوە وەک شوێنی دوورخستنەوە و مردنی ئەو مەحکومکراوانە ناسراوە کە دەوڵەت بە مەترسیداریان دەبینێت. ئەگەر ڕاستینەکانی حەقیقەتێکی زۆر مەزن جێگای باس نەبێت ماوەیەکی درێژخایەن خۆڕاگری مرۆڤێک بەرامبەر هەلومەرجەکانی ئێرە زۆر زەحمەتە. نەک تەنیا سەبارەت بە ڕزگاربوون لە کاریگەری خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوەی هەژموونگەرا کە منی لێرە بەندکردووە، بەڵکو بۆ داماڵینی سەرجەم دەمامکەکانیشی ئیمرالی بوو بە قوتابخانەیەکی بەرکەماڵ. نەک تەنیا لەپێناو ڕزگاربوونی کوردان لەژێر کاریگەری ئەو خوداوەندە، بەڵکو بە ئامانجی بونیادنانی سیستەمی نوێیان لەسەر بنەمای ڕاڤەی زانستی سروشتەکەیانەوە ئیمرالیم وەک قوتابخانەیەکی ڕاستەقینە بەکارهێنا. بیروباوەڕییەکانی قوتابخانەی ئیمرالی نەک تەنیا گەلەکەمان یان گەلەکانمان بەڵکو تورکیای مۆدێرنیشی بەدۆخێک گەیاندووە کە زۆر لە جاران چاکترە. حاشاهەڵنەگرە کە بەگوێرەی پێویست بناغەکانی تورکیای دیموکراتیک لە ئیمرالی دانراوە. لێرە بەشێوەیەکی یەکلایەنە تەنیا باسی بەشی خۆم ناکەم. خودی وەرچەرخانی دەوڵەتیش لەمیانەی ئەو بوێرییەوە بەدیهاتووە کە لە ئیمرالی وەریگرتووە. ئەگەر گرێدراوی پیلانگێڕییە گەورەکەش (١٩٩٩) بێت، لەدایکبوونی کوردستانی مۆدێرنیش ڕاستەوخۆ پابەندی ئەو حەقیقەتەیە کە لە ئیمرالی هاتەئاراوە. لەئاکامی ئەو وانانەی لە ئیمرالی وەرگیراوە هەم تورکیای دیموکرات و مۆدێرن هەمیش کوردستانی ئازادی ـ مۆدێرن کە هەرچەندە لەسەرەتای خۆیشی دایە بەشێوەیەکی تێکەڵ و گرێدراو بەیەکتر هەوڵی بونیادنانیان دەدرێت.

بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لە کوردستاندا گوزارشتی نوێی کۆمەڵایەتی و مێژوویی بوونی کورد و ژیانی ئازادە کە هەم لەبواری تیۆری هەمیش لەبواری پراکتیکییەوە پێویستی بە قاڵبوونەوە و وەرچەرخان هەیە. گوزارشت لە حەقیقەتێک دەکات کە لەئاستی ئەشقی ڕاستەقینەدا خۆبەخت کردن دەکاتە پێویستییەک. وەک چۆن جێگای هیچ ئەشقێکی ساختە لەو ڕێگایە نابێتەوە، جێگای ڕێبواری ساختەش نییە، لەبواری ئەرێنیدا هەرچییەک لەمێژووی مرۆڤایەتیدا هەبێت وەک هەنگوین پاڵێوراوە و پێشکەش بە ڕێبواری ئەو ڕێگایە کراوە. پرسیاری بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات لەو ڕێگایەدا کەی تەواو دەبێت پرسیارێکی بێواتایە. ئەوەی جێگای باسە بونیادنانێکە تا

مرۆڤایەتی هەبێت تەواو نابێت. بەرادەی ئەو بوونەوەرانەی هەرساتێک خۆیان لە گەردوون دەئافرێنن، وەک چۆن مرۆڤیش کەینونەیەکە بەردەوام لەرێگای هوشیاری ئازادەوە خۆی دەئافرێنێت، بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتیش خاوەن ئەو ئازادیەیە کە هەر ئان و ساتێک سەرلەنوێ خۆی بئافرێنێت. لەبواری کۆمەڵگابوونیشەوە یۆتۆپیا و راستینەیەکی خاوەن بانگەشەی بەهێزتر جێگای باس نابێت. بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ راستیيە مێژوویی و کۆمەڵایەتییەکەشیاندا کوردان بەشێوەیەکی بەهێز هەنگاویان بۆ بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات هاوێشتووە. خۆی لەخۆیدا لەبواری زهنیدا رزگاربوونیان لە خوداوەندی دەوڵەت ـ نەتەوە کە باوەڕییان پێنەبوو و زۆرەملێیانە کەوتنە ژێر کاریگەرییەوە هیچ شتێکیان ون نەکردووە؛ لەبارێکی قورس رزگاریان بووە، لەبارێک رزگاریان بووە کە بەکەناری لەناوچوونی گەیاندبوون. لەبەرامبەر ئەوەشدا دەرفەتی نەتەوەبوونی دیموکراتیان بەدەستهێناوە. چەندە نرخ و بەهاکەی بزانرێت، ئەو دەسکەوتە هێندە هێژایە. وەک تاک و کۆمەڵگا پێویستە کوردان بەجۆرێک دەرک بەبونیادنانی نەتەوەی دیموکرات بکەن کە سەنتێزێکی سەرجەم گوزارشتەکانی تەواوی حەقیقەت، بەرخودان، بیروباوەڕی خوداوەندە دێرینەکان تادەگاتە باوەڕی زەردەشتی و ئیسلامی قووڵایی مێژوو و کۆمەڵگابوونەکان کە چڕبوونەوەی پاڵاوتنە، بەمجۆرەش هەرس و پراکتیزەی بکەن. ئەوەی سەرجەم بیروباوەڕییە میتۆلۆژی، ئایینی و فەلسەفییە کۆنەکان و زانستی کۆمەڵایەتی هاوچەرخ خوازیاری فێرکردنی بوون، هەروەها ئەو حەقیقەتانەی سەرجەم یاخیبوون و شەڕەکانی بەرخودان یەک بەیەک و بەکۆمەڵ خوازیاری دەربڕینی بوون لەجەستە و زهنی بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا بەرجەستە دەبێت.

نەک تەنیا کاتێک ناوە ناوە سەرلەنوێ خۆم دەئافرێنمەوە، بەڵکو لەکاتێکدا لە رۆژی ئەمڕۆماندا هەموو ئان و ساتێک هەوڵی خۆ ئافراندن دەدەم لەمیانەی ئەو راستیە و گوزارشتی حەقیقەتەکەیەوە جولامەوە. بەمجۆرەش بەشێوەیەکی ئازاد خۆمم کرد بەکۆمەڵایەتی (جڤاکی). بە شێوەی نەتەوەی دیموکرات (کورد) بەرجەستەم کرد. بەسیفەتی مۆدێرنیتەی دیموکراتیش پێشکەشی سەرجەم مرۆڤایەتی و تاک و گەلە ستەملێکراوەکانی خۆرهەڵاتی ناوینم کرد.

ئایا دەشێت یۆتۆپیایەکی شەخسیم سەبارەت بەئاینده هەبێت؟ ئەگەر مرۆڤ لەناو سنوورەکانی تەمەنیدا هەوڵبدات لەمیانەی هیوای یۆتۆپیاکانی سەبارەت بە ئاینده و حەسرەتی سەردەمە زێڕینەکانی رابردوو بژیت، ئەگەر سەرنج نەدرێت و وریا نەبێت لەوانەیە خودی ژیان مایەپووچ بکات. ئەوەی گرنگە ژیانێکە کە مافی ئان بدرێت. باشترینیان ئەوەیە کە بەبێ رابردوو و ئاینده ئان یان سات بژیت. ژیانی دانایانە ئەو ژیانەیە کە رابردو و ئاینده لە ئاندا گوزارشت دەکرێت و دەژێندرێت. بێ رابردووکردن و بێ ئاییندەکردنی مرۆڤ و گۆڕینی بۆ بەکاربەرێکی ئاژەڵانەی سات لەبناغەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و کلتووره کۆیلایەتییەکەیدا هەیە. لەبەرامبەر ئەو کلتوورەی ژیانی تاکخوازی سەرمایەداری کە مرۆڤ دەکات بە ئاژەڵ پێویستە مۆدێرنیتەی دیموکراتیک

حەسرەتی رابردووی سەردەمی زێڕین و هیوای ئاییندە لە جڤاتەکانی کۆمینالی دیموکراتیکی ئان دا بکاتە یەک، کارکردن بە ئازادی دابنێت و لە بوون بە ئەلتەرناتیڤدا سەرکەوتوو بێت.

بەهۆی ئەو پێویستییە دژوار و قووڵە کۆمەڵایەتییەی لەئارادا بوو تائێستاکە لەپێناو ناسنامەیەکی ئازاد و جڤاتی کوردان و ناسنامەی نەتەوەی دیموکرات خەباتم کرد. بۆ تاکە ساتێکیش بێت دەرفەتی ژیانی کەسیم نەبینی. نازانم لەوە بەدواوە دەرفەتم دەبێت یان نا. بەڵام وەک دەبینم بەملیۆنان کەس لە گەلەکەمان و دۆستەکانمان وەک بڵێی ئیش و کارێک نییە ئەنجامی بدەن دەستبەتاڵ دەسوڕێنەوە. ئەو شێوازەی ژیان رقێکی مەزنم لە لا دروست دەکات. ئەوە بە پووچترین و نابەرپرسانەترین شێوازی ژیانیش ناو نابەم، بەڵکو بە نکوڵیکردنی ژیان ناوزەدی دەکەم. مسۆگەر پێویستە ئەو دژە ـ ژیانە لەهەر تاک و جڤاتێکدا دەرباز بکرێت. پێشتر ئاماژەم پێکردبوو کە ئەو جۆرە دەستبەتاڵی و وێڵییە زۆرجار لەژیانی گەریلاشدا روویدەدا و رقێکی گەورەشی لای من دروست دەکرد. تێکۆشەری چەکبەدەست ئەگەر ئافرێنەرێکی سنوورنەناسی ژیانی ئازاد بێت، لەئاستی ئەشقدا هۆگری ئەو ژیانە بێت و هێندە زانا، ژیر و بەبانگەشە بێت کە لە بستێک خاک ـ شاخدا بتوانێت داستان تۆمار بکات، ئەو کاتە پێویستە بچێتە شاخ. ئاشکرایە کەسانێک هێندەی گەشتیار و شاخەوانە ئاساییەکان خاوەن خرۆش و ئیرادە نەبن ناتوانن ببن بە گەریلای چۆڵەوانی، دارستان و شاخەکان. بەردەوام گوتومە؛ چۆن ئەو مرۆڤە وێڵ و بێکارانە دەست بۆ ئەو ژیانە دەبەن. دەمگوت؛ هەر کێیەک بێت ئەو مرۆڤەی خۆی بخاتە دۆخێکی بێکاری و وێڵییەوە گەورەترین بێ ناموسی ئەنجام داوە، کەوتۆتە رەوشێکی بێ کەرامەتی و نارەسەنێتییەوە. هەروەها گوتبووشم: ئایا مێروولە یان هەنگێکی بێکار هەیە؟ کاتێک هەنگ و مێروولە بێکاربن یەکسەر دەمرن. تەنانەت ئەوانیش بێکاری بەبێ ناموسی دادەنێن و مردن پەسەند دەکەن. لە هەلومەرجەکانی بونیادنانی نەتەوەی دیموکراتدا لە منداڵێکی حەوت ساڵییەوە تا کاڵێکی حەفتا و حەوت ساڵیەوە، لەژنەوە تا پیاو، ئاستی خوێندنی هەرچیەک بێت کار بۆ هەر مرۆڤێک هەیە. کارێک یان چەندین کار بۆ هەر کەسێک هەیە کە لە ئاستی عیبادەتەوە سەرقاڵی بێت، لەمیانەی ئەنجامدانیەوە هەم خۆی بپارێزێت و تێرخۆراک بکات، هەمیش زۆربوونیش ئەنجامبدات و لەرێگاشیەوە ئازاد بێت. تەنیا ئەوە بەسە کە تۆزقاڵێک بەشی خۆی لە ئیرادە و هوشیاری نەتەوەی دیموکرات وەرگرتبێت!

بۆ نموونە؛ ئەگەر من بوومایە و رێگام بکەوتایە هەر شوێنێک جا گوندی خۆم بێت، یان چیای جودی، بنارەکانی شاخی جیلۆ، دەوروبەری دەریاچەی وان، شاخەکانی ئاگری، مونزر و بینگۆل، کەنارەکانی رووباری فورات، دیجلە و زاپ، تا دەگاتە دەشتەکانی ئورفا، موش و ئیغدیر، رێگام بکەوێتە هەر شوێنێک وەک بڵێی؛ بە کەشتیەکەی حەزرەتی نوح لەناو تۆفانێکی سامناک دەرکەوتووم، وەک چۆن حەزرەتی ئیبراهیم لەدەستی نەمرودەکان، حەزرەتی موسا لەدەستی فیرعەونەکان و حەزرەتی

محەمەدیش لەدەستی جەهالەت رایکرد منیش وەها لە دەست مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رامدەکرد، پشتم دەبەست بە ئەشقی زەردەشت بۆ کشتوکاڵ و دۆستایەتی ئاژەڵان، ئیلهامم لەمانە و راستینەکانی کۆمەڵگا وەردەگرت و دەستم بەکارەکانم دەکرد. کارەکانم بەجۆرێک زیاد و بە پیت دەبوو کە بە خەیاڵیشدا نایەت. یەکسەر دەمتوانی لە هەرەوەزییەکانی گوند دەستبەکار بم. ئاواکردنی کۆمۆنی گوندێک یان چەند گوندێک کارێکی چەند بەخرۆش، ئازادیبەخش و تەندروست دەبوو! ئاواکردن و خستنەگەڕی کۆمۆن یان کۆنسەی گەڕەکێک یاخود شارێک چەندە داهێنەرانە و ئازادیبەخش دەبوو! کردنەوەی ئەکادیمیایەک، پێکهێنانی هەرەوەزییەک و کردنەوەی کارگەیەک رێگای لەپێش چی دەکردەوە! ئاواکردنی ئەنجوومەن و کۆنگرەکانی دیموکراسی گشتی گەل، گوتاردان و کارکردن تێیدا چەندە جێگای فەخر و شانازی بوو. ئەو کاتە دەبینرێت وەک چۆن تامەزرۆیی و هیواکان سنووریان نییە، بۆ بەدیهێنانیشیان جگە لە خودی تاک هیچ بەربەرستێکی دیکەی جددی نییە. تەنیا ئەوەی پێویستە تۆزێک کەرامەتی کۆمەڵایەتی، تۆزێکیش ئەشق و ئەقڵ!.

## بەشی حەوتەم

# تەنگژەی خۆرهەڵاتی ناوین و رێگەچارەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک

تا ئێستاکەش تەنگژە ـ دەرکەوتن لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا پێگەی خۆی لە کلتووری گەردوونیدا دەپارێزێت. لەبەر ئەوەی لە بەرگی پەیوەندیداردا بەشێوەیەکی تێرو تەسەل تاوتوێ کراوە، دووبارەی ناکەمەوە و تەنیا سەرنجی بۆ رادەکێشم. ئەوەی پێویستی بە هەڵوەستەکردن و تاوتوێکردنێکی بەرفراوان هەیە دیاردەی دەسەڵاتی ناوەندییە. چەسپاندنێکی زانستییە کە دیاردەی دەسەڵات بناغەی تەنگژە کۆمەڵایەتییەکان پێکدێنێت. هەر بۆیەش پێویستە چارەسەرییەکان پەیوەست بە دەسەڵاتەوە پێشبخرێن.

بە درێژیی هەڵمانسەنگاند کە بە درێژایی پێنج هەزار ساڵ سیستەمی شارستانی ناوەندی رۆڵی پێشەنگایەتی لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا بینیوە. شارستانی ناوەندی گرێدراوی دەسەڵاتی بەناوەندبوونە. بەجۆرێک لەجۆرەکان شارستانی شانبەشانی ناوەندیبوونی دەسەڵات دەڕوات. شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵە لەهەمانکاتدا واتای ئەو دەسەڵاتەیە کە بەدرێژایی هەمان ماوە ناوەندی بووە. پەرتەوازەبوونی دەسەڵات و ناوەندیبوونی بابەتێکە کە لەلایەن چەمکی مێژووی زاڵەوە زۆر تاوتوێ کراوە. بە گوزارشتێکی دیکە پێکهێنانی ناوەندی هەژموونگەرایی و کەنار ئەو دیالیکتیکە سەرەکییە کە هەمان چەمکی مێژوو پەیڕەوی دەکات. هەموو کاتێک دوای تەنگژەیەکی قووڵ هێزە هەژموونگەراکان سەرلەنوێ ئاوا دەکرێنەوە. لەبەر ئەوەی هەر سیستەمێکی هەژموونگەرایی پشت بە ئامرازێکی نوێی بەرهەمهێنان و دەسەڵاتێک پێکدێت، لەگەڵ کۆنبوونی ئەو ئامرازەی بەرهەمهێنان و دەسەڵاتەش دەربازکردنی دەستلێبەرنەدراوە. دەسەڵات و ئامرازە نوێکانی بەرهەمهێنان بەگشتی لەناو پەیوەندییەکانی کەناری ناوەندە هەژموونگەرا کۆنەکە سەرهەڵدەدەن. ئامرازە بەپیترەکانی بەرهەمهێنان و ئامێرە بەهێزترەکانی دەسەڵات لەناو پەیوەندییەکانی کەنار هێزی نوێ دەئافرێنێت. باڵادەستبوونی ئەو هێزە نوێیانە بەسەر هێزە هەژموونگەرا کۆنەکە، بەگشتی ئەو کاتە دەستپێدەکات کە هێزە کۆنەکان خۆیان نوێ نەکەنەوە و بکەونە ناو تەنگژەوە. ئەو قۆناغە لەمیانەی شەڕ و پێکدادانەوە دەرباز دەبێت. هێزە کۆنەکان نایانەوێت بە ئاسانی

پاوانی دەسەڵاتی ناوەندی لەدەستبدەن. ئەگەر هێزە نوێیەکە ناوەندی بێت، بیەوێت لەسەر پێیان بمێنێتەوە و بەهێزتربێت، ناچارە شوێنی ناوەندی کۆن بگرێتەوە. بێگومان تەنگژە لەمیانەی خەسڵەتە گرژ و شەڕانگێزییەکەی ئەو قۆناغە دێتەئاراوە. وەک چۆن هێزێکی هەژموونگەرایی لەخۆیەوە ناکەوێتە ناو تەنگژەوە، هێزێکی نوێش دژی سیستەمی هەژموونگەرایی نەبێت پەرە ناسەنێت. لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین و سیستەمی شارستانی دەستا و دەستکردنێکی زۆری بەمجۆرە جێگای باس بووە. هەڵکشان و پەرتەوازەبوونی شار، چین و دەوڵەتەکان، دامەزراندن و رووخاندنی میرنشین و ئیمپراتۆرەکان، ئاواکردن و کەوتنی خانەدانەکان هەمووی پەیوەست بە تەنگژەکانی پەیوەندییەکانی نێوان ناوەند ـ کەناری ئەو هەژموونگەرایانە هاتۆتەئاراوە. ئەگەر خوازیارین مێژوو بەشێوەیەکی راست بخوێنینەوە، ئەوا تێگەیشتنی دیالیکیتکی ژێر تەواوی ئەو پرۆسە و قۆناغانە ناچارییە.

چۆنیەتی پێکهاتنی ناوەندی هێزی هەژموونگەرایی سەرەکیترین پرسیاری دیالیکتیکی مێژووییە و رۆڵی کلیل دەبینێت. پێکهاتنی هەژموونگەرایی بەر لە هەر شتێک پێویستی بە پێکهاتنی ناوەندەکانی هێزی خۆجێیی هەیە. ئەوانەش بەگشتی میرنشینە شاخاوییەکان، پلەدارییە خێڵایەتی و قەبیلەگەراکان و دەوڵەتۆکەکانی شارن. دوای پێکهاتنی ناوەندی هێزە خۆجێییەکان، شەڕەکانی زیادکردنی بەش لەنێوانیاندا دەست پێدەکات کە سەرچاوەی خۆی لە زێدە ـ بەرهەم وەردەگرێت. شەڕەکانی زیادکردنی بەش مەسەلەی سنوورەکان دێنێتە ئاراوە. ئەوەش مانای گۆڕینی سنووری موڵکایەتی خانەدان و خێڵەکانی چاخەکانی پێشوو بۆ سنووری دەسەڵاتە خۆجێییەکان. هەر دەسەڵاتێکی خۆجێیش مانای خانەدانی بنەماڵە یاخود یەکینە بەرفراوانترەکانی قەبیلەن. چەندە گەورەبن، بەو رادەیەش سنووری خۆیان بەرفراوان دەکەن. لەئاکامدا سنوورەکان یەکتری دەبڕن. پەرەسەندنی ناهاوسەنگانەی هێزەکانی ناو هەر سنوورێک لەئارادایە. ئامێرە نوێکانی دەسەڵات (چەکی نوێ، ئامرازەکانی گواستنەوە..هتد ) و ئامرازەکانی بەرهەمهێنانی بەپێت هۆی سەرهەڵدانی ئەو ناهاوسەنگیەن. زیادکردنی بەردەوامی هێز دۆخی سەرەتایی کەڵەکەکردنی سەرمایەیە. وەک چۆن سەرمایەی سەرمایەداری بەردەوام کەڵەکەکردن زیاد نەکات ناتوانێت لەسەر پێیان بمێنێتەوە، هێزەکانی دەسەڵاتی خۆجێیش هێزی خۆیان گەورە نەکەن ناتوانن لەسەر پێیان بمێننەوە. کاتێک فراوانکردنی سنوورەکان لەناوچە خاڵیەکان تەواو دەبێت، هێزە جیاوازەکان رووبەڕووی یەکتردەبنەوە، ئەو کاتە قۆناغی پێکدادان واتە قۆناغی تەنگژە دەستلێبەنەدراو دەبێت. دەستلێبەرنەدراوی یاخود ناچاری بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە: گەورەبوونی زێدە ـ بەرهەمی هێزە خۆجێییە تازە پێکهاتووەکان نەبێت ناتوانن هێزی خۆیان بپارێزن. چونکە بەهۆی زیادبوونی بیروکراسەکان، خانەدانەکان و قەبیلەکان ژمارەی دانیشتوان هەڵدەکشێت. دەسەڵاتیش وەک خانە شێرپەنجەییەکانی گەورەبوون خوازیارە لەتەواوی بوارەکانی کۆمەڵگا بڵاوببێتەوە. هەر وەک لەنموونەی خانە زیندووەکاندا دەبینرێت ئەوەش رێگا لەپێش شەڕی خۆپاراستن و بەرگری لەخۆکردن

دەکاتــەوە. بەشــێوەیەکی زۆر ســەرنجڕاکێش لەیەکــەمین دەوڵەتشــارەکانی ســۆمەر و شەڕەکانی خانەدانێتیدا تێبینــی ئــەو پرۆســەیە دەکرێــت. لــە ئێراقــی ڕۆژی ئەمڕۆشماندا هەمان پرۆسە بەهەموو ڕوونییەکەوە بەردەوامە (دەشێت نــەفرینی ئینانــای مێخوداوەنــدی ئوروک بێت).

قۆناغی شــەڕ و پێکدادانــەکانی نێوان دەســەڵاتە خۆجێییــەکان یــان بــە لــەناوچوونی هــەمووویان یــاخود بــە باڵادەستبوونی یــەکێکیان لــەو تەنگژەیــەدا کۆتــایی دێــت. لــە دەوروبــەری شــار یــاخود خانەدانــە ســەرکەوتووەکاندا ناوەنــدی نــوێی هەژموونگــەرایی پێکدێت. تــەواوی ســەرخان و ژێرخانەکــەی، واتــە ئامرازەکــانی بەرهــەمهێنانی مــاددی و موڵکــەکانیان لەگــەڵ بونیــادە سیاســی و مەعنەوییــە ئایدیۆلۆژیــەکانیان ســەرلەنوێ ڕێکدەخرێنەوە. هەژموونگەرا نوێیەکە خۆی دەکات بە پیرۆز و ئیلاهی. یان ئایینە کۆنەکە بــەگوێرەی بەرژەوەندییــەکانی خــۆی دەگونجێنێــت، یــان مەزهــەبێکی دیکــە پێکــدێنێت و جیاوازی خۆی دەخاتەڕوو، یاخود لەمیانەی ئایین یاخود میتۆلۆژیایەکی نوێوە، واتە لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە خوازیارە خۆی بکات بەهەمیشەیی و ئەبەدی. سیستەمی شارستانی ناوەندی خۆرهەڵاتی ناوین بەدرێژایی پێنج هەزار ساڵ لەرێگای ئەو ڕێکارە دیالیکتیکیەوە خۆی کرد بە ناوەندی و لەتــەنگژەکان دەرکــەوت. هــەر قۆنــاغێکی ململانــێ و پێکدادان بــە دەسەڵاتێکی دیکەی ناوەندی گەورەتر ئەنجامگیر بوو. هەڵبەتە هەر لەئاکامی ئەوەش بوو کە بەردەوام توانی ببێتە سیستەمی شارستانی ناوەندی. ئەو ناوەندیبوونەی لەزیادبووندا بوو باجەکەی تەنیا لەدەستدانی هێزی دەسەڵاتە خۆجێییەکان نەبوو. بەشێوەیەکی گشتی بــەردەوام مــافی خۆبــەڕێوەبردنی کۆمــەڵگاکان زەوت کــرا، دەســتێوەردان بــۆ سیســتەمە دیموکراســییە سروشــتییەکەی بنەماڵــە و قەبیلــەکانی ناوەنــد، کــەنار و بگــرە ئەوانــەی دەرەوەش کــراوە، مــافی خۆبــەڕێوەبردنیان زەوتکــراوە و بــەخۆیانیان بەســتوونەتەوە و ناوەنــدی هەژموونگــەرایی بــەهێزکراوە. ئەگــەر دەســەڵاتی هەژموونگــەرایی بێــت یــاخود دەسەڵاتە خۆجێییەکان باجی پێکهاتنیان لاوازکــردن یــاخود لــەناوبردنی خۆبەڕێوەبــەرێتی شــار و گونــدەکان، قەبیلــە و خێڵــەکان بــووە کــە لــەناو سیســتەمی کۆمــۆنی ســەرەتاییدا دەژیان.

دەسەڵاتی ناوەنــدی هەژموونگــەرا بــەردەوام لەســەر حیســابی دەســتڕۆییە خۆجێییــە دیموکراتیەکان پێکدێت. دەسەڵاتە هەژموونگەرا هەزاران ساڵیەکان ڕۆڵێکی دیاریکەریان لە لاوازبوونی ڕۆح و زهنیەتی دیموکراسیانەی کلتووری خۆرهــەڵاتی ناویندا هەیــە. لەبــەر ئەوەی کلتووری دەسەڵاتی ئەوروپا پشت بە مێژووی نزیک دەبەخشێت بەردەوام مەیلەکانی نەتەوەی دیموکرات بەهێز بووە. بەهۆی نەمانی دەرفەتی دەستڕۆیی کۆمۆنی سەرەتایی لە خۆرهەڵاتی نــاوین، ڕەوتــە ئــایینی و مەزهەبیــەکانی لەگەشــەکردندان نــەریتێکی شێواوی دیموکراسی دەخەنەڕوو. هەر بزووتنەوەیەک لە ناوەڕۆکدا بەرهەڵستکاری دەسەڵات بێت دیموکراتیکــە. لەســەدەی شــازدەهەمەوە خزانــی نــەریتی هەژموونگــەرایی بــۆ ئــەوروپای خۆرئاوا ڕێگای لەپێش کاراکتەری سیستەماتیکی تەنگژەی سیاسی و ئابووری خۆرهــەڵاتی

ناوین کردەوە. لەکاتێکدا لەو سەدەیە بەدواوە هەژموونگەرایی ئیسلامی لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی لە پاشەکشە و لاوازبووندایە، دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ئەوروپا هەڵدەکشێت. پێویستە دەسەڵاتی هەژموونگەرایی وەک سیستەمێک ببینرێت. لەکاتێکدا ناوچەیەک لەسەدەیەکدا تووشی کەوتن و تەنگژە دێت، لەناوچەیەکی دیکە و سەدەیەکی دیکەدا هەڵکشان جێگای باسە. تا دەچێت دەبێت بەناوەندی و جیهانگیری. سەدەکانی نۆزدە و بیست سەدەیەکن کە زۆرترین ناوەندیبوون و جیهانیبوونی سیستەمی هەژموونگەرایی بەخۆیەوە بینیوە. لەو دوو سەدەیەی دواییدا کە زیاتر هەژموونگەرایی ئینگلتەرا و ئەمریکا تێیدا پەرەیسەندووە خۆرهەڵاتی ناوین لە پێگەی کلتووری کەناردایە و بەدەست تەنگژەیەکی قووڵەوە دەناڵێنێت. دوای پەرتەوازەبوونی هەژموونگەرایی عوسمانی تەنگژە هەزاران ساڵیەکەی کلتووری دەسەڵاتی هەژموونگەرایی ناوەندی قووڵتر بۆتەوە.

سیستەمی دەسەڵاتی هەژموونگەرایی کە ئینگلتەرا و ئەمریکا نوێنەرایەتی دەکەن، لەمیانەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە جێبەجێ دەکرێن کە لەچوار سەدەی دوایی ئاواکران و هەڵکشان. پێویستە زۆر بە باشی ئاشنای سروشتی دەوڵەت ــ نەتەوەکان ببین. شرۆڤەکانی دەوڵەتی سەربەخۆ کە ئایدیۆلۆژیای وردەبۆرژوازی بۆ دەسەڵاتی هێناوەتەوە، جگە لە پەردەپۆشکردنی دەسەڵات هیچ ڕۆڵێکی دیکە نابینێت، ڕاستینەی دەوڵەت ــ نەتەوە روون ناکاتەوە. بەتایبەتیش ئەوجۆرە شرۆڤانەی وردەبۆرژوازی سەبارەت بە دەوڵەت ــ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانەوە ئاواکران، خزمەت بەشاردنەوەی کێشەکانی دەوڵەت و دیموکراسی دەکات، لە سیستەمی سەرمایەداری دادەبڕێت یان دەرهەست (ئەبستراکت)ی دەکات. پێویستە زۆر باش بزانین کە ئینگلتەرا دوو ئامانجی سەرەکی لە ئاواکردنی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەدا هەیە کە سەرەتا لەژێر هەژموونگەرایی خۆی لە ئەوروپا، دواتر لە تەواوی دونیا بونیادنران. یەکەمیان؛ پارچەکردن و بچووککردنەوەی ئەو ئیمپڕاتۆریەت و دەوڵەتە گەورانەی کۆسپی بەردەم هەژموونگەراییەکەی بوون. دوومیان؛ بەلاوەنانی کۆسپی نەریتی نەتەوەی دیموکرات ــ کە لەکاتی دەرکەوتن لە چاخی ناوین پێکهات ــ بوو لەبەردەم پەرەسەندنی سەرمایەداریدا. سەرکەوتنی هەردوو ئامانج لەدەرەنجامدا ڕێگا لەپێش دامەزراندنی هەژموونگەرایی سەرمایەداری دەکاتەوە. ئەو چوار سەد ساڵەی رابردوو پاوان یاخود قۆرخکاری دەوڵەت ــ نەتەوەی هەژموونگەرا بەدەست ئینگلتەرا و ئەمریکای ئەنگلۆساکسۆنەوەیە. تا سەرجەم دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی هەژموونگەرا ئاوێتەدەکرێن بچووککردنەوەیان دەستلێبەرنەدراوە. هەر سیستەمێکی هەژموونگەرایی پێویستی بەوەیە. بەدرێژایی مێژوو بەوشێوەیە بووە. لەسەردەمی هەژموونگەرایی سەرمایەداریدا سیستەمەکانی دەوڵەت زیاتر کراون بە سیستەماتیک. لەو سۆنگەیەوە؛ پێشخستنی بۆچوونێکی لەجۆری گوایە لە دەرەوەی سیستەم دەشێت دەوڵەتی سەربەخۆی تەواو لەئارادا بێت، ئەگەر بەمەبەستیش نەبێت خۆ بەزۆرزاندانانی بۆرژوازی بچووکە. لە سەرجەم سیستەمە هەژموونگەراییەکانی پێنج هەزار

ساڵی دواییدا جێگای دیاردەی دەوڵەتی سەربەخۆ نییە. لەسایەی هەژموونگەرایی سیستەمێکی وەک سەرمایەداری کە تا دوایی هەڵگری ئیمپریالیزم و توندوتیژییە باسکردنی دەوڵەتە سەربەخۆکان، ئاواکردنی دەوڵەت بە ئارەزووی خۆت و درێژەپێدانی سەربەخۆییانەی قەوارەی دەوڵەتەکان سەفسەتە و چەنەبازییە.

بۆچی سیستەمی سەرمایەداری پێویستی بە دەوڵەت ـ نەتەوەی هەژموونگەرا دەبێت؟ ئاشکرایە کە سیستەم لەمیانەی چەشنێکی دیکەی دەوڵەت بەردەوام نابێت بۆیە ئیمپراتۆریەتەکان پەرتەوازە نەکرێن، بەتایبەتیش ئەو کۆمارە دیموکراتیانە لەناو نەبرێن کە لەکاتی دەرکەوتن لە چاخی ناوین لەشارەکان چڕبوونەوە، لەو سۆنگەیەوە؛ نەتەوەبوونی دیموکراتیانە بەربەست نەکرێت، سەرمایەداری بەرەو سیستەمی هەژموونگەرایی باڵا ناگرێت. ئەگەر دەسەڵات سەرلەنوێ بەسیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوە رێکنەخرێتەوە، سەرمایەداری ناتوانێت بوونی خۆی بپارێزێت و پەرەی پێبدات. هەژموونگەرایی ئینگلتەرا رۆڵێکی تایبەتی بە خۆرهەڵاتی ناوین بەخشیبوو کە کەوتبووە سەر ئەو رێگایەی باڵادەستی کە تا هیندستان درێژدەبوویەوە. لەکاتێکدا دوای ناپلیۆن هەنگاو بە هەنگاو کۆنترۆڵی خۆی لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین بەرەو پێشەوە دەبرد، یەکێتی یاخود یەکپارچەیی سیستەمی رەچاو دەکرد. لەو پێناوەشدا ئیمپراتۆریەتەکانی ئیسپانیا و فەرەنسای بچووک کردبوویەوە. لەمپەرێکیشی لەپێش ئیمپراتۆریەتی رووسی دانابوو تابەرەو باشوور شۆڕنەبێتەوە. بەدرێژایی ئەو ماوەیەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بەکارهێنا لەدۆخی ناوچەی تامپۆندا هێشتیەوە. کاتێک رێککەوتنی لەگەڵ هەژموونگەرایی هەڵکشاوی ئەڵمانیادا بەست خستیە ناو پرۆسەی پارچەبوونەوە. لەئاکامی یەکەمین جەنگی جیهانیشەوە بە ئامانجەکەی گەیشت. سەرجەم ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی لەو دیرۆکە بەدواوە لە خۆرهەڵاتی ناوین ئاواکران سەرەتا مۆرکی ئینگلتەرا، دواتریش مۆرکی هاوپەیمانە ستراتیژییەکە (ئەمریکا) ی پێوەیە. سەرجەم ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی ئاواکران لەسەرووی هەمووشیانەوە کۆماری تورکیا رەزامەندی دەوڵەت ـ نەتەوەی ناوەندی نەبێت نەیاندەتوانی بەردەوامی بە بوونی خۆیان بدەن. هەڵوەشانەوەی رووسیای سۆڤیێتی دوای حەفتا ساڵ لەدامەزراندنی، تا ئێستاش بەرەوپێشەوە چوونی چین لەرێگای سەرمایەداریدا ئەو راستییە دەسەلمێنێت. بوونی هەندێک ناکۆکی لەسەرەتادا ــ بۆنموونە؛ ئەو ناکۆکیانەی لەساڵانی دامەزراندنی کۆماری تورکیادا لەئارادا بوون ــ لەبەردەم ئەنجامێکی بەو جۆرە نابنە کۆسپ . سیستەمێک خاوەن کەڵەکەکردنی چوارسەد ساڵەی هەژموونگەرایی بێت بەئاسانی دەستبەرداری نابێت و لەژێر ناوی دەوڵەتە سەربەخۆکان هاوبەشێتی لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە ناکات. هاوبەشێتیکردنی هەژموونگەرایی لەگەڵ لۆژیکی سیستەم ناکۆک و دژە. یان شەڕ روودەدات و یەکێکیان سەردەکەوێت، هەژموونگەرایی لەدەست ئەودا دەبێت، یان سیستەمێکی دیکەی نوێ و بە بەرهەم لەدایک دەبێت و هێزی هەژموونگەرایی کۆن بەشی رووبەڕووبوونەوەی ناکات. ئەویش لەچوارچێوەی یەکێتی دیالیکتیکیدا پێویست بکات لەرێگای شەڕەکانی بەرگری یان

ڕێککەوتن بەردەوامی بەبوونی خۆی دەدات. هەڵبژاردنی سەرمایەداری و باسکردنی سەربەخۆیی دەرەوی سیستەم جگە لەخۆ فریودان یاخود خۆبەزۆرزانی بەولاوە هیچ مانایەکی دیکەی نییە.

لەحاڵەتێکی وەهادا پێویستە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا ئاواکراون وەک قاڵبۆوەترین دەزگا سیخوڕیەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی هەژموونگەرا دادگایی بکرێن. بۆ نموونە؛ بیست و دوو دەوڵەت ـ نەتەوەی بچووکی عەرەبی تەنیا دەشێت لەمیانەی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی هەژموونگەرادا روون بکرێتەوە. ناشێت روونکردنەوەیەکی دیکەی هەبێت. تەنیا ئەوکاتەی بە دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووک رازی بوو قەوارەی کۆماری تورکیای پاشماوەی عوسمانیەکان دانی پێنرا. بەجۆرێکی دیکە ئاوانەدەبوو و دەرفەتی ژیانی نەبوو. وەک تەواوی جیهان لەخۆرهەڵاتی ناوینیشدا دەوڵەت ـ نەتەوەکان ئامرازی رزگاربوون لە تەنگژە نین، بەپێچەوانەوە ئامرازی قووڵکرنەوەی تەنگژەکانن. ئامانجیان جێبەجێکردنی داخوازییە جیهانگیریەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە هەژموونگەراکانە. لەئاکامدا ئەوەش تەنگژەی سەرمایەداری دەکات بەجیهانگیری. لەبەر ئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ئامرازێک نین لە کلتووری ناوچەکەوە تێرخۆراک بن بەردەوام لەناو ناکۆکیەکدا دەژین. فاکتەرگەلێک دەخەنە سەر تەنگژەی دەسەڵاتی نەریتی کە سەرچاوەی خۆی لە نامۆبوون یان بیانیبوونیان وەردەگرێت. بەو جۆرەش بەتەواوی لەراستینەی کلتووری کۆمەڵگاکانی ناوچەکە دادەبڕێن. ئەو دەزگا سیخوڕیانەی هیچ کێشەیەکی کۆمەڵایەتی چارەسەر ناکەن تا دەچێت بێبایەخ و بێکەڵک دەبن. هەرچەندە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە لە قۆناغی سەرەتای سەرمایەداریدا لەرێگای سەرمایەداری دەوڵەتەوە تۆزێک بوونی خۆیان رەوا کردبێت، بەڵام لە ماوەیەکی کورتدا لەژێر باری قورسی کێشە کۆمەڵایەتییەکان هەناسەیان لەبەر براوە. تەنیا بە دژە ـ دیموکراسی نەوەستان، بەڵکو بوون بە ئانتی کۆمەڵگاش. وەک پێویستییەکی لۆژیکی لەدایکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لەسەر بنەمای دژایەتیکردنی نەتەوەی دیموکرات بوو. لەقۆناغەکانی درەنگیشیاندا ئەو دژایەتییە بۆ دژایەتی کۆمەڵگابوون و کۆمەڵایەتیبوون دەگۆڕێت. ژینگە بەرەو داڕووخان دەبات. ئەگەر بەشێوەیەکی بەرجەستە دۆخی ئەمڕۆیان تاوتوێ بکەین ئەوا دەتوانین باشتر دەرک بە راستیەکەیان بکەین.

### أ) دیزاینکردنی کۆماری تورکیا

ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی دواترین گەورە نوێنەری هەژموونگەرایی ئیسلامییە. دوای شەشسەد ساڵی شەڕ لە دژی هەژموونگەرایی بیزەنتی، دواتریش بەرامبەر هەژموونگەرایی خاچپەرستانی ئەوروپا کە نەمسای هابسبۆرگ پێشڕەوایەتی دەکرد، هەروەها بەرامبەر پەلهاوێشتنی قەیسەری رووسی بەرەو باشوور، هەرە دوایش شەڕەکانی دژی

هەژموونگەرایی ئینگلیز لەدواییدا رووخا. بەردەوام هەوڵی شیکارکردنی ئەو کۆمارەمان داوە کە لە پاشماوەی ئیمپراتۆرییەت دەرکەوت. ئەوانەی رووخانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ ریککەوتنەکەیان لەگەڵ ئەڵمانەکان دەگەرێننەوە بە هەڵەداچوون. ئەگەر ئەڵمانیاش سەرکەوتبووایە دیسان پەرتەوازە دەبوو. دەشێت ئاواکردنی کۆماری تورکیا سەرەتا بە لەناوبردنی گەلە کرستیانەکان، دواتر کۆمۆنیستەکان، ئوممەتگەرا ئیسلامییەکان، چەرکەس و کوردە هاوپەیمانەکانیان و ریککەوتنی نێوان میللیگەرایی یەهودی زایۆنی و بۆرژوازی بیروکراسی تورک ببەسترێتەوە. لەمیانەی ئەو ریککەوتنەی لەژێر سایەی هەژموونگەرایی ئینگلیزدا بەدیهات مەودایەکی گرنگی ئەو رێگایە براوە کە بەرەو پێکهێنانی قەوارەی ئیسرائیل دەچێت. سەرجەم نیشانەکان واقیعی بچووکی کۆماری تورکیا بە ئیسرائیلی بەرایی دەبەستێتەوە. هەروەها لەناوبردنی پێکهاتەی کوردان لە باکووری کوردستان و لە باشووری کوردستانیش هەنگاونان بۆ قەوارەیەکی بچووکی سیاسی کوردان لە نزیکەوە گرێداوی رۆڵی ئیسرائیلی بەرایی کۆمارە. هەلومەرجی سیاسی ئەو کاتە ئەوەی دەکرد بە واقیعێک و دەیسەپاند. هەروەها دابەشکردنی عەرەبەکانیش بۆ چەندین دەوڵەت ـ نەتەوەی بچکۆلە گرێدراوی ئاواکردنی ئیسرائیلە. دەوڵەت ـ نەتەوە بچکۆلەکانی فەلەستین و کورد کە لە رۆژی ئەمرۆمان تازە ئاوا دەکرێن دیسان لە چوارچێوەی هەمان بەرنامە دایە.

کوردان و تورکەکان کە لەشەڕی رزگاری نیشتمانیدا وەک دوو ئەندامی بنەڕەتی رۆڵیان بینی ئەو هەڵوێستەیان لەگەڵ نەریتە مێژووییەکەیان گونجاو بوو. هەروەک لە خانەدانەکانی سەلجوقی، ئەیوبی و عوسمانیدا دەبینرێت لە ئاواکردنی سەرجەم دەسەڵات دەوڵەتەکاندا هەڵوێستێکی هاوبەشیان هەبووە. هەرچەندە لەرێگای یاریکردن بە هەردوولا لە سەدەی نۆزدەهەم بە کاریگەری ئینگلتەرا هەوڵی تێکدانی ئەو هاوبەشێتیە درابێت، بەڵام سەری نەگرت و هاوبەشێتیەکە بەردەوام بوو. پیلانگێڕی و گێرەشێوێنیەکانی تورکە لاوەکان کە دواتر ناویان بوو بە جەمعیەتی ئیتحاد و تەرقی و جڵەویان بەدەست میللیگەرا یەهودییەکان و ماسۆنییەکانەوە بوو نەیانتوانی هەمان نەریتی مێژوویی تێکبدەن. لەدوا شیکاردا هەر ئەو هاوبەشێتیە مێژووییە بوو کە سەرکەوتنی شەڕی رزگاری نیشتیمانی دەستنیشانکرد.

لێرەدا سەرەکیترین پرسیاری پێویستە بوروژێنرێت؛ بۆچی نکوڵی لەبوونی کوردان کراوە کە هاوپەیمانە ستراتیژییە نۆسەد ساڵیەکە و ئەندامی بنەڕەتی دامەزرێنەری کۆمارە؟. کاتێک لۆژیکی وێناکردنی کۆماری تورکیا شیکاردەکەین مسۆگەر پێویستە کاریگەری میللیگەرایی یەهودی و هێزی سەرمایەکەی لە شۆڕشەکانی رووسیا و فەرەنسا رەچاو بکەین. وەک دەزانرێت؛ پاشاکانی فەرەنسا کاسۆلیکی وشک و دژە یەهودی بوون. لەسەردەمی چاخی ناوینەوە رۆڵێکی گرنگیان لە بەندکردنی یەهودییەکان لە گیتۆکان و پەرەپێدانی دژە سامیدا بینوە. قەیسەرە رووسەکانیش ئۆرتۆدۆکسی وشکبوون و لە کاسۆلیکەکان زیاتر رۆڵیان لە کۆمەڵکوژی یەهودییەکاندا بینیوە. ئەگەر رۆشنبیرە

یەهودییەکان بن (دەشێت بە کاتب یان نووسەرەکانیش ناویان ببەین؛ پێشتر هەڵگری نازناوی پێغەمبەر بوون ) یاخود سەرمایەدارە یەهودییەکان ( بەدرێژایی مێژوو کۆکەرەوە لەپێشەکانی سەرمایەی مارژینال بوون ) زۆر بە باشی شارەزای خانەدانی ئەو پاشایەتییانە بوون و لەبەرامبەریان دەوەستانەوە. کاتێک گونجاویان دەبینی لەپێناو تۆڵەسەندنەوە لێیان تیژ دەبوونەوە. شۆڕشەکانی فەڕنسا و رووسیا ئەو دەرفەتەی بۆ رەخساندن. لەخۆڕانییە کە هەردوو شۆڕشیش بە شۆڕشی بۆرژوازی ناوبراون. لە ئامادەکاری ئایدیۆلۆژی و کرداری شۆڕشدا چالاک و بەکاریگەرن. رۆڵێکی کارا و دیاریکەریان لە سێدارەدانی هەردوو پاشا و پەرەسەندنی شۆڕشەکان لەژێر هەژموونگەرایی بۆرژوازیدا هەبوو.

بێگومان کاریگەریەکەیان بەهۆی چەندایەتیەکەیان نەبوو، بەڵکو بەهۆی چۆنایەتییەکەیان بوو. هەروەها ئەو قورساییەی سەرمایەشیان هەبوو کە بتوانێ پێشەنگایەتی بۆ بۆرژوازی بکەن. رێککەوتنیان لەگەڵ ئەو پرۆتێستانە ئەنگلۆساکسۆنانەی لە هێڵی لەندەن ـ ئەمستردام لەهەڵکشان دابوون کاریگەرییەکی زۆری لەسەر هەردوو شۆڕشدا هەبوو. سەرەکیترین هێزی پاڵنەری پشت ئەو شۆڕشانە بوون کە لەسەر هێڵی لیبراڵ یاخود سۆسیالیستی بونیادنراودا پەرەیانسەند.

کاتێک دەوڵەت ـــ نەتەوە پرۆتستانتە ئەنگلۆساکسۆنەکان بەئامانجە هەژموونگەراییەکان ئیمپراتۆرییەتە کاسۆلیک و ئەرتۆدۆکسەکانی ئەوروپایان دەڕووخاند و پارچە دەکرد هێزی سەرمایە و رۆشنبیرە یەهودییەکان هاوپەیمان و رێنیشاندەری سەرەکییان بوون. ئەگەر کاریگەری هێزی سەرمایە و رۆشنبیرانی یەهودی رەچاو و حیساب نەکەین، شیکارکردنی شۆڕشە بۆرژوازییەکانی ئەوروپا زۆر ناتەواو و دۆگماتیک دەمێنێت. هۆکاری هەڵوێستی بۆرژوازی پرۆسیای ئەڵمانی کە دژی هەژموونگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئەنگلۆساکسۆن وەستایەوە، هەروەها هەڵوێستی بۆرژوازی و قەیسەری رووس بەرامبەر بە یەهودییەکان کە بەئاستی کۆمەڵکوژی گەیشت بۆ ئەو بڕوایەیان دەگەڕایەوە کە کاریگەری ئەو دوو لایەنەی یەهودییەکان، واتە پشتگیری کردنیان بۆ پرۆژەی دەوڵەت ــ نەتەوەی ئەنگلۆساکسۆن و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆڵێکی دیاریکەریان لەدۆڕاندنی شەڕی هەژموونگەراییدا هەبووە. هەمان خاڵ بۆ هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیش لەجێگای خۆیدایە، بەڵکو زیاتریش جێگای باسە. چونکە ئیمپراتۆرییەت کۆسپێک بوو لەبەردەم بڕیارەکانی کۆنگرەی زایۆنی کە لە ١٨٩٦دا کۆبوویەوە و فەلەستینی وەک نیشتیمانی یەهودییەکان پەسەندکرد. خاوەن سەرمایە و ملیتانە یەهودییەکان سەرەتا بەشێوەیەکی دۆستانە داوایان لە سوڵتان عەبدولحەمید کرد رێگای کۆچی یەهودییەکان بکاتەوە. کاتێک عەبدولحەمید بەگوێرەی داخوازیەکانیان رەفتاری نەکرد ( بەڵام دیسانیش لەگەڵ یەهودییەکان زۆر تێکەڵ بوو ) یاخود کارەکانیان بەکەم زانی، تورکە لاوەکانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقیان ئاواکرد ( باڵیۆزی ئەو کاتەی بریتانیا گرتنەدەستی دەسەڵات لەلایەن تورکە لاوەکان و جەمعیەتی ئیتحاد و

تـەرەقی وەک دەستبەسـەرداگرتنی یەهودییـەکان بـۆ ئیمپراتۆریـەت هەڵدەسـەنگێنێت ) و ئیمپراتۆریەتیان خستە ژێر کاریگەری خۆیانەوە. هـەروەک پاشـای فەرەنسـا و قەیسـەری رووس لـە میانـەی مەشـروتیەتی دووەم (١٩٠٨) و کودەتـای ٩ی ئـاداری ١٩٠٩دا سـوڵتان عەبدولحەمیدیشیان بێکاریگەرکرد، لەئاکامی دامەزراندنی کۆمار کاریگەرییان لە ئـەنادۆڵ و میزۆپۆتامیا بەلوتکە گەیشت.

لێکچوونێکی دیکەی زۆر سەیر و سەرنجڕاکێش لـەئارا دایـە، ئـەو گۆڕنکارییـەی لـە شۆڕشەکانی فەرەنسا و رووسیا بەشێوازی تەسفیەکردنی نەتـەوە پـەروەرە دیموکراتـەکان واتە تەسفیەکردنی کەمینـەکان، سۆڤێتەکان و رادیکاڵـەکان و ئـاواکردنی دیکتاتۆرییـەتی دەوڵەت ـ نەتەوە هاتنەئاراوە لە کۆماری تورکیاش دووبارە بوویـەوە. شۆڕشـی فەرەنسا لەبنەڕەتدا شۆڕشـی نیشـتمانی ـ دیموکراسیخوازی گـەل بـوو. رێبـەری وەک رۆبسـپێر و بابۆف ئەو راستییە دەسـەلمێنن. هـەر وەک پاشـا لویسـی شـازدەهەم پەرانـدنی کەللـەی ئەوانیش بە گیوتین سەرەکیترین هـەنگاوی ئـەو رێچکەیـە بـوو کـە بـەرەو دیکتاتۆریـەتی دەوڵەت ـ نەتەوە دەرۆیشت. وەک چۆن دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەر مۆدێلی ئەنگلۆساکسۆن ئاراسـتەی خـۆی گـرت، هـەڵگری کاریگـەری راستەوخۆشـیان بـوو. مێژوونووسـان لـەو بۆچوونەدا هاوفیکرن کە ئەنجامگیربوونی شۆڕشی فەرەنسا بە دەوڵەت ـ نەتـەوە یـەکێک لە گەورە هەنگاوەکانی گەیشتنی سەرمایەداری ئەنگلۆساکسۆنی ئینگلیزییە بەئاستی هێزی هەژموونگەرا. ئەگەر بەتەواویش نەبێت دەشێت هەمان بۆچـوون سـەبارەت بـە دەوڵـەت ـ نەتـەوەی رووسـیش بگوترێـت کـە دوای رووخـانی ئیمپراتۆرییـەتی رووسـیای قەیسـەری ئـاواکرا. لەسـەرەتای شۆڕشدا تـەنیا قەیسـەر لـەناو نـەبراوە، لـە کەسـایەتی و دۆخـی بەرجەسـتـەی سـۆڤێتەکان نەتەوەپـەروەری دیموکراتیانـەی رووسـیش لـەناوبراون. نەتەوەپەروەرێکی دیموکراسیخوازی رووسی چاک، واتـە کرۆپـۆتکینی سۆڤێتخواز خـودی لینینی ئاگادار کردۆتەوە و پێشنیازی بـۆ کـردووە کـە سۆڤێتەکان بـەرەو دیکتاتۆرییـەتی دەوڵەت ـ نەتەوە نەخزێت. ئەو بوویەرانەی دواتر لە دەوڵەت ـ نەتەوەی رووسیا روویاندا ئاگاداری و پێشنیازەکانی کرۆپۆتکینی مافدار دەرخست.

جەمعیەتی ئیتحـاد و تـەرەقی کـە هـەنگاو بـە هـەنگاو سـەرەتا کۆنترۆڵی خـۆی لـە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا پێشخست و دواتر دەستی بەسەر دەسەڵاتدا گرت، لەناوەرۆکدا گوزارشـت لەپێشـەنگایەتی ئایـدیۆلۆژی و پراکتیکـی هێزەکـانی سـەرمایە و ملیتانـە یەهودییـەکان دەکـات. دامەزرێنـەر و بەرێوەبـەرانی سـەر بـە میللەتـەکانی دیکـە رۆڵێکـی دیاریکەریان لە جەمعیەتدا نەبوو . بەشداربووە کورد و تورکـەکانیش بـەو شێوە بوون. ئەندامە کورد و تورکەکان زیاتر رۆڵی پەردەپۆشکردنی کاریگـەری یەهودییـەکانیان بینـی. لـەکاتی دامەزراندنیـدا هێنـدەی لایـەنی رزگـاری نیشـتیمانی کۆمـار لایـەنی رزگـاری دیموکراتیانەشـی هـەبوو. سـەرەتا شـۆڕش لەمیانـەی رێککـەوتنی هێـزە نیشـتیمانی ـ دیموکراسـیخوازەکان سـەرکەوتوو بـوو. رێککـەوتنێک لـەنێوان کۆمۆنیسـت، ئوممەتگـەرا ئیسلامیەکان، چەرکـەس، کـورد و تورکـەکان جێگـای بـاس بـوو. وەک لـە شۆڕشـەکانی

فەڕەنسا و رووسیا روویدا، لەشۆڕشی ئەنادۆڵیشدا لەمیانەی ڕێبازە پیلانگێڕییەکانەوە بونیادی خاوەن کارەکتەری دیموکراسیانە بۆ دەوڵەت - نەتەوەی دیکتاتۆری گۆڕا. ئەوەی لێرەشدا ڕۆڵی سەرەکی بینی هەژموونگەرایی ئینگلیز بوو. بەڵام لە دەوڵەت ـ نەتەوەی کۆماردا تەنیا ئەندامە نەتەوەییە دیموکراسیخوازەکان لەناو نەبران. هەروەها بە لەناوبردنی چوار لەو پێنج ژەنەڕاڵەی ـ جگە لە مستەفا کەمال ـ رۆڵی پێشەنگایەتییان دەبینی نەوەستان. کۆماری تورکیا کە یەکێک بوو لەبەردی بناغەی سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ـــ کە لەژێر هەژموونگەرایی ئینگلیزەکاندا دەمێننەوە ـ کە ئینگلتەرا خوازیار بوو سەرلەنوێ ئاوای بکاتەوە، بەشێوەیەکی زۆر جیاوازتر لەچوارچێوەکەی سەردەمی شەڕی رزگاری، ئاواکرا. وەک بڵێی؛ سەرلەنوێ وێناکراو بونیادنرایەوە. وەک دەوڵەتێکی ئیسرائیلی بەرایی (دەوڵەتێکی بەر لە ئیسرائیل) ئەو ڕێگایە نەخشەڕێژ کرا کە بەرەو دامەزراندنی ئیسرائیل دەچێت. لەو بارەیەوە مەسەلەی موسڵ - کەرکوک ( پارچەکردنی کوردستان ) وەک نوێڵێک بەکارهێنرا. دووڕیانی ـ یان کۆمار یان موسڵ ـ کەرکوک ـ کە خرایە پێش مستەفا کەمال ئەو مانایەی دەبەخشی. لێرەشدا بە بەردێک دوو چۆلەکەیان دەپێکا. هەم موسڵ - کەرکوکیان لە دەست دەردەهێنرێت (دژ بە میساقی میللی)، هەمیش لە ڕێگای دامەزراندنی ئیسرائیلەوە بناغەی قەوارەیەکی کوردی دووەمین پرۆتۆ ئیسرائیل دادەنرێت. هەرچی بەشی باکووری کوردستانی گەورەیە بەدرێژایی مێژووی کۆمار لەناو گۆلی خوێندا مایەوە و بەدۆخێک گەیشت توانای جولەی نەبێت.

هەڵبەتە کۆمارێک لەگەڵ ئایینگەراکانی ئوممەتی خۆیدا، لەگەڵ هاوپەیمانە سەرەکیەکانی خۆی واتە لەگەڵ کوردان و کۆمۆنیستەکان لەناو شەڕی بەردەوام دابێت، نکوڵی لەبوونیان بکات، بەردەوام لەڕێگای تەڵەزگەکانەوە لەناویان ببات و لەسێدارەیان بدات چانسی پەرەسەندن و گەورەبوونی نابێت. ئەو توێژە بەرتەسکەی چینی نوێ کە کەمینەیەکی زۆر بچووکن و لە بۆرژوازی بیروکراسی تورک و ئەندامە یەهودییەکان پێکهاتووە بە تورکی سپی ناودەبرێت. ئەوانە بەشێوەیەکی زۆر وشک میللیگەرایی عەلمانییان وەک ئایینێک پەسەندکرد و سەرجەم فاکتەرە دیموکراسیخوازەکانی کۆماریان کردبوو بە ئەویتر. مێژووی کۆمار بریتییە لە پارێزگاریکردن لەو ناوەڕۆکە. هەندێک لە کاربەدەستانی دەوڵەتی وەک مەندەرەس، ئۆزال، ئەربەکان و ئەجەوید کاتێک خواستوویانە تۆزێک لەو ناوەڕۆکە دەرباز بکەن، لەناوەوە پەرە بە دیموکراتیزەبوون بدەن، لەدەرەوەش دۆخی بچکۆلەیی لە خۆرهەڵاتی ناوین دەرباز بکەن و گەورەی بکەن یەکسەر لەناوبراون. بەسووربوونەوە پارێزگاری لە "یاسای سوور"ی ناوەڕۆکی دیکتاتۆریەتە بچکۆلەکە کراوە. لەو پێناوەشدا لەناوبردنی کوردان، موسڵمان و کۆمۆنیستەکان و بگرە چەرکەسەکانیش لەمیانەی گێرەشێوێنی و پیلانگێڕییەکان هەر لەرۆژەڤدا هێڵرایەوە. هیچ کاتێک کۆمەڵکوژی، دەستگیرکردن و لەسێدارەدان کۆتاییان نەهات. بوون بە ئەندامی ناتۆ. لەساڵی ١٩٥٢بەدواوە سوپا نهێنییەکەی ناتۆی بەناو

گلادیۆ بەکرداری تورکیای بەرێوە برد کە ناوەندەکەی ئەلمانیایە. بەردەوام گلادیۆ لەپشت ئەو قۆناغانەوە بوو کە بە وەسایەتی سوپا و کودەتاکان ناودەبرێت. گرژییەکانی راسترەو - چەپرەو، سوننی ـ عەلەوی و کورد ـ تورک بەردەوام بەبێچارەیی هێلرایەوە و کرا بەبیانوویکی دیکتاتۆریەتی سەربازی و مەدەنی بەرێوەبەرایەتی گلادیۆ. دوای ۱۹۲۵ گێرەشێوێنییەکان رۆلێکی هاوشێوەیان بەرامبەر کوردان بینی. دوای شەری سارد ویستیان رۆلی نوێ بە کۆماری تورکیا بدەن. هەرچۆنێک بێت دامەزراندنی ئیسرائیل تەواو ببوو، هەژموونگەراییەکەی خۆرهەلاتی ناوین پەرەسەندنی بەخۆیەوە بینیبوو. کاتێک هەرەشەی رووسیای سۆڤیێتی لەئاردا نەما (۱۹۹۰)، بەرەبەیانی دیرۆکی هەژموونگەرایی تەواوەتی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەسەر خۆرهەلاتی ناوین بوو.

لەپێناو تێگەیشتنی ئەو رۆژە مێژووییە دیسان پێویستە نیشانە سەرەکییەکەمان پێگەی ئیسرائیل بێت. ئیسرائیل ئاواکرابوو، بەلام گرفتەکانی ئاسایشی چارەسەر نەکرابوون. هەرساتێک لەوانەبوو لەلایەن میللیگەرایی عەرەبییەوە قووتدرابووایە. هەربۆیەش پێویستی بە هاوپەیمانی هەمیشەیی هەبوو، واتە پێویستی بە ستراتیژی و تەکتیک هەبوو. ئەو رۆلەی دیکتاتۆرییەتی دەولەت ـ نەتەوەی تورکی سپی کۆماری تورکیا لەسالانی ۱۹۲۰کان بینی ئەوجارە دەولەت - نەتەوەی کوردی سپی لە کوردستان هەمان ئەو رۆلەی دەبینی. قۆناغی ۱۹۹۰کان دووەمین قۆناغی ۱۹۲۰کانە. دەشێت هەمان شت سەبارەت بە دووەمین شەری کەنداوی سەرەتای ۲۰۰۰کانیش بلێین. هەلوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیێت لەسەرەتای ۱۹۹۰کان، کێشەی دەستنیشانکردنی دوژمنێکی نوێی بۆ هەژموونگەرایی دونیای سەرمایەداری (ئەمریکا هێزی سەرکێشە) هێنائاراوە. لەئاکامدا ئاسایشی ئیسرائیل بەبنەما وەرگیرا و رادیکالیزمی ئیسلامی وەک هەرەشە یاخود دوژمنی نوێ راگەیەنرا.

ئەو واقیعە نوێیەی هاتە ئاراوە سەرلەنوێ بیرکردنەوە لەبارەی پێگەی ئیسرائیل لە ناوچەکە دەکات بە ناچارییەک. بونیادنانی ئیسرائیل وەک بونیادنانی هیچ یەکێک لە دەولەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە نییە، وەهاش نابێت. ئیسرائیل تەنیا دەولەت ـ نەتەوەیەکی یەهودییش نییە. ناشێت تەنیا بەمجۆرە دەرکی پێبکرێت. کاتێک سەرلەنوێ چاوێک بەو قۆناغ و پرۆسەیدا بخشێنینەوە کە بەرەو دامەزراندنی ئیسرائیل رۆیشت ئەوا دەبینین کە چەندین بوویەری لەجۆری کۆبوونەوەی کۆنگرەی زایۆنی(۱۸۹٦)، گەمارۆدانی سولتان عەبدولحەمید (۱۸۷٦ ـ ۱۹۰۹)، کودەتای دووەمین مەشروتییەت، لەدەسەلاتخستنی عەبدولحەمید لە ۳۱ی ئاداری ۱۹۰۹، لە ۱۹۱۳/۱/۱ دەستبەسەرداگرتنی دەسەلات لەلایەن جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی لەئاکامی کودەتایەکەوە، بەشداریکردن لە یەکەمین جەنگی جیهانی ۱۹۱٤دا، دابەشکردنی خۆرهەلاتی ناوین لەسەر بنەمای رێککەوتنی سایکس - بیکۆی نێوان ئینگلتەرا و فەرەنسا، پەیمانی بلفۆر (پلانی دامەزراندنی نیشتمانێکی یەهودی ئیسرائیل ـ لە فەلەستین)، جێگیرکردنی ماندای ئینگلیز لە فەلەستین و راگەیاندنی ئەنجوومەنی گەورەی میللەتی تورکیا (سالی ۱۹۲۰)، لەگەل پەسەندکردنی پەیمانی لۆزان

(١٩٢٣) دوای شەڕی ڕزگاری نیشتیمانی لەناوبردنی کۆماری نەتەوەی دیموکرات و ئاواکردنی دیکتاتۆرییەتیCHP، دەستپێکردنی قۆناغی کۆمەڵکوژی کوردان (١٩٢٥ ـ ١٩٣٨)لەمیانەی پرۆڤەکردنی شێخ سەعید لە ١٥ی شوباتی ١٩٢٥، ڕێککەوتنی نێوان ئینگلتەرا ـ کۆماری تورکیا (١٩٣٩)، بە فەرمی ڕاگەیاندنی دامەزراندنی ئیسرائیل(١٩٤٨)، بە ئەندامبوونی تورکیا لە ناتۆ(١٩٥٢)، کودەتای ٢٧ی ئایار(١٩٦٠)، کودەتای ١٢ی ئادار(١٩٧١)، کودەتای ١٢ی ئەیلول(١٩٨٠)، کودەتای چیلەر ـ دیمرال(١٩٩٣)، کودەتای چەڤیک بیر(١٩٩٨)، هەرەدواییش کودەتای دژی ئەجەوید و هێنانە سەرکاری حکومەتی ئاکەپە (٢٠٠٢) و ڕووداوی لەجۆری یەکەمین (١٩٩٠) و دووەمین شەڕی کەنداو (دیمەنی ٢٠٠١ی داگیرکردنی ئەفغانستان لە ڕاستیدا پرۆڤە و ئامادەکارییەک بوو بۆ دووەمین شەڕی کەنداو و داگیرکردنی ئێراق) وەک زنجیرەیەک گرێدراوی یەکترن و لەتەوەری ئیسرائیل دان. هەروەها پێویستە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە (پێویستە بەشێکی تایبەت بۆ ئەوانە جیابکرێتەوە) ش لەچوارچێوەی ئەو ڕووداوانە بیری لێبکرێتەوە و بخرێتە سەر ئەو زنجیرەیە. بەبێ ئەوەی بۆ پەیوەندییەکانی ناواخنی ئەو ڕووداوانەدا شۆڕببینەوە کە بەردەکانی بناغە پێکدێنن بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین؛ کە پرۆسەی بونیادنانی ئیسرائیل نیشانە و پێوەری سەرەکی پەرەسەندنی هەژموونگەرایی ئەنگلۆساکسۆنە لەناوچەکەدا. دوای ڕووخاندنی نەخشەبۆدانراوی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی ئیسرائیل وەک هێزێکی ناوکی هەژموونگەرایی نوێ لەناوچەکە وێناکراوە و لەو چوارچێوەیشدا بونیادنراوە. هەژموونگەرایی ئینگلتەرا ـ ئەمریکا لەدونیا چی بێت، هێزە هەژموونگەرا نوێیەکەی ناوچەکە واتە ئیسرائیلیش بۆ خۆرهەڵاتی ناوین هەمان شتە. ئیسرائیل تەنیا دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووکی یەهودی نییە، هێزێکی گەورەی هەژموونگەراییە.

لەگەڵ ئەوەی پێکهاتە بنچینەییەکەی کۆمار نەگۆڕاوە کە حکومەتی ئاکەپە هەوڵدەدات مۆرکی خۆی لێبدات، بەگوێرەی دەستنیشانکردنی دوژمنە سەرەکییە نوێیەکەی سیستەمی هەژموونگەرایی دووچاری گۆڕانکارییەکی ڕێژەیەکی دێت. کۆماری میللیگەرا و عەلمانی لەساڵانی ١٩٢٠کان قەوارەیەکی سەرەتایی ڕێگای ئاواکردنی ئیسرائیل بوو، لەساڵانی ٢٠٠٠کانیشەوە هەوڵدەدرێت بۆ کۆماری تورکیای ئیسلامی میانڕەو بگۆڕدرێت کە ئامانجی بەلاوەنانی هەڕەشەی ڕادیکالیزمی ئیسلامی و میللیگەرایی عەرەبی و ئێرانی سەر ئیسرائیلە. لە یەکەمین قۆناغی کۆماردا کە CHP مۆرکی خۆی لێداوە، لەمیانەی دەوڵەتی نەتەوەپەرستی عەلمانیدا هەوڵی لەناوبردنی ئوممەتگەرایی ئیسلام دراوە کە لە بنەڕەتدا لەناو کۆمەڵگادا زاڵ بوو. سوڵتانە عوسمانییەکان هێزێکی هەژموونگەرایی ئیسلامی شەشسەد ساڵە بوون و نازناوی خەلیفایەتیشیان بەدەستەوە بوو، میراتێکی بەهێزی ئوممەتگەرایی ئیسلامی بۆ کۆمار جێهێشتبوو. لەدونیای ئیسلامدا ئەگەر پارێزگاری لە یەکێتی و یەکپارچەیی ئەو ئوممەتگەراییە ئیسلامیە بکرێت، ئەوا جێگیرکردنی هەژموونگەرایی ئینگلیز و بونیادنانی ناوکە بەرایییەکەی واتە ئیسرائیل زۆر زەحمەتە دەبوو. ئەو ڕۆڵەی دراوەتە کۆماری ژێرکۆنترۆڵی دیکتاتۆریەتی CHPی عەلمانی

نەتەوەپەرست، کردنەوەی رێگای پارچەکردنی ئەو یەکێتییەی ئوممەتگەراکان بوو. لەزۆر گۆشەی دونیادا ئینگلتەرا چەکی دەوڵەت ـ نەتەوەی لەپێناو ئەو ئامانجە بەکارهێنابوو. بۆ خۆرهەڵاتی ناوینیش تا دوارادە دەبوو بەچەکێکی پێویست و کاریگەر، دابڕاندنی کۆمار لە بنچینەی نەتەوەی دیموکرات، بەخێرایی و بەشێوەیەکی زۆر خێرا گۆڕینی بۆ دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکی سپی، تەنیا لەمیانەی ئەو رۆڵە ستراتیژیەیەوە روونەکرێتەوە.

گۆڕانکاریەکانی داوتر کە رۆڵی بەردی بناغە دەبینن بە ئاراستەی ئەو ستراتیژییەتەدا دەبێت. دووەمین رۆڵی بە دەوڵەت ـ نەتەوە (کۆمار)ی ١٩٢٠کان دراوە بەربەستکردنی پەرەسەندنی پەلهاویشتنی رووسیای سۆڤیتی لە خۆرهەڵاتی ناوین و کۆمۆنیزم لەناو کۆماری تورکیا. سیاسەتی ناوەوە و دەرەوەی تورکیا بەشێوەیەکی بنەڕەتی بەگوێری ئەو دوو ئامانجە سەرەکییە شێوەی گرت. ئینگلتەراش هێزی کۆنترۆڵکەری بوو. شۆڕشی ئیسلامی ئێران لە ١٩٧٩ لەهەمان رێکەوتدا دەستپێکردنی داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤیتەوە، لەرەگەوە هاوسەنگی ئاواکراوی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکەی هەژاند. هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لە یەکەم قۆناغی کۆماردا کە لەژێر سایەی ئینگلیز و ئەمریکا ئاواکرا گرێدراو بە ئیسرائیل تەواو ببوو. ئەڵقەی ناتەواو دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد بوو، ئەویش لەقۆناغی دامەزراندندا بوو. بەگرنگیەوە پێویستە ئاماژە بەو خاڵە بکرێت: لەقۆناغی ١٩٧٩ی شۆڕشی ئیسلامی ئێران تا داگیرکردنی ئەفغانستان لەلایەن یەکێتی سۆڤیتەوە لەژێر هەژموونگەرایی ئیسرائیل (بەشێوەیەکی هاوبەش لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ئەمریکا ـ ئینگلتەرا ) هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە لەخۆرهەڵاتی ناوین ئاواکرابوو. وەک بانگەشە دەکرێت دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی خۆرهەڵاتی ناوین پێویستییەکی نەتەوەی سەربەخۆ نەبوو، بەڵکو رێکخستنی بەگوێرەی لێکدانەوەکانی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەناوچەکە، بەشێوەیەکی بەرچاو بوونی ئیسرائیل وەک ناوکی هێزی هەژموونگەرایی روون دەکاتەوە. سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوە لە خۆرهەڵاتی ناویندا مەرجی لەپێشینەی ئاواکردنی ئیسرائیلە، لەو سۆنگەیەوە؛ سیستەمێکە بۆ هەمیشەیی و بەردەوامکردنی بوونی ئیسرائیل پێویستە، ئەو لۆژیکەی سیستەم بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا بچووککردنەوەکەی دەرهەق بە کۆماری تورکیاش رۆشن دەکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەی ئەو هەڕەشەیەی لەساڵی ١٩٧٩وە لەدوو کەناڵەوە بۆ سەر سیستەم لەئارادا بوو (رووسیای سۆڤیتی و ئێرانی ئیسلامی ) هۆکاری سەرەکی و دەرەکی گۆڕانکارییەکەی کۆماری تورکیا بوو، ئۆپۆزسیۆنی نەتەوەی دیموکراتیش کە لەناوەوە بەئاستێکی بەرز گەیشتبوو و ببوو بەهەڕەشە. بەهۆی ئەو دوو هەڕەشەیەوە ئەنجامدانی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ لەچوارچێوەی گلادیۆ کە لەدۆخێکی بەهێز دابوو وەک پێویستییەکی بەرژەوەندییە ژیانیەکانی سیستەم بوو. بەهۆی هەڕەشە نوێیەکانەوە ئایدیۆلۆژیای نەتەوەپەرستی عەلمانی قۆناغی کۆماری یەکەم کورتیدەهێنا. سەبارەت بە بەربەستکردنی هەردوو هەڕەشە سەنتێزی تورک ـ ئیسلام پێویست بوو. پێشخستنی

ئایدیۆلۆژیای فەرمی کۆماری دووەم بەسیفەتی تورک ـ ئیسلام لەو چوارچێوەیەدا بەمانای خۆی دەگات. لەمیانەی سەنتێزی تورک ـ ئیسلامی میانڕەوەوە وەڵامی رادیکالیزمی ئیسلامی ئێران دەدرایەوە، هەروەها لەرێگای تیرۆری فاشیستانەشەوە بزووتنەوەکانی نەتەوەی دیموکرات لەناو دەبران. لەژێر کۆنترۆڵی گلادیۆدا بەشێوەیەکی بنەڕەتی لەمیانەی کودەتایەکی بەمجۆرەی کۆمار ـ کۆماری دووەم ـ وەڵامی ئەو دوو هەڕەشە ناوخۆیی و دەرەکییەی دەدایەوە. کردارەکانیش لەسەر بنەمای ئەو بۆچوونە ئایدیۆلۆژییە نوێیە بوو. AKP وەک پارتە هەژموونگەرا جێگیر و بەربڵاوەکەی قۆناغی کۆماری دووەم وێناکرا کە لە ١٩٨٠کان دەستپێکرد. وەک پارتێکی گرێدراو بە سیاسەتە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی کۆماری دووەم پێکەوەنرا کە خوازیارە هەژموونگەرایی خۆی تەواو بکات. بەجۆرێک لەجۆرەکان وەک CHPی کۆماری دووەم وێناکرا. کردار و کارەکانی هەشت ساڵی رابردووش ئەو گوزارشتە دەسەلمێنێت. ئەو ناکۆکییە دروستکراوانەی ئەمڕۆ لەنێوان ئاکەپە و ئیسرائیل لە ئارادایە پێویستە کەس دەستخەڕۆ نەکات. ناشێت بڵێین؛ هیچ ناکۆکییەکیش لەنێوانیاندا نییە، بەڵام ئەو ناکۆکیانە جۆرە ناکۆکیەکن دەکرێ لەناو هەمان سیستەمی هەژموونگەراییدا چارەسەر بکرێن.

لەسەردەمی کۆماری یەکەمیشدا بەو سیفەتەی ئیسرائیلی ـ بەرایی بوو ناکۆکیگەلێکی جددی و خوێناوی هاتبووە ئاراوە. بۆرژوازی بیروکراسی تورکی لاو بەردەوام ئەو رێککەوتنەی بەلای خۆیدا دادەتاشی کە لەگەڵ سەرمایەی یەهودی ئەنجامی دابوو. بەردەوام خوازیاربوون پشکی یەهودی و ماسۆنییەکان کەم بکەنەوە. چەندین کردەوەی لەسێدارەدانی جاویدبەگ (یەکێک لەسەرکردەکانی جەمعیەتی ئیتحاد و تەرقی )ی وەزیری دارایی لایەنگری ئینگلیز تا ئەو دەستبەسەراگرتنانەی لەساڵی ١٩٤٢دا لەژێر ناوی باجەوە ئەنجامدران، گشتیان بە ئامانجی شکاندنی سەرمایەی یەهودی بوو. وێڕای تەواوی ئەو ڕووداوانەش، یەهودییەتی تورک لە پێگەی ئەو هێزە دیاریکەرەدا مایەوە کە بەردەوام مۆرکی خۆی لەپێکهاتە ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئابوورییەکەی سیستەم دەدات. لەبواری سوپا و پەیوەندی دەرەوەشدا دیاریکەر بوو.

لەرێگای AKP وە باڵێکی نوێی بۆرژوازی تورک، واتە سەرمایە تایبەتەکەی ئەنادۆڵی ناوەندەکەی قۆنیا و قەیسەرییە داوای پشکی زیاتر لە سەرمایەی یەهودی و هێزەکەی دەوڵەت (هی کۆماری یەکەم) دەکات. ئاکەپە کە لەئەنجامی خزمەتکردنی هەژموونگەرایی لەخۆرهەڵاتی ناوین لەلایەن سێیانەی ئەمریکا ـ ئینگلتەرا ـ ئیسرائیل پێکەوەنراوە، لەبەرامبەر خزمەتکردنی هەژموونگەرایی داوای زیادکردنی پشک دەکات. رێگاکەشی بەسووککردنی وەسایەتی سوپا، ئەنجامنەدانی کودەتای نوێ لە دژی و زیادکردنی بەشەکەیەتی لە کێکەکەی خۆرهەڵاتی ناویندا. ئیسرائیلیش ئەو بۆرژوازییە تازە پێگەیشتووەی ئەنادۆڵ بەزێدەڕۆ دەبینێت. چاوەڕوانی کەمکردنەوەی داواکاریەکانی دەکات. هەروەها مەقام و پایەکانی "هێزی هەرێمی" و "هێزی جیهانگیری" بەزێدەڕۆ و نابەجێ دادەنێت، خوازیاری خوێندنەوەیەکی راستە بۆ ناسنامەی هێزی هەژموونگەرایی

هەرێم و جیهان. ئەو رۆڵەی بە ئاکەپە دراوە نەرمکردنەوەی میللیگەرایی شیعەی ئێران، ئیسلامگەرایی رادیکاڵ و میللیگەرایی عەرەب و گونجاندنیانە لەگەڵ سیستەمدا. ئاشکرایە کە هەر لەو پێناوەشدا لە سوپا و پەیوەندییەکانی دەرەوە رۆڵێکیان پێدراوە. ئاکەپەش ئەو رۆڵە دەبینێت. دیمەنی ململانێ دەرهەق بەو بەشە زۆرانبازێیەکی رێکخراوە، بەڵام ناکۆکیەکانیان دەرهەق بەزیادکردنی بەش راستەقینەیە و لەناو سیستەمدا چارەسەر دەکرێت. تەبایی و گونجانی تەواوەتی ئاکەپە لەگەڵ سیستەمی هەژموونگەرایی لەماوەی ناوین و درێژخایەندا دەستلێبەرنەدراوە. ئەگەر کەللەڕەقی بکات و رێککەوتن لەگەڵ ئێران و ئیسلامی رادیکاڵ و ئیسلامگەرایی میانڕەویش ئەنجامبدات و سیستەمی هەژموونگەرایی تەواو بکات، ئەوا دووچاری هەمان دۆخیCHP و ئەوانەی پێشووتری خۆی دێت.

زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین؛ کە تورکیا ئەڵقەی لاوازی سیستەمە. دابڕانی لە سیستەم ئەگەرێکی لاواز نییە. دەشێت دابڕان لە دوو تەوەردا رووبدات؛ تەوەرەی یەکەم، ئەگەر فریودان تەبێت ئەو رێگایەیە کە لەگەڵ ئێران، سوریا، تەنانەت رووسیا و وڵاتانی بەرازیل، چین و هیندستان هەوڵی پێشخستنی دەدات و بە خزاندنی تەوەریش ناو دەبرێت، بوون بە هێزێکی هەرێمیە و تا ئاستی هێزی جیهانگیری دەڕوات و بەمجۆرەش رووبەڕووبوونەوەی هەژموونگەرایی ئیسرائیل، ئەمریکا، ئینگلتەرا و یەکێتی ئەوروپایە. ئەگەر مەحاڵیش نەبێت بەڵام بەهۆی بوونی خودی کۆماری تورکیا و هاوسەنگییە کۆنکرێتیەکانی ئەو رێگایە زۆر زەحمەتە بیگرێتەبەر. هەنگاونان بۆ دووەمین تەوەرەی دابڕانیش، لەرێگای رۆژانەییکردنەوەی رێککەوتنەکانی شەڕی رزگاری نیشتمانی لەسەر بنەمای نەتەوەی دیموکراتییەوە بەدیدێت. ئەو رێگایەی بە دابڕان لە مودێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامگیردەبێت. ئەو کێشە سەرەکیانەی لەئاستی تورکیا و هەرێم لەئارادان تەنیا لەمیانەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیەوە چانسی چارەسەری ریشەییان دەبێت.

### ب) دیزاینکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب و ئیسرائیل

یەکێکی تر لەسەرچاوە سەرەکییەکانی ئەو تەنگژەیەی کە خۆرهەڵاتی ناوین بەدەستیەوە دەناڵێنێ بەیەکەوە قۆناغی بونیادنانی ئیسرائیل و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەبە. کاتێک لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم ئینگلتەرا ئۆپەراسیۆنەکانی خۆی دەرهەق بە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی دەستپێکرد شێخەکانی عەرەبی وەک قۆچی قوربانی بەکارهێنا. زانا ئایینیە ئۆرتۆدۆکسە بە بنەڕەت گریکیەکانی لە بەلقان بەکارهێنا و پشتگیری لە بونیادنانی دەوڵەت ـ نەتەوەی یۆنانی کرد، بەمجۆرەش هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆرییەتی لە بەلقان خێراتر کرد. لە نیمچە دورگەی عەرەبی باشووردا ئیمپراتۆرییەتیش کە لەسەر رێگای هیندستان پێگەیەکی ستراتیژی هەبوو خەباتێکی هاوشێوە دەستپێکرد، واتە لەرێگای زانا ئایینیە موسڵمانەکانەوە پشتگیری لە دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەب کرا. لەهەمان قۆناغ لەرێگای سەرۆک تەریقەتەکانی خەڵکی سلێمانی

(لەسەرووی هەموویانەوە نەقشبەندی و قادری) لە کوردستانیش هەوڵی هاوشێوەی دا. شاهەنشایی ئێرانیش کۆنترۆڵی خۆی لە باشوور پەرەپێدا. ئەو قۆناغەی بە یاخیبوونەکان دەستیپێکرد، دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بە ڕژێمەکانی ماندا بەردەوام بوو، لەئاکامی دووەمین جەنگی جیهانی بەدەوڵەت ـ نەتەوە تەواو ئەنجامگیر بوو. لەو نێوانەدا ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەناوچوو. بۆشاییەکی گەورە لەناوچەکە دروست بوو یاخود دروستکرا. بەپێچەوانەی ئەوەی ئینگلتەرا لە هیندستان ئەنجامیدا بەخۆی ڕاستەوخۆ وەک هێزێکی داگیرکەر لەناوچەکەدا جێگیر نەبوو. بەڵام هێزێکی ڕکابەریشی نەهێشتەوە. لەهەمان چوارچێوە و ڕێکەوتدا (١٩٢٠) دەیویست کۆماری تورکیاش لەگەڵ ڕژێمەکانی ماندای عەرەبی پێکەوە بنێت (بابەتی سەرەکی کۆنگرەی سیواس سەبارەت بە ماندابوونی ئەمریکی یاخود ئینگلیزی بوو). هەڵوێستە ڕادیکاڵەکەی مستەفا کەمال ئەنجامەکەی بەرەو کۆمار گۆڕی. بەڵام هیچ شتێک لەناوەڕۆکدا نەگۆڕا. دوای ماوەیەکی کورت ڕژێمە عەرەبییە مانداکانیش بۆ دەوڵەت ــ نەتەوەی هاوشێوە گۆڕابوون. بەکارهێنانی ناوەکانی پاشایەتی یاخود کۆمار ناوەڕۆکی دەوڵەت ــ نەتەوە بچووکەکانیانی نەدەگۆڕی.

خێرابوونی لەدایکبوونی ئیسرائیلیش تەواو ڕێکەوتی ئەو قۆناغە بوو. جگە لەو باسانەی لە بەشەکانی پێشووتر سەبارەت بە قەبیلەی یەهودی ئاماژەمان پێکردن پێویستە دووبارەی بکەینەوە کە ڕیشەی ئیسرائیل بۆ ئەو قەبیلە و ئایدیۆلۆژیاکانیان (ئایدیۆلۆژیای یەهودی ـ ئایینە تاکخوداییەکان و میلیگەرایی) دەگەڕێننەوە. لەناوەڕۆکدا ئیسرائیل ئەنجامێکی سروشتی شەڕەکانی دەوڵەت ــ نەتەوەیە کە لەساڵانی ١٥٥٠کان لەهێڵی ئەمستردام ـ لەندەن وەک دەوڵەتێکی مۆدێرن دەرکەوت. نزیکەی چوارسەد ساڵی خایاند و ئەوروپای کرد بە دەریای خوێن. سەرمایە و ڕۆشنبیری یەهودی بەردەوام ڕۆڵی پێشەنگایەتییان لە بونیادنانی دەوڵەت ــ نەتەوەدا بینیوە. بەڵام لەو بڕوایە دابوون لەمیانەی پارچەکردنی ئیمپراتۆریەتە کاسۆلیک، ئۆرتۆدۆکس و ئیسلامیەکانەوە یەهودییەکان بەئازادی خۆیان دەگەن و لەمیانەی بەسەرچوونی کات و لەسەر بنەمای بانگەشەکانی میلیگەرایی زایۆنی یەهودی دەوڵەتێکی یەهودی ــ ئیسرائیلی دادەمەزرێت. ئەو خەباتە بەبڕوا، هۆشیار و ڕێکخراوانە بەر لە یەکەمین جەنگی جیهانی، کاتی جەنگ و دواتریش ئەنجامگیر بوو. لەو هەلومەرجەی دەوڵەت ــ نەتەوە بچووکەکەی کۆماری تورکیای پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و چەندین دەوڵەت ــ نەتەوەی بچووکی عەرەبی ڕێگایان لەپێش کردەوە. دەوڵەت ــ نەتەوەی یەهودی ئیسرائیل بە فەرمی ڕاگەیەنرا (١٩٤٨) کە ئایدیۆلۆژیا پیرۆزەکەی زایۆنیزم کردبووی بەئامانجی خۆی. وەک بڵێی؛ کۆماری تورکیا خوازیار بوو ناوەڕۆکی ئیسرائیل ــ بەرایی خۆی بسەلمێنێت، یەکەمین دەوڵەت ـ نەتەوە بوو دانی بە دەوڵەتی ئیسرائیل دانا.

ئاواکردن و ڕاگەیاندنی ئیسرائیل ڕووداوێکی ئاسایی نییە. ئیسرائیل وەک هێزێکی هەژموونگەرایی و ناوکی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەدایکبووە و ئەو

بۆشاییەی دەسەلاتی پڕکردەوە کە لە ئاکامی گۆڕینی شاھەنشایی ئێران و ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ دەولەت ـ نەتەوە بچووک و وابەستەکان ھاتەئاراوە. وێناکردنی ئیسرائیل وەک ھێزێکی ھەژموونگەرای ناوک خالێکی زۆر گرنگە. ئەوەش ئەو مانایە دەبەخشێت ئەگەر دەولەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە دان بە بوون و قەوارەی ئیسرائیل دابنێن بە رەوا دادەنرێن، دانی پێدانەنێن ئەوا تا دەیانھێنێتە سەرڕێ لەرێگای شەڕ و پێکدادانەکانەوە ھێزی لەبەر دەبڕن و ھیلاکی دەکەن. لەبەر ئەوەی کۆماری تورکیا، ئوردن و ھەندێک دەولەتانی کەنداو یەکەمین ولات بوون دانیان بە ئیسرائیل دانا، ھەریەکەیان وەک دەولەت ـ نەتەوەیەکی رەوا پەسەندکران و خزانە ناو سیستەمەوە. ئەوانەی کە ماونەتەوەش شەڕیان لەگەل ئیسرائیل و ھاوپەیمانەکانی بەردەوامە. ئەو شەڕانەی لەچوارچێوەی کێشەی فەلەستین لەگەل عەرەبەکان، لەچوارچێوەی کێشەی کەنداویش لەگەل ولاتە ئیسلامیەکانی دیکە ئەنجامدران، لەنزیکەوە گرێدراوی قەوارە ھەژموونگەراکەی ئیسرائیلە لەناوچەکەدا. تا دان بە ھەژموونگەرایی ئیسرائیل دانەنێن ئەو پێکدادان، پیلانگێڕی، تیرۆر و شەڕانە بەردەوام دەبێت.

ئەگەر بەشێوەیەکی راست دەرک بە دیزاینکردن و پێکەوەنانی ھەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە خۆرھەلاتی ناوین نەکرێت، ئەوا تێگەیشتنێکی راست سەبارەت بە ھۆکاری ئاواکردنی بیست و دوو دەولەت ـ نەتەوەی عەرەبی جێگای باس نابێت. ئەوکاتە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەشێوەیەکی راست شیکار ناکرێت کە لەمیانەی شرۆڤەی راسترەو ـ چەپڕەو، ئایینی ـ مەزھەبی، ئەتنیکی ـ قەومی سەربەخۆگەرایی وردە بۆرژوازی دەولەت ـ نەتەوە سەبارەت بە مێژوو لە خۆرھەلاتی ناوین وێناکراوە. لەو چوارچێوەیەدا تێگەیشتنی خودی راستییەکەی کێشەی عەرەب (وەک تێگەیشتنێکی راست بۆ کێشەکانی کۆماری تورکیا و جڤات و کۆمارە تورکییەکانی دیکە ) بەر لە ھەموو شتێک پێویستی بە تێگەیشتنێکی راستی دیزاینکردنی و دامەزراندنی ھەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە خۆرھەلاتی ناوین ھەیە. لەمیانەی زھنیەتەکانی "دامەزراندنی شکۆمەندانەی دەولەت – نەتەوەی سەربەخۆ" کۆمەلگا و مێژوو کە گالتە بەڕاستییەکان دەکات ھیچ کێشەیەکی دەولەت و کۆمەلگا دەرکی پێناکرێت. یەکەمین کێشە قوولەکەی عەرەبەکان بەدەستیەوە دەنالێنن وەک چۆن تەنیا کێشەیەکی پەیوەست بە ئیسرائیل نییە، ناشێت بۆ کێشەیەکی فەلەستین – ئیسرائسل یش بچووک بکرێتەوە، بەر لە ھەمووشتێک سەرچاوەکەی بۆ دابەشکردنی عەرەبەکان بۆ بیست و دوو دەولەت ـ نەتەوەی بچووک دەگەڕێتەوە. ئەو بیست و دوو دەولەتە جگە لە رێکخستنێکی ھاوبەشی سیخوڕێتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری رۆلێکی دیکە نابینن. بوونیان سەرەکیترین کێشەیە سەبارەت بە گەلانی عەرەب. لەو چوارچێوەیەدا کێشەی عەرەب کێشەیەکی پەیوەست بەپێکەوەنان و دامەزراندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە لەناوچەکەدا. تەنیا لەو چوارچێوەیەدا دەشێت کێشەیان دەرھەق بەھێزی ھەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە ناوچەکە (ئیسرائیل) ھەبێت.

لێرەدا پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین ئەو هێزانەی ئیسرائیلیان ئاواکردووە هەمان ئەو هێزانەن کە بیست و دوو دەوڵەتی عەرەبیشیان ئاواکردووە. لەو سۆنگەیەوە؛ پەیوەندی و ناکۆکیەکانیان لەگەڵ ئیسرائیل خەسڵەتی پەردەپۆشکردن دەبینێت، لەبەر ئەوەی لەناوەڕۆکدا ئەوانیش هاوبەشێتی لەهەمان سیستەمی هەژموونگەرایی دەکەن، تەنانەت ئەو ناکۆکیانە بەهێزیش بن، تەنیا ئەو کاتەی بوێری دەرکەوتن لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پیشان بدەن مانایەکی دەبێت. هەم لەناو هەمان هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا دەمێنیتەوە، هەمیش دان بە ئیسرائیل دانانێیت! بەڵێ دیبلۆماسی ساختە و دەمامکدار سەرچاوەی خۆی لە نکوڵیکردنی ئەو راستییە وەردەگرێت. سەرجەم ئەو هەڵوێستە میللیگەرا ئیسلامیانەی خوازیارن لەجێگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری جێگیری بکەن جا ئەوە ئیسلامی رادیکاڵ، ئیسلامی میانڕەو یاخود ئیسلامی شیعە بێت، بریتییە لەساختەکارییەکی گەورە و زەبەلاح. چونکە ئەو ئیسلامگەراییە جۆرێکە لەو میللیگەراییەی لەسەرەتای سەدەی نۆزدەهەم لەژێر هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا سەریهەڵدا، ئامرازێکی ئایدیۆلۆژی سەرمایەدارییە تایبەت بە وڵاتانی خۆرهەلاتی ناوین و پەیوندی بە شارستانێتی ئیسلامەوە نییە. ئیسلامگەرا سیاسیەکانی ئەو دوو سەد ساڵەی دوایی جگە لە سیخوڕە دەمامکدارەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری هیچ رۆڵێکی دیکە نابینن. چونکە لەچوارچێوەی دیدگای مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەمجۆرە وێناکراون و خراونەتە جووڵەوە. بێگومان لەو دووسەد ساڵەی دواییدا جگە لە قووڵکردنەوەی کێشەی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکانی خۆرهەڵاتی ناوین رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە، ئەوەش ئەو واقیعەیان دەسەلمێنێت. سەرەکیترین کۆسپی ئایدیۆلۆژی و سیاسی بەردەم کۆمیناڵیزم و نەتەوەی دیموکراتن. ئیسلامی کلتووری بابەتێکی جیاوازترە، لەچوارچێوەی ئەو نەریتە ئیسلامییە پاراستن و بەرگری لێکردنی لایەنێکی ئەرێنی و ماناداری هەیە.

ئەگەر پێکدادانەکانی عەرەب ـ ئیسرائیل و فەلەستین ـ ئیسرائیل چوارچێوەی مۆدێرنێتەی سەرمایەداری دەرباز نەکات ئەوا لەشەڕێکی هاوشێوەی مشک ـ پشیلە یاخود حوشتر ـ فیل رزگاری نابێت. ئەوەی لەدەرەنجامدا هاتۆتەئاراوە: نزیکەی سەد ساڵە تەواوی وزەی ژیانی گەلی عەرەب لەو شەڕ و پێکدادانە بەفیرۆدەدرێت کە پێشتر ئەنجامەکەی دیارە. ئەگەر ئەو شەڕانە نەئافرێنرابووانایە، ئەوا تەنیا بە داهاتی نەوت دەیانتوانی عەرەبستانێک بئافرێنن دە بارتەقای ژاپۆن بێت. گرنگترین ئەنجامی لەو چەسپاندنانە دەردەکەوێت، وەک بانگەشە دەکرێت سیستەماتیکی دەوڵەت ـ نەتەوەی لە خۆرهەڵاتی ناوین سەرچاوەی چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان نییە، بەڵکو بەپێچەوانەوە سەرچاوەی پێشخستن، قورسکردن و قووڵکردنەوەی کێشەکان و گەیاندنێتی بەدۆخێک بەرگەی نەگیرێت. دەوڵەت ـ نەتەوە کێشە چارەسەر ناکات، کێشە بەرهەم دێنێت. لەوەش زیاتر، هەمان سیستەم تەنیا دەوڵەتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین هیلاک ناکات، بەڵکو ئامرازێکە کۆمەڵگاکانیش بەگژ یەکترەوە دەنێت و هێز و توانایان لەبەر ناهێڵێت. واقیعی ئێراق بەشێوەیەکی زەق و

بەرچاو ئەو چەسپاندنە دەسەلمێنێت. لێرە تەواوی بەرپرسیارێتیەکە ناخرێتە سەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری. بەڵکو ئایدیۆلۆژیا و رێکخستنە سیاسییە ئیسلامی و چەپەکان (سۆسیالیستی بونیادنراو)ی بەناوی رزگاریخوازی و چارەسەرکردنی کێشەکان دەرکەوتن، بەلانی کەم ئەوانیش هێندەی فاکتەرەکانی هەڵگری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری (تورکی لاو، کوردی لاو، عەرەبی لاو، فارسی لاو) بەرپرسیارن. سەرباری سەرنەکەوتنی ئەو رێباز و بەرنامانەی نزیکەی سەد ساڵە بۆ گەلەکانیان پێشنیازدەکەن، جگە لە خزمەتکردنی بونیادنانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە ناوچەکە و بەکارهێنانیان رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. لەچوارچێوەی رێکخستنە سیاسی و ئایدیۆلۆژیاکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەبی ناشێت نکوڵی لەرۆڵی ئەو راستینە بکەین.

کێشەی عەرەبەکانیش هاوشێوەی کێشەی تورکیا و تورکەکان کێشەگەلێک نین چارەسەر نەکرێن. لێرە لەمیانەی دوو تەوەرەی سەرەکی هەوڵی شیکارکردن و چارەسەرکردنی کێشەکان دەدرێت: تەوەرەی یەکەمیان؛ لەمیانەی زیادکردنی پشکی دەوڵەت و کۆمەڵگای خۆیان لەناو هەمان سیستەمدا، لەو پێناوەدا شەڕی ئاراستەکراو دەئافرێنن و هەوڵدەدەن ئەنجام بەدەستبێنن. ئەوە ئەو ئەنجامەیە کە رێکخراوی رزگاریخوازی فەلەستینیشی لەناودا دەوڵەت ـ نەتەوە عەرەبییەکان لەمیانەی رێبازەکانی شەڕ و پێکدادانەوە لەو پەنجا ساڵەی دواییدا هەوڵیانداوە پێی بگەن. لە رێگای رێککەوتنی هاوشێوەی کامپ دێڤید کە لەگەل میسر ئەنجامدراوە زوو یان درەنگ دەخوازن ئەو تەوەرە تەواو بکەن. بەڵام جگە لە قورسترکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی عەرەبەکان و ناچارکردنیان بۆ چارەسەری رادیکاڵ ئەو رێگایە هیچ مانایەکی دیکەی نییە. لەوانەیە ئەو رێگایە دەوڵەت ـ نەتەوە ئۆلیگارشییە عەرەبییەکانی پشتبەستوو بە نەوت رازی و تێر بکات، بەڵام هەرگیز توانای جێبەجێکردنی داواکارییە ئابووری و دیموکراسییە قووڵەکانی گەلانی نییە. گەلانی عەرەب کێشەگەلێکی ئابووری و دیموکراسی زەبەلاحیان هەیە کە بەدرێژایی مێژوو کەڵەکە بووە. دەوڵەت ـ نەتەوە عەرەبییەکانی داردەستی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین، نەک ئەو کێشانە چارەسەر ناکەن، بەڵکو نایانەوێت باسی چارەسەریشی بکەن. لەمیانەی قورسکردن و شاردنەوەی لەرێگای شەڕە ئایینی و مەزهەبگەراییە دروستکراوەکانەوە کێشەکان بەخاڵێک دەگات، وەک لە نموونەی ئێراقدا دەبینرێت یان تادوایی بەرەو هەڵوەشانەوە، پەرتەوازەبوون و شەڕی دەبات یان چارەسەری ریشەیی ئابووری، کۆمەڵایەتی، کلتووری و نەتەوەیی ـ دیموکراسیخوازی دەوێت.

دووەمین تەوەرەی سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەی عەرەبەکان تەنیا لەسەر بنەمای دەربازکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری جێگای باس دەبێت. لێرەدا دابڕان لە سیستەم جێگای باسە. پێویستە زۆرباش بزانین کە رادیکالیزمی ئیسلامی یاخود ئیسلامی سیاسی ناتوانن مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیف پێک بێنن. دەشێت ئیسلام بەسیفەتی کلتوور رۆڵ لەژیانی ئەو مۆدێرنیتەیەدا ببینێت کە ئەلتەرناتیفی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. پارادایمی مۆدێرنیتەیەکی گونجاو لەگەڵ راستینەی مێژوویی و کۆمەڵایەتی سەرجەم

گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بۆ گەلانی عەرەبیش بژاریکی ڕاست و هەرە بەهێزە. مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیڤ بۆ گەلان مۆدێرنیتەی دیموکراتیکە کە لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لــە تێکۆشــانی بەردەوامــدا بــووە، لەیــەکێتی بزووتنــەوەکانی نەتــەوەی دیمــوکراتی، سۆسیالیستی، ژینگەپارێز، فیمینیست و کلتوورییەکان پێکدێت.

دووەمــین دەســتەی گرنگــی کێشــەکانی چوارچێــوەی کێشــەی عەرەبــەکان پەیوەســت بەبوونی قەوارەی ئیسرائیلە. تێڕوانینی دەوڵەت ـ نەتــەوە، ئیسلامگەرایی و میللیگــەرایی عەرەب سەبارەت بــە ئیســرائیل لــەلایــەن خــودی هەژموونگــەرایی ئایــدیۆلۆژی یــەهودی ـ ئیسرائیل ئاراستەکراوە. لەچوارچێوەی ئەو سنوورەدا ماوەتــەوە کــە لەلایــەن دەوڵــەت و ئایدیۆلۆژیای یــەهودی ـ ئیســرائیلەوە کێشــراوە. تــا لــەچوارچێوەی هــەمان مۆدێرنیتــەدا بمێنێتەوە، ئەوا لــە بووکەڵەیەکی دەست هەژموونگەرایی ئیسرائیل بــەولاوە ڕۆڵێکی دیکــە نابینێت. خودی ئیسرائیلیش لە دیلێتی دەست مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕزگاری نابێت کە زادەی خۆیەتی. تا ئیسرائیل هەست بە هەبوونی هێزگەلێکی دەوروبەری بکات کە ئامادەن لەناو دەریا نووقمی بکەن، ئەوا چەکی ناوەکیشی لەناودا، هــەرگیز لەمیانــەی بــاڵابوونی چەکی تەکنۆلۆژییەوە دوودڵی لە پاراستنی خۆی ناکات. یان لەژێر هەژموونگەرایی خۆیدا هاوسەنگییەکی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهــەڵاتی نــاوین ئاوادەکــات کــە لەگەڵیــدا ئاشت بوونەتەوە، لــەبەر هۆکــارە ئامــاژە پێکراوەکــان دەرکــەوتووە کــە ئــەوە چەنــدە زەحمەتــە؛ ئەگەر بیەوێت لەدیلێتی ئەو سیستەمە ڕزگاری بێت کــەخۆی ئافراندوویــەتی ئــەوا ناچــارە دەربازکردنی مۆدێرنیتــەی ســەرمایەداری ڕەچــاو بکــات. لەدارســتانی خۆرهــەڵاتی ناوینــدا مۆدێرنیتەی دیموکراتی نــەک تــەنیا بــۆ کێشــەی یــەهودی بــەڵکو ئــەو بژارەیــە کــە ڕێگــای چارەسەری هەمیشــەیی کێشــەی دەوڵــەتی ئیسرائیلیشــە کــە چــواردەورەی بــەو جانــەوەرە ئایینگەرا و میللیگەرایانە گەمارۆدراوە کە خۆی خولقاندوونی.

### ج) دەوڵەت ـ نەتەوەی شیعی ئێران و ڕۆڵی لە خۆرهەڵاتی ناویندا

نەریتی دەوڵەتی ئێرانیش بە پێچەوانەی کۆماری تورکیا زۆر بەئاســانی کەوتنــە ژێــر باڵی بچووکبوونەوە پەسەند ناکات، بگرە شاهەنشایی ئێرانی سەردەمی مۆدێرن لە کۆمار زیــاتر بەرامبــەر بچــووک کردنــەوە بــەرخودانی کــرد. شۆڕشــی ئیســلامی ئێــران ۱۹۷۹ هەڵوێستێکی گرنگی بەرامبەر سیستەمی هاوسەنگی و بچووککردنەوەی دەوڵــەت ـ نەتــەوە پێشخست کــە سنوورەکانی تایبــەت بــە خۆرهــەڵاتی نــاوین کێشراوە. هــەر لەســەرەتاوە بەرامبەر بە هەژموونگەرایی ئیسرائیل هەژموونگــەرایی خــۆی ســەپاند. کۆمــاری تورکیــا و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عــەرەبی ئــەو وڵاتانــە بــوون کــە ڕەوابــوونی سیســتەمی دەوڵــەت ـ نەتەوەی ئافرێنەری ئیسرائیلیان پەسەندکردووە، بەڵام کۆماری ئیسلامی ئێران سەرباری ناجێگیرییەکەی، وەک خۆی ستاتۆی دیاریکراوی پەسەند نەکردووە، هــەوڵی پێشخستنی هەژموونگەرایی دژی داوە، ئەو گرژییەی لەڕۆژی ئەمڕۆمانــدا لــەنێوان ئێران ـ ئیسرائیل

دەبینرێت تەنیا لەنێوان دوو دەوڵەت ـ نەتەوەدا نییە، بەڵکو لەنێوان دوو سیستەمی هێزدایە کە لەپای هەژموونگەراییدان.

لەبەر ئەوەی دووەمین هێزە کە لەپای هەژموونگەراییدا بێت پێویستە لەنزیکترەوە هەڵوەستە سەبارەت بە ئێران بکرێت. وەک لە بەرگەکانی دیکەی بەرگرینامەشدا ئاماژەم پێکرد؛ ریشەی نەریتی دەوڵەتی ئێران بۆ کۆنفیدراسیۆنی میدیا (ماد) درێژدەبێتەوە. خاوەن کلتوورێکی هاوشێوەی کوردە ـ مادەکانە. زەردشتایەتی و میترایزم دوو سەرچاوەی گرنگن کە لەمێژوودا بوونی ئەو کلتوورەیان راگەیاندووە. ئیمپراتۆرییەتی پارس کە یەکەمین دەوڵەتی ئێرانییە بەتەواوی لەسەر شوێنپەنجەی کۆنفیدراسیۆنی میدیا ئاواکراوە. هاوکاتی قۆناغێکی ئیمپراتۆریەتە کە بەجۆرێک لەجۆرەکان مادەکان رۆڵی سەرەکی تێدا دەبینن. لەگوزەرکردن لە کۆیلایەتی چاخی یەکەمەوە بۆ کۆیلایەتی چاخی کۆن (١٠٠٠ ـ ٥٠٠ پ.ز) خاوەن رۆڵی سەرەکییە. کۆیلایەتی کۆنی گریک و رۆما لەبوونی خۆیدا قەرزباری پەلهاوێشتنی ماد ـ پارسە. سەردەمی هێلینی کە بە فەتحەکانی ئەسکەندەر دەستپێکرد گوزارشت لە سەنتێزێکی ئافرێنەرانەی نێوان کلتووری خۆرهەڵات ـخۆرئاوا دەکات. ئەو تەنگژە قووڵەی شەڕی هەژموونگەرایی جیهانی نێوان رۆما و پارتەکان و رۆما (بێزنت) و ساسانییەکان (١٠٠پ.ز-٦٣٠ زایینی) کە سەدان ساڵ بەردەوام بوو، بە هەڵکشانی ئیسلام وەک هێزێکی هەژموونگەرایی ئەنجامگیر بوو. لەسەردەمی فەتحە ئیسلامییەکانەوە تا دامەزراندنی خانەدانی سەفەوی (٦٥٠ ـ ١٥٠٠زایینی ) بەدرێژایی هەزار ساڵ نەریتی دەوڵەتی ئێران لەلایەن خانەدانە عەرەب، تورک و مەغۆلەکان نوێنەرایەتی کراوە کە لە کلتووری خۆیان نامۆبوون. لەرێگای خانەدانی سەفەوی شیعەگەرێتیەوە بوو بە ئایدیۆلۆژیای دەوڵەت. لەو سەردەمەدا بناغەکانی ئێرانی مۆدێرن دانراوە. ئەو شەڕە هەژموونگەراییەی لە کوردستان لەگەڵ ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ئەنجامیدا، بە پەیمانی قەسری شیرینی ١٦٣٩ ئەنجامگیر بووە. لە هەنگاونان بۆ چاخی مۆدێرن بۆ یەکەمجار کوردستان لەرێگای ئەو پەیمانەوە کراوە بە دووبەش. لەئاکامی ئەو پارچەبوونەوە ئەگەری پێکهاتنی دەوڵەتێکی مۆدێرن لە کوردستان زەبرێکی گەورەی بەرکەوت. لەسەر بنەمای ئۆتۆنۆمی ناوخۆیی سیاسەتی ژیانی هاوبەش لەناو میرنشینە کوردییەکان پێشکەوتووە.

هەروەک لە نموونەکانی کۆماری تورکیا و شاهێتی ئەفغانستان بینرا، دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لە دەرەنجامی حیساب و لێکدانەوەکانی هەژموونگەرایی ئینگلتەرا وەک دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی مۆدێرن سەرلەنوێ بونیادنراوەتەوە. وەک چۆن لەگەڵ مستەفا کەمال رێککەوتن، بەرامبەر بە ئێرانێکی بچووک دەسەڵات دراوەتە رەزا شا. لەو قۆناغەدا ئینگلتەرا وەک دەوڵەت ـ نەتەوەی تامپۆن بیری لە کۆماری تورکیا، شاهێتی ئێران و ئەفغانستان کردۆتەوە کە بچووکی کردبوونەوە تا وەک بەربەستێک لە رێگای دابەزینی یەکێتی سۆڤێت بەرەو باشوور بەکاریان بێنێت. پەیرەونەکردنی سیستەمی داگیرکاری کلاسیک لەو ناوچانە بەهۆی لاوازییەوە نییە، بەهۆی ترسەکەیەتی لەپەلهاوێشتنی رووسیای سۆڤێتی. سیاسەتی دەوڵەتی تامپۆن سیستەمێکی ئینگلیزەکانە کە لەسەرەتای

سەدەی نۆزدەهەمەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەشێوەیەکی گشتی سەرکەوتووانە پەیرەو دەکرێت. خانەدانی ڕەزاشا نەریتی کلتووری ئێرانی بەلاوە ناو بەرنامەیەکی مۆدێرنیتەی لاساییکردنەوەی خۆرئاوای پەیڕەوکرد. سەرەتا هەوڵیدا وەک ڕژێمێکی پاشکۆی ئینگلتەرا، دواتر پاشکۆی ئەمریکا و بگرە ئیسرائیل لەسەر پێیان بمێنێتەوە. خەسڵەتی دەوڵەتی پاشکۆی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین زەقترین نموونەی لەرێگای بنەماڵەی پەهلەویەوە پیشاندراوە. ئەو دەوڵەتانەی لەرێگای هێزی سەرباز و پۆلیسەوە لەسەر پێ ماونەتەوە، کاتێک هێزە هەژموونگەراکە پشتگیری خۆی وەستاندووە لە ڕۆژێکدا رووخاون. کۆتایی خانەدانی پەهلەویش بەمجۆرە بوو.

شۆڕشی ئیسلامی ئێرانی ١٩٧٩ بەو رادەیەی سیاسی بوو شۆڕشێکی کلتووریشە. ئەو شۆڕشە تەنیا هێزی خۆی لەرێکخستنی زانا ئایینییە شیعییەکان وەرنەگرت؛ بەپێچەوانەوە لەبنەڕەتدا هێزی سەرەکی خۆی لە کلتووری کۆمەڵایەتی گەلانی ئێران وەردەگرت کە ریشەکەی لەقووڵایی مێژوو دایە. هەروەک لە شۆڕشەکانی فەرەنسا، رووسیا و ئەنادۆڵ روویدا سەرەتا شۆڕش خاوەن خەسڵەتی نەتەوەیی دیموکراتیک بوو. پشتی بەرێککەوتنێکی بەرفراوانی هێزە نیشتیمانی ــ دیموکرسیخوازەکان دەبەست، لەسەرووی هەمووشیانەوە کۆمۆنیستەکان، ئوممەتگەرا شیعەکان و کوردەکان خاوەنە سەرەکیەکەی سەرکەوتن بوون. بەڵام زانا شیعەکان و دەستەی بازرگانی ناوین کە نەریتی مێژوویی و کۆمەڵایەتی بەرێوەبردنی بەهێزتر بوو لەماوەیەکی کورتدا هەژموونگەرایی خۆیان ئاواکرد. بێبەزەییانە هاوپەیمانەکانی دیکەی سەرکوت کرد. لە کۆماری تورکیای ١٩٢٠کانیشدا قۆناغێکی هەژموونگەرایی هاوشێوە روویدابوو. هەرچەندە بناغەی نەتەوەی دیموکراتی شۆڕش لەلایەن زانا شیعەکانەوە بشێوێنرێت، لەناوەڕۆکدا پێچەوانەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو. ئۆلیگارشی شیعە ویستی ئەو توانستە ئانتی ــ سەرمایەدارییەی مانا مێژوویی و کلتوورییەکەی مەزن بوو وەک قۆزێکی رەواکردنی بوونی خۆی لەبەرامبەر هێزەکانی هەژموونگەرایی سیستەمی سەرمایەداری بەکار بێنێت. تائێستاش خوازیارە لەسەر ئەو بنەمایە بەکاری بێنێت. هەموو هەوڵێکی ئۆلیگارشی ئێران لەو پێناوەدا بوو بناغەی دژە ـ مۆدێرنیستی شۆڕش دژی هێزە هەژموونگەراکانی خۆرئاوا بەکاربێنێت، تا لە هاوسەنگی دەوڵەت ـنەتەوەی خۆرهەڵاتی ناوین لە پێگەیەکی ئەرێکراو و رێزداردا جێگیربێت. لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەیەکی جیاوازدا لە ناوەڕۆکدا ناکۆکی لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نییە. هەروەک دەوڵەت ـ نەتەوە عەرەبەکان و کۆماری تورکیا کە لەقۆناغی یەکەم و دووەمیندا لەمیانەی حیسابە تەکتیکیەکانیان بەرامبەر بە سوود لێوەرگرتنیان زۆرترین پشک لەناو سیستەم بەدەست بێنن، پەسەند بکرێن و یارمەتی بدرێن، ئەویش ناکۆکیەکانی خۆی لەگەڵ سیستەم بەئامانجی هاوشێوە بەکاردێنێت و خوازیارە هەمان ئەنجام بەدەست بێنێت. مامەڵەیەکی نموونەیی بازاڕ (بازرگانی ناوینە) جێگای باسە کە لەنەریتی ئێران خاوەن پێگەیەکی بەهێزە. لە ئێرانیش ناکۆکی تەواو لەو خاڵەدا دەست پێدەکات. نەریتی کلتووری بەهێز ئۆلیگارشییەکی شیعە

پەسەند ناکات کە لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سازشی کردووە. لەو سۆنگەیەوە؛ ناکۆکییەکەی ئێران هەموو کاتێک ئەو چانسەی هەیە کە بۆ تێکۆشانی نێوان دوو مۆدێرنیتەی ئەلتەرناتیڤ وەرچەرخێت. پێچەوانەی دۆخی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عەرەب و تورکیا بەئاسانی لەناو ناچێت.

هەرچەندە زیاتر لەئاستی زارەکی بەڕێوەبچێت، بەڵام لەڕۆژی ئەمڕۆماندا ئۆلیگارشی ئێران لەسەر خۆرهەڵاتی ناوین لەگەڵ ئیسرائیل کەوتۆتە ناو شەڕێکی هەژموونگەراییەوە. هەر بەو ئامانجەش بەنیازە کار و خەباتی ئەتۆمی وەک دووەمین قۆز بەکاربێنێت. لەمێژووشدا نەریتی شیعەگەرایی لەپای هەژموونگەراییەوە بووە. ئێرانی هەژموونگەرایی هەزاران ساڵەی وەک چەکێک خستۆتە پشت خۆیەوە، بەڵام لە هەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لە گەورە پیشاندانی هێزی خۆی زێدەڕۆیی دەکات. لەسەردەمێکدا سیستەم بەبەرزترین ئاستی جیهانگیری گەیشتووە ئەگەر ئۆلیگارشی شیعەگەرایی ئێرانی هەنگاو بۆ بژارێکی ریشەیی مۆدێرنیتە نەنێت چانسی سەرکەوتنی زۆر لاوازە. خۆی بەوڵاتانی (BRIC: بەرازیل، رووسیا، هیندستان، چین) دەچووێنێ و لێکدانەوەکانی پێکهێنانی جەمسەرێک دەکات. ئەو رێککەوتنەی لەسەر بنەمای دژایەتیPKK لەگەڵ دووەمین کۆماری ئاکەپە هەوڵی پێشخستنی دەدات خوازیارە لەگەڵ سوریا بەرفراوانی بکات. تەواوی ئەو لێکدانەوانە هیچ بەهایەکی مەیدانی نییە. وەک دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە رێگایەکی چارەسەری دوو تەوەرەییش بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەیی ئێران هەیە. بەڵێنی چارەسەری تەورەی یەکەم وەک رژێمی شا سازشکردنێتی لەگەڵ سیستەمدا. لە راستیدا ئۆلیگارشی شیعە بۆ ئەوە ئامادەیە. بەڵام وەک خۆی سیستەم پەسەندی ناکات. دیدارەکانی لەپێناو سازش بەڕێوەدەچن لەرێگای دانوستانەوە بێت یان شەڕ پێویستە لەبەرژەوەندی هێزەکانی هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەنجامگیربێت. دووەمیان کاتێک چارەسەرکردنی کێشەکان دەکەوێتە رۆژەڤەوە، دابڕانێکی رادیکاڵانە لە سیستەمدا جێگای باس دەبێت. کاتێک ئۆلیگارشی شیعە و هێزە هەژموونگەراکانی خۆرئاوا بێچارە و لاواز دەبن، ئەوا کەوتنەگەڕی چارەسەری مۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەستلێبەرنەدراوە.

### د) هەڵوەشانەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە لە ئێراق، ئەفغانستان و پاکستان و بنبەستبوونی بونیادی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری

ئەو هێرشەی ئەگەری پیلانگێڕی بەهێزە و لە ١١ی ئەیلولی ٢٠٠١ کرایە سەر جووت تاوەرەکەی نیویۆرک، لەبنەڕەتدا هەنگاوی سیستەمی سەرمایەداری بوو بۆ دەستپێکردنی "سێیەمین جەنگی جیهان"ی. ئیسلامی رادیکاڵ کە دوای هەڵوەشاندنەوەی یەکێتی سۆڤێت لە ١٩٩٠کان لەلایەن ناتۆ و سیستەمی هەژموونگەرایی وەک دوژمنە سەرەکییە نوێیەکە راگەیەنرا، لە راستیدا وەک دەمامکێکی ئایدیۆلۆژی بەکاردەهێنرا. لەناوەڕۆکدا ئامانج

تەواوکردنی دامەزراندن و جێگیرکردنی هەژموونگەرایی سەرمایەدارییە لە وڵاتە کلتوور ئیسلامییەکانی خۆرهەڵاتی ناوین کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بە نیوەچڵ مابوویەوە. بەتایبەتی ئامانجیان پەلکێشکردن و ئاوێتەکردنی دەوڵەتە بەناو چەتەکانی لەجۆری ئێران، ئێراق، سوریا، لیبیا و...هتد لەگەڵ سیستەم و بەهێزکردنی هەژموونگەرایی ئەمریکا بوو لە جیهاندا. لەمیانەی "سێیەمین جەنگی جیهان" کە ئەمریکا پێشڕەوایەتی دەکات هەوڵی پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی هەژموونگەرایی دەدات کە لەئاکامی هەرەسهێنانی سیستەمی سۆڤێت هاتەئاراوە. هەروەها ڕێگری لەهەڵکشانی چینیش دەکرد کە ئەگەری هەبوو ببێت بە ڕەقیبە نوێیەکە. ئامانجی یەکەمین هەڵمەتی دژ بە ئەفغانستان بەدەستهێنانی دەستپێشخەری بوو تا ڕووسیا و چین ئەو بۆشاییەی هەژموونگەرایی پڕ نەکەنەوە کە لە ئاسیای ناوین هاتبوویە ئاراوە. ئەلقاعیدە و تاڵیبان ئامرازگەلێک بوون بۆ بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانە بەکارهێنران. ئەگەر بیانویستایە دەیانتوانی لە شەو و ڕۆژێکدا کۆتاییان پێبێنن. بەڵام لەپێناو ڕەواکردنی شەڕەکەیان دەبووایە بەردەوام لەڕۆژەڤدا بمێننەوە. بەئاراستەی ئامادەکارییەکانی یەکەمین هەڵمەتی شەڕەکە سەرکەوتوو بوو. شاڵاوەکەی سەر ئێراق لەمیانی باڵابوونی تەکنۆلۆژییەوە بە ئەنجامەکەی گەیشت. ئامانجی ڕووخاندنی ڕژێمی سەددام حوسێن بوو. ئەو ئامانجە بەدیهات. بەڵام زەحمەتی سەرەکی لەبواری سیاسیدا سەریهەڵدا. دوای ڕووخاندنی ڕژێمێکی یاخی وەک ئێراق (دەکرێ بڵێین والیبە یاخی بووەکەی سیستەم) وەک کرانەوەی قوتووی پاندۆرا سەرجەم ئەو خراپیانەی بەدرێژایی مێژووی شارستانی کەڵەکە ببوون یەک بەدوای یەکتر ڕژان.

ئێراق وڵاتێکی ئاسایی نەبوو. یەکەمین دەڤەری ئاوابوونی سیستەمی شارستانی ناوەندی بوو، بەهەزاران ساڵ بێشکەی بووە. دەڤەری کۆبوونەوەی تەواوی ئەتنیک، ئایین و مەزهەبەکان بوو. لەبواری سیاسیدا پێویستی بە سەرەڕۆترین ڕژێم یان ڕادیکاڵترین سیستەمی دیموکراسی هەبوو. چانسی پەیڕەوکردنی ڕژێمە سیاسییە لیبرالەکانی خۆرئاوای نەبوو. هەروەها ناوچەیەک نەبوو لەمیانەی سۆسیۆلۆژیای خۆرئاواشەوە شیکاربکرێت. ئەو ڕەوشەی هاتەئاراوە، لەو دۆخەی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دەچوو کە دژی ئینگلتەرا وەستایەوە. ئەو سەرکەوتنەی لەبواری سەربازی بەدەستهاتبوو لەبواری سیاسیدا هەمان ڕۆڵی نەدەبینی. بەپێچەوانەوە لەگەڵ ڕووخانی ڕژێمە ستەمکارە باوەکان کێشە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکان تەقینەوە و کێشەگەلێک نەبوون مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرگەیان بگرێت. لەسەردەمی سۆمەرییەکانەوە هەمان خولگەی ناپەسەند دووبارە دەبوویەوە. هەر هەنگاوێکی بە ئامانجی چارەسەری نراوە کێشەکانی گەورەتر کردووە. کلتوورەکانی دەڤەری ئێراق لە هەرکەسێک زیاتر پێشانیان دەدا کە کردەوە و ڕەفتارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە سەرچاوەی بێچارەیی و گەورەکردنی کێشەکانە. جگە لە دەوڵەت ـ نەتەوە ئامرازێکی دیکەش بەدەست مۆدێرنیتەی خۆرئاواوە

نەبوو. ئەوەی لەدوای دەولەت ـ نەتەوەوە دەهاتە ئاراوە دۆخێکی ئاژاوە و گێژاوی نموونەیی بوو.

دۆخەکەی ئەفغانستانیش هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ئێراق نەبوو. لەویش ئامرازێکی بەردەست نەبوو کە دوای دەولەت ـ نەتەوە جێگیر بکرێت. لە راستیدا ئەو دۆخەی دوای شکاندنی قاوغی دەولەت ـ نەتەوە لەتەواوی ناوچەکە هاتەئاراوە لەیەکتری دەچوو. جیلوەی دەولەت ـنەتەوە تەنیا لە رووالەتدا ڕێگای لەپێش تێگەیشتنێکی مۆدێرنیتە کردبوویەوە. کاتێک ئەو جیلوەیە داماڵرێت ئەو راستییەی دەکەوێتەڕوو ئەو کێشە کلتوورییانەیە کە هەزاران ساڵە کەڵەکە بوون. رژێمە سەرکوتکارە باوەکان کلتوورەکانیان لەمیانەی فشارەوە سەرکوت کردبوو. ئەستەم بوو ئەو کلتوورانە لەناو ببەن. جیلوەی مۆدێرنیتە زۆر رووکەشی بوو، لەجووڵەیەکی بچووکدا هەڵدەڕژا و تابلۆ راستەقینەکە ئاشکرا دەبوو. ئیتر لەکاتێکدا هەژموونگەرایی ئەمریکا چاوی بڕیبووە برنجی لادێ ساوەرەکەی ماڵەوەشی لەدەست دابوو. بنبەستبوونی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتە تەواو کارەکتەرێکی بەمجۆرەی هەبوو . سەبارەت بە دەولەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەلاتی ناوین لەسێدارەدانی سەددام حوسێن تەواو بەکۆتایی هاتنی رژێمە مۆنارشییەکان دەچوو کە لەشۆڕشی فەرەنسادا لەئاکامی لەسێدارەدانی لویسی شازدەهەم هاتەئاراوە. وەک چۆن لەدەرەنجامی لەسێدارەدانی لویسی شازدەهەم جارێکی دیکە رژێمە مۆنارشییەکان نەهاتنەوە هۆش خۆیان و کەوتنە قۆناغی توانەوە، ئەو قۆناغەی لەمیانەی لەسێدارەدانی سەددام حوسێنیش دەستی پێکرد رژێمە فاشیستەکانی دەولەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەلاتی ناوین جارێکی دیکە نایەنەوە هۆش خۆیان و دەکەونە قۆناغی توانەوە و لەناوچوونەوە. وێڕای ئەوەی سیستەمی هەژموونگەرایی تەواوی هێزی خۆی خستەگەڕ، وەک چۆن لە قۆناغی ١٨١٥ ـ ١٨٣٠دا هەولەکانی نوژەنکردنەوەی رژێمە مۆنارشییەکان سەرینەگرت، هەولەکانی نوژەنکردنەوەی دەولەت ـ نەتەوە لە ئێراق و ئەفغانستانیش سەرناگرێت: تەنیا ئێراق و ئەفغانستان دووچاری هەلوەشانەوەی دەولەت ـ نەتەوە نەهاتوون، لەدەولەت ـ نەتەوەکەی قرغستانی سنووری چینەوە تا وڵاتی مەغریبی کەنار زەریای ئەتڵەسی، لەدەولەت ـ نەتەوەکەی یەمەن و سودانەوە تا دەگاتە دەولەت ـ نەتەوەکانی بۆسنا ـ هەرسک و باشووری قەفقاسیا (ئەوانەی باکووریش ) لەسەرجەم دەولەت ـ نەتەوەکاندا قەیرانی هاوشێوە لە ئارادایە. هەر لەئێستاوە پاکستان هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ ئەفغانستان نەماوە. لوبنان، یەمەن و سودان بەردەوام دەکوڵێت و گڕی گرتووە. لە نەرمبوونێکی کەمی دیموکراسیدا رژێمی میسر رووبەڕووی هەلوەشانەوە بۆتەوە. جەزائیریش تائێستا بەتەواوی لەشەڕی ناوخۆ رزگاری نەبووە. تورکیا کە خۆی وەک دورگەی ئارامی راگەیاندووە تەنیا لەمیانەی کردەوە تایبەتەکانی گلادیۆوە لەسەر پێیان دەمێنێتەوە. تاکە وڵاتێکی خۆرهەلاتی ناوین نییە کە لەناو کێشەدا نەبێت. ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی تەواوی هێزە سەربازییەکانیشیان کوبکەنەوە ناتوانن قەیرانەکان چارەسەر بکەن. چونکە لە راستیدا کێشەکان لەو جۆرانە نین کە لەرێگای سەربازییەوە

چارەسەر بکرێن. ئەوانەی ناوی تیرۆریستی ئیسلامییان لێناون، سیخوڕەکانی زادەی خۆیانن. هێزێک لەبەرامبەریاندا نییە کە لە بواری سەربازیدا شەڕیان لەگەڵدا بکات. لەوانەیە ئێران هەبێت. بگرە ئەگەر لە ئێرانیش بدرێت هێزگەلێکی دیکە سەرهەڵدەدەن کە دوو ئەوەندە بەکێشەن.

سەرجەم نیشانەکانی دەرهەق بەتەنگژەی خۆرهەڵاتی ناوین پیشانیدەدەن کە ئەگەرێکی لاوازە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ناوچەکە لەمیانەی نوێبوونەوەوە دەرەتانێک بدۆزنەوە. لەراستیدا ئەوەی لە١٩٩٠کان بەدواوە هەژموونگەرایی ئەمریکا هەوڵی ئەنجامدانی دەدات نوژەنکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەیە کە بە نوژەنکردنەوەی مۆنارشییەکانی ١٨١٥ ـ ١٨٣٠دەچێت. بەڵام وەک چۆن نوژەنکردنەوەی رژێمە مۆنارشییەکان سەرینەگرت، نوێکردنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانیش بەتایبەتی لەخۆرهەڵاتی ناوین سەرناگرێت. چونکە لەراستیدا ئەو قەیرانەی وڵاتانی یەکێتی ئەوروپای شوێنی لەدایکبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە دووچاری هاتووە و تا دەچێت قووڵتر دەبێتەوە خۆی لەخۆیدا قەیرانێکی دەوڵەت ـ نەتەوەیە. ئەگەر یەکێتی ئەوروپا دەیەوێت قەیران دەرباز بکات ئەوا ناچارە وەرچەرخانی رادیکاڵانە لە دەوڵەت ـ نەتەوەدا ئەنجام بدات. تا دەوڵەت ـ نەتەوەکان پارێزگاری لە دۆخی باڵادەستی ئێستا بکەن ئەو قەیران قووڵتردەبێتەوە. هەڵبەتە شەست ساڵە یەکێتی ئەوروپا هەوڵدەدات سنوورێک بۆ باڵادەستی دەوڵەت ـ نەتەوە دابنێت و گەشەبکات. ئەگەر ئەو هەوڵانەش بەشی نەکردبێت ئەوا بەڕوونی جیهانیبوونی قەیرانی دەوڵەت ـ نەتەوە ئاشکرا دەبێت. چیتر کێشە دەرهەق بەوە نییە کە دەوڵەت ـ نەتەوە، لەو سۆنگەیەوە؛ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تووشی قەیرانی بونیادی بووە یان نا؛ سەبارەت بە چییەتی ئەو دۆخەیە کە دوای قەیران دێتەئاراوە. تەنگژە و گێژاو چۆن و لەرێگای چییەوە دەرباز دەکرێت؟ ئەگەر دۆخەکە بەرموشی دوای هەرەسهێنانی ئیمپراتۆرییەتی رۆما یاخود عوسمانی بچوێنین، ئەوا پێویستە گفتوگۆیەک لەو بارەوە بکەین و چارەسەرییەک بدۆزینەوە کە چ جۆرە رژێم، قەوارەی سیاسی و ژیانی کۆمەڵایەتی هاوبەش دێتەئاراوە.

لەپێناو تاوتوێکردنی قەیرانی دەوڵەت ـ نەتەوەی قۆناغی دواتر هەوڵماندا گفتوگۆکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پێشبخەین. چەندین رووداوی خۆرهەڵاتی ناوین لەمێژە ئاستی تراژیدیایان تێپەڕ کردووە و مانای کارەساتی مەزن دەبەخشن، لە بوویەرێکی سنووردار بەو گەلانە دەرکەوتوون (ئەرمەنی، سریانی، هێلینی، یەهودی، فەلەستینی، کورد، تورک، عەرەب، ئەفغانی) تەواوی ژیانی کۆمەڵایەتی ناوچەکەی تەنیوەتەوە. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و رژێمەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە خۆیان هۆکاری ئەو کارەسات و تراژیدیا گەورانەن، چیتر ناتوانن ئەو سیستەم و رژێمانە وەک رێگاچارەیەک پێشکەش بکەن. لەبەر ئەو هۆکارەیە کە چڕکردنەوەی گفتوگۆکانی مۆدێرنیتە و تاوتوێکردنی ئەرکەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک بۆ دەرکەوتن لە تەنگژە و چارەسەری گرنگییەکی مەزنی هەیە.

**ە) هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە و کێشەی کورد لە خۆرهەڵاتی ناویندا**

وەک چۆن وێناکردن و پێکەوەنانی دەوڵەت ـ نەتەوە لەژێر کێشە هەنووکەییە رۆژانەییەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا شاراوەیە، لەبنەڕەتدا کێشەی کوردیش سەرچاوەی خۆی لەو دیزاین و وێناکردنە وەردەگرێت. نەخشەی سیاسی خۆرهەڵاتی ناوین کە لەیەکەمین جەنگی جیهانیدا دارێژرا، بەو ئامانجە کێشراوە کێشەگەلێک رووبدەن لانی کەم سەدەیەک بەردەوام بن. رێککەوتنی ڤێرسایلس بۆ ئەوروپا چی بێت، رێککەوتننامەی سایکس بیکۆش بۆ خۆرهەڵاتی ناوین هەمان شتبوو. رێککەوتنی ڤێرسایلس کە لە ئەوروپا رۆڵی "ئەو ئاشتییەی کۆتایی بە ئاشتی هێنا" رێگای لەپێش دووەمین جەنگی جیهانی کردەوە. رێکەوتننامەی سایکس ـ بیکۆش هەمان رۆڵی بینی. لەجیاتی ئاشتی عوسمانی، خۆرهەڵاتی ناوینی بەرەو بنبەستبوون و تەنگژەیەکی قووڵ برد. سەرجەم ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەی لەدەرەنجامی شەڕ هاتنەئاراوە ئۆراگانیزاسیۆن یاخود رێکخستنێک بوون کە لەناوەوە لەگەڵ گەلانی خۆیان، لەدەرەوەش دژ بەیەکتری خزانە ناو شەڕەوە. لەناوبردنی کۆمەڵگای نەریتی، مانای شەڕکردن بوو لەدژی گەلان. هەرچی ئەو نەخشانەن کە بە راستەهێڵ کێشرابوون مانای بانگەوازی دەوڵەتە دروستکراوەکان بوو بۆ شەڕکردن لەگەل یەکتریدا.

تەنیا وێناکردنی ئیسرائیل لەدۆخی ئێستادا شەڕێکی سەدساڵی لەدوای خۆیدا جێهێشتووە. تا ئێستاش تێبینی ناکرێت کە رێگا لەپێش چەند گەورە شەڕی دیکە دەکاتەوە. لوبنانی بچووک بەردەوام لەدۆخی شەڕ دایە. سوریاش بەردەوام لەرەوشی نائاسایی و شەڕ لەگەڵ ئیسرائیل دایە. خۆی لەخۆیدا دەوڵەتی ئێراقیش بەدرێژایی تەمەنیەوە مانای شەڕی ناوخۆ و دەرەکی بوو. ئێرانیش دۆخێکی جیاوازتری نییە. لۆژیکی بونیادنانی سەرجەم دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین، چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی ناکاتە ئامانج، بەڵکو لەسەر بنەمای زۆرترکردنی کێشەکان و هێشتنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانە لەدۆخی شەڕی ناوخۆیی و دەرەکی بەردەوامدا. هۆکارە سەرەکیەکەشی بونیادنانی ئیسرائیلە بەسیفەتی ناوکی هێزە هەژموونگەراکان. ئەگەر وەک ناوکی هەژموونگەرایی دەرک بە ئیسرائیل نەکەین، ئەوا لەچۆنێتی وێناکردن و دامەزراندنی هاوسەنگی یاخود ناهاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوەی خۆرهەڵاتی ناوینیش تێناگەین. بەرچاوترین فاکتەری سەلمێنەری ئەو چەسپاندنە کێشەی کورد و دابەشکردنی کوردستانە.

رێککەوتننامەی سایکس ـ بیکۆ ( دابەشکردنی خۆرهەڵاتی ناوین لەنێوان ئینگلتەرا و فەرەنسا) بناغەی پەیماننامەی سیڤەریشە. پەیمانی سیڤەر پارچەکردنی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیای سەروو رێکدەخات. وەک بانگەشە دەکرێت شەڕی رزگاری نیشتیمانی پەیمانی سیڤەری لەبەین نەبرد، تارادەیەک رێگای لەپێش بێکاریگەربوونی کردەوە.

بەشێکی زۆری پەیماننامەکە جێبەجێکرا. کۆمارێکی بچووک وەک پێویستییەکی سیڤەر پەسەندکراوە. هەروەها بەجێهێشتنی موسڵ ـ کەرکوک بۆ ئینگلیزەکان ئەنجامی سیڤەرە. لەو سۆنگەیەوە؛ دووەمین دابەشکردنی کوردستان لەسەردەمی مۆدێرندا هۆکاری سەرەکی کێشەی کوردە. ئەو دوو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەی لە ئێراق و ئەنادۆڵ ئاواکراون مانای دوو کردەی شەڕە کە جەستەی کورد و کوردستانیان پارچەکردووە. ئەگەر بەو جۆرە لە دەوڵەت ــ نەتەوە تێنەگەین، ئەوا نە لەدابەشکردنی کوردستان تێدەگەین، نە لەدرێژخایاندنی کێشەی کورد و دۆخە بێچارەییەکەی تێدەگەین، دەرک بەهیچیان ناکەین. تەنانەت ئەو ڕژێمەی لەساڵی ١٩٢٠ەوە واتە لەسەردەمی دامەزراندنییەوە تاڕۆژی ئەمڕۆمان دەوڵەتی ئێراق لەسەر کوردانی پەیڕەوکردووە شەڕی نەوەد ساڵی بووە. ئەو ڕووداوانەی ڕۆژی ئەمڕۆمان ڕوونیدەکەنەوە کە ئەو دەوڵەتە بەرامبەر بە کۆمەڵگای خۆیشی ڕژێمێکی شەڕە. ئەگەر تەنیا لە ڕوانگەی کوردانەوە سەیر بکرێت، ئیتر هەرکەس دانی بەو ڕاستییە داناوە کە دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکی سپی ڕژێمێکی شەڕی تایبەتی هەشتا و پێنج ساڵەی پەیڕەوکردووە کە بە ئاستی کۆمەڵکوژی گەیشتووە. کێشمەکێشمەکانی ناو خودی ڕژێمیش هەر لەسەرەتاوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەردەوام بووە. ئەو کێشانەی کوردان دووچاری هاتوون لەخۆیانەوە سەریانهەڵنەداوە، کێشەگەلێکن بەشێوەیەکی نەخشە بۆکێشراو پێشخراون، کێشەگەلێکن وەک بەشێکی گرنگی بەڕێوەبردنی خۆرهەڵاتی ناوین نەخشەی بۆکێشراوە و هەمیشەیی کراوە.

پێویستە ئەو هۆکارانە زۆر بەباشی شیکاربکرێت کە بۆچی هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری سەرەتا بەدەستی ئێران و ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، دوای یەکەمین جەنگی جیهانیش کوردانی بەدەستی تورکیا، ئێران، ئێراق و سوریا سەرکوت کرد. لێرەدا چەندین ئامانج جێگای باسە. ئامانجی یەکەم؛ قووڵکردنەوەی ناکۆکییەکانی کوردان لەگەڵ گەلانی عەرەب، تورک و ئێران کە بەدرێژایی مێژوو بەیەکەوە لەگەڵیان ژیاوە و کەم تا زۆر ستاتۆیەکی ڕەوا لەنێوانیاندا هەبووە. تێکدانی پێگەکەیان و پاڵنانیان بۆ ناو پەشێوی و شەڕ و پێکدادانی هەمیشەییەوە. ئامانجی دووەم؛ لەڕێگای لەناوبردنی کوردانەوە وڵاتێکی بەرفراوان بۆ دەوڵەت ــ نەتەوەی ئەرمەنی، سریانی، یەهودی بەدەستبێنن کە نەخشەیان بۆ دانابوون. بەمجۆرە هەم سێ دەوڵەت ـ نەتەوەی وابەستەی ڕەها بەخۆی دەستەبەر دەکرد کە ڕۆڵی تامپۆن و ئەڵقەی گواستنەوەی دەبینی، هەروەها لەمیانەی شەڕی بەردەوامی کوردان لەگەڵ دراوسێ موسڵمان، کریستیان و یەهودییەکانەوە دەخرێتە ناو کێشەوە، بەو چەشنەش هەموویانی، بە مانایەکی تر خۆرهەڵاتی ناوینی ناوکیان بەخۆیانەوە دەبەستەوە. هەڵبەتە هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دوو دڵییان نەکرد کە ماوە ماوە لەناو کێشەکان خۆیان وەک فریشتە فریادڕەسەکانی کوردستانی دابەشکراو و کوردی خنکاو پێشکەش بکەن. کاتێک سەیری ئەو گۆڕانکاری و ڕووداوانە بکەین کە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان هاتوونەتە ئاراوە ئەوا

زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین؛ بەشی زۆری ئەو ئامانجانە جێبەجێکراون کە لەمیانەی پەیماننامەکانی "ئەو ئاشتییەی کۆتایی بە ئاشتی هێنا" نەخشەی بۆکێشرابوو.

دەکرێ پەرەسەندنەکانی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) وەک بەڵگەی سەلمێنەری ئەو بۆچوونانەمان پێشکەش بکەین. سەرجەم سەرکردەکانی سەرەتا هەوڵیاندا پێشڕەوایەتی بۆ کوردەکانی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)ی ئەمڕۆ بکەن، سەرەتا بەدەستی عوسمانییەکان، دواتریش لەلایەن دەسەڵاتی ئێراقەوە سەرکوت کران. لەو کارەدا خودی ئینگلتەراش هێزی بەکارهێنا. عەرەب و کوردەکانی خستە ناو شەڕی بەردەوامەوە، بەمجۆرە هەردووکیانیشی بەخۆیەوە بەستەوە. لەو نێوانەدا لەمیانەی بەڵێنی وڵاتی سەربەخۆوە سریانییەکانی بەدەستی میرنشینە کوردەکان ( بەدرخان بەگ)، بەدرخان بەگیشیان بەدەستی عوسمانییەکان سەرکوت کرد (١٨٤٠کان) و هەموویانیانی بەخۆیەوە بەستەوە. دوای دووەمین جەنگی جیهانیشەوە ئیسرائیل کەوتەگەڕ کە وەک ناوکی هەژموونگەرایی ئاواکرا. وەک چۆن زۆر پێش دامەزراندنی خۆی ئیسرائیل دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکی سپی ( دیکتاتۆرییەتیCHP) بە سیفەتی ئیسرائیلی بەرایی بۆ خۆی کرد بەکۆڵەکەیەک لەمیانەی پشتبەستن بە یەهودییە تورکە ساباتاییە بەناو "هەڵگەڕاوە"کان و بیروکراسی تورکی ئەنادۆڵ ئاوایکردبوو، لەمیانەی بە بنەماگرتنی کوردە یەهودییەکانی ئێراقیش کە پێشتر لەناوچەکە بوون ویستوویەتی دووەمین قەوارەی ستراتیژی پشتیەستوو بەکوردان (بەشێوەیەکی سەرەکیPDK) پێکەوە بنێت و دایبمەزرێنێت. هەڵبەتە ئەو قەوارە سیاسییە کوردییەی هەوڵی پێشخستنی دەدرێت ناشێت تەنیا بە لێکدانەوە هەژموونگەراییەکانی دەرەوەی ببەستینەوە. ئەو خاڵەی هەوڵی ئاماژەپێکردنی دەدەین: هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە لە خۆرهەڵاتی ناوین لەلایەن هێزە هەژموونگەراکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەخشەی بۆدانراوە و جێبەجێشکراوە. وەک بانگەشە دەکرێت هێزەکانی چینی دەسەڵاتداری ناوەوە ئیرادەی دیاریکەر نەبوون. پێشەنگایەتی بۆرژوازی میللی چەنەبازییەکی تەواوە. بینینی رۆڵی پێشەنگایەتی لەلایەن هەندێک ئەندامی بۆرژوازی رادیکاڵ یان بۆرژوازی بچووک، ئەو مانایەی نابەخشێت کە هێزی دیاریکەری سیستەمن. بۆنموونە؛ دەرکەوتنی سەرکردەی وەک مستەفا کەمال، جەمال عەبدولناسر، سەددام حوسێن مانای ئەوە نییە کە سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەیان دەستنیشان کردووە. هەروەها سیستەم لەسەراوبنکردنی رۆڵی ئەو کەسایەتیانە لە بونیادنانی دەوڵەت ـ نەتەوەدا لێهاتووە، سەراوبنیشی کردووە. هەرچەندە حەفتا ساڵیشی بەسەردا تێپەڕ بوویێت لەسەراوبنکردنی رۆڵی رێبەری سۆسیالیستی وەک لینین و ستالینیش لێهاتووە کە لەسەر بنەمای سۆسیالیزم خوازیاری بونیادنانی سیستەمی دەوڵەت ـ نەتەوەی رووسیا بوون. دەکرێ هەمان شت سەبارەت بە"چین"ی ماویش بگووترێت. ئەو خاڵەی لێرەدا بەگرنگیەوە هەوڵی ئاماژە پێکردنی دەدەین: ئەگەر پارادایمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەهەموو رەهەندەکانیەوە دەربازنەکرێت، ئەوا ئەو مۆدێرنیتە و هێزە هەژموونگەراکانی دەبنە سەرەکیترین هێزی داگیرکار.

تەنیا لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە دەشێت بەشێوەیەکی ڕاست دەرک بە وێناکردنی درەنگوەختی ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد و دامەزراندنی بکرێت. بەتایبەتی کوردستان و ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد ڕۆڵێکی گرنگ لە حیسابە هەژموونگەرایییەکانی ئیسرائیل لە ناوچەکەدا دەبینێت. وەک چۆن دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک لە ئەنادۆڵ لە دەرکەوتنی ئیسرائیلدا ڕۆڵی پێشەنگایەتی (ئیسرائیلی بەرایی) بینیوە، دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردیش لە لێکدانەوە هەژموونگەرایییەکانی ئیسرائیل سەبارەت بە ئێران، سوریا و تورکیا ڕۆڵێکی گرنگ دەبینێت. هەر لەساڵی ١٩٤٥ەوە پشتگیری هێزە دامەزرێنەرەکانی ئیسرائیل بۆ دامەزراندنی پ.د.ک و لە ساڵی ١٩٦٠ بەدواوەش پێشکەشکردنی یارمەتی کرداری لەرێگای تورکیاوە، گرێدراوی حیسابە ستراتیژی و هەژموونگەرایییەکانیانە دەرهەق بەناوچەکە. ئاواکردنی دەوڵەتی فیدراڵی کوردی لەسەر بنەمای تەسفیەکردنیPKK لەلایەن ئەو کوردانەی لە ١٩٩٠کانەوە لەگەڵ گلادیۆ تێکەڵ بوون، ناشێت جیاواز لەو حیسابە هەژموونگەرایییە ستراتیژییە ببینرێت. هەڵبەتە هێرشی هاوبەشیان بۆ سەرPKK ئەو ڕاستییە ڕووندەکاتەوە. یەکێک لەئامانجە هەرە سەرەکییەکانی دووەمین شاڵاوی ٢٠٠٠کانی شەڕی کەنداو، دامەزراندنی هەمیشەیی ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد بوو لە ئێراق. ئەو هێزانەی ئەو بڕیارەیان داوە و جێبەجێی دەکەن هەمان ئەو هێزانەن کە لە سەدەی دواییدا کوردستانیان دابەشکرد و کوردانیان لەژێر بەزەیی کۆمەڵکوژییەکاندا هێشتەوە. پێویستی لێکدانەوە و حیسابەکانی سیستەم جێبەجێ دەکرێت. لەڕۆژی ئەمڕۆماندا بەلانی کەم هێندەی ئیسرائیل ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد بۆ سیستەمی سەرمایەداری پێویستە. لەهاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە و هێزەکاندا خۆرهەڵاتی ناوین خاوەن ڕۆڵێکی ستراتیژی دەستلێبەرنەدراوە. وەک چۆن بەگشتی لەپێناو ئاسایشی سیستەم و پێداویستی پەترۆڵ، بەتایبەتیش بۆ ئاسایش و هەژموونگەرایی ئیسرائیل دەستبەرداری ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد نابن، هەرچییەک لەپێناو بەهێزکردنی پێویست بێت ئەنجامدەدرێت. بەمجۆرە ئەڵقەیەکی دیکەی هەرە گرنگ دەخرێتە سەر ئەڵقەکانی دیکەی سیستەم کە لە ١٩٢٠کانەوە نەخشەی بۆدانراوە. گرنگی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورکی سپی بۆ دەستپێکی سیستەم چی بێت، ئەوا گرنگی دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردی سپی بۆ تەواوکردنی هەمان شتە.

بەئامانجی ڕێگریکردن لە هەندێک تێگەیشتنی هەڵەوە پێویستە ئاماژە بەو خاڵانە بکەین: لەبەر ئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکان لە لۆژیکی سیستەم ئاواکراون، ناشێت بە ئەنجامێکی بەمجۆرە بگەین کە سەبارەت بە گەلان بێبایەخن یاخود دوژمنێکی ڕەهان. تەواو بەپێچەوانەوە پێویستە دەوڵەت ـ نەتەوەکان وەک دامەزراوی گرنگ ببینرێن و ناکۆکی و پەیوەندییەکانی لەگەڵ بەرنامەی کۆمەڵگای دیموکراتی گەل ڕێکبخرێت. بەرنامەکانی کۆمەڵگای دیموکراتی ئامانجیان ڕووخاندنی دەوڵەت ـ نەتەوەکان و بە دەوڵەتبوونی خۆیان نییە. لەسەر بنەمای ڕێککەوتنی دەستووری چاوەڕوانی لە دەوڵەت ـ نەتەوە دەکات بەرامبەر پرۆژەکانی کۆمەڵگای دیموکراتیک ڕێزدار بن. وەک مەرجێکی

سەرەکی بەیەکەوە ژیانێکی هاوبەش و ئاشتیانە دەیانەوێت پرۆژەکانی کۆمەڵگای دیموکرات و جێبەجێکردنیان وەک مافێکی سەرەکی دەستووری پەسەند بکرێت. دانانان بەیەکتر و جێگیرکردنی لە دەستووردا بەبنەما وەردەگرن.

ئاشکرایە کە لە خۆرهەڵاتی ناوینی ٢٠٠٠کاندا لە هاوسەنگی دەوڵەت ـ نەتەوە و کۆمەڵگای دیموکراتیشدا کوردستان و کوردان وەک واقیعێکی دینامیک و بەهێز جێگای خۆیان گرتووە. ئەو رێککەوتنە ئانتی ـ کوردەی بەڕێبەرایەتی کۆماری تورکیا لەگەڵ ئێران و سوریا هەنگاوی بۆ نراوە چانسی سەرکەوتنی نییە. چونکە پێچەوانەی لێکدانەوەکانی سیستەمی سەرمایەدارییە. بەکرێگیراوێتی کردن بۆ سیستەمێکی بێ کورد و کوردستان لەژێر هەڵەکانی رێککەوتنێکی بەمجۆرەدا شاراوەیە. بەڵام ئیتر ئەستەمە ئیسرائیل و ئەمریکا ئەو هەڵوێستە پەسەند بکەن. سیاسەتی بەکرێگیراوێتی ئیمپریالیستی بێ کورد و کوردستان کە لەنێوان ساڵانی١٩٢٠ – ٢٠٠٠ پەیڕەوکرا چیتر دەرفەتی جێبەجێکردنی نەماوە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە کوردییەی بەرێککەوتن لەگەڵ ئێراق بونیادنرا، ئەگەرێکی بەهێزە لەماوەیەکی نزیکدا لەلایەن ئێران، سوریا و تورکیاشەوە دانی پێدابنرێت. بەڵام زەحمەتی و بەربەستەکە لەوەدایە بەرامبەر بەو دانپێدانانە لەناوبردنی PKK و KCK دەسەپێنرێت. ئەوەش داواکارییەکی پووچە. لەمە بەدواوە راستینەی کۆمەڵگای دیموکراتیKCK و واقیعی دەوڵەت ـ نەتەوەی رێککەوتنی بۆرژوازی کورد بەشێوەیەکی تێکەڵ و لەسەر بنەمای تەبایی و رێککەوتنێکی دیاردا بەیەکەوە چارەنووسی کورد و کوردستان دیاردەکەن. بۆ یەکەمجارە لە مێژووی مۆدێرنی خۆرهەڵاتی ناویندا هێزی کۆمەڵگای دیموکرات و هێزی دەوڵەت ـ نەتەوە بەیەکەوە رۆڵ دەبینن. ئەو شەڕانەی لە ئێراق، ئەفغانستان و ئیسرائیل ـ فەلەستین، بگرە لە تورکیا روویاندا و ئەو بنبەستبوونانەی رێگایان لەپێش کردەوە وانەی گرنگ بۆ کوردان لەخۆوە دەگرێت. بەو ئامانجەی رابردووی خوێناوی سیاسەتی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خاوەن سنووری وشک دووبارە نەکەنەوە سیستەمێکی دووانە بەبنەما وەردەگرن: واتە سیستەمێک پەیڕەو دەکەن کە رێککەوتنی نێوانKCK کەی خاوەن دیدگای مۆدێرنیتەی دیموکراتی و دەوڵەت ـ نەتەوەی کوردی ئێراقی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەبنەما وەردەگرێت. بەمجۆرە وانە لە دەوڵەت ـنەتەوەی سۆسیالزمی بونیادنراویش وەردەگرێت. کورد و کوردستان نە دەبێتە دووەمین ئیسرائیل نە وەک دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە دەبێت. دەبێتە شوێن و هێزی سەنتێزێکی نوێی مۆدێرنیتە کە سەرجەم کێشە سەرەکییەکان دەرباز دەکات.

### و) شەڕەکانی مۆدێرنیتە لە خۆرهەڵاتی ناوین و ئەنجامە پێشبینیکراوەکانی

پێویستە بەشێوەیەکی راست دەرک بەو شەڕ و پێکداداانانە بکرێت کە ئەو دوو سەدەیەی دوایی لە خۆرهەڵاتی ناوین روویاندا. بەر لەهەموو شتێک زانینی ئەو خاڵە گرنگە کە ئەو شەڕ و پێکدادانانە لەچوارچێوەی کلتووریدا دەربازبووە نەک چوارچێوەی

هەژموونگەرایی سەرمایەداری. دواترین شەڕەکانی هەژموونگەرایی لەگەڵ ئەوروپا، واتە لەگەڵ خۆرئاوا دوای سوڵتان سلێمانی قانوونی ئیتر بە بەرژەوەندی ئەوروپادا شکاوەتەوە. ئەو قۆناغ و پرۆسەیەی تا سەدەی نۆزدەهەم بەردەوام بووە هەژموونگەرایی سیستەمی شارستانی ناوەندی بەسەرکەوتنی سەرمایەداری ئەوروپای خۆرئاوا ئەنجامگیر بیوو. هەژموونگەرایی وڵاتانی ئەوروپا کە سەدەی نۆزدەهەم بەشێوەیەکی جەستەیش هاتنە ناوچەکە هێزە کۆمەڵایەتییەکانیان لەبەرامبەر خۆیاندا بینیەوە کە بەرامبەر سەپاندنی کلتووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەرخودانیان کرد، نەک ئەو هێزانەی شەڕی هەژموونگەرایی دەسەڵاتیان دەکرد. بەمانای هەژموونگەرایی دەسەڵات هەردوو ئیمپڕاتۆرییەتی عوسمانی و ئێرانی لەو دۆخەدا نەبوون شەڕ لەگەڵ وڵاتانی ئەوروپا بکەن. هەوڵیاندەدا لەسەر پێیان بمێننەوە. لەمیانەی لێکدانەوە هەرزانەکانی هاوسەنگی دەسەڵاتەوە ئەو هەوڵەیان دەدا. بەشێوەیەکی جیاوازتر لەگەڵ زۆربەی ناوچە کۆڵۆنییەکانی جیهان کلتووری کۆمەڵایەتی لەجیاتی پەسەندکردن و هەرەسکردنی ڕاستەوخۆی کلتووری مۆدێرنی ئەوروپا زیاتر لەبەرامبەریدا بەرخودانی کرد. داگیرنەکردنی تەواوەتی ناوچەکەش بۆ هێزە کلتوورییەکەی دەگەڕێتەوە. بەتایبەتی ئیسلام بەو سیفەتەی نەریتی کلتووری زاڵە لەو قۆناغەدا سۆبژەی چالاکی بەرخودان بوو. ئەو خاڵە گرنگەی پێویستە لێرەدا جیابکرێتەوە ئەوەی بەرخودانی کردووە ئیسلامی دەوڵەتی و دەسەڵاتگەرا نییە، بەڵکو ئیسلامە بە سیفەتی کلتووری کۆمەڵایەتی. بزووتنەوەکانی ئیسلامی سیاسیش لەئارادا بوون، بەڵام لەبەرامبەر هەندێک بەرژەوەندی دیاردا زۆر بەئاسانی کەمەندکێشی بەکرێگیراوێتی دەکران. ئەوەی بەردەوام لەبەرخودان دابوو و لەژێرەوە وەک شەپۆلێکی ئەستوور بەردەوام بوو نەریتە کۆمەڵایەتییە ئیسلامییەکان بوو. لەبەر ئەو هۆکارە لێکجیاکردنەوەی نەریتی کۆمەڵگایی و نەریتی دەسەڵاتگەرایی سیاسی گرنگە کە لەسەدەی نۆزدەهەمەوە تا ڕۆژی ئەمڕۆمان بەناوی ئیسلامەوە پەیڕەوکراوە.

ئەو پرسیارەی پێویستە پێشبخرێت: سەبارەت بەچۆنایەتی و چەشنی ئەو شەڕەیە کە لەنێوان ئیسلامی کلتووری و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەئارادایە. بەگوێرەی ئەوەی پێکدادانی نێوان دوو دەسەڵاتی هەژموونگەرا لەئارادا نییە، بەڵکو پێکدادان لەنێوان کلتووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و کلتووری نەریتی ئیسلامی دایە. شەڕەکانی مۆدێرنیتە جێگای باسە کە زیاتر لەبواری کلتووری کۆمەڵایەتی ڕوودەدات. لە خۆرهەڵاتی ناویندا کاتێک کلتوور جێگای باس بێت پێویستە تەنیا بە ئیسلامییەت سنووردار نەکرێت. پێویستە لە ئایینە ئیبراهیمییەکانی دیکەش واتە بە کرستیانی و یەهودییەت تەواو بکرێت، بگرە ئەو کاریگەرییە ئایینیانەشی بخرێتە سەر کە لەدەرەوەی ئایین یاخود لەدەرەوەی ئایینە تاکخوازییەکان بەشێوەیەکی پەردەپۆشکراو لە عەلمانی و شامان ـ بتپەرستی لەئارا دایە و بەشێوەیەکی یەکپارچە تاوتوێ بکرێت.

جوگرافیای خۆرهەڵاتی ناوین سەرەکیترین ناوچەی کلتوورییە کە مرۆڤایەتی هاوچەرخی پێکهێناوە. ئەگەر کلتووری مرۆڤی هۆمۆساپیانسیشی بخەینەسەر ئەو ناوچە کلتوورییە بنەڕەتیەیە کە لەسەردەمەکانی بەر لەمێژووەوە تا سەدەی نۆزدەهەم بەدرێژایی سێسەد هەزار ساڵ مرۆڤایەتی تێرخۆراک کردووە. کلتووری مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە راستیدا کلتووری هەژموونگەرایی ئەو دوو سەدەیەی دواییە. چاوەڕوانی ئەوە ناکرێت کلتووری ئەو دوو سەدەی دوایی لەماوەیەکی کورتدا کلتوورێکی سێسەد هەزار ساڵی بتوێنێتەوە و ئاسیمیلەی بکات. چاوەڕوانی درێژخایاندنی شەڕی کلتووری و بەئاسانی رادەستنەبوونی کلتووری خۆجێیی دەکرێت، بگرە پێویستە چاوەڕوانی دەستپێکردنی شەڕی هەژموونگەرایی کلتووری بکرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ ئەو شەڕە هەرێمیانەی بەشێوەیەکی بەردەوام لەڕۆژی ئەمڕۆماندا روودەدەن دەشێت وەک قۆناغی شەڕی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتە شرۆڤە بکرێت. هەربۆیەش راڤەکردنێکی جیاواز بۆ ئەو پێکدادانانەی لەئاستێکی بەرزدا لەمیانەی بواری دەسەڵاتەوە تەواو دەکرێت گرنگییەکی مەزنتری هەیە. لەو روانگەیەوە؛ وەسفکردنی شەڕ و پێکدادانەکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی پارادایمی شەڕی نەتەوەیی و چینایەتی خۆرئاوای بەرتەسکەوە یان شەڕی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئیسلامی سیاسی رادیکاڵ و میانڕەو تەواو نییە. شەڕ و پێکدادان ئەو رەهەندانەشیان هەیە. شەڕ و پێکدادانەکانی ئەو رەهەندانە زیاتر بوارەکانی دەسەڵات و دەوڵەت پەیوەندیدار دەکات. بەڵام ئەو چۆنایەتی یاخود ناوەڕۆکەی شەڕەکان گرنگە کە سەرجەم ئەو رەهەندانەی دەسەڵات دەرباز دەکات. کەچی لە راستیدا پێکدادانەکانی رەهەندی دەسەڵات و دەوڵەت چەندە بەرفراوان و درێژخایەنیش بن، بەڵام ئەو هێزەی نییە دەرکەوێتە دەرەوەی بواری دەسەڵاتی هەژموونگەرا. لەبەرامبەر ئەوەشدا کاراکتەری ئەو شەڕانەی لە رەهەندەکانی مۆدێرنیتە دان جیاوازە و مۆدێرنیتەی زاڵ دەرباز دەکات.

### ١ . چارەنووسی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە خۆرهەڵاتی ناویندا

بەگوێرەی پەندی "هەر رووەکێک لەسەر بنجەکانی خۆی سەوز دەبێتەوە " وێڕای سەرجەم نیگەرانییەکان، بەڵام ئەگەرێکی بەهێزە کە چارەنووسی دواترین سیستەمی شارستانی ناوەندی واتە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە میانەی شەڕ و پێکدادانەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا دیاری بکرێت. وێڕای باڵادەستی و زاڵبوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەڕۆژی ئەمڕۆماندا بەڵام وەک رەگ و ریشە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی سەرمایەداری مارژینال بووە و وەک گومڕابوون و لادانێکی کۆمەڵایەتی بینراوە. دژی لێشاوە سەرەکییەکەی مرۆڤایەتییە. هەروەها دژی دیالیکتیکی گەردوونی سروشتییە یاخود گومڕایە. هەڵکشانی سەرمایەداری لە سەدەی شازدەهەم و ئاواکردنی هەژموونگەرایی جیهانگیری تۆزێکیش لە چیرۆکی "چل چەتەکان"دەچێت. گومڕابوونی جوگرافیای ئەورووپای خۆرئاوا و کلتووری جڤاتەکانی بەگوێرەی لێشاوی سەرەکی شارستانییەت،

پێکدادانە مەزهەبییەکانی دونیای کرستیان و ئیسلام، هێرش و پەلامارە وێرانکارەکانی لەجۆری مەغۆلییەکان و دونیای داخراوی لەجۆری خانەدانەکانی چین نەبووایە ئەوا لە ئەوروپای خۆرئاوا سەرمایەداری ئەو دەرفەتەی نەدەقۆستەوە و هەلی هەنگاونانی بەرەو هەژموونگەرایی بۆ نەدەڕەخسا. پێویستە لەبیرنەکەین کە ئەو پێهەڵگرتنە هەژموونگەراییە لەجەمسەری هەرە خۆرئاوای بەیەککەیشتنی سێ کیشوەر لەهێڵی ئەمستردام ـ لەندەن، لەدوورگەیەکی بچووکی (بەریتانیا) چاوەڕواننەکراودا رویدا. هێزێکی بچووکی سەرمایە و دەسەڵات کە دوورخراوەتەوە، لەپێناو قووتنەدانیان لەلایەن ئیمپراتۆرییەکانی کیشوەرەوە بەرخودانێکی مان و نەمانی کرد و شەڕەکەی بردەوە.

ئەو هێزە سێ گەورە چەکی دروستکردبوو کە لەو شەڕەدا نوێ بوو. ئەو سێ چەکەی لەسەدەی شازدەهەمەوە تا سەدەی نۆزدەهەم سەرکەوتووانە پەیڕەوکران سێ فاکتەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو: مەیلی هەمیشەیی سەرمایە بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج، ڕێکخستنی دەسەڵات بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم بوو کە لەمیانەی گوزەرکردن لە مانیفاکتۆراوە بۆ شۆڕشی پیشەسازی دەستیپێکرد. ئەو دونیایەی لەو دووسەدەیەی دواییدا لەرێگای ئەو سێ فاکتەرەوە فەتحکرا، بەراستی دونیایەکی سەیر و گومڕایە. بێگومان ئەوە سیستەمێکی ئیلاهی نییە لە ئاسمانەوە هاتبێتە خوارەوە. ئەوەی جێگای باسە دونیای هەژموونگەرایی هێزێکی گومڕا و پۆتانسیێلی شاراوەی درزو و ڕێڕەوە نهێنیەکانی سیستەمی شارستانی ناوەندی پێنج هەزار ساڵەیە کە بە تاوانبار دانراوە و لەلایەن مرۆڤایەتییەوە وەک "چل چەتەکان" مەحکوم کراون. جێگیربوون و جیهانگیربوونی لە ئەوروپا بۆ خەسڵەتی کوشندەی ئەو سێ چەکە سەرەکییە دەگەڕێتەوە کە بەکاریدێنێت. لەمیانەی ئەو دونیا زانستییەی بەئامانجی حوکمکردنی ئایدیۆلۆژی بەسەر کۆمەڵگا و سروشت پێکیهێناوە، دونیای دەوڵەت ـ نەتەوە کە باجەکەی نکوڵیکردن لە سیاسەت بوو، دونیای ئیندوستریالیزم و مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج کە کۆمەڵگا و ژینگەیان قووتداوە؛ ئەو قۆناغەی پێی گەیشتووین لەناوچوون یاخود ئیفلاسبوونی تەواوەتی کۆمەڵگا، تاک و ژینگەیە. هەرچی سەرمایەداری فینانسە کە لە ١٩٧٠کان بەدواوە مۆرکی خۆی لە هەژموونگەرایی داوە، سیستەمێکە تەواو پێچەوانەی سروشت و کۆمەڵگایە. یاریکردن بە ژمارە وەهمییەکان و پارچە کاغەزەکان و لەرۆژێکدا قازانجکردن و بەدەستهێنانی ترلیۆن دۆلار، بە هەرحاڵ بەسە بۆئەوەی روون بێتەوە کە ئەو سیستەمە چل هێندەی "چل چەتەکان" سیستەمێکی دزی، حەرام و هۆڤێتی (کوشتنی جەستەیی و مەعنەوی )ین.

هەموو کەسێک تەنگژەکانی رۆژی ئەمڕۆمان بەتەنگژەی بونیادی سەرمایەداری دادەنێت. لەراستیدا پێویستە بە دوا تەنگژەش ناو نەبرێت. چونکە خودی سەرمایەداری کوشندەترین تەنگژەی سیستەمی سەرمایەدارییە کە هەمیشەیی بووە. ئەو شەڕانەی قڕکردن و کۆمەڵکوژی، تاڵانکارییە سامناکەکانی کۆلۆنییەکان، چەوساندنەوەی رەنج، وێرانکردنی ژینگە کە حوکمڕانێتییەکەی ئەو پێنج سەد ساڵەی دوایی رێگای لەپێش

کردۆتـــەوە، واتـــە لـــە دەرەئەنجامـــدا لەمیانـــەی لـــەناوبردنی تـــاک و کۆمـــەڵگاوە تایبەتمەندێتییە سەرەکییەکانی خۆی پیشانداوە. کاتێک ئەوە رەچاو بکەین کە تەنیا ئامارەکـانی سـەدەی دوایـی چەنـد ئەوەنـدەی ئامـاری شـەڕەکانی تـەواوی مێـژووی مرۆڤایەتییە، ئەوا زۆر بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین تایبەتمەندێتی شێرپەنجەیی بۆ ژینگە و کۆمەڵگای مرۆڤ لەخۆوە دەگرێت. ئەو سیستەمەی لەمێژە ئەو خەسڵەتانەی لە ناوەندەکانی خۆی و جیهانگیریەکاندا ئاشکرابووە، مایەی تێگەیشتنە کە لە ناوەندی کلتووری مێژوویی مرۆڤایـەتی واتـە لـە خۆرهـەڵاتی نـاوین کارەکـانی زۆر زەحمەتـە. رێکخستنەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە لـەو سـەدەیەی دواییدا بەشی رزگارکردنی مۆدێرنیتـەی سەرمایەداری ناکـات. بەشێوەیەکی روون و بەرچاو ئاشکرابووە کە دەوڵـەت ـ نەتـەوە بچووکەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ئامرازی زاڵبوون و حوکمڕانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین . والیەکانی ئیمپراتۆرییەتی رۆما لەناوچەکە لەقۆناغێکدا چ مانایەکیان هەبووە، دەوڵەت ـ نەتەوەکانی رۆژگاری ئەمڕۆشمان هەمان مانایان هەیە. لەوانەیە بە بەراورد لەگەڵ والـی یـان ویلایەتـەکانی رۆمـا بـەکرێگیراوتر بن؛ لەنەریتـە کلتوورییـەکانی ناوچەکـە دوورن، کاتێک هەوڵی لێ نزیکبوونەوەشیان بۆ بدەیت دەبینیـت بەتـەواوی لـەدۆخێکی ناکۆکـدان. فاکتـەرەکانی ئیندوسـترالیزم و زۆرتـرین قـازانجی مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری، نـاتوانن بەقووڵایی کلتووری ناوچەکەدا بچن. ئامرازەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەش کە بە بـەربڵاوترین شێوە بەکاردەهێنرێت وەک تەواوی جیهان لەناوچەکەشدا لـە داخـوران و دەربـازکردنێکی خێـرا دایـە. ئامرازەکـانی دەوڵـەت ـ نەتـەوە بگـرە لەدرێژەپێـدانی ئـەو تەنگژەیـەش کورتیهێنـاوە و تـەنگژەی بوونەکەشیان لـە قووڵبوونـەوە دایـە. تەنانـەت بوونەکەشـیان تەنگژەکـە قووڵتردەکاتـەوە. کاتێـک دواتـرین رەوشـی دەوڵـەت ـ نەتـەوە و بوونەکـەیان لەبەرامبەر پێشهاتە چاوەڕوانکراوەکان شیکاربکەین دەتوانین ئەوانە بڵێین:

أ) دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەبی لەمێژە بەدۆخی ناکۆکی سەرەکی گەیشتووە و تووشی رق و نەفرینی گەورەی گەلەکانی هاتووە. دەوڵەت ـنەتەوەی ئێراق کـە بـە بـەهێزترینیان دادەنـرا، لـە رەوشـی ئێسـتادا گۆڕسـتانی دەوڵـەت ـ نەتەوەیـە. وەک چـۆن دەوڵـەت ـ نەتەوەیەکی نوێ لەشوێنی کۆنەکە ئاوانەکراوە، ئەگەری دابەشبوون بـۆ سـێ دەوڵـەت ـ نەتـەوەی نـوێ، کێشـەکان قورسـتر دەکـات و شـەڕ و پێکدادانـەکان بەئاسـتی ژینۆسـاید دەگەیەنێت. بەهەرحاڵ دەوڵەت ـ نەتەوەکانی عـەرەبی شیعە، عـەرەبی سوننە و کـوردان دەبنە شانۆی خوێناویترین رووداوەکانی سەدەی بیست و یەکـەم. ئەگـەر سـەیری رەوشـی ئێسـتا بکرێـت و لەگـەڵ کۆمـەڵکوژی هەڵەبجـە و سـەرجەم کۆمەڵکوژییـە ئـەتنیکی و مەزهەبیـەکانی رابـردووی نزیـک بـەراورد بکرێـت ئـەوا باشـتر دەرک بـە سـامناکی پێکدادانەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی داهاتوو دەکرێت. ئێستا و داهاتوویەک جێگـای باسـە کە زۆر لەیەکتر لەناوبردنی دەوڵەتشارەکانی سەردەمی سۆمەر دەچێت. هەڵسەنگاندنێکی بەمجۆرە هەڵـە نییـە کـە دۆخـی ئێسـتا و داهـاتووی نزیکـی سـەرجەم دەوڵـەت ـ نەتـەوە عەرەبەکان لە مەغریب تا یەمەن، لـە سـودانەوە تـا دەگاتـە سوریا و لوبنـان لـە ئێراق

جیاوازتر نییە و جیاوازتریش نابن. وێڕای ململانێ و شەڕە رووالەتیەکانیان لەگەڵ ئیسرائیل بەڵام لەناوەڕۆکدا ئەو بەکرێگیراوانەن کە دەرفەتیان بە ئیسرائیل داوە و بەشێوەیەکی بابەتی دەیژێنن. بوونەکەیان لەمیانەی هەژموونگەرایی ئیسرائیلەوە بەدیدێت. لەوانەیە دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەب ئەو لایەنە بێت کە زۆرترین پێویستی بە ئیسرائیل هەیە.

لەدونیای عەرەبیدا ئیسلامگەرایی سیاسی بەسیفەتی میللیگەرایی لە میللیگەرایی عەلمانی و دەوڵەت ـ نەتەوەکەی بە کێشەترە. ئەو میللیگەراییانەی کە لەسەر بنەمای قۆستنەوەی ئیسلامی کلتوورین جگە لە بزووتنەوە فاشیستە درەنگوەختەکان رۆڵێکی دیکە نابینن. وەک لەنموونەی ئەلقاعیدەشدا بینراوە جگە لە رێکخراوێکی گێرەشێوێنی و ماشەی دەستی دەوڵەت ـ نەتەوەکان زیاتر بڕ ناکەن و ئەوەش راستییەکی سەلمێنراوە. ئەگەر کۆنەکان بن یان ئەوانەی هەوڵی سەرلەنوێ بونیادنانەوەیان دەدرێت، دەوڵەت ـ نەتەوەی عەرەب سەبارەت بە ژیانی کۆمەڵایەتی و لەبەرامبەر نەریتی ئیسلامی رۆڵی گۆڕهەڵکەندنی تێپەڕ نەکردووە و تێپەڕیشی ناکات. دامەزراوەکانی ئیندوستریالیزم و قازانجی ئەوپەڕگەر کە فاکتەرەکانی دیکەی سەرمایەدارین، دۆخەکەیان لە هی دەوڵەت ـ نەتەوە رەونەقدارتر نییە. پیشەسازیگەرایی و قازانج کە پشت بەنەوت و تەلارسازی دەبەستێت گەورەترین سەرچاوەی کێشەکانی ئایندەن. کاتێک پەترۆڵ وشک بێت و کۆتایی پێبێت لەمیانەی ئەو شارانەی وەک تەنێکی نەخۆشی گەورە دەبن لەوانەیە ئایندە بۆ عەرەبەکان ببێت بە مەحشەرێکی راستەقینە.

ب) ئەگەر پاشکۆی ئەمریکا ـ یەکێتی ئەوروپا بن یان رووسیا، دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانی تورک هەرگیز ناتوانن رۆڵی دەوڵەت و دەسەڵاتەکانی بنەچەی کۆنی تورک ببینن و دۆخی ویلایەتی ئەو سیستەمە دەرباز ناکەن کە پێیەوە گرێدراون. هەڵبەتە لەسەردەمی دامەزراندنیانەوە بەگوێرەی پێداویستی هەرێمی هەژموونگەرا سەرمایەداری و سۆسیالیستە بونیادنراوەکان ئاراستەکراون. بە پاککردنەوەی بارە کۆسپگیرییەکەی رابردوو و بەربەستکردنی راپەڕینی گەلان ئەرکدار کرابوون. کاتێک سەیرێکی نەوەد ساڵی رابردوویان بکرێت ئەوا بەدڵنیاییەوە دەتوانین بڵێین؛ ئەو رۆڵەیان جێبەجێکردووە. وەک بڵێی ئەرکدار کراون تا رۆڵی هەزار ساڵی دوایی تورکەکان سەراوبن بکەنەوە. هەمووشیان رۆڵی بچووکبوونەوە و داخراوبوون لەناوخۆدا دەبینن. بەجۆرێک رەفتاردەکەن کە هیچ بەرپرسیارێتییەکیان بەرامبەر کلتوور و گەلانی ناوچەکە نەبێت. بگرە رۆڵێکی ئەرێنی بەرامبەر یەکتریش نابینن. ئەو دۆخەش پەیوەست بەفێربوون و هۆگری ژیان و زهنییەتی ئەو دەوڵەتگەرایی و میللیگەراییە بەرتەسکەیە کە تێی خزێنراون. بەو رەوشەی ئێستایان ناتوانن ببن بە سێبەری رابردووش، ئەو رابردووەی زۆرجار رەخنەی دەکەن یاخود لاسایی دەکەنەوە. لە دۆخی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوانەدان کە لەداهاتوویەکی نزیک پێویستییان بەزۆرترین ریفۆرمە.

بەڵام ئەو مۆدێلەی لە قۆناغەکانی دواییدا لەژێر ناوی سەنتێزی تورک ـ ئیسلامەوە پێشکەش دەکرێت، لە ریفۆرم زیاتر، دیسان بەگوێرەی پێویستی سیستەمی هەژموونگەرایی بۆ سەربازگەی پێشەوە، شێوەدەگرێت. وەک چۆن هیچ وەرچەرخانێکی چۆنایەتی بەخۆیەوە نەدیوە، ئەگەرێکی لاوازە لەمیانەی کێشمەکێشەکانیان لەگەڵ سەردارەکانیان هیچ پشکێک بەدەستبێنن. هەروەک عەرەبەکان، هەر هەموویان کۆبکەنەوە هێندەی ئیسرائیلێک نابن، جگە لە وابەستەبوون بە هەژموونگەرایی ئیسرائیل چانسێکی دیکەیان نییە. وەک چۆن بوونەکەیان بە هەلومەرجەکانی لەدایکبوونی ئیسرائیل دەبەسترێتەوە، لەقۆناغە درەنگەکانیشیاندا چارەنووسەکەیان لەمیانەی بوونی قەوارەی ئیسرائیلەوە دەستنیشان دەکرێت؛ هەڵبەتە ئەگەر زهنیەت و قاڵبەکانی ژیانی ئێستایان دەربازنەکەن. فاکتەرەکانی دیکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تەنانەت بۆ خۆیشیان هیوابەخشن نین. ئەو ئیندوستریالیزمەی لە کۆماری تورکیا بەتایبەت لەسەر کەرتەکانی پەترۆڵ، غاز و دەرهێنانی هەندێک کانزا و هەروەها لەسەر گەشتوگوزار، ئۆتۆمبێل و جلوبەرگ ئاواکراوە هەر لەئێستاوە زەوی و زاری ژیانی کردووە بە گۆڕستان. چاوچنۆکی زۆرترین قازانج بەنیازە ئیکۆلۆژیا و کلتووری مێژوویی حەوزەی دیجلە و فورات لەناو ببات و گەلی کوردی نیشەجێی ئەو دەڤەرە دووچاری هەمان چارەنووسی گەلانی ئەرمەنی و سریانی بکات. دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک لەو بڕوایە دایە لەمیانەی دواترین کۆمەڵکوژی کوردەوە بەسیفەتی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی "یەکگرتوو بە میللەت و نیشتیمانەوە" ئیتر دەبێت بە ئەبەدی. ئاشکرایە کە دەوڵەت ـ نەتەوە و مۆدێرنیتەی تورک (ئەگەر پارادایمەکەی نەگۆڕێت) لەداهاتوویێکی نزیکدا جگە لەرۆڵی گۆڕهەڵکەنەی گەلان و کۆمەڵگاکانی ناوچەکە، لەسەرووی هەمووشیانەوە گەلی کورد و تورک، هیچ رۆڵێکی دیکە نابینێت.

ج) پێگەی ئێران و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دیکە بەکێشەترە. خۆی لەخۆیدا ئەفغانستان و پاکستان بە سامناکترین شێوە تووشی تەنگژەی دەوڵەت ـ نەتەوە هاتوون. شەڕەکانی ئەو سەدەیەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوەکان کارەساتێکیان هێناوەتە سەر ئەو گەل و کلتوورانە کە لە هی بۆمبی ناوەکی قورسترە. گەلە ئاماژە پێکراوەکان دووچاری وێرانکاری، تیرۆر و پیلانگێڕییەک هاتوون کە لە هیچ قۆناغێکی مێژوویاندا تووشی نەبوون. لەوانەیە هەرساتێک ئێران رووبەڕووی کارەساتی ئەتۆمی ببێتەوە. هەر لەسەرەتاوە کلتووری ئێران لەگەڵ مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ دەوڵەت ـ نەتەوە، ناتەبایە و لەشەڕ دایە. لەبەرامبەر تەواوی ئەو فاکتەرە سەپێنراوانەدا بەرخودان دەکات. هەر لەئێستاوە گەلانی ئێران تێگەیشتوون کە ئەو شیعەگەرایییەی وەک دیاردەیەکی زۆر مێژوویی و خۆجێیی دەسەپێندرێت میللیگەرایییەکە جۆرێک لە ڤێرسیۆنەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پێکدێنێت و لەرێگای ئەو دەمامکەوە شۆڕشی ئیسلامی ئێران مایەپووچ کراوە و لەو پێناوەشدا رابووەتە سەرپێیان. رووداوەکانی ئەفغانستان و پاکستانیش جیاوازتر نین. وێڕای تەڵەکەبازی و

جامبازییەکانی حزبوڵڵا، ئەلقاعیدە و تاڵیبان، ناتوانن راستی پەردەپۆش بکەن. پێویستە لەبیرنەکەین کە هەر سێ دامەزراوەی دەمامکداریش، واتە حزبوڵڵا، ئەلقاعیدە و تاڵیبان لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە نۆکەرەکانەوە ئاواکراون، ئەمڕۆش وەک ئامرازێکی فشار بەرامبەر بە سەردارە هەژموونگەراکانی وەک ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا بەکاریان دێنن تا پشکی زیاتر بەدەستبێنن. واتە ئەو ئامرازانەی پیلانگێڕی، تیرۆر و کۆمەڵکوژی کە بەیەکەوە ئاوایانکردوون بەئامانجی بەدەستهێنانی پشکی زیاتر و یەکتری رامکردن لەبەرامبەر یەکتری بەکاری دێنن. وەکو دیارە؛ رووبەڕووی ئامرازگەلێک بووینەتەوە کە بۆ قێزەوەنترین تەڵەکەکانی مێژوو داهێنراون. لەرێگای ئەو ئامرازانەی گەمە و پیلانگێڕییەکانەوە وەک چۆن یاری منداڵانە بکات گەلان و کلتوورەکەیان دەکوژێت. ئاشکرایە کە لەرێگای ئەو ئامرازانەوە نە سیستەم دەتوانێت لە خۆرهەڵاتی ناوین شوێن بدۆزێتەوە، نە دەوڵەت ـ نەتەوە بەکرێگیراوەکانیشیان چاک دەبن و دێنەوە سەر رێ، هیچ یەکێکیان بەدینایەت.

بەتایبەتیش ئێران لەو بڕوایە دایە لەمیانەی بەکارهێنانی نەریتە زۆر کۆنەکەی دەوڵەت دەتوانێت دەرەقەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێت، بەمانایەکی تر دیمەنێکی بەو جۆرە دروست دەکات تا لەلایەن سیستەمەوە پەسەند بکرێت. بەم چەشنە بەکارهێنانی مێژوو لەوانەیە چاوچنۆکانەترین شێوەی لەناوچوون بێت. ئەو مەزەندانەی لەو بڕوایە دایە کە بەتێکەڵکردنی ئەو رادەیەی مۆدێرنیتە و نەریتی مێژوویی دەتوانێت دەوڵەت ـ نەتەوە رزگار بکات، تەنیا دەکرێ بە گووتەی "فێڵبازی عەجەم"روون بکرێتەوە. لەبەر ئەو هۆکارەش لەوانەیە خۆرهەڵاتی ناوینی داهاتووی نزیک لەرێگای ئێرانەوە شێوە بگرێت. لەراستیدا ئێران لەپێگەی ناوەندی گفتۆگۆکانی مۆدێرنیتە دایە. هەرچەندە میللیگەرایی شیعە چەواشەی بکات، بەڵام گفتوگۆ سیاسی و ئایدیۆلۆژییەکانی سەبارەت بە مۆدێرنیتە بە گەورەبوونەوە بەردەوام دەبێت. بەبەراورد لەگەڵ گەلانی دیکە گەلانی ئێران باشتر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەناسن و بۆ رووبەڕووبوونەوە و ملکەچنەکردن بەبڕیار دیارە. میللیگەرایی شیعەی ئێستا چەندە ئانتی ـ ئیسرائیلی، ئانتی ئەمریکایی و ئانتی ـ خۆرئاواچێتی ساختەش بکات، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ ناتوانێت رێگری لە بەدواداچوون و لێکەڕینی گەلانی ئێران بکات بۆ نۆزینەوەی مۆدێرنیتەیەکی گونجاو و بەگوێرەی خۆیان. بگرە ئەگەر لەگەڵ ئەمریکا و ئیسرائیلیش رێکبکەوێت بەرامبەر بەو لێگەڕینەی گەلان ناتوانێت هەڵوێستە دەمامکدراوەکەی رزگاربکات. لە کلتووری ئێراندا لێگەڕینی حەقیقەت بەهێزە. هەروەها نەریتێکی ژیانی کۆمیناڵی هێندەی مێژووی کۆن لە ئێران جێگای باسە. لەو سۆنگەیەوە؛ لەوانەیە لەمێژوویێکی نزیکدا بەمانا راستەقینەکەی لە ئێران ئاشنای شەڕێکی مۆدێرنیتە ببین. لە راستیدا شۆڕشی ئیسلامی ١٩٧٩ شەڕێکی مۆدێرنیتە بوو، بەڵام بەلارێدا بردرا. لەمیانەی ئەو پەند و ئەزموونانەی لەو شۆڕشە و مێژووی خۆیان وەریانگرتووە لەرێگای شەڕەکانی مۆدێرنیتەوە لەداهاتوویێکی نزیکدا گەلانی ئێران رێگا لەپێش پێشهاتێکی شایستە بە مێژووی خۆیان و مێژووی خۆرهەڵاتی

ناوین دەکەنەوە کە ڕێگایەکی نوێ بۆ تەواوی گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین دەکاتەوە. هەربۆیەش گفتوگۆکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک و ئەزموونە کردارییەکانی گرنگییەکی زۆری هەیە و ڕێپیشاندەر دەبێت.

## ٢. ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات لەتەنگژەی خۆرهەڵاتی ناویندا

دیاردە کۆمەڵایەتییەکان نەرمن. بگرە لە بە تەنگژەترین دیاردەشدا بەردەوام ئەگەری فرەچارەسەری لەئارا دایە. کێشەکە سەرچاوەی خۆی لەهۆکاری پەیوەستبوونی کۆڵەکە وێناکراوەکانی چارەسەری بەحەقیقەتی کۆمەڵگاوە وەرناگرێت. دیاردە کۆمەڵایەتییەکان وەک هیچ دیاردەیەکی فیزیایی و کیمیایی ناپێورێن و بە یاساکانەوە نابەسترێنەوە. ئەوە کۆمەڵگایە کە تاکی خاوەن حەقیقەت دەستنیشان دەکات. ئەگەر کۆمەڵگاکەی پشتگوێ بخرێت هیچ تاکێک یان خاوەن حەقیقەتێک مایەی تێگەیشتن نابێت. لەو سۆنگەیەوە؛ وەک چۆن سۆسیۆلۆژیا دواترین زانستە کە پەرەیسەندووە، لەسەرووی ئەو زانستانەشەوە دێت کە بەردەوام پێوستی بە کامڵبوون و پێگەیشتن هەیە. لە کۆمەڵگاکان تێنەگەیت، ڕێگەچارەیەک سەبارەت بەکێشەکانیان پێش ناخرێت کە هەڵگری پشکێکی زۆری حەقیقەت بێت. لەپێناو تێگەیشتنی تەنگژە کۆمەڵایەتییەکاندا پێویستییەکی زیاتر بە پەیبردنی کۆمەڵگاکان بە حەقیقەتەوە هەیە. ساتەکانی تەنگژە ئەو ساتانەن کە کۆمەڵگاکان هەڵدەوەشێنەوە، لەو سۆنگەیەوە؛ ساتی گۆڕانی حەقیقەتەکانە. لەمیانەی زانیارییەکانی دەرهەق بە کۆمەڵگای کۆنەوە تەنگژە شیکار ناکرێت – کە ئەو زانیارییانە زیاتر لەجۆری میتۆلۆژی، ئایین و داناییە – ئەگەر شیکاریش نەکرێت ئەو ئەلتەرناتیڤانەی چارەسەریش پێشناخرێن کە پشکی ڕاستییان هەیە. لەئەنجامدا ئەوەی چارەسەری دیاردەکات پشکی ئەو حەقیەقەتەیە کە لەخۆیەوە دەگرێت. بەگووتەیەکی تر ئەوەی لەچالاکی کۆمەڵایەتیدا سەرکەوتن دیاری دەکات هێزی ئەو حەقیقەتەیە کە لەخۆیەوە دەگرێت. هەرچی خودی حەقیقەتە پشکەکانی گوزارشتکردنی هێزەکانی ژیان و مانای دیاردەی کۆمەڵگایە. واتە ئەو گوزارشتانەی هەڵگری پشکێکی بەرزی حەقیقەتن گرێدراوی نوێنەرایەتیکردنی هێزی ژیان و مانایە کە دیاردەی کۆمەڵگا لە خۆوەی دەگرێت.

فەتحکردنی خۆرهەڵاتی ناوین لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە، لەدوا شیکاردا بۆ باڵابوونی ئەو حەقیقەتە دەگەڕێتەوە کە کۆمەڵگابوونی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەبەرامبەر کۆمەڵگابوونەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا نوێنەرایەتییان دەکرد. نوێنەرانی حەقیقەتی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین کە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئیتر لە دۆخی کۆمەڵگای نەریتی باودا بوون، پەلکێشی پێگەیەک کرابوون سەرکەوتنیان بەرامبەر حەقیقەتەکانی مۆدێرنیتە ئەستەم بوو. بەکورتی حەقیقەتی خۆرهەڵات لەبەرامبەر حەقیقەتی خۆرئاوایی لاوازبوو و مەحکومی ژێرکەوتن بوو. نەدەبوو ژێرکەوتن بکرێت بە موڵکی تەواوی کۆمەڵگا. ئەوانەی دۆڕابوون نوێنەرە فەرمیەکانی حەقیقەت بوون، واتە

خاوەنەكانی دەوڵەت و دەسەلات بوون. چونكە حەقیقەتی زاڵ ئەو حەقیقەتە بوو كە ئەوان نوێنەرایەتییان دەكرد. دۆڕان لەتەواوی دامەزراوەكانی سەرخان و ژێرخاندا روویدا كە سیستەمی دەوڵەتەكەیانی پێكهێنابوو. ئەگەر ژێركەوتووەكان تامردن بەرخودان نەكەن، ئەوا ناچارن گرێدراو بەهێزی هەژموونگەرایی و نوێنەرایەتی حەقیقەتی نوێ بژین. چیتر ئەو هێزانە زهنیەت و ئیرادەی ژیانی كۆمەڵگاكانی خۆیان دەستنیشان ناكەن. بەسیفەتی دامەزراوە سیخوڕی و بەكرێگیراوەكانی هێزی هەژموونگەرایی، لەبەرامبەر گەرەنتیكردنی ژیانیان بە پێشكەشكردنی خزمەتەكانیان ئەركدار كراون. بەڵام وەك نموونەی لاشەیەكی بێسەر جەستەیەكی كۆمەڵایەتی لەشوێنی خۆیدا گرمۆڵە بووە و كزۆڵەیەتی. وەك باسمان كرد؛ لەمیانەی ئەو كزۆڵەكردنەوە یان دەپووكێتەوە و لەناو دەسەلات و كۆمەڵگای نوێی مۆدێرنیتەدا دەتووێتەوە و لەناو دەچێت، یاخود بەهۆی كارەكتەرە نەرمەكەیەوە، لەمیانەی زهنیەتێكی ئازادەوە بڕیارداری ژیانی ئازاد سەبارەت بە جەستە رادەستنەبووەكە پیشاندەدات، واتە بەزهنیەتێكی ئازادترەوە لە تەنگژە دەردەكەوێت. بێگومان ئەو هەستانەی لەمیانەی پێشەنگایەتی ئەو زهنیەتە نوێیەوە ئەنجامدەرێت، پەیوەستی پشكی ئەو حەقیقەتەیە كە هەڵیگرتووە. زانست، فەلسەفە، هونەر، ئایدیۆلۆژیا و بەرهەمە ئابوورییە نوێیەكەی ئەو زانست، فەلسەفە، هونەر، ئایدیۆلۆژیا و بەرهەمە ئابوورییەی دەربازكردووە كە دەرفەتی بە فەتحی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دا، سەركەوتنی ئەو رابوون و پێهەڵگرتنە دیاری دەكات. ئەوەش مانای مۆدێرنیتەیەكی نوێیە. بەڵام كۆمەڵگایەك كە لە كۆمەڵگایەكی نەریتی دۆڕاوەوە بەرەو سەركەوتن بچێت تەنیا لەمیانەی مۆدێرنیتەیەكی ئەلتەرناتیڤەوە كە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەربازبكات دەتوانێت لەتەنگژە دەربكەوێت و پێهەڵگرتنێكی سەركەوتوو ئەنجام بدات.

لەبەر ئەوەی كۆمەڵگای سۆسیالیستی بونیادنراو خۆی بەپێگەی مۆدێرنیتەیەكی جیاواز نەگەیاند هەڵوەشایەوە. نەیتوانی هەر سێ فاكتەرەكەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرباز بكات. نەك هەر تەنیا دەربازی نەكردن، بەڵكو لەرێگای سەرمایەداری بیروكراسیەوە بەشێوەیەكی زێدەڕۆ هەر سێ فاكتەرەكەشی بەكارهێنا. لەئاكامدا لەبەرئەوەی پشكی حەقیقەتی ئەو بونیادە كۆمەڵایەتییانەی ئاوایكردبوون لەپشكی حەقیقەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لیبرال لاوازتر بوون لە دۆڕان و هەڵوەشانەوە رزگاری نەبوو. ئەوەی لێرەدا لەبەرامبەر سەرمایەداری لیبرال دۆڕا سەرمایەداری بیروكراتیك بوو. وەك چۆن سەرمایەداری بیروكراسی خۆی وەك مۆدێرنیتەیەكی جیاواز بەرنامەرێژ و وێنا نەكرد، نەیتوانی خۆی بكات بەمۆدێرنیتەیەكی نوێی سەرمایەداریش كە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لیبرال دەرباز بكات. هەرچی بزووتنەوە ئیسلامگەرا دەوڵەتی و دەسەلاتخوازەكانن كە دەكرێ تەنیا وەك بزووتنەوە گومڕاكان پێناسە بكرێن، دیاردەگەلێكی گومڕان و بەهۆی پشكە حەقیقەتەكەیان كە لە سۆسیالیزمی بونیادنراو دواكەوتووترە هەر لەدۆخی ئایدیۆلۆژیدا لەدۆڕان رزگاریان نابێت. هەرچی ئەو بونیادە كۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژیانەن كە خۆیان وەك مۆدێرنبوونی نەریتی سوننی زانكۆی

ئەزهەری میسر و نەریتی شیعی مەدرەسەکانی شاری قوومی ئێران پێشکەش دەکەن، لەمیانەی ئەو پشکە حەقیقەتەی هەڵیانگرتووە بگرە بە سەرەتاکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لیبرالیش ناگەن. وێڕای ئەو هەموو هەوڵ و بەرخودانانەیان، تەنانەت ئەگەر بەرامبەر بە ئیسرائیلی ناوکی هەژموونگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆرئاواش ببن بەیەک دیسان لە دۆڕان رزگاریان نابێت. هۆکارەکەشی بۆ باڵادەستبوونی تەکنۆلۆژیا و چەکی ئەتۆمی ئیسرائیل ناگەڕێتەوە؛ لەدوا شیکاردا پەیوەندی بەپشکی حەقیقەتی رکابەرەکانەوە هەیە. ئەو پشکە حەقیقەتەی ئیسرائیل رێکیخستووە چەندین هێندەی کۆی پشکی حەقیقەتی بەرامبەرەکانێتی. ئەگەر هیچ گومانێکیش لەو نیازەیان نەبێت کە خۆیان وەک دونیایەکی جیاواز پێشکەش بکەن، بەڵام تەنیا ئەو کاتە مافی نوێنەرایەتیکردنی دونیایەکی جیاوازی هەیە کە لەبواری پشکی حەقیقەتدا دونیای سەرمایەداری مۆدێرن دەرباز بکات، بەمجۆرەش دەتوانێت بانگەشەی نوێنەرایەتی ژیانێکی کۆمەڵایەتی و مۆدێرنیتەیەک بکات کە پشکی حەقیقەتی بەرزترە. کاتێک ئەوە روونەدات بانگەشەی مۆدێرنیتەیەکی جیاوازتر جگە لە بانگەشەیەکی پووچ هیچی تر نییە. ئەگەر هەبێت و نەبێت دەشێت لقێکی نەریت بێت کە دەمامکێکی مۆدێرنی پۆشیوە. بەکورتی پێشکەشکردنی نەریتی کلتووری ئیسلام وەک مۆدێرنیتەیەکی جیاواز هەوڵێکی ئامادەکردنی کۆپیەکانی شاکارە کۆنەکان و فرۆشتنێتی کە هیچی لە ساختەکار و قۆڵبڕەکان جیاوازتر نییە. بەتایبەتیش ئەوجۆرە بانگەشەیەی دەسەڵاتی فەرمی ئێرانی ئەمڕۆ سەبارەت بە مۆدێرنیتە، بە دۆخی ئێستای جگە لە ساختەکاری هیچ مانایەکی دیکەی نییە و چانسی ژیان پێشکەش ناکات.

لەژێر رۆشنایی ئەو رەخنانەوە دەتوانین راستترین پێناسە بۆ مۆدێرنیتەی دیموکراتی بکەین کە لە یەکەمین بەرگرینامەی ئیمڕالی هەوڵی گفتوگۆکردنمان داوە. بەر لە هەموو شتێک پێویستە رەخنەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەرهەق بە سۆسیالیزمی بونیادنراو راست دەرکی پێبکرێت. ئەو رەخنە نە رەدکردنەوەی سۆسیالیزم و نە پەسەندکردنێکی دۆگماتیکانەیە، هەردووکیشیان نییە. وەک ئەزموونێک شیکاری دەکات و حەقیقەتی ئانتی ـ مۆدێرنیزمی سۆسیالیزمی بونیادنراو هەڵدەسەنگێنرێت، هەڵەکانی دەرباز دەکات، راستییەکانیشی پەسەند دەکات. شیکارێکی زانستی سەبارەت بە کلتووری باوی خۆرهەڵاتی ناوین دەکات، وەک گرنگترین سەرچاوە حەقیقەتەکەی دەکات بە هەنووکەیی. مۆدێرنیتەی دیموکراتیک تەنیا یۆتۆپیایەکی دەرهەق بە داهاتوو نییە. کۆڵەکەکانی زیاتر بە نەریتی کلتوری هەزارانساڵەوە قایمە. راستینەی هەنووکەیی ئەو کلتوورە، کۆمەڵگاکەیەتی. ئەو کۆمەڵگایە چەندە دووچاری دۆخێکی بێچارە کرابێت، بەڵام دیسان راستینەیەکە. لەبەر ئەوەی راستینەیەکە پشکێکی گرنگی حەقیقەتی هەیە، شیکارکردنی ئەو پشکە واتادار دەکات. پێویستە نەریت لەگەڵ موحافەزەکاری تێکەڵ نەکرێت. بەو سیفەتەی موحافەزەکاری چەقبەستنە خودی نەریتی کۆمەڵایەتی نییە، نوێنەرایەتی نەریتی زاڵی ژێرکەوتووە کە بەرامبەر لیبراڵیزم هەوڵی لەسەر پێ مانەوە

دەدات. ناتوانین باسی مۆدێرنیتەیەکی دیموکراتیک بکەین کە پێیەکانی بە نەریت قایم نەکردبێت. نەریتی کۆمەڵایەتی ڕاستینەی مێژوویی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکە. وەک چۆن کۆمەڵگایەکی بێ مێژوو جێگای باس نابێت، مۆدێرنیتەی دیموکراتی بێ مێژووش نابێت.

هەروەها پێویستە ڕەخنەی بزووتنەوەی فێمینستی و ئیکۆلۆژیەکانیش دەرهەق بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بێ بایەخ نەبینرێت. هەڵبەتە بەو سیفەتەی ئیکۆلۆژی زانستی ئەو ژینگەیەیە کە ئیندوستریالیزم کردوویەتی بە قوربانی، ئەویش ئانتی ـ سەرمایەدارییە، یەکێک لەسەرچاوە دەستلێبەرنەدراوە سەرەکییەکانی دیکەی مۆدێرنیتەی دیموکراتییە. پێهەڵگرتنی فێمینستی وێڕای سەرجەم کەموکوڕییەکانی بەڕادەی کۆمەڵگەکەی بۆ بزووتنەوەی ژن بەهادارە. خودی مۆدێرنیتەی دیموکراتیش بەتایبەتی ڕاستینەی ژن شیکار دەکات و خۆی دەکات بە حەقیقەت. لەپاڵ ئەوەشدا بەجۆرێک نزیک دەبێتەوە تا ڕەخنەکانی بزووتنەوەی فێمینستی بکات بە بەشێکی دەستلێبەرنەدراوی خۆی. کە دەڵێین بەش لەوانەیە لەجێگای خۆیدا نەبێت، ژنی ئازادیخواز وەک فاکتەرێکی سەرەکی ژیانیی تەڤلی سیستەمەکەی دەکات.

لەمیانەی گفتوگۆ و شەڕەکانی مۆدێرنیتەوە پێشبینی کردنی چارەنووسی مۆدێرنیتە لە کلتووری خۆرهەڵاتی ناویندا ئاسان دەبێت. سەرجەم هەوڵە شیکارییەکانی ئەنجامماندان پیشانیدەدات کە ئەو چارەنووسە لەخۆیەوە دەستنیشان ناکرێت. تەنیا لەمیانەی هێڵکاری و پلانەکانی مۆدێرنیتەیەکی ئەلتەرناتیڤی لە بانگەشەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەهێزتر دەرباز دەکرێت. ئەوەش شانبەشانی ڕەخنەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی سەبارەت بە فاکتەرە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، بە یەکانگیرکردنی ڕەخنەکانی سۆسیالیزمی بونیادنراو، کلتووری نەریتی، بزووتنەوە فێمینستی و ئیکۆلۆژییەکانی سەبارەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری - بەڵام توانای دەربازکردنیان نەبوو - بەمجۆرە دەتوانین هێزی چارەسەری فاکتەرە سەرەکییەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتی بخەینەڕوو. کاتێک سەرجەم ئەم باسانە لەسەر تەنگژەی کۆمەڵایەتی خۆرهەڵاتی ناوین جێبەجێ بکەین ئەوا دەتوانین پێشبینی ئەگەرەکانی چارەسەری بکەین.

أ)تیۆری نەتەوەی دیموکرات فاکتەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی دیموکراتییە بۆ چارەسەری. لەدەرەوەی تیۆری نەتەوەی دیموکرات تیۆرێکی دیکە نییە سەرلەنوێ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی کۆبکاتەوە - کە تیۆری دەوڵەت ـ نەتەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەک قەساب لەت و پەتی کردووە - و لەناو ئازادیدا بیانژێنێت. تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکانی دیکە لەبەرامبەر کێشەکانی ئەمڕۆماندا جگە لەڕۆڵێکی مارژینال و بێکاریگەر هیچ مانایەکی تریان نییە. تیۆرییە لیبراڵەکانی سەرمایەداری لەجیاتی چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشییە بۆماوەیی و شێرپەنجەییانەی سەرمایەداری تووشی مرۆڤایەتی کردووە و کۆمەڵگا بە تەندروستی خۆی بگەیەنێت، تەنیا لەڕێگای هەندێک دەرمانەوە دەتوانن تەمەنی نەخۆشەکە درێژ بکەنەوە. سەرجەم ئەو ڕێگەچارانەی ئەو

تیۆرییانە پێشنیازی دەکەن، کێشەکان گەورەتر دەکات و تۆزێکی تر تەمەنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری درێژتر دەکاتەوە. رووداوەکانی ئەم سەدەیەی دوایی ئەو داوەریەمان دەسەلمێنێت. کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین کە بەدرێژایی مێژوو، تەنانەت دەیان هەزارساڵ بەر لەئێستا لەمیانەی یەکێتییەکی کلتووری ژیانی خۆی بونیاد نابوو، لەناو گڕی ئاگری یەکەمین جەنگی جیهانیدا لەلایەن هێزەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە لەت و پەتکرا، خرایە ژێر بەزەیی ئەو جانەوەرانەی بە دەوڵەت ـ نەتەوە ناودەبرێن. دەوڵەت ـ نەتەوە بەو سیفەتەی بەرجەستەترین دۆخی لێویاتانە کە لەپەرتووکی پیرۆزدا هاوتای دەوڵەت ـ نەتەوە بینراوە، جگە لەوەی لەمیانەی درۆکانی بەناو سیاسەتی دەرەوە و ناوەوە راستییە کۆمەڵایەتیەکانی پارچەکردووە و قووتیداون هیچ رۆڵێکی دیکەیان نەبینیوە. ئەو شتەی بەکۆمەڵگای نەتەوەیی مۆدێرن ناوی دەبن جگە لە نەشتەرگەری پارچەکردن، نکوڵی و قڕکردنی کلتووری کۆمەڵایەتی یەکگرتووی مێژوویی شتێکی دیکە نەبوو. چەندە کلتووری کۆمەڵایەتی و مێژووییان پارچە کردبێت، دووچاری نکوڵی و قڕکرنیان کردبێت، بەو رادەیە خۆیان بەسەرکەوتوو داناوە. دەوڵەت ـ نەتەوەکانی رۆڵی قەسابەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەبینن، بەو رادەیەی لە نکوڵی و قڕکردنی رابردوودا سەرکەوتوو بن و دامەزراوە و سیخوڕەکانی سیستەم و زهنیەتە خۆرهەڵاتناسیەکەیان لەجێگایدا زاڵ کرد، بەرامبەر بەسەرداره نوێکانیان خۆیان بەسەرکەوتوو و بەختەوەر دەزانی. پارچەبوونەکانی ئەم سەدەیەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوە و کردەوەکانی بە سیاسەتی ناوخۆ و دەرەوە ناودەبرێن بەمانا گشتییەکەی سەبارەت بە کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین شاڵاوێکی قڕکردن بوو. ئەو دۆخەی لەبواری زهنیەتەوە تادەگاتە دونیای ئابووری دووچاری هاتوون، پارچەکردن و شکستپێهێنانی راستینەی یەکپارچە لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و گەیاندنێتی بە رەوشێک کە قووت بدرێت. تەنیا ئەو بوویەرانەی لە ئێراقی رۆژی ئەمڕۆماندا روودەدەن سەبارەت بە نرخاندنەکانمان دەرهەق بەسەدەی دوایی زۆر فێرکەر و وانەبەخشە.

بەرلەهەموو شتێک تیۆری نەتەوەی دیموکرات هێڵکاری و پلانی دونیای زهنیەتێکە کە بزاوتی لەت و پەتکردنی قەسابئاسای یەکێتی کلتووری دەوەستێنێت؛ واتە وەستاندنی دەوڵەت ـ نەتەوە و سەرلەنوێ دەستپێکردنەوەی هەمووێتی و یەکپارچەییە. تیۆری نەتەوەی دیموکرات لەژێر دەستەواژەی یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکان وەک پرەنسیپێک بەها و لەپێشینەیی بەیەکخستنەوەی دونیای کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین دەدات. دونیا کلتوورییەکەمان کە بەدرێژایی سەرجەم چاخە مێژووییەکانی بونیادنراوە بەهەموو جیاوازی و هەمەڕەنگییەکەیەوە یەکگرتوو و یەکپارچە بووە، وەک ئەلتەرناتیڤێکی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ناچارە لەژێر ئەو دەستەواژەیەدا بکرێت بەیەک. ئەگەر سەیرێکی سەدەی دوایی بکەین: ئەوا دەبینین کە گۆڕانکاری یان ئاراستەکان بەردەوام بەرەو پارچەبوون رۆیشتوون. قەومی عەرەب تەنیا بۆ بیست و دوو دەوڵەت ـ نەتەوە دابەش و پارچە نەکراوە، بەڵکو بۆ سەدان زهنیەت، رێکخستن، خێڵ و مەزهەبی ناکۆک و

دژ بەیەكتری دەوڵەت ـ نەتەوەی بەرایی دابەش دەكرێت. لەبواری كۆلۆنیكردندا ئەوەیە ئامانجی فەلسەفەی لیبرال. پۆتانسیێلی تاكگەرایی سەرمایەداری بۆ بەئەتۆمكردنی كۆمەڵگا بێكۆتایە. لەو سۆنگەیەوە؛ لەرێگای سەرلەنوێ یەكبوونەوەی ئازاد و دیموكراتیانەدا تیۆری نەتەوەی دیموكرات گوزارشت لە سەرەكیترین یەكێتی و یەكپارچەیی بە پرەنسیپ دەكات.

لەبەر ئەوەی لەبەرگەكانی دیكەدا تیۆری نەتەوەی دیموكراتمان شیكاركرد، هێندە ناوەڕۆكەكەی تاوتوێ ناكەین. بەكورتی ئەو تیۆرییە چەمكێكی نەتەوە بەبنەما دەگرێت كە بۆ بوون بە نەتەوە خاوەن چەمكی سنوورێكی سیاسی وشك نییە، لەهەمان شوێن و تەنانەت شارەكانیشدا دەرفەت بە نەتەوە جیاوازەكان دەدات لەمیانەی یەكێتییە هەمەڕەنگەكانەوە بەشێوەی جڤاتە نەتەوەییە باڵاترەكان بونیاد بنرێن. بەمجۆرەش جڤاتە نەتەوەییە مەزنەكان و بچووكترەكان و كەمینەكانی بەهۆی سنوورەكان لەگەڵ یەكتردا دەخرانە شەڕ و پێكدادانەوە لەناو هەمان یەكێتی و هەمووێتی نیشتمانیدا ئازاد، دیموكرات و یەكسانیان دەكات. تەنانەت بەتەنیا جێبەجێكردنی ئەو پرەنسیپە بۆ مایەپووچ كردنی سیاسەتەكانی "پەرتكە – زاڵبە"و "كەروێشك رابكە، تانژی بیگرە "ی سیستەمی هەژموونگەرایی بەسە. بەها ئاشتیخواز، ئازادیخواز و یەكسانیخواز و گەورەكەی ئەو پرەنسیپە، تەنیا بەو سیفەتانەیەوە لەمیانەی مایەپووچكردنی سەرجەم رەفتار و كردەوە شەڕانگێز، كۆیلایەتی و فاشیستییە سەرەڕۆییەكانی گەندەڵی دەوڵەت ـ نەتەوەكان رۆڵە باڵاكەی چارەسەركردن دەسەلمێنێت. تەنیا لەمیانەی زهنیەتی نەتەوەی دیموكراتەوە دەكرێ میللیگەرایی قۆرخكار و موتڵەقگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوە بوەستێنرێت. نەك تەنیا بۆ پارچەبوون و دابەشبوونی بێكۆتایی عەرەبەكان، گونجاوترین پرەنسیپ و تیۆرییە بۆ وەستاندنی پارچەبوون و دابەشبوونە هاوشێوەكانی توركەكانیش. دونیای توركیش كە لە بەلقانەكان تا قەفقاسیا، لە ئاسیای ناوینەوە تادەگاتە خۆرهەڵاتی ناوین لەچەندین دەڤەری جیهاندا دووچاری دابەشبوون و پارچەبوون هاتووە، بەشێوەیەكی كوێرانە خوداوەندی دەوڵەت ــ نەتەوە دەپەرستێت و لەسەر بنەمای زهنیەتی میتافیزیك و پۆزیتیڤیستانەی خۆرهەڵاتناسیەوە دەستیان لەبینەقاقای یەكترەوە ناوە، تەنیا لەمیانەی تیۆری نەتەوەی دیموكراتەوە دەتوانێت ئەو دۆخە دەرباز بكات و سەرلەنوێ لەچوارچێوەی پرەنسیپە دیموكرات، ئازاد و یەكسانەكان ببێتە یەك.

بۆ وڵاتێكی وەك ئێرانیش كە هەموو كاتێك پۆتانسیێلێكی گونجاوی دابەشبوون و پارچەبوونی هەیە دەوڵەت ـ نەتەوە وەك بۆمبێكی ئەتۆمییە كە لەژێری دانراوەتەوە. هەرچی میللیگەرایی شیعەیە كە بەردەوام دەوڵەت ـ نەتەوە وشكتر دەكات، وێڕای سەرجەم جامبازییەكانی دەرهەق بە مۆدێرنیتەوە، وەك چۆن ناتوانێت دابەشبوون و پارچەبوونی ئێران بوەستێنێت خێراتری دەكات. تیۆری نەتەوەی دیموكرات بەتایبەتی بۆ ئێران وەك دەرمانێك وایە كە رۆژانە بەكاری بێنێت. گەل و كلتووری ئێران كە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆڕاگر بووە، تەنیا زهنیەتی نەتەوەی دیموكرات دەتوانێت بەدونیایەكی

یەکسان، ئازاد و دیموکراتی بگەیەنێت کە بەدرێژایی مێژوو هەوڵی بۆ داوە. تیرۆر و پیلانگێڕیەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی شەڕانگێز مایەپووچ بکات و بە ئاشتییەکی شەرەفمەندانەی بگەیەنێت.

یەکێک لەکارەساتە هەرە گەورەکانی بنبەستبوونی دەوڵەت ـ نەتەوە ئەمڕۆ لەهێڵی ئەفغانستان ـ پاکستان لەئارادایە. هەروەها کێشەی کشمیریش کە گرێدراو بەو دۆخە لەئارادایە بەتەواوی سەرچاوەی خۆی لە دەوڵەت ـ نەتەوەوە وەردەگرێت. کێشەکانی پاکستان ـ هیندستان، پاکستان ـ بەنگلادیش وەک ئەنجامێکی هەمان زهنیەتی میللیگەرایی روویانداوە، تا ئێستاش روودەدەن. وەک پێویستییەکی سروشتەکەی ئاشتی و رێگەچارەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە بێچارەیی و شەڕ دەئافرێنێت. ئەو نموونە بەرجەستانەش بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا راستییەکە دەخەنەڕوو. ویستیان مۆدێلەکانی دەوڵەت ـ نەتەوەی کۆماری، پاشایەتی و سۆسیالیستی بونیادنراویش لە ئەفغانستان پەیڕەو بکەن. بەڵام ئەنجامەکەی کۆمەڵگایەکی ئەفغانستانە کە لە بەرگی خۆی دەرکەوتووە، لەناو هەلومەرجی توندوتیژییەکی کوێرانەی بێ پرەنسیپ دایە، هەڵوەشاوەتەوە و توانای بەردەوامکردنی نەماوە. جگە لە تیۆری و دەستەواژەکانی نەتەوەی دیموکرات زهنیەت و ئیرادەیەکی دیکە نییە کە دووبارە ئەو کۆمەڵگایانە کۆبکاتەوە و بە ژیانێکی دیموکراتیک و ئازادانەتریان بگەیەنێت. ئەگەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان لەبواری زهنیدا شیکار نەکرێن، لەبواری بونیادیشدا بەچارەسەری ناگەن. لە ئاسیای ناوینەوە تا هیندستان زهنیەتی نەتەوەی دیموکراتیک گونجاوترین چوارچێوەی یەکێتی گەلان و کلتوورەکانی پێکدێنێت کە خاوەن هەمەڕەنگییەکی دەوڵەمەندن. کەچی لە راستیدا گەل و کلتوورەکانی ئەو جوگرافیایانە بەدرێژایی مێژوو لەژێر چەتری سیاسی هاوبەشی لەجۆری کۆنفیدراڵ و ئیمپراتۆرییەتەکان ژیاون. ئەگەر ئایدیالیش نەبێت توانیویانە بوون و ئازادی خۆیان بپارێزن. ئەگەر بەشێوازی میللیگەرایی ئاینگەرایی بێت یان عەلمانی تا زهنیەتی دەوڵەت ـ نەتەوە بەردەوام بێت، ئەوا هەڵوەشانەوە و پێکدادانی زیاتری ئەو کۆمەڵگایانە دەستنیشانکراوە. کاتێک ئیسلامییەت ـکە بانگەشەی پەیوەستبوونی پێوە دەکەن ـ وەک ئایدیۆلۆژیایەکی تیرۆر پێشکەش دەکەن، چەندەی بڵێیی ئەو نەریتەش دەشێوێنن و خراپ پیشانیدەدەن. وەک بۆ ئێران ئاماژەمان پێکرد پێویستە سەرەتا یەکێتییە هەرێمییەکانی نەتەوەی دیموکراتیک لەو جوگرافیا بەرفراوانانەدا پێشبخرێت، بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ ئەویشدا یەکێتییەکانی نەتەوەی دیموکرات لەئاستی خۆرهەڵاتی ناوین پێشبخرێت. بەتایبەتیش باشترین و گونجاوترین ئەلتەرناتیف بۆ ئەو هەڵوەشانەوە بەرفراوانەی هەر لەئێستاوە دەوڵەت ـ نەتەوەی لە چەشنی پاکستان دووچاری هاتوون پرۆژەیەکی یەکێتی نەتەوەی دیموکراتیکە کە لە ئاستی خۆرهەڵاتی ناوین پێشدەخرێت.

سەبارەت بە واقیعی ئیسرائیلیش کە ناوکی هەژموونگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەیە تیۆری و دەستەواژەکانی نەتەوەی دیموکرات لەئاستێکی ژیانییدا رۆڵی چارەسەری

دەبینێت. دوو ڕێگا بۆ ئایندەی ئیسرائیل جێگای باسە. ڕێگای یەکەم؛ بەو ئامانجەی بە ڕێبازەکەی ئێستای درێژە بە هەژموونگەرایییەکەی بدات بەردەوام شەڕ بنێتەوە و ببێتە ئیمپراتۆرییەتێکی هەرێمی. وەک دەزانرێت ئیسرائیل پرۆژەیەکی هەژموونگەرایی لە نیلەوە تا فوراتی هەیە، تەنانەت دوورتریش دەڕوات. ئەو پرۆژەیە کە سەبارەت بەقۆناغی دوای ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی پێشخرابوو. هەرچەندە مەودایەک لە جێبەجێکردنی ئەو پرۆژەیە بڕابێت، بەڵام سەبارەت گەیشتن بە ئامانجەکەی هێشتا ناتەواوە. حیسابە هەژموونگەرا هاوشێوەکانی ئێرانیش کە لەو ماوانەی دواییدا لەبەرامبەری وەستاوەتەوە ڕێگای لەپێش گرژی نێوانیان کردۆتەوە. گرژییەکی هاوشێوەی لەگەڵ تورکیاش جێگای باسە کە ئاستی ڕاستی و جددییەتەکەی نازانرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ قۆناغێکی هەژموونگەرایی ناوچەکە جێگای باسە کە پڕ لەشەڕ و پێکدادان دەبێت. حیسابەکانی هەژموونگەرایی خودی لایەنەکان ئەو کێشانە دەئافرێنن کە سەرچاوەی خۆیان لە دەوڵەت ـ نەتەوە وەردەگرن و گەورەبوونیان دەستلێبەرنەدراوە. دووەمین ڕێگا بۆ ئیسرائیل و گەلی یەهودی؛ لەو ئابلۆقەیە دەربکەوێت کە دەوروبەی بە دوژمنان گەمارۆ دراوە، بەشداری پرۆژەی یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ببێت، لەسەر ئەو بنەمایەش لەپێناو پێهەڵگرتندا دەستپێشخەرییەکی ئەرێنی پێشبخات. سەرمایەی ماددی و ڕۆشنبیری پاشخانی ئیسرائیل دەتوانێت ڕۆڵێکی زۆر گرنگ لەپێناو پرۆژەی یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکان ببینێت. لەدۆخی نەتەوەیەکی دیموکراتدا هەم دەتوانێت خۆی بەهێز و تۆکمەتر بکات، هەمیش کاتێک ئەوەیان بخاتە چوارچێوەی یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکان کە لە ئاستی خۆرهەڵاتی ناویندا پێشخراوە ئەوا بەئاسایش و ئاشتیەکی هەمیشەیی دەگات کە پێویستییەکی زۆری پێیە.

گەورەترین کارەساتەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە ڕێگای بۆ خۆش کردووە سەبارەت بەو گەلانەی خۆرهەڵاتی ناوینە کە دووچاری کۆمەڵکوژی هاتوون. گەلانی کورد، سریانی، ئەرمەنی و هێلینی کە لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا کەوتنە دوای میللییگەرایی پێشوەختەوە، وێڕای نوێنەرایەتیکرنی کۆنترین کلتووره خۆجێییەکانی مێژوو، بەڵام ئەزموونەکانی سەدەی دوایی دەوڵەت ـ نەتەوە بەلێواری لەناوچوونی گەیاندن. سەرشێتی میللیگەرایی نەتەوە دەسەڵاتدارەکان بۆ ئافراندنی کۆمەڵگای نەتەوەیی هۆمۆژەن لەناو سنووره وشکەکاندا، سەبارەت بەو گەلانە بوو بە کارەساتێکی ڕاستەقینە. چەمکی میللیگەرایی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەبووایە ئەو کارەساتە مەزنانە ڕوویاننەدەدا. ئەوەی بژاری تورکی سپی ئافراندووە سەرمایەدارییە. بەرنامەکانی ئافراندنی نەتەوەی هۆمۆژەن (لێکچوو) لە پێویستی کەڵەکەکردنی سەرمایە دابڕاو نییە. وەک گرووپ تورکەکان نین کە پێویستە بە بەرپرسیاری کۆمەڵکوژییەکان دابنرێن، هەروەک لای ئەڵمانەکان ڕوویدا گرووپێکی مارژینال بوو کە سەردەمێک لەپای پیشەسازی میللییەوە بوون. نەک تەنیا میللیگەراکانی نەتەوەی دەسەڵاتدار، لەبەر ئەوەی جانەوەری دەوڵەت ـ نەتەوەیان بێدار کردۆتەوە میللیگەراکانی نەتەوەی ژێردەستیش بەرپرسیارێتییان هەیە. لەحاڵەتێکدا

دووبـاره زیندووکردنـەوەی ئەوانـە ئەستەمە کـە لـەناوبران تـەنیا زهنیـەتی نەتـەوەی دیموکرات دەتوانێ ئەوانەی تر لەسەر پێیان بهێڵێتەوە کە بەشێوەی کەمینە ماونەتەوە. بۆ نموونە؛ کاتێک ویستوویانە دەوڵەت ـ نەتەوەی تـورکی سپی لـە ئەستەنبۆل زاڵ بکـەن، فەرمانی مەرگ بۆ سەرجەم کلتوورە مێژووییەکانی شار دەرخراوە یاخود زەنگی مـەرگیان بـۆ لێـدراوە. لەمیانـەی تەسـفیەکردنی بـەردەوامی کلتوورەکـان ئـەوەی دەمێنێتـەوە ئەستەنبۆلێکی سپی یەک کلتوورییە، ئـەوەش جگـە لـە فاشیزمی کلتووری شتێکی دیکـە نابێت. هەرچی ئەو ئەستەنبۆڵەیە کە زهنیەتی نەتەوەی دیموکراتی تێدا دەژیت ئاشکرایە ئەستەنبۆلێکە لەناو دەوڵەمەندێتی کلتووری مێژووییدا.

دەکرێ لـەو روانگەیـەوە سـەیرێکی کلتـووری ئـەنادۆڵ و میزۆبۆتامیـا بکرێـت. تـەنیا زهنیەتی نەتەوەی دیمـوکرات دەتوانێـت سـەرجەم کلتـوورە مێژووییـەکان لـەناو ئاشـتی، یەکسـانی، ئـازادی و دیموکراسـیدا کۆبکاتـەوە. لەکاتێکـدا هـەر کلتوورێـک خـۆی وەک گروپێکـی نەتـەوەی دیمـوکرات بونیـاد دەنێت، لەلایـەکی دیکەشـەوە لەمیانـەی یەکێتییـە باڵاترەکـانی نەتـەوەی دیموکراتـەوە دەتوانێـت لەگـەڵ کلتوورەکـانی دیکـەدا بژیـت. دوای دەربازکردنی چەمکی یەک نەتەوە پێویستی بـە تواندنـەوەی یـەکتری نامێنێت. لـەجیاتی ئەوە وەک چۆن بەدرێژایی مێژوو روویداوە بەشێوەی یەکپارچەیی کلتـووری دەژیـن. ئیتـر بەگوێرەی ئەو راستییەی کـە ئەرمـەنی، هێلینـی و سریانییەکان سنوورەکانی دەوڵـەت ـ نەتەوە بۆ خۆیان ناکێشن و ناچاریشن بوونی خۆیـان بپـارێزن، ئاشکرایە کـە زهنیـەتی یەکێتی نەتەوەیی ـ نیشتمانی دیموکراتیک و بونیادی خۆسەری دیموکراتیانە گونجاوترین بژارە. ئەگەر درەنگیش بێت مۆدێرنیتەی دیموکراتی بەڵگـەی زهنیـەتی ئـەو گـەل و گروپـە کلتووریانەیە کە لە هەر چوار لای ناوچەکەوە دووچاری هەمان کردەوە هاتوون، هـەرچی خۆسەری دیموکراتیانەیە مۆدێلێکی گونجاوی دووبارە بەجەستەبوونە.

تەنیا پێکهاتە نەتەوەیی و ئەتنیکیەکان نین کە میراتێکی دەوڵەمەند پێکدێنن. ئایین و مەزهەبەکانیش چەترێکی بەرفراوانی گروپەکان پێکدێنن. نوێنەرایەتیکردنی ئەو رووخسارە نوێیانە کێشەیەکی بەهەندە کە ئایین و مەزهەبەکان بەشـێوە بـاو و مۆدێرنـەکانیان پێـی گەیشتوون. دەوڵەت ـ نەتەوە بەشێکی زۆری ئەوانەشی لەناوبرد. بەڵام ئیتر لەبەر ئەوەی خۆی بەسـەرچووە، تـەنیا دەشـێت لـەچوارچێوەی دەستەواژە و تیۆرییـەکانی نەتـەوە و خۆسەری دیموکراتیک ئەو میراتە دەوڵەمەندانەی کلتووری مێژوویـی گوزارشـت لـەخۆیان بکـەن. هـەم سـەبارەت بەپـەی پێبردنـی زهنیـەت هـەمیش بـۆ بونیادەکانیـان خۆسـەری دیموکراتیک گونجاوترین مۆدێلە. سەبارەت بە سەرجەم بوارەکانی هاوشێوەی کۆمەڵگای ـ مێژوویی کۆمەڵگای نەتەوەیی دیموکراتیک گەرەنتی یان زامنی ئاشتی، یەکسانی، ئازادی و ژیانی دیموکراتیکە لەبەرامبەر کارەساتی دەوڵەت ـ نەتەوەدا.

رەوشی کوردان تەواو کارەساتێکە کە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی خۆرهەڵاتی ناوین دابەشی کردووە، لە هەر پارچەیەکیش قڕکردن و ئاسیمیلاسیۆنی جیـاوازی بەسـەردا سەپێنراوە. یەکسەر ناتوانن بەتەواوی لەبواری جەستەیی یان کلتووری لەناوی ببەن. گەلێکە لەدونیا

نموونەیەکی دیکەی نییە. تەنیا لەبواری زهنیدا سەقەت نەکراوە، وەک جەستەش پارچە پارچەکراوە. زامداری کۆمەڵایەتی کراوە بەشێوازێکی ژیان. نە ژیانی نەریتی کۆن نە ژیانی مۆدێرن هیچ یەکێکیان لەئارادا نین. هەڵبەتە تا قۆناغی دوایش چانسی هەڵبژاردنی لەدەست دەرهێنرا بوو. بێگومان ئەو ڕەوشە سەرچاوەی خۆی لەو دەوڵەت ـ نەتەوە زاڵ و دەسەڵاتدارانە وەردەگرت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئاوایکردوون. هەرچی هەوڵەکانی کوردانە بەئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوەدا هەمان چانسی سەرکەوتنی بە دەست نەهێناوە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ بەرژەوەندییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا کۆک نەبووە چانس یاوەری نەبووە. هەرچی ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچکۆڵەیە کە ئەمڕۆ لە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) هەوڵی پێشخستنی دەدرێت لەنزیکەوە گرێدراوی حیسابە هەژموونگەرایییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچکۆڵەی کوردی لەوانەیە بەگوێرەی بەرژەوەندی سیستەم بێت. مەترسی لێرەدایە کاتێک سیستەم بڵێت:"بەگوێرەی بەرژەوەندی من نییە"، لەوانەیە هەرکات و ساتێک ڕێگا لەپێش قڕکردن و کۆمەڵکوژی نوێ بکاتەوە. لەبەر ئەوەی بەشی هەرە زۆری بەرگرینامەمان بۆ دیاردەی کورد، کێشەکەی و چۆنێتی چارەسەرکردنی تەرخانکردووە گونجاوترین مۆدێلی ڕزگاربوون لەو ستاتۆ یاخود بێ ستاتۆییەی سەرلەنوێ پێناسەمان کردووە نەتەوەی دیموکراتە. بەبێ ئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئێستا برووخێنێت، نەتەوەی دیموکراتیک و خۆسەری دیموکراتیک وەک زهنیەت و بونیاد لەمیانەی هاوبەشێتی بەڕێوەبەریشەوە دەرفەتی بەیەکەوە ژیان دەڕەخسێنێت. ڕژێمی دەستووری دیموکراتیانە لەو پێناوەدا پێویستە.

وەک ئەلتەرناتیڤێکی "کۆماری کوردستانێکی سەربەخۆ و یەکگرتوو" ئەو ڕێگایەی کوردان باوەڕیان پێهێناوە "کوردستانی کۆنفیدڕالی دیموکراتیکە" کە دەست بۆ سنووری ئێستا نابات. بە پێچەوانەوە ئەو سنوورانە دەکات بە بیانووی یەکێتی نەتەوەی دیموکراتیانەی خۆرهەڵاتی ناوین. چەندین گرووپی کلتووری و گەل بەشێوەی یەکینە فیدڕالییەکان دەتوانن خۆیان لەناو ئەو مۆدێلەدا ڕێکبخەن. لەهەمان هەرێمی خۆجێیی یاخود شاردا گرووپە ڕەگەزی، مەزهەبی، ئایین و ئەتنیکییە هەمەڕەنگەکان دەتوانن بەیەکەوە لەناو ئاشتی، یەکسانی و ئازادیدا بژین. کاتێک کوردستانی کۆنفیدڕالی دیموکراتیانە مۆدێلی نەتەوەی دیموکراتی خۆی پێشبخات، بەدڵنیاییەوە دەتوانێت یەکێتی و یەکینەی هاوشێوە لەگەڵ کۆمەڵگا دراوسێکانی هەر بەشێک ئاوابکات. ئەگەر پێکهاتەی هاوشێوە لە تورکیا، ئێران، ئێراق و سوریا پێشبخرێت، ئاشکرایە کە کوردستانی کۆنفیدڕالی دیموکراتیک دەبێتە ناوکی یەکێتی نەتەوەی دیموکراتیانەی خۆرهەڵاتی ناوین. هەردوو دیاردە ئەو چانسەیان هەیە بەشێوەیەکی تێکەڵ ئاوا بن. هەڵبەتە یەکێتی و هەمووێتی کۆمەڵگای ـ مێژوویی خۆرهەڵاتی ناوینیش ئەوە دەکات بە پێویستییەک.

لەبەرامبەر ئەوەشدا پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی مەزن چانسی سەرکەوتنی نییە کە ئەمریکا لەو ماوانەی دواییدا هەوڵی بەرۆژەڤکردنی دەدات. هەڵبەتە ئەو پرۆژە پشت بە دەوڵەت ـ نەتەوەکان دەبەستێت. چەندین پرۆژەی هاوشێوە خۆرهەڵاتی ناوینیان بەرەو

پشێوی زیاتر بردووە. ئەو دۆخەی پرۆژەی دوایش ڕێگای لەپێش کردۆتەوە جیاوازتر نەبووە. ئەگەر لۆژیکی دەوڵەت ـ نەتەوە دەرباز نەکات، هیچ پرۆژەیەک ناتوانێت خۆرهەڵاتی ناوین لەکێشە و تەنگژە قووڵەکانی رزگاربکات، لەشەڕ و پێکدادانەکان دووری بخاتەوە. ئەگەر ڕێکخراوی کۆمکاری عەرەبی بێت یان کۆنگرەی ئیسلامی لەبەر ئەوەی بەهەمان لۆژیکی دەوڵەت ـ نەتەوە ئیفلیج کراون، ڕۆڵی چارەسەرکردنی هیچ کێشەیەکیان نەبینیوە. زهنیەت و بونیادەکانی ئێستایان دەرباز نەکەن چانسی چارەسەریشیان نابێت. هەروەها شەڕەکانی زیادکردنی نفوز کە تورکیا و ئێران لەرێگای ئەلقاعیدە و حیزبوڵلا بەرامبەر ئیسرائیلی هێزی هەژموونگەرایی هەرێمی بەڕێوەی دەبەن جگە لەقووڵکردنەوە و بنبەستکردنی زیاتری کێشەکان هیچ ڕۆڵێکی دیکە نابینن. حیسابەکانی بەدەستهێنانی پشک لەوانەیە هەر ساتێک پێچەوانە ببێتەوە. ئەو دۆخەی سەرجەم یارییە کۆن و نوێکانی دەوڵەت ـ نەتەوەکان خۆرهەڵاتی ناوینیان پێکەیاندووە لەبەر چاوانە. ئەو دۆخەی خۆرهەڵاتی ناوین کە لەژێر ناوی" کێشە چارەسەر دەکەین، دیبلۆماسی سفر کێشە بەڕێوە دەبەین" کە کێشەکانی گەورەتر بووە و بووە بە گلۆڵەی کێشەکان، وەک بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا خستمانەڕوو بونیادییە و سەرچاوەی خۆی لە دەوڵەت ـ نەتەوە وەردەگرێت. وەک چۆن بەهەمان روونییەوە ئاماژەمان پێکرد زهنیەتی نەتەوەی دیموکرات و بونیادی خۆسەری دیموکراتیانەی مودێرنیتەی دیموکراتیک یەکسان، ئازادیخواز و دیموکراسیخوازترین مۆدێلی رزگاربوونە لەو دۆخە گێژاوە، پارادایمە نوێیەکەیەتی. مۆدێلێکە ڕێگای ئاشتی و ئاسایشی هەمیشەیی پێشانی هەرکەس و کۆمەڵگایەک دەدات.

ب) ئابووری کۆمۆنەی دیموکراتیک ڕێگای سەرلەنوێ بەدەستهێنانەوەی ژیانی مرۆییانەیە بۆ ئەو کۆمەڵگایەی مەیلی زۆرترین قازانجی سەرمایەداری کردوویەتی بە کۆیلە کرێکار و بێکارەکان. بەدرێژایی مێژوو ئابووری دیاردەیەکە لەرێگای کۆمۆن (هەرەوەزی )ەوە ئەنجام دراوە. ناشێت بەبێ کۆمۆن بیر لە ئابووری بکرێتەوە. تەنانەت ریشەی خودی وشەی ئابووری (ئۆکۆنۆمی) یش مانای "یاسای کۆمۆنی خێزان " ـە. واتە کارە هەرەوەزییەکانی بژێوی خێزانە. شێوازی پەیدابوون و ژیانی کۆمەڵگا بەتەواوی بەشێوەی کۆمۆنە. مێژوو نەبووە بەشاهێدی ئابوورییەک بە تاکەوە دەستی پێکردبێت. ئابووری تایبەت جانەوەرێکە کۆمەڵگا و مێژوو بەخۆیانەوە نەدیوە و دانیان پێدانەناوە و وەک دەوڵەت ـ نەتەوە ئەویش زادەی سەرمایەدارییە. لەبەر ئەوەی بەدرێژایی مێژوو ئابووری تایبەت و ئەوانەی بەدوای کۆکردنەوەی سەرمایەوەبوون بەدز دانراون و بێکاریگەر کراون، بەهۆی سزادانەوە خۆیان شاردۆتەوە. لەگەڵ هەڵکشانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وەک پۆلێنێکی نوێ کەوتۆتە بازاڕەوە. بە مشکێک دەچێت کە ماوەیەکی درێژ لەژێر خاک شاراوە بوو و دواتر وەک پشیلەیەک بکەوێتە بازاڕەوە. ئەوانەی بەدوای ئابووری تایبەت یاخود سەرمایەوە بوون بەدرێژایی مێژوو وەک دز دادگایی کراون و لەبەرچاو ونکراون. ئەو مشکە ـ پشیلەییانەی لەگەڵ هەڵکشانی هەژموونگەرایی

سەرمایەداری دەستیان بەسەر بازاڕ داگرت، بەراستیش بۆ کۆمەڵگای مرۆڤ بوون بەکارەسات. وەک چەسپاندنە راست و گونجاوەکەی براودلی مێژووناس، سەرمایەداری کە ئابووری نییە؛ قۆرخکارییەکە بەئامانجی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج دەست بەسەر بازاردا دەگرێت. ئەوانەی دەست بەسەر ئابووریدا دەگرن، جا ئەوانە قۆرخکاریەکانی دەوڵەت بن یان کەسایەتییەکان، دەرک بەو راستییە دەکەن کە بەو رادەیەی کۆمۆن واتە یەکەمین رێکخستن برووخێنن کە بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانی ژیان مرۆڤ پەنای بۆ بردووە دەتوانن دزیەکەی خۆیان ئەنجام بدەن. قۆرخکاری دەوڵەت یاخود تایبەت مانای تالآنکارییە بەسەر ئابووری هەرەوەزییەوە. ئەو تالآنکارییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەژێر هەزار و یەک دەمامکەوە ئەنجامی دەدات، مانای پووکاندنەوەی بناغەی کۆمۆن و کۆمەڵگایە. سەرجەم نەخۆشی و قەیرانە ئابوورییەکان بە هەڵوەشاندنەوە و رووخاندنی ئابووری هەرەوەزی دەستپێدەکات کە بناغەی کۆمەڵگایە. مێژووی سەرمایەداری مێژووی رووخاندنی ئابووری هەرەوەزییە. ئەنجام روودانی گەورەترین کارەساتی کۆمەڵایەتی مێژووە. هەڵوەشانەوە و دارووخانەکەی ئابووری هۆکاری راستەقینەی هەڵوشانەوە و دارووخانی تەواوی بواری کۆمەڵایەتی، ئەخلاق و سیاسەتە. هەڵوەشانەوەی ئابووری خودی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتییە. لەدۆخێکی وەهادا تەنیا پاشماوە بێکار، بێ ئەخلاق و بێ سیاسەتەکانی کۆمەڵگا دەمێننەوە. ئەوەیە قۆرخکاری دەوڵەتی و تایبەتی سەرمایەداری.

لەبەر ئەو هۆکارەیە کە لەو چوار سەدەی دواییدا، بەتایبەتیش لەسەردەمی سەرمایەی فینانسی رۆژی ئەمرۆماندا ئەو تەنگژە بونیادییەی بەلوتکە گەیشتووە لەساڵێکدا چوارسەد ملیۆن بێکاری لەجیهان ئافراندووە. هەڵوەشانەوەکەی کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین سەیر و بەرچاوترە. هەڵوەشانەوەی ژیانی کۆمیناڵ لەو پەنجا ساڵەی دواییدا رێگای لەپێش بێکاری سەرتاسەری کۆمەڵگا کردۆتەوە. لەهیچ سەردەمێکی مێژوودا کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین تا ئەو رادەیە هەڵنەوەشاوەتەوە. کەچی لە راستیدا کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناوین یەکەمین کۆمەڵگایە کە هەم ئابووری کۆمیناڵی داهێناوە، هەمیش تا قۆناغی هەژموونگەرایی سەرمایەداری لەئاستی دونیادا پێشەنگایەتی کردووە. ئەو تەنگژەیەی لەرۆژی ئەمرۆماندا دووچاری هاتووە هەمان مانای لەدەستدانی ژیانی کۆمۆنی هەیە کە نزیکەی سێسەد هەزار ساڵ بەر لە ئێستا ئافراندوویەتی. لەبەر ئەو هۆکارە مێژووییە دووچاری کارەساتێکی سەرتاسەری بووە. ئەنجامەکانی ئەو تەنگژەیە لەگەڵ هیچ یەکێک لەکارەساتە هۆڤێتییەکانی مێژوودا بەراورد ناکرێت. چونکە تەنانەت لە هێرشە بەربەریەکانیشدا بەردەوام ژیانی کۆمیناڵ مەرج بوو، هیچ کەسێک بیری لەوە نەدەکردەوە دەستی بۆ ببات. بۆ یەکەمین جار بەربەرییەتی سەرمایەداری بە ئیبلیسانەترین لۆژیکیەوە بیری لە هەڵوەشاندنەوەی کۆمۆن کردەوە و تێیدا سەرکەوت. ئەنجامەکەشی؛ شەڕەکانی ئەو چوار سەدەیەی دوایی، تالآنکردنی کۆلۆنییەکان، پەیڕەوکردنی کۆیلایەتی کرێی مۆدێرن بەسەر کۆمەڵگاوە کە زۆر لە کۆیلایەتی کلاسیک

خراپترە، لەوەش بێ بەزەییانەتر بێکارکردنی؛ لەدەستدانی یەکێتی ئەخلاقی و سیاسی؛ تێکدانی ژینگە و هاوسەنگی دونیای بایۆلۆژی؛ پووچکردن و خاڵیکردنی ژێر زەوی، پیسکردنی سەرزەوی؛ کارەساتەکانی کەشو هەوایە.

ئاشکرایە کە لەدەرەوەی ئابووری کۆمینالی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک ئەستەمە لەمیانەی هیچ ڕێگایەکی دیکە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو وێرانکاریانە سەربگرێت کە دەرەنجامی ستەمکاری ئابووری دەوڵەتی و لیبراڵی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارین. پێویستە وەک بەرنامە یاخود دۆزینەوەیەکی نوێ سەیری ئابووری کۆمۆن نەکرێت. ئابووری کۆمۆن پلان یاخود پرۆژەیەکی نوێش نییە. پێویستە وەک شێوازێکی ژیان یاخود حەقیقەتێک مایەی تێگەیشتن بێت کە کۆمەڵگای مرۆڤ بەبێ ئەو ناژیت. ئەگەر کۆمەڵگا داخوازی لەسەر پێ مانەوە و بەردەوامبوونی هەبێت، ناچارە ئابووری کۆمۆن بەبنەما وەربگرێت. گووتەی ناچارە، لەوانەیە یاساییبوونێکی وشک لەخۆوە بگرێت. بەڵام بەگوێرەی ئەوەی ژیان بەبێ ئابووری نابێت، ئابووریش بەبێ هەرەوەزی سەرناگرێت، ئەوا فەرمانی ناچاری کە لێرە بەکارهێنراوە لە جێگای خۆیدایە. نەک تەنیا لە خۆرهەلاتی ناوین، بەڵکو ئەگەر بمانەوێت لەتەواوی جیهان درێژە بەژیانی کۆمەلایەتی بدەین، ئەوا ناچارین ئابووری کۆمۆن بکەین بە سەرەکیترین بنەماکەی. دەڵێم سەرەکی؛ چونکە ناتوانین بەچەقۆ سەرمایەداری تایبەت و دەوڵەتی ببڕین و بەلاوەیان بنێین. لەکاتێکدا پێویستە وەک جاران مارژینال و بێکاریگەری بکەین، پێویستە کۆمۆن بکەین بەشێوازی سەرەکی.

هێندەی ئەوروپا و دەڤەرەکانی دیکەی جیهان کۆمەڵگای خۆرهەلاتی ناوین لەگەڵ سەرمایەداری ناگونجێت و لەگەڵیدا ئاشت نییە، پەسەندی نەکردووە. لەو سۆنگەیەوە؛ ڕیشە کۆمینەکانی بەهێزە. فاکتەری ئابووری هەرەوەزی و مۆدێرنیتەی دیموکراتیک کە لەمیانەی زانست و تەکنۆلۆژیای سەردەم بەهێزکراوە تەنیا بە مایەپووچکردنی کاریگەرییە پووکێنەر، ڕزێنەر و وێرانکارییەکانی سەرمایەداری ناوەستێت؛ بەڵکو بناغەیەکی بەهێز بۆ سەرلەنوێ بونیادنانەوەی تەواوی بوارەکان ئامادە دەکات. بەڵام لەو سەدەیەی دواییدا سەرمایەداری بە ڕادەیەک تاکەکانی مرۆڤی بەدۆخێکی بێکار، بەتاڵ و ئانتی ـ کۆمەلایەتی گەیاندووە کە لەپێناو سەرلەنوێ جێگیرکردنی لەسیستەمی ئابووری کۆمینال پێویستی بە شۆڕشێکی کۆمەلایەتی ڕاستەقینە هەیە. تاکخوازی یاخود تاکگەرایی لیبرال نەخۆشیەکە هێندەی شێرپەنجە مەترسیدارە. تەنیا کاتێک بەشێوەیەکی تایبەت چارەسەری بکەین دەتوانین ئەقلی ژیانی کۆمینالی بکەین. زهنیەت و پەروەردەی ئەخلاقی ڕۆڵێکی مەزن لەوەدا دەبینێت. بەڵام کاتێک بەرەو ئابووری کۆمینال دەڕۆین، بەبایەخەوە پێویستە ئاگاداربین و تێبگەین کە بەبێ سیاسەتی دیموکراتیانە بونیادنانرێت و پێداویستییەکانی جێبەجێ بکەین. هەروەها ناکرێ ڕەهەندی ئەخلاقیش پشتگوێ بخرێت. بەکورتی؛ سەرلەنوێ بونیادنانەوەی ئابووری کۆمۆن پێویستی بە پەروەردەیەکی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و ئەخلاقی زۆر هەیە.

کاتێک باسی ئابووری کۆمۆن دەکەین، پێویستە تەنیا سەبارەت بەچەند بوارێک سنوورداری نەکەین، بەڵکو لە کشتوکاڵەوە تا پیشەسازی، لەخزمەتگوزارییەوە تا زانست و سەرجەم بوارەکانی پیشەکاری بیری لێبکرێتەوە. ئابووری کۆمۆن سیستەمێکە هێندەی گوند پێویستە لەشاریش پێشبخرێت. تەنانەت ئابووری لادێ ــ شاریش تەنیا لەچواردەوری ئابووری کۆمۆنەوە پێشدەخرێت کە پێویستە وەک ئەلتەرناتیڤی ئابووری شار و کشتوکاڵ ـ لادێیی ئاوابکرێت کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری وێرانی کردووە و کردوویەتی بە شێرپەنجەیی. ئابووری کۆمۆنی هاوچەرخ بە قورسایی ئابوورییەکی گوند ـ شارە. پێویستە بەهەڵە دەرک بە ئابووری گوند ـ شار نەکرێت. ئەوە مانای بەشارکردنی گوند و وەرچەرخانی شار بۆ گوند نییە، هەردووکیشیان نییە. پێویستە ئابووری گوند ـ شار وەک یەکە یاخود یەکێتی هاوچەرخی کۆمەڵگای کۆمۆن مایەی تێگەیشتن بێت. هەڵبەتە مەیلی زاڵ لەمێژوودا خەسڵەتی گوند ـ شاری هەیە. جیابوونەوە گومڕاکەی گوند و شار گرێدراوی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە. سەرجەم ئەو ئابوورییانەی بەدرێژایی مێژوو لەکەناری رووبارەکانی لەسەرووی هەمووشیانەوە لە کەنارەکانی فورات، دیجلە، نیل و پەنجاب ـ هیندۆس ئاواکران هەمووی کۆمیناڵە. هەڵبەتە هەر ئەو ئابوورییە کۆمیناڵانەن کە دەرفەتی سەرهەڵدانی ئەو شارستانیانەیان رەخساندووە. سیاسەتی بەنداوەکان کە سەرمایەداری لەچوارچێوەی مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجەوە پێشیخستووە، تەنیا بە وێرانکردنی ئابووری گوند رانەوەستاتەوە کە بەهۆی ئەو سیاسەتەوە وشکی کرد، بەڵکو بەپیتترین زەوییە کشتوکاڵییەکان، رووپۆشی رووەکی، جۆرەکانی ئاژەڵ و جوانترین شارەکانی دونیای ئارکۆلۆژیشی قووت دا. بەڕادەی کۆمەڵکوژی کۆمەڵایەتی قڕکردنی ئیکۆلۆژی و ئارکۆلۆژیشی ئەنجام دا. تەنیا ئابووری کۆمۆنی پەیوەست بە سیاسەتی دیموکراتیانە دەتوانێت رووبەڕووی ئەو هەموو وێرانکاریانە ببێتەوە.

ئایدیۆلۆژیا و سیاسەتە شۆڕشگێڕییەکان بەشێوەیەکی زۆر کەم و سنووردار باسی ئابووری کۆمۆنیان کردووە. بەتایبەتیش کاتێک سۆسیالیزمی بونیادنراو سەرمایەداری دەوڵەتی بە سۆسیالیزم داناوە رێگای لەپێش کارەساتی مەزن کردۆتەوە. بەو رادەیەی سۆسیالیزمی تێکداوە ئابووری کۆمیناڵیشی لەرۆڵە راستەقینەکەی خۆی بێبەش کردووە. لەژێر ناوی کۆلەکتیفیزم (دەستەجەمعی) ەوە لەمیانەی سەرمایەداری دەوڵەتەوە گەورەترین کۆمەکی پێشکەش بە سەرمایەداری کردووە. هێندەی رەدکرنەوەی ئابووری تایبەت پێویستە ئابووری کۆمۆن ئابووری بەدەستی دەوڵەت، بەمانایەکی تر ستەمکاری ئابووریش رەدبکاتەوە. بەتایبەتیش پێویستە قۆرخکاری دەوڵەت وەک تێکچوونی دەستەجەمعی کۆمۆن هەڵسەنگێنێت و لەژێر هەر هەلومەرجێکدا لەبەرامبەری تێبکۆشێت. هەروەها پێویستە ئەو خاڵانەش زۆر بەباشی بزانرێت؛ سەرمایەداریش لەرۆژی ئەمڕۆماندا هەوڵدەدات بەرەو جۆرێک لە کۆمۆنەکانی سەرمایەداری بگۆڕێت کە لە گروپە کۆمپانیاکان پێکدێت و لەلایەن "CEO" پرۆفشیۆناڵەکانەوە بەڕێوەدەبرێت. هەوڵدەدات ئەو پرۆسەیە

لەهەر بوارێکدا جێبەجێ بکات. پێویستە وەک یەکێک لە تەڵەزگە گرنگ و مەترسیدارەکانی سەرمایەداری لیبرال هەڵبسەنگێنرێت. سەرمایەداری بە سیفەتی کۆمپانیاکان کە خۆی بەگوێرەی قاڵبەکانی شێوازی کۆمۆن گونجاندووە، بەو فۆرمەیەوە زیاتر دوژمنی کۆمەڵگا و ئابووری کۆمۆنە. هەرچەندە لەرووکەشدا سەرمایەداری بانگەشەی دەربازکردنی فۆرمە کۆنەکانی کۆمەڵگا بکات، بەڵام لەخۆڕێکخستن بەشێوەی کۆمەڵگای قەبیلەیەک دواناکەوێت. بەجۆرێک لەجۆرەکان قەبیلەگەرێتی و کلانگەرێتی مۆدێرن ئەنجامدەدات. چونکە لەبنەڕەتدا کۆمەڵگا لەسەر ئەو بناغە ئاوادەکرێت کە کلان و قەبیلە، واتە یەکینەکانی کۆمەڵگای کۆمیناڵ پێکدێنن. بەڵام مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەناوەڕۆکدا خۆی لەسەر نکوڵیکردنی فۆرمە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان وێنا و ئاوادەکات. کاتێک ئەوەش ئەنجامدەدات لە گونجاندنی قاڵبە کۆنەکان بەگوێرەی خۆی دواناکەوێت.

لەبەر ئەوەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەگوێرەی قۆرخکاریەکانی سەرمایەداری شێوەی گرتووە، نایەوێت دان بە ئابووری کۆمۆن دابنێت. بەمانایەکی تر وەک قۆرخکاری ئەویش خوازیارە بەسەریدا زاڵ بێت. دەوڵەت ـ نەتەوە ژیانی کۆمیناڵی خۆرهەڵاتی ناوین هەڵدەوشێنێتەوە و بەکۆسپی بەردەمی خۆی دادنێت. کۆمەڵگا نموونەییەکەی دەوڵەت ـ نەتەوە کۆمەڵی ئەو مرۆڤە کۆیلانەیە کە سەرجەم ناسناماکانی دەستەجەمعی و کۆمۆنی مێژوویی لەدەستداوە، بێ ناسنامە و بێ کەسایەتییە و بەچەشنی مێروولە کاردەکات. لە راستیدا لەسەر بنەمای ئەو کۆمەڵبوونە کۆمەڵگا لەناوبراوە. کاتێک فەیلەسوفی وەک نیچە و فۆکۆ دەڵێن:"کۆمەڵگا یاخود مرۆڤ لەلایەن مۆدێرنیتە کوژرا" خوازیارن باسی ئەو راستییە بکەن. کۆمەڵگای کۆمەڵی پێکهاتوو لە تاکە بێ کەسایەتی و بێ ناسنامەکان کە لەگەڵ پووکاندنەوەی کۆمەڵگای کۆمۆنی خاوەن کەسایەتی و ناسنامە ئاوادەبێت تایبەت بە مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییە و شێوەی هاوڵاتی دەوڵەت - نەتەوە پێکدێنێت.

سەرجەم ئەو نەریتانە بەهادارن کە بناغەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پێکدێنن و هەڵگری ناوەڕۆکێکی مێژوویین. هاوکاری و ئابوورییەکانی کۆمۆن کە لەسەرووی ئەوانەوە دێن رۆڵی یەکینەی سەرەکی دەبینن. ئابووری کۆمۆن یەکینەی سەرەکی نەتەوەی دیموکراتیشە. وەک چۆن قۆرخکاریەکانی ستەمکاری یەکینە سەرەکیەکانی چەوسانەوەی ئابووری دەوڵەت - نەتەوەن، یەکینەکانی ئابووری کۆمۆنیش یەکینەی سەرەکی ژیانی ئابووری نەتەوەی دیموکراتن. نەتەوە و مۆدێرنیتەی دیموکراتیک لەسەر ئابووری کۆمۆن بەرز دەبنەوە. پێویستی بەروونکرنەوەیەکی زۆر بۆ ناوەڕۆکی ئابووری کۆمۆن نابینین. لە کۆمۆنی بنەماڵەیەکەوە تا دەگاتە نەتەوەیەکی دیموکرات بەگوێرەی پێویست دەکرێ یەکینەی قەبارە گەورە و لەژمارە نەهاتوو بونیاد بنرێن. کۆمۆنە نموونەییەکانی کشتوکاڵ و کارگەش لەسەرووی هەموویانەوە دێن. هەروەها کۆمۆنەکانی پەروەردە، تەندروستی، گەیاندن و کۆپەراتیفی فرە ئامانج سەرەکیترین شێوەکانی کۆمۆنن. ئەوەی گرنگە دەستنیشانکردنی پێشوەختی کۆمۆنەکان نییە، بەگوێرەی پێویستی و رۆڵەکەی هەمووجۆرە یەکینەیەکی کۆمیناڵ بە ناوەڕۆک و چەندایەتی گونجاو بونیاد بنرێت، هیچ

تاکێک بەبێ کۆمۆن نەمێنێت. نەتەوەی دیموکرات ئەو نەتەوەیە کە سەرجەم ئەندامەکانی لەناو کۆمۆنەکان ڕێکدەخات و ئەرکداریان دەکات. وەک چۆن ناکرێ تاکی بێ کۆمۆن لەو سیستەمە لەئارادابێت، ئەگەر هەشبێت واتە نەخۆشە و تووشی هەرەس و داڕووخان دەبێت. ئەرکی سەرەکی تاکەکانی نەتەوەی دیموکرات، بەتایبەتیش ئەندامە بونیادنەرەکانی، مسۆگەر سەرجەم ئەندامەکانی بکەن بە خەباتکارێکی چالاکی کۆمۆنێک یان چەند کۆمۆنێک.

کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوینی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەو ڕادەی لەهەر بوارێکدا کۆمۆن ئاوابکەن، لەسەرووی هەمووشیانەوە کۆمۆنە ئابوورییەکان، دەتوانن لەو تەنگژە قورسانە ڕزگاربن کە دووچاری هاتوون. ڕزگاربوون بەبێ کۆمۆن نابێت. نەریتە مێژوویی و کلتوورییەکان تەنیا لەمیانەی ژیانی کۆمۆنەوە دەتوانن جێگای خۆیان لە هەنووکەدا بگرن و بەردەوامی بەبوونی خۆیان بدەن. لاسایی نەریت ناکرێتەوە، بەڵام بەبێ پشتبەستن بە نەریتیش ژیان نابێت. تەنیا کاتێک نەریت لەمیانەی بەهاگەلێکی ئافرێنەرانە تێرخۆراک بوو کە پشت بە نکوڵی و لاساییکردنەوەی نەریت نابەستێت، ئەوا ژیانی کۆمەڵگای مێژوویی بە واتا ڕاستەقینەکەی خۆی دەگات. نەریتی ئابووری کۆمیناڵ ڕۆڵی سەرەکی لەوەدا دەبینێت. کۆمۆنە ئابوورییەکان بۆ سەرجەم وڵاتان پێویستە. ڕێگای بەربەستکردنی بێکاری و هەڵوەشانەوەی کۆمەڵایەتی گوزەرکردنە بۆ سەردەمی خەباتی کۆمیناڵ. بەتایبەتیش لەسەر بنەمای زهنیەت و ڕێکخستنی نوژەنی کۆمۆن گەڕانەوە بۆ گوند و کشتوکاڵ هێزاترین خەباتی شۆڕشگێڕییە. شۆڕشگێڕی ڕاستەقینە جێگیرکردنی ئافرێنەری بوونی مێژووییمان، واتە جێگیرکردنی ژیانی کۆمیناڵە لەسەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگادا، لەسەرووی هەمووشیانەوە بواری ئابووری. وەک چۆن فیدراسیۆن و خۆسەری دیموکراتیک ڕێکخستن و دامەزراوەبوونی ژیانی سیاسی نەتەوەی دیموکراتە، ئەوا فیدراسیۆنی یەکینەکانی ئابووری کۆمیناڵیش ڕێکخستن و دامەزراوەبوونی ژیانی ئابوورییە. فیدراسیۆنی یەکێتیەکانی ئابووری کۆمیناڵ لەئاستی خۆجێیی، نیشتیمانی و هەرێمی گوزارشت لەبناغەی ئابووری یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین دەکات. یەکینە ئابوورییەکانی ئیسرائیلی ناوکی هێزی هەژموونگەراییە کە بە کیبوتز ناودەبرێت لێکچوونی لەگەڵ ئابووری کۆمۆن، باڵابوونی ئابووری کۆمیناڵ دەسەلمێنێت. ئەگەر نیازی دەربازکردنی هەژموونگەرایی دەوڵەت ـ نەتەوەی ئیسرائیل لەئارادا بێت، ئەوا جگە لەگوزەرکردن بۆ ئابووری کۆمیناڵ هیچ ڕێگایەکی دیکە نییە. هەروەها ڕێگای ڕزگاربوون لە هەژموونگەرایی سەرمایەداری جیهان و هەرجۆرە چەوسانەوەیەکی قۆرخکارانە بەئاواکردنی ئابووری کۆمیناڵی نوێدا دەرباز دەبێت کە بناغەی ماددی یەکسانی، ئازادی و دیموکراسییە.

ژیانی ئابووری کۆمیناڵی نوژەن تاکە ڕێگای ڕزگارییە بۆ ئەو نەریتە ئابوورییە کۆمیناڵیانەی بە زەحمەتیشەوە بێت لە کوردستان هەوڵی لەسەر پێمانەوە دەدەن؛ هەروەها بۆ ئەوانەی بەهۆی پووکانەوەی کۆمەڵگا لەلایەن دەوڵەت ـ نەتەوە و پێکهاتنی

کۆمەڵی بێکاران، کۆیلایەتی کرێی هەرزان کەرامەت و مانای ژیانیان لەدەستداوە. تەنیا ئەو خاکانەی کە کۆمەڵگا و مێژووەکەیان بە کۆمۆن پێکهاتووە لەمیانەی ئابووری کۆمیناڵ و پیشەسازی ئیکۆلۆژی مۆدێرنیتە و نەتەوەی دیموکراتیکەوە گەورەترین شۆڕش لە بەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری، دەوڵەت ـــ نەتەوە، تالانکاری ئیندوستریالیزمەکەی و کردە وێرانکاریەکانی زۆرترین قازانج، ئەنجام بدات. بەمجۆرە لەناو کۆمەڵگایەکی یەکسان، ئازاد و دیموکرات دەبن بە مەیدانێک ژیانێکی ئارام، سەرفراز و جوانی تێدا بەدیبێت.

ج) سێیەمین فاکتەری ڕێگەچارەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پیشەسازی ژینگەدۆستە لەبەرامبەر ئیندوستریالیزمی سەرمایەداری. دەکرێ ئیندوستریالیزم بەشێوەی بەکارهێنانی سنوورنەناسانەی تەکنۆلۆژیا لەپێناو سەرخستنی مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج لەلایەن سەرمایەدارییەوە پێناسە بکرێت. وەک چۆن مەیلی بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج بەسیفەتی ئامرازی زۆرترین دەسەڵات سەرلەنوێ دەوڵەتی بەشێوەی دەوڵەت ــ نەتەوە ڕێکخستەوە، ئامادەباشی و توانای تەکنۆلۆژیشی بەشێوەی ئیندوسترالیزم ڕێکخست کە گوزارشت لە بەکارهێنانی لەپێناو زۆرترین قازانج دەکات. مەترسی بنەڕەتی ئیندوستریالیزم لەوەدایە کۆمەڵگای خاوەن دونیایەکی زیندوو و سۆزدار بۆ گۆڕستانی ئامێرەکان دەگۆڕێت، کۆمەڵگا دەکات بە ڕۆبۆت. سنوور بۆ ئیندوستریالیزم دانەنرێت، هیچ کۆمەڵگایەک ناتوانێت لە دونیایەکی هەست و سۆزی تەندروستانە درێژە بەژیانی خۆی بدات. بەئامێرکردنی کۆمەڵگا، دوای ماوەیەکی دیار بۆ وێرانکردنی کۆمەڵگا دەگۆڕێت. ئەو ڕووەی سەرمایەداری کە لەشەڕیش مەترسیدارترە، مەیلی گەیاندنی ئیندوستریالیزمە بەبەرزترین ئاست. هەر لەئێستاوە دونیا لەژینگە سروشتەکەی دابڕاوە و بووە بە دیلی شار و ئامرازە وەهمیەکان. ئەوە ئیندوستریالیزمە کە دەرفەتی گەورەبوونی شێوازی شێرپەنجەییانەی شاری ڕەخساندووە. شارەکان بوونەتە ئەو جانەوەرانەی هەسارە زیندووەکەمانیان قووتداوە. وێڕای ئەوەی شارە ملیۆنی و دە ملیۆنییەکان هیچ مانایەکی کۆمەڵایەتیان نییە و سەرچاوەی خۆیان لەهیچ پێویستییەکەوە وەرناگرن، تائێستاش گەورەبوونە شێرپەنجەییەکەیان لەنەخۆشی زیاتر هیچ واتایەکی دیکەی نییە.

گرێدراو بەمەشەوە تەنیا ئەو ڕووداوانەی ئامرازەکانی هاتووچۆ ڕێگایان لەپێش کردۆتەوە لەمێژە ئاماری شەڕەکانیان دەربازکردووە. بەهۆی ژاوەژاو و پیسکردنی هەوا و تێکدانی جەستەی مرۆڤ، لەمێژە لەدۆخی ئامرازگەلێک دەرچوون ئاسانکاری بۆ گواستنەوە بکەن. ئامرازەکانی گەیاندنی وەهمی، بینراو و بیستراو بەو سیفەتەی بوارێکی دیکەی سەرەکی ئیندوستریالیزمە مرۆڤایەتی لە حەقیقەت دابڕیوە و کردوویەتی بە هۆگر و ئالوودەی دونیایەکی وەهمی. کۆمەڵی ئەو تاکانەی لەسەر بنەمای دابڕان لە حەقیقەت ڕایەڵەیان لەگەڵ کۆمەڵگا لەدەستداوە، گوزارشت لە ئەتۆمبوونی کۆمەڵگا دەکات. ئەو کۆمەڵانەی هەڵوەشاونەتەوە و خەسڵەتی کۆمەڵگایان لەدەستداوە لەگەڵ

پیشەسازی ئامرازەکانی شەڕ، لەمێژە ئەو ئاستەیان دەربازکردووە کە مرۆڤایەتی و ژینگەکەی قووت بدەن. بەو سیفەتەی مرۆڤ بوونێکە لەمیانەی ژینگەکەیەوە دەژیت و پەیدا دەبێت، بە مانا ئیکۆلۆژییەکەیەوە لەگەڵ چەندین زیندەوەری دیکەی دوروبەرییەوە ـ رووەک و دارستانیشی لەناودا ـ لەلایەن ئیندوستریالیزمەوە قووت دەدرێت. بێگومان لەبەرامبەر مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و ئامرازەکانی ئیندوستریالیزم کە بۆ تەواوی جیهان بوونەتە ئامێر و ئامرازەکانی وێرانکاری، هەڵوێستی مۆدێرنیتەی دیموکراتی سەبارەت بە پیشەسازی تەواو ژینگەپارێزە. ئەو پیشەسازییەی ژینگەپارێز نییە بەلانی کەم هێندەی سەرمایەداری و دەوڵەت ـ نەتەوە ئامرازی رووخاندنی کۆمەڵگایە. هەڵبەتە لەپێناو پراکتیزەکردندا فاکتەرەکانی نەتەوەی دیموکرات و ئابووری کۆمیناڵی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک لە تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی بێبەش نابن. بەپێچەوانەوە ئەو مۆدێرنیتە و فاکتەرەکانی پێشخستنی زانست و تەکنۆلۆژیا و بەکارهێنانیان لە پیشەسازیدا دەکاتە پێویستییەک. لێرەدا مانا بنەڕەتیەکەی پیشەسازی بۆ مرۆڤ دەکەوێتەڕوو. بەشێوەیەکی گشتی بەو رادەیەی پیشەسازی کۆمەک بەبوونی کۆمەڵگا، لێهاتوویی سیاسی و ئەخلاقییەکەی، گەشەکردنی ئابووری و دیموکراسیەکەی بکات بەهادارە. بێگومان دەستنیشانکردنی بڕی کۆمەکەکە سەرەکیترین ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی سیاسی و ئەخلاقییە.

هەرچەندە کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین تائێستا دووچاری هەمان ئەو وێرانکاریانە نەهاتبێت کە وڵاتە شارە گەورەکان (مەترەپۆلەکان) لەلایەن ئیندوستریالیزمی سەرمایەدارییەوە تووشی هاتوون، بەڵام بەهۆی تایبەتمەندییەکانی وێرانکردنی ژینگەیی سیستەمی شارستانی ناوەندی و کۆمەڵگای نیولیتیکی پێشووتر، لەو لایەنەوە دووچاری وێرانکاریەکی درێژخایەن هاتوون. پێگەی لانکەی پێنج هەزار ساڵەی شارستانی ناوەندی، رێگای لەپێش ئاستێکی بەرزی وێرانکاری کردۆتەوە. نەهێشتنی دارستان و بێ دارستانکردن لەئاستێکی زۆر لەپێشدا ئەنجامدراوە. ئەو دەڤەرەی سەردەمانێک بەهەشتی رووەک و ئاژەڵان بوو، ئێستا بووە بە دۆزەخیان. ناوچەکە لەدۆخێک دایە کە زۆرترین پێویستی بە ژیانی ئیکۆلۆژی هەیە. پیشەسازییەکی ئیکۆلۆژی سەرتاسەری لەوانەیە سەرلەنوێ ناوچەکە بۆ بەپیتییەکەی جارانی بگەڕێنێتەوە.

کێشە کۆمەڵایەتییەکان خەسڵەتێکی بەمجۆرەیان هەیە: لەکوێ کێشەکان سەخت بووبن، رێگاکانی چارەسەریش لەوێدا بەو رادەیە پێگەیشتووە. ناشێ کێشەی بێ چارەسەری هەبێت. هەلومەرجەکانی شوێن و کاتی دەرکەوتنی کێشەکان لەگەڵ خۆیدا هەڵگری هەلومەرجەکانی چارەسەریشە. هەروەک تەواوی جیهان لە خۆرهەڵاتی ناوینیشدا پرەنسیپی چارەسەری ئیکۆلۆژی بەدۆخێک گەیشتووە کە بەلانی کەم هێندەی شۆڕشە سیاسیەکان گرنگییان بۆ چارەسەری هەیە. لەو بارەشەوە ئیسرائیل نموونەی سەرکەوتوو پێشکەشدەکات. باڵابوونی زانستی و تەکنۆلۆژی خۆی لەبواری پیشەسازی ژینگەپارێزدا بەکاردێنێت، تەنانەت لەبیابانەکانیشدا دەوروبەرێکی ژیانی بەهەشتیانە دەرەخسێنێت.

ئەو پیشەسازییە ئیکۆلۆژییەی لەگەڵ ئابووری کۆمۆن لەتەواوی وڵاتانی ناوچەکە بەکاردەهێنرێت دەرفەتی سەرلەنوێ بونیادنانەوەی ئازاد، یەکسان و دیموکراتییانە دەڕەخسێنێت کە کۆمەڵگا پێویستییەکی زۆری پێی هەیە. لەجیاتی ئیندوستریالیزم گەشەپێدانی ئیکۆلۆژی لەپێشترین و راستەقینەترین پێویستییە. لەکاتێکدا وڵاتە گەشەکردووەکانی ئەورووپا پیشەسازییە نائیکۆلۆژیەکانیان لەمیانەی پیشەسازی ئیکۆلۆژیک جێگیر دەکەن، دابینکردنی ئۆتۆمبێل، جلوبەرگ و گەشتوگوزاریان تەنیا کێشە کۆمەڵایەتییەکان قورستر دەکاتەوە. لەو رێگایەوە سەرمایەداری ئامرازەکانی وێرانکردنی مرۆڤایەتی جیهانگیری دەکات. ژێرخانی تەکنۆلۆژی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک ناچارە ئیکۆلۆژیک بێت. ئابوورییەکی ئیکۆلۆژی کۆمیناڵ کە بێ گوزەرکردن بۆ ئیندوستریالیزم یان نکوڵیکردنی پیشەسازی پێشبخرێت، دەبێتە هێزی تەواوکەر و پتەوکردنی ژیانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک و نەتەوەی دیموکرات.

کوردستان کە وڵاتێکە سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم تێیدا لاوازە، لەدۆخێک دایە بەباشترین شێوە دەتوانێت ئەو پێگەیەی لەپێناو بونیادنانی ئابووری ئیکۆلۆژی و کۆمیناڵ بەکاربێنێت. لەو بارەویەوە دەتوانێت دۆخە دواکەوتووەکەی بکاتە خاڵێکی بەهێز. لەمیانەی رێکخستنی سەرجەم کۆمەڵ و بێکارەکان لەچوارچێوەی ئابووری ئیکۆلۆژی و کۆمیناڵدا ئەوا لەرێگای شارستانێتی دیموکراتییەوە دەتوانێت وڵاتە بەهەشتیەکەی جاران بەشێوەی نەتەوەی دیموکرات سەرلەنوێ بونیاد بنێتەوە. ئەوەی لەو پێناوەدا پێویستە: تەنیا کەرامەت و ئەشقی ژیانە لە وڵاتێکی ئازاد و کۆمەڵگایەکی دیموکراتدا.

### ر) شۆڕشی زهنیەت لە خۆرهەڵاتی ناویندا

وەک چۆن لەسەر ئاستی جیهان روویدا مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەر لەهەموو شتێک لەمیانەی زهنیەتی هەژموونگەراییەوە هاتە خۆرهەڵاتی ناوین. ئەو هەژموونگەرا زهنییەی بە ئوریانتالیزم (خۆرهەڵاتناسی) ناودەبرێت بناغەکەی بۆ سەدان ساڵی پێشووتر دەگەڕێتەوە. لەوانەیە بۆ سەردەمی پەلهاوێشتنی کلتووری گریک ـ رۆما درێژ ببێتەوە. پەلامارەکانی خاچپەرستان لەخۆرهەڵاتی ناوین زیاتر شەڕەکانی زهنیەت بوو. بەڵام فەتحکارییە سەرەکیەکەی هزر لەگەڵ هەڵکشانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەستیپێکرد. پێویستە ئەوەش لەبیرنەکەین کە سەرەکیترین فاکتەر لەهەڵکشانی ئەورووپای خۆرئاوادا باڵابوون بوو لە بواری هوشیاری حەقیقەتدا. گونجاندنی ئەزموونی خۆرهەڵات بەگوێرەی هەلومەرجە بەرجەستەکانی خۆی رۆڵێکی دیاریکەری لەوەدا هەبوو. سەردەمەکانی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری دەرکپێکردنی حەقیقەتی ئەورووپای خۆرئاوای لەئاستی جیهان باڵاکرد. بەو رادەیەی خۆی شیکارکرد جیهانیشی شیکارکرد، بەتایبەتیش خۆرهەڵاتی ناوینی شیکارکرد. وەک چۆن سەرمایەداری خۆی کرد بە خاوەنی

چەندین پەرەسەندنی ئەرێنی کە تازە سەریانهەڵدەدا، قۆرخکاری لەسەر دەرکپێکردنی حەقیقەتیش ئاواکرا. کاتێک بە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم گەیشت لە مێژبوو پاوانی خۆی لەسەر دەرک پێکردنی حەقیقەت ئاواکردبوو. لەمیانەی بالابوونی دەرکپێکردنی حەقیقەتەوە هاتە خۆرهەڵاتی ناوینە. سەرەتا مژدەبەخشەکان سەرلەنوێ کەشفی ناوچەکەیان دەستپێکرد. دواتر تێکەیشتنی گەڕیدە و توێژەرە زانستیەکان سەبارەت بەناوچەکە، بوو بە قوتابخانەیەکی هزری بەناوی خۆرهەڵاتناسی. ئۆریانتالیزم مانای هەژموونگەرایی زهنیەتی شارستانی ئەورووپای خۆرئاوایە. لە سەدەی نۆزدەهەمەوە تا چوو خۆرهەڵات سەربەخۆیی زهنیەتی نەما. هزرە خۆرهەڵاتناسییەکان زاڵکران. نوخبە و ڕۆشنبیرە خۆرهەڵاتییەکانیش کەوتنە ژێر باڵادەستی هزری خۆرهەڵاتناسی. سەرجەم ڤێرسیۆنەکانی هزری لیبرالیزم، لەسەرووی هەمووشیانەوە میللیگەرایی، زهنیەتی خۆرهەڵاتیان داگیرکرد. تەنانەت بزووتنەوە هزریەکانی ئیسلامگەرایی و ئایینە نوێیەکانی دیکەش لەسەر قاڵبە خۆرهەڵاتناسییەکان پەرەیانسەند.

بزووتنەوەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە کە لەگەڵ سەدەی بیستەمدا پەرەیانسەند لەناوەڕوکدا دامەزراوگەلێکی سیخوڕی هزری خۆرهەڵات ناسین. وەک بەردەوام بانگەشەیان بۆ دەکرد دامەزرێنەرانی دەوڵەت ـ نەتەوە خاوەن فیکری سەربەخۆخوازی نەبوون، نەیاندەتوانی ببن بە خاوەنیشی. سەرجەم فۆرمە هزرییەکانی سەدەی بیستەم ـ فیکری چەپڕەویشی لەناودا ـ لە خۆرهەڵاتی ناویندا مۆرکی خۆرهەڵاتناسییان پێوەبوو. هەرچی ئەو هزرانەن کە لەژێر ناوی زانستی کۆمەڵایەتیشەوە لەسەر ناوچەکە پەیڕەوکران و ڕێکخران وێڕای ئەوەی بە حەقیقەتەکانی زانستی گەردوونی ناودەبران، بەڵام لەناوەڕۆکدا هەمووی خۆرهەڵاتناسی بوو. هەڵبەتە خۆرهەڵاتناسی هێزی لەو دۆخەی وەردەگرت کە بە بەراورد لەگەڵ قاڵبە زهنییە کۆنەکان زیاتر لە حەقیقەت نزیک بوو. بە بەروارد لەگەڵ ئۆریانتالیستەکان لەبەرئەوەی پشکی حەقیقەتی ڕەخنەگرانی خۆرهەڵاتناسی لاوازتر بوو سەرکەوتوو نەدەبوون. دەکرێ هەمان شت سەبارەت بە نوخبەکانی دەسەڵاتی خۆرهەڵاتناسیش بگووترێت. نوخبەکانی دەسەڵاتی خۆرهەڵاتناسی، بۆ نموونە؛ نوخبەکانی وەک تورکە لاوەکان و جەمعیەتی ئیتحاد و تەرەقی هێزی خۆیان لە زهنیەتی خۆرهەڵاتناسی وەردەگرت کە بەگوێرەی زهنیەتە کۆنەکان بەهێزتر بوون. ئەو دۆخە هۆکاری سەرەکی سەرکەوتنیان بوو لەشەڕی دەسەڵاتداریتی سەردەمی مەشروتییەت و کۆمار . پێویستە زۆر باش بزانین کە خۆرهەڵاتناسی خۆرئاوا سەرچاوەی هێزەکەی پشت میللیگەرایی تورک پێکدێنن. گۆڕینی قیبلەی نوخبەکانی دەسەڵات لە مەککەوە بۆ پاریس هۆکارەکەی ئەو هێز و سەرکەوتنە دەگەڕایەوە کە هزری خۆرهەڵاتناسی ڕێگای لەپێش کردەوە. لەمیانەی ئاواکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانەوە هزری خۆرهەڵاتناسی لە لوتکەدا جێگیر بوو. پاوان و قۆرخکاری لەسەر تەواوی زهنیەتەکانی دیکە ئاواکرد. نەک تەنیا لەبواری ئایدیۆلۆژی بەڵکو لەبواری هونەریشدا خۆرهەڵاتناسی پاوانی خۆی

ئاواکرد. ئەخلاقی نەریتی هەڵوەشاندەوە و ڕێگای لەپێش قاڵبەکانی ئاکاری خۆرئاوا کردووە.

وەک چۆن لەدووەمین نیوەی سەدەی بیستەم لەتەواوی جیهان ڕوویدا لە خۆرهەڵاتی ناوینیش دەربازکردنی قۆرخکارییەکانی زهنیەت دەستیپێکرد. شۆڕشی کلتووری ۱۹٦۸ قۆرخکاری خۆرهەڵاتناسی کونکرد. ئەو سەردەمە ساڵانێک بوو کە لەدەستدانی باڵابوونی ئایدیۆلۆژیای لیبراڵیزم و زانستگەرایی پۆزیتیڤیست دەستیپێکرد. هەڵوەشانەوەی خێرای سۆسیالیزمی بونیادنراو لە۱۹۹۰کان، زیاتر باڵادەستی هزری لیبراڵیزمی پۆزیتیڤیستی هەژاند. بەتایبەتیش زانستگەرایی کۆمەڵایەتی برینێکی گەورەی لێکەوتەوە. قۆرخکاری زهنیەتی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دووچاری یەکەمین هەژاندنی جددی هات. چەندین ڕەوتی بەناوی پۆستمۆدێرن سەریانهەڵدا. قوتابخانەکانی هزری فێمینیزم، ئیکۆلۆژی، کلتووری چەپڕەویتی نوێ دەرکەوتن. تەنگژەی بونیادی سەرمایەداری کە ۱۹۷۰کان قووڵبووەوە، لەگەڵ تەنگژەی زهنیەت ڕوویدا. ئەوە تەنگژەیەک بوو تا دەچوو قووڵتر دەبووەوە. قۆرخکاری هزری کۆن بەجۆرێک ڕووخا کە جارێکی دیکە ئاوانەکرێتەوە. خۆرهەڵاتناسی بەو سیفەتەی لقێکی ئایدیۆلۆژیای لیبراڵە پشکی خۆی لەو ڕووخانە بەرکەوت. باڵادەستییە هزرییەکەی دەرهەق بە خۆرهەڵات پارچەبوو. چەندین بیرمەندی کە بە سیفەتی سیستەمی شارستانی ناوەندی ڕۆڵی خۆرهەڵاتی ناوینان خستەڕوو، لەسەرووی هەمووشیانەوە گۆردن شیلد، سامۆیل کرامەر و ئەندری گوندەر فرانک، کۆمەکێکی گرنگیان پێشکەش بە شۆڕشی هزری کرد. کاتێک سنوورەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری و پەرەسەندنی خۆرهەڵاتی پەیوەست بە سیستەمەکانی شارستانی ناوەندی خستەڕوو، ڕێنسانسێکی ڕاستەقینەی هزر ڕوویدا. بۆچوونەکانمان سەبارەت بە مۆدێرنیتەی دیموکرات و سیاسەتی دیموکراتیانە کە لەبەرگرینامەکاندا تا دەچوو قووڵتر و بەرفراوانتر دەبوو، لەمیانەی ئەڵقەی جیاوازەوە هەوڵی پێشخستنیمان دا، بەبێ ئەوەی ئاگامان لێی بێت ڕۆڵی تەواوکردنی هزری ئەو بیرمەندانەی بینی. ئەو شیکارانەی لەسەردەمی لەدایکبوونیەوە تا ئەو ڕۆڵەی لەهەڵکشانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەرهەق بە سیستەمی شارستانی ناوەندی پێشخران بە هێڵە گشتییەکانیەوە ڕاست بوون.

کۆی کاریگەری تەواوی فاکتەرەکانی ئەو هزرە شۆڕشگێڕییانە بەرامبەر زهنیەتی لیبراڵ و خۆرهەڵاتناسی ڕێگای لەپێش شۆڕشێکی زهنیەت کردەوە کە لە ۱۹۹۰کانەوە خێرابوو. لەگەڵ ئەوەی کاریگەری سنوورداری ئەو شۆڕشە زهنیانە جێگای باس بووە، بەڵام بەرگرینامەکانم شۆڕش و پەرەسەندنێکی هزری بوون کە زۆربەی لایەنەکانی بە شێوازێکی سەربەخۆ پێشخراون. شۆڕشێکی زهنی کە لەژێرکاریگەری مەزهەبە ناوەندی، ڕاستڕەو و چەپڕەوەکانی لیبراڵیزم ڕزگار بووبێت و خۆرهەڵاتناسیشی دەرباکردبێت لەخۆرهەڵاتی ناوین گرنگی و بایەخێکی زۆری هەیە. پێویستە لەبیرنەکەین ئەگەر شۆڕشی زهنیەت ڕوونەدات هیچ شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی هەمیشەیی ڕوونادات. دواترین بەشە پێنج بەرگییەکەی بەرگرینامەکانم هێڵە گشتییەکانی مەبەستمان لە شۆڕشی زهنی خۆرهەڵاتی

ناوین دەخاتەڕوو. لەجیاتی دووبارەکردنەوە پێویستە جەخت لەسەر گرنگی پراکتیزەکردنی بکەمەوە. تەنانەت هێژاترین فیکریش، واتە ئەو هزرانەی پشکی حەقیقەتیشیان زۆر بەهێزە ئەگەر جێبەجێ نەکرێن هیچ واتایەکیان نابێت. بەڵام ئەگەر تەواوی جیهان لەسەر هزرێک بینەیەک کە چەوت یاخود حەقیقەتەکەی لاوازبێت، لەبەرامبەر ئەوەدا تاکە کەسێک نوێنەرایەتی هزرێک بکات و لەبەرامبەر هەمووشیاندا بەرگری لێبکات، لەئاکامدا دەتوانێت سەرکەوتنی ئەو هزرە بەدەستبێنێت. مێژووی مرۆڤایەتی پڕ لە نموونەی بەمجۆرەیە. ئەوەی ڕێگای لەپێش دەکاتەوە، هزری حەقیقەتە کە بەردەوام سەرکەوتوو دەبێت. ئەو هزرانەی گوزارشت لە حەقیقەت دەکەن لەوانەیە سەرکوت و سزابدرێن، بەڵام هەرگیز دووچاری شکست نابن.

سەرەتا لەمیانەی هزرگەلێکەوە دەستم بەکارکرد یان دەستمان بەکار کرد کە پشکی حەقیقەتیان زۆر سنووردار بوو. چەندە لە بواری هەڵوێستە پراکتیکیەکەمان پێشخست، پشکی حەقیقەتی هزرمان زیادی کرد. کاتێک لەمیانەی هزرگەلێکەوە بەرەو پراکتیک هەنگاومان نا کە پشکی حەقیقەتەکەی زیادی کردووە، پراکتیکی سەرکەوتووتر دەستلێبەرنەدراو بوو. سەرەکیترین ئەنجامی بەدەستبهێنرێت، لەکاتی پێویستدا گەورەترین حەقیقەت و ئەو مەزنە چالاکییە ژیانییانەی ئەو حەقیقەتانە ڕێگای لەپێش دەکەنەوە بەتاکە گووتەیەک دەست پێدەکات. لەحاڵەتێکدا دەستبەرداری لەپایەبەندبوونێکی ڕاستگۆیانەی گووتە و هەوڵەکانی ئاوێتەکردنی لەگەڵ ژیاندا نەکرێت، ئەوا گەورەبوونی حەقیقەت و خستنەڕووی بەشێوەی سەرکەوتنی ژیانی ئازاد لەناو کۆمەڵگادا دەستلێبەرنەدراوە. کۆمەڵگاکانیش وەک خاکی تینووی ئاو دیاردەگەلێکی تامەزرۆی حەقیقەتن. لەگەڵ ڕەواندنەوەی ئەو حەسرەتە وەک چۆن زەوی سەوز دەبێت کۆمەڵگاکانیش ئاشنای ژیانی ئازاد و دیموکراتیک دەبن.

مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەڕێگای دامەزراوەکانی زانکۆی لایەنگرانی عەلمانیەتەوە باڵادەستی زهنیەتی کڵێسای شکاند کە بەدرێژایی چاخی ناوین بەدەست خۆیەوە گرتبوو. لەمیانەی ئەو قۆرخکاری و پاوانەی لەسەر زانکۆکان ئاوایکرد دەستکەوتە زانستی، فەلسەفی و هونەریەکانی سەردەمی ڕێنسانس، ریفۆرم و ڕۆشنگەری کرد بە موڵکی خۆی. لەم ڕووەوە سەدەی نۆزدەهەم ئەو سەردەمەیە کە باڵادەستی سەرمایەداری بەسەر زانست، فەلسەفە و هونەر مسۆگەر بوو. بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ ئەو تەنگژە و هەڵوەشانەوەیەی لە کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم لە بونیادی گشتی سیستەمدا ڕوویدا، لەخودی ئەو حوکمڕانی یاخود باڵادەستیەشدا ـ کە نزیکەی دووسەدە بەردەوام بوو ـ تەنگژە و هەڵوەشانەوە هاتەئاراوە. لەبەرامبەر ئامرازە زانستیە کرداریەکان فەلسەفە گرنگی جارانی نەما، خودی زانست بۆ ئامرازگەلێکی لەژمار نەهاتووی لێتۆژینەوە گۆڕا، هەرچی هونەرە دوای چاخی کلاسیک بەهای قوتابخانەی لەدەستدا و لەدۆخی پیشەسازییەکی قەرەباڵغدا بۆ کاڵایەکی قەبە بچووککرایەوە. لەئاکامدا ببوون بەئامرازە بێبەهاکانی بەرژەوەندی سەرمایەداری، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم. بەمجۆرە

بەهرەی توێژینەوە و گوزاشتکردنی حەقیقەتیان لەدەستدا کە رۆڵی سەرەکییان بوو. مەبەست لەتەنگژەی زانست، فەلسەفە و هونەر لەدەستدانی بەهرەی توێژینەوە و گوزارشتکردنی ئەو حەقیقەتە بوو.

لەسەدەی دوازدەهەمدا کاتێک دۆگماتیزمی مەدرەسەی ئیسلام لەبەرامبەر فەلسەفە، زانست و هونەر باڵادەست بوو قۆناغێکی هاوشێوە لە خۆرهەڵاتی ناوین روویدابوو. ئەو تەنگژەیەی لە خۆرئاوا لە زانست، فەلسەفە و هونەر هاتەئاراوە لەخۆرهەڵاتی ناوین لەمیانەی لەچاو کەوتنی خۆرهەڵاتناسی مانادار بوو. لەو رووەوە پەرەسەندنێکی ئەرێنی بوو، بەڵام لەبەرئەوەی شۆڕشێکی زهنیەتی ئەلتەرناتیڤی ئەنجامنەدا هەڵگری مەترسی بوو. وێڕای ئەوەی هەندێک پەرەسەندنی سنووردار لەناوچەکە بەرامبەر بە زهنیەتی هەژموونگەرایی خۆرئاوا، هونەر و شێوازی ژیانەکەی هاتنەئاراوە، بەڵام شۆڕشێکی ریشەیی رووینەداوە. وەک سەرجەم ناوچەکانی دیکە لەو هەرێمەشدا تەنگژە بەردەوامە. خۆرهەڵاتی ناوین دەتوانێت ئەو مەترسیانە بکات بە دەرفەت کە تەنگژە ئافراندوویەتی. لەو پێناوەشدا دەتوانێت شۆڕشی فەلسەفە، زانست و هونەر ئەنجام بدات کە ئیلهام و رێنمایی بە فاکتەرەکانی نەتەوەی دیموکرات، ئابووری بازاڕی کۆمیناڵ و پیشەسازی ئیکۆلۆژی مۆدێرنیتەی دیموکراتی ببەخشێت کە لەگەڵ بناغە مێژوویی و کلتوورییەکەی خۆی گونجاوبێت؛ بەمانایەکی تر واتە سەردەمەکانی رێنسانس، ریفۆرم و رۆشنگەری بەشێوەیەکی تێکەڵ و بەردەوام بەشێوازێکی شۆڕشگێرانە ئەنجامدەدات و دەتوانێت بەرجەستەی بکات. پێویست ناکات لەو چوارچێوەیەدا لاسایی خۆرئاوا بکاتەوە. لەگەڵ ئەوەی هاوبەشێتی لەدەستکەوتە گەردوونییەکان دەکرێت، بەڵام ئەوەی بنەڕەتییە داهێنانی مێژوویی و جوگرافی خۆت نمایش بکەیت و شۆڕشی رەسەنی خۆت ئەنجام بدەیت.

شۆڕشی کوردستان کە بەگوێرەی تیۆری و دەستەواژەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پێشخراوە چانسێکی لەوەدایە کە لەسەردەمی تەنگژەی زهنیەت و شێوازی ژیانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هاتۆتەئاراوە. بەشی زۆری شۆڕشەکانی سەدەی نۆزدەهەم و بیستەم لەسەرووی هەمووشیانەوە شۆڕشەکانی فەڕەنسا و رووسیا شۆڕشێک بوون کە زهنیەت و شێوازی ژیانی مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان دەرباز نەکرد. وێڕای هەوڵە رەسەن و خەیاڵەکانی ئەلتەرناتیڤبوون، بەڵام سەرکەوتنەکانیان سنووردار بوو. بێگومان میراتێکی هێژا، بەهای ژیانی ئەخلاقی ـ ئەستاتیکا و دەستکەوتێکی زهنییان لەدوای خۆیان بەجێهێشت کە تا ئێستاش پشکی حەقیقەتیان بەرزو و زیندووە. شۆڕشی کوردستان ئەو دەسکەوتە هێژایانەی زهنیەت و ژیان لەگەڵ پراکتیکی خۆی بکاتە یەک، دەتوانێت زۆر بەباشی چانسی خۆی بەکاربێنێت. کاتێک لەبەرامبەر تاکخوازی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری هەڵگری تەڵەزگە، قووتدەری حەقیقەت و جانەوەرە چاوبرسییەکانی بەکاربردن و فاکتەرەکانی قازانجپەرستی، دەوڵەت ــ نەتەوە و ئیندوستریالیزمی ئافرێنەری تاکخوازیدا، بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات، ئابووری کۆمیناڵ و پیشەسازی

ژینگەدۆست لەناو یەکتریدا بکرێت بەشێوازێکی ژیانی کۆمەڵایەتی ئەوا تاکی سۆسیالیست و دیموکراسیخواز دەبێتە راستییەکی بەرجەستە. هێندەی دەتوانێت شۆڕشی زهنیەت، ئەستاتیک و ئەتیکی خۆی قووڵدەکاتەوە و دەیکاتە مۆڵکی تاک و بۆ گەلانی خۆرهەڵاتی ناوینی دەگوازێتەوە. لەمیانەی شۆڕشی رەسەنی خۆیەوە دەتوانێت کۆمەکێکی گرنگ پێشکەش بە کلتووره مێژووییەکەی خۆرهەڵاتی ناوین بکات کە بەردەوام گوزارشت لە یەکپارچەیی و گەردوونی دەکات. لەو پێناوەشدا دەشێت خودی ژیان و هەر بوارێکی وەک قوتابخانەیەک بەکاربێنێت. چانسێکی ئەرێنی ئەو گەل و تاکانەی هەرشتێکی خۆیان لە دەستداوە پەسەندکردن و هەرسکردنی ئەو ژیانانەیە کە هەڵگری بەها شۆڕشگێڕییەکان، ئازادی، ئەتیک و ئەستاتیکن. تەنیا رشانەوەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریمان بەرنەکەوێت. باشە کە هیچ بەرمان نەکەوتووە یان زۆرکەم. لەوەش شکۆدارتر، بەشێوەیەکی ئازاد، یەکسان و دیموکراتیانە بەهاکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک، شێوازی ژیانی نەتەوەی دیموکرات، ئابووری کۆمیناڵ و ئیکۆلۆژیک بەشێوەیەکی گونجاو لەگەڵ سروشتی کۆمەڵگای خۆمان و چالاکی کەسێتیمان شانبەشانی زانست، فەلسەفە و هونەرەکەی هاوبەشێتی بکەن و بیکەینە موڵکی کۆمەڵگا.

# ئەنجام

پێشکەشکردنی بەرگرینامەی کەسێک لەمیانەی ڕەهەندە گەردوونیەکانەوە لەوانەیە بە سەیر و زێدڕۆیی دابنرێت. ئەوەی بەرگرینامەش خوازیاری سەلماندنێتی: خۆجێیی و گەردوونی بەئاسانی لەیەکتر جیاناکرێنەوە. سەرگوزەشتەکەمان کە لە دیاردەیەکی کزی وەک کوردانی لەبیرکراوی ناو پەرتووکە تۆزاویەکانی مێژوو بەجێ هێشترابوو، ڕوونی کردۆتەوە کە چارەسەری ئەو کێشەیەی سەرچاوەی خۆی لەو دیاردەوە وەردەگرێت تەنیا لەمیانەی ڕەهەندە گەردوونیەکانەوە فەراهەم دەبێت. خودی مرۆڤیش بوونێکی گەردوونییە. کۆبوونەوەی سەرجەم نهێنیەکانی گەردوون لەمرۆڤدا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە مرۆڤ بوونێکی گەردوونییە. ئەوەش مانای ئەوە نییە کە تاکانە، خۆجێیی و ئان بەهاو جیاوازییان نییە. بەپێچەوانەوە گەردوونیبوون لەمیانەی بەش یان تاکانەوە بەدیدێت. گەردوونیبوون کۆی سەرجەم بەش و تاکانەکانە. هەر بەشێک بەرامبەرێکی لەگەردووندا هەیە. لەبەرامبەر ئەوەشدا شوێنپەنجەیەکی گەردوونی لەهەر بەش یاخود تاکانەیەکدا هەیە. پرۆسەی ڕووداوەکانی بە نەشونماکردن یان پەیدابوون ناو دەبرێت ڕێکاری دیالیکتیکی نێوان بەش و گەردوونییەکەیە.

هۆکاری گەڕانەوەی بەردەوامامان بۆ ئەو پرەنسیپە سەرەکییەی فەلسەفە، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە کوردان یەکێک لەو دیاردانەن دووچاری زۆرترین نکوڵی و قڕکردن هاتوون. بەدرێژایی مێژوو پاوانی چەوسانەوە و سەرکوتکردنی لۆژیکی شارستانی دەوڵەتی هیچ کاتێک لەسەر کوردان کەم نەبۆتەوە. کوردان بەو سیفەتەی کۆنترین میراتگری کۆمەڵگای قەبیلەن کە بە هەموو شکۆدارییەکەوە لەناو شۆڕشی نیۆلیتیکدا ژیاوە تاڕادەیەک گیرۆدەی ئەو سەردەمەی مرۆڤایەتی بووە کە تا ئێستاش هەڵگری شوێنپەنجەی ژیانی پازدە هەزار ساڵ بەر لەئێستایە. هەروەها لەلایەکی دیکەشەوە کەوتۆتە ژێر کاریگەری هێزی هەژموونگەرایی جیهانگیری سەردەمیشەوە. وەک تاک ئایا تووشی چی دەبووین؟ ئایا دەبوو لە دۆخی کۆمەڵگابوون دەربکەوین؟ بەبێ خۆجێیبوون چۆن چۆنی دەبووین بە گەردوونی؟ کاتێک یەکەمین هەنگاوی خۆمان بۆ ژیان هاوێشت وەک کۆت و بەندێک کوردێتی پێیەکانمانی بەستبوویەوە. وازهێنان لە کوردێتی لەوانەیە وەک ڕێگاچارەیەک بینرابووایە. بەڵام باجەکەی چی بوو؟ تۆ بڵێی ئەو کاتە هیچ شتێک لەمرۆڤایەتمان دەمایەوە؟ کێشەی کورد کێشەیەکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی ئاسایی نەبوو. ئەگەر باسی سیفەتێکی تا دواڕادە کز و بێکاریگەری بکەین کە ناوی کوردێتی بوو، ئەوا ئێمەش وەک جۆرێک لەو کێویانە بووین کە مەحکومی ڕەهەندە مارژیناڵەکانی کرابووین. ژیان بەشێوەی کێویەکی مارژیناڵ سزایەکی زۆر قورسە. تەنیا ئەو کاتە ئاشنایی ڕاستینەی کۆمەڵایەتیمان دەبووین کە بەرگری وەک بیرێکی قووڵ و فراوان بوو و مرۆڤی بەرەو خۆی کەمەندکێش دەکرد. لەلایەکەوە لەقووڵایی مێژوودا بەدوای خۆماندا دەگەڕاین، لەلایەکی دیکەشەوە لەناو شالاوەکانی چاخ و مۆدێرنیتە بۆ قووتدانی پاشماوەکانمان، هەوڵی

پێناسەکردنی ڕاستینەی خۆمانمان دەدا. سوربوون لەسەر کەسی مرۆڤی شەرەفمەند، وەک ئەرکێک کەشفکردن یاخود ئاشکراکردنی هەموو لایەنەکانی حەقیقەتمان دەسەپاند. ئەرکێکی بەمجۆرە بەلێگەڕینە بەناوبانگەکەی چەسپاندنی "ڕاستی یەکپارچەیە " ی هیگل دەگەیشت.

ژیانی شەخسیم، بەرگرینامەکەم، بەرگرینامەکەشم ژیانی شەخسیم دەکات بە پاساو. نەک وەک هەرکەسێکی دیکە بەڵکو ناچاربوونی ژیان وەک کوردێکی بەکێشە ئەنجامێکی دیاردەی کوردی بەکێشەیە. بەرخودان بەرامبەر هەڵوێستەکانی ئافراندنی کۆمەڵگا و تاکی بێبەرپرسیارێتی کە بەهەموو هێزی خۆیەوە لیبرالیزم هەوڵی بۆدەدات، مەرجی لەسەر پێمانەوەی کۆمەڵگایە. دابڕان لە کۆمەڵگای کورد تاڕادەیەک ئاسانە کە لە هێزی بەرگری خۆیی بێبەشکراوە. چونکە میکانیزمی کۆمەڵکوژی کۆمەلایەتی درێژخایەن لەمێژە تەواوی هەلومەرجەکانی دابڕانی ئاسانی ئامادەکردووە. بەبێ یەک و دوو دابڕان لە کوردێتی زۆر ئاسانە. نەبوونی هێزی لێگەڕین و لێپرسینەوەی گەلی بێ بەرگری تەواوی ئەو ئەنجامانە دێنێتە ئاراوە. گەلێک کە دابڕانەکەی هێندە ئاسان بێت چاوەڕوانی لێبکرێت بەشێوەیەکی تایبەت بەکۆمەڵگا مۆدێرن و کۆمەڵگاکانی دەوڵەت - نەتەوە بەرگری لە نیشتیمان، ئابووری، ژیانی ئازاد و ناسنامەکەی بکات دەبێتە هەوڵێکی بێهودە. ئیمپریالیزم و داگیرکاری بەردەوام بەدوای ئاواکردنی تاک و کۆمەڵگای بێ بەرگرییەوەیە. بەهەموو هێزی خۆی هەوڵی جێبەجێکردنی دەدات. کاتێک ڕەوشی کوردان جێگای باس بێت دۆخەکە مەترسیدارتر دەبێت. کوردان تەنیا نەخزاونەتە دۆخێکەوە کە نەتوانن بەرگری لە بوونی کۆمەلایەتی، نیشتیمان و ئازادی خۆیان بکەن، بەڵکو لە هەمانکاتدا بەدۆخێک گەیەنراون کە لە خۆیان بترسن، رابکەن و شەرم بکەن.

دەشێت چەندین وەسفی هاوشێوە سەبارەت بەدیاردەی کورد و دۆخە بەکێشەکەی بکرێت. هۆکاری گەڕانەوەم بۆ چیرۆکی ژیانی شەخسیم کۆمەککردنی ئەو وەسفکردنانەیە. بەلام ئەو وەسفانە لە ئاسمانەوە نەهاتنە خوارەوە، بەدەستی خودی مرۆڤ ئافرێنران. ئەو مرۆڤانە کێ بوون، سەر بەکام هێزبوون؟ وەلامی سەرجەم ئەو پرسیار و کێشانە یەکپارچەیی یاخود هەمووێتی ڕاستییان دەسەلماند. هەڵبەتە ئەو هێزانە بوون کە منیان بەندکرد. هەمووشیان دەمامکدار بوون. هیچ یەکێکیان وەک ڕاستینەی خۆی دەرنەدەکەوت، وەک ڕووخسارەکەشی نەدەبوو. تێگەیشتنی ڕاستییە پەردەپۆشکراوەکان پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی مەزنە. پیشاندانی بوێری سەرکێشی ژیان و درێژەپێدانی بۆ من لە ژیانی مرۆڤە سەرەتاییەکانی ناو دارستان ئەستەمتر بوو. چونکە ئەو مرۆڤە مۆدێرنانەی بۆ لەناوبردنی پێکهاتەیەکی کۆمەلایەتی ئامادەکراون مرۆڤ گەلێکبوون کە تا ڕادەیەک مەترسیدار بوون، بە پیلان و ڕێکخراو بوون و کوشتنیان کردبوو بە هونەرێک کە لەگەڵ مرۆڤە کێوی و جانەوەرەکانی هیچ سەردەمێک بەراورد ناکرێن.

ئەگەر ژیانی خۆم لەگەڵ کوردێتی، کوردێتیشم لەگەڵ ژیانی خۆم هاوتا نەکردبووایە، هیچ کاتێک لەکۆمەڵگابوونێکی واقیعی تێنەدەگەیشتم. پێوانەی

دەستلێبەرنەدراوی ژیانی بە پرەنسیپ وابەستەی راستینەی کۆمەڵایەتییە، ئەو رۆڵەی لەمێژووی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکان بارکراوە، دابڕان لەراستینەی کۆمەڵایەتی و پیشاندانێتی وەک پەرەسەندنێکی پێشکەوتنخواز. ئەوە گرنگترین گورزە کە بەناوی زانست لە کۆمەڵگابوون وەشێنراوە. کاتێک کوردێتی جێگای باس بێت، دابڕان لەگەڵ رزگاری یەکسان و هاوتا دەکرێت. بەتایبەتی کوردان دابڕان لەخودی خۆیان کردووە بە بیانوویەکی رزگاری. لەخۆتەوە راگەیاندنی بێبەریبوون لە گشت بەرپرسیارێتیەکانی بەرامبەر خود ئارامیش فەراهەم دەکات. هەرچی بەرامبەرەکەی ئەو چالاکییەشە، هەمان ئەو کەس یان تاکانە لەگەڵ کامە ناسنامە بووبن بەیەک کە هاتۆتە پێشیانەوە، دەبن بە پارێزەرە کوێرانەکانی ئەو ناسنامانە.

تەواوی ئەو بیانووانە لەپێناو دەستنیشانکردنێکی تەندروستانەی یەکانەیی دیاردەی کوردە. ئەگەر بەشێوەیەکی راست تاکانەیی کوردێتی دەستنیشان نەکەین، ئەوا ناتوانین شوێنەکەی لەناو گەردوونیبوونیشدا دەستنیشان بکەین. لەقووڵاییەکانی مێژوو گەڕان بەدوای شێوە بەراییەکانی دیاردەی کورد، لەپێناو تێگەیشتنێکی راستی خۆجێییەکەیەتی. لەبەر ئەوەی ئاگادارین کە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان تەنیا بەسیفەتی مێژوویییان دەرکیان پێدەکرێت، ئەو توێژینەوەیە ئەنجام دەدەین. ئەگەر قەبەش بێت، بەڵام بەشی زۆری بەرگرینامەکە ئەنجامەکانی ئەو توێژینەوە دەخاتەڕوو. بەڵام وەک چۆن ناچاربووین لە یەکانەیی و خۆجێیەتیدا بەدوای کوردایەتیدا بگەڕێین، ئەوا پێویستی تێگەیشتنی ماناکەشمان لە گەردوونیبووندا بینی. چونکە خۆجێیەتی و تایبەتبوون بە تەنیا رۆشنکەرەوە نەبوون. تەنیا کاتێک پێگەکەمان لە گەردوونیبووندا شیکار دەکرد روونکردنەوەیەکی تەواو یاخود پێوست فەراهەم دەبوو. کاتێک رەوشەکە بەمجۆرە بوو گەردوونییەکانی بەدرێژایی مێژوو حوکمڕانی تەواوی خۆجێیەتییەکانیان کردووە، وەک مێژووی گەردوونی تاوتوێمان کرد. روونکردنەوەکانی سەبارەت مێژووی شارستانی و مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ئەنجامەکانی ئەو لێتوژینەوەیە بوو.

تەنیا لێتوژینەوەی وەک دیاردە بەشی پێناسەکردنی کوردێتی ناکات. هەروەها چۆنێتی ئەو کارەش جێگای باسە. لەو سەردەمەی کوردێتی وەک دیاردەیەک شێوەی گرتووە دووچاری بێ چانسی ژیانکردنی سەختترین کێشە هاتووە. هەلومەرجە ژیۆپۆلیتیکەکان ژیانی بە کێشەیان وەک چارەنووسێک دەستنیشانکردووە. بەدرێژایی سەردەمەکانی پێشوو بینیمان کە دۆخەکە بەمجۆرەیە. کاتێک قۆناغی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دێت، کێشەکان بۆ کۆمەڵکوژی دەگۆڕێت. ئیتر گفتوگۆ لەبارەی ئەو کێشانەوە دەکرێت کە ئاخۆ دەتوانێت بوونی خۆی بپارێزێت یان نا، بگرە ئەوەش دەرباز دەکات و بوون و نەبوونەکەی دەکەوێتە رۆژەڤەوە.

خاوەندارێتیکردن لە کوردێتییەک کە دیاردە و کێشەکانی تا ئەو رادەیە مێژوویی و بەرفراوانە وەک ئەوەیە شاخێک لەکۆڵ بکەیت. PKK و فێرسیۆنەکانیمان کرد بە ئامرازی هەڵگرتنی ئەو بارە. بارەکانی کۆمەڵگا بە ئاسانی لەکۆڵ ناکرێت. بەتایبەتیش کاتێک ئەو

بارە لەناو بەرداشی کۆمەڵکوژیدا بێت مایەی تێگەیشتنە کە ئامرازەکە و تێکۆشەران لەژێر چ ریسک و مەترسییەکدا دەژین. PKK و ڤێرسیۆنەکانی وەک حەقیقەتێک گوزارشت لە چییەتی خۆجێییەتی کورد دەکەن لە لایەک بەو سیفەتەی دیاردەیەکی بەکێشەیە، لە لایەکی تریش بە سیفەتی چییەتی بەرامبەرە گەردوونییەکەی هەمان دیاردەی بەکێشە. خۆیان وەک سەرەکیترین گوتەبێژ و چالاکوانی حەقیقەتی کورد رادەگەیەنن. ئیتر PKK و ڤێرسیۆنەکانی بەسیفەتی گوزارشتی حەقیقەت و دیاردەی کورد دەستیان بە کاروانێکی دیالیکتیکی بەمجۆرە کردووە. کاتێک دیاردە ـ هوشیاری (حەقیقەت) ببێت بە راستینە ئەو پرۆسەیە بەخۆی سەرهەڵدەدات کە بە پێکهاتنی دیالیکتیکی یاخود بزاڤی رزگاری ناوی دەبەین.

دەشێت گوتە و چالاکی PKK بەشێوەی دانانی بەتاکانەیی و ناسنامەی کورد و گەردوونیبوونی پێناسە بکرێت. گوتە و کردار واتای بانگەشە و کرداری چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەیە کە بەشێوەی قەیرانێکی بەردەوام لەدیاردەی کوردا دەژیت. کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بوو بە هێزی هەژموونگەرایی لەمیانەی گوتە و کرداری هاوشێوەوە وەڵامی ئەم دیاردە بەکێشانە درایەوە کە لەناو کۆمەڵگادا گەورە دەبوون. بەتایبەتیش سۆسیالیزمی بونیادنراو، دیموکراسی کۆمەڵایەتی و بزووتنەوەکانی رزگاری نیشتیمانی بزووتنەوەگەلێکی بەمجۆرەبوون. مۆدێرنیتەی سەرمایەداری توانی ئەو سێ بزووتنەوە یەکسانیخواز و ئازادیخوازە لەناو فاکتەرەکانی خۆیدا بتوێنێتەوە. ئەگەر سنوورداریش بێت بەڵام PKKش بە هەر سێ لقەکەی سۆسیالیزمی زانستی کاریگەر ببوو. چاوەڕوانی تووشبوونی ئەو کێشانەی لێدەکرا کە ئەو سێ بزووتنەوانە دووچاری هاتبوون. کاتێک لەبوارەکانی ئایدیۆلۆژی، سیاسی و سەربازییەوە PKK دەرفەتەکانی چارەسەری تاقیکردەوە بەشێکی ئەو کێشانەی رووبەرووی بوویەوە هاوشێوەی ئەو کێشانەبوو کە ئەو سێ بزووتنەوانە تووشی ببوون. ئەو کێشانەی سەرچاوەی خۆی لەخودی رێبازە ئایدیۆلۆژی و سیاسییەکەی وەردەگرت PKK هەوڵیدا لەرێگای تیۆری و دەستەواژەکانی دەرهەق بە مۆدێرنیتەی دیموکراتییەوە دەربازیان بکات. دۆخی جێگای باس ئەنجامدانی پێهەڵگرتنی ئایدیۆلۆژی و سیاسی پێویست بوو تا دووچاری هەمان چارەنووسی سۆسیالیزمی بونیادنراو، نەتەوەگەرایی و دیموکراسی سۆسیال نەبێت کە لەئاستی دونیادا باویان نەمابوو و هەڵوەشابوونەوە. بۆ ئەوەی لەلایەن فاکتەرەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نەتوێنرێنەوە پێشخستنی ئەلتەرناتیفەکەی دەستلێبەرنەدراو بوو.

ئەلتەرناتیفی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک چەکەکانی نەتەوەی دیموکرات، ئابووری کۆمیناڵ و پشەسازی ژینگەدۆستی لەبەرامبەر سێ فاکتەرە سەرەکیەکەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری زۆرترین قازانج، دەوڵەت ـ نەتەوە و ئیندوستریالیزم دەرخستە پێش و پێهەڵگرتنێکی بە بڕیاری هەڵنایەوە. بەبێ گفتوگۆکردنی دەستەواژەی مۆدێرنیتە دابڕانێکی رادیکاڵانە لەسەرمایەداری بەدینەدەهات. چەندین ئەلتەرناتیفی ئایدیۆلۆژی بەناو

راستڕەو و چەپڕەوی ئانتی ـ سەرمایەداری لەسەرووی هەمووشیانەوە مەیلەکانی سۆسیالیستی زانستی و ئەنارشیستی لەبەرئەوەی سەرمایەدارییان بەسیفەتی مۆدێرنیتەی هەژموونگەرایی شیکار و دەربازنەکرد سەرکەوتوو نەبوون. لەو دۆخەدا دەرفەتی پێشخستنی گفتوگۆی مۆدێرنیتە و سەرلەنوێ مانادارکردنی تیۆری و دەستەواژەکانی مۆدێرنیتەی جیاواز لەئارادا بوو. بژاری مۆدێرنیتەی دیموکراتیک کە ئێمە هەوڵی پێشخستنی دەدەین یەکێک لە پارادایمەکانی ئەو مۆدێرنیتە جیاوازە بوو. بێگومان دەکرێ گەڕان و بەدواداچوون بۆ مۆدێرنیتەی جیاوازتریش بکرێت. بالأبوونی تیۆری مۆدێرنیتەی دیموکراتیک لەوەدایە کە بەدیدگایەکی دەوڵەتی و دەسەڵاتگەرایی تەماشای کێشەکانی نەدەکرد. هەم سیستەمەکانی شارستانی مێژوو کە لە تەوەرەی دەوڵەت و دەسەڵات پێشخراون، هەمیش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری نوێنەری شارستانییە مێژووییەکانی ڕۆژی ئەمڕۆمان بەدیدگایەکی دەوڵەتی و دەسەڵاتگەراییەوە هەڵوێستیان بەرامبەر کێشە کۆمەڵایەتییەکان پیشاندا. کەچی لە ڕاستیدا دەوڵەت و دەسەڵات خۆیان سەرچاوەی ئەو کێشانەن کە هەوڵدەدەن لەچوارچێوەی توندوتیژییدا چارەسەری بکەن. دەسەڵات و دەوڵەت بەو سیفەتەی ڕێکخستنی توندوتیژین چەندە گەورەبن و دەستێوەردان لەکۆمەڵگادا بکەن، بەو ڕادەیە کێشەکان زیاد دەکات، گەورەتریان دەکات و بەبێ چارەسەرییان دەهێڵێتەوە. نموونە لەژمار نەهاتووەکانی ئەزموونەکانی مۆدێرنیتە و سەرمایەداری درێژایی مێژوو سەلماندوویەتی کە ئەو جۆرە هەوڵانە چ جۆرە توانایەکی ئافراندنی کێشەی هەیە. لەو بەرگرینامەیەدا لەسەر بنەمای مۆدێرنیتەی دیموکراتیک مۆدێلەکانی چارەسەری دیدگای دەوڵەتی و دەسەڵاتگەرایی ڕەخنەکراو و قاڵبوونەوە سەبارەت بەو مۆدێلانەی چارەسەری پێشخرا کە لە تەوەرەی دەوڵەت و دەسەڵاتدا نین. وەک ئەنجامێکی ئەو قاڵبوونەوەش دەستەواژەی ڕێگەچارەی دیموکراتیانە پێشخرا.

بەڵام دەستەواژەی ڕێگەچارەی دیموکراتیک پەیوەندی بە دەستەواژەی "دیموکراتیزەبوون و مافی مرۆڤ"ی لیبڕالیزمەوە نییە، تەواو گوزارشت لە ڕاستینەیەکی جیاوازتر دەکات. لیبڕالیزم کە خوازیارە سۆسیالیزم و مافەکانی تاک بشێوێنێ، خۆی لەدەستەواژەی دیموکراتیزەبوون و مافەکانی مرۆڤ پێچاوە. وێڕای ئەوەی خودی لیبڕالیزم دیموکراتیک نییە، بەڵام بەرگی دیموکراسی پۆشیوە. سەرباری ئەوەی ئایدیۆلۆژیای ئەو سیستەمەیە کە مافەکانی مرۆڤی لەبەین بردووە، خۆی بە پارێزەری پلە یەکی مافەکانی مرۆڤ پیشاندەدات. دونیابینی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکیش لەمیانەی ئەو تیۆری و دەستەواژانەی سەبارەت بە ڕێگەچارەی دیموکراتیانە، یەکسانیخوازی و ئازادی مرۆڤ پێشیخستووە ئەو جۆرە دەمامکانەی لیبڕالیزم دادەماڵێت و چەواشەکاریەکانی مایەپووچ دەکات. هەمان شت سەبارەت بە مافی چارەی خۆنووسینی نەتەوەکانیش ئەنجامدەدات. وێڕای ئەوەی سیستەمی سەرمایەداری خودی گوتەبێژی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کێشەی نەتەوەیی ئافراندووە کە لیبڕالیزمیش ئایدیۆلۆژیاکەیەتی، بەڵام دیسانیش مۆدێلە دەوڵەتی و دەسەڵاتگەراییەکان وەک

ڕێگەچارە پێشنیاز دەکات و دەیانسەپێنێت. بەمجۆرەش وەک چۆن مـەیلی بەدەسـتهێنانی زۆرتـرین قـازانج بـەردەوام کەڵەکـەکردنی سـەرمایە زیـاد دەکـات، مۆدێلـە دەوڵـەتی و دەسەڵاتگەراکانیش بەردەوام دەسەڵات و دەوڵەتەکان زیـاد دەکـەن و کێشـە نەتەوەییـەکان بەدۆخێکی سەخت و بنبەستبوون دەگەیەنن. بەگوێرەی ئەو مۆدێلە دەسەڵاتەکانی دەوڵـەت بێ سنوور زیاد دەکات و دەتوانێت هەموو جۆرە کێشەیەکی نەتەوە و کەمینەکان چارەسەر بکات. زیادکردنی ئۆرگانە خۆجێییەکان و دەوڵەتی نوێ بۆ پاڵ ئـەو دەوڵەتـە فەرمیانـەی ژمارەیان نزیکەی ٢٠٠ قەوارە دەبێت و ئاواکردنی هەزارانی دیکە بەچارەسـەری دادەنرێت. کەچی لە ڕاستیدا دەسەڵات و دەوڵەت ـ نەتەوەکان زیاد بکەن کە بـەجۆرێک لـەجۆرەکان کەڵەکەکردنی سەرمایەی دامەزراوەییە سەرکوتکردن و چەوساندنەوەش زیاددەکـات، لـەو سۆنگەیەوە؛ هەرجۆرە کێشەیەکی نەتەوەیی و کۆمەڵایەتی زیاد دەکات. ڕاستینەی دەوڵەت و دەسەڵاتی ئەو سەردەمەمان ئەم شیکارانەمان دەسەلمێنێت.

لـەو بارەشـەوە وەک ئـەنجامێکی ڕێگـەچارەی دیموکراتیانـە تیـۆری مۆدێرنیتـەی دیموکراتیـک هەڵوێسـتی نەتـەوەی دیمـوکراتی پێشخسـت. نەتـەوەی دیمـوکرات ئـەو نەتەوەبوونەیـە کـە بـەبێ پشتبەسـتن بەدەوڵـەت و دەسـەڵات خـودی گـەل لەمیانـەی سیاسیبوونی پێویستەوە ئەنجامیدەدات. نەک تەنیا لـەڕێگای سیاسـیبوونەوە بـەڵکو بـەو بڕوایەوە کاردەکات کـە بـەبێ ئـاواکردنی دەوڵـەت و دەسـەڵاتدارێتی لەمیانـەی دامـەزراوە خۆسـەرییەکانی بـەرگری خـۆیی، ئـابووری، یاسـایی، کۆمەڵایـەتی، دیبلۆماسـی و کلتوورییەوە دەتوانێت ببێت بەنەتـەوە؛ دەتـوانن خۆیـان بەسیفەتی نەتـەوەی دیمـوکرات بونیاد بنێن. بەگوێرەی پیرۆزی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری تاکە شێوەیەکی دەوڵەت بۆ ئەو سەردەمەمان دەبێت ئەویش دەوڵـەت ـ نەتەوەیـە. بەپێچەوانـەی مەزنـدەکان، دەوڵـەت ـ نەتەوەکەی لیبراڵیزم عەلمانیش نییە. بەپێچەوانەوە، شێوەی مۆدێرنی چەمکی دەوڵـەتی تیۆکراتی تایبەت بەچاخی ناوینە کە جیلوەی نەتەوایەتی لێدراوە. بەگوتەی هیگل دۆخـی بەرجەستەی خوداوەنـدە کـە لـەڕێگای شۆڕشـی فەڕەنساوە دابەزیوەتـە سـەر زەوی. ئـەو ڕاڤەیەی هیگل داوەرییەکی زۆر ڕاستە. چەندە ڕووپۆشی سەر دەوڵەت ـ نەتـەوە لاببـەین و بیکۆڵین، بەو ڕادەیە بتەکانی خوداوەندی چاخەکانی کۆن و نـاوین دەردەکـەوێت. تـا بـەم چەشنە لەناواخنی دەوڵەت ـ نەتەوە تێنەگەین، ناتوانین لەهیچ کێشـەیەکی نەتـەوەیی و کۆمەڵایەتی تێبگەین و چارەسەریان بکەین. ڕێگەچارەی نەتەوەی دیمـوکرات ئاشتیخواز، ئـــازادیخواز و دادوەرانـــەترین ڕێگـــەچارەی کێشـــە نەتەوەییەکانـــە کـــە مۆدێرنیتـــەی سەرمایەداری لەمیانەی شەڕەکانی ئەو چوار سەدەیەی دوایی دەوڵـەت ـ نەتـەوەکان لـەو ڕێگایەوە کۆمەڵگای مێژوویی، جڤاتە ئەتنیکی و گرووپە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی پارچـە پارچەی کردبوو و نووقمی دەریای خوێنی کردبوون.

دەکرێ هەمان هەڵسەنگاندن سەبارەت بە ئیندوستریالیزمیش بکرێت کە مۆدێرنیتـەی سەرمایەداری بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین قازانج بەکاری دێنێت. ڕۆڵی ئیندوستریالیزم لـە بەدەستهێنانی زۆرترین قازانجدا بناغەی سەرجەم کێشە کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکانی ئەو

سەردەمەمانە. تاکە هۆکاری کێشەکانی ژینگەیە. هەسارەکەمان دوو سەدە بەرگەی ئەو ئیندوستریالیزمەی نەگرتووە کە تەنیا خزمەتی زۆرترین قازانج و کەڵەکەکردنی سەرمایەی کردووە. بەو ئاراستەیەی ئێستاوە لەپێناو کەڵەکەکردنی سەرمایەدا پێویستی بەچەند هەسارەیەکی دیکە هەیە. هەرچی هەسارەکەمانە، واتە دونیا رووبەڕووی ئیفلاس بۆتەوە. لەمیانەی تیۆری و دەستەواژەکانی ئابووری کۆمیناڵ و پیشەسازی ژینگەدۆستەوە مۆدێرنیتەی دیموکراتیک سیستەماتیکترین دەرفەتی چارەسەرییە کە بەباشترین شێوە تاک و کۆمەڵگا لەبەرامبەر سەرشێتیەکانی تیۆری زۆرترین قازانج و ئیندوستریالیزمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەپارێزێت. کاتێک رەخنەیەکی راست سەبارەت بە زانستگەرایی ئابووری - سیاسی لیبرال پێشبخرێت کە زۆرترین قازانج و ئیندوستریالیزمیشی وەک دەوڵەت ـ نەتەوە پیرۆز کردووە و وەک تاکە حەقیقەت پێشکەشی کردوون، ئەوکاتە روونەبێتەوە کە ئەوانە ئامرازگەلێکن کۆمەڵگا و دەوروبەرەکەشیان وێرانکردووە. رەخنەنەکردنی ئیندوستریالیزم لەلایەنی سۆسیالیزمی زانستییەوە، وەک ئەلتەرناتیفێکی بەرامبەر زۆرترین قازانج پێشخستنی ئابووری دەوڵەت لەمیانەی مۆدێلی بچووککردنەوەی ئابووریش هەڵە بوو. بەجۆرێک لەجۆرەکان ئەوە لیبرالیزمی چەپڕەو بوو؛ حەواڵەکردنی چارەسەری کێشە کۆمەڵایەتییەکان بوو بۆ دەسەڵاتی دەوڵەت. لەئاکامدا هەڵوەشانەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو لەناوخۆیدا روونیکردەوە کە ئەو ئیندوستریالیزم و ئابوورییەی بەدەستی دەوڵەت جێبەجێ دەکرێت ئامرازی چارەسەرکردنی کێشە کۆمەڵایەتییەکان نین.

کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەداری خۆی کرد بە هەژموونگەرا و وەک تاکە راستینەش سەپاندی و رەوای کرد، رۆڵێکی گرنگی لە بێکاریگەرکردنی سەرجەم رکابەرەکانیدا بینی. لەجیاتی پێشخستنی گفتوگۆکان لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەدا، تەنیا بەرەهەندی کەڵەکەکردنی سەرمایەوە سنووردار کرا. هەرچی مۆدێرنیتەیە بە زۆربەی فاکتەرەکانییەوە پەسەندکرا. هەڵوێستیان سەبارەت بە مۆدێرنیتە رۆڵی دیاریکەری لەتوانەوەی سەرجەم رکابەرەکان هەبوو. هەڵوێستی ئەوپەڕگەری مۆدێرنیستی سۆسیالیزمی بونیادنراو هۆکاری سەرەکی خۆ تەسفیەکردنی بوو. تیۆری مۆدێرنیتەی دیموکراتیک تەنیا ئابووری - سیاسی سەرمایەداری رەخنە ناکات، بەڵکو تەواوی سیستەمەکەی رەخنە دەکات. وەک سیستەمێکی هەژموونگەرایی پەیوەندییەکەی بە مێژووی شارستانییەوە، ئەو گۆڕانکارییانەی لەدیاردەکانی شار، چین و دەوڵەت ریگای لەپێش کردۆتەوە و مۆدێرنیتەکەی خۆی لەسەربنەمای کامە فاکتەر پێکەوە ناوە؛ بەشێوەیەکی سەرتاسەری رەخنەی دەکات و راستیەکانی دەخاتەڕوو. لەمیانەی ئەو هەژموونگەراییە ئایدیۆلۆژییەی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەسەر زانست، فەلسەفە و هونەر ئاوایدەکات بەردەوام خۆی رەوا دەکات. ناوەڕۆکەکەی ئەو بوارە سەرەکیانەی زهنیەت خاڵی دەکاتەوە و دەیکات بە ئامراز؛ وێرانکاریەکەی سەر کۆمەڵگا قووڵتردەکاتەوە. ئیتر زانست، فەلسەفە و هونەر لە بوارەکانی روونکردنەوەی حەقیقەت دەردەخات. بەو سیفەتەی ئامرازگەلێکن بەتەواوی خراونەتە خزمەتی سەرمایەداری و رۆڵیان بە رەواکردنی سیستەم و بەدەستهێنانی

زۆرترین قازانج سنووردار دەکرێت؛ لەناو دۆگماتیزمێکدا دەخنکێت کە لە دونیای چاخی ناوین مەترسیدارترە.

رەخنەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەرهەق بە بوارەکانی زهنیەت تەنیا بە شیکارکردنی دۆگماتیزمی ئەو بوارانە ناوەستێت. ڕێگای زانست، فەلسەفە و هونەریش خۆشدەکات تا بەشێوەیەکی شایستە ڕۆڵی خۆیان لەناو کۆمەڵگادا ببینن. خودی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکیش تەنیا لەمیانەی رەخنەکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەبوارەکانی زانست، فەلسەفە و هونەرەوە ئینجا بە دامەزراوە دەبێت؛ ئامرازەکانی تایبەت بە دەستەواژەکانی خۆی پێشدەخات. لەمیانەی زانکۆی ئازاد و بونیادنانی دامەزراوە ئەکادیمییەکان لەسەرجەم بوارەکانی کۆمەڵگادا هەوڵی چارەسەرکردنی تەنگژەی دونیای زانکۆ و ئاکادیمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری دەدات. چەندە هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی سیستەم هەڵوەشێتەوە، ڕێگای زهنیەتی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە دەکرێتەوە. ئەوەش ڕێگا لەپێش سەرلەنوێ بونیادنانەوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتی دەکاتەوە.

شۆڕشی کوردستان کە لەڕێگای دەستەواژە و تیۆرییەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیییەوە سەر لەنوێ ڕێکخراوەتەوە، بەشێوەیەکی شایستە درێژە بە گەشەکردنی کرداری خۆی بدات، تەنیا بەسەرخستنی ڕێگەچارەی دیموکراتیانەی کێشەی کورد ناوەستێت؛ چارەسەری خۆجێیی شۆڕش لەهەمانکاتدا دەبێتە پتەوترین ئاوێتەی چارەسەری گەردوونیش. وەک چۆن هەر شۆڕشێک لەهەمانکاتدا پووختەی شۆڕشەکانی رابردووە، هەڵگری مانای دەربازکرنیشیانە. لەچوارچێوەی پۆتانسیێلەکەی و ئەو هێزانەی کێشمەکێشی لەگەڵیاندا هەیە شۆڕشی کوردستان پێویستی بە حیساب پرسین لەگەڵ مێژوو و مۆدێرنیتەدا هەیە. ئەگەر ئەو حیساب پرسینەی سەرکەوتووانە ئەنجام بدات گرنگترین کۆمەک پێشکەش بە گەردوونیبوون دەکات. لەو ڕێگایەی بەرەو گەردوون یان گەردوونیبوون دەڕوات وێستگەی خۆرهەڵاتی ناوین ستراتیژییە. ئەگەر لەڕۆژی ئەمڕۆماندا شۆڕشی جیهان ئەنجام بدرێت، سەرجەم هێما و نیشانەکان پیشانی دەدەن کە تەنیا لەچوارچێوەی کلتووری خۆرهەڵاتی ناوین دەرفەتی ئەنجامدانی هەیە. شۆڕشەکانی رووسیا، خۆرهەڵاتی دوور، ئەمریکای لاتین و ئەفریقیا کە ڕەنگدانەوەی شۆڕشەکانی ئەوروپا بوون هیچ کاتێک مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییان دەرباز نەکرد. بگرە زۆربەیان ڕۆڵێکی گرنگییان لەخزمەتکردنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا بینی. کاتێک ڕۆڵی شۆڕشەکانی رووسیا و چین بەڕێبەرایەتی "پارتە کۆمۆنیستەکان" لە پەلهاوێشتنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەئاستی دونیادا ڕەچاوبکرێت، مەبەستەکەمان باشتر مایەی تێگەیشتن دەبێت. پاشکۆی شۆڕشە جیهانییەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە خۆرهەڵاتی ناوین سەرکەوتوو نەبوون. بێگومان کلتووری ناوچەکەش ڕۆڵێکی گرنگی لەوەدا بینی. کلتووری مۆدێرنیتە ناتوانێت بەتەواوی کلتووری ناوچەکە فەتح بکات. سەبارەت بەو بابەتە بەرخودانێکی کلتووری بەهێز لەئارادایە. بەرخودان تەنیا لەڕێگای

کلتووری ئیسلامەوە نییە، کلتووری ناوچەکە کە کلتووری ئیسلام دەربـاز دەکـات، بەسیفەتی میراتگری سەردەمە مێژووییەکان بەرخودان دەکات.

تـەنیا بـەرخودان بەشی رووخانـدنی هەژموونگـەرایی مـۆدێرن و پێشخسـتنی ئەلتەرناتیڤەکەی ناکات. پێویستی بەشارەزایی بونیادنـانی مۆدێرنیتـەی دژ هەیە. لـەو بارەیەوە شۆڕشی کوردستان دەتوانێت پێشەنگایەتی رۆڵـی بونیادنـانی پێویست بکات. لەهەموو روویەکەوە پێگەی کوردستان بۆ ئەو کارە لەبارە. بـەر لەهـەموو شتێک جێگـای خۆی لەناوەڕاستی سێ گەورە نەتەوەی ناوچەکەدا دەگرێت. لەلایەن نەتەوەکانی عەرەب، تورک و فارس ئابلۆقە دراوە. ئەو نەتەوانە هەر یەکە و بەشێکی کوردستانیان خستۆتە ژێر باڵادەستی دەوڵەت ـ نەتەوەکـەی خۆیـان. هـەروەها کوردسـتان وەک وڵاتـیش گـەل و کلتووره کۆنەکانی دیکە لەخۆوە دەگرێت. چەنـدین نەتـەوە و کلتـووری دیکـە لەسـەرووی هەمووشیانەوە ئەرمەنی و سریانییەکان لەگەڵ تورکمان و عـەرەب و فاکتـەری دیکـەی لـە کوردستان نیشتەجێن. بەدرێژایی مێژوو کوردستان ناوەند و پێگـەی دەرکـەوتن و بـەرگری خۆیی چەندین ئایین و مەزهەب بووە. رۆڵی لانکەی شۆڕشەکانی مرۆڤـی هۆمۆسـاپیانس، میزۆلیتیـک، نیولیتیـک، کۆیلایـەتی کـۆن و دەرەبەگایـەتی چـاخی نـاوینی بینیـوە. چارەنووسـی "سـێیەمین جـەنگی جیهـانی" مۆدێرنیتـەی سـەرمایەداری رۆژی ئەمڕۆشـمان لەمیانەی پێشهات و گۆڕانکاریەکانی کوردستاندا دیار دەبێت.

کاتێک تـەواوی ئـەو فاکتەرانـە رەچـاو بکـەین، شۆڕشـی کوردسـتان لـەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیکدا پەرەبسەنێت، ئەوکاتـە دەبیـنین کـە هۆکـارێکی ئـەوتۆ لـەئاردا نامێنێت کـە بـۆ شۆڕشـی دیموکراتیانـەی خۆرهـەڵاتی نـاوین وەرنەچـەرخێت. کۆسپیشـی لەبەردەمدا هەبێت دیسان گەشەکردن دەستلێبەرنەدراوە. لـە کوردستاندا چارەسـەرکردنی کێشەی کورد لـەچوارچێوی نەتـەوەی دیموکراتـدا کاریگەرییـەکی زۆری لەسـەر تـەنگژەی دەوڵەت ـ نەتـەوەکانی خۆرهـەڵاتی نـاوین و ئـەو بێچارەییـە دەبێـت کـە رێگایـان لـەپێش کردۆتەوە. جگە لە رێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات هیچ ئەگەرێکی دیکەی دەربازکردنی ئەو تەنگژە، شەڕ و بنبەستبوونانە نابینرێت کە هەر لەئێستاوە دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئێراق، ئێران، سوریا و تورکیا رێگایان لەپێش کردۆتەوە. سووربوون لەسەر دەوڵـەت ـ نەتـەوە مانـای کێشە و پێکدادانی زیاترە. هەرچەندە خوازیـارن دەوڵـەت ـ نەتـەوەی دیکـە بونیـاد بنێن (بۆ نموونـە؛ دەوڵـەت ـ نەتـەوە بچووکـەکانی کوردان و فەلەستین)، بـەڵام ئەوانـە کێشەکان چارەسەر ناکەن، تەنیا کێشەی دیکـە دەخەنـە سـەر کێشـەکانی پێشـووتر. ئـەو شـتەی وەک چارەسـەری پێشـکەش دەکرێـت ئەگـەر سـەرمایەداری و ئیندوسـتریالیزمی زیاتربێت، وەک لەهەر لایـەکی جیهانـدا دەبینرێت، ئـەو رەوشـە مانـای قـەیران، شـەڕ، وێرانکاری ژینگە و پیسکردنی زیاتری ئاو و هەوایە. شۆڕشی کوردستان کە نەک تەنیا لە فاکتەری نەتەوەی دیموکراتی مۆدێرنیتەی دیموکراتیانە بەڵکو لـە فاکتـەرەکانی ئـابووری کۆمـۆن و پیشەسـازی ئیکۆلۆژیشـدا رووبـدات، لەسـەر میراتـی شۆڕشـەکانی رابـردوو

هەڵدەکشێ و دەربازیشیان دەکات و دەتوانێت ببێت بە سەرەتایەکی پتەو و بەردی بناغەی شۆڕشەکانی سەدەی بیست و یەکەم.

زیاتر دەوڵەت و دەسەڵات سەرچاوەی ئەو کێشانە پێکدێنن کە لەناو کۆمەڵگاکانی خۆرهەڵاتی ناوین لەئارادایە. بەدرێژایی مێژووی شارستانی هەر هێزێکی بەئامانجی چارەسەرکردنی کێشەکان سەریهەڵدابێت، جگە لە پەنابردن بۆ هێز و دەسەڵاتی زیاتری دەوڵەت چارەیەکی دیکەی نەدۆزیوەتەوە. بەکارهێنانی توندوتیژی لە چارەسەرکردنی کێشەکاندا بووە گۆچانە سیحراوییەکەی گەیشتنە دەسەڵات و بەدەوڵەتبوونی سەرجەم هێزەکان لە ئیمپراتۆرییەتەکەی لوتکەوە تا دەگاتە مێردەکەی ناو خێزان. شارستانی خۆرئاوا شێوە مۆدێرنەکانی ئەو نەریتەی ئافراند. لەو بڕوایە دابوو لەمیانەی جیلوەی دیموکراسییەوە دەوڵەت و دەسەڵات دیموکراتیزە دەبن یاخود لیبرالیزم پەنای بۆ ئەو ساختەکارییە برد. تائێستاش لە خۆرهەڵاتی ناوینی ڕۆژی ئەمڕۆماندا هەوڵدەدرێت لەسەر بنەمای دەسەڵاتداریتی و بوون بە دەوڵەت کێشە سەرەکییەکان چارەسەر بکرێت. بۆنموونە؛ لە ئێراق لەجیاتی دەوڵەت ـ نەتەوەیەک لەڕێگای سێ دەوڵەت ـ نەتەوە یاخود زیاتر، لە فەلەستین لەمیانەی ئەو دەوڵەتانەی لە ئێستاوە ژمارەیان بە سێ گەیشتووە، لە ئەفغانستانیش لەڕێگای ئەو دەوڵەتۆکانەی ژمارەیان هێندەی ژمارەی خێڵەکانە هەوڵی چارەسەرکردنی کێشەکان دەدرێت. هەڵبەتە زیادکردنی قەوارەی نوێتر بۆ سەر نوخبەکانی دەسەڵات و دەوڵەت کە خۆیان بارن، جگە لە چەوسانەوە و سەرکوتکردنی زیاتر ئەنجامێکی دیکەی لێناکەوێتەوە. ئەوەش مانای کێشەی کۆمەڵایەتی و پێکدادانی زیاترە. ئەگەر شۆڕشی کوردستان لەمیانەی دامەزراندنی بەڕێوەبەرایەتی کۆنفیدڕاڵ و ئۆتۆریتە (نفوذ)ی دیموکراتیک ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکرات بەدامەزراوە بکات دەکرێ ئەو مۆدێلە بۆ چارەسەرکردنی گرێکوێرەکانی دەسەڵات و نەخۆشییە هەزاران ساڵیەکانی خۆرهەڵاتی ناوین ڕێگا لەپێش وەرچەرخانی ریشەییانە بکاتەوە. ئەو شتەی کلتوور و گەلانی خۆرهەڵاتی ناوین بە پێویستییەکی ژیانیی دەبینێت ئۆتۆریتە (دەسترۆیی)ی دیموکراتیکە. لەدەرەوەی ئەوە هەر هەڵمەتێکی چارەسەری لەسەر بنەمای هێزی دەوڵەت و تاقیکردنەوەی هێز، هەروەک سەرجەم ئەو نموونانەی بینیومانە کە تا ئێستا تاقیکراوەتەوە ڕێگا لەپێش ژیانێکی کۆمەڵایەتی ژێر باری کێشە سەختەکان دەکاتەوە کە بەرگەگرتنی ئەستەمە.

لەژێر ناوی ژیانەوە تەنیا نەخۆشی لە خۆرهەڵاتی ناویندا هەیە. لەڕێگای مۆدێلی دەوڵەت ــ نەتەوە داخراوەکانیشەوە کێشەکان لەبۆشاییدا مانەوە. لەگەڵ ئەوەی هەژموونگەرایی خۆرئاوایی ئەو هێزەی نەنواند کە خۆی لە خۆرهەڵاتی ناوین بەدامەزراوە بکات، بەڵام بەلانی کەم لەمیانەی دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەکانەوە توانی ناوچەکە بە سیستەمی خۆی ببەستێتەوە. ئەو قۆناغەی پێی گەیشتووین مایەپووچ بوونی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە. ئەو دەزگا یان دامەزراوانەی شۆڕشی کوردستان لەچوارچێوەی ڕەهەندەکانی نەتەوەی دیموکرات دەیئافرێنێ و بونیادیان دەنێت دەتوانێت ئەو نەریتە

پێچەوانە بکاتەوە. لەسەر بنەمای کلتووری هاوبەشەکانی مێژوو دەتوانێت یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکان پێشبخات. پێویستە فاکتەرە دیموکراسی یاخود دیموکراسیخوازەکانی کلتوورەکانی خۆرهەلاتی ناوین بچووک نەکرێتەوە. نەریتەکانی خێڵ و قەبیلەکان و نەریتی گرووپە ئایینی و مەزهەبیەکانی تارۆژی ئەمڕۆشمان بەهێزن لەگەڵ پرەنسیپ و دامەزراوەکانی نەتەوەبوونی دیموکراتیانە بکرێتە یەک، دەکرێ بۆ هێزی دیموکراتیزەبوون وەرچەرخێنرێت. پێویستە لەبیرنەکەین کە دەسەڵاتی سەرەڕۆ چەندە لەئارادابێت، ئەوا پێویستیی دیموکراسی هێندە جێگای باسە و فەراهەم دەبێت. هەر شوێنێکی دەسەڵات تێیدا بەهێز بێت هێزی شاراوەی دیموکراسیش مەزنە. زیاتر لەپێویست ئاشکرا بووە کە لەمیانەی چەمکی ئێستای نەتەوە و دەسەڵاتدا خۆرهەلاتی ناوین بەڕێوەنابرێت. هەر لەئێستاوە بونیادنانی چەتری یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشە نەتەوەیی و هەرێمیەکان پێویستیەکی ژیانییە. لەکاتێکدا ئاشکرابووە کە هیچ دەوڵەتێک بە تەنیا لەژێرباری ئەو کێشانە هەڵناستێتەوە کە رۆژ دوای رۆژ گەورەتر دەبن، خۆدزینەوە لە یەکێتی هاووڵاتای بێ بڕیاری و بێچارەییە. دەوڵەت ـ نەتەوەبوونی کوردستانیش ناکرێ وەک پەرەسەندنێکی شۆڕشگێڕی بۆ کوردان وەسف بکرێت. تەنیا کێشەیەکی قورستر یان سەختتر دەخرێتە سەر کێشە قورسەکانی هەرێمەکەوە. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە کوردییەی لە ئێراقدا تاقیدەکرێتەوە تەنیا ئەگەر لە رێگای نەتەوەبوونی دیموکراتیکەوە جلەوبکرێت و بکرێت بە پەدەگێکی سازشکارانەی ئەو قۆناغ یاخود پرۆسەیە، دەشێت رۆڵێکی ئەرێنی لە کوردستان و خۆرهەلاتی ناویندا ببینێت. لەدۆخێکی پێچەوانەدا پێشبینی دەکرێت رێگا لەپێش کێشەگەلێکی زۆر قورستر لەکێشەکانی ئیسرائیل ـ فەلەستین بکاتەوە.

ئەو رێگاچارەیەی مۆدێلی نەتەوەی دیموکرات دەیسەپێنێت نکوڵی لە دەوڵەت نەتەوە ناکات. بەڵکو وابەستەبوونیان بە رێگەچارەی دەستووری دیموکراتیانە دەکات بەپێویستییەک. هاوسەرگیری دەوڵەت ـ دیموکراسی کە لە ئەورووپای خۆرئاوادا تێکەڵ بەیەکتر بووە تاکە مۆدێلی چارەسەری نییە. بەپێچەوانەوە مۆدێلێکە کێشەی زۆرە و چارەسەریش درەنگ یاخود دوادەخات. ئەو مۆدێلەی پێویستە لە خۆرهەلاتی ناوین تاقیبکرێتەوە، رێگەچارەی دەستووری دیموکراتیانەیە کە بوون و خۆسەری نەتەوەی دەوڵەت و نەتەوەی دیموکرات بەبنەما دەگرێت. لەحاڵەتێکی پێچەوانەدا مۆدێلی ئەو یەکێتیانەی دێنەئاراوە پێکهاتەکانی هاوشێوەی کۆنگرەی ئیسلامی و کۆمکاری عەرەبی و (پێویستە کۆنسەی دەوڵەتە تورکەکانیشی بخەینەسەر) دەرباز ناکات. ئەو نەتەوانەی (لێرە لەدەستەواژەی نەتەوە مەبەستمان نەتەوەی سەروو یاخود نەتەوەی نەتەوەکانە کە لەئاکامی رێککەوتنی نەتەوەی دەوڵەت و نەتەوەی دیموکرات دێتەئاراوە) لەناوەوە پابەندی سیستەمی دەستووری دیموکراتیکن بێگومان یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی لەنێوان خۆیان ئاوای دەکەن دەبێتە پەرەسەندنێکی مەزن. تەنیا ئاشتی هەمیشەیی فەراهەم ناکات، بەڵکو لەمیانەی بەیەکەوەبوونی ئابووری کۆمیناڵ و پیشەسازی

ئیکۆلۆژی ئەو کۆمەڵە یاخود سوپایانەی بەتەواوی لەبێکاری رزگاریان بووە مانای بەپێتی ئابووری و ڕێنێسانسی کلتووری دەبەخشێت. لەسەردەمی زانیاری و تەکنۆلۆژیای ئێستادا ناشێت هیچ کەسێک بێکاری، ئابووری بێ بەرهەم و ژیانە کلتوورییە هیوا شکێنەکەی خۆرهەڵاتی ناوین بەقەدەر یان چارەنووسێک دابنێت. ئەوانەی بەمجۆرە سەیری دەکەن کەسانێکن لەدۆخی نابینای ئایدیۆلۆژیدا دەژین یاخود دووچاری هەژموونگەرایی ئایدیۆلۆژی سیستەم هاتوون. تەنیا لەژێر چەتری یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکاندا دەشێت خۆرهەڵاتی ناوین سەرلەنوێ ئەو ڕۆڵە گەردوونییەی خۆی بەدەست بێنێتەوە کە لەمێژوودا درێژخایەن بووە. وەک هەرجار گوتوومە؛ دیسان کوردان لەسەر بنەمای شارستانێتی (ژیاری) دیموکراتیک دەتوانن ڕۆڵێکی هاوشێوەی ئەو ڕۆڵە ببینن کە لەسەردەمی بەرەبەیانی مێژوودا بینیویانە. پۆتانسیێلی شۆڕشی کوردستان و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتی کوردان بەزیادەوە هەموو جۆرە هێز (هێزی ڕۆشنبیری و جەستەیی)ێکی پێویستی لەو پێناوەدا پێشکەش دەکات. لەهەرکاتێک زیاتر شۆڕشی کوردستان شۆڕشێکی خۆرهەڵاتی ناوینە. نەتەوەبوونی دیموکراتیانەی کوردیش یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناوینە.

لەو حاڵەتەدا ڕێگای گەردوونی شۆڕشی کوردستان بەیەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناویندا گوزەر دەکات. چەندین یەکێتی هەرێمی (یەکێتی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەورووپا، ئاسیا، ئەمریکا و ئەفریقیا) مۆدێرنیتەی سەرمایەداری پشتبەستوو بە یەکینەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە و نەتەوە یەکگرتووەکان، لەسەردەمی دامەزراندنیانەوە تا ئێستا چارەسەرییان بۆ هیچ کێشەیەکی جیهانی و هەرێمی نەدۆزیوەتەوە. چونکە ئەو بێچارەییە بونیادییەی دەوڵەت ـ نەتەوە بەدەستیەوە دەناڵێنێت و توانستەکەی بۆ گەورەکردنی کێشەکان و درێژەپێدانیان، بۆ ئەمجۆرە یەکێتییە هەرێمی و یەکینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکانیش لەئارا دایە. لەجیاتی ئەو نموونە سەرنەکەوتووانە، پێکهێنانی یەکێتی نوێ لەمیانەی ئەو یەکینانەی یەکینەکانی دەوڵەت ـ نەتەوە دەربازدەکەن پێویستییەکی دوانەخراوە. وەک چۆن پێویستی بە یەکێتییە هەرێمیەکانی نەتەوە دیموکراتەکان هەیە، لەجیاتی نەتەوە یەکگرتووەکانی ئێستاش پێویستییەکی ژیانیی بە یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی جیهان هەیە کە لەو یەکینانەی نەتەوە دیموکراتیەکان پێکدێت کە دەوڵەت ـ نەتەوەکانیان دەربازکردووە. ئەگەر لەچوارچێوەیەکی هەرێمی یاخود جیهانگیری بێت پێویستە یەکێتی نەتەوە دیموکراتییەکان تەنیا لە یەکینەکانی دەوڵەت پێکنەهاتبێت، بەڵکو یەکێتییەک بێت ڕێکخراوە دیموکراتییەکانی کۆمەڵی مەدەنیش بەشداری تێدا بکەن. ئاشتی جیهان لەرێگای دەوڵەت ـنەتەوەکانەوە بەدینایەت کە خۆیان سەرچاوەی شەڕن. لە هەمانکاتدا گەشەکردن لەمیانەی دامودەزگاکانی مۆدێرنیتەشەوە بەدیناپەت کە سەرچاوەی قەیرانەکانن. نموونەکانی لەئارادان بەپێی پێویست ئەو ڕاستییە دەسەلمێنن. وەک چۆن ئاشتی جیهان بە نەتەوە دیموکراتەکاندا گوزەردەکات، مافی کارکردنی گەلانی جیهان و دابینکردنی پێداویستییە بنەڕەتییەکانیان لە قۆرخکارییەکانی

فینانسی سەرمایەداریدا نییە کە لەپای چاوچنۆکی قازانجەوەن، بەڵکو بەیەکینەکانی پیشەسازی ئیکۆلۆژیک و ئابووری کۆمیناڵ و ژینگەدۆستدا گوزەر دەکات کە هەرکەس کاری تێدادەکات و کارکردن بەئازادی دادەنێت.

تەنیا لەبواری بونیادییەوە لەناو تەنگژەی ئابووری، کۆمەڵایەتی و سیاسی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا ناژین؛ بەڵکو شانبەشانی ئەوە لەتەنگژەی حەقیقەتیشدا دەژین. گەشەکردنی مرۆڤایەتی بەردەوام لەگەڵ گەشەکردنی پەیبردنی بە حەقیقەتەوە بووە. سەرمایەداری کە پەیبردن بە حەقیەقەتی کردووە بە وەهمی و گریمانەیی، لەمێژووی مرۆڤایەتیدا ڕێگای لەپێش خراپترین، دزێوترین و هەڵەترین ژیان کردۆتەوە. ژیانێکی ڕاست لەسەر ڕێگای ژیانێکی چەوت بەدینایەت. ژیانێکی چاک و جوانیش لەڕێگای ژیانێکی خراپ و دزێو بەدینایەت. کارەساتێک کە لەقەیران و شەڕەکان زیاتر بۆ ژیان قورستر بێت، وابەستەبوونێکی کۆیلانەیە بەقوتووەکانی ژیانی گریمانەیی کە ڕێگا لەپێش دابڕانێکی ریشەیی تێگەیشتنی حەقیقەت دەکاتەوە؛ ژیانکردنە لەسەر ڕێگای ژیانی چەوت، قێزەون و خراپ کە لەمێژە کێشراوە. بەگشتی گفتوگۆکانی دەرهەق بە مۆدێرنیتە، بەتایبەتیش گفتوگۆکانی سەبارەت بەمۆدێرنیتەی دیموکراتیک دەتوانێت سەرلەنوێ پەیبردنمان بە حەقیقەت بەرەو پێشەوە ببات. دەشێت لەو ژیانانە دابڕێین کە لە ڕێگا چەوت، قێزەوەن و خراپەکان بەفیرۆ چوو، بەرەو ڕێگاکانی ژیانی ڕاست، جوان و چاک بڕۆین. لەو پێناودا پێویستە لەمیانەی شۆڕشی زهنیەتی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک، لەڕێگای زانست، هونەر و فەلسەفەی بەکۆمەڵایەتیبوو پەیبردنمان بۆ حەقیقەت بەهێزبکەین، ژیانی ڕاست، چاک و جوان فەراهەم بکەین.

# دواگوته

لە ژیانی مرۆڤێکدا هیچ شتێک لەوە هێژا و بەهادارتر نییە بە حەقیقەتی ئەو ڕاستیانە بگات کە تێیدا ژیاوە. پەیجوربوونی حەقیقەت بەهادارترین خەبات یان چالاکی مرۆڤە. ئەگەر پوختکردنەوە پێویست بێت: مرۆڤ ئەو بوونەیە کە حەقیقەتی داهێناوە.

کاتێک دەستم بەکاروانی ژیانم کرد نائامادە و بێچەک بووم. وەک منداڵێک کە لەبنەماڵەیەکی هەڵوەشاوە هاتوومەتە دونیا و بەئەستەم خۆی لەسەر پێیان ڕادەگرێت و کۆمەڵگاکەشی هەڵوەشاوەتەوە منداڵ گەورەکردن زۆر زەحمەتە. ئەوەی بناغەی ئەو زەحمەتییەش پێکدێنێت: لەمێژە ماڵبات ڕاستییەکانی خۆی لەدەستداوە و شتێکی نەماوە بیداتە منداڵەکەی. ئەوەی دەمێنێتەوە دونیای زهنیەتێکی خاڵییە کە بۆ درۆ بێ سنوورەکانی فەرمانڕەواکان کراوەیە. ئەو زهنیەتانەی نەتوانن هەڵوێست بەرامبەر درۆ و دەلەسەکان پیشان بدەن بەڵای سەرن. لەکۆمەڵگا کۆلۆنی یاخود خراپتر لە داگیرکراوەکان دوای قۆناغێکی دیار یان لەمیانەی توندوتیژیەوە پەلکێش دەکرێت یان لە ڕێگای ڕازیکردنەوە باوەڕهێنان بە درۆکان دەستلێبەرنەدراوە. لەو بارەیەوە دونیای حوکمڕانی خاوەن ئەزموونی زۆر بەهێزن. زۆرباش دەزانن لەکوێ بوەستن و درۆ و دەلەسەکانیان چۆن چۆنی بەکاریگەر بکەن. کاتێک ئەو سەرەتایانە دەرباز بکرێت، ئەو پرۆسە دەست پێدەکات کە بەشۆڕش ناودەبرێت. هەموو کاتێک دۆخی دەرئاسای بەمجۆرە جێگای باس دەبن.

لەو کەسانە بووم کە نەیاندەزانی سەرەتا و وێستگەی وەستان چییە.

زوو یان درەنگ کێبڕکێ و ڕاکەڕاکەی ژیان منی ڕووبەڕووی حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان دەکردەوە. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت بەشەکانی بەرگرینامە کە پەیوەست بە سەرگوزەشتەی ژیانمە چۆنییەتی ڕووبەڕووبوونەوەم لەگەڵ حەقیقەتە کۆمەڵایەتیەکان بەشێوەی قۆناغی جیاواز باس دەکات. هەروەها هەوڵماندا چۆنێتی بەڕێوەبردنی نێچیروانی حەقیقەتیش بخەمەڕوو کە لەمیانەی کۆششە ئایدیۆلۆژی و زانستییەکانەوە پەیڕەوم دەکرد. تەواوی ئەو ڕوونکردنەوانەم لەبەرامبەر کێ ئەنجام دا؟ لەبەرامبەر ئەوانە کە نکوڵی لەناسنامە مرۆیی و کۆمەڵایەتییەکەم دەکەن، بەدوای قڕکردنەوەن، بەتاوانبارمان دادەنێن و سزای قورسمان بۆ دەبڕنەوە. هەروەها بەرامبەر ئەو کەسانە دەیکەم کە لەجێبەجێکردنی یاسا و دادوەری سیستەمەکەی بەرامبەر تاکەکانی بەرپرسیارە، بەرامبەر یەکێتی ئەورووپا، ئەمریکا، کۆماری تورکیا و بەکرێگیراوەکانی ئەو ڕوونکردنەوانە پێشدەخەم.

لەکاتێکدا لە تێکۆشانی زیندانە کراوەکەمدا تیۆری و کرداری سەیرم پێشدەخست، دەرفەتێکی ئەوتۆم بۆ پەیبردنی حەقیقەت نەدۆزیەوە. هەلومەرجەکانی زیندانی داخراو مامۆستا و فێرکەرێکی ناوازەیە بۆ ئەو کەسانەی دۆزی گەورەیان هەیە. هەر بۆیەش بەندیخانە داخراوەکان لەوە زیاتر کە مەیدانی تێکۆشانی کرداری و تیۆری بێت، بۆ ئەو

کەسانەی کێشەی گەورەیان هەیە و لەژێریدا نەپڵیشاونەتەوە، شوێنێکە تێکۆشان و پەیبردنی حەقیقەتی تێدا زۆر بەهێزە و سەرکەوتوو دەبێت. بۆ ئەو کەسانەی خاوەن دۆزی مەزن و ڕۆژانە لەپێناو دۆزینەوەیدا تێکۆشان دەکەن زیندان ئەو شوێنەیە کە حەقیقەتەکان بەدەستدەهێنرێن. ئان و ساتەکانی کات پڕ لە دەسکەوتەکانی حەقیقەت بەسەر بچێت، ئەوا ژیانی زیندان مانای دەبێت و شایانی خۆڕاگرییە.

دەستگیرکردنم و هێنانم بۆ ئیمڕالی لەلایەن هێزی سیستەمی هەژموونگەرابیەوە بوو (سیستەمی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری کە ئەمریکا و یەکێتی ئەوروپا ڕێبەرایەتی دەکەن). لەوەش گرنگتر لە ڕێگای بەکارهێنانی هێزە ڕەوا و ڕێگە یاساییەکانەوە ئەو کارەیان نەکرد، لەمیانەی ڕێگایەکی ناڕەوا و نا یاسایی، بە ئۆپەراسیۆنێکی گەورەی گلادیۆی ڕێکخراوە نایاسایی و نانیزامیەکەی ناتۆی ڕێکخراوی سەربازی سیستەم منیان هێنایە ئیمڕالی. لەڕووواڵەتدا گوایە هێزەکانی ئاسایشی کۆماری تورکیا لەئاکامی ئۆپەراسیۆنێکی سەرکەوتووانەدا منیان بێکاریگەر کرد و بۆ ئیمڕالییان گواستمەوە. ئەو دیمەن یاخود تابلۆیەی دەیانویست پیشانی جیهانی بدەن بەمجۆرە پیلانکرابوو. مێژووی هێنانم بۆ ئیمڕالی ١٥ی شوبات بوو. ڕێکەوتی ١٥ی شوبات ڕۆژی دەستپێکردنی پیلانگێڕیەکەی ١٩٢٥ی دژ بە شێخ سەعید بوو. دوای شانۆگەری دادگاکەی دورگە، لە ٢٩ی حوزیرانی ١٩٩٩ بڕیاری لەسێدارەدانیان دا. ٢٩ی حوزەیرانیش ئەو ڕۆژە بوو کە شێخ سەعید و گروپێک لە هەڤاڵانی (١٩٢٥) لەسێدارە درابوون. وەک دیاربوو ئۆپەراسیۆنە گەورەکانی قڕکردن و نکوڵیکردنی سەر کوردان ٧٥ساڵ (بەگوێرەی ساڵی ١٩٩٩) بێوچان بەردەوام بوو. سەبارەت بە چاوترساندن لەڕێگای سزای لەسێدارەدانەوە لەگەڵ کۆنسەی یەکێتی ئەوروپا و ئەمریکا ڕێککەوتبوون. بەڵام ئەو سیاسەتە بنەڕەتی و هاوبەشەی لەسەری ڕێککەوتبوون: لەڕێگای دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاوە سزای لەسێدارەدان بەربەست بکەن، لەکەسێتی مندا PKK و تێکۆشانی ئازادیخوازی کوردستان، بزووتنەوە شۆڕشگێڕیەکانی دەرەوەی کۆنترۆڵیان تەسفیە بکەن، بۆ ئەو ئامانجە بەکاری بێنن. بەنهێنیەکی یەکجار مەزنەوە ئەو کارەیان ئەنجامدەدا. لە"تێکۆشان دژ بە تیرۆریستان" سەبارەت بە پێشێلکردنی ڕێگا ڕەواکانیش سازشیان کردبوو. بەکارهێنانی دادگای مافی مرۆڤ ئەوروپا وەک ئۆرگانێکی رووکەشی، دەمتوانی بیکەم بە دەرفەتی بەرگرییەکی مەزن و شکۆدار. هەوڵمدا وابکەم، بەو ئامانجەش چەندین بەرگرینامەی یەک بەدوای یەکم پێشخست. لەڕێگای دوا بەرگرینامەی بەردەستم خوازیاری ڕاگەیاندنی گەیشتن بووم بە بەشی زۆری ئەو حەقیقەتانەی پەیجوری بووم. لەو بڕوایەدام ئەو بەرگرینامەیەی خستوومەتەڕوو ئەگەر لەچوارچێوەی هێڵە گشتیەکانیشدا مابێتەوە حەقیقەتەکانی سەبارەت بە مرۆڤایەتی، گەلەکەمان و تێکۆشانی پێشەنگایەتیمان پێشکەش کردووە.

لەمیانەی ئەو بەرگرینامەیەی پێشمخستووە لەناو چاوەڕوانی هیچ دەسکەوتێکی یاساییدا نیم. پێشتر ئاماژەم پێکردبوو هەر لەسەرەتاوە کاتێک دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا پیلانگێڕییەکەی شاردەوە و پەردەپۆشی کرد بەگوێرەی فەرمانەکانی سیستەم

جولابوویەوە. تەنانەت ئەگەر بەگوێرەی پێوەرەکانی یاسای بۆرژوازیش بێت، لەیەکەم بڕیارەکانیان روونببووەوە کە دادوەری سەروەر نابێت. بەلام ئەنجامە سیاسییەکانی بەرگرینامەکە زۆر گرنگ بوو. سەبارەت بەو بوارە تەنیا لەناو چاوەڕوانی نەبووم. بەڵکو لەمیانەی ڕێگاگەلێکەوە هەوڵی تاقیکردنەوەی هێزە گەورەکەی تیۆری و کردارم دا کە زۆر سنووردار بوون و لەوانەیە بەگومانەوەش پێشوازی لێبکرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ توانیم پراکتیکی ١٢ی ساڵی زیندانی داخراو سەبارەت بە ڕێگای حەقیقەت و سیاسەت بۆ ئازادی زهن و ئیرادە وەرچەرخێنم. هەر ئەوەش بۆ من و تێکۆشانی بوون و ئازادی گەلەکەم گرنگ بوو. بەگوێرەی ئەو قۆناغەی پێی گەیشتووین سەرکەوتنی پیلانە بەرفراوانەکانی پیلانگێڕان جێگای باس نییە. بەڵکو بۆ یەکەمین جارە بە پێویستی دەزانن دەستبەرداری ئەو سیاسەتەی نکوڵی و قڕکردن (قۆناغی کۆمەڵکوژی کلتووری پەردەپۆشکراو) بن کە ٨٥ ساڵە سەبارەت بە کوردان و کێشەی کورد پەیڕەوی دەکەن. ئەوە پەرەسەندنێکی گرنگە. قۆناغی ئیمرالی رۆڵێکی گرنگی لەو گۆڕانکارییەی ئیرادەی دەوڵەتدا بینی.

بەبێ زێدەڕۆیی دەتوانم بڵێم؛ ئەو پیلانگێڕییەی دژی من ئەنجامدرا ناوەڕۆک و ئامانجگەلێکی هەیە کە رۆڵێکی زیاتری ئەو رۆڵە لەخۆوە دەگرێت کە کوشتنی شازادەی جێنشینی نەمسا لەلایەن ناسیۆنالیستێکی سربییەوە بەئاراستەی بەرپابوونی یەکەمین جەنگی جیهانییەوە لەخۆیەوە دەگرت. ناوبردنی داگیرکاری ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بۆ خۆرهەلاتی ناوین بە "سێیەمین جەنگی جیهانی" کە گرێدراو بە پیلانگێڕییەکە پێشخرا لەوانەیە زێدەڕۆیی ببینرێت. بەلام بەهۆی ئەو پێشهاتانەی ڕێگای لەپێش کردوونەتەوە ئەنجامەکانی بەدڵنیاییەوە دەشێت وەک یەکێک لەقۆناغە گەرم و ئەنجامگیرەکانی"سێیەمین جەنگی جیهانی" پێناسە بکرێت. ئەگەر ئۆپەراسیۆنەکەی دژی من لەو چوارچێوەیدا تاوتوێ بکەین دەتوانین بەمانا راستەقینەکەی خۆی بگەیەنین. لەبەرامبەر سربستانی "یەکەمین جەنگی جیهانی" دەتوانین بڵێین؛ کوردستانی "سێیەمین جەنگی جیهانی" لەڕووی ژیۆپۆلیتیک و ژیۆستراتیژییەوە رۆڵی ناوەندی دەبینێت سەبارەت بە دەستپێکردن، پەرەپێدان و ئەنجامگیربوونی "سێیەمین جەنگی جیهانی" کە سەرچاوەکەی بۆ خۆرهەلاتی ناوین دەگەڕێتەوە. کاتێک ناپلیۆن لەکاتی پێشخستنی داگیرکارییەکەی ساڵی ١٧٩٨ لەڕێگای میسر باسی گرنگی ستراتیژی کوردستان و ئەرمەنستان دەکات، پیشانیدەدات کە زۆر پێشوەخت دەرک بەو راستییە کراوە. وەک ئاگادارین یەکێک لە هەنگاوە یەکەمینەکانی ئیمپراتۆریەتی ئینگلیز لەسەرەتای ١٨٠٠کان کە دوای ناپلیۆن خوازیاری پێشخستنی داگیرکاری سەر ناوچەکە بوو لە باشووری کوردستان لەڕێگای سلێمانییەوە بوو. وەک ئەنجامێکی ئەوەش یەکەمین یاخیبوونی مۆدێرنی کورد لە سلێمانی بەرێبەرایەتی عەبدولڕەحمان پاشای بابان دەستی پێکردبوو. ئینگلیزەکان ئەو هێزە بوون کە سەبارەت بە داگیرکردنی خۆرهەلاتی ناوین و بەدەستهێنانی هەرجۆرە کاریگەرییەک زۆرباش دەرکیان بە گرنگی ستراتیژی کوردستان کردبوو. لە سیاسەتەکانیان دەرهەق بە ئیمپراتۆریەتی عوسمانی و ئێرانی بێت یاخود

ئەرمەنی و سریانییەکان، لەبەکارهێنانی بێبەزەییانەی ڕۆڵی کوردان لەپێناو مەبەستە ستراتیژییەکانیان دوو دڵییان نەکردووە. سەرجەم ئەو هێزانە دۆڕاون و زیانیان بەرکەوتووە کە لەپێناو ئامانجەکانی خۆیان بەکاریانهێنان. بەڵام کوردان لەسەرووی ئەو هێزانەوە دێن کە بەشێوەیەکی تراژیدی زیانیان بەرکەوتووە.

ئینگلتەرا سەرۆکایەتی ئەو داگیرکارییەی دەکرد کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی لە خۆرهەڵاتی ناوین پێشخرا. سەبارەت بە داگیرکاری و چالاکبوونەوە دیسان کورد و کوردستان خاوەن گرنگییە ستراتیژییەکەی خۆی بوو. سیاسەتی ١٩٢٠کانی ئینگلتەرا سەبارەت بە کورد و کوردستان بە ئامانجی بەهێزکردنی کۆنترۆڵەکەی بۆ سەر باشووری ئێران، بەخۆوەگرێدانی بەڕێوەبەرایەتییە بووکەڵە عەرەبییەکەی ئێراق، لەهەمووشی گرنگتر کۆماری تازە دامەزراوی تورکیا ـ بەڕێبەرایەتی مستەفا کەمال ـ لەهێڵێکی بچووکدا سنووردار بکات. سیاسەتی ئاماژەپێکراو سەبارەت بەکوردان لەرۆژی ئەمڕۆماندا لەچوارچێوەی کۆماری تورکیاش پەیڕەوکراوە. بەئامانجی بەربەستکردنی هیوا باوەکانی حوکمڕانی دەسەڵاتدارانی تورک سەبارەت بە خۆرهەڵاتی ناوین لە١٩٢٠کان بەدواوە پڕۆژەیەکی شارەزایانەی کۆمارێکی بچووک جێبەجێکرا. یەکەمین بناغەی ژێرخانی پێویست بۆ هەژموونگەرایی ئینگلتەرا، ئیسرائیل و ئەمریکا لەچوارچێوەی قەوارەی کۆماری تورکیا دانرا. لەئاکامی سازشی بۆرژوازی بیروکراتی تورک و بۆرژوازی یەهودی و ئینگلیز کۆماری تورکیا لەسەر خاکی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا ئاواکرا. لەسازشکارییەکەدا هەر سێ شەریک بەهێزێکی یەکسان جووڵانەوە. ئەگەر ئەو ڕێککەوتنە سێیانییەی بناغەی کۆمار تێنەگەین، ناتوانین گۆڕانکارییەکانی دواتر شیکاربکەین. ئەگەر بەجێهێشتنی موسڵ ـ کەرکوک لەساڵی ١٩٢٦بۆ ئینگلیزەکان، بەدەستهێنانی هاتای (ئەسکەندەروون) لە١٩٣٨، کودەتای ٢٧ی ئایاری ١٩٦٠، ئاگادارکردنامەی١٢ی ئاداری ١٩٧١، ڕژێمی کودەتای سەربازی ١٩٨٠، کوشتنی تورگوت ئۆزاڵ لە ١٩٩٣، قۆناغی کودەتای پۆستمۆدێرنی ١٩٩٧ ـ ١٩٩٨، لەسەرکارلابردنی کابینەکەی بلند ئەجەوید لە ٢٠٠٢ و گەیاندنی ئاکەپە بەدەسەڵات وەک ئەنجامێکی ئەو هاوپەیمانییە سێیانەیە ببینرێت، ئەوا گۆڕانکارییە گرنگەکانی کۆماری تورکیا ڕاستتر مایەی تێگەیشتن دەبێت.

هۆکاری ئاماژەکردنم بەو کورتە مێژووە بەئامانجی خستنەڕووی پەیوەندی پیلانگێڕییەکەی سەر منە بە هەژاندنی ئەو ڕۆڵەی بە کۆماری تورکیا درابوو. ئەو کۆمارە بچووککراوەیەی ڕۆڵ، کار، ناوەڕۆک و پێگەکەی لە خۆرهەڵاتی ناوین لەسەر بنەمای ئانتی ـ ئیسلامی، ئانتی ـکۆمۆنیستی بەرنامەڕێژ کراوە کێ بیهەژێنێت و لەو ڕێبازە بەلاڕێیدا ببات بە دوژمن دادەنرێت و لەناودەبرێت. کێ ئەو بەرنامەیە تێپەڕبکات سەرکوت دەکرێت. شکاندنی بەرخودانی کوردان، لەناوبردنی ئۆپۆزسیۆن، بەئەندامبوون لەناتۆ، گرتنەدەستی دەستپێشخەری گلادیۆ لەرێگای کودەتاکانەوە، لەسێدارەدران، تیرۆرکارییەکان و گێرەشێوێنیەکانی سەبارەت بە بزووتنەوە شۆڕشگێڕییەکان وەک پێویستییەکی ئەو بەرنامەیە ئەنجامدراون. لەئاکامی هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤دا

بەشێوەیەکی قووڵتر رووبەڕووی واقیعی ئەو بەرنامەیە بووینەوە. بە ئامانجکردنی PKK لەو کامپانیایەی لەساڵی ١٩٨٥دا لەلایەن ئەڵمانیا و لەچوارچێوەی ئانتی ـ تیرۆریست دەستیپێکرد، گوتەی" بۆ سەرکوتکردنی PKK و بزووتنەوەی کورد لەندەن لامپی سەوزی بۆ هەڵگیرساندین" کە لەسەرەتای ١٩٩٠کان سوپاسالاری ئەو کاتە دۆغان گورەش ئاماژەی پێکرد، لەناوبردنی تۆرگۆت ئۆزاڵ لەکاتێکدا نیازی سەرلەنوێ رێکخستنەوەی عادیلانەی پەیوەندی کورد ـ تورک بوو، هێرشەکانی قڕکرنی سەرتاسەری کوردان دوای ١٩٩٣، رێکخستنی ئۆپەراسیۆنی هاوبەش لەگەڵ هێزە دەسەڵاتدارەکانی باشووری کوردستان، لەسەر کار لابردنی سەرۆک وەزیران نەجمەدین ئەربەقان، هەڵمەتی تیرۆرکردنی حوسێن کفرک ئۆغلو لەکاتی چاوەڕوانی وەرگرتنی ئەرکی سوپاسالاری، لەساڵی ١٩٩٨ دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێی پیلانگێڕی دژی من، ئەو رەفتار و کردەوانە بوون کە لەچوارچێوەی ئەو بەرنامەیە و لەژێر دەستپێشخەری گلادیۆدا پشکی من و PKK بوون.

کاتێک یەکەمین هەنگاوم بۆ ئەوروپا هاوێشت ئینگلتەرا منی وەک کەسی نەخوازراو راگەیاند: دیسان پێویستی ئەو بەرنامەیەی جێبەجێدەکرد. لێدوانی گاڵتیری راوێژکاری تایبەتی سەرۆکی ئەوکاتەی ئەمریکا کە من بەفەرمانی تایبەتی بیل کلنتۆن رادەستکراوم، داخستنی فرۆکەخانەکانی ئەوروپا لەبەرامبەر ئەو فرۆکەیەی هەڵیگرتبووم، چاودێرییە بەردەوامەکەی ئیسرائیل لە مۆسکۆوە تا کینیا، چەندین کردار و رەفتاری لە ئیمرالی دووچاری هاتم هەمووی لەچوارچێوەی هەمان بەرنامە جێبەجێکران. بەڵام لاسەنگی تەرازووی دادگاییەکەی ئیمرالی، هەلومەرجەکانی گۆشەگیری، چاوترساندن لەمیانەی سزای لەسێدارەدانەوە، شەڕە دەروونییەکان و رەوا بینینی پیلانگێڕی لەلایەن دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا پیشانیاندا کە دامەزرێنەر و پارێزەرە راستەقینەکانی کۆماری تورکیا کێن. ئەو راستییە مێژووییە نزیکانەی ئاماژەم پێکردن لەوانەیە لەلایەن هەندێ کەسەوە تێرکەر نەبینرێت. لەو سۆنگەیەوە؛ بەو ئامانجەی تۆزێکی تریش رۆشنایی بخاتەسەر هەمووێتی بەرگرینامە تاوتوێکردنی وردەکارییەکانی هەندێک رووی هۆکارەکانی رێگایان بۆ پیلانگێڕی کردەوە، ئەوانەی بەرژەوەندییەکانیان هەژاوە و ئەو گۆڕانکارییانەی هاتوونەتە ئاراوە باشتر دەیسەلمێنێت و فێرکەر دەبێت.

دەرکەوتنی PKK لەگەڵ ئەو پرۆژەیەی ئینگلتەرا ناکۆک بوو کە لەو دوو سەدەیەی دواییدا سەبارەت بە کورد و کوردستان پێشخرابوو. ناکۆکبوون چەندین بواری ستراتیژی، ئایدیۆلۆژی و سیاسی دەگرتەوە. پاریکردن بە کورد و کوردستان و سەرلەنوێ دیزاینکردنەوەی هێزە دەسەڵاتدارەکانی تورک، عەرەب و فارس جوگرافیا ستراتیژییەکەی تەنیشتی بەو شێوەیەی پێویستیەتی؛ ئەو سیاسەتەیە کە بناغەی پرۆژەکەی پێکدێنێت. هەر لەزووەوە بێکاریگەرکردنی کورد و کوردستان لەلایەن دەسەڵاتدارانی ئەو سێ دراوسێیەوە و سروشتە یاخیبووەکەیان، پێگەکەیانی بۆ ئەو پرۆژە و سیاسەتانە لەبار کردبوو. هەروەها لەسەدەی نۆزدەهەمەوە هەنگاو بە هەنگاو پرۆژەی ئاواکردنی وڵاتێکی سەربەخۆ بۆ هەریەک لە ئەرمەنی، سریانی و یەهودییەکان لەهەمان جوگرافیا

پێشدەخرا. پێشخستنی پرۆژە بۆ یەکە یەکەی ئەو قەومیەتانە، لەنزیکەوە ئیمپراتۆریەتی ئینگلتەرای پەیوەندیدار دەکرد. هەرچەندە لەرێگای پەیمانی سیڤەر ویستبێتیان پرۆژەی ئاواکردنی وڵاتێک بۆ کوردان دابنێن، ئەوە داواکارییەک نەبوو لەناخەوە بێت. جۆرێک لە رازاندنەوە بوو. بەمجۆرە کوردستان بەتەواوی کراوەتە تەختەی شەترەنج، رۆڵی پیۆنیش شایستەی کوردان بینراوە. هەرچەندە بێ بەزەییانەیە بەڵام یارییەکی راستی وێناو ئامادە پێکەوەنراو بوو. رێککەوتنەکەی رزگاری نیشتیمانی مستەفا کەمال کە لەدەرەوە لەگەڵ فەرەنسی و رووسەکان، لەناوەوەش لەگەڵ کوردانی پێشخستبوو، زەبرێکی قورسی لە پرۆژەی ئینگلیزەکان وەشاندبوو. بەڵام ئینگلتەرا وازی نەهێنا. لەمیانەی ئەو پەیوەندییانەی لەساڵی ١٩٢١ لەگەڵ بەرێوەبەرێتی مستەفا کەمال پێشیخست لەناچارکردنی بۆگۆڕینی ئاراستەکەی زەحمەتی نەبینی. یەهودییە ساباتاییەکان رۆڵی پێشەنگایەتییان لەبزووتنەوەی جۆن تورکدا دەبینی و یەهودییە زایۆنییەکانی لایەنگری خۆیشی لە پرۆژەی کۆماری نوێدا بەکارهێنا. لەرێگای ئەو هاوپەیمانێتیە سیانییەی ئاماژەمان پێکرد کۆمار هاتەئاراوە. سەرلەنوێ رژێمێک دزاین کرابوو کە لەریشەوە لەگەڵ رێککەوتنی رزگاری نیشتیمانی جیاواز بوو. بەمجۆرە لەرێگای کۆمارە بچووکەکەوە سیاسەتە هەژموونگەراییەکەی تایبەت بە خۆرهەڵاتی ناوین پاڵپشتێکی پتەوی بۆ فەراهەم بوو. بەمجۆرە گۆڕانکارییەک روویدا کە بە دژە شۆڕشی ناو شۆڕش ناوی دەبەین.

لەجیاتی هەوڵەکانی دۆزینەوەی وڵات لە کوردستان کە یەهودیەکان لەمیانەی رێککەوتنیان لەگەڵ ئینگلیزەکان کۆماریان کردبوو بەکۆڵەکەی خۆیان پرۆژەی ئاواکردنی وڵات لە فەلەستین جێگای گرتەوە. ئاواکردنی ئەرمەنستانی بچووک لەژێر پارێزگاری بەلشەفییەکان، لەناوبردنی ئەرمەنیەکانی ئەنادۆڵ و تووشبوونی سریانییەکانی میزۆبۆتامیاش بەهەمان چارەنووس گۆڕانکارییەکی رێژەیی لەسیاسەتی ئینگلتەرا سەبارەت بە کورد و کوردستان ئەنجامدا. لەبەرامبەر وەرگرتنی موسڵ ـ کەرکوک، واتە باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)ی ئەمڕۆ، تەواوی باکووری کوردستانی خستە ژێر ویژدانی رژێمی کۆماری نوێوە. ئەوە گۆڕانکارییەکی ستراتیژی و کوشندە بوو سەبارەت بە کورد و کوردستان. لەبەرامبەر ئەوەشدا رژێم تەنیا بە وازهێنان لە موسڵ ـ کەرکوک ناوەستێت، لەبەرامبەر پاراستنیدا بەڵێنی یەکجارەکی وابەستەبوون و یەکێتی دەدات. پێویست ناکات دیاردەکانی سەبارەت بەو مەسەلەیە سەرلەنوێ ریزبکەین. ئەوەی گرنگە، سیاسەتی کوردستانی مردوو و کوردانی پێویستە بکوژرێن لەو رێککەوتنەدا ئەنجامگیر بوو. لەگەڵ ئەندامبوونی تورکیا لەناتۆدا بەرپرسیارێتی ئەو سیاسەتە لەگەڵ ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی دیکە دابەشکرا. پێویست ناکات بڵێین؛ ئەو رێککەوتنە تورکە ئوممەتگەرا و بزووتنەوەکانی ئازادی و یەکسانی تورکە رەنجدەرەکانیشی کردۆتە ئامانج.

ئاشکرایە کە دوای ئەو هەموو ئانتیە وەسفکردنی رژێم زەحمەت نییە. لەسەرەمی دەرکەوتنیداPKK لەو ستاتۆیە بێ ئاگابوو. بەو سیفەتەی گروپێکی بچووکی ناو هێزە چەپەکانی ئۆپۆزسیۆن بوو تا ١٩٨٠ سەرنجێکی تایبەتی رانەکێشابوویە سەرخۆی. تەنیا

هەندێک ڕێکخراوی گێرەشێوێنی زادەیPDK کە شیمانە دەکرا لەژێر کۆنترۆڵی گلادیۆ دابن هەندێک هێرشی تایبەتیان پێشدەخست. بەو ئەگەرەی لەچوارچێوەی میلیگەراییداPDK خۆی سەبارەت بە کوردستان بەرپرس دەبینی، دەیویست سنوور بۆ بزووتنەوەکانی دیکە دابنێت. ئەوەی پەیوەست بە پەرەسەندنەکانی ناوخۆ لەکودەتای سەربازی ١٢ی ئەیلول چاوەڕوان دەکرا لەناوبردنی سەرجەم هێزەکانی دەرەوەی کۆنترۆڵ بوو بەبێ جیاوازی کورد ـ تورک، ڕاستڕەو ـ چەپڕەو، عەلەوی ـ سوننی. کۆنترۆڵی گلادیۆی ناتۆش کە لە ١٩٦٠کان بەدواوە لەچوارچێوەی تورکیا چڕبووبوویەوە لەئاکامی کودەتای ١٢ی ئەیلولی ١٩٨٠ بە لوتکە گەیشتبوو. لەو سۆنگەیەوە؛ سەرجەم هێزە هاوپەیمانەکان لەپشت پیلانەکەی لەناوبردن بوون. بەمجۆرە ئەو ڕۆڵەی لەسەردەمی دامەزراندنیەوە بۆ کۆمار دیاری کراوە، لەگەڵ هەندێک وردەکارییەوە بەڵام لەبنەڕەتدا وەک خۆی بەردەوام بوو.

هەڵمەتی ١٥ی ئابی ١٩٨٤بەهیچ جۆرێک لەحیسابدا نەبوو. ئەنجامی چوونەکەی ساڵی ١٩٧٩ی من بۆ دەڤەرە گەرمەکەی خۆرهەڵاتی ناوینی ڕکابەری سیستەم شیمانە نەدەکرا. دوا حیسابکارییەکانی هەژموونگەرایی کە لەگەڵ یەکێتی سۆڤێت هاتەئاراوە هەلومەرجێکی گونجاوی بۆ پێشخستنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی لە کوردستان ئافراند بوو. قۆستنەوە و بەکارهێنانی ئەو دۆخە بۆ من زەحمەت نەبوو. هەرچەندە بەدرەنگکەوتن و کەموکوڕیش بێت، بەڵام کاتێک هەڵمەتی ١٥ی ئاب دەستپێکرد، منیشی لەناودا هیچ کەسێک پێشبینی ئەنجامەکانی نەدەکرد. خۆی لەخۆیدا شتێکی لەمجۆرە ئەستەم بوو. چونکە دەستێوەردانە ڕۆژانەییەکان هەرساتێک ڕێگای بۆ گۆڕانکاری و پێشهاتی نوێ دەکردەوە. کاتێک هەڵمەتەکە ساڵی یەکەمی خۆی پڕکردەوە، بەپێچەوانەی بانگەشەکان بۆیەکەمین جار ناتۆ ماددەی پێنجەمی لەڕێگای ئەو هێرشە بەکارهێنا کە لەڕێگای ئەڵمانیاوە دەستپێکرد. بەڵام ئەو هەنگاوە لەچوارچێوەی فەرمی و ڕەوا نەبوو، لەلایەن گلادیۆوە پێشخرا کە ناڕەوا و نافەرمییە. هێزە هەژموونگەراکانی لەسەردەمی دامەزراندنی کۆمارەوە (پێشتریش) کە هیچ کاتێک کاریگەری خۆیان لەسەر ژیانی سیاسی تورکیا لەدەست نەداوە، دوای ١٩٥٠کان لەگەڵ ئەندامبوونی تورکیا لە ناتۆ ئەو کاریگەریەیان زۆر بەهێزتر کرد. ئەو کۆمارەی سەرەتا ڕۆڵی پرۆتۆ ـ ئیسرائیلی بینی، دوای دامەزراندنی فەرمی ئیسرائیل بووە تاکە هاوسەرەکەی لەناوچەکەدا. پەیوەندییەکانیان ڕێککەوتنی دەربازکرد و لەئاستی هاوسەرگیرێتییەکی ناڕەوادا بوو. شێوەکانی هاوبەشێتی دەگۆڕا، بەڵام ناوەڕۆکەکەی وەک خۆی دەمایەوە. سیاسەتی دوای ١٩٤٥ی هێزە هەژموونگەراکان سەبارەت بە کورد (ئەمریکا جێگای ئینگلتەرای دەگرتەوە، بەڵام بەردەوام ڕێککەوتنی ستراتیژییان لەنێواندا هەبوو) ئاواکردنی کوردستانی ئێراق سەرەتا بەشێوەی ئۆتۆنۆمی، دواتر بەشێوەی دەوڵەت ـ نەتەوەیەکی بچووک بوون. کوردانی بەشەکانی دیکەی کوردستانیشیان لەژێر سیاسەتی نکوڵی و قڕکردنی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئێران، عەرەب و تورکەکان جێهێشتبوو کە بەکرێگیراوی خۆیان بوون. بزووتنەوەی کوردانی ئێراق لەبنەڕەتدا بۆ پێویستییەکانی ئەو ڕۆڵە بەس بوو کە لە سەدەی نۆزدەهەمەوە سەبارەت

بەکوردان نەخشەی بۆکێشرابوو. لە ڕێگای ئەو بزووتنەوەوە چاوەڕوانی خۆیان سەبارەت بـە ئێـران و تورکیـا، ئێـراق و سـوریا دەردەخسـت. لـەو سـۆنگەیەوە؛ بـە هـەموو هێزەکانیانەوە پشتگیریان دەکرد تا لەسـەر پێیـان بمێننـەوە. ئیسرائیلیش بە ئامانجی هاوشێوە لەپشت ئـەو جوولانەوەیـە بـوو. وەک پێویستییەکی بەرژەوەندییەکانیشـیان هەندێک جار لە خیانەت لێکردنیـان دوودڵییـان نـەدەکرد. لەسەر ئـەو بنەمایە مامەڵـەی مردوو لەگەڵ کوردانی بەشەکانی دیکە سەبارەت بە لۆژیکی بەرژەوەنـدی سیستەم مایـەی تێگەیشتنە.

بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد کە لە ١٩٨٤ بـەدواوە بـرەوی پێدرا و هەڵکشا، ئـەو سیاسەتەی دەرهەق بە کوردانی دەهەژاند کە دوو سەدەی دوایی پێشـخرابوو. لـەو دیرۆکـە بەدواوە شەڕێکی کۆنترگەریلا لەژێر کۆنترۆڵ و ئاراستەکردنی گلادیۆ دەستپێدەکرد. لـەو قۆناغـەدا بـەلانی کـەمPDK لـەژێر چاودێرییـەوە بـەکاردەهێنرا، جـارانێکیش خـۆی وەک هێزێکی کۆنترگەریلا دەجووڵایەوە. ڕێکەوت نییە ئەو ڕێکخراوەی بە ژیتەم ناودەبرێت پاش دەستبەکاربوونی گلادیۆ واتە دوای ١٩٨٥کان ئاواکرا. ژیتەم بـاڵی شـەڕی چەپـەڵی گلادیـۆ بوو. بەهێزکردنی ئەو پێکهاتەیە بەڕادەیەک هەڕەشە لەسوپای باوی تورک بکات مەحاڵـە بەبێ گلادیۆ بیری لێبکرێتـەوە. ڕۆژ بـە دوای ڕۆژ لـەناوبردنی بزووتنـەوەی ئـازادیخوازی کوردان و هێزە پێشـەنگەکەی PKK زیـاتر بـوو بـەرۆژەڤ و جێگیـر بـوو. ئەگـەر تەسـفیە نەکرێت لەوانەیە پیلان، پڕۆژە و کردەوەکـانی دەوڵـەت ـ نەتـەوەی دوو سـەدەی دوایـی سیسـتەمی هەژموونگـەرایی زەبرێکـی گـەورەی بەربکـەوێت، ڕێگـا لـەپێش بۆشـایی و کەلێنگەلێک بکاتەوە جارێکی دیکە پڕنەکرێتەوە. لەگەڵ تێپەڕبوونی ساڵان کاتێک بۆیـان ڕوونبـووەوە کـە بزووتنەوەکـە لـەناو ناچێـت، ڕوویـان لەبـەکارهێنانی میکانیزمـەکانی تامپۆن کرد. هەنگاویان بـۆ سیاسـەتی شـەکر و قـامچی هـەڵێنا کـە لیبرالیـزم بـەدرێژایی مێژووی خۆی بـەکاریهێناوە. بەشێوەیەکی هاوتـەریب لەگـەڵ ئـەو فشارانەی بەتایبـەتی لەڕێگای ئەورووپاوە بۆ سەرPKK زیادی کرد، زیـاتر هەوڵیانـدا گرووپـە ئەلتەرناتیڤـەکان خۆراک بدەن و لەگەڵ سیستەم بیگونجێنن. لەو قۆناغەدا لەگەڵ ئەو پیلانگێڕییانەی دژ بە خۆم برەویان پێدرابوو، زیاتر قورساییان خستە سەر شـەڕی دەروونییـەوە. هـەم لـەناو پەکەکـە و زیندانەکانـدا. هـەم لـەڕێگایPDKوە بەدەستی گرووپ و کەسانێکەوە چەنـدین پیلانگێڕییـان پێشخست، کاتێـک هەسـتیان بـە مەترسـی دەکـرد بـەرەو باوەشـیPDKو دەوڵەتی تورک رایان دەکرد. تەنانەت وایلێهـاتبوو هـەر سـاڵە و پیلانگێڕییـەکی گـەورەی ناوخۆی بەرکەوێت.

پێویستە بەگرنگییەوە ئاماژە بەو خاڵەش بکەم کـە لەسـاڵانی ١٩٩٠کانـەوە ئینگلتـەڕا لەڕێگایYNK، ئیسرائیل ـ مۆسادیش لەڕێگایPDKوە دەیانویست پـەنایان ببەینـە بـەر. چونکـە هەڵوێسـتێکی بـە برەنسـیپانەمان پیشـاندا، بـەلای ئـەمجۆرە پەیوەندییـە ناراسـتەوخۆیانە نـەچووین کـە مانـای مایـەپووچبوونی ئایـدیۆلۆژی و سیاسـی بـوو. بەتایبەتیش ئەگەر ڕێگری لەهەوڵەکانی تەسلیمکاری دوای پێکدادانـەکانی مـانگی ١٠سـاڵی

١٩٩٢ و پێکدادانەکانی ٢٠٠٠ (هەوڵی تەسلیمکاری عوسمان ئۆجەلان، نیزامەددین تاش و چەندین کەسی بەناو فەرماندە) نەگیرابووایە ئەوا تەسفیەکاری سەرتاسەری و بەکرێگیراوێتی ئەنجامی بەدەستدەهێنا. لەو لایەنەوە سیستەم سەرەتا لە رێگای PDK و دواتریش لەرێگایYNK دەرگاکانی بەکراوەیی هێشتبوویەوە.

لەژێر ئەو هەلومەرجانە بەمانگی تشرینی یەکەمی ١٩٩٨ گەیشتین، گەیشتم. چاوەڕوانیان دەکرد لە رێگای ئێراقەوە بچمە شاخ. بەڵام پێشبینیمان دەکرد کە تەگبیرێکی زۆریان لەسەر ئەو رێگایە وەرگرتبێت. هەروەها گرتنەبەری رێگای شاخ مانای تاقیکردنەوەی هەرجۆرە رێگایەکی لەناوبردنی سەربازی بوو. لەو پێناوەشدا سیستەم رەزامەندی پێویستی پیشاندابوو. هەڕەشەی ئاشکرای ئەتیلا ئاتێش فەرمانەدەی هێزە زەمینیەکان ( ١٨ی ئەیلولی ١٩٩٨ ) بۆ سوریا، بەناوبژیوانی حوسنی موبارەکی سەرۆکە بەکرێگیراوەکەی میسر ئەنجامی بەدەستهێنا. منیش زۆر خوازیار بووم لە سوریا دەربکەوم. بەڵام چاوەڕوان بووم لەژێر هەلومەرجی جیاوازتردا بەدیبێت. هەروەها پێگەکەم لە سوریا رۆڵێکی ستراتیژی دەرئاسای بۆ بزووتنەوەی ئازادیخوازی کورد دەبینی. ناچاری نەبێت دەستبەردان لەو رۆڵە راست نەدەبوو. لەبەر ئەوەی چیرۆکی دەرکەوتن و ئەنجامەکانی زانراوە دووبارەی ناکەمەوە. چاوەڕوانیەکانی دوای دەستبەسەرکردنم بەکورتی بەمجۆرەن:

أ) سەرلەنوێ بەهێزکرنەوەی مەیدانی سنووردداربووی جووڵانەوەی کوردی ئێراق لەبواری رێبەرایەتی و جموجۆڵدا و بڵاوکردنەوەی لەتەواوی کوردستان.

ب) پێشخستن و جێگیرکردنی هێزی ئەلتەرناتیڤ لەجێگای PKK و ئەو بزووتنەوە ئازادیخوازەی رێبەرایەتی دەکات.

ج) پێشخستنی گرۆپی تەسلیمکار و بەکرێگیراو لەناو PKK دا.

بەمجۆرەش دەرفەتی سەرلەنوێ پینەکردنەوەی ئەو درز و کەلێنانە دەرەخسا کە لەو سی ساڵەی دواییدا هاوسەنگییەکانی سیستەم لە کوردستان دووچاری هاتبوو. لەو نێوانەدا بەرئەندامکردنی تورکیا بۆ ئەندامێتی یەکێتی ئەوروپا لەچوارچێوی هەمان لۆژیکدا ئەنجامدرا، تەواوی ئەو هەوڵانەی سیستەم لەتەوەرەی کوردستان و چوارچێوەیPKK دا بەرێوەی دەبردن، هەریەکە و بەشێکی پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی گەورەی ئەمریکا بوون. پێشتر کردارەکانی ئەو دە ساڵەی دوایی ئەو پرۆژەیەم وەک گرنگترین قۆناغی "سێیەمین جەنگی جیهانی" پێناسە کردبوو. لەپێناو سەرکەوتنی ئەو پرۆژەیە بەر لەهەموو شتێک دەبووایە من لەناوببرێم. خودی بیل کلینتۆن لەمیانەی ئەو دوو سەردانەی لە ١٩٩٢ بەدواوە بۆ سوریا ئەنجامیدان ئەو هەنگاوانەی دەستپێکرد. بابەتی سەرەکی ئەو دیدارە چوار کاتژمێرییەی لەگەڵ حافز ئەسەد ئەنجامیدا رەوشی من وPKK بوو. چەندین جموجۆڵی دیبلۆماسی هاوشێوە لەئارادا بوون. تەواوی ئەو بەڵگانەی خستمەڕوو دەیسەلمێنن کە وەک کەسێک بینراوم بەلانی کەم وەک تەسفیەکردنی سەددام حوسێن پێویستە لەناوببرێم یان بێکاریگەر بکرێم. ئەو دەوڵەت ـ نەتەوە بچووکەی لە

باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق) لەچوارچێوەی پرۆژەی خۆرهەڵاتی ناوینی گەورە ئاواکراوە ئەنجامێکی سروشتی گۆڕانکاری و حیسابە هەژموونگەراییەکانی ئەو دوو سەدەی دواییە لەناوچەکەدا. چاوەڕوانی سیستەم ئەوەیە وەک رابردوو لەرێگای ئەو ئامرازە نوێیەوە جارێکی دیکە هەم کوردان هەمیش هێزە دراوسێکان بخاتە ژێر کۆنترۆڵەوە، پێویستیش ببینێت راستەوخۆ دەستێوەردان بکات. بەهۆی ئەو ئامانجەیان بەتەواوەتی قەوارەکەی باشووری کوردستان (کوردستانی ئێراق)، دەوڵەت ـ نەتەوەکەی بێبایەخ و بێکەڵک پیشان نادات. بونیادنانی نەتەوەی دیموکرات کە لە کوردستاندا پێشدەخرێت و هەڵوێستی یەکێتی و رێککەوتنی KCKکە پێشەنگایەتی ئەو بونیادنانە دەکات، دەستلێبەرنەدراوە کە لە تەواوی کوردستان و دەوڵەت ـ نەتەوەکانی دراوسێی خۆرهەڵاتی ناوین رێگا لەپێش گۆڕانکاری گرنگ و ئەرێنی دەکاتەوە. هەر لەئێستاوە سیاسەتە باوەکانی نکوڵی و قڕکردن لەکارخراون. ئەگەر ئەو پەرەسەندنانەی لە ١٢ی هەمین ساڵوەگەڕی قۆناغی ژیانی ئیمرالی سەبارەت بە هێزە پەیوەندیدارەکان هاتوونەتە ئاراوە بە کورتی شیکاری بکەین:

أ ) سەبارەت بە رێککەوتنی ئیسرائیل، ئینگلتەڕا و ئەمریکای سەرۆکی هەژموونگەرایی سەرمایەداری ئەو گۆڕانکارییانەی لە سێگۆشەی سوریا ـ ئێران ـ PKK هاتۆتەئاراوە پێچکەیPKK بێکاریگەر کراوە. بەڵام ناتوانین بڵێین ئەوجۆرە گۆڕانکارییە لەخزمەتی سیستەم دایە. ئەگەر بە ئامانجێکی تەکتیکیش بێت تورکیا لەجێگایPKK جێگیرکراوە. ئەگەر لەچوارچێوەی ئانتی ـ کوردیشدا بێت هاوکاری نێوان تورکیا ـ سوریا ـ ئێران تا دواڕادە سیستەمی هەژموونگەرایی بێزار دەکات، بگرە هەڵگری ئەنجامگەلێکە زۆر لە دۆخیPKK مەترسیدارترە، بەتایبەتیش رەوشێکە هەرگیز لەلایەن ئیسرائیلەوە پەسەند ناکرێت. تورکیا لەو پێناوەدا چۆتە ناو ئەو هاوکارییەوە تا کارتەکانی دەستی بەهێز بکات. چاوەڕوانی تورکیا لەجەمسەری ئەمریکا ـ ئینگلتەڕا ـ ئیسرائیل: سپاردنی کۆنترۆڵی کوردەکانی ئێراق بە تورکیا و گەرەنتیکردنی هەوڵنەدانیان بۆ قەوارەیەکی ئۆتۆنۆم یاخود سەربەخۆ، زیادکردنی پشکەکەی لەبەرژەوەندی و داهاتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین و ئێرانیش دووچاری رەوشێکی هاوشێوەی ئێراق نەکرێت. سەبارەت بەو سیاسەتانەی سیستەمی هەژموونگەرایی لەو دوو سەدەیەی دواییدا پەیڕەویان دەکات ئەو چاوەڕوانیانە واقیعی نین. یان ئەوەتە تورکیا گوێڕایەڵی سیستەم دەبێت یان ئەو سیاسەتەی لەسەر ئێراق و ئێران پەیڕەو دەکرێت لەسەرخۆیشی بەڕێوە دەبرێت. گوێڕایەڵیکردنی تەواو بۆ سیستەم مانای سازشکردنی لەگەڵ کوردان، مەودا خستنە نێوان پەیوەندییەکانێتی لەگەڵ سوریا و ئێران. لەحاڵەتێکدا لە سیستەم دابڕێت و بەدوای تەوەرەی نوێدا بگەڕێت یاخود ئاوای بکات، مسۆگەر پێویستە ئۆپەراسیۆنێکی هاوشێوەی ئەوەی سەر ئێراق بۆ سەر خۆی رەچاو بکات. لەو دۆخەدا سیستەم بەتەواوی هێزی خۆیەوە پشتگیری جوڵانەوەی دەوڵەت ـ نەتەوەی کورد دەکات و ناوکی دەوڵەت ـ نەتەوە کوردییەکەی ئێراق بەرفراوان دەکات. بەمجۆرەش پێشبینی جەمسەری ئیسرائیل ـ بەڕێوەبەرایەتی کوردانی ئێراق ـ

KCK دەکرێت کە ئەنجامی گەورەی بۆ ناوچەکە دەبێت، ئەوەش خۆرهەڵاتی ناوین ناچاری وەرچەرخانی مەزن دەکات. ئێستا تورکیا لەسەر پردی سیراتە. بژارێکی مسۆگەری دیارنەکردووە، سیاسەتێکی هاوسەنگی کلاسیک لەگەڵ هەردوو لایەن بەڕێوە دەبات. سیستەمی هەژموونگەرایی لە خۆرهەڵاتی ناوین هەنگاو بۆ دواوە ناهاوێژێت. لەدۆخێکدا هەنگاو بۆ دواوە بهاوێژێت گۆڕان و پێشهاتگەلێک دەستلێبەرنەدراو دەبن کە لەڕیشەوە دونیا دەهەژێنن: لە تەسفیەبوونی ئیسرائیل تا دەگاتە لەناوچوونی چەندین دەوڵەتی عەرەبی گەورە و بچووک دەڕوات.

کاتێک باسی سێیەمین جەنگی جیهانی دەکەین، ئەو پێشهاتە چاوەڕواننەکراوەش ڕەچاو دەکەین. چەکی ناوەکیش لەناودا پێشکەوتووترین چەکەکان بەکاردەهێنرێن. بەهەرحاڵ ئەنجامی زۆر لە دۆخی ئەوروپای پاش دووەمین جەنگی جیهانی جیاوازتر نابێت، بگرە قورستریش دەبێت. کاتێک لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی قۆناغی ئەو دووساڵەی دواییدا بەراورد بکرێت، ئەوا مەترسی پێشهاتە چاوەڕواننەکراوەکان باشتر دەرکی پێدەکرێت. ئەگەر لەناوچەکەشدا بمێنێتەوە سیستەمی هەژموونگەرایی بەدۆخی ئێستا ڕازی نابێت و سنووردار نابێت. وەک هەر سیستەمێکی هەژموونگەرایی دەیەوێ سەرکەوتن بەدەستبێنێت. ئەوەش پێویستی بەوەیە کە ئێران دەستبەرداری کاریگەرییە هەرێمییەکەی تەوەرەی شیعەگەرێتی ببێت، بەپێگەیەکی گوێڕایەڵ و مالیکراوی هاوشێوەی سەردەمی شاهێتی بگات. پەسەندکردنی دۆخێکی بەمجۆرە لەلایەن ڕژێمی ئێرانەوە مانای مردنێتی. سەرجەم نیشانەکان پیشانی دەدەن کە هەوڵەکانی کاریگەربوون لەسەر ناوچەکە بەزیادبوونەوە بەردەوام دەبێت. قۆناغێکی نوێی"سێیەمین جەنگی جیهانی" ئەگەرێکی دوور نییە. دۆخی هاوسەنگییە ناجێگیرەکەی ئێستا ماوەیەکی درێژ بەردەوام نابێت. لەهەرسێ حاڵەتیشدا پێگەی کوردستان وەک جوگرافیا و کوردانیش سەبارەت بە هاوپەیمانێتی ستراتیژییە. لەدۆخێک دایە ئەنجامی هاوسەنگی لەدژی یان لەبەرژەوەندی لایەنەکان یەکلادەکاتەوە. ئیتر لەوە بەدواوە کورد و کوردستان دەستبەرداری ڕۆڵی تەختەی شەترەنج و پیۆن دەبێت کە لە رابردوو بۆیان ڕەوا بینرا بوو، بە پێگە و دۆخی سۆبژە دەگات. سیاسەت و ڕێککەوتنە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی پەیڕەو بکرێن ڕۆڵێکی دیاریکەر لەوەدا دەبینن. ناکرێ پشکی ئەزموونی ژیانی ئیمڕالیم لەپەرەسەندنی گۆڕانکارییەکان بەو ئاراستەیدا بچووک ببینرێت. بێگومان ئەوەش سەبارەت بەهێزە پیلانگێڕەکانی تورکیا و سیستەم مسۆگەر نەرێنی بووە، سەبارەت بەهێزە سازشکارەکانیش دەرفەتێکی گرنگی پێشکەش کردووە.

ب) هەرچەندە هاوکاری نێوان تورکیا ـ ئێران ـ سوریا لەتەوەرەی ئانتی ـ کورددا پەرەبسێنێت، بەڵام ئاکامەکانی زۆر گرنگ و بایەخدار دەبێت. ئەو هاوکارییەش ڕاستەوخۆ گرێدراو بەهێنانی من بۆ ئیمڕالی پەرەیسەند. بانگەشەی گۆڕانکاری تەوەرەی تورکیا لەخۆڕا نییە. ئەگەر لەناو سیستەمی هەژموونگەرایی خۆرئاوادا بمێنێتەوە، ماوەیەکی درێژ بەردەوامی بەو ڕەوشەی ئێستا نادات. چاوەڕوانی تورکیا ئەوەیە لەبەرامبەر هەندێک

قەرەبوو و سازشکاریدا هاوکاری سێیانە لەگەڵ سیستەم بگونجێندرێت، لەو حاڵەتەشدا چارەنووسی ئیسرائیل بەرامبەر مەترسییەکان کراوە دەبێت. مەحاڵە بزووتنەوەی زایۆنیستی ئەو ڕەوشە پەسەند بکات. بەپێچەوانەوە، بەو سیفەتەی ئیسرائیل گرنگترین هاوپەیمانی سیستەمە لەناوچەکەدا و ناوکی هەژموونگەراییە بەردەوام ناچارە کاریگەری خۆی زیاد بکات. مسۆگەر ناچاردەبێت سنوورێک بۆ زیادبوونی کاریگەری ئێران، تورکیا و سوریا دابنێت و بۆ دواوەیان بگەڕێنێتەوە. جۆرێک لە کێشمەکێشی هەژموونگەرایی هەرێمی نێوان ئیسرائیل و تورکیا - ئێران - سوریا لەئارادایە کە ناوی لێنەنراوە. پێگەی ئانتی - ئیسرائیلی ئێران و سوریا ڕوون و ئاشکرایە. ئەگەر لەپێناو ئامانجی جیاوازیش بێت، بەشداریکردنی تورکیا لەو پێگەیەدا، خوازراویش نەبێت شەڕی هەژموونگەرایی لەناوچەکە گورتر دەکات. واتە ئەگەرێکی بەهێزە کە ئەنجامەکانی بەپێچەوانەی چاوەڕوانیەکانی تورکیا بێت.

نادەچێت ئەو ڕەوشە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر سیاسەتی ناوخۆ دەبێت. چاوەڕوانی پەرتەوازەبوونی ڕێککەوتنی ئەو هێزانە دەکرێت کە ڕێگایان بۆ ئاکەپە خۆش کرد، لەجیاتی ئەویش هاوپەیمانێتیەکی نوێی هێزە ناوخۆییەکان ئاوابکرێت. لەو ڕوانگەیەوە؛ گۆڕانکارییەکانی ناوCHP سەرنجڕاکێشە. کێشەی کوردیش کە تورکیای بەرەو ئەو دۆخە ناکۆکە ڕاپێچ کردووە، تەواو بە دووڕیان گەیشتووە. یان ئەوەتا تورکیا ڕازی دەبێت کە کێشەی کورد (لە تورکیا) لەڕێگای ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە چارەسەر بکات کە بەلانی کەم بۆ خۆسەری دیموکراتیک کراوە بێت. ئەوەش مانای سەرلەنوێ گەڕانەوەیەکی بە بەرنامە و ڕاستگۆیانەیە بۆ ڕێککەوتنی ڕزگاری نیشتیمانی هەلومەرجی جیاوازتر. بەمجۆرەش ئەو کۆمارەی لەسەر بنەمای پیلانگێڕییەوە بەلاڕێدا بردرابوو سەرلەنوێ بۆ سیستەمێک وەردەچەرخێت کە بۆ دیموکراسی و نەتەوەبوونی دیموکراتیانە کراوە بێت. یان ئەوەتا زیاتر بە ئێران و سوریا دەبەسترێتەوە و قورسایی زیاتر دەخاتە سەر شەڕی دژی کوردان. سوریا و ئێران بۆ خۆیان لەبەرامبەر کوردان پەرە بەشەڕ نادەن. سیاسەتە باوەکەیان زیاتر بەلایەنی سازشدا دەبەن، قورسایی شەڕیش دەخەنە ئەستۆی تورکیا. وەک چۆن تا ئێستا ڕوویداوە، بەشداریکردنی زیاتر و خەستتر بۆ شەڕەکانی کوردستان، تورکیاش لە ئەفغانستان و ئێراق جیاوازتر نابێت، بەڵکو دەیخاتە ڕەوشێکی خراپترەوە. لەمێژە تورکیا ئەو مەودایەی بڕیوە کە بەڕێبازی سەربازی بتوانێت پێی بکات. لەوە بەدواوە تەنیا لەمیانەی دیالۆگی دیموکراسی و سیاسی دەشێت لەبەرژەوەندی ئەودا بشکێتەوە. هەڵبەتە ئەگەر نەریتە ڕیشەدارەکەی پیلانگێڕی و کودەتا دەرفەتی پێبدات.

ج ) گواستنەوەم بۆ ئیمراڵی ڕووداوێک بوو ڕاستەوخۆ بەرپرسیارێتی یەکێتی ئەورووپای تێدا هەبوو. لەکاتی گواستنەوەم بۆ زیندانە تایبەتەکەی ئیمراڵی یەکەم کەسی پێشوازی لێکردم کاربەدەستی کۆنسەی یەکێتی ئەورووپا بوو، ئەوەش گوزارشتی لەو ڕاستییە دەکرد. سەبارەت بە من لەگەڵ تورکیا بەرێککەوتنێک گەیشتبوون. لەچوارچێوەی

ئەو ڕێککەوتنەشدا لەبەرامبەر بەرئەندامێتی بۆ ئەندامبوون لەیەکێتی ئەوروپا دەبووایە چەندین گۆڕانکاری یاسایی ئەنجام بدات، لەسەرووی هەموشیانەوە هەڵگرتنی سزای لەسێدارەدان. ئەگەر بەشێوەیەکی سنوورداریش بێت لە بوارەکانی دیموکراتیزەبوون و مافەکانی مرۆڤدا ئەو ڕێککەوتنە ڕێگای لەپێش هەندێک پەرەسەندن کردەوە. دوای وەرگرتنی ڕەزامەندی هەژموونگەرایی خۆرئاوا لەبارەی رادەستکردنەوەی من تورکیا بەو ڕێککەوتنە گەیشتبوو. کاتێک دەڵێم؛ ڕاستەوخۆ پەیوەست بە گواستنەوەم بۆ ئیمڕالی، مەبەستم ئەو ڕێککەوتنەیە کە لەمێژە ئاشکرابووە. هەروەها لەبەرامبەر ئەو ڕێککەوتنەدا یەکێتی ئەوروپا پەسەندی کردبوو کەPKK وەک "تیرۆریست" ڕابگەیەنێت و جێبەجێی کرد. دەیویست بۆشاییەکەش بەو کەس و گروپانە پڕبکاتەوە کە ماوەیەکی درێژبوو خۆراکی پێدەدان یاخود نیازی بەکارهێنانیانی هەبوو. لەو بارەشەوە لەگەڵ تورکیا کاریکی هەمەلایەنیان بەتایبەتی لەڕێگای سوێدەوە ئەنجام دابوو. بزووتنەوەی کورد لە خەسڵەتە شۆڕشگێڕی، دیموکراسیخوازی و ئازدیخوازەکەی دادەبڕێنرا، دەخرایە چوارچێوەی پێشخستنی یەکلایەنەی دیموکراتیزەبوون و مافەکانی مرۆڤ. لەڕووداوەکانی دواتر بۆمان ڕوونبووەوە کە لەو بارەوە ئامادەکارییەکی زۆرکرابوو. ئەزموونە مێژووییەکەی لیبڕالیزمی ئینگلیز سەبارەت بەو بابەتە و پێشنیازەکانی ڕەچاو دەکران. هەروەها دیسان لەمیانەی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانەوە تێدەگەیشتین کە لەو بارەیەوە ڕێککەوتنێکی شاراوەی لەگەڵ ئاکەپەشدا پێشخستووە.

لەچوارچێوەی پەیوەندییەکانی لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا تورکیا بە ئامانجی تەکتیکی نزیکی دیموکراتیزەبوون و مافەکانی مرۆڤ دەبوویەوە. لە ئەنجامدانی ریفۆرمدا ڕاستگۆ نەبوو. بگرە ئەو ریفۆرمانەی بۆ خۆیشی پێویستییەکی ڕەهابوون دەیکردن بە بابەتی مامەڵە و هەراجکردن. لەو پێناوەشدا لەکاتی پێویست هێزە پیلانگێڕ و کودەتاچییەکانی وەک گۆچانێک بەدەستەوە گرتبوو. وێڕای ئەوەی زۆر ڕوون و ئاشکرابوو کە لەمیانەی پیلانگێڕییەوە بێکاریگەر کرابووم، بەڵام دەرنەخستنی بڕیارێکی ڕاست لەلایەن دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپاوە فاکتەرێک یاخود ماددەیەکی دیکەی گرنگی ڕێککەوتنی ئەنجامدراو بوو. سەبارەت بەو بابەتەش ئینگلتەڕا پێشەنگایەتی دەکرد. دادوەرە ئینگلیزەکەی ئەندامی دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا داکۆکی کردووە تا بڕیارێکی ڕاست نەدرێت، واتە لەسەر ئەوە سوور بووە کە پرۆسەکەی سەبارەت بە ڕفاندنم بەگوێرەی یاسای نێودەوڵەتی بووە و بۆچوونەکانی خۆیشی کردبوو بەبڕیار. بەو ئامانجەی زیاتر تورکیا بەخۆیەوە ببەستێتەوە یەکێتی ئەوروپا زۆر بەخراپی من، PKK و بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردی بەکارهێنا. تورکیاش لەپێناو ڕێککەوتن لەگەڵ یەکێتی ئەوروپا بەهەمان شێوە زۆر بەخراپی من، PKKو بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردی بەکارهێنا. ویستیان هاوشێوەیەکی سیاسەتە نەریتیەکانی دەرهەق بە کوردان لە ڕێگای تەسفیەکردنی من و پەکەکەوە جێبەجێ بکەن. هیچ یەکێک لە حوکمەکانی یاسا بۆرژوازییەکەی خۆیان جێبەجێ نەکرد کە لە بەرژەوەندی مندا بوون. چەندین نارەزایی لەو بارەوە هەن کە تائێستاش لە دادگای

مافی مرۆڤی ئەوروپا بەردەوامن. وێڕای ئەوەی تورکیا لە خاڵەکانی پەیوەست بەمنەوە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا یاساکانی خۆی پێشێل کرد، بە مەراقەوە چاوەڕوان دەکرێت کە لە بەرامبەر ئەو رەوشانە دادگای مافی مرۆڤی ئەوروپا چ هەڵوێستێک پیشاندەدات.

بابەتێکی دیکەش لەرێککەوتنەکەی ئەوروپا ـ تورکیا هەبوو. لەبەرامبەر سەربەستکردنی تورکیا لەچۆنیەتی جووڵانەوەی سەبارەت بە بابەتی من، PKK و کوردان، لەبارەی چارەسەرکردنی کێشەکانی لەگەڵ ئەرمەنستان، قوبرس و یۆنان هەڵوێستی سازشکارانەی پیشانبدات. لەو بارەیەوە تورکیا بەڵێنی جددی داوە. درێژەی بە سیاسەتی باوی عوسمانییەکان دا. لەبەرامبەر ئەوەشدا داوای لەلایەنە پەیوەندیدارەکان کرد فشارەکانیان بۆ سەرPKK زیاد بکەن، کار و خەباتەکانی بەربەست بکەن و دەستبەردانی یارمەتیدانی بن. دوازدە ساڵە سیاسەتێکی هەڵاواردن لەو بارەیەوە جێبەجێ دەکرێت. تورکیا لەو بڕوایە دابوو کە بەمجۆرە من بە تەواوی دەڕووخێم، PKKش پەرتەوازە دەبێت و کوردانیش دووچاری دۆڕان دێن.

د) هەروەها تورکیا سیاسەتێکی تایبەتی ئیمڕالی هەبوو کە سەربەخۆ جێبەجێی دەکرد. پێویستە ئەوە بە سیاسەتە میللییەکانی ئیمڕالی ناوببەین. تورکیا هێنانەوەی منی بۆ ئیمڕالی بە دووەمین سەرکەوتنی ساقاریا دانابوو. بەتایبەتیش توێژە پیلانگێڕ ـ کودەتاچییەکان تەسفیەکردنی من و پەکەکەیان وەک "دووەمین جەنگی یۆنان لە خۆرئاوا" کردبوو بە ئەفسانە. تایبەتمەندێتییە هەزاران ساڵیەکەی کوردانیان لە مێژووی تورکیا لەبیر کردبوو کە رۆڵێکی مسۆگەر و دیاریکەریان بینیبوو، لەپێگەی ئەو دوژمنە جێگیرکرابوون کە زۆر لە یۆنانی و ئەرمەنییەکان مەترسیدارترن. هەرچۆنێک بێت تۆزێک مابوو ئەو شەڕە بەسەرکەتن بگەیەنن کە چارەگە سەدەیەک بوو بەڕێوەیان دەبرد. لە کەشوهەوایەکی سەرکەوتنی میللییدا هێنانەوەی منیان بۆ دورگەکە پیرۆزکرد کە تا مۆخی ئێسقانیان رۆچووبوو. کاتێک پێم نایە ناو دورگەکە بە لێکۆڵەرەوەکانم گووت:" ئێوە منتان دەستگیر نەکرد، ئەو هێزەشتان نییە. لەمیانەی پلانگێڕییەکەوە رادەستی ئێوەکرام کە لە ماوەی درێژخایەندا دژی ئێوەش ئەنجامگیر دەبێت". هەڵوێستی لێکۆڵەرەوەکانیش خوێن سارد و واقیعی بوو. بەڵام ئەو شەپۆلە شۆفێنستییەی لە سی ساڵی دواییدا ئافرێنرابوو هەرکەسی لە پێشاندانی هەڵوێستێکی واقیعی دوورخستبوویەوە. من هەڵوێستێکی زۆر میانڕەوم پیشاندا تا ئەوان دۆخەکە وەک دەرفەتێکی ئاشتی تاوتوێ بکەن و بەکاری بێنن. مەزندە دەکەم دوای ئەنجامدانی چەندین کۆبوونەوەی نێوان خۆیان ئیتر بەو بڕوایە گەیشتبوون کە من هەرەس دێنم، PKKش لەدۆخێکی هاوشێوە دایە، هەڵوەشانەوەیەکی ناوخۆش ئەگەرێکی بەهێزە، بەمجۆرەش ئیتر یاخیبوونی ٢٩مین لەکۆتایی نزیک بۆتەوە. هەروەها لەگەڵ هەڵوێستە زۆر خراپەکەی MHPکە ئەندامێکی حکومەتە هاوپەیمانییەکە بوو هەلومەرج بەئاراستەی ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە نەڕۆیشت. دەرفەتیان بەوە نەدا.

سێیانەی ئەمریکا ـ ئینگلتەرا ـ ئیسرائیلیش لەگەڵ ئەوەدا نەبوون. پێشتریش چەندین هەڵوێستی بەربەستکارانەی هاوشێوەیان جێگای باس بوو. بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە سیاسەتی"کەروێشک راکە، تانژی بیگرە" یان بەڕێوەدەبرد کە بەسەر تورکیایان سەپاندبوو. بەرپرسانی سیاسەتە میللییەکانی ئیمرالی لەو بڕوایە دابوون کە ئەوجارە لەکەسایەتی مندا کەروێشک توانای راکردنی نەماوە و هیوایان بە هەڵوەشانەوەی خودی ڕێکخستن بەستبوویەوە. ئەگەر بڕیار بەدەست سەرۆک وەزیران بلند ئەجەوید بووایە رێگەچارەی ئاشتییانەی بەربەست نەدەکرد، بەڵام وایزانم ئەو دەرفەتەیان پێنەدا. چونکە پیلانی داگیرکردنی ئێراق لەئارادا بوو. لەروانگەی ئەو هێزانەی بلند ئەجەویدیان لەکارخست و ئاکەپەیان ئامادەکرد ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە خەیاڵێکی خاو بوو. بەتایبەتیش کاتێک بابەتێکی وەک داگیرکردنی ئێراق لەرۆژەڤدا بێت، لەکاتی داگیرکاری و داوتریش مانەوەم لەزینداندا بۆ ئەوان ژیانیی بوو. مەزەندە دەکەم هێزە دەسەڵاتدارە کوردییەکانی ئێراقیش چاوەڕوانییەکی هاوشێوەیان هەبوو. مەنجەڵ و قەپاغ یەکتریان دۆزیبوویەوە.

لەسەردەمی حکومەتەکانی ئاکەپەش قۆناغی ئیمرالی زۆر بەخێرایی قۆزرایەوە. لەبەرامبەر کۆنترۆڵکردنی کوردان لەلایەن ئاکەپەی رووخسار ئیسلامی، بەتایبەتی لەلایەن بەشێکی سوپاوە مانەوەی بەدەست حکومەتەوە گونجاو بینرابوو. لەو سۆنگەیەوە؛ دۆخی مەحکومیەتی من و لەناوبردنیPKK سەبارەت بە ئاکەپەش هۆکارێکی بوون و ژیان بوو. هەربۆیەش هەموو شتێک کرا بەقوربانی حیسابە تەکتیکییە رۆژانەییەکان. هیچ هەنگاوێک لەپێناو ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە نەنران. سەبر و ئارامی ئێمەیان خراپ بەکارهێنا. تەسیفەگەرێتی ۲۰۰۲ ـ ۲۰۰٤ هیوا و چاوەڕوانیەکی لای ئەوان دروستکرد و رۆڵێکی زۆر خراپی بینی. کاتێک ئاکەپە ئیسلامیەتی خستە خزمەتی میللیگەرایی تورکەوە پابەندی هیچ پرەنسیپێکی ئایینی و ئەخلاقی نەبوو. پێویستیەکانی باوەڕی و ویژدانی جێبەجێ نەکرد. هەربۆیەش هەزاران گەنجیتر مردن. زیانێکی گەورەی ماددی و مەعنەوی بەر دەوڵەت کەوت. تاکە لایەنی ئەرێنی ئەوەبوو؛ لەگەڵ دەستپێکردنی قۆناغی ئیمرالی گرژی نێوان پیلانگێڕ ـ کودەتاچییەکان و دژەکانیان کە لەسەردەمی دامەزراندنی کۆمارەوە لەئارادا بوو بۆ یەکەمجار بوو بە ئاراستەی بەرژەوەندی رکابەرانی پیلانگێڕ ـ کودەتادەچیەکان پێشدەکەوت و باڵادەست دەبوون. لەوانەیە ئەوە گرنگترین پەرەسەندنی هەشتا و پێنج ساڵی دوایی بووبێت. بۆ یەکەمین جار بوو هیواگەلێک سەبارەت بە هەنگاونان بەرەو ئاشتی و دیموکراسی سەوز دەبوو. سەبری من و بەرگرینامەکانم دەرهەق بە ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە رۆڵێکی گەورەی لەوەدا بینیبوو. ئیتر دەرکیان بەو رۆڵەی کوردان دەکرد کە لە مێژووی تورکەکاندا بینیوویانە. هەروەها تێگەیشتبوون کە وێڕای تەواوی هەوڵەکانیان بۆ لەناوبردنی بەلام PKKو بزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردان بناغەیەکی پتەو و تۆکمەیان هەیە. ئەوەش رەوشێکی نوێ نەبوون، بابەتێک بوو لەسەردەمی تۆرکۆت ئۆزالەوە دەیانچرپاند. بەڵام بۆ یەکەمین

جاربوو بەرەو سیاسەتێک ئاراستەی گرتبوو. من زۆر پێشووتر بیروبۆچوونێکم سەبارەت بەسەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی پەیوەندی نێوان کورد ـ تورک هەبوو. بۆ یەکەمجار نەبوو باسی بەیەکەوە ژیان بکەم. بەڵام ئەوەش ڕاستییەکە لەمیانەی خۆڕاگری و بەرگرینامەکانەوە لەقۆناغی ئیمراڵی زۆرترین بەڵگەی تەندروست و جێگای باوەڕم پێشخست. ئەو دیالۆگانەی ساڵانی دوایی لەگەڵ هەندێک کاربەدەستانی دەوڵەت پێشمخستن کاریگەرییەکی ئەرێنییانەی بۆ ڕکابەرانی پیلانگێڕ و کودەتاچییەکان هەبوو.

لەقۆناغی ئەمڕۆماندا حکومەتی ئاکەپە سیاسەتی هاوسەنگی بەرامبەر هەردوو مەیلی ناو دەوڵەت بەڕێوە دەبات و هەوڵی بەهێزبوونی زیاتر دەدات. تا ئەو قۆناغانەی دواییش ئاکەپە لەناخەوە لایەنگری ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە نەبوو. بەتایبەتیش لەکاتی پرۆسەی دادگاییکردنی ئەرگەنەکۆندا ئەو هەڵوێستەی بەشێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ڕەنگیدایەوە. تا ئێستاش ئاکەپە پشت بە سیاسەتی هاوسەنگی دەبەستێت، بەتایبەتیش لەمیانەی متمانەی بەدەنگی کوردان ئامانجی سەپاندنی خۆیەتی وەک پێویستییەکی دەستلێبەرنەدراو. بەڵام ڕەچاونەکردنی هەڵوێستی مانادراری کوردان بۆ ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە ئەوانیش ڕاپێچی دۆخی هاوشێوەکانی دەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی ئاکەپە ئەزموونێکی زۆری بەدەستهێناوە و ڕوون و ئاشکرایە بەئاسانی دەستبەرداری دەسکەوتەکانی ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە (بەگووتە) نابێت، بەردەوام دووبارەی دەکاتەوە و کە کاتی بێت لەگرتنەبەری دەسپێشخەری سەبارەت بەو بابەتە دوو دڵی ناکات.

لەقۆناغی ئەمڕۆماندا ڕژێمی کۆمار سەبارەت بەکێشەی کورد لە دەروازەی دووڕیانێک دایە. یان درێژە بەڕێگای شەڕانگێزی کودەتاچی پیلانگێڕەکان دەدات، یان دێتە سەر ڕێگای ئاشتییەکی شەرەفمەند و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە. هەرچەندە چانسی ئاشتی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە زیاد بوویێت، بەڵام مەیلی کودەتاچی ـ پیلانگێڕان کە ڕیشەیەکی مێژوویی بەهێزیان هەیە تائێستاش دەستبەرداری ڕێبازەکانی شەڕی تایبەت و لەناوبردنی سەرانسەری نەبوون. بەئەندازەی تێکۆشانی نێوان لایەنەکان، سەرکەوتنی ئەو تێکۆشانەی کوردان لە ڕێگای ئاشتی و سیاسەتی دیموکراتیانە بەڕێوەی دەبەن هەموو شتێک دەستنیشان دەکەن.

ه) ڕفاندنم و گواستنەوەم بۆ ئیمراڵی کەشوهەوایەکی پرسەی نەتەوەیی بۆ زۆربەی زۆری گەلی کورد ئافراندبوو. کوردان ئەندێشە و نیگەرانی قووڵیان لەو بارەوە بوو کە هیوای ئازادی سەوزبووی سەردەمی هاوچەرخی کوردان لە پرۆسە و قۆناغی ئیمراڵی لەناو بچێت. سەرجەم بەرخودانە هاوچەرخەکانی ئەنجامدرابوون هەمان ئەنجامی تراژیدییان هەبوو. هەربۆیەش وەک "ڕۆژی ڕەش "یادی ١٥ی شوبات کرایەوە. کاتێک یادگاری ١٥ی شوباتی ١٩٢٥یشی هاتەسەر، باشتر دەرک بە جددیەتی ڕەوشەکە کرا. لەئاکامی ئەو خۆڕاگری و بەرخودانەی بەرامبەر پیلانگێڕی ١٥شوبات پیشاندرا شەهادەتی

بە نرخ و بەهاداری لێکەوتەوە. ئەو شەهادەتە بە نرخانە دەیسەلمێنن کە جارێکی دیکە رابردوو دووبارە نابێتەوە.

هەر بەشێکی کوردستان بەشێوەیەکی جیاواز کاریگەربوو. کوردانی کوردستان ـ تورکیا بە ئەندێشە و ترسێکی مەزنەوە پێشوازییان لەقۆناغ کرد. بەشێوەیەکی راست و تەواو دەرکیان بە پێشنیازی پاشەکشێی گەریلا بۆ باشووری کوردستان نەکرد و پێویستییەکانیشی تەواو جێبەجێ نەکران. بەڵام ئەو پابەندبوونەی بۆ پێشنیازەکە پیشانیاندا و زەحمەتییەکانی لەو بارەوە رووبەڕووی بوونەوە زۆر ماناداربوون. هەروەها ئەو هەنگاوەی دوو گرووپەکەی ئەورووپا و شاخ بە ئامانجی پەیامی ئاشتی هاویشتیان هەمان بەهای هەبوو. وەک چۆن پاشەکشێ لە ناو دۆخێکی ترس و دڵەڕاوکێدا روویندا، کەوتنی ورە و مۆراڵی گەلیش جێگای باس نەبوو. هەروەها تا ساڵی ٢٠٠٥ قۆناغێکی زۆر زەحمەت بەڕێوەچوو. تەسفیەگەرێتی ٢٠٠٢ ـ ٢٠٠٤ گورزێکی لە بزووتنەوە وەشاندبوو زۆر لەو پیلانگێڕییە قورستر بوو کە لەدەرەوە دەسەپێندرا. ئەو خیانەتەی لەناو گەل روویندا لەناو PKKسەریهەڵدا. ئەوانەی ساڵانێکی درێژیان لەسەر رەنج و ماندووبوونی لەهەنگە هێژاکان بەسەر برد و لەو بڕوایەدابوون بزووتنەوەکەمان ناتوانێت جارێکی دیکە خۆی کۆبکاتەوە، ئەو خیانەتەی سەپاندیان جۆرێک بوو نموونەکەی لەمێژوودا دەگمەنە. هەم بەرامبەر بەو خیانەتە، هەمیش بەرامبەر هەڵوێستە نابەرپرسانەکانی ئاکەپە راگەیاندنی قۆناغی نوێ لەلایەن PKKوKCK لەسەربنەمای ئەو رێبازەی وەرچەرخانی بەخۆیەوە بینیبوو، پەرەسەندن و رووداوێکی گرنگ بوو. ئەوەش پەرەسەندنێک بوو لەلایەن دەوڵەت و حکومەتی ئاکەپەوە چاوەڕواننەکراو بوو. ئەو دۆخەش رێگای دیالۆگی لەگەڵ دەوڵەت کردەوە. ئەو هەنگاوانەی پارتی گەلی دیموکراتیک (HADEP) و پارتی کۆمەڵگای دیموکراتیک (DTP) لەو قۆناغە هاویشتیان شایانی باسکردنن. خۆپیشاندان و گردبوونەوە بەردەوامەکانی گەل هەڵگری چەندین گۆڕانکاری و پێشهاتی گرنگ بوو. بەدەستهێنانی بەڕێوەبەرایەتی چەندین شارەوانیش کاریگەرییەکەی پیشاندەدا.

تەواوی ئەو پەرەسەندنانە بەس نەبوون تا حکومەتی ئاکەپە بەرەو ئاشتی و رێگەچارەی دیموکراتیانە هەنگاوبنێت. بەشێوەیەکی قووڵتر و بەبێدەنگییەوە درێژەی بە سیاسەتی تەسفیەکردن دا. بەرپرسیارێتی سیاسی هەنگاوەکانی دەوڵەتی بە ئاراستەی دیالۆگ نەگرتە ئەستۆ و گۆڕانکاری یاسایی پێویستی ئەنجامنەدا. بەپێچەوانەوە سەرجەم یاساکانی دەرهەق بەبزووتنەوەی ئازادیخوازی کوردانی توندتر و وشکترکرد. ئەدەبیاتی "کرانەوەی دیموکراتیانە"ی ئەو یەک دوو ساڵەی دواییش جگە لە هەوڵێک بۆ بەربەستکردنی کەوتنی دەمامکەکەی هیچ رۆڵێکی دیکەی نەدەبینی. وێڕای سەرجەم هەوڵە نیازپاکییەکەی من، گەل، PKK-KCK و ئاگربەستە یەکلایەنەکان، بەڵام دەستبەرداری بێچارەیی، کۆکردنەوەی هێز و داهات نەبوو. بەرامبەر بەو رەوشە کۆنگرەی کۆمەڵگای دیموکراتیک کە رێکخراوی چەترئاسای رێکخراوەکانی کۆمەڵگای مەدەنییە لە رەهەندی "خۆسەری دیموکراتیک" دەتوانێت پرۆسەکە بەهێزبکات.

بەڵام دووری ئاکەپە و پارتەکانی دیکەی دەوڵەت ـ نەتەوە لە خەسڵەتە سەرەکیەکانی مۆدێلی ڕێگەچارەی دیموکراتیانە، ئامادەنەبوونیان لەبواری زهنی و کردارییەوە و بگرە ئەو دۆخەیان کە کۆسپی دەنایەوە، کاریگەرییەکی نەرێنی کردە سەر قۆناغە مێژووییەکە. بەرپرسیارێتی سیاسی ئەو دیالۆگەیان نەگرتەئەستۆ کە لەگەڵ دەوڵەت بەڕێوەدەچوو. لەمیانەی ئەو ئەزموونەوە ئاشکرابوو کە بەرپرسیارێتی سەرەکی سەرنەکەوتنی کرانەوەی دیموکراتیک و کرانەوەی کورد ناکەوێتە سەر دەوڵەت، بەڵکو دەکەوێتە ئەستۆی ئۆلیگارشی سیاسی. بونیادەکانی ئۆلیگارشی سیاسی کە لەپای بەرژەوەندیپەرستی و داهاتەکانی دەوڵەتەوەن هۆکاری سەرەکی قوفڵبوونی بنچینەیین. ئەو دۆخەش سەرلەنوێ کوردان و بزووتنەوە ئازدیخوازەکەیانی بەدەروازەی ڕێگایەک گەیاند. ئەو وەڵامەی درابایەوە پەیامە ئاراستە کراوەکان یان بەئاراستەی ئاشتییەکی گەورە و شەڕەفمەندانە و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە ـ بەلانی کەم ناوەڕۆکەکەی خۆسەری دیموکراتیک بێت ـ دەبێت، یان هەنگاونان بوو بۆ قۆناغی شەڕەکانی بەرگری خۆیی کە زۆر لە شەڕە چڕ و ئاست نزمەکانی سی ساڵی رابردوو بەرفراوان و دژوارتر بێت و بەشێوەیەکی تێکەڵ لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتی یەکلایەنەیKCK پەیڕەو دەکرێت. ناوبردنی ئەو سەردەمە بەقۆناغێکی نوێی شەڕ کورت دێنێ و ناتەواوە. بەو ئەندازەیەی لە ئامادەکارییەکانی PKK_KCK تێدەگەین کە لەراگەیاندنەکاندا ڕەنگیداوەتەوە ڕاگەیاندنی " بەڕێوەبەرێتی کوردستانی خۆسەر و دیموکراتیک "ی کوردستانی نوێ جێگای باس دەبێت کە پشت بە ئۆتۆریتەی دیموکراتیک دەبەستێت.

بەڕێوەبەرێتی کوردستانی خۆسەر و دیموکراتیک کە لەسەر بنەمای سەرجەم ڕەهەندەکانی نەتەوەی دیموکرات پێشدەخرێت ڕەوشێکی نوێ دەئافرێنێت. دوو ئۆتۆریتە جێگای باس دەبێت:

ئۆتۆریتەی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک و ئۆتۆریتە یاخود بەڕێوەبەرێتی خۆسەری دیموکراتیانەی کوردان. ئاشکرایە کە قۆناغێکی زۆر ئاڵۆز بەڕێوە دەچێت. لەمیانەی هەزاران بڕیاری بەڕێوەبەرایەتی خۆسەر یەکلایەنە پشت بە بەرگری خۆیی دەبەدات، ئەوەندە ڕێکخراوەی ئاوایدەکات لەوانەیە ڕێگا لەپێش ئەنجامگەلێک بکاتەوە لە شەڕ و پێکدادانەکانی نێوان ئیسرائیل ــ فەلەستین قورستربێت. تەنیا ئاشتیەکی جددی و شەرەفمەندانە، ڕێگەچارەی خۆسەری دیموکراتیانەی دوولایەنەی پشبەستوو بەدانوستاندن و بنەمای یاسایی و دەستووری دەتوانێت قۆناغێکی چاوەڕوانکراوی بەمجۆرە بەربەست بکات. ئاشکرایە ئەو هەوڵانەی یەکپارچەیی کۆمار لە دیموکراسیدا دەبینن چیتر بەرگەی دەرنکەوتن ناگرن. یان ئەوەتا قۆناغ لەسەر بنەمای برایەتی، یەکپارچەیی، یەکێتی ئازاد و یەکسان بەڕێوەدەچێت کە پەیوەندییەکانی کورد ــ تورک بەگوێرەی هەڵوێستێک ریفۆرمیزەکراون شایستەی ڕۆحە مێژووییەکەی بێت و وەڵامی مانا ستراتیژییەکەی بداتەوە، یان چانسی یەکێتی ئازادانە بەکار ناهێنرێت، قۆناغێک جێگای باس دەبێت کە

هەردوو ئۆتۆریتەش لەڕێگای بڕیاری یەکلایەنە هەوڵی بەڕێوەبردنی دەدەن، بەمجۆرەش ڕۆژ دوای ڕۆژ ڕێگا لەپێش شەڕ و جیابوونەوەی زیاتر دەکاتەوە.

کوردەکانی ئێستای ئێراق وەک گرووپێکی تایبەت لەسەرەتاکانی سەدەی نۆزدەهەم واتە لەسەردەمی پەرەسەندنی هەژموونگەرایی ئینگلیز لە کەنداو کران بە ئامانج. لەڕێگای ئەوانەوە هەوڵیاندا بۆ ناو قووڵایی کوردان و کوردستان نفوز پەیدا بکەن. مژدەدەر و سیخوڕە ئینگلیزەکان گرووپی نوخبەیان لە پلەداری سەرەوەی خێڵ و تەریقەتەکان کۆکردەوە و هەوڵیاندا بیانخەنە خزمەتی خۆیانەوە. ئەو ڕەوشە تا دووەمین جەنگی جیهانی بەردەوام بوو. ئەو قۆناغە بریتییە لە سەردەمی میلیگەرایی سەرەتایی. دوای دووەمین جەنگی جیهانیش لەڕێگایPDK کانەوە هەوڵیاندا درێژە بە هەمان سیاسەت بدەن. ئەوەی جیاواز بوو زیادبوونی کاریگەرییەکانی ئەمریکا و ئیسرائیل بوو. لەساڵی ١٩٦٠ بەدواوە بەشێوازی یاخیبوون و گەریلا و پشتگیری ئەمریکا، ئیسرائیل و ئێران نزیکی ئۆتۆنۆمی بوونەوە. بەڵام هەلومەرجی نێودەوڵەتی و ڕێککەوتنی ئێران ـ ئێراق ڕێگای لەپێش تەسفیەبوونیان کردەوە. لەساڵی ١٩٧٥ بەدواوەش بەشێوەی دوو باڵ پەیوەندییەکانیان لەگەڵ هەمان هێزە هەژموونگەراکان پەرەپێدا و بەئاراستەی دەوڵەت ـ نەتەوەی فیدراڵ مەودایان بڕی. ئامانجەکانی هەژموونگەرایی سێیانەی ئەمریکا ـ ئینگلتەرا ـ ئیسرائیل هاوبەش بوو: تەنگەتاوکردنی ڕژێمی عەرەبی ئێراق، بەکارهێنانی ئەو قەوارەیە وەک قۆزێک لەبەرامبەر دراوسێکانی تری.

کەوتنەگەڕی PKKدوای ١٩٨٥ ناڕەحەتی لای ئەوان دروستکرد. بەرتەسکبوونەوەیەکی بەرچاوی کاریگەرییەکەیان سەبارەت بە تەواوی کوردستان هاتەئاراوە. پێشوازینەکردن و بەپەرۆشنەبوونیان بۆ ڕێککەوتنی مۆدێرن و ئۆرگانیزاسیۆنی هاوبەشی لەچەشنی کۆنگرە کاریگەری لەوەدا هەبوو. بێ متمانەیی و کێبڕکێ لەنێوان هێزەکان پەرەیسەند. شەڕ و پێکدادانە باو و نەریتییەکانی نێوان PDK-YNK ، پێکدادانەکانی نێوان PKK-PDK و PKK-YNK ی هاتەسەر. لەگەڵ جێگیربوونی "هێزی چەکوشی ئامادە" لە ناوچەکە لەساڵی ١٩٩٠ بەدواوە پەیوەندی خۆیان لەگەڵ هێزەکانی گلادیۆ ـ ژێتەمی تورکیا پێشخست، بەیەکەوە هەوڵی تەسفیەکردنی PKKیاندا. تا سەردەمی قۆناغی ئیمراڵی چەندین ئۆپەراسیۆنی هاوبەشیان ئەنجامدا. لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی ناوبەینکاری نێوان PKK و کۆماری تورکیاشیان دەبینی، بەڵام YNK دەستبەرداری هەوڵەکانی تەسفیەکاریش نەبوو. PDK بەشێوەیەکی چالاک بەشداری ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانی کرد و هەوڵی لەناوبردنی PKKی دا. بە ئاسوودەبوون و بەختەوەرییەوە پێشوازیان لەقۆناغی ئیمراڵی کرد. کەسانێکیان لەناودا هەبوو ڕزگاربوون لە من و PKKیان وەک ڕزگاربوون لەسەددام تاوتوێ دەکرد. بەڵام گەل باوەڕییەکی جیاوازی هەبوو. زۆر باش دەیانزانیPKK نەبێت ڕێکخراوە کوردییەکانی ئێراق و سەرکردەکانیان نرخیان نابێت، چانسی سیاسەتکردنیان زۆر کەمە. گەلی باشوری کوردستانیش بەنیگەرانی و ئەندێشەیەکی قووڵەوە پێشوازییان

لەقۆناغی ئیمڕالی کرد. ئاگادارین کە چەندین گرووپ و کەسانی نیشتمانپەروەر بەهەمان ئەندێشە و داوای هاوکارییەوە بەرەو پیلمان هاتن و خۆشیان بەختکرد.

داگیرکردنی ئێراق دوای ۲۰۰۰کان بەئەندازەی دەرفەتێکی دیرۆکی، هەلومەرجێکی کراوە بۆ مەترسی نوێ پێکدێنێت. پێکهێنانی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی کوردان، هەنگاوێک بوو پێویست بوو بنرێت. وەلێ ناوەڕۆکە دیموکراسییەکەی جێگای گفتوگۆ بوو. پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا بەهیچ جۆرێک سەبارەت بە تەواوی کوردان بە پرەنسیپ و جێگیر نەبوو. بەڵام قورسایی زیاتریان خستەسەر دابڕان لە باڵە کودەتاچی – پیلانگێڕییەکەی کۆماری تورکیا و پێشخستنی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ باڵەکەی لایەنگری ئاشتی و سازش. ستاتۆی کەرکوک کاریگەری سەبارەت بەو بابەتە هەبوو. لەبەر ئەوەی دەزانن هێزەکانیان توانای تەسفیەکردنی PKK-KCK یان لەناوچەکە نییە و بگرە ئەوە بەگوێرەی بەژەوەندییەکانیان نییە، لەوانەیە پلاتفۆرمێکی نوێ لەنێوان هێزەکاندا ئاوابێت. بەهۆی بەربەست و کۆسپە یاساییەکانی بەڕێوەبەرایەتی هەرێمی کوردان دروستی دەکات کار و خەباتی کۆمەڵگای دیموکرات و یەکێتی نەتەوەیی لە باشووری کوردستان دەرفەتێکی ئەوتۆی پێشکەوتنیان نییە. ڕاکردن و خیانەتی چەندین کەسی ناو PKK ش کە لەو دەقەرە بەرپرسیار بوون ڕۆڵی لەوەدا هەیە. هەروەها دەقەرێک بوو کە چەمکی لادانی ڕاستڕەوانە لێی گیرسابوویەوە، زەبری لە پراکتیزەبوونی ڕێبازی شۆڕشگێڕانە دابوو. هەروەها کار و خەباتی پارتی چارەسەری دیموکراتی کوردستان (PÇDK) لەناو خەڵکەکەمان لەو ناوچەیەدا بایەخدارە کە ئاستی پراکتیکی لە کوردستان پێشکەوتووە. پێشخستنی زهنیەتی نەتەوەی دیموکرات و ئۆتۆریتەی خۆسەری دیموکراتیانە بەرامبەر زهنیەتی دەوڵەت – نەتەوە و بەشداریکردنی کۆنگرەی نەتەوەیی – نیشتمانی دیموکراتیک لە ئەرکە سەرەکییەکانێتی. لەمیانەی پلاتفۆرمێکی لەچەشنی کۆنگرەی نیشتیمانی - نەتەوەی دیموکراتیک دەشێت پەیوەندییەکان بەستاتۆیەک بگات. لەمیانەی کۆنسەی بەڕێوەبەرایەتی هەڵبژێردراو لەلایەن کۆنگرەوە و کۆنسەی یەکینەکانی بەرگری خۆیی کە گوزارشت لە یەکبوونی هێزە چەکدارەکان دەکات، پەیوەندییە ناوخۆیی و دەرەکییەکانی تەواوی کوردان هاوسەنگ دەکات و دەتوانێت بە گوزارشتێکی هاوبەشیان بگەیەنێت. بەمجۆرە هەم توانستی ئاشتی ناوخۆیی و ڕێگەچارەی دیموکراتیانە لەنێوان کوردان پێشدەکەوێت، هەمیش توانای پێشخستنی پەیوەندی دیبلۆماسی هاوبەش لەگەڵ هێزە دەرەکییەکان بەدەستدێنن، لەسەرووی هەمووشیانەوە لەگەڵ دراوسێکانیان.

کوردانی ئێران لەمیانەی پرسێکی قووڵی نەتەوەییەوە پێشوازییان لەقۆناغی ئیمڕالی کرد. لەکاتی ئەنجامدانی خۆپیشاندانەکانی نارەزایی دەربڕیندا چەندین شەهیدیان پێشکەش کرد. یارمەتی و هاوکاری خۆیان خستەڕوو. لەگەڵ ئاوابوونی PJAK هەڵوێستی خۆیان بە دامەزراوە کرد. ئەو بێ هیواییەی ڕێکخراوە بێچارەکانی هاوشێوەی PDK ئافراندبوویان، لەڕێگای PJAK ەوە هەوڵیاندەدا سەرلەنوێ بۆ هیوا و ژیانەوەی وەرچەرخێنن. ئەو هەوڵە لەئاستی نەتەوەیی و نێودەوڵەتیدا دەنگی دایەوە و پشتگیری

بەدەستهێنا. PJAK وەک هێزێکی کاریگەر جێگای خۆی لەژێر چەتری KCKدا دەگرێت. لەرێگای چەندین شەهید و تێکۆشەرەوە لەسەر رێگای بەرگری خۆیی بووە بە سەرچاوەی هیوایەکی زیندووی گەل. دامەزراوە نەتەوەییە دیموکراتییەکانی لەژێر رۆشنایی میراتی ئەرێنی مێژوویی ـ کلتووری گەل و تیۆری و دەستەواژەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک پێشبخرێن، مانای قەڵەمبازێکی شۆڕشگێڕی راستەقینە بۆ کوردان و خۆرهەڵاتی کوردستان (کوردستانی ئێران) دەبەخشێت. سەنتێزێکی نموونەیی نێوان نەریتی ئێران و مۆدێرنیتە پێشکەش دەکات. لەچوارچێوەی مۆدێرنیتەی دیموکراتیدا ئەلتەرناتیڤی جیاواز بۆ یەکێتی و یەکپارچەیی ئێران دەئافرێنێ و رۆڵی پێشەنگایەتی دەبینێت. وەک نموونەی ئەو ئاگرەی بەدرێژایی مێژووی ئێران لە لوتکە و بنارەکانی شاخی زاگرۆس دەگەشایەوە، هەڵمەتی PJAK-KCK یش وەک گەرمایی و رووناکییەک بۆ تەواوی ناوچەکە و ئێران بەردەوام دەبێت. وەک یەکێک لەهێزە تۆکمەکانی کۆنگرەی نیشتمانی ـ نەتەوەی دیموکراتیک درێژە بەپێگەی خۆی دەدات.

لەبەر ئەوەی قۆناغی ئیمراڵی دوای دەرکەوتنم لە سوریا (٩ ـ ١٠ـ ١٩٩٨ ) هاتەئاراوە کوردانی سوریا بەخەمگینی و رقێکی زۆرەوە وەڵامی پیلانگێڕییان دایەوە. بەرپەرچدانەوەیەکی مەزنیان بەرامبەر پیلانگێڕی پیشاندا، شەهیدی نوێیان خستە سەر شەهیدانی پێشوویان. هەرگیز پابەندبوونی خۆیان لەدەست نەدا، بەڵکو بەهێزتریان کرد. بەدرێژایی نزیکەی ئەو بیست ساڵەی لەوێ بەسەرم برد گەورەترین پشتیوانی ماددی و مەعنەویم بوون. شانبەشانی پشتیوانییە ماددیەکەیان، بەهەزاران کچ و کوڕی لاوی خۆیان تەڤلی ریزەکانی شۆڕش کرد و رۆڵێکی مێژوویان بینی. بەهەزاران شەهیدیان هەیە. تائێستاش لەرێگای هەزاران شەڕڤان و خەباتکاری سیاسییەوە درێژە بەپشتگیرییە ئاکتیڤەکەی خۆیان دەدەن. کوردانی سوریا لەرێگای پارتی یەکێتی دیموکراتی (PYD) وە بەشێوەیەکی سەرکەوتووانە هەمان ئەو رۆڵە دەبینن کەPJAK لەئێران وPÇDK لە ئێراق دەبینێت. لەمیانەی هەزاران شەهید و سەدان زیندانییەوە نموونەی هەڵبژاردەی هەڵوێستی بەرگری خۆیی و سیاسەتی دیموکراتیانەمان پێشکەش دەکات. کوردانی سوریا و پارتی یەکێتی دیموکراتی یەکێک لە هێزە بەشداربووە لەپێشەکانی کۆنگرەی نیشتمانی ـ نەتەوەیی دیموکراتیکن. مسۆگەرە کە لەوە بەدواوەش لەچوارچێوەی گشتی کوردستان و یەکێتی کوردان سەرکەوتووانە رۆڵی خۆیان جێبەجێ دەکەن.

ئەگەر لەناو گەلی سوریا ـ لوبنان ـ فەلەستین بێت، یاخود لەناو رێکخراوەکان و بەڕێوەبەرایەتی دەوڵەتدا چەندین پەیوەندی دۆستایەتیمان دروست ببوو. شێوازی بەجێهێشتنی ئەوێم بۆ ئەوانیش جێگای غەمگینی بوو. جێهێشتنەکە بەدڵ و داخوازی ئەوان نەبوو. لەگەڵ ئەوەی هەردوو لاشمان هەڵە و کەموکورتیمان هەبوو، بەڵام پەیوەندی گەلێکی مێژوویی بوون کە لایەنی ئەرێنییان لەپێش بوو. هیوادارم لەداهاتووشدا لەچوارچێوەی پلاتفۆرمی یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی خۆرهەڵاتی ناوین سەرلەنوێ یەکێتی و هاوکاری لەگەڵیاندا فەراهەم دەبێتەوە.

## سەبارەت بە ژیانی بەندیخانەی دوورگەی ئیمرالی

لەسەرجەم بەرگرینامە و دیالۆگە زارەکییەکان تائێستا زۆر باسی ژیانی شەخسی خۆمم نەکردووە. جگە لەهەندێک کێشەی تەندروستی و گرفتی رۆژانەیی لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی زیندان، باسی چۆنیەتی خۆراگری تەنیایی و بەرخودانم نەکرد بەرامبەر ئەو گۆشەگیرییەی سیستەم بەتایبەتی ئامادەی کردووە و تەنیا لەسەر منی جێبەجێ دەکات. لەو بڕوایەدام زۆرترین شتی جێگای مەراقە، ئەزموونەکانی ژیانمە کە بەرامبەر ئەو بێدەنگی و تەنیاییە رەهایەدا پێشمخستووە. کاتێک هێشتا منداڵ بووم یەکێک لە دانا بەساڵاچووەکانی گوند پێی گوتم: " لەجێگای خۆت دانیشە، دەڵێیت جیوەت تێدایە! ". وەک دەزانرێت جیوە توخمێکی زۆر بزۆکە. منیش بەمجۆرە یەکێکی زۆر بزۆک و بە جموجۆڵ بووم . تەنانەت ئەگەر خوداوەندەکانی میتۆلۆژیاش بیریان کردبایەوە، بەهەر حاڵ سزایەکی هێندە قورسی وەک بەستنەوە لە گاشە بەردەکانی ئیمرالییان بەخەیاڵدا نەدەهات. وێڕای ئەوەش دوازدە ساڵی خۆمم لە ژووری تاکەکەسی پڕکردەوە.

لەمێژوودا ئیمرالی بەوە بەناوبانگە کە شوێنی جێبەجێکردنی ئەو حوکمانەیە کە سەبارەت کاربەدەستە باڵاکانی دەوڵەت دراون. کەشو هەواکەی زۆر شێدار و دژوارە. بۆ پووکاندنەوەی مرۆڤ لەبواری جەستەییدا لەبارە. کاتێک گۆشەگیری ژووری داخراویشی بێتەسەر کاریگەرییە پووکێنەرەوەکەی بۆ سەر جەستەی مرۆڤ زیاد دەکات. هەروەها لەسەرەتای دەستپێکردنی تەمەنی پیربووندا بۆدورگەکە هێنرام. ماوەیەکی درێژ لەژێر کۆنترۆڵ و چاودێری فەرمانداریتی هێزی تایبەتدا راگیرام. لەو بڕوایەدام ئەو دووساڵەی دوایی چاودێری وەزارەتی داد کەوتەگەڕ. جگە لە پەرتووکێک، رۆژنامەیەک، گۆڤارێک و رادیۆیەکی یەک کەناڵی دەرفەتی گەیاندن و راگەیاندنم نییە. هەڵبەتە ئەگەر بەبیانووی "خراپی کەشوهەوا" بەردەوام رێگیریشی لێبکرێت چەند مانگ جارێک سەردانێکی برا و خوشکەکانم، دیدارە هەفتانەییەکانی پارێزەرەکانم پەیوەندییەکانم لەگەڵ دەرەوە پێکدێنن. بێگومان ئەو هۆکارانەی پەیوەندی بچووک ناکەمەوە بەڵام بۆ لەسەرپێمانەوە بەس نین. زهنم و ئیرادەم دیاریکەری لەسەر پێمانەوە و رێگەنەدان بە پووکانەوەم بوو.

کاتێک هێشتا لەدەرەوە بووم هەم خۆمم تەنیا کردبوو، هەمیش بەرامبەر بەتەنیایی خۆمم ئامادە کردبوو. ئەزموونگەلێکم هەبوو کە پەیوەندییە هۆگرییە گرنگەکانی لەجۆری خێزان، خزمی نزیک، بگرە پەیوەندییە نزیکەکانی هەڤاڵ و هاوڕێیەتیشی دەرجەستە دەکرد. لەگەڵ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ژن زۆر گرنگە، ئەویش بوارێکی پەیوەندی بوو کە دەرجەستەم کردبوو. بە تەواوی پێچەوانەی نازم حکیمەت بووم. بەڵێنم دابوو نەبم بە خاوەنی مناڵ. کاتێک هێشتا لەدوا ناوەندی بووم یەکێک لەو دارشتنانەی نووسیبووم و نمرەی تەواوم لێی وەرگرت لەژێر ناونیشانی: "تۆ بۆ من ئەو منداڵەیت کە هەرگیز لەدایک نابیت!". هێندەی لەبیرمە لەو نووسینەدا باسی زۆری و زەحمەتی ژیانی منداڵانم کردبوو. بەڵام تەواوی ئەو ئەزموونانەش بەشی روونکردنەوەی هێزی بەرخودانی ئیمرالی ناکات.

بەبێ باسکردنی ئەو خاڵەش ناکرێ دەرباز ببم. ئەو پیلانگێڕییەی لەقۆناغی ئیمڕالی بەسەر مندا دەسەپێنرا چەشنێک بوو تۆزقاڵێک هیوا چییە نەیدەهێشتەوە. هەر بەو ئامانجەش ماوەیەکی درێژ جێبەجێکردنی سزای لەسێدارەدان و شەڕی دەروونییان لە ڕۆژڤدا هێشتەوە. لەڕۆژانی یەکەمدا خۆشم نەمدەزانی چۆن چۆنی بەرگەی دۆخەکە دەگرم. نەک چەندین ساڵ، بەڵکو بەخەیاڵمدا نەدەهات تاکە ساڵێکیش بەسەر ببەم. بەزەیم بەخۆمدا هاتبوویەوە و فیکرێکی وەهام لا دروست ببوو: "چۆن دەتوانن ملیۆنان کەس لەژوورێکی تەسکدا ڕابگرن!" لەڕاستیدا بەسیفەتی ڕێبەرایەتی نیشتیمانی کوردان لەکاتی هەلومەرجی کەوتنە زیندانا ببووم یاخود کرابووم بە سەنتێزی ملیۆنان کەس. گەلیش بەوجۆرە دەرکی پێکردبوو. لەکاتێکدا مرۆڤ بەهیچ جۆرێک بەرگەی بێبەشبوون و دوورکەوتنەوە لە بنەماڵە و منداڵەکانی ناگرێت، ئەی من چۆن بۆ ماوەیەکی درێژ بەرگەی جیابوونەوەی ئیرادەی ملیۆنان کەسم دەگرت کە تامردن لەگەڵمدا بوون! تەنانەت نامە چەند دێرییەکانی گەلیشم پێنەدەدرا. جگە لەچەند نامەیەکی سنووورداری هەڤاڵانی زیندان کە ئەویش بەژێر چاودێرییەکی وردا تێپەڕدەبێت و چەند دانەیەکی دەرئاسا نەبێت هیچ نامەیەکم لە دەرەوە وەرنەگرتووە. نامەشم ڕەوانە نەکردووە. لەوانەیە ئەو خاڵانە تارادەیەک ئەو دۆخە روونبکاتەوە کە گۆشەگیری ڕێگای لەپێش کردۆتەوە. بەڵام پێگەی من لایەنی تایبەت بەخۆی هەبوو. ئەو کەسە بووم کە سەبارەت بە کوردان هەنگاوی بۆ چەندین یەکەمەکان ناوە. تەواوی ئەو پێهەڵگرتنانەی بەنیوەچڵ مابوونەوە مەرجە ژیانییەکانی ژیانی ئازاد بوون. یەکەمین پێهەڵگرتنم سەبارەت بە هەر بوارێکی کۆمەڵگا و هەرکەسێکی گەلەکەمان هاویشتبوو، بەڵام هیچ یەکێکیانم لەژێردەست و هەلومەرجی متمانەپێکراودا بەجێ نەهێشتبوو. بیر لە ئاشقێک بکەنەوە: هەنگاوی بۆ یەکەم ئەشقی خۆی ناوە، بەڵام تەواو لەکاتی بەدەستهێنانیدا دەستەکانی لە بۆشاییدا ماوەتەوە. قەڵەمبازی ئازادی من لەبوارە کۆمەڵایەتییەکاندا هەر ئاوەهایی لە بۆشاییدا مابوویەوە. تەنانەت خۆمم لەناو مەیدانەکانی ئازادی کۆمەڵگادا تواندبوویەوە. شتێکم بەناوی "من" لەدواوە بەجێ نەهێشتبوو. لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە قۆناغی زیندان لەساتێکی وەهادا دەستی پێکردبوو.

لە ڕاستیدا هەلومەرجە دەرەکییەکان، دەوڵەت، بەڕێوەبەرایەتی زیندان و خودی بەندیخانەش ئەگەر خاوەن بونیادێکی تایبەت بە گۆشەکەکانیش بێت، بەشی ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەرگەگرتنی گۆشەگیرییەکەی تایبەت بە من ناکات. پێویستە هۆکارە سەرەکییەکان لە هەلومەرج و هەڵوێستەکانی دەوڵەتدا نەبینرێت. ئەوەی دیاریکەرە خۆڕاهێنان و قەناعەتکردنی خۆمە بە هەلومەرجەکانی گۆشەگیرییەوە. دەبووایە پاساوێکی هێندە مەزنم هەبێت تا بەرگەی گۆشەگیری بگرم، لە هەلومەرجەکانی گۆشەگیریشدا نوێنەرایەتیکردنی ژیانێکی مەزن بسەلمێنم. لەسەر ئەو بنەمایەش پێویستە باسی هزر بکەم، بەر لەهەموو شتێکیش باسی دوو پەرەسەندنی دەستەواژەیی بکەم.

یەکەمیان؛ سەبارەت بە ستاتۆی کۆمەڵگا یاخود کۆمەڵایەتی کوردان بوو . بەمجۆرە بیرم دەکردەوە: بۆ ئەوەی ئارەزووی ژیانی ئازاد بکەم، پێویستبوو ئەو کۆمەڵگایە ئازادبێت کە من پێیەوە پەیوەستم. بەمانایەکی تر ئازادی تاکەکەس بەبێ کۆمەڵگا بەدینەدەهات. لەرووی سۆسیۆلۆژییەوە ئازادی تاکەکەس بەتەواوی گرێدراوی ئازادی کۆمەڵگا بوو. کاتێک ئەو ئەگەرە و گریمانەم لەسەر کۆمەڵگای کورد پەیڕەوکرد، هەستم بەوەکرد و حاڵی بووم کە ژیانی کوردان هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ زیندانێکی تاریکدا نییە کە چواردەوەرکەی شورا نەکراوە. ئەو حاڵیبوون یاخود هەستکردنە وەک باسێکی ئەدەبی پێشکەش ناکەم، بەڵکو وەک حەقیقەتی واقیعێکی بەرجەستە ئاماژەی پێدەکەم. دووەمیان؛ لەپێناو تەواو تێگەیشتنی دەستەواژەکە پێویستی وابەستەبوون بە پرەنسیپێکی ئەخلاقی هەیە. مسۆگەر خۆت لەو بارەیەوە حاڵی دەکەیت کە وابەستە بە کۆمەڵگایەک توانا و دەرفەتی ژیان هەیە. یەکێک لەگرنگترین ئەو هەستانەی مۆدێرنیتە ئافراندوویەتی؛ تاکی لەو بارەیەوە رازی کردووە کە بەبێ رایەڵە یاخود پەیوەستبوون بە کۆمەڵگاوە دەتوانێت خۆی بژێنێت. ئەو رازیکردنە باسێکی دروستکراو و ساختەیە. لە راستیدا ژیانێکی بەمجۆرە لەئاردا نییە، بەڵام وەک واقیعێکی گریمانەیی (وەهمی ) دروستکراو دەسەپێنرێت. بێبەشبوون لەو پرەنسیپە مانای هەڵوەشانەوەی ئەخلاقە. لێرەدا حەقیقەت و ئەخلاق تێکەڵن. تاکخوازی یاخود تاکگەرایی لیبرال تەنیا ئەو کاتە مەیسەر دەبێت کە کۆمەڵگای ئەخلاقی هەڵدەوەشێتەوە و پەیوەندییەکەی لەگەڵ هەستی حەقیقەتەوە دەپچڕێت. لەو سەردەمەماندا پێشکەشکردنی وەک شێوازی ژیانی زاڵ بەڵگەی راستبوونی نییە. وەک چۆن سیستەمی سەرمایەداری ــ کە لیبرالیزم گوتەبێژەکەیەتی ــ پش تەنیا لەمیانەی هەڵوەشانەوەی کۆمەڵگای ئەخلاقی و لەدەستدانی هەستی حەقیقەتەوە هاتەئاراوە. وەک ئەنجامێکی قاڵبوونەوەم سەبارەت بەدیاردە و کێشەی کورد بەو داوەرییە گەیشتم.

پێویستە زۆرباش دەرک بەخاڵێکی دوولایەنەی ژیانم بکرێت. ئەویش راکردن لە کوردێتی و پێچەوانەکەی چوون بەرەو کوردێتی بوو. وەک پێویستییەکی کۆمەڵکوژی کلتووری پەیڕەوکراو لەهەر شوێن و ئان و ساتێک هەلومەرجەکان بۆ راکردن لەبار و ئامادەبوون. بەردەوام راکردن بابەتی هاندان و وروژێنراو بوو. تەواو لێرەدا پرەنسیپی ئەخلاقی دەکەوێتەگەڕ. رزگاری شەخسی باجەکەی راکردن لە کۆمەڵگای خۆت بێت تاچەندە راست یاخود باشە؟ گەیشتن بەدوا قۆناغی خوێندنی زانکۆ، لە راستیدا ئەو مانایەی دەبەخشی کە لەو سەردەمەدا رزگاری شەخسیم گەرەنتی کرابوو. تەواو لەو قۆناغەدا دەستپێکردن یاخود یەکلابوونەوەی هەنگاونان بۆ کوردێتی، مانای گەڕانەوە بوو بۆ پرەنسیپی ئەخلاقی. لەچوارچێوەی سۆسیالیستیدا دەشیا ئەو کۆمەڵگایە کورد نەبێت و کۆمەڵگایەکی تر بێت. دیسان مسۆگەر پێویستە پابەندی دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بیت، تا بتوانیت ببیت بە تاکێکی ئەخلاقی. ئیتر ئاشکرا دەبوو کە هەرگیز نابم بەتاک یاخود کەسێکی بێ ئەخلاق. لێرەدا دەستەواژەی ئەخلاق بەمانای ئەتیک، واتە بەمانای تیۆری ئەخلاق بەکاری دێنم. ئەگەرنا مەبەستم ئەخلاقی سەرەتایی نییە، بۆ نموونە؛ باسی ئەوە

ناکەم کە بەدرێژایی تەمەن گرێدراوی خێزان یاخود جڤاتێکی هاوشێوە بژیت. چونکە پەیوەستبوون بە دیاردەی کورد و دۆخە بەکێشەکەی تەنیا لەمیانەی ئەخلاقەوە فەراهەم دەبوو. دۆخی کۆیلایەتی ڕەهای کوردان ـ کە ئێستاش وەهایە ـ مسۆگەر خەیاڵێکی بەمجۆرەی منی بەربەستکرد کە بڵێم "دەرفەتی ژیانی ئازاد هەیە". باوەڕیم بەوە هێنا: دونیایەکم نییە بەئازادی تێیدا بژیم. لێرەدا بەراوردکارییەکی زۆرم لەنێوان بەندیخانەی ناوەوە و دەرەوە کرد. لەئەنجامدا بینیم کە بەندێتی دەرەوە بۆ تاک زۆر مەترسیدارترە. ئەگەر تاکێکی کورد لە دەرەوە خۆی ئازاد ببینێت و بەمجۆرەش بژیت ئەوە بە هەڵەداچوونێکی گەورەیە. ژیانێک لەژێر باڵادەستی بەهەڵەداچوون و درۆوە بەسەر بچێت، ژیانێکی دۆڕاوە و دووچاری خیانەت هاتووە. ئەو ئەنجامەی لێرەوە پێی گەیشتم: تەنیا بەیەک مەرج دەتوانیت لەدەرەوە بژیت، ئەوەیش تەنیا کاتێک شەو و ڕۆژ بیست و چوار کاتژمێر تێکۆشان لەپێناو بوون و ئازادی کوردان بکەیت ـ لەهەلومەرجی سەرمایەداریشدا لەپێناو ڕەنجدەرانی تورک ـ . تەنیا لەمیانەی جەنگاوەرێتیبوون و ئازادییەوە دەشێت ژیان بۆ کوردێکی بە ئەخلاق و شەرەفمەند بەدیبێت.

کاتێک ژیانی دەرەوەم بە پارزنگی ئەو پرەنسیپەدا تێپەڕ بکەم، ناتوانم بڵێم تەواو بەگوێرەی ئەو پرەنسیپە ئەخلاقیانە ژیاوم. کاتێک بەرامبەرەکەی یاخود باجەکەی مردن یاخود زیندان دەبێت ئەوەش پێویستییەکی سروشتی شەڕ و تێکۆشانە. وەک چۆن ژیانێکی بێ شەڕ و تێکۆشان مانای ساختەکاری و بێ شەرەفییەکی گەورەیە، ڕەچاوکردنی مەرگ یاخود زیندانیش لەسروشتی کار و چالاکییەکەدا هەیە. بەرگەنەگرتنی هەلومەرجەکانی بەندیخانە لەگەڵ پاساوەکانم بۆ ژیان ناکۆکە. وەک چۆن هەرشێوەیەکی تێکۆشان و شەڕ لەپێناو بوون و ئازادی دەستلێبەرنەدراوە، ئەوا ناشێت خۆت لە بەندیخانەش لابدەیت. چونکە ئەویش پێویستییەکی ژیانی ئازادە کە لەپێناویدا شەڕ و تێکۆشان دەکەین. کاتێک کوردان جێگای باس بن و باوەڕیت بە سۆسیالیستبوونی خۆت هەبێت، ئەگەر لەژێر فەرمانی سەرمایەداری و لیبرالیزم یاخود لەژێر فەرمانی دەمارگرژییەکی گومڕای ئایینیدا نەبێت، لەپێناو ژیانێکی ئەخلاقی و ئەتیکانە جگە لە شەڕکردن ئەوا هیچ شتێکی دیکە نییە لەدەرەوە بیکەیت و دونیایەکی دیکەت نییە تێیدا بژیت. کاتێک لەژێر ڕۆشنایی ئەو دەستەواژەیەدا سەیرێکی ژیانی هەڤاڵانی ناو بەندیخانەکانم کرد بۆم دەرکەوت کە دووچاری بەهەڵەداچوونی بەرچاو هاتوون. باوەڕییان بە ژیانێکی ئازاد هێناوە کە لەدەرەوە لەئارا دایە یاخود ناچاری باوەڕهێنان کراون. خۆی لەخۆیدا کاتێک لەبواری سۆسیۆلۆژییەوە شیکار بکرێت دەبینرێت کە ڕۆڵی بەندیخانەکان ئافراندنی حەسرەتێکی خەستی ئازادییە لەتاکدا. لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەدا بەندیخانەکان بەتایبەتی لەپێناو ئەو ئامانجە بونیاد نراون. کاتێک تاکەکان لەزیندان دەچنە دەرەوە یان بە درۆ و ساختەکارییەوە ژیانیان پەسەند کردووە، لەدۆخێکی بەمجۆرەدا چاوەڕوانیکردنی ژیانێکی شۆڕشگێڕانە، ئەخلاقی و شەرەفمەندانە بێهودەیە و پووچە. یان لەمیانەی ئەو پێگەیشتن

و کامڵبوونـەی پراکتیکـی بەندیخانـە پێـی بەخشـیون بەشـێوەیەکی سـەرکەوتووانەتر تێکۆشانی کۆمەڵایەتی خۆیان جێبەجێ دەکەن.

زیندانەکان خانەکانی چاکسازی نین، بەڵکو ئەو شوێنەن کە تێیدا فێری چۆنییەتی جێبەجێکردنی لێهاتووانەی ئەرکە ئیرادەیی و ئەخلاقییەکان دەبیت بەرامبەر بەکۆمەڵگا. هەمان خاڵ بۆ جەنگاوەرانی ئازادیش لەجێگای خۆیدایە کە چوونەتە شاخەکان. بوون بە گەریلای ئـازادی، مانـای ئەوەیـە لەبـەرزترین ئاستدا ئەرکـە ئـەخلاقی و سیاسیەکانت دەرهـەق بەکۆمـەڵگابوون جێبـەجێ دەکـەیت؛ مانـای گەیشتنە بـەو هوشـیاری و ئەرکـە ئەخلاقییە؛ مانای جێبەجێکردنی پێویستییەکانی بەرگری خۆییە لەپێناو ئازادیدا. بوون بە گەریلای ئازادی لەپێناو باڵادەستی شەخسی یاخود دەسەڵاتداریێتی نییە. چونکە ئەوە شەرڤانێتی ئازادی نییە، بەڵکو چەکداریێتی دەسەڵاتە. ئەوانەی بەمجۆرەن دەرکەوتنیان بۆ شاخ و گەڕانەوەشیان ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی نییە. هەڵبەتە ئەمجۆرانە کاتێک هیواکانیان بەدینایـەت بەئاسـانی خیانـەت دەکـەن. لـەهیچ بـوار و مەیدانێکـدا پێویسـتی ئەرکـە کۆمەڵایەتییـەکانیان جێبـەجێ ناکـەن. ئـەوەی لێـرەدا مەبەسـتمە: ئەوانـەی بـوونی کۆمەڵایەتییان لەناو کۆیلایەتییەکی ڕەها دایە، یاخود تەنانەت دووچاری پەرتەوازەبوون هاتوون هەرشوێنێک هەڵگری هەمان تایبەتمەندێتییە. جیاوازییـە نابەجێکانی لـەجۆری نـاوەوە خراپـە و دەرەوە باشـە، چەکدارەکـەی خراپـە و بێچەکەکـەی باشـە هەوڵـە بنەڕەتییەکەی تێکۆشانی بوون و ئازادی ناگۆڕێت. لەکاتێکدا ژیانی مرۆڤ تەنیا لـەدۆخی ئازادیدا مانای هەیـە، بـەبێ ئـازادی لەهـەر کوێیـەک بژیـت، بـەردەوام ئـەوێ زینـدانێکی تاریکە.

دەستەواژەی دووەم؛ بەشێوەیەکی پەیوەست بەدەسـتەواژەی یەکەمـەوە پەرەسـەندنی هەست یاخود پەی پێبردنی حەقیقەتە. تاکە دەرمانی هێزی خۆڕاگری زیندان پێشخسـتنی دەرکپێکردنی حەقیەتە. ژیانداریکردنێکی بەهێزی دەرکپێکردنی حەقیقەت سەبارەت بەگشتی ژیان، گەیشتنە بە خۆشترین ساتی ژیان، بەمانایەکی تر گەیشتنە بە مانای ژیان. ئەگەر مرۆڤ بزانێت و ڕاست تێگەیشتبێت بۆچی دەژی، ئەوا لەهەر شوێنێک بژیت بۆ ئەو کێشە نییە. ئەگەر ژیـان بـەردەوام لـەناو هەڵـە و درۆ و دەلەسـەدا بەسـەر بچێت مانـای خـۆی لەدەست دەدات. بەمجۆرەش ئەو دیاردە سەرهەڵدەدات کە بە خراپبـوون و ناڕەسـەنبوونی ژیـان ناودەبرێـت. خـەمگینی، ناڕەحـەتی، شـەڕ و جنێـو ئـەنجامێکی سروشـتی ژیـانی ناڕەسەنە. ژیانی مرۆڤ بۆ کەسـانێک پـەرجوویکی تـەواوە کـە پـەیبردنیان بـە حەقیقـەت پێگەیشـتووە. خـودی ژیـان سـەرچاوەی جـۆش و خرۆشـانێکی مەزنـە. مانـای گـەردوون لەژیانـدا شـاراوەیە. کاتێک هەست بـەو نهێنییـە بکرێت، ئەگـەر لـە زینـدانیش دابێت، کێشەیەک بەناوی بەرگەگرتنی ژیـان لـەئارادا نامێنێت. هەڵبەتـە ئەگـەر زینـدان لـەپێناو ژیانـدا بێـت، ئـەوەی لەوێـدا گـەورەدەبێت دەرککردنـی حەقیقەتـە. ئـەو ژیانـەی لەگـەڵ پـەیبردنی حەقیقەتـەوە گـەورەدەبێت، دەتوانێـت گـەورەترین ئـێش و ئازارەکـانیش بـۆ بەختەوەری و ئاسوودەیی بگۆڕێت.

سەبارەت بە تێگەیشتنی دیاردە و کێشەی کورد و ئافراندنی دەرفەتەکانی چارەسەری بەندیخانەی ئیمرالی بۆ من تەواو بوو بەمەیدانی شەڕی حەقیقەت. لەکاتێکدا لەدەرەوە زیاتر گوتە و کردار لەجێگای خۆیدابوو، لەزیندانەدا مانا جێگای باس بوو. ئەو فیکرانەی لەو بەرگرینامەیەدا بەشێوەیەکی بەرجەستە و بەرفراوان سەبارەت بە فەلسەفەی سیاسەت ئاماژەم پێکردوون لەدەرەوە زۆر زەحمەت دەبوو. تەنانەت تێگەیشتنی خودی دەستەواژەی سیاسەتیش پێویستی بە هەوڵ و کۆششێکی مەزن هەیە، پێویستی بە پەیبردنێکی بەهێزی حەقیقەت هەیە. دەتوانم بڵێم؛ لەقووڵاییەوە هەستکردنم بەدۆخی دۆگماتیزمی پۆزیتیڤیستی خۆم پەیوەندییەکی زۆری بە گۆشەگیرییەوە هەیە. لەهەلومەرجەکانی گۆشەگیرییدا زیاتر دەرکم بەو ڕاستییە کرد کە دەشێت دەستەواژەی مۆدێرنیتە جیاوازەکان، مۆدێلی جیاوازی بونیادنانی نەتەوە لەئارا دابێت، بونیادە کۆمەڵایەتییەکان بەگشتی بونیادگەلێکی وێناکراو و زادەی دەستی مرۆڤن و خاوەن سروشتێکی نەرمن. بەتایبەتیش دەربازکردنی هزری دەوڵەت ـ نەتەوە لای من زۆرگرنگ بوو. ماوەیەکی درێژ ئەو دەستەواژەیە لای من پرەنسیپێکی مارکسیست ـ لینینیست ـ ستالینی بوو، وەک دۆگمایەک بوو کە هەرگیز نەدەبوو بگۆڕێت. کاتێک زیاتر لەبارەی سروشتی کۆمەڵگا، شارستانی و مۆدێرنیتەوە قاڵبوومەوە، بۆم ڕوونبووەوە کە ئەو پرەنسیپە پەیوەندی بە سۆسیالیزمەوە نییە، خڵتەیەکی شارستانی چینایەتییە و زۆرترین دەسەڵاتگەرێتی سەر کۆمەڵگایە کە بەدەستی سەرمایەداری ڕەواکراوە. لەو سۆنگەیەوە؛ دوودڵیم لەرەدکردنەوەی نەکرد. بەڕاستی وەک باس دەکرێت ئەگەر دەیانەوێت سۆسیالیزمی زانستی هەبێت، ئەوەی پێویستە لەو بارەیەوە بگۆڕێن وەستاکانی سۆسیالیزمی بونیادنراون. واتە خودی کەسانێکی وەک مارکس، ئەنگلس، لینین، ستالین، ماو و کاسترۆن. بەکارهێنان و خاوەنداریێتیکردنیان بۆ دەستەواژەیەکی سەرمایەداری (دەوڵەت ـ نەتەوە) هەڵەیەکی گەورەبوو و زیانێکی گەورەی بۆ دۆزی سۆسیالیزم هەبوو.

کاتێک لە قووڵاییەوە دەرکم بەو ڕاستییە کرد کە لیبراڵیزمی سەرمایەداری هەژموونگەرایییەکی ئایدیۆلۆژی بەهێزە، ئیتر دەستم بەشیکارە بەهێزەکانی مۆدێرنیتە کرد. لەدەرەنجامی ئەو شیکارانەدا بۆم ڕوونبوویەوە کە نەک تەنیا مۆدێرنیتەی دیموکراتی دەرفەتی هەیە، بەڵکو لە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری واقیعیتر، هاوچەرختره و بۆ ژیانیش لەبارترە. لەبەر ئەوەی سۆسیالیزمی بونیادنراو دەستەواژی دەوڵەت ـ نەتەوەی دەرباز نەکرد و وەک ڕاستییەکی بنەڕەتی مۆدێرنیتەی بینی، بەهیچ جۆرێک بیرمان لە چەشنێکی دیکەی نەتەوە نەکردبوومەوە، بۆنموونە؛ بیرمان لە ئەگەری نەتەوەی دیموکرات نەکربووەوە. کە باسی نەتەوەت دەکرد شتێک بوو کە دەبووایە خاوەنی دەوڵەت بێت! ئەگەر کوردان نەتەوەیەک بن، مسۆگەر پێویستە دەوڵەتێکیشیان هەبێت! کەچی لە ڕاستیدا چەندە سەبارەت بە دیاردە کۆمەڵایەتییەکان قاڵبوومەوە تێگەیشتم کە خودی نەتەوە ناڕوونترین واقیعی ئەو چەند سەدەیەی دواییە، لەژێر کاریگەری بەهێزی سەرمایەداری شێوەی گرتووە و بەتایبەتیش مۆدێلی دەوڵەت ـ نەتەوە قەفەسی ئاسنینی

کۆمەڵگاکانە، هەر بۆیەش دەستەواژەی کۆمەڵگابوون و ئازادی بەهادارترن. کاتێک بۆم روونبوویەوە کە شەڕ و تێکۆشان لەپێناو دەوڵەت ـ نەتەوە مانای شەڕکردنە بۆ سەرمایەداری، وەرچەرخانی گەورە لە فەلسەفەی سیاسیمدا هاتەئاراوە. چونکە تێکۆشانی چینایەتی و نەتەوەگەرایی بەرتەسک لەئاکامدا جگە لە بەهێزکردنی سەرمایەداری هیچ دەرەنجامێکی دیکەیان لێنەدەکەوتەوە. هەستمکرد و تێگەیشتم کە لەرووێکەوە من قوربانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریم. کاتێک دەرکم بەوە کرد کە ئەو زانستە کۆمەڵایەتییانەی مۆدێرنیتە دەیسەپێنێت زانست نییە، هوشیاریم سەبارەت بە کۆمەڵگا و مێژوو قووڵتربوویەوە. شۆڕشێکی تەواو سەبارەت بەتێگەیشتم بۆ حەقیەت روویدا. چەندە دۆگماکانی سەرمایەداریم شکاند و دامماڵین، بەچێژ و حەقیقەتێکی زیاتر و مەزنتر ئاشنای کۆمەڵگا و مێژوو بووم. لەو قۆناغەدا ناوی "نێچیروانی حەقیقەت" م لەخۆم نابوو. چەرخی "کەروێشک راکە، تانژی بیگرە" کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری بەسەر کوردانی سەپاند بوو، لەبواری ماناوە بۆ چەرخی "مۆدێرنیتەی سەرمایەداری راوبکە"م گۆڕی بوو. کاتێک هەست یاخود پەیبردنی حەقیقەت بەشێوەیەکی سەرانسەری پەرە بسەنێت، سەبارەت بەهەر کام لە بوارە کۆمەڵایەتییەکان، بگرە مەیدانە بەرجەستەیی و بایۆلۆژییەکان بیربکەینەوە، بالابوونێکی مانای دەستەبەر دەکرد کە لەگەڵ جاران بەراورد نەدەکرا. لەهەلومەرجەکانی بەندیخانەدا بەپێی داخوازی خۆم دەمتوانی چەندین شۆڕشی رۆژانەی حەقیقەت ئەنجام بدەم. ئەو هێزی بەرخودانەی پێت دەبەخشێت هیچ شتێکی دیکە ناتوانێت پێشکەشی بکات.

بەهێزبوونی تێگەیشتنی حەقیقەت کاریگەری خۆی لەسەر پێشخستنی چارەسەری کوردیش خستەڕوو. بەردەوام زهنیەتی دەوڵەتگەرایی تورک پیرۆز دەکرێت و بەتاکانەیی پێشکەش دەکرێت. کاتێک دەڵێن بەڕێوەبەرایەتی، بەردەوام بە دەوڵەتبوون بە خەیاڵیان دادێت. ئەو زهنیەتە بنەچەکەی زادەی سۆمەرە، بەچڕی لەگەڵ ئیلاهیبوون گونجێنراوە، بەردەوام بۆ کلتووری دەسەڵاتی عەرەب و ئێرانیش گواستراوەتەوە. دیاردەی دەسەڵات شوێنێکی بەهێزی لە رەگ و ریشەی دەستەواژەی یەک خوداوەندێتی گرتووە. کاتێک نوخبەکانی دەسەڵات لەناو تورکەکانیش پێکهاتن، چوارەمین یان پێنجەمین ڤێرسیۆنی ئەو دەستەواژەیان پێشخستبوو. بەبێ زانینی مانا ئەتیمۆلۆژییەکەی بە ئەنجامەکانی کاریگەر ببوون. لەکردار و رەفتارەکانی سەلجۆقی و عوسمانییەکان ببوو بە کوێرە مانا، بەواتایاکی تر بۆ بێمانایی گۆڕابوو. لەپێناو دەسەڵاتدا هەندێک جار لەچاوتروکانێکدا بەدەیان برا و خزم لە سێدارەدرابوون. لەرێگای کۆمارەوە کیفێکی تر بەسەر ئەو چەمکەوە کرا، بەمانایەکی تر چەمکەکانی سەروەری نەتەوەیی و دەوڵەت ـ نەتەوە کە ئەورووپا دایهێنابوو وەک خۆی بەدەسەڵاتەوە لکێنرا یاخود مۆنتاژ کرا. بەمجۆرەش دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک کرابوو بە لێویاتانێکی مەترسیدارتر ئەوەی دەستی بۆ بردبووایە لەسێدارە دەدرا. دەوڵەت ـ نەتەوە لەسەرووی پیرۆزییە رەهاکانەوە دەهات. بەتایبەتیش

ئەو دۆخە بۆ چینی بیروکراتیک بەمجۆرە بوو. کێشەی دەسەڵات و دەوڵەت ببوو بە ئاڵۆزترین کێشەی کۆمەڵایەتی مێژووەکەی.

کاتێک تێگەیشتم کە دەستەواژەکانی دەوڵەت و دەسەڵات ـ لەو دەستەواژانە بوون کە لە ئیمرالی زۆرترین قاڵبوونەوەم لەبارەیانەوە کرد ـ چۆن ڕۆڵێکی لەپەیوەندی نێوان کورد و تورکەکاندا بینیوە، بەشێوەیەکی بەهێزتر هەستم بەپێویستی هەنگاونان بەرەو چارەسەری کرداری کرد. وەک چۆن سەبارەت بەگشتی ئەنجامدراوە، پێویستم بینی لەپەیوەندییەکانی کورد ـــ تورکیشدا ڕەوتی پەرەسەندنی دەوڵەت و دەسەڵاتی پەیوەندییەکانی تورک ـ کوردیش بەرەو سەردەمی هیتیتەکان ببمەوە. کاتێک پەیوەندییە ژیۆپۆلۆتیکی و ژیۆستراتیژییە توندەکەی نێوان کلتووری دەوڵەت و دەسەڵاتی میزۆبۆتامیا و ئەنادۆڵم بۆ ڕوونبوویەوە و لەگەڵ پەیوەندی نێوان کورد و تورکم گونجاند، بەدڵنیایەوە بینیم کە جیاکردنەوەی دەسەڵات و دەوڵەت ڕێبازێکی ئاقڵانە نییە. لەبەر ئەوەی دەستەواژەگەلێک بوون دژی دەستەواژەی دیموکراسی پێشخرابوون، دەستەواژەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتم پەسەند نەدەکرد. کاتێک بینیم هێشتنەوەی بەڕێوەبەرایەتی بۆ هێزەکانی دەوڵەت و دەسەڵات زیانێکی گەورە بە کۆمەڵگا دەگەیەنێت، زیاتر دەرک بەگرنگی دیموکراسی دەکرا. بەڵام کاتێک هەستم کرد نکوڵیکردنێکی ئەنارشیستانەی دەوڵەت و دەسەڵات لەبواری کرداریدا ڕێگا لەپێش بێچارەیی یاخود ناچارەسەری دەکاتەوە، هەرچەندە لەلام ڕێبازێکی چارەسەری پەسەندکراو نەبێت، لە قووڵاییدا هەستم کرد کە نکوڵیکردن لە هاوبەشێتی یاخود دابەشکردنی دەسەڵات و دەوڵەت لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکاندا ناگونجێت. بەڕێوەبەرایەتی دیموکراتیک بژارە بنەڕەتییەکەمان بوو. بەڵام کاتێک بینیم نکوڵیکردنی کلتوورەکانی دەوڵەت و دەسەڵات کە بەدرێژایی مێژوو بووە بە تاکانە، ئەو لایەنانەی دەرکی پێنەکرێت کە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە هاوبەشیکردنی مافە، ئەوا لەدەرەنجامدا بە ڕێگەچارەی کرداری تەندروست ناگەین، زۆر باشتر لە گرنگی دەستەواژەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتی هاوبەش تێگەیشتم.

لە سیاسەت و ستراتیژییەکانی دەوڵەت و دەسەڵاتەکانی ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا بەدرێژای مێژوو پەیوەندی توندوتۆڵ لەئارادا بوو، بەردەوام مۆدێلی هاوبەش تاقیکراونەتەوە. لەسەرجەم قۆناغە هەستیارەکانی پەیوەندی تورک ـ کوردانیشدا مۆدێلی هاوشێوە هەڵبژێردراون. هەرە دوایش ئەو مۆدێلە لەشەڕی ڕزگاری نیشتیمانیدا تاقیکرابوویەوە. لەبەرگرینامەدا بەتێروتەسەلی باسی ئەو بەشانەم کرد. شانبەشانی ئەوەی وەک مۆدێلێکی تیۆری پێشکەشم کردووە، کاتێک بکرێت بە پرۆژەی چارەسەری پراکتیکی نەک تەنیا بۆ پەیوەندییەکانی نێوان کورد ـ تورک، بەڵکو سەبارەت بە کێشە هاوشێوەکانی خۆرهەڵاتی ناوینیش بەهایەکی مەزنی هەیە کە لەبنبەستبوونێکی مەزن دایە. بەتایبەتیش لەبەرامبەر دۆگماتیزمی پۆزیتیڤیستی سەپێنراو لەلایەن مۆدێرنیتەی سەرمایەدارییەوە هەم لەگەڵ ڕاستییە مێژووییەکان گونجاو و تەبایە، هەمیش سەبارەت

بەرێگاچارەی پراکتیکی ئەو فاکتەرانەی لەخۆوە دەگرت کە لەنموونە و فیکرەکانی هەر کەسەوە نزیکە. لەژێر رۆشنایی پەرەسەندنە مێژووییەکاندا قاڵبوونەوە سەبارەت بەدەسەڵات و دەوڵەت کاریگەرییەکی گرنگی دەرهەق بە قاڵبوونەوە لەسەر دەستەواژەکانی مۆدێرنیتەی دیموکراتیک، نەتەوە و خۆسەری دیموکراتیک هەبوو. راستییەکی دیکەی مێژووییش ئەو چەسپاندنە بوو کە: دەستەواژەی دەسەڵاتی ناوەندی دەرئاسایە، هەرچی دەستەواژەکانی دەسەڵاتی خۆجێییە رێسایە. لەرۆژی ئەمرۆشماندا کاتێک پێشکەشکردنی مۆدێلی دەوڵەت – نەتەوە وەک مۆدێلێکی رەها و تاقانە پەیوەندییەکەی بە سەرمایەدارییەوە راست دەرکی پێبکرێت و ناوەرۆکەکەی رۆشنتر بکرێتەوە، ئەوا گرنگی رێگەچارە خۆجێییەکانی بۆ دیموکراسی باشتر دەرکی پێدەکرێت.

سەبارەت بە پەیوەندی نێوان توندوتیژی و دەسەڵات بە ئەنجامگەلێکی هاوشێوە گەیشتبووم. ئاشکرابوو کە نەتەوەبوون و دەسەڵاتدارێتی لەرێگای توندوتیژییەوە نەدەبوو بە بژاری ئێمە. کاتێک پێویستییە ناچاریەکانی بەرگری خۆیی لەئارادا نەبێت، بەدەستهێنانی دەستکەوت و پێگەی کۆمەڵایەتی لەرێگای توندوتیژییەوە هیچ پەیوەندییەکی بە سۆسیالیزمیشەوە نەبوو. جگە لە بەرگری خۆیی (رەوا) سەرجەم شێوەکانی توندوتیژی تەنیا بۆ قورخکارییەکانی دەسەڵات و چەوسانەوە جێگای باس دەبوون. پەرەسەندنی دەستەواژەیی ئەو لایەنە، بایەخێکی مەزنتری بەهەڵوێستێکی مانادار و بەپرەنسیپانەی سەبارەت بەکێشەی ئاشتی دەبەخشی. لەو سۆنگەیەوە؛ بە توانستێکی دەستەواژەیی و تیۆری ئەوتۆ گەیشتبووم کە مۆرکی "جوداخوازی" و "تیرۆریستی" مایەپووچ بکات کە نوخبەکانی دەوڵەت و دەسەڵات بەسەر کوردان و سەرجەم ئەو چین و توێژانەیاندا سەپاندبوو کە لەژێر سەرکوتکردن و چەوسانەوەدا بوون. ئەو دیالۆگانەی لەسەر بنەمای ئەو توانستە دەستەواژەیی و تیۆرییە لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەت پێشمخستن بەپیتر بوو و دەرفەتی داهێنانی بۆ رێگاکانی رێگەچارەی کردارییانەش دەرەخساند. وەک چۆن لەبەشە جیاوازەکانی بەرگرینامەدا دەرفەتی تێبینیکردنی دەبێت، لەمیانەی کۆمەکی پەرەسەندنەکانی پەیبردنی حەقیقەت و ئازادی کۆمەڵایەتی لەچەندین بواری هاوشێوەدا دەرفەتی پێشخستنی رێگەچارە تیۆری و کردارییەکان دەرەخسا.

جگە لەو هۆکارە جەستەییانەی رێگا لەپێش گرفتی تەندروستی دەکەنەوە، ژیانی ئیمرالی هیچ لایەنێکی نییە توانای بەرگەگرتنیم نەبێت. بە بەراورد لەگەڵ جاران ئاستی موراڵ، هوشیاری و هێزی ئیرادەم هەرگیز کەمی نەکردووە؛ بەپێچەوانەوە بە دۆخێکی پاڵاوتەتر گەیشتووە، لەمیانەی ئەستاتیکاوە خۆراکدراوە و بەلایەنی گەشەکردنی جوانەوە دەوڵەمەندکراوە. کاتێک روونکردنەوەی حەقیقەتە کۆمەڵایەتییەکان لەمیانەی زانست، فەلسەفە و ئەستاتیک پەرەبسەنێت، ئەوا دەرفەتەکانی ژیانی راستتر، چاک و جوان زیاتر دەبێت. لەجیاتی ئەوەی لەگەڵ ئەو مرۆڤانە بژیم کە مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لە

ڕێگای حەقیقەت دووری خستوونەتەوە و گۆمڕای کردوون، لەژووری تاکەکەسی تا دوا هەناسەم تەنیایی هەڵدەبژێرم.

پرسیارێکی پەیوەست بەژیانی ئیمپرالییەوە لای گەلەکەمان مەراق دەکرێت لەبارەی چۆنێتی و جێگای ژیانمە لەکاتی دەرکەوتن لەزینداندا. کەسایەتییەک نیم خەیاڵپەرست بم. پێویستە زۆرباش بزانرێت خاوەن شێوازێکی ژیانم کە بە راستینەی شۆڕشگێڕی ناو دەبرێت. نەک ئەو ژیانەی دوای دەرکەوتن لە زیندان، بەڵکو ئەگەر سەیرێکی ڕێبازی ژیانی رابردووشم بکرێت کە لەمنداڵییەوە دەستپێکردووە، ئەوا دەکرێ باشتر وەڵامی ئەمجۆرە پرسیارانە بدرێتەوە. "یەکەمین یاخیبوونەکانی"ی لەتەمەنی ژێر دە ساڵان بەرامبەر ئۆتۆریتەی دەسەڵات ئەنجاممدا لەو بارەوە سەرە داوی گرنگ لەخۆوە دەگرێت. هەر لەوکاتەوە یاخیبووێکی تەنیا بووم. لەبەرگرینامەدا شوێن بەشوێن هەوڵمداوە نارەزاییەکانم سەبارەت بە کۆمەڵگای شار و گوند بخەمەڕوو. پەیوەندیدارەکان دەتوانن پرسیار و وەڵامی پێویست بەیەکەوە بدۆزنەوە. پێویستە زۆر بەکورتی پووختی بکەمەوە؛ لای من ژیان ئەوکاتە فەراهەم دەبێت کە ئازاد بژیت. وەک بناغەی ئەو بەرگرینامە پێنج بەرگییەی دوایی هەوڵمدا روونیبکەمەوە کە ژیانی ئازاد چییە. ژیانێک ئەتیک، عادیل و سیاسی نەبێت ژیانێکە پێویستە لەرووی کۆمەڵایەتییەوە نەژێنرێت، بەگشتی شارستانی، بەتایبەتیش مۆدێرنیتەی سەرمایەداری لەمیانەی قۆرخکارییەکانی چەوسانەوە و فشاری ئایدیۆلۆژییەوە کە خۆی ئاوایکردوون، لەرێگای ژیانی تاکخوازی، دیماگۆژی، پڕ لە درۆ و تێوەگلاو لەهەر جۆرێکی کۆیلایەتی ژیانی چەوت مەیسەر دەکات و دەیسەپێنێت. ئەو رووداوانەی بەکێشەی کۆمەڵایەتیش ناودەبرێت بەمجۆرە سەرهەڵدەدەن. هەر کەسێکی خۆی بە شۆڕشگێڕ دابنێت جا ئەوە بە سۆسیالیست و ئازادیخواز ناوببرێت یاخود دیموکراسیخواز و کۆمۆنیست ناچارە نارەزایی بەرامبەر شارستانی پشتبەستوو بە چەوسانەوە و فشاری چین، شار و دەسەڵاتی زێدەڕۆییانە و شێوازی ژیانی زاڵی قۆناغەکانی مۆدێرن پیشانبدات و دژی بوەستێتەوە. بەجۆرێکی دیکە شێوازی ژیانی عادیل، ئازاد، دیموکرات و کۆمەڵایەتی بەدینایەت؛ لەو سۆنگەیەوە؛ ژیانداری ناکرێت. ژیانگەلێکی پڕ لەدرۆ، خراپی و قێزەونی جێگای باس دەبن. ئەوەش بەشێوازێکی ژیانی چەوت ناودەبرێت کە بناغەیەکی راستی نییە. پێویستە هەوڵە گەورەکانم سەبارەت بە رەتکردنەوەی ئەو شێوازەی ژیان مایەی تێگەیشتن بێت کە بەدرێژایی ژیانم کردوومە بەکێشە یاخود خۆی بەکێشەیە. لەدۆخێکی پێچەوانەدا ناشێت وەک ڕێبەرایەتی و کەسایەتی دەرکم پێ بکەن. ئەوانەی بەبێ تێگەیشتن خوازیارن تەقلی کەسایەتی یاخود ڕێبەرایەتی من ببن و خوازیارن سوودی لێ ببینن لەوانەیە تووشی بێ هیواییەکی گەورە بێن. تێگەیشتن و تەقلیبوونی راست کێشەیەکی کۆمەڵایەتییە نەک کەسی.

لەو بارەیەوە پرسیارێکی دیکەی جێگای مەراق سەبارەت بە شێوازی ژیانە لەگەڵ ژندا. لەتەواوی بەرگرینامەکاندا ناوە بەناوە باسی چۆنێتی ژیانم لەگەڵ ژندا کردووە. بەتایبەتیش لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەدا ژیان لەگەڵ ژن گرنگیەکی مەزنی هەیە. ئەوە

کێشەیەک نییە لەمیانەی داخوازیکردن، گەڕان بەدوای ژن و فریودانی، یاخود بەیەکەوەبوون لەرێگای خانەی "گشتی" یان "تایبەت"و بەیەکەوە ژیانی منداڵدار یان بۆ منداڵ چارەسەر بکرێت. لەپێناو چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەی گۆشەی سەرەکی دڵ و مێشکی کێشە کۆمەڵایەتییەکانی داگیرکردووە، پێویستە هەڵوێستی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک بەبنەما وەربگیرێت. لەهەلومەرجەکانی ئەو سەردەمەماندا، واتە لەهەلومەرجەکانی مۆدێرنیتەی سەرمایەداریدا هاوژیانی ئازاد لەگەڵ ژن ژیانێکە پێویستی بە بەر پرسیارێتییەکی گەورە و هێزی هەڵوێستی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک هەیە. بەبێ زانینی ئەو ستاتۆیەی لەمێژووی شارستانی و مۆدێرندا ژنی تێ ئاخێنراوە، بەبێ پیشاندانی هێزی هەڵوێستی ئەتیک و ئەستاتیک، کامە چەشنی بەیەکەوە ژیان تاقیبکرێتەوە ئەوا بەچەوتی، بێ ئەخلاقی و قێزەونی ئەنجامگیردەبێت.

لەپێناو بە فیرۆنەدانی ژیان بەر لە هەموو شتێک فەراهەمکردنی شێوەی راست، ئەخلاقی و ئەستاتیکەکانی ژیان لەگەڵ ژندا مەرجە. شیکارکردنی ناسنامەی ژن کە هەموو جۆرێکی کۆیلایەتی لەسەر کەسایەتیەکەی تاقیکراوەتەوە و ناچاری هەرسکردنی کراوە، بوون بە هاورێ و هاوژیانی دۆزی یەکسانی و ئازادی مەرجی سەرەکی بوونە بەپیاوێکی راست ، جوان و بەئەخلاق. ئەگەر خوێندنەوەیەکی راست بۆ دێرە پەیوەندیدارەکانی بەرگرینامە بکرێت، ئەوا باشتر رووندەبێتەوە کە بۆچی گرنگیم بەو شێوازەی ژیان داوە و کردوومە بە پرەنسیپ. بەمجۆرەش باشتر دەرکی پێدەکرێت. شێوازی ژیانی رەگەزگەرایی کە ئەخلاقی شارستانی ئەوەرەی دەسەڵاتی مۆدێرنیتە سەپاندوویەتی و لەناو هەڵوێستێکی بەربەرێتی "دڕاندنی"کچێتی ژن دایە، قێزەونی و بێ ئەخلاقییەکی گەورە بەرهەم دێنێت. ئەگەر بەشێوەیەکی راست دەرک بەتێکۆشانە گەورەکەم بەرامبەر ئەو شێوازەی ژیان و دەرەنجامەکانی بکرێت ئەوا ژیان لەگەڵ ژن جوان و بە ئەخلاقانەتر دەبێت. لەو پێناوەشدا پێویستە هەر ژن و پیاوێکی هەست بە بەرپرسیارێتی دەکەن بەردەوام هەڵوێست و پراکتیکێکی زانستی، فەلسەفی، ئەتیک و ئەستاتیک پێشبخەن تا بەتایبەتی ژن ئازاد و بەهێز بێت و لەسەرجەم مەیدان و بوارە کۆمەڵایەتییەکاندا ئاستێکی یەکسان و هاوتا بەدەستبێنێت، ئەمەش لە زهنیەت و دامەزراوەکانی نەتەوەی دیموکراتدا بەرجەستە بێت.

ئەگەر لەبەندیخانە بێت یان دەرەوە، لەناو سکی دایکدا بێت یان لەهەر سات و شوێنێکی فەزا تەنیا بەسیفەتی کۆمەڵایەتییەوە دەشێت ژیانی مرۆڤ لەناو ئازادی، یەکسانی (لەناو جیاوازییەکاندا) و دیموکراسیدا بێت. شێوەکانی دیکەی ژیانی دەرەوەی ئەوە لادانن، لەو سۆنگەیەوە؛ نەخۆشی و دەردەدارییە. بەئامانجی راستکردنەوەی ژیان و گەیاندنی بە دۆخێکی تەندروستانە شۆڕشیشی لەناودا لەمیانەی گوتە و کرداری کۆمەڵایەتی جیاوازەوە تێکۆشان بەڕێوەدەبرێت. لەو پێناوەشدا زهنیەت و ئیرادەیەکی ئەتیک، ئەستاتیک، فەلسەفی و زانستیانە دەئافرێنرێت.

لەحاڵـەتێکی بـەمجۆرەدا لەئەگـەری دەرکـەوتن لەبەندیخانـە لەهـەر کوێیـەک بـم و لەکامە ئان و ساتدا بژیم سروشتییە کە لەمیانـەی هـەر شێوازێکی پێویستی تیۆری و کردارییەوە تێکۆشان لەپێناو ئەو کۆمەڵگایـەدا دەکـەم کە ئینتیمـام بۆی هەیـە، لـەپێناو کورداندا تێدەکۆشم کە گوزارشت لە تراژیدیترین واقیعی ئەو کۆمەڵگابوونە دەکەن، بـەڵێ دیسـان تێکۆشـان لـەپێناو نەتـەوەبوونی دیموکراتیانەیانـدا دەکـەم کـە رێگـای رزگـاری و چارەسەرکردنی کێشەکانیانە، لەپێناو یەکێتی نەتەوە دیموکراتەکانی دونیا تێدەکۆشم کە کوردانیش بەشێکی پێکدێنن و رێگـای رزگـاری تـەواوی گـەلانی خۆرهـەڵاتی ناوینـە، لـەو سۆنگەشەوە تێکۆشان لەپێناو یـەکێتی نەتـەوە دیموکراتـەکانی جیهـان دەکـەم کـە رێگـای چارەسەری و رزگاری تەواوی گەلانی دونیایە . لەمیانەی کەسایەتی حەقیقـەت درێـژە بـە کاروانەکەم دەدەم؛ کە لەمیانـەی هێزێکـی ئـەتیک، ئەستاتیکا و فەلسـەفە بەشـێکی زۆری حەقیقەتی بەدەست هێناوە، هـەر لـەو رێگایەشـەوە ژیـان بەدەسـت دێـنم و هـەر کەسـیش دەکەمە شەریک.

**٢١ی کانوونی یەکەم ـ ٢٠١٠**

**عەبدوڵڵا ئۆجالان**

**زیندانی داخراوی شێوەی ـ F ـ ئیمرالی**

**حوکمدراوی ژووری ئینفیرادی**

## بۆ سەرۆکایەتی دادگای مافی مرۆڤی ئەورووپا

**ستراسبۆرگ/فەرەنسا**

**بەڕێزان سەرۆک و ئەندامانی دادگا**

تائێستا چاوەڕوانی بڕیاری دادگاکەتانم کە سەبارەت بەو بەرگرینامەی پارێزەرەکانم دەرهەق بەو دۆزە جیاوازانە پێشیانخست کە لە ڕۆژەڤتان دایە. ئەو نارەزایی و بەرگرینامانە سەبارەت بەگۆڕینی ئەو یاسایانەیە کە کۆماری تورکیا پێشتر لەچوارچێوەی ستاتۆی ئەندامێتی یەکێتی ئەورووپا ڕێکیخستبوون؛ ئەو بەشانەی سوودیان بۆ من هەبوو بەشێوەیەکی نەرێنی لەگەڵ یاساکانی رابردوو گۆڕیویەتی، ئەوەش لەگەڵ پرەنسیپەکانی یاسای گەردوونی و دەستووری خۆیشیدا ناکۆکە. لەسەرووی ئەوانەشەوە کاتێک سزای لەسێدارەدان هەڵگیراوە، حوکمێکی زیادیان بۆ یاساکە داناوە و ئەو سزایەیان کردووە بە "حوکمی هەتا هەتایی قورسکراو" . کەچی لە راستیدا دوای نەمانی سزای لەسێدارەدان دەبووایە حوکمی هەتا هەتایی بکەوێتەگەڕ کە پێشتر لەبارەی منەوە درابوو. ئەوەش ماددەیەکە بەشێوەیەکی روون و ئاشکرا لە دەستوور و یاساکان ئاماژەی پێکراوە و بەحوکمەکانی جێبەجێکردن بەستراوەتەوە. سەبارەت بەو بابەتە و حوکمی چەندین یاسای دیکەی شەخسی منیان کردۆتە ئامانج و لەگەڵ یاسای گەردوونی و میللی تورکیا ناکۆکن، پارێزەرەکانم نارەزایی خۆیان پێشکەش بە بەڕێزتان کردووە. بۆچوونێکی جیاوازترم نییە بیخەمەسەر. تەنیا خوازیار بووم سەرنجی راکێشمە سەر و هیوا و ئاواتمە کە پێویستییەکانی جێبەجێ بکرێت.

دووەمین خاڵی گرنگ کە ئاماژەی پێبکەم: هەرچەندە زەحمەتە کە بڕیاری پێشووتان سەبارەت بە پیلانگێڕی رەچاوبکرێتەوە، بەڵام بەو ئامانجەی لەمێژوودا تۆمار بکرێت کە ئەو بڕیارەتان لەبەرامبەر پەرەسەندنە مێژوویی، کۆمەڵایەتییەکان راست نییە و لەگەڵ یاسای ئەورووپاش ناکۆکە دوا بەرگی ئەو بەرگرینامەیەم ئامادەکردووە کە لە پێنج بەرگ پێکهاتووە و پێشکەشتانی دەکەم. لەرێکەوتی ٢٢ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٠ بەرگی پێنجەم بەشێوەی دەفتەرێکی ئەستوور و ئەو داخوازینامە دوو لاپەڕەییە لەرێگای بەڕێوەبەرایەتی بەندیخانەی ئیمڕالیەوە بۆتان رەوانە دەکەم. ئەگەر دەرفەتی بەدواداچوون و لێکۆڵینەوەتان هەبێت، ئەوا زۆر بەئاسانی دەبینن کە لەرێگای ئەو دۆزەوە بەرگری لەچی دەکەم، ئەو کوردانە کێن کە لە کەسایەتی مندا کراونەتە ئامانج، بەدرێژایی مێژوو بەناو چۆن ژیانێکی کۆمەڵایەتیدا گوزەریان کردووە و بەرۆژی ئەمڕۆمان گەیشتوون و لەسەردەمی مۆدێرنیتەشدا چۆن دووچاری کۆمەڵکوژی کلتووری هاتوون. لەنزیکەوە رۆڵی

گلادیۆی سوپا نهێنیەکەی ناتۆش لەدەستگیرکردنی مندا دەبینن: جا ئەو رۆڵەی لەکاتی قۆناغی ئیمرالی بێت یاخود پێشتر و دواتری ئەو قۆناغە. لەنزیکەوە دەبنە شاهێدی شەڕەکانی گلادیۆ کە نەک تەنیا دژی من بەڵکو لەبەرامبەر تەواوی کوردانی بەڕێوە بردووە. بەپێی ئاگاداری و زانیارییەکانمەوە ئەو چالاکیانەی لەوڵاتانی ئەوروپا و پاشکۆکانیەوە لەلایەن رێکخراوی گلادیۆوە ئەنجامدراون لەگەڵ یاساکانی یەکێتی ئەوروپا ناکۆکە، لەو سۆنگەیەوە؛ لەگەڵ حوکمەکانی پەیمانی مافی مرۆڤی ئەوروپاش ناکۆکە. بەبڕوای من لەیەکەمین گەورە بڕیاریدا (سەبارەت بەناڕەوایی دەستگیرکردن) دادگاکەتان خۆی نابینا کردووە و بابەتیانە رەفتاری نەکردووە. چونکە دەستگیرکردن لە رێگای نایاسایی و پیلانگێڕییەوە، بەتایبەتیش لەلایەن رێکخراوێکی نامەشروعەوە ئەنجامدراوە ، ئەمە لەگەڵ یاسای نێودەوڵەتی و یاسای یەکێتی ئەوروپاش ناکۆکە و گونجاو نییە. ناشێت ئەو بڕیارەتان رەوا ببینم کە بەشێکی زۆری ئەندامەکانی دادگاکان لەژێر کاریگەری ئەندامەکەی ئینگلتەرا پێی گەیشتوون.

راستکردنەوەی ئەو حوکمە چەوتە لەمیانەی بڕیارێکی نوێوە یاخود لەرێگای دوابڕیارەوە لەسەر ئارەزووی خۆتان وەستاوە. من تەنیا ویستم سەرنج راکێشمە سەر ناھەقیەکە. چەندین رووداوی هاوشێوەی ئەو بوویەرانە روویانداوە کە بەسەر من و گەلەکەم هاتووە. بەسەرهاتی ئەرمەنی ، هێلینی و سریانییەکان لە ئەنادۆڵ و میزۆبۆتامیا لەیادەوەری نزیک دایە. لەکاتێکدا یاسا و دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوەکانی ئەوروپا لەژێر ناوی پشتگیریکردن ئەو گەلانەیان رووبەڕووی قڕبوون کردەوە، بەرپرسیارێتی خۆیان لەئەنجامی تراژیدیایەکەی ئەو گەلانە نەدیوە کە خاوەنی کۆنترین کلتووری هەزاران ساڵەی مرۆڤایەتین، نایانەوێت ئەو بەرپرسیارێتییەش پەسەند بکەن. لەرێگای تەڵەکەبازییە وردەکانی دیبلۆماسی دەوڵەت ـ نەتەوەی تورک و خۆگونجاندنی لەگەڵ بەرژەوەندی وڵاتانی ئەوروپا ئەو گەلانەش لەناو لاپەڕەکانی مێژوو لەبیرکران. هیچ ئەنجامێکی یاساییان بەدەستنەهێنا. ئێستا کوردانیش دووچاری هەمان رەوش دەکرێن. ئەوەی لە کەسی مندا دووچاری پیلانگێڕی هات گەلی کوردە، مافی گەلی کوردە. پیلانگێڕی رووداوێکی ئاسایی نییە، بۆ گەلێک هەڵگری مانا و خەسڵەتێکی کوشندەیە. بەتایبەتیش هەڵوێستی ئینگلتەرا، ئەمریکا و ئیسرائیل لە بەرژەوەندی تورکیا رۆڵێکی دیاریکەری لە سەرکەوتنی پیلانگێڕییەکەی دژ بە من هەبوو. هەرچەندە لەدوا گەورە بەرگرینامەکەمدا لەمیانەی بەڵگەی تیۆری و ئەزموونییەوە بەپێی پێویست ئەو بابەتانە خراونەتە روو بەڵام دیسان بۆ دواجار سەرنجم راکێشایە سەر.

**بەڕێزان سەرۆک و دادوەران**

جارێکی دیکە دەیڵێمەوە؛ ئەگەر ئەو گۆشەگیرییە تایبەتە بێت کە لەبەندیخانەی ئیمرالی لەسەر من پەیڕەو دەکرێت، یاخود ئەو یاسانەی تورکیا لەژێر ناوی جێبەجێکردنی یاسای ئەوروپا دەریخستوون لەناوەڕۆکدا پێچەوانەی یاسان. هەروەها ڕێگریکردنی کۆنسەی لە سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە لەگەڵ یەکەمین بڕیارتان دا ناکۆکە، واتە لەگەڵ بڕیاری "سەرلەنوێ دادگاییکردن "وە ناکۆکە. پەسەندکردنی ئەو بڕیارەی کۆنسەی ـ کە بڕیارێکی بەو شێوەیەی پەسەندنەکردنی سەرلەنوێ دادگاییکردنەوەی هیچ کەسێکی نەداوە ـ لەلایەن ئێوەوە ناهەقییەکی گەورەیە و بوونە بە ئامرازی پیلانگێڕی، بەگرنگیەوە ئاماژەی پێدەکەم و داوا دەکەم هەر هیچ نەبێت لەمیانەی دوا بڕیارتان بۆچوونتان سەبارەت بەو بابەتە بگۆڕن و بڕیارێک لە بەرژەوەندی من دەربخەن، بەمجۆرەش ڕێگا بە مافی "سەرلەنوێ دادگاییکردنەوە "بدەن، لەگەڵ سڵاو و ڕێزمدا.

٢٢ی کانوونی یەکەم ٢٠١٠
عەبدوڵڵا ئۆجالان
زیندانی هەتاهەتایی قورسکراو
ئیمرا

ئەگەر من بوومایە و ڕێگام بکەوتایە هەر شوێنێک چا گوندی خۆم بێت، یان چیای جودی، بنارەکانی شاخی جیلۆ، دەوروبەری دەریاچەی وان، شاخەکانی ئاگری، مونزر و بینگۆل، کەنارەکانی ڕووباری فورات، دیجلە و زاپ، تا دەگاتە دەشتەکانی ئورفا، موش و ئیغدیر، ڕێگام بکەوتبایە هەر شوێنێک وەک بڵێی بە کەشتییەکەی حەزرەتی نوح لەناو تۆفانێکی سامناک دەرکەوتووم، وەک چۆن حەزرەتی ئیبراهیم لەدەستی نەمرودەکان، حەزرەتی موسا لەدەستی فیرعەونەکان و حەزرەتی محەمەدیش لەدەستی جەهالەت ڕایکرد منیش وەها لە دەست مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ڕامدەکرد، پشتم دەبەست بە ئەشقی زەردەشت بۆ کشتوکاڵ و بۆستانەتی ئازادان، ئیلهامم لەمانە و ڕاستینەکانی کۆمەڵگا وەردەگرت و دەستم بەکارەکانم دەکرد. کارەکانم بەجۆرێک زیاد و بە پیت دەبوو کە بە خەیاڵیشدا نایەت. بەکەسر دەمتوانی لە هەرەوەزییەکانی گوند دەستبەکار بم. ئاواکردنی کۆمۆنی گوندێک یان چەند گوندێک کارێکی چەند بەخرۆش، ئازادیبەخش و تەندروست دەبووا ئاواکردن و خستنەگەڕی کۆمۆن یان کۆنسەی گەڕەکێک یاخود شارێک چەندە داهێنەرانە و ئازادیبەخش دەبووا کردنەوەی ئەکادیمیایەک، پێکهێنانی هەرەوەزییەک و کردنەوەی کارگەیەک ڕێگای لەبێش چی دەکردەوە! ئاواکردنی ئەنجوومەن و کۆنگرەکانی دیموکراسی گشتی گەل، گوتاردان و کارکردن تێیدا چەندە جێگای فەخر و شانازی بوو. ئەو کاتە دەبینرێت وەک چۆن ئامەزرۆیی و هیواکان سنووریان نییە، بۆ بەدیهێنانیشیان جگە لە خودی ئاک هیچ بەربەرستێکی دیکەی جددی نییە. تەنیا ئەوەی پێویستە ئۆزێک کەرامەتی کۆمەڵایەتی، ئۆزێکیش ئەشق و ئەڵل!